# ئینسكلوپیدیا
# پارێزگەها دهوكێ

سەرنڤیسەر و سەرپەرشتێ گشتێ

**موسەدەق تۆڤێ**

هاریكارێ سەرنڤیسەری
خالد سالح

## بەرگێ دووێ

## مێژوو

## دیرۆكا كەڤن و شوینوار، دیرۆكا ئیسلامێ

٢٠١٧ ز ٢٧١٧ ک ١٤٣٩ مش

# ناڤەرۆك

# مێژوویا کەڤن یا پارێزگەها دهۆکێ

پ.د.محەمەد سالح تەیب سادق

## پێشەکی:

ڤەکۆلین ل سەر مێژوویا دەڤەرەکا بچویك د چەرخێن کەڤندا کارەکێ ئالۆز و گرانە، ژبەر نەبوونا بەلگەیێن پێدڤی نەخاسمە نڤیسینێن کەڤن، ژبەرکو دهۆك نەبوویە سەنتەرەکێ دەستەلاتداری کو کوچك و پەرستگەهـ لێ هەبن و زۆربەیا نڤیسینێن کەڤن ل کۆچك و پەرستگەهان هاتینە دیتن، لەوما ڤەکۆلەر یێ ناچارە پەنایێ ببەتە بەر مێژوویا دەڤەرێن نێزیکی دهۆکێ و مفای ژێ وەرگریت.

یا ئالۆزتر ئەوە کارێ ئارکولوژی(Archaeology) وەکی پێدڤی ل پارێزگەها دهۆکێ نەهاتییەکرن و تا ئەڤرو گەلەك بنگەهێن شوینەواری چاڤەرێی ڤەکۆلینێ دکەن نەخاسمە شکەفتێن چیایێن پارێزگەهێ و گەلەك جهێن دی، چونکی پاشمایێن شوینواران ژێدەرەکێ سەرەکییە بۆ مێژوویا کەڤن ل چەرخێن پێش مێژوویێ (بەری پەیدابوونا نڤیسینێ).

ژێدەرێن مێژوویا کەڤن:

١- شوینوار: کو پێکدهێن ژ پاشمایێن مرۆڤان، مینا ئامان، ئامیر، هەستی، پەیکەر، ئاڤاهی، جۆك، سکر، پر و پارە.

٢- نڤیسین: تێکستێن نڤیسی ژێدەرەکێ هەری سەرەکییە، نەخاسمە نڤیسینێن بزماری (میخی، مسماری) Cuneiform چونکی ب هزارەها تەختێن بچویك (الالواح الطينيه) کو ژ ئاخێ دروستکرین ل بازێرێن عیراقێ هاتینەدیتن، مینا بازێرێن نەیناڤا و نەمرود و ئاشوور کو نێزیکی دهۆکێ نە و نڤیسینێن سۆمەری ل بازێرێ ئۆر، لەجەش، کیش و ئوما، ئەڤ نڤیسینە یێن هاتینە وەرگێران بۆ زمانێن بیانی، نەخاسمە زمانێن ئنگلیزی و ئەلمانی و فەرەنسی.

٣- پەرتووکێن پیرۆز: نەخاسمە تەورات کو دهێتە هەژمارتن ژێدەرەکێ مێژوویی.

٤- ژێدەرێن کلاسیکی (یونانی و رۆمانی)، مینا نڤیسینێن هیرودوتس و زەینەفون و پلینی و ئەریان و بلوتارك.

٥- نڤیسینێن سریانی: هەر چەند ژێدەرێن سریانی کو ب زمانێ ئارامی هاتینە نڤیسین دووپاتیێ ل سەر مەسیحیەتێ و دێرا و مەترانا و کارێن وان دکەت، لێ ڤەکۆلەر دکاریت مفای ژێ وەربگریت.

٦- ژێدەرێن عەرەبی: هندەك ژێدەرێن عەرەبی مینا مێژوویا تەبەری و بەلازوری و دینەوەری ل سەر دەولەتێن ئیرانێ یێن کەڤن نڤیسینە، لێ پێزانینێن وان دویرن ژ راستیێ و پێدڤیە ب هشیاری ڤە مفا ژێ بهێتە وەرگرتن.

## ئێك - چەرخێن پێش مێژوویێ

( Prehistory) ٢٨٥٠-٦٠٠٠٠٠ پ.ز:

ئاركولوژی و مێژوونڤیس دبێژنە وی چەرخی ئەوێ مرۆڤی نڤیسین نەدزانی چەرخێن پێش مێژوو، چونكی مێژوو نەهاتیە نڤیسین.

چەرخێن پێش مێژوویێ دەمەكێ زۆر درێژ ڤەكێشا و دبیتە رێژا ٩٨٪ ژ ژیانا مرۆڤایەتیێ، بێ گومان ئەڤ رێژەیە دێ ل پاشەرۆژێ كێم بیت.

دیرۆكڤان دبێژنە چەرخێ پێش مێژوویێ چەرخێن بـــــەری(Stone Ages) چونكی مرۆڤی ل وی سەردەمی ئامیرە و ئامانێن خۆ ژ بەری دروستدكرن، یان ژی ب تنێ ئامیرێن بەری یێن ل دویڤ خۆ هێلاین. ژبەر درێژیا ڤی چەرخی مێژوونڤیسا یێ دابەشكرییە سەر سێ چەرخان:

### أ- چەرخێ بەریێ كەڤن

(Palaeolithic) ٦٠٠٠٠٠- ١٥٠٠٠پ.ز:

ئاركولوژی و مێژوونڤیس دبێژنە ڤی چەرخی چەرخێ كۆمكرنا خوارنێ ( Food Gathering Stage)، ژبەر درێژاهیا وی چەرخی یێ هاتییە پشككرن بۆ سەر سێ سەردەمان و هەر دەمەكی ئامیرێن خۆ یێن بەرنیاس یێن هەین، ئەڤە ژی ناڤێن وان سەردەمانە:

١-چەرخێ بەریێ كەڤنێ نزم (Lower Palaeolithic).

٢-چـــەرخـــێ بەریێ كەڤنێ نـــاڤـــیـــن(Palaeolithic Middle).

٣-چەرخێ بەریێ كەڤنێ بلند (Upper Palaeolithic).

### ب- چەرخێ بەریێ ناڤین

Mesolithic ١٥٠٠٠- ١٠٠٠٠ پ.ز:

ئەڤ چەرخە گوهورینە ژ قۆناغا كۆمكرنا خوارنێ بۆ چەرخێ بەرهەمئینانا خوارنێ ( Food Producing Stage) كو دبیتە چەرخێ بەریێ نوی.

### ج- چەرخێ بەریێ نوی

(Neolithic) ١٠٠٠٠- ٥٦٠٠ پ.ز:

چەرخێ شۆرشا چاندنێ و گوهورینا ژیانا مرۆڤان و دەرچوون ژ شكەفتان بەرەڤ ئاڤاكرنا خانیان و پێكئینانا گوندان و پەیدابوونا جڤاكی.

### د- چەرخێ بەرییێ كانزایی

(Chalcolithic) ٥٦٠٠- ٣٥٠٠ پ.ز:

مرۆڤی دڤی چەرخی دا كانزا بۆ چێكرنا ئامیرێن خۆ بكارئینان، دگەل بكارئینانا بەرا و ئاخێ.

بێگومان كوردستان و دەڤەرا نها سەر ب پارێزگەها دهۆكێ دڤان هەمی چەرخاندا دەربازبوویە، چونكی ژیانا مرۆڤان و دەسپێكا ئاڤاكرنێ و چاندنێ یێ ل كوردستانێ دەستپێكری.

### هـ- چەرخێ نیمچە مێژوویی

(Proto-Historic) ٣٥٠٠-٢٨٥٠پ.ز:

ئەڤ سەردەمە وەرچەرخان و دەربازبوونە ژ چەرخێ پێش مێژوویێ و چەرخێن مێژوویی، لێ عیراقی دبێژنە ڤی چەرخی چەرخێ وەركا (بازێرێ وەركا یێ كەڤن ل پارێزگەها ناسریێ) و جمدەت نصر (تل جمده نصر) ل رۆژهەلاتا بازێرێ حللە، چونكی شوینوارێن وی چەرخی ب رەنگەكێ بەرچاڤ ل وان هەردو بنگەهێن شوینواری هاتنە دیتن، مرۆڤی د ڤی چەرخی دا مۆرا لولەیی و نڤیسینا وێنەیی بكارئینا، لێ بۆ نڤیسینا مێژوویی نەهاتە بكارئینان [1].

ل چەرخێن پێش مێژوویی ژینگەها سرۆشتیا كوردستانێ فاكتەرەكێ سەرەكی بوو بۆ ژیانا مرۆڤان، لەورا كوردستان دهێتە هژمارتن ژ دەڤەرێن هەرە كەڤن كو مرۆڤ د چەرخێ ناڤبریدا تێدا ژیای، ژبەر هەبوونا چیا و شكەفت و دارستان و پەزێ كیڤی و ژێدەرێن ئاڤێ. ل چەرخێن پێش مێژوویێ مرۆڤی بۆ دەمەكێ درێژ كارێ نێچیرڤانیێ دكر و دناڤ شكەفتادا دژیا. هەژیە بێژین كو ل دەسپێكا چەرخێ بەریێ نوی گوهورینێن سەڤای ل رۆژهەلاتا ناڤین دەستپێكر، چونكی ژ لایێ جیولوجیڤە ب درێژاهیا چەرخێ بەریێ كەڤن دبێژنێ چەرخێن سەهۆلی (العصور الجليدية- Ice - Ages). دڤان چەرخاندا

باكوورێ ئەوروپا و ئەمریكا باكوور بەفرەكا ستویر گرتبوو، بۆ ئەگەرێ نەمانا ژیانێ ل وان دەڤەران و مرۆڤ و گیانەوەران بەرەڤ باشووری بۆ كەنارێن دەریا ناڤەراست و رۆژهەلاتا ناڤین كۆچكرن، وی دەمی بەفر و بارانەكا زۆر ل دەڤەرێن رۆژهەلاتا ناڤین دباری[٢]، لەوما ژینگەها كوردستانێ و نەخاسمە دەڤەرێن پارێزگەها دهۆكێ(یا نها) جهەكێ گونجای بوون بۆ ژیانا مرۆڤان و گیانەوەران ژبەر ڤان خالان :

أ- هەبوونا شكەفتان ل دەڤەرێن چیایی بۆ ئاكنجیبوونا مرۆڤان.

ب- هەبوونا گیانەوەران وەكی ژێدەرەكێ سەرەكی بۆ خوارنێ.

ج- هەبوونا دارستانان كو ئەو ژی ژێدەرەك بوو بۆ كۆمكرنا خوارنێ.

د- هەبوونا ژێدەرێن ئاڤا پاقژ.

هەر چەندە كریارێن ئاركولوژی ل سەر ژیانا مرۆڤان د شكەفتێن دەڤەرێ دا ب رەنگەكێ بەرفرەهـ ل چیایێن پارێزگەها دهۆكێ نەهاتینە ئەنجامدان، لێ نیشان هەنە كو مرۆڤ ل دەڤەرێ دژیا و كارێ نێچیرێ دكر. ژ وان نیشانان دیتنا هەستییێن مرۆڤان ل شكەفتا شانەدەر كو مێژوویا وان دزڤرنەڤە بۆ دۆرێن ٦٠٠٠٠ سالان پ.ز.[٣] شكەفتا شانەدەر یا دویر نینە ژ چیایێن پارێزگەها دهۆكێ.

ل چەرخێ بەری یێ نوی مرۆڤێ كوردستانێ زانی پەزی ب خودان كەت و چاندن زانی، ئەڤ پێشكەفتنە بوونە ئەگەرێن گوهورینا ژیانا مرۆڤان و ل شكەفتێ دەرچوو بۆ دەڤەرێن دەشتێ و گوند ئاڤاكرن و كۆمەل پێكئینان.

ل سالا ١٩٨٥ ێ دەمێ دروستكرنا سكرێ مووسلێ دەسپێكری، كارێ ئاركولوژی ل رۆژئاڤا و رۆژهەلاتا رووبارێ دیجلە هاتە ئەنجامدان و گەلەك بنگەهێن ژیانا مرۆڤان هاتنە دیتن، ل رۆژهەلاتا رووباری ل باشووری دهۆكێ بیست جهێن شوینواری هاتنە دیتن، ل ڤان بنگەهان ئامیرە هاتنە دیتن، كو دیرۆكا وان دزڤریتە چەرخێ بەرێ یێ كەڤن یێ نزم[٤]، مێژوویا هندەك ئامیران كو ل وێرێ هاتینە دیتن دزڤرنە بۆ (٨٠- ٤٠) هزار سالان پ.ز، ئەو ئامیرە هەر مینا وان ئامیرانە یێن ل چیایێن كوردستانێ هاتینە دیتن[٥].

باشترین نموونە بۆ گوندێن چاندنێ ل پارێزگەها دهۆكێ گوندێ نەمریكێ (نمریك) یە ل باشوورێ فەیدێ، تیمەكا ئەركولوژیا پولونی ئەڤ گوندێ كەڤن دیتیە، ڤی تیمی خانی دیتینە و دناڤ خانیاندا هەستیێن پەزی و دندكێن گەنمی دگەل ئامیرە و هەستیێن مرۆڤان هەبوون، دیرۆكا ئاڤابوونا ڤی گوندی دزڤریتە داویا هزارا ٨ پ.ز[٦].

ژیان و ئاڤەدانی ل سنوورێ نهایێ پارێزگەها دهۆكێ یا بەردەوامبوو، ل چەرخێ بكارئینانا گلینەیی (عصر الفخار) مینا شارستانیەتا جەرمو[٧] و حەسونە[٨] ل هزارا هەشتێ و حەفتێ پ . ز . هەژی گۆتنێ یە كو رێڤەبەریا شوینوارێن دهۆكێ هندەك ئامیرە ل سێمێلێ دیتن، مێژوویا وان ڤەدگەریت بۆ داویا هزارا هەشتێ پ . ز ، ئەڤ ئامیرە یێن هاتینە ڤەگوهاستن بۆ مۆزەخانا دهۆكێ، هەروەسان پەیكەرێ خوداوەندا دایك یێ ل بنگەهێ دێرك– سێمێلێ هاتیە دیتن كو مێژوویا وی ڤەدگەریت بۆ نێزیكی دەسپێكا هزارا ٦ پ. ز.

ل هزارا ٦ پ.ز چەرخێ میتالی (معدنی) دەسپێكر، چونكی مرۆڤ دڤی چەرخی دا شیا هندەك ئامیرا ژ میتالی دروست بكەت و دبێژنە ڤی چەرخی شارستانیەتا حەلف (حلف)[٩].

چەرخێ شارستانیەتا عوبەید[١٠] ل دەڤەرێن پارێزگەها دهۆكێ هاتنە بەلاڤبوون[١١]، وەدیارە ئەڤ بەلاڤبوونە ب رێكێن بازرگانیێ بوو، چونكی جەرێن چەرخێ عوبەید جوانی تێدانەبوو ژبەر چێكرنا وان ب دۆلابا چێكرنا جەرا[١٢].

چەرخێ نیمچە مێژوویی چەرخێ پێشڤەچوونێ و ئاڤاكرنا كۆمەلگەهـ و پەرستگەها و زانینا نڤیسینا وێنەیی بوو ل عیراقا كەڤن كو دبێژنێ چەرخێ وەركا[١٣] و جومدەت نەسر (جمدە نصر)[١٤]. ژ ڤی چەرخی بنگەهێن شارستانی ل كوردستانێ و پارێزگەها دهۆكێ هاتنە دیتن كو ئامیرێن وان دزڤرن بۆ ڤی چەرخی مینا بنگەهێ خرابەبان و خرابە بنجیرك[١٥].

## دوو- چەرخێن مێژوویی: (٢٨٥٠پ.ز -- ٦٣٧ز):

### أ-چەرخێ سۆمەری (٢٨٥٠- ٢٣٧١پ.ز):

هەر چەندە نڤیسینا وێنەیی ل سەر تابلوێن ئاخێ ل باشووری عیراقێ (وەلاتێ سۆمەر) ل دەردۆرێن ٣٠٠٠ پ.ز هاتینە دیتن، لێ نەهاتینە بکارئینان بۆ توومارکرنا رویدانێن مێژوویی، دەسپێکا بکارئینانا نڤیسینێ بۆ توومارکرنا رویدانێن مێژووی ل دەردۆرێن ٢٨٥٠- ٢٨٠٠ پ.ز دەست پێدکەت.

مێژوونڤیسان تا نهو رەگەزێ مللەتێ سۆمەریان دیارنەکرینە، لێ بۆچوونەك هەیە دبێژیت کو ئەو دبنەرەتدا خەلکێ چیایێن کوردستانێ نە[١٦] ، پشتی بوورینا هزارەها سالان و فێربوونا وان بۆ چاندنێ و ئاڤاکرنا گوندان پێنگاڤ پێنگاڤ بەرەڤ باشوور چووینە، پاشی وان ئاڤدێری ب رێکا کۆلینا جۆکا زانی[١٧]، ئەڤە ژی هۆکارەك بوو کو پتر بەرەڤ باشووری ڤە بچن و ل باشووری عیراقێ نیشتەجێبوون و شارستانیەت بەرەڤ پێش بر، مینا ئاڤاکرنا باژێرا و پەرستگەها و زانینا نڤیسینێ و دانانا یاسایان[١٨]. شوینوار وێ چەندێ خویا دکەن کو ل دەسپێکا چەرخێ بنەمالێن سۆمەری ژیان ل کوردستانێ دگەل پارێزگەها دهۆکێ و دەردۆرێن وێ ژی یا بەردەوام بوو.

دناڤبەرا سالێن (٢٠١٠-٢٠١٣ز) رێڤەبەریا شوینوارێن دهۆکێ کارێ خۆ یێ ئارکولوژی ل دەڤەرا سێمێلێ ل بنکەهێن کەمونە و دێرکێ ئەنجامدان و گلینە (فخار) هاتە دیتن کو مێژوویا وی بۆ چەرخێ بنەمالێن سۆمەری (٢٩٠٠- ٢٥٠٠پ.ز) دزڤریت، دیسان ئامانێن خوارنێ و پەیکەرێن مرۆڤان ل هەمان بنکەهـ هاتینە دیتن.

ل سێمێلێ بەرەکێ نەخشاندی ب نڤیسینا مزماریا جەڤەنگی (الكتابة الرمزية) هاتبوو دیتن، بۆچوون بۆ هندێ دچن کو ناڤێ میرێ دەڤەرێ ل سەر هاتبیتە نەخشاندن، لێ ڤێ چەندێ پتر ڤەکۆلینێن زانستی پێ دڤن. یا گرنگ ئەوە مێژوویا ڤێ نڤیسینێ دزڤریتەڤە بۆ چەرخێ بنەمالێن سۆمەری و دیار دکەت کو دەڤەرا دهۆکێ تایبەتمەندیا خۆ هەبوویە و سیستەمەکێ برێڤەبرنێ بخۆڤەگرتبوو.

سۆمەریان ناڤێ وەلاتێ سوبارتو(Subartu) ل دویڤ ئیدیومێ سۆمەری بۆ هەرێما کوردستانێ و پارێزگەها دهۆکێ بکارئینایە و پشکەك بوو ژ ڤێ هەرێمێ. تێکستێن بزماری دیاردکەن کو وەلاتێ سوبارتو تووشی هێرشێن سۆمەریان بوویە، میرێ باژێرێ لەگش (باشووری عیراقێ) یێ سۆمەری (ئەیا ناتوم) د نڤیسینێن خۆدا ل دەردۆرێن سالا ٢٥٠٠ پ. ز دیار دکەت کو وی دەڤەرا سوباریا ئێخستیە ژێر دەستەلاتداریا خۆ[١٩].

### ب- چەرخێ ئەکەدی (٢٣٧١-٢٢٣٠پ.ز):

دەستەلاتداریا دەولەتا ئەکەدی گەهشتە دەڤەرێن پارێزگەها دهۆکێ، ژبەر گرنگیا جوگرافییا دەڤەرێ ژبو کونترولکرنا رێکێن بازرگانی دناڤبەرا دەولەتا ئەکەدی و ئاسیا بچویك (ترکیا نهو) ژلایەکی و سوریا ژ لایێ دی.

داستانا شاهێ شەرڤان (ملحمة ملك الحرب) ئاماژێ ددەتە هندەك بازرگانان ل ئاسیا بچویك ئەوێن هەوارا خۆ گەهاندینە شاهێ ئەکەدی سەرجون (شروم ئوکن)(٢٣٧١- ٢٣١٦پ.ز)، چونکی ئەو تووشی دەستدرێژیا میرێ دەڤەرێ ببوون، لەورا ل دویڤ ناڤەرۆکا وێ داستانێ شاهێ ئەکەدی بەتەلیونەکا لەشکەری شاندە دەڤەرێ ژبو هاریکاریا وان[٢٠]، ژێدەر ئاماژێ ددەنە هێرشێن سەرجونێ ئەکەدی بۆ سەر دەڤەرا وەلاتێ سوبارتو (کوردستانێ)[٢١].

دەمێ ل سالا ١٩٧٥ ێ جادا دناڤبەرا سێمێلێ و زاخو ل گوندێ باستکێ بەرفرەهـ دکرن، پەیکەرێ شاهێ ئەکەدی نەرام سین (٢٢٩١- ٢٢٥٥پ.ز) هاتە دیتن[٢٢]. دیتنا ڤی پەیکەری گرنگیا دەڤەرا دهۆکێ بۆ دەولەتا ئەکەدی دیار دکەت، چونکی شاهێ ئەکەدی کۆچکەك و سەنگەرەك ل گرێ بەراك (تل براك) ل سەر رووبارێ خابویری ل رۆژئاڤایێ کوردستانێ ئاڤاکربوو. ئەڤ کۆچکە بنکەهەك بوو

ژبو رێکخستنا بازرگانیێ و ستاندنا گومرکێ[23]، بێگومان پەیوەندیێن بازرگانی دناڤبەرا دەڤەرا دهۆکێ و بنگەهێن بازرگانی یێن ئەکەدی ل ترکیا و سوریا هەبوون، ژبلی پەیوەندیێن راستەوخوو یێن بازرگانی دگەل دەولەتا ئەکەدی ل ناڤەندا عیراقێ.

دەستەلاتداریا ئەکەدی ل دەڤەرێن پارێزگەها دهۆکێ پتر لایەنێ ئابووری بخۆڤە دگرت و گەلەك ڤەنەکێشا، چونکی مللەتێ گۆتی ل باشوورێ کوردستانێ هێرش کرە سەر دەولەتا ئەکەدی و ئەو دەولەت ژناڤبر و دەستەلاتداریا ناوەند و باشوورێ عیراقێ پتر ژ سەد سالان (٢٢٣٠- ٢١٢٠پ.ز) کەفتە ژێر کۆنترۆلا گۆتیان[24].

دەستەلاتداریا بنەمالا ئوراسیێ (٢١١٣-٢٠٠٦پ.ز) ل وەلاتێ سوبارتو و پارێزگەها دهۆکێ یا لاواز بوو، هەر چەندە شاهێ وێ بنەمالێ شولگی (٢٠٩٥-٢٠٤٨پ.ز) بزاڤکرن وەلاتێ سوبارتو بێخیتە ژێر رکێفا (نفوذ) خۆ و نوینەرێن خۆ رەوانەی دەڤەرێ کرن، نوینەرێ شاهێ ئور داخواز ژ خەلکێ کوردستانێ کر خۆ مل کەچ بکەن و باجێ بدەنە شاهێ سۆمەری، لێ مەرەما وان ب جهـ نەهات. د نامێن نوینەرێ شاهی ئەوێن بۆ شولگی هنارتین دیاردبیت کو میرێن وەلاتێ سوبارتو پویتە ب نوینەرێن شاهێ سۆمەری نەکریە، سەرەرای هندێ وان میرێن سۆمەری ل دەڤەرێ دەرئێخستبوون. دیسان ئەڤ نامە دیار دکەن کو میرێن وەلاتێ سوبارتو خودان شارستانیەتبوون و وان شاهێ خۆ هەبوو، کۆچك هەبوون و شاهێ وان خودان هێزەکا بەرچاڤ بوو[25].

## ج- پارێزگەها دهۆکێ ل هزارا دووێ پ.ز:

ل داویا هزارا ٣ پ.ز مللەتێ هوری (خوری) ل کوردستانێ و رۆژهەلاتا ناڤین بەربەلاڤبوو و دگەل گێرانا رۆلەکێ ئابووریێ ب هێزدا بنگەهێن شارستانیەتی دامەزراندن، دەڤەرا دهۆکێ کەفتە ژێر دەستەلاتداریا هوریا دگەل دەڤەرا نەینەوا و کەرکۆکێ (ئەرابخا) و رۆژئاڤایا کوردستانێ[26]. ژبەر رۆلێ گرنگێ هوریان ناڤێ وان دو جاران د تەوراتێ دا هاتی یە[27]. خوریا مفا ژ نەمانا دەولەتا ئەکەدی ل سەر دەستێ گۆتیان وەرگرت، چونکی ئەو شیان دەولەتەکا بەرفرەهـ ل رۆژئاڤایێ کوردستانێ دابمەزرینن، دەستەلاتداریا وێ ژ سنوورێ نهایێ پارێزگەها دهۆکێ دەربازکر و گەهشتە چیایێ زاگروس. شاهێ هوری ئەتل شین نڤیسینەك ل پاش خۆ هێلایە تێدا هاتییە:

(ئەتل شین شاهێ باژێرێ ئەرگیش (دکەڤیتە سەر رووبارێ خابویری ل رۆژئاڤایێ کوردستانێ - سوریا) و باژێرێ نوار (دکەڤیتە ناڤبەرا زێ بچویك و رووبارێ سیروان)[28]. دیسان شاهـ تیش ئەتل نڤیسینەکا بزماری ب زمانێ هوری ل دویڤ خۆ هێلایە ئاماژە ددەتە ئاڤاکرنا پەرستگەهێ[29]).

هوریان گەلەك میرگەهـ ل کوردستانێ دناڤبەرا رووبارێ فورات و بەرەڤ رۆژهەلاتی کوردستانێ کو زۆربەی کوردستانێ بخۆڤە دگریت دامەزراندن، د هەمان دەم دا دەستەلاتێ ئابووری یێ میرگەهێن هوری بەرەڤ رۆژئاڤایێ چوو تا کەنارێن دەریا ناڤەراست[30].

پەیکەرێن شکەفتا گوندکی (رۆژئاڤایی ئاکرێ ب ٢٠ کم) پێکدهێن ژ سێ کەڤالان، کەڤالێ ئێکێ وێنەیێ نێچیرڤانەکی یە، تیرەك یا بەردایە پەز کیڤیەکی و تیرێ ئارمانجا خۆ یا هنگافتی. یێ دووێ مێڤانداری یە و چەند مرۆڤەك تێدا پشکدارن. یێ سیێ کەڤالەکێ ئایینی یە[31]. مێژوویا ڤی پەیکەری ڤەدگەرێتەڤە بۆ دەسپێکا هزارا دووێ پ.ز. چەرخێ پێشڤەچوونا چاندنێ و ب خودانکرنا پەزی یە ل کوردستانێ. بۆچوون بۆ هندێ دچن کو ئەو یێن ل سەر دەستێن هوریا ل سەر رەخێن شکەفتێ هاتینە کۆلین و نەخشاندن[33].

ل دەسپێکا هزارا ٢ پ. ز شەپۆلێن مللەتێن هندو ئەورویی هاتنە دەڤەرا رۆژهەلاتا ناڤین و کوردستانێ و تێکهەلبوون دگەل خەلکێ دەڤەرێ. هندو ئەورویییان هێزەکا نوی دانە خەلکێ دەڤەرێ و ب هەڤکاریا هوریان دەولەتا میتانییان دامەزراندن .

دەولەتا میتانی (١٥٠٠- ١٢٧٠) کەڤنترین دەولەتە ل کوردستانێ هاتییە دامەزراندن، دەستەلاتداریا وێ کوردستانێ و دەوروبەرێن وێ بخۆڤە گرتیە. دەڤەرا

دهۆكێ كەفتە ژێر دەستەلاتا دەولەتا میتانی، شەپۆلەكا ئاموریا (كۆچەرێن رۆژئاڤا كو ژ نیمچە دۆرگەها عەرەبی هاتبوون) هاتبوونە دەڤەرا شرگات (باژێرێ شرگات ل باشوورێ نەینەوا ب ۱۳۰كم) و ل وێ دەڤەرێ نیشتەجێبوون و دەستەلاتێ وان بەرفرەهبوو و گەهشتە نەینەوا، ئەڤ شەپۆلە دمێژوویێ دا ب ناڤێ ئاشووریان دهێتە نیاسین.

هەر چەندە مە چ بەلگە نینن كو دەستەلاتداریا ئاشووریا ل چەرخێ ئاشووریێ كەڤن (۲۰۰۰-۱۵۰۰پ.ز) گەهشتبیتە پارێزگەها دهۆكێ، لێ پەیوەندیێن ئابووری و نەخاسمە یێن بازرگانی دناڤبەرا دەڤەرێ و ئاشووریان دا هەبوون، ئاشووریان پشتی (۱۹۰۰پ.ز) پەیوەندیێن بازرگانی دگەل ئاسیا بچویك هەبوون.

گەلەك سەنتەرێن بازرگانیێن ئاشووری ل دەڤەرا كەبەدوكیا (باكوورێ باژێرێ قەیسەریێ) هاتنە دامەزراندن، ب هزاران تەختێن ئاخێ یێن بچویك ل دەڤەرێ هاتینە دیتن كو ناڤەرۆكا پتریا وان ل سەر پەیوەندیێن بازرگانیێن دناڤبەرا ئاشووریان و خەلكێ ئاسیا بچویك. دیارە دەڤەرا دهۆكێ ژی رۆلێ خۆ یێ ئابووری دەربارەی پەیوەندیێن بازرگانی دناڤبەرا ئاشووریا و دەڤەرا كەبەدوكیا دیتییە، نەخاسمە دەربارەی هاتن و چوونا كاروانێن بازرگانی و رێكخستنا گومركێ.

دەولەتا میتانی ل سەدساليیا ۱۵ پ.ز زۆربەی دەڤەرێن سوریا كۆنترۆلكرن، پاش دەستێ خۆ بۆ پتر ژ سەد سالان دانا سەر وەلاتێ ئاشووریان، دەولەتا میتانی دهاتە هەژمارتن هەڤهێزا ئیمپەراتوریەتا مسری، ڤێ دەولەتێ رۆلەكێ سەرەكی ژبۆ پەیدابوون و پێشڤەبرنا پەیوەندیێن نیڤ دەولەتی ل رۆژهەلاتا ناڤین ل سەدساليیا پازدێ و چاردێ پ.ز دا هەبوو، ئەو نامێن ل پایتەختێ فیرعەونێ مسرێ ئەخناتون (۱۳٦۷-۱۳۵۰پ.ز) شارێ عەمارنە هاتینە دیتن ڤێ چەندێ خویا دكەن، هەژی گۆتنێ یە ئەڤ نامە ب نڤیسینا بزماری و ب زمانێ ئەكەدی هاتبوونە نڤیسین[۳۵].

دەولەتا میتانی ژبەر ناكوكیێن ناڤخوویی ژ ئالیەكیڤە و ب هێزكەفتنا ئاشووریان و دەولەتا هیتی (حثی) ل ئاسیا بچویك ژ ئالیێ دی ڤە ل سەدساليیا چاردێ پ.ز لاوازبوو، شاهێ ئاشووری ئاشورئوبالتا (۱۳٦۵- ۱۳۳۰پ.ز) شیا خۆ ژ كونترۆلكرنا میتانیان رزگار بكەت. دەڤەرا دهۆكێ ل سەر دەستێ ئەددنەراری (۱۳۲۹-۱۳۲۰پ.ز) كەفتە ژێر كونترۆلا ئاشووریان، هەر وەكی دنڤیسینێن وی دا هاتی وی هێرش كرنە سەر خەلكێ كوردستانێ ژ كاشیا و لولویا و گوتیا و سوباریا، وی ناڤێ هندەك دەڤەرا تووماركرینە كو ل نێزیكی دەوروبەرێن دهۆكێ نە، ئەو دبێژیت وی دەستێ خۆ دانایە سەر ئاماساكی ( Amasaki) كو گەلەك نێزیكی ناڤێ ماسیكێ یە (كو نهو تاخەكێ دهۆكێ یە) و شادوهی ( Shaduhi) كو گەلەك نێزیكە ل پەیڤا شندوخا[۳٦]. شیلمە نەسری (۱۲۷٤-۱۲٤۵ پ.ز) ل دەڤەرا دهۆكێ دەربازبوو و هێرش برنە سەر دەڤەرا دەریا وانێ - وەلاتێ ئورارتو[۳۷]، ئەڤ چەندە دیار دكەت كو دەستەلاتێ میتانی ل دەڤەرێ نەمابوو.

ل دەسپێكا دەستەلاتداریا توكلتی نەنورتا (۱۲٤٤-۱۲۰۸پ.ز) پەیوەندیێن بازرگانی دناڤبەرا دەولەتا ئاشووری و دەڤەرێن باكوورێ كوردستانێ هەبوون، كەل و پەلێن بازرگانی د هەرێما دهۆكێ را دەربازدبوون، چونكی شاهێ ئاشووری دەستێ خۆ هەر ژ زێیێ بچویك تا رووبارێ فورات دانابوو سەر كوردستانێ[۳۸].

پشتی كوشتنا توكلتی نەنورتا I دەولەتا ئاشووری لاواز بوو، ئەو شاهێن پشتی وی دەستەلاتداری گرتییە دەست فەرمانرەوایا وان نەگەهشتییە پارێزگەها دهۆكێ، لێ گەلەك نەكێشا شاهێ خودان شیان تجلاتپلیزەر (۱۱۱۵-۱۰۷۷پ.ز) تانجێ دەولەتا ئاشووری وەرگرت، شاهێ نوی هێرش ئینانە سەر چیایێن بادینان و دەڤەر كونترۆلكر، پاشی دەربازی باكوورێ كوردستانێ بوو تا گەهشتییە باژێرێ مەلاتیێ، ئەڤ كارێن لەشكەری دنڤیسینەكا شاهێ ئاشووری دا ل دەڤەرا دەریا وانێ دا هاتینە[۳۹].

دیسان تجلاتبلیزەری دەستێ خۆ دانابوو سەر

دەڤەرا قەزا شێخان و گەهشتبوو گەلیێ باڤیان ل باکوورێ گوندێ خەنس ل نێزیکی گوندێ خەنس، ڤی شاهی نڤیسینەکا بزماری ل سەر بەرەکی توومارکریە، تێدا ئاماژە دایە سەرکەفتنێن خۆ. ناڤێ خەنس (Hunusa) و بیسری (Bisri) (گوندێ بێسرێ) و ناڤێ میری (مزویری) دناڤ ڤێ نڤیسینێ دا هاتیە، شاهێ ئاشووری دڤێ نڤیسنێ دا گۆتیە کو ئەو دەڤەرێن وی هێرش برینە سەر باژێرێن (گوندێن) میتانیبوون[٤٠].

تێکستێ شاهێ ئاشووری دیار دکەت کو دچەرخێن کەڤندا خەلکێ کوردستانێ ل دەڤەرا خۆ د نیشتەجێ بوون و خودان شارستانیەت بوون، ناڤێ گوند و هۆزێن کوردی ل داویا هزارا دووێ پ.ز دناڤ تکستێن بزماری دا هاتینە. ئارمانجا هێرشێن شاهێ ئاشووری بۆ سەر ئاخا کوردستانێ د ئابووری بوون، مینا ئەو دنڤیسینێن خۆدا ئەشکەرا دکەت کو وی دەڤەر تالانکریە و پەز و دەوارێن خەلکی برینە وەلاتێ ئاشووریان، دیسان ئاماژێ ددەتە وێ چەندێ کو وی خەلکێ کوردستانێ راگوهاستینە (ترحیل) هندەك دەڤەرێن دی[٤١].

نڤیسینێن ئاشوور بیل کالە (١٠٧٤- ١٠٥٧پ.ز) ئاماژە دایە هێرشێن شاهێ ئاشووری بۆ سەر دەڤەرا دهۆکێ و باکوورێ کوردستانێ[٤٢] ل داویا هزارا دووێ پ.ز. دەولەتا ئاشووری تووشی هێرشێن هۆزێن ئارامی بوو[٤٣]، لەورا پێگەهێ ئاشووریان ل دەڤەرێ لاواز بوو و دەستەلاتا وان ل کوردستانێ و پارێزگەها دهۆکێ کزبوو.

## د- پارێزگەها دهۆکێ ل هزارا ئێکێ پ.ز:

### ١- سەردەمێ ئیمپراتوریا ئاشووری (٩١١-٦١٢پ.ز):

ئەڤ سەردەمە سەردەمێ هێزا دەولەتا ئاشووری بوو، چونکی دەستەلاتا وان بەرفرەهبوو، پشکا پتر ژ رۆژهەلاتا ناڤین بخۆڤە دگرت تا گەهشتیە مسرێ[٤٤]. بێ گومان کوردستان و پارێزگەها دهۆکێ کەفتە ژێر کونترۆلا ڤێ دەولەتێ و دەستەلاتا وان ل دەڤەرێن پارێزگەها دهۆکێ یا راستەوخۆ بوو.

دەولەتا ئاشووری گرنگی ددا کوردستانێ ژبەر ڤان ئەگەران:

أ- کوردستان ژێدەرێ کەرەستەیێ ئاڤەدانکرنێ بوو، ژ دار و بەر و کانزا و ئاڤێ.

ب- ژبەر جهێ وێ یێ گرنگ کو دکەفتە سەر رێبێن بازرگانی یێن دەولەتا ئاشووری.

ج- ژێدەرێ مرۆڤان بوو، ژ کویلە (بەندە-عەبد) و مرۆڤێن شەهرەزا ژبۆ ئاڤاکرنا سەنگەر و شویرهە و باژێر و کۆچکا، دگەل بەستنا سکرا و چێکرنا پرا و نەخشاندنا پەیکەران ل سەر بەرا[٤٥].

د- ژبۆ بەرسینگگرتنا دەولەتا ئورارتو ئەوا کو بوویە مەترسێ ل سەر بەرژەوەندیێن دەولەتا ئاشووری و رێکێن وێ یێن بازرگانی[٤٦].

دەولەتا ئاشووری ل سەدسالیا ٩ پ.ز ل نێزیکی باژێرێ دهۆکێ بنگەهەکێ لەشکەری ب ناڤێ مالیاتی[٤٧] (گرێ مالتایێ) دامەزراند.

دەڤەرا دهۆکێ ببوو بنگەهـ ژبۆ ئەنجامدانا هێرشێن ئاشووریان ژبۆ سەر باکوورێ کوردستانێ یێ نها ل سەر دەمێ ئەدد نەراری ٢ (٩١١- ٨٩١ پ.ز) ڤان هێرشان دەستپێکر و دبەردەوام بوون ل سەر دەمێ توکلتی نەنورتا ٢ (٨٩٠-٨٨٤ پ.ز) و ئاشوور ناصر بال ٢ (٨٨٣- ٨٥٩ پ.ز)[٤٨].

ل سەر دەمێ شیلمە نەسەرێ ٣(٨٥٨-٨٢٤ پ.ز) هێرشا ئاشووری سالا ٨٣١ پ.ز بۆ سەر ئورارتو ب سەرکردایەتیا دەیان ئاشووری دەستپێکر. ئەڤ هێرشە دناڤ گەلیێن چیایێن دهۆکێ را دەربازبوو، پشتی هینگێ شاهێ ئاشووری بخۆ ژی چەند هێرش برنە سەر دەڤەرا دەریا وانێ (ئورارتو)[٤٩].

پشتی شاهێ ئاشووری شەمش ئەدد ٥ (٨٢٣-٨١١پ.ز) دەستێ خۆ دانایە سەر دەڤەرێن دهۆکێ و هێرش برینە سەر دەڤەرێن باکوورێ کوردستانێ و گەهشتە دەڤەرێن دەریا وانێ و شەمدینان (نەهری)[٥٠].

دەولەتا ئاشووری تووشی شەرێ ناڤخۆیی بوو، لەوما د سەردەمەکی دا د قۆناغەکا لاوازیێ را دەرباز بوویە هەر ل دەسپێکا دەستەلاتداریا شەمش ئەدد

٥. لێ ئەڤ لاوازی یە پتر پشتی مرنا وی شاهی ل سالا ٨١١ پ.ز هەتا هاتنا تجلا تپلیزەرێ ٣ (٧٤٤-٧٢٧پ.ز) بۆ سەر تەختی یا دیاربوو[٥١].

بێ گومان ڤێ بێ هێزیێ دەرفەت بۆ مللەتێن بن دەست روخساند کو سەربەخوویا خۆ رابگەهینن و خۆ ژ دەستەلاتداریا ئاشووریا رزگار بکەن، نەخاسمە مللەتێ کوردستانێ.

شاهێ ئاشووری تجلا تپلیزەرێ ٣ جارەکا دی شیا ئیمپەراتوریەتا ئاشووری نویژەن بکەتەڤە، وی لەشکەرەکێ رێکخستی دامەزراند، پشتی هینگێ دەست ب هێرشا بۆ سەر دەڤەرا دهۆکێ کر، ئەو دگەلیێ دهۆکێ را ب مەرەما هێرشێ بۆ سەر دەولەتا ئورارتو دەرباز بوو. ڤی شاهی وێنەیەکێ خۆ ل سەر بەرەکی ل دەرگەلا شێخ ئەحمەد ل ملا مێرگێ نەخشاندی یە و نڤیسینەکا بزماری ب زمانێ ئەکەدی و زاراڤێ ئاشووری دگەل وێنەیێ شاهی ل سەر بەری هاتییەکۆلان، ئەڤ نڤیسینە پێکدهێت ژ (٥٤) رێزێن رێك و پێك. د ڤێ نڤیسینێ دا هاتییە کو شاهێ ئاشووری سەرکەفتن ل سەر خەلکێ دەڤەرێ ب دەستڤە ئینایە و ئەو ب ناڤێ ئولوبیان ( Ullubaeans) داینە نیاسین[٥٢].

نڤیسینەکا دی یا تجلا تپلیزەرێ ٣ یا ل باژێرێ نمرود (باشوورێ رۆژهەلاتێ نەینەوا) هاتییە دیتن، تێدا هاتییە کو وی ل سەر دەمێ شاهێ وان سەردور ٢ (٧٥٣- ٧٣٥پ.ز) هێرش برینە سەر دەولەتا ئورارتو. د هەمان تێکست دا هاتییە کو وی باژێرەك ب ناڤێ ئاشوور ئیکیشا Assur- Ikisha)) ل دەڤەرا ئولوبا (دهۆك) ئاڤاکریە[٥٣].

دیارە دەڤەرا دهۆکێ ل سەردەمێ ڤی شاهێ ئاشووری گرنگیا خۆ ژ لایێ لەشکەری و ئابووری ڤە هەبوویە، لەورا هێرش ئینانە سەر دەڤەرێ و کونترۆل کریە و بنکەهێن سەربازی تێدا دامەزراندینە.

دەولەتا ئورارتی ل سەر دەمێ شاهێ وان روسا (٧٣٣-٧١٤پ.ز) ب هێز کەفت، وی پەیمان دگەل میرێن دەڤەرێ بەستن، نەخاسمە میرێن رۆژئاڤایێ رووبارێ فورات. هێزا ئورارتو ببوو مەترسییەکا بەرچاڤ ل سەر دەولەتا ئاشووری و رێکێن وان یێن بازرگانی[٥٤].

ژبۆ کۆمکرنا پێزانینان ل سەر بزاڤێن شاهێ ئورارتو روسا و پەیمانێن وی دگەل میرێن دەڤەرێ، شاهێ ئاشووری سەرجون (٧٢١-٧٠٥ پ.ز) کورێ خۆ شاهێ پاشەرۆژێ سەنحاریب هنارتە دەڤەرێن نها یێن باکوورێ پارێزگەها دهۆکێ (دەڤەرا زاخۆ) و ب کارێ هەوالگیریێ رابوو، ب رێکا بەلاڤکرنا مرۆڤێن خۆ ل دەڤەرێ. وان مرۆڤان راپۆرت کۆم دکرن و دکرنە نامە و بۆ بابێ خۆ رەوانەی نەینەوا دکرن[٥٥].

پشتی کۆمکرنا پێزانینان شاهێ ئاشووری هێرشا ژمارە (٨) ل سالا (٧١٤ پ.ز) بۆ سەر دەولەتا ئورارتو دەستپێکر و لەشکەرێ ئاشووری گەهشتە پایتەختێ ئورارتو شارێ تورشبا[٥٦].

شاهێ ئاشووری سەنحاریب (٧٠٤-٦٨١ پ.ز) زۆر گرنگی ددا باشوورێ کوردستانێ یێ نها ب گشتی و دەڤەرێن پارێزگەها دهۆکێ ب تایبەتی. وی شاهی چەند پرۆژێن ئاڤدێریێ ژ بۆ ڤەگوهاستنا ئاڤا کانی و رووباران بۆ باژێرێ نەینەوا چێکرن.

ئێك ژ وان پرۆژان بەستنا سکرەکی بوو ل سەر رووبارێ گوملی ل گەلیێ باڤیان نێزیکی گوندێ خەنس.

سەنحاریبی پەیکەرێ خۆ دگەل خوداوەندێن ئاشووری (ئاشوور- ئەنلیل) ل سەر بەرێن کەڤرێن وی گەلی نەخشاندن دگەل پەیکەرێن گایێن بالدار[٥٧].

شاهێ ئاشووری ب درێژاهیا (٨٠کم) جوکەك ژ سکرێ باڤیان تا سەر رووبارێ خەوسەری کۆلی بۆ دەربازکرنا ئاڤێ ژ گەلیێ جەروانە شاهی پرەك ژ بەرا ل سەر کویراتیا وی گەلی کو دبێژنێ پرا جەروانە دروستکر، ئەو ئارکولوژیێن کار ل سەر پاشمایێن ڤێ پرێ کرین دیار دکەن کو درێژاهیا پرێ (٢٨٠م) بوون و بلندیا وێ (٩م). دیسان دیار دکەن کو بۆ ئاڤاکرنا ڤێ پرێ مەلیون بەرێن دیواران بکارئینابوون، ئەندازیارێن ئاڤاکرنێ (١٤) جە ژبۆ چوونا ئاڤێ ل بنێ پرێ هێلابوون[٥٨].

سەنحاریبی تێکستەکێ بزماری ل سەر بەرێن ڤێ پرێ نڤیسیبوو دبێژیت:

(.. ل جهەکێ دویر ژ رووبارێ (خازری) من ئەڤ جۆکە کۆلا بەرەڤ دەشتا نەینەوا. ل سەر گەلیەکێ تەنك و کویر من پرەك ئاڤاکر ژ بەرێن سپی دا ئاڤ ل سەر دەرباز ببیت)[٥٩].

سەنحاریبی گەلەك پەیکەرێن دی ل سەر کەڤرێن شکەفتا هەلامەتا (باشوورێ رۆژئاڤایێ باژێرێ دهۆکێ) نەخشاندینە. ئەڤ پەیکەرە پێکدهێن ژ چوار (نەخشەبەرێن) کەڤالێن ئاینی و هەر چوار وەکی ئێکن. هەر نەخشەبەرەك کەڤالەك پێکدهێت ژ:

شاهـ سەنحاریب، خوداوەند، ئاشوور، ننلیل، سین، نابو، شەمش، ئەدد، عشتار، شاهێ پاشەرۆژێ (ولي العهد).

دڤان کەڤالاندا خوداوەند یێن دراوەستیاینە ل سەر پشتا گیانەوەرێن ئەفسانەیی و هەر خوداوەندەکی هێمایێ وی یێ ئەبشکەرایە[٦٠].

کەڤالێن شکەفتا هەلامەتا راوەستانا شاهی هەمبەر خوداوەندا دیاردکەن، وە دیارە سوپاسیا وان دکەت، ژبەر پشتەڤانیا وان بۆ وی دژی دوژمنێن ئاشووریا لەورا وی سەرکەفتن ب دەستڤە ئینایە.

هەر چەند نڤیسین ل سەر پەیکەرێن شکەفتا هەلامەتا نینە، لێ ئەو پەیکەر دگەل پەیکەرێن گەلیێ باڤیان مینا هەڤن. ب ڤی رەنگی خویا دبیت کو شاهێ ئاشووری د خواست سکرەکی ل سەر رووبارێ دهۆکێ ئاڤابکەت دا ئاڤێ ڤەگوهێزیتە دەڤەرێن دەشت، لێ وەسان دیارە شاهێ ئاشووری بەری ڤی پرۆژەی دروست بکەت هاتیبەکوشتن[٦١].

شاهـ سەنحاریبی پەیکەرێ خۆ بۆ هەمان مەبەست ل گەلیێ بەنداوا (رۆژهەلاتا ئەلقوش) نەخشاندیە[٦٢].

هەژی گۆتنێ یە شاهێ ئاشووری سەنحاریب پرۆژەکێ ئاڤێ ل نهالا بەستۆرە چێکریە و ئاڤ کۆمکر ب رێکا کۆلینا کاریزا ب مەرەما کۆمکرنا ئاڤێ، پاشی جۆکەك ب درێژاهیا (٢٠کم) کۆلی و ئاڤ بۆ باژێرێ هەولێرێ دابینکر[٦٣].

ل سەر دەمێ شاهێن ئاشووری ئەسەرحەدون

**شوینوارێن خنس**



ژێدەر: رێڤەبەریا شوینوارێن پارێزگەها دهۆکێ

(٦٨٠-٦٦٩ پ.ز) و ئاشوور بانیبال (٦٦٨-٦٢٦پ.ز) تێكستێن ئاشووری یێن شاهانە ئاماژە نەداینە هێرشێن وان بۆ سەر دەڤەرا دهۆكێ. ل وی سەردەمی هۆزێن ئەسكیش[٦٤] بەرەڤ دەڤەرێ هاتن و بوونە فاكتەرەك بۆ لاوازكرنا دەولەتا ئاشووری.

### ٢- سەردەمێ ئیمپراتوریەتا میدی (٧٠٠- ٥٥٠ پ.ز):

ئەڤ دەولەتە ل سالا (٧٠٠پ.ز) ل سەر دەستێ دیوسیس- دیاكو (٧٠٠- ٦٧٣پ. ز) هاتییە دامەزراندن و باژێرێ ئەكبەتان (هەمەدان) پایتەختێ ڤێ دەولەتێ بوو[٦٥].

دەولەتا میدی گەلەك دەڤەرێن كوردستانێ بخۆڤە دگرتن، ل سەردەمێ شاهێ میدی فراوەرتیس (خاشاسریتا) (٦٧٣-٦٣٣پ.ز)، ئەڤ دەولەتە بەرفرەه بوو و بۆ ئیمپراتوریەت ل سەر دەستێ كەی خسار (كەی خسرو ٦٣٣- ٥٨٤ پ.ز). دەولەتا ئاشووری ژی پشتی كوشتنا شاهـ سەنحاریب سالا (٦٨١پ.ز) بەرەڤ بێ هێزیێ چوو چونكی تووشی شەرێن ناڤخۆیی بوو، نەخاسمە دگەل بابلیان. هۆزێن ئەسكیش دەستێ خۆ دانانە سەر رێكێن بازرگانیێ ل باكوور و رۆژهەلات و گڤاشتن ئێخستنە سەر دەولەتا میدی. شاهـ كەی خسار پێدڤی دەمەكێ درێژ بوو تا بكاریت هۆزێن ئەسكیش ژبۆ دەولەتێ مل كەچ بكەت[٦٦].

لەشكەرێ میدی ل سالا ٦١٤ پ.ز هێرش ئینانە سەر دەولەتا ئاشووری، لەشكەرەكێ وان ل دەڤەرا دهۆكێ بەرەڤ نەینەوا چوو، پشتی دەولەتا میدی دەستێ خۆ دانایە سەر وەلاتێ ئاشوور، باژێرێن ئاشوور و نەمرود كۆنترۆلكرن و ل سالا ٦١٢ پ.ز دەستێ خۆ دانا سەر نەینەوا و رۆلێ سیاسی یێ ئاشووریان ب دووماهی هات و دەولەتا میدی دەستێ خۆ دانانە سەر هەمی كوردستانێ[٦٧].

ژیانا ئابووری ل سەردەمێ میدی د گەشێ دا بوو پشتی شیاین دەستێ خۆ داننە سەر رێكێن بازرگانی و دەڤەرا دهۆكێ هەر گرنگیا خۆ یا بازرگانی پاراست[٦٨].

### ٣- دهۆك ل سەردەمێ دەولەتا هاخەمنش (٥٥٩-٣٣١ پ.ز):

ئیمپراتوریەتا میدی ل سەر دەستێ شاهێ بنەمالا هاخەمنش كورش ٢ (٥٥٩-٥٣٠ پ.ز) ژ ناڤچوو و دەستەلاتداریا وی گەهشتە باشوورێ كوردستانێ و دەڤەرا دهۆكێ بۆ پشكەك ژ ئیمپراتوریەتا فارس ل دەوروبەرێن سالا ٥٤٦ پ.ز. بەرپرسێن دەولەتا هاخەمنش سەرەدەرییەكا باش دگەل مللەتێن بن دەست دكرن، چونكی وان گەلەك مایێ خۆ دناڤ كاروبارێن وان یێن ناڤخۆیی نەدكر و ب تنێ باج ژ خەلكی دستاند. هاخەمنشیا ئیمپراتوریەتەكا بەرفرەهـ دامەزراند، پێكدهات ژ ئیران و عیراق و كوردستان و ئەرمەنستان و ئاسیا بچویك و سوریا و مسرێ[٦٩].

ل سالا (٤٠١ پ.ز) دەهـ هزار یونانی ب سەركردایەتیا زەینەفونی د دەڤەرا دهۆكێ را بوورین دەمێ ژ بابل بەرەڤ یونانێ ڤەگەریاین. زەینەفون دبیرهاتنێن خۆدا دبێژیت: ئەو ل دەڤەرەكا چیایی دەربازبوون و دناڤ مللەتەكی را بوورین دبێژنێ كاردۆخی (كورد). زەینەفون یێ گۆتی: مللەتێ كاردۆخی ل گوندان دژین و كارێ چاندنێ دكر، گەنم و جەرێن مەی دناڤ مالێن واندا هەبوون، دیسان وی ئاماژە دایە مێرخاسیا كاردۆخیا، چونكە هەژمارەكا یونانیان ل سەر دەستێ وان هاتبوونە كوشتن و دبێژیت یونانی پێدڤی حەفت رۆژان بوون تا ل سنوورێ كاردۆخیا دەرباز بووی[٧٠].

بیرئانینێن زەینەفون دیاردكەن كو خەلكێ دەڤەرا دهۆكێ كورد بوون و كۆچەر نەبوون، بەلكی ئاكنجیبوون و هەمبەر هێرشێن گریكیا (یونانیان) بەرگری ژ عەردێ خۆ دكر، بۆچوون بۆ هندێ دچن كو زەینەفون و لەشكەرێ یونانی ل دەڤەرا زاخۆ دەربازبووینە باكوورێ كوردستانێ.

### ٤-دهۆك د چەرخێ هیلنستیدا (Helnistic period) (٣٣١-١٤٧ پ.ز):

هاتنا ئەلكزەندەرێ مەگدونی (الاسكندر المقدونی) ٣٣٦-٣٢٣ پ.ز بۆ رۆژهەلاتی دگەل

سەردەمێ دەستەلاتداریا دەولەتا سلوکی ل دەڤەرێ دبێژنێ چەرخێ هیلنستی، چونکی هەردو شارستانیەتێن گریکی و رۆژهەلاتی تێکهەلبوون.

سالا ٣٣٣ پ.ز هێرشا ئەلکزەندەری بۆ سەر رۆژهەلاتی دەستپێکر، پشتی کونترۆلکرنا ئاسیا بچویك و سوریا و مسرێ بەرەڤ رۆژهەلاتیڤە هات ژبۆ راڤنانا شاهێ فارس دارایێ ٣ (٣٣٦-٣٣١ پ.ز) و لەشکەرێ وی، لەشکەرێ مەگدونی ل رووبارێ دیجلە دەرباز بوو و د باشوورێ دهۆکێ را بووری (دەڤەرا فەیدیێ)، مێژوونڤیسێ ئەلکزەندەری دبێژیت:" ئەلکزەندەر و لەشکەرێ وی ب لەز مینا تیرێ بوورین، چیایێن کوردان ل سەر دەستێ وی یێ چەپێ بوون و رووبارێ دیجلە ل سەر دەستێ وی یێ راستێ بوو"[(٧١)].

## أ- شەرێ گوگا مێلا (شەرێ گوملی)،

هەر بۆچوون بۆ هندێ دچوون کو شەرێ گوگا مێلا دناڤبەرا لەشکەرێ مەگدونی و لەشکەرێ فارسی ل نێزیکی هەولێرێ بوو و هندەك دبێژنێ شەرێ (اربیل)[(٧٢)]، لێ بەلگەیێن مێژوویی ڤێ بۆچوونێ پشتراست ناکەن. ئەریانس (مێژوونڤیسێ ئەلکزەندەری) دبێژیت: " پشتی سەرکەفتنا لەشکەرێ مەگدونی د وی شەری دا، رۆژا پاشتر ئەلکزەندەر گەهشتە هەولێرێ پشتی چوونا نێزیکی (١٠٠کم)[(٧٣)] دویراتیا دناڤبەرا گوندێ کەلەکچی کو دکەڤیتە سەر رووبارێ گوملی بەری رووبار بچیتە سەر رووبارێ خازری. نێزیکی ١٠٠ کم".

هۆسا خویا دبیت کو شەرێ گوگا مێلا یێ ل سەر رووبارێ گوملی ل نێزیکی گوندێ کەلەکچی ل دەڤەرا قەزا شێخان ل پارێزگەها دهۆکێ رویدای و ڤەکۆلینێن نوی ڤێ بۆچوونێ پشتراست دکەن[(٧٤)].

## ب- دەولەتا سەلوکی

**(٣١١- ٦٥پ.ز)،**

ئەلکزەندەر سالا ٣٢٣ پ. ز ل بابل مر، سەرکردێن وی یێن لەشکەری ئیمپراتوریەتا مەگدونی دناڤبەرا خۆدا پارڤەکرن، دەڤەرێن رۆژهەلاتی دگەل سوریا و عیراق بەهرا سەرکردە سەلوکس بوو، ئەوێ دەولەتا سەلوکی ل دەوروبەرێن سالا ٣١١ پ. ز دامەزراندی[(٧٥)].

کوردستان و پارێزگەها دهۆکێ بۆ پشکەك ژ دەولەتا سەلوکی، لێ دەستەلاتداریا وان ل دەڤەرێ یا لاواز بوو و پتر لایێ ئابووری بخۆڤە دگرت، دەولەتا سەلوکی گرنگی ددا رێکێن بازرگانی و پاراستنا وان، بازرگانیا ئارمیشی ل سەردەمێ سەلوکیا دناڤبەرا چینێ و ئەوروپا یا چالاك بوو، هندەك جاران ئەڤ بازرگانی یە دناڤ کوردستانێ را دەرباز دبوو، لەورا دەڤەرێن پارێزگەها دهۆکێ رۆلێ خۆ یێ ئابووری هەبوو[(٧٦)].

## ٥- دەولەتا ئەشکانی – پەرەس (الدولة الفرثيه) (٢٥٠پ.ز-٢٢٦ ز)،

ئەڤ دەولەتە ل هەرێما خوراسانێ - رۆژهەلاتا ئیرانێ هاتە دامەزراندن، پاشی سنوورێن خۆ بەرەڤ رۆژهەلاتی بەرفرەهکرن، ل سالا ٢٤٧ پ.ز پشتی نەمانا دەستەلاتا سەلوکی ل دەڤەرێ هەرێما میدیا (رۆژهەلاتێ کوردستانێ) کونترۆلکر، لێ دەستەلاتا وان درەنگ، ئەو ژی ل سالا ١٤٧ پ.ز گەهشتە دەڤەرا بەهدینان (پارێزگەها دهۆکی) و رووبارێ فورات دبوو سنوور دناڤبەرا دەولەتا ئەشکانی و رۆمانی ل دەمێن ئاسایی دا[(٧٧)].

ل دەستپێکا دەستەلاتداریا ئەشکانی دەڤەرێن پارێزگەها دهۆکێ یا نها ئارامی بخۆڤە دیت، چونکی شاهێن وێ دەولەتێ ئازادییەکا بەرچاڤ بەخشی مللەتێن ژێر دەست. ل سەردەمێ ئەشکانی کوردستان هاتبوو پشککرن بۆ سەر سێ هەرێمان:

**أ- میدیا (ئەتروپاتین).**

**ب- ئەدیابین - حدیاب (دناڤبەرا زێ یێ مەزن و زێ یێ بچویك).**

**ج- کوردوئینی (باکوور و رۆژئاڤایێ کوردستانێ).**

دەڤەرا بادینان یا نها دناڤبەرا هەرێما ئەدیابین و کوردوئینی دا بوو، لێ پتر سەر ب هەرێما کوردوئینی ڤەبوو، دەڤەرا دهۆکێ تووشی هێرشێن رۆمانی دبوو، دگەل بوورینا دەمی کەفتنە ژێر رکێفا (نفوذ) وێ دەولەتێ.

ژبەر پەیدابوونا دەولەتا ئەرمەنی، ئارامی ل دەڤەرێ

تێكچوو، چونكی وێ دەولەتێ هێرش ئینانە سەر هەرێما كوردوئینی، شاهێ ئەرمەنی تیكران (٩٣-٥٤ پ.ز) باژێرێ فارقین كرە پایتەختێ دەولەتا ئەرمەنی و ناڤێ باژێری گوهوری بۆ (تیكرانا كورتا)، دەستەلاتێ تیكرانی گەهشتە دەڤەرا دهۆكێ[٧٨].

دەولەتا رۆمانی شیا دەستێ خۆ دانیتە سەر هەرێما كوردوئینی و ئەرمەن ل سالا ٦٩ پ.ز ژ دەڤەرێ رامالین، دیسان دەولەتا ئەشكانی بزاڤكرن كو هەرێما كوردوئینی ب هاریكاریا ئیمارەتا ئەدیابین كونترۆلبكەت و كێشە ل سەر هەرێمێ ل سەدسالیا ئێك و دووێ زایینی یا بەردەوامبوو[٧٩].

ئیمپراتورێ رۆمانی تراجان (٩٨-١١٧ز) ل سالا ١١٤ ز هێرش ئینا سەر رۆژهەلاتی، و ئەو رێكا ئەلكزەندەر تێرا بۆ ئیرانێ (باشوورێ دهۆكێ) دەربازبووی دا بەرخوو و هێرش برە سەر دەولەتا ئەشكانی، تراجانی ل سالا ١١٥ ز دەستێ خۆ دانا سەر هەرێما كوردوئینی و دەڤەر هاتە وێرانكرن، هەروەسان تراجانی دەستێ خۆ دانا سەر باژێرێ هەولێرێ (پایتەختێ ئیمارەتا ئەدیابین) و بەرەڤ باشوور چوو هەتا دەستێ خۆ دانایە سەر پایتەختێ دەولەتا ئەشكانی، شارێ تەیسەفون (نێزیكی بەغدا)[٨٠].

كێشە و دوبەرەكی دناڤبەرا فارس و رۆمانا ل سەر هەرێما كوردوئینی یا بەردەوامبوو، ئەڤ دو بەرەكی یە بۆ ئەگەرێ تێكدانا بارێ هێمنیێ و كوشتنا خەلكی، نەخاسمە دەمێ هەرێم دبۆ مەیدانا شەری، هەروەسان بارێ ئابووری ژی تێكچوو، هەژاری و نەساخی بەلاڤبوو، تا گەهشتیە برسیبوون و كولیێ، لەوما خەلكێ دەڤەرێ مشەختبوونە وان دەڤەرێن ئارامی تێدا جێگیر.

هندەك شوینوارێن ئەشكانی ل دەڤەرا دهۆكێ یێن ماین، مینا شكەفتا چارستوین كو پەرستگەهەكا زەردەشتی بوو[٨١] ، هەروەسان كەڤالەك یێ ل سەر بەرەكی ل بەر دەرگەهێ مووسل ل باژێرێ ئامێدیێ هاتیە كۆلین.

## ٦-دەولەتا ساسانی (٢٢٦- ٦٣٧ ز):

ئەڤ دەولەتە ل سەر دەستێ ئەردەشیر كورێ بابك (٢٢٦-٢٤١ز) هاتیە دامەزراندن، و ئەردەشیر شیا هەمی دەڤەرێن ل ژێر دەستێ دەولەتا ئەشكانی كونترۆل بكەت و باژێرێ تەیسەفون (المدائن) كرە پایتەخت. ب وی رەنگی ساسانی بوونە میراتگرێن ئەشكانیان[٨٢].

سیاسەتا شاهێن ساسانی یا جودا بوو ژ سیاسەتا شاهێن ئەشكانی، چونكی ساسانییان بزاڤكرن سیاسەتەكا مەلبەندی (مركزي) بەرامبەر هەرێمێن ل ژێر ركێفا وان پەیرەو بكەن و وان هەرێم راستەوخۆ ب رێڤەدبرن. ئەڤ سیاسەتە بۆ ئەگەرێ سەرهلدانا خەلكێ كوردوئینی دژی دەستەلاتداریا ساسانیان، لەورا شاهێن ساسانی خەلكێ وێ هەرێمێ راگواستنە دەڤەرا ئەهواز[٨٣].

سەردەمێن ئاشتیێ و شەری دناڤبەرا ساسانی ورۆمانیاندا هەبوون، پشتی دەولەتا بیزەنتی (٣٢٤-١٤٥٣ز) هاتیە دامەزراندن و باژێرێ بیزەنتە (قەستەنتینیە) بوویە پایتەختێ وێ دەولەتێ شەر دناڤبەرا وان دا نە راوەستیان و دەولەتا بیزەنتی بزاڤ نەكرن پەیوەندیان دگەل دەولەتا ساسانی خۆش بكەن. هەرێما كوردوئینی گەلەك جاران دبوو مەیدانا شەری، وان كاودانان خەلك بێ ئۆمێدكرن و خۆزی رادهێلان كو دەولەتا ساسانی نەمینیت[٨٤].

ل سەردەمێ ساسانیان و ژبەر شەرێن فارس- رۆمانی گرنگیا دەڤەرا دهۆكێ نەما، بازرگانی گەلەك لاواز بوو، چونكی دەڤەر ببوو جهێ كێشە و ململانێ و خەلكێ دەڤەرێ نیگەران ببوو و دڤیان ژ وێ قوناغا نەخۆش دەرباز ببن و كاودان بهێنە گوهورین و ئاشتی و تەناهی جارەكادی بزڤریتە هەرێما كوردوئینی و دەڤەرا دهۆكێ و ئەو چەند ببوونە هیڤی و ئۆمێدا خەلكی. شەرێن فارسی- رۆمانی بوونە ئەگەر بۆ لاواز بوونا هەردو زلهێزان ل رۆژهەلاتا ناڤین، ڤان كاودانان رێ بۆ عەرەبێن موسلمان خۆشكر كو دەستێ خۆ داننە سەر دەڤەرێ، سالا (٦٤٠ز) هێرشێن عەرەبێن موسلمان گەهشتنە سنوورێن پارێزگەها دهۆكێ و چەرخێن ناڤین (العصور الوسطى) ل كوردستانێ دەستپێكرن.

## کورتییەك ل سەر بەلاڤبوونا ئایینێن کەڤن:

### أ- پەیدابوونا بیروباوەرێن ئایینی:

مرۆڤی ل دەستپێکا ژیانا خۆ ل سەر ڤی عەردی بزاڤکرینە مێشکێ خۆ بکاربینت بۆ زانینا نهێنیان ل سەر وان تشتێن کارتێکرن ل سەر ژیانا وی کربیت، مینا خۆراکی و سرۆشتی و سەقای و مرنێ.

ل چەرخێ بەریێ کەڤن مرۆڤی کارێ نێچیرێ دکر و ژیانا وی یا ب وی کاری ڤە گرێدای بوو، ئەڤ کارە بۆ ئەگەر کو مرۆڤ وێنێ گیانەوەران دگەل وێنێ نێچیرڤانەکی کو تیرەکێ بەرددەتە گیانەوەران و ل دلێ وی ددەت (جهێ مرنێ ددەت) دناڤ شکەفتاندا ل سەر بەرا ب نەخشینیت، چونکی مرۆڤی هزر دکر کو ڤی وێنەی کاریگەرییەکا سێربەندی (سحری) ل سەر وان گیانەوەران هەیە، ب ڤی رەنگی بیروباوەرێن ئایینی دچەرخێ بەرێ کەڤندا وێنەیەکێ سحری بخۆڤە گرت[٨٥].

پشتی مرۆڤی زانی گیانەوەران کەهی بکەت و فێری چاندنێ بووی، هزرا وی یا ئایینی پێشڤەچوو و هەبوونا گیانەوەران ببوو تشتەکێ ئاسایی و مرۆڤ بەرەڤ پەرستنا ئەگەرێ زۆربوونێ چوو، چونکی مرۆڤ زۆر بوون و گیانەوەر زۆر بوون، بەرهەمێ دەخل و دانی زۆر بوو. ل چەرخێ بەرێ نوی- چەرخێ چاندنێ ل گەلەك جهێن شوینواری پەیکەرێن خوداوەندا دایك (Mother Goddess) هاتینە دیتن[٨٦] ، کو ژ تەقنێ دهاتنە چێکرن، ئەڤ پەیکەرە جەڤەنگێ زۆربوون و پەیدابوونا مرۆڤان و زۆربوونا بەرهەمێ خوارنێ بوون. بۆ نموونە پەیکەرێ خوداوەندا دایك ئەوێ ژ لایێ رێڤەبەریا شوینوارێن دهۆکێ ڤە ل دەڤەرا سێمێلێ هاتییە دیتن کو مێژوویا وی بۆ دەوروبەرێن ٦٠٠٠ پ.ز ڤەدگەریت و نهو د مۆزەخانا دهۆکێ ڤەیە.

پشتی زۆربوون بوویە تشتەکێ ئاسایی، مرۆڤی پەرستنا هێمایێن سرۆشتی کر، چونکی سرۆشتی کارتێکرن ل سەر بزاڤ و ژیانا مرۆڤی هەبوو، مینا بای و بارانێ و لەهی و ئاسمانی دگەل رۆژێ و هەیڤێ و ستێرا، هەروەسان عەردی و مرۆڤی بۆ هەر ئێك ژ ڤان تشتێن سرۆشتی خوداوەندەك دانا و پەیکەر بۆ چێکرن و پەرستگەهـ بۆ ئاڤاکرن و هەر خوداوەندەکی پەرستگەها خۆ یا تایبەت هەبوو، بۆ نموونە خوداوەندێ ئاسمانی (ئانو)، پەرستگەها وی ل وەرکا بوو و خوداوەندێ هەیڤێ ننار (سین)، پەرستگەها وی ل باژێرێ ئۆر بوو[٨٧] ، پەرستگەها خوداوەندێ بای (ئینلیل) ل باژێرێ کیش بوو. کارتێکرنا سۆمەریا یا سیاسی و شارستانی گەهشتە کوردستانێ و دەڤەرا دهۆکێ و پەرستنا ڤان خوداوەندان ل جەم خەلکێ دەڤەرێ ل هزارا ٣ پ.ز دەستپێکر[٨٨].

پەیکەر و وێنە و هێمایێن ڤان خوداوەندان ل دەڤەرا دهۆکێ ل پەیکەرێن شکەفتا هەلامەتا و شکەفتا چارستین و پەیکەرێ ملا مێرگێ د بەرچاڤن[٨٩].

دەمێ دەولەتێن ب هێز ل دەڤەرێ پەیدابووین، خوداوەندێن نەتەوەیی ژی پەیدابوون مینا مەردۆخ خوداوەندێ بابلیا و خوداوەند ئاشوور خوداوەندێ ئاشووریا[٩٠] و خوداوەند تیشوب خوداوەندێ میتانیا[٩١] و خوداوەند خالدی خوداوەندێ دەولەتا ئورارتو[٩٢]. پەرستنا ڤان خوداوەندان ل دەڤەرێن رۆژهەلاتا ناڤین تا سەدسالیا پێنجێ پ.ز یا بەردەوامبوو دگەل هندەك گوهورینان دا ئەو پەرستن ب گونجیت دگەل کەلچەرێ جودا یێ مللەتێن دەڤەرێ، بۆ نموونە خوداوەندا سۆمەری ئەوا دگۆتنێ ئینانا- خوداوەندا جوانیێ و شەری (ستێرا بەرێ سپێدێ - الزهرە) ل جەم بابلیان د گۆتنێ عشتار و ل جەم خەلکێ کوردستانێ ببوو شاوشکا و ل جەم فارسا ئاناهیتا و ل جەم یونانیان ئەفرودویتس و ل جەم رۆمانا ڤینۆس[٩٣].

پیرێن ئایینی (الکهنە) خزمەتا خوداوەندا دکر و پەیکەرێن وان دناڤ پەرستگەهاندا د پاراستن، دیسان کارێ رێزگرتنێ و پەرستنا خوداوەندا بۆ خەلکی شرۆڤە دکر، دگەل سەرپەرشتکرنا ئەرد و سامانێ پەرستگەها و گەلەك جاران رۆلەکێ سیاسی مل ب ملێ شاهـ و میرا دگێرا[٩٤].

## ب- بەلاڤبوونا ئایینێ جوییان (Juddism):

ئایینێ جوییان ئایینەکێ ئاسمانیێ پیرۆزە، موسا پێغەمبەر (س) بیروباوەرێن جوییان ل بیابانا سینا و فلستینێ دناڤ مللەتێ عبری دا بەلاڤکر، هندەك دبێژنە ئایینێ جوییان ئایینێ موسەوی. موسا پێغەمبەری ل دەستپێکێ بانگەوازا خۆ یا ئایینی ل مسرێ ل سەردەمێ فیرعەون رەمسیسێ (١٢٩٠-١٢٢٤پ.ز) راگەهاند و داخوازا پەرستنا خودایێ مەزن کر، لێ دەستەلاتداریا دەولەتێ ل مسرێ باوەری پێ نەئینا و دژی موسای و پشتەڤانێن وی راوەستیان، ئەڤ هەلویستە بۆ ئەگەرێ مشەختبوونا موسای و باوەرپێکەرێن وی بۆ بیابانا سینا[٩٥]. عەرەب دبێژنە جویا (یهود)، کو ژ پەیڤا (یەهوە) هاتییە، ناڤێ خودایێ مەزن هەر وەکی د پەرتووکا جویا یا پیرۆز تەوراتێ دا هاتی[٩٦].

پەیکەرێ خوداوەندا دایك



ژێدەر: مۆزەخانا دهۆکێ

پێنج پشکێن تەوراتێ (الاسفار الخمسة) یێن بۆ موسای هاتین ئەو ژی ئەڤەنە : (التكوين، الخروج، اللاوين، العدد، التثفية). مەرەم ژ ناڤێ تەوراتێ رێکا راستیێ یە[٩٧].

بەری مرنا خۆ موسای چەند شیرەت ل جویا کرینە ب دەهـ راسپاردە (الوصايا العشر) دهێنەناڤکرن: پەرستنا خودایێ مـەزن، دویـر کـەڤتن ژ دزی و کوشتنێ، دویرکەفتن ژ حەسویدیێ، رێزگرتن ل دایك و بابان، داکوکیکرن ل سەر پاکیێ، رۆژا شەمبی رۆژا بێهنڤەدانێ بیت[٩٨].

بەلاڤبوونا بیروباوەرێن جویاتیێ ل کوردستانێ بۆ سەدسالیا ٩ پ.ز ڤەدگەرێت، دەمێ شاهێ ئاشووری شیلمەنەسەرێ ٣ (٤٥٨- ٨٢٤پ.ز) ل شەرێ قورقور سالا (٨٥٣ پ.ز) نێزیکی دیمەشقێ ل سەر شاهـ و میرێن سوریا سەرکەفتی، ئێك ژ وان شاه ئاخاب بوو (٨٧٤- ٨٥٢پ.ز) شاهێ ئسرائیلی[٩٩]. شاهێ ئاشووری هندەك ئێخسیرێن جویا ژێ دەڤەرا میدیا (رۆژهەلاتی کوردستانێ) ڤەگوهاستن. وان جویا ل میدیا ژیانا خۆ برە سەر و شیان بیروباوەرێن جویاتیێ ل کوردستانێ بەلاڤبکەن[١٠٠].

راگواستنا جوییان بۆ دەڤەرێن کوردستانێ ژ لایێ شاهێن ئاشووری ل سەدێن هەشت و حەفت پ.ز ل سەردەمێ تجلا پلیزەر ٣ (٧٤٤-٧٢٧ پ.ز) و سەرجۆنێ دووێ (٧٢١-٧٠٥ پ.ز) و سەنحاریب (٧٠٤-٦٨١ پ.ز) یا بەردەوامبوو، بۆ نموونە سەرجۆنێ دووێ (٢٨٨٧٠ ) جوی راگواستنە کوردستانێ[١٠١]. پشتی بۆرینا چەند دەمەکان هندەك ژ وان ل دەڤەرێن پارێزگەها دهۆکێ مینا گوندێ سندۆرێ (باکوورێ باژێرێ دهۆکێ) و زاخۆ ئاکنجی بوون[١٠٢].

ئەو جوییێن هاتینە راگوهاستن بۆ پارێزگەها دهۆکێ خۆ دگـەل خەلکێ دەڤـەرێ گونجاندن و حاخامێن جوییان (پیرێن ئایینی) رێ دا وان ژێ بەلاڤکرنا بیروباوەرێن ئۆلی دناڤ خەلکێ دەڤەرێ دا. ب ڤی رەنگی ئەو شیان جویاتیێ دناڤ هندەك خەلکی دا بەلاڤبکەن[١٠٣].

ل سەدسالیا شەشێ پ.ز شاهێ بابلی نوبوخەز

نوسەری ٢ (٦٠٥-٥٦٢ پ.ز) هێرش کرنە سەر باژێرێ ئورشەلیم (القدس- باژێرێ ئاشتیێ)، ل سالا ٥٨٩ پ.ز و سالا ٥٨٦ پ.ز[١٠٤] شاهێ بابلی ژمارەکا زۆر یا جوییان راگوهاستنە بابل، نەخاسمە د هێرشا دووێ دا بۆ سەر باژێرێ پیرۆز کو هندەك ژێدەر هەژمارا وان دگەهیننە ٤٠ هـزاران[١٠٥]. باژێرێ ئورشەلیم و پەرستگەها سولەیمانی (هیكل سليمان) هاتنە وێرانكرن[١٠٦]. هندەك ژ وان جوییێن هاتینە راگوهاستن بۆ وەلاتێ بابل مشەختبوون و هاتنە دەڤەرێن کوردستانێ و دناڤ کوردان‌دا ئاکنجی بوون[١٠٧].

هەر چەند بەلگە ل بەر دەست نینن، لێ گومان تێدا نینە کو جوی ل سەردەمێن ئەشکانی و ساسانی یێن تووشی بەرتەنگیێ بووین، لەورا یێن مشەختبووین هاتینە دناڤ چیایێن کوردستانێ دا.

مەزارێن پیرۆزێن جوییان ل کوردستانێ هەنە، مینا مەزارێ ناحوم پێغەمبەر ل ئەلقوش و مەزارگەهێ حەزان ل ئامێدیێ و مەزارگەهێ دانیال پێغەمبەر ل کەرکوکێ[١٠٩].

ل سەدسالیا ئێکێ پ.ز بنەمالا شاهێن ئەدیابین ل هەولێرێ چوونە سەر دینێ جوییان، ئەڤ چەندە بۆ ئەگەرێ گەشەکرنا وی دینی دناڤ کوردان‌دا، چونکی دەولەتا ئەدیابینی کارتێکرنا سیاسی و کۆمەلایەتی ل سەر دەڤەرێن باشوورێ کوردستانێ هەبوو. ئەڤ کارتێکرنە د گەهشتە پارێزگەها دهۆکێ شاه دایك هیلینا جوی بوو و ل ژێر چاڤدێریا وێ کنیشتە هاتنە ئاڤاکرن، هەردو کورێن وێ موناباروس و ئیزاتیس ٢ پشتی مرنا وان ل ئورشەلیمێ هاتنە ڤەشارتن[١٠٩].

## ج- ئایینێ زەردەشتی :

ناڤێ ڤی ئایینی ژ ناڤێ زەردەشتی (٦٦٠-٥٨٣ پ.ز)، ئەوێ ل داویا سەدسالیا ٧پ.ز بزاڤ کری بیروباوەرێن خۆ ل میدیا بەلاڤبکەت هاتییە، لێ خەلکێ میدیا باوەری پێ نەئینا، لەوما زەردەشتت نەچاربوو مشەخت ببیتە رۆژهەلاتێ ئیرانێ و بیروباوەرێن خۆ ل باژێرێ بەلخ بەلاڤبکەت[١١٠].

پەرتووکا پیرۆزا زەردەشتیان ئاڤێستایە، دڤێ پەرتووکێ دا رێنمایێن ئایینێ زەردەشتی هاتینە، زەردەشتیا باوەری ب گەلەك خوداوەندا نەبوو و داخوازا پەرستنا یەك خوداوەند ب ناڤێ خوداوەند ئەهورامزدا دکر، خوداوەندێ باشیێ و هێمایێ وێ رۆناهی یە. هەروەسان زەردەشتیا باوەری ب هێزا خرابیێ هەبوو و دگۆتێ ئەهریمەن و هێمایێ وی تاری بوو[١١١].

ئایینێ زەردەشتی باوەری ب فریشتەیان ژ رەگەزێ نێر و مێ هەیە، کو هاریکاریا ئەهورامزدای ژبۆ ب رێڤەبرنا هندەك کارێن جیهانی دکەن[١١٢]. هەروەسان باوەری ب دێوان ژی هەبوو، کو ژێدەرێ خرابیێ یە، چونکی دێو (Devil) خەلکی پالددەنە تاوانان و کارێن نەباش[١١٣].

ئاخ و ئاڤ و ئاگر و با ل جەم زەردەشتیا د پیرۆزن، لەورا وان مرییێن خۆ ددانانە سەر بورجێن بلند و ل سەر بەران ل سەرێن چیان تا بالندە گۆشتێ وان بخۆن، پاشی هەستیێن وان د هاتنە بن ئاخکرن[١١٤]. زەردەشتی رۆژێ پێنج نڤێژان دکەن، لێ ئەو رۆژیان ناگرن، چونکی ل دویڤ باوەریا وان رۆژی ئەزیەتا مرۆڤان ددەت. وان گەلەك گرنگی ددا پاقژیێ. ب کورتی زەردەشتی ڤان دروشمان پەیرەو دکەن:

**١- هزرا باش**

**٢- گۆتنا باش**

**٣- کارێ باش**[١١٥].

## بەلاڤبوونا ئایینێ زەردەشتی ل کوردستانێ:

شاهێ دەولەتا هاخەمنش دارایێ (٥٢١-٤٨٦ پ.ز) باوەری ب ئایینێ زەردەشتی ئینا و کرە ئایینەکێ فەرمی بۆ دەولەتێ، بێ گومان ئەڤە ئەگەرەکا گرنگ بۆ ژ بۆ بەلاڤبوونا دینێ زەردەشتی ل کوردستانێ کو ل ژێر کونترۆلا هاخەمنشیا بوو[١١٦]. دەولەتا ئەشکانی گرنگی نەددا ئایینێ زەردەشتی چونکی وان ژ لایێ ئایینی و سیاسیڤە ئازادی دا خەلکی و فەرمانرەواییا وان نە یا راستەوخۆ بوو[١١٧].

دەولەتا ساسانی جارەکا دی ئایینێ زەردەشتی کرە ئایینی فەرمی بۆ دەولەتێ و گرنگی دا ئاڤاکرنا پەرستگەهان ل ئیرانێ و کوردستانێ، لێ وەسان

دیاره بەلاڤبوونا ئایینێ زەردەشتی ل دەڤەرا میدیا بوو (رۆژهەلاتێ كوردستانێ) و ل دەڤەرێن دی یێن كوردستانێ پتر ئایینەكێ فەرمی بوو، پەرستگەهێن ئۆلێ زەردەشتی ل كوردستانێ هاتنە ئاشاكرن، مینا پەرستگەها حەلوان و هەمەدان و شارەزوور و هندەك دەڤەرێن دی[118].

ڤەكۆلینەكا نوی دەربارەی شكەفتا چارستین و دەوروبەرێن وێ هاتییە ئەنجامدان، ڤێ ڤەكۆلینێ پشتبەستن ب كارێ ئاركولوژی و بەراوردكرن دگەل پەرستگەهێن ئیرانێ كریە، ڤەكۆلەر گەهشتییە وی ئەنجامی كو ژمارەكا پەرستگەهێن ئاگرێ پیرۆز ل رەخ و رویێن شكەفتا چارستین هەبوون، ژبلی شكەفتێ كو پەرستگەها سەرەكی بوو، لێ دبیت ئەڤ پەرستگەهە ژ دەمێ زەردەشتی كەڤنتر بن و هندەك ژ وان ژبۆ پەرستنا خوداوەند ئاناهیتابن، سەر هندێ را كو وان پەرستگەهان خاسیەتێن زەردەشتی تێدا هەبوون[119].

هەر چەند بۆچوون هەنە كو شكەفتا چارستین پەرستگەهەكا زەردەشتی یە و ئایینێ زەردەشتی ل ئاكرێ بەلاڤبوو[120] ، لێ ئەڤ بۆچوونە پێدڤی ڤەكۆلینێنە، چونكی پەرستگەهێن زەردەشتی و بورجێن سۆتنا مریان ل پارێزگەها دهۆكێ نەهاتینە دیتن. وەسان دیاره بیروباوەرێن زەردەشتی ب رەنگەكێ مللی ل دەڤەرا ناهایا پارێزگەها دهۆكێ بەلاڤنەبوون ژبەر ڤان ئەگەران:

- **ئێك:** دویربا دەڤەرا دهۆكێ ژ سەنتەرێ دەولەتێن فارسی.
- **دو:** دەڤەرا دهۆكێ پتر كەتبوو ژێر كارتێكرنا شارستانیەتا رۆمانی.
- **سێ:** دینێ زەردەشتی دینێ شاه و میرا و مەزنێن دەولەتێ بوو و نەبوو دینەكێ مللی مینا ئایینێ مەسیحی.
- **چوار:** بەلاڤبوونا پەرستنا خوداوەند میترا (خوداوەندێ رۆژ – یان چاڤێ رۆژێ. میترانیزم) [121] ل دەڤەرێن پارێزگەها دهۆكێ و پەرستگەهێن میترایی یێن ل ئاكرێ و دهۆكێ و زاخۆ هاتینە دیتن[122].

## د- ئایینێ مەسیحی (Chiristianity):

ئایینێ مەسیحی ل دەڤەرێن كوردستانێ ب رێكا هنارتنا مزگینیدەرێن ئۆلی بەلاڤبوو، یەكەم كەس بۆ بەلاڤكرنا ئایینێ مەسیحی هاتییە كوردستانێ مار ئادی بوو، شاگردێ عیسایێ مەسیح[123] ل سەدسالیا ئێكێ ز. بنەمالا شاهێن ئەدیابین ئۆلێ خۆ ژ جویاتیێ گوهوری و بوونە مەسیحی ل كوردستانێ[124]، دبیت چوونا ڤان شاهان بۆ سەر ئایینێ مەسیحی ل ژێر كارتێكرنا مار ئەدی بیت، ئەوێ مەسیحیەت ل باژێرێن روها و نسێبین و باشوورێ كوردستانێ بەلاڤكری. پشتی مرنا مار ئەدی مزگینیدەر د بەردەوام بوون ل سەر كاری و شاگردێ وی ئەركێ بەلاڤبوونا ئایینێ مەسیحیەتێ وەرگرت.

هەولێر - پایتەختێ ئەدیابین ببوو بنگەهێ سەرەكیێ مەسیحیا ل كوردستانێ و رۆلێ خۆ ژبۆ بەلاڤبوونا وی ئۆلی ل دەڤەرێن دی گێرا [125].

ل سەدسالیێن چوارێ و پێنجێ ز، مەسیحیەت پتر دناڤ خەلكێ دەڤەرێن چیایی ل كوردستانێ بەلاڤبوو و مەسیحیێن هەولێرێ، نەخاسمە مەتران و دێران رۆلەكێ سەرەكی د بەلاڤبوونا ئایینی مەسیحی دناڤ گوندێن كوردستانێ دا و نەخاسمە ل دەڤەرێن چیایی یێن كوردستانێ هەبوو[126]. گەلەك دێر ل دەڤەرێن چیایی یێن كوردستانێ هاتنە ئاڤاكرن، كو مێژوویا وان ڤەدگەرێتەڤە بۆ سەدسالیێن دناڤبەرا (٥-٧ز)، مینا دێرا چیایێ مەقلۆبی (دێر مار مەتی) و دێرا ئەلقۆش و دێرا گوندكی ل ئاكرێ. ل دەڤەرا ئامێدیێ و گەلەك جهێن دی شوینوارێن ڤان دێران پێدڤی ب كارێ ئاركولوژی هەنە ژبۆ زانینا مێژوویا ئاڤاكرنا وان ب رەنگەكێ زانستی.

مەسیحیێن كوردستانێ سەر ب كەنیسا نەستۆری [127] ڤەبوون كو هەر ژ سالا ٤٤٠ ز ژ كەنیسا رۆما هاتبوو دابرین[128]. ئەدی شیر دیار دكەت كو دەڤەرێن نها سەر ب پارێزگەها دهۆكێ ڤە ل سنوورێن مەترانیا ئەدیابین بوون كو ئەڤ دەڤەره بخۆڤە دگرتن: نوهەدرا و مالتاو بێت داسن و قەزایێن دهۆك و زاخۆ و دەوروبەرێن ئامێدیێ و گوندێن چیایێن

گارەی و دەشتا ناڤكورێ (مرگا) - دەشتا بەردەرەش دگەل قەزا ئاكرێ و زێبارێ[١٢٩].

دچەرخێن كەڤندا هندەك ئەگەر بۆ بەلاڤبوونا ئایینێ مەسیحی ل كوردستانێ هەبوون، ئێك ژ وان ئەگەران رەڤینا مەسیحیان ژ دەڤەرێن رۆژئاڤا (سوریا) بەرەڤ كوردستانێ، ب تایبەتی ل سەردەمێ ئیمپراتور نیرۆن (٥٤-٦٨ ز)، ئەوێ زۆرداری ل مەسیحیان كری و هندەك ژ وان كوشتین[١٣٠]، دیسان هندەك ژ خەلكێ كوردستانێ چوونە سەر دینێ مەسیحیان.

ئێك ژ ئەگەرێن دی ئینانا ئێخسیران بوو ژ ئەنجامێن شەرێن بەردەوام دناڤبەرا دەولەتا رۆمێن بیزەنتی و دەولەتا ساسانی، هەروەسان مەسیحی دناڤ دەولەتا ساسانی دا تووشی زۆرداریێ و كوشتنێ و تەپەسەریێ دبوون، نەخاسمە دەمێ شەراندا دناڤبەرا هەردو دەولەتاندا. ژبەر وان ئەگەران ئەو مشەختی كوردستانێ بوون و نەخاسمە بۆ چیایێن دەڤەرا دهۆكێ، كو باشترین جهـ بوو بۆ خۆ پاراستنێ[١٣١].

دەمێ موسلمانان دەستێ خۆ ل سالا ٦٤٠ ز دانایـنە سەر دەڤەرێن باكوورێ كوردستانێ و دەڤەرا دهۆكێ، خەلكێ وان دەڤەران وەكی ژێدەر ئاماژە پێ ددەن مەسیحی بوون، چونكی دناڤ هەمی رێككەفتنێن دناڤبەرا موسلمان و خەلكێ روها و ئامەدێ و مەلاتیێ و دەڤەرێن دی، ئێك ژ مەرجێن رێكەفتنێ ئەو بوو كو كەنیسە و دێرێن خەلكی نەهێنە وێرانكرن[١٣٢].

**كورتە** (Abbrivitions)

1- A B L = Assyrian Babylonian Letters.
2- A R A B = D.D. Luckenbill, Ancient Records of Assyria and Babylonia, (Chicago), vol. 1926, vol II 1927.
3- C A H = The Cambridge Ancient History, Cambridge.
4- J N E S = Journal of Near Eastern studies, Chicago.
5- J S O R = Journal of the Society of oriental Research, Chicago.
6- A B L = Assyrian Babylonian Letters.
7- A R A B = D.D. Luckenbill, Ancient Records of Assyria and Babylonia, (Chicago), vol. 1926, vol II 1927.
8- C A H = The Cambridge Ancient History, Cambridge.
9- J N E S = Journal of Near Eastern studies, Chicago.
10- J S O R = Journal of the Society of oriental Research, Chicago.

## ژێدەر:

١. ژبۆ پتر پێزانینان ل سەر چەرخێن پێش مێژوویێ بنێرە: طه باقر، مقدمه في تاريخ الحضارات القديمة، ط٢، دار الشؤون الثقافية، (بغداد: ١٩٨٦)، ص١٦٣ و ما بعدها ؛ تقي الدباغ و وليد الجادر، عصور قبل التاريخ، (بغداد- ١٩٨٣)، ص ١٧ و ما بعدها. دەربارەی چەرخێن مێژوویی بنێرە: جين بوتيرو و أخرون، الشرق الادنى الحضارات المبكره، (لندن: ١٩٦٧)، ترجمة عامر سليمان، دارالكتب للطباعة و النشر، (الموصل: ١٩٨٦)، ص ٤٧ و ما بعدها ؛ عامر سليمان، العراق فى التاريخ القديم، دار الحكمة، ( الموصل: ١٩٩٢)، صص ٩٧- ٩٩.

٢. باقر،طه،المصدر السابق، ص ٥٧ و ما بعدها.
٣. سيتون لويد، اثار بلاد الرافدين، دار الرشيد، (بغداد: ١٩٨٠)، ص ص ٢٢- ٢٣؛ باقر، ص ص ١٨٠- و ما بعدها.
٤. بهنام أبو الصوف، من الكهف الى القرية، موسوعة الموصل الحضارية، دار الكتب، (الموصل: ١٩٩١)، ج ١ ، ص٣٠.
٥. هەمان ژێدەر، بپ ٣٠.
٦. Stefan,K. Kosoloski, « The Proliminary Report on the Third Season 1987 of Polish Excavation at Nemrik, Saddam Dam Selvage Project, Sumer 46 (1989-1990), pp-20-26.
٧. گوندێ جەرموێ کەڤن دکەڤیتە رۆژهەلاتا چەمچەمال، مێژوویا وێ یا چاندنێ ڤەدگەریت بۆ دەوروبەرێن٦٧٥٠ پ.ز. زانایێ ئەمریکی برید وود (Braid Wood) کارێ ئەرکولوژی دناڤبەرا سالێن (١٩٤٨- ١٩٥٥) ل سەر ئەنجام داینە، بنێرە: لويد، ص ص ٣٤- ٣٧.
٨. بنگەهێ حەسونە یێ کەڤن دکەڤیتە باشوورێ مووسل، سالا ١٩٤٢ سیتون لوید و ( فؤاد سفر) کارێ ئەرکولوژی لێ کر: بنێرە:
eton Lloyd and Fuad Safar, Tell Hassuna, JNES Iv 1945, pp. 255-289.
٩. حەلەف گرەکە دکەڤیتە سەر رووبارێ خابویری ل رۆژئاڤایێ کوردستانێ. ڤون ئوپنهایم (Von Oppenheim) کارێ ئەرکولوژی ل سالا ١٩١٩ ێ ل سەر کری یە، کۆخ و جەرێن رەنگاو رەنگ هاتینە دیتن، بنێرە: احمد امين سليم، فى تاريخ الشرق الادنى القديم، دار النهضة العربية، (بيروت: ١٩٩٠)، ص ص ٣٠ - ٣٢.
١٠. عوبەید: گرەکە دکەڤیتە رۆژئاڤایا باژێرێ ناسریێ، لیونارد وولی (L. Woolley) کارێ ڤەکۆلینێ دناڤبەرا (١٩٢٦- ١٩٢٧) لێ کری یە، بنێرە: ليونارد وولى، وادى الرافدين مهد الحضاره، تعريب احمد عبدالباقي، دار القلم، (القاهره: ١٩٤٨)، ص ص ١٩- ٢٤ ؛ باقر، المصدر السابق، ص ص ٢٢٣- ٢٢٥ ؛ ديفيد و جوان ئوتيس، نشوو الحضارة، ترجمة لطفى الخوري، دار الحرية، (بغداد: ١٩٨٨)، ص ص ٢٥٦- ٢٦٥.
١١. نائل حنون، مدن ومواقع اثريه، دار الزمان، (دمشق: ٢٠٠٩)، ص ص ٢٣١- ٢٣٢.
١٢. جورج رو، العراق القديم، (لندن- ١٩٦٣)، ترجمة حسين علوان حسين، (بغداد- ١٩٨٤)،، ص ٩٨.
١٣. باژێرێ وەرکا باژێرەکێ سۆمەریێ کەڤنە، دکەڤیتە نێزیکی باژێرێ سەماوا؛ رو، ص ١٠٨.
١٤. جومەدەت نەسر(جمدة نصر)، ئەڤ گرێ شوینواری دکەڤیتە رۆژهەلاتا باژێرێ حلە؛ لويد، ص ١٢.
١٥. حنون، ص ص ١٣٢- ١٣٣.
١٦. طه باقر، مقدمه فى تاريخ الحضارات القديمه، گ٢، (بغداد: ١٩٥٥)، ج١، ص ص ٨٩- ٩٢.
١٧. أوتيس، ديفيد و جوان، ص ١٢٩.
١٨. دەربارەی شارستانیەتا سۆمەریان بنێرە: صموئيل نوح كريمر، السومريون، (شيكاغو: ١٩٦٤)، ترجمة فيصل الوائلى، (الكويت: ١٩٧٣)؛ سامى سعيد الاحمد، السومريون، دار الشؤون الثقافية العامة، (بغداد: ١٩٩٠)؛ وولى، وادي الرافدين مهد الحضارات ،ص ١٥ و ما بعدها.
١٩. Gad,C.j. «Sumerians Dynasties, CAH, (Cambridge : 1971), Part 2, p. 117.
محمد صالح زيباري، الاقوام الكردية القديمة- السوباريون , مجلة شانەدەر، العدد ٣ ،١٩٩٧، ص٨٣ وما بعدها.
٢٠. ff.1 Albright, The EPIC of the King of the Battle JSOR, VII, 1923, pp.
٢١. رو، ص ٢١١.
٢٢. فوزي رشيد، دراسة اولية لتمثال باسطكى، سومر ٣٢، ١٩٧٦، ص ص ٤٨- ٥٨.
٢٣. انطوان مورتكات، الفن في العراق القديم، (برلين: ١٩٦٦)، ترجمة عيسى سلمان و سليم طه التكريتى، (بغداد: ١٩٧٥) شكل ٣٦، ص ١٥٥؛ باقر، ص ص ٣٧٠- ٣٧١.
٢٤. هارى ساكز، عظمة باب، ط٢،(لندن: ١٩٦٦)، ترجمة عامر سليمان، دار الكتب، (الموصل: ١٩٧٩)، ص ص ٧٢-٧٣؛ محەمەد سالح زێباری و رێبەر مایی، مێژوویا کوردستانێ یا کەڤن، چاپخانا هەوار، (دهۆک: ٢٠١٢)، ص ص ١٠٠- ١٠٣.

٢٥. كريمر، ص ص ٤٧٩- ٤٨١ ؛ الزيباري، الاقوام الكردية القديمة، المصدر السابق، ص ص ٨٣- ٨٤.

٢٦. جرنوت فيلهم، الحوريون، ترجمة فارق اسماعيل، (حلب: ٢٠٠٠)، ص ١٧ وما بعدها.

٢٧. التكوين ١٤: ٦ ؛ التثنيه ٢: ١٠.

٢٨. جمال رشيد احمد و فوزي رشيد، تاريخ الكرد القديم، مطبعة دار الحكمة، (اربيل: ١٩٩٠)، ص ص ٦٧- ٦٨.

٢٩. هەمان ژێدەر، ص ٦٨.

٣٠. Kupper, J.P. « Northern Mesopatamia and Syria, C A H,(Cambridge) 1973, Vol 2, PI, p.36 ff.

٣١. حسن احمد قاسم البرواري، رموز الالهه في منحوتات منطقة بادينان، رسالة ماجستير، غير منشوره، قدمت الى كلية الاداب جامعة صلاح الدين، (اربيل: ٢٠٠٢)، ص ٨٥ ومابعدها.

٣٢. كمال نوري معروف، كهف گندك ومنحوتاته البارزة، سومر ٤٥، ١٩٨٨، ص ٢٦٥.

٣٣. فيلهلم، ص ٥٩ وما بعدها ؛ Kupper, op. cit, ٣٨

٣٤. سامى سعيد الاحمد، المستعمرة التجارية الآشورية في اسيا الصغري، سومر العدد ٣٣، ١٩٧٧، ص ص ١٠٨- ١٤٧ ؛
Veenhof, R. Klaads, « The Old Assyrian List of Year Eponyms from Karum Kanish and its- Chronological Impliations, (Ankara: 2003), p 20 ff.

٣٥. Bezold, Dr.C. « The Tell – EL- Amarna Tablets in British Museum, (London: 1892), pp .. xxv- xxx.

٣٦. ARAB I, p. 27.

٣٧. هارى ساكز، قوة يشور، (لندن: ١٩٨٤)، ترجمة عامر سليمان، منشورات المجمع العلمي، (بغداد: ١٩٩٩)، ص ٧٧؛
Sayce, A. H. , « The Kingdom of Van (urartu), CAH, (Cambridge: 1965), ,87-ARAB, I, pp. 78 Vol .3, pp. 169- 186.

٣٨. ساكز، قوة أشور، ص ٨٢.

٣٩. ARAB I, pp ٧٧-٨٠.

٤٠. حنون، ص ١٨٤؛ ARAB, pp ٨٣- ٨٥.؛ حسن احمد قاسم بەرواري، شوینوارێن خەنس، چاپخانا هاوار، (دهۆك: ٢٠١٣)، بپ٩ و پشتی وێ.

٤١. ساكز، قوة أشور، ص ص ٩٤-٩٥.

٤٢. هەمان ژێدەر، بپ ١٠١.

٤٣. ل دووماهیا هزارا دووێ پ.ز هۆزێن ئارامی ل نیمچە دۆرگەها عەرەبی مشەخت بوون و ل سوریا و رۆژئاڤایێ كوردستانێ بەلاڤبوون و وان گڤاشتن ئێخستنە سەر دەولەتا ئاشووری، بۆ پتر بنێرە: ساكز، قوة أشور، ص١٠٠ ومابعدها؛ باقر، مقدمه (بغداد: ١٩٨٦)، ص ص ٤٩٣-٤٩٨؛ اوتنهايم، ليو، بلاد ما بين النهرين،(شيكاغو:١٩٦٤)، ترجمة سعدي فيضي عبدالرزاق، دار الشؤون الثقافية، (بغداد: ١٩٨٦)، ص ٢١٠.

٤٤. ساكز، قوة أشور، ص ١٠٦ وما بعدها.

٤٥. بۆ پتر پێزانینان: ريبر جعفر احمد البرواري، الحملات العسكرية الآشوريه على كوردستان، دار موكرياني، (دهوك: ٢٠١٢)، ص ٦٥ وما بعدها.

٤٦. عماد شاكر احمد، مملكة اورارتو، رسالة ماجستير، غير منشورة، قدمت الى كلية الاداب – جامعة صلاح الدين، (اربيل: ٢٠٠٩)، ص ٥٠ وما بعدها.

٤٧. طه باقر و فؤاد سفر، المرشد الى مواطن الاثار والحضارة، دار الجمهورية، (بغداد: ١٩٦٦) – الرحلة الثالثة، ص ص ٤٧-٤٨.

٤٨. البرواري، الحملات ... ص ٨٦ وما بعدها ؛ ARAB, I, p. ١٠٩ ff

٤٩. عبدالله يوسف خلف، الجيش والسلاح فى العهد الآشورى الحديث، (بغداد: ١٩٧٧)، ص١٨؛ منير يوسف، علاقة الآشوريأن مع المناطق المجاورة، موسوعة الموصل الحضارية، (الموصل: ١٩٩١)، ج١، ص ١١٥؛ .. ARAB, I, p ٢٠٨.

٥٠. Grayson, A. k, « Assyrian Rulers of the Early First Millennium B. C, (Tornto: 1996), Vol 2, pp 183 -184.

٥١. ساكز، قوة أشور، ص ص١١٦-١١٨.
٥٢. Postgate, J. N. , « Inscription of Tiglatpileser III at Millamirgi, Sumer, 26, 1973, pp. 47- 60. ،
ژيار صديق رمضان، كتابات الملك تجلا تليزر ٣ (٧٤٤- ٧٢٧ق.م) في منحوتة ملة مەرگى – دراسة تحليلية، مجلة جامعة دهوك، م ١٥، ع ١ ٢٠١٢، ص ص ١٧٠- ١٨٧.
٥٣. ARAB, I, pp. ٢٨١- ٢٨٢.
٥٤. احمد، مملكة اورارتو، ص 65 Parpola, S. , « The Correspondence of Sargon II, (Helsinki: 1987), Part I. N. g,p. 28 (ABL 198)Pfiffer, State Letters of Assyria (New Haven: 1935), N. 11, p 11 (ABL 196).
٥٥. محمد صالح طيب صادق الزيباري، النظام الملكي في العراق القديم، دراسة مقارنة مع النظام الملكي المصري، رسالة ماجستير، غير منشوره، قدمت الي كلية الاداب – جامعة الموصل، (الموصل: ١٩٨٩)، ص ص ٨٥-٨٦.
٥٦. ARAB, 2, pp 73-99.
٥٧. البرواري، رموز الالهه، ص ١٠٢.
٥٨. Luchenbil, D. D., « The Annals of Sennachrib, Chicago ١٩٢٤), p. ١٣ ff.: Jacobsen, Th. And Lloyd, S.» Sennachrib s Aqueduct At Jerwan,(Chicago:1935),p.6 احمد سوسه، مشروع سنحاريب لارواو نينوى،
مجلة المجمع العلمي العراقي، مجلد 9 1961، ص ص -168 169 ؛
Oates, D. « Studies in the Anient History of Northern Iraq, (London: 1968), pp. 49-52.
٥٩. Jacobsen and Lloyd, Op. cit, p. 23.
٦٠. البرواري، رموز ... ، ص ٦٣؛ ١٤٧.
٦١. دەربارەى كوشتنا سەنحاريبى بنێرە: التورات، سفر الملوك الثانى، ١٩: ٣٧؛ طالب عبدالمنعم حبيب، سنحاريب، رسالة ماجستير، غير منشوره، قدمت الى كلية الاداب – جامعة بغداد، (بغداد: ١٩٨٦)، ص ص ٤٨، ٥١.
٦٢. زيبارى و مايى، ص ص ٧٦- ٧٧.
٦٣. Saffer, F., Sennachrib Project for Supplying Erbil With Water, Sumer, 3, 1947, pp. 23- 25.
٦٤. ل ناڤەندا كيشوەرا ئاسيا هاتن و دستێ خوەدانا سەر دەڤەرێن دناڤبەرا دەريا ئورمیێ و دەريا وانێ . بوونە ئەگەرێ لاوازيا دەولەتا ميدى.ساكز، عظمه بابل، ص١٥٥؛ باقر، مقدمة، (بغداد: ١٩٨٦)، ص ص ٥١٧- ٥١٨.
٦٥. Herodotus,«The Histories, Translated by Aubry De Selincourt, The Penguin Classics, (Idinburgh: 1963), pp. 53-68.
٦٦. حسن بيرنا، تاريخ ايران القديم، ترجمة محمد نورالدين. عبدالمنعم والسباعي محمد السباعي، ط٢، (القاهره: ١٩٩٢) ص ص ٦٢-٦٣.
٦٧. ساكز، قوه أشور، ص١٧٢.
٦٨. ساكز، عظمه بابل، ص١٧٣.
٦٩. بيرنيا، ص١٧٥ وما بعدها؛ طه باقر، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ط٢، (بغداد: ١٩٥٦)، ج٢، ص٤١٨.
٧٠. زينفون، حملة العشرة الاف ، ترجمها عن الانكليزية افرام منصور، (الموصل: ١٩٨٥)، ص ص ١٧١- ١٨١.
٧١. أريان، يدون ايام الاسكندر، ترجمة فوئاد جميل، سومر ٢١ ١٩٦٥، ص٢٦٨؛ فلافيوس أريانس، ايام الاسكندر الكبير في العراق، ترجمة فؤاد جميل، دار الوراق، (بغداد: ٢٠٠٧)، ص١٠.
٧٢. باقر، مقدمة... (بغداد: ١٩٨٦)، ص ٥٨١.
٧٣. ايام الاسكندر الكبير في العراق، ص ٣٤؛ بلوتارك فلوطرخوس، السير، ترجمة جرجيس فتح الله، دار ئاراس، (اربيل: ٢٠٠٤)، ج٣، ص١٢٨٤.

٧٤. عبدالله امين اغا، معركة اربيلا (كوكميلا)، (اربيل: ٢٠٠٤)، ص ص ٦-١١؛ جميل محمد مصطفى، الاسكندر الكبير ووقائع معركة طوطميلا في كوردستان، ط٢، مطبعه هاوار، (دهوك: ٢٠١٢)، ص ص ٣١-٣٢.

٧٥. طه باقر، تاريخ ايران القديم، (بغداد: ١٩٧٩)، ص ص ٨٥-٨٩؛ خسرو كوران، كردستان عبر ازمنة التاريخ، (ستوكهولم: ١٩٩٢)، ص ٩٣ وما بعدها؛ بيرنيا، ص ص٢٦٥- ٢٦٦.

٧٦. محمد نجيب السيد احمد في: محمد عبدالحميد الحمد، حضارات طريق الحرير، (دمشق: ٢٠٠٧)،ص ٩؛ هەمان ژێدەر، بپ ٢٥-٢٦.

٧٧. بۆ پتر پێزانینان ل سەر دەولەتا ئەشكانی: بيرنيا، ص ٢٧٥ و ما بعدها؛ باقر، تاريخ ايران القديم، ص ٩٣ وما بعدها.

٧٨. احمد رشيد، تاريخ الكرد القديم، ص١٢٢؛ گۆران، ص١٠٣.

٧٩. هيڤی صبری جميل البرواري، الحروب الفرثية الرومانية واثرها على كوردستان، رسالة ماجستير، غير منشوره، قدمت الى كلية الاداب- جامعة دهوك، (دهوك: ٢٠٠٨)، ص ص ١٠٩-١١٠.

٨٠. هەمان ژێدەر، بپ١١١؛ گوران، ص ص١١٧-١٢٠.

٨١. حسن قاسم احمد البرواري، عماره معابد النار في موقع چارستين على ضوو التنقيبات الاثرية، مطبعة هاوار، (دهوك: ٢٠١٣)، ص ٣٤ وما بعدها.

٨٢. بۆ پتر پێزانینان ل سەر دەولەتا ساسانی بنێرە: أرثر كريستنسن، ايران في عهد الساسانيێن، ترجمة يحيى الخشاب، (القاهره:
١٩٥٧)، ص ١٩٦ وما بعدها؛ بيرنا، ص٢٢١، وما بعدها.

٨٣. احمد ورشيد، ص١٣٣.

٨٤. كريستنسن، ص ٢٠٨ وما بعدها.

٨٥. باقر، مقدمه... (بغداد: ١٩٥٥)، ج١، ص٣٦.

٨٦. باقر، مقدمه، (بغداد: ١٩٨٦)، ص١٩٧.

٨٧. بۆ پتر پێزانینان ل سەر پەرستنا خوداوەندان بنێرە: جان بوتيرو، الديانة عند البابليأن، ترجمة وليد الجادر، (بغداد: ١٩٧٠)، ص ٣٦
وما بعدها؛ ادزارد، قاموس الالهة والاساطير، عربة عن الالمانية محمد وحيد خياطة، ط٢، (بيروت: ٢٠٠٠)، ص٥٩، وما بعدها.

٨٨. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: ژيار صديق رمضان الدوسكي، المعتقدات الدينية في منطقة بادبنان خلال العصر الآشوری الحديث، رسالة ماجستير، غير منشوره، قدمت الى كلية الاداب –جامعة دهوك، (دهوك: ٢٠٠٨)، ص ٥٤ وما بعدها.

٨٩. البرواري، رموز الالة ص ٣٢ وما بعدها.

٩٠. ساكز، عظمة بابل، ص٣٩٣، عامر سليمان، العراق في التاريخ القديم، موجز التاريخ الحضارى، دار الكتب، (الموصل: ١٩٩٣)، ص١٩٩.

٩١. فيلهلم، الحوريون، ص ص ٩٨- ٩٩.

٩٢. هەمان ژێدەر، بپ١٠١؛ ARAB, 2, p. 98.

٩٣. ادزارد، قاموس الالهه، ص٨٧ وما بعدها.

٩٤. ساكز، عظمة بابل، ص ٣٩٩ وما بعدها.

٩٥. التوراه، الخروج ٣: ٦ – ١٠: ١٢: ٣٧-٣٩.

٩٦. الخروج، ٣: ١٥؛ فيليب متى، سوريا و لبنان و فلسطين، ترجمة جورج حداد و عبدالمنعم رافق، دار الثقافه، (بيروت: ١٩٨٥) ص ص ١٩٣- ١٩٤.

٩٧. اسعد الحمرانى، البيان فى مقارنه الاديان، (بيروت: ٢٠٠٠)، ص٣٠.

٩٨. سليمان مظهر، قصة الديانات، (بيروت: ١٩٨٤)، ص ص ٣١٦-٣١٧.

٩٩. ميخائيل السرياني، تاريخ مار ميخائيل السرياني الكبير، عربة عن السريانية: مار غريغوريوس صليبا شمعون، (حلب- ١٩٩٦)، ج١، ص ٤٢ ؛ حتى، ص٢٠٩.

١٠٠. السرياني، ص ٤٦ ؛ ابن العبري، تاريخ مختصر الدول، ط٤، دار المشرق، (بيروت- ٢٠٠٧)، ص ٣٧.؛ - Mehrdad R. Izady, The Kurds, (London: 1992), p. 162 ».

١٠١. التوراه، سفر الملوك الثاني، ١٧: ١ ؛ حتى، ص ٢١٣؛

١٠٢. محمود الامين، تعليقات تاريخية على حملة سرجون الثامنة، سومر العدد ٥، ١٩٤٩، ص ٢١٨.

١٠٣. Ezady, Op. Cit, P. 162.

١٠٤. ادى شير شير، تاريخ كلدو و أشور، (حلب: ٢٠٠٧)، ج١، ص ١٨٥؛ ابتهال عادل ابراهيم الطائي، اليهود في النصوص المسمارية، اطروحة دكتورا، غير منشورة، قدمت الى كلية الاداب– جامعة الموصل، (الموصل: ٢٠٠٢)، ص ص ١٧٧-١٨١.

١٠٥. باقر، مقدمه، (بغداد: ١٩٨٦)، ص ٥٥٠.

١٠٦. التوراه، سفر الملوك الثانيه، ٢٥: ١-٢٧؛ السرياني، صص ٥٩- ٦٠ ؛ اوبنهايم، ص ٢٠٣؛ رو، ص ص ٥٠٨-٥٠٩).

١٠٧. عامر سليمان و فاضل عبدالواحد علي، عادات وتقاليد الشعوب القديمة، (بغداد: ١٩٧٩)، ص٢٥

١٠٨. Izady, p. 162 ؛ محەمەد صالح زێباری، جوهێن بەهدینان، دیدار دیرۆكی ل دۆر ئامێدیێ، چاپخانا خانی، (دهوك: ٢٠٠٤)، ص ١٤٠.

١٠٩. Izady, p. 162.

١١٠. Olmstead, A. T, « History of Persian Empire, (Chicago: 1943), p. 102 ؛ محمد صالح طيب صادق، الاسس التاريخية للديانة الزرادشتية، مجلة جامعة دهوك، م٣، ع١، ٢٠٠٠، ص٩٣.

١١١. حامد عبدالقادر، زرادشت الحكيم، (القاهره: ١٩٥٧)، ص٨٣؛ البان ويدجيري، المذاهب الكبري في التاريخ، ترجمة ذوقان قرقوط، (بيروت: ١٩٧٢)، ص١٣.

١١٢. خالد السيد محمد غانم، الزرادشتية تاريخا وعقيدة وشريعة، (دراسة مقارنة)، (دمشق: ٢٠٠٥)، ص١٨١؛ البرواري، عماره معابد النار، ص٢١.

١١٣. تقي الدباغ، الفكر الديني القديم، (بغداد: ١٩٩٢)، ص١٨٧؛ زيبارى و مايى، ص٢٤٥.

١١٤. مظهر، ص٢٧٥، المتيوتي، نايف محمد شبيب علي، المعتقدات الدينية واثرها علي المجتمع الفارسي في العهد لساساني، رسالة ماجستسر، غير منشورة، قدمت الى كلية الاداب- جامعة الموصل، (الموصل: ٢٠٠٢)، ص ص ١٣٠-١٣١؛ البرواري، عمارة معابد النار، ص ص ٢٩- ٣٠.

١١٥. وول ديورانت، قصة الحضارة، ترجمة محمد بدران، گ٣، (القاهره: ١٩٦٥)، ج٢، ص٤٣٢.

١١٦. Boyce, M. , « Zoroastrians- Their Religious Bliefs and Practies, (London: 1987), pp 54- 58.

١١٧. طه باقر، تاريخ ايران القديم، ص١٠٤.

١١٨. كريستنسن، ص ص ١٥٨- ١٥٩؛ أسمونسن، جى. ث، فاتحه انتشار المسيحية في الشرق، نقلها الى العربية جرجيس فتح الله، ط٢، دار أدى شير، (اربيل: ٢٠٠٥)، ص ص١٧-١٨.

١١٩. البرواري، عمارة معابد النار، ص ص٨٠-٨١.

١٢٠. عبدالفتاح على بوتاني وأخرون، ئاكرێ مدينة العيون والينابيع، مجلة دهوك، العدد ٣ ١٩٩٨، ص٧٦.

١٢١. بۆ پتر پێزانینان ل سەر میترا بنێرە:

عەلی تەتەر نێرۆەیی، كورد و مێژوو، دەزگەهێ سپیرێز، (دهوك: ٢٠١٠)، بەرگێ ا ، بپ ٧٥ و بێن دووڤدا.

١٢٢. دەربارەی پەرستگەهێن میترایی بنێرە:

عبدالرقيب يوسف، المعابد الميترائية في ايطاليا ومقارنتها مع المعابد الميترائية في كوردستان، ترجمة جميل مجيد (مەلاقەرە)، مطبعة الثقافة، (اربيل: ٢٠١٣)، ص٢٣ وما بعدها.

١٢٣. كريستنسن، ص٢٥، أدى شير، تاريخ كلدو و أشور، ج٢، ص١٣؛ أسمونسن، فاتحة... ، ص١٧.

١٢٤. جمال رشيد احمد، كركوك في العصور القديمة، دار ئاراس، (اربيل: ٢٠٠٢)، ص٤٦.

١٢٥. أسمونسن، ص ص ١٧-١٨؛ أدى شير، ص١٣.

١٢٦. مشيخا زخا، كرونولوجيا اربيل، ترجمة عزيز عبدالاحد نباتي، دار ئاراس، (اربيل: ٢٠٠١)، ص١٥٦ وما بعدها ؛ السرياني، ج٢،ص ١٣٥.

١٢٧. نەستوروس ل سالا ٤٢٨ ز. بەتریاركێ قەستەنتینیێ بوو، ژبەر ئەگەرێن لاهوتی ژ كەنیسا رۆما جودا بوو. بنێرە: عبدالقادر احمد الیوسف، الامبراطوریة البیزنطیة، (بیروت: ١٩٦٦)، ص٢٦.
١٢٨. Izady, p. 163.
١٢٩. تاریخ كلدو وئاشور، ج٢، ص ص ١٤-١٥.
١٣٠. ه. أ. ل فیشر، تاریخ اوربا فی العصور القدیمة، نقلة الی العربیة ابراهیم نصحی بك و محمد عواد حسین، دار المعارف، (القاهرە: ١٩٥٠)، ص١٢٤، ص١٣٦؛ عادل نجم عبو و عبدالمنعم رشاد، الیونان والرومان، (الموصل: ١٩٩٣)، ص ص ٣٢٧-٣٢٨.
١٣١. بۆ پتر پێزانینان ل سەر تەپەسەركرنا مەسیحیان ل سەر دەستێ فارسان بنێرە: السریانی، ج٢، ص ١٩٢ و یێن دووڤدا، كریستنسن، ص٢٥٢؛ أسمونسن ص ص ٢٩- ٥٥.
١٣٢. البلاذري، فتوح البلدان، مكتبة الهلال، (بیروت: ١٩٨٣)، ص١٧٢ وما بعدها.

# گرنگترین چەرخێن شارستانییێن كەڤن كو دەڤەرا بەهدینان تێدا دەرباز بووی

د. حەسەن قاسم ئەحمەد
وەرگێران: موسەدەق تۆڤی

## ١. جهـ

دەڤەرا بەهدینان دكەڤیتە لایێ باكوور ژ هەرێما كوردستانا عیراقێ، دناڤبەرا هەردو هێلێن پانییێ ٣٧ و ٣٦ بۆ لایێ باكوور و هەردو هێلێن درێژیێ ٤٢ و ٤٥ بۆ لایێ رۆژهەلاتی. دەڤەرێ هەر دكەڤن دا و تا ئەڤرۆ جهێ خۆ یێ گرنگ یێ هەی، و دەڤەرا بەهدینان ئەو جهە یێ ئەڤ ڤەكۆلینە ژێ دگریت، كو ددەمەكی دا میرگەهەكا ب هێز بۆ ب ناڤێ میرگەها بەهدینان كو بۆ دەمێ پتر ژ شەش سەدسالییان حوكم لێ دكر[١].

میرگەها بەهدینان ل دەستپێكا خۆ ب تنێ باژێرێ ئامێدیێ و رەخ و رویێن وێ ڤەدگرت[٢]، لێ ب زێرەكییا میرێن بادینان و مفا وەرگرتنا وان ژ دەلیڤە و كاودانێن سیاسیێن گونجای جهێ دەڤەرا وان بەرفرەهتر لێ هات، وهەر ژ سەدساڵییا شازدێ زایینی[٣] سنوورەكێ دەستنیشانكری بۆدیار بوو، كو خەلكەكی پێ دزانی و میرنشینا داسنیان[٤] و دەڤەرێن زاخۆ و ئاكرێ و شێروان و بەرادۆست كەتنە دناڤ سنوورێن وێ دا[٥]. و حوكمێ ڤێ میرنشینێ تا چیایێ مەقلۆبی بۆ لایێ باشووری و تا میرنشینا هەكاری و شەمدینان و چیایێ شەرنەخ و رووبارێ هیزل بۆ لایێ باكوور ڤە دچوو، و ژ لایێ رۆژهەلاتی ڤە دگەهشتە ئیرانێ و رووبارێ زێی و ژ لایێ رۆژئاڤاڤە دگەهشتە رووبارێ دیجلە .

## ٢. پێكهاتەیا جیولۆجی

دەڤەرا بەهدینان هەر د وی چاخیدا یا دروست بووی یا كو پتریا ئەردێ كوردستانێ تێدا دروست بووی ددەمێ فشار ئینایە سەر نیشتەیێن دەریایی یێن خرڤە بووی ل بنێ دەریایی تشس (Tethys)(*) یێ كو زۆریەی ئەردێ عیراقێ و دەڤەرێن دراوسێ ڤەدگرت[٦].

كەڤنترین پێكهاتەیێن جیولۆجی یێن دەڤەرێ(*) ڤەدگەرینەڤە چاخێن جیولۆجیێن كەڤن. دروست بوناخابووری ڤەدگەرێتەڤە چاخێ (ئەردوفیشی)[٧]، كو مێژوویا وێ نێزیكی ٧٥٠ ملیون سالانە[٨]، و تەختێن وێ یێن د ناڤ رووبارێ خابوور و دەڤەرا ئامێدیێ هەین[٩]، و مێژوویا چێبوونا كێستە و ئۆرە و هرۆر ڤەدگەرێتەڤە هەردو چاخێن كاربونی و برمی دچاخێ ژیانا كەڤن دا[١٠]، وچێبوونا شەرانش

و هدێنە ڤەدگەریێتەڤە چاخێ كرتیاسی[11] (٢٢٠) مەلیون سالان[12] دچاخێ (دهر) ژیانا ناڤین دا ژ بلی گەلەك پێكهاتەبێن دی.

دەڤەرا بەهدینان ب گشتی دهێتە هەژمارتن ژ دەڤەرێن چیایی یێن ئاسێ و گەلەك زنجیرە چیایێن بلند دناڤ خۆ دا هەلدگریت هەر چەند ب بۆرینا دەمی و تا ئەڤرو هەر یێن تووشی هێرشێن لەشكەری بووین، و ئەڤە ژی بووینە هاریكار كو خەلكێ وێ ناسنامە و رەوشت و تیتالێن خۆ و هەر ژ كەڤن دا و تا ئەڤرو بپارێزیت، و دەڤەر زنجیرە چیایێن شەرانش و زجیرە چیایێن زۆزان وهرۆر و مەتینا و چیایێن بەرواری بالا و زنجیرا قەندیل وبەرادۆست و گارە و بێخێر و ئاكرێ بخۆڤە دگریت[13]

دیسان هندە دەشتێن ب زاخ بۆ چاندنێ ژی ل دەڤەرێ هەنە، ژوانا دەشتا سندی و دەشتا سلێڤانەیا و دەشتێن ئاكرێ و شێخان.

هەروەسان دەڤەرا بەهدینان دهێتە هەژمارتن ژ وان دەڤەرێن گەلەك ئاڤ لێ هەی و كانیكێن ئاڤا شرین مشە لێ هەنە و گەلەك رووبارێن گرنگ دناڤ دەشت و چیایێن وێ را دەرباس دبن ژ وانان دیجلە وخابوور و گومل و خازر و زێیێ مەزن و رویێ شین. ژ بلی ئەو رووبارێن بچویك كو درژێنە سەر، ئەڤە بووینە ئەگەر كو بەرێ مرۆڤێ كەڤن ب كەڤیتێ دا لێ بژیت و ل بەر پەراڤێن وێ ئاكنجی ببیت و شارستانیەتا دەستپێكی لێ پەیدا ببیت و وەرارێ بكەت.

چیا و دۆلێن بەهدینان ب دارستانان داپۆشكرینە و گەلەك رەنگێن دار و باری لێ هەنە، هەروەسان گیا ژی لێ شین دبن كو ئەو ژی ل جهێ خۆ دبنە چەروانێن باش و دبنە هاریكار كو گەلەك گیاندارێن كیڤی وەكی هرچ و بەراز و حەفتیار و گورگ و رویڤی و پلنگ و ... یێن مایی لێ بژین. و گەلەك رەنگێن فرندا لێ هەبن و ل ئەسمانێ وێ ب فرن مینا بازی و ئەلهو و شاهین و كوند و قەل و لەگلەگە و كەو، كو ژ وان فرندێن بەر چاڤن ل كوردستانێ.[14]

دیسان دەڤەر یا دەولەمەندە ب گەلەك كانزایێن گرنگ ژ وانان ئاسن كو كەرەستێن وی (یێن خام) ل دەڤەرا بەرواری بالا هاتینە دیتین، و كەرەستێن رساسی و زنكی ل باكوور رۆژهەلاتێ زاخۆ و باكوور ئامێدیێ یێن هەین، و كوارتز و زێر و زیڤ ل دەڤەرا ئامێدیێ، و رساس و بارایت ل زاخۆ[15]، هەروەسان كەرەستێن كانزایێ كالینا و كلێ چاڤان ل دەڤەرا بەرواری بالا و ڤیر و نەفت ل نێزیكی زاخۆ ل گوندێ تاوكێ(*) یێن هەین و كانیێن ئاڤا كبریتی و بەرێن مۆزایك[16] ل دەڤەرێ هەنە.

## ناڤ

یا زانا ئەوە پەیڤا بادینان ژ بنیات یا ژ بەهدینان هاتی كو ئێك ژ ناڤێن زەرەدەشتیانە ب شێوێ (باهـ دینان) و ئەو ژی پەیڤەكا كوردی یا پێك هاتییە ژ دوو برگان: (بەهـ) ب واتایا (دروست) و (دین) كو ب واتایا (دیتن). ژ بەر ڤێ چەندێ بەهدینان دهێت ب واتایا (دیتنا دروست). لەوما ئەو دەڤەرا كو كوردێن زەرەدەشتی لێ دژیان ب ڤی ناڤی هاتییە ناڤكرن، ل سەر ناسناڤێ بیر و باوەرێن وان.

## چەرخێن شارستانی

رێڤەبەریا گشتیا شوینوارێن عیراقی پتر ژ (٦٠٠) جهێن شوینواری ل دەڤەرا بەهدینان توومارکرینە و وەك شوینوار دانیە نیاسین، ئەو ژی د پێكهاتینە ژ شكەفت و ناوسك و گر و پەیكەر و كەلا و سۆلینە و پر و كارێز و پەرستگەهـ و (صوامع) و دێر (الادیرە والكنائس) و مزگەفت و ڤۆتابخانە و مەزار و ... یێن دی .

هەر چەند شاندێن عیراقی و بیانی كێم گەریان ل سەر ڤان جهێن شوینواری كرینە، لێ ئەنجامێن وان دیار دكەن كو دەڤەر یا د چەندین چاخێن شارستانیێن گرنگ دەرباس بوویە و ب ڤی رەنگی:-

یەكەم: چەرخێن بەردینێ كەڤن (Paleolithic). (ژ نێزیكی نیڤ مەلیون سالان تا دەهـ هزار سالان پێشی زایینی)[17]

دووەم: چەرخێن بەردینێ ناڤین (Mesolithic). (ژ هزارا دەهێ و چەندەکێ ژ نەهێ بەری زایینی پ.ز)[١٨]

سێیەم: چەرخێن بەردینێ نوی (Nesolithic) ز (ژ هزارا نەهێ و تا ٥٦٠٠ پ . ز )[١٩]

چوارەم: چەرخێن بەردینێ کانزایی (٥٦٠٠- ٣٥٠٠ پ.ز)

پێنجەم: دەڤەر دناڤبەرا هزارا سێ و دووێ پ . ز

شەشەم: دەڤەر دماوێ هزارا ئێکێ پێشی زایینی

## یەکەم: چاخێ بەردینێ کەڤن (Paleolithic)

دەڤەر دهێتە هەژمارتن لاندکا پێشەنگا دەستپێکا مرۆڤایەتیێ ل وەلاتێ کەڤنێ دۆلا ناڤبەرا هەردو رووباران داو ئەو هەلکۆلین و لێکەریانێن شاندێن عیراقی و بیانی ل رەخ و رویێن سکرێ مۆسل کرین کو لایێ وێ یێ باشووری رۆژئاڤا دبیتە دەڤەرا بەهدینان شوینوار و پاشڤەمایێن مرۆڤێ کەڤن بێن دیتین کو مێژوویا وان ڤەدگەرێتەڤە بۆ پتر ژ چارێك مەلیون سالان[٢٠]، و ئەو

پەیکەرێ برونزیێ ئەکەدی



بەرمایی پێکهاتینە ژ کەل و پەل و ئامیرێن مرۆڤێ وی سەردەمی، کو ل پتر ژ بیست ئاکنجیکەهـ و جهێن د کەڤنە پەراڤێن رۆژهەلاتی رووبارێ دیجلە و ل ملێن وان دۆلێن ڤەدرێژنە سەر رووبارێ دیجلە ژ لایێ رۆژهەلاتی ڤە هاتینە دیتن، کو هەردو بازێرێن فەیدیێ و سێمێلێ دکەڤنە هەمان جهـ، وئەو کەل و پەل ژ پێدڤیێن وی سەردەمی یێن کەرکرن و برین و تیڤلاندنێ(مفارم و مقاشت) و بڤرێن ژ بەری دروست کرینە، و مێژوویا وان ڤەدگەرێتەڤە دەمێن بەرێ ژ چاخێ بەردینێ کەڤن[٢١]. و ل لایێ رۆژهەلاتی ڤە گەلەك شکەفت هاتینە دیتن، کو مرۆڤێن کەڤن وەکی پەناگاهـ یان وارگەهـ بکار ئینانە دا وان ژ کاودانێن سرۆشتییێن سار و ئەو مەترسییێن تووشی وان دبوون بپارێزن، و ژ کەڤنترین و ناڤدارترین شکەفت[٢٢] تا ئەڤرو شکەفتا شانەدەرە(*) کو ناڤ و دەنگێن خۆ هەبین و تێدا ڤەرقۆدەیێن مرۆڤان هاتینە دیتن کو ڤەدگەرێنەڤە دەمێ مرۆڤێ نیاندرتالێ کەڤن و ئەو پشکنینێن ل تاڤیگەهان ل سەر ڤەرقۆدێن هەستێکێن ئێك ژ وان هاتینە کرن مێژوویا وی ڤەدگەرینەڤە بۆ (٦٠٠٠٠) هزار سالان بەری نهو و مێژوویا سێ ڤەرقۆدێن دی ڤەدگەرینەڤە بۆ بەری (٤٥٠٠٠) هزار سالان بەری نهو[٢٣]، هەروەسان گەلەك کەل و پەلێن ژ هەستیکان چێکری ل لایێ ژێری ژ تەخا (A)[٢٤] و کەل و پەلێن ژ بەرا دروستکری تێڤە دیتینە[٢٥].

## دووەم: چەرخێن بەردینێ ناڤین (Mesolithic)

شارەزایێ شوونواران یێ ئەمریکی(سولیکی) کو لێگەریان ل شکەفتا شانەدەر کرینە، د ئەنجامدا

پەیکەرێن ل شندۆخا هاتینە دیتن



ژێدەر: رێڤەبەریا شوینوارێن پارێزگەها دهۆکێ

شيايە گوندەكێ گەلەكێ گرنگێ وى سەردەمى[٢٦]، ل نێزيكى شكەفتا شانەدەر ل سەر ئەردێ بارزان ب ناڤێ (زاوى چەمى) بينتەڤە، و دهێتە هەژمارتن كەڤنترين گوند خەلكێ وى كارێ چاندنێن دەستپێكى كرين و گياندار ب خودان كرين، و يەكەم كريارا ب خودان كرنا تەرش و كەوالى ل دەڤەرا شانەدەر - زاوى چەمى)(*) ب نێزيكى (١٠٨٠٠ پ.ز)[٢٧] يا چێبووى، و ئەڤە دەستپێكێن ئێكێ يێن شۆرشێ نە كو ل ژيانا مرۆڤان، كا چەوان مرۆڤان ژ ڤێدان و خرڤەكرنا فێقى و نێچيرێ و ژيان د شكەفتاڤە بەرەڤ وێ چەندێ وەرار كرييە كو خوارنێ بەرهەم بينت و تۆڤێن چۆلى بچينت و گيانداران ب خودان كەت و ئاڤەدانكرنێ بكەت[٢٨].

ئەڤ جهە مينا ئاكنجيكەهەكا هاڤينى بوويە بۆ خەلكێ شكەفتا شانەدەر، و ل تەخێن سەرى ژ شكەفتا شانەدەر كۆمەكا قەرقۆدێن هەستيكان ديتينە، مێژوويا وان ڤەدگەرێتەڤە چاخێ (زاوى چەمى)[٢٩]. هەروەسان خەلكێ وێ فێر بوون خانيێن رەنگ بازنەيێ و سادە دروست دكرن[٣٠].

هەر ديسان دشكەفتێ ڤە سەرێن تيرێن (كرافتى) مينا (النصال) هاتينە ديتن، كو درژاڤ ودرێژ بوون و سەرێ وان يێ تيژ بوو، و ل تەخا (B) ژ شكەفتا شانەدەر، و تەخا (B) ژ زاوى چەمى تيرێن سەرێ وان سێ گۆشە هاتينە ديتن[٣١].

## سێيەم: چاخێ بەردينێ نوى (Neolithic)

گوندێ (نەمريكێ)(*) دهێتە هەژمارتن ژ كەڤنترين گوندێن چاندنێ كو مێژوويا وى ڤەدگەرێتەڤە دەستپێكا چەرخێ بەردينێ نوى ل سەرانسەرى دەڤەرێ، و مێژوويا وى دناڤبەرا هزارا هەشتێ و نيڤا ئێكێ ژ هزارا شەشێ پ.ز. ئەو دەمێ دناڤبەرا چاخێ (زاوى چەمى) و دەستپێكا دياربوونا (فخارى) ل چاخێ بەردينێ نوى ل دەڤەرێ[٣٢]، ب ڤێ چەندێ كەڤنترە ژ گوندێ (جەرمو) ب نێزيكى (١٠٠٠) سالان، و ل ڤى جهى گەلەك ئامير و كەل و پەلێن بەرى و يێن ژ هەستيكى هاتينە چێكرن هاتينە ديتن[٣٣].

## چوارەم: چاخێ بەردينێ كانزايى (٥٦٠٠ - ٣٥٠٠ پ.ز)

(مە) پێزانينێن كێم ل سەر ڤى چاخى هەنە، چونكى لێكەريانێن شوينوارى ل ڤێ دەڤەرێ نەهاتينە كرن دان ژ بلى ئەو چەند لێكەريانێن ل پەراڤێن رووبارێ ديجلە هاتينەكرن دا كو ئەو شوينوارێن دكەڤنە بەر پرۆژێ رەخ و روبێن سكرێ مووسل بهێنە پاراستن و دەمێ بۆ وێ چەندێ ژى هاتييە تەرخان كرن گەلەك يێ سنۆرداى بوو. ژ بەر ڤێ چەندێ پێزانينێن تێر و تەسەل ل سەر ڤى چاخى نينن و ئەڤێن هەين ژى دكێمن، و ل (تەل جيكان)(*) هندە تەخێن ئاكنجى بوونى ديار بووينە كو مێژوويا وان ڤەدگەرێتەڤە چاخێ حەسونە (هزارا شەشێ پ.ز)، و تێدا گلێنە - قافك(فخار) ێ رەنگێن هاتييە ديتن كو مێژوويا وى ڤەدگەرێتەڤە چاخێ حلف(*) (٥٥٠٠ - ٤٨٠٠ پ.ز)، هەروەسان گلێنە - قافك ێ رەنگين و (محزز) و نۆرمال هاتينە ديتن، مێژوويا وان ڤەدگەرێتەڤە چاخێ نەينەوا[٣٤]، و ل جهێ تەل جەمبور(*) پاشڤەماى هاتينە ديتن كو مێژوويا وان ڤەدگەرێتەڤە چاخێ ئەلوەركا و بەنداتيێ (هزارا پێنجێ پ.ز). ديسان فخار نەينەوا ٥ ژێ[٣٥] هاتييە ديتن، و ل جهێ (تەل بەقاق)(*) ژى (فخار) ٥ هاتييە ديتن[٣٦].

## پێنجەم: دەڤەر د ناڤبەرا هزارا سێ و دووى پ.ز

پێزانين ب گشتى ل سەر دەڤەرێ دوى چاخى دا نينن ژ بلى چەند پێزانين و ئاماژەكێن كێم نەبن، و سۆمەريان(***) دكەڤنترين دەربرينا جوگرافى ب شێوێ (SU- BIR) سوبير پێ داى كو مێژوويا وى ڤەدگەرێتەڤە چاخێ دەستەلاتداريا (أدب) (لوكال - ئاى - موندو) ل چارێكا ئێكێ ژ هزارا سێ پ.ز[٣٧] كو وى دەمى دەڤەرا بەهدينان دكەتە دناڤ وەلاتێ

سوبارتو دا[٣٨]، و سۆمەریان پەیوەندی دگەل ئاسیا بچویك هەبوون[٣٩]، و تەها باقر پتر بۆ هندێ دچیت كو پەیكەرێ گوندك ژ پەیكەرێن دیاره تا دووماهیا هزارا سیێ پ.ز[٤٠]، هەروەسان ل تەخا پێنجێ ژ تەل جەمبۆر پاشڤەماییێن ئاڤاهییێن شوینواری هاتینە دیتن و ئەو چەند پشت راست دكەت كو مرۆڤ ل وی دەمێ بەرنیاس ب (فخار٥) دئاكنجی بوون، كو یێ هەڤدەم بوو دگەل دووماهییا چەرخێ جمدە نصر و دەستپێكا دەسەلاتییا مالباتان (٢٩٠٠- ٢٣٥٠ پ.ز)[٤١] ل ناڤەراست و باشوورێ عیراقێ، و ل دەڤەرا شندۆخا یا دهۆكێ رێڤەبەرییا شوینوارێن دهۆكێ نڤیسینەكا وینەدارا سۆمریان دگەل پەیكەرەكی و ب دەهان پارچێن شوینواری دیتینە كو مێژوویا وان ڤەدگەرێتەڤە شارستانیەتا سۆمەریان، و شاهێ ئەكەدی سرجون (٢٣٤٠- ٢٢٨٤ پ.ز) و ل سەر داخوازیا بازرگانێن ئەكەدی كو ل ئەنادۆل دژیان هێرشەكا لەشكەری درێكا دەڤەرێ دا كریە سەر ئاسیا بچویك (ئەنادۆل)[٤٢]، و ئەو دەمێ پیشەسازیێن سفری جهێ كەل و پەل و چەكێن بەری ب رەنگەكێ بەرفرەهـ گرتین هێرش ژی ل سەر دەڤەرێن باكوور كو یێ دەولەمەند ب كانزاییێن خۆڤە پتر لێ هاتن[٤٣].

ل سالا (١٩٧٥) ێ ژ نشكەكێ ڤە ل سەر پەیكەرەكی هەلبوون كو دبێژنێ پەیكەرێ (باستكێ)(*) مێژوویا وی ڤەدگەرێتەڤە چاخێ حوكمێ شاهێ ئەكەدی نرام - سین (٢٢٦٠-٢٢٢٣ پ.ز)[٤٤] و دهێتە هەژمارتن ژ پارچەیێن شوینوارێن كێم وینە[٤٥]، ل سەر بنكێ وی دەڤەكێ بزماركی (میخی) هەیە یێ پێكهاتییە ژ سێ پارچان برگەیان و هەر برگەیەك نێزیكی(٢٥) رێزانە ب زمانێ سۆمەری ئەڤ چەندەهاتییە نەخشاندن:-

((نرام سن - یێ ب هێز - شاهـ - ئەكەد - دەمێ هەڤپەیمانی دژی وی هاتییە كرن - ئالیێن جیهانێ - هەر چوار، پێگڤە، ب هاریكاریا خۆشتڤیاتیا وی - دگەل خوداوەند عشتار -، كو حەز ژێ دكەت - (شیبا ) سەركەڤیت - د نەهـ شەرادا - دئێك سال دا - و مەلكێن دەڤەرا شجر گرێدەن، كاژ (واتە ئەو مەلكێن، ئەوێن دشەرێن خۆدا ل سەر سەركەتی، هەر نەهان )، و ل سەر وان بۆ (ژ بلی دۆراندنا وان د شەری دا ) ب، دانانا شەنگستێن هەر باژێرەكی، ژ باژێرێن خۆ ب زەحمەت، دگەل - عشتار، ل (أی - أنا)، دگەل، خوداوەند انلیل، ل نفر، دگەل، خوداوەند دكان، ل توتولی، دگەل، خوداوەند ننخر ساك، ل كیش، دگەل، خوداوەند انكی، ل اریدو، دگەل، خوداوەند سن، ل اور، دگەل، خوداوەندێ رۆژێ، ل سبار، خوداوەند نركال، ل كوسە؟؟، هیڤی دكرن كو (واتە مەلك نرام سین) خوداوەندێ باژێرێ وان ببیت، ئەكەد، و خانیێ وی ئاڤاكرن، دناڤ باژێرێ ئەكەد دا، ئەوێ ژێ دبەت، ڤێ نڤیسینێ، (دبیت) خوداوەند شمش، و خوداوەند عشتار، و خوداوەند نركال، شوینكار؟؟، یێ مەلكی، و كۆمەكا خوداوەندان، ئەڤە (واتە ئەوێن ناڤێن وان ددەقی دا هاتین)، ژ بن ببەت، شەنگستێ وی، و ژناڤببەن، تۆڤێ وی (واتە نفشا وی)))[٤٦].

د دەقەكی دا كو ئەو دەق ڤەدگەریت بۆ حاكم (ارننا) ژ رڤشتێ اور یێ سیێ ناڤێ ناسناڤێ حاكمێ سوباریان و وەلاتێ كاردا یێ هاتی، و ئەڤە دیار دكەت كو كاردا دەڤەرەكا چیایی بوو یان دكەڤیتە لایێ باكوور رۆژهەلاتێ رووبارێ دیجلە[٤٧]، و پەیڤ ب شێوێ (وەلاتێ كار – دا) یێ هاتی كو ئەڤە یەكەم ئاماژە پێكرنە بۆ ناڤێ كورد[٤٨].

ل سەر دەمێ مەلك كودیا (٢١٤٤ – ٢١٢٤ پ. ز) هندە پێزانین یێن گەهشتین كو بزاڤێن وی یێن بازرگانی و لەشكەری یێن گەهشتینە وەلاتێ شامێ و ئاسیا بچویك دا كانزایا مینا زیڤی و سفری و ئاسنی و رساسی بینت[٤٩].

ل دووماهییا هزارا سیێ پ . ز (حۆری)(*) یێن ل كوردستانا كەڤن بەلاڤ بووین[٥٠]، و ژ بنگەهێن وان یێن گرنگ نوزی و نەینەوا و باكوور سۆریا، و دەڤەر كەتە ژێر دەسەلاتا وان[٥١]. و ژ بەر كو (ئاشووری) (**) ل دەستپێكا هزارا دووێ پ .ز هێزەكا سیاسی بوون و بنگەهـ و پەیوەندیێن بازرگانی دگەل كانیش

ل ئاسیا بچویك هەبوون[٥٢]، لەوما دەڤەرا بەهدینان ژبەر جهێ وێ یێ جوگرافی مینا خەلەکا پێگڤە گرێدانێ بوو دناڤبەرا ئاشوور و بازرگانێن ئاشووری دا ل ئاسیا بچویك میتانی(*) ئەو ژی شیان دەولەتەکا بەرفرەهـ کو یا بەرنیاس بوو ب دەولەتا میتانی (١٥٠٠- ١٢٧٠پ.ز)[٥٣] دامەزرینن و گرانییا خۆ ل دەڤەرێ هەبوو کو بووینە ئەگەر گەلەك تێکچوون دناڤبەرا وان و فیرعەونێن مسری داهەبن ژ بەر ڤێکنەکەفتنا بەرژەوەندیێن وان ل دەڤەرێ، لێ هەر زوی زمانێ ئاشتی و تێك گەهشتنێ ژبوو نەهێلانا شەری ل سەر وان زال بوو، ئەڤ چەندە ب هەڤپەیمانیەکێ ب داویهات و ڤێ هەڤپەیمانیێ ئەو گەهاندنە خزمانیێن سیاسی دا هەڤالینی و باوەری دناڤبەرا وان دا موکم بیت، و فیرعەون تحوتمس أمنحوتبێ سیێ (١٤٢٥- ١٤١٧ پ.ز) کچا شاهێ میتانی(ارتاتامایێ ئێکێ) بۆ خۆ ئینا، و فیرعەون أمنحوتێ سیێ (١٤١٧- ١٣٧٩پ.ز) کچا شاهێ شوترنایێ دووێ بۆ خۆ ئینا . ب ڤێ چەندێ ئاهەنگێن دەهواتان جهێ هێرشێن سەربازی گرتن و دەڤەر د تەناهی و ئارامیێ دا ژیا[٥٤]. و ل دەمێ لێگەریانێن شوینواری ل گرێن دەڤەرا بەهدینان (تەل جەمبور، و تەل بەقاق، تەل جیکان) دهاتنە کرن پارچێن شوینواری هاتنە دیتن، مێژوویا وان ڤەدگەرێتەڤە چاخێ حۆرییا (میتانی) کو دهێنە هەژمارتن ژ باشترین جۆرێن گلێنەیێن ب جوانی هاتینە خەملاندن و کۆپێ درێژ ێ ب بنکەهـ ژ هەمییان بەربەلاڤتربوون[٥٥].

ل سالا (٢٠١٠) ێ رێڤەبەریا شوینوارێن دهۆکێ بازێرێ شودوخی یێ میتانی دیتەڤە، کو ناڤێ وی د (تووماریێن) مەلکێ ئاشووری (ئەدد نیراریێ ئێکێ) یێ دناڤبەرا (١٣٠٥- ١٢٧٤ پ.ز) حوکم کری هاتییە[٥٦]، لێ دەسـەلاتـا دەولەتا میتانی ل وی چاخی ب دووماهی نەهاتییە وەکی هندەك مێژوونڤیس دبێژن و دەڤەر هەر ل ژێر دەستەلاتا دەولەتا میتانی ڤەبوو، تا مەلکێ ئاشووری (تجلات بلاصر) هێرشەکا ب هێزا لەشکەری ل دەور و بەرێن سالا (١١٠٠ پ.ز ) ێ ئینایە سەر دەڤەرێ. ب ڤێ چەندێ دەولەتا ئاشووری دەڤەر داگیر کر و کەتە ژێر دەستێ وان، هەر چەند خەلکێ وێ گەلەك بەرهەلستکاری کر، لێ ئاشوریان ب دژواری ئەو سەرکوتکرن .

## شەشەم: دەڤەر دەمێ هزارا ئێکێ پێشی زایینی دا[٥٧]

دڤی سەردەمیدا دەڤەر یا تووشی گەلەك هێرشێن سەربازی و راگوهاستنێن ب کۆمێن ئاشووریان بووی، دەمی ئاشووریان ل سەر دەمێ مەلکێ ئاشووری (ادد - نراریێ دووێ ) (٩١١- ٨٩١ پ.ز) خۆ ب هێز دیتی. خۆ بەرهەڤکرن بۆ هێرشێن سەربازی بۆ سەر هەمی لایان دا جارەکادی زال ببن ل سەر دەڤەرێ و هێزا خۆ بۆ وان دیار بکەن[٥٨]، و دەمێ مەلکێ ئاشووری (ناصر بالێ دووێ) حوکم گرتییە دەست (٨٨٣- ٨٥٩ پ.ز) دەست ب نیشادانا هێزا خۆ ل دەڤەرێ کر[٥٩]، و رابوو ب هێرشەکێ ل سەر وەلاتێ خلدیا (ئورارتو) و ل سەر وەلاتێ نائیری و کرخی و شوباری و شیبا دەستێ خۆ دانیتە سەر[٦٠]، و پشتی مرنا وی کورێ وی (شیلمنصرێ سیێ ) (٨٥٨ – ٨٢٤ پ.ز) حوکم ل وەلاتێ ئاشۆر وەرگرت، و ل وی دەمی خەلکێ وان دەڤەرێن ئاشووریان ئەو ئێخستینە ژێر دەستێ خۆ شیان خۆ ژ حوکمدارێن خۆ یێن ئاشووری رزگار بکەن، و هەر زوی هێزێن ئورارتی هێرش برنە سەر لەشکەرگەهێن ئاشووریان، ئەڤێ چەندێ مەلکێ ئاشوورێ نوی پالدا ل سالا سیێ ژ حوکمێ خۆ (٨٥٥ پ.ز) هێزەکێ بەرهەڤ بکەت بۆ سەر وەلاتێ ئورارتو کو دەڤەرا بەهدینان ب خۆ ڤە دگرت، ژ زاخۆ تا رووبارێن زێیێ مەزن و بەرەڤ باکوور تا دەریاچا وانێ و تا بازێرکێ رەواندز ل لایێ باشووری ڤە[٦١].

شاهێ ئاشووری (تجلات بلاتبلیزرێ سیێ) رابوو ب هێرشەکا لەشکەریا بەرفرەهـ بۆ سەر دەڤەرێ و ئەو چەند ل سەر نەخشەبەرێ سەر ملا مەرگێ یا نڤیسی، و ل سالا (٧١٤ پ .ز) هێرشەکا لەشکەری ب فەرماندەیا مەلکێ ئاشووری(سرجونێ دووێ) (٧٢١- ٧٠٥پ.ز) یا برییە سەر ئورارتو د رێکا دەڤەرێ دا[٦٢].

شاهێ ئاشووری (سنحاریب) یێ رابووی ب دانانا

گەلەك پرۆژێن ئاڤدانێ وب دروستكرنا پەیكەرێن گەلەك جوان ل دەڤەرا بەهدینان، مینا نەخشەبەرێن خنس و نەخشەبەرێن شكەفتا هەلامەتا و پەیكەرێن شیر ملكاپا و دیسان یێ رابووی ب گەلەك هێرشێن لەشكەری بۆ سەر دەڤەرێ.دچاخێ مەلكێ ئاشووری (اسرحدون)ی دا (٦٨١-٦٦٩ پ.ز) و ژ ئەنجامێ سیاسەتا ئاشتبوونێ، كو دگەل مللەتێن دەڤەرێ پەیرەو دكر، دەڤەرێ ڤەژینەك بخۆڤە دیت، و پشتەڤانییەكا لەشكەری پێشكێشی میدییان كر[٦٣]، و هەڤپەیمانییەك دگەل وان كر، دا ژ سنوورێن خۆ یێن رۆژهەلاتی پشتراست ببن و دا مفای ژ هێزا وان وەرگرن[٦٤]، و دەمێ مەلكێ ئاشووری (ئاشۆر بانیبال) (٦٦٨- ٦٢٧ پ.ز) هاتییە سەر دەستەلاتا حوكمی، ڤێ ئاشتبوونێ گەلەك نە ڤەكێشا. و ل سالا (٦٥٨ پ.ز) و دهێرشەكا چاڤترساندنێ دا برە سەر میدیا و سەرۆكێن وان(*) شكاندن و وەكی ئێخسیر (دیل) برنە باژێرێ نەینەوا و ل پشتی هینگێ كوشتن[٦٥].

هەرچەند ئیمپەراتۆریا ئاشووری گەلەك یا ب هێز بوو، و گەلەك هێرشێن لەشكەری ب فەرماندەییا مەلكێن وان دهاتنە كرن و شیان دەستێ خۆ تا دەڤەرێن رۆژهەلاتا دوورێ كەڤن، لێ هەر زوی و ل پشتی مرنا (ئاشوور بانیبال)ی دەستەلاتێ ئیمبراتوریێ بەرەف هەرفینێ چوو. پشتی كو ئالوزی دروست بووین مللەتێن وان سەربەخۆییا خۆ وەرگرتن . وی دەمی كلدانییان ژی شۆرشا خۆ ل وەلاتێ بابل ب سەرۆكاتییا (نبوبلاصر)دەست پێ كرن، و (فینیقی) و فلستین رازی نەبوون ب میننە ل ژێر دەستێ ئاشوورییان و میدیان سەربەخۆیا خۆ ژ ئیمپەراتۆریێ وەرگرتن، ل وێ چەندێ ژی نە راوەستیان بەلكی خۆ بەرهەڤكرن كو هێرشەكێ بكەنە سەر ئاشوورییان، و هەر ل زوی میدی و بابلی رێككەفتن كو شەرەكی دژی ئاشوورییان ل سالا (٦١٦ پ.ز) رابكەهین[٦٦]، و مەلكی میدی (كی – أخسار) شیا بۆ جارا ئێكێ ل سالا (٦١٤ پ.ز) دەستێ خۆ دانیتە سەر باژێرێ ئاشۆر، و هەڤپەیمانییەك دگەل مەلكێ بابل (نبو بلاصر) كر. وێ هەڤپەیمانیێ ئەو گەهاندنە وێ چەندێ كو (أمیتس) كچا (كی أخسار) شوی ب كورێ (نبوبو لاصر)ی شوینگرێ تەختێ شاهینیێ بابل بكەت[٦٧]، و پشتی دو سالان میدی شیان هێرشەكێ ب هاریكارییا بابلییان بكەنە سەر باژێرێ نەینەوا پایتەختێ ئاشوورییان و شیان ل سالا (٦١٢ پ.ز) دەستێ خۆ داننە سەر[٦٨]. ب ڤێ چەندێ شانشینا میدیان بەرفرەهـ بوو، تا گەهشتییە كویراتییا ئاخا ئاسیا بچویك[٦٩]. و پشتی ئەخمینی (٥٣٩ – ٣٣١ پ.ز) شیاین دەستێ خۆ داننە سەر دەولەتا میدی[٧٠]. شیبا ل دەور و بەرێن سالا (٥٤٧پ . ز) دەستەلاتێ ل دەڤەرێ هەمیێ بگریتەبەر[٧١]. ب ڤێ چەندێ وەلاتێ ئاشوور و شام و فلستین و بابل هەمی كەتنە ژێر دەستهەلاتا وان.

ل سالا (٤٠١ پ.ز) ی فەرماندە و مێژوونڤیسی یونانی (زەینەفون) یێ ددەڤەرا بەهدینان را دەرباس بووی[٧٢]، و دەمێ دگەلیێ زاخۆ را دەربازبووی، دەڤەرێ وەسان سالۆخەت ددەت، كو دەڤەرەكا ئاسێ یە و مللەتەك ب ناڤێ كاردۆخی یان كورد لێ دژین[٧٣]، و پەسنا وان ب قەهرەمان دكەت و جارەكێ هێرشەكا سەدو بیست هزار لەشكەری بریوو سەر وان، لێ كەس ژ وان نەژڤری بوو[٧٤]. دیسان دەڤەر ل سالا (٣٣١ پ.ز) یا تووشی یەكەمین شەرێ جیهانی بووی ئەو ژی هێرشا ئەسكەندەرێ مەقدونی (٣٣٦ – ٣٢٣ پ.ز) بوو دوی شەری دا و شەرەكێ دژوار یێ دناڤبەرا لەشكەرێ وی و لەشكەرێ فارسان ب فەرماندەییا (داریوسێ سیێ) دا یێ چێ بووی (٣٣٨ – ٣٣٠پ.ز). و ئەسكەندەر د ڤی شەری دا ب سەركەفت و تەرازییا هێزێ ل وی سەردەمی هاتە گوهارتن[٧٥].

ل دەور و بەرێن سالا (٢٥٠ پ.ز - ٢٢٦ ز) (فور ثی) شیان سەربەخۆییا خۆ وەرگرن و شانشینەكا بچویك بۆ خۆ دروست كرن و پیچ پیچ ل سەر ئاخا سلۆقییان[٧٦] سنوورێن خۆ بەرفرەهكەن، ل داوییا هزارسالییا ئێكێ بەری زایین ساسانی(٢٢٦- ٦٤٠ز) شیان ل سالا (٢٢٤) یان (٢٢٦) فرسییان ژ ناڤببەن[٧٧]، ب ڤێ چەندێ گشت دەڤەر كەتە ژێر دەسەلاتێ وان و وان ژی كرە مەیدانا شەری د ناڤبەرا خۆ و رۆمانیاندا، و دەڤەر كەتە ژێر دەسەلاتێ وان و پەیكەرێن دەرگەهێ بادینان یێ ئامێدیێ ژ شوونەوارێن بەرچاڤێن وی سەردەمینە .

## ژێدەر و پەراوێز:


١. ئامێدی ، کاوه فریق احمد ، امارة بادینان ، دهوك - ٢٠٠٠ ، بپ ٢٤.
٢. المایی : أنور ، الاکراد فی بهدینان ، چ٢ ، دهوك - ٢٠٠٠ ، بپ ٣٨.
٣. ئامێدی ، أماره ، بپ ٢٤.
٤. زکی : محمد امین، تاریخ الدول والامارات الکردیة في العهد الاسلامي ، ترجمة محمد علي عونی ، القاهرة -١٩٤٥، ص ٣٩٩.
٥. المایی ، الاکراد، ص ٣٨.
*. ناڤێ دەریایەکا کەڤنە کو کوردستانا عیراقێ هەمی دچەرخێن جیولوجیێن کەڤن دا ڤەدگرت.
٦. الجنابی : صلاح حمید ، جغرافیة منطقة الموصل ، موسوعة موصل الحضاریة، م ١ زانکویا مووسل - ١٩٩١ ، بپ ٣.
*. پێکهاتەیێن تەخێن ئەردی نە ل کوردستانا عیراقێ هاتینە دیتن و دهێنە هەژمارتن باشترین دیتنێن کەڤری کو ب ناڤێ وان گوندێن لێ هاتینە دیتن ب ناڤ کرینە.
٧. العمري : فاروق صنع الله و علی صادق ، جیولوجیة شمال العراق ، زانکویا مووسل - ١٩٧٧ ، بپ ٦٦
٨. هەمان ژێدەر ، بپ : ٦٤
٩. ابراهیم : غاده محمد سلیم و یێن دی ، مبادئ الجیولوجیا والجیومورفولوجیا ، مؤسسه المعاهد الفنیه - ١٩٨٤ ، بپ ٢٦١
١٠. العمري، جیولوجیة شمال العراق ، بپ ٧٠
١١. هەمان ژێدەر، بپ ١٠٦
١٢. هەمان ژێدەر، بپ : ٦٤
١٣. خصباك، شاکر، العراق الشمالی، بغداد - ١٩٧٣ بث ٢٥- ٣٠
١٤. المایی الاکراد في بهدینان ، بث ٣٩- ٤٠
١٥. دلیل محافظة دهوك ، محافظه دهوك ، بغداد – د . ت ، بث ٤٥
*. گوندەکە ل رۆژهەلاتی زاخۆ سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤە
١٦. هەمان ژێدەر ، ، بپ ٤٦
١٧. سلیمان : عامر و احمد مالك الفتیان ، محاضرات في التاریخ القدیم ، زانکویا مووسل - ١٩٧٨، بپ ٥٣
١٨. هەمان ژێدەر، بپ ٥٣
١٩. هەمان ژێدەر، بپ ٥٤
٢٠. ابو الصوف : بهنام ، تاریخ منطقة الموصل القدیم ، موسوعة موصل الحضاریة، م ١، زانکویا مووسل - ١٩٩١ ، بپ ٣٠
٢١. ابو الصوف: بهنام، تنقیبات انقاذیة شاملة في حوج سد الموصل ١٩٨١- ١٩٨٦، بحوث لآثار حوض سد صدام و بحوث اخری، المؤسسه العامة للاثار والتراث - ١٩٨٧، بپ ٩
٢٢. الشیخ: عادل عبدالله ، بدو الزراعة اولی القری في العراق ، رسالة ماجستیر (نه بەلاڤکریبه) هاتیية پێشکێشکرن بۆ کولیژا
ئاداب زانکویا بەغدا – ١٩٨٥ ، بپ ٣٤- ٣٥
*. شکەفتا شانەدەر: کو دهێتە هەژمارتن مەزنترین و کەڤنترین شکەفت ل دەڤەرێ هاتیە دیتن ، و دکەڤیتە زنجیره چیایێن بەرادوست و زانایێ ئەمریکی رالف سولیکی (Ralph. S. Soleki) لێ کرینە و قەرقوَدێن مرۆڤان تێڤە دیتینە . بۆ پتر پێزانینان بنێره
Soleki: Ralph. S. Three Adult Neanderthal Skeletons from Shanidar Cave, Northern Iraq: .(SUMER, vol: xv11,1961, No: 1& 2), p: 71-96

٢٣. باقر: طه، عصور ما قبل التاريخ في وادي الرافدين على ضوو التنقيبات الاثرية في كوردستان العراق، ( مجلة المجمع العلمي الكردي، م ١٩٧٣، ١ ، ع١) ، بپ ٥٧١ ز و بۆ پتر پێزانینان بنێره: Trinkaus: Erik & T. Dalestewartn, The Shanidar ٣ Neanderthal, (SUMER, vol. XXX VI, P. 9–35 ,1980, NO 1-2,)

٢٤. الجادر : وليد و احمد مالك الفتيان ، طرق التنقيبات الاثرية، زانكويا بەغدا - ١٩٨٣، بپ ٣١٩

٢٥. الدباغ: تقي ووليد الجادر ، عصور قبل التاريخ ، زانكويا بەغدا - ١٩٨٣، بپ ١٢٠

٢٦. باقر: طه يێن دی ، تاريخ العراق القديم ، زانكويا بەغدا - ١٩٨٠، ب١، بپ ٧٨

*. زاوی چەمی ب كوردی واته دەڤەرا زاب - زێ، كو دكەڤیته پەراڤێن زێیێ مەزن ل نێزیكی شانەدەر، بۆ پتر پێزانینان ل سەر ڤی جهی بنێره: Singh: Purushottam, Neolithic Cultures of Western Asia, Second Printing, NewYo-rk-1976, p: 114-121. And : Solecki: R, Excavation Cave, SUMER, vol :XV11, p: 71- 91

٢٧. الملائكه : عصام ، تطور علم الحيوان في الحضارات القديمة ، (سومر، م ١٩٧٤، ٣٠، ج ١- ٢)، بث ١٥

٢٨. سعيد : خليل ، معالم من حضاره وادي الرافدين ، دار البيضاء - ١٩٨٤ ، بث ٢٩

٢٩. باقر: طه و فؤاد سفر، المرشد الى مواطن الاثار والحضاره، الرحلة الخامسة بغداد - اربيل - بغداد - ١٩٦٦، بث ١٩

٣٠. الجادر: وليد، العمارة حتى عصر فجر السلالات، موسوعة حضارة العراق، بەغدا - ١٩٨٥، ب ٣، بث ٧٨

٣١. العاني: عماد طارق توفيق، الصناعات الحجرية في العراق من نهاية العصر الحجري الحديث، نامەكا نەبلاڤكريا ماجستێرێ یە، یا پێشكێشی كولیژا ئادابێ، زانكويا بەغدا كری - ١٩٨٦، بپ ٥٥

*. نەمریك: د زمانێ كوردی دا دهێت ب واتایا هەرمان، واته گوندێ هەر مایی، جهێ نەمریك ٩ ژ لایێ شاندەكێ پولونیێ سەر ب زانكویا وارشو ڤە هاتییە دیتن دەمێ لێگەریانا جهێن پێش زایین دا دكرن ل بهارا سالا ١٩٨٥ێ، ئەڤ جهە دكەڤیته لایێ باشووری رۆژئاڤا ژ دەڤەرا بادینان ب دویراتیا (٢كم) ژ پەراڤێ رۆژهەلاتا رووبارێ دیجله، و دكەڤیته رۆژئاڤایێ باژێرێ فەیدیێ سەر ب پارێزگەها دهۆكێ ڤە ب دویراتیا (٤كم) و ب دویراتیا (٥٠كم) ژ باكوورێ رۆژئاڤایێ باژێرێ مووسل ڤە. بنێره :

٣٢. Kozlowski: Stefan Karol & Karol szmcak, Pre - Neolithic site Nemrik 9, Researchs on the Antiquities of Saddam Dam basin salvage and other researches, information state organization of Antiquities, 1987, p:10

٣٣. كوسلوفسكی: ستیفان كاروك و كارول شامزاك، نمریك ٩، وەرگێران رافیده عەبدوللا عەبدولسەمەد، گوڤارا هزار مێرد، ژ ١٣، سلێمانی - ٢٠٠٠، بپ ١٧٧

*. تەل جیكان دكەڤیتەباشوورێ ناحیا فەیدیێ ب دویراتییا ١٠ كم ، ل وی جهێ رووبارێ بەقافا دگەهیته رووبارێ دیجله ، بلندترین خال ل وێرێ (١٤م) ل سەر رویێ دەریایێ. درێژاهیيا وی ژ باكووری تا باشووری نێزیكی ٥٥٠ م . لێگەریان ل وێرێ ل دووماهییا هاڤینا ١٩٨١ ێ دەست پێ كرن و ژ بەر فرەهیا گرێ، گەلەك شاندێن عیراقی و بیانی هەلكۆلین لێ كرن .

*. چەرخێ حلف: - قۆناغا سیێ ژ چەرخێ بەردینێ كانزایی ب ڤی ناڤی هاته ب ناڤكرن ، ل سەر ناڤێ حلف (كوزانا) كو دكەڤیته نێزیكی گوندێ راس العین - سەروكانی) ل سەر سنوورێن سۆریا - تركیا كو تێدا رەنگە (فخارەكێ) نه مینا هەمی (فخاران) دیتین . بنێره : باقر، تاريخ العراق، ب١ ، بپ ٩٠- ٩١

٣٤. الاسود : حكمت بشير ، التنقيب في تل جيكان، بحوث لآثار حوض صدام ، المؤسسه العامه للاثار والتراث - ١٩٨٧ ، بث ٨٧

*. تەل جەمبور: پەیڤەكا كوردی یە، یا پێك هاتییە ژ دوو برگان (جەم بور) واته ئەردێ دێم، یان بێ ب زاخ ، دكەڤیته باشوورێ رۆژهەلاتی باژێرێ فەیدیێ ب دویراتیا ٦كم، ل سالا ١٩٨١ هەلكۆلین لێ هاتنه كرن، ژ بەر كەتنا وێ ل سەر رێكا نوی یا دهۆك - مووسل، كو ئەو جه دبیت ژ بەر رێكێ بهێته برین و ب تمامی ژ ناڤ بچن.

٣٥. يوسف: كريم توما، التنقيب فی تل جمبور، بحوث لآثار حوض سد صدام، المؤسسه العامه للاثار والتراث - ١٩٨٧، بث ٢٥

*. تەل بەقاق : ناڤەكێ كوردی یە ، ب واتایا گرێ بەقا ، چونكی دكەڤیته هنداڤی رووباركێ بەقاقا ، كو گەلەك گیا و قەرەم و باغ و بیستان لێ هەنه ، و گەلەك بەق دهێنه وێرێ .

٣٦. يوسف: كريم توما، التنقيب فی بقاق (١)، بحوث لآثار حوض سد صدام ، المؤسسة العامة للاثار والتراث - ١٩٨٧ ، بث ٣٩

* . سۆمەری: کەڤنترین مللەتن ل وەلاتێ دۆلا دو رووبارن دا ژیاین. کەسێن تایبەتمەند بیروراێن جودا ل سەر بنیات و وەلاتێ وان هەبوون، لێ باراپتر ئەو خەلکێ کوردستانا کەڤنن و یێن مشەخت بووینە لایێ باشووری ژ عیراقێ، ژ بەر گەلەکیا مرۆڤان بەرامبەر داهاتێن بەرهەمێن خوارنێ ل دەڤەرێ. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: رشید: فوزي، قواعد اللغة السومرية، بغداد- ١٩٧٢، بپ ٢٦. دیسان بنێرە: Jacobsen : Thorkild , Sumer , PEAC , London – 1980 , p : 72-83

٣٧. احمد : جمال رشید ، دراسات كردية في بلاد سوبارتوم ، بغداد – ١٩٨٤ ، بث ٣

٣٨. زیباری: محمد صالح زيباري، دهوك عبر العصور التاريخية القديمة(٢٥٠٠ پ.ز- ١٤١ ز) گۆڤارا دهۆك، ژماره١، دهۆك ١٩٩٧، بپ ٧٢

٣٩. الاحمد : سامي سعيد ، المستعمرات الاشورية في اسيا الصغرى ، (سومر، م ١٩٧٧، ٣٣، ج١) ، بث ٧٣

٤٠. باقر: طه و فؤاد سفر ، المرشد الى مواطن الاثار والحضارة، الرحلة الثالثه بغداد - الموصل ، بغداد - ١٩٦٦ ، بث ٤٥

٤١. يوسف ، التنقيب في تل جمبور ، بث ٢٥

٤٢. اسماعیل : بهيجة خليل، المستعمرات التجاريه الاشورية في الاناضول، گۆڤارا (النفط والتنمية، سالا شەشێ، ١٩٨١، ژ ٨-٩)، بپ ٥٢-٥٣. هەروەسان: فرانكفورت: هنري، فجر الحضارة في الشرق الادنى، وەرگێران میخائيل خۆری، بیروت- ١٩٥٩، بپ ٩٤

٤٣. الحلو: عبدالله، صراع الممالك في التاريخ السوري القديم (مابين العصر السومري وسقوط المملكة التدمرية، بيروت - ١٩٩٩، بپ ١٠٧

* . باستکێ : گرەکێ شوینواری یە ، ب ناڤێ وی گوندێ گر دکەڤیتێ ی ناڤ کرییە ، کو دکەڤیتە رۆژئاڤایێ وێ و رێکا سەرەکیا دهۆك – زاخو دبەررا دەرباز دبیت .

٤٤. AL – Fouadi: Abdul – Hadi, Bassetki Statue, SUMER, vol XXX11, No 1 &11, P: 63, 64 ,1976.

٤٥. مظلوم: طارق عبد الوهاب، دراسة لتمثال اكدي من البرونز ، (سومر، م ١٩٧٦، ٣٢، ج ١- ٢) ، بپ ٤٥

٤٦. رشید: فوزي، دراسة لولية لتمثال باسطكي، (سومر، م ١٩٧٦، ٣٢، ج ١- ٢) ، بپ ٥٣- ٥٦

٤٧. الاحمد: سامي سعيد، فترة العصر الكاشي، (سومر، م ١٩٨٣، ٣٩، ج ١- ٢) ، بپ ١٣٥

٤٨. الاحمد سامي سعيد، العراق القديم ( من العصر الاكدي حتى نهاية سلالة بابل الاولى ، بغداد - ١٩٨٣، ج٢ ، بث ١١٩

٤٩. اسماعيل ، المستعمرات التجارية، بث ٥٤

* . حۆری: مللەتەکێ چیایی یە، هەر ل دەستپێکا هزارا دووێ پ. ز ل پشکا باکووری ژ عیراق و سوریا دژیان. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: فيلهلم: جونوت ، الحوريون ، ترجمه فاروق اسماعيل، ط١، حلب - ٢٠٠٠، بپ ٢٥- ٢٤

٥٠. شيت : ازهار هاشم ، علاقة بلاد أشور مع بلاد الاناضول خلال الالفين الثاني والاول ق . م ، ناما ماستەرێ (نە بەلاڤ کری) هاتییە پێشکێشکرن بۆ کولیژا ئادابێ زانکویا مووسل - ١٩٩٦ ، بپ ٢٤

٥١. زیباری، دهوك عبر العصور ، بث ٧٣

* . ئاشووری مللەتەکە د بنەرەت دا خەلکێ نیمچە دۆرگەها عەرەبی نە ، پاشی یێن دەست پێ کرین ژ وێرێ رابووین و مشەخت بووینە وەلاتێ شامێ ، و ل دەڤەرێن باکوورێ ژ وەلاتێ دۆلا هەردو رووباران دا ئاکنجی بووین ، و چ بەلگەیێن دیرۆکی ل بەر دەست نینن وێ چەندێ ب سەلمینن کو پەیوەندیا وان ب پەیڤا (أثور) ڤە هەبن. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: سليمان: عامر واحمد مالك الفتيان، محاضرات في التاريخ القديم ، زانكویا مووسل – ١٩٧٨ ، بپ ١٤٣

٥٢. ادزارد: اتو ، العصر البابلي القديم، الشرق الادنى الحضارات المبكرة، ترجمة عامر سليمان ، زانكویا مووسل - ١٩٨٦، بپ١٨٨

هەروەسان بنێرە: Ozgug: Nimet, Assyrian Trade Colonies in Anatolia, ARCHEOLOGY, vol 22, 1969, NO 4 , p: 250- 255

* . مللەتەکێ چیاییە ، ل دەڤەرێن باکووری ژ وەلاتێ دۆلا هەردو رووباران یێن ئاکنجی بووین و ل هزارا دووێ پ . ز تا چەرخێ چاردێ پ . ز ل کوپیتکا هێزا خۆ بوون و دهێنە هەژمارتن ژ مللەتێن هندو ئەورویی . بۆ پتر پێزانینان بنێرە: Grayson A.K.,Mitanni,PEAC,London-1980,p:109 and 110.

٥٣. زیباری ، دهوك عبر العصور ، بث ٧٣

٥٤. فرحان: وليد محمد صالح، الصراع الدولي في الشرق الادنى بين القرنين الخامس عشر والثالث قبل الميلاد ، گۆڤارا (أداب

الرافدين، زانكويا مووسل - ١٩٧٩ ، ژ (١) ، بپ ٢٢٣ .
٥٥. لويد سيتون، أثار بلاد الرافدين ، ترجمة سامي سعيد الاحمد ، بيروت - ١٩٨٠ ، بث ٢٠٨
٥٦. GRAYSON: KIRK, Assyrian Rulers of the Third and Second Millennia B.C TO 1115 BC, V 1 University of Toronto, London–1987, p.131
٥٧. ساكز ، قوة أشور ، بث ١٣٠
٥٨. باقر و يێن دی ، تاريخ ، بپ ٢٣١
٥٩. ساكز ، قوه أشور ، بث ١٠٩
٦٠. امين، محمود، مسلتا طوبزاوة و كێله شين ، (سومر، م ١٩٥٢، ٨، ج١) بپ ٥٥
٦١. امين ، مسلتا طوبزاوه ، بپ ٥٥- ٥٦
٦٢. ساكز ، قوه أشور ، بث ١٣٧- ١٣٩
٦٣. الدوري : رياض عبد الرحمن امين ، أشور بانيبال ... سيرتة و منجزاتة، بەغدا - ٢٠٠١ ، بث ٢٨
٦٤. اسماعيل : شعلان كامل ، العلاقات الدولية في العصور العراقية القديمة، نامەيا ماجستێرێ (نە بەلاڤكرى)، يا هاتييە پێشكێش كرن بۆ كولیژا ئادابێ زانكويا مووسل - ١٩٩٠ ، بپ ٥٢
*. ميدى: هۆزێن هندو - ئارى نە ، ناڤێ وان دنڤیسینێن ئاشووریيان دا ل نێزیكى سالا (٨٣٦ پ.ز) یێ هاتی، و ئەو هینگێ ل دەڤەرێن
دكەڤنە باشوورێ دەرياچا ئورمیێ دژیان، و كورد دهێنە هەژمارتن كو نەڤیێن وانن. بۆ پتر پێزانينان بنێرە : مینورسكی ، الاكراد احفاد الميديين، گوڤارا كۆرى زانيارى كورد ، م ١٩٧٣، ١، ژ ١) بپ ٥٥٢ - ٥٦٣
٦٥. اسماعيل، العلاقات الدولية ، بث ٩٣- ٩٤
٦٦. بايك : أى. روستن، قصة الاثار الاشورية ، ترجمة يوسف داود عبدالقادر ، بەغدا - ١٩٧٢ ، بث ١٣٢
٦٧. عصفور : محمد ابو المحاسن ، معالم تاريخ الشرق الادنى القديم ، بيروت - بلا ، بث ٣٨٤
٦٨. مينورسكى، الاكراد ، بث ٥٥٧ ، ٥٥٦
٦٩. هەمان ژێدەر ، بپ ٥٥٧
٧٠. ابراهيم : جابر خليل ، منطقة الموصل في فترة الاحتلال الاجنبي (الاخميني ، السلوقي، والفرثي) ، موسوعة موصل الحضارية، م١، زانكويا مووسل – ١٩٩١ ، بپ ١٢٨
٧١. هەمان ژێدەر ، بپ ١٢٨
٧٢. الزيبارى: دهوك عبر العصور، بپ ٧٥
٧٣. LIOYD : Setin , Twin Rivers , Oxford – 1961 , p 87
٧٤. زينوفون، حملة العشرة الاف ، ترجمة يعقوب افرام منصور ، بەغدا - ١٩٨٥، بث ١٦٦
٧٥. العسلي: بسام ، الاسكندر الكبير (المقدونى)، چ١، بيروت - ١٩٨٠ ، بث ٧٧ - ٨١
٧٦. سعيد: مؤيد، العراق خلال عصور الاحتلال (الاخميني، السلوقي، الفرثي، الساساني) موسوعة العراق في التاريخ، بەغدا-١٩٨٣،
بث ٢٥٥
٧٧. محل: سالم احمد، منطقة الموصل تحت وطأه الاحتلال الساساني، موسوعة الموصل الحضارية، م ١، زانكويا مووسل - ١٩٩١ ، بپ ١٤٥ .

# باندۆر و ڤەرێژا
# تێکهەلبوونا شارستانییا میتانی ـ ئورارتی
# ل سەر دەڤەرا بەهدینان

**کوڤان ئیحسان یاسین**

بێ دو دلی هەردو تێگەهێن ئەم بەحس دکەین، جهێ بالکێشێ، دبیت ژی جهێ رەخنێ بن، ژبەرکو ژ ڤەرێژا گڤاشتنێ ڤێککەفتن دروست دبیت، ل دووماهیێ دبیتە شەرەنیخا شارستانی د ناڤبەرا مللەتێن جودا دا، لێ د راستی دا کوردستان ب رەنگەکێ گشتی و دەڤەرا بەهدینان ب رەنگەکێ تایبەت جهێ بالکێشییا چەند مللەتان بوو. ژ ڤەرێژا ڤان گڤاشتن و ڤێککەفتنا د ناڤبەرا مرۆڤان دا دروست بووی، شیا چەند چەق و چمبلێن شارستانی ب دەتە دەڤەرێ، نەخاسمە ل هزارا دووێ بەری زایینی.

بەختێ مە یێ سپی ئەڤ تێگەهە و ناڤێن مە وەرگرتین بۆ شرۆڤەکرنا ڤی بابەتی، هەمی ب روحن و بەردەوامن د گەل خەلکی دا، بەلکو یێن بووینە کلتورەکێ گۆتی بێی ئەم رهـ و ریشالێن وان دیارکەین و بزانین، دیسان مە بزاڤ کرییە چەند تێکستێن بزماری شرۆڤەبکەین بۆ نێزیکبوونا ڤان تێگەها (هەر چ نەبیت ئەو قەد و پەیڤێن نێزیکی ئەوان پەیڤا)، ل دووماهیێ ئەم گەهشتینە چارچۆڤەکێ هزری نەك جوگرافی بۆ تێگەهشتنا سەمتا باندۆرا (کێنجێ) هەردو شارستانیەتێن میتانی و ئورارتی ل سەر دەڤەرا بەهدینان، ئەوژی ب رێکا چەند هەڤبەرکرنەکان چ ژ رەخێ ئاڤاهی بیت یان ئەو پەیڤێن ماین و دهێنە گۆتن.

## تێکهەلبوونا شارستانی چی یە؟

کەسێ ئێکێ ب ئەڤێ هزرێ ئاخفتی بیرمەندێ فەرەنسی (رۆجیە گارۆدی) بوو، ل دووڤ بیردۆزا خۆ یا بەرکەفتی و پرۆژەیێ خۆ بۆ کۆمکرنا هەمی شارستانییەتان ل سەر شەنگستێن هەڤپشکی د ئەردیدا، پاشی سەرۆکێ ئیرانێ (محەمەد خاتەمی) بیردۆزا گەنگەشا شارستانی ل ئەیلولا سالا (١٩٩٧ز) ێ ل بارەگایێ نەتەوەیێن ئێککرتی هاڤێتنە د مەیدانێدا، ئەو د بینیت گەنگەشا شارستانی رێکا ژ هەمیان باشترە بۆ خرڤەکرنا شارستانییەتا، پاشی ب مەرەما نێزیککرنا شارستانییەتان کۆمەکا کونگرە وکونفرانسان هاتنە گرێدان، ،

ڤەرێژا ڤێ چەندێ دەرکەفتنا کۆمەکا هەلشکافتن و پەرتووکان بوو، ب مەرەما خۆشکرنا رێکێن گەنگەشەکرنێ د ناڤبەرا شارستانیەتێن دنیایێ[1].

## تێگەهـ و مەرەم:

ل دووڤ شەنگستێن تێکهەلبوونا شارستانی یا نوی، شیرەتکرن و تێکهەلبوونا رەوشەنبیرییە د ناڤبەرا مللەتاندا، چاوانیا خۆ گونجاندن د گەل هزرێن هەڤدژ، سەرەدەری کرن دگەل بیروباوەرێن رەوشەنبیری و دینی و سیاسی. ئارمانج ژێ نیاسین و بەردەوامی و تێکەلبوون[٢] و خۆ دوورکرنە ژ دژایەتی کرنێ[٣].

هەکە ئەم بنێرینە ڤێککەفتنا شارستانی دێ بینین ل سالا (١٩٩٠)زێ و پشتی ژناڤچوونا ئێکەتییا سوڤیەتی، ئەڤ تێگەهە دەرکەفتییە، پاشی د پەرتووکا بیرمەندێ یابانی (فرەنسیس فوکویامای- نفشێ وی ئەمریکی یە) ب روهنی بەحسێ ڤێ هزرێ کرییە. ل بەراهیا سالێن نۆتاندا بیرمەندێ ئەمریکی (صموئیل هنتنگتون) ئەڤ هزرە ئێخستییە دناڤ خەلکیدا، پەرتووکا خۆ (شەرەنیخا شارستانیەتێ) بەلاڤ کرییە[٤].

ب ڤی رەنگی ل سەردەمێن نوی هزرا تێکەلبوونا شارستانی دەرکەفتییە، ئەم دشێن بێژین هەر ئەڤ پیڤەرێن زانستی نە بۆ هزرا کەڤن ژی دەردکەڤن، هەر چەندە ل هزرێن کەڤن ژێبرنا یێ بەرامبەر هزرەك و کارەکێ ڤەکری بوو، لێ ل هندەك دەما دەمێ ب سەرداگرتنا یێ بەرامبەر و ژ ڤەرێژا تێکهەلبۆنێ گەلەك ڤەرێژێن شارستانی یێن جوان د هاتنە دروست کرن.

## ناڤێ چیایێ مەتین و ڤەرێژا شارستانیەتا میتانی:

پشتی دەولەتا حوری[٥] نێزیکی ژناڤچوونێ بووی، دەولەتەکا ب هێز رابوو، ناڤێ وێ (میتانی) بوو. پتریا خەلکێ وێ هەر حوری بوون، ژ ناڤێن سەرکێش و میرێن وان دیار دبیت، نفشێ وان هند و ئەوروپی بوون،

وێنەیێ (١)

نەخشەیێ بەلاڤبوونا میتانیا و دیارە دەڤەرا بەهدینا پشکەك بوو ژ تۆخیبێن وان.




ژێدەر: ئەنترنێت

ئەڤ چەندە ژی ژ ناڤێن خوداوەندێن وان دیار دبیت. نەخاسمە خوداوەندا (میترا و فارۆنا و ئەندرا)[٦] .

ناڤێ وان د تەوراتێ دا ب (حۆریت) هاتییە[٧] ، دەورەكێ مەزن ل دەڤەرێ گێرایە، نەخاسمە ل كوردستانا كەڤن.

ژ وەلاتێ خۆ یێ كەڤن باكوورێ قەفقاسێ مشەختی كوردستانا كەڤن بووینە[٨] .

نڤێسەر (ئەنور مائی) د پەرتووكا خۆدا (الاكراد في بهدینان) دبێژیت: چیایێ مەتینا ئەڤێ ژ زێبارێ دەست پێ دكەتن تا رۆژئاڤای خابووری، دبیت ناڤێ وی ڤەگەریت بۆ هەیامێ حكۆمەتا میتانییا[٩]، ئەرێ میتانی كی نە و ژ كیڤە هاتینە و ناڤێ وان ژ كیڤە هاتییە؟ د راستی دا تا ئەڤرۆ ڤەكۆلەر نەگەهشتینە بنواشێ دروستێ ناڤێ میتانییا، گەلەك رەنگا دەردكەڤیت د نڤیسینێن بزماری (مسماری-coneform)دا، وەك (مایتا-maitta)، پاشی پاشگرێ (ni) ل سەر هاتییە زێدەكرن، تا دبیتە (مایتانی-maittani)، پاشی بۆرینا دەمی بوویە (میتانی-mittani)[١٠].

دیسان ناڤێ میتانییا هاتییە گرێدان ب ناڤێ (خانیكلبات hanikalbat)، هاتییە گرێدان ب ناڤێ (خۆری-hurri)، وەكی بەری نها مە بەحس كری، د ژێدەرێن كەنعانی و عبری دا، ناڤێ وێ ب (نخریما و نهریما و ئارام نهرایم) هاتییە، دیارە هەر ئێك ژ ئەڤانا رامانەكا تایبەت ل دەڤ میتانییا هەیە، نیڤشكێ ڤان ناڤا ئەوە تێگەهێ (میتانی) د هاتە گۆتن بۆ مەملەكەتەكا سیاسی[١١] .

جوداهی دناڤبەرا ناڤێ میتانی و ناڤێ خۆری یا دا تنێ د ناڤادایە، ئەگەر نە هەردو ئێك حكۆمەتن، دیسان سەركردەیێن میتانییا ل ئەوان جها دەسەلاتداری كرییە یێن حوری لێ خۆجهـ، دەركەفتنا گەلەك ناڤێن خودایێن میتانییا ل دەڤ خۆریا پشت راستییەكێ دەتە ڤەكۆلەرا هەردو مللەت ئێكن، وەك

وێنەیێ (٢)
دیمەنەك ژ چیایێ مەتینی ئەڤێ ڤەدگەریتە هەیامێت میتانیا.



ژێدەر: ڤەكۆلەر

دەركەفتنا خوداوەندێ میتانی(میترا-mittra)[12] .

پتریبا ڤان ناڤا (مەرەم گرێدای میتانی و خۆری و حتتی یا) بۆ مە ژ نامەیێن (تل عمارنە) ژ مسرێ دهێن، ئەو ژی كۆمەكا نامەیێن دبلوماسینە د ناڤبەرا فرعەونێن مسرێ و شاهێن ئاشووری و حتتی و میتانی، ب تایبەت ل هەیامێ فرعەون (ئەمنوفسێ سێ و چوارێ-ئەخناتون)[13].

ئەگەر ئەم خواندنەكێ بۆ ئەڤان ناڤ و تێكەها بكەین دێ بینین پتریبا وان نێزیكی ناڤێ چیایێ (مەتین-mattin)یە، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەم ب دوور نزانین ناڤێ ڤی چیایی ڤەگەریت بۆ هەیامێ حوكمێ میتانیا.

ئەرێ دەڤەرا چیایێ مەتینی دكەڤیتە دناڤ توخیبێن دەڤەر و حكۆمەتا میتانییاندا؟ ل دەمێ دەركەفتنا دەولەتا میتانی ل سەدسالییا پازدێ بەری زایینی گەلەك هەڤركیێن سیاسی ل دەڤەرێ هەبوون[14].

پاشی ئەو شیا ب رێكا جهێ خۆ یێ گرنگ دەست دانیتە سەر گەلەك مەلبەندێن بازرگانی، هوسا د گۆرەپانا سیاسی دا ببوو هێزەكا خودان باندۆر، ئەو بۆ توخیبێن وێ یێن جوگرافی ژ سرتا چیایێن ناڤبەرا رووبارێ دیجلە و فوراتی دەست پێدكر تا باشوورێ چیایێ زاگروسی[15] .

تێكەهێ جوگرافیێ میتانییا دگەهشتە دەڤەرا ئەربخا (كەركووكا نها)، چەند دەڤەرێن دی ژ دۆلا دو رووبارا[16] .

بێ دو دلی ئەگەر ئەم بنێرینە توخیبێن وان یێن جوگرافی، چیایێ مەتینا ژی پشكەكە ژ ئەوێ ئیمبراتوریەتێ، تنێ ناڤێ چیایێ مەتینی یێ روهنە ل سەر هەبوونا میتانییا ل دەڤەرێ، نەدووره ئەگەر هەلشكافتنێن زمانڤانی - شوینواری ل دەڤەرێن جودا یێن چیایێ مەتینی بهێنە كرن، گەلەك پێزانینێن ژهەژی ب دەنە بەر دەستێ مە، پشتی ڤێ ڤەكۆلینێ پتر دیاردبیت دەسەلاتا میتانییا گەهشتییە دەڤەرێ، بۆ دەمەكێ درێژ دەڤەرا سپنەی و چیایێن گارە و مەتین پشكەك بوون ژ دەولەتا میتانی و تا ئەڤرۆ ئەڤ ناڤە مایە.

# ناڤێ چیایێ گارەی و خواندنەك د تێكستێن بزماری دا:

## چیایێ گارەی د تێكستێن میخی (بزماری) دا.

گارە سرتەكا چیایی یە دكەڤیتە لایێ باشوور و رۆژهەلاتا سپنەیێ بەهدینان، یان ئەو سرتا چیایی یە ئەوا د گەل سرتا چیایێ مەتینی نهالا سپنەیێ بەهدینان پێك دئینیت، هەر چەندە ناڤێ وی ل گەلەك جها دهێت گوهۆرین لێ چاوابیت ل دەڤەرا دۆسكیبا و پاشی سیارەتویكا و چەمانكێ دەست پێ دكەتن و بەرەڤ سەرسنكێ و دەڤەرا بەرێنگارەی تا دگەهیتە ناحیا دێرەلوكێ، بەردەوام دبیت. ژێدەرەكێ ژیارێ باشە ژ كەڤن و نها بۆ گژوگیای، د گەل سحرا ئەڤی چیای ژ لایێ گەریان و گوزاریڤە، تا توخیبەكی بالكێشیا وی خۆ ل سەرێ سەركردە و مەلیكا دایە كو بنەكۆكا خۆیا گەریان و گوزاری لێ پالین بكەن، هەلبەت گژوگیایێ چیایێ گارەی بۆ دو مەرەما دهاتە بكارئینان مەرەما خوارنا وان وەكی گیایێن سترك و رێڤاس و ترشۆك و بۆ مەرەمێن ساخلەمیێ دهاتە بكارئینان.

ژێدەرێ ژ هەمیا كەڤنتر ئاڤری دایە ناڤێ چیایێ (گارە)ی، بۆ چیرۆكێن ژیانا پەرستڤانێ (كاهن) مەسیحی (مار زەیا) دزڤریتەڤە، ب تایبەت ئەو چیرۆكێن ل سالا (٣٠٩ز) نڤیسین، مەعنا وێ ئەوە كو بەری (١٧٠٤) سالا ژ نها ناڤێ ڤی چیای هەر (گارە) بوو، هەر وەكی د (تشیعیتێن مار زەیا) دا هاتی كو ل سالا (٣٠٩ز)ێ مار زەیای دینداری ل وێرێ بەلاڤ كرییە و هاتن و چوون ل وێرێ كرییە[17]، هەلبەت ئەڤە جهێ دینپەرستێن فەلایە، ڤی جهی پیرۆزیبا خۆ ل دەڤ موسلمان و فەلا هەیە و تا ئەڤرۆكە ئەو پیرۆزییە مایە[18] .

ئەم دشێن بێژین نێزیكبوونەك دناڤبەرا تێكەهێ (گارە و گەرەگوو)دا هەیە[19]، دیسان نێزیكبوونەك دناڤ بەرا تێكەهێ (گارە و گارووك و گوندێ گارەبا

وێنەیێ (٣)
دیمەنەك ژ چیایێ گارەی.



ژێدەر: ڤەكۆلەر

)دا هەیە، رەنگە گارووك ژ پەیڤا گارە هاتبیتە بچویككرن، ب زێدەكرنا (وك-uk) یا بچویككرنێ د زمانێ كوردی دا (گەلەك دبێژنێ وك یا زاگروسی)، پەیڤا گارووك هاتییە دروستكرن، ئەو ژی چیایەكێ بچویكە دكەڤیتە هنداڤ سەرسنكێ. دیسان گوندێ گەرەگوو ئەوێ دكەڤیتە لایێ رۆژهەلاتا سەرسنكێ بچویكرنەكە ژ پەیڤا گارە، رەنگە ب بوورینا دەمی ئەڤ پەیڤە دروست ببن. دیسان گوندێ گارەیا ئەوێ دكەڤیتە رۆژهەلاتا گوندێ گەرەگو، ل بن سرتا چیایێ گارەی ئەو پەیڤە ب دورستاهی ب كارئینایە بۆ سەر گوندی، ل ڤی گوندی ژی جهەكێ پیرۆز هەیە، خەلك بەردەوام قەست دكەنێ. ب رەنگەكێ گشتی دبێژنە ئەڤێ دەڤەرێ (دەڤەرا بەرێگارێ)، كو ب هەر رەنگەكێ هەبیت ئەوان گوندا گرێدانەك د گەل چیایێ گارەی یا هەی. هەر چەندە ژ زار دەڤێ خەلكی گەلەك مەعنا ژ تێكەهێ گارە دچن، هندەك گرێدەن دگەل پەیڤا (گاور) یا زەرەدەشتی، كو دگۆتە وان كەسا ئەڤێن ل سەر دینێن دی، پەیڤا (كافر) یا عەرەبی ژێ هاتییە وەرگرتن، دناڤ پەیڤا گاوردا چیڤانۆكەك هەیە كو ب تۆفانا (نوح - س) پێغەمبەرڤە دهێتە گرێدان، دیسان هندەك دبێژن كو ئەو چیایێ گەلەك بەر ژێ دهێنە خوار دبێژنێ (گار)، ئەگەر ئەم كەتوارێ چیایێ گارەی وەربگرین رەنگە یا دجهێ خودابیت، ئەگەر ئەم بزانین كو حەجمەكێ مەزن ژ بەرێن چیایێ گارەی سالانە دهێنە خوارێ، ئەڤ دیاردە ل بامەرنێ ژی هەیە، دۆلەكا مەزن هەیە دبێژنێ (گاردول)، دیارە هەر سال گەلەك بەر ژێ دهێنە خوارێ[٢٠]. دیسان دیاردا كەڤێن بەفرێ ب ئاشكرایی ل چیایێ گارەی دەردكەڤن ئەگەر ئەم بزانین كو گارە ژ چیایێن بەفرینە، لێ چاوابیت ڤان بۆچوونا باهرا پتر ژێ خش-گومان- تێدا هەیە[٢١].

ل ڤێرە پەیڤا (گار-GAR) دناڤ گەلەك ژ

تێكستێن سوومەری - بزماریدا هاتییە و ب گەلەك رەنگان، دێ بزاڤێ كەین وان پەیڤا شرۆڤەبكەین دگەل هندەك پەیڤێن نێزیكی (گارە)، رەنگە ل دووماهیێ ببیتە دەرگەهەك بۆ گەهشتنا راستیا پەیڤا (گارە)، پەیڤا (GAR) د تێكستێن سوومەریدا هاتییە، ل بەرامبەر ڤێ پەیڤێ د زمانێ ئەكەدی دا پەیڤا (شیكانو-Shikanu) هاتییە، ب مەعنا شكل یان خۆرست، ب راستی چیایێ گارەی یێ تژی خۆرستە؟، ئەگەر پەیڤا (لو-LU) د زمانێ سوومەری دا ل بەراهیا هەر ناڤەكی هات، مەعنا وێ ئەوە ئەو ناڤ یێ مرۆڤەكی یە، ئەڤجا سەركردە بیت یان پەرستڤانەكێ دینی بیت. پەیڤا (لوگار-Lu gar) د زمانێ سوومەری دا، ل بەرامبەر پەیڤا (شەكنو-shaknu) د زمانێ ئەكەدیدا هاتییە، مەعنا وێ بەرپرسێ ب رێڤەبرنا جهەكی یە، دیسان پەیڤا GAR بتنێ بۆمە هاتییە و ل بەرامبەر پەیڤا (kamaru) یا ئەكەدی بۆ مە هاتییە، ب مەعنا چاندنا بەروبوومێ نۆكێ. پەیڤا (GAR-GAR) و ل بەرامبەر پەیڤا ئەكەدی (KUMARRU) بۆ مە ب مەعنا كۆمكرنا تشتەكی هاتییە، دیسان پەیڤا (GAR-RA) ب مەعنا جلك هاتییە[22]، هەر چەندە وەكی مەعنا چ ژ ڤان پەیڤا د نێزیكی كارێ پەیڤا گارە نینن، لێ چاوابیت مەرەمەكە بۆ تێگەهشتنا بنواشێ پەیڤا (gara).

پەیڤەكا دی یا سوومەری مە نێزیكی پەیڤا چیایێ گارەی دكەت، ئەوژی سوومەریا دگۆتە هەر چیایەكی (كور-kur)، ل بەرامبەر وێ پەیڤا ئەكەدی (shadu) دهاتە بكارئینان، گەلەك جارا تێگەهێ (kur) دهاتە ب كارئینان وەكی تێگەهشتنەك بۆ مللەتێن بیانی، ئەگەر ل ڤێرە پەیڤا (za) بەری (kur) هات، مەعنا وێ ئەوە كو رەنگەكێ بەری دیار دكەتن، بۆ میناك: ( za-kur-na) مەعنا وێ بەرێ

وێنەیێ (٤)
خلوەتگەها مارزەیا (كۆرێ مزگەفتا) ل چیایێ گارەی كو ژێدەرێ كەڤنێ ناڤێ چیایێ گارەیە



ژێدەر: ڤەكۆلەر

سـووره[٢٣]، ئایا ئەڤ بەره ل چیایێ گارەی هەیە؟ بلا بەرسڤ بۆ هەلشكافتنەكا جیولۆجی بیت.
گەلەك جارا پەیڤا (kur) دگەل خودایێن بلنداهیێ وەكی چیا دهاتە بكارئینان، هەر پەیڤەكا پیتا (d) پێڤە دهاتەكرن، مەعنا وێ خوداوەندەك بۆ یان پەیڤا (digir) د زمانێ سوومەری دا، نڤیسینا وێ وەكی ستێرەكا هەشت رەخـە، بۆ میناك: ( d KUR- GAL) مەعنا وێ خوداوەندێ مەزنە یان خوداوەندێ بریسی و عەورا (ئنلیلێ) سوومەری. دیسان ئەگەر وەلاتەكێ نوی هاتبادیتن، د ڤێت پەیڤا (KUR) پێڤە هاتباكرن، بۆ نیاسینا وی وەلاتێ نوی هاتییە دیتن بۆ میناك: (KUR-GIBIL) مەعنا وێ وەلاتێ نوی یە. دیسان ئەگەر پەیڤا (MI) ب (KUR) ڤە هاتبا كرن مەعنا وێ مەلیكەكا ژن بوو، ئەگەر پیتا (U) بەری (KUR) هاتبا مەعنا وێ گیایەكێ ساخلەمیێ بوو، بۆ میناك: (U KUR-KUR) رەنگەكێ گیایا بە بۆ ساخلەمیێ دهێنە بكارئینان. ئەگەر ل دووماهییا وێ (ZI) هاتبا مەعنا وێ گیایەكێ چەمێ ناڤ مال بوو، نەكو ژدەرڤە وەكی: U KUR-ZI، ئەگەر (KUR) دو جارا ل سەر ئێك هاتبا وەكی (KUR -KUR-RA) مەعنا وێ دوژمن بۆ یان وەلاتێن هەڤدژی وان، ئەرێ دەڤەرا مە یا هەڤدژ بۆ دگەل سوومەرییا؟ دیسان پەیڤا (KUR-GAR-RA) ب مەعنا حەیوانێ كاڤر هاتی، د ناڤ گەلەك تێكستێن سوومەری ب مەعنا رۆژهەلات دهێن[٢٤].

دیسان دەستەرێزا (KI-BI-GAR) یا هاتی مەعنا وێ هاریكارێ بەریرسی یان خودانێ پلەیەكا رێڤەبرنێ یە، پەیڤا (KI-GAR) ب مەعنا ئاخ یا هاتی، ئەو رەنگێ ئاخێ یێن دكەنە گۆزك[٢٥]، ئەگەر ئەم ب عەقلانە ئەڤێ چەندێ شرۆڤەبكەین، رەنگە گەلەك ژڤان فەرمانا ب چیایێ گارەی ڤە بهێنە گرێدان، لێ چاوابیت تا ئەڤرو مە چ دیكیومێنت ل بەر دەست نینن. بەلێ ئەم ب دوور نابینین كو ناڤێ چیایێ گارەی ژ پەیڤا (KUR-KUR-RA) سوومەری هاتبیت، ژ بەركو ژ لایێ فونوتیكی ڤە گەلەك د نێزیكن، هاتییە بچویككرن حەتا بوویە گارە.

وێنەیێ (٥)
**هەلامەتەكێ ئورارتیا كو نها ل مووزەخانا هەولێرێ پاراستییە، رەنگێ لڤین و نكراندنێ یێ روهنە و ل پتریا هەلامەتێت ئورارتیا وەكی ئێكن.**



ژێدەر: دلشاد عزیز

## ئورارتی و چەند شوین پێیەك ل دەڤەرا بەهدینان:

ئورارتی ل سەدسالییا سێزدێ بەری زایینی دناڤ نڤیسینێن بزماری یێن ئاشوورییادا بەرچاڤ دكەڤن. ئەڤ مللەتە ئێكە ژ مللەتێن كەڤنارێن كوردستانێ، ل هزارا سیێ بەری زایینێ و دگەل مللەتێ خۆری دا ئێك نفش و رڤشت هەبوو، هندەك ڤەكۆلەرا ئاڤری دایە نێزیكبوونا زمانێ ئورارتی و خۆری، تایبەت ئەو زمانێ دناڤبەرا سەدسالییا نەهێ تا سەدسالییا شەشێ بەری زایینێ هاتییە بكارئینان، زانایێ زمانی

(فرێدەر) یێ رژد بوو ل سەر ڤێ گرێدانێ، دیاکونوفی ئەڤ چەندە سەلماندییە[٢٦].

ئەڤێ چەندێ دیارکر زمانێ ئورارتی پشکەکە ژ زمانێ خۆری، بەلکی هەردو ب سەر ئێك زمانێ دایکن (زمانێ خۆری -ئورارتیێ بەراهی)، پاشی بووینە دو زمانێن سەربەخۆ، وەکی دو زمان دەرکەفتینە ل هزارا سیێ بەری زایینێ، پاشی خۆری هاتینە هندەك دەڤەرێن دی یێن باکوورێ میسوبۆتامیا، دەڤەرێن کوردستانێ و زمانێ خۆری بۆیە زمانەکێ سەربەخۆ[٢٧].

## میرگەها ئورارتی:

ل بەراهیێ میرگەها ئورارتی ل دەوروبەرێن دەریا وانێ دەرکەفت، پاشی دەسهەلاتا وانا پشتی سەدساڵیا سیێزدێ بەری زایینی بەرفرەهتر لێ هات، ژ رۆژئاڤای د گەهشتە دەڤەرێن کوردستانا سوریا یا نها، ژ باکووری نێزیکی دەریا رەش د بوو، ژ رۆژهەلاتی و باکوورێ رۆژهەلاتی د گەهشتە کوردستانا ئیرانێ و ئەرمینیا، ژ باشووری دگەهشتە دەڤەرا دیانا و سیدەکان و ئامێدیێ و قەلادزێ، شیان دەست ب سەر دەرگەهێن زەنگینێن جهێن کانزایی (معدني) ل کوردستانێ دا بگرن. ئورارتی (سەدساڵیا سیێزدێ ب. ز) ل مەیدانا سیاسی و لەشکەری ل باکووری میسوبۆتامیا دەردکەڤن. د نڤیسینێن میخی یێن پاشایێ ئاشووری (شلمانەسەرێ ئێکێ ١٢٧٤-١٢٤٥ب.ز) ب رەنگێ (ئورارتی) ناڤێ وان هاتییە[٢٨].

## ناڤێ ئورارتییا:

ئورارتییا دگۆتە خۆ (خالدی) و ب زمانێ وان ژی دگۆت (زمانێ خالدی)، ئەڤ ناڤە ژ ناڤێ خوداوەندێ (خالدی/هالدی) هاتییە، خوداوەندێ گەلێ ئورارتییا بوو، بەلێ دنڤیسینێن بزماری یێن ئاشووری دا ناڤێ وان ب (ئورارتی) هاتییە، ناڤێ وەلاتێ وان ب ئورارتی ئینایە. هەروەکی یا دیار پاشگرێ (تو) ل هەیامێن سوومەری دا دهاتە بکارئینان بۆ دەستنیشانکرنا دەڤەرەکا جوگرافی ژ هەر چ رەخەکی بیت، هەروەکی

**خشتەیێ (٦)**
**گۆزکەکێ ئورارتیا کو ژ هەمی گۆزکێت دیرۆکا کەڤن جوانترن و ب رێك و پێك ترن.**



ژێدەر: دلشاد عزیز

چاوا دگوت (مارتو، سوبارتو)، ژهەژی گوتنێ یە ناڤێ ئورارتییا تا نها ب ساخی ل ناڤ زنجیرا چیایێ (ئارارات) مایە، هەر دیسان ڤەکۆلەر(مار) دبینیت رڤشتا کاردۆخییا هەر رڤشتا ئورارتیبایە[٢٩].

هەژی گوتنێ یە هندەك رۆژهەلاتناس و نڤیسەڤانێن بیانی یێن ئەرمەنیا دبینن ئورارتی باپیرێن ئەرمەنییا نە، یان ئەرمەنی بەرمایێن ئورارتییا نە، دنڤیسینێن خۆدا ناڤێ ئەرمەن جهێ ناڤێ ئورارتی بکاردئینن. خۆ دبەنە سەر ب ڤی مللەتێ دێرین ڤە، لێ د راستی دا ئەڤ هەردو مللەتە ژێك جودانە و بێ دو دلی سەدەمێن دینی ژی ل پشت ڤان بۆچوونا یە[٣٠].

## ناڤێ گوندێ ئەرەدنا و بنواشێ وی یێ ئورارتی:

ئەرەدنا گوندەکە سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە، نێزیکی (١٥٠کم) ژ مووسلێ و (٢٥کم) ژ ئامێدیێ و (١٤کم) ژ ناحیا سەرسنکێ یا دوورە[٣١].

ل گۆر سەرژمێریێن سالا ۱۹۵۷ێ ل ئەرەدنا بسلمانا (۵۷۵) کەس لێ دژیان، ل ئەرەدنا ژێری یان ئەرەدنا فەلا (۱۰٤۹) کەس لێ دژیان[۳۲]. ژلایێ کارگێری ڤە سەر ب ناحیا بامەرنێ ڤە یە[۳۳].

ژلایێ جوگرافی ڤە ئەرەدنا دکەڤیتە سەر پەسار و سرتا چیایێ مەتینی و دەشتا سپنەی، یا ئەم دشێن بێژین دکەڤیتە سەر تیڤەرێزا چیایێ مەتینی و هەردو دیاردەیێن (ظواهر) خۆرستی دەشت و چیا لێ هەنە، ژبەر ڤێ چەندێ مە دو دلی نینە ڤی جهی بالا مرۆڤی راکێشایە و هەر ژ کەڤن بوویە حەوینگەها مرۆڤینیێ، ژبەر هەبوونا ئالاڤێن ژیانا رۆژانە، ئەردێ پویتی و رووەکێ خۆرستی و ئاڤ، زێدەباری جهێ بەرۆژێ ئەرەدنا، بێ دو دلی سەقای ژی رۆلێ خۆ دیتیە د ئەڤی جهی دا. هەر چەندە تا ئەڤرۆ چ هەلشکافتنێن ئەکادیمی-شوینواری ل ئەرەدنا نەهاتینەکرن، دا تایبەتمەند بشێن ب گەهنە بالاتەیا ئێکێ یا ژیان و شارستانیێ ل ئەڤی گوندی. لێ کۆمەکا جها لێ هەنە و هاتینە دانەزان وەکی شوینوار د پەرتووك و ئەتلەسێن جهێن شوینواری

**وێنەیێ (۷)**

**تابلوێ بەری یێ توپزاوە کو بۆ جارا ئێکێ ناڤێ (ئەردینی) تێدا هاتییە ئینان، نوکە ل مووزەخانا بەغدا یە.**



ژێدەر: ئەنتەرنیت

**وێنەیێ (۸)**

**تابلوێ بەری یێ کێلەشینێ کو نوکە هاتییە ڤەگوهاستن بۆ مووزەخانەکا ئیرانێ**



ژێدەر: ئەنترنێت.

ل عێراقێ، وەکی شکەفتا قەلایێ و دێرا سلتانە مەهادوخت، ناوسکێن ئەرەدنا و دێرا نەشمونێ وخانا مێرگەها بەهدینان (ئەوا دهێنە گرێدان ب سولتان حسین وەلی ١٥٣٤-١٥٧٥ز)ڤە[٣٤]. زێدەباری گرێ خەورانێ (گرێ دەمقەدو) ل سالا (١٩٣٣)ێ هاتییە دیتن[٣٥]. دیسان چەند جهێن دی ل ئەڤان داوییا هاتینە دەسنیشانکرن، وەکی بۆرجا بەیرەمێ (بۆرجا بەهرام پاشای) و چەپەرێ مێرکی بلباس و شوینوارێن ناڤێلا[٣٦].

دیروکڤانێ ناڤدار (پیتەر گرین) د پەرتووکا خۆدا (ئەسکەندەرێ مەقدونی) ئەوا ل سالا (١٩٢٤)ێ هاتییە چاپکرن نڤیسییە: ئەسکەندەرێ مەقدونی ل ئەرەدنا بەرهەڤیا شەری کرییە بۆ رووبرووبوونا لەشکەرێ داریوسێ فارسی ل سالا (٣٣٢ب. ز)ێ،

هەر ل ئەرەدنا سەركردەكێ خەلكێ گوندێ ئەرەدنا بەرسینگێن ئەسكەندەری گرتییە، هاتییە كوشتن. ل سالا (۱۹۳۳)ز)ێ پشتی ڤەكرنا رێكا ئرومبێلا د ناڤبەرا ئەرەدنا و بامەرنێ دا، گۆرەك هاتییە دیتن، شوینوارێن وی سەركردەیێ بەرامبەر لەشكەرێ ئەسكەندەری هاتییە كوشتن دناڤ دابوون. ژ ئەوان شوینواران مۆرەكا سادە بوو (مرۆڤەك و دو شێر د گەل بالندەكی ل سەر هاتبوونە نەخشاندن) و ڤەدگەریتن بۆ سەردەمێ ئەخمینی(۵۵۰-۳۳۰ب.ز)[۳۷]. ئەڤەژی گرۆڤەكە بۆ هەبوونا ژیانێ ل ئەرەدنا ل چەرخێ چوارێ بەری زایینێ، هەر چەندە ئەوی دەمی ئەرەدنا وەكی دەڤەرا سپنەی هەرێمەك بۆ ژ (۲۲) هەرێمێن ئەخمینییان.

گەلەك ژێدەر ناڤێ ئەرەدنا ڤەدگێرن، هندەك بنواشێ ڤی ناڤی بۆ ئارامییا ڤەدگەرینن، دبینن ناڤێ ئەرەدنا (ܐܪܥܐ ܐܪܥܐ ܘ ܥܕܢ) ب رامانا (ارض عدن- ئەردێ عەدەن یان جنات عدن) دهێن[۳۸]. نڤێسەڤانێ ناڤدار پارێزەر (جمال بابان) ناڤێ ئەرەدنا ب ڤی رەنگی شرۆڤەكرییە: (ئەر-ب رامانا ئەرد ئینایە) و دبینیت بۆرینا دەمی پەیڤا (ارض) یابوویە (ئەر) و (دنا) ب رامانا (عدن) هاتییە .

دیسان كۆمەكا بۆچوونا هەنە و ناڤێ ئەرەدنا ڤەدگەرینن بۆ بنواشەكێ كوردەواری، یا ئەم دزانین باهرا پتر ژ ناڤێن كوردەواری ژ كریار و فەرمانا تشتی دهێنە وەرگرتن، رامانا ناڤێ ئەرەدنا دهێنە دیتن ب (ڤێرە-دنیا)، ئەڤە ژی شرۆڤەكرنەكا جوگرافییە، ل سەر خۆشی و جوانی و خۆرستییا ڤێ دەڤەرێ، ژبەر بۆرینا دەمی كۆمەكا گوهورینا ب سەردا هاتییە و بوویە ئەرەدنا[۴۰]. ئەگەر ئەم شرۆڤەكرنەكا لوژیكی بدەینە ڤێ پەیڤێ دگەل بۆچوونا ژێ هاتی، هندەك پرسیار تێدا بێ بەرسڤ دمینن، ئەڤ دەڤەرە یا خۆجهـ بوویە نێزیكی پێنج چەرخا بەری زایینێ، ئەرێ خۆجهێن ڤی جهی چ زمانەك بكاردئینا. یا دووێ یا ئەم دزانین ژ رەخێ خۆرستی ڤە ب تایبەت ئەرەدنا ژووری جهەكێ ئاسێ و خودان خۆرستەكێ دژوارە بۆ هەیامەكی هێشتا ئالاڤێن ژیانێ دبەرتەنگ، ئەرێ چاوا مرۆڤی ب چاڤەكێ خۆش ژیان دیتییە؟.

دێ ڤەگەرینە سەر چیرۆكا دووێ ئەڤا ناڤێ ئەرەدنا

**وێنەیێ (۹)**
**دیمەنەك ژ ب سەرداگرتنا باژێرێ ئەردینی ژ رەخێ سەرجوونێ ئاشووری ڤە، رەنگێ ڤەصر و ئاڤاهی و ژیانا ئورارتیا دیار دكەت.**



ژێدەر: دلشاد عزیز

ڤەدگەرینیت بۆ سالا(٣١٩ز)ێ، نەخاسمە بۆ رویدانێن ئاڤاكرنا دێرا سولتانە مەهادوخت، مەرەم ئەوە دێرا سلتانە مەهادوخت ل ڤێرە دانایە، ئەو خۆشكا خۆ لێ ژیاینە. هێدی هێدی ناڤ بچویك بۆیە تا بۆیە ئەرەدنا. ئەگەر ڤێ بۆچوونێ وەربگرین دێ بینین ژ لایێ زانستی ڤە یا لاوازە، ئەگەر ئەم شرۆڤەكرنەكا كەتواری ب دەینێ، پرسیارەك سەرهەلددەت و دبێژیت: رویدانا سولتانە مەهادوخت بۆ چەرخێ چوارێ ڤەدگەریت، یا ئەم دزانین وی دەمی فەلێن دەڤەرێ ل ژێر زولما دینی بوون، ئەڤ دەڤەرە د هەڤركیێ دابوو دناڤبەرا ساسانی و بیزەنتیاندا. چیرۆكا كوشتنا سلتانە مەهادوخت وەكی دیەرتووكا (شهداء المشرق) یا (د. بهنام ابو الصوف)دا هاتی، ڤەدگەریت بۆ شەهیدبوونا وی ل سەر دەستێ فارسا، مەهادوخت بخۆ وەكی پەیڤ پەهلەوییە، دێ بۆچی پەیڤەكا كوردەواری ل سەر هێتە دانان[٤٢].

بۆچوونا سیێ ئەوە دو گوند هەنە ب ناڤێ ئەرەدنا (بوسلمان و فەلا)، دبیت ئەڤ ناڤە ژ (ڤێرە-دونە) یان دو ئەرەدنا هەنە هاتبیت[٤٣]. ئەگەر ئەم بهێین ڤێ پەیڤێ وەربگرین و بكەینە پارچە دێ بینین (ar-a-din-a)، پیتا (a) یا دووماهیێ وەكی دەڤۆكا كوردەواری دا دیار، پتر بۆ گۆتنا دەڤەرەكا سەربەخۆ دهێنە بكارئینان، وەك بەروارییا، دۆسكییا، مزوورییا، یان ب رەنگەكێ دی بۆدیاركرنا دەڤەرەكا جوگرافی یا چارچوڤەكری دهێنە بكارئینان، ژبەر ڤێ چەندێ نەدوورە هەیامەكی ناڤێ پشكەكا مەزنا سینەیێ بەهدینان ئەرەدنا بیت، ژبەر كۆمەكا سەدەما، ژ ئەوان: ڤەدیتنا جهەكێ دژوار د گەل دەشتەكا ڤەكری، زێدەباری ژێدەرێن ئاڤێ، هەر دیسان كەتنا ڤێ دەڤەرێ ل سەر رێكا كەڤنا ئامێدیێ بهایێ وێ پاراستییە. تا ل ئەڤان دووماهییا خانەك لێ هەبوویە و بوویە جهێ ڤەحەواندنا رێڤینگ و بازرگانان [٤٤].

دێ ڤەگەرینە سەر دیرۆكا كەڤنارا كوردستانێ و خواندنەكا سەرپێ بۆ دیرۆكا گەلێ ئورارتو كەین، ل هەیامەكی ڤالاتییا دەسەلاتا سیاسی ل كوردستانێ تژی كرییە، ئەگەر ئەم بنێرینە جهێ بەربەلاڤبوونا ئورارتییا دێ بینین ژ دەریا وانێ بەرەڤ وەلاتێ ئەرمەنا ژ رۆژهەلاتی، رۆژهەلاتێ ئەنادول دگەل باكوورێ رۆژئاڤا ئیرانێ، باكوور و هندەك پشكێن دی ژ ئەزەربێجانێ، زێدەباری باكوور و رۆژهەلاتێ عێراقێ. دبیت شاهـ (ساردوری) دامەزرینەرێ ڤێ دەولەتێ بیت[٤٥]. ل سەر زمانێ ئورارتییا هەردو ڤەكۆلەرێن دنیایێ (میشتشانیوف) یێ رۆسی، (میلكەشڤیلی) یێ جۆرجی، دبینن زمانێ ئورارتویی زمانێ وانی و ئەردینی یە (موساسیریە)، ژبەر كو ئەڤ جهە پایتەختێن وان بێن گرنگن. زمانێ ئورارتی نێزیكە ژ زمانێ خۆری، لێ بۆرینا دەمی باندۆرا زمانێ ئاشووری هاتییە سەر[٤٦].

ئەگەر ئەم ڤەگەرینە سەر راڤە پەیڤێن (قاموس) نڤیسینێن كەڤن (بزماری)، دێ بینین برگا (ar) گەلەك رامان ژێ دچن، برگا(ar) ل هەڤبەری وێ د زمانێ ئەكەدی دا پەیڤا (karmu) دهێن، رامانا وێ جهەكێ بلندە یان (گرە)[٤٧] . ئەگەر ئەم كەتوارێ جوگرافیێ گوندێ ئەرەدنا وەربگرین، سەرباری وێ چەندێ دكەڤیتە سەر پەسارا سرتا چیایێ مەتینی، گرەكێ شەفەللەح لێ هەیە ب ناڤێ (گرێ سلتانە - رومتا) كو دكەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ ئەرەدنا ژێری-فەلا.

دیسان برگا (ara) د زمانێ سوومەری دا ل هەڤبەری وێ پەیڤا (tenu) د زمانێ ئەكەدی دا هاتییە، رامانا وێ ژی هێرانە[٤٨]. ئەگەر ئەم سەحكەینە كەتوارێ نها یێ ئەرەدنا ژلایێ جوگرافی ڤە، دێ بینین پەسارا ئەرەدنا یێ بەرهەڤە بۆ دروستبوونا ئاشا، كۆمەكا كۆتەلا لێ هەنە، بەلێ ئەڤ بۆچوونە پتر پێدڤی شرۆڤەكرنێ یە.

برگا (ar) ل هەڤبەری وێ د زمانێ ئەكەدی دا پەیڤا (namaru) هاتییە، راماناوێ ژی تەیساندنە[٤٩]. برگا (ir.ar) ل هەڤبەری وێ د زمانێ ئەكەدی دا (ardu) هاتییە ب رامانا خزمەتكار، دیسان پەیڤا سوبار ژی هەر ب كارئینایە بۆ ڤێ مەرەمێ[٥٠]. ئەم دوور نابینین ئەڤە سیاسەتەكا سوومەریا بیت، ب چاڤێ خزمەتگوزار بەرێ خۆدابیتە گەلێن دی!، ئەگەر پیتا (d كورتكرنا dingar دهێن ئەو ژی ل

سەر هەر پەیڤەکا هاتە دانان ب رامانا خوداوەندەك)، ئەگەر بەری (era-ir) هات ب رامانا خۆدایا (ئیرا) وهوسا(d era) دهێن[51]. دیسان باژێرەك دتێکستێن سوومەری دا هاتیيە ب ناڤێ (aratt)، ل هەڤبەرێ وێ د زمانێ ئەکەدی دا پەیڤا ئەراتو هاتییە[52]. ژلایێ فونوتیکی ڤە گەلەك ژ ڤان ناڤ و برگا نێزیك پەیڤا ئەرەدنانە لێ ئەڤە بتنێ دەرگەهەکە بۆ پتر کووربوون د بنەکوکا ئەڤی ناڤێ دیرۆکی.

ئەگەر ئەم ڤەگەرینە سەر رویدانێن سالا (۸۹۵ب.ز)، هەڤرکییا ئاشووری و ئورارتییا، دێ بینین کۆمەکا رویدانا ل دەڤەرێ چێ بووینە، هەر ل سالا (۸۹۵ ب.ز)ێ شاهێ ئاشووری (ئەدد- نەراریێ دویێ) ژبەر یاخویبوون و دژ راوەستانا هندەك باژێرا دژی دەولەتا ئاشووری، تایبەت باژێرێ کومو یان کومانێ، نها دکەڤیتە کوژیێ باکوورێ رۆژهەلاتێ توخیبێن عێراق و تورکیا [53]. د تێکستی دا هاتییە:

((من خۆ کێشا دەڤەرێ دا هاریکارییا [کومو] بکەم، من قوربانی پێشکێشی خوداوەندێ[ئەدد] کرن ل باژێرێ کومو، هێژایێ من، من باژێرێن وەلاتێ خیخۆ[54] سووتن...))، یا دیارە باژێرێ کومو گوندێ کانێ یێ نها یە.

**د تێکستەکێ دێ یێ بزماری دا هاتییە:-**

((ئەز ژ باژێرێ ئاشوور دەرکەفتم، گەهشتمە چیایێن [کیروری] و چوومە چیایێن [ئورینا-urrubna]، ئەز گەهشتمە هندەك جها شاهێن بەری من نەگەهشتبوونێ، هندەك رێکێن دژوار ئەز دەرباسبووم، پاشی ئەز چوومە ئەردێ لەدانو[Ladanu] یا لولوبییا[55] ))، ئەگەر ئەم ڤان هەردو تێکستێن بزماری شرۆڤە بکەین دێ چەند ڤەرێژەکا بینین ژ ئەوان:

١- باژێرێ کوما یان کومانێ ئەڤە دبنواشێ خۆدا (گوندێ کانێ) یە، دکەڤیتە رۆژهەلاتا ئامێدیێ، کوما بخۆ وەکی ناڤ خودایەکێ تایبەتە د بیروباوەرێن میتانییا دا، ئەم دوور نابینین پایتەختەکێ گرنگێ میتانییا بیت، ئەگەر هاتو هەلشکافتنێن شوینواری تێدا بهێنە کرن.

٢- دیارە ئەڤ جهە و دەڤەرا سپنەی ب رەنگەکێ گشتی ژ دەستەلاتا ئاشووریيان یاخی ببوو، سەرکردێن ئاشووریيا دڤیا وێ بێ دەنگ بکەن، نەخاسمە بەری ڤان رویدانا بزاڤ دهاتنە کرن بۆ دەستدانانا سەر دەڤەرێ، وەك بزاڤێن شاهێ ئاشووری (تجلات بلێزەرێ سیێ) ل دەڤەرا مانگێشکێ، کو ل وێرێ هەلامەتەکێ بیرهاتنا هێلایە ل سەر سەرکەفتنا خۆ.

٣- پەیڤا (ئوریانا و لەدانو) نە دیارن ژلایێ ناڤەرۆکێ ڤە، لێ پەسنا شاهێ ئاشووری بۆ جهێ جوگرافیێ دژوار و تژی چەپ و جیر، دوور نابینین دەڤەرا سپنەی بیت، یا ئەم دزانین ئەڤ دەڤەرە دهەڤرکییەکا بەردەوام دا بوو د گەل ئاشووریيا.

ئەگەر ئەم ڤەگەرینە سەر شوینوارێن کوردستانێ، دێ بینین کۆمەکا تابلۆ و تێکستێن بزماری هاتینە دیتن، پەسنا رویدانێن دیرۆکی ل دەڤەرێ دکەن. یا ژ هەمیا ب ناڤ و دەنگتر تابلۆیەکە ڤەدگەریتە هەیامێ ئورارتی، بۆ شاهێ ئورارتی (ئەریکش کورێ مینوا)، تابلۆیا (کێلە شین)ە، دکەڤیتە سەر توخیبێن عێراق و ئیرانێ (یێن نها)، بۆ جارا ئێکێ رۆژهەلاتناس (کوتز فریدریك) بەحسێ ڤێ تابلۆیێ کرییە، پاشی (سپایزەر) و ل دووماهیێ (سایکس)ی ل سەر نڤیسییە، ڤەدگەریت بۆ سالا (۸۱۰ب.ز). ل سەر ڤێ تابلۆیێ ب زمانێ (خەلدی-هەلدی) نڤیسییە، تێکستا (کێلە شین) ژ (٤١) رێزێن نڤیسینا ئورارتی پێك دهێن، هندەك ڤەدگەرن بۆ شاهێ ئورارتی (ئەشبوئینی)، نەخاسمە ل چەرخێ هەشتێ بەری زاینێ، ئەڤ تێکستە بۆ کلیلا شرۆڤەکرنا زمانێ ئورارتی، پاشی درێکا وێ دا هاتە زانین، کو دەولەتەکا دی یا ب هێز ل هەمبەر دەولەتا ئاشووری هەبوویە، ئەوژی دەولەتا ئورارتییە، تێکست ژی بڤی رەنگێ ل خوارێ یە:

(ئەز ئەشبوئینی کورێ سردوری، شاهێ (عظیم)، شاهێ جیهانێ، هێژایێ باژێرێ توشبا، ئەز و کورێ خۆ ل بەرامبەر خوداوەندێ خەلدیا ل باژێرێ [ئەردینی] راوستیاین [ د تێکستێ ئاشووری دا ناڤێ موساسیر

هاتییە]، مە پەرستگەهەك بۆ خوداوەندێ خلدا چێکر، گەلەك دیاریێن جوان هاتنە پێشکێشکرن، ژ چەکێن جوان و ئامانێن [قبدکو] کو ژ کەرستێ سفری هاتبوونە چێکرن)، هوسا ڤێرا دچیت و بەحسێ قوربانا و هاریکاریا خوداوەندێ خلدیا دکەتن بۆ سەرکەفتنێن وی، ل دووماهیێ بەحسێ وێ چەندێ دکەت و هەر کەسێ ڤێ تابلۆیێ تێك بدەتن دێ لەعنەتێن خودایی ل سەر باریت[٥٦].

دناڤ تێکستێ بزماری یێ کێلەشین، یا زمانێ ئورارتی پەیڤا (ئەردینی) هاتییە، هەر چەندە د تێکستا ئاشووری دا پەیڤا (موصاصیر) هاتییە، ل دۆر تێکستی ئەڤ باژێرە دکەڤیتە دناڤ وەلاتێ کیروری دا. وەلاتێ کیروری ل دووڤ ژێدەرێن دیرۆکی و جوگرافی د کەڤیتە دەڤەرا سیدەکان و برادۆست، هەر ل ئەڤی جهی تێکستا [توبزاوە] یا دیرۆکی هاتییە دیتن[٥٧]، ل ڤێرە پەیڤا [ئەردینی] هاتییە و ل دەڤەرێ بەرامبەر مە پەیڤا [ئەرەدنا] هەیە، ژلایێ فونوتیکی ڤە ئەڤ پەیڤە گەلەك دنێزیکی ئێکن،

ئەگەر ئەم پیتا (ی)یا دانەنیاسینێ ب پەیڤا ئەرەدنا ڤەکەین، دێ بیتە (ئەرەدنی)، پەیڤا دتێکستێ ئورارتی دا هاتی (ئەردینی)یە، ژبەر ڤێ چەندێ ئەم دوور نابینین پەیڤا ئەرەدنا گرێدانەکا ب هێز دگەل شارستانیەتا ئورارتییا هەبیت، نە دوورە ئەردینیا پایتەختێ ئورارتییا ل دەمەکی هاتبیتە ڤەگوهاستن بۆ ئەرەدنا، ئەڤ ناڤە مایە تا ئەڤرو[٥٨].

تێکستێ (توبزاوە)یێ ئورارتییا، ئەڤ تێکستە بۆ شاهێ ئورارتی (روساسێ ئێکێ) ڤەدگەریت، ئەڤێ هەڤدەم د گەل شاهێ ئاشووری (سەرجونێ دووێ ٧٢١-٧٠٥ ب.ز)، تێدا هاتییە شاە روساسی هاریکاریا هەڤپەیمانێ خۆ (ئەرزانای) شاهێ موصاصیر کرییە، دتێکستێ دا هاتییە:

(ئەز ئەرزانامە شاهێ موساسیر من داخوازا هاریکاریێ ژ [ئەرسا] کورێ شاهێ خلدی سردوری کرییە، دا ژیانا وی پارێزم، دژی دەستهەلاتا ئاشووریا...)، هوسا ڤێرا دچیتن و بەحسێ هێز و شیانێن خۆ دکەتن. پاشی بەحسێ وەفاداریێ و قوربانیێ

URUAr-di-né



URUAr-di-nURU



URUAr-di-nURU



دكەتن، پاشی نڤیسین ل دووماهیێ بەحسێ شاه [ئەرسا] دكەتن، بەحسا خۆ و خوداوەندێ خلدی و هیڤیێن خۆ دكەتن، ل دووماهیێ لەعنەتا ل سەر هەر كەسێ ڤی تێكستی تێك بدەت دبارینیت[٥٩]. ئەگەر ئەم سەحكەینە ڤی تێكستی دێ بینین ناڤێ شاهەكی هاتییە ئەوژی شاهل (ئەرزانا) شاهێ باژێرێ موصاصیرە پایتەختێ وەلاتێ كیروری [ئورارتی]، ئەم ب دوور نابینین پەیڤا ئەرزانا نێزیكییەك دگەل پەیڤا ئەرەدنا هەبیتن، هەر چەندە ناڤێ شاهەكی یە نەك جهەكی.

رامانا ئەردینی: ئورارتییا دگۆتە پایتەختێ خۆ (ئەردینی)، هەرچەندە ئاشوورییا دگوتێ (موصاصیر). ئەڤ پەیڤە د بنواشێ خۆ دا ئورارتییە[٦٠]. هەر ئەڤ چەندە بۆ مە دیار دكەت كو پەیڤا (ئەردینی) ژ پەیڤا (ئارتینی) یا ئورارتی هاتییە وەرگرتن، رامانا وێ ژی (باژێرە). هندەك ژ ڤەكۆلڤانا دبینن كو ئاردینی باژێرەكێ حۆریا یە، ل هەیامێ مالباتا ئورا سیێ، نەخاسمە ل هەیامێ شاهێ وان (شولگی ٢٠٢٩-١٩٨٢ب.ز). ناڤێ (ئەرینی) هەبوو، ئەڤە ژی د تێكستەكێ بزماری دا هاتییە، ڤەدگەریتە سالا ٤٩ ژ حوكمێ شاه شولگی. پاشی ل هەیامێ ئورارتییا هاتییە گوهۆرین بۆ (ئەردینی). ژ بەر ڤێ چەندێ ناڤێ ئەرەدنا ناڤەكێ دیرۆكی كەڤنە. ناڤێ ئەردینی د تێكستێن بزمانی دا ب ئەڤی رەنگی هاتییە[٦١].

ل دووڤ ڤێ هەلشكافتنێ یا دروست تر ئەوە ناڤێ ئەرەدنا ناڤەكێ ئورارتییە، كو ل ناڤەراستا هزارا دووێ بەری زایینێ ل دەڤەرێ بەلاڤ بووین، راماناوێ ئەوە ئەرەدنا ل هزارا دووێ بەری زایینێ جهەكێ ئاڤابوو، ئورارتییا گەلەك چەڤێن شارستانی ب جهـ هێلاینە، بەلێ حەتا هزر و تەڤرێن ڤەكۆلڤانا دگەهنێ.

## دیوارێ شكەفتا قەلایێ ل ئەرەدنا و سەخلەتێن ئورارتی:

ئەڤ شكەفتە دكەڤنە سەر پەسارێ چیایێ مەتینی ل گوندێ ئەرەدنا، ل سالا (١٩٥٢ز)ێ هاتییە

**وێنەیێ (١٠)**
**دیوارێ شەفەللەحێ شكەفتا قەلایێ ل ئەرەدنا، رەنگێ ئاڤاكرنێ یێ جۆدایە ژ هەمی ئاڤاهیێن دی.**



ژێدەر: ڤەكۆلڤان

دانەزان وەكی شوینوارەكێ گرنگ ل سەر دەستێ ڤەكۆلەر (ئەحمەد حاج مەهدی). پشتی مرۆڤ دچیتە دناڤ شكەفتێ دا، تشتێ ئێكێ یێ مرۆڤ دبینیت، كلیسكێن دەرگەهی نە وهاتینە هەلكۆلان ب مەرما دائێخستنا دەرگەهی ل سەری، ل خوارێ ژبۆ لڤاندنا دەرگەهی، بلنداهییا دەرگەهی (٢ م). دەمێ مرۆڤ دچیتە ژوور ل بەرامبەر دەرگەهی ژلایێ دەستێ راستی جورنیكەكا (خزان) ئاڤێ هەیە، ب رەنگەكێ گرۆڤر ژ بەر و كسلا هاتییە چێكرن، درێژاهییا وێ (٢ م) و (١,٥م) یا كوورە. شكەفت ب رەنگەكێ گشتی (١٥م) یا درێژە و(١٢م) یا فرههیە، جۆیەكا درێژ ژ سەروكانییا ئەرەدنا بەرەڤ ڤێ جورنیكی ڤە ئینایە، ب دووراتییا (٢كم) دبێژنێ ڤێ جۆیێ (جۆیا فرەنگی) و تا نها شوینوارێن وێ ل گەلەك جها دیارن، دكەڤرا را هاتییە كۆلان و ل هندەك جها ب (بەر و كلس) هاتییە چێكرن[٦٢].

د ناڤا شكەفتێ دا شوینوارێن سێ دیوارا دیارن، دیوارێ ژدەرڤە كو ب راستی جهێ حێبەتیێ یە ژ بەرێ بازی یێ نكراندی و گۆگراندی وكسلێ هاتییە

دروستکرن، بلنداهیا وی (٥م)ن، فرەهیا وی (١،٥م)، درێژاهیا وی (٩م)[٦٣]، رەنگێ نژنینا ڤی دیواری وەکی نژنینا دیوارێن ئورارتییایە. دیوارێ دووێ ب تنێ چەند بەرەك ل سەر دیارن، ئەگەر ئەم بنێرینە رەنگێ ئاڤاکرنا ئەڤی دیواری نەدووره ڤەگەریتە سەردەمێ ئورارتییا ژبەرکو رەنگێ دانانا وی دگەل دیوارێن کەلایێن ئورارتییا دگونجیت، پاشی دیوارێ سیێ دهێن شوینوارێن ژوورەکا چوارکوژی ل سەر دیارن، پشتی هندەك کەسا ئەڤ جهە ڤەکۆلای سێ گۆڕ تێدا هاتبوونە دیتن، چەند هەستیکێن مرۆڤا هاتبوونە دیتن، لێ مخابن چ پویتە پێ نە هاتبوو دان، بۆ رەخێ رۆژهەلاتێ شکەفتێ ڤەکۆلینەکا نوی هاتیەکرن، شوینوارێن چوار پەیسکا هاتیە دیتن، د کەڤیتە د ناڤبەرا دیوارێ ژدەرڤە ودیوارێ دووێ، ب بەرێن نکراندی و گۆگراندی هاتیە ئاڤاکرن، درێژاهیا وان بەرا (٧٥سم)، وفرەهیا وان (٢٠ سم). ئەڤەژی وی[٦٤] چەندێ دگەهینیت کو ئەڤ جهە پەرستگەهـ بوو[٦٥]، ژ دوو نهۆما پێك هاتییە. دیسان جەڤەنگەکێ سەیر ل سەر شکەفتێ هاتییەدیتن ئەو جەڤەنگ ل سەر بەرێن وان پەیسکا ژی هاتییە دیتن، وەکی کڤانەکێ بەروڤاژیە، بتنێ ل سەر هۆنەرێ ئورارتییا دەردکەڤیت. ژ ڤێ چەندێ بیرا مە ل رەنگێ ئاڤاهیێن (ئورارتی) دئینیت کو ئەڤ جهە پەرستگەهـ بوو. هەر چەندە ل پشتی وی هەیامی، فەلا ژی ب کارئینایە بۆ مەرەمێن پەرستنێ. لێ مخابن چ پێزانینێن دیار ل سەر نە گەهشتنە بەر دەستێ مە.

## دیوارێ کەلا قومریێ - هرۆرێ[٦٦]

ل دەڤەرا بەرواری بالا و شوین تبلێن ئورارتییا: دەڤەرا بەرواری بالا دەڤەرەکا دژوارە ژ رەخێ خۆرستی ڤە، دیسان د کەڤیتە سەر توخیبێن وەلاتێ عێراق-ترکیا، یا ب ناڤ و دەنگە ب کەسکاتی و فیقی، زێدەباری گیایێن

وێنەیێ (١١)
دیمەنەك ژ کەلا هرور - قومریێ.



ژێدەر: ڤەکەر

خۆرستی، ل ناڤبەرا گوندێ هرۆر-قومریێ كەلایەكا دژوار و ئاسێ و مەزن بەرچاڤێن مرۆڤی دكەڤیتن، دهێتە هژمارتن ئێك ژ كەلایێن ئاسێ ل كوردستانێ و دەست ب سەرداگرتن گەلەكا ب زەحمەتە، ژبەركو ژ سێ رەخاڤە یا ئاسێ یە، بتنێ ب رێكا دەرگەهی مرۆڤ دشێن بچیتە سەر شوینوارێن كەلایێ[٦٧].

دیوارێن ڤێ كەلایێ گەلەك وەكی خۆماینە و هێشتا دباشن، دیسان چەند بیرێن عمبارکرنا ئاڤێ تێدا ماینە، ژ رەخێ ئاڤاهی و كەرەستەیێن ئاڤاكرنێ ئەڤ كەلایە وەكی كەلایێن ئورارتیا یە[٦٨].

چەندین چیرۆك و چیڤانۆك ب ڤێ كەلایێ ڤە هاتینە گۆتن، دهێتە بەحس كرن د ئەفسانەكێ دا پاشایەك د ئەڤێ كەلایێ دا ژیایە و هەمی سالەكێ ژنەك ژ دەڤەرێن دەوروبەر ئینایە، پشتی ژنێ زارۆیەك دبیتن دا ژنێ كوژیتن، پاشی ژ دیوارێ كەلایێ دا زارۆكێ ب ساخی هاڤێتە خوارێ، د ئێك ژ سالا دا ل دەمێ هاڤێتنا زارۆیەكی تەیرەكێ مەزن دهێت و وی زارۆكی ژ مرنێ قورتال دكەتن. ژ بلی ڤێ چەندێ كەس نەشیایە ڤێ كەلایێ ژبەر زۆرداریا ڤی پاشای بستینیت، ئەو بوو هندەك مێرخاسا خۆ دیاركر وەكی دارتاش، چەك و تیر و كڤانێن خۆ دناڤ سندۆڤا دارتاشیا خۆ دا د ڤەشێرن، ب ڤی رەنگی پاشا رازی دبیتن ئەڤ دارتاشە بهێتە دناڤ كەلایێ دا، بۆ ئەوێ چەندێ تەخت و دارا بۆ دروست بكەن، هوسا شیان گەلەك چەك و شەركەرا بینە د ناڤ كەلایێ دا، ل دەمەكێ دیاركری دا هێرش كریە سەر پاشای و دكوژن. هەژی گوتنێ یە دیوارێ ڤێ كەلایێ وەكی دیوارێ كەلا (توشیبایە) ئەوا ل پایتەختێ ئورارتیا هاتیە دروست كرن[٦٩]. كەلا هرۆر-قومری ل هەیامێ ئیسلامی گەلەك هاتیە بكارینان، نەخاسمە ل سەردەمێ میرگەها بەهدینان.

## ژێدەر:


١- كۆڤان ئیحسان یاسین: تێكهەلبوون و ڤێككەفتنا شارستانیەتا میتانی و ئورارتی و ڤەرێژا وان ل سەر دەڤەرا بەهدینان، گۆڤارا مەتین، هژمارە ٢١٦، (دهۆك- ٢٠١٣)، بپ ١٠٥.

٢- هەمان ژێدەر، بپ ١٠٦.

٣- ژمالپەرێ ئنترنێتێ ویكیبیدیا،ئنسكلوپیدیا ئازاد:- http://ar.wikipedia.org/wiki/ صموئیل هنتكتون.

٤- هەر چەندە هندەك ڤەكۆلەر چ جوداهیێ نا ئێخنە دناڤبەرا هەر دو مەملەكەتا (مەرەم حوری-میتانی) بەلێ وەكی دیار هندەك جوداهی د ناڤبەرا وان دا هەیە، نەخاسمە كو گەلێ حوری گەلەك باندۆركریە سەر میتانیا و میتانی ژی نە شیاینە شارستانییەتا وان ب گوهۆرن نە خاسمە ل دەوروبەرێن سالێن ١٥٠٠ب.ز، بۆ پتر پێزانینا بنێرە: طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ج٢، وادي نيل، شركه الطباعه و تجارة المحدودة، (بغداد-١٩٥٦)، ص ٣٦٤.

٥- طه باقر: المصدر السابق، ص ٣٦٤.

٦- كۆزاد محەمەد ئەحمەد: كوردستانی ناوەراست لە نیوەی یەكەمی هزارەی دووەمی پ. ز دا، بنكەی ژین، چاپخانەی چاپ و بلاوكردنەوەی حەمدی، (سلێمانی-٢٠٠٧)، بپ ٨٣.

٧- هەمان ژێدەر، ل ٨٤.

٨- انور المائي:الاكراد في بهدينان،مطبعه هاوار، ط٣، (دهوك -٢٠١١)، ص ٩٠.

٩- د. جمال رشيد و د. فوزي رشيد: تاريخ الكرد القديم، (اربيل-١٩٩٠)، ص ٧٦.

١٠- حلمي رسول رضا: المملكة الميتانية ١٥٥٠-١٣٦٥ق.م، رسالة ماجستير غير منشوره مقدمة الى جامعة كويه -كلية العلوم الاجتماعية، (كويه-٢٠٠٩)، ص ٥١.

١١- د. جمال رشيد: المصدر السابق، ص ٧٦.

١٢- هاني عبدالغني عبدالله بكر:حركات التحرير في العراق القديم من عصر فجر السلالات السومرية حتى نهاية الاحتلال الفارسي الاخميني،رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة الى جامعة الموصل-كلية الاداب، (موصل-٢٠٠٥)، ص ١٠٧.
١٣- حلمي رسول: المصدر السابق، ص ٥٨.
١٤- المصدر نفسه، ص ٥٩.
١٥- هاني عبدالغني: المصدر السابق، ص ١١٠.
١٦- انور مايي: الاكراد في بهدينان، چاپخانا خەبات -چاپا دووێ، (دهوك- ١٩٩٩)، بپ ٥٤.
١٧- کوڤان ئیحسان یاسین و نەزیف محمد علی: گەرەگوو. شوینوار و پێگەهـ ژیان، گوڤارا سیلاڤ، ژمارە ٤٦، (ئامێدیێ - شواتا ٢٠١٠)، بپ ١٢.
١٨- هەمان ژێدەر، بپ ١٠.
١٩- ڤەکۆلینەکا مەیدانی ل رۆژا ٢٠١٢/١١/٢٢ بۆ دیتنا دۆلا (گاردولی) ل بامەرنێ.
٢٠- کۆڤان ئحسان: ڤەرێژ، بپ ١١٢.
٢١- رينيه لابات: قاموس العلامات المزمارية، ترجمة: الاب البير ابونا و اخرون، مراجعة: ا.د.عامر سليمان، منشورات المجمع العلمي العراقي، (بغداد-٢٠٠٤)، ص ٢٤٥.
٢٢- المصدر نفسه، ص ١٦٧.
٢٣- رينيه لابات:المصدر السابق، ص ١٦٩.
٢٤- المصدر نفسه، ص ٢٠٧.
٢٥- مینۆرسکی: کورد، وەرگێرانی: حەمە سەعید حەمە کەریم، (بەغداد-١٩٨٤)، بپ٤٦.
٢٦- دلشاد عزيز زاموا: هۆنەری ئورارتو لە کوردستانی باشوور (١٣٠٠-٥٩٠ ب.ز) توێژینەوەیەکی مەیدانی شیکاریە، گوڤاری سوبارتو، ژمارە ٣، سەنتەری شوینوارناسانی کوردستان، (هەولێر-٢٠٠٩)، بپ٦٠.
٢٧- هاري ساكز: قوه اشور، ترجمة: عامر سليمان، (بغداد-١٩٦٩)، ص٧٧.
٢٨- دلشاد عزيز: ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٠.
٢٩- کوڤان ئیحسان: ڤەرێژ، بپ ١١٩.
٣٠- جمال بابان: اصول اسماء المدن و المواقع العراقية، ج ١، (بغداد-١٩٨٦)، ص ١٤.
٣١- جمال بابان:المصدر السابق، ص ١٤.
٣٢- بەرێ وێ هەیامێ سەر ب ناحیا سەرسنکێ ڤە بوو، بەلێ دەمێ ناحیا بامەرنێ هاتیە دامەزراندن ئێکسەر گوند کەفتە سەر ناحیا بامەرنێ ڤە ل سالا ١٩٩٩ێ بریارا ناحیبوونا وێ دا و ل سالا ٢٠٠٠ێ هاتە ب جهـ ئینان.
٣٣- المديريه العامه للاثار، اطلس المواقع الاثريه في العراق، (بغداد-١٩٧٠).
٣٤- کوڤان ئیحسان یاسین: ل سالا ١٩٣٣ێ ل ئەرەدنا هاتبوو دیتن و ل سالا ١٩٥٤ێ چێ بوو، گوڤارا سیلاڤ، ژمارە ٧٣، (ئامێدیێ-گولانا ٢٠١٢)، بپ ١٥.
٣٥- مستەفا عبدالرحمن ئەرەدنی و عبدالله درویش ئەرەدنی: ئەرەدنا بەرپەرەکێ ڤەشارتی ژ دیرۆکا دەڤەرا بەهدینان، چاپخانا کاروان، (هەولێر-٢٠٠٧)، بپ ٧٩- ٨٤.
٣٦- کوڤان ئیحسان: ل سالا ١٩٣٣ێ ل ئەرەدنا هاتبۆ دیتن، بپ ١٥.
٣٧- مستەفا عبدالرحمن: ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٠. دیسان بنێرە پەرتووکا: محافظه دهوك: دهوك بعد ١١ اذار، (دهوك-١٩٧٣)، ص ٣١٨.
٣٨- جمال بابان: المصدر السابق، ص ١٤، ئەڤ پێزانینە نڤیسەڤان جمال بابان ژ: بشر فرنسیس و گورگیس عواد: مجلة سومر العدد ٨، (بغداد-١٩٥٢)، ص ٢٤٩. وەرگرتیە.
٣٩- مستەفا عبدالرحمن: ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٠.
٤٠- کوڤان ئیحسان یاسین: خواندنەك نوی بۆ شرۆڤەکرنا ناڤێ ئەرەدنا، گوڤارا سیلاڤ، ژمارە ٨٢، (ئامێدیێ- ٢٠١٣)، ل ٢٠.

بۆ پتر پێزانیان ل سەر دێرا سولتانە مەهادوخت بنێرە: كۆڤان ئیحسان، دێرا مەهادوخت..كەڤناتی و هەڤركی دگەل دەمی، مالپەرێ ئامێدیێ.. http://www.amedye.com/shinwar/dera.mehadoxt.htm.

٤١- كۆڤان ئیحسان، ڤەریژ، بپ ١١٩.

٤٢- كۆڤان ئیحسان، خواندنەك، بپ ٢١.

٤٣- بۆ پتر پێزانیا سەحكە نڤێسینا مە: ئەرێ بۆرجا بەیرەمێ ل كیڤەیە، مالپەرێ ئامێدیێ: http://www.amedye.com/shinwar/borca-beyremi.htm

٤٤- رشا ثامر مزهر، التطورات السیاسه لدوله الاشوریة ٩١١-٧٤٥ق.م، رساله ماجستیر غیر منشورة، (موصل-٢٠٠٥)، ص ٨٧.

٤٥- د.جمال رشید احمد، ظهور الكورد فی التاریخ، ج٢، دار اراس لطباعه و النشر، (اربیل -٢٠٠٣)، ص ١٢٢.

٤٦- رنیه لابات، المصدر السابق، ص ١٣٦.

٤٧- المصدر نفسه، ص ١٨٧.

٤٨- المصدر نفسه، ص ٢٠٣.

٤٩- المصدر نفسه، ص ٥٩.

٥٠- رنیه لابات، المصدر السابق، ص ٥٩٠.

٥١- المصدر نفسه، ص ١٩٧.

٥٢- سامی سعید الاحمد و رضا جواد الهاشمی، تاریخ الشرق الادنی ایران و اناچول، (بغداد-د.ت)، ص ٢١٧.

٥٣- وەلاتێ خیخۆ: پتریا ژێدەرا د رژدن كو وەلاتێ خیخو دەڤەرا ئامێدیێ یە، ژ بەركو بەحسێ بازێرێ كومو (كانێ) دكەت و بازێركێ كانێ نێزیكی ئامێدیێ یە ب (٦كم).

٥٤- كۆڤان ئیحسان، ڤەریژ، بپ ١٢٢.

٥٥- محمود امین، سومر ،ج ١، مجلد ٨، (بغداد-١٩٥٢)، ص ٦٨.

٥٦- ل سالا ١٩٨٦ ل دەمێ حكومەت مژویلی دروستكرنا رێكێ بۆ ئەڤێ دەڤەرێ ئەو تابلۆیە برێكا دەرفەتەكا نەچاڤەرێ كری هاتبوو دیتن.

٥٧- كۆڤان ئیحسان، ڤەریژ، بپ ١٢٥.

٥٨- هەر ئەو ژێدەر، بپ ١٢٥.

٥٩- گیرنووت ڤیلهیلم، شارستانییەت و مێژووی خورییەكان، وەرگیرانی : ئارام جەلال هەمەوەندی، ( هەولێر، ٢٠٠٩)، بپ ١٩٠.

٦٠- تێكستا بزماری ژ دەستێ هێژا (ئارام جەلال هەمەوەندی) ب سۆپاسی گەهشتییە مە، نها سەیدایێ پشكا شوینوارا یە ل زانینگەها سەلاحەددین.

٦١- هەلشكافتنەكا مەیدانی.

٦٢- كۆڤان ئیحسان، ڤەریژ، بپ ١٢٧.

٦٣- بۆ پتر پێزانینا ل سەر شكەفتا قەلایێ بنێرە نڤیسینا مە: كوڤان احسان یاسین، كهف قلایی بین الاهمال و تاریخ الموغل، مجلة سوبارتو، العدد ٣، القسم العربی، (اربیل -٢٠٠٩)، ص ١٧٨-١٨٠.

٦٤- هەر چەند لێكدانێت جودا بۆ ناڤێ ڤێ كەلایێ دهێنە كرن، وەكی بەركێت تری یێت بژاله، بەلێ ئەڤ بۆچوونە پتر پێدڤی دویڤچوونێ یە، دیسا دبێژنێ كەلا هاون، كەلا ڤومرێ ژ بەر هەڤ تۆخیبیا وێ دگەل ڤومرێ. لێ ژبەركو ئەزمانێ دوبارەكرنێ (تكرار) تێدا یە و ئەڤەژی سەخلەتەكا ئەزمانێ ئورارتیا یە ئەم ب دوور نابینین ئەڤ پەیڤە ڤەگەریتە بنواشێ خۆ یێ ئورارتی. بۆ پتر پێزانینا ل سەر ناڤێ كەلایێ بنێرە: د.عبدالله خۆرشید قادر ئالەی، العماره الاسلامیه فی العمادیه حتی القرن ١٢ه/١٨م، مطبعه الروضه-اسطنبول، دار سبیریز ل طباعه و النشر، (دهوك-٢٠١٢)، ص ١٦٣.

٦٥- المصدر نفسه، ص ١٦٤.

٦٧- دلشاد عزیز، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٨.

٦٨- دلشاد عزیز، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٨.

٦٩- د.عبدالله خورشید، المصدر السابق، ص ١٦٦-١٦٨.

# نەخشەبەرێن شکەفتا گوندك

د. حەسەن ئەحمەد قاسم
رێڤەبەرێ شوینوارێن پارێزگەها دهۆکێ

## یەکەم - جهـ

شکەفتا گوندك دکەڤیتە دویراتییا (٢٠کم) ژ رۆژئاڤایێ ناڤەندا قەزا ئاکرێ[1]، کو ژ لایێ کارگێری سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤەیە، و ئەو بخۆ شکەفتەکا سرۆشتییە، دیرۆکا وێ ڤەدگەرێتەڤە چەرخێن جیولۆجیێن کەڤن[2]. مرۆڤ دشێت درێکەکا لاوەکی یا نە چێکری دا ب گەهیتێ. ل سەر رێکا سەرەکییا (دهۆك - ئاکرێ) بۆ لایێ باکوور ڤە، ناڤێ وێ ژ ناسناڤێ گوندێ گوندك یێ هاتی[3]. کو نەخشەبەرێن شکەفتا گوندك دکەڤنە دناڤ سنۆرێ وێ دا[4]. ئەڤ جهە وەکی جهەکێ شوینەواری هاتە نیاسین ، پشتی رۆژناما (الوقائع العراقیە) یا فەرمی ل ژمارا خۆ (١٦١٦) رێکەفتی (١٩٣٨/٢/١٨ز) ێ شوینوارییا وێ دایە راگەهاندن. و بادەکەکا تایبەت ل ژێر ژمارە (٥٣) بۆ هاتە رێکخستن[5].

شکەفت دکەڤیتە لایێ باکوورێ رۆژئاڤایێ گوندی ب دووراتییا (٥٠٠ م) ان ، و بیاڤەکێ بەرفرەهـ یێ هەی و ژ لایێ باشووری ڤە یێ ڤەکری، بلنداهییا وی ژ ئەردی نێزیکی (٥٠م) انە و پانییا دەرگەهێ وێ (جهێ چوونا ژوور) نێزیکی (٥٠م) انە . بانێ وی نیمچە کڤانییە، یێ پالدایە ل سەر دوو کوژێن رۆژهەلاتی و رۆژئاڤایی و بیاڤێ وێ یێ بەرفرەە یێ ل هنداڤی نهالەکا مەزن بۆ لایێ باشووریڤە . ئەڤرو گوند پتری (٢٠٠ ) مالانە، هندەك ژ وان ل دویڤ (تەرزێ) بەرێ یێن دروست کرین و ژ دەرڤە یێن ب (ئاخە سپیکێ) یێن هنین. ئەڤە ژی ب هەمان شێوازێ خەلکێ وەلاتێ دناڤبەرا دۆلا دوو روباران (وادی الرافدین)دا ل دەمێن کەڤن ژی دکرن[6].

## دوو - دیتنا نەخشەبەران

شوینوارناس (لایارد) یەکەم کەس بۆ هەردو نەخشەبەرێن دکەڤنە لایێ کوژیێ رۆژئاڤایی دەرگەهێ شکەفتێ ل سالا (١٨٤٦ز) ێ دیتین[7]، و زانا باختمان( W. Bachman) ل سالا (١٩١٤) ێ سەرەدانا وی کر[8]. ل هاڤینا سالا (١٩٣٧ز) ێ رێڤەبەرییا گشتییا شوینواران، دەستەکەکا تایبەت یا پێك هاتی بوو ژ دکتۆر (کروك مان) و هێژا (ناصر ئەلنەقشەبەندی) و هنارتە گوندێ گوندك سەر ب قەزا ئاکرێ ڤە. دەستەکێ سەرەدان برنە شکەفتێ و نەخشەبەرێن وێ، راپۆرتەکا وێنەدار ل سەر سەرەدانا خۆ پێشکێش کرن[9].

ل سالا (١٩٤٧) ێ رێڤەبەرییا گشتییا شوینواران،

دەستەکەکا دی پێکهینا وهنارتە شکەفتا ناڤبری و نەخشەبەرێن وێ. لیژنە یا پێك هاتیبوو ژ دکتۆر (مەحمود ئەلئەمین) و هێژا (ئەکرەم شوکری)، تێبینەرێ تاڤیگەهێ و هێژا (ئەنتران ئیگان) وینەگرێ رێڤەبەریا گشتیا شوینواران. و دەستەك شیبا نەخشەبەرەکێ نوی دشکەفتێ دا ببینن، مینا پەرستگەهان، کو ئەو گەرۆك و شوینوارناسێن ل بەری ڤێ لیژنێ چووین، نەشیابوون دەستنیشان بکەن. ئەڤ دیتنا نوی و گرنگ بۆ رێڤەبەریا گشتیا شوینوارێن کەڤنێن عیراقی (١٠) ل (١٩٤٧/١٠/٩ز)ی هاتە توومار کرن[١١]، و گەلەك ژ خەمخۆرێن شوینواران و گەرۆکان سەرەدانا وی جهی کرینە.

## سێ - سالۆخەتێن نەخشەبەران

ئەڤ نەخشەبەرێنە ژ سێ کەڤالان پێك دهێن کو ل سەر بەرەکێ کلسی ب رەنگەکێ دەرکەتی هاتینە نکراندن. ب درێژاهیێن جودا جودا، و هەر کەڤالەك بابەتەکی بخۆڤە دگریت، کو رەنگڤەدانا لایەنەکێ گرنگە ژ ژیان و ئەو بیرو باوەرێن کو ل وی سەردەمی ل وێ دەڤەرێ دبەربەلاڤ، و دێ ل سەر وان نەخشەبەرێنان ئێك ل دووڤ ئێك ئاخڤین:

### أ - نەخشەبەرێ ئێکێ

یێ پێك هاتیە ژ کەڤالەکی و دیمەنێ نێچیرەکێ بخۆڤە دگریت، ئەو بزاڤا هەردەم دچەرخێن کۆچەراتیێدا (الترحال) دگەل مرۆڤان هەی، کو ژیانا وان یا گرێدای نێچیرێ و خرڤەکرن و ڤێدانا فێقیێ دارا ڤە بوو، بەری کو ئاکنجی ببیت و دەست ب بەرهەمئینانێ و خۆ ب هیڤیا خۆڤە بهێلیت بۆ خرڤەکرنا خوارنا خۆ[١٢]. ژبلی ڤێ چەندێ گیاندارێن کیڤی و کەهی جهەکێ گرنگ هەبوو وەکی رەگەز و هێمایێن هێزێ کو ژیانا مرۆڤی موکم دکەت یان ژی دئێختە ل ژێر گەفان[١٣]. ژبەر ڤێ چەندێ دیمەنێن نێچیرێ ژ وان بابەتانە، کو هۆنەرێ وەلاتێ (دۆلا دناڤبەرا دوو رویباران) و وەلاتین دی پێ هاتینە نەخشاندن .

بلنداهیا نەخشەبەری ب چاڤ ئەردێن ل دەورو بەرێن وێ نێزیکی (٢٠م)انە، دیمەنێ وێ نە یێ رێك و پێکە. و ژبەر دەستکارییێن مرۆڤان و نەزانینا وان بۆ بهایێ شوینواران، و گەلەك یێ هاتیە تێکدان.

دیمەن یێ پێك هاتیە ژ وێنێ نێچیرڤانەکی، وەسان دیارە یێ راوەستیایە و بەرێ کڤانا خۆ یا دایە بزنەکا چیایی (کیڤیەکێ)ل بەرامبەری خۆ و ب تیرەکا[١٤] کوژەك ل ناڤبەرا هەردو ملێن یا وێ هنگافتی[١٥]و ژ بەر هویر هنگافتن و دژواریا وی، بۆ وی جهێ کاریگەر، ئێکسەر یا هاتیە کوشتن [١٦]، و وەسان دیارە ل دەمێ هنگافتنێ کیڤی د سەروبەرێ رەڤێ دابوو، لەوما ل ژێر کارتێکرنا وی دربی یا ژ بزاڤێ کەتی. و سینگێ وێ یێ ب ئەردی ڤەمای و دەستێ وێ یێ چەپێ بۆ پێشیێ یێ چووی و یێ راستێ بۆ پاشیێ.

هندی نێچیرڤانە ژی دەستێ وی یێ راستێ کو تیر پێ هاڤێتی یێ تیرێ دشدینت هەر وەکی دێ هاڤێت،و دەستێ وی یێ چەپێ هێشتا کڤان یێ تێدا وژلایێ ئەنیشکێ ڤە یێ خوار کری، مینا کوژیەکێ ڤەکری (گۆشا ڤەکری) یێ چێکری، و ژبۆ کو نێچیرڤان خۆ موکم بگریت و پالپشتیێ ل سەر بکەت و ئالیسەنگیا خۆ راگریت، پێ خۆ یێ چەپێ پێنگاڤەکێ یێ بۆ پێش هاڤێتی، دا ب رەنگەکێ گەلەك هویر ب هنگێڤیت، و بۆ ڤێ چەندێ سینگێ خۆ یێ بۆ پێشیێ دەرئێخستی و سەرێ وی ئالیسەنگیا وی یا پاراستی[١٧]، و نێچیرڤانی کراسەکێ کورت وەکی (تەنۆرا) یێ دبەردا و قائیشەکا ل سەر[١٨]. لێ لایێ ژووری ژ لەشێ وی، ئێکسەر د سەر قائیشێ و هەردو چۆکان دا) [١٩] یێ رویسە. و سەرێ وی یێ خرە یێ تووشی تێکدانێ بووی و وەسان دیارە یێ سەرو ریە تراشییە، کیڤی ژ گیاندارێن چیایی یە، کو ب هەژمارێن مشە ل ناڤ چیایێن کوردستانێ هەبوون و وەسان دیارە نەخشەبەرێن گەلەك نێزیکی سرۆشتی یێن هاتینە نکراندن، ریهێن درێژ ب رەنگێ (قۆچەکی - مەخرۆتی) و دوو شاخێن درێژ و دکڤانی بۆ سەری یێن هەیین[٢٠]. و پویتەدان ب شاخان دەربڕینەکە کو

شکەفتا گوندك



مرۆڤ ژیانا راستا ڤان گیانداران تێدگەهیت و های ژ ژیانا وان یا راست هەیە وناڤەرۆکا سرۆشتێ ڤان گیانداران باش دزانیت[21].

## ب – نەخشەبەرێ دووێ

دکەڤینە ژێریا نەخشەبەرێ ئێکێ ب دوو مێتران. دەمێ من سەرەدانا وێ شکەفتێ کری ڤەکۆلەر نەشیبا ل دویڤ چوونا نەخشێن ل سەر هاتینە دروست کرن بکەت، چونکی ب تەمامی ژناڤچووبوون، ژبەر ڤێ چەندێ سالۆخەتێن وی بێن ژ وێنەکی کو ل گۆڤارا(سۆمەر) بەلاڤکری هاتینە وەرگرتن، نەخشەبەر ب رەنگەکێ لاکێشەیی هاتییە دروست کرن[22] و ل سەر دیمەنەکێ هاتییە نەخشاندن، وەکی دەربڕین ژ مێهڤانداریەکێ[23] یان ئاهەنگەکێ، کو تێدا یێ نێچیرێ نێزیك دکەن و گۆشتێ وێ قەت د کەن[24].

كەڤالی گرنگیا خۆ یا مەزن یا هەی ، چونكی ڕەنگڤەدانا لایەنەكێ گرنگێ ژیانا ڕۆژانە یا خەلكێ كوردستانێ یە دچەرخێن بەرێ دا، ل ناڤەراستا دیمەنی، دوو كەسێن ڕوینشتینە ل سەر دو كورسیكێن بێ پالپشت، ئێك ل بەرامبەر ئێكی[٢٥]، و دناڤبەرا وان دا مینا مێزەكا ڕەنگ بازنەیی هەیە و دوو زارۆكێن بچویكێن رویس رووی ب رووی ئێك ل سەر دراوەستاینە[٢٦]. و وەسان دیارە نەخشەبەرێنسازی گرنگیەكا مەزن یا دایە هەردو ڕوینشتییان، ب پتر دەركەتن و دیار كرنا وان ژ كەسانێن دی، كو ب قەبارەكێ بچویك دیار دكەن، و ل هینگێ وەكی سنج ئەو كەسێ هێزو دەسەلات ددەستاندا مەزنتر دروست دكرن، وەكی گرنگیدانەك و دیاركرنەك بۆ جهێ وی[٢٧].

ئەم دناڤ گەلەك نەخشەبەران دادبینین، هەر ل دویڤ هزرو بیرێن مرۆڤان ل وی چەرخی، و ژبەر پیرۆزی و دەسەلاتا خوداوەندان ل سەر مرۆڤان، وێنێن خوداوەندان، ب ڕەنگەكێ مەزنتر ، و ب جل و بەرگەكێن ژێێن مەلكان ژی ماقویلتر دهێنە نەخشاندن. و ژ وێنەی دیارە كو ئەو زەلامێ ل سەر كورسیكا ڕاستێ ڕوینشتی، زەلامەكە كراسەكێ درێژ یێ ل بەر و لایێ ژووری ژ لەشێ وی یێ ڕویسە و ئامانەك یێ ددەستاندا، هەر وەكی دێ ژێ ڤەخۆت، و ژ سەرو چاڤان و ژ سەرو بەری دیارە ئەو نێچیرڤان بخوویە ، یێ كو كیڤی دنەخشەبەرێنێ ئێكێ دا نێچیر كری[٢٨]. و ئەو یێ سەرو ڕیە تراشیەو دفنەكا مەزن و خوار یا هەی[٢٩]. و ئەو كەسێ ل بەرامبەر زەلامی ڕوینشتی، وەسان دیارە ژنكە، ژبەر پرچ و كەزیێن بۆش و كراسەكێ درێژ یێ دبەردا، و دەستێ خۆ یێ چەپێ وەكی كوژیەكێ ڕاوەستای یێ لێكری ودرێژ كریە زارۆكی، هەر وەكی دێ خوارنێ دەتێ یان یێ یاریان دگەل دكەت[٣٠]، و هەر دناڤ دیمەنی دا دوو زەلام بەرف وان دهێن و نێچیرا ددەست وان دا، ئێك ژ وان یێ بزاڤێ دكەت تیری ژ پشتا نێچیرێ بهێنتە دەر، و هەردو ژی مژویلی پارچە پارچەكرنا نێچیرێ نە[٣١]. و ل لایێ ڕاستێ ل پشت زەلامێ ڕوینشتی كەسەكێ دی یێ دهێت و ترارەك یێ ل سەر سەری، و یێ ب لڤینە، ب ڕەنگەكێ گەلەك هویر پێ خۆ یێ چەپێ یێ بۆ پێشیێ بەرەڤ وان هەردو كەسان ڤە درێژكری.

## ج - نەخشەبەرێ سیێ

ئەڤ نەخشەبەرە دكەڤیتە ب تەنشت هەردو نەخشەبەرێنێن ل پێشتر ئاماژە پێ هاتییە كرن بۆ سەمتا ژ ناڤداڤە، ب بلنداهیا دەه مێتران و یێ ڕەنگ لاكێشەیی یە، درێژاهیا وی نێزیكی مێترەكێ یە و پانیا وێ نێزیكی دوو مێترانە، ژ لایێ ڕێڤەبەریا گشتیا شوینواران ڤە ل (١٩٤٧/١٠/٩)ێ یا هاتییەدیتن[٣٢].ئەڤ نەخشەبەرە ل سەر لایێ ڕاستێ یێ كەڤرینێ شكەفتێ هاتییە نەخشاندن و وەسان دیارە كو وێنێ دیمەنەكێ ئایینێ یێ پیرۆزە، دیمەنێن مرۆڤا و گیاندار و رووەكان دناڤ خۆدا خرڤە دكەت، تێدا مرۆڤەكێ ل سەر كورسیكەكا بێ پالپشت ڕوینشتییە، كراسەكێ درێژ دگەهیتە پێن وی یێ دبەردا، و تاجەكێ شاخدار یێ ل سەر سەرێ وی، و سەرو چاڤێن وی دبێ ڕیە و سمبێلن، و پرچێ وی یێ ل سەر ملان، دەستێ وی دیار دكەت یێ ل سەر ڕانێ وی و یێ چەپێ یێ بلند كری، دا خوارنێ ب دەتە پەز كیڤیێ، كو هەر وەكی كیڤیا بەرێ یە و ئەو ژی یا ل سەر پێن خۆ ڕاوەستایە، ژبوو ئالیسەنگیا خۆ دا بشێت ڕاوەستیت پێ خۆ یێ ڕاستێ پێنگاڤەكێ یێ بەرەڤ پێش هاڤێتی، و هەردو دەستێن وێ یێ ل سەر چۆكێن خوداوەندی، وكیڤی دوو شاخ و ڕیهێن درێژ یێن هەبن. دیسان كیڤی و خوداوەند ، یان مەلكێ خۆ كرییە خوداوەند، دارەكی یان تایێ ڕووەوەكێ ب ڕەنگێ ستوینی دبینن، كو دبیت تایێ دار خورمەكێ، یان تایێ دارەكادی دی بیت[٣٣]. وەسان ل پشت كیڤی گیاندارەكێ دی یێ هەی، كو دبیت هرچ بیت و یا شێری ددەتە كودیكا خۆ، و سەرێ خۆ یێ بریە پشت تێشكا خۆ دا پشتراست بیت كو ئەو تێشكا وێ یە و دا شێری بخووت، وەكی چەوان پتریا گیاندارن وێ كریارێ دكەن، و تێشك یا شێری

ل بەر سینگێ وێ دمێژیت، و ئێكسەر ل پشت وان زەلامەكێ دهێت و كراسەكێ درێژ یێ دبەردا، هەردو دەستێن خۆ بۆ پێشیێ یێن درێژ كرین، و ل لایێ بەرامبەر ل پشت خوداوەندێ شاخدار، وێنێ شێرەكێ دەڤ ڤەكریە و كوریا خۆ یا بلند كری و بەرەڤ پێش دچیت[٣٤].

## چوار - دیرۆكا نەخشەبەران و سالۆخەتێن وان یێن هۆنەری

گەلەك بیروراێێن جودا ل سەر چەرخێن دیرۆكیێن نەخشەبەرێن شكەفتا گوندك هەنە. پشتی تاها باقر ی سەرەدانەك بریە وی جهی دبێژیت ئەو دیمەن یێ مێهڤانداریەكێ، یان ئاهەنگەكێ یە ، مینا دیمەنێن وان شوینوارانە، كو ل هزارا سیێ پێش زایینی ل لایێ باشووری دۆلا هەردو روباران (وادی الرافدین) دبەربەلاڤ[٣٥].

شوینوارناس (سیتون لوید) وەسان هزر دكەت كو دیرۆكا ئێك ژ وان هەردو نەخشەبەرێنان ڤەدگەریێتەڤە وی چاخێ هێشتا چاندن ل ڤۆناغێن وێ یێن دەستپێكی، لەوما دڤێت ئەڤە ل بەر چاڤ بهێتە وەرگرتن.

(باختمان) پتر بۆ هندێ دچیت، كو ب لێكەریانی ل وی گرێ نێزیكی شكەفتێ، دێ هندە شوینوار دەركەڤن ، و دێ چاخێ دیرۆكیێ هەر نەخشەبەرێنەك ژ وان هویرتر دیار بیت[٣٦].

لێ (مەحمود ئەلئەمین) وان ڤەدگەرینتە (حیسییان یان میتانییان)، و هەر ئەو بخۆ وەسان هزر دكەت كو ئەڤ چەندە ژی هزرەكا كەڤنە. چونكی دیمەنێ گیانداران و دیمەنێ نێزیكرن(ألتقریب) مینا وان دیمەنانە، كو دناڤ كەڤال و ختمێن (لۆلەیێن - اسطوانی) سۆمەری و بابلیان دا دهێنە دیتن [٣٧].

ئەگەر ئەم نەخشەبەرێن شكەفتا گوندك هەڤبەر بكەین دگەل نەخشەبەرێن چاخێ (نیمچە نڤیسكی-الشبیه بالكتابی) (٣٥٠٠-٢٨٥٠پ.ز)، دێ هێتە دیار كرن وەكهەڤیەك ژلایێ بابەتی و جلكان و سەروچاڤان یێ دناڤبەرا وان دا هەی.

هۆنەرێ سۆمەریان، كو دیرۆكا وی ڤەدگەریێتەڤە وی چەرخی، وێنە یێن هاتینە نەخشاندن كو لایێ ژووری ژ لەشی وان یێ رویسە و دفن وان یا خوارە[٣٨]، وزەلامێن ئایینی (كهنە) یێن سۆمەریان، ل دووڤ پاڤژیا رێ و رەسمێن ئایینی پێدڤی دكر سەرو ریهێن خۆ دتراشین.

میرێن وان ژی، د كریارا نێچیرێ دا (تەنۆرەكێ) كورت ل بەر خۆ دكرن، و ڤائیشەكا دیار ودەركەتی ل بن لایێ ژووری ژ لەشێ رویس گرێددان[٣٩]. و ئەڤە ب تەمامی وەكی وێنێ وی نێچیرڤانی یە، كو دنەخشەبەرێنێ ئێكێ یێ شكەفتا گوندك دا. و (تەنۆرە) تدارەكەكێ سومەرییە، ناڤتەنگا لەشی و دسەر هەردو رانان دا یێ د هاتنە دگرتن، و جیاوازیەك ل سەر درێژاهیا ڤی كراسی یێ هەی، كو دگەهیتە دسەر، یان د بن چۆكی را. و د سەردەمێ سۆمەریان دا (تەنۆرە) ل وەلاتێ دۆلا هەردو روباران دا جلكێن ژن و زەلامان بوو[٤٠]. حاكمێ سۆمەری (EN) ل دەستپێكێن ئێكێ ژ سیستەمێ سیاسی كو دهاتە نیاسین ب(هێژا - السید) یێن ل بەر خۆ كرین، و د ناڤ وان نەخشەبەرێن دەركەتی و موورێن لۆلەیی دا یێ هاتییە نیاسین ب زەلامێ خودانێ تەنۆرێ (رەنگ تۆر- ذی التنورة المشبكة)[٤١].

ل سەر كیڤی ژی، نێچیرڤانی ئەو یا ب تیرەكێ كو ل پشتا وێ دای یا هنگافتی و وەسان دیارە ئەو د سەروبەرێ رەڤێ دابوو و دبیت ڤی دیمەنی هندە پالدەرێن ئایینی هەبن. وێنێ گیانداران ل وی سەردەمی، دەربرینا پیرۆزیێ یە ل نك مرۆڤی، چونكی ژێدەرێ سەرەكیێ خوارنا وی بوو[٤٢]. و دبیت نێچیرڤان دەربرین ژ خوداوەند دوموزی، ژبەر وان موورێن لۆلەیی كو دیرۆكا وان ڤەدگەریێتەڤە چاخێ (جمده نصر) و تێدا شڤانێ شاهی و نێچیرڤان دوموزی، كو ب هەمان كریارا نێچیرێ رادبیت د هێتە دیتن[٤٣]، هەروەسان وێنێ كیڤیێ چیایی ب شاخێن خۆ یێن درێژ ڤە ل وی دەمی یێن هاتینە نەخشاندن[٤٤]، و سۆمەریان بهایەكێ مەزن ددانە نێچیرا كیڤیان[٤٥]، سەرەرای هندەك بەلگەیێن دی كو دێ ئاماژە دێ پێ هێتەدان.

هندی نەخشەبەرێنێ دووێ ژی، ئەو ژی دەربرینا ئاهەنگەکێ یان مێڤانداریەکێ یە، چونکی ئاهەنگ گێران هەر ژ دەستپێکا سەردەمێ ئاکنجیبوون و کووم ڤەبوونا مرۆڤان دگەل وان یا بەردەوام بوو[٤٦]. پشتی مرۆڤ فێری چاندنێ و ب خودان کرنا گیانداران بووی، ئاهەنگ گێران پەیدابوون[٤٧]، ل دەستپێکێ پێکدهات ژ سەماێن هەڤپشك كو ل سەر (فخاریات) ێن دیوارێن سامراو ل دەورو بەرێن (٤٥٠٠) پێشی زایینی دهاتنە نەخشاندن[٤٨]، و ئەو ئاهەنگ یان ب هەلکەفتا سەرکەتنا هەوەکا نێچیرێ یان سەرکەتن ل سەر دوژمنان[٤٩]دهاتنە گێران، یان ب هەلکەفتا هەڤژینیا پیرۆز [٥٠]كو ئاهەنگ ل جەژنا سەرێ سالێ دکرن[٥١].

ئەو ئاهەنگ گێران ب سەرژێکرن و خوارنا گیاندارەکی ب هەڤرا دەستپێدکرن، چونکی ئەو ل وێ باوەریێ بوون، کو ئەڤە رێکەکە بۆ موکوم کرنا پەیوەندیێن جڤاکی و بەلاڤ کرنا خۆشیێ دناڤبەرا کۆما وان دا، و هەروەسان خێزانەکا ب تنێ نەدشیا گیاندارەکی د ئێك رۆژ دا بخۆت، ژ بەر هندێ گازی مرۆڤێن خۆ دکرن، وەکی دەربرینەك ژبوو هاریکاریێ و خۆشتڤیاتیێ[٥٢]، و هەر دوی دەمی دا وان دڤیا گیانەوەران بپارێزن، نە هەر خێزانەك ب تنێ گیانەوەرەکی هەر وەکی وی دڤێت سەرژێ بکەت. و ئەڤەیە جەژنێ دگەل خۆ دهینت. لەوما چ ئاهەنگ یان هەلکەفت نە دهاتنە ئەنجام دان ئەگەر قوربان دگەل دا نەبان[٥٣].

ئەڤ دیمەنە وەکی وی دیمەنی یە، کو ب ئاهەنگا هەڤژینیا پیرۆز ل سەرێ سالا سۆمەریان دهاتنە ئەنجام دان. تێدا زەلامەك و ژنکەك دروینشتینە، و دو زارۆکێن رویس یێ دناڤبەرا وان دا، و خولامێن ل دۆرا وان خزمەتێ دکەن، و ئەڤە ژ وان دیمەنانە کو ل چەرخێ دەستپێکی یێ سۆمەریان دیار بووین. و باشترین نموونە ئامانێ قوربانییان کو هەر چوار (خانەیێن - حقول) وێ جەڤەنگێن ئاهەنگێرانێنە ب هەلکەفتا بهارێ، و گەلەك جاران دیمەنێن مێهڤانداری و ڤەخواران ل سەر کەڤالێن قوربانیێ هاتینە نەخشاندن، ئەو دو کەسێن تێدا دەربرینەکە ژ شاهی و ژنا وی و خولام یێ ئامانێن خوارنێ رادکەن، و هندەك ژ ڤان کەڤالان ژبۆ کاروبارێن ئایینی یێن هاتینە تەرخان کرن، وەکی ئاهەنگ گێران ب هەڤژینیا پیرۆز، کو وەکی سنج ل سەرێ هەمی سالان دهاتنە ئەنجام دان[٥٤].

نەخشەبەرێ سێێ ژی، دهێتە هەژمارتن ژ گرنگترین نەخشەبەرێنان چونکی وێنێ وی خوداوەندی دناڤ خۆدا هەمبێز دکەتیێ هەردەم ل سەرەژووری یێ هاتیە چێکرن، و ئەڤە ب بوورینا هەمی چەرخێن دیرۆکی دا، وەکی سنجەکی بوو، کو خوداوەند ل سەرەژووری و ب رەنگەکێ بەرچاڤ دروست دکرن[٥٥]. و (پرەنسیبێن کومتی - مبدأ القمه) ژ پرەنسیبێن بنەرەتی بوو کو نەخشەبەرێنساز د هەر کارەکێ خۆیێ هۆنەری دا ل سەر دچوو. و کەڤالێ سەرەژوور یان بلندتر دەربرین ژ کومتێ رووداني د هەر نەخشەبەرێنەکیدا د کر، وەکی چەوان ئەم ل سەلکا نێچیرا شێران و ئالایێ ل باژێرێ ئۆر دا دبینین. و یا دیار ئەوە کو دیمەن دەربرینێ ژ خوداوەند دوموزی دکەت، ژ بەر وان جەڤەنگێن ل رەخ و رویێن وی، کو نیشانا وێ چەندێ نە، و د دیمەنی دا خویایە کو خوداوەند یێ خوارنێ ژ دارەکێ ددەتە کیڤی و ئەڤ هەردوە جەڤەنگێن دوموزی هەر دگەل دا بوون، وەکی چەوان ل سەر موورەکێ دیاربووی، کو دیرۆکا وێ ڤەدگەریێتەڤە چەرخێ ئەکەدیان، و هەر ب وی رەنگی و وێ ناڤەرۆکێ[٥٦]. د هندە مووران دا دناڤ دیمەنی دا دیارە کو گەلەك تایێن دارا ژێ دچن[٥٧]. چونکی ل دویڤ بیر و باوەرێن وان، ل جەژنا سەرێ سالێ، و ب ڤەژین و زڤرینا وان بۆ ژیانێ گیا و دار و بار شین دبن و چەروانە بەرهەڤ دبن، و دیاربوونا شێری دناڤ کەڤالی دا جەڤەنگەکە ژ جەڤەنگێن خوداوەند (ئەنانا)، کو ئەڤینی دگەل خوداوەند دوموزی هەی، و بەلگە بۆ ڤێ چەندێ وێنێ شێری یە، کو ل سەر ئامانێ قوربانیێ هاتیە نەخشاندن *کو دەربرینێ هەر ژ وێ هەلکەفتێ دکەت، و ل سەر (قیثارة) دیار دکەت کو یێ سەمایێ ب هەلکەفتا هەڤژینیا پیرۆز

دکەت، و مرن بخۆ ژی ئاهەنگا جەژنا ژیانێ دکەت، وەکی چەوان ب وێنێ شێری هاتیە وێنە کرن.

دناڤ هۆنەرێ وەلاتێ دۆلا هەردو رویباران دا وێنێ هرچەکێ یێ ل سەر رویێ (قیپارێ)** و ئەو ژی یا سەمایێ ب هەلکەفتا هەڤژینیا پیرۆز دکەت[٥٨] (کەڤال ١٣). و هۆیێ دیار بوونا هرچێ دناڤ ئاهەنگێن هەڤژینیا پیرۆز دا، ڤەدگەریێتەڤە کارتێکرنێن بیر و باوەرێن دی ل سەر دەڤەرێ، و ئەو دەربرینێ ژ (مرن و ڤەژینیا گیانداری) دکەت، و ئەڤە ئەفسانەیە ژی، وەکی ئەفسانەیا دوموزی یە، خوداوەندێ رووەکان و مرن و ڤەژینێ ل نك مللەتێن کشتوکالی[٥٩]، کو ئاهەنگ ل دۆر وی دزڤرن، و کەسێ دی وەکی زەلامێن ئایینی یێن سۆمەرییانە (کهنە)، کو لایێ ژووری ژ لەشێ وان یێ رویسە و سەر و ریە دتراشینە، ژ بەر ئەنجام دانا وی بۆ رێ و رەسمێن ئایینی[٦٠]. و ژ بەر کو دەڤەرێن باکوور ل پلا ئێکێ خۆ دهێلانە ب هیڤیا بارانانڤە ، لەوما خەلکێ وان گەلەك یێ پێدڤی بوو، کو ڤان رێ و رەسمێن سێربەدی یێن تایبەت ب بارینا بارانێ ڤە بکەن، دا زاخ کرنا ئەردی ب کریارا هەڤژینیا پیرۆز پتر لێ بهێت[٦١].

ئەڤ رێ و رەسمە ل سەر (فخاریاتێن) سامراو[٦٢] و حلف[٦٣] هاتینە نەخشاندن، هەروەسان دیمەنەکێ هەڤژینیا پیرۆز ل تەپە گورا ژی یێ هاتیە دیتن، کو دیرۆکا وێ ڤەدگەریێتەڤە هزارا چوارێ پێش زایینی[٦٤] و ئەڤ جهەدکەڤیتە دویراتیا ٧٠ کم ژ باشوورێ شکەفتا گوندك، و دبیت ب رەنگەك ژ رەنگان پەیوەندییەك دگەل هەبیت، و ئەڤ رێ و رەسمە ل کوردستانا عیراقێ دبەردەوامن ،کو باراندنا بارانێ دناڤ رێ و رەسمێن ستران و سەمایا دا دهێتە کرن، زەلامەك کەڤلێ بزنەکا رەش ل بەر خۆ دکەت دگەل دوو شاخ و ریهێن ژ موی چێکری و کێلبێن ژ هەستیك، یان دارا چێکری[٦٥].

هەروەسان کەسەکێ دی دێ جلکێن رەشێن ژنکان دگەل خرخال و بازنکان ل بەر خۆ کەت، و سەماکەر ب رەنگەکێ بازنەیی دێ رووی ب رووی ئێك راوەستن و زەلام دێ خۆ درێژ کەتە ئەردی و ژنك دێ ئاخێ ب سەرێ خۆ وەرکەت، و زەلامێ مری دێ هەردو دەست و هەردو پێن خۆ، ببێچارەیی بلند کەت، و سەماکەرو بینەر بەردەوام دێ دەستا قوتن و ب بەردەوامی سترانا بێژن، و ژنك ل خوارتر ژ تەرمی دێ سجدێ بەت دا خەمدارییا خۆ پتر دیار بکەت، لێ زەلامەکێ دی ب لەز دێ سەتلەکا ئاڤێ ل سجدەدارێ کەت و ب ڤێ چەندێ زەلامێ مری دێ ڤەژینیتەڤە[٦٦].

هەروەسان دناڤ ئاهەنگێ داهرچێ ژی رادکەنە سەمایێ[٦٧]. دبیت ریهێن بزنی و شاخان، وێ رەنگە گرێدانەك دگەل خوداوەندێ سۆمەریێ (زوی ئەنجامدانا زاخێ - پیتاندنێ) ڤە هەبیت، کو دگەل پەزکیڤی یان بەرانی دناڤ موورێن کەڤندا یێ دیار. ئەو ژی دوموزی یە، کو پەروەردیگارێ دەڤەرێ سالۆخەتێن خوداوەندیی هەبین[٦٨].

ژ رێ و رەسمێن دی یێن وان ژێك پەرتاندن (التمزیق) ل هنداڤی گایەکێ سپی، و دانانا نیسانۆکان، ئەدونیس ل بهارێ ل سەر دەرگەهێن گۆری ل شێخادی دبشکڤن و ئەڤ سالۆخەتە گرێدای دوموزی و ئوزیریسینە[٦٩].و[٢١] ئاداری دهێتە هەژمارتن سەرێ سالا سۆمەرییان[٧٠] و یا کوردان (نەوروز) * - رۆژا نوی کو ل وێرێ هەیڤا زاخێ و شین بوونێ ل کوردستانێ دەست پێ دکەت، و ل بەرێ دووازدە رۆژان ئاهەنگ دگێران [٧١]و ئەو هەیڤا رابوون و ڤەژینا خوداوەند دوموزی یە، و د بەرێ دا ژن هینان و رابوون ب کارێن چاندنێ و جۆتکرنا ئەردی حەرام بوو، چونکی ئەرد یێ داگرتییە ژ ژیانێ و تۆڤان (٧٢) و کوردێن بسولمان ژی حەز ناکەن ژنێ د ڤێ هەیڤێ دا بینن، و وەسان هزر دکەن کو ئەڤ هەیڤە بخۆ بویکە. ئەڤ رەوشت و تیتالە بەلگەنە کو کوردان هندەك بیر و باوەرێن شارستانی یێن بنیات سۆمەری ئەوێن ددەمەکی دا ل کوردستانێ هەبین یێن وەرگرتین[٧٣] و ئەڤە مرۆڤی دگەهینتە وێ باوەریێ کو سۆمەری دچەرخێن کەڤن دا ژ ئاخا کوردستانێ یێن بەرەڤ ناڤەراست و ژێریا عیراقێ ڤە چووین، پشتی شەهرەزایین شارستانیێن پێدڤی ل دەڤەرێن زویرك و دەشتێن پانێن بەرین دیتین کو لێ ئاکنجی ببن[٧٤].

# پێنج - هێمایێن خوداوەندی

## تاجێ شاخدار :

یێ پێك هاتییە ژ تاجەکێ شاخدار ب دوو شاخێن پێکڤە نویسیای بەرەو ژوور و سەرێن وان د بادایـنە بۆ ژ دەرڤە (کەڤال ١٥-ج ). تاجێ شاخدار دهێتە هەژمارتن هێمایەکێ بنەرەتی ژ هێمایێن خوداوەندان ، هۆنەرمەند دا رابیت ب وێنەکرنا خوداوەندا مینا مرۆڤێن تەمام، کو مرۆڤ نەشێت جیاوازیێ دناڤبەرا وان و مرۆڤێن نۆرمال دا بکەت، تنێ ب تاجێ شاخدار نەبیت[٧٥] (کەڤال ١٥ أ). ئەڤ تاجێن ب دوو شاخان دچاخێ سۆمەریێن دەستپێکێ دا گەلەك دبەربەلاڤ بوون، لێ ڤێ چەندێ وەرار کر و دچەرخێ میر کودیا دا (چەرخێ بیست و دووێ پ.ز) یێ پێك هاتی بوو ژ چەندین شاخان[٧٦](کەڤال ١٥ — ب). و مەلکێ ئەکەدی نەرام - سین (٢٢٦٠-٢٢٢٣ پ.ز)[٧٧]تاجێ ب دوو شاخ ل بەر کر (کەڤال ١٦) کو پەسنێن مەلکێ خوداوەند هەنە[٧٨]. وئەو نیشانا ئاماژە دکەتە خوداوەندیێ دانا بەری ناڤێ خۆ و گۆتێ (خوداوەندێ ئەکەد)[٧٩]. و ڤی شاهی و هەمی شاهێن دی یێن ئەکەدی نە دهێلان بێژن کو ئەو بچویك بوون و یێن ژ هەڤژینیا پیرۆز چێ بووین، بەلکی سالۆخەتێن خوداوەندیێ یێن ژ هەمی خوداوەندێن دەولەتێن باژێران وەرگرتین کو دەنگێن خۆ داینێ، هەڤدژی هەمی شاهێن دی. کو ل وەلاتێ دۆلا دوو رویباران دا خۆ ب خوداوەند ددانە نیاسین و ژ بەر کو ئەو یێ ژ ئەنجامێ رێ و رەسمێن هەڤژینیا پیرۆز چێ بووین[٨٠].

دبیت باوەریەکا دی کو پتر جهێ باوەریێ بت دەربارەی بزاڤا مەلکان کو خۆ ب خوداوەند داینە نیاسین هەبیت، ئەو ژی ئەو سنجە یا عیراقیێن کەڤن ل سەر رانەهاتین بەروڤاژی ژ مسریان. ئەڤ بیرو باوەرە دبیت ژ بەر پێدڤیێن دەرکرنا فەرمانێن دامەزراندنا حوکمدارێن باژێرێن نێزیك هاتبیت، کو کەتینە دناڤ ئیمپەراتۆریەتا ئەکەدی دا، و ژ بەر کو دا سالۆخەتەکێ ئایینی بدەتە وێ دامەزراندنێ، مەلك نەرام سین و ئەوێن ل پشتی وی هاتین خۆ ب خوداوەند دانە نیاسین[٨١].

ناڤێ خودانێ دوو شاخان یێ دقورئانا پیرۆز دا هاتی :بسم الله الرحمن الرحیم(ویسئلونك عن ذي القرنین قل سأتلوا علیکم منه ذکرا)[٨٢].


## ژێدەر:

١. باقر: طة وفؤاد سفر ، المرشد الی مواطن الاثار والحضارة ، الرحلة الثالثة بغداد — الموصل ، بغداد — ١٩٦٦ ، ص ٤٣

٢. صالح : قحطان رشید ، الکشاف الاثری فی العراق ، المؤسسة العامة للاثار والتراث ، بغداد — ١٩٨٧ ، بث ٨٥

٣. گوندك پەیڤەکا کوردییە واتە گوندەکێ بچویك . (گوند) دگەل پیتا (ك) کو ئامرازەکە ژبوو بچویك کرنێ . بنێرە موکریانی : کیوی، فەرهەنگی کوردستان ، هەولێر ، چاپی یەکەم ، ١٩٩٩ ، ل ٨٢٤ . ل سەر پیتا (ك) ژی بنێرە مارف : ئەورەحمان حاجی ، وشەرونان لە زمانی کوردیدا ، چاپی دووەم ، ١٩٨٧ ، ل ٥٧

٤. الامین : محمود ، أستکشافات اثریة جدیدة فی شمال العراق ، (سومر ، م : ١٩٤٨ ، ٤ ، ج ١) ، ص : ٢٠٤

٥. مدیریة الاثار العامة : المواقع الاثریة فی العراق ، بغداد — ١٩٧٠ ، بث : ٢٨٧

٦. احمد : سهیلة مجید ، الحرف والصناعات الیدویة فی بلاد بابل وآشور ،رسالة دکتوراة ( نة بةلاظکری) جامعة الموصل (٦) -٢٠٠٠ ، ص : ١٣٩

٧. مظلوم : طارق ، تاریخ اکتشاف النحوتات فی شمال العراق ، الاثاری ، وزارة الثقافة والفنون ، بغداد — ١٩٧٧ ، ع ٣ ، بث ٩

٨. AL – Haik ، Albert . R . Key ، lists of Archaeological Excavation in Iraq 1942 – 1963 ، Florida – 1968 ، p : 44 .

٩. مظلوم ، تاريخ اكتشاف ،ص ١١

١٠. الامين : استكشافات ، ص ٢٠٧

١١. صالح : الكشاف الاثرى ، ص ٨٧

١٢. باقر : طة ، المقدمة فى تاريخ الحضارات القديم ، ط ١ ، بغداد – ١٩٨٦ ، ج ١ ، ص ١٧

١٣. مورتكات : انطوان ، الفن فى العراق القديم ، ترجمة وتعليق سلمان طة التكريتى ، بغداد – ١٩٧٥ ،ص ٤٣

١٤. باقر : مواطن ،ص : ٤٥

١٥. الامين : استكشافات ، ص ٢٠٤

١٦. صالح : الكشاف الاثرى ، ص ٨٧

١٧. هەمان ژێدەر، بث ٨٧

١٨. باقر : المرشد ، الرحلة الثالثة ، ص ٤٥

١٩. Wahby : T. The Rock – sculptures in Gunduk Cave ، (SUMER ، vol 4 ، 1948 ، No : 2 ، p : 145 .

٢٠. الامين : استكشافات ، ص ٢٠٥

٢١. مورتكات ، الفن ، ص ٥٤

٢٢. الامين : استكشافات ص ٢٠٥

٢٣. باقر : المرشد ، الرحلة الثالثة ، ص ٤٥

٢٤. الامين : استكشافات ، ص ٢٠٥

٢٥. صالح ، الكشاف الاثرى ، ص ٨٧

٢٦. الامين : استكشافات ، ص ٢٠٥

٢٧. جودى : محمد حسن ، تاريخ الفن العراقى ، النجف – ١٩٧٤ ، ج١ ، ص ٢٣

٢٨. الامين : استكشافات ، ص ٢٠٥

٢٩. Wahby ، rock – sculptures ، p : 146 .

٣٠. الامين : استكشافات ، ص 206

٣١. Wahby ، rock – sculptures ، p : 146 .

٣٢. الامين : استكشافات ، ص ٢٠٧

٣٣. صالح : الكشاف الاثرى ، ص٨٧ .

دبیت باراپتر تایێ دار خورمێ بیت، چونکی دار خورمە هێمایێ خوداوەند ئانانا بوو، و ل دووڤ ئەفسانەیێن سۆمەری خورمە یا ژ دندکێن کلێ ئانکی هاتییە دروست کرن، و ئەڤە بەلگەیە کو گرێدانەکا ب ئاڤێ ڤە هەی، ژبەر ڤێ چەندێ سۆمەریا و مللەتێن دی ئەو پیرۆز رادگرت، و بۆ سۆمەریان دارا ژیانێ بوو، و قورمێ وێ نیشانا خداوەندیێ ل سەری هەلدگرت و هێمایەك بوو ژ هێماییێن خوداوەند دوموزی . بۆ پتر پێزانینان بنێرە : الماجدى : خزعل ، انجيل سومر، ط ١ ، لبنان – ١٩٩٨، بث ١٥٨ . هەروەسان دار خورمێ جهەکێ ماقویل و گرنگ دشارستانیەتا وەلاتێ دۆلا دوو رویباراندا هەبوو ژ بەر مفایێن وێ بۆ ژیانا مرۆڤی. هەروەسان ئەو دار بوو یا عیسا سلاڤ ل سەر بن ل ژێدەر سیبەرا وێ هاتییە سەر دونیایێ، ناڤێ وێ یێ دقورئانا پیرۆز د سۆرەتا (مريم، ئایەتا ٢٥- ٢٣) و سۆرەتا (النحل ، ئایەتا ٦٧) و سۆرەتا (ق ، ئایەتا ١٠- ١١) دا یا هاتی. بۆ پتر پێزانینان بنێرە :

الجبورى : صلاح سلمان رميض ، ادب الحكمة فى وادى الرافدين ، بغداد – ٢٠٠٠ ، ص ١٦٠

٣٤. الامين : استكشافات ، ص ٢٠٧

٣٥. باقر : المرشد ، الرحلة الثالثة ، ص ٤٥

٣٦. Lioyd : Seton ، F.S.A ، GUNDUK (SUMER ، vol : 4 ، 1948 ، No : 2) ، p : 143 .

٣٧. الامين : استكشافات ، ص ٢٠٧

٣٨. مورتكات ، الفن ، ص ٣٣
٣٩. هەمان ژێدەر، ص ٣٦
٤٠. الجادر : وليد ، الازياء والاثاث ، موسوعة حضارة العراق ، بغداد – ١٩٨٥ ، ج٤ ، بث ٣٢٤
٤١. فلكشتاين ، أدام (عصور ما قبل التاريخ والعصور التاريخية فى غرب آسيا ، الشرق الادنى الحضارات المبكرة ، ترجمة عامر سلمان ، جامعة الموصل – ١٩٨٦ ، ص ٥٩ .
٤٢. جودى، تاريخ، ص ٥٤
٤٣. مورتكات، الفن ، ص ٥٢
٤٤. الاحمد: سامى سعيد ، العراق القديم ، جامعة بغداد – ١٩٨٠ ، ج١ ، بث ٢١٦
٤٥. Kramer : Samuel . Noah . The Sumerians . Chicago – 1963 . p : 4 .
٤٦. النعيمى : راجحة خضر عباس ، الاعياد فى حضارة بلاد وادى الرافدين ، نامەیا ماجستێرێ (نەبەلاڤکری) هاتییە پێشکێشکرن بۆ کولیژا ئادابێ زانکویا بەغدا – ١٩٧٦ ، ص ١١
٤٧. هەمان ژێدەر،ص٤
٤٨. هەمان ژێدەر، ص ٥
٤٩. هەمان ژێدەر، ص ٣
٥٠. باقر و یێن دی ، تاريخ ، ج ٢ ، بث ٣٥
٥١. ساكز : هارى ، عظمة بابل (لندن – ١٩٦٢) ، ترجمة عامر سليمان ، الموصل – ١٩٧٩ ، بث ٤٩
٥٢. رشيد : فوزى ، نشأة الدين والحضارة والعصور الجليدية (سومر ، م ١٩٧٦ ، ٣٢ ، ج ١ – ٢ ) ، ص ٣٦ – ٧
٥٣. النعيمى ، الاعياد ، ص ٢
٥٤. بصمەجى : فرج ، الالواح الحجرية المنقوشة فى المتحف العراقى ، (سومر ، م ٧ ، ١٩٥١ ، ج ١ ) ، ص ٦٢- ٦١
٥٥. مورتكات ، الفن ، ص ٥٢- ٥١
٥٦. Frankfort : H . Gods and Myths on Sargonid Seals . IRAQ . vol : 1 . 1934 . p : 13 .
٥٧. على : فاضل عبد الواحد ، عشتار ومأساة تموز ، وزارة الاعلام ، بغداد – ١٩٧٣ ، ص ٥٣
* ئامانێ قوربانیێ ئامانەکە ژ جۆرە بەرەکی (رخام) ی ، دیمەن ژ رێ و رەسمێن ئایینێ سۆمەریان ل سەر دهاتنە نەخشاندن ، و ل وەرکاء هاتینە دیتن ، بلنداهیا وی ١٠٥ سم ، دیرۆکا وی ڤەدگەرینەڤە دناڤبەرا هزارا چوارێ و دەستپێکا هزارا سیێ پ . ز ، ل مۆزەخانا عیراقی ل بەغدا یا پاراستییە، بۆ پتر پێزانینان بنێرە : مورتكات ، الفن ص ٥١ – ٥٠ – ٤٩ .
** روپێ ئامیرەکێ موسیکێ یە، دیمەنێن گیانداران ل سەر هاتینە نەخشاندن سەمایێ دکەن، ل گۆرستانا پاشایی ل ئۆر هاتییە دیتن، کو دیرۆکا وێ ڤەدگەرینەڤە چەرخێ هەلاتنا بەرەبابان ل نێزیکی (٢٥٠٠ ث.ز). بنێرە: الصوانی، اور، بث ٥٨- ٥٩.
٥٨. عكاشة : ثروت ، الفن العراقى (سومر وبابل واشور) ، بيروت – ١٩٧٢ ، ص ٢٢٢
٥٩. توكاريف : سيرغى ، الاديان (موسكو – ١٩٧٦) ، ترجمة احمد م . فاضل ، ط ١ دمشق – ١٩٩٨ ، ص ١٨٩
٦٠. الجادر ، الازياء والاثاث ، ص ٣٢٤
٦١. النعيمى ، الاعياد ، ص ١٤٣
٦٢. بارو : اندرى ، سومر فنونها وحضارتها ، ترجمة وتعليق عيسى سلمان و سليم طة ، بغداد – ١٩٧٨ ، ص ٩٤
٦٣. ساكز ، عظمة ، ص ٣٣
٦٤. الماجدى ، انجيل سومر ، بث ٥٣
٦٥. ئەڤ رێ و رەسمە ل کوردستانا عیراقێ دهاتنە ئەنجامدان ، و شوینوارناس هنری فرانكفورت یێن ل خورساباد ل ١٩٣٠/٣/٢٠ دیتین و چەند پێزانینێن گرنگ ل سەر توومار کرینە ، بۆ ڤپتر پێزانینان بنێرە :
Frankfprt : H. A Tammuz ritual in Kurdistan . IRAQ . vol . 1934 . p 139 .
٦٦. Frankfprt . A Tammuz . p : 137 .
٦٧. Ibid . p : 143 .

٦٨. Frankfprt . A Tammuz . p : 144 .

٦٩. Ibid . p : 145

٧٠. الماجدی ، متون سومر ، ص ٢٠٣

* نەوروز : سەرێ سالا کورد و فارسانە. هەر سال ل ٢١ ئادارێ ئاهەنگا دگێرن و دەربرینا سەرکەتنا چاکیێ یە ل سەر شەری بنێرە : المایی ، الاکراد ، ص ٧٠ .

٧١. النعیمی ، الاعیاد ، ص ٩٦ . هەر وەسان : علی ، المعتقدات ، ص ٣١١

٧٢. الیوسف : مرشد ، دوموزی ، ط ١ ، دمشق – ١٩٩٩ ، ص ١٣٠

٧٣. عبداللة : یوسف خلف ، الكورد وعلاقتة بالمفردات السومریة من خلال النصوص المسماریة ، مجلة شانەدەر ، ع ١٢ ، للمدیریة العامة للاثار – ٢٠٠٠ ، ص ١١٢ .

٧٤. سلیمان : عامر واحمد مالك الفتیان ، محاضرات فی التاریخ القدیم ، جامعة الموصل – ١٩٧٨ ، ص ٧٥

٧٥. مورتكات ، الفن ، ص ١٤١

٧٦. King . The Sumerian . p : 58

٧٧. Knapp . The History . p : 88 .

٧٨. CHILDE : V . CORDON . The Aryans U. S . A . 1948 . p : 17 .

٧٩. بوترو : جین ، الامبراطوریة السامیة الاولی ، الشرق الادنی الحضارة المبكرة ، ترجمة عامر سلیمان ، جامعة الموصل – ١٩٨٦ ، ص ١١٧

٨٠. رشید : فوزی ، نرام سین ، الموسوعة الذهبیة ، وزارة الثقافة والاعلام ، بغداد – ١٩٩٠ ، ص ٦٢

٨١. عبداللة : یوسف خلف ، الفكر العسكری فی العراق القدیم ، نامەیا دكتورایێ یە (نەبەلاڤكری) . هاتیە پێشكێشكرن بۆ (معهد التاریخ العربی والتراث العلمی – ١٩٩٦ ، ص ٢٤ ، ٢٣ .

٨٢. قورئانا پیرۆز ، سۆرەتا كەهف ، ئایەتا ٨٣ .

زانا و راڤەكەر د ناكۆكن ل سەر مەبەستا (ذی القرنین) كا كیبە . لێ پتریا بیر و رایان ل سەر سێ كەسان دكۆكن كو ئەو ژی ١- الاسكندر المقدونی . ٢- الصعب ذو القرنین الحمیری ٣- زەلامەكێ چاكێ نە بەرنیاس د چەرخێ ئیبراهیم سلاڤێت خودێ ل سەر بن دا . ژ بلی چەند بیروراییّن دی . بۆ پتر پێزانینان بنێرە :

یوسف : محمد خیری رمضان ، ذو القرنین القائد الفاتح والحاكم الصالح ، دمشق – ١٩٨٦ .

# ڤەکۆلینەك ل سەر پەیکەرەکێ برۆنزیێ ئەکەدی*

**دکتور طارق عبدالوهاب مظلوم**
**رێڤەبەرێ ڤەکۆلینێن ئاشووری**
**وەرگێران سالح یوسف سوفی**

ئەڤ شوینوارێ گەلەك گرنگ ب رێکەڤت ل گرەکێ شوینواری یێ ب ناڤێ (گرێ باستکێ) هاتییە دیتن دەمێ رێیا ل ناڤبەرا دهۆك - زاخۆ دهاتە ڤەکرن کو ئەڤ گرە دکەڤیتە رەخێ چەپێ یێ وێ رێکێ (بەرێ خۆ بدە دیگرامێ ١) ل گوندەکێ هەر ب وی ناڤی ل ناحیا سلێڤانەی ل قەزا سێمێلێ ل پارێزگەها دهۆك و پەیکەر ب رێیا ئامیرێ کۆلانێ (حەفارێ) ل کویرییا دو مێتران ل وی جهی هاتییە دیتن.

فەرە بێژین کو دبیت رێیا نۆکەیا ل ناڤبەرا باژێرێ مووسل (نەینەوا) و ترکیا هەر ئەو رێ ل سەردەمێن ئەکەدی ژی هاتبیتە ب کار ئینان، چونکی ب ساناهیترین و چۆلبڕترین رێیە و چ ئاستەنگێن هشکانی و ئاڤی ل وێ دەڤەرێ نینن، و ئەڤە ئەو رێیە یا ئەکەدییان ب کار ئینای داکو بگەهنە دەڤەرێن خرڤەبوونێن خۆیێن بازرگانی و لەشکەری ل دەڤەرا کەپەدۆکیا ل ناڤەڕاستا ئەنادۆلێ، هەروەسا دبیت ژی جهێ نۆکەیێ باستکێ ل سەر وێ رێیا ناڤبری باژێڕەکێ ئەکەدی بیت. (بەرێ خۆ بدە دیگرامێ ١)

دەمێ رێڤەبەریا گشتییا شوینواران ڤەدیتنا ڤی شوینوارێ گرنگ راگەهاندی کو جۆرەکێ کێم وێنەیە ل سەر وەرارا هۆنەری ل میزۆپۆتامیا، دەزگەهێن جودا جوداییێن راگەهاندنێ ب گەرمی ئەو دەنگ و باس بەلاڤ کرن ژ بەرکو ڤێ ڤەدیتنێ کاریگەرییەکا مەزن ل ناڤ ناڤەندێن شوینواری و هۆنەری هەبوویە.

ڤێجا ژ بۆ راکرنا پەردێ و رۆنکرنا لایەنێن مژەوی یێن ڤی شوینواری، مە ڤەکۆلینەکا هۆنەریا کورت کر بۆ زانینا وێ چەندێ کا ئەرێ ئەڤ شوینوارە چییە و چ کارێن هۆنەری تێدا هاتینە کرن (بەرێ خۆ بدە کۆڤارا - افاق عربیە - هژمارە ١ ئیلۆنا ١٩٧٥ ێ)، هەروەسا مە ئەڤ ڤەکۆلینە رادەستی کۆڤارا (سومر) ژی کر، هیڤیخوازین بسپۆرێن ڤەکۆلینێن نڤیسینا بزماری ڤەکۆلینا خۆ ل دۆر وێ نڤیسینا ل سەر ڤی پەیکەری هەی تمام بکەن، داکو خواندەڤایێ هێژا هەر تشتەکی ژ ڤی شوینوارێ بێ وێنە بزانیت.

ئەڤ شوینوارە (کەڤالێ ١) ژنیڤا ژێریا پەیکەرەکێ برۆنزی پێك دهێت کو پەیکەرێ لەشێ مرۆڤەکێ رویس و چپلاقە ل سەر بنکەکێ(تەقچکەکێ)

بازنەیی یێ ب تیرەیا ٧٢ سم و چێوەیێ(کەمەرەکا) ١٢٠ سم و بلنداهیا ١٠سم روونشتییە، ئەڤ بلنداهییە ژی ژ لایێ دەرڤە ب دو تیڤارێژێن هەڤتەریب هاتییە نەخشاندن (کەڤالێ ٣ ب، ٦ ب)، هەروەسا روویێ سەرڤەیێ بنکی لاکێشەیەکا (٣٤×١٣سم)ە و سێ دامکێن نڤیسینا بزماریا ئەکەدی ل سەر وی لاکێشەی هەنە، بسپۆر دبێژن کو ئەڤ شوینوارە یێ سەردەمێ شاهێ ئەکەدی (نەرام سین ٢٢٩١-٢٢٥٨ ب. ز)ە و ناڤەرۆکا گشتییا وی دەقی ئەوە کو شاهێ ناڤبری ل دەڤەرەکا نەیارێن ئەکەدییان نەهـ نەتەوە شکاندینە.

## رەوشا نۆکەیا پەیکەری:

تشتێ ژ وی پەیکەری مای پشکا ژێریا لەشێ گەنجەکێ روونشتییە (بەرێ خۆ بدە لایێ ژێری) و هەردو لنگێن وی ب ئاوایەکێ ئاسۆیی ل راستا ئێکن و تشتێ نۆکە ژ هەمی وێ بلنداهیێ مای هەر ژ سەر بنکی و بەرەڤ ژۆر (٥,٥ سم)ە.

وی گەنجی بۆری(لوولە)یەکا ب بلنداهیا ١٥ سم کریە د ناڤ هەردو لنگێن خۆ دا و چێوەیێ سەری یێ بۆریێ یێ تەبقی و خواروڤیچ بووی ٣٣ سم و چێوەیێ بنی ژی ژ وێ کێمترە، ئەڤ بۆرییە یا خلۆلەیە و لێڤا وێ دو کون لێ هەنە (کەڤالێ ٢،٣).

پەیکەر ل دەڤەرا زکی ب دووماهی دهێت کو ژ ئەنقەست هاتییە برین و پشکا ژووری یا پەیکەری ژ زکی و پێهەل نەهاتییە دیتن کو بێگومان ئەڤە پشکەکا گرنگە ژ کەلواشێ گشتیێ ڤی شوینواری، لێ ژ بەرکو ئەڤ پشکە بێسەروشوون بوویە، ب زەحمەتە ڤەکۆلەر بشێت لڤینا هەردو دەستان و سەری و سینگی بزانیت، بێگومانە ژی ئەڤ پشکە و بزاڤا هەردو پییان و بۆریا (ل نیڤێ) رەگەزێن سەرەکینە بۆ زانینا پێکهات و ڤەکۆلینێن ل سەر ڤی پەیکەری دهێنەکرن.

وەسا دیارە ژ ئەنقەست و ب مەرەمەکێ پەیکەر هاتبیتە برین، دەمێ مرۆڤ بۆ جارا ئێکێ بەرێ خۆ ددەتێ، بۆ دیار دبیت کو جۆرێ برینێ وەك پێتڤی گرنگی پێ نەهاتییە دان، ئەڤە ژی وەل مە دکەت هزرا هندێ بکەین کو ئەڤ پەیکەرە ژ لایێ وان نەیاران ڤە هاتییە برین یێن ئەڤ شوینوارە کەڤتییە د دەستاندا و هەر وان بڕییە و تێکدایە، دبیت مەسەلە وەسا نەبیت ژی، دبیت ئەڤ شوینوارە بەرێ و ل سەردەمێن کەڤن کەڤتبیتە د دەستێ هۆستایەکێ برۆنزی دا و ڤیا بیت کەرەستەیەکێ نوویێ مفادار ژێ چێ کەت و بۆ وێ چەندێ ژی پشکا ژووری حەلاندبیت، دبیت ئەڤ هزرە بەرئاقلتر بیت، چونکی هەکە کەڤتبا د دەستێ نەیارێن ئەکەدییان دا، بەری هەر تشتەکی دا نڤیسینا دیار و تمام یا ل سەر بنکی هێتە تێکدان (کەڤالێ ١٧).

سەربارێ وێ برینێ، هندەك دەڤەرێن دی یێن پەیکەری ژی هاتینە خراب کرن و شوونێن درب و رووشاندنێ ل سەر هەنە و باش د دیارن (کەڤالێ ٦)، پتر ژ هندێ ژی، ل سەردەمێ بۆری هندەك تبلێن پییان ژی بێسەروشوون بووینە، هەروەسا هندەك تبل شکەستینە یان بەرزە بووینە دەمێ ڤێ دووماهیێ ئامیرێ کۆلانێ ل وی جهی هاتییە ب کار ئینان و ئاخا وی جهی هاتییە راستڤەکرن (کەڤالێ ٣ ب، ٧).

## لڤینا پەیکەری:

هەکە بەرێ خۆ بدەینە هەمی پەیکەرێن سەردەمێن ئێك ل دووڤ ئێکێن شارستانییا میزۆپۆتامیا یێن ژ کەرەستێن جودا جودا هاتینە چێکرن، ئەم چو پارچەیێن شوینواری یێن وەکی ڤی نابینین کو نۆکە بابەتێ ڤێ ڤەکۆلینا مەیە، ل سەر ڤی شەنگستەی، دێ ڤەکۆلینەکا نەمازە ل سەر پەیکەری کەین و دێ پشتا خۆ ب هندەك لایەنێن دەستنیشانکری گەرم کەین و ئێك ئێکە دێ وان لایەنان رۆهن کەین:

١- پشکا ژووریا بێسەروشوونبوویا پەیکەری، هەروەکی مە بەری نۆکە بەحس کری، گەلەك یا گرنگە بهێتە ڤەکۆلان و کێمترین تشتێ ل سەر بهێتە گۆتن ئەوە بێژین کو لڤینا هەردو دەستان پەیوەندییەکا موکم ب وی تشتی ڤە هەیە یێ

ب بنكێ بوڕیا خلۆلەڤە هەی یا ل ناڤ هەردو پیبان هاتییە ڤاهیمكرن كو دوو كون بۆ گرێدانێ لێ هەنە (كەڤالێ ٢)، ڤێجا تشتێ ب ڤی بنكێ لوولەیی(اسطوانی) ڤە گرێدای، دبیت تشتەكێ ب ئاوایێ ستوونی بیت وەكی (سنگی، سپێنەی یان بزماری) و ژ كەرەستەیەكێ نە برۆنزی هاتبیتە چێكرن، دبیت دار، یان بەر، یان كانزایەكێ گرانبها بیت لێ نە برۆنز بیت كو پەیكەر ژێ هاتییە چێكرن.

ڤێجا هەكە ل وێنەیێ بنكێ لوولەیی بزڤڕین، دێ بینین كو تیرەیا رەخێ ژووری بەرفرەهترە و ل ژێری بەرتەنگترە (كەڤالێ ٣،٢)، ئەو تشتێ ژێ بلندی بووی ژێ پیچ پیچە قەبارێ وی بەرەڤ خوارێ بەرتەنگ دبیت، ئەڤە ژی مە پالددەت بزڤڕینە هندەك پەیكەر و كارێن دی یێن پەیكەرتاشییا بلند وەكی وان خوداوەندێن خۆچەماندی و ب هەردو دەستێن خۆ پارچەیەكا وەكی سپێنەی گرتین و ب بنی ڤە هاتییە ڤاهیمكرن و تیرەیێ وی ژ ژوور و ژ ژێر پیچ پیچە بەرفرەه دبیت، هەروەكی ل سەر كارەكێ پەیكەرتاشییێ بلند هەی یێ ژ بەری هاتییە چێكرن و نڤیسینا سەردەمێ (بوزور ـــ ان شوناك) ل سەر هەی و دزڤڕیتە دووماهییا سەردەمێ ئەكەدی كو ل سوسە[1] (كەڤالێ ٩ ب) هاتییە دیتن، هەروەسا پەیكەرەكێ دی یێ برۆنزی یێ سەردەمێ (كۆدیا) هەیە كو ئەو ژی پەیكەرەكێ خوداوەندەكییە هەر ب وی ئاوایی سپێنەك د دەستی دایە[2] (كەڤالێ ٩ أ).

ئەڤ هەمی نموونە وان گومانان ل سەر لڤینا پشكا ژووریا پەیكەری نەخاسمە ژی ل سەر لڤینا هەردو دەستان ڤەدرەڤینن، تشتەكێ مسۆگەرە كو هەر د بنواشەدا پەیكەر وەسا هاتبیتە دیزاینكرن كو تشتەكێ وەكی سپێنەی د دەستی دا بیت، ب وی ئاوا و تێكەهێ مە بەری نۆكە گۆتی.

٢- ئاوایێ روونشتنێ د ڤی پەیكەرێ مە دا، ئاوایەكێ گەلەك كێم وێنەیە د هۆنەرێ عیراقیێ كەڤندا، هەكە هوورك بەرێ خۆ بدەینە ڤێ روونشتنێ، دێ بینین لایێن ژێری ل سەر بنكی د بنەجە و رحەتن و نەوەكی وانە یێن مە د نموونەیێن بەری نۆكە دا دیتین (كەڤالێ ٩).

د ڤان نموونەیان دا روونشتن ب ئاوایێ خۆچەماندنێ یە و نەوەكی روونشتنا بنەجهە هەروەكی د پەیكەرێ مە دا هەی، سەرباری ڤێ چەندێ، تشتەكێ ئەنقەست ژ لایێ هۆنەرمەندی ڤە ل سەر رەوشا پیبان هاتییە كرن، وی ئەڤ رەوشە كریە لڤینەكا بەردەوام یا ل دۆر بنكێ لوولەیی دزڤڕیت، ب ئاوایەكێ وەسا ران و لنگێ چەپێ لڤینا بەردەواما ران و لنگێ راستێ تمام بكەت (كەڤالێ ١-٣)، ئەڤە سەرباری گونجانا لڤینا هەردو پیبان دگەل ئێك ودوو و پێ راستێ دگەل هەڤكووڤێ وی یێ پێ چەپێ بەرویشتی ئێك دبن، ب ئاوایەكێ وەسا مرۆڤ ب ئاوایەكێ ئۆتۆماتیكی ژ ڤی پی بەرێ خۆ بدەتە پێ دی كو رەگەزێ زڤڕین و بەردەوامیێ تێدا هەیە.

٣- هۆنەرمەندێ ئەكەدی یێ ئەڤ پەیكەرە چێكری، هەبوونا جهەكێ ڤالا ل سەر روویێ بنكی پشتگوهڤە نەهاڤێتییە كو ل ناڤبەرا هەردو پیبان و لێڤا بازنەییا وی بنكی هەیە (كەڤالێ ١، ٣ أ)، وی هۆنەرمەندی دامكا لاكێشەیی یا نڤیسینێ رێكخستییە و درێژاهی و فرەهییا وێ دگەل روویەرێ وێ ڤالاتیێ گونجاندییە.

ئەڤە ژ لایەكی، ژ لایەكێ دووڤە، هۆنەرمەندی نڤیسین ب خۆ ژی وەك پەرەگرافەكا تمامكەر بۆ لڤینا پیبان ب كارئینایە و كریە پشكەكا جودانەبووی ژ پێكهاتێ گشتیێ ئەڤ كارە پێ بەرچاڤ دبیت، مەگرتی ئەو نڤیسین نینە، بێگومان ئەو ڤالاتی دێ بیتە جهێ بێزارێ و هەتا رادەیەكێ بلند دێ هەڤسەنگیا گشتیا ڤی پەیكەری كێم كەت.

ب كارئینانا نڤیسینێ وەك پشكەكا جودانەبووی ژ پرۆسێسا ئاڤاكرنا بابەتێ نوو ل نك پەیكەرتاشێ ئەكەدی، پرۆسێسەكە باش د پێكهاتا بابەتێ مۆرێن لوولەیی یێن ئەكەدی دی دا دیار دبیت، د ڤان مۆران دا هەلكۆلەری فۆرمێن نڤیسینێ[3] (هێل و رووبەر) وەك قەبارە و بهایێن هۆنەری ب كارئینانە و دشیاندا نینە د بابەتێ گشتی دا بهێنە پشتگوهڤەهاڤێتن كو ئارمانج ژێ دیاركرنا وی بابەتییە (كەڤالێ ١٠،

١١أ، ١٢ ب) و بەری مە ژی مامۆستا (فرانکفۆرت) تێبینیا ڤێ چەندێ ل سەر مۆرێن لوولەیی یێن ئەکەدی کریە[٤].

هۆسا، گونجان ل ناڤبەرا رووبەرێ هاتییە نڤیسین و نەهاتییە نڤیسین و کۆمەل و قەبارێن وەکی یی یێن د پەیکەرێ مە دا، نموونەیەکا دیارە بۆ سەرکەڤتنا هۆنەرمەندێ ئەکەدی و زانینا هوور د بابەتێ گونجان و نەگونجانێ د هۆنەری دا، کو ئەڤە ژی کارەکێ گەوهەری و فەرە بۆ سەرکەڤتنا هەر پارچەیەکا هۆنەری.

## ئەرێ پەیکەر کەسەکە یان خوداوەندەکە؟

پێتڤی بوو نڤیسینا ل سەر بنکی هاتییە توومارکرن، زانیاری ل سەر ناسناما ڤی کەس دابانە کا ئەڤ پەیکەرە کییە، لێ ڤان زانیاریان چو ل سەر ڤی بابەتی پێشکێشی مە نەکریە هەروەکی بسپۆرێن خواندنا نڤیسینێن بزماری گۆتین، هەروەسا بێسەروشوونبوونا پشکا ژووری یا پەیکەری گەلەک پرسیارێن دی ژی دئازرینیت و بوویە ئەگەرێ هندێ زانیارێن سەرەکی ل سەر وی پەیکەری ژناڤ بچن و نەمینن، ژ بەر هندێ، ئەم حێبەتی دبین و نەشێین دیار بکەین کا ئەڤ کارێ هۆنەری نوینەریا کێ دکەت.

لێ سەرباری ڤان ئاستەنگان، هندەك ئاماژە هەنە و رێیا مە خۆش دکەن داکو گرێدانەکێ ل ناڤبەرا ڤی کارێ هۆنەری و هەڤکووفێن وی یێن هۆنەرێ سەردەمێ ئەکەدی بکەین وەکی مۆرێن لوولەیی و پەیکەر و کارێن دی یێن پەیکەرتاشییا بلند.

ب پشتەڤانییا وان ئەگەرێن من گۆتین و ژ بەر راستیێن ئێك ل دووڤ ئێکێن دهێنە دیار کرن، پەیکەر دێ خوداوەندەك یان نیڤ خوداوەندك بیت د کەلواشێ گەنجەکێ رووتشتی دا (بەرێ خۆ بدە لایێ ژێری) و مژوولی ریتوال و رێ ورەسمێن ئایینی یێن ئەکەدی یە، کو ئەو ژی ب دەستگرتنا وی سپێنەیە یێ د لوولەیێ دا بنەجهکری ب وی فۆرم و ئاوایێ هاتییە گۆتن.

د هۆنەرێ عیراقیێ کەڤن دا، نەخاسمە ژی د هۆنەرێ ئەکەدی دا، کەسانێن کارێن هۆسا دکەن و ب ئاوایێن جودا جودایێن هۆسا پەیکەر بۆ دهێنە چێکرن، بێ گومان ئەو خوداوەندن و پەیکەر بۆ هاتینە چێکرن دەمێ تشتەکێ شاخدار دکرنە سەرێ خۆ، نموونە ژی بۆ ڤێ چەندێ ئەو تشتە یێ د کەڤالێ ٩ دا هاتییە بەلاڤکرن.

هەکە مە گرتی کەسانێ پەیکەر بۆ هاتییە چێکرن شاهەك بیت، پەیکەرتاشێ ئەکەدی ئەوێ دەستوور و تێگەهێن وی دەمی پشتگوهڤە ناهاڤێت، چەوان دێ ڤێ مەسەلێ پشتگوهڤەهاڤێت و چەوان دێ وی رویس و چیلاق کەت، چونکی هەمی پەیکەرێن بۆ شاهێن ئەکەدی نەخاسمە ژی بۆ (نەرام سین)ی هاتینەچێکرن، هەمیان جلك ل بەر هەنە[٥].

ب ڤی ئەنجامی دگەهینە داوییا وێ هزرا دبێژیت ئەڤە پەیکەرێ شاهەکی بیت، دبیت ئێك بهێت و بێژیت کو ئەڤە پەیکەرێ ئێك ژ وان کەسان بیت یێ (نەرام سین) ب سەر سەرکەڤتی و پەیکەرێ هۆسا رویس بۆ چێ کریبیت، چونکی ئەکەدیان د کارێن خوێنێن پەیکەرتاشیێ دا ئەڤ چەندە دکر و دوژمن و نەیارێن خۆ هۆسا نیشا دەدان[٦]، لێ ئەڤ مەگرتییە د جهێ خۆدا نینە، چونکی مەسەلەیەکا ڤەبڕ و ئێکلاکەر هەیە کو ئەو ژی ئەو کەمەرە یا ل دۆر ڤی کەسی ئالیای یێ پەیکەر بۆ هاتییە چێکرن (کەڤالێ ٢،٦) ئەڤ کەمەرە ژی ژ شریتەکا دیار یا ب چوار ناڤبڕێن وەکی وەریسی پێکدهێت و ل وێرێ ب دووماهی دهێت، ل رەخێ چەپێ یێ کماخێ ژی شریتەکا وەکی کەمەرێ پیچەك خویل و خوار دبیت و شۆڕ دبیتە خوارێ (کەڤالێ ١،٥).

مسۆگەرە ژی ئەڤ جۆرێ کەمەران تایبەتن ب دوو قارەمانان ڤە یێن گەلەك جاران ل سەر مۆرێن لوولەیی یێن ئەکەدی دهێنە دیتن[٧]، کو ڤەکۆلەرێن پەیوەندیدار وەسا شرۆڤە دکرن ئەڤ کەسە هەردو قارەمانێن ئەفسانەیی (گلگامش) و (ئەنکیدۆ) بن، چونکی ئەڤ هەردو قارەمانە هەردەم رویس و ب ڤان جۆرێن کەمەرێن تایبەت ب وان ڤە دهاتنە نیشادان

(كەڤالێ ١١)، هندی گلگامشە د كەلواشێ مرۆڤەكێ ریهدارێ پرچدرێژ و كەزیێن وەربادایێن ڤەهاندی دایە، لێ ئەنكیدۆیێ قارەمان نیڤا وی مرۆڤە و نیڤا دی كو لایێ ژێریە د كەلواشێ گایەكی دایە، هەروەسا سەرێ وی سەرێ مرۆڤییە و جۆتەكێ شاخان پێڤە هەیە[٨]، كو گەلەك جاران ل سەر مۆرێن ئەكەدی مرۆڤێن قارەمانێن رویسێن كەمەردار دهێنە دیتن هەروەكی بەری نۆكە هاتینە سالۆخدان و تانجەكا شاخدار ل سەریە كو ئەڤە ژی هێمایێ خوداوەندینییا وی یە[٩]، هەروەسا ئەڤ قارەمانە ب ڤێ تانجێ[١٠] (كەڤالێ ١٢ب) و بێ تانج[١١] (كەڤالێ ١٢أ) زۆرانبازەكە و دگەل هەڤكووڤەكێ خۆ دهێتە دیتن.

د ڤان مۆران دا هەر وی قارەمانی دبینین كو دەستێ خۆ هاڤێتییە دارێ مەلبەنێ دەرگەهی (كەڤالێ ١٣ب) و ژ پێڤە راوەستایە[١٢] یان خۆ چەماندیە[١٣]، هەروەسا پەیكەرێ وی هاتیە چێكرن دەمێ زێرەڤانیا خوداوەندەكێ روونشتی دكەت[١٤] (كەڤالێ ١٣أ)، هەروەسا دبینین كو د رەوشا خۆچەماندنێ دایە و پێ زێرەڤانیا خوداوەندی دكەت لێ ئەو دار د دەستاندا نینە پێ بەری نۆكە هاتییە بەحسكرن[١٥]، هەروەسا مۆرێن دی یێن ئەڤ قارەمانە ل سەر دیار دبیت، ئەو مۆرە یا د كەڤالێ (كەڤالێ ١٠أ) دا هاتییە بەلاڤ كرن و دبینین ئەڤ قارەمانە پێ ب ئامانەكی گایەكی ئاڤ ددەت و ئاڤ ب هەردو رەخێن وی ئامانی دا دهێتە خوارێ.

ئەو كەسایەتییا ئەڤ پەیكەرێ برۆنزی پێ ژ لایێ فۆرم و ناڤەرۆكێ ڤە دەربرینێ ژێ دكەت وەكی وی قارەمانێ رویسە پێ دیاربوونا وی ل سەر مۆرێن لوولەیی یێن ئەكەدی هاتییە ژێبرن، دیارە ژی ئەڤ قارەمانێ بەحسێ وی هاتییە كرن رۆلەكێ مەزن د ژیانا ئایینی یا ئەكەدی دا هەبوویە، چونكی گەلەك هەبوونا وی ل سەر وان مۆران، وێ مەگرتییا مە پشتراست دكەت و دشێین بێژین كو پتر ژ نیڤا مۆرێن لوولەیی یێن ئەكەدی یێن ل بەر مە بەرنیاس ل سەرانسەری مۆزەخانە و كۆمەلێن جیهانی، ئەڤ قارەمانێ رویسێ خودان كەمەر ل سەر دیارە، بۆ مە تشتەكێ سەیر نینە وی ب وێ بەژن وبالێ (نە تنێ ل سەر وان مۆران) ل سەر ڤی پەیكەری ژی ببینین كو بابەتێ ڤەكۆلینا مەیە، ئەو هەر دمینیت هەلگرێ تایبەتمەندیێن خوداوەندی و دەمێ خۆ ب كارێن قەنجێن تایبەت ب پڕ باوەریا ئایینی یا ئەكەدی ڤە دبۆرینیت، سەیر نینە ژی ئەڤ قارەمانێ د ڤی پەیكەرێ مە دا مژوولی كارەكی ژ ڤان كاران بیت كو ئەو ژی گرتنا سپێنەیە هەروەكی بەری نۆكە مە بەحس كری.

## گرنگی یا هۆنەری یا پەیكەری:

ئەڤ شاكارە ب تنێ ل ناڤ پەیكەرێن دی یێن سەردەمێ ئەكەدی دێ دیار و سەربلند مینیت، چونكی نە نۆكە و نە ژی سەردەمێن دی مە چو بەرهەمێن هۆنەری یێن هۆسا د شارستانییا دویر ودرێژا میزۆپۆتامیا دا نەدیتینە.

ئەڤ پارچا شوینواریا كێم وێنە دبیتە ڤەكۆلینەكا نوو و گیانەك و ستایلەكێ تایبەتی ل سەر توومارێن مە یێن هۆنەری زێدە دكەت كو مە د چو پارچێن دی یێن شوینواری دا نەدیتینە، ب ڤێ چەندێ، ئەڤ شوینوارە رۆناهییەكا نوو زێدە دكەت و تەخێن بنواشەكێ موكم ئاڤا دكەت و دیارۆكەكا بەرچاڤە د وارێ وەرارا هۆنەراندا نە تنێ ل میزۆپۆتامیا، بەلكی د وارێ هۆنەرێن پەیكەرتاشیێ دا ل سەرانسەری جیهانێ، هەرچەندە ژی پشكەكا گرنگ ژ ڤی شوینوارێ مەزن هاتییە ژێڤەكرن، لێ هەتا رادەیەكێ بلند شیاینە ب پشكا ژێریا مایی گەلەك مەسەلێن هوورێن تێدا بزانین.

ئێكەمین تشتێ بالكێش د ڤی پەیكەری دا، سەركەڤتنا هۆنەرمەندێ ئەكەدی و شیانێن وی یێن بەرفرەهن د تێگەهشتنا لەشێ مرۆڤی و هەمی هووركارییێن لەشی دا، ژ بەر هندێ، پێتڤییە ڤی پەیكەرتاشی ب هووری ڤەكۆلین ل سەر زانستێ توێكاری (علم التشريح Anatomy) كربیت و لڤین و زەڤلەكێن جوداجودایێن مرۆڤی زانیبن، هەر

ژ بەر هندێ ژی هەر لڤینەك و زەڤلەکەکێ بەهرا وێ دابیتێ، چونکی لڤین و زەڤلەك و پشکێن سەرڤەیێن جودا جوداێن ڤی کاری ب ئاوایەکێ وەسا هاتینە ئەنجامدان کو تێدا کاملانبوونا شیانێن پەیکەرتاشی و شیانێن وی یێن دەربڕینێ دیار دبن ب وی ئاوایێ وی ڤیای، نموونە ژی بۆ یا مە گۆتی، ئەو ئاوایە یێ لنگێ راستێ یێ پەیکەری یێ هاتیە چێکرن (کەڤالێ ٤) کو کەلواشێ دەرڤەیی ژ پشکێن سەرڤەیێن زەڤلەکان پێکهاتییە، هەڤدەم ژی زانیاریان ل سەر هێستی ڤەدشێریت کو ئەڤە ئەو بنواشەیە یێ زەڤلەکێن لنگی ل سەر هاتییە ئاڤاکرن، ل ڤێرە چو زێدەرۆیی و خۆڤەدزین نینە، بەلکی ستایلەکێ ریالیزمییە ژ خۆرستی هاتییە وەرگرتن و هەستا نازك یا پەیکەرتاشێ ئەکەدی ل سەر هاتییە زێدەکرن، پتر ژ هندێ، پەیکەرتاشی نەتنێ پویتە ب دیمەنێ دەرڤە دایە، بەلکی وێنەیەکێ راستگۆیێ چالاك ژی پێشکێش کرییە یێ وی ڤیای ل سەر لەشێ وی کەسی دیار بکەت یێ پەیکەرێ وی هاتییە چێکرن، ب ڤی ئاوایی، پەیکەرتاشی هندەك سەخلەتێن دەستنیشانکری د هزرا وی دا هەبووینە و ڤیایە د ڤی بەرهەمی دا دیار بکەت، پەیکەرتاشی گرنگیدایە دروڤێن گەنجینی و زرکوڕینی و خورتینیێ ب ئاوایەکێ وەسا هەست ب هندێ بکەین کو ئەڤە پەیکەرێ گەنجەکی بیت ژ ژێ بیست سالێ نەبۆرییت.

هۆنەرمەندێ ئەکەدیە یێ رێسایێن خواندنگەها ریالیزمی د هۆنەری دا بنەجهـ کرین و پێشئێخستین ب وی ئاوایێ د ڤی پەیکەری دا تێبینی دکەین، د هۆنەرێ عیراقیێ کەڤندا و بەری سەردەمێ ئەکەدی ئاماژە هەنە کو هۆنەرمەندان پەنابرینە بەر خواندنگەهێن هۆنەری، هەر بۆ نموونە، مە پارچەیەکا پەیکەرتاشییا لەشدار (مجسم) یا سەردەمێ (میسلیم) هەیە کو ئەو ژی ژ برۆنزی هاتییە چێکرن کو پێشییا پیێ مرۆڤەکییە و دشێین بێژین نێزیکی قەبارێ خورستییە[16] (کەڤالێ ١٤أ)، د ڤی کاری دا هۆنەرمەندی خۆ ژ ستایلێ سۆمەریێ پەیکەرتاشیێ دویرئێخستییە، هەر بۆ نموونە، وی خۆ رزگار کرییە تبلان پێکڤە گرێدەت و کارێ خۆ گەلەك ب دەستڕەنگینی و شارەزایی ئەنجامدایە، ڤێجا ئەڤ پارچە و پەیکەرێن دی یێن برۆنزی یێن وەك هەو(کەمپین) بۆ کاروبارێن ئایینی هاتینە ب کار ئینان کو ئەو ژی نیشادانا زەلامەکێ ریهدار و کەمەرداره (کەڤالێ ١٤ب)، ب پێکۆلێن بەری ئەکەدیان دهێنە ل قەلەمدان د بیاڤێ وان پەیکەرێن برۆنزی دا یێن ئاراستەیێن جودا جودا د سیستەمێ خواندنگەهێن هۆنەری یێن سۆمەری دا هەین، هەر بۆ نموونە، پەیکەرتاشی د پەیکەرێ برۆنزیێ کەڤالێ (١٤ب) دا کو ل جهێ خەفاجی[17] هاتییە دیتن، خۆ ژ ستایلێن کەڤن رزگار کرییە، وی پێگیری ب هۆنەرێ کوبیزم (تەکعیبی Cubism) نەکرییە کو ئەڤ هۆنەرە د پتریا پەیکەرێن سۆمەری دا هەیە، دێ بینین هەردو لنگ ژێکڤەکرینە، هەروەسا هەردو دەست ژی نەگەهاندینە سینگی، ب ئاوایەکێ گشتی، لەشداریەك دایە لەشی کو نێزیکی ژیواری بیت.

ئێك ژ وان کارێن دکەڤنە د ناف ڤێ کۆمێ دا ئەو پەیکەرێ بەری یە یێ دەربڕینێ ژ قارەمانەکێ رویسێ خۆچەماندی دکەت و کەمەرەك ل بەرە و ئامانەك[18] ل سەر سەرێ وی یە (کەڤالێ ١٦)، هەرچەندە ئەڤ کەڤالە ژ بەری هاتییە چێکرن، لێ ژ ئالیێ ستایلێ خۆیێ ریالیزمی ڤە بەرامبەری پەیکەرێن دی یێن برۆنزییە یێن مە بەحس کرین، هەرچەندە کو ماددێ بەری هەتا پلەیەکا کێم بوویە ئاستەنگ د رێیا گیانێ لەشداری و وێ هەستکرنێ دا یا مە سالۆخدای، هەروەسا پێدڤییە ژ بیر نەکەین کو دڤێت پەیکەرێ برۆنزیێ ناڤداریێ ل خەفاجی هاتییە دیتن کو وێنەیێ دوو قارەمانێن ئامان ل سەر سەری نە و خۆلێکدانێ دکەن[19] (کەڤالێ ١٥)، هەروەسا بابەتێ پایتۆنا شۆفێرەکێ (تل اجرب) سەرکێشییا وێ دکەت، بکەینە د ناف ڤێ کۆمێ دا[20].

ئەوێن ئەڤ پارچێن ژێکۆتی چێ کرین، ئەون یێن ب راستا کلیلێن خواندنگەها ریالستی یا پەیکەرتاشییا

لەشدار ل میزۆپۆتامیا دانایین، پەیکەرتاشیێ ئەکەدی ژی ل رێکا وان چوویە و رێسایێن ڤێ خواندنگەهێ و بنەمایێن وێ یێن بەرفرەهـ موکم و بنەجهـ کرینە، هەروەسا هۆنەرمەندێ سۆمەری سەربۆرێن خۆ ئەنجامداینە هەروەکی ئێکسەر ل سەر بەری دیار دبن و نەشیا خۆ ژ وان تەکعیبان رزگار بکەت یێن ل سەر بەری هەبوون بەری کارێ پەیکەرتاشی تێدا بهێتە کرن، لێ گیانێ لەشدارکرن و هووربینیێ د دەربڕینا پەیکەرتاشیێ ئەکەدی دا زالە، چونکی ل وێ باوەرێینە دەمێ وی کار د چێکرنا پەیکەران دا دکر، ل شوونا بەری تەقن ب کار ئینایە و پاشی ئەڤ گیانە ڤەگوهاستییە هەر ماددەیەکێ دی یێ رەق ڤێجا چ برۆنز یان بەر بیت.

ئەڤ ئاراستەیێ د هۆنەری دا هاتییە ب کار ئینان پێدڤییە ئارەزوویێن هۆنەرمەندی رازی کرین یێن هزرێن وی بەرەڤ ریالیزمێ چووین و بەرەڤ دەربڕینکەریێ (التعبیریە Expressionism ئیکسپرێشینیزم) نەچووین کو ئەڤە ئێك بوو ژ تایبەتمەندیێن هۆنەرمەندێن سۆمەری.

دشیاندایە کەزاختن و زێدەکرن و هەڤسەنگکرن ب گۆمتلێ تەقنێ بهێتە کرن، لێ دشیاندا نینە هەر ئەو تشت د پارچا بەری دا بهێتە کرن، ڤێ چەندێ ژی رێیا خۆ ل نك پەیکەرتاشیێ ئەکەدی دیتییە ئەوێ رێسایێن خواندنگەها ریالیزمی د پەیکەرتاشیێ دا بنەجهـ کرین.

رێیا داگرتنا پەیکەرێن برۆنزی ل سەردەمێن بەری ئەکەدییان د بەرنیاس بوون هەروەکی بەری نۆکە مە گۆتی، لێ هۆنەرمەندێ ئەکەدی یێ دەستهەل بوو د ئەنجامدانا پشکێن جودا جودایێن سەرڤەیێن پارچا برۆنزی دا ب ئاوایەکێ وەسا بەری هنگی ئەو دەستڕەنگینی مە نەدیتبوو، هەروەسا هۆنەرمەندێ ئەکەدی سەرباری کو دشیا لەشێن مرۆڤان و یێن دی بەرهەم بینیت، ژ بەرکو دشیا د زانستێ تویکاری بکەهیت، بهایێ لڤین و هەڤسەنگی و باش چێکرنا هێلێن دووماهیێ بەرهەمێ خۆ ژی ژ بیر نەکرن، وی پشکەکا ب تنێ ژی ژ ڤی کارێ خۆ نەهێلایە کاریکەرییەکا پێدڤی نەدابیتێ.

پەیکەرتاشیێ ئەکەدیێ ئەڤ پەیکەرە چێ کری، هەروەکی مە گۆتی پەیکەرێ خۆ ژ کەرەستێ تەقنێ چێ کرییە پاشی کرییە د قالبەکێ گێچێ دا و دڤێت ژی بۆ ژێڤەکرنا پەیکەری ژ قالبی ماددێ ڤیڕی هاتبیتە ب کار ئینان، لێ هەکە ب دەست نەکەڤتبیت، دبیت شەما ب کارئینابیت، پرۆسێسا ژێڤەکرنێ ژی ئەوە یا ب رێیا وێ پەیکەر دهێتە داگرتن، چونکی برۆنزێ حەلاندی جهێ ڤیڕی دگریت کو د بنواشەدا ئەڤە ئەو پەیکەرێ پێدڤی داگرتنێ یە، ئەڤ کارە ژی ب رێیا کونان دهێتە کرن داکو تێڕا برۆنزێ حەلاندی بچیتە د ناڤ دا، هەروەسا هندەك کونێن دی بۆ باژێبەردان و دەرئێخستنا گازێن ژ بەر گەرمیا بلند پەیدا بووین هاتبنە چێکرن.

چێکەرێ برۆنزی پەیکەر بۆ داگرتنێ کرییە دو پارچەیێن سەرەکی، لەشێ پەیکەری جودا ژ بنکی داگرتییە و هەر ئێك ژ وان جودا جودا تمام کرییە، لێ بنەجهکرنا لەشی ل سەر بنکی ب رێیا چوار سپێنێن لاکێشەیی ئەنجامداینە کو ب ئاوایەکێ نێر ژ بنێ لەشێ داگرتنی دەردکەڤن و دچنە د ناڤ بنکی دا کو چوار لاکێشەیێن خلۆلە ل سەر هاتبوونە چێکرن داکو ئەو سنگ بچنە تێدا.

هەکە بەرێ خۆ بدەینە بنێ بنکی ئەڤ چەند ب باشی دیار دبیت (کەڤالێ ٨)، پتر ژ هندێ ژی، چێکەرێ پەیکەری ب کارێ بنەجهکرنێ ب تنێ رانەبوویە، بەلکی لەشێ پەیکەری ب بنکی ڤە قاهیمکرییە، ئەڤە ژی ب رێیا تبلێن برۆنزی یێن د لاکێشەیێن نێر ڕا دەرباز دبن یێن ئەو سنگ پێڤە دهێنە قاهیمکرن (کەڤالێ ٨أ).

**•ئەڤ ڤەکۆلینا دکتور طارق عبدالوهاب مظلوم رێڤەبەرێ ڤەکۆلینێن ئاشووری یێ وی سەردەمی د بەرگێ ٣٢ پشکا ئێکێ و دوێ کوڤارا (سومەر)١٩٧٦ هاتییە بەلاڤکرن، ژ بەرگرنگییا ڤەکۆلینێ و پەیوەندییا وێ ب شوینوارێن پارێزگەها دهۆکێ ڤە ل دووڤ پێشنیازا دکتور حەسەن قاسم ئەحمەد مە ئەڤ ڤەکۆلینە وەك خو ئینایە خوارێ .**


دیگرامێ پەیکەرێ ئەکەدی
ترکیا
TURKEY
SYRIA
سوريا
ZAKHO
TIGRIS RIVER
باسطكى
BASTKI
سميل
زمار
DOHUK
دهوك
القوش
SCALE
المقياس
1 _ 500,000
وانه
الموصل
MOSUL
نينوى
NINEVEH

## ژێدەر:


١. Anton Moortat، The art of ancent Mesopotamia، (London 1969) p.56.p.158.

٢. هەر ئەو ژێدەر P. ١٦٠

٣. R. M. Boehmer، dia Entwickiong der Glyptik der Akkad-Zeit، (Berlin ١٩٦٥) بەرێ خۆ بدە نڤیسینێن ل سەر مۆران، هەر ژ كەڤالێ XII هەتا كەڤالێ XXIV

٤. p. 85. H. Frankfort، Cylinder Seals (London 1939)

٥. Moortaga، The art of ancient Mesopotamia، وێنەیێ ١٥٣،١٥٥-١٥٧

٦. هەر ئەو ژێدەر/ وێنەیێ ١٣٤-١٣٦، ١٣٨.

٧. 67-Frankfort، Cylinder Scals، P.62

٨. op.cit، XXXI، R. M. Boehmer.

٩. Frankfort، Cylinder Scals، Pl.XX، e، f.h.

١٠. Bochmer، op. cit، tal، XXIV، 31037.

١١. هەر ئەو ژێدەر سەرێ XXXVI-XXII، 310 .317-Tal، XXVIII، 326،332

١٢. هەر ئەو ژێدەر Tal. XLII، ٤٩٩-٥٠١.

١٣. هەر ئەو ژێدەر Tal. XLIV، ٥٢٥.

١٤. هەر ئەو ژێدەر Tal. XLI، ٥١٨، ٥٢٥،٥٢٠

١٥. هەر ئەو ژێدەر Tal. XLIV٥٢٤.

١٦. H. Frankfort more sculpture from the D›yala region، O.F.P. LXI، P.11، P!. 61،311، هەروەسا پەرتووكا 103-Sulpture of the therd Millennium B. C. from Asmer and Khafajah، O. I. P. XLIV، pls 98

١٧. سەرباری وێ ژێدەرێ مە بەری نوكە دیاركری، بەرێ خۆ بدە پەرتووكا Moortgat، The art of ancient Mesopomia، pp 32، pl. 52.

١٨. Moortgat .56-op. citk p.33، pl. 55.

١٩. Frankfort، more Sculture from the Diala region، Pl. 54

٢٠. هەر ئەو ژێدەر xol 59-op. cit. pl. 5. 58

مظلوم، الدكتور طارق عبدالوهاب، دراسة لتمثال اكدي من البرونز، مجلة (سومر)، الجزء الاول والثاني، المجلد الثاني والثلاثون، مجلة تصدرها مديرية الاثار العامة — وزارة الاعلام — الجمهورية العراقية — بغداد، ١٩٧٦.


**هندەك پەیڤێن گران:**

تیرە: قطر

چێوە: محیط

لوولەیی: اسطوانی

سپێنە: اسفین

هەفتەریب: موازي

دیگرام: مخطط

بنك (بنكە): قاعده

# شوینوارێن کێلییا شەدا

## ئەنجامێن ڤەکۆلینێن شوینواری یێن کێلییا شەدا

د. حەسەن ئەحمەد قاسم بەرواری

## ئێك- جهـ

کێلییا شـەدا جهەکێ بلنده ل کومتێ گەلیێ دهۆکێ، ل هنداڤی سەنتەرێ باژارێ دهۆکێ و هنداڤی سکرێ دهۆکێ ژ ئالێ ژووریڤە، مرۆڤ دشێت ب پییا ژ جهێ چارستین یێ شوینواری[*] سەرەدانا ڤی جهی بکەت و رێك دەمژمێرەکێ دکێشیت.

## دوو- ناڤ:

خەلکێ وەلاتی دبێژنە ڤی جهی کێلییا شەدا و بەرامبەری کومتێ ناڤدار ب کێلییا فیرعەونی یە، دیرۆکا ڤی جهی زۆرا کەڤناره و پەیڤا شەدا دتێکستێن بسماری داهاتییه (☒u-du -a)، د سەردەمێ سۆمەری دا (٢١٠٠- ٢٠٠٠پ.ز) ب واتا بلندی یێ ددەت[1]، د تێکستێن ئاشووری دا (☒ad-da) واتا وی ئانکو خوجهێ گوبیتکا چیای[2] و گرێدایە ب سەردەمێ دەولەتا میتانی ڤە[**]، ڤی ناڤی پەیوەندی بناڤێ پادشایێن میتانی وەك شوتارنا[3] و توشارتا[4] یا هەی، هەژی گوتنێ یە پەیوەندی ب ناڤێ باژارێ میتانی (شودوخی)[5] ڤە هەیە یێ ناڤێ وی د تێکستێن بزماری یێن شاهێ ئاشووری ئەدد نیراری یێ ئێکێ ( ١٣٢٥پ.ز)[6].

## سێ- ڤەکولینێن شوینواری:

کارێن ڤەکۆلینا ژ رۆژا ٢٠٠٩/٥/٢ تا رۆژا ٢٠٠٩/٨/٢٠ ڤەکێشا، ل دووڤ پلانەکا دارشتی هاتەئەنجامدان، ل دەستپێکێ نەخشەیێن کەنتوری هاتنە دروستکرن و جهـ هاتە وێنەکرن و کار زۆر ب زحمەت بوو ژبەر گەرما هاڤینێ و رێ ب پییان بوو، سەرەرای ڤێ چەندێ دەستەیا ڤەکۆلینێ گەهشتە ئەنجامێن باش و گرنگییا جهی ژلایێ شارستانی و دیرۆکی ڤە دیار دکەت.

ئەنجامێن ڤەکۆلینا:

١- یەکەیێن بیناسازی:

ئـ- توخمە

ب- تونێل

پ- ناووسك

ت- كێلیيا شەدا

ج- سەكو

چ- رێ يا توخمێ

ح- رێ يا كێلیيا شەدا

خ- رێ يا سرتێ.

٢- پارچێن شوینوارا:

ا- مۆرێن پان

ب- سەرێن رما

پ- سەرێن تیرا

ت- پارە

ج- گوهارك

چ- چەقماق

ح- پارچێن گۆزكا

خ- بزمار

د- قەلوین

ر- بەركێ رەشوكی یێ.

## ئـ- توخمە(***):

پشتی دروستكرنا نەخشێن كەنتوری یێن پێدڤی جهێ توخمێ هاتە دەسنیشان كرن كو (٨٥٣) مەترا ژ ئاستێ دەریای بلندە و دكەڤیتە ناڤ هێلا ( ٣٦,٥٢,١٨) پلا باكوور و (٤٣،٠٠،٣٦) پلا رۆژهەلات. هەلكۆلین ب راكرنا ئاخ و بەرماییێن ناڤ توخمێ هاتنە ئەنجامدان، دیار بوو توخمە شێواز و روخسارێ وێ چوارگوشەیە و ڤەكری یە بەر هەتاڤێ، درێژاهیيا وێ (٣,٥٠) سێ مەتر و نیڤن و پانیيا وێ (٣,١٠ ) سێ مەتر و دەهـ سەنتیمەترن، رووبەرێ وێ بگشتی ژ ناڤدا ( ١٠,٨٥) دەهـ مەتر و هەشتێ و پێنج سەنتیمەترن، ل ناڤەراستا وێ كۆرەكا بازنەیی هاتیە كۆلان كو تیرێ دەرێ وێ (١) مەترە و كووراتیيا وێ (٧٠) سەنتیمەترن، ل دەمێ كۆلانا ئاخا كەتی ژ ناڤدا چ پاشماییێن شوینواری نەهاتن دیتن، دبیت د چەرخێن ل دووف دا هاتبیت بكارئینان. بەلێ پشتی بەر دەرێ وێ هاتیە كۆلان پاشماییێن شوینوارا لێ دەركەفتن كو پێكهاتبوون ژ پارچێن گۆزكا و پارێن كەڤن.

## ب- تونێل:

ل ئالیێ رۆژئاڤایێ توخمێ تونێلەك د سرتا كەڤری را هاتیەكۆلان، درێژاهیيا وان (٣٠) مەترن و پانی (٤) مەترن و بلنداهیيا وێ (٢) مەترن، دكەڤیتە ناڤ هێلا (٣٦,٥٢,١٨) پلە باكوور و (٤٣,٠٠,٣٣) پلە رۆژهەلات و بلندە ب (٨٥٣) مەترا ژ ئاستێ دەریای.

## پ- ناووسك:

ئەڤ ناووسكە دكەڤری را ب شێوازەكێ لاكێشەیی هاتیەكۆلان، درێژاهیيا وێ ژ ناڤدا (٦) شەش مەترن و پانیيا وێ (٣,١٠) سێ مەتر و دەهـ سەنتیمەترن و بلنداهیيا وێ (٢,٥٠) دو مەتر و پێنجی سەنتیمەترن، هۆسا رووبەرێ وێ ژ ناڤدا دبیتە (١٨,٦٠) هەژدە مەتر و شێست سەنتیمەتر. ناووسك (٧٢٠) حەفت سەدو بیست مەترا ژ ئاستێ دەریایێ بلندە، دكەڤیتە ناڤ هێلا (٣٦,٥٢,٢٣) پلا بەرەڤ باكوور و (٤٣،٠٠،٠٩) پلا بەرەڤ رۆژهەلات.

## ت- كێلیيا شەدا:

سەرێ كومتێ چیایە، جهەكێ زۆر ئاسێیە ب كسل و بەرا بشێوەكێ بازنەیی هاتیە ئاڤاكرن، دبیت كەلایەكا كەڤن بیت، درێژاهیيا وێ (٢٠) مەترن و پانیيا وێ (١٤) مەترن، رووبەرێ وێ دبیتە (٢٨٠) مەتر، دكەڤیتە ناڤ هێلا (٣٦،٥٢،١٦) پلە باكوور و هێلا (٤٣،٠٠،٣٠) پلە رۆژهەلات، و بلندیيا وێ ژ ئاستێ دەریای (٨٨٨) هەشت سەد و هەشتێ و هەشت مەترن. ژبەر كو ب هەمان كەرەستێن ئاتەشكەدا ئەناهیتا ل چارستێن هاتیەئاڤاكرن دبیت ئەڤ جهە توخمە بیت مینا توخما یەزد بەلێ ژبەركو د دەهان سالێن چوویدا بارەگا(ربیعه)یەكێ لەشكەری بوو

ژ لایێ داگیرکەرێن کوردستانێ ڤە هاتییەکۆلان و تێکدان، و سیمایێ خو ژ دەست دایە. دیوارێ کومتی یێ کەڤن ب بەر و کسلێ هاتییە ئاڤاکرن کو دزڤریتە سەردەمێ پێش ئیسلامێ (زەرادەشتی).

## ج - سەکو:

سەکویەکا سێ پایە یە د کەڤری را هاتییەنکراندن، (١,٢٠) مەترەك و بیست سەنتیمەترا یا درێژە، هەر پایەك (٤٠) سەنتیمەترا پانە و (٣٠) سەنتیمەتران بلندە، دبیت دەربرینێ ژ بیر و باوەرێن زەرادەشتی بکەت، ب تایبەت هزرا باش پەیڤا باش و کردارا باش کو شەنگستێن چاکسازیا جڤاکینە هەمان بنەمایێن دینێ ئیسلامێ نە[٧] وەك د قورئانا پیروز دا هاتی(****).

## چ - رێ یا توخمێ:

ئەڤ رێکە د کەڤری را هاتییە نکراندن ب کووراتییا (٢٠) بیست سەنتیمەترا و(٣,٣٠) سێ مەتر و سیهـ سەنتیمەترا درێژە و (٥٠) پێنجی سەنتیمەترا فرەهە، ئەڤ رێکە ژ تونێلێ دچوو بۆ توخمێ و بەروڤاژی.

## ح - رێ یا کێلییا شەدا:

ئەڤ رێکە د کەڤری را ب کووریا (٢٠) بیست سەنتیمەترا هاتییە نکراندن و (٢) دو مەترا درێژە و (٤٠) چل سەنتیمەترا فرەهە، ئەڤ رێکە ژ توونێلێ دچوو بۆ کێلییا شەدا و بەروڤاژی.

## خ- رێ یا سرتێ:

ل سرتا کەڤری رێکەکا هاتییە نکراندن ب تنێ جهێ پییا نە ب درێژاهییا پتر ژ بیست مەترا، رێکەکا ئاسێ یە ل گوپیتکا سرتا چیای.

## پارچێن شوینواران:

چەندین پارچێن شوینواران ل ڤی جهی هاتنە دیتن کو ئەڤەنە:-

## ڤ - مۆرێن پان:

**مۆر:** پارچەکا کەرەستەیە (ئاخ، بەر، هەستی، دار.....هتد ) ب هندەك سونبل و وێنە و نەخش و نڤیسینا هاتییە نەخشاندن ب مەرەما مۆرکرنا ئێمانەت و کەرەستێن تایبەت ب شێوەیەکێ فەرمی ب مەرەما پاراستنێ[٨]. و دو جۆرێن ڤان مۆرا هەبوون:-

### ١-مۆرێن پان:-

پارچەکا کەرەستەیە (ئاخ، بەر) ب شێوەکێ لاکێشە یان بازنەیی هاتییە دروستکرن ل سەر چەند نەخش یان سونبل یان وێنە هاتینەنەخشاندن، دەستپێکا ڤی جۆرێ مۆرا هزارا شەشێ پێش زایینی ل دەڤەرا مە[٩] پەیدا ببوو.

### ٢-مورێن خر:

پارچەکا کەرەستەیە (ئاخ، بەر) بشێوەکێ لۆلەیی هاتییەدروستکرن ل سەر چەند نەخش یان سونبل یان وێنە یان نڤێسین هاتینەنەخشاندن، دەستپێکا ڤی جۆرێ مۆرا هزارا چوارێ پێش زایین ل دەڤەرا مە[١٠]

**جۆرێن سەرێن رما یێن هاتینە دیتن و هاتبوونە بکار ئینان ل تونێلا کێلییا شەدا د چاخێن کەڤن دا**



سەرێن تیرا یێن ل تونێلا شەدا هاتینە دیتن كو د چاخێن كەڤن دا ل وێرێ هاتینە ب كارئینان



پەیدا ببوو. ژ ئەنجامێ ڤەكۆلینێن ل ڤی جهی و جهێ چارستین هاتینەكرن پێنج مۆر هاتنەدیتن كو دهێنە هژمارتن ژ جۆرێ مۆرێن پان و ب ڤی رەنگی ل خوارێ A،B،C،D،E-:

**مۆرا A ، B:**

مۆرێن پانن ئێك بابەت ل سەر هەردویا نەخشاندییە، ئەوژی بابەتێ بیرو باوەرێن ئایینی نە كو وێنەیێ خوداوەندێ میتانی یا تێشوبە[11] خوداوەندێ بریسی وكەش و هر و با ئێكە ژ خوداوەندێن كەڤن یێن مللەتێ خوری حەباندنا وی ل هزارا دووێ پێش زایینی ل وەلاتی بەلاڤبوویە، هەر ژ چیایێ زاگروس تا دەریایی ناڤەراست[12]، د دەستێ راستێ یێ ڤی خوداوەندی دا سونبلا بریسی یێ یە و نیشانا وی یە ددەستێ دیدا وێنەیێ گیاندارەكی یە كو دەربرینێ ژ راڤ و نێچیرێ دكەت ل هەمبەر سەرێ وی سونبلا هەیڤێ هاتییە نەخشاندن كو دەربرینێ ژ خوداوەندێ هەیڤێ (سن) دكەت كو مللەتێ پێغەمبەر ئیبراهیمی دحەباندن ((فَلَمَّا رَأَى الْقَمَرَ بَازِغاً قَالَ هَذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لَئِنْ لَمْ يَهْدِنِي رَبِّي لأَكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضَّالِّينَ))[13]. بازارێ میتانی كۆما سەنتەرێ حەباندنا ڤی خوداوەندی بوو[14] بەلكی گوندێ كانێ بیت یێ دكەڤیتە رۆژهەلاتێ بازارێ ئامێدیێ.

**مۆرا C:**

ل سەر ڤێ مۆرا پان وێنەیێ خانمەكێ هاتییە نەخشاندن، كراسەكێ درێژ ل بەرە ل هەمبەری سەرێ وێ سونبلا هەیڤێ هاتییە نەخشاندن كو دەربرینێ ژ خوداوەندێ هەیڤێ دكەت، خانم ل سەر كورسییەكا چوار پێیك روینشتییە ل هەمبەری وێ شێرەك ب سەرێ كیڤیا رابوویە سەر لنگا و د هۆنەرێ میتانی دا شێر و بزن و گا ژ سونبلێن پیرۆزێن ئەسمانی بوون، هەروەسا ل پشت خانمێ نڤیسینەك هەیە مینا مۆرەكا میتانی یە

كو ل ئوگاریت ل رۆژئاڤایێ كوردستانێ هاتییە دیتن[15].

مۆرا D:

ل سەر ڤێ مۆرا پان وێنەیێ خانمەكێ هاتییە نەخشاندن، كراسەكێ كورت ل بەرە و هەر دەستەكێ وێ گیانەوەرەك گرتی تێدایە، ئالیێن وێ ژی ب گولیا جەهی هاتینە خەملاندن مینا مۆرەكا میتانی یە ل رۆژئاڤایێ كوردستانێ هاتییە دیتن[16].

مۆرا E (ئەیوبی):

د ڤەكۆلینێن ناووسكا ژمارە (٥) پێنج دا ل جهێ چارستین یێ شوینواری مۆرەكا بەری هاتەدیتن، رەنگێ وێ شینە ل كوژیێ باشووریێ رۆژهەلات دبن دو مەترێن ئاخێ ڤە ل سەر نڤیسایە {القناعة با}ب شێوەكێ هێلكەیی هاتییە دروستكرن، تیرێ وێ ١٦،٥٠ ملیمە وسەنگا وێ ١،٠١ گرامە، دیرۆكا وێ دزڤریتە سەردەمێ ئەیوبی سالا ٥٨١ مشەختی- ١١٨٥ زایینی، دبیت مۆرا ئەبوبەكرێ كورێ ئەیوبی بیت.

## ب- سەرێن رما:

رِم دارەكێ درێژە دهێتە دورستكرن و حلیكرن، سەركەكێ ئاسنی بۆ كوشتنێ دبەنێ[17]، چەكەكێ كەڤنارە و ژلایێ زۆر مللەتان ڤە هاتییە بكارهینان، نەخاسمە ل میزوبوتامیا كو ژ كەڤن دا راڤ و نێچیر پێ دهاتەكرن[18]، دوی سەردەمی دا سەرێ رِمێ بەرەكێ تیژ بوو، چەكێ پەیادا بوو ژ لایێ لەشكەری ژی ڤە دهاتە بكارئینان دەما پێكدادانێن نێزیك دقەومین[19]، سێ جۆرێن ڤان سەركا ل ڤی جهی ب قەبار و شێوێن تێڤەل هاتنە دیتن.

## پ- سەرێن تیرا:

د تێكستێن سۆمەری دا دگوتە تیری (ti) ئانكو تیر یان ژیان، چونكی د وی سەردەمیدا ژیانا مرۆڤان بەندبوو ب تیرێ ڤە ژبەر راڤ و نێچیرێ هەروەسا بەرگریێ ژ خۆ و ئەڤ پەیڤە ژ سروشتێ كوردستانێ هاتییە وەرگرتن و پەیڤەكا كوردی یە، تیر ژ سێ

دو پارچێن گۆزكان ب رەنگێن كەسك و كەسكێ تاری هاتینە رەنگ كرن (چەرخێ ساسانی).







وێنەیێ تایێن دارا و گولا ل تۆنێلا شەدا هاتییە دیتن (چەرخێ یازدێ تا چەرخێ سێزدێ زایینی).



وێنەیێن نەخشێن ئەندازەیی و نەخشاندن ب بەرێن شین ل سەر ا ل شەدا هاتییە دیتن
(چەرخێ یازدێ تا چەرخێ سێزدێ زایینی).



پارچا پێك دهێت، سەرێ تیرێ بارا پتر ژ كانزا دهێتە دروستكرن و د دارەكێ زراڤ را دهێتە ئاسێ كرن، بنێ وی كوتە دا بەنك خۆ ل سەر بگریت و ب كڤانی دهێتە هاڤێتن، ژ چەكێن كەڤنارە دهاتە بكارئینان ژ لایێ شەركەرێن سوار و پەیاڤە. چەندین جۆرێن سەرێن تیرا هاتینە دیتن كو شێوە و كێش و قەبارێن وان تێڤەلن ژبەركو بۆ چەند سەردەمێن دیرۆكی دزڤرنەڤە و وەسا دیارە بكەڤرا كەفتینە ژبەر ب هێز لێدانێ سەرێن وان خوار بووینە.

## ت – پارە:

ژ ئەنجامێ ڤەكۆلینێ چەند پارچێن پارا ب ڤی شێوەی هاتنە دیتن:

### پارێ (A):

دەرهەمەكێ زیڤی یە، دیرۆكا وی دزڤریتە چەرخێ حەفتێ یێ مشەختی/ دووازدێ زایینی، سەنگا وی (١,٥٦) گرامە و تیرێ وی (١٠,٩) ملیمە و كوژێ بەرێ پارەی (١٨٠/ ٦h) پلەیە ل سەر پشتاوی نڤیسی یە (الامام المستنصر بالله) و ل سەر بەرێ وی نڤیسایە (رسول الله صلی الله علیه) ل كێلیا شەدا هاتە دیتن.

### پارێ (B):

دەرهەمەكێ زیڤی یە، دیرۆكا وی دزڤریتە چەرخێ حەفتێ یێ مشەختی/ دووازدێ زایینی، سەنگا وی (١,٣٣) گرامە و تیرێ وی (١٦,٩) ملیمە و كوژێ بەرێ

وێنەیێن رەنگ و نەخشا ل سەر گۆزکا ل شەدا هاتییە دیتن (چەرخێ ئیسلامی)



پارچێن گۆزکان یێن ل شەدا هاتینە دیتن کو د زڤرن بۆ (سەردەمێ ئەیوبی)



پارەی (6h / 180 ) پلەیە ل سەر پشتاوی نڤیسی یە (الامام المستنصر بالله امیر المؤمنین الاعظم) و ل سەر بەرێ وی نڤیسایە ( لولو محمد رسول الله ............) ل توونێلێ هاتە دیتن.

## پارێ (C):

فلسەكێ سفری یە، دیرۆكا وی دزڤریتە سالا 652 مشەختی/ 1254 زایینی، سەنگا وی (7,59) گرامە و تیرێ وی (25,25) ملیمە و كوژی بەرێ پارەی (6h / 180) پلەیە، ئەڤ پەیڤە ل سەر پشتا وی هاتینەنڤیسین (منكو قا لآن الاعظم[20] خداوند عالم بادشاهـ روی زمین بند عظما) و ل سەر بەرێ وی نڤیسایە ب عەرەبی (لؤلؤ الملك الرحيم بدر الدنيا سلطان الاسلام والمسلمين أبو الفضائل) [21] ل توخمێ هاتییەدیتن.

## پارێ (D):

فلسەكێ سفری یە، دیرۆكا وی دزڤریتە چەرخێ حەفتێ یێ مشەختی/ دووازدێ زایینی سەردەمێ حوكمداریا (الملك العادل) ئەبابەكر كورێ ئەیوبی ل جزیرا بۆتان هاتییە لێدان، سەنگا وی (1,90) گرامە و تیرێ وی (19,6) ملیمە و كوژیێ بەرێ پارەی (6h/ 180 ) پلەیە ل سەر پشتا وی نڤیسییە (لا الله الا الله) و ل سەر بەرێ وی وێنەك دناڤ هەیڤێ دا هاتی یە نەخشاندن، هاتە دیتن ل كێلییا شەدا.

## ج- گوهارك:

گوهارك ژ كەڤنترین جوانكارییانە كو ئافرەتا بكارئینایێن، و جۆرێن تێڤەل هاتینە چێكرن، ژ وان گوهاركێن خەلەكێن سادە و گوهاركێن ل سەر سیمایێ هەیڤێ و یێن بازنی و هێلكەیی[22]. جۆتەكێ گوهاركێن زیڤی ل باشووری توونێلێ بشێوەكێ بازنەیی هاتینەچێكرن هاتەدیتن، تیرێ هەر كتەكێ (25,25) ملیمە، ئێك ژ وان ب دو گوكا هاتییە نەخشاندن كو سەنگا وی (2,08) گرامە كتا دی سادەیە نەهاتی یە نەخشاندن سەنگا وێ (0,08)گرامە.

## چ - چەقماق:

ل ناووسكا پێنجێ چەقماقەكا ژ ئاسنی چێكری هاتییەدیتن، پارچەكا ئاسنێ سێ گوشەیە، هەردو ئالیێن وێ وەك هەڤن درێژاهیا وان (5) پێنج سەنتیمەترن ودرێژاهیا بنێ وێ (5,5) پێنج سەنتیمەترو نیڤن و سەرێن ئالیێن وێ دڤەچەماندی نە بۆ ژ دەرڤە ب شێوێ دو خەلەكێن بچویك، دەمێ ئاگری پێ هەلدكەن ب تبلا دنیڤا دەستی دهێتە گرتن[23]، و ب دەستێ دی بەرستەی ل بنێ سێ گوشێ ل بەر پیشێ هشك دكەت، هوسا مرۆڤی ئاگر هەلدكرن. دبیت ئەڤ چەقماقە یا رەبەنێن ئاتەشكەدا بیت كو دەمێ رۆژئاڤا دبوو ئاگردانێن چارستین پێ هەلدكرن، چونكی ناووسك جهێ مانا ڤان رەبەنا بوون.

## ح- پارچێن گۆزكان:

د دەمێ ڤەكۆلینان دا چ گۆزكێن دروست ژ بلی پارچێن گۆزكان نەهاتنە دیتن، و دبیت ژبەر بلنداهیا جهێ وی هەر ژ سەردەمێن كەڤن جهەكێ لەشكەری بوویە و دكەڤیتە هنداڤی بازارێ دهۆكێ، ئەڤجا بەردەوام ژ لایێ داگیركەرێن كوردستانێ ڤە هاتییە تێكدان، بەلێ ل ڤی جهی چەندین پارچێن گۆزكان هاتنەدیتن، كو ژبۆ دەستنیشانكرنا سەردەمێن دیرۆكی یێن ڤی جهی گرنگییا خۆ هەیە، ژ وان چەندین پارچە دزڤرنە سەردەمێ میتانی و سەردەمێ پارتی و ساسانی و سەردەمێن ئیسلامی و ئەیوبی، هندك ژوان ب وێنەیێن بالندا[24] هاتینە نەخشاندن و هندەكێن دی ب نەخشێن ئەندازەیی هاتینە نەخشاندن و چەندەك ب وێنەیێن گول و تایێن دارا هاتینە نەخشاندن و هندك ژێ هاتینە نڤیسان ب نڤیسانا عەرەبی، پەیڤێن سەردەمێ ئەیوبی و چەندەكێن دی ب بەرێن رەنگین[25] هاتینە نەخشاندن.

## خ- بزمار:

پتر ژ دەهـ بزمارێن ئاسنی ب جۆر و قەبارێن تێڤەل ل توونێلێ هاتنە دیتن، ئەڤەژی وێ چەندێ دیار دكەت

کو ل ڤی جهی دەرگەهێن داری هەبوون کو دهاتنە ڤەکرن و گرتن.

## د- قەلوین:

چەند پاشمایێن قەلوینێن ئوسمانی ژی ل ڤی جهی هاتینە دیتن.

## ر- بەرکێ رەشوکی یێ:

ئەڤ بەرە کو بەرکێ چەکێ رەشوکی بوو، ل شەدا هاتییە دیتن کو دزڤریتە چەرخێ ئوسمانی.

## ژێدەر و پەراوێز:


* سەبارەت جهێ چارستین یێ شوینواری بنێرە :-

البرواري : حسن أحمد قاسم، عمارة معابد النار في موقع ضارستين على ضوء التنقيبات الاثرية، دهۆك – ٢٠١٣.

1. Lucius ، E .& Kari Sornig ، Zum Lokalisierungsproblem von Wassugani und anderen . Istanbul-1969، P١٠.

٢. Brinman ، john A & Miguel Civil other the Assyrian Dictionary ، v17، the oriental institute of university of Chicago-1989،p.43.

**. بو پتر پێزانینان بنێرە:

Kantor، H.j. ،plant ornament in the Ancient Near East،ChapterXIV،Mitanni Oriental Institute University Chicago-1999 .

٣. فيلهام : جرنوت ، الحوريون تاريخهم وحضارته ، ترجمة الدكتور فاروق اسماعيل ،ص ٦٣ .

رضا، حلمي رسول ، المملكة الميتانية ١٥٥٠؟-١٣٦٥ق.م دراسة ( تاريخية –سياسية ) رسالة

٤. رضا، حلمي رسول ، المملكة الميتانية ١٥٥٠؟-١٣٦٥ق.م دراسة ( تاريخية –سياسية ) رسالة ماجستير غير منشورة ،جامعة كوية– ٢٠٠٩، ص ٨٢.

٥. Luckenbill ، D. D.Inscriptions of Early Assyrian Rulers ،The American Journal of Semitic Languages and Literatures، Vol. 28، No. 3 ( University of Chicago -1912)، p. 180 . and

GRAYSON، A.KIRK، Assyrian Rulers of the third and Second Millennia BC (TO 1115 BC) . UNIVERSIT Y OF TORONTO -1987، P 131

٦. BUDGE، A.WALLIS AND KING،L.W ،ANNALS KINGS OF ASSYRIA، VO 1،BRITISH MUSEUM-1902، P4.

***. بو پتر پێزانینان بنێرە:

**علیپور**، نەسیم ، دادگاه ضم ،تصحيح ويرايشعلمى احمد ضايضي ،چاپ اول ،تهران -١٩٨٥ . و بنێرە: المتيوتي : نايف محمد شيب علي، المعتقدات الدينية واثرها على المجتمع الفارسي في العهد الساساني، رسالة ماجستير غير منشورة،جامعة الموصل-٢٠٠٢.

٧. غانم: خالد السيد محمد، الزرادشتية تاريخا و عقيدة و شريعة دراسة مقارنة، ط١، دمشق-٢٠٠٦.

****. القرآن الكريم، سورة التوبة، الآية رقم ١١٩، وسورة المؤمنون الآيات ١-٣.

٨. رشيد : صبحي انور و حياة عبد علي الحوري، الاختام الاكدية في المتحف العراقي، بغداد-١٩٨٣ .

٩. ناجي: عادل، الاختام الاسطوانية، حضارة العراق، ج ٤، بغداد -١٩٨٥.

١٠. فارس: شمس الدين والدكتور سلمان عيسى الخطاط،تاريخ الفن القديم،ط ١، بغداد – ١٩٨٠.

١١. 121-Wilhelm ، Gernot ، the Hurrians England-1989،p.50.

١٢. Ibid ، p.49.

١٣. القرآن الكريم، صورة الانعام، الآية ٧٧ .

١٤. Wilhelm ، the Hurrians، P: 50 .

١٥. Ibid ، p:115.

١٦. Kantor ، plant ornament ، P: 548 .

١٧. حميد : عبدالعزيز وآخرون، الفنون الزخرفية العربي الاسلامية، بغداد -١٩٨٢.

١٨. Yadin: Y ، THE Art of warfare in Biblical Land ، London -1963،p: 45.

١٩. عبدالله : يوسف خلف، الجيش والسلاح في العهد الآشوري الحديث، ط١، جامعة بغداد -١٩٧٧.

٢٠. عبو: عادل نجم، نتائج تنقيبات جامعة الموصل في مصيفنة، بحوث آثار حوض سد صدام، بغداد-١٩٨٧.

٢١. الحسيني : محمد باقر، العملة الاسلامية في العهد الاتابيكي، بغداد-١٩٦٦.

٢٢. حميد : الفنون الزخرفية، ص ١٠٦.

٢٣. جرجيس : محمد عجاج، الغليون وانواعه، بحوث آثار حوض سد صدام وبحوث اخرى، المؤسسة العامة للآثار والتراث، بغداد - ١٩٨٧.

٢٤. حسن : زكي محمد، اطلس الفنون الزخرفية والتصاوير الاسلامية، بيروت -١٩٨١.

٢٥. التوتونجي: نجاة يونس محمد، التنقيب في تل بقاق (٣) الموسمان الاول والثاني١٩٨٣/١٩٨٤، بحوث آثار حوض سد صدام وبحوث اخرى، المؤسسة العامة للآثار والتراث ، بغداد – ١٩٨٧.

# نەخشەبەرێ ملا مەرگێ

د. حەسەن ئەحمەد قاسم بەرواری
وەرگێران:موسەدەق تۆڤی

## یەك: جهـ

نەخشەبەر (المنحوتە) دکەڤیتە گەلیەکێ* ب (دەرگەلا شێخ ئەحمەد)[1] دهێتەناڤکرن، دکەڤیتە ژووردانیێ (گرێ رەش)[2]، بەرامبەرێ وی ژ ئالیێ رۆژئاڤاڤە[3] (چار چەل)** کو هێژ شوینوارێن کەلایەکا کەڤن لێ هەنە[4]، ئەڤ گەلییە دکەڤیتە دوورترین خالا باکوورێ رۆژئاڤایێ ناڤەندا باژێرێ دهۆکێ، دو رێك دگەهنە ڤی گەلی، رێکا دهۆك- مانگێشکێ و رێکا ژ رێکا دهۆك- زاخۆ پشتی دەربازبوونێ ژ گەلیێ زاخۆ بەرەڤ رۆژهەلاتی دەردکەڤیت، ئەڤ جهە ژ ئالیێ کارگێریڤە سەر ب ناحیا مانگێشێ ڤەیە.

ڤی گەلی ژ ئالیێ لەشکەریڤە گرنگییەك مەزن هەیە، چ ژ بۆ هێرشکرنێ بیتن یان بۆ بەرگریێ بیتن[5]، ئەڤ گەلیە ب سروشتێ خۆ مەترسییەك بوو ل سەر دەڤەرێن دکەڤنە باکوورێ رۆژهەلاتێ باژێرێ نەینەوا ئەگەر هندەکان ژ خەلکێن دەڤەرێن چیای ڤیان هێرشێ بەرنە سەر، هەروەسان جهەکێ ئاسێ بوو و یا بزەحمەت بوو بۆ گرتنێ.

## دو: دیرۆکا دیتنەڤا نەخشەبەری

بۆ جارا یەکەم ئەڤ نەخشەبەرە ژ ئالیێ رێڤەبەریا گشتییا شوینوارێن عیراقێ ڤە هاتەدیتن دەمێ دکتور مەحموود ئەلئەمین ل سالا ١٩٤٧ێ هنارتیەدەڤەرا دهۆکێ و شیای ڤی پەیکەرێ نوو ل نیڤا (گەلیێ ملا مەرگێ) یان (دەرگەلا شێخ ئەحمەدی)ببینتەڤە[6]. هەر ئەڤ گەلیەیە دچیتە گوندێ زیناڤا ل ناحیا مانگێشکێ[7]و دەڤەرێن دی ل باکوورێ رۆژهەلاتی، د ئەنجامدا دیتنەڤا ڤی نەخشەبەری د رۆژناما (الوقائع العراقیە) هژمار ٢٩١٩ ل رۆژا ١٩٥٠/١٢/٢٥ هاتەراگەهاندن و بادەکەکا تایبەت ب هژمار ٩٠٦ ل رێڤەبەریا گشتیا شوونواران بۆ هاتەڤەکرن[8].

## سێ: ناڤکرن

ژبەرکو ئەڤ گەلییە رێکەکا بازرگانی لەشکەریا گرنگ بوو و خەلکەك تێرا بەرەڤ باشوور و بەروڤاژی دچوون ڤی جهی گرنگییەك جوگرافی هەبوو لەوما ژێ ئەڤ پەیکەرە ب چەند ناڤەکان هاتییەناڤکرن، گوندیێن دەڤەرێ ب پەیکەرێ (ملا مەرگێ) و هندەکێن دی ب پەیکەرێ (دەرگەلا شێخ ئەحمەدی ناڤدکەن، هەروەسان ب پەیکەرێ (تەیموورێ لەنگ)* ژێ هاتییەنیاسین.

## چوار: پەسنا پەیکەری

ئەڤ پەیکەرە ل نیڤا کەفرەکێ قەبارەمەزن ب بلنداهییا ٣.٥م ل ژووردانیێ چیایێ (گرێ رەش) کو

دیمەنەك ژ نەخشەبەرێ ملا مەرگێ



ب ملا مەرگێ دهێتەناڤكرن ل نیڤا گەلیێ دەرگەلا شێخ ئەحمەد هاتییەنكراندن[٩]. ئەڤ نەخشەبەرە د دیوارەكێ بەردیندا (بنحت غائر) هاتییەنەخشاندن ب كووراتییا (١٠سم)، ئەڤە ژی ب مەرەما دابینكرنا روبەرەكێ گونجای بۆ نكراندنا نەخشەبەری كو بلنداهییا وی د ناڤا كوركێدا (١.٣٥) و پانییا وی ژ ٨٢سم ل نیڤێ و پاشتر ل ژێر بەرفرەهدبیت هەتا دبیتە ٨٨سم هەردو ئالی ژی ژ سلالڤە ل سەر شێوازێ پاناڤەكێ كەوانەییێ ژ بەری هاتییەنكراندن[١٠]. د نیڤا وێ دا وێنەیێ شاهێ ئاشووری تەجلاتبلیزەرێ سیێ[١١] هاتییەنەخشاندن یێ كو ب تبلا خۆ ئاماژە ب هێماێن خوداوەندی دكەت یێن ل هنداڤ پەیكەری هاتینە نەخشاندن، هەر د میحرابێدا بەرامبەری وێنەیێ شاهی نڤیسینەكا بزماری د (٥٢) رێزاندا ب زمانێ ئەكەدی (ئاشووریی) هاتییەنڤیسین كو پاشتر دێ ئاماژە پێكەین.

سەرەرای ڤاییمیا ئەو بەرێ تێدا هاتییەنكراندن ئەڤ نەخشەبەرە كەتیە ژێر باندۆرا فاكتەرێن سەقای، ئەڤە ژی بوویە ئەگەرێ ژ ناڤچوونا هندەك نیشانێن وی ب تایبەت ژی وێنەیێ شاهی، یێ كو ب دەستێ ئەنقەست هندەك زیان گەهشتینێ و بچووكان دایە بەر بەران هەروەسان كونەكا بچووكا د نیڤا پەیكەریدا هاتییەچێكرن پەیكەر شێواندیە. ئەڤ پەیكەرە ژ سێ پشكێن سەرەكی پێكهاتییە:

ا- کۆمت (لوتکە)
ب- نڤیسین
ج- وێنەیێ شاهی

## أ-کومت

ل کۆمتێ نکراندی هێمایێ چەند خوداوەندەکان هاتینە نەخشاندن، راستەوخۆ دکەڤنە هنداڤ وێنەیێ شاهی و نڤیسینا بزماری، ئەو ژی ئاماژەیە بۆ وی خوداوەندی یێ د دەقێ بزماریدا هاتی، دشیاندایە ژ ئالیێ چەپێ بۆ راستێ ل دووڤ زنجیر و پەیسکا وی چاخی یا خوداوەندان هەی بێنە ژ هەڤجوداکرن، وەك ل ژێری:-

1. هێمایێ خوداوەند ئاشووری (سەرکێ شاخدار- القبعە المقرنە).
2. هێمایێ خوداوەندێ هەیڤێ سن ( کڤانێ هەیڤی).
3. هێمایێ خوداوەندێ رۆژێ (تلپێ بالدار).
4. هێمایێ خوداوەند عەشتاری (ستێرا شەشکوژی)
5. هێمایێ خوداوەند مەردوخی (مەڕك)
6. هێمایێ خوداوەند نابو (لەڤەن).
7. هێمایێ خوداوەند ئامورۆ (چویڤێ خوار) چویڤێ شڤانی
8. هێمایێ خوداوەند ئادەدی(بروسیا تێکەل).

### ١- هێمایێ خوداوەند ئاشووریی (سەرکێ شاخدار)[12]،

ژبەر وێ پەیسکا د وی سەردەمیدا خوداوەند ئاشووری هەی ل رێزا ئێکێ دهات، هێمایێ وی ژ وان هێمایانە یێن ل دەمەکێ زوی د سێ هزارساڵییا بەری زایینیدا د بەربەلاڤ[13]، ل دەسپێکا چەرخێ سومەریێ بەراهیێ کو پێکهاتبوو ژ تاجەکا تێکگرێدایی ب دو شاخان و ل سەردەمێ میر کودیا (سەدساڵییا بیست و دووێ پ.ز) پێکدهات ژ گەلەك شاخان[14]، و هێما بوو بۆ خوداوەند (ئانو) خوداوەندێ ئەسمانی[15]، پاشتر وەك هێمایێ خوداوەند ئەنلیلی یێ ب سەنگ کەتی و بوویە خوداوەندێ نەتەوەییێ سومەریان[16]، دەمێ دەستەلاتێ ئاشووریان بالادەست بووی ئاشووریێ*خوداوەندێ نەتەوەییێ ئاشووریان شوونا خوداوەند ئەنلیلی گرت و ب کولاڤێ شاخدار (القبعە المقرنە) هێما بۆ دهاتەکرن[17]، یێ کو پێکهاتبوو ژ حەفت جوتێن شاخێن تێکگرێدای کو راپێچا بەرچاڤا سەریێ (غطاء الراس) خوداوەندی بوو. و د هۆنەرێ ئاشووریێ نوودا بوویە یەك ژ هێمایێن خوداوەند ئاشووری[18]....

د توومارکرێن شاهـ سەنحاریب دا هاتییە کو وی فەرمان دایە ب چێکرنا کولاڤەکا بهادار ژ خوداوەندییا خوداوەند ئاشووریی، ژ زێرێ سور و بەرێن گرانبها، د نامەکێدا نووچەیێ چێکرنێ گەهشتیە وی و ئاماژە ب وان بەرێن گرانبها کریە یێن ژبۆ خەملاندنا وی کولاڤێ هاتینەبکارئینان، نامەکا دی دەربارەی (بەر و چاڤکان) ئاخفتیە کو گەلەك د گونجاینە بۆ خەملاندنا کولاڤێ شاخدار[19].

ب درێژییا چەرخان حەفت رەنگ تاجێن شاخدارێن پیروز هاتینەناسکرن، رەنگێ ئێکێ ژ کولاڤەکێ شاخدارێ خەملاندی ب پەراوێزەکا پەرێن بالندەیان پێکهاتبوو، یێ دیتر ل سەر رەنگێ کولاڤەکی بوو، و د سەردەمێ شاهـ سەنحاریبی دا کولاڤ ب رەنگێ تەربوشەکی نوو بوو، هندەك جاران کۆمتێ وی ب رەنگە بلندبوونەکێ ب داوی دهات، د سەلکا شاهـ ئەسەرحەدون وێنەیێ شاهی دیارە یێ ل بەرامبەر ئەو کولاڤەکێ شاخدار پەراوێزەك ژ پەرێن باڵندەیان ل سەر کۆمتێ دوشکەکێ درێژ هاتییەدانان دوعادکەت. کولاڤ تنێ ل سەر نەخشەبەرێن شاهی وەك هێمایێ خوداوەند ئاشووری دیاردبن، ب دروستی وەك ستڤانك و نیشانان دیاردبیت یێن کو پشکەك بوون ژ خەملاندنێن جلکێن ئایینی یێن شاهێن ئاشووری د دەمێ ئەداکرنا رێورەسمێن ئایینیدا دکرنە بەرخۆ، هەروەسان ستڤانکەك ژێ وەك کولاڤەکێ شاخدارێ خوداوەند ئاشووریی بوو[20].

ئاشوور خوداوەندێ دەولەتا ئاشووریێە کو ب وی ناڤی هاتییەناڤکرن[21]، یەکەمین ئاماژە ب ڤی خوداوەندی د توومارێن ئیبلا یێن بزماری دا هاتییە

ئەوێن دزڤرنەڤە دەوروبەرێن (٢٥٠٠ب.ز) و دوا جار ئاماژە پێ هاتییەكرن د توومارێن ئارامییاندا بوویە كو دیرۆكا وان دزڤریتەڤە بۆ سەدسالیا دووێ پ.ز[22].

خوداوەند ئاشوور پەرستگەهەكا تایبەت ل بازێرێ ئاشوور ب ناڤێ (E- shar- ra) هەبوو ئەو و هەڤژینا خۆ نەنلیل تێدا دژیان، نەنلیل د بنیاتدا هەڤژینا ئەنلیلێ خوداوەندێ سومەری بوو یێ كو ئاشووریان هەموو پەسن و نازناڤێن وی ژێ ستاندین هەتاكو هەڤژینا وی ژی ژێ ستاند بوو یا پاشتر بوویە هەڤژینا خوداوەند ئاشوور. ب ڤێ چەندێ ژی وان چاڤ ل بابلییان كر یێن پێشتر خوداوەندێ خۆیێ یێ نەتەوەیی مەردوخ ب هەمان پەسن و نازناڤان ناڤكری[23]. ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی ژ هندێیە كو وان ژ بۆ ئەنجامدانا سیاسەتا خۆ یا بەرفرەهكرنێ و هێرشێن لەشكەری پەنا بوو بەر ئایینی دبر ، ئەو دەستەلاتێ سیاسیێ بهێزێ ئاشووریان ژ سەدسالیا نەهێ ب.ز ڤە هەی ژ وێ چەندێ بوو كو خوداوەند ئاشووری ب خۆ سەركردێ گشتیێ لەشكەری بوو و شاهی نوونەراتییا وی ل سەر عەردی دكر و خوداوەندێن دیتر ددەمێ شەریدا هاریكاریا وی دكرن و ل پێشیا لەشكەرێ ئاشووری دچوون[24]، ئەو بازێرێن ئاشووریان دگرتن هێمایێن وی خوداوەندی لێ بلندكرن دا ژ ئالیێ وی خەلكێ كەتیە ژێردەستەلاتێ وانڤە بێنەپەرستن[25]. هەروەسان هێمایێ خوداوەند ئاشووری یێ وەك تلپەكێ پەردار و د نیڤەكا وی دا وێنەیێ خوداوەندی دیار دبوو كو بەرێ تیرا خۆ دایەنیشانێ وەك ئالا ل پێشیا لەشكەرێ ئاشووریان بوو دەمێ ب ئوپەراسیۆنێن لەشكەری رادبوون[26].هەروەسان رۆژا پەردار ژی ژ هێمایێن وی بوو كو ژ پەسنێن وی خوداوەندی بوو[27].

## ٢- هێمایێ خوداوەند سینی (كڤانێ هەیڤێ)[28]

ئەڤ هێمایە ب پلا دووێ پشتی خوداوەند ئاشووری دهێت و عیراقییان ب وی هێمای بەرجەستەكریە یێ كو دبینن ئەو ژی كڤانێ هەیڤێ یە، كەڤنترین ئاماژە پێكرن بۆ ڤی هێمای د چەرخێ حلف[29]دا كو بۆ یەكەمین جار هێمایێ كڤانێ هەیڤێ تێدا دەركەت و هێمایێ خوداوەندێ هەیڤێ بوو[30]، سومەریان ب سین ناڤكریە هەوەسان جەزەریان ژی ئەڤ هێمایە ب كارئینایە، بەلێ نە ناڤەكێ جەزەری بوویە بەلكی ناڤەكێ سومەرییا (Su-en)[31] بوو ئەڤ پەیڤە ژی ژ پەیڤا (En-zu)[32] كو ب (Zu-en)دهێتەخواندن، هەروەسان ب (ننار)ژی هاتییەناڤكرن كو د زمانێ سومەریدا ئانكو (زەلامێ ئاسمانی)[33] هەروەسان ئەكەدی و بابلی و سومەریان خوداوەند (سن) پەرستییە و ئەكەدیان ب ئاشمبار(Asimbabbar) و نامراشت (Namrasit) ناڤكریە[34]. بەلێ عەرەبێن ژێری خوداوەندێ هەیڤێ ب ناڤێ (ود) پەرستییە یێ كو د دەڤێن ئوگاریت دا ب ناڤێ (شهر) ئاماژەپێهاتییەكرن و ئارامیان ژی پەرستییە. (یهوە) ناڤێ عیبریێ ڤی خوداوەندی بوو، ل جەم حیسییان ب ئارما هاتییەنیاسین و زەردەشتیان ب ناڤێ (فارونا) پەرستنا وی كریە[35]. د قورئانا پیرۆزدا ئاماژە پێهاتییەكرن كو مللەتێ ئیبراهیمی (س) رۆژ و هەیڤ د پەرستن و ژ بەر ڤێ چەندێ داخوازا خودێ پەرستنێ و دەست بەردان ژ پەرستنا رۆژ و هەیڤان ژ مللەتێ خۆ دكر[36]، هەروەكی د سورتا (فصلت) دا هاتی بسم الله الرحمن الرحیم ((لا تسجدوا للشمس و لا للقمر و اسجدوا لله))[37].

خوداوەند (سین) كورێ خوداوەند(ئەنلیل)یە[38]، و خوداوەند (نەنكال)و* هەڤژینا وی (خوداوەند (ئەنلیل) یە و خوداوەندێ رۆژێ (ئوتو) و خوداوەند (ئانانا) ژ كورێن وانن[39] و هژمار (٣٠) هێمایەكێ پیروزە ژ بەركو ئاماژەیە بۆ هژمارا رۆژێن هەیڤێ، و گا و شێرێ باڵدار گیانەوەرێ وی یێ هەرەباشە[40]، بازێرێ ئور* ل ژێریێ عیراقێ و حەران** ل باكوورێ سوریێ ژ جهێن هەرەگرنگێن پەرستنا خوداوەند (سن)بوون كو شاهێ بابلی نابونائید (٥٥٦-٥٣٩ب.ز) گەلەك گرنگی پێ ددا[41]. ب درێژیا چەرخان هێمایێ وی یێ بەربەلاڤ كڤانێ هەیڤێ بوو ژبەركو دەربرین ژ شێوە و وێنەیێ وی ل جەم مرۆڤی دكر ، خوداوەندێ هەیڤێ د بیر و باوەرێن خەلكێ میزوپوتامیادا

نوونەراتیبا خوداوەندێ پارێزڤان و چاڤدێرێ گیایێن نوژداری دكر[٤٢].

د هونەرێ پەیكەرسازیدا ب رەنگەكێ بەرفرەهـ مووریێن رەنگ كڤانێ هەیڤێ ل ئاستێ(SIS) ل بازێرێ هەنە[٤٣]، پەیكەرەكێ كڤانێ هەیڤێ یێ نكراندی ژ سفری (النحاس) و ئێكێ نكراندی ژ زێری ل ژوورا هژمار (٨)ا پەرستگەهێ هاتییەدیتن و دیرۆكا وان دزڤریتەڤە چەرخێ كشی، هەروەسان ل ژوورەكا سەر ب پەرستگەهێڤە كڤانەكێ هەیڤێ یێ چیكری ژ مەرمەرێ سپی هاتییەدیتن كو ل سەر ستوونەكێ هاتبوو دانان، ئەڤە ژی دیاردكەت كو حەرەمێ ژوورێ هاتبوو تەرخانكرن بۆ پەرستنا خوداوەند (نەنار) ێ خوداوەندێ هەیڤێ نەك بۆ خوداوەند (نركال)ی كو وەسان باوەردهاتەكرن.هەروەسان كەربوچەكێ مووركری ب هێمایێن خوداوەندی ل خەرسباد هاتینەدیتن د ناڤ وان هێمایاندا هێمایێ كڤانێ هەیڤێ هەیە و د كۆمەكا مووریێن سەردەمێ بابلی یێن نوی دا نموونەیێن بانیێن پەرستگەهەكا كەڤن دهێنەدیتن، هەریەك ژ وان ل سەر بنواشەكێ هێمایێن خوداوەندی ل سەر هاتینە نكراندن هاتییەدانان، وەسان دهێتەدیاركرن كو ئەو زەڤورە یا تایبەت بوو ب پەرستنا وی و یا نەخشاندی بوو ب هێمایێن كڤانێ هەیڤێ، خوداوەندێ نەنار سەرپەرشتێ سەنگان (كێشان) بوو و هێمایێن كڤانێ هەیڤێ هندەك جاران ل سەر سەنگ و پێڤەرێن مولكێ خوداوەندێ هەیڤێ هاتبوونە نەخشاندن، د چەرخێ بابلیێ كەڤن دا ب سێ تلپان ئاماژە ب هێمایێ خوداوەند (رۆژێ، سین، عەشتار) دهاتەكرن ئەو ژی برەنگێ زێری دهاتنە وێنەكرن: ستێرا چواركوژیا تیشكدار و كڤانێ هەیڤێ و ستێرا هەشت كوژی[٤٤].

د چەرخێ كشی دا وێنەیێ كڤانێ هەیڤێ ل سەر زۆربەی بەرێن سنووران هەبوو؟؟؟!!، ئەڤ هێمایە گەهشتبوو سەر وان ستاڤنكان یێن شاهێن ئاشووری د دەمێ ئەنجامدانا رێورەسمێن ئایینی دا دكرنە ستویێ خۆ و هەلگرتنا ستاڤنكان د دەمێ رێورەسمێن ئایینی دا گەلەك ژ كارەكێ كەڤنترە ژ ڤی چەرخی ئانكو چەرخێ ئاشووری[٤٥].

هەروەسان كڤانێ هەیڤێ ل سەر گەلەك ژ وان پەیكەران هاتییەنەخشاندن ئەوێن دزڤرنەڤە چەرخێن ئاشووری و بابلی یێن نوو، هەر ب ڤی رەنگی كڤانێ هەیڤێ د ناڤ وان هێمایاندایە یێن ل كۆمتێ سەلكەكا نەمرودی یا سەردەمێ شاهـ ئاشوور ناصربالێ دووێ[٤٦] (٨٨٤-٨٥٩ب.ز) و دسەلكەكا دی یا سەردەمێ ئەدد نراریێ سیێ[٤٧](٨١٠- ٨٧٢ ب.ز) و گەلەك نموونەیێن دی ژی هەنە.

## ٣- هێمایێ خوداوەندێ رۆژێ (تلپێ پەردار)[٤٨]

تلپێ رۆژێ یێ پەردار هێمایەكێ گەلەك كەڤنە، ژبەركو رۆژ ب خۆ دیاردەیە لەوما ئەو ژی ژ سەردەمێن زووڤە پەیدابوویە، د ئەدەبێ سومەریێ كەڤندا دیاربوویە[٤٩] هەروەسان تلپێ رۆژێ وەك هێمایێ خوداوەندێ رۆژێ ل نوزی* دیاربوویە[٥٠]و یا نەخشاندی ل سەر موورەكا شاهێ میتانی شوشتار (١٤٥٠ب.ز) هاتییەدیتن[٥١].

هەمان ئەڤ تلپێ پەرداری رۆژێ ژ ئالیێ میسریێن كەڤنڤە ب ناڤێ (حورس)* دهاتەپەرستن، د وێنەیێ ئەلهوویەكی ب دو پەرێن درێژكری هاتییەدیتن[٥٢]، هەرچەندە گەلەك هێما هەنە بەلێ ب پرانی وەك تلپێ پەردار ئاماژە پێ هاتییەكرن[٥٣]، كو پێكهاتییە ژ تلپەكی یان خەلەكەكا دو پەر، د چەرخێ ئاشووریێ نوودا وێنەیەیێ خوداوەندی د چوارچوڤێ تلپەكێدا هاتییەنەخشاندن كو بەرێ تیرا خۆ ددەتە نیشانێ و ئەڤە ژی ب یەك ژ هێمایێن خوداوەند ئاشووری هاتییەهژمارتن ژبەركو ب پەسنێن رۆژێ هاتبوو پەسندان[٥٤].

ڤەكۆلەر بیكر پرینگ (Birgir Pering) گەهشتیە وێ باوەریێ كو تلپێ پەردار ل ئاشوور و ل شارستانیەتا حیسیان هێمایە بۆ ئەسمانی و رۆناهیا ئەسمانی، ل وەلاتێ ئاشوور هێما بوو بۆ ئەسمانی و رۆناهیا ژێ دهات، لەوما ئەو نوونەراتیا رۆژێ دكەت، د هەردو سەدسالیێن نەهێ و هەشتێ

پ.ز هەڤدەم دگەل ئارەزوویێن ئایینی یێن نوو ب تایبەت ل بازێرێ نەمرود خوداوەند (ننورتا) د ناڤ تلپیدا هاتیەوێنەکرن کو شاهێ دپارێزیت و وێنەیێ وی دگەل وێنەیێ دارا پیروز هاتیەدانان، پرینک یێ ئاگاداربوویە ل سەر وێ گۆرانکاریێ یا د شێوازێ چێکرنا تلپیدا د سەدسالییا نەهێ پ.ز دا هاتیەکرن و تێدا بوویە خۆدی کوری و نەخشێ وی ل سەر نەخشێن دیواران یێن شاهـ توکلتی ننورتایێ دووێ ١١ ukulti - Ninurta(٨٩٠- ٨٨٤ ب.ز))هاتیەدیتن،.

د ناڤ تلپیدا وێنەیێ خوداوەندی ل هنداڤ سەرێ شاهی هەیە کو ل گالیسکەکێ شەری سواربوویە، و پشکا خوارێ ژ خوداوەندێ نەخشاندی (الاله المنحوت) د ناڤ تلپیدا بەرەڤ خوار بەلاڤەدبیت وەك کوریا بالندەی و کوری نە بۆ تلپییە بەلکی بۆ خوداوەندیە، ژبەرکو تلپێ بالدار د وێنەیێ خۆدا پتر نێزیکی ئەلهویەکی یە، و دبیت ئەو خوداوەندێ کوری هەی ئەلهویە خوداوەندێ کەڤن و د مووریێن نوزی دا هێمایێ تلپێ بالدار هاتییە کو ب سەر هەوای یان سەر درەختا پیروز دکەڤیت، یان ل هنداڤ ستوونەکا ناڤبەرا دو گیانەوەرێن ئەفسانەیی، هەروەسان ل سەر موورا شاهێ میتانی شاوشتار ئەوا دکەڤیتە سەر بنواشەکێ نزم هاتییەنەخشاندن[٥٥].

د پرانییا مووریێن شاهێ ئاشووری ننورتا توکلتی ئاشووری (Ninurta- Tukulti- Assur) ١١٣٢پ ز و هەڤژینا وی ریمینی ( Rimeni )تلپێ پەردار دگەل کوریەکا دیار هاتینەنەخشاندن، و ل سەرسەلکەکا شکەستی کوهزر بۆ هندێ دچیت یا شاهـ ئاشووری- بیل-کالا(-Assur-bel-kala)١٠٨٧- ١٠٧٠پ.ز دبیتن هێمایێ پەران بوویە کەزیەك ژ پەران ل دوریێن تلپەکێ بچووك و دو دەست ژ ناڤا کەزیێ دەرکەتینە یەك ژ وان کڤانەك گرتییە یێ دی ئاماژە ب نیشانا پیروز دکەت[٥٦].

بەلێ مووریێن چەرخێ ئاشووری (٩١٢- ٦١٢ب.ز) و بابلی یێن نوی (٦٢٦- ٥٣٩ ب.ز) تلپێ پەردار دگەل درەختا پیرەز ل سەر هاتینەنکراندنیان ژی دگەل هندەك هێمایێن دی وەك کڤانێ هەیڤێ[٥٧].

د هندەك پەیکەرێن ئاشووریێن دیتر دا پەیکەر وەك پشتا تلپێ پەرداره لێ بێ بێی وێنەیێ خوداوەندییە ئەڤە ژی ب یەك ژ هێمایێن خوداوەندێ رۆژێ دهاتەهژمارتن[٥٨]، دبیت ئەڤە ژبەر هندێ بیتن کو ئەڤ هێمایە هێمایێ خوداوەندێ رۆژێ بوو ل جەم میتانییان بەری هاتنا ئاشووریان و ئەڤە مایە د باوەرییا ئاشووریاندا ژبەرکو کەتبوونە ژێر کاریگەرییا وان و دبیت ژی رەنگە سیاسەتەك بیتن بۆ رازیکرنا وەلاتیێن میتانی یێن کەتینە ژێر دەستەلاتێ وان، هەروەسان پەرستنا رۆژێ ل سەردەمێ زەردەشتیان بلندترین پلا پیروزی و خوداوەندیێ بوو کو تلپێ رۆژێ هێمایێ خوداوەندێ وانێ هەرە مەزن ئاهورمەزدا بوو کو وەك هێما ب شێوەیێ تلپێ پەردار د نیڤا وی دا وێنەیێ خوداوەندی دیاردبوو[٥٩] و هژمارا وی یا پیروز ژی هژمار (٢٠)بوو[٦٠].

خوداوەندێ رۆژێ ل جەم سومەریان ب ئوتە (UTU)[٦١] یان (abbar)[٦٢]و ل جەم ئەکەدی و بابلی و ئاشووریان ب (شەمش)[٦٣] هاتبوو ناڤکرن، هەروەسان حوریان ژی ئەو دپەراستن ب ناڤێ هوری، خوری)[٦٤] و کاشیان* ب ناڤێ (سوریاش)[٦٥] و میدیان ب ناڤێ (میترا)[٦٦] پەرستنا وی دکر و قورئانا پیروز ژی ئاماژە ب پەرستنا وی خوداوەندی کریە**.

خوداوەندێ رۆژێ ب کورێ خوداوەند (سین) ێ خوداوەندێ هەیڤێ و برایێ خوداوەند (عەشتار) برایێ خوداوەندێ ئەڤینێ و شەری دهێتەهژمارتن، ئەو خوداوەندێ مەزنێ دادپەروەریێ و دژی تاریکیێ یە، هەر ئەو ژ ئاسوویەکێ بۆ ئاسوویەکێ دیتر ژ ئەسمانی دەرباز دبیت و تیشکا خۆ وەك تۆرەکێ ددەتە سەر عەردی و هەر ئەوە هەموو شەرخوازی مەترسیێن جیهانێ دبینت[٦٧].و رۆژا هێز، مان، رۆهنکرن، هێزا ژیانێ، توانا و ژێدەرێ ژیانێ ل سەر عەردی و پشکەکا گرنگ ژ ئەفسانە و هۆنەر و ئەدەبیاتێ ڤەدگریت[٦٨].

هەروەسان خوداوەندێ رۆژێ هژمارەکا هێمایان هەنە گرنگترینێ وان خاچ، بازنە، ستێرا چوار کوژی، شیرێ ددانکی (السیف المسنن)، تلپێ ل هنداڤ ستوونێ و هێمایێن دی هەنە[٦٩]، و بازێرێ سبار مەلبەندێ پەرستنا وی بوو.

### ٤- هێمایێ خوداوەند عەشتار (ستێر)[٧٠].

یەكەمین جارا هێما یێ ستێرێ ل تەپە كـورا*(٣٣٠٠ب.ز) دیاربوویە و هێمایێ خوداوەند (ئانانا)ی[٧١]بوو كو ب زمانێ سومەری ئانكویا (خانما ئەسمانی)[٧٢] ئەكەدی و بابلی و ئاشووریيان ب عەشتار ناڤكریە ئانكو پەرستی یان خوداوەند دهـێـت[٧٣]. بەلێ حوریان ب ناڤێ شاوشكا پەرستیە[٧٤]، هەمی دەمان ستێرا هەشت كوژی د پەیكەر و نكراندیاندا وەك هێمایێ وێ دگەل خوداوەندێ خۆجهی هاتیە[٧٥]. هەژیە بێتە زانین كو د خەتێ بزماركیدا ستێرا هەشت كوژی وەك دەربرینا ناڤێ خوداوەند یان خوداوەندا مێیینە (الهە) هاتیە[٧٦]، ئەڤ هێمایە دگەل خوداوەند عەشتاری هاتیەگرێدان ژبەركو د گولستێرێدا كو جوانترین ستێرا ئەسمانییە بەرجەستە بوویە[٧٧].هژمارا وێ ژی (١٥)یـە[٧٨] و كچا خوداوەن (سن) خوداوەندێ هەیڤێ و خوشكا خوداوەندێ رۆژێ (ئوتو)[٧٩]یە ژ پەسنێن وێ ئەوە كو خوداوەندا رەگەز و ئەڤین و شەرییە و خانما خەمباری و شەرانە، گولا هەژی (الزهرة اللائقة)یە[٨٠].

باژێرێ وەركا* ژ گرنگترین مەلبەندێن وێ بوون و پەرستگەها وێ (ای-انا) پەرستگەها ئاسمانی ل پشكا ژێریا وەلاتێ ناڤبەرا دورووباران بوو و هەر ل وێرێ بۆ یەكەمین جار شوینوارێن دەسپێكێن بەراهیێ یێن نڤیسینێن وێنەدار[٨١](الكتابات الصوریە) هاتینەدیتن، ل باكوور ژی هەردو باژێرێن نەینەوا و ئەربیل ژ گرنگترین مەلبەندێن پەرستنا وێ بوون، وەسان هزر دهێتەكرن و كو پەیڤا نەینەوا ژ ناڤێ خوداوەند (ئانانا) هاتیەوەرگرتن ژبەر كو ئەڤ باژێرە مەلبەندەكێ گرنگێ پەرستنا وی خوداوەندی بوو[٨٢]، و دسەردەمێ ئاشووریێ نوودا ناڤێ عەشتارا ئەربیل بەربەلاڤببوو و د سالنامێن (الحولیات) شاهێ ئاشووری سەنحاریب (٧٠٤-٦٨١ب.ز)[٨٣] ئاماژە پێ هاتیەكرن، گەلەك چیرۆك و ئەفسانە هەنە پەیوەندی ب خوداوەند عەشتار ئەنانا[٨٤] ڤە هەنە، ڤی خوداوەندی گەلەك هێما هەنە ژوانا: لەڤەنێ سەرتیژ و سێ قەد- برین تێدا هەنە و دەستەكێ لەڤەنێن خوار، ئەڤە ژ گرنگترین هێمایێن وێ نە و ژ لەڤەنێ وی شڤانێ وەرگرتییە یێ پشكا ژێریا وەلاتێ ناڤبەرا دورووباران د چوار هزار سالیا بەری زایینیدا هەڤالینیا خوداوەند ئانانایێ دكر[٨٥]. هەروەسان ستێرا ئانانا یا هەشت كوژی كەڤنترین و ناڤدارترین هێمایێن وێ نە ل هەردو پشكێن باكوور و باشوورێ وەلاتێ ناڤبەرا دو رووباران و د پرانییا چەرخاندا یا بەردەوام بوویە[٨٦]. هەروەسان گولا ئەرخەوانی یا هەشت بەلگ كو نوونەراتیا درەختا ژیانێ دكر. د هندەك دیمەنێن هۆنەریدا خوداوەند ئانانا ب رویسی دەركەتیە هەروەك خوداوەندێ ئەڤین و پەیوەندیێن سیكسی یە[٨٧]. د هندەك دیمەنێن دی دا هەر ب رویسی دەركەتیە كو مەمكێن خۆ ددەستێن خۆدا گرتینە هەروەك شیری ددەتە جیهانێ[٨٨]،یان ژی ب جوانییا خۆ كەلەجانێ بۆ زەلامان دروستدكەت، د هندەك دیمەنێن دیتردا دیار دبیت كو سوارێ گیانەوەرێ خوێێ هەرەباش شێری بوویە و چەك پێدڤیێن شەری د دەستاندانە و سەرێ وێ ژی ب ستێرا هەشت كوژی هاتیەنەخشاندن[٨٩].

### ٥- هێمایێ خوداوەند مەردوخی (مەرك) ل سەر بنواشەكێ دەرەجكی[٩٠]

مەرك گرنگترین هێمایێن خوداوەند مەردوخ یە، بۆ یەكەمین جار د سەردەمێ مالباتا ئور یا ئێكێدا دەركـەت و یا بـەردەوام بوو هەتا مالباتا سیێ یا ئور(٢١١٢-٢٠٠٤پ.ز)(٩١) marru مەر* ئانكو مەرك كو د كارێ چاندنێدا دهێتەبكارئینان، دبیت ئەو ژی نیشانا هندێ بیتن كو ئەو خوداوەندێ چاندنێ یە[٩٢] مەردوخ خوداوەندێ باژێرێ بابل بوو سومەریان دگۆتێ(AMAR- UTU)[٩٣] ئانكو گولك خوداوەندێ رۆژێ یێ بچووك[٩٤]. ئەڤ رامانا ژ ناڤێ وی دهێتەدیتن نیشانا پەیوەندیا وی یە دگەل رۆژێ و ب كورێ نەخریێ خوداوەند ئایا دهێتەهژمارتن[٩٥]. بابلیان ب (مار- دوكو) ناڤكریە ئانكو كورێ خوداوەند دكوی ب رامانا (گرێ پیروز. كو وەسان باوەردهێتەكرن كو دكەڤیتە ناڤ زنجیرە چیایێن حەمرین ل باكوورێ

رۆژئاڤایێ وەلاتێ بابل[٩٦].

دەمێ بۆیەکەمین جار پەرستنا خوداوەند مەردوخی پەیدابووی ئەو خووداوەندێ خۆجهیێ باژێرێ بابل* بوو[٩٧]، د چەرخێ بابلیێ کەڤندا دەمێ (ئومەریان)° دەستەلاتداری دکر مەردوخ بوو خوداوەندێ هەرە مەزنێ ئیمبراتوریێ و خۆدیێ جەمسەریا دەستەلاتی بوو د وێ ئیمبراتوریێدا[٩٨]. و دگۆتنە هەڤژینا وی (صربانتیم) ب رامانا زیڤ یان تەیسی وەك زیڤی[٩٩]، و خوداوەندێ نڤیسینێ نابو کورێ وان بوو[١٠٠]. باژێرێ بابل دهاتە هژمارتن مەلبەندێ سەرەکیێ پەرستنا خوداوەند مەردوخی و وی پەرستگەهەك ل ویرێ هەبوو دگۆتنێ (E-sag-IL) ئانکو (مالا سەر بلند) ئەڤ مالە ناڤەندەکا گرنگێ زانستێن ئایینی و سێحربازیێ بوو[١٠١]، د قورئانا پیروزدا مژارا گرنگیدانا بابلییان ب سێحربازیێ پشتراستکرییە دەمێ گۆتی: بسم الله الرحمن الرحيم ((يعلمون الناس السحر و ما انزل على الملكين ببابل هاروت و ماروت))[١٠٢] ڤێ پەرستگەهێ زەقورەك ب ناڤێ (e-temen-ak-ki)مالا بنیاتێ ئەسمان و عەردی هەیە[١٠٣]، زەقورە ژ حەفت نهومان پێکهاتیە و بلندیا وێ ٩١ مەترن و بنواشێ وێ ژی رەنگ چوارگوشەیە درێژیا ئالیێ وێ ٩١،٥مێترە[١٠٤]، د پێشەکیا قانوونا حامورابی** دا ب ڤی رەنگی ئاماژە ب خوداوەندی کریە: ((دەمێ خوداوەند ئانو ئەلمتسامی ب سەر شاهێ ئانوناکی*** دا سەرکەتی و خوداوەند سەروەرێ ئەسمان و عەردی و بریاردەرێ سەرنڤشتێ وەلاتی. بریاردان مەردوخ کورێ نەخریێ خوداوەند ئانکی پیروزیا خوداوەند ئەنلیلی ل سەر هەموو مرۆڤان هەبیت)[١٠٥]. ژ دەقی دیاردبیتن کو خوداوەند ئانو و ئەنلیلی خوداوەند مەردوخ ژێگرتییە کو پیروزیا ئەنلیلی ل سەر هەموو مرۆڤان هەبیتن و خوداوەند مەردوخی حامورابی د ناڤ مرۆڤاندا ژێگرتییە کو نوونەرێ وی یێ مرۆڤایەتیێ بیت[١٠٦]. هەروەسان مەردوخ خوداوەندێ سێربازیێ بوو رێنمایێن سێربازیێ ژ بابێ خۆ ئەنکی[١٠٧] وەردگرتن و پێنجی ناڤ هەبوون[١٠٨] و هژمارا وی یا هێمایی (٥٠) بوو[١٠٩]، و د هۆنەریدا ب گوهێن مەزن دەربرین ژێکریە کو نیشانا وەرگرتن و تێگەهشتنەکا بەرفرەهە[١١٠]، دەمێ دیاردبیت دار و تلپ د دەستاندایە وەك هێمایێ هێز و دەستەلاتداریێ و تاجەکا خەملاندی ب زێری ل سەر سەریە[١١١]. هەموو دەمان ژی د پەیکەر و نکراندیان دگەل گیانەوەرێ ئەفسانەیی (موشخوش)* کو هێمایێ وی یە دهێتەوێنەکرن[١١٢]. سەرکردێ کۆمکارێ خوداوەندان بوو یێن شەرێ خوداوەند تیامتی و سەرکردەیێ وێ کری، کۆمکارێ خوداوەندان ئەو وەك سەرکردەکێ گەنج ژێگرتبوو و دەستەلاتەکێ بەرفرەهـ دابوونێ بۆ بجهئینانا ئەو ئەرکێن پێ هاتییەسپاردن[١١٣]. بۆ یەکەمین جار د هۆنەرێن نهالا ناڤبەرا دو رووباران مەرك ل سەر مووروەکا لولەیی هاتییەدیتن، ب رەنگەکێ بەروڤاژی ل داویا دیمەنەکیدا کو دەربرینێ ژ شەرەنیخا گیانەوەران دکەت هاتییەنەخشاندن، و د چەرخێ بابلیێ کەڤندا بێی بنواشە ل سەر مووروەکێ هاتییە نەخشاندن[١١٤].

ل نیڤا هزار سالییا دووێ پ.ز مەرك ل سەر مووران دەرکەتییە لێ ل ژێر باندۆرا شێوازێ سوری و میسریێ کەڤن بوو، و هێمایێ وی ل سەر بنواشەکێ هوور د ناڤ هێمایێن دی دا هاتبوو نەخشاندن، هەروەسان ل سەر هندەك موورێن کاشییان و ئاشووریان خوداوەندەکێ پەردار دهێتەدیتن یێ ل سەر گایەکی راوەستایە و هندەك جانەوەرێن (مخلوقات) پەردار دگەلدانە و د باگگراوندێ وی دا نەخشێ مەرکەکا بچووك بێی بنواشە هەیە، ل سەر روویەکێ گۆرێ شاهێ کاشی میلشباك (melisipak) ١٢٠٠ ب ز هێمایێن خوداوەندی هاتینەنەخشاندن دناڤ واندا هێمایێ مەرکەکا دانای ل سەر تیرەکا درێژ یا خەملاندی ب سەرێ ئەژدیهایێ مەردوخی هەیە[١١٥].

گرۆڤێ ڤەبر ل سەر پەیوەندیا مەرکێ دگەل خوداوەندی ب رەنگەکێ گومان تێدانەی ل سەر وێ شفرا سێ گوشە یا وێ مەرکێ دیاردبیت یا ل سەر دو ژووران (Kudurru) ل باژێرێ سوسە هاتییە نکراندن و ناڤێ خوداوەند مەردوخی ل سەر هاتییە نڤیسین، هەروەسان چەند جارکی ل دووڤ یەك ئەو

هێمایە ل سەر مووریْن ئاشووری یێن سەدسالییا نەهێ و هەشتێ پ.ز هاتینەنکراندن، و دیرانیا جاراندا ب تێلەکێ گرێدای ل ژێریا سێگوشەی و داوییْن وێ ب رەنگەکێ خەملاندی شووردبنە خوار و ل سەر پشتا ئەژدەهای دانابنە[116]، هێمایێ مەرکێ ل نەخشێن خنس ل سەر سەلکا ئەسەرحەدونی ل زنجرلی هاتینەنکراندن.

## ٦- هێمایێ خوداوەند نابوی لەڤەن (قەلەم) ل سەر بنواشێ پایە[117]

لەڤەن (قەلەم) هێمایێ بەربەلاڤێ خوداوەند نابۆیە[118] د هەمان دەمـدا هێمایێ خوداوەند (نیسابا)* ب خۆیە[119]،ل دوهزار سالییا پ.ز هێمایێ وی پێکهاتبوو ژ لەڤەن (قەلەم)ەکێ چکلاندی ل سەر پەیکەرێ پەرستگەهێ، و ئەڤ هێمایە ل دەسپێکا هزار سالییا ئێکێ پ.ز هاتبوو دانان ل سەر پشتا گیانەوەرەکێ خورافی (موشخوش) و ل سەدسالییا نوزدێ پ.ز و پشتی وێ نەخشێ هێمایێ وی یێ بەرێ کو پێکهاتبوو ژ لەڤەنێ (قەلەم)ێ داچکلاندی ل سەر قەرقودێ پەرستگەهێ زڤریڤە بەرچاڤان[120] و ئەڤە ژی د وی پەیکەرێدا دهێتەدیتن، هەروەسان هێمایێ لەڤەن(قەلەم)ی ل سەر مووریْن لولەیی یێن ئاشووری ئەوێن دزڤرنەڤە هەردو سەدسالییْن نەهێ و هەشتێ پ.ز هاتییەنکراندن، هەروەسان ل سەر دوشکێ ب رەخ مەرکێ ڤە یێ هێمایێ خوداوەند مەردوخی هاتییەنەخشاندن، و د هندەك کاودانێن دی دا هاتییەنەخشاندن ل سەر بەرێن رەنگبها دگەل مەرکێ ل سەر پشتا ئەژدیهای[121].

ل باژێرێ خەرساباد تابلویەك ژ دەرگەهەکێ برۆنزی هاتییەدیتن وێنەیێ ئەژدیهای ل سەر هاتییەنەخشاندن ئەو ئەژدیها د سەروبەرێ لڤینێ دایە و لەڤەن ل سەر پشتا وی دیارە، ل هەمان جهـ کەرپویچەك (قالب طابوق) هاتییەدیتن ب هێمایێن پیروز هاتییەنەخشاندن و لەڤەنێ هێمایێ خوداوەند نابۆی ژ وان هێمایانە، د سەردەمێ ئاشووریێ کەڤندا هندەکان رەنگە گوهارکەکێن لوئلوئی د رەنگێ هێمایێن خوداوەند نابۆی دکرنە گوهێن خۆ کو لەڤەنا هێمایێ خوداوەند نابۆی یەك ژ وان هێمایان بوو[122].

ناڤێ خوداوەند نابۆی ب رەنگێ(نیبۆم) د نڤیسینێن مالباتا ئۆر یا سێ دا و سەردەمێ بابلیێ کەڤن هاتییە، ئەو کورێ خوداوەند مەردوخی و خوداوەند(صربانیتم) ێ یە دگەل هەڤژینا خۆ (تشمتو)* ل پەرستگەها باژێرێ (بورسیبا)** کو مەلبەندێ پەرستنا وی یە دژیت، و ناڤێ وی د کتێبا پیرۆزدا ب (نبۆ)[123] هاتییە. ژ پەسنێن وی ئەو خوداوەندێ زانست و نڤیسین و قەلەمییە[124] یە و پارێزڤانێ نڤیسکارانە و ب ژێری دهێتەنیاسین و دەپێن قەدەرێ ل جەم خۆ دپارێزیت...[125] ژ سەدسالییا پازدێ پ.ز ڤە ل جەم ئاشووریان دهاتەپەرستن و ل نەینەوا و ئاشوور پەرستگەهـ بۆ هاتبوونە ئاڤاکرن وپیروزیا وی د سەردەمێ بابلیێ نوودا گەهشتبوو لوتکێ [126]و رۆلەك د بیروباوەرێن ئاینی شارستانیدا گێرایە و پەیکەرەك هاتییەدیتن پتری هزر بۆ هندێ دچیت کو یێ خوداوەند نابۆی بیت د دەستێ وی یێ چەپێدا لەڤەنێن نڤیسینێ هەنە[127].

## ٧- هێمایێ خوداوەند ئامۆرو دارێ چەمیای (دارێ شڤانی) ل سەر بنواشەیێ مودەرەج[128]

پەیڤا (ئامۆرو یان مارتو) د زمانێ سۆمەریدا ئانکو رۆژئاڤا، ئەڤە ژی ئاماژەیە بۆ رۆژئاڤایێ رووبارێ فرات کو خەلکەکێ کوچەر (بەدو) ل بیابانێ دژیان، ئامۆرو خوداوەندێ نەتەوەییێ کۆما عەشیرەتێن ئامۆری یە[129]، ئەکەدیان ب (عمورۆ) ناڤکریە و یەکەمین جار ناڤێ ڤی خوداوەندی ل سەردەمێ مالباتا ئور یا سێ هاتییە، ئەو کورێ خوداوەند (ئان) خوداوەندێ ئەسمانی یە و چەند هەڤژینەك هەنە ژوانا بلت صری خانما بادیێ و ئاشراتو و هندەك پەسنێن خوداوەندێ سەڤای هەنە و ئەگەرێ خرابی و وێرانکرنێ بۆ وی دزڤرینەڤە[130].

د دەقەکیدا هاتییە کو پەیڤا (urinnu) هەڤمانایە دگەل ((Sibiruu کو رامانا دارێ شڤانی ددەت، گرۆڤەکێ بنبرنینە کو دار تایبەتە ب خوداوەندەکێ دیارکری بەلێ دهێتەپالدان بۆ خوداوەند ئامۆروی،

ژبەركو نەخشاندنا وی ل سەر پەیكەر و نكراندیان د ناڤبەرا نیڤا یەكەم ژ هزارساليیا دووێ پ.ز بوو، گەلەك جاران دار هاتییە وێنەكرن ب رەخ پەرستیەكێ نێر (پیاو) كو كراسەكێ كورت ل بەرە و سەولەجانەك د دەستاندایە، ئەڤ وێنەیە ژ وێنەیێن بەرچاڤبوویە د وی سەردەمێ دیرۆكیدا و وەسان هزردهێتەكرن كو ئەوی دەربرین ژ خوداوەند ئامۆروی دكر، د دیمەنەكێ دی دا ل سەر موورەكا لولەیی (اسطواني) وێنەیێ خوداوەندییە د سەروبەرێ نزاكرنێ بەرامبەری وێنەكێ راوەستیای روی ب روی زەقورەكێ ژ نهۆمێ سەری ب دو داران كو دكەڤنە هنداڤی پەرستگەهێ شوور دبنەڤە سەر دەرگەهێ پەرستگەهێ ل كۆمتێ زەقورێ وەسان هاتییەشروڤەكرن كو ئەو دەربرینێ ژ ئامۆروی دكەت، خوداوەندێ رۆژئاڤا بەرامبەری زەقورەكا تایبەت ب وی ڤە راوەستیایە، هەروەسان ل سەر موورەكا دی یا لولەیی خوداوەندەك هەیە پێیەكێ وی ل سەر پشتا بزنەكییە و دارەك ل بەرامبەرە و خوداوەندێ ل پشت وی روونشتی دارێ دووێ هەلگرتییە كو ئەڤە ژێ وەسان هاتییەشروڤەكرن كو ئەو هەڤژینا وی یە و ل سەر موورێ برگەیەك هاتییەنڤیسین دهێتەخواندن (mar-tu dumu AN-NA)، ل سەر موورەكا دی هەمان خوداوەند دهێتەدیتن ب هەمان سەروبەر بەلێ دارەك هەلگرتییە پەیڤێن(Apil-Amuruu) دگەلدایە ئانكو خزمەتكار (Amuruu Sdad)[١٣١].

د هندەك دیمەنێن دی یێن چەرخێ بابلیێ كەڤن خوداوەند دیاردبیتن د دەستەكێدا یان هەردو دەستاندا هەمان بابەتێ ل سەر موورێن بەربەلاڤێن ڤی چەرخی هەلدگریت، هەروەسان هێمایێ داری ل ڤالاهی ب رەنگێ ستوونكی ل سەر عەردی هاتییەنەخشاندن، دبیت هندەك جاران یێ مەزنبیتن، یان بچووك و درێژ یان كورت بیتن، هندەك جاران ژێ هێما ب رەنگێ دو داران ب هەمان رێزكرن دهێتەنەخشاندن، یان ژێ ب شێوازێ دارەكێ ب رەخ خوداوەندی یان د دەستاندا دهێت، یان ژێ ب شێوەیێ دو داران ب رەخ سەگەكیڤە دگەل دارێ سێێ ل هنداڤ سەری ..هتد پرانییا ڤان هەموو وێنەیان دزڤرنەڤە چەرخێ بابلیێ كەڤن[١٣٢].

د هونەرێ میسریێ كەڤندا دارێ ڤەچەمیای هێمایێ دەستەلاتێ شاهینی بوو ل دەولەتا ناڤەندی ل دەوروبەرێن (٢١٣٣-١٧٨٦پ.ز) و دزمانێ میسریدا دگۆتنە دارێ ڤەچەمیای (حەقا) و ژ ئالیێ خوداوەندی و شاهان و فەرمانبەران و خودان پایەیێن بلند دهاتەهەلگرتن[١٣٣].

### ٨- هێمایێ خوداوەند ئەددی (برووسیا جووت) ل سەر بنواشێ دەرجكی[١٣٤].

یەكەمین جار ل سەر موورەكا لولەیی یا سەردەمێ ئەكەدی (٢٣٧١-٢٢٣٠پ.ز) ل گورستانا شاهینییا باژێرێ ئوور هاتییەدیتن، هێمایێ وی ب رەخ ستێركێڤە ب رەنگەكێ مەزن یێ دیاربوو[١٣٥]، ئەڤ هێمایە ل سەر بەرێن كودورو* ب شێوازێ برویسییەكا دووانی هاتییە كو هێمایە بۆ خوداوەند ئەددی[١٣٦]، یێ كو ناڤێ وی د نڤیسینا بزماركیدا ب شێوازێ (IM) ئانكو با[١٣٧] هاتییەنڤیسین. هەر ئەو خوداوەندێ سەقای و بارۆڤانە ل جەم سومەریان و ئەو ژیانێ و هەر ئەو ژێ ل دووڤ بیروباوەرێن وان دكاریت وێرانبكەت[١٣٨].

ب وی ناڤی كو خوداوەندێ برویسیایە ل نیڤا یەكەم ژ هزارساليیا سێێ پێشی زایینی هێمایێ وی چەنگالێ جووت بوو هەر ئالیەكێ وی سێ هێمایێن برویسی هەبوون ب ڤی رەنگی دبوونە شەش نیشانێن برویسیێ كو ئەو ژێ هێمایێ وی یێ پیروز بوو[١٣٩]. ئەڤ چەندە د چەرخێن پاشتر دا یا بەردەوام بوو، و چەرخێ ئاشوورێ نوودا هێمایێوی چوكلاندی ل سەر بنواشەكی یان عەردی هاتییەنكراندن و وەك زەخرەفە ژێ بۆ پركرنا ڤالاهییان هاتییەنەخشاندن، د چەرخێ بابلیێ نوودا برویسیا تێكەل هاتییەدانان ل سەر هێمایێ زەقورەكێ كو ئەو ژێ هاتییەچەسپاندن ل سەر بنواشەكی[١٤٠].

بابلیان ئەڤ خوداوەندە ب ناڤێ (اشكر) پەرستیە، ئەكەدی و بابلی و ئاشووریان ژێ ب ناڤێ (ئەدد) و كاشیان ب ناڤێ (برباش) و حوریان ب ناڤێ تیشوب پەرستیە و ل جەم كەنعانیان ژێ بوویە (بەعل)[١٤١]

ئەو کورێ خوداوەند (ئان)ە و ناڤێ هەڤژینا وی ژی شالایە[142]*، ئەو رێکێ ل بەر هەوران دگریت و رۆناهی چەکێ وی یە و ئەو د ناڤ بابەلیسك و برویسییاندا هەیە[143]، دهێتەدیتن برویسییا هەلگرتی سواری گیانەوەرێ خۆیێ پیروز گای بوویە.144مەلبەندێن پەرستنا وی ژی کارکارایە ل حەلەبێ[145]، ل بابل ژی دهاتەپەرستن[146]، بەلێ ل ئاشوور خوداوەند (ئەدد) دگەل خوداوەند (ئانو) د یەك پەرستگەهێدا دهاتنەپەرستن، هەردویان دو زەقورەیێن بچووك ل پەرستگەها خۆ ل رۆژئاڤایێ زەقورا پەرستگەها ئاشوور نێزیك کوچکا شاهی یا شاهێن ئاشوور هەبوون، ئەڤ پەرستگەهە یا تەرخانکری بوو بۆ پەرستنا ڤان دو خوداوەندان پێکڤە[147].

## ب- نڤیسین

پێکهاتییە ژ دەقەکی بزمارکی ب زمانێ ئەکەدی (زاراڤێ ئاشووری)بەرامبەری وێنەیێ شاهێ ئاشووری هاتییەنڤیسین و پێکهاتییە ژ 54 رێزان ژ نڤیسینا بزمارکی[148]، ب قەبارێ بچووکێ خەتێ بزمارکیێ خوار یێ ناڤکری ب (کورزیف ) و نڤیسین ب شێوازێ بزمارکیێ و خەتێ ئاشووریێ نوویە[149]،ژ لیڤا میحرابا ژێری بەرەف وێنەیێ شاهی درێژ دبیت و پانییا وێ نێزیکی 60سم و درێژی نێزیکی مەترەکییە[150].
ئەڤە ژی وەرگێرانا وی دەقیە:

1. ئاشوور خوداوەندێ مەزن، ئینلیلێ خوداوەند، یێ بریارێ ل سەر قەدەری ددەت؛
2. ماردوخ، رێڤەبەر (؟) هەمووعەردان............؛
3. نابۆ، ئەوێ دەرزیکێ و تلپێ قەدەران هەلدگریت (خوداوەند(؟))، ئەو ب پێدا دچیتەڤە..؛
4. رۆژ شاهێ ئەسمان و ئەردی، ئافرێنەرێ مرۆڤایەتیێ.............. مرۆڤان ؛
5. (سن) رۆژهەلاتیێ تەیسۆك، ئەوێ سولجانان ددەت (و تاجی (؟)......)..........؛
6. ئەداد سەرپەرشتیارێ ئاڤدانا ئەسمان و عەردی، کی ددانتەسەرێك (سامان ل سەر (؟)...و) مشەیی، و سازدکەت............گەشبوون؛
7. ئەیا*،(خوداوەندێ)پەندێ، ئەوێ هەموو تشت ژ هەموو رەنگان چێکرین، چێکرنەکا باش.. ئافراندن؛
8. (ئینانا(؟)) خانما ئوروك، عەشتار، ئەو شاژنا حەز ویشاهێ دکەت یێ ئەو ب ساناهی کری، یا بەزێنەر........؛
9. سیبیتی * خوداوەندێ خودانهێزان ئەوێن بەری دو تیپێن لەشکەری بەرەف پێشدچن.........، ئەوێ دهاڤێتە بنی (؟) (دوژمنێن من (؟))
10. ئامورۆ، ئەوێ چویڤ و سەتلێ هەلدگریت........ نرکال(؟)، کی ب سەرێکڤە دئینیت(؟)....
11. ئەڤە ئەو خوداوەندا مەزنە یا ئەسمان و عەردی دژیت...............................
12. ............تیجلات بلاصر شاهێ هەر چوار ئالییان، حوکمدارێ(زانین و شەرەزابوونێ) (اتقان) ئەنلیل(کاهنێ ئاشوور(؟))...خوشتڤی....
13. ئەوێ چێدکەت (خوداوەند(؟)) ئەڤین............
14. چیایێن مەزن دبریت مینا شقفە قازانێن گلینەیی،
15. ل دەریایێ بالا ئانجی بوویە (ئاڤابوونا رۆژێ بەرەف دەریایێ ژێری یێ رۆژهەلاتی).. .
16. د سالا حەفتێدا ژ دەستەلاتداریا وی، ولوباینس ئەوێن ل عەردێن بەرامبەری ئیمبراتوریا ئاشووری دژین.........
17. وان (خرڤەکر) لەشکەرێ خۆ، یێ (خۆبدەستڤەنەدای) تنێ ئەو شاهێن بەری من چووین.....
18. ........وان ب رێکوپێکی بەندایەتیا خۆ ئەدا نەکر، باژێرێن وان..........
19. اهلامی (؟)............. تو نزانی..........
20. وان باوەریەکا توند هەبوو.............چوون.........
21. پلانێن شەرخوازی دژی وەلاتێ ئاشوور دانان........ ئاخفتن.....
22. .............

٢٣. ..........بازلت (؟)، عەردێ ئاسێ یە

٢٤. (ئەز) فەرمانێ ددەم (تیپێن لەشکەری نە)دڤێت بەرەف پیش بچن، رێك..........

٢٥. و بلد لی، ب رەنگەکێ کەریکرتی، ل گەلیی چیان..........(چیا)....

٢٦. ٣٢ (لیستا عەرد و باژێران)

٣٣. .......... ب گشتی، ٢٩ باژێرێن ئولوبیانس

٣٤. ...........کەلوپەلێن وان من دەست ب سەرداگرت..........

٣٥. ژ وان باژێران ئولوبیانس، یا (رەڤی) بەرامبەری چەکێن من.......

٣٦. .... بر........ ل جهێن پڕ ژووردانی ژ چیایێ ئیلم.........

٣٧. ..........مینا هونگوستیرکێ..............

٣٨. .......... وان دیت.... و بۆ دەرۆکان

٣٩. ....... ب مولکێن خۆ... جهێن ژووردانیێن دژوار ل چیایی.....(کومتێن چیای)

٤٠. یێن وەك کەلا بۆ خۆ گرتین، وان دیت (!؟) کەلوپەلێن وان...(ترس)

٤١. دەست ب سەرداگرت، ئەو ژ چەکێن من دترسیای بوون................

٤٢. بێی ناڤ (؟)، عەردێ کیسی (؟) دگەل مولکێن وان، دناڤ.........

٤٣. من هزر کر کمێتە (؟)، ئەو باژێر، ژ کۆما وان

٤٤. من دەست ب سەرداگرت، ئەو کەسێن کەتینە ژێر دەستێ من، ئەز ل وی جهێ نیشتەجێ بووم، و (دانا) خصی (بۆ من وەك حوکمدار ل سەر وان............ و بۆ هەرێمێ)

٤٥. وەلاتێ ئاشووری من زڤراندن. من ل چیان چێکر( یان: ل چیایێ (ئیلیم................)پەیکەر...........و

٤٦. من وێنەیێ شاهیا خۆ لێ ئافراند، و .....بۆ هەموو رۆژان.......(هەر یەك ژ)

٤٧. دەقی ژێ ببت، یان دەسکارێ د (دەقی............)٤٨ یان بپەلخینیت یان ژێ ببەت یان ب بەرا بپەلخینیت...............

٤٩. یان ل عەردی بەلاڤەبکەت، دبیت خوداوەندێ مەزنی ل ئاسمانی و عەردی نیشتەجێ..

٥٠. یا کو ناڤێن وێ هاتین (د ڤی نەخشیدا(؟))..........

٥١. دێ عەردی گوهرن ((٥؟)) بۆ کاڤل و خرابەیان.........

٥٢. ئەو نەخشەبەر..............

٥٣. ب هێلن ب زەیتا پیروز پاقژبکەت.........

٥٤.(و) خوداوەندێ هەموو عەردان (؟) دێ گوهداریيا دوعا وی کەت.....))[١٥١]

## ج- وێنەیێ شاهی

پێکهاتییە ژ وێنەیێ شاهێ ئاشووری تجلاتبلیزەرێ سێ، د سەروبەرێ ئاسایدا و سەرەرێ ژ ئالیەکیڤەیە راوەستایە، بەرێ وی ل ئالیێ چەپێ یە، ب دەستێ خۆیێ راستێ ئاماژە دکەتە کۆمتی کو هێمایێن خوداوەندینە، و د دەستێ خۆیێ چەپێ دا گوپالێ شاهی (صولجان)ی هەلدگریت[١٥٢] د سەروبەرەکێ خواردا ژ دەستێ وی یێ چەپێ ڤە ب رەنگەکێ خوار دەسپێدکەت هەتا دگەهیتە کەمەرا وی کوژیەکێ ڤەبووی نێزیکی ٥٥ پلان پێکدئینت وەك سەروبەرێ هەمان گوپالێ شاهانەیە یێ شاهـ شەمشێ ئەدەدێ پێنجێ (٨٢٣- ٨١١ پ.ز) هەلدگریت ل وی پەیکەرێ ئەوێ ل نەمرود هاتیيەدیتن*[١٥٣]گوپالێ شاهانا ژ نیشانێن نەلڤێن دەستەلاتداریيا ئاشووری بوون، ژ ئالیێ شاهـ و خۆدی پلەیێن بلندێن دەولەتێ دهاتنەهەلگرتن، د هەمان دەمدا ژ ئالیێ خوداوەندی ڤە دهاتنەهەلگرتن و وەك هێمایێ خوداوەندەکی دیتر بوو، هەروەسان گوپالێ شاهانە ژ نیشانێن بەرچاڤی بوو بۆ دیارکرنا پلەیا وی کەسێ یێ هەلدگریت.[١٥٤]

### ١-کولاڤێ سەری

شاهی کولاڤەك دکرە سەرێ خۆ ژ کومتی ڤە یێ تیژ بوو[١٥٥]، ئەو ژی هێمایەك بوو ژ هێمایێن خوداوەندێ و شاهینیا ئایینی بوو[١٥٦]، راپێچەکا

سەری یا ب شێوازەكێ مەخروتی یێ تیژ بوو[١٥٧]، بۆ یەكەمین جار ل داویا هزارسالییا دووێ پێشی زایینی شاهێن ئاشووری دكرە سەرێ خۆ[١٥٨]، د قوناغێن پاشترێن سەردەمێ ئاشووری ئەڤ چەندە یا بەردەوام بوو، و ئاشووریا كومتێ كولاڤی دخەملاند ئەڤە ژی ئەنجامێ باوەریا وان بوو كو ئەڤە هێمایێ دەرێخستنا گیانێن شەرخوازە (الارواح الشریرە) [١٥٩].

### ٢-جلو بەرگ

شاهی جلكێن درێژ یێن ب ریشالوكێن پانڤە كو ب سەر پییاندا دهاتنەخوار دكرنە بەرخۆ[١٦٠]، ئەڤە ژی ئەو جلكە بوون یێن پرانییا شاهێن ئاشووری دكرنە بەر خۆ[١٦١]، ژ سنگی ڤە دیار كو دو كنفێن هەڤبر دكرنە بەر خۆ یەك ژ وان یا دیارە و یا دیتر ناهێتەدیتن و كەمەرەك* ل نیڤا پشتێ بوو و لەوندیێن وی د كورتبوون.[١٦٢]

## پێنج- گرنگییا پەیكەری و دیرۆكا وی

مەرەم ژ نكراندنا ڤی پەیكەری ل دەڤەرا بەهدینان یا نها تنێ ژبۆ بزیندوو هێلانا بیرهاتنا وێ سەركەفتنێ یا شاهـ ئاشووری تجلاتبلزەرێ سیێ دەستخوڤە ئینای و بۆ ڤێ مەرەمێ فەرمانا نكراندنا پەیكەری ل ڤی جهی دایە هەروەك د ریزێن ١٢، ٤٥ و ٤٦ێن وی دەقێ بزماركی هاتییە نڤیسین.

د وی دەقیدا ئاماژە پێكریە كو وی ل سالا حەفتێ ژ دەستەلاتدارییا خۆ (٧٣٨ پ ز) هێرشەكا لەشكەری بریە سەر دەڤەرا ولوبا (بەهدینانا نها)، ئەگەرێ ڤێ هێرشێ ژی وەك دیاركری ئەو بوو كو خەلكێ دەڤەرێ و باژێرێن وێ تاگیری و گوهدارییا خۆ بۆ دەستەلاتێ شاهێن ئاشووریێن بەری وی دیارنەكریە، و پەسنا خەلكێ دەڤەرێ دكەت كو خەلكەكە زۆر باوەری ب خۆ هەیە و وان تاوانبار دكەت كو كارێ پیلانگێرییێ دژی شاهنشینا ئاشووری كریە.

هەروەسان دەمێ سالوخەتا وێ هێرشێ دكەت كو تێدا دەست ب سەر ٢٩ باژێران (گوندان)دا گرتی و ناڤێن وان ئینایەن د پەسنا خەلكێ واندا دبێژیت ژبەر چەكێن وی رەڤینە كۆمتێن چیا بۆ خۆ كرنە كەلا، وی ئەو تالانكرن و سامانێن وان برن و وان ژی ل سەر چیان لێ دنێری، هەروەسان وی هەمان سەرەدەری د گەل خەلكێ كسی كر و هەموو ئەوێن كەتینە دەستان گرتن ویەك ژ سەركردێن خۆیێن خەساندی كرە حوكمدارێ دەڤەرێ یا كو پشتی ڤێ هێرشێ بوویە پشكەك ژ شاهنشینا ئاشووری. ب دانانا یەك ژ ئالیگرێن شاهی ئەڤ دەڤەرە راستەخۆ كەتە ژێر دەستەلاتدارییا ئاشووری و ئەڤە ژی ژ كارێن هەرە گرنگێن سیاسەتا ئاشووری بوو ل سەردەمێ ڤی شاهی.[١٦٣]

نەخشەبەرێ ملا مەرگێ گرنگییەكا دیرۆكییا مەزن هەیە، ژبەركو ب رەنگەكێ هوور یەك ژ وان هێرشان بۆ مە بەرچاڤدكەت یێن شاهێن ئاشووری ب مەرەما بەرفرەهكرنا شاهنشینا خۆ و تالانكرنا سامان و خێرێن ڤێ دەڤەرێ و بێ باهركرنا خەلكێ وێ ژ سەربەخۆییێ كرینە سەردەڤەرا بەهدینان و مهانا وی ژی بۆ ڤێ هێرشێ دەست بسەرداگرتنا رێكێن بازرگانی ئەوێن د ڤێ دەڤەرێ را هەین و د هەمان دەمدا مەرەما وی ژ ڤێ هێرشێ تالانكرنا سامان و خێر و بێرێن دەڤەرێ و ژ ناڤبرنا هەر بزاڤەكێ یا خەلكێ رەسەنێ دەڤەرێ دژی دەستەلاتێ وی دكر.

شاهێ ئاشووری تجلا تبلزەرێ سیێ دهێتەنیاسین كو یەكەمین كەسە یێ دست ب ڤەگوهاستنا ب كۆما مللەتێن دیترێن دەڤەرێ كری، گەلەك پارچە ژ دەڤەرێ ب تەواوی ژ خەلكێ وان ڤالاكرن و ب زۆری هندەكێن دی ل شوونا وان ئاكنجیكرن، هەردەمێ پشتەرێبوون دژی دەستەلاتێ وان دوبارەدبووڤە ئاشووریان پەنا دبرە بەر ڤەگوهاستنا وی خەلكی ژ سەر مولك و وارێ وان[١٦٤]،ئەو د وێ باوەرێدابوون كو ئەڤە چاكترین رێكە بۆ ژناڤبرا هزرا خۆجهی و پێگیرییا خەلكێ وان دەڤەران ب تیتال و باوەرێن خۆجهی ڤە، ڤی شاهی د ناڤبەرا (٧٤٢- ٧٤١ پ.ز) ٣٠٠٠٠كەس ژ دەڤەرا حەمات یاسورێ ڤەگوهاستنە چیایێن زاگروس، و ل سالا ٧٤٤پ ز ٦٥٠٠٠ د هەوەكێدا كەسێن دی ڤەگوهاستنە ئیرانێ.[١٦٥]

پشتی وەلاتێ لوبۆ (Ullubu) گرتی هەروەکی وی ب خۆ د پەیکەرێ ملا مەرگێ دا ئاماژەپێکری چەند هزار کەسەك ژ وەلاتێ شامێ ڤەگوهاستن و ب زۆری ل دەڤەرا دهۆك و زاخۆ ئاکنجیکرن.[١٦٦] هندی ئەو هێمایەنە یێن ل پشکا سەری یا پەیکەری نەخشاندین هێمایێن خوداوەندێ ئاشووری بوون و ب زۆری ل سەر خەلکێ وان دەڤەران سەپاند کو پەرستنا وێ و هێمایێن دیتر ئەوێن خەلکێ دەڤەرێ بەری داگیرکرنا ئاشووریان باوەری پێ هەی بکەن.

دبیت نەخشاندنا ڤان هێمایان ب مەرەما خۆ نێزیککرنێ ل خەلکێ وان دەڤەران و رێزگرتنێ ل بیروباوەرێن وان بیتن و ئەڤ چەندە ژی ژ ئالیێ ئاشووریانەڤە هاتیبەکرن، گەلەك پەرستگەهـ ل ئاشوور هەنە هاتینەئاڤاکرن بۆ خوداوەندان دبیت خوداوەندێن ئاشووری ژی نەبن، هەروەسان پەرستگەهێن کەڤن ژی سەر ژ نوو نووژەنکرنەڤە و ل سەردەمێ شاهـ شیلمینسەرێ سیێ پەرستگەها هەڤپشکا هەردو خوداوەندان (ئانو) و ئەدد ل ئاشوور هاتنەڤە نووژەنکرن.[١٦٧]

ئەڤ کریارە کیشیان ژی بەری وان ئەنجامدایە و دگەل خوداوەندێن خۆ خوداوەندێن سومەری و ئەکەدی ژی پەرستینە[١٦٨]، و یەکەمین شاهێ وان (ئەکوم ١٦٠٢-١٥٨٥پ.ز) ب مەرەما زڤراندنەڤا پەیکەرێ خوداوەند مەردوخ و هەڤژینا وی (صربانیتم) ژ دیلیێ (ئێخسیریێ) هێرشەك برە سەر دەڤەرا عانە و پەرستگەها وی سەر ژنوو ل بابل ئاڤاکرەڤە داکو ئالیگریا بابلیان راکێشیت و پشتەڤانیا وان بۆ دەستەلاتێ نوو دەستڤەبینیت.[١٦٩]

## ژێدەر و پەراوێز:

*. گەلی پەیڤەکا کوردی یە، بۆ رێکا دکەڤیتە ناڤبەرا دو چیان دهێتەگۆتن، د زاراڤێ کرمانجیا باشووردا پەیڤا دەربەند شوونا گەلی دگریت.

١. باقر،طه، و فؤاد سفر، المرشد الى مواطن الاثار و الحضارة، الرحلة الثالثة بغداد- الموصل، بغداد- ١٩٦٦، ص ٤٩.

٢. صالح، قحطان رشيد، الكشاف الاثري في العراق، المؤسسة العامة للاثار و التراث، بغداد- ١٩٨٧، ص٨٧.

٣. الامين، محمود، استكشافات الاثرية الجديدة في شمال العراق، (سومر، ١٩٤٨/م٤، ج١)، ص ١٨٩.

**. چار چەل ئانکو چوار کۆمت یان چوار لوتکە.

٤. باقر، المرشد، الرحلة الثالثة، ص ٤٩.

٥. الامين، الاستكشافات، ص ١٨٩.

٦. مظلوم، طارق، تاريخ اكتشاف المنحوتات في شمال العراق، وزارة الثقافة و الفنون، بغداد- ١٩٧٧، ع٣، ص ١٢.

٧. الامين، استكشافات، ص ١٨٩.

٨. مديرية الاثار العامة : المواقع الاثرية فى العراق ، بغداد – ١٩٧٠ ص ٢٦٤

***. تەیمووریێ لەنگ (١٣٣٦-١٤٠٥ز) ل کش نێزیکی سەمەرقەندێ هاتیبە سەر دنیایێ، ب زیرەکی و خوینرێژیا خۆبوویە شاهـ و دەست ب سەر وەلاتێ فارس و سوریا و میسرێ دا گرتیە، ل سالا ١٣٨٦ز باژێرێ بەغدا وێرانکریە، دووراهێتەدیتن د رێکا ڤی گەلی را دەرباز ببیت و لەوما ژی ئەڤ پەیکەرە ب ناڤێ وی ڤە هاتیبەناڤکرن.

٩. الامين، استكشافات، ص: ١٩١.

١٠. Postgate، J.n، The Insciption of Tiglath- pileser III at Mila Mergi، SUMER، vol. XXIX،No١ 2.p;49&.

١١. Soden، W V. The Ancient Orint، Traslated by Donald G. Schley، Michigan- 1994، p: 57.

١٢. Postgate، Inscription ، p: 50.

١٣. Blak: Jeremy and Anthony Green, Gods, demons and symbols of Ancient Mesopotamia, 2.ed, British Musem- 1998, p:102.

١٤. Weidner: Ernest &Soden Welfram Von, Reallexikon der Assyriologie und Vorerasiatischen Arhaologie, Berlin New York, 1957- 1971, p 486.

١٥. King: L. W. The Somerian Problem, U S A, 1969 ,p: 58.

١٦. الطعان: عبدالرضا، الفكر السياسي في العراق القديم، وزارة الثقافة و الاعلام، بغداد- ١٩٨١، ص ٢٦٠.

*. زانایێن زانستێن ئاشووریيان پەیڤا ئاشووری شروڤەکریە کو کورتیا پەیڤا (لآن. شار)ە کو هێمایە بۆ (انو) ئەسمانی، کو خوداوەند ئانو ل ئاشووری دهاتەپەرستن و ب خوداوەندەکێ دی ب ناڤێ ئاشووری هاتەگۆهارتن کو ناڤێ پەیتەختێ وانێ کەڤن بوو، هەروەسان شورڤەکرنەکا کەڤنتر بۆ ئاشووری هەیە ئەو ژی (آ- شر) کو وەك زمان ئانکویا (سەرکردە) ددەت، دبیت پەیڤا (أ- شر) گۆهارتن ب سەرداهاتبیت و بوویە ئاشووری، بۆ پتر پێزانینان دەربارەی پەیڤا ئاشووری بنێرە:

Jastrow: Morris, Aspects of Religious Blie and Practice in Banylonia and Assyria Newyork, 1911, p: 121- 123.

١٧. ساكز: عظمة بابل (لندن- ١٩٦٢)، ترجمة عامر سليمان، موصل- ١٩٧٩، ص: ٣٦٨.

١٨. Samuel.mark, Assyria: Astudy of symbols, Posted: Monday, January, 22, 2001, http.www.atour.com.education 20010122a. html

١٩. Douglas: E, Symbos of Gods in Mesopotamian Art, Roma- 1945.p: 105.

٢٠. Ibid.p: 105- 106.

٢١. ادزارد: د، قاموس الاله و الاساطير، ترجمة محمد وحيد خياطة، ط:٢، بيروت- ٢٠٠٠، ج ١، ص ٦٨.

٢٢. رشيد: فوزي، المعتقدات الدينية، موسوعة حضارة العراق، بغداد- ١٩٨٥، ج١، ص ١٦٣.

٢٣. موسكاتي: سبتينو، الحضارة السامية، ترجمة السيد يعقوب بكر، الهيئة المصرية العامة للكيتاب، القاهرة- ١٩٧٧، ص ٢٣٣- ٢٣٤.

٢٤. عبدالله، يوسف خلف، الفكر العسكري في العراق القديم، رسالة دكتوراه مقدمة الة المعهد التاريخ العربي و التراث العلمي، (غير منشورة)- ١٩٩٦، ص ١٦.

٢٥. SMITH > S . Dney, The Age of Ashurbanipal, CAH, Cambridge – 1962, Vol :111, p; 91.

٢٦. ساكز، عظمة بابل، ص: ٤٧٨.

٢٧. الحاج يونس: ربا محسن عبدالرزاق، الكتابة على الاختام الاسطوانية غير منشورة في المتحف العراقي، رسالة ماجستير (غير منشورة)، جامعة بغداد- ١٩٨٧، ص ١٥٨.

٢٨. Postgate, Inscrition, p:50.

٢٩. Knapp:A..Bernard ,The history and Culture of Ancient Western Asia and Egypt, U S A- 1988.P: 24.

٣٠. Wahby:T, The Rock-sculptures in Gunduk Cave, SUMER, Vol ٤, No 2, 1948.P:486.

٣١. ساكز، عظمة بابل، صك ٣٧٠.

٣٢. بوتيرو: جان، الديانة عند البابليين، ترجمة وليد الجادر، بغداد-١٩٧٠، ص ٤٠.

٣٣. الماجدي: خزعل، انجيل سومر، ط١، لبنان-١٩٩٨، ص ٣٦.

٣٤. Black ,GDSAM, p ,١٣٥.

٣٥. الدباغ، تقي، الهة فوق الارض، (سومر، ١٩٦٧،٢٣م، ج١)، ص ١١٦-١١٧.

٣٦. النجار: عبدالوهاب، قصص الانبياء، ط٣، بيروت- ١٩٧٩، ص٨٠.

٣٧. سورة فصلت، اية ٣٧.

٣٨. Weilard; James, By The Waters of Bablon, London-1970, p; 88.

*. نەنكال: واتايا ناڤێ وێ ب زمانێ سومەری خانما مەزن و ئەو هەڤژینا خوداوەندێ هەيڤێ يە. بنێرە: Black, GDSAM, p : 136

٣٩. Ibid، p: 135

٤٠. كدنتينو: جورج، الحياة اليومية في بلاد بابل و أشور، ترجمة و تعليق سليم طه التكريتي و برهان عبد التكريتي، بغداد- ١٩٧٩، ص ٤٢٩

*. ئور: ناڤدارترین باژێرێن سومەریانە، ب دووراتیا ٣٦٥ كم دكەڤیتە ژێریێ رۆژهەلاتێ بەغدا مەلبەندەكێ گرنگێ پەرستنا خوداوەن سنی و خوداوەندێ هەیڤێ بوو مەزنترین پەرستگەهێن وی لێ هەنە. بنێرە: الصيواني: شاهـ محمد علي، اور، مديرية الاثار العامة، بغداد- ١٩٧٦.

**. حەران: باژێرەكێ دكەڤیتە ژووریێ وەلاتێ میزوپوتامیا نها باكوورێ كوردستانێ، بنگەهەكێ گرنگێ پەرستنا خوداوەندێ هەیڤێ سن بوو و پەرستەگەها وی لێ هەیە. باقر، طه، مقدمة في تاريخ الحضارات القديم، ط٢، بغداد- ١٩٨٦، ج١، ص ٥٥٠-٥٥١.

٤١. باقر: طه وأخرون، تاريخ العراق القديم، بغداد- ١٩٨٠، ج٢، ص ١٤.

٤٢. عبدالرحمن: عبدالرحمن يونس، الطب في العراق، رسالة ماجستير (غير منشور) مقدمة الى كلية الاداب جامعة الموصل- ١٩٨٩، ص ٤٠.

٤٣. Douglas، SGMA، p:61.

٤٤. Douglas، SGMA، p :62 -44

٤٥. Douglas، SGMA، p:63.

٤٦. بارو: اندري، بلاد أشور (نينوى و بابل)، ترجمة عيسى سلمان و سليم طه التكريتي، بغداد- ١٩٨٠، ص٢٨.

٤٧. عكاشة: ثروت، الفن العراقي (سومر و بابل و اشور)، بيروت- ١٩٧٢، ص ٥١٢، ٥١٥.

٤٨. Postgate: inscription، p: 50..

٤٩. Shira. Symbols From Middle East.http:www.Shira.net symbols.htm

*. نوزی: ناڤێ باژێرەكێ میتانیە ب دووراتیا ٢٠ كم دكەڤیتە ژێریا باژێرێ كەركووكێ. بنێرە:مورتكات: انطوان، الفن في العراق القديم، ترجمة و تعليق عيسى سلمان و سليم طه التكريتي، بغداد- ١٩٧٥، ص: ٣٢٤.

٥٠. Wiedner، Reallexikon.p: 485.

٥١. مورتكات، الفن، ص ٣٣٢.

*.حورس: ب وینەیێ تلپەكێ رۆژێ ب دو پەرێن مەزن و رەنگین هاتیە كێشان، وارێ وی یێ بنیاتی دەلتا میسرێ یە. بۆ پتر زانیاریان بنێرە: ادولف: ارمان، ديانة مصر القديمة نشئتها و تطورها و نهايتها في اربعة الاف سنة، ترجمة عبدالمنعم ابوبكر و محمد شكرى، القاهرة- بلا، ص٣٤- ٣٥.

٥٢. خشيم: علي فهمي، الهة مصر العربية، م١، ط١، الدار البيضاء- ١٩٩٠، ص ٣٧٤.

٥٣. Boulay، R.A.Fiying serpents and Dragons، 1990
htpp:www.Apollonius.net boulay٠١e.html .

٥٤. الماجدي، خزعل، متون سومر، ط١، لبنان- ١٩٩٨، ص ١٢١.

٥٥. Douglas، SGMA، p: 101-102

٥٦. Ibid، p: 98

٥٧. Douglas، SGMA، p:101- 102.

٥٨. عبدالرحمن: عبدالمالك يونس، عبادة الاله شمس في حضارة وادى الرافدين، رسالة ماجستير (غير منشورة)، جامعة بغداد- ١٩٧٥، ص:١٧٢.

٥٩. Hurat.Clement، Ancient Presia and Iranian Civilization، London- 1972، P81، and Olmstead، A.T .History of Persian.Empire، Chicago- 1966، p:195

٦٠. روثن: مركريت، علوم البابليين، تعريب و ايضاحات يوسف حبى، وزارة الثقافة الاعلام، بغداد- ١٩٨٠، ص: ٢٥.

٦١. Labat، Rene، Manuel Epigraphie Akkadienne، Paris- 1976.p: 174.

٦٢. عبدالرحمن، اله الشمش، ص ١٣.

١٣. Labat، REA،p: 174.

١٤. احمد: جمال رشيد، دراسات كردية في بلاد سوبارتو، بغداد- ١٩٨٤، ص ٢٥.

*. كاشی: عەشیرەتێن هندۆ ئارینە ل چیایێن ئاسیێن باكوورێ رۆژهەلاتێ عیراقێ ژیاینە، وارێ وان ل نێزیكی دەریا خەزەر و دەڤەرێن چیایێن قەفقاسە، ل سەد سالیا نەهێ بێری زایینی ل پشكا رۆژئاڤایێ چیایێ زاگروس دژیان و ل نێزیكی دەڤەرا توبیاش ژیاینە، دەمێ وان دەستەلاتێ وەلاتێ بابل گرتیە دەست ب كاردیناش ناڤكر. بۆ پتر پێزانینان: بنێرە: رو: جورج، العراق القديم، ترجمة حسين علوان حسين،ط٢، بغداد- ١٩٨٦، ص ٣٢٧- ٣٣٨.

١٥. الاحمد: سامى سعيد، فترة العصر الكاشي، (سومر، م١٩٨٣، ٣٩، ج١-٢)، ص١٥٤.

١٦. Cook، J.M The Persian Empire، London،p :.150- 147

**. القرأن الكريم، سورة فصلت، أية ٣٧.

١٧. /http:www.pagans. org Owens، D. W. A Small Dictionary of Pagan Gods and Goodesses،Pt٣ .firerosel /paganl.htm

١٨. ،Lyrica، About Sun Gods and Sun Symbols in Mythology،1999 .http://www.lyricalworkc.com/stories/amaterasu/sunsymbls.htm

١٩. عبدالرحمن، الاله شمش، ص ١٦٨ز

٧٠. .Postgate، Inscription، P: 50

*. تەپە كورا (تەپە گەورە): ئەو ب خۆ تەپە گەورەیە ناڤەكێ كوردی ئانكو گرێ مەزنە گرەكێ بلندێ كولاڤكی پێ هاتیەناڤكرن كو ب دووراتیا ٢٢كم دكەڤیتە باكوورێ رۆژهەلاتێ مووسلێ، زانكۆیا بەنسلڤانیا هەلكولین لێ كرینە. بنێرە: الجادر: وليد و احمد مالك الفتيان، طرق التنقيبات الاثرية، جامعة بغداد- ١٩٨٣، ص ٢٢٥- ٢٢٩.

٧١. ،British Museum، Goddess from the world . hhiwl/hhiwl.htm http:// cas. Buffalo/٣٧٥/Edu/ English/ faculty/ Christian/syllabi

٧٢. .Geib.I J The name of theGoddessInnin،JNES،vol،XIX،Chicago- 1960،p: 72

٧٣. باقر و اخرون، تاريخ، ج٢، ص:١٥.

٧٤. هاس: فوكلت، ملاحظات حول عشتار شاوشكا الحورية في الاف الثاني قبل الميلاد، ملحق مجلة سومر (الندوة العلمية و العالمية الاولى بابل و اشور و حمرين)، المؤسسة العامة للاثار و التراث- ١٩٧٨، ص ٣٩٤.

٧٥. Boulay، R.A، ARRIVAL OF THE PROTO_SUMERIANS THE ANCIENT ASTRONAUTS، Editorial ،Comments By Roberto Solarion c 1997 .http://www.apollonius.net/boulay٠١e.html

٧٦. علي: فاضل عبدالواحد، عشتار و تموز جذور المعتقدات الخاصة بهما في حضارة وادى الرافدين، (سومر، م٢٩، ١٩٧٣، ج١-٢)، ص ٥٠.

٧٧. علي: فاضل و احمد مالك الفتيان، طرق التنقيبات الاثرية، جامعة بغداد- ١٩٨٣، ص ٣٠٨.

٧٨. كونتينو: جورج، الحياة اليومية في بلاد بابل و اشور، ترجمة و تعليق سليم طه التكريتى و برهان عبد التكريتي، بغداد- ١٩٧٩، ص ٤٢٩.

٧٩. الدملوجي: فاروق، الالوهية في المعتقدات الوثنية، بيروت- ١٩٥٣، ج١، ص ٦٢.

٨٠. OWENS،D.W،A Small Dictionary of Pagan Gods and Goddesses،pt٣ htm، and Collins، Paul،why Ancient Mesopotamian M.http://www. pagans.org/firerose/pagan١ .yths، Archaeology Univverity College London، UN British Museum Gallery Lecturer .Htpp://www.gatewaystobabylon.com/myths/whymeso.htm

*. وەركا: بازێرەكێ سومەریە ناڤێ وێ یێ كەڤن ئوروك (Uruk)بوو، دكەڤتە باكوورێ بازێرێ ئور مەلبەندەكێ شارستانیێ گرنگ

بوو د دەسپێکا دەستەلاتداریا مالباتێن سومەریدا. بنێرە: باقر، المقدمة، ج۱، ص ۲۳۳.

۸۱. بصمة حي، فرج، الوركاء مديرية الاثار العامة، بغداد- ۱۹٦۰، ص:۸

۸۲. مظلوم، طارق عبدالوهاب، و علي محمد مهدي، نينوى، مديرية الاثار العامة، بغداد- ۱۹۷۱، ص: ۱۱.

۸۳. شاهـ سەنحاریبی د ڤەگێرانا خۆدا دەربارەی هێرشا بۆ سەر بابل رێزا ۱۲ ئاماژە پێکریە، بر پتر پێزانینان بنێرە:

Luckenbill، Daniel David The Annals of Sennacherib. Oriental Institute Pyblication Chicago، .Unive. Of Chicago،1924

http://www

. stolaf.edu/people/kchanson/sennprism 1.htm1.

۸٤. دالي: ستيفاني، اساطير في بلاد ما بين النهرين، ترجمها الى العربية نجوى نصر، بيروت- ۱۹۹۷.

۸٥. الماجدي، متون سومر، ص : ۱۲٥ .

۸٦. الماجدي، انجيل سومر، ص: ۱۰٦.

۸۷. حنون: نائل، هل كان تموز في عقائد السومريين و الاكديين اله الخصوبة او من الهة الموت، (سومر، ۱۹۸۰، ۳٦، ج۱- ۲)، ص ٤۲.

۸۸. الماجدي: خزعل، انجيل بابل، ط۱، لبنان- ۱۹۹۸، ص ۸۳.

۸۹. بوتيرو: جان، الديانة عند البابليين، ترجمة وليد الجادر، بغداد- ۱۹۷۰، ص ٥٥.

۹۰. Postgate، Inscription، p: 15.

۹۱. Douglas، SGMA، p: 15.

*. مەر: پەیڤەکا ئەکەدی یە هەمان رامانا پەیڤا مەر یان مەرك یا كوردی ددەت، دەربارەی بنیاتێ ڤێ پەیڤێ بنێرە: سليمان: عامر، اللغة الاكدية، جامعة اموصل- ۱۹۹۱، ص ۲۸۱ ؛ هەروەسان بنێرە: Douglas، SGMA، p:15.

۹۲. موسكاتي، الحضارة، ص ۲۳۲.

۹۳. اسماعيل: بهيجة خليل، مسلة حامورابي، وزارة الثقافة و الاعلام، بغداد- ۱۹۸۰، ص ۷.

۹٤. ادزارد، قاموس، ص ۱٦۰.

۹٥. باقر: طه، ديانة البابليين و الاشوريين، (سومر، م ۱۹٤٦، ۲) ص ۱٦.

۹٦. رشيد : فوزي ، المعتقدات الدينية ، موسوعة حضارة العراق، بغداد – ۱۹۸٥، ج ۱، ص ۱٦۲ .

*. بابل: باژێرەکێ کەڤنە دکەڤیتە ناڤەراستێ وەلاتێ ناڤبەرا دو رووباران، دسەردەمێ مالبانا بابلییا ئێکی کو حامورابی ناڤدارترین شاهێ وان بوو ئەڤ باژێرەکێ گەلەك ناڤداربوویە. بنێرە:

روتن: ماركريت، تاريخ بابل، ترجمة زينة عزار و ميثال ابي فاضل، ط۱، بيروت- ۱۹۷٥.

۹۷. ادزارد، قاموس، ص: ۱٦۰.

*. ئەموری: هندەك رەگەزێن وەكهەڤ بوون ژ بەدویان ل داویا هزارسالیا بەری زایینی ژ جزیرێ هاتبوونە وەلاتێ ناڤبەرا دورووباران، رۆلەکێ بەرچاڤ هەبوو د شکاندنا مالباتە ئوریا سیێ. بنێرە: باقر، المقدمة، ج۱، ص: ٤۰٥

۹۸. باقر، تاريخ العراق، ج۲ ، ص ۱۸ .

۹۹. موسكاتي، الحضارة، ص۲۳۲.

۱۰۰. ساكز: هاري.و . ف، الحياة اليومية في العراق القديم (بلاد بابل و آشور)، ترجمة كاظم سعدالدين، ط۱، بغداد- ۲۰۰۰، ص ۲۲٤.

۱۰۱. موسكاتي، الحضارة، ص: ۲۳۰.

۱۰۲. القران الكريم، سورة البقرة،آية ۱۰۲، بۆ راڤەکرنا ڤێ ئایەتێ بنێرە: الرفاعي: محمد نسيب، تيسير العلي القدير لاختصار تفسير ابن كثير، ط۲، م۱، الرياض- ۱۹۸۹، ص ۸۱.

۱۰۳. بارو : اندرية ، برج بابل، ترجمة جبرا ابراهيم جبرا، الموسوعة الصغيرة/ ٥٥ ، بغداد – ۱۹۸۰، ص ٤۹ .

***. قانونا حامورابی : د هێته هەژمارتن یەكەمین كارێ یاسایی بێ رێكخستنی ، گەلەك لایەن چارەسەركرینە، شاندا فەرەنسی ل سالا (۱۹۰۱-۱۹۰۲) ل بازێرێ سوسە دیتییە و ل مۆزەخانا لوڤەر یا نیشادایە ، ئەو ژێ :
سەلكەكا ژ بەرێ رەش (دیوریت) هاتییە چێكرن، بلنداهیا سەلكێ ۲۲۵ سم ، ژ ٤٤ خانەیان پێكدهێت . بۆ پتر پێزانینان بنێرە: اسماعيل : بهيجة خليل . مسلة حمورابى . وزارة الثقافة والاعلام – بغداد ۱۹۸۰ .
۱۰٤. موسكاتي، الحضارة، ص:۲۳۰
*. ئەنونانكی: ناڤەكە بۆ كۆمكارێ خوداوەندێن لاوەكی (الثانويين) دهاتەگۆتن. بنێرە: الماجدي: خزعل، الدين السومري، ط۱، ألاردن- ۱۹۹۸، ص ٦۲.
۱۰۵. رشيد: فوزي، الشرائع العراقية القديمة، بغداد- ۱۹۷۳، ص ۸۵.
۱۰٦. جاكوبسن، ثوركيد، ارض الرافدين ما قبل الفلسفة، ترجمة: جبرا ابراهيم جبرا، بغداد- ۱۹٦۰، ص ۲۲۸.
۱۰۷. ساكز، عظمة بابل، ص: ۳۹٤.
۱۰۸. هەمان ژێدەر، بپ ۳۹٦.
۱۰۹. الماجدي، انجيل بابل، ص ۳۷.
۱۱۰. زايد: عبدالحميد، الشرق الخالد، القاهرة- ۱۹٦٦، ص: ۱٤۵.
۱۱۱. بوتيرو: الديانة، ص: ٦۲ و ٦۳.
*. موشخوش: گیانەوەرەكێ پێكهاتییە ژ كوریا ماری و گیانەكێ ب پیلەكێن ماسییان، هێمایێ خوداوەند مەردوخی بوو و پاشتر ژی بوویە هێمایێ خوداوەند نابۆی. بنێرە: Douglas، SGMA،p:166.
۱۱۲. ادزارد، قاموس، ص: ۱٦۲.
۱۱۳. عبدالله: يوسف خلف، الفكر العسكري في العراق القديم، رسالة دكتوراه مقدمة الى معهد التاريخ العربي و التراث العلمي، (غير منشورة)- ۱۹۹٦، ص: ۲۸.
۱۱٤. Douglas، SGMA، p: 15.
۱۱۵. Douglas، SGMA، p: 16
۱۱٦. Ibid، p: 17
۱۱۷. Postgate، Inscriation، p: 50.
۱۱۸. Douglas، SGMA، p: 134
*. نیسابا خوداوەندێ نڤیسینێ و شیانان بوو ل جەم سۆمەریان و لەڤەن (قەلەم) هێمایێ وێ بوو، پشتی ب داویهاتنا چەرخێ سۆمەری خوداوەند نابۆی جهێ وێ طرت كو هەمان پەسن و هێمایێ وێ هەبوو. بنێرە: Blak، GDSAM، P: 137.
۱۱۹. ادزارد، قاموس، ص ۱٦۱.
۱۲۰. الماجدي، انجيل بابل، ص: ۲۸٦.
۱۲۱. Douglas، SGMA،P: 135.
۱۲۲. Ibid،p: 136-137
*. تشمتو: هەڤژینا خوداوەند نابۆیە.
**. بۆرسیبا: بازێرەكێ كەڤنە ب دووراتیا بیست كیلومەتران ل باشوورێ بازێرێ بابل، ژ وان بازێرانە یێن حامورابی نووژەنكرین و مەلبەندێ پەرستنا خوداوەند (نابۆ)یە و پەرستگەها وی ژێ (أي- زيدا) ل وێرێ یە. بنێرە: نيكولاس، حضارة العراق و آثاره، ترجمة سمير عبدالحميد الجلبي، بغداد- ۱۹۹۱، ص ۱۳٤
۱۲۳. ادزارد، قاموس ص:۱٦۵.
۱۲٤. باقر: طه، مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ط۲، بغداد – ۱۹۸٦، ج۱ ص ۳۳۵
۱۲۵. ادزارد، قاموس، ص: ۱٦۵.

١٢٦. هەمان ژێدەر، بپ ١٦٦، ١٦٥

١٢٧. الصالحي: واثق اسماعيل، الاله نبو في الحضر (سومر، م١٩٧٩، ٣٥، ج١-٢)، ص: ١٨١- ١٨٣.

١٢٨. Postgat، Inscription،p: 50.

١٢٩. الماجدي، انجيل سومر، ص: ٥٨.

١٣٠. ادزارد، قاموس، ص ١٥٩.

١٣١. Douglas،SGMA،p: 143.

١٣٢. 143Douglas،SGMA،p:

١٣٣. لوركر: مانفرد، معجم المعبودات و الرموز في المصر القديمة، ترجمة صلاح الدين رمضان، مراجعة محمود ماهر، ط١، القاهرة- ٢٠٠٠، ص ٢٥٤، ١٨٢.

١٣٤. Postgat،Inscription،P: 50.

١٣٥. Douglas،SGMA،p: 72.

* بەرێن كودورو ب بەرێن سنووری ژی دهێتەناڤكرن، یەكەمین جار ژ ئالیێ كاشیيانڤە هاتییەبكارئینان و هەتا سەردەمێن درەنگ بكارئینانا وان بەردەوامبوو، ئەڤ بەرە وەك بەلگەنامەكا مولكداریا عەردەكی یە كو سنووریێ عەردی و ناڤێ خودانی و خوداوەندێن شاهدەیی ل سەر دای تێدا دهاتنەنەخشاندن و وەك عادەت هێمایێن خوداوەند ل سەری دهاتنەنەخشاندن: بنێرە Black، GDSAM،P: ١١٣

١٣٦. Weidner، Reallexikon، P: 485.

١٣٧. موسكاتي، الحضارة، ص 227.

١٣٨. امام : امام عبدالفتاح، معجم ديانات واساطير العالم، م ١ ، بيروت- ١٩٩٥، ص ٤٣ .

١٣٩. الماجدي، متون سومر، ص ١٣٠.

١٤٠. Douglas،SGMA،p: 72.

١٤١. موسكاتي، الحضارة، ص ٢٢٧.

١٤٢. ادزارد، قاموس، ص ٧٩.

* شالا: هەڤژینا خوداوەند ئەدد، خوداوەندا بەفرێ، خوداوەندا حیسیان یان حوریان. بنێرە: Black، GDSAM،P: ١٧٢

١٤٣. Owen، Dictionary، http//www.pagans.org/~firerose/pagan1.htm.

١٤٤. بارو، اندرية، بلاد اشور، ترجمة و تعليق عيسى سلمان و سليم طه التكريتي، بغداد- ١٩٨٠، ص:٩٢.

١٤٥. باقر، ديانة، ص ١٨.

١٤٦. ادزارد، قاموس، ص ٧٩.

١٤٧. يوسف، شريف، تاريخ فن العمارة العراقية في مختلف عصور، بغداد- ١٩٨٢، ص ١٢٩.

١٤٨. Postgate، Inscription،P: 51.

١٤٩. الامين، استكشافات، ص:١٩٣

١٥٠. ژێدەرێ بەرێ: بپ ١٩٢و١٩٣.

* ل ئالیێ راستێ یێ هێمایێ خوداوەند ئەددی دەلیڤە بۆ هندەك هێمایێن دی هەیە بەلێ ژ ئەنجامێ فاكتەرێن سروشتی و شكەستنا بەری شوونا وان هێمایان دیارنینە ئەوێن د رێزێن ٧، ٩، ١٠ هێمایێ خوداوەند ئابای، نرڤال، سیبیتێ دا ئاماژە پێ هاتییەكرن. بۆ پتر بنێرە: Postgate، Inscription،P:51

١٥١. Postgate، Inscripition، P: 52، 53، 54.

١٥٢. Ibid: 51.

* بازێرێ نەمرود دكەڤیتە ئالیێ رۆژهەلاتێ رووبارێ دجلە ب دووراتییا ٣٧ كم ژ بازێرێ مووسلێ پایتەختێ ئاشووریان بوو، د نڤیسینێن ئاشووریدا ناڤێ وێ ب (كالح) هاتییە، شاهێ ئاشووری شلمنسەرێ یەكەم (١٢٧٣- ١٢٤٤ ث.ز) ئەو بازێر ئاڤاكریە،

بۆ پتر پێزانینان بنێرە: امين اغا، عبدالله و ميسر سعيد العراقي، نمرود، مديرية الاثار العامة، بغداد- ١٩٧٦.
١٥٣. الامين، استكشافات، ص ٢٠٢
١٥٤. عبدالله، الجيش و السلاح، ص ٢١١- ٢١٣.
١٥٥. Postgate، Inscription،P: 50.
١٥٦. الجادر، وليد، الحرف و الصناعات اليدوية في العصر الاشوري المتاخر، جامعة بغداد- ١٩٧٢، ص: ٢٥٨.
١٥٧. ديلابورت، ل، بلاد مابين النهرين، ترجمة محرم كمال، و مراجعة عبدالمنعم ابوبكر، القاهرة- بلا، ص: ٤١٣.
١٥٨. الامين، استكشافات، ص ١٩٥.
١٥٩. الجادر ، الحرف، ص ٢٩٥.
١٦٠. الامين، استكشافات، ص، ١٩٥.
١٦١. الازياء الاشورية، سلسلة الازياء العراقية ٣، بغداد- ١٩٧١، ص ٢٧، ٢٣،٢٤.
*. ئاشووریان دگۆتنە كەمەرا هریێ (isru) و كەمەرا ژ چەرمی چێكری د گۆتنێ خزیتو (huzitu) و كەمەران ب رەنگەكێ گشتی دگۆتنێ ئزخو (izhu) بۆ پتر پێزانینان بنێرە:
عبدالله، الجيش و السلاح، ص ٢٩٦- ٢٩٧.
١٦٢. الامين، استكشافات، ص ١٩٥.
١٦٣. عبدالله: الجيش و السلاح، ص: ١٥٢ ؛ هەروەسان باقر، تاريخ العراق، ج١، ص: ٢٣٦.
١٦٤. عبدالله: الجيش و السلاح، ص: ٢٦١ ÷ هەروەسان عبدالله، الفكر العسكري، ص: ٦٥- ٦٦.
١٦٥. Roux،Georges، AncientIraq، rd ed.U S A- 1992 p: 301
١٦٦. ساكز، قوة اشور، ص: ١٣٠.
١٦٧.سفر، فؤاد،آشور، مديرية الاثار العامة، بغداد- ١٩٦١، ص:٦.
١٦٨. رو، جورج، العراق القديم، ترجمة حسين علوان حسين، بغداد- ١٩٨٤، ص ٣٣٣.
١٦٩. باقر، المقدمة، ج١، ص: ٤٥٠.

# شوینوارێن خەنەس

د. حەسەن ئەحمەد قاسم بەرواری

## ١-جهـ:

خەنەس ئێکە ژ گوندێن دەڤـەرا مزووریـان، ژ ئالیێ ئیداری ڤە دکەڤیتە سنووری قەزا شێخان نێزیکی گوندێ باڤیان یێ سەر ب هەمان قەزایێ ڤە، هەروەسـان دکەڤیتە باکووری رۆژهەلاتێ بازێرێ نەینەوا ب دووراتییا (٥٦)کم، مرۆڤ دشێت سەرەدانا ڤان شوینوارا ژ ناحیا مرێبا ب رێکا رۆژهەلات و ژ لایێ رۆژئاڤا ڤە ب رێکا شێخان بکەت.

## ٢-ناڤ:

دتێکستێن بزماریدا یێن نها ل بەر دەستێ مە، ئێکەمین جار ناڤێ خەنەس د تێکستێن شاهێ ئاشووری تجلات بلاسر یێ ئێکێ دا ل دۆرێن سالا (١١٠٠پ.ز) ب ناڤێ بازێرێ (kharusa)[١] ئـان (khanusa)[٢]هاتییە، کو ناڤێ بازێرەکێ دەولەتا میتانی بوو و دەمێ دەست ب سەرداگرتێ زۆر شوینوار ژێ لێ تێکداینە، ئەڤە دیاردکەت کو ئەڤ بازێرە ل سەردەمێ دەولەتا میتانی زۆر بناڤ و دەنگ بوو، ژبەر هندێ دبیت ناڤ ژ ناڤێ خوداوەندێ مسری یا {khensu}[٣] هاتبیت، خوداوەندێ بازاڕێ تیبە ل وەلاتێ مسرێ خوداوەندێ هەیڤێ. واتا ناڤ ب مسری یا کەڤن ئانکو گەشتیار یان کۆچبەر یان دەرباز بووی کو خوداوەندێ هەیڤێ یە، ناڤێ وی دقورئانا پیروز داهاتی یە( فلا اقسم بالخنس، الجوار الکنس)[٤].

## ٣-دیرۆکا دیتنا ڤان نەخشەبەرا:

سالا ١٨٤٥ێ قونسلێ فرەنسی روویت (Rouet.G) کو ئێکە مین کەس بوو ئەڤ نەخشەبەرە دیتین[٥]، و چەندین زانایێن شوینواران سەرەدانا ڤی جهی کرییە، ژوان سالا ١٨٧٤ێ رێزدار رووس[٦](Ross.H.J)، پاشی ل سالا ١٨٥٠ێ لایاردی (Layard.A.H) و سالا ١٩٠٤ێ کینگ (King.L.W)[٧] پاش وی ل سالا ١٩١٤ێ زانایێ ئەلمانی باختمان(Bachmann.W) دووڤدا جاکبسون (Jacobsen) ولوید ( Lioyd) سالا ١٩٣٤[٨] هتد ... .

## ٤-خەنەس د ژێدەرێن دیرۆکی دا:

ژبەر کو خەنەس ئێکە ژ بازێرێن میتانی یێن گرنگ شارستانییەکا بهێز لێ پەیدابوو نەخاسمە دبوارێن بیناسازی و هونەریدا، لەوما هەر ژ دەسپێکێ دەولەتا ئاشووری هزرا داگیرکرنا ڤی بازێرێ دکر چونکی کونترۆلکرنا ڤی بازاری، ئانکو گرتنا هەمی

ئاخا دەڤەرا مزووریيا و باشترین بەلگە ل سەر ڤێ چەندێ ئەڤ تێکستا بزماری یە یا بزمانێ ئەکەدی ب دیالێکتا ئاشووری ژ لایێ ڤەرالێ ئاشووری ڤە تجلات بلەسرێ ئێکێ هاتییە نڤیسین. یێ ل دەوروبەرێ سالا(١١٠٠پ.ز) حوکمرانی ل دەڤەرێ کری کو دبێژیت:

(تجات بلاسر قەهرەمانێ بهێز، یێ کڤانێ راستی یێ دگریت، ودەسەلاتداریێ ل دەڤەرێ دکەت، خوداوەندین نەینەوا و خوداوەند نرگال، چەك و کڤانێن ب ترس و سەهم، هێزەکا مەزن دایە من، دەسپێکێ خوداوەندێ نەینەوا حەز ژ من دکر، چار گایێن کویڤی یێن ب هێز و مەزن ل چۆلێن وەلاتێ میتانییا، شەش ژ باژێرێن وان، یێن ل بن چیایێ بێشرێ (بێسرێ) من داگیرکرن و ب ئاگری سۆتن، ل ئالیێ رۆژئاڤا من شکاندن و ژناڤبرن خوداوەندێن وان، و تالانێ وان من بر باژارێ خۆ جهێ خوداوەند ئاشوور و ئالیێ دی من دەست ب سەردا گرت، تجلات بلەسەر وێرانکەرێ ناڤدارا، سەرکوتکەر و مەلیل کەرێ رکابەرا، هەمی هێزا خۆ بکارئینا بۆ داگیرکرنا دەڤەرا Msuriمزووریيا خوداوەند ئاشوورێ رێزدار، هێرشکر د ناڤبەرا چیایێن ئێمینکێ و تەلوە و خەنەس و ب سەرداگرت من داگیرکر، دەڤەرا مزووری یا پان و بەرین شەرکەرێن وان من بەزاندن، باژارێن وان من ئاگر بەردایێ من سەرکوت کرن و ژناڤبرن، من شکاند لەشکەرێ دەڤەرا کانێ یێ هاتی هەوارا دەڤەرا مزووریيا، ل سەر چیا هەمبەری وان، من شەرێ وان کر و رەڤاندن، د باژێرێ هاریناداا ل بلندی یا چیایێ ئیسیا، من ئێخستنە بن پێت خۆ هاتە گرتن ئەو باژار من بەردا، من گرتی بن و خیك ل سەر سەپاند، هوسا من ژێر دەستکرن و هێلان، دوی وەختی دا هەمی مێرێن دەڤەرا کانێ، ئەوێن هاتینە هەوارا دەڤەرا مزووریيا، یێن بەرنیاس ب خەلکێ ژدەرڤە ئاکنجیێن ڤان دەڤەرانە، دهاتنە بکار ئینان وەك جەنگاوەرێن ڤان شەرا، هاتن بن تۆرەیی یا چەکێ من یێ ب سەهم، دژی بیست هەزارا ژ لەشکەرێ وان یێ بەلاف بووی، ل چیایێ تەلوە من شەرکر، و من بەزاندن، من شکاند ناڤداری و هێزا وان، و بدرێژاهی یا سرتا چیایێ خەنەس یێ هەمبەری دەڤەرا مزووریيا، ل پشت ژی من راهێلا بدویف ڤە و لاشێن کوشتی یا، شەرکەرێن وان ل بلندیا چیای، من بەلاڤکرن و پرت پرت کرن، خوینا وان بـ دۆل و نهالا دا د هات ژجهێن بلندێن چیای، من لەهیەك یێ راکر، من داگیرکر و من سوت ب ئاگری، من وێران کر و شکاند و کاڤل کر، باژارێ خەنەس یێ ئاسێ، من هەرفاند تاکو مینا کاڤلێن پشتی لەهی یێ لێ هاتی)(٩)

یا ژ ڤێ تێکستێ دیاربووی کو ناڤێ ڤی وەلاتێ ئەم ل سەر خاکا وی دژین وەلاتێ میتانییا بوو ل (١١٠٠پ.ز)، هەروەسا دەڤەرا دوی سەردەمیدا هاتییەداگیرکرن دەڤەرا مزووری یا بوو و تا ئەڤرۆ ب هەمان ناڤ بەرنیاسە، و بەحسێ شکاندنا پەیکەرا د ڤێ هەوێدا کرییە و دبیت پەیکەرێن شندۆخا بن چونکی دەما ئەڤ پەیکەرە ل سالا(٢٠١٠)ێ ژ لایێ رێڤەبەریا شوینوارا ڤە هاتینەدیتن شکەستی بوون، هەروەسا ناڤێ بێسرێ کو دکەڤیتە رۆژهەلاتا دهۆکێ دڤی تێکستێدا هاتییە، و ژ وێرێ هەوا لەشکەری چوویە ئێمینکێ و چیایێ وێ، تاگەهەشتی یە تەلوە وچیایێن وێ، ل وێرێ ل دووڤ تێکستا هاتییە نڤێسین خەلکێ دەڤەرا کانێ هاتینە هەوارا خەلکێ دەڤەرا مزووریيا، پشتی هەوا لەشکەری گەهەشتییە هارینا وچیایێ ئێسیا، ل دووماهیيا هەوێ خەنەس ژ لایێ شاهێ ئاشووری ڤە ل سالا ١١٠٠ پ.ز هاتییەوێرانکرن. ئەڤ تێکستە بەلگەکێ زیندی یە ل سەر هەبوونا زمانێ کوردی ل هزارا دووێ پێش زایینی، هەر وەسا پێزانینێن گرنگ ددەتە مە ل سەر ناڤێن وەلات و دەڤەر و باژێر و گوندێن دەڤەرا بەهدینان، پێدڤی یە زمانزان و دیرۆکنڤیسێن کورد مفای ژێ وەربگرن مینا بەلگەیێن رەسەن ل سەر هەبوونا زمانێ کوردی.

## ٥- سەردەمێن دیرۆکی:

خەنەس وەك زۆربەیا جهێن شوینواری ل دووڤ وان ژێدەرێن تا ئەڤرۆ ل بەر دەست د چەند سەردەمێن دیرۆکیدا بوورییە و دبیت د پاشەرۆژێ دا پشتی پشکنین

دهێنە ئەنجامدان دێ هێشتا پێزانین ل سەر خەنەس کەڤنە بەر دەستێ مە، بەلێ یا ددەستێ مەدا ئەڤرۆ ئەوە کو خەنەس د سێ سەردەمێن دیرۆکی یێن گرنگدا بووری یە:

## ١-سەردەمێ خۆری (میتانی):

ژ تێکستێن ئاشووری دیارە کو بەری ئەو دەست ب سەر دەڤەرێدا بگرن، دەولەتا میتانی ئەڤ دەڤەرە برێڤە دبر و ناڤێ دەڤەرێ د وی سەردەمیدا دەڤەرا مزووریا بوو، ئەو ناڤێ کوردی یێ تا ئەڤرۆ ل سەر دەڤەرێ مای، بەلێ ئاشووری بخۆ دبێژن خەنەس بازێرەکێ میتانی بوو یێ پەرژانکری ب سێ شورهێن ب لبنێن قەلاندی هاتینە ئاسێکرن کو پاشایێ ئاشووری ب شەر ئەڤ بازێرە ستاندییە و شوینوارێن میتانییان ب بازێرڤە تێکداینە و پەیکەرێن خوداوەندێن وان دگەل خۆ برینە و ل دووڤ گۆتنا تجلات بلەسەرێ ئێکێ (١١٠٠پ.ز) چەندی شیاین کاڤلکرینە و چ شوینوار لێ نەهێلاینە[١٠].

## ٢- سەردەمێ ئاشووری یێ نوی:

شاهێ ئاشووری سەنحاریب پشتی بوورینا زێدەتر ژ چوارسەد سالا ل سەر گرتنا بازێری ژ لایێ ئاشووریا ڤە، دوبارە گرنگی بڤی بازێری دایە و پرۆژەکێ مەزن یێ ئاڤێ ل ڤی جهی دروستکرییە و زۆر نەخشەبەر ل سەر کەڤرێن وێ نکراندینە کو تاکو ئەڤرۆماینە ل ڤی جهی[١١].

## ٣ - سەردەمێ دەولەتا میدی:

پشتی شکەستنا دەولەتا ئاشووری ل سالا (٦١٢پ.ز) حوکمرانی کەتە دەستێ دەولەتا ماد دا و بیرو باوەرێن زەردەشتی ل دەڤەرێ ل سەر هەمی بیروباوەرێن دی زال بوون، ژ بەر هندێ چەندین ناووسك ل نەخشەبەرێن خەنەس هاتنە کۆلان ل گەل چەندین ئاگردان و جۆیێن ئاڤێ و ئەڤ بیرو باوەرە بەردەوام بوون[١٢] تا خەلکێ دەڤەرێ بووینە موسلمان.

## ٦- نەخشەبەرێن خەنەس:

نەخشەبەرێن خەنەس دهێنە هژمارتن ژ شوینوارێن پر بها یێن کوردستانێ ژ ڤان شوینوارا پێکدهێن:

### ١- تێکست:

شوینوارێن دو تێکستا ل خەنەس هاتینە دیتن کو ب دو دەست نڤیسێن تێڤەل هاتینە نڤێسان:

#### أ- تێکستا هیروگلوفی[١٣]:

تێکستا هیروغلوفی یا خەتی ب شێوەکێ رێك و پێك هاتییەنڤیسان، بەلێ تێکست هاتییە شکاندن و ژێ برن، دبیت ژ ئەنجامێ هەوەکا لەشکەری ل وی سەردەمی و د دێرا (٩٨) ژ تێکستا داگیرکرنا خەنەس یا دیارە شکاندن هاتییەکرن. و دبیت د وی سەردەمی دا ئەڤ تێکستە هاتبیتە ژێ برن تنێ ئەڤ پەیڤە ماینە.

#### ب- تێکستا بزماری:

تێکست بشێوەکێ گشتی ژ سێ پارچا پێکدهێت، پارچا ئێکێ ناڤێ خوداوەندایە یێن سونبلێن وان ل هنداڤ هاتینە نکراندن، و وەسا دیارکرییە کو ڤان خوداوەندا هێزو دەستەلات دایە شاهـ سەنحاریب ژبۆ دروستکرنا ڤێ جۆیا بناڤ و دەنگ، ئەڤ چەندە ژی بەخشینا شەرعییەتی یە بۆ شاهی دا پرۆژەی ئەنجام بدەت[١٤]. پارچا ناڤەراست بەحسێ گرنگییا پرۆژەیێ راکێشانا ئاڤێ بۆ نەینەوا دکەت و ئەگەرێن ئەنجامدانا پرۆژەی و دەڤەر و گوندێن ئاڤ ژێ هاتییە راکێشان[١٥]. پارچا سێ پاشا سەنحاریب بەحسێ هەوا خو یا لەشکەری ل سەر وەلاتێ کاردنیاش دکەت و خویا دکەت بحەزا خوداوەندا بوو دا شەرعیەتێ بدەتێ کو هێرشێ بکەتە وەلاتێ کاردنیاش و بابل و ب پەرستگەهـ و خوداوەندێن وێ ڤە ویران کەت[١٦]. ل پاشکویێ نفرەت و لەعنەت ل وان کەسا کرینە یێن ل پاشەرۆژێ بەرێ جۆیا نەینەوا بگوهوریت ئەگەر خۆ کورێن وی ژی بن[١٧]. تێکست بشێوەکێ گشتی ژ شێست دێرا پێکدهێت کو رێز

## تێکستا هیروگلوفی



| 1- | na-mu-va-ia-s | کور |
| --- | --- | --- |
| 2- | a-ma-tu-va-na | وەلات |
| 3- | e-va-ia | پادشا |



ڕێز (دێر دێر) ب ڤی ڕەنگی هاتییە وەرگێران.

(خوداوەند ئاشوور خوداوەند ئانو خوداوەند ئەنلیل خوداوەند ئەیا خوداوەند سین خوداوەند شەمەش خوداوەند ئەدەد خوداوەند مەردوك خوداوەند نابو خوداوەند نیسکو خوداوەند ئشتار خوداوەند سبیتو خوداوەندێن مەزن

یێن دەستەلاتداری یێ ل هەمی دەڤەرێ دەنە مێرێن سەرڕەش و دکەنە پادشا

سەنحاریب شاهێ مەزن و بهێز شاهێ گەردونی شاهێ ئاشوور شاهێ چار سیێن جیهانێ میرێ هەمی تەخ و چینا دگەهینیت

بەختەوەری یێ و بوین پیش ژبەر هندێ کو خەلکێ دەڤەرێ ئاڤا ئاڤدانێ نەبوو چاڤێن وان ب ئاسمانی ڤە مابوون چاڤەرێ دلوڤانییا ئاسمانی بباریت

من ئاڤدان ژ گوندێن ماسیتی، بانباکابنا، شاپریشوك کار شەمەش ناسیر، کار نوری، ریموسا خاتا، دالاین، رێشێنی، سولو دور ئشتار، شیبانیبا، اسپاریرا

گینگلینیش، نامپاگاتا، تیلو، ئالوم س وسی ئاڤا ل ژوریا باژێرێ خادابیتی، د هەژدە جۆیێن من کۆلای من ئینا سەر رووبارێ خەوسەر ژتوخیبێ باژارکێ کیسیری تا ناڤەراستا نەینەوا من جۆ کۆلا و راکێشا بەرەف خوارێ

ئاڤا دناڤدا ب جووا سەنحاریب من ناڤکر وئاڤا زیدە من بەردا بناڤ چیایێ تاس

چیایێ ئاسێ ل سەر توخیبێ ئەکاد بەری دگوتنە ڤی جهی .... نۆکە ب فەرمانا

خوداوەند ئاشوور، خوداوەندی مەزن، رێزداری من بەرێ من دا ڤێ جۆیێ د ئالێن راست و چەپێن چیای را

ل ئالێ مە .... کوك وبیتورا، وباژارکێن دەوروبەر من دیوارێن جۆیێ ب بەرا ئاڤاکر و من ناڤ کر بناڤێ جوا سەنحاریب

زێدەباری ئاڤا کانیا ئاڤا جوا من کولای ژی منبەردا بەرەف

نەینەوا، باژارێ ناڤدار، جهێ دەسەلاتداری یا من ژ کەڤن دا بابکالێن من نە بەرفرەهـ کری

ونە جوان کری بەری ڤی دەمی ئەز سەنحاریب شاهێ ئاشوور یێ ئێکی د ناڤ میرادا ژ دەمێ

خوداوەندێ رۆژێ د هەلێت
تا خوداوەندێ رۆژێ ئاڤا دبیت جۆیا من كۆلای دهاتە نەینەوا و لگەلدا ل دەورو بەرا باخچە و رەزێن تری
هەمی جۆرێن فێقی یێ چەل و چیا ل گەل دارو بارێن فێقی یێن هەمی وەلاتا
من چاندن و من رێك خۆشكر بۆ ئاڤێ چەمێن تێنی پر ژیار بكەت بكەسكاتی یێ
یێن بەهین ژ هشكاتی یێ هەمی چەم ل بەر دەر و سەر و بنێن باژێری و ل ناڤەراستا باژێرێ تەریسی
بو نەینەوا ئاڤ هات دابینكرن بۆ چاندنا گەنمی و كونجییا .... دناڤبەرا پادشایان دا
كورێن من نەدهاتە هزرا وان (دناڤ دلی ژی دا) كو باوەر بكەن ب كێم كەسان
من كۆلا جۆ سۆند دخۆم ب ئاشوور خوداوەندێ من یێ مەزن ب هێزا وی نەبا نە دشیام ب كێم كەسا جۆیێ بكۆلم
د ماوێ سالەك و سێ مەها ئاڤاكرنا وێ بدووماهی نەهات لێ ڤەكولین بدووماهی هاتن
بۆ ڤەكرنا جۆیێ من ڤرێكر ئەبیو و كالوێ رەبەن و بەرێ سەندو و لاپیس لازولی موشكارو خولالو وبەرێ اود ئاش
بەرێن پربها و ماسیێن بالوگی وماسیێن سوخور ژ زێری و گیا و زەیتا دەرئینای بۆ خوداوەند ئەیا خوداوەندێ كانی یا
و زەڤیا و انبیلولو رێزدارێ ریبارا یێ بەرسڤا نڤێژێن من دای من كرنە دیاری و نڤێژ بۆ خوداوەندێن مەزن
یێن بەرسڤا نڤێژێن من داین و كارێ دەستێن من بسەر ئێخستی و دەرێ جۆیێ من كر ڤەنتەرە و بسكرەكێ ڤەكری
ئاڤەكا بۆش من دابینكر بدەستێ مرۆڤان بساناهی ڤەنتەرە نەد هاتە ڤەكرن ب خوداوەندنا من ڤەكر و پشتی من پلان دانای
خوداوەندێن مەزن سەرپەرشتی یا كارێ ئاڤاكرنی دكر و پشتا من گرت و شەنگستێن پێشڤەبرنا ئابووری و گایێن حت
و كاڤرێن ڤەلەو من پێشكێشكرن بپاڤژی بۆ وان مێران یێن بكارێ كۆلانا جۆیێ رابووین و من جل و بەرگێن كتانی یێن رەنگا و رەنگ و تەیسۆك ل بەر وان كرن
و من پێڤەكرن گوستیرك و خەنجەرێن زێری و ل هەمان سالا من جۆ ڤەكری دژی ئومانمێنانو
شاهێ ئیلام وشاهێ بابل و هندەك پاشایێن چیا و دەریا یێن هەڤپەیمان ل دەشتا باژارێ خالولیا
من پلانا شەری دانا بفەرمانا خوداوەند ئاشوور خوداوەندێ مەزن خوداوەندێ من مینا رمێ بلەز چووم نیڤا وان بسەركەفتی من لەشكەرێ وان بەزاند و كۆمبوونا وان ژناڤبر و رێكخستنێن وان من تێكدان و سەركردێن شاهێ ئیلام دگەل نابو شوم ایشكون كورێ مەردوخ بەلادان
شاهێ بابل بدەستێن خو ل شەری من گرت شاهێ ئیلام و یێ بابل ب هێرشا من یا بترس و سەهم
ژ ناڤچوون عەرەبانێن خۆ یێن شەری بجهـ هێلان و رەڤین ژ وەلاتێ خۆ دا گیانێ خۆ بپارێزن
و یێن نە زڤرینە ڤە، ل وی دەمی سەنحاریب تۆرە بوو فەرماندا لەشكەرێ خۆ ب سەر ئیلام دا بگرن
ترس و نەرەحەتی كەفتە ئیلام وخەلكێ وێ ئاخا وێ بجە هێلان دا ژیانا خۆ قورتالبكەن مینا تەیرێ بازی
خو بەرزەكرن د چیایێن ئاسێ را مینا بالندێن رەڤوك دلێن وان پچیان ل وێ رۆژێ مرن
نە دەركەفتن ب چ رێكا و نە شەرەك كر ل هێرشا من یا دووێ بلەز چووم پێشڤە دژی بابل و رك بوو
ل سەر داگیركرنا وێ، مینا باروڤێ ئەز چووم و من شكاند مینا هر و بایەكێ بهێز من ب ئێك جاری باژێر شكاند لگەل
گەنجینە و ئەو تشتێ دەستێن من گەهەشتی یێ ژ بازاری من تالانكر هەر تشتەكێ بچویك یان مەزن من نەهێلا ئێك بتنێ ژی ل گەل بەرهەمێن وان
تژی قولاچێن باژێری بووین، شوزوبو شاهێ بابل ل گەل خێزانا وی و كاربدەستێن وی من گرتن ساخ

گایێ ب پەر



و برنە ئاخا خو

ملك و مالێ بازاری زیڤ زێر بەرێن ب بها ملك و مال وتشت مە بدەستێ خو بەلاڤکرن ل سەر مللەتێ خۆ و بوونە ملکێ وان

خوداوەندێن خۆجەه ل ناڤ دەستێن خەلکێ من گەهەشتنێ و شکاندن وملك و مالێ وان بۆ خۆ برن یێن خوداوەند ئەدەد و شالا

خوداوەندێن ئیکالات یێن مردوخ نادین اخی شاهێ بابل دسەردەمێ دەستەلات داری یا تجلات بلاسر شاهێ ئاشوور دەست بسەرداگرتی و برینە بابل

پشتی هەشتێ و چوار سالا ژ برنا وان بۆ بابل من زڤراندن ئاخا وان بێلا ئیکالات، بازێر و مال

و شەنگست و دیوار من هەرفاندن و ژناڤ برن و من سۆتن ب ئاگری دیوار و شوورها ژدەرڤە پەرستگەهـ وخوداوەند و بورجێن پەرستگەها خشت و ئاخێ و هەر تشت لوێرێ

من هەرفاندن ومن خەندقاندن ب ئاڤا جۆیا ئاراختــو، ل ناڤەراستا بازێری من جـۆیەکا دی کۆلا و من دەوروبەرێن وێ ب ئاڤێ خەندقاندن باش

شەنگستە ژ بنچینا وان من هەرفاندن ژ لەهی یێ پتر ل وێ رۆژێ جهێ بازاری و پەرستگەهـ و خوداوەند من بنئاڤ کرن

دبیت بیرا من نەهێت ب چ هێز من بن ئاڤ کر مینا پێلا، ل دەرگەهێ جۆیا من کۆلای ل نیڤا چیایێ تاس

نکراندن شەش نەخشەبەر ل گەل وێنێ خوداوەندێن مەزن ژ هەما ئەڤرازتر خوداوەندێ من و وێنێ پادشایی یا خۆ ل ژێر چاڤدێری یا وی

د نڤێژێ دا روینشتم هەمبەر وان کارێ دەستێن من کرین و من ئەنجامداین ب باشی بۆ نەینەوا من نکراندن ل وێرێ

دا ببن شوینوارێن بیرەوەرییا بۆ پادشایا کورێن من و هەکە ل پاشەرۆژێ میرەك ل ناڤ پادشا هەکە کورێن من ژی بن

هەرڤاند کارێ من کری و سۆزا دناڤبەرا مەدا شکاندو بەرێ جۆیێ وەرگێرا ژ دەشتا نەینەوا

خۆزی خوداوەندێن مەزن هەمی یێن ناڤێن وان دنەخشەبەری دا هاتین ب پەیڤێن زمانێ وان

بریارا پیرۆز یا ژناڤ ناچیت، نفرەت و نفرەتێن پیس ل سەر بن و دەستەلاتا وان ژناڤ بچیت)[١٨].

## ٢-گایێ ب پەر:

دکەڤیتە رۆژهەلاتێ کەڤالێ مەزن، د سەردەمەکێ نە دیار دا کەڤرەکێ مەزن بوو ژ سرتا کەڤرا کەفتی یە ناڤ رووبارێ گومل، ل سەر ڤی کەڤری وێنێ گایەکێ ب پەر هاتییە نەخشاندن، سەرێ وی سەرێ

کەڤالێن مەزن





مرۆڤانە کو هێمایێ ئاقلداری یێ بوو و بەدەنا وی بەدەنا گایانە هیمایێ هێزێ[19] بوو و ب پەرە هیمایێ فرینێ و هێزێ ل ئاسمانی. ئەڤ گایێن ب پەر دبیت ل بەر دەرگەهێ سویلاڤێن خەنەس هاتبنەنەخشاندن دگەلدا هندەك وێنێن مرۆڤان ژی هاتینە نەخشاندن لگەل وێنێن خوداوەندا یێن راوەستیای ل سەر پشتا گیانەوەران، ئەڤ هەمی نەخشەبەرە ژبەر کاودانەکا سرۆشتی هرپاینە ناڤ رووبارێ گومل دا و کەس نزانیت کەنگی. و گایێن ب پەر دوی سەردەمی دا د پیرۆز بوون چونکە خەلکی هزر دکر ئەڤ گایە بازێری ژ گیانێن خرابکەر د پارێزیت هەروەسا روخسارەکێ هۆنەرێ بیناسازی یێ بەرکەفتی و بترس دئێخستە دلێ دوژمنا و دەربرین ژ هێزا وەلاتی دکر[20].

## ٣-کەڤالێ مەزن[21]:

ل سەر کەڤرەکێ بلند یێ نەخشاندییە، پانییا وی (٤) مەترن و بلنداهیا وی (٦) مەترن، ناڤەرۆکا ڤێ نەخشەبەری وێنێ دو خوداوەندانە ل سەر پشتا گیانەوەرا راوەستاینە ل پێشیا وان شاهـ سەنحاریب ب پێخاسی راوەستایە هیمایێ پیرۆزیا جهی و ل پشت وان سەرکردێ لەشکەرێ وی ب ڤی رەنگی خوارێ راوەستایە.

### -شاهـ سەنحاریب:

قەرالێ ئاشووریا بوو دناڤبەرا سالێن(٧٠٤-٦٨١)پ.ز حوکمرانی کرییە، راوەستایە ب پێخاسی وەك رێزگرتن و سەخلەتێن حەباندنێ هەمبەر خوداوەندێ مللی یێ ئاشووری یا ئاشوور، دەستەك بلند کرییە بۆ سلاڤێ و د دەستێ دی دا دارێ حوکمرانی یێ هەلگرتییە وەسا خویا کرییە کو ل دووڤ شیرەت و راسپاردێن خوداوەندان کار دکەت، ژبەر هندێ خوداوەند دپارێزن. پاشا ژی ژ ئالیێ رامیاری ڤە بیروباوەرا د کەتە پەردە داکو شەرعییەتێ بدەتە هەوێن خۆ یێن لەشکەری و داگیرکرنێ.

### - خوداوەند ئاشوور:

خوداوەندێ مللی یێ ئاشووریا نە چەکدارە قامچی د دەستێ وی یێ راستێ دایە و د دەستێ چەپێدا بازنەك هەلگرتی یە وێنێ پاشا سەنحاریب تێدایە، کو وەسا خویا دکەت سەنحاریب ب هێزو چاڤ دانا ڤی خوداوەندی حوکمرانیێ دکەت و خوداوەند ل سەر پشتا دو گیانەوەرا راوەستایە، یێ ئێکێ گایە سونبلا خوداوەند انلیل خوداوەندێ سۆمەریا و یێ دووێ ئەژدەهایە سونبلا خوداوەند مەردوخ خوداوەندێ بابلی یا یە، ئەڤەژی وێ چەندێ خویا دکەت کو شاهـ سەنحاریب میرات گرێ سۆمری و بابلییایە و رێزێ ل

پیروزیێن وان دگریت.

**- خوداوەند ننلیل:**

خوداوەندەكا سۆمەری یە، واتا ناڤێ وێ ب سۆمەری (خانما هرو بایە) ل ڤی چەرخێ بوویە خێزانا خوداوەند ئاشوور ل سەر پشتا شێرەكی راوەستایە هەمبەر خوداوەند ئاشوور، نە چەكدارە، دەستێ راستێ بۆ سلاڤێ بێ بلندكری و د دەستێ چەپێ دا دارخورمایەك هەلگرتی یە.

**-قوماندار ئەسەرحەلدون:**

قوماندارێ لەشكەرێ سەنحاریبە دەستێ راستێ بلند كریە بۆ سلاڤێ و دەستێ چەپێ دار تێدایە، ب پێخاسی ل پشت خوداوەندا راوەستایە.

## ٤-سونبولێن خوداوەندا (رموز الالهە):

ل بەر وێنێ شاهـ سەنحاریب چەندین سونبولێن خوداوەندا هاتینە نكراندن[٢٢] و ناڤێن وان دتێكستا بزماریدا هاتینە ئەوژی ئەڤەنە:

١-كولاڤێ شاخدار سونبولێ خوداوەند ئاشوور.
٢-كولاڤێ شاخدار سونبولێ خوداوەند ئانو.
٣-كولاڤێ شاخدار سونبولێ خوداوەند انلیل.
٤-سەرێ شەكی سونبولێ خوداوەند ئان — كی.
٥-كەرێ هەیڤێ سونبولێ خوداوەند سن.
٦-رۆژا بازی سونبولێ خوداوەند رۆژ.
٧-بریسی سونبولێ خوداوەندێ بریسی یا.
٨-مەر سونبولێ خوداوەند مەردوخ.
٩-پێنوس سونبولێ خوداوەند نابو.

**ناووسكێن خەنەس**



١٠-گۆپال سونبولێ خوداوەند نرگال.

١١-ستێر سونبولێ خوداوەند عشتار.

١٢-حەڤت گو سونبولێ حەفت خوداوەندا.

## ٥-نەخشەبەرێن سرتا:

چەندین نەخشەبەر ل سرتێن کەڤرێن خەنەس ب وەریسا هاتینە نکراندن، پرانییا وان وێنێ شاهـ سەنحاریب ل سەر نەخشاندینە، تنێ ئێك ژ وان نەبیت کو دگەل وێنێ شاهـ سەنحاریبی دگەلدا تێکستەك بدەست نڤیسێ بزماری زمانێ ئەکەدی دیالێکتا ئاشووری هاتییەنڤێسین کو ژ ٦٠ دێرا پێکدهێت. وێنێ شاهـ سەنحاریب: وێنێ وی هاتییەنەخشاندن کراسەکێ درێژ ل بەرە کو دگەهیتە سەر پێن وی و هەمبەر سونبولێن خوداوەندان ب پێ خاسی راوەستایە.

### جۆیا سەنحاریب:

ل سالا ٧٠٣پ.ز دەست ب پرۆژێ کێشانا ڤێ جۆیێ کرییە[٢٣]، مەرەم ژکێشانا وێ گەهاندنا ئاڤا سار و خۆشا کانی یا بوو بۆ باژێرێ نەینەوا، درێژیا ڤێ جۆیێ (٨٠)کم و رەخێن وێ ببەرێن نکراندی هاتینە ئاڤاکرن و بنێ وێ ژی ب قیری هاتییەهنین. ئەڤ جۆیە ب جووا سەنحاریب هاتییە نیاسین و ب دو گەرا هاتی یە ئەنجامدان:

#### -گەرا ئێکێ:

ئاڤاکرنا سکرەکی ل سەر رووبارێ خەوسەر ل نێزیك گوندێ کیسیری، مەرم ژێ راکێشانا ئاڤێ بوو بۆ نەینەوا ژبۆ ئاڤدانا چەمێن هاتینە شینکرن[٢٤].

#### -گەرا دووێ:

راکێشانا ئاڤا رووبارێ گومل، ئەو ژی ب نکراندنا قەنتەرەکێ بوو ل خەنەس. ژبۆ کونترۆلکرنا جۆیا و ب بەرێن بازی هاتییە ئاڤاکرن و ژناڤدا ب قیری هاتییە هنین، هەر وەسا ئاڤاکرنا سکرەکێ مەزن ل جروانە ببەرێن بازی و ل سەر ڤان بەرا ب زمانێ ئەکەدی دیالێکتا ئاشووری چەندین تێکست هاتینە نڤیسان[٢٥]، رووبەرێ ڤی سکری درێژاهی نێزیك (٣٠٠) مەترانە و پانی یا وی (٢٢) مەترن و بلنداهی نێزیکی (٩) مەترانە.

## ٦-ناووسك:

زۆر ناوسك ل سەر نەخشەبەرێن خەنەس هاتینە نکراندن، دیرۆکا ڤان جۆرە ناوسکا دزڤریتە سەردەمێ دەولەتا میدی (٦٥٠-٥٥٠پ.ز)[٢٦] کو جهێ ڤەشارتنا موغان بوو[٢٧]، ئەڤ ناوسکە دکەڤرا را ل باهرا پتر ژ چیایێن کوردستانێ چ ل رۆژهەلات[٢٨] یان باشوور یان باکوور هاتینە نکراندن، ژبەر کو زەردەشتی یا مریێن خۆ دئاخێ را نەد ڤەشارتن، چونکی وان ئاخ و ئاڤ و هەوا و ئاگر ب پیرۆزی د دانان[٢٩] بەلێ چەندین جۆرێن ڤەشارتنێ ل دەڤ زەردەشتییان هەبوون، ئێك ژ ڤان جۆرا ڤەشارتنا ناڤ ناوسکا بوو کو تایبەت بوو بۆ چینا موغان[٣٠] کو ئایینزانێن بیرو باوەرێن زەردەشتی بوون، و هندەك ناووسك زێدەباری موغان سەرۆك و سەرکردێن دەولەتا میدی ژی لێ دڤەشارتن، مینا ناووسکا قەسقابان[٣١] یا کەی خوسرەو تێدا هاتی ڤەشارتن.

## ٧-ئاگردان:

ژبەر کو ئاگر زۆر یێ پیروز بوو ژ ئالیێ زەردەشتییانڤە ژ بەر هندێ ل سەر کەڤرا و جهێن بلند ئاگردان د نکراندن[٣٢] ژبو رۆناهیێ هەروەسا سونبلەکا گەش بوو ژ بۆ خودێ نیاسین و زانینێ و چەکەکێ بهێز بوو دژی خرابکاری و تاریێ و نەزانینێ، هەر وەسا زەردەشتی یا هزر دکر ب ئاگری مرۆڤ دێ ژ گونەها هێتە پاقژکرن[٣٣]. ئاگردانێن خەنەس ژی مینا ئاگردانێن چارستین[٣٤] و باسفرێ[٣٥] و ئاگردانێن دی یێن زەردەشتی یا ل دەڤەرا بەهدینان هاتی نە نکراندن، تیرێ ئاگردانێن خەنەس (١٥) سەنتیمەترن و کویراتیا وان (٢٠) سەنتیمەترن ل سەر جووا ئاڤێ دوو ژوان هاتینە نکراندن.

## ٨-سەکوییێن ئاگری:

ئەو جهە یێ ئاگر ب پیرۆزی لێ هەلکرن و زۆر جۆرێن سەکویا هەنە، ژوان سەکویا کەی خوسرەو یا بناڤ و دەنگ ل قەسقابان[٣٦]، هەر وەسا سەکویا ئاگرێ ل باسفرێ[٣٧] و سەکوییێن ئاگری ل چارستین[٣٨]، بەلێ سەکویا ئاگری ل خەنەس مینا سەکوییێن جهێ چارستین یێ شوینوارییە. سەکویا خەنەس ژ چوار پایا پێك دهێت، درێژیا وێ (٥) مەترن و پانیا هەر پایەکێ (١،٥) مەترو نیڤن، بلندیا پایا ئێکێ ٣٠ سەنتیمەترن و پایا دووێ (٤٠) سەنتیمەترن و پایا سێ(٤٠) سەنتیمەترن بەلێ یا چوارێ (٥٠) سەنتیمەترن، د سەردا دو ئاگردان هەنە، تیرێ هەر ئێکێ (١١) سەنتیمەترن وکویراتیا وان (٨) سەنتیمەترن .

## ٩-جۆیا ئەناهیتا:

ئەڤ جۆیێن ئاڤێ دگرێداینە ب ئەناهیتایێ ڤە و چ ئاتەشکەدێن زەردەشتی نینن ئەگەر ئەڤ جۆرە جووە لێ نەهاتبنەنکراندن ژ بەر کو ئاڤ دهێتە بکارئینان بۆ پاکی یێ[٣٩]. ئەڤ جۆیە ل خەنەس ل سەر بانێ ناووسکا هاتیبە نکراندن، درێژیا جویێ (٣،٩٠) سێ مەترو نۆت سەنتیمەترن و پانیا وێ (٢٠) سەنتیمەترن، کویراتیا وێ (١٠) سەنتیمەترن ل سەر لێڤێن وێ ئاگردان هاتینە نکراندن.

وو وێنە یێن بەرپەرێن ٤٩ ل وێنەیێن خنسێ دڤێت بهێنە دانان .

## ژێدەر:


١. Budge: Wallis .E.A & king .L.W. Annals of the king of Assyria .Vol 1 .London-1902.P:75-77 .

٢. Ibid . P:78.

٣. خشیم : علي فهیم، آلهة مصر العربیة، م ١، ط١، بنغازي - ١٩٩٠.

٤. القرآن الكریم، التكویر آیة ١٥-١٦.

٥. مظلوم : تاریخ اكتشاف المنحوتات، في شمال العراق، الآثاري، وزارة الثقافة والفنون، بغداد-١٩٧٧، ع٣، ص ٩ .

٦. Al-Haik : Albert . R.Key. lists of archaeology Excavation in Iraq 1942-1963.Florida-1968.P:43.

٧. مظلوم : تاریخ اكتشاف المنحوتات ، ص ٩ .

٨. - Al-Haik .lists of archaeology .P:43.

٩. Budge. Annals of the king of Assyria .P:74-75-76-77-78-84-85 .

١٠. Grayson.A.K. Assyrian Rulers of the early first millennium (1114-858) B.C. Toronto-1987. P: 23.

١١. ساكز : هاري، قوة آشور، ترجمة الدكتور عامر سلیمان، بغداد-١٩٩٩، ص ١٤٥-١٤٧ .

١٢. طیمن : دوشن، دین ایران باستان، ترجمة رویا منجم، تهران – ١٣٨١، ص ٢٠٢-٢٠٤ .

١٣. Jacobsen.T.A . A Hittite Hieroglyphic Inscription from Hines . Oriental Institute Discoveries in Iraq 1933-34.Chicago-1934.p:115-118 .

١٤. سوسة: أحمد، تاریخ حضارة وادی الرافدین، بغداد – ١٩٨٦، ج٢، ص١٠٨.

١٥. Luckenbill : Danil David . Annals of sennacherib . Chicago-1924.

١٦. Smith .G .History of sennacherib.London-1878.p:129-135.

١٧. Pognon:par.H. Linscription De Bavian . Paris-1879.

١٨. Luckenbill ، Danil David ، Annals of sennacherib ، Chicago-1924.

١٩. كيبرا، ادوارد، كتبوا على الطين، ترجمة محمود حسين الامين، بغداد-١٩٦٢، ص٢ .

٢٠- الاسود، حكمت بشير، الرموز الفكرية في حضارة وادي الرافدين، بغداد-٢٠١٠ ، ص ٢٥٣-٢٥٨ .

٢١. Bachmann ، W، felsrelifs in Assyrian Leipzi – 1927 ، p، 10-22 .

٢٢. lack،Jeremy and Anthony Green، Gods ، Demons and symbols of Ancient Mesopotamia ، Second edition ، British Museum-1998،p،17 .

٢٣. حبيب : طالب منعم، سنحاريب، رسالة ماجستير (غير منشورة) مقدمة الى كلية الاداب جامعة بغداد -١٩٨٦ ، ص ١٥٤ .

٢٤. المصدر نفسه، ص ١٥٤ .

٢٥. Jacobsen،T.A & Seton Lioyd ، sennacherib Aqueduct at Jerwan .

٢٦. دياكونوف، ا.م، ميديا، ترجمة وهبية شوكت، دمشق - بلا .

٢٧. عليثور : نسيم ، دادطاه ضم تصحيح و ويرايش عملى احمد ضايضى امير خيز ، ض ١، ( تهران-١٣٨٥ )، ص٦٢ .

٢٨. Koch ، Heidemarie ، Persepolis and surroundings، Tehran-2006، p، 155-161 .

٢٩. غانم : خالد السيد محمد ، الزرادشتية تاريخا وعقيدة وشريعة ( دراسة مقارنة )، ط١، دمشق – ٢٠٠٥، ص ١٧٧-١٨٥.

٣٠. عليثور : نسيم ، دادطاه ضم تصحيح و ويرايش عملى احمد ضايضى امير خيز، ض ١، ( تهران-١٣٨٥ )، ص٦٢ .

٣١. Edmonds ، J.A tomb in Kurdistan ، Iraq ، V1 ، London-1934،p، 184-191 .

٣٢. ولبر، دونالد، ايران ماضيها وحاضرها، ترجمة الدكتور عبدالمنعم حسنين، ( القاهرة - ١٩٤٨ )، ص ٤٦-٤٧.

٣٣. البرواري : حسن أحمد قاسم، عمارة معابد النار في موقع ضارستين على ضوء التنقيبات الاثرية(دراسة عمارية مقارنة )، دهوك – ٢٠١٣، ص ٣١ .

٣٤. المصدر نفسه، ص ٩٠-٩١.

٣٥. المصدر نفسه، ص ٨٨ .

٣٦. Edmonds ، J.A tomb in Kurdistan ، Iraq ، V١ ، London-١٩٣٤،p، ١٨٤-١٩١ .

٣٧. البرواري، عمارة، ص ٩٥-٩٧.

٣٨. البرواري، عمارة، ص ٨٨.

٣٩. البرواري، عمارة، ص ٩٥.

# پەیکەرێن شکەفتا هەلامەتا

**پ.د.محەمەد سالح تەیب سادق**
**زانکۆیا دهۆك کۆلیژا زانستێن مرۆڤایەتی**

شکەفتا هەلامەتا دکەڤیتە داوییا زنجیرا چیایێ رەش (چیایێ شندۆخا- چیایێ زاوا) ژ ئالیێ رۆژئاڤایێ چیایڤە. سرۆشتێ جهێ شکەفتێ و وێنەی زنارەکێ بلندە و شکەفت یا ڤەکرییە ناچیتە دناڤ رەڤەزا وی زناری دا، بێ گومان ئەڤ جهێ ڤەکری و نە یێ کویر پالدەر بوویە کو ئەڤ نەخشەبەرە ل سەر بهێتە چێکرن، چونکی روویێ وێ بۆ وێ چەندێ تا رادەیەکی یا خۆش بوو کو پەیکەرتاش پەیکەرێن نیڤەرۆ ل سەر چێکەت، لێ چێکرنا پەیکەرێن تەمام (النحت المجسم) بۆ وی یا ب زەحمەت بوو[1].

شکەفت دکەڤیتە بەرامبەری گرێ مالتایێ یێ شوینواری[2]، کو حەفت کیلومەتران ژ ناڤەندا باژێرێ دهۆکێ یا دوورە و ل هنداڤی گوندێ گەڤەرکێ کو نها بوویە تاخەکێ باژێری.

ئەڤ شوینوارێ مێژوویی یێ گرنگ هەتا ئەڤرۆ هێژ نەهاتییە پەرژانکرن و نەبوویە جهێ سەرنجا گەشت و گوزارێ، چونکی رێکا شکەفتێ هەتا نها دەستکەڤرە، دیسان دەستێ مرۆڤێن نەزان ژی گەهشتیە ڤان نەخشەبەران، ژبلی کو سەقای ژی کارتێکرن یا لێ کری، و ئەڤ شکەفتە پتر پێدڤی سەخبێرکرنێ یە، و هەتا نها چ سەخبێری لێ نەهاتینە کرن.

سالا (١٨٤٥)ز)ێ قونسلێ فەرەنسی ل مووسل رووی (Rooy) ئەڤ نەخشەبەرە دیتییە، سالا (١٨٤٦)ز)ێ لایارد (Layard) قونسلێ ئنگلیزی ل ستەنبۆلێ سەرەدانا وی کرییە، پشتی هینگێ ژی گەرۆك و شوینوارناسان ژی سەرەدانا ڤی جهی کرینە[3].

پەیکەرتاشێن ئاشووری چوار کەڤال ژ خوداوەندێن ئاشووری کو ژ پیاڤە ل سەر پشتا گیاندارێن ئەفسانەیی راوەستاین ل سەر روویێ شکەفتا هەلامەتا نەخشاندینە، سێ ژ وان نێزیکی ئێکن و وەکی ئێکن، یێ چوارێ یێ جودایە و ل سەر رەڤەزەکا نزمتر هاتییە کۆلان و قەبارێ وی بچووکترە، کو دکەڤیتە رۆژئاڤایێ هەرسێ کەڤالێن سەرەکی نێزیکی شکەفتێ.

رووبەرێ هەرئێك ژ وان سێ پەیکەرێن سەرەکی کو ل سەر روویێ شکەفتێ هاتینە نەخشاندن (٥.٧٥ X ٢.٠٢م)[4]. رووبەرێ پەیکەرێ چوارێ کو بچووکترە و نێزیکی ئەردییە، لەوما کارتێکرنێن سرۆشتی (عوامل التعریە) پتر ل سەر ددیارە.

ڤان پەیکەران چ نڤیسین ل سەر نینن، لێ

گەلەك ب سەر پەیكەرێن خەنس[5] ڤە دچن، لەورا خۆیا دبیت كو مێژوویا چێكرنا پەیكەرێن ڤان خوداوەندان ڤەدگەرێتەڤە سەردەمێ شاهێ ئاشووری سەنحاریب (٧٠٤- ٦٨١پ. ز)ێ.

هەر كەڤالەك ژ وان پێكدهێت ژ كەژاوەیێ (مەوكبێ) خوداوەندا و شاهێ سەنحاریب ل پێشیا وان راوەستیایە و مرۆڤەكێ دی كو دبیت جێنشینێ (ولی عهد) شاهی بیت ل دووڤ كەژاوەیێ راوەستیایە. ئەڤە نیشانێ پەرستنا خوادوەندایە و دیارە شاهـ و جێنشینێ خۆ ل دووڤ باوەریا وان و ب مەرەما دەستڤەئینانا سەركەتنێ ل سەر دوژمنان سوپاسیا خوداوەندا دكەن.

وەك ژ ڤان كەڤالان دیاردبیت خوداوەندا تشتەكێ سڤك مینا صەندەلێ دپێن وان دایە، لێ خوداوەند عشتار یا پێخاسە، دیسا شاهـ و جێنشین ژی دپێخاسن.

وەك ژ كەڤالان دیار خوداوەندێن نێر و مرۆڤان ریهێن درێژ هەنە، جل و بەرگێن خوداوەند و مرۆڤان د درێژن مینا (رۆبا) و گوهارك یێن د گوهێن وان دا. خوداوەندێن نێر دارێ دەستەلاتێ (الصولجان) یێ دەستێن وان یێن چەپێ دا و هەر ئێكی شیرەك ژ لایێ راستێ بەرەڤ پشتێ یێ هەلگرتی. بازن د دەستێن خوداوەند و مرۆڤان دا هەنە كو وێنەیێ دەمژمێرێ بخۆڤە دگریت.

هەمی خوداوەند ل سەر پشتا گیاندارێن ئەفسانەیی (خرافی) ژ پییاڤە د راوەستیاینە، بتنێ خوداوەند نەنلیل (خێزانا خوداوەند ئاشوور) نەبیت كو ل سەر كورسیەكێ ل سەر پشتا گیانەوەرەكێ ئەفسانەیی روونشتییە.

شاهـ و جێنشین ل سەر ئەردی راوەستیاینە و خۆیایە كو ئەو مرۆڤن، چونكی وان مینا خوداوەندا ماف نینە ل سەر پشتا گیاندارێن ئەفسانەیی راوەستن.

وێنەیێن هەر كەڤالەكێ ژ چەپ بۆ راست ب ڤی رەنگینە:

١-شاهـ سەنحاریب.

٢-خوداوەند ئاشوور، خوداوەندێ دەولەتا ئاشووری.

٣-خوداوەند نەنلیل، خانما خوداوەند ئاشوور.

٤-خوداوەند سین، خوداوەندێ هەیڤێ.

٥-خوداوەند نابو، خوداوەندێ باژێرێ بورسیا- وەلاتێ بابل.

٦-خوداوەند شەمش، خوداوەندێ رۆژێ.

٧-خوداوەند ئەدد، خوداوەندێ بابەلیسك و بریسێ. خوداوەندێ چیای.

٨-خوداوەند عشتار، خوداوەندا شەری و جوانیێ- ستێرا زوهرە (ستێرا بەری سپێدێ)(٦).

٩-جێنشین.

ئەو گیانەوەرێن ئەفسانەیی كو خوداوەند ل سەر پشتا وان راوەستیاین دبنە سومبلێن وان خوداوەندا و ئێكە ژ هێمایێن وان، چونكی هەر خوداوەندەكی هێمایێن خۆ یێن تایبەت هەنە و ب رێكا وان هێمایان ڤەكۆلەر دشێن خوداوەندان ل سەر كەڤالان بنیاسن، ل دووڤ ڤێ رۆنكرنێ:

## ١-خوداوەند ئاشوور

ل سەر پشتا ئەژدەهایەكی و گایەكێ راوەستیایە، هێمایێ وێ كومێ بشاخە.

## ٢-خوداوەند نەنلیل

ل سەر كورسیكەكێ یە ئەوا ل سەر پشتا شێری یا روونشتی، دەستێ خۆ یێ راستێ یێ بلند كری و چ چەك (شیر) نە هەلگرتینە. وێنەیێن گیانەوەرێن بالدار و ئەفسانەیی مینا گایێن بالدار ل سەر كورسیكێ هاتینە نەخشاندن، كو سەرێ وان سەرێ مرۆڤانە و كەلەخێ گیانەوەرانە.

## ٣-خوداوەند سین

ل سەر پشتا گایەكێ بالدار راوەستیایە، هێمایێ وی وێنەیێ هەیڤێ یە كو ل سەر كومێ (كولاڤ)ێ وی هاتییە نەخشاندن.

## ٤-خوداوەند نابو

ل سەر پشتا ئەژدەهایەکی (تنین) راوەستیایە، ستێرەکا هەشت چوکل ل سەر کومێ وی هەیە.

## ٥-خوداوەند شەمش

ل سەر پشتا هەسپی راوەستیایە، هێمایێ وی تیشکا رۆژێ یە کو ل سەر کومێ وی یێ دیارە.

## ٦-خوداوەند ئەدد:

ل سەر پشتا دو گایێن ئەفسانەیی راوەستیایە، هێمایێ وی نیشانا بریسیێ یە کو د دەستێ وی دا و ل سەر پەیکەرێ وی یێ بەرچاڤە.

## ٧-خوداوەند عشتار:

ل سەر پشتا شێری یا راوەستیایە، هێمایێ وێ ستێرە کو ل سەر کومێ وێ هاتییە نەخشاندن، ئەو ژی مینا خوداوەند ئەنلیل چەکێ شەری هەلنەگرتییە[٧].

**پەیکەرێ شاهـ سەنحاریب،** ل پێش خوداوەندا یێ راوەستیایە و گۆپالێ (صولجان)ێ دەستەلاتێ د دەستێ وی یێ چەپێ دایە و دەستێ راستێ بۆ سلاڤێ یێ بلند کری و کۆمەکێ درێژ یێ ل سەر سەرێ وی و یێ پێخاسە و وێنەیێ وی بچووکترە ژ وێنەیێ خوداوەندا.

**پەیکەرێ جێنشینی،** هەر هەمان ساخلەتێن پەیکەرێ شاهی تێدا هەنە.

## ئەگەرێ چێکرنا ڤان پەیکەران:

چەند بۆچوون ل سەر ئەگەرێ دروستکرنا ڤان پەیکەران هەنە:

**ئێك،** وێنە دیار دکەت کو کەژاوەیەکێ (مەوکبێ) ئایینی یە و شاهـ سۆپاسیا خوداوەندان دکەت ژبەر پشتەڤانییا وان بۆ شاهی کو دوژمنێن خۆ ژ ناڤ ببەت. بەلگە ژی ل سەر ڤێ بۆچوونێ ئەوە کو خوداوەندێن نێر چەکێ شەری هەلگرتییە[٨].

**دو،** وەسان دیارە شاهێ ئاشووری بریار دابوو سکرەکێ ئاڤێ ل سەر رووبارێ دهۆکێ چێکەت دا ئاڤێ ب گەهینتە دەڤەرێن دەشتێ، چونکی وێنەیێ ڤان نەخشەبەران ب وێنەیێن خەنس ڤە دچن، کو پشتی

ژ پەرتووکا(حسن البرواری،موز الالهة في منحوتات منطقة بهدينان)



چێكرنا سكرەكی و كۆلینا جۆكەكێ ب درێژاهییا (٨٠كم) و ئاڤاكرنا پرەكا بەرین بۆ دەربازكرنا ئاڤێ ل گەلیێ جەروانە، سەنحاریبی ئاڤ ل خەنس بۆ رووبارێ خەوسەری راكێشابوو[٩].

**سێ:** چێكرنا ڤان پەیكەران نیشانا بەرفرەهبونا دەستەلاتا دەولەتا ئاشووری یە، لەورا وان هێمایێن خۆ ل سەر چیایێن كوردستانێ نەخشاندینە، چونكی پەیكەرەكێ سەنحاریبی ل نهالا بەنداوا ل نێزیكی ئەلقۆش[١٠] و ئێكێ دی ل سەر چیایێ جۆدی(١١) هاتبوونە چێكرن. ئەڤ كارە مینا راگەهاندنەكێ بوو ژ بۆ دەولەتا ئاشووری، چونكی د وی سەردەمی دا چ رێكێن دی یێن راگەهاندنێ نەبوون.

## ژێدەر و پەراوێز:

١. انطون مورتكات، الفن فی العراق القدیم، ترجمة عیسی سلمان وسلیم طه التكریتی، (بغداد: ١٩٧٥)، ص ١٢١ وما بعدها؛ اندریة بارو، بلاد آشور، ترجمة عیسی سلمان وسلیم طه التكریتی، (بغداد: ١٩٨٠)، ص٣٨ وما بعدها؛ طارق عبدالوهاب مظلوم، النحت من عصر فجر السلالات حتی العصر البابلی الحدیث، حضارة العراق، (بغداد: ١٩٨٥)، ج٤، ص ص٨٦-٨٧.

٢. گرێ مالتایێ ل سەردەمێ ئاشووری یێن نوی (٩١١- ٦١٢پ. ز) بنگەهەكێ دەولەتا ئاشووری و سەنگەرەكێ لەشكەری یێ وێ بوو، ئاشووریان دگۆتە دەڤەرا دهۆكێ مالیاتی، ب واتایا دەرگەهێ یان ژی رێك بۆ دەڤەرێن چیایی. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: طه باقر و فؤاد سفر، المرشد الی مواطن الاثار والحضارة، الرحلة الثالثة، (بغداد:١٩٦٦)، ص ص٤٧- ٤٩.

٣. طارق عبدالوهاب مظلوم، تاریخ اكتشاف المنحوتات فی شمال العراق، (بغداد: ١٩٧٧)، بۆ پتر پێزانینان بنێرە:

حسن احمد قاسم البرواری، رموز الالهة فی منحوتات منطقة بادینان، رسالة ماجستیر، غیر منشورة، قدمت الی قسم الاثار- كلیة الاداب- جامعة صلاح الدین، (اربیل: ٢٠٠٢)، ص ص٦١- ٦٢.

٤. البرواری، ص٦٢.

٥. گوندێ خەنس دكەڤیتە باكوورێ رۆژهەلاتێ سەنتەرێ قەزا شێخان (ئێسفنێ) نێزیكی گەلیێ باڤیان، شاهێ ئاشووری سەنحاریب چەند نەخشەبەر ل كەڤرێن وی گەلی كولاینە و ب نڤیسینا بسماری كار و سەركەتنێن خۆ ل سەر ڤان كەڤران نەخشاندینە. بۆ زانیاریێن بەرفرەهتر بنێرە: احمد سوسة، تاریخ حضارة وادی الرافدین، (بغداد: ١٩٨٦)، ج٢، ص ص ١٠٨- ١١٥

٦. بۆ پتر پێزانینان ل سەر ڤان خوداوەندان بنێرە:

ادزارد، قاموس الالهة والاساطیر فی بلاد الرافدین، عربه عن الالمانیة محمد وحید خیاطة، ط٣، (بیروت: ٢٠٠٣)، ص٦٢ وما بعدها؛ فوزی رشید، المعتقدات الدینیة، حضارة العراق، (بغداد: ١٩٨٥)، ج١، ص١٤٨ وما بعدها؛ سامی سعید الاحمد، المعتقدات الدینیة فی العراق القدیم، (بغداد: ١٩٨٨)، ص١٩ وما بعدها.

٧. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: البرواری، ص ص ٦٣- ٧٢؛ ص١٤٧.

٨. نیكولاس بوستغیت، حضارة العراق وآثارە، ترجمة سمیر عبدالرحیم الجلبی، (بغداد: ١٩٩١)، ص١١٧؛ البرواری، ص٧١

٩. دەربارەی شوینوار و پرۆژێ ئاڤێ ل خەنس بۆ نەینەوا و چێكرنا پرا نهالا جەروانە بنێرە:

احمد سوسة، تاریخ حضارة وادی الرافدین، ج٢، ص١١٦ وما بعدها؛ احمد سوسة، مشروع سنحاریب لأرواء نینوی، مجلة المجمع العلمی العراقی، العدد ٩ ١٩٦١، ص١٦٨ وما بعدها؛ محمد صالح الزیباری، مشاریع الری الاشوریة فی كردستان، شانەدەر، العدد ١ ١٩٩٧، ص ص٤٥- ٥٠؛ دەربارەی پرا جەروانە بنێرە:

.ff ٨.Jacobsen، Th. And Lioyd.s " Sennachribs Aqueduct at Jerwan.(Chicago: 1935)، P

١٠. باقر وسفر، ص ص ٤٦- ٤٧.

١١. طه باقر، مقدمة فی تاریخ الحضارات القدیمة، ط٣، (بغداد: ١٩٧٣)، ص٥٢٠.

# کەلا ئاکرێ یا شوینواری

بێکەس جەمالەددین بریفکانی
خویندکارێ دکتورایێ زانکۆیا لیۆن٢ فرەنسا
وەرگێران: ژیان عەبدولحەمید عومەر

وێنەیێ ژمارە (١)



**جهـ:**

کەلا ئاکرێ یا شوینواری دکەڤیتە قەزا ئاکرێ[1] ئەوا سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤە ل باشوورێ کوردستانێ، د رۆژناما (الوقائع العراقیه) هژمارا (۳۳۰۳) ل رێکەفتی (۱۹۵۱/۱۱/۵)ێ وەکی شوینوار هاتییە راگەهاندن، کەلا ل سەر گوپیتکا چیاییە، (۱۰۱۰م) ل سەر ئاستێ دەریای یا بلندە، پیڤانا وێ دگەهیتە (۱۳۵X۱۵۰م)، هەر ئەو گوپیتکا بلند بەر ب نشیڤی و هێدی هێدی بەر ب باشووریڤە دچن، پەسارا وێ یا هاریکارە پرۆژێن نیشتەجیکرنێ ل سەر بهێنە ئاڤاکرن (وێنەیێ ژمارە ۱).

تاخێ کەڤن ژ باژێرێ ئاکرێ ژ رەخێ باشووریڤە ملبملێ چیایێ کەلایێ یە، ناڤێ باژێرێ کەڤن د دەنگوباسێن گەرۆکێن عەرەب و گەرۆکێن دیدا هاتینە، هەروەسا باسێ ڤی باژێری د پەرتووکا (البلدان)دا ب ناڤێ (عقره الحمیدیه)[2] هاتییە، ئەڤرۆ قەزایەکە سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤە.

## ئاکرێ مێژوو و سروشت و شوینوار:

کەڤنترین ناڤئینانا باژێرێ ئاکرێ ل سەردەڤێ خودانێ پەرتووکا (شعیب المارزیا) یێ ئارامی هاتییە، دەمێ ئاڤرییێ ب(مارزیای) ددەت، بۆ پەرستنا خودێ ل باژێرکێ[3] شوشێ و گوندێ شەرمنێ ل نێزیکی سالا (۳۰۹ز) خۆ ڤەدەر کری، خۆدانێ پەرتووکا (دامسنائی) ئاڤرێ پێکربوو کو پەیکەرەکێ وەسەنیێ مەزن لێ هەبوو، ئەو پەیکەرە یێ دووێ بوو ژ وی رەنگی کو ل وەلاتی ئەدیابن هەی، ئەڤ نڤیسەرە دبێژیتە ئاکرێ (مالا ئاگری)[4].

د ژێدەرێن مێژوویدا باژێرێ ئاکرێ ب گەلەك ناڤان هاتییە، ژ وان ژێ: عەقرە، عەقرە ئەلحەمیدیە، کچك ئسلامبول - ستانبۆلا بچووك، (الحیال) ئەوا د پەرتووکا (مناقب الاولیاء)دا هاتی، د گۆتنێ ئەردێ ب پیت و بەرەکەت، ل جەم کوردان ژێ ب (ئاکرێ) دهێتەناڤکرن[5]. ئەو ناڤە ل دەڤ وان یێ کەڤن و بەرنیاسە، ئەو ژ پەیڤا ئاگر هاتییە، بۆ ڤی نازناڤی ئەڤە نە تشتەکە کو جهێ جێبەتیێ بیت، دەمێ فیستەڤالێن خەتیرێن ئاگری ب لڤینەکا پێچایی و بەربەلاڤ ژ کەلایێ هەتا تاخێ کەڤن د ئاهەنگێن سالانە ب هەلکەڤتا جەژنا نەوروزێ ل ئاکرێ دهێنەگێران، دەربرینا ژ وی کەتواری دکەن. تشتەکێ سرۆشتییە کو مێژوویا باژێری و رەوشەنبیریا وێ ب مێژوو و رەوشەنبیریا دەڤەرێ و هەرێمێڤە بهێتە گرێدان، بکەڤیتە ژێر باندۆرا روودانێن ل دەڤەرێن رەخۆدۆرا روو ددن، ئەگەر مرۆڤێن سەردەمێن بەرین یێن کەڤن ژبەر جهێن خۆپاراستنێ و سامانێن وێ یێن سرۆشتی ل هەرێمێ ژیابن، بەلێ شوینوارێن ژ هەمیا کەڤنتر کو ناڤودەنگی هەی ل ئاکرێ دەوروبەرێن وێنە، بۆ سەردەمێن مێژوویی یێن کەڤن دزڤرنەڤە، ئەڤە وێ چەندێ ناگەهینیت کو مرۆڤێن کەڤن ل ڤێ دەڤەرێ نەژیابن، سامانێن سرۆشتی ژێ وەکی (فێقی و ئاڤ و جهێ ئاکنجیبوونێ....) وەکرییە کو مرۆڤێ نیاندرتال بەری (۵۵) هزار سالان ل چیایێن کوردستانێ بژیت. هەروەسا هەبوونا شکەفتان ئەوێن بۆ ئاکنجیبوونێ دەستددەن هەرچەندە ژ شکەفتا شانەدەرێ بچووکتر ژێ بن، ئەوا کو ئەو مرۆڤ تێدا ژیاین، گومان تێدا نینە کو دووڤچوونێن شوینواری د پاشەرۆژێدا دێ بەرسڤا گەلەك پرسیاران دەن و دێ رۆناهییەکا باش دەنە مێژوو و شارستانییەتا ڤێ دەڤەرا کەڤنار[6].

کەلا ئاکرێ یا شوینواری ل پشکا خوارێ ژ چیایێ باژێرێ ئاکرێ هاتییەئاڤاکرن، دکەڤیتە هنداڤی باژێری، چیایێ ناڤهاتی ئێکە ژ گوپیتکێن چیایا یێن ژ رۆژهەلاتی بۆ رۆژئاڤایی چیایێ ئاکرێ پێکدئینن، هوسا دیارە کو ژ کەڤن وەرە خەلکێ ئەڤ پشکە بۆ نشتەجیبوونێ هەلبژارتییە، دا کو دەمێ مەترسی وەك هێرشێن دوژمنان ب سەردا دهێن، نێزیکی گوپیتکێن چیایێن ئاسێ ببن، بۆ وان ئەڤ جهە باشتر بوو لێ بژین ل جهێ گەلیێن بخێر و بێر خودان کانیێن ئاڤا تەزی، کو مەزنترینا کانییان ژێ (کانی زەرکە) کو هەموو دەمێن سالێ ئاڤ لێ هەیە.

ل هەردو رەخێن ڤی گەلیێ پەسارا وێ بەر ب خارێڤە دچیت، بانیێن بخێر و بەرەکەت و ناڤدار ب

وێنەیێ ژمارە (٢)



گەنمێ خۆ هەنە، دناڤرا هندەك گەلیێن دیتر هەنە، باغ و چەمێن فێقی لێ هەنە، دار هنار و هژیر و دارێن كاژێ هەمبێز دكەن و گەلەك ژ تەوالێن كویڤی ژی لێ هەنە.

## جهێن ئاڤەدانی یێن گرنگ ل كەلهێ:

### دەرگەهێ دەرڤە (دەرگەهێ باشووری)؛

دكەڤیتە نك لێڤا باشوورێ رۆژهەلاتێ گوپیتكا چیایی، ب رەنگێ بازنەیە گوپیتكا وی دروست نەهاتییە كۆلان، هەر دو داوییێن وی ل سەر شێوێ سەرێ تەوالەكێ ب سەروبەر نەدیارە، بەلێ ئەگەر ژدوورڤە و ژلایێ رۆژلاهەتی ژ بنێ چیاییڤە بەرێ خۆ بدەینێ، دێ وەك سەرێ دو ئەلهۆیان بەرامبەری ئێك دیاربیت (وێنەیێ ژمارە ٢)، درێكا سەنتەرێ بازێرێ كەڤن را (جهێ سەرایا كەڤن) رێك دچیتە ڤێ دەرگەهی، پشتی دناڤ كۆلان و مالێن ئێك ل سەر ئێك را د بۆریت، ل بلنداهییا بازێری دێرەكا كەڤن هەیە، كو باكوورێ چیایێ كەلایێ ڤەدگریت، هەر رێڤینگەكێ بچیت دێ هندەك ناوسكێن چیاییدا كۆلای و نێزیكی دێرا مە ئاڤری پێكری، بینت، پشتی وێ ژی ڤۆناغا دووێ ژ سەركەڤتنێ بەر ب ژوور دەستپێدكەت، ب سەر پەیسكەكا نوو را سەرا كەڤن ئەو ژی ب رێكەكا خاروڤیچ ب سەر بەرمایێن پەیسكێن كەڤن و د چیایرا كۆلای سەردكەڤن، ل هندەك چەپان دیوارێن كۆلای مینا نیڤژوورا دگەل هندەك پشكێن پەیسكەكا كەڤن دكەڤنە بەرسنگێ ئەوێ سەردكەڤیت، دبیت ئەڤ جهە بۆ بێنڤەدانا وان كەسان بن یێن بەر ب وێ گوپیتكێ دچوون یا دكەڤیتە هنداڤ وی گەلی ب كوژیەكێ نێزیكی (٧٥ پلەیان)یە، ل ژێریا لێڤا كەلایێ ل هەردو ئالیێن دەرگەهی شوینوارێن دو شویرهان ژ دو سەردەمێن جودا دهێنەدیتن، بارا پتر هزر بۆ هندێ دچیت كو یێ كەڤنتر ب بەرێن نكراندی هاتییە ئاڤاكرن، ژبەركو كەلایێ شویرهێن دژوار و ئاسێ هەبوون (وێنەیێ هژمار ٢)، هێژ هندەك ژێ ل بەرچاڤ مانە و ئەڤە زێدەباری دەرگەهێ باكووری یێ كەلایێ ل ئالیێ بەرامبەر بەر ب سەمتا باكووری دچیت، كو دكەڤیتە هنداڤ بیستانێ میری.

وێنەیێ ژمارە (٣)



## زیندان:

هۆلەکا مەزنە ب دووراتیێن (٤X٣٢م)، دکەڤیتە ژێر لێڤا باکووریێ رۆژئاڤایێ کەلایێ ب کوراتیا (٣٠م)، زیندان پەیڤەکا خۆجهییە ئەڤ جهە پێ هاتییە نافکرن، ژ بەر هەبوونا هندەك تشت و پاشبەندێن نە هەژی بۆ تەبایی خەلکی ل ڤی جهی گومانا بوونا زیندانێ

وێنەیێ ژمارە (٤)



ل ڤی جهی ل جەم وان پەیدابوویە، ئەڤ جهە کو بێ ڤەشارتی نەبوویە ل بەر هەرکەسەکێ بوێریت بچیتە دناڤدا، ب چیڤانۆکەکێ ڤە گرێدایە، وەك دهێتەڤەگێران کو میرەك ب ناڤێ (میر زەند) بەری پتر ژ (٢٥٤٠) سالان ژیایە، ئەڤ کەلایە ئاڤاکرییە و کرییە بنگەهێ خۆ[٧]، ئەڤ زیندانە جهێ کەسانێن گونەهبار و دوژمن بوویە، رووبەرێ وێ دبیتە (١٢٨م٢) بلنداهییا وێ (٣،٤٠م) دەرگەهێ زیندانێ دکەڤیتە رۆژهەلاتی، هەموو سپێدەیان تاڤا رۆژێ لی ددەت و دەرگەهێ ناڤهاتی ب رەنگێ سەرێ ئەلهۆی بەر ب باکووریڤە دچیت (وێنەیێ ٣)، بۆ وێ بارستەك ژ کەڤری دەرباز دبیت، ژ لایێ چەپێڤە یا گرێداییە ب بارستەکا کەڤری کو زیندان ژێ هاتییە کۆلان، د سەر دا کۆرکێن ئاگرینە، دناڤبەرا ڤێ بارستێ و دەرگەهێ پشکا پرکری، نەخشەکێ نیڤکڤانی چێکرییە داوییا وێ ب کوژیێ باشووریێ دەرگەهیڤە گرێدایە ئانکو سەمتا وێ بۆ لایێ بەرۆڤاژیێ سەرێ ئەلهۆیە.

هندە هەتا دەرگەهی ب داوی دئینین دێ چاڤێ مە ب بانێ وی کەڤیت، پویچەك بەر ب کڤانیڤە

وێنەیێ ژمارە (٥)



دچیت، دو کونێن نێزیك ئێك لێ هەنە، یا ئێکێ بازنەییا دەرزیایە تیرێ وێ (١م)، یا دووێ ب چوارگۆشەیی هاتییە کۆلان ل کوژیێ وێ دەرزەکا لاکێشەیی بەر ب باکووریڤە دهێتەدیتن، ب ڤی رەنگی وەکی سەرێ ئەلهۆی لێدهێت و ب شێوازەکێ هونەریێ جودا دیاردبیت (وێنەیێ ژمارە ٤)، دگەل هندێ ب رووبەرێ (٢م) رۆناهی دچیتە د وان کونانڤە، بەلێ تاریاتیێ خۆ ب سەر ڤی جهی دا گرتییە، یا ب زەحمەتە بۆ کەسەکی بکاریت داوییا وێ ب رەنگێ دۆشکەکێ چوارگوشەیە ببینیت، ڤی دوشکی کوژیێ باشوورێ رۆژئاڤایی ڤەگرتییە و نیڤتیرێ وێ (١،٢٠م) و بلنداهییا وێ (٠،٨٠م). بزحمەتە پەیسك بهێنە جوداکرن، ئەوێ دکەڤیتە نیڤا روویێ باشووری و بەر ب ژوورا سەریا بازنەیی ب تیرێ (٣م) و ب (١٢) پەیسکا بلند دبیت (وێنەیێ ژمارە ٥) و ئەوێ ب سەر دەرەجێ دکەڤیت، دو رێك دهێنە بەرسنگێ وێ، ئێك ل ئالیێ راستێ و یا دیتر ل ئالیێ چەپێ و هەردو ژی بەر ب وێ ژوورێ دچن و ئەو رێکا بەر ب ژوور دچیت بایەکێ سڤك تێرا دهێت، ئەڤە ژی نیشانا بوونا کونەکێ یە ل باکوورێ بانی؟ بەلێ ب بۆرینا هەیامێن درێژ، ئەو کون هاتییەگرتن و پرکرن و شوینوارێن وێ نەماینە هەروەك هندەك ژ خەلکێ دەڤەرێ ڤەدگێرن.

## ژوورا میر زندی:

مەرەم ژێ ژوورا میرێ (زەنـد)ی یە، ژ جوانترین پێکهاتێن کۆلایی یێن کەلایێ یە، رووبەرێ وێ وێ (٦٧م٢) و بلنداهییا رووێن وێ (٣،١٠م)، ژوورا میری یا لاکێشەیە، دەرگەهێ وێ یێ دەرڤە دکەڤیتە رێکا ناڤین، هەروەکی دەرگەهێ زیندانێ بەرامبەری جهێ رۆژهەلاتێ یە (وێنەیێ ژمارە ٦)، دەرگەهێ لاکێشە ب کڤانەکا تیژڤە دکەڤیتە هنداڤێ، کەسێ دچیتە د ناڤدا دێ دیوارەکێ ل لایێ خۆ یێ چەپێ بینیت هەتا ناڤەراستا وی جهی درێژ دبیت، هەر ژ دەسپێکێ ڤە نیڤا وێ ژ پشکا ژێری ڤەدەر دکەت، ژ ئالیێ راستێ ڤە ژی ل داوییا پشکا ژووری میحرابەکا کڤانی یا سەرتیژ هەیە، فرەهییا وێ دگەهیتە ٢،١٠م و بلنداهییا وێ دگەهیتە ٢،٢٠م و دکەڤیتە سنگی، بەرامبەری وێ دۆشکەکێ مەزنە پیڤەرێن وێ (٢١م) و بلنداهییا وێ (٠،٤٠م) و ب رەخ ڤی دوشکێ مەزنڤە دەرگەهەکێ مینا میحرابا باکووری یە، بلنداهییا وێ (١،٨٠م) و فرەهییا وێ (٠،٩٠م) و کووراتییا وێ (٠،٧٥م)، ب بلنداهی (٠،٤٥م) ب رەنگەکێ رێکوپێك ژ ئەردی بلنددبیت، ژ ئالیێ ژێریڤە دیوارەك بۆ ئالیێ چەپێ یێ دەرگەهی روویێ ژێری ڤەدگریت و دۆشکەکێ بازنەیی ل کوژیێ ژێریێ رۆژهەلاتی هەیە و دۆشکەکێ دیتر ژی دکەڤیتە ئالیێ دی یێ کوژی.

دەرگەهێ دکەڤیتە نێزیکی میحرابا چەپێ، مینا خەلەکەکا کۆلای ژ بەری د بنیاتێ تەنشتێڤە دیارە.

وێنەیێ ژمارە (٦)



وێنەیێ ژمارە (٩)



## ١- هۆلا ئێکێ:

دکەڤیتە باکووریێ هەردو پێکهاتێن دی، ب کووراتییا سێ مەتران هاتییەکۆلان، ل ناڤەراستا وێ دو دۆشك هاتینە کۆلان، بلنداهیا وان دگەهیتە (١.٦٠م)، رووبەرێ روویێ وان (٢.٥٦م)، بنیاتێ وان ب پیڤەرێ (٣.٢٤م)، جوداهیا دناڤبەرا گوپیتکێ و بنواشەی ب چاڤ دۆشکێن برەخڤە جوانییەکا جودا یا دایێ، هەروەکی دیوارێن تەخێن زەقورێن ئیراقی یێن کەڤن، هۆل و ئەردێ وێ ب قاتەکێ کلسی کوتنەکرییە، ستویراتییا وێ (١- ٤ سم) ب رەقاتییا خۆیا بهێز هاتییەنیاسین، دیوارێ باکووری یێ جودابوو، پێنج خەلەك دلێڤا وێ یا سەریدا هەبوون، ب روویێ وێڤە گرێدای بوون، بۆ زانین ئەڤ خەلەکە ل گەلەك جهێن کەلایێ هاتینە کۆلان (وێنەیێ ژمارە ٧).

## پێکهاتێن سەنتەری:

سێ هۆلێن لاکێشە یێن برەخێکڤە ژ رۆژهەلاتی بۆ رۆژئاڤای دچن، د رووبەریدا نەوەکهەڤن:

## ٢- هولا دووێ

ب کووراتییا هولا ئێکێ هاتییە کۆلان، رووبەرێ

وێنەیێ ژمارە (١٠)



وێ دگەهیتە (٥١م)، دیارە ئەردێ ڤێ هۆلێ ب چوار تەخێن ئێك ل دووڤ ئێك هاتییەنخافتن، تەخا چوارێ یا كەڤنتر دزڤریتەڤە ئەردێ (LV١) ژ كلسی و ئەردێ (LV١)ێ ب كەرپیچا هاتییەرائێخستن، قەبارێ وێ (٢٥X٥X٦ سم) (وێنەیێ ژمارە ٨).

## ٣- هۆلا سیێ

بچووكترین ئاڤاهیێن سەنتەرییە بەلێ كووراتیا وێ كێمترە، رووبەرێ وێ (٣٢م٢) و كووراتیا وێ (١.٧٥م)، ل دەڤ روویێ نێزیكی كوژیێ وێ یێ رۆژئاڤایی پەیسكەك هەیە، هندیكە ئەردێ وێ یە ئەم ژێ د پشتراست نینین كو ئەردێ تەخا چوارێ بڤێ كووراتیێ بیت، یان كاركرن دڤی جهیدا وەك هندەك جهێن دی هێژ ب داوی نەهاتییە، د سەروبەرێ دووێ دا ئەڤ ئەردە ل سەردەمێ تەخا سێ یێ یا د دووڤدا هاتییەچێكرن، ب تەخەكا (زفتێ) هاتییە نخافتن، ستووراتییا وێ (١-٢سم)ە، پاشتر تیكەكا بچووك د نیڤا وێ دا ژ باكووری بۆ باشووری هاتییەكۆلان، درێژاهیا وێ دگەهیتە (٥٠سم) و كووراتیا وێ دگەهیتە (١٥سم) و فرەهیا وێ دگەهیتە (٣٠سم) (وێنەیێ ژمارە ٩).

## دیوارێن نكراندی (الجدران المنحوتە):

وان دیواران ڤەدگریت، یێن ژ رۆژهەلاتیڤە درێژدبن و ل گەلەك جهێن كەلایێ هەنە، گەلەك ئاڤاهی و میحراب و بركێن ئاڤێ و كۆركێن ئاگری د گەل دا هەنە، هەموو ژی دیار و بەرچاڤن، دووڤچوونێن شوینوارێن بەراهیێ ئەو برك و كۆرك و نیشان و سەروبەرێ وان بەرچاڤكرییە، ئەو دیوارە ژی ئەڤەنە:

١- دیوارێ باكووری: ئەوە یێ ئەم ب بلندی ل پشكا باكوورێ رۆژهەلاتی ژ كەلایێ دبینین.

٢_دیوارێ باكوورێ رۆژئاڤایی: دكەڤیتە دووراتیا (٣٠م) ژ لێڤا باكووری یا كەلایێ.

٣_دیوارێ ناڤەراست: ب سەنتەریڤە گرێدایە، ژ دەرگەهێ هۆلا ناڤەراست دەستپیدكەت و ب درێژاهیا (٤٧م) بەردەوام دبیت، دگەهیتە رۆژئاڤای

وێنەیێ ژمارە (١١)



جهێ چوارگۆشە لێ هەین، ئەڤ دیوارە ژی ژ گرنگترین دیوارێن بەرچاڤە، د سەر هندێ را كو گرێدان ب سەنتەریڤە ژی هەیە، ژ دو میحرابا و (٥) حەنایا[8] پێكهاتییە، ل سەر روویێ دیواری ب بلنداهیا (١.٧٠م) كۆركێن رۆناهیێ ب قەبارێن جودا هەنە. دسەر ڤان دیواران را هندەك دیوارێن دی یێن ژ كەڤری كۆلای وەك نیڤژووران هەنە، مەزنترینێ وان دیواران دكەڤیتە هنداڤ زیندانێ، دبیت گەلەك ژوان ژی ژێرئاخ كەتبن و ل هیڤیا لێگەریانێن شونواری نە (وینێ ژمارە ١٠).

## پرۆژێن ئاڤدانێ:

ئەو لێگەریانێن هاتینەكرن و ئاڤاهی و پرۆژەیێن ل سەر گوپیتكا چیایێ كەلایێ هەین، ئەگەر كەسەك هزر بكەت كو ل پشت وان ئیمپراتۆرییەتەك و ئیمپراتۆرەكێ خودان ئارمانج هەبوویە هەڤرویشی شاشیێ نابیت، ئەو ئیمپراتۆر خودانێ هندەك رێك و ئامرازان بوویە كو ڤان دەسكەڤتان دەستڤەبینیت، وەكی ئیمبراتوریا ئاشووری و ئیمبراتور سەنحاریبی ئەوێ ئاڤ ژ رووبارێ گوملی گەهاندییە نەینەوا، تشتەكێ سرۆشتییە كو ئەڤ دەسكەڤتە تەمام نابن، هەكە پروژەكێ ئاڤدانێ نەبیت یێ ئاڤێ بگەهنیتە ڤێ گوپیتكا بلند، چیڤانۆكا (میر زەندی)

وێنەیێ ژمارە (٢)



و کار و پرۆژەیێن وی دهێتەڤەگێران، ژ پرۆژێن ئاڤدانێ یێن کەلایێ:

١- جووا سەرەکی یا ژ دەرڤە دهێت: ئەڤ پروژە ب کۆلانا جوکەکێ ژ کانییا ئاڤدارا (سەرێ ئاکرێ) کو دکەڤیتە چیایێ (سەرێ ئاکرێ) دەسپێکرییە، جوو ب پانییا (١م) و کووراتییا (١،٤٠م) ب دووراتییا ١کم یا درێژە، سولینێن ئاڤێ یێن ژ ئاخێ چێکری تێدا هاتینە بکارئینان و پاشی ب ئاخێ هاتییەداگرتن، هەتا ئاڤا پاقژ و بژوین د چەند نزمی و بلندییەکاندا گەهاندییە گۆپیتکا کەلایێ ل رۆژئاڤایێ بانێ زیندانێ و ئەڤە ژی ب رێکا فیزیکی ب ئامانێن نەوەکهەڤ (الاوانی المستطرقە) دهێتەنیاسین، هەتا ئاڤ گەهاندییە نیڤا کەلایێ (وێنەیێ ژمارە ١١).

٢- عومبارا سەرەکی: ئەو مەزنترین عومبارێن کەلایێ بە، روویێ وێ یێ باکووری چەند حەنایا ب خۆڤە دگریت دکەڤنە هنداڤ تیڤەرێزەکێ ل هەموو ئالییێن عومبارێ نەخشاندییە، جوویەك ب کووراتییێن جودا بەر ب ژێری دچیت، ل سەر بیران بەلاڤدبیت (وێنەیێ ژمارە ١٢).

٣- بیر: هژمارا وان دگەهیتە (١٣) بیران و ب قەبارێن جودا ل وی جهی دبەربەلاڤن، پشکەك ژ وان ب کلسی کوتنەکرینە، ئەوا کو سالۆخا (الامتصار) هەی، داکو ئەو کەرستێن دکەنە تێدا بهێنە پاراستن و پشکەك ژ وێ نەیا کوتنەکری بوو، ئارمانج ژێ عمبارکرنا ئاڤێ بوو، ئاڤا بارانان ژی ب رێکا کۆمەکا جووان ل دەوروبەرێن بیران ئەڤ بیرە تژی دکرن.

## کۆرکێن رۆناهییێ:

کۆرکێن رۆناهییێ ب قەبارێن جودا بوون، تیرێ وان دناڤبەرا (٦-٣٠سم) بوو، کووراتییا وان دگەهشتە

نێزیكی نیف مەتری، ئالیێن ڤان كۆركا گەلەك ب هووری هاتبوونە كورتانەكرن، حلی و رێكوپێك بوون، دا ژ گەرماتیا ئاگرێ كو بەرێ كلسێ تێدا كۆلایی پێچدكەت، بهێتە پاراستن. دناڤدا هندەك ئامانێن باش ل شوونا وان چراكێن زەیتی دانابنە.

## مێژوویا كەلایێ:

شوینوارێن بەرچاڤێن ڤێ كەلایێ نێزیكی (٩٩٪)ێ ژ وان شوینواران پێكدئینن، ژ بەركو گەلەك ژ نیشانێن وان بۆ تەبایی خەلكی د ئاشكرا نینن، لەورا هندەك چیرۆكێن دوور ژ راستیێ ل سەر دهێنەڤەگێران، تشتێ مە دهێلیت حێبەتی ئەوە كو كەسەكی ژ وان كەسان یێن سەرەدانا وێ كرین، ژ دیرۆكنڤێس و شوینوارناسان یان هەر ئێكێ دی چ ڤەكۆلینێن زانستی ل سەر شوینوارێن بەرچاڤێن كەلایێ نەكرینە، ژبەر هندێ بۆ دیرۆكا ڤێ كەلایێ تنێ دێ پشتا خۆ ب وان ڤەكۆلینان گەرمكەین یێن فەرمانگەها شوینوارێن ل سالێن (٢٠١٠-٢٠١١)ێ ئەنجامدایین.

ب ڤەكۆلینا دیرۆكا رۆژهەلاتی د سەردەمێن بەری زایینی و پشتی زایینی دێ بەرێ مەدەتە وێ راستیێ كو مللەتێن هندوئەورویی ئەوێن ل ئیرانێ و دەوروبەرێن وێ ژیاین، ژ وان ژی خەلكێ كوردستانێ باوەری ب ئایینێ زەردەشتی ئینایە[٩] ئەو ئایینێ ل نیڤا دووێ ژ هزارا ئێكێ بەری زایینی بەلاڤەبووی.

دسەر پیرۆزیا وێ بۆ ژیانێ و تۆخمێن وێ یێن ئەكتیڤ وەكی (ئاڤ و ئاگر و ئاخ و با)، یاكو هاریكاریا بەلاڤبوونا ڤی ئایینی كری، ئەوە شاهێن هەرسێ ئیمپراتۆریێن فارسی (ئیمپراتوریا ئەخمینی/ چەرخێ پێنجێ- داویا چەرخێ چوارێ بەری زایینی، ئیمپراتوریا فرثی/ چەرخێ دووێ بەری زایینی و چەرخێ سێ یێ زایینی، ئیمپراتوریەتا ساسانی/ چەرخێ سێیێ- حەفتێ زایینی) هاتینە سەر ڤی ئایینی، ئەو ژێدەرێن ڤەكۆلین ل سەر ڤان ئیمپراتووریان و ئایینێ زەردەشتی و هەڤكویفێ وێ میترایی كرین تێرا ڤەكۆلەران هەنە، لەورا ئەم خۆ ب كووراتی و پشكێن بیروباوەرێن وانڤە مژوول ناكەین، بەلكێ تنێ دێ خۆ ب شرۆڤەكرنا شوینوارێن كەلا ئاكرێ مژوولكەین، گومان ژی تێدا نینە گرنگترین شوینوارێن وێ دەرگەهێ سەرەكی و زیندان و ژوورا میر زەندی نە دگەل پێكهاتێن سەنتەرێ كەلایێ و پرۆژێن ئاڤێ.

پشتی مە ڤەكۆلین و لێگەریانان كرین كۆمەكا خالان مە بەر ب پێزانینا مێژوویا كەلایێ و گرنگیا وێ دبەن:

١- دەرگەهێ دەرڤە: نێرینا ئێكێ ل سەر ڤی دەرگەهی یێ دكەڤیتە هنداڤ رۆژهەلاتی، كو ژ هەردو ئالیێن وی ب رەنگێ كڤانەكێ نەتەمام هاتییەكۆلان، هەردو رەخێن وی وەكی سەرێ دو ئەلهۆێن بەرامبەری ئێك ژ كەڤری هاتینەكۆلان، ناهێتە ڤەشارتن كو ئەلهۆ و باز ژ چەڤەنگێن هێژانە یێن هەردەم دگەل پەیكەرێن خوداوەند (میترا)ی دهاتن، ل دووف ئایینێ زەرەدەشتی خوداوەندێ رۆناهیێ ئەوێ دگەل رۆژێ دیاردبوو.

٢- زیندان: هەركەسێ چەند مەترەكان سەرنشیڤ بەر ب دەرگەهێ زیندانێ بچیت دێ دەرگەهێ ژدەرڤە كەڤیتە بەرامبەری وی كو ب هووراتییەكا بێ سنوور، ب رەنگێ سەرێ بازی نەخشاندینە، بەری بچییە د ناڤدا دێ ژ ئالیێ چەپێڤە ب رەخ ئاگردانان را بۆری، د ناڤدا و ل كوژێ چەپێ یێ دەرگەهی دێ خەلەكەكا كووركری بینی، ل هەردو ئالیان ژی جوویێن د دیواریدا كۆلاینە ب رەنگێ ستوونی و ئاسوویی هەنە، ئەڤە هەموو ژی ژ سەخلەتێن پەرستگەهێن میترایی نە. هەژیە بێژین پیرۆزكرنا ئاگری و ئاڤێ ژ ستوونێن ئایینێ زەردەشتینە.

هەر وەكو مە دیتی كو دەرگەهێ ژدەرڤەیێ كەلایێ كو چەڤەنگێ میترایی (ئەلهۆ) هەلگرتییە، دكەڤیتە رۆژهەلاتی، دەرگەهێ زیندانێ ئەوا كو هێمایێ دووێ هەلگرتی ئەو ژی هەر دكەڤیتە رۆژهەلاتی، كو هەموو سپێدەهییان پێشوازیا

رۆناهیا خوداوەند میترا دكەن.

هۆلا زیندانا مەزن یا كو د نیڤەكا چیایی را هاتیەكۆلان، چەندین نیشانێن پیرۆز ب خۆڤە دگریت كو د پەرستگەهێن كەڤنێن ئیراقێدا د بەربەلاڤبوون، ژ وانان تەقچكەكا (مسطبە) درێژ دكەڤیتە ئالیێ چەپێ هەروەسان دوشكەك دكەڤیتە كوژیێ ژێریێ رۆژئاڤای كو ب شێوێ چارێكە بازنەكێ یە، شێوازێ وی ل هندەك جهێن پیرۆزێن ئیراقا كەڤن هاتینەنیاسین.

٣- ژوورا میر زەند: پەیڤا زەند رامانا وەرگێران و شرۆڤەكرنا ئاڤێستایێ (پەرتووكا پیرۆزا زەردەشتی) ددەت، هەروەسان ب رامانا (مالا ئاگری) دهێت، پەیڤا ئیزەد ئانكو: خوداوەند و پەیڤا یزتی ب رامانا خوداوەندێ ئێكانە (ئاهورمەزدا) (خودا) دهێت(١٠). پشتی مە رامانا پەیڤێن (زەند و ئیزەد و یزتی) زانی و هێمایێن وان یێن پیرۆز زانین كو گرێدانەك ب پەیڤا زیندانڤە هەیە، ئەڤ نیشان و هێمایێ پەیڤێ و پیرۆزیا رامانا وێ پەیوەندی ب پەیڤا زیندانڤە هەیە، هەروەسان دگەل پەیڤا (زیندە خۆر) دگەهنە هەڤ كو رامانا (ژوورا زیندو) ددەت، ئەڤ ژوورە شكەفتەكە وەكی ژوورا میر زەندی و رەخۆدوورێن وێ یە، دكەڤیتە دەڤەرا شێخان، كو مەزنترین قۆلێن ئێزدیان لێ هەنە، هەكە ئەم پویچەكێ هزر د ناڤكرنا ڤێ شكەفتێ دا بكەین، ئەوا ل ڤێ داویێ هاتییە نیاسین، دێ بۆ مە وێ پیرۆزیێ بەرچاڤكەت كو ژیانا بەردەوام پەسنەكا خوداوەندییە، لەوما ئەم دكارین بێژین كو ژوورا میر زەندی ب دەرودورێن خۆڤە پەرستگەهەكا خوداوەندییە و پەسنا خوداوەندی ژێ هاتییەگوهارتن و بوویە زەند، ئەو ژی پەیڤەكا پیرۆزە.

٤- میحراب (محاریب): ژ گرنگترین سیمایێن پێكهاتێن كەلایێ یە، هەروەكی كو ئێك ژ نیشانێن بەرچاڤێن ئایینی یە د جهێن خودێ پەرستیێدا ل جەم هەمووو ئایینان، میحراب ل كەلایا ئاكرێ ل سەر چەندین جهێن نەخشاندی هاتینەبەلاڤكرن، پتریا وان ژ چووناڤەكێ (دخلە) پێكهاتییە كو بلنداهیا وێ ژ (١م) زێدەتر نینە، هندیكە ئەركێ وانە ب دروستی نەهاتییەزانین، هەرچەندە مەزنترینا وان كو بلنداهیا وێ نێزیكی (١،٥م)یە دیارە ئەركێ وێ گرێدایی رێورەسمێن ئایینی یە، ئەڤە و هژمارا وان دگەهیتە پێنج (میحرابا) ژ وان بەر ب ژوور، مەزنترینا وان دكەڤیتە ژوورا میر زەندی و دۆشكەكێ مەزن دكەڤیتە سنگێ وێ و دگەل (میحرابی) هەمەوو روویێ ژووری ڤەدگرن، بۆ پەیكەرێ خوداوەندی یان هێمایێ وی تەرخانكرییە، ئەڤە ژی سەرئەنجامێ هەڤبەركرنا وان دگەل هەمووو (مەحاریبێن) ل جهێن پەرستنێ ل جەم ئایینێن كەڤن و نوو هەین. هندیكە میحرابا دویێ یە نەخشەبەرەكە (نحت) ل سەر روویێ ژێریێ دیواری یێ بەر ب پێكهاتێن سەنتەرێ كەلایێ درێژ دبیت و ئەڤ (میحرابە) دكەڤیتە ب رەخ چەند (میحرابەكێن) بچووكڤە كو د شیاندا یە ب (دخلات) بێنە بناڤكرن، زێدەباری میحرابا سیێ ل ئالیێ رۆژهەلاتی، كو دیوار ل وێرێ دزڤریت و جووێن ئاڤێ دبەررا دچن و دو ئاگردانێن ئاگرێ پیرۆز دكەڤنە هنداڤ، هندیكە ( میحرابا) چوارێ یە دكەڤیتە ئالیێ باكووری ل رۆژئاڤایێ چیایێ كەلایێ ل جهەكی كو ب زەحمەتە كەسەك بگەهیتێ.

ژ هندرێ ڤان نێرینا ئەم دبینین كو شوینوارێ ڤێ كەلایێ ب بەرفرەهی و هەمەرەنگیا خوڤە ژ چیایی هاتییەكۆلان، ئەڤ شێوازە ژی ڤی جهی دكەتە ئێك ژ گرنگترین و مەزنترین جهێن پیرۆزێن میتراییا، نە تنێ ل كوردستانێ بەلكی ل وەلاتێن رەخۆدۆر و هەمووو جیهانێ ژی، پاشتر ژی ژ ئالیێ ئایینێ زەردەشتی ڤە هاتییەبكارئینان، هوسان بۆ مە دیاردبیت كو ئەڤ كەلایە نە دبنیاتدا كەلایەك بوویە وەك ژێدەرێن دیرۆكی ڤەدگێرن، بەلكی پەرستگەهەك بوویە و د هندەك سەردەماندا ژی وەك كەلایەك لەشكەری مفا ژێ هاتییەوەرگرتن، هەلشكافتن و دووچوونێن د دەمێن پاشتردا دهێنەكرن دێ بەرسڤا گەلەك پرسیاران ل دوور كەلایێ دەن.

## ژێدەر:


١. المائي، انور، ٢٠١١ ، الاكراد في بهدينان، ط ٣، مطبعة هاوار، دهۆك.

٢. ئاكريى، فائق سليم ابو زيد، ١٩٩٩، دليل ئاكري السياحي، مطبعة الجامعة، اربيل.

٣. ئاكريى، جمبد شكري، ٢٠٠٨ ، ئاكري (عقره) في العهد الملكي، مطبعة حاجي هاشم، اربيل.

٤. باقر، طه، ١٩٦٦، المرشد الى مواطن الاثار و الحضارة الرحله الثالثة (بغداد الموصل)، دار الجمهورية للطباعة والنشر، بغداد.

٥. البريفكاني بي كه س وحمزه حسين علي، ٢٠١١ نتائج التنقيبات الاثرية في قلعة ئاكري الموسم الاول.

٦. http://www.google.fr/imgres?imgurl=http٪3A٪2F٪2Fkaremlash٤u.c


## پەراوێز:

١. قەزا ئاكرێ ل سەردەمێ رژێما بەعسی سەر ب پارێزگەها مووسلێ ڤە بوو.

٢. باقر، ١٩٦٦، ٤٣.

٣. لمائي، ٢٠١١، ٧٧.

٤. ئاكرەیی، ١٩٩٩، ١٨- ١٩.

٥. البريفكاني و حمزة، ٢٠١١، نتائج التنقيبات في قلعة ئاكرى الاثرية الموسم الاول.

٦. ل سەردەمێ ئوسمانی کەڤالەکی ل هنداڤ دەرگەهی بوو ناڤێ والیێ مووسلی ئیسماعیل پاشای لێ هاتبوو نڤیسین.

٧. ئاكرەی، ٢٠٠٨، ٢٣.

٨. حەنیە: ئەو نکراندنا ژ سەرڤەیە کو د دیوارا یان بەرا را دهێتە کۆلان باهرا پتر جارا کووراتیا وێ دناڤبەرا (٣- ٥سم)، ژبلی کو هۆنەرەکێ ئاڤاکرنێ یە، جوانیێ ژی دەتە ئاڤاهی (نڤیسکاریا ئینسکلۆپیدیایێ).

٩. البريفكاني و حمزة، ٢٠١١، نتائج التنقيبات في قلعة ئاكرى الاثرية الموسم الاول.

١٠. البريفكاني و حمزة، ٢٠١١، نتائج التنقيبات في قلعة ئاكرى الاثرية الموسم الاول.

# پرۆژەیێن ئاڤدێریێ یێن شاهێ ئاشووری سەنحاریب ل كوردستانێ (دەڤەرا بەهدینان)

م/محەمەد عارف تاتار
وەرگێران: موسەدەق توڤی

خەلكێ وەلاتێ ناڤبەرا دو رووباران ب وێ چەندێ هاتینەنیاسین كو گەلەك پرۆژێن ئاڤدێری و جۆكێن ژ وان پرۆژان دەردكەڤن كولاینە، ئەڤە ژی ئەنجامێ پێدڤیاتیا وانا هەرە گرنگە ب ئاڤێ بۆ چاندنێ، توومارێن (المدونات) دیرۆكی وێ چەندێ دیاردكەن كو هزرا چێكرنا ڤان پرۆژێن ئاڤدێری دزڤریتەڤە سەردەمێ سومەریان، د هەیامێن جودا جودادا شاهێن وان سەردەمان بەردەوامی ب چێكرنا ڤان رەنگە پرۆژەیان دایە ل ئاستەكی د نڤیسینێن شاهـ حامورابی ئاماژە پێكرییە كو وی ژی ئەڤ كەنالێن ئاڤدانێ چێكرینە.

دەمێ ئاشووری ل پشكێن باكوورێ وەلاتێ ناڤبەرا دورووباران ب هێزكەتین شاهێن وان گرنگیەكا مەزن ب چێكرنا پرۆژێن ئاڤدێری و كولانا جووێن ئاڤێ و چێكرنا سكران و عومبارێن ئاڤێ ب تایبەت ژی ل چەرخێ ئاشووریێ نوو داینە.

دەمێ شاهـ سەنحاریب ل سەر تەختێ شاهینیا ئیمبراتوریا ئاشووری روونشتی گرنگییەكا مەزن ب كولانا جوكێن ئاڤێ و ئاڤاكرنا سكران دا، دەست ب كولانا جۆكەكا مەزن كر كو ب گرنگترین پرۆژێن ئاڤدێرییێن دیرۆكا كەڤن دهێتەنیاسین و ب ڤی پرۆژەی ئاڤ گەهاندە پایتەختێ خۆ نەینەوا و ئەڤ ژی ب رێكا ئەنجامدانا جووا كیسری ل ئەربیلێ و پرۆژێ رووبارێ گۆمل و كانیێن ئاڤێ یێن ژ چیایێن كوردستانێ ل دەڤەرا ئەتریش دزێن هەتا ژ وێرێ بگەهنە خەنس و گوندێن دەوروبەرێن وێ و ژ وێرێ ب رژێنە رووبارێ گۆمل و ب رێكا جووەكا مەزن ل سالا (٦٨١- ٧٠٤ پ.ز) ی گەهاندە پایتەختێ خۆ نەینەوا.

## مەرەم ژ ڤی پرۆژەی و گرنگیا وی:

ئەڤ پرۆژەیە دهێتەهژمارتن ب گرنگترین و مەزنترین پرۆژەیێن ل باكوورێ ئیمبراتوریا ئاشووری (كوردستانێ) هاتینەئەنجامدان و هاندەرێ سەرەكیێ شاهـ سەنحاریب (٧٠٤- ٦٨١) پ.ز پالدای بۆ چێكرنا ڤی پرۆژەی گەهاندنا ئاڤێ بوو بۆ پایتەختێ وی نەینەوا، ژبەركو ئەڤ شاهە پشتی مرنا بابێ وی سەرجونێ دووێ (٧٠٤) پ.ز ژ شاروكین (خورسبادا نها) كو گوندەكێ شەبەكانە و (١٨) كم ژ مەلبەندێ قەزا شێخان دوورە چوو پایتەختێ بابێ خۆ نەینەوا،

نڤیسینا بزماركی ل سەر ئێك ژ دیوارێن پرا جەروانە



ئاڤاهیێن ڤی باژێری نوژەنكرنەڤە و ب نەخشەبەر و پەیكەران خەملاند و گەلەك كارێن دیتر لێ كرن. هندی پەیوەندی ب كارێ ئاڤدانا چەم و بیستان و باخچەیان هەی سەنحاریبی سكرەك ل سەر رووبارێ خەوسەری چێكر و ئاڤا وی ب رێكا جووەكا مەزن كو ژ پێشیێ سكری دەردكەفت و مل ب ملێ رووباری بەرەف رۆژئاڤا دچوو هەتا دگەهشتە چەم و بیستانێن نەینەوا. پاشتر و ب مەرەما بەرفرەهكرنا ڤان چەم و بیستانان بەرەف تایێ رووبارێ گۆملی ل ئالیێ رۆژهەلاتیێ خەوسەری چوو ئاڤ ژ كانیێن بلنداهیێن چیایێن بەهدینان ل دەڤەرا ئەتریشێ و دەوروبەرێن وێ راكێشا هەتا دگەهیتە خەنس و باڤیان و ب رێكا چەند جووەكان ژ گۆملی گەهاندە خەوسەری و ب بیاڤێ (٥٠) میلان گەهاندیە نەینەوا.

د ڤی پرۆژەیدا ئەو گەلیێن كوير ئەوێن دكەتنە سەر ئاڤرێژا ڤی رووباری د رێكا وی دا بۆ خەوسەری ب چەند قەنتەرەكێن ژ بەری چێكری پێكڤە گرێدان و ئەو جوكە دسەر وانرا دەرباز كرن، هندی پەیوەندی ب ڤان قەنتەرانڤە هەی رێڤەبەریا شوینوارێن دهۆكێ ب هەڤكاری دگەل شاندەكێ زانكۆیا ئودینی یا ئیتالی ل سالا (٢٠١٢)ێ رووپیڤەكا مەیدانی ل سەر ڤان قەنتەران كر كو د بەلاڤەبوون ل سەر گوندێن (شیڤكێ) پاشتر (جەروانە) و (محموودان) و (شیڤشرین) هندیكە ئەڤ قەنتەرەیەنە ژ كەڤرێن مەزن و ب شێوازەكێ ئەندازیاریێ سەرنجراكێش هاتینەئاڤاكرن.

ل بەر رۆناهییا ئەڤا چوویی د شیاندا بێژین پرۆژێ ئاڤدانا نەینەوا د دو قوناغاندا دەربازبوویە: ل بەراهیێ

پارچێن بەری کو بەنداڤ ژێ هاتییە دروستکرن



جوو هاتییەکێشان و سکر هاتییەئاڤاکرن، د قوناغا پاشتردا ئەو ئاڤا ژ کانیێن ژ دەڤەرێن چیایێن بەهدینان دەردکەت ب رێکا وان جوویان یێن سەنحاریبی کێشاین گەهاندیە سەر رووبارێ خەوسەری.

## قەنتەرا جەروانە:

گوندێ جەروانە دکەڤیتە دووراتیا نێزیکی پێنج کیلومەتران ژ رۆژهەلاتێ قەزا شێخان (ئێسفنێ)، هندیکە ناڤێ وێ یە ناڤەك کوردییە، هەروەك د ژێدەرەکیدا هاتی ئانکویا ئاڤرێژا رووباری ددەت، لێ ب کوردی رامانا (چەروان)ئانکو جهێ چەرا گیانەوەران، ژبەرکو ل جەروانە ئاڤەکا بۆش هەبوو و د هەمان دەمدا دەڤەرەکا پڕی گیا و شینکاتی بوو لەوما جهەکێ باش بوو بۆ مەخەلا پەزی، ل دەهکا سیهان ژ سەدسالییا چوویی ئەڤ جهە وەك جهەکێ شوینەواری هاتییە راگەهاندن و د ژێدەرێن دیرۆکیدا ب زمانێ عەرەبی ب قەنتەرا جەروانە (قنطره جروانة)یان (عباره جروانه) دهێتەنیاسین و ب یەك ژ ناڤدارترین پرۆژێن ئیمبراتۆریا ئاشووری دهێتە هژمارتن.

ژ ئالیێ توبۆگرافیڤە ڕوویێ عەردێ ڤێ دەڤەرێ پێکهاتێن جودا جودایە ژ پێکهاتێن بەری و ئاخێ ل سەر روویێ عەردی و ئەڤ بەرە یێ قایمە ژ جۆرێ بەرێ جیری و کونکلومریتی و گیرهەیێن (نیشتەیێن) نووچێبووی و پێکهاتێن جیولوجییە. دەڤەر ب رەنگەکێ گشتی ژ نهالێن کویر و گر و بلنداهییان و ئاڤرێژێن جوو و رووباران پێکدهێت، ژبەر ڤێ چەندێ ژی ناچار بووینە ئاستەنگێن سروشتی ژ چیا و گران ببڕن و هندەك قەنتەرێن ئاڤێ یێن بچووك ئاڤاکەن داکو ژ لەهیێن وەرزی بپارێزن.

ئەڤ قەنتەرەیە ل گوندێ جەروانە ل سەر نهالەکێ ژ نهالێن تایێن رووبارێ گۆملی هاتییەئاڤاکرن داکو جوویەکا ئاڤێ دسەر وێ را دەربازبکەن و بگەهیننە رووبارێ خەوسەری، ئەڤ قەنتەرەیە د هەمان دەمدا هاتییەچێکرن یێ جوویەك ژ رووبارێ هاتییەکێشان ژبەرکو ئەو پشکەکە ژ وێ جوویێ، و ئەڤ جوویە نە

دکاری وی ئارمانجی بجهـ بینیت یێ بۆ هاتییەچێکرن ئەگەر قەنتەرا جەروانە نەهاتبا ئاڤاکرن.

درێژیا قەنتەرێ دگەهیتە نێزیکی (٣٠٠) مەتران و بلنداهیا وێ ژ بنێ کڤانێ قەنتەرێ (اسفل الطوق) بۆ سەرێ ئاڤاهی (٩) مەترن، هندیکە پانیا وی عەردییە یێ قەنتەرێ د نهالێدا گرتی(٢٢) مەترن و ل هەردو ئالیێن قەنتەرێ دیوار ب بلنداهیا ئاڤاهی هاتینە ئاڤاکرن و ئەڤ دیوارە ئاڤێ دناڤ جوویدا ڤەدگرن داکو نەدەرکەڤیتە دەرڤە، عەردێ بنیێ جوویێ ژی هاتییەداگرتن و هنوین ب ستووریا نێزیکی مەترەکی هاتییەچێکرن ئەڤە ژی ب وێ مەرەمێ کو نەهێلیت ئاڤ د ناڤ بەرانرا دەرکەڤیت.

ئەڤ قەنتەرەیە ژ (١٣) دەرۆکان پێکدهێت پانیا هەر دەرۆکەکی نێزیکی(١٥) مەترانە و تنێ دەرۆکەك ب پانیا (٣٠) مەتران ل نیڤێ هەیە کو دبیتە چوار دەرۆکێن کوور ل نیڤا نهالێ و ب چەند کڤانەکێن قوچەکی (مخروطي) هاتییەگرێدان وەسان دیارە کو ئەڤ کڤانا نیڤێ بۆ هندێ هاتییەچێکرن ئاڤا نهالێ د ژێر قەنتەرێرا بچیت.

سەنحاریبی ل هندەك کوژیێن قەنتەرێ هندەك نڤیسینێن بزمارکی (میخەکی) نڤیسینە تێدا هاتییە: ((سەنحاریب شاهێ دنیایێ، شاهێ ئاشوور ژ جهێن دوورڤە ئاڤا هەردو رووبارێن خازر بێن هەڤالجێمك- ئاڤا رووبارێ بولبولیا و ئاڤا بازێرێ خەنوسە و ئاڤا بازێرکێ ماکار و ئاڤا کانیێن چیان ژ راست و چەپ و هەموو ئالیان کۆمکرییە، و جوویەك کولایە کو دگەهیتە مێرگێن نەینەوا و ل هنداڤ نهالێن کوور پرەك (عبارە) ژ بەرێ سپیێ مەزن ئاڤاکرییە و ئەڤ پرە د سەررا دەربازدبیت.)) هەروەسان ل سەر گەلەك پارچە بەران ئەڤ دەستەواژەیە: ((بۆ سەنحاریبی دژڤریتەڤە، شاهێ جیهانێ شاهێ ئاشوور)) هاتییە نکراندن.

قەنتەرا جەروانە ژ نێزیکی دو ملیون پارچە کەڤرێن بەرێ کلسی- لایمسون ب قەبارەیێن جودا پێکهاتییە، ئەڤ قەنتەرەیە ب شێوازەکێ ئەندازیارێ بەرکەتی و ب هووری هاتییەچێکرن ب تایبەت ژی ئەو دیوارێن پالپشت و قەنتەرێن بانێن وان کڤانی و ب دروستی ژ کەڤران هاتینەچێکرن، دەمێ ڤەکولەرێ شوینەواران (جاکوبسون)ی ل سالا (١٩٣٢)ێ سەرەدانا جهێ جەروانە کری شیا وێ قەنتەرەیێ ببینتەڤە و دەست ب لێگەریانێ تێدا کر هەتا کو ب درووستی هەموویێ ببینیت.

## پرۆژێ ئاڤدێریێ دەڤەرا فەیدیێ:

ئەڤ پرۆژەیە دکەڤیتە سەر رێکا گشتیا ناڤبەرا دهۆکێ و مووسلێ ل رۆژهەلاتێ ناحیا فەیدیێ و (٨٠٠) مەتران ژێ دوورە، ژ زنجیرەکا گران پێکهاتییە و دنیڤا وانرا جووەك بەرەڤ دەشتێن دەوروبەران دهێت، ل ئالیێ رۆژهەلاتیێ وێ جوویێ هندەك پەیکەر هەنە برەنگێ راوەستای و یەك ل دووڤ یەك، ژ وانا سێ پەیکەرن کو ب شێوازەکێ بەرچاڤ ژ کەڤالەکی ب بلنداهیا (٥٠) سم و درێژیا(٤) مەتران هاتییەنەخشاندن و بلندیا هەریەك ژ وان نێزیکی (٢٥) سم، دبیت ئەڤ پرۆژەیە ژ ئالیێ شاهـ سەنحاریبی ڤە بۆ ئاڤدانا دەڤەرێ هاتبیتەبکارئینان، هەژیە بێژین ئەڤ پرۆژەیە پێدڤی ب رووپیڤەکا مەیدانییە بۆ وی جهی و د هەمان دەمدا پێدڤی ب لێگەریانێن شوینەواریە بۆ وان جهان.

زێدەباری وێ پرۆژەکێ دیتر ل گوندێ (بەنداوایێ) ئەوێ دکەڤیتە رۆژهەلاتێ ئەلقوشێ هەیە کو رێرەوا جوویەکێ لێ هەیە ئەو جویە هاتییەکولان و ب رێکا وێ ئاڤ ژ کانیێن سروشتیێن دکەڤنە ژوورێ گوندی و هەر ل قەدپالەکێ چیایی ل ژوورێ گوندێ وێنەیەکێ شاهی هاتییەنکراندن و خەلکێ گوندی دبێژنێ (شێر و مەلکێا) ئانکو گورگ و مەلك (شاهـ)، لێ ئەڤ پرۆژەیە هێژ پێدڤی لێگەریان و ڤەکولینێن بەرفرەهترە ب زانینا رێرەوێ ڤێ جوکێ و تشتێن دی یێن پەیوەندی پێڤە هەی.

ژ ئەڤا چوویی دیاردبیت کو د وی سەردەمیدا گەلەك کانیێن ئاڤا شرین ل دەڤەرا بەهدینان هەبوون، ڤێ چەندێ شاهـ سەنحاریب هاندایە ب مەرەما ئاڤدانا پایتەختێ ئیمبراتوریا ئاشووری نەینەوا وان پرۆژەیان ل دەڤەرێ چێکەت دا پایتەختێ ئیمبەراتۆریا ب ئاڤ بێخیت.

## ژێدەر:


١. احمد سوسة،تاريخ حضارة وادى الرافدين ج٢،بغداد،١٩٩٣.
٢. احمد سوسة، الرى والحضارة فى بلاد الرافدين، بغداد، ١٩٦٨.
٣. حسن احمد قاسم، رموز الالهة فى منحوتات بادينان، رسالة ماجستير (غ)، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، ٢٠٠٢.
٤. بيوار خنسى، ابرز المواقع الاثرية فى محافظة دهوك، دهوك ٢٠٠٩.
٥. طالب منعم حبيب، سنحاريب، رسالة ماجستير (غ) كلية الاداب- جامعة بغداد، ١٩٨٦.
٦. عامر سليمان، العصر الاشورى فى العراق،بغداد، ١٩٨٣.
٧. Jcobson،T.Lioyed،Sennachr ibs Aqueductat Jerwan،Chicago ،1935.
٨. Louis،L.o.،Assyrian Golonies in cappadcia،mouton،1970.

# دیرۆکا ئیسلامێ

## پشکا ئێکێ:
## ژ هاتنا ئیسلامێ
## هەتا شەرێ چالدیران

# ڤەگرتنا ئیسلامێ بۆ دەڤەرا بەهدینان

**پ.د. فەرسەت مەرعی**
**زانکۆیا زاخۆ کۆلیژا زانستێن مرۆڤایەتی**
**وەرگێران: موسەدەق تۆڤی**

بەهدینان دەڤەرەکا جوگرافیا بەرفرەهە هەموو پارێزگەها دهۆکێ یا نها ڤەدگریت، هندەك ژ ڤێ دەڤەرێ د ژێدەرێن مەسیحی و ئیسلامیدا ب (نوهەدری، بانوهەدرا و نوهەدرا) دهاتەناڤکرن، ئەڤ دەڤەرا جوگرافی دکەڤتە پشکێن باکوور و رۆژهەلاتێ نەینەوا و سەر ب نەخشەیێن مووسلێ ڤە بوون هەروەك جوگرافیناسێن موسلمانان ئاماژە پێکری. د راستیدا سنوورێ ڤێ دەڤەرێ ب شێوازەکێ جوگرافیێ هوور و رێکوپێك نەهاتبوو دەسنیشانکرن، هەتا کو ژێدەرێن دێرین سریانی هندی شیاین بزاڤێن دەسنیشانکرنا ڤی سنووری کربوون، دگەل ڤان بزاڤان ژی کەتبوونە د دژهەڤیێن جوگرافی و دیرۆکیدا، ژێدەرێن درەنگوەختێن دێران بزاڤکرن خۆ ژ ڤێ دژهەڤیێ دەربازکەن بەلێ نەکارین بەرسڤەکا دروست بۆ ڤان دژهەڤیان بدەن سنوورێ دەڤەرا بەهدینان (نوهەدرا) دەسنیشانکەن، ژێدەرێن ئیسلامی ژی هاتن و ل دووڤ هەمان ژێدەرێن سریانی چوون، بەلێ ئەو ژی کەتنە د ناڤ هەمان دژهەڤیێن دیرۆکی جوگرافیدا.

ب هەر رەنگەکێ هەبیت ل دەسپێکا هاتنا ئیسلامێ بۆ دەڤەرێ، بەهدینان ژ سنوورێ نهایێ ڤەزا دهۆکێ و ڤەزا زاخۆ پێکدهات، ئانکو رووبارێ دیجلە ئەو سنوورە بوو یێ دەڤەر ژ باشوور و رۆژئاڤا جوداکر، زنجیرا چیایێ گارە (چیایێن داسن) سنوورێ وێ یێ باکوور و چیایێ ئەلقوشێ (چیایێ باعەدرێ) سنوورێ وێ یێ رۆژهەلاتی پێکدئینا. لەوما ژێدەرێن دیرۆکا گشتی وەك ئەلبلازەری، ئیبنولئەسیر، ئەلتوبەری، ئیبنولخەلدون و یێن دی هند گرنگی هەیە کو رۆناهیێ بەردەنە سەر قوناغەکا گرنگ ژ دیرۆکا کوردان د چەرخێ دەسپێکا پەیدابوونا ئایینێ ئیسلامێ، هەرچەندە ڤەگێران (الروایات) د ڤی واریدا کێمن و تنێ هندەك ئاماژەپێکرنێن سەرپێ نە، بەلێ ڤەکۆلەر ب کۆمکرن و دووڤچوونا ڤان ڤەگێرانان و بەراوردکرنا وان ب یێن مینا وان، تایبەت یێن مللەتێن جیرانێن کوردان وەك فارس و ئەرمەن و ئاسووریان دکاریت بگەهیتە هندەك راستیيان و ب هاریکاریا وان راستیيان پەردەی ل سەر وێ شێلاتیێ راکەت ئەوا خۆ ب سەر کریارێن گرتنا ئیسلامێ (الفتوحات الاسلامیە) بۆ دەڤەرێن کوردان ب تایبەت دەڤەرا (نوهەدرا- پارێزگەها دهۆکێ یا نها و دەوروبەرێن وێ) و ئەو گۆرانکاریێن ئایینی جڤاکی و ئابووریێن دووڤدا هاتین دا گرتی، ئەڤ سەروبەرە ژی بەرپرسە ژ هەموو گۆرانکاریێن ب سەر پەسن و رەوشتێن عەشیرەتیێن وی چەرخی یێن جڤاکێ کوردی دا هاتین.

هەژبە بێتەگۆتن دیرۆکنڤیس ئەلتوبەری (ل ٣١٠ مش مریبە) پتر ژ هەموو دیرۆکنڤیسێن موسلمانان ئەڤ ڤەگێرانە ڤەگێراینە یێن پەیوەندی ب کوردانڤە هەین، چ یێن پەیوەندی ب دیرۆکا کوردان یا بەری ئیسلامێ ڤە هەی چ یێن دیرۆکا پشتی وێ. وێ ژی بەرچاڤ وەرگرین کو پتریا ڤەگێرانێن وی تایبەتن بۆ بەرخۆدانا کوردان بۆ ڤەگرتنێن ئیسلامێ بۆ هەردو دەڤەرێن ئەهواز و فارس ل سەردەمێ خەلیفێن راشدی و بزاڤێن پێگیرینەکرن ب فەرمان و پشتەرێبوونێ ل سەردەمێ ئەمەوی.

یا سەیر د ڤی واریدا ئەوە سازیەکا چەپرەوا کوردی پەرتووکاکا ڤەکۆلەرێ کورد ملا. ع. کردی بەلاڤکریە[1]، دگەل دووریا زانیارێن د ڤێ پەرتووکێدا هاتین ژ هەموو وان زانیارێن زانستیێن د ژێدەرێن ئیسلامی و رۆمانی و سریانی و ئەرمەنیدا هاتین، ئەم ب باش دبینین دەقێ تایبەت ب بەلاڤبوونا ئیسلامێ ل کوردستانێ ژ وێ پەرتووکێ بەرچاڤبکەین کو تێدا هاتیە: موسلمانێن هێرشکەر ل سالا ١٤ مشەختی بەرامبەری ٦٣٦زایینی و ل سەردەمێ عومەر کورێ خەتابی هێرش ئینا سەر کوردستانێ، کوردان ل چیایێن خۆیێن ئاسێ و سەخت دەست ب بەرخۆدانێ بەرامبەری هێرشا وان کر و بەرەف پاش[2] زڤراندنەڤە، پاشتر موسلمانان دوبارە هێرشکرەڤە سەر کوردستانێ جارەکا دی کوردان ئەو شکاندن و بەرەف پاش زڤراندنەڤە، وەسان دیارە یا گران بوو ل بەر موسلمانێن هێرشکەر دەست ب سەر چیایێن کوردستانێدا بگرن، لەما ب باش دیت گرتنا کوردستانێ بۆ دەمەکێ دیتر گیروبکەن، د ڤی دەمیدا کورد ل سەر ئایینێ دووانیێ یێ (الثنائی) زەردەشتی بوون، ئانکو باوەری ب دو خوداوەندان دئینا، د ڤێ قۆناغێدا ئانکو قۆناغا بزاڤێن ڤەگرتنا کوردستانێ و خۆئاسێکرن و پشتەرێبوونا خەلکێ وێ دا، تشتەکێ هەژی سەرنجراکێشانێ رووداا، ئەو ژی ئەو بوو دەمێ کورد ل ئایینێ نوو ئایینێ ئیسلامێ ئاگادار بووین، ئەو ئایینێ پشتەڤانیێ ل کەسێ بێ دەستەلات و هاریکاریا بەلەنگازان دکەت، ب دادپەروەریێ و وەکهەڤیێ سەرەدەریێ دگەل خەلکێ خۆ دکەت، کوردان د ناڤبەرا خۆدا گەنگەشە ل سەر ڤێ چەندێ کر و بریاردان هندەك ژ موسلمانێن هێرشکەر بینە ناڤ خۆ دا ڤی ئایینێ نوو ب وان بدەتە نیاسین، ئەڤ چەندە هاتەکرن، پرانیا کوردان ب ڤی ئایینیڤە بەندەوار بوون، ژبلی هژمارەکا کێم کو رازی نەبوون دەست بەردەن ژ ئایینێ باب و باپیرێن خۆ بەردەم ئەڤێن دی باوەری ئینا و موسلمان بوون، ئەڤ چەندە بوو ئەگەرێ ناکۆکیێ د ناڤبەرا ئەوێن موسلمان بووین و یێن نەموسلمانبووین، هەر زوو ئەڤ ناکۆکیە دژوار بوو و پاشتر بوو ئەگەرێ شەرەکێ ناڤخۆیی، د ئەنجامدا کوردێن موسلمانبووین ئەوێن نەموسلمان بووین شکاندن، ئەڤێن داویێ پەنابرە بەر چیایێن ڤەدەر و ئاسێ ئەڤە ئەون ئەوێن ب کوردێن ئێزدی یان تیرەیا ئێزدی دهێنەناسکرن...))[3]

## ڤەگرتنا ئیسلامێ بۆ دەڤەرێن کوردان ل مووسلێ و دەڤەرێن باکوورێ وێ:

جزیرە و ئەرمەنیا دو هەرێمن کورد تێدا هەنە و هندەك دەڤەرێن وان جهێ بنیاتی و رەسەنێ ئاکنجیبوونا کوردانن[4]، ئەڤە وێ چەندێ ناگەهینیت کو نەتەوەیێن دن وەك ئەرمەن و سریان و عەرەب ل ڤان دەڤەران دگەل کوردان ناژین[5]. ل ڤێرێ دەمێ ڤەکولەری بڤێت ئەو دەڤەرێن کوردان ژ مللەتێن دی جودا دکەن دەسنیشانبکەت دێ ئاستەنگ کەڤنە بەر سنگێ وی، ژبەرکو ژ ئالیێ زانستیڤە هوورینی د نڤیسینێن دیرۆکنڤیس و جوگرافیناسێن بەرێدا نینە، ئەڤە ژی هەتا ئاستەکێ مەزن ژ دەڤەرێن رۆژهەلاتێ مووسلێ و پشکێن رۆژهەلاتێ رووبارێ دیجلە یێن بەرامبەری باژێرێ جزیرێ دگریت[6].

ب هەر رەنگەکێ هەبیت رۆمێن بیزەنتی ئەوێن ژ سالا ٦٢٧ز ڤە دەست ب سەر پشکەکا مەزنا دەڤەرا جزیرێ دا گرتی[7] دەمێ هەست ب سەرکەتنێن مەزنێن لەشکەرێ موسلمانان ل هەر دو بەرۆکێن

عیراقێ و شامێ کری دەست ب بەرهەڤیان کرن و هێزێن خۆیێن پێکهاتی ژ شەرڤانێن رۆم و خەلکێ مووسلێ و هەڤپەیمانێن خۆ ژ عەشیرەتێن عەرەبێن ئەباد و تەغلب و نەمر کۆمکرن، نووچەیێن ڤان لەشکەرکێشیێن رۆمان گەهشتنە سەر لەشکەرێ موسلمانان سەعد کورێ ئەبا وەقاصی وی ژی ب نڤیسینەکێ خەلیفە عومەر کورێ خەتابی ئاگادارکر و خەلیفەی ژی د بەرسڤێدا نڤیسی: (( عەبدوللا کورێ موعتەمی بهنێرە شەرێ وان،[8] بلا رەبعێ کورێ ئەلئەفکەلی ل پێشیا لەشکەرێ وی بتن،[9] و عەرفەجە کورێ هەرسەمەی[10] سەرکێشیا سوارەیان بکەت...))[11].

عەبدوللا کورێ موعتەمی دگەل پێنج هزار شەرڤانان کەتە رێ و د رێکا ئالیێ چەپێ یێ رووبارێ دیجلە را ب چوار ڤۆناغان و دچوار رۆژاندا ل سالا ١٦ مش گەهشتە تکریتێ[12]، پشتی کو بۆ دەمێ چل رۆژان دوورپێچدای و د وان چل رۆژاندا بیست و چوار هێرش برنە سەر[13]، عەبدوللا کورێ موعتەمی پەیامەك بۆ وان عەرەبان یێن دگەل لەشکەرێ رۆمێ شەرێ موسلمانان دکر هنارت، د پەیامێدا ژ عەرەبان خواست ئێدی بەس پشتەڤانییا رۆمان بکەن و وەرن بگەهنە رێزێن برایێن خۆ عەرەبێن موسلمان ل عیراقێ، ئەو عەرەبە ل سەر داخوازا وی رازیبوون و داخوازا ئێمناهیێ و پاراستنا سەر و مالێن خۆ ژێکرن، وی ژی د بەرسڤێدا گۆتێ ئەگەر هوون راست دبێژن شەهدە بدەن و باوەریێ ب وێ چەندێ بینن یا ژ نك خودێ هاتی هەروەك دەق دبێژت:**(ان کنتم صادقین فاشهدوا ان لا اله الا الله و ان محمداً رسول الله، و اقروا بما جا من عند الله...)**[14]. ئەوبوو موسلمانان دەڤ ب گۆتنا ئەللاهو ئەکبەرڤە هێرش بر و چوونە د باژێریدا، عەرەبێن وێرێ ژی دگەل وان ئەللاهو ئەکبەر گۆتەڤە و مووسلمان بوون و هەروەسان (کوردێن شەهارجە)[15]رۆلەك مەزن د هاریکاریا موسلماناندا هەبوو بۆ گرتنا باژێرێ تکریتێ[16]، رۆمی ناچار بوون د وان دەرگەهێن باژێری را یێن دکەڤنە هنداڤ رووبارێ دیجلە برەڤن، بەلێ ل ڤێرێ ژی ژ پشت و پێشڤە کەتنە بەر شیرێن

لەشکەرێ موسلمانان و تنێ ئەو ژێ رزگاربوون یێن موسلمان بووین و ب ڤی رەنگی باژێرێ تکریتێ ژ ئالیێ لەشکەرێ موسلمانڤە هاتەڤەکرن.

هەژییە بێتەگۆتن کو ل باژێرێ تکریتێ گۆرێ سەحابیەکی ب ناڤێ جاگیرێ کوردی هەیە، و وەسان باوەری دهێتەکرن کو ئەو د ناڤ لەشکەرێ موسلمانان بوو یێ بۆ گرتنا دەڤەرێن کوردان هاتیبەهنارتن، ئەڤە ژی ل سەر وی بنیاتی کو وی سەحابیێ کورد شارەزایی د وان رێك و کۆرە رێکێن چیایێن سەختێن وەلاتێ خۆدا هەبوو، وەسان دیارە د دەمێ گرتنا تکریتێ دا هاتیبەشەهیدکرن. دبیت ناڤێ جاگیر ژ (جابان) هاتبیت، هەژییە بێتەگۆتن د ژێدەرێن دیرۆکیێن دەربارەی ژیانا سەحابیێن پێغەمبەری (س) هاتینەنڤیسین ئاماژە ب (جاگیر) ی نەهاتییەکرن، بەلکی وەك سەحابی ئاماژە ب ناڤێ (جابان) یێ ناڤدار ب (ابو میمون) هاتییەکرن وەك پەرتووکا (اسد الغابة في معرفه الصحابة) نڤیسینا (ابن الاثیر)ی ئەوێ ل سالا ١٣٠مش مری، هەروەسان پەرتووکا (تجرید اسماء الصحابة) یا (الذهبي) ئەوێ ل سالا ٨٤٦مش مری، هەروەسان پەرتووکا (الاصابه في تمییز الصحابه) یا (ابن حجر العسقلانی) ئەوێ ل سالا ٨٥٢مش مری[17].

خەلیفە عومەری (ر) فەرمان دابوو سەعدی ئەگەر وانا باژێرێ تکریتێ گرت، فەرمانێ بدەتە عەبدوللا کورێ موعتمی بەرێ رەبعێ کورێ ئەلئەفکەلێ عنزی بدەتە (الحصنین)، عەبدوللای ژی ب مفا وەرگرتن ژ دەمی بلەز بەرێ وی دا وێرێ و ژێ خواست لەزێ ل چوونێ بکەت هێژ نووچەیێن سەرکەتنا وان نەگەهشتینە هەردو ئاسێگەهان (الحصنین) و بەرهەڤیێن پێدڤی بۆ بەرسنگگرتنا هاتنا لەشکەرێ موسلمانان نەگرتینە بەر[18].

تەغلب و ئەیاد و ئەلنەمر دگەل رەبعێ کورێ ئەلئەفکەلی بوون، دەمێ نێزیکی (الحصنین) بووین، ب کۆمێن بچووك بچووك چوونە د ناڤدا داخوازا سەرکەتن و پشتگیریێ ل سەر موسلمانان کرن دا ب ڤێ چەندێ باوەریێ بۆ خەلکێ (الحصنین)

چێکەن و دەرگەهان ڤەکەن، هێزێن ڕەبعێ کورێ ئەلئەفکەلی بەرەف ناڤدا هاتن و (الحصنین) گرتن، و داخوازا پێگیریێ ب ئاشتیێ کرن، ئەوێن ل دووڤ داخوازێ هاتین پێگیری کرن و یێن ل دووڤ داخوازیێ ژی نەهاتین ڕەڤین، دەمێ عەبدوللا کورێ موعتەمی هاتی ژ کەسێن ڕەڤی خواست بزڤرنەڤە سەر زیمەتێ*ئەو ژی ل دووڤ بانگێ وی هاتن، و پاشتر ڕەبعێ کورێ ئەلئەفکەلی کرە بەرپرسیارێ مووسلێ و عەرجەفە کورێ ئەسلەمەی بەرپرسیار ژ خویکا (خەراج)ا وێ[١٩].

خەلیفە کورێ خەیاتی دەربارەی ڤەگرتنا مووسلێ ڤەگێرانەکا جودا ژ یا ئەلتەبەری ڤەگێرایە کو تێدا دبێژیت: ((عومەری بەرێ عەیازی دا مووسلێ و باژێر گرت، عەتەبە کورێ فەرقدی[٢٠] هێلا ل سەر یەك ژ هەردو ئاسێگەهان و هەموو ئەو دەڤەر ب زۆری ڤەگرتن ژبلی ئاسێگەهەکێ، د ئەنجامدا خەلکێ وی دگەل وی پێکهاتن و ئەڤە ل سالا هەژدێ مشەختی بوو))[٢١] ئیبن خەلدون ڤەگێرانا ئیبن خەیاتی پشتراستدکەتەڤە کو عەیازێ کورێ غەنەمی عەتەبە کورێ فەرقەدی هنارتییە داکو والیتیا(دەستەلاتداریا) مووسلێ بگریتەدەست[٢٢]، بەلێ ڤەگێرانا وی و ڤەگێرانەکا ئەلبلازەری تێکەلی هەڤکرینە دەمێ دبێژیت: (( ئەبا عوبەیدەی بەرێ عەیاز کورێ غەنەمی دا وێرێ (مەرەما وی وەلاتێ جزیرێ یە)، ل سالا هەژدێ مشەختی دگەل پێنج هزار شەرڤانان... بەرەف وێرێ چوو... سەمیسات و سرۆج و ڕەئس کێفا گرتن، سەرا مەنبەجێ پێکهاتن، پاشتر ئامەد و میافارقین و کفر توسا و پاشتر ژی نسێبین و مێردین و مووسلێ ویەك ژ ئاسێگەهێن وێ گرتن ...))[٢٣].

هەژیە ل ڤێرێ بدەینەزانین کو ئەلواقدی د دیرۆکا خۆدا دبێژیت: (( عەیاز کورێ غەنەمی ب لەشکەرێ خۆڤە هات هەتا گەهشتییە ئیسماعیلیات، عومەر کورێ جوندی هنارت دا هێرشێ بکەتە سەر مووسلێ و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە، ئەو چوو و هێرشبرن و کەلەپویرت ئینان و دەنگێ هاواران بلندبوو و لێ بدەنگهاتن و کەتنە شەرێ وی و کەلەپویرت ژێ ستاندنەڤە وی ژی شەر کر هەتا هاتییەکوشتن و ل ئالیێ ڕۆژئاڤا هاتەڤەشارتن، دەمێ عەیازی ئەڤ چەندە زانی ژ ئیسماعیلیات[٢٤]دەرکەت و بەرەف مووسلێ چوو و خەلکێ وێ ب هژمار و چەکێ خۆڤە بەرسنگێ وی گرت، خالدی ب لەشکەرەکیڤە هێرش برە سەر وان و ب سەرێکدا پەلخاندن وی دەمی ژی شویرەهە نەبوو بەرسنگێ وی بگریت و ب هێزا شیری گرت و ل سالا ٢٠مش عەشیرەتا خەزرەجی لێ ئاکنجیکرن))[٢٥].

ب بەراوردکرنا ڤان هەرسێ ڤەگێرانان ڤەکۆلەر دکاریت بێژت: مووسل دوجاران ژ ئالیێ لەشکەرێ مووسلمانانڤە هاتییەگرتن، جارا یەکەم ل سالا ١٦مش ل دووڤ ڤەگێرانێن ئەلتوبەری[٢٦] و ئیبن ئەلئەسیر[٢٧]. دووەمین جار ل سالا ٢٠مش هەروەکی د دەڤێن ئەلواقدی[٢٨] و ئەلبلازەری[٢٩]و ئیبن خەلدونی[٣٠]ئاماژە پێ هاتییەکرن، دڤێت وێ ژی بێژین کو گرتنا دووێ هات پشتی کو خەلکێ باژێری ژ وێ پەیمانێ پەشیمان بووینەڤە ئەوا د دەمێ گرتنا یەکەما سالا ١٦مش دایە موسلمانان، بێی کو بچینە د ناڤ هەڤدژێن ناڤبەرا دیرۆکنڤیسان دەربارەی هەردو گرتنان[٣١]. یەکەمین جار ئاسێگەهێن مووسلێ هەردو ب ئاشتی و پێکهاتن هاتبوونە گرتن[٣٢]، بەلێ دووەمین جار ئاسێگەها ڕۆژهەلاتی ب کۆتەکی هاتەگرتن بەروڤاژی د گەل یا ڕۆژئاڤایێ مووسلێ کو ب ئاشتی هاتەگرتن[٣٣]. بەلێ هندی پەیوەندی ب گرتنا هەموو هەرێما جزیرێ ب تایبەت دەڤەرێن کوردان ل پشکێن باکوور و ڕۆژئاڤا، دیرۆکنڤیسێن موسلمانان د پێکهاتینە کو هەموو دەڤەرێن جزیرێ و باژێرکێن وێ ل سەردەستێ سەحابی عەیاز کورێ غەنەمێ فەهری هاتینەڤەگرتن[٣٤].

## گرتنا بەهدینان — نوهەدرا:-

دەڤەرێن دکەڤنە ناڤبەرا جزیرا بۆتان ژ ئالیێ ڕۆژئاڤایڤە و دەریاکێ ئۆرمیێ ژ ئالیێ ڕۆژهەلاتڤە ب ناڤەندێن ڕەسەنێن ژیانا کوردان دهێنەنیاسین و هیچ

مللەتەكی دی ژ مللەتێن جیران هەڤركییا وان ل سەر ئاكنجیبوونێ ل ڤان دەڤەران ناكەت، ئەو ڤەگێرانێن تایبەت ب ڤەگرتنا ڤان دەڤەران ژ ئالیێ موسلمانانڤە د كێم و دەگمەنن، دكارین بێژین ئەلبلازەری یێ د ڤەگێرانێن خۆدا ئاماژە ب ڤان ناڤەندێن كوردان (مەلبەندێن كوردان)[35]كری و دەمێ كریارا گرتنێ دەسنیشانكری و ئاماژە ب وێ چەندێ ژی كرییە كو ئەڤ دەڤەرە ب كوتەكی هاتینەگرتن[36]، بەلێ ئەلتوبەری ب یەكجاری ئاماژە ب وێ چەندێ نەكرییە، تنێ هندە ئاماژە ب ڤەگێرانەكێ كرییە كو عەتەبە كورێ فەرقەدی میراتیا شەری و وەرگرتنا خویكان ل سالا ١٧ مش دایە دەست عەرفەجە كورێ هەرسەمەی، هەروەسان د ڤی واریدا ئەلتوبەری دگەل ئەلبلازەری یەكباوەرە كو عەتەبەی دەڤەرا ئازەربێجانێ یێن پشتی وی ڤەگرتینە پشتی كو شارەزور گرتی، ژبەركو ئەو دەڤەرە دكەڤیتە ناڤبەرا مووسل و ئازەربێجانێ و دەڤەرەكا خۆرۆ كوردی یە[37].

ئەلبلازەری دبێژیت: عومەر كورێ خەتابی عەتەبە كورێ فەرقەدێ سەلەمی كرە والیێ مووسلێ، خەلكێ نەینەوا شەرێ وی كر، وی ژی ب زۆری ئاسێگەها رۆژهەلاتێ وێ گرت و ژ رووبارێ دیجلەی دەرباز بوو دگەل خەلكێ ئاسێگەها دی پێكهات یێ بڤێت باركەت باركەت، هندەك دێر ل مووسلێ دیتن دگەل خەلكێ وان پێكهات كو جزیێ بدەن، پاشتر دەڤەرا مێرگ (ئەلمەرج)[38]و گوندێن وێ و عەردێ باهەزرێ[39] و باعەزرێ[40]و حبتون[41] و حەیانە[42] مەعلە[43]و داسیر[44]و هەموو جهێن كوردان ڤەگرتن[45]و هاتە بانعاسا[46] ژ حزە ئەو ژی گرت، پاشتر هاتە گرێ شەهارجە (تل الشهارجە) [47]و ئەلسلق كو ب بەنی ئەلحور كورێ صالح كورێ عیبادەیێ هەمەدانی[48] دهێتەناسكرن مەزنێ خەلكێ مووسلێ ئەڤە هەموو گرتن و ب سەرواندا سەركەت))[49]، ئەلبلازەری د بەردەوامییا ڤەگێرانا خۆدا دبێژیت: (( عەتەبە كورێ فەرقەدی (الطیرهان) [50] و تكریت ڤەگرتن و خەلكێ ئاسێگەها تكریتێ ژ سەر و مالێ وان دلنیاكرن، بەرەف وارێ (كورە) باجرمێ چوو، پاشتر بەرەف شارەزورێ دا رێ)).

هەروەسان عەتەبە بەرەف بلنداهیێن رووبارێ زێیێ مەزن دارێ و دەڤەرێن پشت دامیر ئەوێن ب رزان[51]دهێنەناڤكرن ڤەگرتن و شیا كەلا وان د رۆژا جەژنا واندا بگریت و د بێ چەكبوون[52]، ئەلبلازەری د ڤەگێرانا دووێ دا مژارا گرتنا شارەزورێ ئەوا د ڤەگێرانا ئێكێ دا دەسپێكری تەواودكەت كو والیێ حەلوانێ سەحابی عوزرە كورێ قەیسی ل سەردەمێ خەلیفە عومەر كورێ خەتابی بۆ ڤەگرتنا شارەزورێ هات بەلێ بدەستڤە نەهات، بەلێ عوتبە كورێ فەرقەدی هێرش برە سەر و گرت پشتی شەرەكی وەك پێكهاتنا حەلوان، مووسلمانان د ڤان رووداناندا گەلەك نەخۆشی ژ دووپشكان دیتن[53]. عەتەبە كورێ فەرقەدی د هێرشێن خۆدا یێ بەردەوامبوو و بناڤ دەڤەرێن كورداندا چوو و شیا كورتی درأباذ[54] و صامغان[55] بگریت پشتی كو هژمارەكا مەزن ژ كوردان و موشریكان كوشتین ژبەركو بەرخۆدان دژی هێرشێن موسلمانان كربوو، بەلێ د سەر هندێ را عەتەبە كورێ فەرقەدی ل سەر دانا جوزیێ و خەراجێ دگەل وان پێكهات و ب مەرجێ نە كوشتنێ بكەن و نە جڤینان بدەن و نە رێكان ل بەر موسلمانان بگرن[56].

پشتی كو عەتەبە كورێ فەرقەدی بناڤ دەڤەرێن كورداندا چووی و گرتین دەربارەی سەركەتنێن خۆ بۆ خەلەیفە عومەری نڤیسی: ( ب ڤەگرتنێن خۆ ئەز گەهشتیمە ئازەربێجانێ)) ئەو بوو خەلیفەی ئەو كرە والیێ ئازەربێجانێ و هەرسەمە كورێ عەرجەفەی هێلا ل سەر مووسلێ[57].

پشتی كو عەتەبە كورێ فەرقەدی والیەتیا ئازەربێجانێ گرتیەدەست شیا باژێرێن ئورمیە[58] و ئەلحور[59] و خویێ[60]و سەلماس[61]ژی بگریت و بێخیتە ژێردەستەلاتێ دەولەتا ئیسلامێ.

د راستیدا ڤەگێرانا ئەلبلازەری تاكە ڤەگێرانە ب بەرفرەهی دەربارەی گرتنا ناڤەندێن كوردان ئاخفتبیت و تاكە ڤەگێرانا هەڤدژ دگەل وێ ڤەگێرانا ئەلتوبەری یە ئەوا دبێژیت: ((عەتەبە كورێ فەرقەدی والیتیا

شەر و خەراجا میرگەها مووسلێ ل سالا ١٧مش وەرگـرت))[١٢]ب مەرەما سەرراستکرنەکا ناڤبەرا ڤان هەردو ڤەکێرانان ڤەکۆلەر د وێ باوەرێدایە کو یەکەمین گرتنا هەردو ئاسێکەهێن (مووسل و نەینەوا) ل سالا ١٦مش هاتەئەنجامدان[١٣]، بەلێ راوەستیانا هێرشان ل بەر دەرازینکا هەردو ئاسێکەهان و پێشڤەنەچوونا وان بۆ دەڤەرێن جیرانێن پڕی عەشیرەت و ئاسێکەهێن کوردان، بوونە ئەگەرێ سەرهلدانا هەردو ئاسێکەهان بەرامبەری وێ پەیمانێ ئەوا دگەل عەبدوللا کورێ موعتەمی مووڕکری، ئەڤە ژی د ڤەکێرانا ئەلبلازەری دا دیاردبیت دەمێ دبێژیت: ((ئاسێکەهێا رۆژهەلاتی ب زۆری گرت ژ دیجلەی دەربازبوو و خەلکێ ئاسێکەهێا دیتر ل سەر دانا جزیەیێ دگەل وی پێکهاتن...))[١٤].ل ڤێرێ پیدڤی کر سەروبەر وەك خۆ لێ بێتەڤە وەك دامەزراندنا عەتەبە کورێ فەرقەدی ب والیێ مووسلێ، وی ژی سەرژنوو گرتەڤە و پاشتر دەست ب هێرشێن بەرفرەهکر بۆ سەر جهێن کوردان ل دەڤەرێن چیایی هەتا گەهشتیە شارەزوری[١٥].

ب هەر رەنگەکێ دیتر بیتن ئاستەنگەکا دیتر دکەڤیتە بەر سنگێ ڤەکۆلەری، ئەو ژی ئەوە کو هەردو ڤەکێران ل سەر سالا دانانا عەتەبەی والیێ مووسلێ ژهەڤجودانە یەك دبێژیت سالا ١٧مش و یێ دی دکەتە سالا ٢٠مش، بۆ چارەسەرییا ڤێ پرسگرێکێ ڤەکۆلەر وەسان دبینتن باوەرییا خۆ ب ڤەکێرانا ئەلبلازەری بینین ژبەرکو ئەو تایبەتمەندە ب شەرێن وی سەردەمێ و بەری ئەلتوبەری ژیایە و ئەلتوبەری دیرۆك ب گشتی دنڤیسی، ژ ئالیەکێ دیترڤە ئەلبلازەری ناڤێ جهێن کوردان ب ئاشکرایی دیاردکەت و ئالیێ وانێ جوگرافی وەك دووری و نێزیکییا وان ژ مووسلێ بەرچاڤدکەت، یا کو پتر پشتەڤانیێ ل ڤێ بۆچوونێ دکەك ڤەکێرانەکە ئەوا دیرۆکنڤیسێ سریانی ئیلیا بەرشینایا د ناڤ رووداێن سالا ٩٥١ یونانی بەرامبەری ١٩مش ئاماژەپێکری و تێدا دبێژیت: (... عەبازی ئامەد گـرت.. پاشان تورعابدین[١٦]و قردێ[١٧] گرتن.. ئەڤان هەموو رووداێن ل سالا نوزدێ مشەختی و رۆژێن موحەرەما بیستێ مشەختی روودا...)[١٨].

ب هەر رەنگەکێ هەبیت عەیاز کورێ غەنەمی یەکەمین سەرکردێ موسلمانانە ب ناڤ کووراتییا خاکێ کوردستانێ دا هاتی، ب تایبت ژی ئەو ب هێرشێن خۆ گەهشتیە دەڤەرێن کوردی یێن سەر ب جزیرا بۆتانڤە، ئەوا د چەرخێ بەراهیێ ئیسلامێدا ب (جزیرە ابن عمر) هاتییەناڤکرن، ل دووڤرا ل سالا ١٩مش رێکا زۆزانان هات و داخوازا پێکهاتنێ کر و بەرهەڤییا خۆ دیارکر بۆ دانا جزیێ دیارکر[١٩]، دەڤەرا قردی کەڤنترین دەڤەرێن نیشتەجێبونا کوردانە و گرۆڤێ ڤێ چەندی ژی کو بەر ب هزاران سالان ژ هاتنا ئیسلامێ کورد ل دەڤەرێ ژیاینە[٧٠].

ل ڤێرێ پرسیارەك دهێتە پێش گەلۆ چما ب رەنگەکی دەسنیشانکری دەڤەرا بەهدینان ب ئاشتی هاتەگرتن..؟ د بەرسڤا ڤێ پرسیارێدا دبێژین: ئەڤ دەڤەرە سەر ب ئیمبراتوریا رۆمانی (بیزەنتی)بوو و ئایینێ وێ مەسیحی بوو، د ژیارەکا ژێردەستی و نەخوشدا دژیا، ژبەرکو دەمێ پێشەنگێن لەشکەرێ موسلمانان گەهشتین و دگەل خۆ نیشانێن ئازادی و تەناهیێ هەلدگرتن، لەوما ژی هەرزوو جڤاکێ کوردی پێشوازی لێکر و هاتە دریژێن ئیسلامێدا، ئەڤە ژی بەروڤاژی بوو دگەل دەڤەرێن دیترێن کوردان ئەوێن ژێر دەستەلاتێ ئیمبراتوریا ساسانی کو ئایینێ وان زەردەشتی بوو و بەرخۆدان بەرامبەری هاتنا ئیسلامێ کر و پاشتر ب زۆری موسلمان بوون.

هەژییە ل ڤێرە ئاماژە ب بۆچوونێن ڤەکۆلەرەکێ باکوورێ کوردستانێ ب ناڤێ میرئال زیلانی بکەین یێ کو د سمینارێن خۆیێن ل پارێزگەها دهۆکێ دەربارەی گەهشتنا هێرشێن لەشکەرێ ئیسلامێ بۆ دەڤەرا بەهدینان و گرتنا دەڤەرێ پێشکەشدکرن دگۆت: دەمێ سەحابیێن هێرشبەر گەهشتینە دەڤەرا دکەڤیتە ژووریێ مووسلێ ب تایبەت دەڤەرا چیایێ گارەیێ پڕی دارودرەخت و بەرێ فێقی و کانی و رووبار وان وەسان هزرکر کو ئەو یێ ل بەهەشتا د قورئانێ دا ئاماژە پێ هاتییەکرن، مانديبوون و رێکا دوور هزر و بیرێن وان ژ دەستدابوون و ب هزرا

واندا نە دهات کو ئەو یێ ل پارچەکێ ژ کوردستانا جوان، د ئەنجامدا پەیوەندیێن وان دگەل خەلیفێ راشدیێ دووێ عومەر(ر)ی هاتنە برین و خەلیفەی هێزەکا سەحکرنێ (الاستطلاع) دووڤرا هنارت دا کو تشتەکی ژ سەرئەنجامێ وان و سەروبەرێ دەڤەرێ بزانیت، دەمێ هەردو هێز گەهشتینە هەڤ دیار بوو نە وەسان بوو کو سەحابییان هزر لێکری بەلکی ئەو یێن بووینە دیلێن سروشتێ جوانێ کوردستانێ و بۆ رۆژێن دووڤرا هێژ گەلەك ئەرك و كار ل پێشیا وانن[71].

ڤەکۆلەر د وێ باوەرێدایە کو ئەوا میرئال زیلانی دەربارەی هاتنا ئیسلامێ بۆ دەڤەرێ و گرتنا دەڤەرا کوردان ژ ئالیێ دەولەتا موسلمانانڤە گۆتی، نە ل سەر بنیاتەکێ زانستیێ پشتگەرم ب ژێدەرێن دیرۆکا ئیسلامی و نە ئیسلامی ژ رۆمانی و ئەرمەنی یان گەهشتیە وان بۆچوون و سەرئەنجامان، بەلکی ئەنجامێ هندەك بۆچوونێن ئاڤاکریيە ل سەر پاشخانەکا ئایدیولۆژی و بریارێن پێشدەم یێن وی ب خۆ وی ل جەم خۆ ب راستییێن زانستی داینەنیاسین بێی کو دیرۆکنڤیسەکێ کەڤن یان نوو ئاماژە پێکربیتن.

وەسان دیارە ئەڤ رەنگە بۆچوونە و یێن دی ب هیچ رەنگەکی خزمەتا کاروانێ پێشڤەچوونا دیرۆکیێ گەلێ مە ناکەن، بەلکی پێدڤییە دیرۆکا خۆ ل سەر بنیات و بنەماییێن پشتگەرم ب ژێدەرێن دیرۆکییێن رەسەن یێن هەموو مللەتێن جیران ژ عەرەب و فارس و رۆمانی و ترك و سریان و یونان و ئەو شوینوار و هەلکۆلین و کەلەپۆرێ د بیرا خەلکیدا هاتییەپاراستن بنڤیسینەڤە، دا کو نڤشێ نوویێ کوردان ژی جهێ خۆ د ناڤ گەلاندا بکەت وە گەلەکێ خۆدی دیرۆك و شارستانییەکا دیرین کو ج ژ خەلکێ دی مللەتێن دێرینێن دەڤەرێ کێمتیر نینە.

## ژێدەر و پەراوێز:

١. ملا. ع. كردي، كردستان و الاكراد، المكتبة التقدمية الكردية (١٣)، دار الكتب، رابطة كاوه للثقافة الكردية، الطبعة الاولى، بيروت، ١٩٩٠

٣. ملا. ع. كردي، كردستان و الاكراد، ص ٧٤- ٧٥ ؛ ڤێ چەندێ دگەل ئەوا د پەرتووکا (الاكراد فی بهدينان)دا هاتی بەراورد کە کو تێدا هاتییە: (( ل دووڤ ڤەکۆلینێن مە کرین دیاردبیتن کو ل بەراهیێ کورد موسلمان نەبوون و والیێن موسلمانان وەك خۆدی پەرتووك (اهل الكتاب) سەرەدەری دگەل وان کر، بەلێ هێژ سەدسالەك ب سەرڤە نەچووین پرانییا وان خۆبەخش مووسلمان بوون ژبەرکو ئایینێ نوو دگەل هزر و بیرێن زکماکیێن وان دگونجین. بنێرە: انور المائي: الاكراد في بهدينان، ص ٧٩ ؛ بۆ بەرسڤا ڤان رەنگە پرسیاران دڤێت بزڤرینەڤە ئەوا محەمەد ئەمین زەکی د پەرتووکا خۆ (خلاصة تاريخ الكرد و كردستان)، ص ١٢٢- ١٢٥دا نڤیسی و ئەوا بلەچ شێرکوی د پە رتووکا خۆ (القضية الكردية، ماضى الكرد و حاضرهم) نڤیسی کو تێدا دبێژیت: موسلمانەتی ل سەر دەستێ هەردو سەحابیێن خالد کورێ وەلیدی و عەیاز کورێ غەنەمی بەلاڤەبوو، بپ ١٥.

The New Encyeclopaedia Britanica، Vo 1. p 8-9، Ag Encyeclopaedia، Vol 17، p 9 .4

٥. یاقوت، معجم البلدان، ١٣٤/٢- ١٣٥.

٦. ل دوور ڤێ مژارێ بنیرە: The Cambriage Ancient History V. X 11. Map 8

٧. لدینوری، الاخبار الطوال، ص ١٠٦ ؛ الطبری: ١٨٣/٢ ؛ ابن اعثم الكوفي: كتاب الفتوح، ٢٢٠/١.

٨. عەبدوللا کورێ موعتەمیێ عەبەسی (عبدالله ابن معتم العبسی)، سەحابیەکێ ناڤدارە یەك ژ وان دەهـ کەسێن عەشیرەتا (بنی عبس) بوو ئەوێن موسلمان بووین و پشتی ڤەگەڕیانا عەشیرەتا وان ژ ئیسلامێ ئەو مایینە ل سەر موسلمانەتیا خۆ و پشکداری د شەرێ ڤەگەڕایایاندا کر، هەروەسان سەرکردێ ئالیێ چەپێ یێ لەشکەرێ سەعدی بوو د شەرێ قادسیێ دا، شانازیا گرتنا مەدائین و بازێرێن تکریت و مووسل هەبوو. بنێرە: طبقات ابن سعد: ٢٩٥/١، الطبری، ٣٥/٤.

٩. رەبعێ کورێ ئەلئەفکەلی (ربعی بن الافكل) یەك ژ وان سەحابیانە یێن سەردەمێ پێغەمبەری (س) موسلمانبووی،

پشکداری د شەرێن ڤەگەڕیایان و شەرێ قادسیێ و گرتنا مەدائین دا کریە، یەکەمین جار د شەرێن گرتنا تکریت و مووسل دا ناڤدار بوو. بنێرە: الطبری: ٧٣/٤، ابن الجوزی: تاریخ ٢/ ٥٢٤ ؛ ابن الکثیر: البدایة و النهایة ٧٤/٧ ؛ ابن حجر: الاصابه ٩٤/٢

١٠. عەرفەجە کورێ هەرسەمەی (عرفجة ابن هرثمة): عەرفەجە کورێ عەبدولعەزیز کورێ زوهەیرێ بارقی سەحابیەکە دەنگوەخت موسلمان بوویە ژبەرکو ناڤ ێ وی د شەرێن سەردەمێ پێغەمبەری (س) دا نەهاتیە، یەك ژ وان سەرکردەیان بوو یێن خەلیفە ئەبوبەکرێ سەدیق هنارتینە شەرێ ڤەگەڕیایان، پشکداری د گرتنا وەلاتێ فارس و شەرێن بوەیب و قادسیە و گرتنا مەدائین و تکریت و مووسلدا کریە، جارەکا دیتر پشکداری د گرتنا وەلاتێ فارس دا کریە و پاشتر ژڤریەڤە مووسلێ و ل سالا ٢٢ مش بوویە والیێ وێ، یەکەم کەس بوو بازێرێ(اختط) کری و عەرەب لێ ئاکنجیکرن و پاشتر مزگەفتا مەزنا ناڤدار ب (مسجد الجامع) لێ ئاڤاکر.بنێرە: الطبری: ٣٧/٤، ابن الجوزی: تاریخ ٢/ ٥٢٤ ؛ ابن الاثیر: اسد الغابه ٤٠١/١ ؛ ابن الکثیر: البدایة و النهایة ٧٤/٧ ؛ ابن حجر: الاصابة ٢٥/٤ ؛ .

١١. الطبري: ٣٥/٤، ابن الجوزي: ٢١٥/٤ ؛ ابن الاثیر: ٥٢٣/٢- ٥٢٤ ؛ ابن خلدون: ٩٥١/٤.

١٢. الطبري: ٣٥/٤ ؛ ابن الاثیر: ٥٢٣/٢.

١٣. الطبري: ٣٥/٤.

١٤. الطبري: ٣٦/٤.

١٥. یەزید کورێ محەمەدێ ئەزدی (یزید بن محمد الازدي): تاریخ الموصل، القاهره ١٩٦٧، ص ٢٠٨- ٢٠٩، تحقیق علی حبیبة ،وەك ژ نڤیسکارێن مەسیحییان شەهارجەیان ب هەلگرێن باوەریا نەسرانیان د دەتە نیاسن دەمێ دبێژیت: (( شەهارجە ب ناڤ مەسیحینە بەلێ باوەری ب مەسیحی هەیە وەك مرۆڤەکێ ئاسایی و وەك پێغەمبەرەك دنیاسن...)). بنێرە: سهیل قاشا: فتح الموصل لدی المؤرخین العرب، مجلة بین النهرین، عدد خاص نیسان ١٩٧٦، العدد ١٤- ١٥، ص ٢٠٦، هامش ٢٦. بەلێ خۆدیێ پەرتووکا (تاریخ الموصل) ژ عەشیرەتێن عەرەبان جوداکرینە، د دەمەکیدا یەك ژ دیرۆکنڤیسێن عیراقی د ناڤ عەشیرەتێن عەرەب دا دانایە، بنێرە: سلیمان الصائغ: تاریخ الموصل، ص ٥٨ ؛ عبدالموجود احمد السلمان: الموصل في عهدي الرشدي و الاموي، الموصل، الطبعة الاولی١٤٠٦ (١٩٨٥)، ص ٣١ ؛ ڤەکولەر د وێ باوەریدایە بۆچوونا (الازدی) نێزیکترە ژ راستیێ ژبەرکو ئەو تایبەتمەندە ب دیرۆکا مووسلێ ژ ئالیەکێ دووڤە (الطبری) شەهارجە نەدانینە دگەل عەشیرەتێن عەرەبان دەمێ گۆتی ( و شەهارجە دگەلدا)، الطبری: ٣٥/٤.

١٦. الطبري: ٦٣/٤ ؛ گەلەك ژ ڤەکولەرێن دیرۆکنڤیس کەتینە د خەلەتیێدا دەمێ ئاماژە ب هەڤکاریا ب فارس و بیزەنتیان د بەرسنگگرتنا هێرشا موسلمانان بۆ سەر تەوەرێ تکریت- مووسلێ کری، دهێتەزانین کو دەڤەرا جزیرێ ژ سالا ٦٢٧ هەتا هاتنا ئیسلامێ بۆ دەڤەرێ ل سالا ٧٣٧ز کەتبوو ژێر دەستەلاتێ بیزەنتیان. بنێرە ابن اعثم الکوفي: کتاب الفتوح- ٢٢/١ ؛ الطبري: ١٨٣/٢ ؛ الدنوري: الاخبار الطوال، ص ١٠٦.

١٧. د.کامل حسن البصیر، من مشکلات اللغة الکردیة و ادابها، مجلة المجمع العلمي العراقي، مج ٣٤، ص ٩٩ ؛ ترفة احمد عثمان، اسهامات العلماء الاکراد في بناو الحضاره الاسلامیة في القرنین الثامن الهجریین، دار الکتب، بیروت- ٢٠١٠م، ص ٣٤.

١٨. الطبري: ٣٦/٤، ابن الاثیر: ٢٤/٢ ؛ ابن خلدون: ٩٥٢/٤

١٩. الطبري: ٣٧/٤.

٢٠. عەتبە کورێ فەرقەدێ سەلەمی (عتبه بن فرقد السلمی): سەحابیەکە بەری غەزوا خەیبەرێ موسلمان بوویە، پشکداریەکا باش د جیهادا دژی ڤەگەڕیایان دا کریە، پشتی کو عەتبە ل مووسلێ بنەجهـ بووی کارێ گرتنا شارەزوور و صامغان و دەرئابادێ کریە، پشتی کو ژ ئالیێ شارەزوورێ ڤە پشکداری د گرتنا ئازەربێجانێ دا کری بوویە والیێ ئازەربێجانێ. بنێرە: طبقات ابن سعد: ٢٨٩/٤ ؛ ابن الاثیر: اسد الغابة، ٣٦٥/٣- ٣٦٦.

٢١. خلیفة بن خیاط: تاریخ، ص ١٣٩. ابن خلدون: ٩٥٢/٤.

٢٢. ابن خلدون: ٩٥٢/٤. م ن، ٤/ ٩٥٥ ؛ تێبینی د هێتەکرن کو وی ڤەگێرانا ئەلبلازەری ژ بەرپەرێ ١٨٠ێ ژ پەرتووکا وی (الفتوح) ڤەگوهاستیە و تێدا ناڤێ بازێرێ (راس کیفا) هاتیە ئەرێ ئەڤە بازێرێ سەرێ کانیێ (راس العین)ە.... ئەگەر بێژین ئەڤە بازێرێ حەسکیڤێ (حصن کیف)ە ئەڤە ژێ دژهەڤە دگەل سەروبەرێ جوگرافی. بنێرە: یاقوت: معجم البلدان، ٢٦٥/٢.

٢٣. . م ن، ٤/ ٩٥٥ ؛ تێبینی د هێتەکرن کو وی ڤەگێرانا ئەلبلازەری ژ بەرپەرێ ١٨٠ێ ژ پەرتووکا وی (الفتوح) ڤەگوهاستیە و تێدا ناڤێ بازێرێ (راس کیفا) هاتیە ئەرێ ئەڤە بازێرێ سەرێ کانیێ (راس العین)ە.... ئەگەر بێژین ئەڤە بازێرێ حەسکیڤێ (حصن کیف)ە ئەڤە ژێ دژهەڤە دگەل سەروبەرێ جوگرافی. بنێرە: یاقوت: معجم البلدان، ٢٦٥/٢.

٢٤. ئیسماعیلیات (الاسماعیلیات) بازێرکەکە نها دکەڤیتە سەر خێچا ئاسنی یا مووسل- تەل کوچەك. بنێرە: فتح الموصل لدی المؤرخین العرب، مجلة بین النهرین، عدد خاص ١٩٧٦/٤، ص ٢٠٦ هامش، ٣١.

٢٥. الواقدي: فتوح الشام، ج٢ص١٨٢- ١٨٣.

٢٦. الطبري: ٣٧/٤.

٢٧. ابن الاثير: الكامل في التاريخ، ٥٢٤/٢.

٢٨. الواقدي: فتوح الشام، ١٨٢/٢- ١٨٣.

٢٩. البلاذري: فتوح، ص ٣٣٧.

٣٠. ابن خلدون: العبر، ٩٥٢/٤.

٣١. هەژیە بێژین ئیبن ئەلخەیات د بێژیت: مووسل ل سالا ١٨مش هاتییەگرتن. خليفە ابن خياط: تاريخ، ص ١٣٩.

٣٢. الطبري: ٣٧/٤.

٣٣. البلاذري: فتوح، ص ٣٣٧، یەك ژ ڤەكولەرێن مەسیحیان كەتیە د شاشییێدا دەمێ گۆتی: یەكەمین گرتنا ئاسێگەها رۆژهەلاتی ب كوتەكی بوویە و دووەمین گرتن ب ئاشتی بوویە. سهيل قاشا، الوصل لدى المؤرخين العرب، مجلة بين النهرين، عدد خاص ١٩٧٦/٤، ص ٢٠٣، ئەو ب خۆ بەرڤاژی راستە. ڤەكولەر.

٣٤. عەیاز كورێ غەنەمیێ فەهری (عياض بن غنم الفهري): سەحابیەكێ ناڤدارێ قورەیشی یە، رۆلەك بەرچاڤ د گرتنا باكوورێ كوردستانێ دا هەبوو.

٣٥. البلاذري: ص ٣٣٧ .

٣٦. م. ن ، ص ٣٣٧.

٣٧. یاقوت: ٣٧٥/٣.

٣٨. هەریەك ژ ئیبن ئەلئەسیر و ئیبن خەلدون ئەڤ ڤەگێرانە ژ وی ڤەگوهاستیە. ئەلمەرج (المرج): یەك ژ دەڤەرێن سەر ب مووسلێ ڤەیە، ئەڤ وارە هندەك جاران (بێ گومان د ژێدەرێن عەرەبیدا)ب (مرج الموصل) یان (مرج ابى عبيد) دهێتەناڤكرن. ابن الاثير، اللباب فى تهذيب الانساب، ١٩٤/٣ ؛ ل ڤێ دەڤەرێ پەز و چێل و گۆل و عەردێ ئاڤی د مشەنە، و بازێرەك لێ هەیە دبێژنێ بازارێ یەكشەمبیان (سوق الاحد) هەموو كەرەستە و پێدڤیێن بازرگانی و كورد لێ خرڤەدبن. بنێرە: ابن حوقل: صوره الارض، ص ١٩٦ ؛ یەك ژ ڤەكولەران دبێژیت (مركا) بۆ وێ دەڤەرا سێگوشەیا هەردو لنگێن وێ وەكهەڤ و بنواشێ وێ بەرەڤ باكوور بۆ زنجیرا چیایێن ئاكرێ وسەرێ وێ بەرەڤ باشوور جهێ بهەڤگەهشتنا هەردو رووبارێن زێیێ مەزن و خازەری، رووبارێ زێیێ مەزن دكەڤیتە رۆژهەلاتێ ڤێ دەڤەرێ و رووبارێ خازر و تایێ وی گۆمل دكەڤنە رۆژئاڤایێ وێ، ئەڤ ناڤە دهێتەگۆتن بۆ دەڤەرەكا عەردێ وێ ب خێر و بێر و پڕی ئاڤ. سهيل قاشا، فتح الموصل لدى المؤرخين العرب، مجلة بين النهرين، عدد خاص ١٩٧٦/٤، ص ٢٠٥ هامش ١٧ ؛ ئەڤە دەڤەرە نها قازا ئاكرێ یا سەر ب پارێزگەها دهۆكێ یە. ڤەكولەر.

٣٩. باهذری: باهذرا- نوهدرا، ژ وارێن سەر ب مووسلێ ڤەنە. ابن خردادبه: المسالك و الممالك، ص ٩٤ ؛ الاصبهاني: الاغاني، ٢٨٤/٦ ، تصحيح احمد الشنقيطي. یاقوت ب یەك ژ وارێن سەر ب مووسلێ ڤە ددانیت بەلێ ب شێوازێ (باهذرا). یاقوت: معجم البلدان، ٢٢٣/٥. و ئەو جهێن دكەڤنە ناڤبەرا رووبارێ دجلە و خابووری ب (نوهذرا) ناڤدكەت. يوسف حبي، الموصل في المصادر السريانية القديمة، مجلة سومر، المجلد ٣٤، ص ١٣١ ؛ د دەمەكیدا ڤەكولەرەكێ دی یێ مەسیحی هوسان ددەتە نیاسین: (( دەڤەرەكا سەر ب دێرێ یە ژ رووبارێ زێیێ مەزن ل باشوور بەرەڤ دەوروبەرێن هلمون ل باكوور ڤەدگریت، ژ سالا ٤١٠ز ناڤێ ڤەشەیێن وێ دهێنە نیاسین. بنێرە: سهيل قاشا، م. ن، ص ٢٠٥ . ب كورتی وەك شێخ ئەلربوە گۆتی مەلبەندێ پارێزگەها دهۆكێ و هندەك ژ قەزا زاخۆ ڤەدگریت. شيخ الربوه الانصاري، نخبة الدهر في عجائب البر و البحر، ص ٢٥٥.

٤٠. باعەدری (باعذرى) گوندەكێ سەر ب مووسلێ ڤەیە دكەڤیتە رۆژهەلاتێ وێ. یاقوت: ٣٢٤/١ ؛ جهێ تیرەیا یەزیدیا كوردە ل جیهانێ، دەڤەرا (باعذرى) نها قەزا شێخان یا هەرێما كوردستانێ ڤەدگریت، ڤەكولەرەكێ مەسیحی ب شاشییێدا چوویە دەمێ گۆتی مەزارێ شێخ عودەی كورێ مسافرێ ئەمەوی( شێخ ئادی وەك ل جەم ئێزدیان دهێتەنیاسین. وەرگێر) ب خۆڤە دگریتن سهيل قاشا، م. ن، ص٢٠٥، هامش ١٩ ؛ یا راست ئەوە كو ئەو مەزارە دكەڤیتە چەند كیلومەترەكا بەرەڤ باكوورێ باعەدرێ ل گەلیێ لالش. ڤەكولەر

٤١. حبتون: چیایەكە ل دەڤەرێن سەر ب مووسلێ ڤە. یاقوت: ٢١١/٢ و ٢٢٣/٥، و د دەڤەكێ دیدا هاتییە ((پاشتر ژ عەردێ حفيتون ژ عەردێن مووسلێ چیت هەتا ل وارێ مێرگ (المرج) ژ وارێن مووسلێ دەردكەڤیت)). یاقوت: ١٢٣/٣ ؛ دبیت (حفيتون) گورانكاریا ناڤان بیتن و ژ ئالیێ نڤیسەرێن دەسنڤیسانڤە هاتبیتە كرن، ڤەكولەر ل دووڤ ئەوا یاقوتی ڤەگێرای باوەردكەت كو ئەڤ دەڤەرە چیایێ قریشویە ئەوێ دكەڤیتە هنداڤ دەڤەرێن عەشیرەتا سورچی هەتا چیایێ حەریر ئەوێ ل هنداڤ دەشتا حەریرێ.

٤٢. حەیانە (الحیانة) شاشیە،یا راست (الحنانة) دەڤەرەکە دکەڤیتە رۆژئاڤایێ مووسلێ عەتەبە کورێ فەرقەدی ب ئاشتی گرت. یاقوت: ٣٢٠/٢ یا راست ئەوە کو یەك ژ دەڤەرێن رۆژهەلاتێ مووسلێ یە و دکەڤیتە سەر تایەکێ رووبارێ زێیێ بچووك.
توما المرجي، کتاب الرؤساء، ص ١١٩، هامش ٢، تحقیق و تعریب البیر ابونا؛ ئەڤە دکەڤیتە دەڤەرێن سەر ب قەزا رەواندزێ ل هەرێما کوردستانێ.

٤٣. مەعلە (المعلة) یەك ژ دەڤەرێن مووسلێ یە. یاقوت: ٢٢٣/٥. ئانکویا دەروازە یان دەرگەهـ وەك پەیڤا دەربەند ب زمانێ کوردی، دکەڤیتە جهێ دەربازبوونا رووبارێ زێیێ مەزن ژ چیای ل نێزیك بێخمێ. توما المرجي: م.ن. ص١٠٠ هامش١ ؛ یەك ژ ڤەکولەران دوورنابینتن کو (المعلی- معلتا- معلاثایا) بیت ئەوا دکەڤیتە (بانوهذرا) کو دبیتە دەرگەهێ دەشتا نەینەوا بۆ دەڤەرا چیان (دهۆکێ). سهیل قاشا: م.ن. ص٢٠٥ هامش ٢٢.

٤٤. داسیر شاشیە یا راست (داسن)ە: چیایەکێ مەزنە دکەڤیتە باکوورێ مووسلێ، ل ئالیێ رۆژهەلاتێ رووبارێ دیجلە هژمارەکا زۆرا خەلکێ ژ تیرەیێن کوردان لێ هەنە دبێژنێ داسنی. یاقوت: ٤٣٢/٢. هندەك ڤەکولەرێن مەسیحییان دبینن کو مامیر راستڤەکرنا داسیرە ئەوا دکەڤیتە گەلیێ (نحلة) ل دەڤەرا مێرگ (المرج) ئاکرێ یان ژی دیبورە ئەوا دکەڤیتە سەر سەروکانیا رووبارێ زێیێ مەزن ل ژێریێ رۆژهەلاتێ رەواندزێ. توما المرجي: ص ٩٢ هامش ٣٧ ؛ سهیل قاشا: ص ٢٠٦ هامش ٢٣ ؛ ڤەکولەر د وێ باوەرێدایە کو ئەڤ دەڤەرە پشکێن ژێریی قەزا ئامێدیێ‌نە ل پارێزگەها دهۆکێ ئانکو دەڤەرێن بەرێ گارەی، و پەیڤا داسن د زمانێن کەڤندا ئانکو عەردەکێ سەخت و پڕی دار و درەخت.

٤٥. مەرەما ئەلبلازەری ژ هەموو جهێن کوردان (معاقل الاکراد) هەموو ئەو باژێر و گوند و کەلایێن کوردانە ئەوێن دکەڤنە باکوورێ ئاسێگەها رۆژهەلاتی (نەینەوا)، ئانکو هەردو پارێزگەهێن هەولێر و دهۆك یێن باشوورێ کوردستانێ. یەك ژ ڤەکولەران نێزیکتر دبینت کو دەڤەرێن رۆژهەلاتێ دجلەی ژوانا مێرگ (المرج) و گوندێن وێ و عەردێ (باهذری و باعذری)ێ و یێن دی ل سالا ٢٠مش/٦٤٠ز ل سەر دەستێ عەتەبە کورێ فەرقەدێ سەلەمی هاتینەگرتن. بنێرە: سامي بن خماسي الصقار: امارە اربل فی العهد العباسي و مؤرخها ابن المستوفي، الریاچ- داز الشواف للنشر و التوزیع (١٤١٣مش- ١٩٩٢ز)، ص ٣١.

٤٦. بانعاسا (بانعاثا): گوندەکە دکەڤیتە دەڤەرا مێرگ (المرج) ل رۆژهەلاتێ نەینەوا ب دووراتیا ١٢کم ژ قەزا ئاکرێ ژێریێ گوندێ شوش. توما المرجي، ص ٦، تعلیق البیر ابونا، بەلێ ئەڤە دژهەڤە دگەل ئەوا ئەلبلازەری دیارکری دەمێ گۆتی بانعاسا ژ حزەیە (بانعاثا من حزه)، لەما ڤەکولەر کو یەك ژ وان دەڤەرانە یێن دکەڤنە ئەربل (ئەربیل) ئەوا دکەڤیتە حزە. بنێرە: یاقوت: معجم البلدان، ٢٥٦/٢.

٤٧. شەهارجە (الشهارجة): ژێدەرێن دیرۆکی و جوگرافی ئاماژە ب جهێ ڤی گری نەکرییە بەلێ ئاماژە ب هاریکاریا (کوردێن شەهارجە) بۆ موسلمان د گرتنا باژێرێ تکریت دا کرییە. بنێرە: الازدی: تاریخ الموصل، ص ٢٠٨- ٢٠٩، ڤەکولەر د وێ باوەرێدایە کو ئەڤ گرە دکەڤیتە ئالیێ رۆژهەلاتێ رووبارێ دیجلە دەڤەرا جرمای- کرمای یا نها سەر ب پارێزگەها کەرکوکێ ل باشوورێ کوردستانێ.

٤٨. ئەلسلق (السلق): چیایەکە د ژێدەرێن عەرەبیدا ب (سلق احمد بن روح بن معاویة من بني اود) هاتییەناڤکرن دکەڤیتە ناڤبەرا شارەزور و ئازەربێجانێ، رووبارێزێیێ بچووك ژ وێرێ دزێت. یاقوت: معجم البلدان، ١٢٤/٣، و ل جهەکێ دی ب ڤی رەنگی ددەتە نیاسین (( چیایەکێ بلندە ل هنداف زێی ل دەڤەرێن سەر ب مووسلێ ڤە دگەل دەڤەرێن شارەزورێ دگەهیتەهەڤ ب (سلق بني الحسن بن الصباح بن عباد الهمداني) دهێتەناڤکرن د نووچەیێن گرتناندا ئاماژە پێ هاتییەکرن)). یاقوت، ٢٣٨/٣ ؛ هەژیە بێتە گوتن خۆدیێ (رابطە الموصل) چەند کەلا هەنە دکەڤنە بەرامبەری کەلا (الحراء) ئەو ژی ئەلکێ، ئاروخێ، باخوخێ، بەرخو، کەنکور، و نێروە و خەشەب (( القیێ، أروخ و باخوخ و برخو و کنکور و نیوە و خوشب))ن. یاقوت: ١٥٨/٣، هەموو ئەڤە کەلایە دکەڤنە دەڤەرا زۆزانان کو مەلبەندێ کوردانە، ئەڤە ژی ڤەکولەری پالددەت پشتگەرم ب ڤەگێرانێن البلاذری، ص ٣٣٧ ؛ یاقوت الحموي: ١٢٤/٣ و ١٥٨ و ٢٣٨ بێژیت: ل سەدسالییا یەکەما زایینی مەلبەندێ کوردستانێکوردستانا نها یا عیراقێ و هندەك پارچەیێن کوردستانا ترکیا و ئیرانێ یە.

٤٩. البلاذري: ص٣٣٧ ؛ ابن الاثیر: ٥٢٤/٢ ؛ ابن الخلدون: ٩٥٢/٤ کو ئاماژە ب کەلا و باژێرێن کوردان وەك ((قردی و بزبدی و دەڤەرێن دی یێن مووسلێ)).

٥٠. تەبرەهان (الطبرهان): یاقوت الحموی وەك دەڤەرێن سەر ب مووسلێ ئاماژەپێکرییە، وەسان دیارە دکەڤیتە ناڤبەرا تکریت و باجرمێ. بنێرە: یاقوت/ معجم البلدان ٢٢٣/٥ ؛ ابن رستە: الاعلاق النفیسة، ص ١٠٣.

٥١. رزان: دەڤەرەکا نێزیکی دامیرە دکەڤیتە سەر سەروکانیا رووبارێ زێیێ بچووك ل ژێریێ رۆژهەلاتێ رەواندزێ. توما المرجي: کتاب الرؤساء، ص ٩٢، ١٣٧ ؛ بەلێ وەك د دەقێ ئەلبلازەری دا هاتی ئەڤ دەڤەرە دکەڤیتە نێزیکی بابغیش ئەوا دکەڤیتە باکوورێ زێیێ مەزن هەروەك یاقوت الحموی ئاماژەپێکری. یاقوت: ٢٧٧/٢ ؛ ڤەکولەر د وێ باوەرێدایە کو ئەڤ ناڤە ل سەر ناڤێ گوندێ رێزانێ هنداڤ رووبارێ زێیێ مەزن بنێ چیایێ شیرین ژێریا رۆژهەلاتێ گوندێ بارزان یێ سەر ب قەزا میرگەسوورێ ل پارێزگەها هەولێرێ، هەروەك بێژی دکەڤیتە ئالیێ دی یێ رووباری بەرامبەری گەلیێ نەهلا (دەڤەرا دامیر. بنێرە: سهیل قاشا،

م.ن. ص٢٠٦ هامش ١٠٣.

٥٢. البلاذري: ص ٣٢٨.

٥٣. البلاذري: ص ٣٢٩.

٥٤- ڤەکولەری چ پێزانین دەربارەی ڤی ناڤی دەست خۆ نەئێخستن، دوورنابینت بکەڤیتە ناڤبەرا شارەزور و سامغان ل کوردستانا ئیرانێ. ڤەکولەر

٥٥. سامغان (الصامغان) وارەکە ژ وارێن چیا ل سنوورێ تبرستان ب فارسی دبێژنێ بمیان. یاقوت: ٣٩٠/٣٤ ؛ ابن رسته: الاعلاق النفیسة، ص ١٠٣.

٥٦. البلاذري: ص ٣٢٩، ابن خلدون: ٩٨٢/٤.

٥٧. البلاذري: ص ٣٢٩ ؛ ابن خلدون: ٩٨٢/٤.

٥٨. ئورمیە باژێرەکێ کەڤنێ ناڤدارە ل ئازەربێجانێ، ٣-٤ میلان ژ دەریاکی دوورە، باژێرێ زەردەشت پێغەمبەرێ مەجوسیانە، دەولەمەندە ب خێر و بێر و میوەهاتی، هەوایەکێ سازگار لێ هەیە. یاقوت: ١٥٩/٣.

٥٩. ئەلحور: د پەرتووکێن دیرۆکنڤیس و جوگرافیناساندا من تشتەك ل سەر ڤی باژێری دەستڤەنەئینا، دبیت شاشیا نڤیسەرێن دەسنڤیسان بیتن ژ ناڤێ کەلا ئەلحەراء هاتبیتن. ڤەکولەر

٦٠. خویێ: باژێرکەکێ ناڤدارێ سەر ب مووسلێ یە، دەولەمەندە ب خێر و بێر و میوەهاتی، ب جلکێن خویی ناڤدارە. یاقوت: ٤٠٨/٢.

٦١. سەلماس: باژێرەکێ ناڤدارێ ئازەربێجانێ یە، ناڤبەرا وێ و ئورمیێ دو رۆژن، ناڤبەرا وێ و خویێ قوناغەکە. یاقوت: ٢٣٨/٣- ٢٣٩.

٦٢. الطبري: ٨١/٤.

٦٣. الطبري: ٣٧/٤.

٦٤. البلاذري: ص ٣٣٧.

٦٥. البلاذري: ص ٣٢٩

٦٦. تور عابدین(طور عابدین): ئەلمەسعودی ئاماژە پێکریبە وەك یەك ژ جهێن کوردێن یەعقوبی دایەنیاسین.بنێرە: المسعودي:مروج الذهب، ١٢٤/٢؛ سالا ٩٥١ یونانی یان بیزەنتی بەرامبەری ٦٣٩-٦٤٠ زاینیە بنێرە:الیلیا برشانا:ص١٣٣.

٦٧. الیلیا برشانا: ص ١٣٣.

٦٨. البلاذري: ٣٣٧.

٦٩. م. ن: ص١٨٠ ؛ یاقوت ئەلحەمەوی د دانەنیاسینا دەڤەرا زۆزانادا دبێژیت: (تیرەیێن کوردان لێ هەنە)، د بابەتەکێ دیدا ژ ئیبنولئەسیر ڤەدگوهێزیت: (زۆزان دەڤەرەکا بەرفرەهە ژ جزیرا ئیبنولعومەری ل رۆژهەلاتێ دجلە، بەراهیبا سنوورێ وێ دو رۆژان دوور ژ مووسلێ دەسپێدکەت هەتا دەسپێکا سنوورێ خەلاتێ و دگەهیتە ئازەربێجانێ و هەتا دەسپێکا دەڤەرا سەلماس، گەلەك کەلاێن ئاسێ لێ هەنە هەموو ژی یێن کوردێن بەشنەوی و بوختینە، کەلا بەرفە و کەلا بەشیر ژ کەلاێن بەشنەویانە و کەلا جەرزەقیل یا بوختیانە، باشترین کەلا وانە و جهێ مەلکێ وانە هەروەسان ئاتیل و علوس و باراء الحراء یا خۆدیێن مووسلێ یە و ئەلکێ، ئاروخێ، باخوخێ، بەرخو، کەنکور، و نێروە و خەشەب (( القیء، أروخ و باخوخ و برخو و کنکور و نیوە و خوشب). یاقوت الحموي: معجم البلدان ١٥٨/٣.

٧٠. طه باقر: تاريخ ايران القديم، ٧٤ ،، The Kurd، London Hasak Arfa

٧١. ڤەکولینەکا نە بەلاڤکریا نڤیسکار (خەلیل شاخکی).

# بەهدینان.. جوگرافییا مێژوویی

**پ.د زرار سەدیق توفیق**
**زانكۆیا دهۆك كۆلیژا زانستێن مرۆڤایەتی**

كوردستان وەلاتێ كوردان ب رەنگەكێ گشتی ودەڤەرێن ناڤەندا چیان ئەوێن دوور و نەدیار برەنگەكێ تایبەت، ب درێژاهیا دیرۆكێ ناڤەندەكا ئاڤەدانییا مەزن یا وەسان لێ نەبوویە كو بشێن ب شار یان باژێر ناڤ بكەین، بساناهی هاتن و چوون دڤان دەڤەراندا نە دهاتەكرن، ونە دكەفتنە سەر رێكێن بازرگانی، تنێ ئەڤ دەڤەرە ژ دەهان وسەدان كەلایێن سرۆشتی و چێكری و شورهە ئاسێگەهـ و گوند و بارەگا پێكدهات، ژ كەڤنڤە بنگەهـ و پایەگاهێ رێبەر و سەردارێن كوردان بوو، هەر راستەخۆ ژئالیێ خودانانڤە دهاتنە برێڤە برن، و دەولەتێن ناڤەندی و هێزێن بیانی دەستەلاتەكا وەسا لێ نە بوو كو بشێن مایێ خۆ د كاروبارێن ناڤخوییێن واندا بكەن.

دهەمان دەمدا ڤێ دووری و ڤەدەرێ كارەكێ وەسا كر د ژێدەرێن بیانیدا پێزانین و ئاگاهی سەبارەت ڤان دەڤەران ئێكجار كێم و دەگمەن بن، وەكی خویایە كوردان بخۆ ژی چ پیتە و بایەخەك ب یاداشتكرن و توومارکرنا سەربۆری و سەرهاتیێن خۆ نە داینە، ژ بەر ڤێ یەكێ مێژوویا دەڤەرێن ناڤخوویا هاتی بە پشت گوهـ هاڤێتن و تشتەكێ وەسا بو مە نەمایە.

ئەڤ راستیا بە ل سەری ئاماژە پێ هاتیبەكرن تەمام وەكی خو ب سەر دەڤەرێن بەهدینان جێبەجێدبیت چونكو پشكەكا گرنگە ژ كوردستانێ.

ل چەرخێن ناڤین و مێژوویا ئیسلامی هەمی دەڤەرێن چیایی كو دكەڤتنە رۆژهەلات و باكوورێ رۆژهەلاتێ باژێرێ مووسلێ ب هەكاری دهاتنە نیاسین، هەرچەندە ئەڤە دەڤەرەكا گەلەك بەرفرەهـ بوو بەلێ تنێ ئەڤ ناڤە لێ دهاتە دانان و چ ناڤەكێ دی نەبوو، د ژێدەرێن عەرەبی دا ب (الهكارية، بلاد الهكارية، بلاد الهكار، جبل-جبال الهكارية، ارض الهكار) دهاتە ناڤبرن، ئەڤ دەڤەرە ب (جبل –چیا، بلدە و ناحیە - باژێر و دەڤەر، بلدە و ناحیە و قری ئانكو باژێر و دەڤەر و چەند گوندەك و ارض- ئاخ ، ویلایەت —وەلات هاتییە وەسفكرن، و د هەمموو ژێدەراندا دا ئەو راستییە هاتییە توومارکرن كو ئەڤ وەلاتە ژ ژمارەك قلعە -كەل، حصن -شورا- ئاسێگەهـ، معاقل - پایەگاهـ- بارەگا، قری-چەند گوندەك پێكدهات و چ ئاماژەك نینە بەحسێ باژێران بكەتن و هەمی ئاكنجیێن هەكاری ب كوچەر و ئاكنجی و هوز و مالبات ڤە پتر ب كوردێن هەكاری دهاتنە نیاسین وناڤبرن[1].

ژ بەر هندێ ئەم دبینین دەمێ ڤەگرتنا دەڤەرێن هەكاری ژلایێ عەرەبێن موسلمانڤە سەردەمێ خەلیفێ راشدی یێ دووێ عومەرێ كورێ خەتابی -

دەورووبەرێن سالا ٢٠مش/٦٤١ز- تنێ ئاماژە ب کەلایێن کوردان معلثایا –مالطا ،داسن، باعذرا،بانوهذرا ... کری یە و ب(معاقل الاکراد) ئانکو بارەگایێن کوردان ناڤبری یە[٢].

هەکاری ژلایێ کارگێرێ ڤە هەرێمەکا سەربەخۆ نەبوو، وەك یەکەیەکا کارگێری سەرەدەری دگەلدا نەدهاتەکرن، بەلکی بەشەك بوو ژهەرێما جزیرە - وەلاتێ دناڤبەرا هەردو رووباران-سەر ب بازێری موصل ڤەبوو، ژبەر ڤێ یەکێ چ سنوورێن دیار و جێگیر نەبوون کو ب فەرمی دانپێدانێ پێ بکەین، د ڤی واریدا ژێدەران چ پێزانین نە داینە کو بشێین نەخشەکێ جوگرافی بۆ سنوورێن دەڤەرێ دابنین، هەروەسا رووبریبوونا ڤێ دەڤەرێ دگەل هیرش وشالاوێن سەربازیێن دەرڤە ب درێژاییا مێژوویێ نەخاسمە ئاریشێن سنوری دناڤبەرا هۆزا هەکاری و هۆزێن جیران بوویە ئەگەرێ نەسەقامگیری یا سنووری و هەمی دەمان کێم یان زێدە د گۆهرینێ دابوون[٣].

سەرەرای ئەڤ چەندا مە دیارکری، پشتگەرم ب ژێدەرێن جوگرافی ل سەر دەنگوباسێن وەلاتان ولێکدانا ئاخفتنا مێژوونڤیس و جوگرافیناس (بلداني) وگەرۆکێن موسلمان دەربارەی ڤی وەلاتی، ئەم دشێین سنوورەکێ نێزیکی راستیێ بو وەلاتێ هەکاری بڤێ شێوەی دیاربکەین:

ژ رۆژئاڤاڤە دەڤەرا چیاییا ناڤبەرا رووبارێ دیجلە، ژ رۆژهەلاتی هەرێما ئازەربێجان و رووبارێ زێیێ مەزن، ژ باشوورڤە بازێرێ موصل ومێرگ(المرج)، ل باکووری زنجیرا چیایێن ناڤبەرا بوتان تا جودی - ئانکو وەلاتێ زوزان - ئەڤ دەڤەرە هەمی گرتی یە ، ئو ژلایێ باشووریڤە دگەهیتە دەروبەرێن بازێری مووسلێ، بۆ نموونە لالش کو جهەکێ پیروزێ کوردێن ئێزدی یە دکەڤیتە چیایێن داسن یێن بناڤ ودەنگ ئەو ژی دکەڤیتە وەلاتێ هەکاری و شیخ عەدیی کورێ مسافر (م٥٥٧مش/١١٦٢ز) کو ل لالش هاتی یە ڤەشارتن ب شیخ عەدیی کورێ مسافرێ هەکاری دهاتە ناسین[٤] و نها هەردو دەڤەرێن بەهدینان(هەکاری باشوور) و شەمدینان (هەکاری باکوور) هەموو ئەڤ دەڤەرێن مە ئاماژە پێکری بخوڤەدگریت.

وچێدبیت ئەم بێژین هەکاری وەلاتێ کەلانە - کەلایێن هەکاری ژبەرکو گەلەك پایەگاهـ ئاسیکەهـ وشوراییێن جەنگی لێ هەنە، ژ کەڤن وەرە ل سەر زنجیرەیێن ڤان چیایان گەلەك پایەگاهـ وکەلە و وخالێن زێرەڤانی و کونترولێ (دویرگەهـ) لێ هەبوون و ژلایێ هوزێن کوردانڤە مفا ژێ دهاتە وەرگرتن.

ل سەدسالیێ چوار تا شەشێ مش/دەهـ تا دووازدەی زایینی د ژێدەرێن ئیسلامیدا ناڤێ ژمارەیەکا دی یا کەلا و بازێرێن سەر ب هەکاریڤە هاتینە مینا: ئەردەمشت(ئەرمشتێ) -کواشێ، باجلایا- باجلێ، زەعفەرانیە، شەعبانی- شابانی، هرۆر، ئامێدی (العمادية)، ئاکری (العقر)،شۆش ،شرملە- شەرمن ،الحسنيە-زاخۆ،بامەردنی-بامەرنێ، مانغیس -مانگیش و دەهان گوند و دێهات[٥].

## وەلاتێ داسن

ئەو زنجیرە چیایەنە کو ب سەر مووسلدا دکەڤن و ئەو دەڤەرن یێن زێیێ مەزن یێ ژ چیایێن ئەرمەنستانێ دزێت پێدا دەرباز دبت، ب وەلاتێ داسن دهاتە ناسین و گوندەك بناڤێ المحمديە لێهەبوو[٦]، داسن د ژێدەرێن سریانی و دێرێدا ژی بەرنیاسە.

## وەلاتێ زۆزان

زۆزان وەك خۆیابە پەیڤەکی کوردیە، ب رامانا دەڤەرێن چیایی یێن هین (فێنك)، هەر ژ دەسپێکا سەردەمێ ئیسلامی ڤە ئەڤ پەیڤە وەك ناڤەکی جوگرافی د ژێدەرێن مێژوویی و جوگرافیناسیێن موسلماناندا بەلاڤبوویە[٧]دووڤ ئاخفتنا یاقوتێ حەمەوی زۆزان ژ نێزیکی مووسل تا جەزیرا بۆتان و بەرەڤ رۆژهەلات تا خەلات و ئەرمینیا و سنوورێ ئازەربێجان درێژدبووڤە[٨].

هەتا سەردەمێ دەستەلاتا مەغول ژی ناڤێ هەکاری هەر مابوو، بەلێ پشتی کو میرگەها بەهدینان دەرکەفتی کو میرێن وێ نەڤیێن میر

بەهائدینی نە، هیدێ هیدێ ئەڤ دەڤەرە ب بەهدینان هاتییە نیاسین، نەخاسمە پشکێن باشووری کو پارێزگەها دهۆکێ یا نها پێکدهێنت، دیاردەیەکا بەلاڤبووی دناڤ کوردانددا هەبوو، گەلەك جاران ناڤێ مالباتێن دەستەلاتدار دبوو ناڤێ ئەو دەڤەرا حوکمداریا خۆ لێ دکرن، وەك چەوان مالباتا عەزیز یان عەبدولعەزیزی کو حوکمێ وەلاتێ بۆتان دکر دگۆتنێ دەڤەرا ئازیزان ومالباتا شەمسەدین کو حوکمێ باکوورێ هەکاری دکرن ئەڤ پشکە هاتە بناڤکرن ب وەلاتێ شەمسەدینان - شەمزینان- شەمدینان، یان دەڤەرا شەهرەزور - سلێمانی یا نها- دسەردەمێ دەستەلاتداریا میرێن بابانی دا ب وەلاتێ بابان دهاتە نیاسین، ب هەمان شێوە هەکاریێن باشوور ل سەردەمێ مالباتا بەهائەدینی ب وەلاتێ بەهائەدینان دهاتەنیاسین کو پاشتر بوویە بەهدینان.

ب ئاگەهداریا مە شەرەفخانێ بەدلیسی یەکەم مێژوونڤیسە ناڤێ بەهدینان ئینای[9]، وبەری وی د چ کتیبەکێدا ئەڤ نەهاتییە توومارکرن، وپشتی وی ژی گەلەك ب کێمی دهاتە ب کارهینان و میرگەها بەهدینان د ژێدەراندا پتر ب میرگەها ئامێدی -العمادیە دهاتە ناڤبرن، بەلێ ئەم دبینین لڤان سالێن داویێ ل ڤیرێ و وێرا هندەك نڤیسەرێن نە پسپور د مێژوویێ دا ژبەر هەستا خو یا نەتەوایەتی کو پێ نەخۆشە ناڤێ بەهدینان ژناڤەکێ عەرەبی ئیسلامی هاتبیت وبێ بەلگە وبێ ژێدەر دبێژن ناڤێ بەهدینان ژناڤێ باخێ دینان ئانکو بەهدین هاتی یە و ڤان ئاخفتنا هیچ راستی و دروستی یەك بو نینە و چ ژێدەر وێ یەکێ پشتراست ناکەت .

## پەراوێز:

١. (السمعاني، الانساب،٦٤٥/٥، ابن الجوزي، المنتظم، ٧٩/٩، ياقوت الحموي، معجم البلدان،٤٨٠/٤، ابن الاثير، الكامل، ١٠٢/٧، ٨٠/٩، ٣٦٩، اللباب في تهذيب الانساب، ٣٩٠/٣، سبط ابن الجوزى، مراه الزمان، ٣٠/١٩، ٤٥٤، ابن خلكان، وفيات الاعيان، ٣٤٥/٣)
٢. (البلاذرى، فتوح البلدان، ص٣٢٧)
٣. (بو پتر پێزانینا بروانە: درويش يوسف حسن هروری، بلاد هكارى (٩٤٥-١٣٣٦م) ،(دهۆك:٢٠٠٥)، ص١٧-٢٠، ٣٩-٥٩)
٤. (الكامل، ٨٠/٩، تاريخ أربل، ١١٤/١-١١٦، وفيات الاعيان، ٢٥٤/٣)، هەروەسا عين سفنێ-شێخان دکەفتە وەلاتێ هەکاری (ابن الفوطي، معجم الالقاب،١٩٩/٤-٢٠٠). هرۆر و ئامێدی ژڤەلاییێن هەکاری بوون (الكامل، ٣٤٣/٨-٣٤٤، ٣٢١/٩)
٥. (معجم البلدان،٤/٣،١٦٢،١٣٧/٤٧٦)
٦. (ابن حوقل ،صوره الأرج، ص٢٦٠، معجم البلدان، ٢٨٤/٢)
٧. (فتوح البلدان، ص١٨٠) - أبن الاثير، عز الدين علي بن بن محمد الجزري (ت٦٣٠هـ/١٢٣٢م).
٨. (معجم البلدان،٤٩٧/٢)
٩. (شرفنامه، ٢٥٣)

## ژێدەر:

- الكامل في التاريخ، دار الفكر (بيروت ١٩٧٨).
- اللباب في تهذيب الانساب، مكتبة المثنى (بغداد (د.ت)).
- البلاذري، احمد بن يحيى بن جابر (ت٢٧٩هـ/٨٩٢م).
- فتوح البلدان، دار الكتب العلمية (بيروت١٩٧٨).

**- ابن حوقل، ابوالقاسم بن حوقل النصيبي (ت ٣٦٧هـ/٩٧٧م).**
- صورة الارض، دار مكتبة الحياة (بيروت: ١٩٧٩).
- أبن خلكان، شمس الدين احمد بن محمد بن أبي بكر (ت٦٨١هـ/١٢٨٢م).
- وفيات الاعيان تحقيق احسان عباس، دار صادر (بيروت ١٩٧٧).
- أبن الجوزي، أبو الفرج عبدالرحمن بن علي بن محمد (ت٥٩٧هـ/١٢٠٠م).
- المنتظم في اخبار الملوك والامم ،الدار الوطنية (بغداد١٩٩٠).
- أبن الفوطي، كمال الدين عبدالرزاق بن احمد الشيباني (ت٧٢٣هـ/١٣٢٣م).
- مجمع الاداب في معجم الالقاب، تحقيق محمد الكاظم (طهران ١٤١٦هـ).
- السمعاني، عبدالكريم بن محمد بن منصور (ت٥٦٢هـ/١١٦٧م).
- الأنساب، دار الفكر (بيروت ١٩٩٨).
- أبن المستوفي، الدين أبوالبركات المبارك بن احمد (ت٦٣٧هـ/١٢٣٩م).
- تاريخ اربل، دار الرشيد للنشر (بغداد ١٩٨٠).
- ياقوت الحموي، شهاب الدين ياقوت بن عبدالله الرومي (ت٦٢٦هـ/١٢٢٩م).
- معجم البلدان، دار أحياء التراث العربي (بيروت د.ت).

# عەشیرەتێن کوردان ل بەهدینان د چەرخێن ناڤین دا

**پ. د زرار سەدیق توفیق**
**زانکۆیا دهۆك کۆلیژا زانستێن مرۆڤایەتی**
**وەرگێران: دیان جەمیل**

بەهدینان ژی وەکی دەڤەرێن دی یێن کوردستانێ وەلاتێ چەندین هۆز و عەشیرەت و ئویجاخێن کوردی بوو، هندەك ژ ڤان هۆز و عەشیرەتان گەلەك د مەزن و بەرنیاس بوون و دەنگۆباس و بەحسێ وان د گەلەك ژێدەرێن مێژوویی و ئەدەبی دا هاتیبە کرن، لێ هندەك دی تا رادەیەکی د بچویك بوون و چ چالاکی یێن سەربازی و لەشکەری نەبووینە و چ داستان یان شەرێن هوسا ئەنجام نەداینە کو ناڤێ وان بچیتە د مێژوویێ.

## گرنگترین عەشیرەتێن کوردی یێن د ماوێ چەرخێن ناڤین دا:

### ١- بازلی

بازلی عەشیرەتەکا کوردی یە کو د ژێدەرێن مێژوویدا نەیا دیارە و رەنگە پەیوەندی ب گوندێ (بیزەلێ) یێ نهاڤە هەبیت. ژ وان کەسێن ناڤدار یێن سەر ب ڤێ عەشیرەتێ ڤە، فەقیێ شافعی و مامۆستایێ ناڤدار (شەمسەدین کورێ عەبدوولایێ کورێ داودێ بازلی یێ کوردی) ئەوێ ل سالا ٨٤٥مش/ ١٤٤١ز ل گزیرتا بۆتان هاتیبە سەر دونیایێ. ب مەرەما فێربوونا فەرمووده‌یان (الاحادیث) و خواندنێ چوویە باژێرێ تەبریزێ و دەهـ سالان مایە ل وێرێ و فێربوویە زانست وەرگرتینە، پاشی چوویە باژێرێ حەلەبێ و ل وێرێ ژی چوویە باژێرکێ (ئەلقەسیر) ل داوێ چوویە باژێرێ حەماتێ و ل وێرێ ئاکنجی بوویە و دەرس گۆتینە و فتوادانە لەوما ژی ژێدەران ئەو ب خەلکێ وێرێ دایە نیاسین[1]. و پەرتووکا (غایة المرام في رجال البخاري الی سید الانام) دەربارەی زەلامێن فەرمووده ڤەگێراین د بەرگەکێ مەزندا نڤیسییە[2].

### ٢- بەروەری بەرواری

بەرواری چەرخێن ئیسلامیێن داوێدا ئێك بوو ژ عەشیرەتێن بەهدینان، لێ چ ئامازە پێ نەهاتینە کرن ب تنێ مێژوونڤیسێ مەزن (شەرەفخانێ بەدلیسی) نەبیت کو د پەرتووکا خۆ یا ب ناڤێ (شەرەفنامە) دا ناڤێ وێ وەك (بەروەری) ئینایە[3].

## ٣- شەنبەکی

ژێدەرێن سەردەمێ عەباسییان بەحسێ چ عەشیرەتان ب ڤی ناڤی نەکرییە. لێ یەکەم ئاماژە ب ڤی ناڤی د سەردەمێ مەغولیان هاتییە کرن، ب رەنگەکی کو مێژوونڤیسان ب دروستاهی ناڤێ وێ نەئینایە بەلکو د دەستخەتەکی (مسالك الابصار) دا ناڤێ وێ وەك (تەستەکی، نەستەبکی) هاتییە (١٣٤/٣) لێ قەلقەشەندی ناڤێ وێ وەك (تەنبەکی) ئینایە[٤]، هەردیسان د ئینسکلۆپیدیا ئیسلامێدا ناڤێ وێ وەك (بەسیتەکی) هاتییە[٥].

خەلکێ ڤێ عەشیرەتێ ل دەڤەرێن چیایێن (عۆمرانی) و شکەفتا داودی ل وەلاتێ(مەرەج) د ئاکنجیبوون[٦]، مەرەج دەڤەرەکا دەشتی بوو دناڤبەرا ئاکرێ هەتا مووسل. هەردیسان عۆمرانی ژی گوندەکێ مەزن بوو ل رۆژهەلاتا مووسلێ کو هەڤسنوور بوو دگەل دەڤەرا (شۆش) و مەرج ڤەبوو کەلا وێ هاتییە هاتییە خرابکرن، ل وێ دەڤەرێ شکەفتەك هەبوو د گوتنێ شکەفتنا داودی[٧].

ئەم دشێین بێژین کو رەنگە تەستەکی شێواندنا شەنبەکیە بیتن، لێ هەکە ئەم ناڤێ وێ وەك (شەنبەکی) بخوینین، دێ بۆ مە دیار بیت کو دێ عەشیرەتا شەبەك یا نها بیت کو هێشتا خەلکێ وێ ل دەڤەرا مەرەج د ئاکنجینە و چەندین گوند ل دەوروبەرێ رۆژهەلاتا مووسلێ هەنە.

## ٤- تیراهی

ئەوژی ل دووڤ دەقەکێ ئارامی ئەوێ ژ لایێ قەشە (رامیشوع)ی ڤە ل سالا ٨٥٥مش/ ١٤٥١ز هاتییە نڤیسین دیاربوویە کو تیراهی ئێکە ژ عەشیرەتێن کوردی یێن ئێزدییان،د ڤی دەقی دا هاتییە کو بابێ شێخ عودەی شێخێ ئێزدیان ژ کوردێن تیراهی بوو ئەوێن ل هاڤینان د چوونە زۆزانان و ل زڤستانان ژی د چوونە کۆزێن دەوروبەرێن مووسلێ[٨].

## ٥- حەمیدی

حەمیدی ئێك بوو ژ عەشیرەتێن کوردی یێن مەزن و بەرنیاس د ماوێ سەردەمێ ئیسلامێ دا، خەلکێ وێ ل دەڤەرێن چیایی ل رۆژهەلاتێ مووسل د ژیان کو دەڤەرا وان د کەفتە دناڤبەرا رووبارێ زێ مەزن و خابووری دا.

ناڤێ ڤێ عەشیرەتێ ژ ناڤێ باپیرەکێ مەزنێ مالباتا حوکمدار هاتییە، یانژی رەنگە ژ ناڤێ ئێك ژ سەرکردێن وێ یێن مەزن و دەستپێکێ هات بیت، لێ ب چ رەنگان ناڤێ وێ ژ ناڤێ ئامێدیێ (العمادیة) نەهاتییە هەروەکی هندەك هوسا هزر ژێ دکەن، لەورا نەیا بەرئاقلە کو پەیوەندیەك دناڤبەرا حەمیدی و ئامێدیێ دا هەبیت.

کەڤنترین دەنگوباس دەربارەی کوردێن حەمیدی بۆ ژێدەرێن ئیسلامی یێن سالا ٢٩٣مش/ ٩٠٦ز دزڤرن، ئەوژی ل دەمێ چەکدارێن هەردو عەشیرەتێن حەمیدیی و داسنی گەهشتینە وی لەشکەری ئەوێ ب سەرکردایەتییا (محمد بن بلال الهذباني ) مەزنێ هەزبانیان سەرۆکاتییا وی دکر و شۆرش دژی (أبي الهيجاء عبدالله بن حمدان التغلبي) راگەهاندی کو ژلایێ خەلیفە (المكتفي) (٢٨٩-٢٩٥مـ/ ٩٠٢-٩٠٨ز)ڤە وەك والی بۆ دەڤەرا مووسل و دەوروبەرێن وێ هاتبوو دامەزراندن[٩].

هەردیسان (ابن حوقل) ل دەمێ سالوخەتا هەرێما چیایی (اقليم الجبال) دکەت کو تێدا بەحسێ هەبوونا هژمارەکا زۆرا حەمیدیان ل وی سەردەمی دکەت و د بێژیت (ئەڤ چیایە (مەرەما وی پێ چیایێن کوردستانێ بوون) هاتینە ئاکنجیکرن ب کوردێن حەمیدی و لاری و هەزبانی و چەندین کوردێن دی یێن شەهرەزور و سەهرورەدی)[١٠]، لێ د هەمان دەمدا (المسعودی) کو د سەردەمێ ویدا د ژیا چ بەحسێ عەشیرەتا حەمیدی نەکرییە دەمێ کو عەشیرەتێن کوردان هەژمارتین.

شەرڤانێن عەشیرەتا حەمیدی بەشدارییەکا چالاك و باش د ناڤ لەشکەرێ ئەیوبی دا هەبوو و چەندین هەلویستێن ئازا و چاڤنەترس ل دەمێ شەرێن دگەل خاچپەرێسان نیشادان، وەك (نەصرێ حەمیدی ،،النصرالحميدي) ئەڤێ ل سالا ٥٨٥مش/

١١٨٩ز ل باژێرێ عەكا هاتییە كوشتن لەوڕا گوتنەكا بناڤودەنگ د هاتە گوتن ئەوژی (فمضى حميداء و شهد مقامه فى الجنه شهيدا)[١١]، وهەكندەرێ حەمیدی مەزنێ تیپا حەمیدیان كو فرقەكا لەشكەری یا مەزن د ناڤ لەشكەرێ (مەلك عەزیزێ كورێ سەلاحەدینی) یێ ناڤدار ب عەزیزی و (بەدرەدینێ حەمیدی) ئێك بوو ژ میرێن (مەلك ناسر یوسف)ی مەلكێ حەلەب و دیمەشقێ، و سالا ٦٤٨مش/١٢٥٠ز د هەووەكا ئەیوبی دا ژبۆ سەر مسرێ ب مەرەما زڤراندنەڤا مسرێ ژ مەمالیكێن ترك، هاتە كوشتن[١٢].

ل سەر ئاستێ بیاڤێ زانستی و ڕەوشەنبیری، چەندین كەسێن زانا و بلیمەت دناڤ عەشیرەتا حەمیدی دا ڕابوون، بۆ نموونە زانا و خرڤەكەرێ فەرموودەیێن (حەدیسێن) پێغەمبەری (س.خ) (ئەبو موحەمەد عەبدوڵا كورێ موحەمەدێ كورێ یوسفی حەمیدی) بوو، ئەڤ زانایە یێ ناڤداربوو ب (ابن الاستاذ)[١٣]، هەروەسان خالد كورێ درباسێ كورێ یوسفێ حەمیدی[١٤] و موفق ئەلدین بابێ قاسمێ كورێ عومەرێ كورێ فەزلێ كوردی یێ حەمیدی كو ئێكەم كەس بوو وانە ل خواندنگەها (هەروی) ل حەلەبێ گۆتین و پاشی بۆ خواندنگەهەكا گشتی هاتە ڤەگوهاستن و نێزیكی نەهـ سالان ل وێرێ وانە گوتن (٦٣٣-٦٤٢مـ/١٢٣٥-١٢٤٤ز)، پاشی هاتە ڤەگوهاستن بۆ كارێ دادوەریێ ل باژێرێ (المعره). (ابن شداد)ی مێژوویا مرنا وی ب شێوەیەكێ شاش توومارکرییە كو دیاكرییە ل سالا ٦١٠مش/ ١٢١٣ز وەغەر كرییە[١٥].

زانا و قازیێ شافعی ئەبو عومرو عوسمانێ كورێ موحەمەدێ كورێ عەلی یێ كورێ عومەرێ كورێ موحەمەدێ كورێ موسایێ كوردی یێ حەمیدی، بۆ ئێكەم جار خواندنا خۆ ل سەر فقهێ شافعی ل خواندنگەهێن مووسلێ دەستپێكر و پاشتر بۆ بەردەوامیدانێ ب خواندنێ قەستا وەلاتێ شامێ كرییە، ل وێرێ قوتابیێ مەلا عەبدوللا كورێ بابێ عەسرونی بوو و پاشی چوو مسرێ و ل دەڤەرا (دمياط) ئاكنجی بوو و پاشی خواندنا خۆ ل مزگەفتا (الاقمر) و خواندنگەها (السيفية)ل قاهیرە تەمام كر كو ل وێرێ خۆاندن ژ شێخ بابێ حەسەنێ موقەدەسی و قازی سەدرەدین عەبدولمەلیك كورێ درباسێ مارانی ل دەڤەرا (قليوب) وەردگرت، پاشی چوویە مەكەهێ و ژیانا خۆ یا مای وەك جیرانێ ماڵا پیروز بۆراندیە، هەتا ل سالا ٦٢٠مش/ ١٢٢٣ز چوویە بەر دلوڤانییا خودێ[١٦].

هەردیسان كەسێ خودانیاس ئەبو حەسەن موزەفەر كورێ مەنوسەرێ كورێ ئەبوجەیشێ كوردی یێ حەمیدی یێ ناڤدار ب (الاطرش) كو ئێك بوو ژ كورمامێن میر موبارز كەكی ل دەڤەرا ئاكرێ ژ دایكبوویە و مەزن بوویە و پاشی وەك سەرباز گەهشتییە لەشكەرێ ئەیوبی و پشكداریی د شەرێن دژی خاچپەرێسان ل پەراڤێن شامێ كرییە و ل سالا ٦٣٣مش/ ١٢٣٥ز ل ماردینێ وەغەركرییە و پاشی هاتییە ڤەگوهاستن بۆ دەڤەرا (دەنیسەر - قوچ حەصار) و ل وێرێ هاتییە ڤەشارتن[١٧].

هەردیسان فەرمووده ڤەگێرێ حەنەفی(ئەبو ئەلحەسەن عەلی كورێ ئیبراهیمێ كورێ خشنامێ كورێ ئەحمەدێ حەمیدی) یێ ناڤدار ب (ئەلحەلەبی) ئەركێ دەرسگۆتنێ ل خواندنگەها (الجاولية) گرتییەدەست و وەك وانەبێژ مایە ل وێرێ هەتا ل سەر دەستێ لەشكەرێ مەغولان هاتییەكوشتن دەمێ ل هەیڤا سەفەرێ سالا ٦٥٨مش/ ١٣٦٠ز هاتینە د باژێرێ حەلەبێ دا[١٨]، دیسان كورێ وی (ئیبراهیم كورێ عەلی (٦٢٩-٧٠٥مـ/١٢٣٢-١٣٠٥ز)) قازیێ باژێرێ حەمصێ و ئیمامێ مزگەفتا وێ دەمێ مەغول هاتینە د باژێریدا پەیوەندی دگەل وان كرییە و مایە دگەل وان هەتا سالا ٦٩٩مش/ ١٢٩٩ز و ل سالا ٧٠٥مش/١٣٠٥ز وەغەركرییە[١٩].

شێخێ تەمەن درێژ (المعمر)(ابوالثناء) مەحموود كورێ ئەحمەدێ حەمیدیێ گەیلانیێ بەغدادیێ شافعی (پشتی ٦٢٠مش/ ١٢٢٣ز)ێ و هەڤوەلاتیێ وی شێخێ چاكێ تەمەندرێژ (الصالح المعمر) (ئەبولحەسەن عەلی نەبا(؟)كورێ صالحێ كورێ

نەصرێ کورێ یوسفێ حەمیدیێ بەغدادیێ حەنبەلی (پشتی ٦١١مش/١٢١٤ز مریە) ئەڤ هەردوکە قوتابیێن شێخ (عەبدولقادرێ گەیلانی) بوون د زەهدو وتەسەوفێ دا. هەردیسان ژ وان بوون یێن بەردەوام د خۆتبەیێن ویدا ئامادەبووینە و کەراماتێن وی ڤەدگێران[٢٠].

فەقیێ حەنبەلی و زەلامێ چاك ژ خودێ ترس عیزەدین ئەبوبەکر کورێ ئەلیاسی کورێ محەمەدێ کورێ سەعیدی کورێ محەمەدێ کورێ هارونێ حەمیدیێ کوردیێ رەسعەینی (ژ ناڤێ راس العین هاتییەوەرگرتن) ل قاهیرە ئاکنجیبوویە و هەر ل وێرێ سالا ٦٩٤مش/١٢٩٥ز وەغەر کرییە کو زانا بوو ل خواندنگەها (الصالحیە) و ئێك بوو ژ شێخێن علم الدین البرزالی[٢١].

هەژی گوتنێ یە کو عەشیرەتا حەمیدی سەرەرای مەزنی و ناڤودەنگیا وێ ل سەردەمێ عەباسییان، لێ دناڤ ژێدەرێن سەردەمێ ئیسلامێ یێ درەنگدا بەرزەبووینە و چ پێزانین ل سەر وان نەهاتینە توومارکرن کو رەنگە هاتبنە ژێکڤەکرن یان ل بن ناڤەکێ دی هاتبنە نیاسین.

## ٦- داسنی - دیسنی - داسن

داسن- دیڤە سنا ناڤەکێ مێژوویی یێ کەڤنارە و گرنگییەکا مێژوویی و ئاینی د مێژوویا کوردی یا کەڤن دا هەبوویە[٢٢]، د سەردەمێ ئیسلامێ دا زنجیرا چیایی یا دکەڤیتە رۆژهەلاتێ ب ڤێ ناڤی دهاتەناڤکرن، هەروەك دگۆتن (چیایەکێ مەزنە ل باکوورێ مووسلێ رۆژهەلاتێ رووبارێ دیجلەی[٢٣] لێ ل دەڤ ئیبن حەوقەلی و قەشە یوحەنای، دەڤەرا داسن جهەکێ بەفرەهتر ب خۆڤە دگرت، بەلکو ئەڤە ئەو ناحیەیە یاکو رووبارێ زێیێ مەزن تێرا د بۆریت[٢٤]، ژ لایەکێ دووڤە کەلا داسن ئێکە ژ وان کەلایێن کوردی یێن ژ لایێ سەرکردێن موسلمان ڤە هاتییە ڤەگرتن[٢٥]، ئەو عەشیرەت و عەشیرەتێن کوردی یێن ل چیایێ داسن ئاکنجیبووین د هاتنە نیاسین ب داسنی[٢٦].

هەردیسان ناڤێ داسن د پەرتووکێن سریانی یێن کەڤن د (سەدسالییا٢مش/٨ز)هاتییە هاتییە ئەوژی ب شێوازێ داسان[٢٧]، لێ ناڤێ وێ د هندەك ژێدەرێن مەملوکی ب شێوازێ دیسنی-دیسنی هاتییە[٢٨].

ل سالا ٢٩٣م/٩٠٦ز داسنییان ژی دگەل عەشیرەترین حەمیدی و هەزبانی شۆرشکرییە[٢٩].

عەشیرەتا داسنی ل سەردەستێ مەغولان ل ناڤەراستا سەدسالییا (٧مشەختی/١٣زاینی) تووشی دو دەردەسەریان بووینە، ئەوژی کو جهێ ئاکنجیبوونا خۆ بجهـ هێلایە و ل سەر چەندین دەڤەر و هەرێمێن دی بەلاڤەبووین، پاشی هندەك ژ ڤێ عەشیرەتێ دووبارە زڤرینە جهێ ئاکنجیبوونا خۆ، ئەلعومەری دبێژت (داسنی عەشیرەتەکا گەلەك مەزن و رێکخستی بوون، لێ دەمێ میرێ وان بەدر کورێ کیاییکی(؟) ب مال و مالباتڤە ئەو دەڤەر ب جهـ هێلایی، ئێدی عەشیرەتا وان تێکچوو و بەربەلاڤ بوون)[٣٠].

پشتی هینگێ هندەك عەشیرەتێن داسنی ل وەلاتێن شام و مسرێ ئاکنجیبووینە و ل دووڤدا ئەڤ عەشیرەتە بووینە لەشکەر د فرقەکا کوردی دا دناڤ پێکهاتنا لەشکەرێ مەملوکی[٣١]، لێ دەنگوباسێن سەرکردێن داسنی ب چ رەنگان دناڤ ژێدەرێن مەملوکی دا نەهاتینە زانین، ژ وان ژی میر بلبانێ دیسنی ئەوێ ل سالا (٧٣٠مش/١٣٣٠ز) وەغەرا داویێ کری[٣٢].

ئێك ژ قوربانیێن داسنیان ب دەستێ مەغولیان خدر (خضر) کورێ جەعفەری کورێ زادەیێ داسنی (خضر بن جعفر بن زادە الداسني) بوو د (الدرر الکامنة) ب الدشتی هاتییە کو ئەو ژی شاشی یە ئەوێ کو پەیوەندی ب هولاکوی کری، ل دەستپێکێ هولاکوی قەدرێ وی گرت و نێزیکی خۆ کر لێ پاشی لێ بکەرب کەت و کوشت و زارۆکێن وی یێن بچویك فرۆتن ب تایبەت زارۆکی وی عومەر ئەوێ جەمالەدین د هاتە نیاسین[٣٣]ئەوێ ل سالا ٦٦١مش/١٢٦٣ز ژدایکبووی. ئەڤ زارۆکە ژ لایێ کەسەکی ب ناڤێ شەرەفەدینێ هارونێ جوینی

هاتەكرين، ڤی كەسی ئەو زارۆك ب خودانكر و هەر ژ بچويكاتی فێری ستران و موزيك و ژەنینا ئامیرێن موزيكێ كر و دانا بەر دەستێ مامۆستایێن موزيكێ يێن شارەزا، د دەمەكێ زوودا ناڤودەنگێ ڤی زارۆكی بەلاڤبوو و وەك مامۆستايەكێ موزيكێ و ژەنینا ئامیرێن وێ هاتە نیاسین و هاتە شامێ و گەهشتە مەماليكان و مەلك ناصر محەمەد كورێ قەلاونی (٦٩٣-٧٤١مش/١٢٩٤-١٣٤٠ز) داخوازا وی كر و ل ديوانا خۆ دا كاری و مووچەيەك ژێ بۆ تەرخانكر.

جەمالودين عومەرێ داسنی پەرتووكەك ل سەر زانستێن موزيكێ و ژەنینا ئامیرێن موزيكێ و سترانان نڤیسا و ناڤێ وێ كرە (الكنز المطلوب فی الدوائر والضروب)، كوپيەكا دەستخەتی يا ڤێ پەرتووكێ نها ل نڤێسينگەها نيشتيمانی ل سويسرا هەيە و كوپيەكا دی يا وێنەكری ل دەڤ حاجی هاشم محەمەد ئەلرەجەب ل بەغدا يا هەلگرتی يە[٣٤].

دەربارەی مرنا وی ژی، ئەلباباني ژ حاجی خەليفەی وەردگريت و د بێژيت كو ل سالا ٨٠٠مـش/١٣٩٨ز وەغەركريە، ئەڤەژی مێژوويەكا دوورە، لێ ئيبن حەجەری مێژوويا مرنا وی ب رەنگەكێ نەديار هێلايە، پتر باوەری بۆ هندێ دچيت كو ل دەوروبەرێ سالێن ٧٤٨كـ/١٣٤٧ز مريە، ئەو ژی ل دووڤ ئەنجامێن ڤەكۆلينێ يێن ڤەكۆلەرەكی[٣٥].

هەژی گۆتنێيە كو هێژا مەسعوود محەمەد كەتيە د شاشيەكا ديرۆكيدا و هەردو كەسايەتی موزيكژەنێ ب ناڤودەنگ جەمالەدين عومەر كورێ خدرێ داسنی و كوپيكەرەكێ دی ب ناڤێ خدرێ كورێ عومەرێ كويسنجەقی ئەوێ پەرتۆكا (الآذكار) يا ئيمام نەوەوی كوپيكری (٦٧٦مـ/١٢٧٧ز مريە) سالا٧٧٦مـش/١٣٧٤ز ل دەڤەرا كويسنجەق كوپيكری تێكەلی ئێككرينە و هزركريە كو ئەڤ هەردو كەسايەتيە ئێك مرۆڤ بووينە ژبەر لێكچوونا ناڤێن وان يێن دوانەيی بێی كو ل دووڤ ژێدەرێن مێژوويی يێن باوەرپێكری بچيت، ل دووڤ ڤێ تێكەلكرنا بێ بەلگە، زندە بەحسێ دەڤەرا كويسنجەق كريە كو ل سەردەمێن چەرخێن ناڤين د بوارێن هۆنەر و موزيكێ دا د پێشكەفتنێ و وەرارێدا[٣٦].

## ٧- دونبەل - دونبەليە -دونبەلی

ب درێژاهيیا چەرخێن ناڤەراست و چەرخێن ئوسمانيياندا دونبلی عەشيرەتەكا بناڤودەنگ و خودان سەنگ بوو و دەنگوباسێن وان ژی بەردەوام دهێنە گۆتن و نا بەرزەبن، ئەوژی ژبەر رۆلێ بەرەبابكێن ڤێ عەشيرەتێ يێن كو د هەمی لقێن زانست و زانينێ دا شارەزا و ناڤودەنگ بووين. بەرەبابكێن ڤێ عەشيرەتێ ل سەر گەلەك جهـ و دەڤەرێن جودا جودا بەربەلاڤ بووينە و ژێكدوير كەفتينە. ئەلعومەری راستيیا ڤێ چەندێ دياركريە دەمێ گۆتی (دونبەلی ل وەلاتی د بەلاڤەنە و ل هەر وارەكی د ب ژالەنە)(الدنبلية متفرقين في البلاد ومتمزقين بكل واد)[٣٧]، لێ ئەم نزانين وەلاتێ وان يێ رەسەن د كەڤيتە كيرێ.

هندەك ژ خەلكێ عەشيرەتا دونبلی ل سەر دەمێ مەسعودی ل وەلاتێ شامێ ئاكنجيبووينە[٣٨]، ل داوييا سەدساليا چوارێ يێ مشەختی/ سەدساليا دەهێ زايينی عەبدولرەحمان كورێ ئەبا ئەلوەردێ دونبەلی ئێك بوو ژ كەسايەتی يێن ميرگەها دۆستەكی- مەروانی بوو[٣٩] و دبيت ئەڤ چەندە بەلگەيەك بيت ل سەر هەبوونا عەشيرەتا دونبەلی ل هەرێما جزيرێ – دياربەكرێ د هەمان سەدساليندا[٤٠].

ژ سەرهاتييەكێ كو بەرەبابكێن كوردێن دونبەلی ڤەدگێرن هاتيە كو مير عيسى باپيرێ مەزن يێ ميرێن دونبەلێ ژ گزيرتا بۆتان رەڤييە و ل دەڤەرێن ئازەربيجانێ ئاكنجی بووينە، ل وی دەمی ئێك ژ ميرێن كەڤن يێن وی دەمی دەڤەرا (سەكمان ئاباد) دايە وی، لەورا ل دووڤ دروسترين ئاخفتن و ژێدەران، وەلاتێ رەسەن يێ دونبليان ل دەڤ شەرەفخانێ بەدليسی ويلايەتا بەختی- بۆتان بوويە، لەورا هاتيە نياسين ب ويلايەتا (دونبولی بەخت)، دگەل ڤێ چەندێ ژی دونبلی مابوو ئێك ژ عەشيرەتێن هەڤپەيمان دگەل بەختی يان[٤١].

و ژ ژياننامەيا ئێك ژ كەسايەتی يێن كوردی يێن

دونبلی هوسا دهێته زانین کو ئەڤ عەشیرەته ل دەڤەرا مەلعەسایا ئاکنجیبوویە[٤٢].

تشتێ گومان تێدا نەی ئەوە کو هژمارەکا ئیجاخ و عەشیرەتێن دونبەلی ب درێژاهییا چاخێن ئیسلامی ل دەڤەرێن رۆژهەلاتا مووسلێ ئاکنجیبووینە ب تایبەت ل دەوروبەری چایێ مەقلوب و چیایێ موختار (مسالك الابصار، ٣/ ١٣٥). هەردیسان فەیرۆز ئابادی دبێژیت (٨١٧مش/ ١٤١٤ز مربیە)((دونبەل ئێك بوو ژ عەشیرەتێن کوردی ل دەوروبەری باژێرێ مووسلێ دژیان))[٤٣]

زەلامێن عەشیرەتا دونبەلی هەرچەندە ل سەر ئاستەکێ بەرتەنگ ژی بیتن هەوڵ دایە پەیوەندیێ ب مەلکێن ئەیوبیانڤە بکەن، ئەڤە چەندە بەروڤاژی عەشیرەتێن دی یێن کوردی بوو، میر سەیفەدینێ دونبەلی ل داویا سەردەمێ خەلافەتا ئەیوبییان سەرکێشیا دونبەلیان ل وەلاتێ شامێ دکر شەڕ دژی هێزێن مەغولی دکر و نەهێلا نێزیکی دەڤەرا وان بن[٤٤].

ژلایەکێ دووڤە، عەشیرەتا دونبەلی میرگەهەك هەبوو ل دەڤەرا سنووری یا دناڤبەرا ویلایەتا خۆیی و وانێ دا، و دەمێ ئەزون حەسەنی (حەسەنێ درێژ) (٨٥٧-٨٨٢مـ/١٤٥٣-١٤٧٧ز) ویلایەتا هەکاری داگیرکری و ژ دەستێ مالباتا شەنبوی (شمو) ئینایە دەرێ، ڕێڤەبرنا وێ کرە د دەستێ میرێن دونبلیان دا[٤٥].

ل سەردەمێ عەباسییان، چەندین فەقی و زانایێن بناڤودەنگ دناڤ عەشیرەتا دونبەلی دا پەیدابوون، وەك:

- فەقیێ مالکی ئەبوئەلحەسەن رزوان کورێ ئیبراهیمی کورێ مەملانێ دونبلیێ کوردی: ل دەڤەرەکا سنووری کو د ژێدەرێن ئیسلامیدا ب (الثغور) د هاتنەناڤکرن یێ ئاکنجیبوو، مەرەم ژ (الثغور) ئەو باژێرە یان کەلا بوون یێن کو دکەتنە سەر سنوورێن ناڤبەرا دەڤەرەکا موسلمانان و دەڤەرکا بێباوەران و بەردەوام ئەڤ دەڤەرە یا پڕبوو ژ سەربازگەهێن لەشکەرێ موسلمان و بێباوەران. هەردیسان ئەڤ فەقییە ئیمامێ ئێك مزگەفتێن وێ دەڤەرێ بوو و بەردەوام د چوو دیوانا حافزێ سەلەفی ژ پێخەمەت گوهداریکرنا فەرمووودەیان. سەلەفیێ یێ مەندەهۆش بوو دەربارەی بنەکۆکا (دونبەلی) و دگوت ((خودان زانینەکا مەزن و یێ داخباربوو ب مەزبەهێ مالکی))، ئەڤ زانایە هەیڤا سەفەرێ ل سالا ٥٤٤مش/ ١١٤٨ز هەر ل وێ دەڤەرێ چوویە بەر دلوڤانییا خۆدێ[٤٦].
- ڤەگێر محەمەد یان ئەبو محەمەد کورێ وەهبانێ دونبەلی د سەدسالیبا ٦ مش/ ١٢ز ژ مەزنە ڤەگێرێن فەرمووودەیان یێن شیعەیان[٤٧].
- قازیێ شافعی ئەبو عەباس ئەحمەد کورێ نەصرێ کورێ حسێنێ ئەنباری: یێ بەرنیاس ب شەمسێ دونبەلی (الشمس الدنبلي) [د معجم البلدان ب الدیبلی هاتییە کو ئەڤە ژی شاشییە ،ئێك بوو ژ دونبەلی یێن دەڤەرا مووسلێ، لێ دیرۆکنڤیسان بۆمە دیارنەکرییە کا بۆچی ناسناڤێ ئەنباری هەلگرتییە، ئەڤ قازیە هاتییە ڤەگۆهاستن بۆ باژێرێ کەربەلا و پاشی بۆ باژێرێ بەغدا و پاشی ل بنگەهێ خەلافەتا عەباسییان و بوویە بریکارێ قازیێ قازیان کەمالەدین ئەبوئەلفەزائیل یەحییا کورێ قاسمێ شەهرەزۆری (٥٩٩مش/ ١٢٠٢ز مربیە). ئەڤ قازیە کەسەکێ ڕاستگوو و دادپەروەر بوو و گەلەکێ زیرەك و ژ خودێ ترس بوو، د بریارێن خۆ دا یێ سەرکەفتی بوو و پشت بەستن ب شەریعەتێ ئیسلامێ دکر و هەوڵددا هەر کەسەك ب گەهیتە مافێ خۆ، جارەکێ چاکی دگەل یاقوتی کرییە و د دۆزەکێدا ئەو گەهاندییە مافێ وی، لەورا دەربارەی وی هاتییە گۆتن(کەسەکێ دلۆڤان ودەست پاك بوو ونەدهێلا مافێ کەسێ ل دووڤ کەسێ بچیت و د هەمی کاروبارێن خۆ دا یێ دادپەوەر بوو، چ جاران سەر خاترا کەسەکێ دەولەمەند یان هەڤالێ وی، مافێ کەسەکێ هەژار و بێ دەستەلات نەدخوار و یەکسانی ب کاردئینا)[٤٨].

پشتی هینگێ شەمسێ دونبەلی ل سەر کارێ خۆ وەك قازی مایە هەتا قازی شەهرەزوری ل سالا ٥٩٠مش/ ١١٩٤ز هاتییەلادان، پێکڤە

زڤرینەڤە مووسلێ، و وەك مامۆستا و موفتیێ خواندنگەها (النظامیة)یا دێرین و خواندنگەها (الكمالیة) هاتە دامەزراندن هەتا مرنا وی ل سالا ٥٩٨مش/١٢٠١ز یان ژی سالا ٦٠١مـ/١٢٠٤ز، ابن باطیش (٥٧٥-٦٥٥مـــش/١١٧٩-١٢٥٧ز) خودانێ پەرتووكا (طبقات الشافعیة) ئەوێ ل رێورەسمێن ڤەشارتنا وی ئامادەبووی دبێژیت(شەمسێ دونبەلی گەلەك گرنگی ددا بابەتێن پەیوەندی ب فەتوایان ڤە هەی و و گرنگیيەكا تایبەت ددا پەرتووكا (الوسیط) یا ئیمامێ غەزالی (ت ٥٠٥مــش/١١١١ز)[٤٩].

- ڤەگێرێ فەرموودەیان (المحدث) و بازرگان قەوامەدین ئەبوئەلحەسەن عەلی كورێ ئەبی بەكری كورێ سلێمان كورێ ئیبراهیمی كورێ حەسەنێ دونبەلی یێ سەر ب دەڤەرا مەلعەسایا-مالتا یا ب رەخ بازێرێ دهۆكێ ڤە، ل سالا ٥٤٨مــش/١١٥٣ز ژ دایكبوویە، ڤی كەسی كارێ بازرگانی دكر و دگەل هندێ ژی ل دووڤ فێربوونا فەرموودەیان دچوو، دبێژن كو ئەوی سەرەدانا ٤٠ بازێران كریە و گوهداریا فەرموودەیان كریە و پولێنكرینە، پاشی چوویە بازێرێ ئەسكەندەریە و ل وانێن حافزێ سەلەفی ئامادە بوویە، پاشی د رێكا خۆ دا دەمێ چوویە حەجێ د بازێرێ بەغدا را بۆریە ل سالا ٦١٧مش/١٢٢٠ز[٥٠] و هەردیسان برایێ وی سولەیمان ژی ئێك ژ ڤەگێرێن فەرموودەیان بوو[٥١].
- بەهائەدینێ دونبەلی: هەمی پێزانین هەتا نها ل بەر دەستێ مە دەربارەی ڤی زانایی بتنێ ئاڤاهیێ خانەیا قورئانێ (دار القرأن)ە یێ وی ل پایتەختێ خەلافەتا عەباسی بازێرێ بەغدا ئاڤاكری و وی دەمی وەكو خواندنگەهەكێ بوو بۆ وان كەسێن فێری خواندنا قورئانێ دبوون، ل وێ خواندنگەهێ گەلەك شێخێن مەزن وانە دگۆتن وەك تەقیێ دین عەلی كورێ عەبدولعەزیزێ ئەربیلی (٦١٠-٦٨٨مــش/١٢١٣-١٢٨٩ز) هەردیسان شێخێ قورئانخوینێن عیراقێ یێ وی سەردەمێ ل ڤێ خواندنگەهێ یێ ئاكنجیبوو ژبۆ تەفسیركرنا قورئانێ[٥٢] و عیزەدین ئەلحەسەن كورێ فەزائیلێ بەرجونی[٥٣].
- سلێمانێ دونبەلی: ئێك بوو ژ شێخێن فەیلەسوف محیێ دینێ ناڤدار ب ئیبن عەرەبی(٥٦٠-٦٣٨مـ/١١٦٥-١٢٤٠ز)[٥٤].
- حوسامودینێ دونبەلی (٦٨٣مش/١٢٨٤ز مریە) ئێك بوو ژ قوتابیێن یێن شاعر جەلالەدینێ رۆمی ( ٦٠٤-٦٧٢مــش/ ١٢٠٧-١٢٨٣ز) خودانێ (المثنوی)، خۆشتڤیترین كەس بوو ل بەر دلێ وی و شوونگرێ وی بوو د رێڤەبرن و سەركردایەتیا تەریقەتا مەولەوی ل تەسەوفێ دا، و گەلەك جاران د شعرێن خۆ دا مەتحێن وی كرینە و وەكی كورێ خۆ یێ رۆحی هەژمارتییە و ئەڤە ئێكە ژ موتەسەوفێن كورد یێن ئەڤ گۆتنە ژێ دگریت ( امسیت كردیاء واصبحت عربیاء)[٥٥].

د شێعرەكا خۆ دا بەحسێ كوردبوونا حوسامەدینی دكەت و دبێژیت:

**همجنان مقصود من زين مثنوي**
**أى ضياء الحق حسام الدين تواي**
**مثنوى أنـــدر فـــــروع در اصـــول**
**جملة أن تست((كردستي)) قبول**[٥٦].

و ژ لایەكی دووڤــە ژ ئاخفتنا ابــن الشعار (٦٥٤مش/١٢٥٦ز مریە) هوسا دهێتە زانین كو ل داوییا چەرخێ عەباسی، عەشیرەتا دونبلی دەستەلاتەكا سیاسی وەكی یا میرگەهان هەبوو، د ژیاننامەیا ئەبو ئیسحاق كورێ ئیبراهیمێ كورێ عومەرێ مووسلیێ دونبەلی (٦٣٣مش/١٢٥٣ز مریە)دا هاتییە كو بابێ وی یێ ناڤدار ب دونبەلی ژ عەشیرەتا دونبەلی نەبوو بەلكو خزمەتا وان كریە و دگەل وان كاركریە و و پێدڤیی یێن وان بۆ دابینكرینە لەوا ژ وان هاتییە هەژمارتن[٥٧]، لێ چ بەحس و دەنگوباسێن سەركردێن دونبلی دناڤ ژێدەرێن مێژوویێ دا نەهاتینە دیتن هەرچەندە جهێ ئاكنجیبوونا وان نێزیكی بازێرێ مووسلێ ژی بوو.

## ٨- ڕادکی- ڕادکانی- ڕێکانی

عەشیرەتا ڕێکانی ب ناڤێ خۆ یێ نها هەر ل دەستپێکا سەدسالیا حەفتێ یێ مشەختی/ سێزدێ زاینی هەبوو، لێ گەلەك دەنگوباسێن وان و ژیاناما مەزنێن وان د ژێدەرێن مێژوویی یێن ئەیوبییان نەهاتینە توومارکرن، تنێ ڤەگێرانەك نەبیت کو بەحسێ ئێك ژ میرێن وێ دکەت. ل سالا ٦٤٢مش/١٢٤٤ز مەلک ئەلصالح نەجمەدین ئەیوب کورێ مەلك کاملێ ئەیوبی ، میر سەیفەدین ئەبابەکرێ ڕادکی بۆ والیەتیا ویلایەتا حەران راسپارد و ل وێرێ ما هەتا سالا ٦٥٧مش/١٢٥٩ز وەغەرکری[٥٨]، ناڤێ دروست یێ ڤێ عەشیرەتێ ڕادکی یان ڕادکانی یە لێ پرانییا کوردان هەروەکی شەرەفخانێ بەدلیسی ژی گوتی ب ناڤێ ڕێکانی گازی دکەنێ[٥٩].

## ٩- ڕەهزادی

ڕەهزادی ئێکە ژ عەشیرەتێن بەرزە یێن دەڤەرا هەکاری، جهێ ئاکنجیبوونا وان دەڤەرا بامەرنێ و دەوروبەرێن وێ بوون، لێ مێژوونڤیس و گەرۆکێن موسلمان چ پێزانین ل سەر ڤێ عەشیرەتێ نەداینە، تنێ قەشەیێ سریانی یوحەنا کورێ کەلدونی(سەدسالیا ٤مش/١٠ز) نەبیت کو دیار دکەت ل گوندێ بامۆردنێ (بامەرنێ) کەسایەتیەکێ مەزن وچەلەنگ یێ ڕەهزادی هەبوو[٦٠].

هەردیسان میر عەلی کورێ داودێ کوردی ئەوێ ژلایێ خەلیفە مەعتەزدێ عەباسی(المعتضد العباسي) (٢٧٩-٢٨٩مش/٨٩٢-٩٠٢ز) وەك والیێ مووسلێ هاتیە دامەزراندن[٦١]، ئێك بوو ژ کەسێن عەشیرەتا ڕەهزادی و ناڤێ وی ل دەف ئیبنئەلئەسیری ب عەلی کورێ داودێ کورێ ڕەهزادێ کوردی بوو[٦٢].

## ١٠- زێباری

زێباری ئێکە ژ عەشیرەتێن دەڤەرا ئاکرێ و شۆش، و ب ناڤێ جهێ ئاکنجیبوونا خۆ زێبارێ هاتینە نیاسین، پەیڤا زێبار پەیوەندی ب ناڤێ ڕووبارێ زێ مەزن یێ هەیە، د زمانێ کوردی دا رامانا وێ (ڕەخ و رویێن رووباری) دهێت[٦٣].

دو سەروك عەشیرەتێن زێباری دەستەلات و ب ڕێڤەبرنا کاروبارێن دەڤەرا زێباری د ماوێ دەستەلاتداریا مەغولی یێ ئەلیخانی دناڤبەرا خۆ دا لێکڤە کرییە، ئێك ژ وان میر محەمەدێ زابی یێ دی میر شەهاب کورێ بەدرەدینێ برش بوو، و هەردویان نێزیکی ٥٠٠ زەلامێن چەکدار هەبوون.

ل داویا چەرخێ عەباسی، زێباری خودان دەستەلات و هژمارەکا باش یا ئاکنجیان بوون، بەلگە ل سەر ڤێ چەندێ ژی سەروکێ وان ئیبراهیم کورێ محەمەدی پەیوەندییەکا باش دگەل خەلیفەیێن عەباسی هەبوو و جهەکێ بەرفرەهـ کریوو د دەستاندا، و پشتی مرنا خۆ ژی کورەکێ بچووك ل دووڤ خۆ هێلا، وی ژی خۆ دا بەر سیبەرا موبارزکاکێ مازنجانیێ حەمیدی داکو وی ب پارێزیت و پشتەڤانیێ لێ بکەت[٦٤].

و ل داویا سەردەمێ مەغولیان، هژمارا ئاکنجیێن عەشیرەتا زێباری بەرەڤ زێدەبوونێ چوو، ئەوژی پشتی هژمارەکا خەلکێ عەشیرەتا مازنجانی گەهشتینێ کو لقەك بوو ژ عەشیرەتا حەمیدی یا مەزن، پشتی کو نەڤی یێن موبارزکاکێ مازنجانیێ حەمیدی نەشیاین میراتێ باپیرێ خۆ ب پارێزن، لەوڕا دەستەلات و سەرۆکاتی ل دەڤەرا ئاکرێ و شۆش و زێبارێ کەفتە دەستێن زێباریان، ل وی دەمی دەستەلات و سەرکردایەتی ل دەڤەرێن ئاکرێ، شۆش و زێبارێ کەتە دەستێ زێبارییان کو کەلایێن قەلادە، شۆش، عومران و بازیران هەبوون ئەوژی بەری کو ئەڤ دەڤەرە هەمی ب کەڤنە ژێر دەستەلاتێ میرێن ئامێدیێ[٦٥].

## ١١- سەرنچی (السرنجیە)– سورچی

ل کوردستانێ چ پێزانین ل سەر عەشیرەتا سەرنچی نینن، لێ مێژوونڤیسێن مسری ئەڤ عەشیرەتا کوردی یا بەرزە ئاشکەرا کرییە ئەوژی ب ڕێکا خەلکێ وان یێ مشەختبووینە وەلاتێ مەمالیکان، ب ڕەنگەکی کو مەقریزی ئەڤ عەشیرەتە ب ئێك ژ عەشیرەتێن کوردی دایە دیارکرن[٦٦] و فەیرۆز ئابادی دبێژیت((سەرنچ: کعرند ئێك بوو ژ عەشیرەتێن

كوردی))[٦٧].

زانایێن سەرنچی دەستەكێ بالا د زانستێن فەرمووەیاندا هەبوو و چەندین كەسێن زیرەك و بلیمەت تێدا ڕابووینە وەك ئەبا مەنسوور محەمەد كورێ ئەحمەدێ كورێ مەهدیێ سەرنچی ژ شێخێن حافزێ سەلەفی ل نسێبینێ گوهداریا فەرمودەیان ژ زاردەڤێ وی كریبە[٦٨] و بابێ ویژی ئێك بوو ژ زانایێن حەدیسێ یێن بناڤودەنگ[٦٩]، هەردیسان زانا عەلی كورێ عەبدولرەحمانی یانژی عەلی كورێ عەبدوللا كورێ عەبدولرەحامێ سەرنجی ژ شێخێن ئیبن حەجەرێ عەسقەلانی بوو، ل خواندنگەهێن مسری گوهداریا (صحیح المسلم و سنن ابی داود) كریبە ژ وان ژی خواندنگەها (البیبرسیة)، ئیبن حەجەر دەربارەی وی دبێژیت (من تشتێ كەڤن و نوی هەردو ژ وی گولێبووینە و فێربوویمە) و ل سالا ٨١٣مش/١٤١٠ز وەغەركریبە[٧٠].

نەیا دویرە ئەگەر ئەگەر عەشیرەتا سۆرچی هەر عەشیرەتا سەرنچی ب خۆ بیت ئەوژی ب بەلگەیێ نێزیكیا ناڤێن وان ل ئێكو دوو.

## ١٢- سلێمانی - سلێڤانەی

عەشیرەتا سلیمانی (سلێڤانەی) عەشیرەتەكا مەزن بوو و ژ گەلەك ئویجاخ و لقان پێكدهات كو ل باژێرێ میافارقین و دەوروبەرێن وێ خودان دەستەلاتبوون، هەردیسان ل دەڤەرێن قولب و باتمانێ هەر ژ سەردەمێ جەلائیریان وەرە، ئەڤ عەشیرەتە یا هەڤپەیمان بوو دگەل عەشیرەتا زەرەقی، لەورا دەنگوباس و بەحسێن وان هەردوكان پێكڤە د ژێدەرێن مێژوویی دا هاتینە[٧١] ژ لقێن ڤێ عەشیرەتێ : بانوكی، هوەیدی، دلخێران، بوەجیلان، زیلان، بسیان، زكزیان، بەڕازی[٧٢].

عەشیرەتا سلێمانی ب كەلایێن خۆڤە سەركێشیا عەشیرەتێن دەوروبەری خۆ ژی دكر، لەورا دهاتە هەژمارتن ئێك ژ حوكمدارێن خۆ جهی یێن ب هێز ل دیاربەكرێ و ژ سەركێشێن سلێمانی یێن بناڤودەنگ، غەرزدین یان ژی عەزیزولدین كورێ بەهائەدینی (سەدسالیا ٨مش/ ١٤ز)[٧٣] و ئیبراهیم بەگێ سلیمانی (سەدسالیا ٩مـ/ ١٥ز)[٧٤]، و روكنودینێ سلێمانی كو دگەل عەزیزولدینێ سلێمانی بوو كو ژ میرێن ژ نێزیكی میر (الظاهر عیسی الارتقی) خودانێ ماردینێ (٧٧٨-٨٠٩م/١٣٧٦-١٤٠٦ز)بوو[٧٥].

دەربارەی عەشیرەتا سلێمانیێ، بەدلیسی دبێژیت (لا یغرب عن ضمائر ناصبي رایات العدل والنصفة، وعن خواطر ناسخی لآثار الاعتساف والبدع المنكره ان نسب الآمراء السلیمانیة یرتقی إلی مروان الحمار أخر ملوك بني أمیة) و دەربارەی بنیاتێ پەیڤا سلێمانی دبێژیت (دویر نینە ناڤێ وان ژ ناڤێ سلێمان كورێ عەبدولمەلك كورێ مەروانی ژ مەلكێن مەروانی هات بیت)[٧٦].

هەژی گوتنێ یە كو ڤەگەراندنا بنیاتێ خۆ بۆ قورەیشیان ب گشتی و مالیاتا پێغەمبەری (س)ب تایبەتی و داهێنانا دارێن بنەمالان (شجرات النسب) و و دروستكرنا چیرۆك و سەرهاتی یان ژ بۆ پشت ڕاستكرنا ڤان كاران، ژ كارێن هەرە بەرچاڤ یێن میر و سەرۆكێن عەشیرەت و عەشیرەتان بوون، هەروەسان كارێ شێخ و زانایێن دینی یێن كورد ژی بوو. و ئەڤ چەندە ل كوردستانێ ژی یا بەربەلاڤبوو ب تایبەت ل دەمێ كەفتنا باژێرێ بەغدا پاتەختێ شارستانیەتا جیهانا ئیسلامی و خەلافەتا عەباسی ل سالا ٦٥٦مش/١٢٥٨ز هەتا وی رادەیی مرۆڤ مەندەهوش د ما، دەربارەی سلیمانیێ ژی هەرئێك ژ ئیبن حەجەرێ عەسقەلانی و ئەبابەكرێ تەهرانی گەلەك جاران دیاركریە كو سلێمانی ئێك ژ عەشیرەتێن كوردی یە و چ پەیوەندی ب مالباتا ئەمەویان (بني امیة)ڤە نینە..

ژ وان كەسێن بنەكۆكا وان ژ عەشیرەتا سلێمانی بوون، فەقیێ شافعیێ نابینا ئەحمەد كورێ ڕەمەزانێ كورێ عەبدوللایێ سلێمانی یێ ناڤدار (الشهاب الحلبي)، ل سالا (٨٠٨مش/١٤٠٥ز) ل دەڤەرا سلیمانیی - سیلوان ژ دایكبوویە كو ئەڤ باژێرە دهێتە هەژمارتن سەنتەرێ شارستانیێ ڤێ عەشیرەتێ و ل سالا ٨٨٠مش/ ١٤٧٥ز وەغەركریبە[٧٧]

## ١٣- سندیه- سندی

وەك ئەم دزانین چ زانیاریەك ل سەر عەشیرەتا سندی ل چاخێن دەستپێكێ یێن ئیسلامێ د مێژوویێ دا نەهاتینە، ئەگەر هەبن ژی چ رۆلەكێ سیاسی نەبوویە، ول داویا سەدسالیا حەفتێ مشەختی/ سێزدێ زاینی سندی بووینە ئێك ژ مەزنترین عەشیرەتێن كوردی، ل وی دەمی وان ملكەكێ مەزن و گەلەك كەلا هەبوون، ل دووڤ گۆتنا ئەلعومەری دیار دبیت كو سندی پترین عەشیرەتا كوردی نە ب هژماری و پترین عەشیرەتە كو ل گەلەك دەڤەران بەلاڤبوون و جهەكێ مەزن گرتی، ل وی سەردەمی هژمارا زەلامێن وان نێزیكی ٣٠ هزار شەڕكەران بوو[٧٨]. بەلێ بەری ڤانا كەسەكی ئاماژە نەدایە سندیان.

عەشیرەتا سندی شیابوون دەستەلاتا خۆ ل سەر وان دەڤەرێن چیایی دا ب سەپینن یێن دكەڤنە باشوورێ گزیرتا بۆتان و رۆژهەلاتا دیجلە، ئانكو ئەو دەڤەرا ئەڤرۆكە د بێژنێ قەزا زاخۆ، هەردیسان حكۆمەت و رێڤەبرنا باژێرك و كەلا یێن سەر ب زاخۆڤە ل سەردەمێ توركمانێن قەرەقوینلو و ئاقوینلو ب دەستێ سەرۆكێن سندی دا بوون ب تایبەت پشتی بەرزەبوونا عەشیرەتا مەهرانی لەورا ئەو دەڤەر د هاتە نیاسین ب ویلایەتا سندیان[٧٩].

هێزێن مەغولی چەندین زیانێن مرۆڤی و مادی و لەشی گەهاندینە گشت هۆز و عەشیرەتێن كوردی و دەڤەرا هەكاری و جزیرێ تووشی چەندین هەوێن مەغولیان بووینە هندەك ژ ڤان هەوان ب سەركێشیا هۆلاكوی بوون ل سالا ٦٥٧مش/ ١٢٥٩ز. ل سالا (٦٧٥مـ/ ١٢٦٨ز) مەغولان ب لەشكەرێ خۆ یێ نێزیكی ١٠ هزار شەڕكەرانڤە هێرش ئینایە سەر چیایێن هەكاری داكو شەڕێ وان كوردان بكەن یێن ل وێ دەڤەرێ د ئاكنجی[٨٠]. دگەل كارەساتێن ب سەرێ خەلكێ هاتین و بەردەوامیا هەوێن دژوار یێن مەغولان، لێ هێشتا هندەك دەڤەرێن زاخۆ مابوونە ل ژێر دەستەلاتا میرێن كوردان كو هندەك ژ وان ژی عەشیرەتێن سندی بوون.

ئێك ژ میرێن سندیان، تەوەكولێ كوردی بوو سەروكێ باژێركێ شەڕانشا نێزیكی زاخۆ بوو، ل سالا ٨١٧مش/ ١٤١٤ز كو ڤی میری ب هەڤكاریا هندەك میرێن دی یێن كورد پشكداری د هەوەكێدا دژی كوردێن ئێزدی ل لالش كر، ل دووڤدا گورێ شێخ عودەیێ كورێ مسافرێ هەكاری ئینا دەرێ و ئەو كێلا د كەتیە سەر گورێ وی ژ ناڤبر[٨١]. مێژوونڤیسێ سریانی (أدی السبرینی) دیار دكەت كو لەشكەرێ سندی ب سەر دەڤەرا ئەسبرینا دا گرت و تالانكر و كەسایەتیێ ماقویل عزیز ژی كوشت[٨٢].

زاخۆ و كەلایێن سەر ب وێڤە مانە د دەستێ مەزنێن سندیاندا هەتا چاخێ عوسمانیان، ل وی دەمی میر حەسەن كورێ میر سەیفەدینی كو ئێك بوو ژ میرێن ئامێدیێ، كەلا دهۆك ژ دەستێ داسنیان و كەلا زاخۆ ژ دەستێ سندیان ئینا دەرێ و مال و ملكێ ڤان هەردو عەشیرەتان دانە دگەل میرگەها ئامیدیێ[٨٣]، لێ مالباتا دەستەلاتدار ل زاخۆ یا سندی هەتا سەردەمێ بدلیسی ژی پیچەكا دەستەلاتێ مابوو ددەستێن وان دا[٨٤].

هەردیسان ژ بەرنیاسێن عەشیرەتا سندی ل سەردەمێ مەملوكی یێ ئێكێ، ئیبراهیم كورێ حەسەن كورێ عەلیێ سندی بوو ((بنیاتێ وی بۆ ئێك ژ عەشیرەتێن كوردی د زڤڕیت)) خویندكارێ هەڤوەلاتیێ خۆ عەبدولواحد كورێ عەلیێ هەكاری بوو، و ل سالا ٦٨١مـ/١٢٨٢ز یێ ساخ بوو[٨٥].

هەردیسان ژ بەرنیاسێن ڤێ عەشیرەتێ ل داویا چەرخێن ناڤەراست، قازی شەهبەدین ئەحمەد كورێ یوسفی كورێ حسێنێ سندیێ حەسكێفی بوو، ل دەڤەرا حەلەبێ بوویە قازی و هەر ل وێرێ ئاكنجیبوویە ، زانا و شارەزایەكێ مەلەڤان بوو د زانستێن دینێ دا، هەردیسان هژمارەكا شرۆڤەكرن و تیبینی و كومێنتان ل سەر ماكە پەرتووكان دنڤیسین، وەك:

- كشف الدرر فی شرح المحرر للرافعی القزوینی (ت ٦٢٣مـــ/١٢٢٦ز). د چوار بەرگاندا ل سالا، ٨٨٢مش/١٤٧٧ز ب داویئینایە.
- شرح طوالع الانوار فی علم الكلام للقاضی البیضاوي (ت ٦٨٥م/١٢٨٦ز).

- شرح فصوص الحكم للشيخ محي الدين ابن عربي (ت ٦٣٨هـ/١٢٤٠م).
- حاشيه بأسم تحفه الفوائد في شرح العقائد للشيخ نجم الدين النسفي(ت ٥٣٧هـ/١١٤٢م) و يێن دی.

ڤی زانای سالا ٨٩٥مش/١٤٩٠ز وەغەرا داویێكرییە[٨٦].

هەردیسان كورێ برایێ وی زانایێ شافعی ئەبوبەكر كورێ ئیسماعیلی كورێ یوسفێ سندیێ حەسكێفی یێ ناڤدار ب (الترابی) ل سالا ٩٢٠مـ/١٥١٤ز ل ئامێدیێ وەغەركرییە و دانەرێ پەرتووكا (شرح القصاری فی التعریف) بوو[٨٧].

## ١٥- سوحبەتی و عەدەوی

ب درێژاهیا مێژوویێ كوردێن ئێزدی ب چەندین ناڤان هاتینە نیاسین وەك (داسنی، تیراهی، عەدەوی، سوحبەتی) و ئەلمەقریزی د گۆتنەكا خۆ دا دەربارەی هەوا میرێن كورد بۆ سەر مەزارگەهێ شێخ عودەی كورێ مسافرێ هەكاری ل سالا (٨١٧مش/ ١٤١٤ز) دا دیار دكەت كو مرید و دویفكەفتی یێن شێخ عودەی ل وی سەردەمی (سەدساليیا نەهێ مشەختی/ پازدێ زایینی) ل دەڤ كوردان ب سوحبەتی د هاتنە نیاسین[٨٨]و گومان تێدا نینە كو ژ پەیڤا (الصحبة) ئانكو هەڤالێن شێخی هاتییەوەرگرتن، بەری هینگێ ژی ( سەدسالیا حەفتێ مشەختی/١٣ زایینی) ب عەدەوی د هاتنە نیاسین[٨٩].

## ١٦-كیكان - كیكی

كیكی ئێك ژ عەشیرەتێن كەڤنێن دەڤەرا مووسلێ بوون و هەتا نهاژی ل وێرێ مانە، و هەر ژ سەردەمێ عەباسی هاتینە نیاسین[٩٠]، كیكانان (یانژی هندەك ژ وان) ژیانەكا كۆچەری دژیان و پەز ب خوداندكر، دناڤ وەرزێن سالێدا ل دووڤ چەروانان جهێن خۆ د گوهۆرین، زڤستانان ل دەشتێ د ئاكنجی بوون و ل داویيا وەرزێ بهارێ د چوونە جهێن خۆدانكرنا پەزێ خۆ ل زۆزانان، لەورا پەزێ خۆژی ب ئەرزانی ل بازارێ مووسلێ د فرۆت، د پەرتووكا (الكامل)دا ب شاشی ناڤێ وان بوویە كلیكان[٩١].

سەركردێن كیكانان گەهشتینە ئەیوبیان و چووینە مسرێ، لێ رۆلێ وان یێ سیاسی د مێژوویيا ئەیوبییاندا نەیێ دیارە، ژ وان ژی میر عیزەدین خدر كورێ محەمەدێ كیكانی كو وی و براێن خۆ ل داویيا سەردەمێ ئەیوبیان گەلەك بیستانێن تری و قەسپان ل ویلایەتا فەیومێ ل مسرێ هەبوون[٩٢].

ژ میرێن كیكی یێن ناڤدار ل كوردستانێ، میر نورەدین بزغك(؟) كورێ میر عیزەدین موسایێ كیكانی دهێتەنیاسین، ئەو ژ وان میرێن كێم بوو ل مووسلێ ل سەردەمێ داگیركرنا مەغولان بۆ كوردستانێ ، خۆ رادەستی مەغولان كر، لەورا مەغولیان ژی پارچەیێن عەردی و بیستان دانێ و كرە پارێزڤان و چاڤدێرێ رێكا بازرگانییا ناڤبەرا هەولێر- مەراغە، و پاشێ ل مەغولان پشتەرێبوو و هندەك دەڤەرێن وان ل دەوروبەرێ وەلاتێ ئەربیلێ تالانكرن و هێرش برنە سەر یەكەیێن لەشكەرێ مەغولی و ل دووڤدا سالا ٦٦٠مش/١٢٦٢ز گەهشتینە مەلك (الظاهر بیبرس المملوكی) كو خال و برایێ وی و نێزیكی ٥٠ شەركەران دگەل دا بوون[٩٣].

هەردیسان ژ ناڤدارێن كیكی ل دەڤەرا شامێ، قازی شەمسەدین محەمەد كورێ یوسفێ كوردی یێ ل سالا ٦٩٤مش/١٢٩٥ز وەغەركری و ل قودسێ هاتییە ڤەشارتن[٩٤]. ل سەردەمێ ئەڤرۆ كیكان دهێنە نیاسین ب كیكی و چ پەیوەندی دگەل كاكەییان نینە.

## ١٧- مارانی

مارانی دهێتە هەژمارتن ئویجاخەكا مەزن و ب ناڤودەنگ ژ هۆزا هەزبانی یا مەزن، و ب درێژاهیا سەردەمێ عەباسییان وەلاتێ وان د كەڤتە دەڤەرێن (مروج ژێریا مووسلێ) ئانكو دەڤەرا بەردەرەشا وحەفت عەشیرەتان یا نها[٩٥].

مارانی ل سالا ٣٠٩مش/٩٢١ز ژ دەولەتا عەباسی پشتەرێبوون، لەورا خەلیفە موقتەدیری (٢٩٥-٣٢٠مش/٩٠٨-٩٣٢ز) محەمەد كورێ نەسرێ

(الحاجب) کرە والیێ شەری ل سەر مووسلێ و دەوروبەرێن وێ، ئەڤ والیێ عەباسیی شیا سەرکەفتنێ ل سەر کوردێن مارانی بینیت و و ل دووڤدا پتر ژ ٨٠ زەلامێن مارانی گرتن و گرێدای فرێکرنە بەغدا[٩٦].

بنەمالا (بنو درباس) قازیێن وەلاتێ مسرێ، بنەکۆکا وان بۆ کوردێن مارانی د زڤریت، ژ وان ژی:

- صەدرەدین عەبدولمەلك کوری عیسایێ کورێ درباسێ کورێ فیرێ کورێ جەهەمێ کورێ عەبدوسێ مارانی قازیێ قازیێن مسری یێ سەلاحەدینێ ئەیوبی و کورێ (الملك الآفضل) هەر ژ سالا ٥٦٦مش/١١٧٠ز ڤە، صەدرەدین سالا ٥١٧مش/١١٢٣ز ل دەڤەرا مروج ژ دایکبوویە و هەر ل مسرێ ل سالا ٦٠٥مش/١٢٠٨ز وەغەرکریە[٩٧].
- قازی زیائەدین عوسمان کورێ عیسا کورێ درباسێ مارانی (٥١٦ – ٦٠٢مش/ ١١٢٢ – ١٢٠٥ز) ئێك بوو ژ وان کەسان یێن گەلەك ل دووڤ فێربوونا فەرموودەیان گەریای و گەلەك خواندی و گەلەك نڤیسای و عومەر کورێ عیسای کورێ درباسێ مارانی و قازی محەمەد کورێ عەبدولمەلکێ مارانی (٦٥٩مش/١٢٦١ز مریە) و محیێ دین کورێ عەبدولمەلکی و گەلەکێن دی[٩٨].

هەردیسان ژ کەسێن دی یێن بنەکۆکا وان بۆ عەشیرەتا مارۆنی دزڤریت، خۆتبە خوێنێن گوندێ (کرمیە) کو دکەڤیتە مروج، ژ وان ژی عومەر کورێ لویز کورێ عەبدوللا کورێ ئەلحەسەن ئەبو خەلیلێ مارانی خۆتبەخوێنێ گوندێ کەرەمیێ و بابێ وی و باپیرێ وی ژی بەری وی خۆتبەخوێن بوون[٩٩].

## ١٨- محەمەدی

مێژوونڤیس نەشیاینە ب دروستاهی جهێ ئاکنجیبوونا عەشیرەتا محەمەدی دیار بکەن (هندەك مێژوونڤیسان دیارکریە کو ل چیایەکی ژ چیایێن مووسلێ د ئاکنجیبوون)[١٠٠]، و دویر نینە حەمیدی ئەو ب خۆ یان ژی بەشەك بن ژ وان ، هەردیسان محەمەدی گوندەکە ل دەڤەرا داسن ل رۆژهەلاتێ مووسلێ و وان دەڤەران یێن رووبارێ زێ مەزن تێرا دبۆریت، (أبن حوقل) د ڤێ دەڤەرێ را بوریە و ئێك بوو ژ دەڤەرێن ژێر دەستێ میر محەمەد کورێ حەسنونێ کوردی[١٠١]، ئەڤ گوندە ب خۆ ژی جهێ ژدایکبوونا شێخ خدرێ کورێ ئەبوبەکرێ کورێ موسایێ مەهرانی بوو (٦٧٦مش/١٢٧٧ز مریە) شێخێ (الملك الظاهر بیبرس المملوکي)، ژێدەرێن مسری ژی ب دەڤەرێن سەر ب جزیرا کورێ عومەری-بۆتان هژمارتیە، کو ئەڤ دەڤەرە ئێك ژ سەنتەرێن شارستانی بوو ل دەڤەرێن نێزیکی باکوور و رۆژهەلاتا مووسلێ[١٠٢]. محەمەدی ئەو عەشیرەت بوو یا گوندێ محەمەدی ئاکنجی بووی و ناڤێ عەشیرەتا خۆژی هەر ژ ناڤێ گوندی وەرگرتیە بیت یانژی د بیت گوند ب ناڤێ عەشیرەتێ هاتیتە ناڤکرن، ل سەردەمێ مەغولیان (شەروین) سەروکێ ڤێ عەشیرەتێ بوو و نێزیکی ٦٠٠ زەلامان هەبوو[١٠٣].

## ١٩- مزووری

مزووری ئێك بوو ژ وان عەشیرەتێن دی یێن کو ل سەردەمێ سەدسالیا ئیسلامی یێ ناڤەراست هەبوون، ئەڤ عەشیرەتە ژی وەکی عەشیرەتا بەرواریان بوو کو مێژوویێ گەلەك پێزانین ل سەر تومارنەکرینە، بتنێ شەرەفخانێ بەدلیسی نەبیت کو ئێکەم کەس بوو ئاماژە ب ناڤێ وێ کری[١٠٤].

## ٢٠-مەهرانی-میرانی

مەهرانی عەشیرەتەکا ب ناڤودەنگ بوو ل سەردەمێ عەباسییان و گەلەك کەلا و ئاسێگەهێن شەری ل دەڤەرا چیایی یا د کەتیە باکوور و باکوورێ رۆژهەلاتێ مووسلێ هەبوون، رۆلێ وان یێ سیاسی د سەدسالیا پێنجێ و شەشێ مشەختی/ یازدێ و دوازدێ زایینی یێ بەرچاڤبوو. ئەڤ عەشیرەتە ل دەڤەرا حەسەنیێ (زاخۆ) و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە یا ئاکنجیبوو، گەلەك خانی و کەلا و ئاسێگەهـ هەبوون.

ئەلمەسعودی دناڤ لیستا هۆز و عەشیرەتێن

کوردی دا چ بەحسێ مەهرانییان نەکربوو، هەردیسان چ بەحسێ ڤێ عەشیرەتێ د ژێدەرێن مێژوویی یێن بەری سەدسالیا پێنجێ مشەختی دا نەهاتییە، هەژی گوتنێ یە کو دڤێت جوداهیێ دناڤبەرا عەشیرەتێن مەهرانی و مارانی دا بکەین، مارانی د بنیات دا لقەك بوون ژ عەشیرەتا هەزبانی یا مەزن و ل دەڤەرا (مروج) ژێرێ مووسلێ ئاکنجیبووین.

عەشیرەتا مەهرانی هەتا نهاژی ناڤێ خۆ پاراستییە و پتر هزر بۆ هندێ دچیت عەشیرەتا میرانی هەمان ئەڤ عەشیرەتەیە، هندی پەیوەندی ب دەستەلاتێ سیاسیێ ڤێ عەشیرەتێ ڤە هەی، ژێدەرێن مێژوویی دیاردکەن کو مەزناتی و دەستەلات ل دەڤەرا زاخۆ ژ وان هاتییەڤەگوهاستن بۆ عەشیرەتا سندی، ب تایبەت ئەڤە ژی د سەردەمێ داویێ یێ عەباسیاندا پشتی کو هژمارەکا میرێن مەهرانی دگەل زەلامێن خۆ گەهشتینە لەشکەرێ ئەیوبی، پاشتر ژی دێ دیارکەین.

دەمێ دەولەتا ئەیوبی ل مسرێ هاتییەدامەزراندن، پتریا میرو خودانێن کەلایێن مەهرانی گەهشتینە سەلاحەدینێ ئەیوبی و هندەك ژ وان بووینە مەزنە سەرکردێن لەشکەرێ ئەیوبی ب تایبەت د شەرێن دژی خاچپەرێساندا، سەرکردێن کورد یێن مەهرانی رۆلەکێ مەزن د ئازادکرنا قودسێ دا هەبوو، ژ وان سەرکردان:

- میر فەتحەدین ابا تالب حەسەن کورێ عەبدوللایێ مەهرانی (٥٦٨مش/١١٧٢ز مریبە)، ل دیمەشقێ وەغەرکریبە ئاخا مەهرانی ل وێرێ بۆ وی دزڤریننەڤە.
- میر ئیبراهیم کورێ حسێنێ مەهرانی د دەمێ ئابلوقەدانا عەسقەلانێ سالا ٥٨٣مش/ ١١٨٧ز هاتییە کوشتن.
- میر درباسێ مەهرانی.
- میر ئەبازێ مەهرانی ل هەیڤا شەوالێ سالا ٥٨٧مش/ ١١٩١ز هاتییە کوشتن و ئێك بوو ب مێرخاسیا خوێ ناڤدار بوو.
- میر حسامەدین حسین کورێ باریکێ مەهرانی.
- میر محەمەد کورێ باریکێ مەهرانی و ((ئێك بوو ژ مێرخاسێن ئیسلامێ)) و یێن دی[١٠٥]
- میر شەمسەدین شیروە کورێ حسێنێ مەهرانی یێ ناڤدار ب (سبع المجانین ٦٤٢مش/١٢٤٤ز مریبە) خودانێ توربا مەهرانی و (رباط المهرانی) خواندنگەها (المجنونیە) ل دیمەشقێ.

میرێن مەهرانی شیابوون هەتا داویا سەردەمێ عەباسی پشکەکا دەستەلاتێ خۆ ل سەر کەلایێن خوێن ئاسێ ب پارێزن، دوا میرێ مەهرانی ب ناڤێ ئەیوبێ مەهرانی دگەل چەند میرەکێن دی یێن دەڤەرێ ئەوێن د خزمەتا ئەرتوکیاندا ب دەستێ مەغولییان هاتییە کوشتن و کەلایێن وان هاتینە داگیرکرن ژلایێ مەغولیان ڤە [١٠٦].

## ٢١- هەزار مەردی- هەزار مێردی

هەزارمەرد، هەزارئەسپ، ئێکە ژ ناڤێن بەرنیاس د مێژوویا کوردی یا ناڤیندا، و ژ ناڤێن ناڤدارە[١٠٧].

مە چ دەڤەرێن جوگرافی د وەلاتێ کورداندا ل سەردەمێ چەرخێن ناڤین ب ناڤێ هەزارمەردی نەدیتینە، فاتما کچا ئەحمەدێ کوردیێ هەزارمەردی مالباتا ناسرولدەولە ئەلحەسەن کورێ عەبدوللایێ حەمدانی (٣١٧ – ٣٥٨مش/٩٢٩/٩٦٨ز) ژ هەزار مردی یان بوو[١٠٨]، و هەزار مێرد نها ناڤێ شکەفتەکا دیرۆکی شوینەواریا کەڤنە ل پارێزگەها سلێمانیێ، لێ ئەم نزانین هزار مەرد ناڤێ جهەکێ جوگرافی یە یانژی ناڤێ عەشیرەتەکا کوردی یە؟

## ٢٢-هەکاری

هەکاری ئێك ژ مەزنترین عەشیرەتێن کوردی یێن سەردەمێ عەباسییانە و ژ سەردەمێ ئەیوبییان و هێرڤەتر ناڤدارترینا وانە، ب ناڤێ جهێ ئاکنجیبوونا خۆ وەلاتێ هەکاریێ سەر ب مووسلێ مەلبەندێ هەرێما جزیرێ- دیاربەکرێ هاتییە ناڤکرن، دیارە کو ئەو ژ هژمارەکا عەشیرەتێن بچویك پێکدهێت کو مینا هەڤپەیمانیەکا عەشیرەتییە، ژبەرکو هەر ژ سەردەمێن کەڤن هەتا نهاژی گەلەك هۆز و

عەشیرەتێن کوردی ل دەڤەرا هەکاری ئاکنجیبوویە، لێ ناڤێ پتریا عەشیرەتێن بچویک دناڤ چ ژێدەران دا نەهاتیە و دبیت ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ هندێ بیت کو وان پشکداری د چ رودانێن میژوویی یێن گرنگ دا نەکر بیت. لەورا ژێدەرێن میژوویی ناڤێ دەڤەرا هەکاری بۆ وان هەمی عەشیرەتان ب کارئینایە، ب تایبەت وان عەشیرەتان یێن ل کەلایێن ئامێدیێ و جولەمێرگێ ئاکنجیبووین و تشتێ سەیر ل ڤێرێ ئەوە کو ئەلمەسعودی چ ئاماژە ب ڤێ عەشیرەتێ دناڤ لیستا عەشیرەتێن کوردی دا نەکریە، لێ ئێکەم ئاماژە پێکرن بۆ ڤێ عەشیرەتێ د میژوویێ دا دزڤریت بۆ سالا ٣٦٩مش/ ٩٧٩ز[١٠٩]، و هەکاری دهێنە هەژمارتن ئێک ژ پێشەنگێن عەشیرەتێن کوردی یێن دەستەلاتەکا عەشیرەتیی و نیمچە سەربەخۆ دامەزراندی و دەستەلاتا خۆ بەرفرەهـ کریە ل سەر کەلایێن وەلاتێ هەکاری یێن ئاسێ ئەوێن زنجیرەکا چیایێن مەزن ل دەوروبەری وان هەین.

هەردیسان دەڤەرێن هەکاری یێن چیایی و ئاسێ بووینە جهەکێ ئێمن و ڤەشارتی بۆ قەشە و بانگخوازێن ئایینی مەسیحیەتێ ئەڤێن ژبەر لەشکەرێ بیزەنتی یان ژی ژبەر زەلامێن ئایینیێن جوهیان ل وەلاتێن شام و مسرێ د رەڤین، و ئەڤ چەندە ئێك بوو ژ وان رێکان یێن بووینە ئەگەرێ بەلاڤبوونا ئایینێ مەسیحی ل دەڤەرا هەکاری و جزیرێ هەر ژ سەدسالیا سیێ یێ زاینی و ئەڤ ئاینە ل دەڤ گەلەك ئاکنجی یێن وێ بەلاڤبوویە هەتا ل سەردەمێ ئیسلامێ ژی دەڤەرا هەکاری یا پربوو ژ دێر و کەنیسەیێن مەسیحی[١١٠].

دگەل بەرفرەهبوونا دەستەلاتا ئەسەدودین شێرکو و برازایێ وی سەلاحەدینی ل شامێ، هژمارەکا میر و سەرۆکێن هەکاری گەهشتینە لەشکەرێ ئەیوبی و هندەك ژوان بووینە سەرکردێن مەزن دناڤ لەشکەرێ وی دا. عەشیرەتا هەکاری دگەل زەلامێن عەشیرەتا هەزبانی و حەمیدی و زرزاری و مەهرانی بووینە پشکەکا هەرە گرنگ ژ لەشکەرێ ئەیوبی ب درێژاهیا سەردەمێ ئەیوبی و پتریا وان ل دەڤەرێن شام و مسرێ ئاکنجیبووینە، هندەك ژ وان سەرکردان ئەڤەنە:

- میر سەیفەدین ئەبولحەسەن عەلی کورێ ئەحمەدی کورێ ئەبا هەیجا یێ بەرنیاس ب (المشطوب الهکاري)، نەڤیێ میر (أبي الهيجاء)، ئەو (میرێ کوردان و مەزنێ وان بوو) و ناڤدارترین میرێن کوردان بوو د لەشکەرێ سەلاحەدینێ ئەیوبیدا سالا ٥٨٨مش/١١٩٢ز م وەغەرکرییە.
- میر عیمادەدین ئەحمەد کورێ سەیفەدین (المشطوب الهكاري)، ل سالا ٥٧٥مش/ ١١٧٩ز ژ دایکبوویە و ل سالا ٦١٩مش/ ١٢٢٢ز ل زیندانێ وەغەر کرییە، و مەزنترین میر بوو ل مسرێ و هەمی سەروکێن دی یێن کورد ل بن گوهداری و چاڤدێریا وی بوون.
- میر بەدرەدین محەمەد کورێ ئەبا قاسم کورێ محەمەدێ هەکاری ئێك بوو ژ مەزنە سەرکردێن مەلك ئەلموعەزەمێ ئەیوبی (الملك المعظم الايوبي) و ئێك بوو ژ شیرەتکارێن وی یێن نێزیك و خودانێ گەلەك هزرێن جوان و بناڤودەنگ بوو ل شەرێ دژی خاچپەرێسان، ل قودسێ خواندنگەها شافعی دروستکرییە و وی ب خۆ سەرپەرشتیا وێ کرییە و دگەل میرەکێ دی یێ کورد ب ناڤێ سیف الدين بن المرزبان شەرکرییە د شەرێ دگەل فرەنجێن خاچپەرێسان ل سالا ٦١٤مـ/ ١٢١٧ز.
- خەلیلێ هەکاری (الحاجب) ل شەرەکێ مەزن ل عەکا هاتییە کوشتن سالا ل ٥٨٥مش/ ١١٨٩ز.
- میر مەجلی کورێ مەروانێ هەکاری ل شەرەکێ مەزن دا هاتییە کوشتن.
- میر زەهیرێ هەکاری (الظهير الهكاري) ئەوێ بەرنیاس ب زانین و دین و چاڤنەترسیێ و برایێ وی یێ زانا عیسایێ هەکاری، ئەڤ هەردو برایە هاتینە ئێخسیرکرن ل سالا ٥٧٣مش/ ١١٧٧ز، زهیر د شەرەکێ مەزن دا کو ب (الوقعة الكبرى) دهێتە ناڤکرن هاتییە کوشتن و دەمێ هەرسێ سەرکردێن کورد و یێن دی (ژ مێرخاسێن خۆراگرێن مەیدانا شەری) هاتینە کوشتن،کەسەکێ وەسان نەما بەرسنگێ لەشکەرێ خاچپەریسان

بگریت و وان هێرش ئینا ناڤ جەرگێ لەشکەرێ موسلمانان و بەرێ خۆدا وی گری یێ خیڤەتا سەلاحەدینێ لێ و نێزیك بوو وی ئێخسیر بکەن.

- زانا عیسایێ هەکاری کو کەسەکێ زانا (فقیه) و سەربازەکێ چاڤنەترس و دلۆڤان بوو، شیرەتکارێ سیاسی و عەسکەری یێ سەلاحەدینی بوو، و بەری هینگێ ژی خزمەت دگەل لەشکەرێ ئەسەدەدین شێرکوی هەبوو، ل سالا ٥٨٥مش/١١٨٩ز وەغەر کرییە.
- میر عیزەدین عومەر کورێ مەجلیێ هەکاری ئێك بوو ژ میرێن مەلکـ (الملك الاشرف موسی (٦١٥-٦٣٥مش/ ١٢١٨-١٢٣٧ز)کورێ مەلکێ ئەیوبیێ دادپەروەر (الملك العادل الايوبی) و سەرکێشێ لەشکەرێ حەلەبێ، ئەڤ کەسە ( د مێرخاسیێدا ل ئاستێن هەرەبلند و خودانێ پەسنێن جوان و رەوشتێن مەردانە) بوو[111].

ژئالیەکێ دووڤە وەلاتێ هەکاری پەیدابوونا مالباتا مەنگەلان ب خۆڤەدیت، و پایتەختێ وێ کەلا جولەمێرگێ بوو، ئەڤە مالباتەکا دی یا هەکاری بوو و هێدی هێدی جهێ مالباتا (ابي الهيجاء) گرت و هێدی هێدی بنگەهێ عەشیرەتا هەکاری ژ کەلا ئامیدیێ ڤەگوهاستە جۆلەمێرگێ[112].

## ٢٣-یەعقوبی

ژ وان عەشیرەتان یێن ل رۆژهەلاتێ مووسلێ ئاکنجی، ل سەدساڵیا سێ مشەختی/نەهێ زاینی ل (مـرج)ا مووسلێ بوون و زەلامێن وێ گەهشتبوونە هێزێن خەوارجان ئەوێن ل وی دەمی ل هەرێما جزیرێ چالاکبووین، و سەروکێ وان موساور کورێ عەبدولحەمیدێ شاری بوو، و پشتی مرنا وی سەرۆکاتی بۆ هارون کورێ عەبدوللایێ بجلی هاتە ڤەگوهاستن ، ل وی دەمی کوردێن یەعقوبی بووینە خودان بزاڤەکا خەوارجان یا سەربەخۆ، لەشکەرێ خەلیفەی ل سالێن و ٢٥٨مش/٨٧٢ز، ٢٦٦مش/٨٨٠ز، ٢٧٣ مش/ ٨٨٧ز سێ جاران شەرێ وان کرییە، ل شەرێ داویێ ئەوێ ل جهێ (سوق الاحد) دەوروبەرێن مووسلێ هاتیەکرن سەرکەتن باهرا یەعقوبیان بوو[113].

د سەدساڵیا دووڤدا، ئەلمەسعودی ئاماژە ب یەعقوبیان کرییە و گوتیە کو ئەو دگەل عەشیرەتا جورقان هەردو ل سەر دینێ نەسرانی بوون، ب رەنگەکی کو شاشبوویە و نەشیایە جوداهیێ بکەتە دناڤبەرا یەعقوبی و یەعاقبیان کو یەك ژ کۆمێن نەسرانیان بوون، و وارێ یەعقوبیان ب (پشتا مووسلێ و چیایێ جۆدی) دەسنیشانکرییە[114]، وئەڤە ژی وێ چەندێ دگەهینیت کو وان ژ وەلاتێ خۆیی رەسەن (مروج) کۆچکرییە و دبیت ئەڤە ژی ژبەر تەنگاڤکرنا وان بیت ژ ئالیێ لەشکەرێ مووسلێ ڤە، یان ژی وان ل چەروانێن خۆیێن هاڤینی ل بەتەنێن چیایێ جودی هاڤینا خۆیا گەرم بۆراندییە. و ژ سەدساڵیا چوارێ مشەختیڤە دەنگۆباسێن وان دیار نامینن.

## ژێدەر و پەراوێز:

١. السخاوي ،الضوء اللامع، ٢٤٠/٧، الحنبلي، شذرات الذهب، ١٣٨/٨)
٢. حاجی خلیفه،کشف الفنون، ٢/ ١٩١)
٣. شرفنامه، ص ٢٥٧)
٤. صبح الأعشی، ٣٧٨/٤)
٥. کرد در دائرة المعارف اسلام، ص٧٢)

٦. العمري، مسالك الإبصار، ١٣٤/٣)
٧. معجم البلدان، ١٥٣/٤)
٨. الحسني، اليزيديون، ص١٧)
٩. الكامل ١١٢/٦)
١٠. صوره الارض، ص٣١٥)
١١. العماد الاصفهاني، الفتح القسي، ص٤٦٤)
١٢. ذيل الروضتين، ص١٨٦، تاريخ الاسلام، ص ٥٩-٦٠، السلوك، ٣٧٥/١)
١٣. تاريخ اربل،٢٧١/١)
١٤. ابن الشعار، قلائد الجمان، ١٨٣/٣)
١٥. الاعلاق الخطيره، ٢٥٧/٢/١، ٢٦١)
١٦. المنذري ،التكملة لوفيات النقلة، ٩٧/٣، السبكي ،طبقات الشافعية الكبرى، ٢٩٣/٨ )
١٧. التكملة، ٤١٧/٣-٤١٨)
١٨. الاعلاق الخطيره، ٢٢٧/١/١، الوافى بالوفيات، ٩/٢٠)
١٩. ابن حجر،الدرر الكامنة، ٣٠/١)
٢٠. الشطنوفي ،بهجة الاسرار،ص١٣٠٦)
٢١. تاريخ البرزالى، ٤١٢/٣)
٢٢. بنێرە: گوڤارا لالش، هژمارە (٦)، (دهۆك- تەباخا ١٩٩٦، بپ١٠٦-١١٢)
٢٣. معجم البلدان، ٤٣٢/٢)
٢٤. صورة الارض، ص. ٢٦٠،تاريخ يوسف بوسنايا،ص٥٦،٨٢ )
٢٥. فتوح البلدان، ص٣٢٧)
٢٦. معجم البلدان، ٤٣٢/٢)
٢٧. ايشوعدناح البصري، الديوره في مملكتي الفرس والعرب،ص٣٣،٤٨،٨١)
٢٨. التعريف،ص١٤٩، السلوك،٣٢٧/٢)
٢٩. الكامل، ١١٢/٦)
٣٠. مسالك الامصار، ٣/ ١٣٤—١٣٥)
٣١. التعريف، ص ١٤٩)
٣٢. السلوك،٣٢٧/٢)
٣٣. هديه العارفين، ٧٩١/١ ب جەلالەدین هاتییە كو نەراستە)
٣٤. الدرر الكامنة، ٩٧/٣، كشف الفنون، ٢/ ٤٣٧، الباباني، هدية العارفين، ٧٩١/١، فارمر، مصادر الموسقىٔ العربية،ص١٦، ١٠٣)
٣٥. كشف الظنون، ٤٣٧/٢، هديه العارفين، ٧٩١/١، عبدالرحمن مزوری، مشاهير الكرد، الفنان عمر الداسني، ترجمه عيدو بابة شيخ، مجلة لالش، العدد (٢-٣)، دهۆك، ١٩٩٤، ص ١٩٥-١٩٦)
٣٦. حاجى قادرى كويى، ٣٦٠/١-٣٦٤)
٣٧. مسالك الإيصار، ١٣٥/٣)
٣٨. مروج الذهب، ١٢٤/٢)
٣٩. تاريخ الفارقي ص٩٣)
٤٠. حضاره الدولة الدوستكية، ص٢١٠)
٤١. شرفنامة، ص٢٧٤، ٥١٣-٥١٥)
٤٢. معجم الألقاب، ٥١١/٣)

٤٣. القاموس المحيط، ٢/ ١٣٢٣، توضيح المشتبه، ٧٠/٤)
٤٤. مفرج الكروب،٦/ ٣٠٧ ، تأريخ أبو الفداء، ٣٢٠/٢)
٤٥. شرفنامه،ص ٢٣٩)
٤٦. معجم السفر، ١٩٦/١)
٤٧. عبد الرزاق بيك الدنبلي، تجربة الاحرار وتسلية الابرار، ٤٦/١)
٤٨. معجم البلدان، ١/ ٢٥٨)
٤٩. معجم الالقاب، ٨٩/١-٩٠، الوافى بالوفيات، ١٣٦/٨-١٣٧، طبقات الشافعيه الكبرى، ٦٧/٦)
٥٠. ابن النجار، تاريخ بغداد، ١٥١/١٨-١٥٢، معجم الالقاب، ٥١١/٣، سير أعلام النبلاو،٢٨٤/١٥، الوافى بالوفيات، ١٣٦/٨-١٣٧)
٥١. القاموس المحيط،١٣٢٣/٢)
٥٢. تاريخ الاسلام، حوادث(٦٨٠-٦٨٩هـ ص ٣٣٧، الوافى بالوفيات،٢٤٨/١١ )
٥٣. معجم الالقاب، ١٣٨/١)
٥٤. خۆدانێ پەتووكا (الفتوحات المكية) (www.alwaraq.com)
٥٥. جلال الدين مولوى، مثنوى معنوى، تحقيق رينولد نيكلسون، ص ٣-٤، ١٥٦، ٢٥٣، ٤٧٦، ٦٣٢، ٧٩٤، ٨٠٠)
٥٦. مثنوي معنوي ،دفتر جهارم، ص٥٠٤)
٥٧. قلائد الجمان،١٠٤/١)
٥٨. ابن شداد، الاعلاق الخطيره ، ٦٠/٣)
٥٩. الشرفنامة، ص ٢٥٧)
٦٠. تاريخ يوسف بوسنايا، ص، ١٠٨،٦٢)
٦١. التنبيه والإشراف، ص٦٤)
٦٢. الكامل، ٧٣/٦)
٦٣. دەڤەرا زێبار و زێباری د پەرتووكا صبح الأعشى (٤/ ٣٧٨)ب ناڤێ دەڤەرا دينار و دينارتە هاتيیەگوهارتن
٦٤. مسالك الإبصار، ٣/ ١٣٢-١٣٣)
٦٥. شرفنامه، ص٢٥٧)
٦٦. الخطط المقريزيه، ٤٠٥/٣، السلوك، ٤/١)
٦٧. القاموس المحيط، ٣٠٠/١، توضيح المشتبه، ٧٢/٥)
٦٨. سير أعلام النبلاء،٢٨٣/١٥)
٦٩. القاموس المحيط، ٣٠٠/١)
٧٠. انباء الغمر، ٧٤٣/٢، السخاوي، الجواهر و الدرر، ٢٠٨/١، الضوء اللامع، ٢٣٨/٥-٢٣٩)
٧١. أنباء الغمر، ٣٣١/١، ٣٤٧، كتاب ديار بكرية، ص٣٢، ٥٧، ٩٥)
٧٢.شرفنامه، ص ٤٤٣
٧٣. أبناء الغمر، ٢٨٠/١، ٢٩١)
٧٤. كتاب ديار بكريه، ص ٢٢٩)
٧٥. ابن عربشاه، عجائب المقدور، ص، ٧٠-٧٤)
٧٦. شرفنامه، ص ٤٤١-٤٤٣)
٧٧. الضوء اللامع، ٣٠٢/١-٣٠٣)
٧٨. مسالك الأبصار، ١٣٤/٣، صبح الأعشى، ٤/ ٣٧٨)
٧٩. شرفنامه، ص٢٥٧)
٨٠.جامع التواريخ ص ٧١٩-٨١٢

٨١. السلوك ٤/ ٢٩٣–٢٩٤)
٨٢. تأريخ طور عابدين ،ص١٠٤)
٨٣. شرفنامه، ص٢٦١)
٨٤. شرفنامه، ص٢٥٨-٢٦١)
٨٥. ابن حجر، توضيح المشتبة، ١٨٨/٥)
٨٦. كشف الظنون، ٣١٧/١، ١٣١/٢، ١٥٥، ٥٠٧، الزركلى، الآعلام، ٢٧٥/١، عمر رضا كحاله، معجم المؤلفين ٣٢٨/١)
٨٧. هديه العارفين، ٢٣٨/١)
٨٨. السلوك، ٢٩٣/٤ – ٢٩٤)
٨٩. مؤلف مجهول، كتاب الحوادث، ص ٣١٥، الكتبي، فوات الوفيات، ١/ ٣٣٥)
٩٠. التنبيه والإشراف، ص٩٤)
٩١. الكامل، ٣٧٥/٩)
٩٢. النابلسي، تاريخ الفيوم وبلاده، ص١٤٥، ١٤٩)
٩٣. تاريخ الملك الظاهر، ص٣٣٣)
٩٤. تاريخ البرزالي، ٣٩٤/٣)
٩٥. التكملة لوفيات النقلة، ١٥٦/٢، وفيات الآعيان، ٣/ ٢٤٣)
٩٦. الكامل، ١٩٦/٦)
٩٧. التكملة، ٢٥٦/٢-٢٥٨، البداية والنهاية، ٥٢/١٣)
٩٨. تاريخ اربل، ٢١٥/١، ٢٧٠/٢ تعليقات المحقق)
٩٩. معجم البلدان، ٤/ ٤٥٦)
١٠٠. الابشيهى، المستطرف، ٥٣٤/٢)
١٠١. صوره الاض، ص ٢٦٠ )
١٠٢. البداية والنهاية، ٢٨٧/١٣،المقفى الكبير ،٧٥١/٣)
١٠٣. مسالك الابصار، ١٣٤/٣)
١٠٤. شرفنامه، ص٢٥٤)
١٠٥. الفتح القسى،ص ١١٣، ٥١٣ ، ٥٥٩؟،ابن شداد، سيره صلاح الدين، ص١١٠، ١٧١، ١٧٣، ١٩٩، الروضتين ،١٣٢/٤، تأريخ الاسلام، حوادث (٦٨١-٦٩٠ هـ) ، ص٢٠، ٢٨، ١٥٢).
١٠٦. الخزندارى، تاريخ مجموع النوادر ، ص١٩٦)
١٠٧. الكامل، ٩/٦، معجم الالقاب، ٣٦٢/١)
١٠٨. الفرج بعد الشدة،١٠٨/٢)
١٠٩. الكامل، ٧/ ١٠٢)
١١٠. معجم البلدان، ٤٩٦/٢، ٤٩٩، ٥٠٤، ٥١١)
١١١. الكامل، ٢٠٣/٩، ٣٨١، الروضتين،٥٤/٤، ٢٠٨، وفيات الآعيان،١٨٠/١-١٨٣)
١١٢. بنێره الجولمركية)
١١٣. الكامل، ٦١/٦، ٢٤)
١١٤. مروج الذهب، ١٢٤/٢)

# کەلا و ئاسێگەهێن دەڤەرا بەهدینان

پ.هـ.د.دەروێش یوسف هروری ڤان شوکری هروری

## ئێك: پێناسا کەلا و ئاسێگەهان و کێ ئاڤاکرینە؟

تشتەکێ رۆن و ئاشکەرایە کو ئاسێگەهێن شەری ژ کەلا و ئاسێگەهـ و برج و شویرها ژ ئاشکراترین شوینوارانە کو مرۆڤی ل پشت خۆ هێلاین، ژ بەر کو گرێدای پێدڤییەکا سەرەکی یە ژ پێدڤیێن جڤاکی و دەولەتێ، ئاڤاکرنا وان لادانا مەترسیێ یە و دابینکرنا ژیانێ یە د ئێمناهیێ و جێگیربوونێدا[1].

بەری ل سەر ئەگەرێن ئاڤاکرنا کەلا و ئاسێگەهێن دەڤەرا بەهدینان ب ئاخڤین و کێ ئاڤاکرینە، د ڤێت جوداهیێ د ناڤبەرا کەلا و ئاسێگەهێ دا بزانین، چونکی باراپترین ژێدەر و لێڤەگەرێن مێژوویی جوداهیێ د ناڤبەرا واندا ژ لایێ زمانی و بیناسازیێ ڤە ناکەن.

**کەلا:** جهەکێ ئاسێ یێ شەری یە و ل جهەکێ ستراتیجی د هێنە ئاڤاکرن وەکی چیا، گر یان بلنداهییەکا کەڤرین، یان ل بەر لێڤێن دەریا، و گرنگیا ڤان ئاڤاهییان د بوارێ زێرەڤانی و بەرەڤانیکرنێ دایە دژی هەر مەترسییەکا دەرەکی.

**ئاسێگەهـ:** هەر ئاڤاهییەکێ ل دۆر رووبەرەکێ عەردی بێتە ئاڤاکرن دا کو دژی هەر مەترسییەکا ناڤخۆیی یان دەرەکی بپارێزیت و ژ بەر هندێ ژی شویرهێن باژێران ل چاخێن ناڤین د گۆتنێ ئاسێگەهـ، کو مەلبەندێ دەستەلاتداریێ بوو ئەگەر چەند یا لاواز یان ب هێز بایە(٢).

ڤەکۆلەرەکێ دی ئاماژێ ب جوداهیا د ناڤبەرا کەلا و ئاسێگەهان دا دکەت، کەلا ل دووڤ بۆچوونا وی ئەو باژێرێن ل دۆرمانێن وی شویرهە و ئاسێگەهـ هاتینە ئاڤاکرن و خەندەك ل دۆر هاتینە کۆلان و بوویە باژێرەکێ ئاسێ و چوونا د ناڤدا بێ رێکێن سەرەکی و دەستنیشانکری و ب هاریکاریا زێرەڤانێن وێ یا ب زەحمەتە(٣).

ئاسێگەهـ: ئەو ئاڤاهیێن ل دەڤەرێن چیایی هاتینە دانان بۆ گرتنا رێك و دەرتەنگان، یان ل دەڤەرێن خودان بهایێن ستراتیجی هاتینە دانان دا کو ل دەمێن پێدڤی بەرگری ژێ بێتەکرن دا نە کەڤنە د دست دوژمناندا(٤).

ئەڤ بۆچوونا کارئینانێ پتر بۆ کەلا و ئاسێگەهێن دەڤەرا بەهدینان یا گونجایە، ئانکو کەلا مەزنترە ژ ئاسێگەهێ.

دەربارەی کا کێ ئەڤ کەلایە ئاڤاکرینە و بۆچی هاتینە دانان؟ بەرسڤا ڤان پرسیاران دمینت بۆ خەملاندن و بۆچوون و دیتن و رایێن جودا، چونکی

ژێدەرێن مێژوویی چ پێزانینێن ئاشكەرا دەربارەی ڤێ چەندێ نەدانە مە. ئەگەر پەرتووكا (القلاع و الاكراد) یا بەرزەبووی یا خودانێ وێ (المدائنی)[5] ما بایە ئەوێ ل سا (٢٢٥مش/٨٤٠ز) مری دبیت دا گەلەك تۆزێ ژ سەر مێژوویا هندەك ژ ڤان كەلان رامالیت.

د گەل نەبوونا دەقێن مێژوویی بۆ ڤەكۆلەری هەیە وەسان بۆ بچیت كو كەلایێن بەهدینان ل سەر دەستێن هێزێن سیاسی هاتینە دانان یێن كو دەستەلاتداری ل دەڤەرێ كرین ئێك ل دووڤ ئێكی و ل بەراهیێ ژی رۆمی (بیزەنتییان) ئەوێن دەستەلاتداری ل هەرێما جزیرا فوراتێ كری بەری ڤەگرتنێن ئیسلامی[6] و ژمارەكا ڤان كەلا و ئاسێگەهان ژ لایێ وانڤە ددەمێ شەرێ وان یێ دوور و درێژ د گەل فارسان هاتینە ئاڤاكرن[7].

ئێك ژ ڤەكۆلەران ئاماژێ د دەتە وێ چەندێ كو (عەباسییان) دەمێ دەستەلاتداری ل سالا (١٣٢مـــش/٧٤٩ز) وەرگـرتـی گەلەك پویتە دایە رێڤەبەریا دەڤەرا جزیرا فوراتی ژ بەر گرنگیا جهێ وێ یێ جوگرافی كو د كەڤیتە نێزیكی سنوورێن رۆما بیزەنتی، و دا كو دەستەلاتداریا خۆ دابین بكەن عەباسییان گەلەك كەلا ئاڤاكرن، ئەوا د گۆتێ هێلا ئاسێگەها رۆژهەلات یان ئاسێگەهێن رووبارێ دیجلەی و ژ وان ژی ئامێدیێ و ئەرمشتێ و هرۆرێ[8].

بەلێ بۆچوونا ژ هەمییان راستتر ئەوە كو باراپترین ژ ڤان كەلان ل سەر دەستێ میرێن كوردان بخۆ هاتینە ئاڤاكرن، ب تایبەت ل سەر دەمێ بووەیهییان (٣٣٤-٤٤٧مش/٩٤٥- ١٠٥٥ز)ی، چونكی ژێدەرێن مێژوویی ئاماژێ ددەنە سەردەمێ بووەیهییان بۆ لێبوورینێ د گەل كوردان[9]. دیسان زۆربەی میرگەهێن كوردان ل ڤی سەردەمێ بووەیهییان سەرێن خۆ هلداینە[10].

هەژی ئاماژێ یە كو ل سەر دەمێ دەستەلاتداریا بووەیهییاندا دەستەلاتداری ل سەر مووسلێ و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە ژ وان ژی دەڤەرا بەهدینان د دەست میرگەها (حەمدانییان) دا بوو و میرێن وێ زنجیرەكا پەیوەندیێن خزماتیا سیاسی دگەل میرێن كوردان هەبوو[11]. و ئەڤێ چەندێ دەلیڤە پەیداكر بۆ ئاڤاكرنا كەلایێن نوی و نویژەنكرنا كەلایێن هەرفتی ل سەر بەرمایكێن كەلایێن كەڤن ئەوێن ل سەر دەستێ خەلیفەیێ عەباسی (المعتضد) ی هاتینە خرابكرن[12]. و هندەك كەلایێن دی ل سەر دەستێ میرێن كوردان هاتنە ئاڤاكرن دەمێ دەستەلاتداریا ئوسمانییان وەكی كەلایێن بارۆخێ و بالۆكا و بێتەنویرێ.

ژ ئەڤا بۆری دیار دبیت كو پشكەك ژ كەلایێن بەهدینان ل سەردەمێ رۆمێ و عەباسییان هاتینە ئاڤاكرن، بەلێ پشكا هەرە مەزن ژ ڤان كەلان ژ لایێ كوردان بخۆڤە هاتینەئاڤاكرن و ل داویا سەردەمێ بووەیهییان سەرنجا خەلكەكی بۆ خۆ راكێشایە و ب تایبەت ل سەردەمێ دەستەلاتداریا میرێن (سەلجۆقیا) ل سەر مووسلێ و گرۆڤێ ڤێ چەندێ ژی ئێك ژ میرێن وان كو ناڤێ وی (جیوش بەگ) بوو[13]راستیا ڤێ چەندێ زانی و ترسا خۆ ژ بەر بەردەوامیا ئاڤاكرنا ڤان كەلان ژ لایێ میرێن كوردانڤە دیاركر و ئەڤێ چەندێ ئەو پالدا كو هەوەكا لەشكەری بكەتە سەر دەڤەرا بەهدینان و دەڤەرێن زۆزانا ل سالا (٥٠٩مـــش/١١١٥ز)ی و د ڤێ هەوێ دا فەرمان ب وێرانكرنا چەندین كەلایێن دەڤەرێ دا[14].

## دوو: پالدەرێ ئاڤاكرنا كەلا و ئاسێگەهان:

بەری ل سەر ئەگەرێن ئاڤاكرنا كەلان ل دەڤەرا بەهدینان باخڤین، دڤێت ئاڤریەكێ ب دەینە وان ئەگەرێن سەرەكی یێن كو ژ پەروازێ گشتی ل دەڤ موسلمانان یان مللەتێن دی وەكی رۆمییان یان خاچهەلگران (سەلیبیان) دەرناكەڤن بۆ ئاڤاكرنا كەلان چ ل وەلاتێ شامێ یان ل هەر جهەكێ دی، و ئەگەرێ ئێكێ یێ داكۆكیا ئاڤاكرنا كەلان و ئاسێگەهان پێدڤییەكا گرنگ بوو دا كو هەمی لایەنێن شەركەر چ رۆم یان عەباسی یان میرێن كوردان هەبوونا خۆ ل دەڤەرێ ب چەسپینن[15].

هەروەسان هندەك پالدەرێن دی ژی بۆ ئاڤاكرنا كەلان هەبوون، چونكی گەلەك ژ میر و خونكار

و سەركردا دديت كو ئاڤاكرنا كەل و ئاسێگەهان سومبولا مانا ناڤێن وان و بیرئانینا وانە و ناڤ و نیشانا هندەك دەستكەفت و سەركەفتن و ڤەگرتنێن وانە، یا دهێتەزانین ئەوە كو د مێژوویێ هندەك ژ خونكار و دەستەلاتدارا ژ بەر مەترسیيان مەلبەندێن دەستەلاتداریێ و ئاكنجیبوونا خۆ موكوم و ئاسێ دكرن. ژ بلی كو رێكێن گەهاندنێ و مەلبەندێن ئاهێن خوارنێ و وێستگەهێن بازرگان و كاروانان و سەرۆكانیێن ئاڤێ و بازارێن بازرگانیێ هەمییا گرنگییا خۆ د ژیانا مرۆڤی دا هەبوون، ژ بەر هندێ دڤیا ب هەمی رێكان زێرەڤانی بۆ هاتبا پەیداكرن ژ وان ژی ئاڤاكرنا كەلان و ئاسێگەهان و مەلبەندێن دیدەڤانیێ (دوورگەهـ) د گەل دابینكرنا گەهاندن و راگەهاندنێ د ناڤبەرا كەلاندا[16].

دڤێت لایەنێ ئابووریێ ئاڤاكرنا كەلان ژ بیر نەكەین، چونكی ئەڤ كەلایە د هاتنە ئاڤاكرن دا كو سامانێ وەلاتی بێتە پاراستن و ب تایبەتی ل هەرێمێن ڤەكری، و كۆمكرنا باجان و چنینا دەرامەتی و عومباركرنا وان، دیسان د هاتنە بكارئینان بۆ دانا خۆراكی و پشتەڤانییا لەشكەری و دانا چەكی و پشكەك ژێ دهاتە ب كارئینان بۆ پیشەسازییا چەك و جلكان[17].

ل داویێ دشێین بێژین كو تەبایی ئەگەرێن ل پشت ئاڤاكرنا كەلان ل دەڤ هەمی مللەتان ئەگەرێن بەرەڤانیێ و هندەك ئەگەرێن هێرشبرنێ بوون، چونكی كەلا ئەو جهە یێ شەر ل سەر دهێتەكرن، دیسان ئەو یەكەیە كو یاسا تێدا د هاتە سەپاندن و كونترۆل ل سەر باژێران و رێڤەبەرییا هەرێمان تێدا دهاتەكرن و ل داویێ ئاڤاكرنا كەلا و ئاسێگەهان ژمارەكا فەرمانێن سڤیل و لەشكەری بخۆڤە د گریت كو پشكەكا مەزنا مێژوویا وان پێكدهینا[18].

## سێ: كەلا و ئاسێگەهێن بەهدینان د مێژوویێ دا:

یا ئاشكەرایە كو دەڤەرا بەهدینان پارچەك بوو ژ هەرێما جزیرا فوراتێ و ئەڤا داویێ هەر ژ سالا (٦٢٧ز)ی كەتبوو ژێر دەستێ رۆما بیزەنتی و ما ل ژێر دەستەلاتدارییا وان تا كو دەستپێكا ڤەگرتنێن موسلمانان ل سالا (٦٣٧ز)ی[19].

دەربارەی ڤەگرتنێن موسلمانان بۆ دەڤەرا بەهدینان و كەلایێن وێ چ پێزانینێن رۆن و بەرچاڤ نینن، بەلێ مێژوونڤیس (البلاذري) سەرهاتییەكا مێژوویی ڤەدگێریت و هندەك تاریێ ژ سەر ڤێ ئاشكەرا دكەت، ئەو ژی ئەوە كو خەلیفەی (عومەر كورێ خەتابی)(ر) سەركردێ خۆ (عەتبە كورێ فەرقەدێ سەلەمی) سالا (٢٠مش/٦٤١ز)ی دەستنیشانكرییە بۆ ڤەكرتنا باژێرێ مووسلێ و جهێن ب سەرڤە، و شیا ئاسێگەهـا وێ یا رۆژهەلاتی ب هێزێ ڤەكەت، و دەمێ دەربازی لایێ رۆژئاڤابووی خەلكێ وێ ل سەر جزیێ (خویكێ) دگەل وان پێكهاتن[20].

سەركردە (عەتبە كورێ فەرقەدێ سەلەمی) بەردەوامی دا كارێ ڤەگرتنا دەڤەرێن سەر ب مووسلێ ڤە ژ لایێ باكوور و باكوورێ رۆژهەلاتێ ڤە، لەوان بەرەڤ دەڤەرا ئاكرێ و شۆشێ و پاشی بەرەڤ دەڤەرا شێخان و باعەدرێ ب رێكەفت، پشتی هینگێ بەرەڤ دهۆك و زاخۆ چوو و شیا هەمی كەلا و ئاسێگەهێن دەڤەرا بەهدینان ڤەكەت، نڤیسەرێ بەری نها ئاماژە پێ هاتییەكرن دبێژیت: ل مووسلێ گەلەك دەڤەر دیتن هەمی خەلكێ وان ل سەر خویكێ د گەل وان پێكهاتن ... پشتی هینگێ (المرج – بەردەرەش) و گوندێن وی ڤەگرتن و جهێ (باهذری (دهۆك)– باعذرا) و المعله (معلثايا- مالتا)یێ و داسنیا و هەمی جهێن كوردان ڤەگرتن[21]. د سەر وێ چەندێ ژی را كو ژێدەرێن مێژوویی چ ئاماژەیا ب چەوانییا ڤەكرنا ڤان كەلان ناكەن كا ب پێكهاتن یان ب شەر هاتینە ڤەكرن؟ بەلێ وەسان دیارە كو پشكەكا خەلكێ وان كەلان بەرگرییا لەشكەرێ موسلمانان نەكرییە وەكی (البلاذری) ئاماژە پێ كری كو (خەلكێ وان ل سەر خویكێ د گەل پێكهاتن)[22].

سەرهاتییەكا دی هەیە ئاماژە ب پشكەكا خەلكێ ڤان كەلان د كەت كو هاتنە د ناڤ ئایینێ موسلمانەتیێ دا ل دەمێ پێشكەتنا هێزێن موسلمانان ب سەركردایەتییا (عەیاز كورێ غەنەم)

ی دەمێ بەرەڤ جزیرێ ڤە چووی و میرێ وێ وی سەردەمی (الصالح) بوو و هندەك كەلایێن دی ژی ل ژێر دەستەلاتداریا وی بوون وەکی کواشێ و زەعفەرانیێ، و دەمێ ناما ئیسلامێ گەهشتیێ وی گوهدان بۆ کر، و (عەیاز کورێ غەنەمی)ی بانگخواز بوو هنارتن داخوازا وان بکەن بۆ ئاینێ ئیسلامێ[23].

د ژێدەرێن مێژوویی دا پێزانین ل سەر چەوانیا ب رێڤەبرنا ڤان کەلان نینن، نە ل سەردەمێ (راشدیان) و نە ل سەردەمێ ئەمەوییان، لەوما هزر بۆ وێ چەندێ د چیت کو رێڤەبرنا وان ژی ژ لایێ والیێ مووسلێ ڤە دهاتەکرن، چونکی ئەڤا داویێ ببوو بنگەهەکێ لەشکەری بۆ ڤەگرتنا دەڤەرێن هەڤسوی و مەلبەندێ ب رێڤەبرنا وان، لەورا تشتەکێ سرۆشتییە کو ڤرالێ مووسلێ ب رێکا نوینەرێن خۆ دەستەلاتداری ل ڤان کەلان کربیت.

پشتی عەباسییان دەستەلاتداری ل سالا (١٣٢مش/٧٤٩ز) ی وەرگرتی خەلیفەیێن وان پویتە دا رێڤەبەریا هەرێما جزیرێ و دا کو ئاسایشا خۆ دابین بکەن خەلیفەیێن وان ژمارەکا زۆرا کەلا و ئاسێگەهێن لەشکەری ل جهێن بەربەلاڤ ل هەرێمێ ئاڤاکرن[24]، و د سەر ڤێ چەندێ ژی را دەڤەرا بەهدینان و کەلایێن وێ ل سەر چاخێ عەباسییان یێ ئێکێ هەر مانە سەر ب میرێن مووسلێ ڤە، و مووسل بخۆ دگەل ئەرمینیا و ئازربایجانێ سەر ب میرێ جزیرێ ڤە بوو وەکی سەردەمێ چاخێ ئەمەوییان[25].

پشتی لاوازی کەفتییە خیلافەتا عەباسی و ب تایبەتی پشتی کوشتنا (موتەوەکل)ی ل سالا (٢٤٧مش/٨٦٤ز)ی دەستەلاتداریا راستەڤینە کەفتە دەست سەرکردێن تورك تا کو خەلیفە (ئەلموعتەزەد بیللا) (٢٧٩- ٢٨٩مش/ ٨٩٢- ٩٠٢ز) ی هاتییە سەر دەستەلاتێ و وی خورتیا خیلافەتا عەباسیان بۆ زڤراندەڤە و جارەکا دی دەستێ خۆ درێژی دەڤەرێن کوردان کرن و ژ وان ژی دەڤەرا بەهدینان، و دەمێ (ئەلموعتەزەد) ژ هەوا خۆ یا ب ناڤ و دەنگ ل سەر کەلا ماردینێ سالا (٢٨١مش/٨٨٨ز)ی زڤریەڤە کو بنگەهێ سەرەکی یێ حەمدانیان بوو، کەلا حسێنیێ (زاخۆ) خرابکر یا کو میرەکێ کورد کو د گۆتنێ (شەداد) تێدا بوو بەلێ ل وی بووری و هێلا ل سەر میرگەها وی[26].

سالا (٢٨٢مش/٨٩٥ز)ی خەلیفە (ئەلموعتەزەد) ل مووسلێ بوو و هەوەکا لەشکەری هنارت بۆ گرتنا میر (حەمدان)ێ باپیرێ (حەمدانییان)، ڤێ هەوێ دلێگەرا خۆدا تەڤلی کورێ وی (حسێن کورێ حەمدانی) بوو ئەوێ د ناڤ کەلا زەعفەرانیێ دا خۆ ئاسێ کری، ئەڤی داخوازا ئێمناهیێ ژ ڤی لەشکەرێ عەباسییان کر، و ڤان ژی لێبوورین بۆ دەرخست بەلێ خەلیفەیێ عەباسی فەرمانا هەرفاندنا کەلا زەعفەرانیێ دەرخست[27] و نها چ پێزانین د ژێدەرێن مێژوویی دا نینن ل سەر کەلایێن بەهدینان ژ دەمێ مرنا خەلیفەیێ عەباسی (ئەلموعتەزەد) ی و تا کو کەفتنا دەستەلاتداریا خیلافەتا عەباسییان د دەستێ بووەیهییان دا ل سالا (٣٣٤مش/٩٤٥ز)ێ.

ل سەر دەمێ بووەیهییان (٣٣٤- ٤٤٧مش/٩٤٥-١٠٥٥ز)ی میرگەها حەمدانییان[28] دەستەلاتداری ل مووسلێ و دەڤەرا بەهدینان د گێرا و میرێن وان هەر ل دەستپێکا دەستەلاتداریا خۆ ل سەر مووسلێ هێز و مەترسیا کوردان ل سەر مووسلێ و میرگەها وان تێدگەهشتن و ددیت گەلەکا ب زەحمەتە ب هێزێ کوردان ب کێشنە ژێر کونترۆلا خۆ، ژ بەر وێ چەندێ ژی وان هەڤپەیمانی د گەل کرن و خزماتیا سیاسی د گەل میرێن هندەك كەلان کرن، بۆ نموونە (ناسرولدەولە ئەلحەسەنێ حەمدانی) (فاتما کچا ئەحمەدێ کوردی) بۆ خۆ ئینابوو و چونکی ئەو کچا ئێك ژ سەرۆکێن کوردان بوو ل سەر کەلا ئەرمشتێ، دا کو راکێشانا ڤیانا خەلکێ هۆزا وی و کەلایێن سەر ب ئەرمشتێ ڤە بۆ خۆ راکێشیت[29].

(ناسرولدەولە) د ڤی پرۆژەیێ خۆ دا یێ سەرکەفتی بوو و ب ڤێ پلانێ پرانیا کەلایێن بەهدینان خۆ دانە دگەل وی و کەتنە ژێر دەستەلاتێ وی و رێڤەبەریا وان د دەست تاگرێن وی دا د هاتنە ب رێڤەبرن، و گرۆڤە ژی ل سەر ڤێ چەندێ ئەوا مێژوونڤیس (مسکویە) ڤەگێرای: دەمێ کەلا ئەرمشتێ رادەستی بووەیهییان

بووی كەلایێن دی وەكی هرۆر و شابانیێ و مەلاسیێ ... هتد، بێ شەر رادەستی بووەیهییان بوون[٣٠]، و (ناسرولدەولە) و كورێ وی (ئەبا تەغلوب) ی پارە و تشتێن گرانبها یێن خۆ د كرنە د ڤان كەلان ڤە[٣١].

ئەم د شێین كەلایێن بەهدینان ل سەر دەمێ بووەیهییان پارڤەكەینە سەر دو پشكان، پشكەك ژێ مەلبەندێ وان كەلا ئەرمشتێ بوو، ئەو و كەلایێن سەر ب وێ ڤە بوو راستە و راست ژ لایێ حەمدانییان ڤە د هاتنە ب رێڤەبرن، و ئەگەرا وێ چەندێ هەیە كو هندەك نوینەرێن كوردان ژ لایێ خزمێن (ناسرولدەولە)ی ڤە لێ بوون، چونكی وی و كورێ خۆ (ئەبا تەغلوب)ی پشتی هینگێ[٣٢] پشتگەرمێن خالێن خۆ بوون و خۆ ب وان ڤە گرێدابوون و دبیت ئەڤە ژ هۆزا (مەهرانییان) بن چونكی (ئیبنولئەسیر) دبێژیت ئەرمشتێ و كواشێ و زەعفەرانیێ و شابانیێ ژ كەلایێن مەهرانییان بوون[٣٣].

پشكا دی یا كەلایێن بەهدینان وەسان دیارە مەلبەندێ وان كەلا ئامێدیێ بوو، ئەڤێ ژی ژمارەكا كەلان ب سەرڤەبوون وەكی كەلا گرێ سۆر و جدیدە و هرۆر و ئەڤ پشكا كەلان نە ل ژێر دەستەلاتداریا حەمدانییان بوون، بەلكی وان تا سالا (٣٦٩مش/٩٧٩ز) ی سەربەخۆییا خۆ دپاراست دەمێ رادەستی بووەیهییان كرین[٣٤].

ژ ئەنجامێ ململانا بەردەواما د ناڤبەرا حەمدانییان و بووەیهییان دا دەڤەرا بەهدینان و كەلایێن وان گەلەك دەردەسەری دیتن، و دەڤەر بۆ مەیدانا شەری د ناڤبەرا هەردو لایاندا، و بووەیهییان هەر ژ دەستپێكا میراتگەریا (مەعەزولدەولە) (٣٤٧مش/٩٥٨ز) ی چەند هەوێن لەشكەری دژی حەمدانییان كرنە سەر مووسلێ و جزیرێ دا كو ژ دەست بینندەر، و داوی و گرنگترین هەوا كریە سەر ب سەرۆكاتییا (عەزدولدەولەیێ بووەیهی) بوو ل سالا (٣٦٧مش/٩٥٧ز)ی دژی میرێ حەمدانییان (ئەبا تەغلوب ناسرولدەولەیێ حەمدانی)، و لەشكەرێ (عەزدولدەولە)ی شیا سەركەفتنێن مەزن ل سەر حەمدانییان ب دەستڤە بینیت و دەستێ خۆ دانا سەر هەمی دەڤەرێن دەستەلاتداریا حەمدانییان، ئەڤێ ژی (ئەبا تەغلوب) نەچاركر كو هەرێما جزیرێ ب جهـ بهێلیت و بەرەڤ شامێ ڤە بچیت و پاشی بۆ (رەملە) و ل وێرێ هاتە كوشتن[٣٥].

پشتی هێزێن (عەزدولدەولە)ی كونترۆل ل سەر هەرێما جزیرا فوراتی كری چ كەلا ل بەر سینگی نەمان ژ بلی كەلایێن بەهدینان ئەوێن دكەڤنە لایێ رۆژهەلاتێ رووبارێ دیجلەی وەكی ئەرمشتێ و شابانیێ و هرۆرێ و ...هتد[٣٦]. و ئەڤ كەلایە ژ لایێ میرێن كورد ڤە دهاتنە ب رێڤەبرن ئەوێن تاگری بۆ (ئەبا تەغلوب)ی دكرن و هندەك ژ ڤان نێزیكێن دەیكا وی (فاتما كوردی) بوون[٣٧].

ژێدەرێن مێژوویی ناڤێن وان میرێن كورد نائینن و چ باسی رۆلێ وان یێ لەشكەری و سیاسی ل سەر ململانا د ناڤبەرا حەمدانی و بووەیهییان دا ناكەن، ژ بلی ئەوا مێژوونڤیس (التنوخی) باسی میرێ كەلا ئەرمشتێ كری ئەو ژی (سالح كورێ بانویە) بوو، وەسان سالۆخەت د دەت كو سەرۆكەكێ كوردایە[٣٨].

هەردو مێژوونڤیس (التنوخی و مسكویە) ب تنێ باسی كەلا ئەرمشتێ و رۆلێ میرێ وێ د ڤێ ململانێ دا كریە ، دبیت چونكی كەلایەكا مەزن و ئاسێ بوویە ب هەڤبەركرن د گەل كەلایێن دی، ژ بلی كو مەلبەندەكێ حەمدانییان بوو ل دەمێ پێدڤی و كۆگەهەك بوو بۆ پارە و گرانبهایێن وان[٣٩].

دیسان میرێ حەمدانییان كەلا ئەرمشتێ كربوونە وەكی گرتیخانەكێ ژێ بۆ كەسێن هەڤركێن وان ل سەر دەستەلاتێ، و (ئەبا تەغلوب) ی بابێ خۆ (ناسرولدەولە) و برایێ خۆ (ئەبولفەوارس محەمەد)[٤٠] د ڤێ كەلاێ ڤە كربوونە د گرتیخانێ ڤە، و میرێن كوردان پیرەژنەك ب ناڤێ (نازبانو)[٤١] دەستنیشانكربوو بۆ خزمەتا گرتییان[٤٢].

ژ بەر گرنگییا كەلا ئەرمشتێ (ئەبا تەغلوب)ی دو كەس ل سەر دانان ئێك ژ نێزیكێن دایكا وی بوو (سالح كورێ بانوی) و یێ دی ژی ژ خزمەتكارێن بابێ وی بوو د گۆتنێ (تاشتم)[٤٣]، بەلێ دەمێ (عەزدولدەولە) ی هەوا خۆ دەستپێكری دا كو دەستێ خۆ دانیتە

سەر كەلایێن بەهدینان ل سالا (٣٦٨مش/٩٧٨ز) ێ ین ئێكێ ل (ئەبا تەغلوب) ی پشتە رێبوو[٤٤] (عەزدولدەولە)ی لەشكەرێ خۆ كرە سێ پشك و هەر پشكەك بۆ كەلایەكا دەستنیشانكری تەرخانكر، لەشكەرێ ئێكێ ب سەركردایەتیا (ئەبی لعەلا عوبەیدولا كورێ ئەلفەزل كورێ نەسر)ی[٤٥]دا دەستێ خۆ دانیتە سەر كەلا ئەرمشتێ، لەشكەرێ دووێ ب سەركردایەتیا (ئەبی لقاسم سەعەد كورێ محەمەد لحاجب) ی بوو بۆ ب سەرداگرتنا كەلا شابانێ، و لەشكەرێ سێێ ب سەركردایەتیا ئێك ژ هەڤالێن (ئەبی نەسر خورشید یەزدیار ئەلخازن) بوو دا كو دەست دانیتە سەر كەلا هرۆرێ و هەرسێ جوینێن لەشكەری شیان دەستێ خۆ داننە سەر هەرسێ كەلان[٤٦].

وەكی بەری نها ئاماژە پێ هاتیبەكرن كو (محەمەد ئەلحەمدانی) د گرتیخانا كەلا ئەرمشتێ ڤە بوو و گەنجەك ب ناڤێ (ناسح) كو ئێك ژ هاریكارێن (عەزدولدەولە)ی بوو ل بەر دەستێ وی بوو و ڤی داخواز ژێ كر (میر محەمەد) بێتە بەردان و ل دووڤ داخوازیا وی هاتە بەردان و خەلاتكرن و پشتی هینگێ كرە میر ل سەر ل سەر مووسل و دەوروبەران و ژ وان ژی كەلایێن بەهدینان[٤٧]. ل سالا دووڤدا، واتە ل سالا (٣٦٩مش/٩٧٩ز) ی (عەزدولدەولە)ی هەوەكا دی یا لەشكەری كرە سەر دەڤەرا بەهدینان دا كو دەستێ خۆ دانیتە سەر كەلایێن دی یێن بەهدینان، وەسان دیار بوو كو هەمی كەلایێن بەهدینان نە كەتبوونە د دەستدا لەوان (عەزدولدەولە) دبێژیت: هندەك كەلایێن ماین نەهاتینە ڤەكرن ... بەلێ مێژوونڤیس (مسكویە) ناڤێن ڤان كەلان نەئینانە و لەشكەرێ بوویهییان ئەڤ كەلایە دووربێچدان و خەلكێ وان بەرگری كر بەلێ ل داویێ پشتی سۆزێن ئێمناهیێ داینێ خۆ رادەستی بوویهییان كرن، لێ میرێ بوویهییان ژ سۆزێن خۆ لێڤەبوو و هەمی ل سەر رێكا د ناڤبەرا مالتایێ و مووسلێ دا ڤنارەدان[٤٨].

دەستەلاتداریا بوویهییان ل سەر كەلایێن دەڤەرا بەهدینان گەلەك نەڤەكێشا، دەمێ میرێ كورد (باد كورێ دوستەك)[٤٩]شیای میرگەها كوردی دامەزرینیت و گەلەك باژێر ب خۆڤەگرتن وەكی (حەسكێفێ، میافارقین، دیاربەكر، نسێبین و جزیرێ) و پاشی دەستەلاتداریا خۆ بەرەڤ مووسلێ ڤە بەرفرەهكر و شیا ل سالا (٣٧٢مش/٩٨٢ز)ی مووسلێ ژ دەستەلاتداریا بوویهییان رزگار بكەت[٥٠] و هەمی دەڤەرا بەهدینان كەتە ژێر دەستەلاتداریا وی[٥١].

دو سال ب سەر دەستەلاتداریا میر (بادی) ڤە ل بەهدینان نەچوون، جارەكادی بوویهییان هەوەكا دی یا لەشكەری ئینانە سەر مووسلێ و شیان ل سالا (٣٧٤مش/٩٨٤ز) میر (بادی) ژ مووسلێ و دەڤەرا بەهدینان بدەرێخن و دەڤەر جارەكادی كەفتە ژێر دەستەلاتا بوویهییان[٥٢].

ل چارێكا داویێ ژ سەدسالیا (٤مش/١٠ز) ی كورێن (ناسرولدەولە ئەلحەمدانی)ی ئەوێن ل بەغدا (ئەبو عەبدوولا ئەلحسێن و ئەبو تاهر) شیان جارەكادی ب هاریكاریا خەلكێ مووسلێ دەستێ خۆ داننە سەر مووسلێ و والیێ وێ یێ بوویهی ژێ دەرئێخست، و دەمێ میر (بادی) ئاگەهـ ژێ بووی كو حەمدانییان جارەكادی دەستێ خۆ دانایە سەر مووسلێ، جارەكادی بەرەڤ مووسلێ د دەڤەرا بەهدینان را بووری و ل لایێ رۆژهەلاتێ مووسلێ ئاكنجی بوو[٥٣].

دەمێ هەردو میرێن حەمدانییان لەشكەرێ (بادی) دیتین و زانین نەشێن بەرگریا وی بكەن و بەرسینگی لێ بگرن داخوازا پشتەڤانیێ ژ (عوقەیلییان)[٥٤]كر دا هاریكاریا وان بكەن و میرێ عوقەیلییان (ئەبا ئەل ذواد محەمەد كورێ ئەلمسیب) ب مەرج رازی بوو هاریكاریا وان بكەت، و شەر د ناڤبەرا هەردو جوینادا شاریا و لەشكەرێ بادی بەرامبەر وان شكەست و میر باد ب خۆ ژی ل سالا (٣٨٠مش/٩٩٠ز)ی هاتە كوشتن[٥٥].

هەڤكاریا د ناڤبەرا حەمدانییان و عوقەیلییان بەردەوامی نەكێشا، چونكی میرێ عوقەیلییان (محەمەد كورێ ئەلمسیب) پشتدا میرێ حەمدانییان (ئەبو تاهر ئەلحەمدانی) و ل سالا (٣٨٠مش/٩٩٠ز)ی دا كوشت و پاشی بەرێ لەشكەرێ خۆ دا مووسلێ

و دەست دانا سەر مووسلێ و دەوروبەرێن وێ و ژوانان کەلاپێن بەهدینان[٥٦].

ل سەردەمێ دەستەلاتداریا عوقەیلییان ل مووسلێ و دەوروبەران چ پێزانین ل سەر کەلاپێن بەهدینان نینن، ژ بلی دو رویدانان، یا ئێکێ ل سالا (٤٤٠مش/١٠٤٨ز)ی دەمێ میرێ عوقەیلییا (قرواش)ی داخواز ژ میرێ ئاکرێ (ئەبو لحەسەن کورێ عیسکانێ حەمیدی) کری بەرەڤ مووسلێ بهێت دا هاریکاریا وی دژی میرێ میرگەها (مەروانییان) (نەسرولدەوله) ی (٤٠١-٤٥٣مش/١٠١١-١٠٦١ز)ی بکەت، بەلێ میرێ عوقەیلییان و (نەسرولدەوله) بێ کو شەر روی بدەت پێکهاتن[٥٧].

رودانا دووێ ل سالا (٤٤١مش/١٠٩١ز) بوو دەمێ ناکۆکی د ناڤبەرا میرێ عوقەیلییان (قرواش)ی و برایێ وی (ئەبی کامل)ی دا چێبووی، قرواشی داخواز ژ (عیسکانێ حەمیدی و سلێمان کورێ نەسر لدەوله)ی کر کو هاریکاریا وی بکەن، بەلێ ئەوا روودای هەردو میرێن ناڤبری رێزا لەشکەرێ قرواشی ب جهـ هێلان و چوونە رێزا هێزێن (ئەبی کامل)ی و ئەڤە بۆ ئەگەرێ ژ ناڤچوونا هێزا لەشکەرێ قرواشی و دەستەسەرکرنا وی[٥٨].

ژ ڤێ چەندا بووری دیار د بیت کو بۆ جارا ئێکێ یە ناڤێ میرێ ئاکرێ د ژێدەرێن مێژوویا ئیسلامی دا دهێتە خویاکرن و بەری سەردەمێ عوقەیلییان چ باس ژ ناڤێ میرێن ئاکرێ نە هاتییەکرن.

دیسان کەلاپێن بەهدینان ل سەردەمێ عوقەیلییان تووشی هێرشەکا دەرەکی ببوون ژ لایێ هۆزێن (غەز) یێن تورك ڤە د ناڤبەرا سالێن (٤٣٢ - ٤٣٥مش/١٠٤٠- ١٠٤٤ز)ی، بەلێ خەلکێ دەڤەرێ بەرسینگ لێ گرتن و شیان ژمارەکا زۆر ژێ ب کوژن، ل داویێ میرێ مووسلێ (قرواشێ عەقیلی) و ب هاریکاریا میرێن کورد و عەرەب شیان ب ئێکجاری وان ژ هەمی دەڤەرێ دەربێخن[٥٩].

کەلاپێن بەهدینان دیسان تووشی هێرشێن لەشکەرێ (سەلجوقییان) ژێ ب سەرۆکاتییا (توغرول بەگ) بووینە، و ل دەمێ بەرێ خۆ دایە مووسلێ دا ل دووڤ (ئەلبسیاسیری)[٦٠] و هەڤبەندێ وی یێ عەقیلی (قریش کورێ بەدران)ی سالا (٤٤٨مش/١٠٥٦ز) بچیت و پشتی دەستێ خۆ دانایە سەر مووسلێ (توغرول بەگ) ب لەشکەرێ خۆ ڤە بەرەڤ باژێرێ جزیرا بۆتان ڤە چوو چونکی میرێ وێ (نەسرولدەوله) پەیوەندی د گەل خەلیفەیێ مسرێ یێ فاتمی هەبوون، بەلێ خونکارێ میرگەها (مەروانی) شیا سولتان (توغرول بەگ)ی قایل بکەت کو دووربێچێ ل سەر جزیرا بۆتان بەرامبەر کوژمەکێ مەزن یێ پارەی راکەت[٦١] و پشتی (ئەلبەساسیری) ب دەستێن سولتانێ سەلجوقی ل سالا (٤٥١مش/١٠٥٩ز)ی هاتییە کوشتن میرێ عوقەیلییان (قریش کورێ بەدران)ی ترسییا و چارەنڤیسێ خۆ رەش دیت، لەوا تاگرییا خۆ بۆ سولتانی سەلجوقی دیارکر و کوژمەکێ پارەی ژی دایێ، توغرول بەگ ژێ لێبووری و دەستەلاتداریا مووسلێ و دەوروبەران و ژ وانان کەلاپێن بەهدینان جارەکادی دانێ[٦٢].

کەلاپێن بەهدینان ژ لایێ کارگێری ڤە بەردەوام مانە سەر ب دەستەلاتداریا حاکمێ مووسلێ (شەرەفولدەوله موسلم) یێ عەقیلی ڤە ئەوێ میراتگرییا بابێ خۆ (قریش)ی ل سالا (٤٥٣مش/١٠٦١ز)ی ب رازیبوونا سولتانێ سەلجوقییان وەرگرتی ئەوێن پشتی (توغرول بەگ) هاتینە سەر دەستەلاتدارێ وەکی (ئەلب ئەرسەلان) و پشتی وی کورێ وی (مەلەکشاهـ) (٤٦٥- ٤٨٥مش/١٠٧٢- ١٠٩٢ز)ی[٦٣].

پشتی مرنا سولتانێ سەلجوقی (مەلەکشاهـ) ی ل سالا (٤٨٥مش/١٠٩٢ز)ێ کورێ وی (برکیاروق) ی سالا (٤٨٨مش/١٠٩٤ز)ی دەستەلاتداری پشتی ململانەیەکا مەزن د گەل نێزێکێن خۆ وەرگرت[٦٤].

د سالا دووڤدا (٤٨٩مش/١٠٩٥ز)ی، برکیاروقی مووسل و دەوروبەرێن وێ دانە دەست میرەکێ تورك (کربوقا)ی کو ئەڤی دەستەلاتداریا میراتگەرییا عوقەیلییان ل مووسلێ ب داوی ئینای دەمێ دەست دانایە سەر داوی میرێ عوقەیلی ئەو ژی (عەلی کورێ شەرەفولدەوله)ی بوو و سەردەمەکێ نوی دەستپێکر د بێژنێ سەردەمێ میرێن سەلجوقییان ئەوێن تا کو

سالا (٥٢١مش/١١٢٧ز)دەستەلاتداری ل مووسلێ و دەوروبەران کری ژ وان ژی بەهدینان[٦٥].

ژێدەرێن مێژوویی چ ئاماژە نەداینە کاودانێن کەلایێن بەهدینان ل سەردەمێ میرێن سەلجوقییان ژ بلی میر (جیوش بەگ)[٦٦] ئەوێ هەوەکا لەشکەری کرییە سەر بەهدینان (هەکاری) و کەلایێن زۆزانا، و خەلکێ ڤێ دەڤەرێ نەشیان بەرگریێ بکەن لەوما خۆ ل جهێن ئاسێ وەکی چیا و دەرتەنگان ئاسێکرن، و (جیوش بەگ)جارەکادی زڤریڤە مووسلێ پشتی کەلایێن وان هەرفاندین[٦٧].

بەری نها هاتە دیارکرن کو دەستەلاتداریا میرێن سەلجوقییان ل سالا (٥٢١مش/١١٢٧ز)ێ ل مووسلێ ب داوی هاتبوو و د ڤێ سالێ دا (ئەتابەگ)[٦٨]، (عیمادەددینێ زەنگی) ژ لایێ سولتانێ سەلجوقی ڤە (مەحموود کورێ محەمەد کورێ مەلەکشاهـ)ی ل سەر مووسڵ و رەخ و رویبان هاتە دامەزراندن ، و (عیمادەددینێ زەنگی)[٦٩] هەر ل دەستپێکا دەستەلاتداریا خۆ ل سەر مووسلێ پویتەکێ باش ب دەڤەرێن کوردی د دا ئەوێن ل رەخ و رویێن مووسلێ ژ لایێ باکوور و باکوورێ رۆژهەلاتیڤە دا کو ئێمناهییا میرگەها خۆ دابین بکەت و ژ بەر شیانێن دەڤەرێ یێن ئابووری، ژ بلی مەترسییێن دەرەکی ژ لایێ هۆزێن کوردێن دەڤەرێ ڤە ل سەر وی کو ئەگەر کونترۆل ل سەر نەکر لەوا ڤیا دەستێ خۆ ب گەهینیتە دەڤەرێ دا کو هێلێن سرۆشتی یێن بەرەڤانیێ وەکی پشتەك دەمێ ئەو دۆر ژ جزیرێ و شامێ و ب شەرانڤە یێ مژوول بۆ خۆ پەیداکەت[٧٠].

ل سەر دەمێ زەنگی دەڤەرا بەهدینان گەلەك کەلا ب خۆڤە دگرتن، هەر ئێکێ بنەمالەکێ ب شێوەیەکێ سەربخۆ دەستەلاتداری لێ دکر، کەلایێن ئاکرێ و شۆشێ و گوندێن دی میر (عیسایێ حەمیدی)[٧١]دەستەلات لێ دگیرا، لێ کەلایێن وەکی ئاشەوا و ئامێدیێ و نۆشێ و نێروە و هرۆر و گرێ سۆر دەستەلاتداریا وان ژ لایێ میرەکێ هەکاریا ڤە (ئەبو لهەیجا کورێ عەبدوولا کورێ ئەبی خەلیل کورێ مرزەبانێ هەکاری)[٧٢] د هاتە ب رێڤەبرن، و هندەك کەلایێن دی هەبوون ژ ئالیێ میرێن نە ژ مالباتێن حەمدانی و هەکاریان ڤە د هاتنە برێڤەبرن وەکی کەلا شابانیێ کو میر (ئەلحەسەن کورێ عەلی)[٧٣] و کەلا کواشێ ل ژێر دەستەلاتداریا میر (خول و هرون)[٧٤] ڤە بوون و بۆچوون پتر بۆ وێ چەندێ دچن کو خودانێن ڤان کەلان ژ کوردێن هۆزا مەهرانییان بوون.

(عیمادەددین زەنگی) وەسان دیت کو ئەڤ کۆما کەلان مەترسیێ ل سەر میرگەها وی دروست دکەن لەوما کاردکر کو ڤان کەلان بێخیتە ژێر سەرۆکاتییا خۆ، دەستپێکێ ب کەلا ئاکرێ دەستپێکر و ل سالا (٥٢٧مش/١١٣٢ز)ێ ب سەرۆکاتییا لەشکەرەکی بەرەف وێرێ چوو، دیسان هەوەکا لەشکەری هنارتە سەر کەلا شۆشێ ژی و پشتی دووریێچدانا هەردو کەلان شیا دەستێ خۆ دانیتە سەر هەردو کەلان و ب وێ چەندێ ژی دەستەلاتداریا میرگەها حەمیدییا ل دەڤەرێ ب داوی ئینا[٧٥].

ژێدەر باسی سەرئەنجامێ میر (عیسایێ حەمیدی) میرێ کەلایێ ناکەت کانێ د شەری دا هاتە کوشتن یان هاتە دەستەسەرکرن؟ لێ وەسان دیارە کو ژ لایێ زەنگی ڤە هاتییە کوشتن چونکی بەرگریا لەشکەرێ مووسلێ کربوو، دیسان ل بیرا زەنگی نەچووبوو دەمێ میر (عیسایێ حەمیدی) هاریکاریا خەلیفەیێ عەباسی (ئەلموستەرشد بیللا)ی کری دەمێ ل سالا (٥٢٧مش/١١٣٢ز)ێ مووسل دووریێچدای و ب شەرکەر و خوارنێ هاریکاریا وی کری[٧٦].

پشتی زەنگی کونترۆل ل سەر ئاکرێ کری رێ ل بەر وی خۆشبوو کو کویر د ناڤ دەڤەرێن کوردان دا بچیت و ل پێشیێ ژی کەلایێن دەڤەرا ئامێدیێ، لەوا میرێ کەلا ئاشەب میر (ئەبولهەیجایێ هەکاری) مەترسییا وی ل سەر دەستەلاتا خۆ زانی لەوا ب لەز گوژمەکێ پارەی بۆ هنارت دا کو تووشی کەلایێن وی نەبیت و پشتی هینگێ ئەوی ب خۆ قەستا مووسلێ کر دا کو لایەنگریا خۆ بۆ زەنگی دیاربکەت[٧٧]، و ل سالا (٥٢٨مش/١١٣٣ز)ی میرێ هەکاری (ئەبولهەیجا)ی ل مووسلێ وەغەرکر، بەلێ بەری سەفەرا خۆ بۆ

مووسلێ میر (باو[78] ئەلئەرجی[79]) ل جهێ خۆ دانابوو سەر كەلا (ئاشب- ئاشەوا)، و ناكۆكی د ناڤبەرا وی و كورێ میرێ هەكاریا (ئەحمەد)ی دا ئەوێ میراتی ل سەر كەلا نوشی د كر دروستبوو، زەنگی ژی مرنا میرێ هەكاری بۆ خۆ ب دەلیڤەكا باش دیت لەوا ئەو بخۆ ب هەوەكا لەشكەری هاتە سەر كەلا ئاشەب و پشتی دووربێچدانێ شیا كونترۆلێ ل سەر بكەت و هەمی میرێن د كەلاێ ڤە كوشتن و زڤریڤە مووسلێ و كەلایێن دی هێلانە دەست خودانێن وان دا وەكی كەلایێن هرۆر و گرێ سۆر كو وی چ ترس ژێ نەددیت[80].

ل سالا (٥٣٧مش/١١٤٢ز)ی جارەكادی زەنگی ب سەرۆكاتیا جێگرێ خۆ هێزەكا لەشكەری هنارتە سەر كەلا ئاشەب و پشتی كونترۆلكرنێ زەنگی فەرمان دا جێگرێ خۆ (جقر)ی ب هەرفاندنا وێ كەلایێ و نووژەنكرنا كەلایەكا نوو ئەو ژی كەلا ئامێدیێ بوو[81] و د دەمەكی دی یێ هەمان سالێدا جێگرێ زەنگی (جقر)ی جارەكادی بەرەڤ كەلایێن بەهدینان ڤە چوو و دەسلاتداریا خودانێن هەمی كەلایێن دەڤەرا زاخۆ ب داوی ئینان وەكی كەلا كواشێ و زەعفەرانیێ و شابانیێ[82]...هتد، و پشتی زەنگی كونترۆل ل سەر هەمی ڤان كەلان كری دەستەلاتداریا وان رادەستی جێگرێ خۆ (نەسیرەددین جقر)ی ل سالا (٥٣٧مش/١١٤٢ز)ی[83] كر، و پشتی كوشتنا (عیمادەددین زەنگی) ل سالا (٥٤١مش/١١٤٦ز)ی كورێ وی (سەیفەددین غازی) دەستەلاتداری ل مووسلێ كر و جێگرەك بۆ خۆ ب ناڤێ (زەینەددین عەلی كچك) دانا و دەڤەرا بەهدینان ژ لایێ رێڤەبەریێ ڤە هەمی كرە د دەست وی دا[84].

(زەینەددین عەلی كچك) كەسەك ب ناڤێ (قەراجە) وەك میر دانا سەر دەڤەرا بەهدینان، و یەكەم كارێ ئەڤێ داویێ پێ رابووی وی بخۆ هەوەكا لەشكەری یا مەزن بەرەڤ ناڤ جەرگێ دەڤەرا بەهدینان بر، مەرەم پێ ئەو بوو دا كو كەلایێن مایی ژی بێخیتە ژێر دەستەلاتداریا خۆ وەكی گرێ سۆر (جل صۆرا) و هرۆر و مەلاسیێ و بابۆخكێ (بابۆخا) و باكۆزێ (باكزا) و شیا هەمیان بكێشیتە ژێر دەستەلاتداریا خۆ، (ئیبن و لئەسیر) د بێژیت: پشتی دەمەكێ درێژ ژ كوشتنا زەنگی وی ئەڤ كارە ب دەست خۆڤە ئینا[85].

پشتی مرنا (سەیفەددین غازی) دەستەلاتداریا ئەتابەگیان ل مووسلێ ل سالا (٥٤٤مش/١١٤٩ز)ێ كەفتە دەست برایێ وی (قەتبەددین مودود)ی دا، ئەوی ژی (عەلی كچك) وەك جێگر بۆ خۆ هێلا و ئەڤێ داویێ میرەكێ دی بۆ سەر كەلا ئامێدیێ و رەخ و روویان دەستنیشانكر ئەو ژی میر (تبر)[86] بوو، ل وی دەمێ كەلایێن دی ل دەڤەرا زاخۆ وەكی زەعفەرانیێ و كواشێ د دەست میرەكێ دی دا بوون ب ناڤێ (ئەغلبەك)ی[87]. هەژیە ئاڤرییەكێ ب دەینە هندێ كو ل سەردەمێ دەستەلاتداریا ئەتابەگ (قوتبەددین مودود)ی (٥٤٤- ٥٦٥مش/١١٤٩- ١١٦٩ز)ێ سالا (٥٥٦مش/١١٦٥ز)ی بزاڤەكا پشتەرێبوونێ ل كەلا ئامێدیێ ل سەر دەستێ ئێكێ جوی د گۆتنێ (داوود كورێ رۆمی) رویدا، بەلێ (عەلی كچك) شیا ب ڤەمرینیت[88].

پشتی مرنا ئەتابەگی (قوتبەددین مودود)ی سالا (٥٦٥مش/١١٦٩ز)ی دەستەلاتداریا مووسلێ كەفتە دەستێ كورێ وی (سەیفەددین غازیێ دووێ) و ئەڤی جێگرێ خۆ (فەخرەددین عەبدولمەسیح)[89] ڤەدەركر و ئێكێ دی ب ناڤێ (مجاهدین قایماز) ل جهێ وی دانا بوو و رێڤەبەریا هەمی كەلایێن سەر ب وێڤە كرنە د دەست دا تا كو مرنا (سەیفەددین غازی) ل سالا (٥٧٦مش/١١٨٠ز)ێ[90].

رێڤەبەریا كەلایێن دەڤەرا بەهدینان ما ل ژێر سەرپەرشتیا قایمازی تا كو ل سالا (٥٧٩مش/١١٨٢ز)ی ژ لایێ خونكارێ مووسلێ (عزەددین مەسعود)ی ڤە هاتیە گرتن و ل جهێ وی (مەحمود زولفندار) هاتە دانان و د وی سەردەمی دا گەلەك ژ ڤان كەلان تاگریا خۆ بۆ سولتان (سەلاحەددین ئەیوبی) راگەهاندبوو، ژ وان ژی میرێ كەلا ئاكرێ ، بەلێ خونكارێ مووسلێ شیا جارەكادی ب هێزێ ب زڤرینتەڤە[91].

پشتی دەركەفتنا (قایمازی) ژ گرتیخانێ سالا

(٥٨٠مــش/١١٨٣ز)ی جارەکادی (سەلاحەددین)ی ل سالا (٥٨١مش/١١٨٤ز)ی دووربێچا مووسلێ دا و د ڤی دەمی دا (سەلاحەددین)ی میر (مەشتۆبێ هەکاری) هنارتە کەلا جدیدێ سەر ب هەکاریا ڤە دا کو بگریت، دیسان گەلەك ژ میرێن خۆ یێن حەمیدی هنارتنە دەڤەرا ئاکرێ و کەلایێن وێ دا کو ب کەتە د ناڤ دەستەلاتداریا خۆدا، بەلێ ژێدەرێن مێژوویی چ باس ل هەلویستێ خودانێن وان کەلان دەربارەی سیاسەتا (سەلاحەددین)ی ل سەر مووسلێ و کەلایێن وێ کا چەوان بێنە د ناڤ دەستەلاتداریا وی دا ناکەن[٩٢].

دەمێ دووربێچا دووێ یا (سەلاحەددین)ی ل سەر مووسلێ سەرنەگرتی، (سەلاحەددین) یێ رژد بوو کو جارەکا دی و د هەمان سالێ دا (٥٨١مش/١١٨٤ز)ی مووسلێ وەرگریتەڤە، بەلێ خونکارێ مووسلێ (مەسعود) دگەل (سەلاحەددین)ی پێکهاتن و ل گۆرەی وێ پێکهاتنێ دووربێچ ل سەر مووسلێ هاتە راکرن و میرێ مووسلێ قایل بوو خوتبە ب ناڤێ (سەلاحەددین)ی ل وەلاتێ وی بێتە خواندن، و (سەلاحەددین) ژی قایل بوو دەستەلاتداری ل مووسلێ و کەلایێن وێ بۆ (مەسعود)ی[٩٣]بیت، ئانکو هەمی کەلایێن دەڤەرا بەهدینان ب ناڤ مانە سەر ب دەستەلاتداریا مووسلێ ڤە.

دەنگ و باس دەربارەی بارێ کەلایێن بەهدینان ژ دەمێ مرنا خونکارێ مووسلێ (عزەددین مەسعود)ی سالا (٥٨٩مش/١١٩٠ز)ی تا کو (بەدرەددین لوئلوئی) کو ب ناڤێ ئەتابەگیا دەستەلاتداریا تاکە کەسی ل سالا (٦٠٧مــش/١٢١٠ز)ی گرتیەدەست دهێنە برین[٩٤].

ئەگەر لێنەرینەکێ ل نەخشێ سیاسیێ دەڤەرا بەهدینان ل وی سەردەمی بکەین دێ بینین خونکارێ مووسلێ بەری مرنا خۆ کەلایێن ئاکرێ و شۆشێ دابوونە کورێ خۆ یێ بچویك (عیمادەددین زەنگی)یێ سیێ، بەلێ کەلا ئامێدیێ هەر ما ل ژێر دەستێ ئێك ژ کولەیێن (مەمالیکێن) (عزەددین مەسعود) ی، کو ژێدەر ناڤێ وی نائینن و پەیوەندی د ناڤبەرا خونکارێ ئامێدیێ و عیمادەددین زەنگی هەبوون بۆ چاوانییا رادەستکرنا ئامێدیێ بۆ ئەڤێ داویێ و ڤان پەیوەندیان ب سالان ڤەکێشا و (بەدرەددین لوئلوئی) یێ پێ ئاگەه بوو کا چ لێ هەیە، ژ بەر وێ چەندێ (بەدرەددین لوئلوئی) رابوو ب ڤەدەرکرنا خونکارێ ئامێدیێ و میرەکێ مەزن ژ زەلامێن خۆ ل جهێ وی دامەزراند و هندەك نوینەرێن (نواب) دی بۆ هەمی کەلایێن بەهدینان دانان دا کو ل پاشەرۆژێ تووشی هەمان ئاریشە نەبیت[٩٥].

ژ سالا (٦١٥مــــــش/١٢١٨ز)ی تا کو سالا (٦٢٢مــش/١٢٢٥ز)ی ململانا د ناڤبەرا (بەدرەددین لوئلوئی) و (عیمادەددین زەنگی) یێ سیێ ل سەر دەستەلاتداریا مووسلێ و کەلایێن سەر ب وێڤە ل دەڤەرا بەهدینان یا بەردەوام بوو و ل ڤێ سالێ (بەدرەددین لوئلوئی) دەستێ خۆ دانا سەر هەمی کەلایێن بەهدینان و هندەك نوینەرێن خۆ دانانە سەر وان هەمی کەلان، ئامێدیێ و هرۆرێ و جەدیدە و گرێ سۆر و کواشێ و ئاکرێ و شۆشێ[٩٦].

ل سالا (٦٣١مش/١٢٣٣ز)ی (بەدرەددین لوئلوئی) شیبا داوی خونکارێ ئەتابەگی (ناسرددین مەحمود) بکوژیت و خۆ وەك خونکارەکێ سەربخۆ ل مووسلێ و رەخ و روویان راگەهاند پشتی دانپێدان ژ لایێ خەلیفەیێ عەباسی ل سەر میرگەها خۆ وەرگرتی[٩٧].

دەستەلاتداریا وی ل سەر مووسلێ بەردەوامی پێ هاتەدان تا کو سەرپەشکێن هێزێن مەغۆلان گەهشتینە رەخ و دۆرێن عیراقێ و (ئەلکتبی) د ناڤ رویدانێن سالا (٦٥٤مش/١٢٥٦ز) دا ئاماژە ب وێ چەندێ دکەت دەمێ د بێژیت: (خودانێ مووسلێ و شنگالێ و جزیرێ و ئەو کەلایێن هاتینە ب سەرڤە و ئەو وەلات هەمی ل ژێر دەستەلاتداریا خونکارێ دلۆڤان (بەدرەددین لوئلوئی) ئەتابەگی بوون[٩٨].

پشتی هۆلاکۆی سالا (٦٥٦مش/١٢٥٨ز)ی کونترۆل ل سەر بەغدا (پایتەختێ خیلافەتا عەباسییان) کری، گەلەك تێدا نەما و بەرەڤ ئازربایجان ڤە چوو و (مراغە) کرە بارەگایێ رابوون و روینشتنا خۆ و

میرێن وەلاتێن دەردۆرێ د هاتنە دەڤ و پیرۆزباهی ژ بەر وەرگرتنا بەغدا لێ د کرن[٩٩]، ژ وان میران ژی (بەدرەددین لوئلوئی) خونکارێ مووسلێ و خودانێ کەلایێن دەڤەرا بەهدینان. و (ئیبنو لعیبەری) ناڤێ میرێ کەلا ئامێدیێ ب (عزەددین ئیباغ) دهینت کو ئێك ژ (مەمالیکێن) کولەبێن (بەدرەددین لوئلوئی) بوو[١٠٠]. بەلێ (فەزلوللا ئەلعومەری) د بێژیت: د وی سەردەمی دا میر (مبارزولدین کك)ی میراتی ل کەلا ئاکرێ و شۆشێ د کر[١٠١].

ئەم د شێین بێژین کو کەلایێن بەهدینان تووشی هێرشێن مەغۆلان نەبووینە چونکی ئەڤ کەلاە سەر ب (بەدرەددین لوئلوئی)ی ڤەبوون کو ئەو ژی سەر ب مەغۆلانڤە بوو[١٠٢]، دیسان (مبارزولدین کك)ی رێزەکا مەزن ل دەڤ هۆلاکۆی هەبوو وەکی (ئەلقەلقەشەندی) ئاماژە ب وێ چەندێ د کەت[١٠٣].

پشتی مرنا (بەدرەددین لوئلوئی)ی ل سالا (٦٥٧مش/ ١٢٥٩ز)ی میرگەها وی ل سەر کورێن وی هاتە پارڤەکرن، مووسل و کەلایێن بەهدینان و ل پێشیێ ئامێدیێ و یێن سەر ب وێڤە بەر ب کورێ وی (ئەلسالح ئیسماعیل کورێ بەدرەددین لوئلوئی) کەتبوون[١٠٤]، بەلێ کەلایێن ئاکرێ و شۆشێ و یێن سەر ب وانڤە مانە ل ژێر دەستەلاتداریا میر (مبارزلدین کك)یڤە[١٠٥].

تاگریا (ئەلمەلك ئەلسالح ئیسماعیل)ی بۆ مەغۆلان بۆ دەمەکێ کێم بەردەوامی کر و ئەگەرێ وێ چەندێ ژی گوهۆرینێن مەزن بوون یێن ل مەیدانا سیاسی ل وەلاتێن شامێ و مسرێ رووداین و شکەستنا مەغۆلان ل شەرێ (جالوت) ل سالا (٦٥٨مش/١٢٦٠ز)ی و ئەڤێ چەندێ ژی کاودانێن نوو پەیداکرن، کو دڤیا هەلویستێن خۆ دەربارەی مەغۆلان ب گوهۆرن، و دەستپێکرن لایەنگریا بۆ مەمالیکان دیارکرن و شیان پیلانێن مەغۆلان یێن بەرفرەهکرنێ ژ ناڤبەن[١٠٦].

ئێکەم کورێ (بەدرەددین لوئلوئی)ی یێن کو دانیێدان ب دەستەلاتداریا مەغۆلان نەکری خونکارێ شنگالێ (عەلائەددین) بوو یێ کو چوویە مسرێ و ژ لایێ سولتان (زاهر بیبەرس)ی ڤە پێشوازی لێ هاتییە کرن و وەك خونکار ل سەر حەلەبێ هاتە دانان[١٠٧]، ژ وێرێ بۆ برایێ خۆ (ئەلمەلك ئەلسالح ئیسماعیل)ی نڤیسی کو مووسلێ ب جهـ بهێلیت و بەرێ خۆ ب دەتە مسرێ[١٠٨].

(ئەلمەلك ئەلسالح ئیسماعیل) زوو بەرەڤ مسرێ ڤە چوو و ل داوییا هەیڤا رەجەبێ سالا (٦٥٩مش/١٢٦١ز)ێ گەهشتێ و ژ لایێ سولتان (بیبەرس)ی ڤە پێشوازی لێ هاتەکرن و هاتە خەلاتکرن و گەلەك پارچە زەڤی ل مسرێ دانێ[١٠٩] و پاشی سولتانی نڤیسارەك بۆ (ئەلمەلك ئەلسالح ئیسماعیل)ی دەرئێخست و ئەو دانا سەر دەستەلاتا مووسل و دەڤەر و کەلایێن ب سەرڤە و ئەوا د نڤیسارێ دا هاتی (مووسل و ویلایەت و دەڤەرێن وێ ... ئاکرێ و شۆشێ و کەلایێن ئامێدیێ و وەلاتێ وێ، کواشێ و هرۆر و گرێ سۆر و ئەوێن ب سەرڤە)[١١٠] و ل دووڤ ڤێ نڤیسارا دانانێ ئەوا (ئەلمەلك ئەلسالح ئیسماعیل) وەرگرتی هەمی کەلایێن دەڤەرا بەهدینان کەفتنە ژێر دەستەلاتداریا وی وەکی ل سەردەمێ بابێ وی د بەرێدا.

بەلێ ئەڤ دانانە وەکی ئەلمەلك ئەلسالح ب دەستڤە ئینای نە هاتە جهئینان چونکی وی مسر ب جهـ هێلا و بەرەڤ مووسلێ ب رێ کەفت، پشتی چوویە ناڤ مووسلێ مەغۆل شیان دەست ب سەرڤا بگرن و وی بکوژن[١١١] و مووسل و هەمی رەخ و روویێن ب سەرڤە راستەوخۆ کەفتنە ژێر دەستەلاتداریا مەغۆلان.

ژ لایەکێ دووڤە (عزەددین ئیباغ)ی پشتی تاگریا خۆ بۆ مەغۆلان ئاشکەراکری شیا بەردەوامیێ بدەتە دەستەلاتداریا خۆ ل سەر ئامێدیێ، و هەمی دەڤەرا بەهدینان سەر ب مەغۆلان ڤە بوون، وەکی (ئەلدواداری) د نڤیسینا خۆدا ئاماژە پێکری (دەولەتا کورێن بەدرەددین لوئلوئی ل مووسلێ و جزیرا بۆتان و ئەو جهێن ب سەر ڤە و ئاکرێ و شۆشێ و یێن سەر ب وانڤە د گەل کەلایێن کواشێ و سەر ب وێ ڤە ژناڤچوو)[١١٢].

دەرگەهێ رۆژئاڤایێ کەلا ئامێدیێ (دەرگەهێ سەقافا - مووسلێ)



ل سەردەمێ حوکمرانییا میراتگرێن هۆلاکۆی (٦٦٣-٧٣٧مش/١٢٦٤- ١٣٣٦ز)ی ژێدەرێن مێژوویی چ پێزانینێن گرنگ و رۆن ل سەر بارێ کەلایێن بەهدینان نادەن ژبلی ناڤ ئینانا خونکارێن وان. بۆ نموونە (عزەددین ئیباغ) تا کو سالا (٦٦٧مش/١٢٦٨ز) ما خونکارێ کەلا ئامێدیێ[١١٣] پشتی هینگێ چارەنڤیسێ وی دیار نینە. (ئیبن فەزلەللا ئەلعومەری) دو میرێن هەکاریان ل سەر دەمێ میراتگریا (مەسعود ئەلبەرقۆتی) یێ ئێکێ (٦٦٦-٦٦٨مش/١٢٦٧- ١٢٦٨ز) ی دەستنیشاندکەت کو میراتی ل کەلا ئامێدیێ و کەلایێن ب سەرڤە دکرن، ئەو ژی (ئەبو بەکر و میر عەلی) بوون، (ئەبو بەکری) پشتەرێبوونا خۆ دژی مەغۆلان راگەهاند، بەلێ (ئەبو مەسعود ئەلبەرقۆتی) شیا وی بکوژیت، لێ برایێ وی (میر عەلی) ما سەربخۆ د کەلایەکا هەکاریانڤە تا کو مری و پشتی وی کورێ وی (غەرسەددین)ی جهێ وی گرتی و کەلا هرۆرێ کرە بارەگایێ خۆ[١١٤].

بەلێ کەلایێن ئاکرێ و شۆشێ مانە دەست میر (مبارزلدین کك)ی دا ئەوێ ل گەل مەغۆلان رێککەفتی و (وی د دەولەتا هۆلاکۆی دا جهەکێ بلند هەبوو و ئاکرێ و شۆشێ دابوونێ ... و ما میر تا کو ژێ نوت سالیێ و رۆمەتا وی رۆمەتا گەنجانبوو)[١١٥].

د ژێدەرێن مێژوویی دا چ پێزانین ل سەر کەلایێن بەهدینان ل سەردەمێ (ئیلخانێن مەغۆلی) (میراتگرێن مەغۆلان) نینن، ژ بلی ئاڤرییەکا بچویك ل سەردەمێ (ئەرغۆن) (٦٨٣-٦٩٠مش/١٢٨٤-١٢٩١ز) ی ئەوێ پێکۆلکری میر (مبارزلدین کك)ی میرێ ئاکرێ و شۆشێ بکوژیت دەمێ سەردانا (ئەرغۆنی) کری بەلێ تێدا سەرنەکەت و میری ب نەپەنیڤە خۆ ڤەکێشا دەڤەرێن ئاسێ یێن چیای[١١٦].

جارەکادی (مبارزلدین کك) زڤریڤە کەلایێن خۆ یێن کەڤن ئاکرێ و شۆشێ و بەردەوام ما ل سەر

دەستەلاتدارییا خۆ تا کو مرنا وی (کو نەیا دیارە) پشتی میرگەهەکا نیمچە سەربخۆ دامەزراندی کو د ژێدەرێن مێژوویی دا ب (میرگەها مازنجانییان) دهێتە ناسکرن[117] و پشتی وی کورێن وی (عزەددین) و پشتی وی (نەجمەددین خدر)ی و پاشی (شوجاعەددین) دەستەلاتداری لێ گێرا و ئەڤێ داوییێ پەیوەندیێن سیاسی د گەل سولتانێ مەملۆکی ل مسرێ هەبوون. ئەڤێ چەندێ (ئەلقەلقەشەندی) ددەتە خویاکرنێ دەمێ د بێژیت: ( د دەستووراندا وەك خودانێ ئاکرێ و شۆشێ دەربرین ژێ د هێتەکرن ، وی نڤیسار ل بەر دەرگەهێن سولتانی ل وەلاتێ مسرێ هەبوون[118].

دەربارەی کەلا ئامێدیێ (ئیبن نازر ئەلجەیش) دبێژیت کو ل کارئینانیا دەمێ (ئیلخانییا) میرەکی دەستەلاتداری لێ د کر د گۆتنێ (حاجی کورێ عومەر)ی و ژێدەر چ پێزانینان ل سەر وی و چەوانییا وەرگرتنا ئامێدیێ نادەن[119].

## کەلا

گرنگترین کەلایێن بەهدینان د وی سەردەمیدا یێن ئەڤ ڤەکولینە ژێ دگریت، کەلایێن ژێرینە:

### ١-کەلا ئاشەبێ[120]:

هەرچەندە پێزانین دەربارەی ڤێ کەلایێ دکێمن، بەلێ ئەم دکارین بێژین یەك ژ کەلایێن گرنگێن وەلاتێ هەکارێ بوو و بارەگایێ میرێن هەکارێ ل بەراهیێ ل وێرێ بوو، بۆ یەکەم جار ناڤێ ڤێ کەلایێ د روودانێن سالا (٥٢٨مش/١١٣٣ز) هاتییە کو مێرێ وێ ئەبوئەلهیجاء عەبدوللا کورێ خەلیلێ کورێ مەرزەبانێ هەکاری بوو[121]. ئیبن ئەلئەسیر پەسنا وێ کرییە کو مەزنترین و قایمترین ئاسێگەها کوردێن هەکارێ بوو، خێزان و سامانێن وان ل وێرێ بوون"[122].

ل سالا (٥٣٧مش/١١٤٢ز) میر عیمادەدینێ زەنگی فەرمان دا جێگرێ خۆ نەسیرەدین جوقری ڤێ کەلایێ خراب بکەت، پاشان کەلا ئامێدیێ ل شوونا وێ بێتە ئاڤاکرن[123]. داکو ئەڤ کەلایە د پاشە رۆژێدا نەبیتە مەلبەندەکێ بەرگریێ و کورد دژی بەرژەوەندیێن وی ل دەڤەرێ مفای ژێ وەرگرن[124].

### ٢- کەلا هرورێ:

ئەڤ کەلایە دکەڤیتە دوورترین پشکا باکوورێ پارێزگەها دهۆکێ. و ئەلقەلقەشەندی جهێ وێ دەسنیشانکرییە کو "دکەڤیتە نێزیکی وەلاتێ جولەمێرگێ"[125]. بەلێ ئەلحەمەوی ئاماژە پێکرییە کو " ژ دەڤەرێن سەر ب موسلێ یە و ل باکوورێ وێ یە و سیهـ فەرسەخ[126] د نێڤبەرا هەردو یاندا هەنە[127]. و هەمان جوگرافیناس جهێ وێ دەسنیشانکرییە کو دووراتییا نێڤبەرا وێ و ئامێدیێ سێ میلن[128].

یا ئاشکرایە هندی پەیوەندی ب دەڤەرێن هەڤتوخیبێن وێ ڤە هەی جوگرافیناس یاقوت ئەلحەمەوی یێ سەرکەتی نەبوویە د دەسنیشانکرنا جهێ وێ یێ جوگرافیدا و دووراتیا نێڤبەرا وێ و ئامێدیێ نە سێ میل ئانکو (٥کم)ن بەلکی دگەهیتە(٢٠کم)ان.

دیرۆکنڤیسێن موسلمان ناڤێ کەلا هرورێ ب شێوازێن ژێك جودا، مسکویەی ب کەلا(اهرور) ناڤێ وێ ئینایە[129]. بەلێ یێن دن ب کەلا هرور(قلعە هرور) ناڤێ وێ ئینایە[130]، کو ئەڤە ژی ناڤێ دروستە، هەروەکی ل جەم پرانییا دیرۆکنڤیسێن ئاماژە پێکری هاتی و هەتا نها ژی گوندی ئەڤ ناڤە هەلگرتیە، هەروەسان قەلقەشەندی ب کەلا هارون (قلعە هارون) ناڤکرییە و گوتیە کو ئامێدیێ و کەلا هارون دکەڤنە نێزیکی وەلاتێ جولەمێرگێ[131].

و یەکەمین جارا ناڤێ ڤێ کەلایێ د ژێدەرێن دیرۆکیدا هاتی ل دووڤ پێزانینێن مە سالا(٣٦٧مش/٩٨٧ز) بوو دەمێ شەرەنیخا نێڤبەرا ئەبا تەغلەبێ حەمدانی و عەزدوئەلدەولەیێ بوەیهی پەڤی و یێ داویێ دەست ب سەر کەلایێن ئەباتەغلەبی دا گرتی کو هرورێ یەك ژ وان کەلان بوو[132].

ئیبن ئەلئەسیر ئاماژە ب وێ چەندێ کرییە کو

لایەك ژ كەلا هرورێ



ئەڤ كەلایە دكەڤیتە جهەكێ سەخت و ئاسێ دەمێ گۆتی:" قایمترین و ئاسێترین ئاسێگەها وانە و بێن وەكی وێ نینن"[١٣٣].

ژ سەردەمێ هێرشا زەنگی ڤە بۆ سەر بارەگایێ میرێن هەكاری ل سالا (٥٢٨مش/١١٣٣ز) ناڤێ وێ دنێڤ كەلایێن هەكاری دا هاتییە[١٣٤].

## ٣- كەلا كواشێ:

ئەڤ كەلایە دكەڤیتە دەڤەرا سلێڤانەیی، نێزیكی(١٠كم) ژ سەنتەرێ قەزا سێمێلێ دوورە، دگەلەك پەرتووكێن دیرۆكیدا ناڤێ وێ هاتییە، بەلێ دیرۆكنڤیس و جوگرافیناسان جوداهی نە ئێخستیە نێڤبەرا وێ و كەلا ئەردەمشتێ (ئەرمشتێ) و ب یەك كەلا دایە نیاسین[١٣٥]. ژ بەركو كەلا كواشێ دكەڤیتە ئالیێ پێشییێ یێ چیایێ سپی و كەلا ئەرمشتێ دكەڤیتە ئالیێ پشتێ، و د ئەنجامێ وێ چەندێ كو هەردو دكەڤنە سەر چیایەكی و هەردو ژی د یەك قوناغا دیرۆكیدا هاتینە نیاسین لەومان دیرۆكنڤیسان وەك یەك كەلا هژمارتیە.

كەلا دكەڤیتە سەر گرەكێ هێلكەیی، بلنداهییا وی نێزیكی پێنجی مەترایە، خەلكێ دەڤەرێ ب گرێ خازیا ناڤ دكەن[١٣٦]، ئەلحەمەوی وەك كەلایەكا قایم ل رۆژهەلاتێ موسلێ پەسنا وێ كرییە[١٣٧]. هەروەسان ئیبن ئەلئەسیر دەربارەی قاییمیا وێ گۆتیە:" كواشێ ژ قاییمترین كەلایێن موسلێ و بلندترین و ئاسێترینێن وانە"[١٣٨].

هەروەكی دیار كواشێ كەلایەكا گرنگ بوو چەندین گوند سەر ب وێ ڤە بوون، ب پەسنا (كواشێ و وەلاتێ وێ) ناڤێ وێ دنامەیێن سولتانێن مەمالیكاندا هاتییە[١٣٩]. كواشێ و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە خۆدی ئاڤاكا زۆرن، گەرۆك ئولیا چەلەبی هژمارا كانیێن وێ ب حەفتی كانی دانایننە[١٤٠].

## ٤- كەلا ئەردەمشت (ئەرمشتێ):

ئەڤ كەلایە دكەڤیتە سەر زنجیرا چیایێ سپی، نێزیكی(٧٠كم) ژ بازێرێ دهۆكێ دوورە، دیرۆكنڤیس و جوگرافیناسێن موسلمان د هووربین نەبووینە د دەسنیشانكرنا جهێ وێ دا، ل دووڤ گوتنا

کەلا ئەرمشتێ



ئەلحەمەوی دکەڤیتە سەر چیایێ جودی نێزیکی جزیرا ئیبن عومەری[١٤١]، هەروەسان ئەو کەلا و کەلا کواشێ ب یەك کەلا ناڤکرینە، هەتا کو دەمێ ئەلحەمەوی ئاماژە ب سەختیا کواشێ دکەت دەمێ دبێژیت:"تنێ رێکەك هەیە ئەو ژی تێرا کەسەکێ پیادە دکەت"[١٤٢] ب ڤێ گوتنێ مەرەما وی کەلا ئەردەمشتێ (ئەرمشتێ) یە، ژ بەر کو کواشێ نەهند کەلایەکا سەخت و قاییم بوو، هەروەسان ئەلمەسعودی ناڤێ کەلا ئەلصواره[١٤٣] دانایە سەر



کو ئەڤە ژی ناڤەکێ غەریبە و ل جەم دیرۆکنڤیسێن دی نەهاتییە نیاسین.

ژ بەرکو جهێ وێ یێ سەخت و قاییم بوو حەمدانییان گەلەك گرنگی پێدایە و ناسرولدەولەیێ حەمدانی سەر ژ نوو ئاڤاکرییەڤە پشتی کو موعتەزەدێ(المعتضد) خەلیفەیێ عەباسی هەرفاندی، هەروەسان ئەبو تەغلەبێ حەمدانی سامان و گەنجینێن خۆ ل ڤێ کەلایێ دانابنه[١٤٤].

ئەڤ کەلایە دبیتە دو پشك، پشکا ژێری هندەك بیرێن کولاینە دکەڤریدا دگەهنە نێزیکی ١١ بیران و عومبارەك مەزن بۆ عەمبارکرنا دەخل و دانێ لێ هەیە، بەلێ پشکا ژووری نێزیکی ٢٠ ژوورێن ژ بەری و کلسی ئاڤاکری لێ هەنە و یەك ژ ڤان ژۆران مزگەفت بوو و هێژ شوینوارێن میحرابێ لێ هەنە، هەروەسان ل هەر چوار کوژێێن کەلایێ شوینوارێن بورجێن زیرەڤانیێ لێ هەنە[١٤٥].

## ٥- کەلا زەعفەرانیێ (زافەرانیێ) :

ئەڤ کەلایە دکەڤیتە ژێریا چیایێ بێخێری و نێزیکی گوندێ کولێ یێ نها. ئەلحەمەوی دەربارەی وێ گۆتیە کو دکەڤیتە ژێریا چیایێ جودی[١٤٦]. نێزیکی (٤٠کم) ژ باژێرکێ مەعلاسایا دووره[١٤٧]. ئیبن ئەلئەسیر ئاماژە پێ دکەت کو دکەڤیتە ژێریا چیایەکێ بلند نێزیکی فیشخابوور(پێشیابویرێ) [١٤٨]. دێرەکا کەڤن لێ هەبوو ب دێرا زەعفەرانێ دهێتە نیاسین[١٤٩].

ئەڤ کەلایە کو ل سەر گرەکی ل هنداڤ باژێرکێ کەڤنە یێ ب رەنگێ نیڤبازنەکا بێ سەروبەر شوینوارێن وی دکەڤنە دەشتەکێ کو ب نێزیکی٢- ٥ کم ب سەمتا رووبارێ دیجلە بەرەف ژێر دبیتەڤە[١٥٠]. و هەتا نها شوینەوارێن دیوارێن وی ماینە و ستووراتیا وان نێزیکی(١،٧٠م) و هەردو ئالیێن دیواری ب بەران هاتینە ئاڤاکرن[١٥١]، دبیت ب پەیڤا زەعفەران هاتییە ناڤکرن ژ بەر چاندنا رووەکێ زەعفەران ل دەورو بەرێن کەلایێ[١٥٢] .

كەلا شوشێ ژلایێ باشوری و رۆژئاڤای ڤە



## ٦-كەلا شوشێ:

كەلایەكا ناڤدارە ژ دەڤەرێن سەر ب موسلێ ڤە یە ل رۆژهەلاتێ روبارێ دیجلەی[153]. هەڤسوویێ كەلا ئاكرێ یە[154]. بەلێ كەلا شوشێ ژ یا ئاكرێ مەزنتر و بلندترە،لێ ژ ئالیێ ئابووریڤە سەنگا وێ كێمترە [155].

ئەڤ كەلایە ب كەلایەكا سەخت و قایم هاتییە نیاسین، ئیبن ئەلئەسیر ئاماژە ب ڤێ چەندێ كرییە دەمێ گۆتی:"دكەڤیتە سەرچیایەكێ بلند"[156]، لەوما شیا بۆ دەمەكێ درێژ خۆ ل بەر هێرشا بەدرەدین لوئلوئی بگریت، هەتا كو ئیبن ئەلئەسیری گۆتی:" ژبەر قایمیا وێ ڤەمانا وی ل وێرێ یا دەمدرێژ بوو"[157].

د ژێدەرێن سریانیدا ناڤێ وێ وەك گوندەك ب ناڤێ (باشوش) هاتییە[158] و نێزیكی (٩٠كم) ژ موسلێ دوورە[159].

## ٧- كەلا ئەلجەدیدە:

یەكەم جار ناڤێ ڤێ كەلایێ هاتییە دەمێ سەلاحەدینێ ئەیوبی ڤیای دەست ب سەر باژێرێ مووسلێ دا بگریت. ئیبن ئەلئەسیری دیاركرییە كو ل سالا (٥٨١مش/١١٨٥ز) سولتانی میر مەشتوبێ هەكاری[160]هنارتییە سەر ڤێ كەلایێ و دووریێچدایە و مایە ل وێرێ هەتا سەلاحەدینێ ئەیوبی ژ مووسلێ چوویی. ژێدەرێن دیرۆكی و جوگرافی ب دروستی جهێ ڤێ كەلایێ دیارنەكرییە، ئیبن ئەلئەسیر و ئەلغەسانی ئاماژە پێدایە كو دكەڤیتە وەلاتێ هەكارێ ژ دەڤەرێن سەر ب موسلێ، پشتی كو ل سالا(٦٢٢مش/١٢٢٤ز) هاتییە هەرفاندن[161] و گوندێن وێ داینە دگەل كەلا ئامێدیێ ڤە[162]. ئەلحەمەوی یێ پشت راست نەبوویە ژ جهێ وێ لەوما دو بۆچوون بەرچاڤكرینە یا یەكەم كو دكەڤیتە نێڤبەرا نسێبینێ و موسلێ، یا دووێ كو كەلایەكا كەڤنە و دەڤەرێن وێ سەر ب حەسكێڤێ نە[163]. و دبیت ئیبن ئەلئەسیر و ئەلحەمەوی د هووربین نەبووینە د دەسنیشانكرنا جهێ وێ دا، نوكە گوندەك ل دەڤەرا بەرواری بالا هەیە ب گوندێ جدیدكێ دهێتە ناڤكرن و جهێ وی

سێریجا ئاڤێ ل کەلا گرێ سۆر



بی ئاسێ یە و نێزیکی ئامێدیێ یە و دبیت ئەو کەلا ئەلجەدیدە بیت.

## ٨-کەلا جل صورا (گرێ سۆر):

ئەڤ کەلایە دکەڤیتە دەڤەرا بەرواری بالا، نێزیکی (١٥کم) ژ بازێرکێ کانی ماسێ دوورە، د ژێدەرێن دیرۆکیدا ناڤێ وێ ب شێوازێن جودا جودا هاتییە، جارەکێ ب(جل صوری) جارەکا دی ب (جل صورا) و یا دی ب (جلصورا) هاتییە ناڤکرن[١٦٤]. ئەلحەمەوی ب "کەلایەکە ل چیایێن هەکاریێ ل ئاخا موسلێ"[١٦٥] دایە ناسکرن. ئیبن ئەلئەسیری ژ هندەك جوامێرێن کوردان ڤەگوهاستیە کو یەك ژ کەلایێن وەلاتێ هەکاریێ یە[١٦٦].

ئەڤ کەلایە دکەڤیتە سەر گرەکێ ئاخێ یێ سور ل نیڤا دەشتەکا ڤەبووی، بلنداهیا وێ ژ (٥٠- ٦٠) مەترانە[١٦٧]. دبیت ئەڤ ناڤە ژ رەنگێ گرێ سۆر هاتبیت، ژ بەرکو هەرکەسێ ژ دوورڤە بەرێ خۆ ددەتێ رەنگێ وی گری سور دیار دبیت و د ئەنجامدا ل جەم خەلکێ دەڤەرێ ب گرێ سور هاتییە نیاسن و ژ بەرکو تیپا (گ) د زمانێ عەرەبیدا نینە و تیپا(ج) شوونا وێ د گریت بوویە (جل صورا).

## ٩- کەلا ئەلشەعبانیە (شابانیێ)[١٦٨]:

مسکویە یەکەمین کەسە ژ دیرۆکنڤیسان

بەرمایێن ئاڤاهیەکێ ل نیڤا کەلا شابان



ناڤێ ڤێ کەلایێ ئینای و ب یەك ژ کەلایێن گرنگێن حەمدانییان دایە نیاسین[١٦٩]. هەروەسان ئیبن ئەلئەسیری د هەردو پەرتووکێن خۆدا ناڤێ وێ ئینایە، بەلێ پێزانینێن وێ دژهەڤ و نە دبنەجهـ بوونە، هەروەکی د پەرتووکا (التارخ الباهر)دا دبێژیت: ل سالا (٥٣٧مش/١٢٤٢ز) عیمادەدینێ زەنگی دەست ب سەر کەلا شابانیێ دا گرت و هەرفاند و وەك یەك ژ مەزنترین کەلایێن هەکاریێ دایە نیاسین[١٧٠]. بەلێ د پەرتووکا خۆ (الکامل) دا دبێژیت: جێگرێ زەنگی نەسیرەدین جقری پشتی کەلا ئاشەبێ خرابکری ل سالا (٥٢٨مش/١١٣٣ز) هندەك لەشکەرێ دی هنارتە سەر کەلا شابانیێ و پشتی کو دوورپێچدای دەست بسەردا گرت و ب یەك ژ ئاسێگەهێن (حصون) عەشیرەتا مەهرانی هژمارتیە[١٧١].

ب هەر رەنگەکێ هەبیت ئەڤ کەلایە دکەڤیتە سەر زنجیرا چیایێ شکێریی ل باکوورێ رۆژئاڤایێ بازێرکێ باتوفا ئەوێ نێزیکی (٢٥کم) دوور ژ زاخۆ، و هەتا نها شوینەوارێن هژمارەکا زۆر ژ ژوور(مەزەلك) و بیرێن ئاڤێ لێ مانە و جهێ کەلا دکەڤیتێ جهەکێ ئاسێ یە و تنێ یەك رێك دچیتێ[١٧٢].

هندەك کەلایێن دی هەنە کو دیرۆکنڤیس و جوگرافیناسان ژ کەلایێن دەڤەرا زۆزان هژمارتینە، بەلێ ئەز ب پێدڤی دبینم ل ڤێرێ د نێڤ کەلایێن وەلاتێ هەکاریێ دا ئاماژە پێ بکەم، چنکو د وی

سەردەمیدا و هەتا نها ژی دنێڤ توخیبێ وێ دەڤەرێ دانە یا کو ڤەکولینا مە ژێ دگریت. ب تایبەت کو جوگرافیناسێن موسلمان ب رەنگەکێ گشتی و بێی دەسنیشانکرن ئاماژە ب توخیبێ زۆزان کرییە، یاقوت ئەلحەمەوی ب " وار(کورە)کا باشە د نێڤبەرا چیایێن ئەرمەنیا ژ ئالیەکیڤە و خەلات و ئازەربێجانێ و دیاربەکرێ و موسلێ ژ ئالیەکێ دووڤە"(١٧٣) پەسنا وێ کرییە. هەروەسان یاقوتی ب ڤەگوهاستن ژ ئیبن ئەلئەسیری دایە نیاسین دەمێ گۆتی" زۆزان دەڤەرەکا بەرفرەهە ل رۆژهەلاتێ رووبارێ دجلە ژ جزیرا ئیبن عومەری و یەکەمین توخیبێ وێ ژ موسلێ هەتا توخیبێ خەلاتێ ب دووراتیا دو رۆژانە و ل توخیبێ ئازەربێجانێ ب داوی دهێت"(١٧٤). هەروەها ئیبن حەوقەل دەربارەی وێ د بێژیت :" دەڤەر و کەلانە، بیستان ژی هەنە و پرانیا وێ چیانە"(١٧٥).

## ١٠- کەلا بێتە نویرێ:

کەلا بێتە نویرێ ئێك ژ کەلایێن بەهدینانە، هەر چەندە ژێدەرێن مێژوویی کێم باسی وێ کرییە لێ ڤێ کەلایێ ژی رۆلێ خۆ هەبوویە د دیرۆکا میرگەها بەهدینان دا. ئەڤ کەلایە د کەڤیتە رۆژهەلاتی دەڤەرا بەرواری بالا، نێزیکی (٣کم) ل باشووری رۆژهەلاتێ باژێرکێ کانی ماسێ، ژ لایەکێ دی ڤە د کەڤیتە باکووری رۆژهەلاتێ کەلا ئامێدیێ ب دووراتییا (٣٠کم) و چیایێ مەتینا ناڤبرە د ناڤبەرا هەردو کەلان دا.

سنوورێن سرۆشتی یێن کەلا بێتە نویرێ، باکووری وێ چیایێ زرکی و کورێ زێری یە و باشووری وێ چیایێ مەتینا و سەر دەرەجا ئێکمالێ یە، رۆژهەلاتێ وێ دەڤەرا نێروە و زێ مەزن و گوندێ تروانشێ یە، رۆژئاڤایێ وێ چیایێ گابنێرك و گوندێ بێتە نویرێ و شمایلایە.

د پەرتووکەکێ دا هاتییە د بێژیت: ئەڤ کەلایە د کەڤیتە د ناڤبەرا گوندێ بێتە نویرێ و تروانشێ دا ل دەڤەرا بەرواری بالا، و ئەڤە کەلایەکا مەزنە ل هنداڤی دۆلەکا تەنگ و کویر د بێژنێ گەلیێ (بیگ داودا) و ل سەر بانیێکا کەڤرین.

شوینوارێن سەرێنجا ئاڤێ ل کەلا بێتەنویرێ



دیوارێ باکورێ کەلا بێتەنویرێ



پشتی مرۆڤ ب ناڤ سنوورێن کەلایێ بخۆ دکەڤیت ژ رۆژهەلاتی ڤە بەرەڤ بلندترین جهـ ل کەلایێ دچیت کو رووبەرێ وێ دگەهیتە (١٥م)، درێژاهی و پانی (١٠م) ژێ ماینە ئەو جهێ تەلارا میری ل سەر هاتییە ئاڤاکرن هەر چەندە هندەك ژ ڤی جهی ژی د گەل هەرفتەی چوویە، بەلێ رووبەرێ تەلارا میری ل سەرە، درێژاهییا وی (١٥م)ن و پانییا وی (٧م) و شوینوار لێ د دیارن، د بیت هندەك ژ قەسرا میری ژی دگەل لایێ هەرفتی چوویت.

لایێ باکووری یێ کەلای شوینوارێن ژ (٣٠- ٤٠) ژوورا لێ ماینە و ستویراتییا دیوارێن وان دگەهنە (١م) ێ. مزگەفتا کەلای دکەڤیتە لایێ باکووری، دیوارێ مزگەفتێ یێ باکوور و دیوارێ باکوورێ کەلایێ د

نێزیکی ئێکن و پانییا دیوارێ مزگەفتێ (١م)ە، سێ دەرگەهـ د چنە مزگەفتێ ژ لایێ رۆژهەلات و رۆژئاڤا و باكووری ڤە. درێژاهییا مزگەفتێ (١٤م)ن و پانییا وێ (٥٠سم)ە و بلنداهییا وێ (١٤٠سم)ن.

## ١١- كەلا ئەرزێ:

كەلا ئەرزێ د كەڤیتە سەر زنجیرەكا شۆر ل ژێرییا رۆژئاڤایێ چیایێ مەتینا د ناڤبەرا گوندێ ئەرزێ و گەلیێ دیهێ و گوندێ بابگۆرییا و تیێ دێرێ دا ل رۆژئاڤایی. باكووری وێ گوندێ بانكا و چیایێ مەتینایە و باشووری وێ گوندێ دیهێ و دەڤەرا سپنەیە، كەلا ئەرزێ دەربارەی كەلایێن دی یێن دەڤەرا بەهدینان، ل رۆژهەلاتێ وێ كەلا ئامێدیێ یە و پتر ژ (٢٥كم) ژێ دوورە و ل رۆژئاڤایێ وێ كەلا شابانیێ دهێتە دیتن و نێزیکی (٢٠كم) ژێ دوورە. ل باكووری وێ ب دووراتییا (٥كم) كەلا شخۆیە بەلێ چیایێ مەتینێ ناڤبرە د ناڤبەرا هەردواندا، ل باشووری وێ ژی كەلا بابۆخكێ یە.

د ناڤ سنوورێن كەلایێ دا و ل رۆژهەلاتێ كەلایێ ل هنداڤی بركا ئاڤێ مەیدانەكا بچویك ب پانییا (٢٢م) و درێژاهییا (٢٥م) هەیە، دبیت ئەڤە ژی جهێ جڤین و كۆمبوونا بیت، یان ژی جهێ وان نۆبەدارا بیت ئەوێن نۆبەداری ل دەرگەهێ رۆژهەلاتێ كەلایێ دكرن و د كەڤیتە بەرامبەر چەپەرێ سۆرا.

ژ شوینوارێن كەڤن ل كەلاێ چەند ژوورەك لێ ماینە و تەلارا میری د كەڤیتە بلندترین جهـ ل سەرێ كەلایێ و بەرامبەر دەڤەرا سپنەی و چیایێ مەتینێ.

دیسان ل لایێ باشووری كەلایێ، ئانكو ل ژێرییا تەلارا میری مەیدانەكا دی یا بچویك ب فرەهییا (٢٣م) و درێژاهییا (٤٢م) هەیە، دبیت ئەڤە جهێ دەركەتنا خەلكێ كەلایێ بیت یان ژی نۆبەدارێن دەرگەهێ باشووری كەلاێ مفا ژ ڤێ مەیدانێ بۆ زێرەڤانیێ و روینشتنێ ددیت.

بركەكا ڤێری و ماسرەكا دۆشاڤێ یان یا شەرابێ ل سەرێ كەلاێ هەبوون، بەلێ ژ بەر دەستكارێن رژێمێ و خرابكرنا وێ د ئەنفالاندا هاتینە تێكدان.

شوینوارێ سەرێ كەلا ئەرزێ



## ١٢- كەلا بابۆخكێ:

كەلا بابۆخكێ د كەڤیتە سەرێ كومتێ بلند ژ چیایێ بابۆخكێ، ئەو چیایێ د كەڤیتە د ناڤبەرا چیایێ سپی ل باكووری باژێرێ دهۆكێ و چیایێ دێراگژنیك دا، ئانكو ل هنداڤی سكرێ دهۆكێ.

جهێ كەلا بابۆخكێ دەربارەی كەلایێن دەوروبەر، كەلا مەمییان د كەڤیتە رۆژهەلاتێ وێ و كەلایێن برجینی ئەرمشتێ د كەڤنە رۆژئاڤایی، باشووری وێ كەلا پیرومەرایە ل هنداڤی دهۆكێ، ژ لایەكێ دی ڤە كەلا بابۆخكێ د كەڤیتە د ناڤبەرا دو گەلییاندا، گەلیێ رۆژهەلاتێ كەلایێ د بێژنێ گەلیێ مالا، و گەلیێ رۆژئاڤایێ كەلایێ د بێژنێ گەلیێ ئاڤا مێرگێ و پتر رێ تێچوون بۆ دچن كو رێكا كەلایێ ژ ڤی گەلیێ داوێ ڤە د چیتێ چونكی دەرگەهێ كەلایێ د كەڤیتە بەرامبەر ڤی گەلی.

ژ شوینوارێن ڤێ كەلایێ هەردو لایێن رۆژئاڤا و باكوور ب شویرهان هاتبوو ئاسێكرن و تا نها ژی بەرمایێن دیوارێ رۆژئاڤایی كەلایێ دیارە، لایێ باشوور ژی دیوارێن هەرفتی و ب سەرێكدا چووینە و چ شوینوارێن وێ نەماینە.

رووبەرێ كەلا بابۆخكێ (٦٠م) درێژە و (٣٠م) یا فرەهە، ئانكو ئەم د شێین بێژین شێوێ وێ هێلكەیی یە، شوینوارێن د ناڤ كەلایێ دا هاتینە

دەستنیشانكرن، دو جوهنی ل لایێ باشووری هەنە و د كەڤری دا د كۆلاینە، دیسان شوینوارێن هندەك ژووران ژ لایێ باكووری ڤە هەنە بەلێ هەمی د تەبقینە.

ژ بەر كو چ ژێدەرێن مێژوویی و باژێران چ پویتە نە داینێ ژ بلی هندەك ئاڤرێێن سادە و كورت ڤەبڕی ژ وان ژی (یاقوت ئەلحەمەوی) ئەوێ ل سالا (٦٢٦مش/١٢٢٨ز)ی مری، و مێژوونڤیس (ئیبن ئەلئەسیر) ئەوێ ل سالا (٦٣٠مش/١٢٣٢ز) مری، د سەر هندێ ژی را هەردو ناڤبریان ناڤێ كەلایێ وەكی ئێك نە ئینانینە، یێ ئێكێ ب ناڤێ (باخوخە)[176] ناڤ د كەت و یێ دووێ ب ناڤێ (بابوخا)[177] ب ناڤ دكەت.

## ١٣- كەلا مەمییان:

كەلا د كەڤیتە سەرێ كومتەكی ژ چیایێ ب ناڤێ چیایێ كەمەكا و ئەڤە پارچەكە ژ زنجیرا چیایێ ب ناڤ و دەنگ ل پشتا دهۆكێ كو د بێژنێ (چیایێ سپی)، ئەڤ پارچا چیایێ كەلا مەمییا د كەڤیتە سەرێ ژ گوندێ (برجینی).

كەلا د كەڤیتە سەرێ كومتەكی ژ كومتێن چیایێ كەمەكا و د بێژنێ (كوپكێ كەلایێ) و ئەڤ كومتە د كەڤیتە د ناڤبەرا دو كومتێن دی كو د بێژنێ (پیكا حەمسۆری و كوپكێ پیكا پیر تاوسی).

د ناڤا كەلایێ دا ژ لایێ رۆژهەلاتی ڤە شوینوارێن هندەك ژوورێن هەرفتی نە و كۆمێن بەرا د دیارن كو ئەو جهێ ئاڤاهییان بوون.

ژ لایێ رۆژئاڤایی ڤە و د بن بلندترین خال دا ل كەلایێ شوینوارێ سێرجەكا ئاڤێ هەیە، نیڤەكا سنوورێن ڤێ سێرجێ ب دیواری هاتینە سنووردان و نیڤەكا دی كەڤرێ خورستی یە، پانیا ڤێ سێرجێ (٤×٣م) و فرەهیا وی دیواری ل بەر هاتییە دانان (٧٠سم) و كویراتیا وێ (١،٥م) و ب رەخ سێرجێ ڤە شوینوارێن ژوورەكا دی هەنە.

ئەڤ كومتێ چیای د سەر هندێ را كو د سرۆشتێ خۆدا یێ ئاسێ یە، بەلێ د بن ڤی كومتی دا و ژ لایێ رۆژهەلاتی ڤە هندەك جە هەنە ب شویرهە و دیواران هاتینە ئاسێكرن دا كو كەلا بهێتە پاراستن، ستویراتیا ڤی دیواری (٢م) و بلنداهیا وی ئەوا مای (٢،٥م) و ل پشت ڤی دیواری دیسان شوینوارێن ئاڤاهییان هەنە.

## ١٤- كەلا شخو:

كەلا شخو د كەڤیتە داویا زنجیرا چیایێ مەتینا ژ لایێ رۆژئاڤایی ڤە، هنداڤی رووباری خابووری، سنوورێ هەردو عەشیرەتێن بەرواری ژووری و گولییان، كەلا هرۆرێ د كەڤیتە باكوورێ رۆژهەلاتێ كەلا شخو ب دووراتییا نێزیكی (١٠كم) و ل سەرێ كەلا شخو كەلا هرۆرێ د هێتە دیتن، رۆژهەلاتێ كەلا شخو كەلا (گرێ سۆر)ە ب دووراتییا نێزیكی (١٥كم)، باشوورێ وێ ژی كەلا ئەرزێ یە ب دووراتییا (١٥كم) و ئەڤ هەردو كەلایێن داویێ ل كەلا شخو ب چاڤ ناهێنە دیتن چونكی چیا د كەڤنە بەر، رۆژئاڤایێ كەلا شخو كەلا شابانیێ یە ب دووراتییا نێزیكی (٤٠كم).

دەربارەی ناڤێ كەلایێ خەلكێ دەوروبەرێن كەلایێ رایەكێ دبێژن ئەو ژی ئەوە كو هەمی ئەو گوندێن ل چوار كنارێن كەلاێ خەلكێ گوندێ شخو د گۆتنێ (وەلاتێ شخو)، لەوا دبیت ناڤێ كەلایێ ژی ژ ڤێ چەندێ هاتبیت.

هەر چەندە كەلا شخو كەلایەكا بچویكە ل دەڤەرێ بەلێ ل دووڤ ڤێ پێناسێ زۆر سالۆخەتێن كەلا ل دەڤ هەنە، رەخێن وێ د دیوار و شویرهە كری نە، دوورگەهـ ژی ل هەمی لایێن وێ هاتینە ئاڤاكرن، ژ لایێ باكووری ب تنێ ڤە سێ دوورگەهـ ل سەرێ كەلایێ دهێنە دیتن، كەلا شخو د كەڤیتە سەرێ گرەكێ كەڤرین ب بلنداهیا (٥٠م) ل بلندترین جهـ و ئەڤ گرە ژ لایێ رۆژهەلاتی ڤە و پشكەكا لایێ باشووری ڤە یێ كەڤرین و فراكەیە و كەس نەشێت ب سەركەڤیت و هەمی لایێن دی ژی د بلندن بەلێ نە كەڤر و فراكەنە و ژ بەر هندێ ئەوێن دەستەلاتداری ل كەلا شخو كری دیوارێن مەزن داینە لایێن وێ یێن نە كەڤر، ئەڤ دیوارە ژ بەر و كسلێ هاتینە نژاندن ب پانیا (٢م) و بلنداهیا (٣م). ژ شوینوارێن كەلایێ

نها شوینوارێن برکەکا ئاڤێ بۆ ئومبارکرنا ئاڤێ لێ د دیارن، درێژاهیا ڤێ دیواری (٥م) و بلنداهیا وێ (٢م) و د کەڤیتە لایێ باشوورێ رۆژئاڤایێ کەلایێ.

د ناڤ کەلایێ دا شوینوارێن چەند ژوورەکا مانە، و ژوورا سەرەکی یا میرێ کەلایێ د کەڤیتە بلندترین جە ل کەلایێ ژ لایێ رۆژهەلاتی ڤە و درێژاهیا وێ (١٠م) و فرەهیا وێ (٦م)، دیسان ل لایێ باشوورێ رۆژئاڤایی شوینوارێن هندەك ژوورێن دی ژێ هەنە.

هەژیە ل داویێ بێژین هژمارەکا دی یا کەلان ل سنوورێ نهایێ پارێزگەها دهۆکێ هەنە هێژ وەك پێدڤی دووڤچوون و ڤەکولین ل سەر نەهاتینەکرن لەوما ژی جهێ خۆ د ڤێ ڤەکولینێدا نەکرییە.

## ژێدەر و پەراوێز:


١. مرفت عثمان، التحصينات الحربية وادوات القتال (القاهرة: ٢٠١٠)، ص١٣٣.
٢. هەمان ژێدەر، بث٩١.
٣. طة الهاشمي، الجغرافية العسكرية، (بغداد: ١٩٢٧)، ص٢٣٢.
٤. محسن محمد حميد، الجيش الايوبي من عهد صلاح الدين، (بيروت: ١٩٨٦)، ص ٣٧٨.
٥. ابن النديم، الفهرست، (بيروت: ١٩٧٨)، ص ١٥٠.
٦. ابن اعثم الكوفي، الفتوح، (الدكن: ١٩٦٨)، ج١، ص٢٢٠.
٧. اسد رستم، الروم في سياستهم، (بيروت: ١٩٥٥)، ج١، ص٢٢٧.
٨. محمد جاسم حمادي، الجزيرة الفراتية والموصل، (بغداد: ١٩٧٧)، ص٣٨٥.
٩. مسكوية، تجارب الامم، صححة، آمدروز، (بغداد: د/ت)، ج٢، ص٢٨١.
١٠. بنێرە: محمد امين زكي، تاريخ الدول والامارات الكردية في العهد الاسلامي، ترجمة محمد علي عوني، (بيروت: ١٩٨٦)، ج٢، ص٢٨.
١١. مسكوية، تجارب الامم، ج٢، ص٣٩٢؛ فيصل السامر، الدولة الحمدانية في الموصل، (بغداد: د/ت)، ج١، ص١٨٦.
١٢. ابن الاثير، الكامل في التاريخ، (بيروت: ١٩٨٢)، ج٧، ص٤٦٩-٤٧١؛ ابن شداد، الاعلاق الخطيرة في ذكر أمراء الشام والجزيرة، تحقيق يحيى عبارة، (دمشق: ١٩٩١)، ج٧، ق٢، ص٥٤٧.
١٣. پاش دێ باس ل سەر هێتەکرن.
١٤. ابن الاثير، الكامل في التاريخ، ج١٠، ص٦٠٤.
١٥. مرفت عثمان، التحصينات الحربية، ص١٣٤- ١٣٥.
١٦. هەمان ژێدەر.
١٧. هەمان ژێدەر.
١٨. ميرفت عثمان، التحصينات الحربية، ص١٣٥.
١٩. الدينوري، الاخبار الطوال، (القاهرة: ١٩٦٠)، ص١٠٦- ١٠٧.
٢٠. فتوح البلدان، (بيروت: ١٩٨٣)، ص٣٢٣؛ بنێرە: ابن الفقية، مختصر كتاب البلدان، (بيروت: ١٩٨٨)، ص١٢٣؛ ابن الاثير، الكامل، ج٢، ص٥٢٤.
٢١. البلاذري، فتوح البلدان، ص٣٢٣.
٢٢. فتوح البلدان، ص٣٢٣.

٢٣. الماردينى، تاريخ ماردين، تحقيق عبدالمجيد السلفى وتحسين ابراهيم الدوسكى، (دهۆك: ٢٠٠٣)، ص٣٩.
٢٤. طة، الموصل فى العهد الاموى، ج٢، ص٣٢.
٢٥. فاروق عمر فوزى، الموصل ابان الحكم العباسى المباشر، موسوعة الموصل الحضارية، ج٢، ص٤٥٤.
٢٦. ابن شداد، الاعلاق الخطيرة فى ذكر امراء الشام والجزيرة، تحقيق يحيى عبارة، (دمشق: ١٩٩١)، ج٣، ق٢، ص٥٤٧.
٢٧. الطبرى، تاريخ الرسل والملوك، تحقيق محمد ابة الفضل، (بيروت: ١٩٨٧)، ج١٠، ص٥٩٠؛ ابن الاثير، الكامل، ج٧، ص٤٦٩- ٤٧١.
٢٨. ئەو میرگەها (ئەبو لهيجاء عەبدوللا كورێ حەمدانێ تەغلوبی) ژ سالا ٢٩٣مش/٩٠٥ز ی تا كو سالا ٣١٧مش/٩٢٩ز دامەزراندی و ئەڤە دەستپێكا حوكمداریا حەمدانییان بوو ل وێرێ و یا بەردەوام بوو هەتا سالا (٣١٧مش/٩٢٩ز)ی و پشتی وی كورێ وی (ناسر لدەولە) جهێ وی گرت ژ بلی هندەك دەمێن قەبرێ كو هەردو مامێن وی و چەند كەسێن دی دەستەلاداری كرتبوونە دەست، ڤێ میرگەهێ دەسەلاتداری ل مووسلێ د كر تا كو سالا ٣٨٠مش/٩٩٠ز دەمێ داوی میرێ وان (ئەبو تاهر) ب دەستێ عەقیلییا هاتییە كوشتن. بنێرە: مسكوية، تجارب الامم، امدروز، (بيروت: د/ت)، ج١، ص١٩٣- ١٩٧؛ ابن الاثير، الكامل، ج٨، ص٢١٤؛ الصولى، اخبار الراضى باللة والمقتفى باللة، (بيروت: ١٩٨٣)، ص١٨٤.
٢٩. مسكوية، تجارب الامم، ج٢، ص٣٩٢.
٣٠. تجارب الامم، ج٢، ص٣٩٣- ٣٩٤؛ ديسان: ابن الاثير، الكامل، ج٨، ص٦٩٦.
٣١. مسكوية، تجارب الامم، ج٢، ص٣٩٢.
٣٢. مسكوية، تجارب الامم، ج٢، ص٣٩٢.
٣٣. ابن الاثير، الكامل، ج١١، ص١٥.
٣٤. ابن الاثير، الكامل، ج٨، ص٧٠٩؛ ابن خلدون، تاريخ ابن خلدون، ج٤، ص٦٠٥.
٣٥. مسكوية، تجارب الامم، ج٢، ص٣٨٠- ٣٨١؛ ابن الاثير، الكامل، ج٨، ص٦٩٢؛ الانطاكى، تاريخ يحيى بن سعيد الانطاكى، (د/ت: د/م)، ص١٩١.
٣٦. مسكوية، تجارب الامم، ج٢، ص٣٩٢؛ ابن الاثير، الكامل، ج٨، ص٦٩٦.
٣٧. مسكوية، تجارب الامم، ج٢، ص٣٩٢.
٣٨. الفرج بعد الشدة، تحقيق عبود الشالجى، (بيروت: ١٩٧٥)، ج٢، ص١٨٦.
٣٩. الفرج بعد الشدة، ج٢، ص١٨٦؛ مسكوية، تجارب الامم، ج٢، ص٣٩٢.
٤٠. میر (ابو الفوارس محمد) هاتە گرتن چونكی ناگریبا برایێ خۆ (حەمدانی) دژی میر (ئەبا تەغلوب)ی كر، بنێرە: مسكوية، تجارب الامم، ج٢، ص٢٩١؛ الصابى، المختار من رسائل ابى اسحق الصابى، ص٨٩.
٤١. نازبانو: ژێدەر باسی ژیانا وێ ناكەن، دەربارەی ناڤێ وێ فارسی یە، ژ دو برگان، ناز ئانكو شاهنازی (فخر) و بانو ئانكو خانم (سيدة) پێكدهێت، رامانا ناڤێ وێ دبیتە شانازا خانمان (فخر النساء)، بنێرە: التنوخى، الفرج بعد الشدة، ج٢، ص١٨٥، پەراوێز ژمارە ٤٤.
٤٢. التنوخى، الفرج بعد الشدة، ج٢، ص١٨٥.
٤٣. چ رامان بۆ ناڤێ وێ نەهاتییە دیتن.
٤٤. مسكويه، تجارب الامم، ج٢، ص٣٩٣.
٤٥. ئەڤ سەركردە نەهاتییە نیاسین.
٤٦. مسكويه، تجارب الامم، ج٢، ص٣٩٢- ٣٩٣.
٤٧. التنوخى، الفرج بعد الشدة، ج٢، ص١٨٥- ١٨٦.
٤٨. تجارب الامم، ج٢، ص٣٩٤؛ ابن الاثير، الكامل، ج٨، ص٧٠٩؛ ابن خلدون، تاريخ ابن خلدون، ج٤، ص٦٠٥؛ زكى، خلاصة تاريخ الكرد، ص١٣٣- ١٣٤.
٤٩. میر باد: ئەبو عەبدوللا ئەلحسێن كورێ دۆستەكی بوو، ناسناڤێ وی (بادە) و بنیاتێ وی ژ دەڤەرا چیایێ باخسمێ ژ وەلاتێ هیزان و مەعدەنێ بوو، بنێرە: الفارقى، تاريخ الفارقى، تحقيق بدوى عبداللطيف عوض، (بيروت: ١٩٧٤)، ص٤٩- ٥٠؛ بەلێ (الروذراوى و ابن الاثير) بنیاتێ وی د كەنە كوردێن حەمیدی، بنێرە: ذيل تجارب الامم، تحقيق امدروز، (مصر: ١٩١٦)، ص٨٤؛ الكامل، ج٩، ص٣٥.

٥٠. الفارقی، تاریخ الفارقی، ص٥١- ٥٢؛ ابن الاثیر، الكامل، ج٩، ص٣٥.
٥١. الفارقی، تاریخ الفارقی، ص٥٣.
٥٢. الروذراوی، ذیل تجارب الامم، ص٨٦- ٨٧؛ ابن الاثیر، الكامل، ج٩، ص٣٨- ٣٩.
٥٣. الروذراوی، ذیل تجارب الامم، ص١٧٧.
٥٤. دەربارەی بنەكۆكا عەقیلیان و دروستبوونا دەولەتا وان بنێرە: خاشع المعاضیدی، دولة بنی عقیل فی الموصل، (بغداد: ١٩٦٨)، ص٣٧ و پشتی وێ.
٥٥. الروذراوی، ذیل تجارب الامم، ص١٧٧؛ الفارقی، تاریخ الفارقی، ص٥٧- ٥٨؛ ابن الاثیر، الكامل، ج٩، ص٧٠- ٧١.
٥٦. بنێرە: ابن القلانسی، ذیل تاریخ دمشق، ص٢٢؛ المعاضیدی، دولة بنو عقیل، ص١٣٥.
٥٧. ابن الاثیر، الكامل، ج٩، ص٥٥٠؛ محمد جمیل بندی الروذبیانی، مدن كردیة قدیمة، (السلیمانیة: ١٩٩٩)، ص٢٧١- ٢٧٢.
٥٨. ابن الاثیر، الكامل، الكامل، ج٩، ص٥٥٣- ٥٥٤.
٥٩. هەمان ژێدەر، ج٩، ص٣٩٠- ٣٩١.
٦٠. ئەلبساسیری: مەملۆكەكێ تورك بوو ژ مەمالیكێن (بەهائەلدەولە كورێ عەز لدەولە)، ناڤێ وی (ئەرسەلان) بوو و ناسناڤێ وی (ئەبولحارث) بوو ژ بازێرێ (بەسا) ل وەلاتێ خورسێ. بنێرە: ابن الاثیر، الكامل، ج٩، ص٦٥٠؛ ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج١، ص١٩٢؛ بۆ پتر پێزانینان بنێرە: ابن العدیم، بغیة الطب فی تاریخ حلب، تحقیق علی سویم، (انقرة: ١٩٧٦)، ص١- ٣.
٦١. ابن الاثیر، الكامل، ج٩، ص٦٣٠؛ ابو الفداء، المختصر، ج١، ص٥٣١؛ محمد، الكرد والسلاجقة، ص١٣٠.
٦٢. ابن الاثیر، الكامل، ج١٠، ص١٧.
٦٣. الحسینی، زبدة التواریخ، ص٦٣؛ ابن الاثیر، الكامل، ج١٠، ص٢٦
٦٤. دەربارەی ململانا د ناڤبەرا وان دا بنێرە: الحسینی، زبدة التواریخ، ص١٥٩- ١٦٥؛ امین، تاریخ العراق، ص٧٩- ٨٢.
٦٥. ابن الاثیر، الكامل، ج١٠، ص٢٥٨- ٢٥٩؛ النیشابوری، سلجوقنامة، كلالة خاور، (تهران: ١٣٣٢)، ص ٣٥؛ الحسینی، زبدة التاریخ، ص١٦١.
٦٦. (جیوش بك): تورك بوو ژ مەمالیكێن سولتانێ سلجوقی (محەمەد)، دو جاران میراتی ل مووسلێ كریبە، یا ئێكێ ل سالا (٥٠٧مش/١١١٣ز)ی و جارا دووێ سالا (٥٠٩مش/١١١٥ز)ی. بنێرە: ابن الاثیر، الكامل، ج١٠، ص٦٠٤؛ عمادالدین خلیل، المقاومة الاسلامیة، ص٥١- ٥٢.
٦٧. ابن الاثیر، الكامل، ج١٠، ص٦٠٤.
٦٨. ئەتابك: زاراڤەكێ توركی یە، (اتا) واتە باب و (بك) ئانكە میر، واتە (بابێ میرا)، ئەڤ زاراڤە ل سەر وان د هاتە دانان یێن پەروەردەییا كورێن سولتانێن سلجوقییان دكر. بنێرە: القلقشندی، صبح الاعشی، ج٤، ص١٨؛ شمس الدین سامی، قاموس الاعلام، مج١، ص٧٧٤- ٧٧٥.
٦٩. بۆ پتر پێزانینان ل سەر ژیانا (عیمادەدین زەنكی) و چەوانییا دەسەلاتدارییا وی ل مووسلێ. بنێرە: ابن الاثیر، الباهر، ص٣٢- ٣٣؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ج١، ص٣١- ٣٣.
٧٠. عمادالدین خلیل، عمادالدین زنكی، ص١٠١.
٧١. ابن الاثیر، الباهر، ص٤٨- ژێدەر باسی ژیانا ڤی میری ناكەت.
٧٢. ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج١، ص١٨١.
٧٣. ابن الاثیر، الكامل، ج١١، ص١٦.
٧٤. ابن الاثیر، الكامل، ج١١، ص١٦؛ ئەنوەر مایی ناڤێ وی ڤی رەنگی (كالوهیرون) د هینت، بنێرە، الاكراد فی بهدینان، ص١١١.
٧٥. ابن الاثیر، الكامل، ج١١، ص١٤؛ ابن الاثیر، الباهر، ص٨٠.
٧٦. ابن الاثیر، الباهر، ص٤٧- ٤٨.
٧٧. ابن الاثیر، الكامل، ج١١، ص١٤- ١٥.
٧٨. باو د بیت ناڤێ وی باد بیت.
٧٩. ابن الاثیر، الكامل، ج١١، ص١٤؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ج١، ص٥٦.

٨٠. ابن الاثير، الكامل، ج١١، ص١٥؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ج١، ص٥٦.
٨١. ابن الاثير، الكامل، ج١١، ص٩١؛ ابن سباط، تاريخ ابن سباط، تحقيق عمر عبدالسلام تدمری،(طرابلس: ١٩٩٣)، ج١، ص٧٤.
٨٢. ابن الاثير، الكامل، ج١١، ص١٥؛ ابو شامة، الروضتين، ج١، ص١٣٥؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ج١، ص٥٦.
٨٣. ابن الاثير، الكامل، ج١١، ص١٥؛ خليل، عمادالدين زنكی، ص١١١.
٨٤. ابن الاثير، الباهر، ص٨٤.
٨٥. ابن الاثير، الكامل، ج١١، ص١٥.
٨٦. تبر: خەلكێ باژێرێ (حمسێ)یە و ناڤێ وی ب شێوێ (طبر) ژی هاتییە، پشتی كەلا ئامێدیێ هاتە دانان ل كەلا تكریتێ و ما لێ تا كو مرنا وی، و سالا مرنا وی نەهاتییە زانین، بنێرە: ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٩٩- ٥٠٠.
٨٧. د ژێدەراندا چ مانا ژ بۆ ناڤێ وی نەهاتینە دیتن.
٨٨. ابن الاثير، الباهر، ص١٣٥؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ج١، ص١٥٤.
٨٩. د ژێدەران دا باسی ژیانا وی نە هاتییەكرن.
٩٠. مجاهددین قایماز: ناڤێ وی ئەبو مەنسۆر قایماز كورێ عەبدوللایێ زەینەبی یە، ناسناڤێ وی مجاهددینە، ژ خەلكێ سجستانێ یە و ژ زارۆكی ژێ چوویە، ل سالا (٥٩٥مش) مریية، بنێرە، ابن الاثير، الباهر، ص١٩٣؛ وفيات الاعيان، ج٤، ص٨٢- ٨٤.
٩١. ابن الاثير، الكامل، ص٤٦٣؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ج٢، ص٤٩٣؛ ابن العبری، تاريخ الزمان، ص١٩٧.
٩٢. ابن الاثير، الكامل، ج١١، ص٥٠٠؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ج٢، ص١٥٤.
٩٣. ابن الاثير، الكامل، ج١١، ص٥١٢؛ ابو شامة، الوضتين، ج٢، ص٦٢؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ج٢، ص١٦٧.
٩٤. ابن الاثير، الكامل، ج١١، ص٥١٧؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ج٢، ص١٧؛ الصفدی، الوافی بالوفيات، تحقيق احمد الارناووط و تركی مصطفی، (بيروت: ٢٠٠٠)، ج٢٥، ص٢٦٧.
٩٥. سبط الجوزی، مرآة الزمان، ج٨، ص٥٤٦؛ ابن تغری بردی، النجوم الزاهرة، ج٦، ص٢٠٠.
٩٦. ابن الاثير، الكامل، ج١٢، ص٣٣٥.
٩٧. هەمان ژێدەر؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ج٤، ص٢٠- ٢١.
٩٨. ابن العبری، تاريخ الزمان، ص٢٨٠؛ الحموی، التاريخ المنصوری، ص٢٦٠.
٩٩. عيون التواريخ، الحوادث الجامعة، ص٣١٥.
١٠٠. الهمذانی، جامع التواريخ، ج١، ص٣٠٠- ٣٠١؛ ابن العبری، تاريخ الزمان، ص٣١٤- ٣١٥؛ ابن الوردی، تاريخ ابن الوردی، ج٢، ص٢٨٩؛ ابن شداد، تاريخ الملك الظاهر، ص٣٣٢؛ اقبال، تاريخ المغول، ص٢٠٧.
١٠١. الهمذانی، جامع التواريخ، ج١، ص٣٠٠- ٣٠١؛ ابن العبری، تاريخ الزمان، ص٣١٤- ٣١٥؛ ابن الوردی، تاريخ ابن الوردی، ج٢، ص٢٨٩.
١٠٢. مسالك الابصار، ج٣، ص١٢٨؛ القلقشندی، صبح الاعشی، ج٤، ص٣٧٥.
١٠٣. ابن الفوطی، مجمع الاداب، ج١، ص١٠١.
١٠٤. صبح الاعشی، ج٤، ص٣٧٥.
١٠٥. ابن العبری، تاريخ مختصر الدول، ص٢٧٩؛ ابو الفداء، المختصر، ج٢، ص٣٠٦.
١٠٦. القلقشندی، صبح الاعشی، ج٤، ص٣٧٥.
١٠٧. عبدالمنعم رشاد، الموصل فی عهد السيطرة المغولية، موسوعة الموصل الحضارية، ج٢، ص٢٣١.
١٠٨. ابن العبری، تاريخ الزمان، ص٣١٩.
١٠٩. هەمان ژێدەر، الويشدی، امارة الموصل، ص٢٦٣.
١١٠. الدواداری، كنز الدرر، ج٨، ص٨١؛ المقريزی، السلوك، ج١، ص٥٣٦.
١١١. ابن عبد الظاهر، الروض الزاهر، ص١١٥؛ اليونينی، ذيل مرآة الزمان، ج١، ص٤٩٥؛ المقريزی، السلوك، ج١، ص٥٣٦؛ دیسان بنێرە: سالم يونس المولی، العراق فی السياسة المملوكية، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب، (جامعة الموصل: ١٩٨٩)، ص٨٩.

١١٢. الهمذانی، جامع التواریخ، ج١، ص٣٢٧- ٣٣٠؛ ابن العبری، تاریخ الزمان، ص٣٢٢؛ ابن الفوطی، الحوادث الجامعة، ص٣٧٧-٣٧٨؛ خواند میر، تاریخ حبیب السیر، ج١، ص١٠١.

١١٣. کنز الدرر، ج٨، ص٩٠؛ الیونیبی، ذیل مرآة الزمان، ج١، ص٤٩٥.

١١٤. مجمع الاداب، ج١، ص١٠٠- ١٠١.

١١٥. سالك الابصار، ج٣، ص١٣٣- ١٣٤.

١١٦. القلقشندی، صبح الاعشی، ج٤، ص٣٧٥.

١١٧. ابن العبری، تاریخ الزمان، ص٣٥٩- ٣٦٠.

١١٨. العمری، سالك الابصار، ج٣، ص١٢٧؛ القلقشندی، صبح الاعشی، ج٤، ص٣٧٥.

١١٩. القلقشندی، صبح الاعشی، ج٤، ص٣٧٥.

١٢٠. تثقیف التعریف، ص٤٥؛ القلقشندی، صبح الاعشی، ج٧، ص٢٧٦؛ خلیل، المغول فی الموصل، ص١٣٢.

١٢١. یەك ژ ڤەكۆلەران ئاماژە ب هندێ كریبە كو كەلا ئاشەب هەمان گوندێ ئاشاوا یێ نهایە، ئەڤ بۆچوونە نەیاراستە، هێژ شوینوارێن كەلا ئاشەبێ ب دووراتیا شەش كیلومەتران ژ سەرسنكێ ماینە، كەلا د كەڤیتە سەر گرەكێ بەردینێ رەنگ هێلكەیی بلنداهیا وێ (٧٠- ٩٠مەترە)، خەلكێ دەڤەرێ د بێژنێ ئامێدیكا خراب و یا نێزیكی ئامێدیێ یە، ڤێ چەندێ ژی ئەم ژ گۆتنا ئەلحەمەوی د زانین دەمێ گۆتی: ((ئاشەب هەرفاند و ل شوونا وێ ئامێدیێ ل نێزیكی وێ ئاڤاكر)). بنێرە: معجم البلدان، ج١، ص٥٤. ل رۆژا ٢٠٠٢/٧/٢٢ من سەرەدانا كەلا ئاشەبێ كریبە.

١٢٢. ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج١، ص١٨٠.

١٢٣. الكامل، ج١١، ص١٥.

١٢٤. الكامل، ج١١، ص١٥؛ الحموی، معجم البلدان، ج١، ص٥٤.

١٢٥. خلیل، عمادالدین، ص١٠٨.

١٢٦. صبح الاعشی، ج٤، ص٣٧٦.

١٢٧. فەرسەخ (الفرسخ)، ژ سێ میلان پێكدهێت، هەر فەرسەخەك نێزیكی، شەش كیلومەترانە. بنێرە: فالترهنس، المكاییل والاوزان الاسلامیة، ترجمة كامل العسلی، (عمان: ١٩٧٠)، ص٩٤.

١٢٨. معجم البلدان، ج٥، ص٤٠٣.

١٢٩. هەمان ژێدەر.

١٣٠. تجارب الامم، تحقیق امدروز، (بغداد: د/ت)، ج٢، ص٣٩٣.

١٣١. الحموی، معجم البلدان، ج٥، ص٤٠٣؛ ابن الاثیر، الكامل، ج١١، ص١٥؛ العمری، مسالك الابصار، ج٣، ص١٣٤؛ ابن ناظر الجیش، تثقیف التعریف، ص٤٦؛ تاریخ ابن خلدون، تعلیق خلیل شحادة، (بیروت: ١٩٨٨)، ج٥، ص٢٧٠؛ صبح الاعشی، ج٧، ص٣١٠.

١٣٢. هەمان ژێدەر، ج٤، ص٣٧٨.

١٣٣. مسكویة، تجارب الامم، ج٢، ص٢٩٢- ٢٩٣.

١٣٤. الكامل، ج٢، ص٤٤٤- ٤٤٥.

١٣٥. ابن الاثیر، الكامل، ج١١، ص١٥.

١٣٦. بۆ نموونە بنێرە الحموی، معجم البلدان، ج١، ص١٤٦ و ج٤؛ ابن الاثیر، الكامل، ج٨، ص٥٢٢.

١٣٧. ل رۆژا ٢٠٠١/٩/١٠ێ من سەرەدانا ڤێ كەلایێ كریبە.

١٣٨. الحموی، معجم البلدان، ج٤، ص١٨٦.

١٣٩. الكامل، ج١٢، ص٤٣١.

١٤٠. ابن عبد الظاهر، الروض الزاهر فی سیرة الملك الظاهر، تحقیق عبدالعزیز الخویطر، (الریاض: ١٩٧٦)، ص١١٥.

١٤١. سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، وەرگێرانی سەعید ناكام، (بەغدا: ١٩٧٩)، بث٥٧.

١٤٢. معجم البلدان، ج١، ص١٤٦.

١٤٣. معجم البلدان، ج١، ص١٤٦.

١٤٤. مروج الذهب، ج٤، ص١٥٧.

١٤٥. الحموی، معجم البلدان، ج١، ص١٤٧؛ مسكوية، تجارب الامم، ج٢، ص٢٩٢- ٢٩٣.

١٤٦. ل رۆژا ٢٠٠٢/١٠/٢٧ من سەرەدانا ڤی کەلایێ کریيە.

١٤٧. الحموی، معجم البلدان، ج١، ص١٤٦.

١٤٨. باقر وسفر، المرشد، ص٥٧.

١٤٩. الكامل، ج١٢، ص٤٤٩؛ ئیبن ئەلئەسیر د بێژیت ئەڤ کەلایە ل سالا (٦٢٢مش) خراب بوویە بێی کو ئەگەرێن خرابوونێ دیارکەت.

١٥٠. الحموی، المصدر السابق، ج١، ص١٤٦؛ ابن الاثیر، الكامل، ج١٢، ص٤٤٩.

١٥١. باقر وسفر، المرشد، ص٥٧؛ بشير سعيد السليفاني، المعالم الاثرية فی منطقة السليفانی، مجلة دهۆك، عدد ١٤، (دهۆك: ٢٠٠١) ص٧٨- ٧٩.

١٥٢. باقر وسفر، المرشد، ص٥٧.

١٥٣. فيصل السامر، الدولة الحمدانية فی الموصل، ج١، ص١٥٣.

١٥٤. الحموی، المشترك، ص٢٧٨؛ ابة الفداء، تقويم البلدان، ص٢٧٤.

١٥٥. ابن الاثیر، الكامل، ج١٢، ص٤١١.

١٥٦. الحموی، معجم البلدان، ج٣، ص٣٧٢.

١٥٧. ابن الاثیر، الكامل، ج١٢، ص٤١١.

١٥٨. ابن الاثیر، الكامل، ج١٢، ص٤١١.

١٥٩. توما المرجی، الرؤساء، ص٨٨.

١٦٠. الصوفی، خطط الموصل، ج٢، ص١١٢.

١٦١. دەربارەی ژیاناما میر مەشتوبێ هەکاری بنێرە: نەبەز مجيد امين، المشطوب الهكاری.

١٦٢. الكامل، ج١١، ص٥١٢- ٥١٣؛ دريد عبدالقادر نوری، سياسة صلاح الدين الايوبی فی بلاد مصر والشام والجزيرة، (بغداد: ١٩٧٦)، ص٢٤٦

١٦٣. الكامل، مج١٢، ص٤٤٩٨؛ العجسد المسبوك، تحقيق شاكر محمد عبدالمنعم، (بيروت: د/ت)، مج٢، ٤١٤.

١٦٤. معجم البلدان، ج٤، ص١١٥.

١٦٥. الحموی، معجم البلدان، ج٢، ص١٥٤؛ ابن الاثیر، الكامل، ج١١، ص١٥؛ ابن عبدالظاهر، الروض الزاهر، ص١١٥؛ اليونينی، ذيل مرآة الزمان، (حيدر أباد الدكن: ١٩٥٥)، ج١، ص٤٩٥.

١٦٦. معجم البلدان، ج٢، ص١٥.

١٦٧. الكامل، ج١١، ص١٥.

١٦٨. ڤەكۆلەری ل رۆژا ٢٠٠٢/٩/١٩ سەرەدانا ڤێ کەلایێ کریيە.

١٦٩. شابانیێ (الشابانی)؛ پەیڤەکا کوردیا لێکدایە ژ شاهـ ئانکو (الملك) و بانی واتە (الهضبە) ب عەرەبی، هەردو ب هەڤرا د بنە بانیا شاهی، یان خۆدیێ دەڤەرێ.

١٧٠. تجارب الامم، ج٢، ص٣٩٢.

١٧١. التاريخ الباهر، ص٦٤.

١٧٢. الكامل، ج١١، ص١٥- ١٦.

١٧٣. ل رۆژا ٢٠٠١/١٠/٢٠ ڤەکۆلەری سەرا جهێ ڤێ کەلایێ دایە، بۆ پێزانینێن بەرفرەهتر بنێرە: درويش يوسف و شڤان شكری، کەلا شابانیێ، گۆڤارا دهۆك، هژمارا (١٤)، بێ٣٣ و پێهەلتر.

١٧٤. معجم البلدان، ج٣، ص١٥٨.

١٧٥. هەمان ژێدەر، من پێناسا (زۆزان) ل جەم ئیبن ئەلئەسیری نەدیت، هەر چەندە ئەز ل هەرسێ کتێبێن وی الکامل والتاریخ الباهر واللباب فی تهذیب الانساب گەریام.

١٧٦. صورة الارض ص٩٢٧.

١٧٧. یاقوت الحموی، معجم البلدان، (بیروت: د/ت)، ج٤، ص٤٨٨.

١٧٨. ابن الاثیر، الکامل فی التاریخ، راجعة محمد یوسف دقاق، (بیروت: ١٩٩٨)،ج٩، ص٢٧٥.

# بەهدینان دنڤێسینێن گەرۆك و جوگرافیناسێن موسلماناندا

**د. زرار توفیق سەدیق**
**وەرگێران:خالد سالح**

ل دەسپێکا چەرخێن ناڤین دەڤەرا بەهدینان (هەکاریا کەڤن) چ پویتەیێ وەسان مەزن پێ نەهاتییە دان، و چ باژێر و جهێن شارستانییێن هەژی لێ نەبوون، کو باس ژێ بکەن، لەوما بۆ چەندین سەدسالییان ما نیڤ بەرزە دیرۆکا دەڤەرێ، تا میرگەها بەهدینان ل دەسپێکا چەرخێ هەشتێ مشەختی/چواردەی زایینی هاتییە دامەزراندن، ئەڤە ژی ئەنجامێ وێ چەندێ بوو کو ب رەنگەکێ گشتی دەڤەر خودانی سرۆشتەکێ چیایی و ئاسێ یە، پێکهاتییە ژ چەندین زنجیرە چیایێن درێژ، کو سەمتا وان ژ باکوورێ رۆژئاڤا بۆ باشوورێ رۆژهەلات ڤە دچن، ئەڤ زنجیرە چیایە تا ڕادەکی بوونە ڕێگر کو تێکەلیێن شارستانی و رەوشەنبیری دناڤبەرا خەلکێ دەڤەرێ و خەلکێ دەڤەرێن نێزیکدا چێببن، لەوما دەڤەر ما نیڤ ڤەقەتیایی ژ جیهانا ژ دەرڤە، دیسان ئەڤ چەندە بوونە هاریکار کو میر و سەرۆك هۆزێن دەڤەرێن کوردان نیڤ سەربەخوویەك هەبیت و کەلا و ئاسێگەهێن خۆ یێن شەری بپارێزن. راستیدا ژمارەکا نە کێما کەلا و ئاسێگەهـ و باژێرکێن شویرهەکری ل دەڤەرا بەهدینان هەنە، ب تایبەت ل کومت و بنارێن چیایێن بلند و د ڕێگر و د ئاسێنە ل بەرامبەر لەشکەرێن داگیرکەران. هەر ژ چاخێ ساسانی (٢٢٤– ٦٤٣ز) ی ب کێماسی شەش کەل و ئاسێگەهێن لەشکەری ل بەهدینان هەبوون، میرێن کوردێن بەهدینانی حوکم لێ دکرن ، و دەمێ سەرپەشکێن لەشکەرێ ئیسلامی دچاخێ خەلیفەیێ راشدی (عومەر کورێ خەتابی) (١٣-٢٤مش/ ٦٣٥– ٦٤٥ز) گەهشتینە دەروازەیێن کوردان تووشی ئاسیگەهێن کوردان بوون و هەمی ڤەکرن[1]، ژ بلی ڤان کەلا و ئاسیگەهێن ناڤێن وان ل ڤێرێ هاتین ناڤێن چ جهێن دی یێن دەڤەرا بەهدینان ل دەسپێکا چەرخێن ئیسلامی نەهاتینە و ئەڤ کەل و ئاسێگەهە ئەڤەنە:

**١-(المرج)** مەبەست ژ (مرج) دەڤەرێن سەر ب باژێرکێ ئاکرێ و ئەو دەڤەرێن دەشتێ نە کو ژ وێرێ دگەهنە مووسل (مێرگی ئاکرێ و بەردەرەش) وجوگرافیناسێ مەزن یاقوت ئەلحەمەوی (٦٢٦م/١٢٢٩ز) دبێژیتێ (مرجا مووسل) و یا گومانبڕە کو مەبەست ژ (مرجا مووسل) دەشتا ئاکرێ یە کو دبێژیت: « ل لایێ وێ یێ رۆژهەلاتی (واتە مووسل)،

جهەكە ل نزماتییەكا عەردییە دناڤبەرا چیایانرا مینا نهال (الغور)ێ و مێرگ و گوند و وارەكێ باش و بەرفرەهـ هەیە و كەلا یێن ل سەر چیایێن وێ هەین[٢] «. مرج ب رەنگەكێ گشتی دناڤ زێدەرێن كەنیسێ و سریانی دا یا بەرنیاس بوو، ژ بەر هەبوونا گەلەك دێر و كەنیسێن مەسیحییان و ژ وانان دێرا (بیث عابی)[٣] كو ئوسقفێ بەرنیاس (توما المرجی، توماس مەرگە) خودانێ پەرتووكا (الرؤساء) تێدا مەزن بووی، كو پەرتووك ل سەر ژیاناما سەرۆكێن ئۆلێن دێرا (بیث عابی) نە . و ژ وان هۆزێن كوردی كو ل (المرج) ئاكنجی بووین مارانی و حەمیدی و یەعقوبی و جورقان ( گۆران) و مازنجان[٤]و ... یێن دیتر.

**٢- المعلة،** ئەو ژی معلثایا- مالتایا- مالتە- مالگە یا نێزیكی دهۆكێ (نها تاخەكێ دهۆكێ یە)، دیرۆكا ڤی باژێركی گەلەكا كەڤنە و ب كێماسی ڤەدگەرینتەڤە دەمێن ئاشووریان، د سەر هندێ را گەلەك بەرفرەه نەبوو و تا چاخێن ناڤین هەر ما گوندەكێ نقووم و نیڤ بەرزە. یاقوت وەسان ددەتە نیاسین و ب (بلید«باژێروك»- بچویككرنا « بەلەد « باژێرك)[٥] سالۆخەت ددەت، و وەسان دیارە كو ئەو دچاخێ خەلیفەیێ عەباسی (ئەلموعتەمەد) (٢٥٦-٢٧٩ مش/ ٨٧٠- ٨٩٢ز)[٦] ژ مولكێن (عەلی كورێ داوود كورێ رهزاد ێ كوردی یە، ژ رڤشتێن وێ یێن دی دچاخێن عەباسیێن پاشین دا بازرگان و ڤەگێرێ فەرموودەیان (المحدث) (قەوام ئەلدین ئەبی ئەلحەسەن عەلی كورێ ئەبی بەكر كورێ سەلمان كورێ ئیبراهیم كورێ ئەلحەسەنێ دونبەلیێ (معلثایی) (٤٥٨مش/١١٥٣ز) پشتی (٦١٧مش /١٢٢٠ز) ی[٧].

**٣- ئەردێ بانهذرا،** ئێك ژ وان جهێن كوردانە كو ناڤێ وێ دچاخێن بەراهیێن هاتنا ئیسلامێ بۆ دەڤەرا بەهدینان دا هاتی، و ڤەكۆلەرەك وەسان دبینت كو ئەو دەڤەر دكەتە دەشتا سلێڤانەییا كو ژ باكوورێ دهۆكێ تا نێزیكی سنوورێ توركیایێ نها دچوو[٨]، و دویر نینە بانهذرا هەر باژێرێ دهۆكێ بخۆ بیت، یان ئەو رووبارێ كو تێرا دەرباس دبیت، و یا زانا ئەوە تا نهو ژی تاخەكێ دهۆكێ ب بانوهذرا – نوهذرا) دهێتە نیاسین .

**٤- باعذرا،** ناڤێ وێ ئێكسەر پشتی بانهژرا یێ هاتی، و ل دووڤ راڤەكرنا مەسیحیان دهێت ب واتایا (بیت العذراء) و گومان تێدا نینە كو ئەڤە باژێركێ (باعذرا) نهو یە، و ژ وان كێمە باژێركێن كوردانە كو ناڤێ خۆ یێ كەڤن پاراستی.

**٥- داسن،** جهەكێ دی یە، كو ناڤێ وێ دناڤ دەنگ و باسێن ڤەگرتنێن ئیسلامی بۆ دەڤەرا بەهدینان دا هاتی، و ژ گۆتنێن گەرۆك و جوگرافیناس و دیرۆكنڤیسێن موسلمانان وەسان دهێتە تێگەهشتن كو داسن ناڤەكە بۆ دەڤەرەك و باژێركەك و چیایەك و عەشیرەتەكێ دئێك دەمدا. ناڤێ (باژێركێ داسن)[٩] یان (خەلكێ چیایێ داسن)[١٠] یێ هاتی. یاقوت ئەلحەمەوی دبێژیت (داسن: ناڤێ چیایەكێ مەزنە ل باكوورێ مووسل ل لایێ رۆژهەلاتێ رووبارێ دیجلە، گەلەك خەلكێ لێ ژ تیرەیێن (طوائف) كوردان دبێژنێ (داسنی) )[١١] .

(فەزلوللا ئەلعومەری) (٧٤٩ مش/ ١٣٤٨ز) ی داسنی ژ عەشیرەت و تیرەیێن (القبائل و الطوائف) كوردان هەژمارتینە[١٢]، و وەسان هزر دكر كو باژێركێ داسن یان كەلا داسن، باژێركێ (ئەترویش) یێ نهایە ، هەروەسان ب دویر نەزانییە كو باژێرێ دهۆكێ بیت كو تا ڤێ داویێ ژی هەر ب دهۆكا داسنیان دهێتە نیاسین.

دچەرخێ سێ یێ مشەختی / نەهێ زاینی دا ئەدەبیاتا گەرۆكان پێگەهشت، گەلەك گەرۆكێن موسلمانان دیار بوون و دناڤ دەڤەرێن جودا یا جیهانا ئیسلامیدا گەریان و تێبینی و سەرنجێن خۆ یێن كەسایەتی ل سەر لایەنێن جودا یێن ژیانا وان دیاركرن، و ژ بەخت رەشیێ پشكا دەڤەرا بەهدینان ژ وێ پویتەییا گەرۆكێن موسلمانان گەلەك یا كێم بوو، یان ل نك هندەكان هەر ئێكجار نەبوو. هندەك ژ وان گەرۆك و جوگرافیناسان، مینا السیرافی (٢٣٦مش/٨٥١ز) و یەعقوبی (٢٩٣مش/٩٠٦ ز) كو ل چەرخێ سێ یێ مشەختی. پەیدابووین، باسی باژێر

و دەڤەرێن بەهدینان نەکرینە، چونکی ژ بنیاتدا دوان جهان را نەبوورینە.

لێ ئیبن خردازبە (٢٨٠مش/٨٩٣ز) ی دپەرتووکا خۆ (المسالك والممالك) دا و ئیبن ئەلفەقیە ئەلهەمزانی (٣١٠مش/٩٢٣ز) ی د پەرتووکا خۆ (مختصر کتاب البلدان)دا و یێن یتر، هەر ئەو ناڤ گۆتینە یێن ئەلبەلازری (٢٧٩مش/٨٩٢ز) گۆتین و چەند دەڤەر لێ زێدەکرینە مینا باجلی و بابغیش و رامین، بێی دەستنیشان کرنا جهێن وان، ب تنێ ئاماژە یا دایە وێ چەندێ کو سەر ب مووسل ڤە نە[١٣]. و باجلی، یان باجلایا کو ل نك ئبن ئەلئەسیر (٦٣٠مش/١٢٢٣ز) ی گوندەکێ بچویك بوو دکەتە سەر پەراڤێن رووبارێ خابوور، هەر چەند یاقوتی ئەڤ چەندە د فەرهەنگا خۆ دا نە دایە نیاسین، و ل ڤی جهی شەرەکێ مەزن دناڤبەرا بادێ کوردی (باذ الكردي)، دامەزرێنەرێ دەولەتا دۆستەکی یا مەروانی و میرێن بەنی حەمدان خودانێ مووسل ل دەوروبەرێن سالا (٣٣٧مش/٩٨٣ز)ێ روودایە، و ل سەر ڤی شەری هۆزانڤانێ بەنی مەروان ئەلحوسەین ئەلبەشنەوی دبێژیت: (ببالایا جلونا عنه غمغمه ... و نحن في الروع جلائون للكرب)[١٤]. و بابغیش (بابغاش ل نك ئبن خردازبە) باژێرکەکێ بەرنیاس بوو، دیرۆکنڤیسێ ڤەگرتنێن (الفتوحات) ئیسلامی (ئەلبەلازری) سەرەدانا ویرێ یا کری و چەند گۆتن ژ زاردەڤێ پیرەمێرێن وان ل سەر ڤەگرتنا ئیسلامێ بۆ دەڤەرا وان یێن کرین[١٥].

د چاخێ خەلیفەیێ عەباسی ئەلموعتەسم دا (٢١٨ – ٢٢٧مش/٨٣٣-٨٤٢ز) شۆرشڤانێ کورد جەعفەر کورێ میر حەسەن (فەرجس)ێ کورد دەستێ خۆ دانا سەر (ماتعیس) و خۆ تێدا ئاسێ کر[١٦]، و رەنگە نێزیکییەك ب گۆتن یا دناڤبەرا بابغیش و باژێرکێ ماتعیس (مانگێش) کا نهو دا هەی، لێ ڤەبڕ نەشێین بێژین کو وان پەیوەندی یا دگەل ئێك هەی، چونکی یاقوت ئەلحەمەوی دبێژیت زێیێ مەزن تێرا دەرباس دبیت[١٧]، هندیکە (رامین)ە مە چ پێزانین ل سەر نینن و هەر ئێك ژ ئەلبەلازری و کورێ خردازبە و کورێ ئەلفەقیە و قودامە کورێ جەعفەری (٣٣٧مش/٩٤٩ز) ی ناڤێ باژێرکێ « ئەلحنایە ؟؟؟» دگەل ناڤێ باژێرکێن مە ئاماژە پێ دای ل بەهدینان یێن ئینای، و ئەم پشتراستین کو ئەو ناڤ یێ گەتییە بەر شێواندن و ئالوگۆرێ ژ ئالیێ وان کەسانەڤە یێن پەرتووك نڤیسییەڤە (النساخ) ، باوەر ناکەم باژێرکەك یان کەلایەك ب ڤی ناڤی هەبیت، و یاقوت باژێرکێ (ئەلحەنانە ؟؟؟) ددەتە نیاسین کو دکەڤیتە رۆژئاڤایێ مووسل[١٨].

جوگرافیناسەکێ دی ژ چەرخێ سێ یێ مشەختی/ نەهێ زایینی ب ناڤێ ئیبن رستە (٢٩٠مش/٩٠٣ز) ی خودانێ پەرتووکا (الاعلاق النفیسە) هەردو جهێن (المرج) و (باجلێ) ژ دەڤەرا بەهدینان یێن دەسنیشان کرین[١٩].

ل سالا (٣٥٨مش/٩٦٩ز) ی گەڕوکێ مەزن ئیبن حەوقەل (٣٦٧مش/٩٧٧ز)ی سەرەدانا مووسلێ و دەڤەرێن وێ کرییە، و دیتنێن خۆ یێن کەسایەتی ل سەر سەروبەرێ وەلاتی یێ ئابووری و جڤاکی و ئاڤەدانیێ ب درێژی ل سەرنڤیسینە، وەکی نڤیسی: (وێ گەلەك دەڤەر و گوند باژێر یێن هەین کو ب سەرڤەنە). (مووسلێ گەلەك دەڤەرێن بەرفرەهـ و گوندێن مەزن و گەلەك وار هەنە پری مرۆڤ و گوند و قەسر و تەرش و کەوالن) و ل سەر بازارێ ئێکشەمبیا دبێژیت (متا و بازرگانیێن جودا جودا... و کورد لێ کۆمڤە دبن ). پاشی سالۆخەتا هندەك باژێرکێن بەهدینان، مینا باهزرا و خابور و مەعلاسایا(باهذرا و خابور و معلثایا (مالطە) دکەت و هندەك پێزانینێن گرنگ ل سەر داهاتێ وان ژ دەرامەتێ چاندنێ مینا گەنمی و جەهی ددەت، وەك: باهەزرا گوندەکێ خودان خێر و بێر و داهاتەکێ باشە (رستاق (قریە) وهو ایضا عظیم جلیل الضیاع والدخل والمرافق والعائدە ) و فیشخابور و معلەتایا دو گوندێن نموونێن وان دناڤ گوند و وارادا دەگمەنن ژ خێر و بێر و بازرگانییان[٢٠].

ئەلمەقدسی ئەلبەشاری (٣٨٧مش/٩٩٧ز) ی کو دهێتە هەژمارتن ئێك ژ مەزنترین جوگرافیناسێن چاخێ ئیسلامی، معلەتایا و حەسەنیێ وەك وی

ب چاڤێن خۆ دیتی ئەو سالۆخەت ددەت و دبێژیت یا ئێكێ « یا بچویكە و گەلەك باغ لێ هەنە و خانیێن وان ژ ئاخێ نە و مزگەفتا وان یا ل سەر گرەكێ « و یا دووێ « یا ل سەر رووبارەكێ كو ژ ئەرمەنستانێ ڤە دهێت (مەبەست ژێ خابووره) و پرەك ل سەر هەیە و مزگەفت یا ل ناڤەراستا بازێری و رووبار یێ ل رەخەكێ» و پێزانینێن كێم وێنە و نوو ل سەر بەرهەمێن چاندنێ و یێن دیتر بۆ هەر ئێك ژ وان و بەرهەمێن معلەتایا ب ناڤ دكەت «رنچال و رەژوی و تری و فێقیێ تەر و .... و ژ بەرهەمێن حەسەنیێ ئاماژە ب» پەنیر و كەو و ژاژی و ماست و فێقیێ هشك كری و مویژ» كریە[21].

ل دەوروبەرێن سالا (٥٨٠مش/١١٨٤ ز) ی گەرۆكێ ئەندەلوسی یێ ب ناڤ و دەنگ ئیبن جوبەیری (٦١٤مش/١٢١٧ ز)ی سەرەدانا مووسل كریە و چەند رۆژان ل وێرێ مایە، و پاش ژ وێرێ دەركەت بەرەڤ نسێبینێ، و درێكا خۆ دا بۆ لایێ راستێ چیایێ جۆدی دیت، كو چیایەكێ بلند و لاكێشەیە[22]، و گەرۆكێ مەغربی ئیبن بەتۆتەی (٧٧٩مش/١٣٧٧ز) ی هەر ئەو سالۆخەتێن چیایێ جۆدی توومار كرینە و باراپتر یێ ژ ئیبن جوبەیری وەرگرتی[23]، و ئیبن جوبەیر كو یێ داگرتیبە ژ كوردان، بێی كو چ زیان گەهاندبنە وی یان تێكەلیبا وان كریت دبێژیت: « رێڤەچوونا مە تا بەری نیڤرۆ ڤەكێشا و ئەم دبەرهەڤ و دهشیار بۆ هەر هێرشەكا كوردان كو ئەو بەلانە ل هەمی لایەنان، هەر ژ مووسل تا نەسیبین تا بازێرێ دنیصر رێگریێ و خرابكاریان دكەن و ئەو بخۆ ل ناڤ چیایێن ئاسێ دئاكنجی نە ل نێزیكی ڤی وەلاتی[24].

دبیت یاقوت ئەلحەمەوی (٦٢٦مش/١٢٢٩ ز) ی ب رەنگەكێ گشتی ژ هەر جوگرافیناسەكێ دی یێ موسلمانان پتر پویتە دابیتە وەلاتێ كوردان، و گەلەك بەرپەر ژ فەرهەنگا خۆ یا جوگرافی یا مەزن بۆ بازێر و دەڤەرێن كوردان تەرخان كرینە، و ب دەهان گوند و بازێرك و دەڤەر و رووبار و چیایێن كوردستانێ دابنە نیاسین، و ژبەر كو ئەو بۆ دەمەكی یێ ل مووسل ژیای و بازرگانی و گەلەك گەریانێن دناڤ جهێن جودا یێن جیهانا ئیسلامی دا كرین، گەلەك پێزانینێن جوگرافی ل سەر وەلاتێ كوردان وەرگرتینە، و ناڤێ گەلەك گوند و بازێران یێ ئینای كو ب تێر و تەسەلی داینە نیاسین و ل سەر ئاخفتی، هەر چەند هندەك دەسنیشان كرنێن وی بۆ هندە جهان پێدڤی ب هویربینیێ هەنە و نابیت دڤی دەمی دا ل دووڤ بچین. ل جەم وی وەلاتێ هەكاریا، واتە بەهدینان (بازێرك و دەڤەر و گوندن ل ژووریا مووسلێ ل بازێرێ جەزیرا ئیبن عومەری– جزیرا بۆتان - كو كورد لێ دژین دبێژنێ هەكاری)[25]. ژ لایەكێ دی ڤە، یاقوت ئەلحەمەوی پێزانینێن دیرۆكی یێن گرنگ ل سەر هندە كەل و ئاسیگەهێن كوردان بەرچاڤ دكەت. دەمێ كەلا ئاشەب (گوندێ ئاشاوا كو نێزیكی سەرسنكی یە) ددەتە نیاسین ل سەر دنڤیسیت دبێژیت: سەخمەراتی كەلایێن هەكاریان ل وەلاتێ مووسل (زەنگی كورێ ئاق سنقر– واتە عیمادەددین زەنگی) (٥٢١- ٥٤١ مش/١١٢٧- ١١٤٦ز)ی خراب كر و ل شوینێ ئامێدیێ ل نێزیكی وێ ئاڤاكر و ل سەر ناسناڤێ خۆ دانا[26]. دەربارەی كەلا ئەرمشت ژی، كو دكەڤیتە بناری زنجیرە چیایێ سپی، كورتیەكێ ل سەر ڤەگرتنا وێ ل سەر دەستێ خەلیفە (ئەلموعتەزد) (٢٧٩-٢٨٩ مش / ٨٩٢- ٩٠٢ز)ی كو ژێدەرێن دیرۆكی ئەو چەند پشت گوهڤە هاڤێتین دنڤیسیت و دبێژیت: (خەلكێ ئەردمشتێ ژ ئەلموعتەزدبللا پشتەرێ بوون و خۆ تێدا حەشاردان، تا ئەو بخۆ چوویێ و چوویە دناڤ دا... و خراب كری... و ئەوە یا ئەڤرو ب كواشێ دنیاسین). پاشی ل سەر ژیانا وان یا كشتوكالی و شیانێن وان یێن ئابووری دئاخڤیت دبێژیت: (گوندێن مەزن لێ نینن ، بەلێ سێ ئاقار (ضیاع) هەنە... و دبێژن دەمێ ڤەگرتی و هەڤالێن وی ئاگەه ژ خۆ بووین و دیتی دەرامەتێ وان یێ كێمە، فەرمانا خرابكرنا وێ دا). لێ ئەو ژی نەشیایە جهێ وێ دەست نیشان بكەت كو گۆتی: یا ل نێزیكی جزیرا كورێ عومەری– بۆتان - ل سەر چیایێ جۆدی[27]. یاقوت هەردو بازێرێن ئامێدیێ و حەسەنیێ (زاخۆ) ددەتە نیاسین، لێ یا دیار ئەو هەردو بازێر ب تنێ كەلایێن لەشكەری

بووینە مینا هەمی کەلایێن وەلاتێ هەکاری (بەهدینان)[٢٨]. هەروەسان سالۆخەتا هندە گوندێن دی دکەت کو دبێژیت ( دکەڤنە رۆژهەلاتێ مووسل)، واتە بەهدینان، مینا (بلاباز و بافخاری و بافکی)[٢٩] لێ یا ب زەحمەتە جهێن ڤان گوندان، یان خرابە و کاڤلێن وان بهێنە دەست نیشان کرن. دیسان یاقوت دو گوندێن ژی ددەتە نیاسین کو تا نهو ناڤێن خۆ یێن کەڤن پاراستین، ئەو ژی:

**بامەرنی،** گوندەکێ مەزنە سەر ب نەینەوا ڤە ژ دەڤەرێن مووسل کو دکەڤنە لایێ رۆژهەلاتێ وێ ، و ئەو بامەرنێ یا نهایە[٣٠].

**باصفری،** گوندەکێ مەزنە دکەڤیتە رۆژهەلاتێ مووسل ل بنارا چیای، گەلەك باغ و مێو لێ هەنە[٣١]، و مەبەست ژێ گوندێ باسفرێ یە کو سەر ب شێخان ڤەیە، و یاقوت هندە کەلا و گوندان ب رەنگەکێ گشتی دەست نیشان دکەت مینا:

الجلانیە: ژ کەلایێن هەکاریانە سەر ب دەڤەرا مووسل ڤە.

**جلصوری،** گلە سوری. ناڤێ کەلایەکێ یە ل ناڤ چیایێن هەکاری.

جوزە: گوندەکە دناڤ چیایێن هەکاری یێن کوردان[٣٢] .

یا دیار ئەوە پتریا ناڤێن باژێرك و گوندێن بەهدینان ب برگێ (با) ب واتایا خانی یان جە ب سریانی دەست پێ دکەن، و ئەڤە وێ چەندێ دیار دکەت کا ئایینێ مەسیحی چەند یێ ل دەڤەرا بەهدینان بەلاڤ بوو.

یاقوت ئەلحەمەوی ل وێ چەندێ ژی نەراوەستیایە، بەلکی ناڤێ هندە چیایێن بەهدینان ژی یێن داینە نیاسین، وەکی دانەنیاسینا وی بۆ چیایێ «گارا» یێ ب ناڤ و دەنگ کو ب (الجار) دایە نیاسین و ل سەر وی چیای دبێژیت: چیایەکە سەر ب مووسل ڤە[٣٣]. هەروەسان چیایەکی ب ناڤێ (تنین) ددەتە نیاسین و دبێژیت چیایەکێ ب ناڤ و دەنگە ل نێزیکی چیایێ جۆدی[٣٤]. و چیایێ (حبتون) کو دکەڤیتە دەڤەرێنسەر ب مووسلێ ڤە[٣٥]، و ناڤێ حبتون ناڤێ وێ یێ دناڤ وان ئاسیگەهێن کوردان‌دا هاتین کو موسلمانان ڤەگرتین[٣٦]، و چیایێ داسن، چیایەکێ مەزنە ل باکوورێ مووسل ل لایێ رۆژهەلاتی ڤە[٣٧].

هەروەسان یاقوتی پێنجی بەرپەر ژ فەرهەنگا خۆ بۆ دێرێن مەسیحی یێن بەربەلاڤ ل کوردستانێ و عیراقێ و باکوورێ شامێ و جزیرا فورات تەرخان کرینە. یا زانا ئەوە دەڤەرا بەهدینان یا پر بوو ژ دێر و کەنیسێن مەسیحی، کو یاقوتی ئاماژە ب پتریا وان داینە و ژ وانان:

دێر أبون (دێرەبوونا نهایە کو دکەڤیتە نێزیکی ئیبراهیم خەلیل)، دێر أکمن، دێر جۆدی، دێر زرنوق، دێر زەعفەران ل نێزیکی کەلا ئەرمشتێ، دێر ئەلکەلب (ئەو دێرا نهو ب قەشەفرێ نیاس)، دێر کۆم ل نێزیکی ئامێدیێ، دێر مەنسۆر ل رۆژهەلاتی مووسل کو دکەڤیتە هنداڤی رووبارێ خابۆر و ... یێن مایی[٣٨].

## ژێدەر:


١. البلاذري، فتوح البلدان، مطبعة السعادة، مصر ١٩٥٩، بث ٣٢٧، قدامة بن جعفر، الخراج وصناعة الكتابة، بغداد ١٩٨١ ز بث ٣٨١.

٢. معجم البلدان، دار صادر، بیروت (د. ت )، ١٠١/٥.

٣. وەرگێران البیر أبونا، الموصل ١٩٦٦ ز.

٤. أبن الاثیر، الكامل فی التأریخ، بیروت ١٩٧٨ز، ٢٤٣/٨ ، ٦١/٦، ١٦٩.المسعودی، مروج الذهب ومعادن الجوهر، مصر ١٩٦٢ ز، ١٢٤/٢. ابن خلكان، وفیات الاعیان- بیروت ١٩٧٧، ٣ /٢٤٣. القلقشندی صبح الاعشی فی صناعة الانشا، دار الفكر، بیروت ١٩٧٨ ز، ٣٧٥/٤.

٥. معجم البلدان، ٥ / ٣٢٧.
٦. ابن الاثیر: الكامل فی التأريخ، ٦ / ٢٤- ٢٥.
٧. ابن الفوطی: مجمع الاداب فی مجمع الالقاب، طهران ١٤١٦ م ، ٤ / ٣٢٦ – ٣٢٧.
٨. بنێره: گۆڤارا بیت النهرین، ژماره (١٤- ١٥)، گۆڤارا مەترانیا مووسل ١٩٧٦ ز: بث (٢٠٤- ٢٠٦).
٩. ابن حوقل: صورة الارض، بیروت ١٩٧٩ ز: بث٢٦٠.
١٠. الكامل فی التاريخ، ٦/ ١١٢.
١١. معجم البلدان، ٢/ ٤٣٢.
١٢. القلقشندی: صبح الاعشی، ٤ / ٣٧٨.
١٣. ابن خردابة: المسالك والممالك، بیروت ١٩٨٨، بث ٨٥. ابن الفقیة: مختصر كتاب البلدان، بیروت ١٩٨٨ ز: بث ١٢٥.
١٤. الكامل فی التأريخ، ( رویدانێن سالا ٣٨٠ م).
١٥. فتوح البلدان، بث ٣٢٨.
١٦. الكامل فی التأريخ، (رویدانێن سالا ٢٢٤م).
١٧. معجم البلدان، ١ / ٣٠٨.
١٨. معجم البلدان، ٢ / ٣١٠.
١٩. الاعلاق النفیسة، بیروت ١٩٨٨ ز: بث ٨٧.
٢٠. ابن حوقل، صورة الارض، بیروت ١٩٧٩ ز: بث ١٩٤، ١٩٦– ١٩٧.
٢١. احسن التقاسیم فی معرفة الاقالیم، بیروت ١٩٨٧ ز: بث ١٢٣، ١٢٦.
٢٢. رحلة ابن جبیر، بیروت ١٩٦٨ ز: بث ١٩٢ – ١٩٣.
٢٣. رحلة ابن بطوطة، (د . ت)، بث ١٥٨.
٢٤. رحلة ابن جبیر، بث ١٩٣.
٢٥. معجم البلدان، ٥ / ٤٠٨.
٢٦. هەمان ژێدەر، ١ / ٥٤.
٢٧. هەمان ژێدەر ، ١ / ١٤٦ / ١٤٧.
٢٨. هەمان ژێدەر، ٢ / ٢٦٠.
٢٩. هەمان ژێدەر، ١ / ٣٢٦ ، ٣٢٧ ، ٤٧٦.
٣٠. هەمان ژێدەر، ١ / ٣٣٠.
٣١. هەمان ژێدەر، ١ / ٣٢٣.
٣٢. هەمان ژێدەر، ٢ / ١٤٩ ، ١٥٤ ، ١٨٤.
٣٣. هەمان ژێدەر، ٢ / ٩٤.
٣٤. هەمان ژێدەر، ٢/ ٥٤.
٣٥. هەمان ژێدەر، ٢/ ٢١١.
٣٦. البلاذری: فتوح البلدان ، بث٣٢٧.
٣٧. معجم البلدان، ٢/٤٣٢.
٣٨. هەمان ژێدەر، ٢ / ٤٩٥ – ٥٤٣. هەروەسان بنێره ڤەكۆلینا (ریف الموصل فی مشاهدات یاقوت الحموی) یا ڤەكۆلەر یوسف جرجیس الطونی، گۆڤارا المورد، بەرگێ هەژدێ، ژماره چوار ١٩٨٩. بث ٤٧– ٥٨ .

# دهۆك د ژێدەرین سریانی دا

پ.د.فەرسەت مەرعی
وەرگیران: موحسن عەبدولرەحمان

## پیشەکی:

ل دووڤ زنجیرەیا مێژوویێ یا دەڤەر تێدا دەربازبووی دەڤەرا دهۆکێ چەندین ناڤ هەنە، وەکو دەڤەرێن دی بناڤەك تایبەت نەدهاتە نیاسین، چنکو گەلەك جاران و ژ گەلەك ئەگەران ژ سەردەمەکی بۆ سەردەمەکێ دی ناڤ دهاتنە گوهارتن؛ و ژێدەرێن دیرۆکی یێن کەڤن بناڤێن سیاسی ناڤدکرن، وەکو گۆتنا ئیمپراتوریا ئاشووری دەستەلاتداری لڤێ دەڤەرێ و چەندێن دەڤەرێن دی کریبە؛ و ئەڤ دەستەلاتداریە بەرفرەهـ دبوو؛ و بەرتەنگ دبوو ل دووڤ هێز و هەڤرکیا وێ دگەل ئیمپراتوریێن دی، لەورا نابیت بەردەوام وەکو ناڤ بکێمیاسێن خۆڤە بێهنە وەرگرتن، ئەگەر بهووری ل ژێدەرێن مێژوویی بنێرین، دو ناڤێن کەڤن بۆ دهۆکێ تیبینی دکەین، کو دشیاندایە مفایی ژێ وەرگرین ئەوژی:- نوهەدرا، باهەدرا، بانوهەدرا، و بەهدینان، لێکچون و وەکهەڤی د ناڤبەرا هەردو ناڤین دەڤەرێ دا هەیە[1].

ناڤکرن ب نوهەدرا کەڤنترە ژ ناڤکرن ب بەهدینان، ناڤێ ئێکێ ئەکەدی یە، ئارامی – سریانی (نوهەدرا) ب رامانا شکو – مەهوژە (الجلال - الهالە) و دبیت لگەل دەمی گەشەکریت، ل دووڤ گۆتنا ڤەکۆلەرێ کەنیسێ (یوسف حببی) کو ب کوردی بوویە ئەردێ نوی، چنکو ئەڤ دەڤەرە ببوو سنوور د ناڤبەرا شاهنشینێن ئیرانی و رۆمانی دا[2] لڤێرە ڤەکولەر دپرسیت بۆچی دبنەمادا ناڤ کوردی نەبیت، (نووئەدرا) (ئەردێ نوو) و دگەل دەمی بوویە (نوهەدرا) یان (بانوهەدرا) ل دووڤ دارشتنا ئارامی – سریانی، چنکو دەڤەر کوردی یە و پێدڤییە ناڤکرن دگەل ژیواری دەڤەری یێ گونجایی بیت. و ئەگەر ناڤەکێ دێ هاتبیت بێگومان ئەو ددەمەك دیارکری دا پەیدابوویە یان مللەتێن ڤێ دەڤەری یان یێن دی ل سەر دانایە. هەروەك (شمال العراق) باکوورێ ئێراقی بۆ کوردستانێ دهاتە گۆتن سەرەرای هندێ کو ناڤێ کوردستان ژلایی مێژوویڤە ژ باکوورێ ئیراقێ کەڤنترە و هوسا[3]، و نەیا بەرزەبە کو جوداهییەکا بەرفرەهـ د ناڤبەرا زمانی کوردی کو هندوئەورۆپی یە؛ و ئارامی – سریانی دا کو سامییە هەیە.

دەمێ یەکەمین جار لەشکەرێ موسلمانان گەهشتینە باکوور و رۆژهەلاتێ نەینەوا ژێدەرێن ئیسلامی داکۆکی ل سەر کوردینیا وێ کریبە و ئەڤە ب ئاشکرایی د وی دەقی دا یێ بەلازری ڤەدگێریت هاتییە: ... و ل مووسل وار هاتنە دیتن و ل سەر دانا زێرەسەرێ (جزیە) پێکهاتن، پاشی (المرج) مێرگ و گوندێن وێ و ئەردێ باهەزرێ و حەبتون و حیانە و

معله و داسیر (داسن) و هەمی ئاسیکەهێن کوردان هاتنه ڤەکرن[٤].

سەرباری کو وان ب هەمان ناڤێن خەلکی دگۆتنێ ناڤکرن، بەلێ گومان تێدا نینه ب بۆرینا دەمی دێ هندەك ناڤێن دی دیاربن و دبیت ناڤێن رەسەن یێن دەڤەرێ بن، بەلێ ئەگەر ناڤێن ژێدەرێن کەنیسێ یێن ئارامی – سریانی ل دەڤەرێ کرین وەربگرین، دێ وەسان بۆ مە دیار دبیت، کو ئەڤ دەڤەره نه کوردی یه و خەلکێ تێدا نیشتەجێ چ پەیوەندی ب کوردانڤه نینه، دا ژ باشووری رۆژهەلاتی کوردستانێ و بدروستی ژ کرمانشاهـ حەلوان و خانەڤینێ دەستپێبکەین، کو ب ناڤکرنا وان ( بیت بلاشفر و کەرکووك- ب بیت کرمای، و هەولێر – ب حدیاب، دهۆك و زاخۆ- ب نوهەدرا، جزیره – ب بیت زبدی، و نوسەیبین و شنگال- ب بیت عربای، و ناڤکرینه و ب ڤی رەنگی بەردەوام بوویه[٥].

بەلێ ئەڤه وێ چەندێ ماندەل ناکەت کو هندەك ژێدەرێن سریانی ب ناڤکرنا وان ب ناڤێ کوردان ئاماژه ب هندەك دەڤەرێن کوردان کرییه وەك گۆتنی ئەسقەفێ کوردان[٦].یان مالێن کوردان (مشکناد قوردو)[٧].

## دەستنیشانکرنا جوگرافیا دەڤەرا دهۆکێ و دەردورێن وێ:

دەڤەرا دهۆکێ دەشتا دناڤبەرا جزیرا فوراتی ( رۆژئاڤای رووبارێ دیجله) و چیایێن کوردان ڤەدگریت، و زێ مەزن ژ باشووری رۆژهەلاتی و رووبارێ گۆمل ژ ئاکرێ جودادکەت و چیایێ ئێسفنێ ل باکووری رۆژهەلاتی، هەروەسا زنجیرێن چیایێ سپی (بێخێر) و چیایێ رەش (زاوا) ل باشووری رۆژهەلاتی و گاره و مەتین ل باکووری، دەشتا نوهەدرا ب چیایێن نزمتر ئەوژی چیایێ بەعشیقه و مەقلووب ل رۆژهەلاتی نەینەوا ب دوای دهێت[٨].

دەربارەی مالتا – مەعلاتا دکەڤیته جهێ بازێرێ مالیاتی یێ ئاشووری و ئاشووریان بۆ پتر ژ هەفت چەرخان فەرمانرەوای لێکرییه، هەر ژ سالا ١٣٦٣پ.ز دەمێ شاهێ ئاشووری ئوبالیت شیای دەستەلاتێ میتانی ب داوی بینیت[٩].تا کەفتنا نەینەوا ل سالا ٦١٢ پ.ز [١٠] ل سەر دەستێ میدییان.

وەسا دیاره کو جهێ مالتایێ بۆ ستراتیژیا لەشکرێ ئاشووری یا گرنگ بوو، ئەو دەرازینك بوو بۆ سێ گەلی یان (سێ رێکێن چیایی) ئەوژی رێکا چیایێ سپی (گەلیێ دهۆکێ) و گەلیێ ڤەشەفر و گەلیێ زاخۆ، و یێ داویێ مەزنترین دیدەڤانه بۆ بزڤینێن لەشکری و سەرکردەیێ گریکی (زەینەفون) د هەوا ئەناباسیس دا ل سالا ٤٠١ی پ.ز ئەو رێك گرتییەبەر و تێدا کورد وەکو مللەتەك بەرسینگێ لەشکرێ وی گرتی داینه نیاسین و ب کاردوخی ناڤکرنه، ئەڤان سێ دەربەندان دەولەتا ئاشووری ب دەولەتێن ئوراتی ل باکوور و باکووری رۆژهەلاتی و میتانی ل باکووری و حیسی ل باکووری رۆژئاڤا گرێددان[١١].

لەورا نه سەیره دەمێ ژێدەرێن ئاشووری ئەڤ دەڤەره ب مالیاتی ئانکو دەروازه (دەرگەهـ - دەربەند) ناڤکری، کو هێزەکا لەشکری لێ ئاکنجی ببوو؛ و ل داویێ بو ئاسیکەهەکا لەشکری، لەورا شاهێن ئاشووری وەکو بەلگە ل سەر دەستەلاتا خۆ ل سەر دەڤەرێ هەولدان گەلەك پەیکەران دانن، کو ل ناڤەراستا چیایێ رەش (زاوه- شندوخا) ل شکەفتا هەلامەتا پەیکەرێن کولای دهێنەدیتن، و ئەڤ پەیکەره ژ چار دیمەنێن وەکهەڤ پێکهاتینه، هەر ئێك ژ وان کەژاوه (مەوکبێ) هەفت خوداوەندان ل سەر گیانەوەرێن خۆیێن پیرۆز یێن تایبەت ب وانڤە و شاهـ ل پێشیێ وانه و کەسەك ل پشت وی راوەستیایه، ئەڤ خوداوەندە برێز ئەڤەنه: ئاشور، ئەنلیل، سین، شمس، ئەدد، عەشتار، لێ چ نڤیسین ل سەر ڤان پەیکەران دنیگارکری نینن، و دهێته تەخمینکرن ئەڤە ڤەدگەرنه سەر دەمێ شاهێ ئاشووری سەنحاریبی (٧٠٥- ٦٨١) پ.ز[١٢] هەرچەنده هندەك ل دووڤ شێوازێ پەیکەرسازی دزڤریننەڤە بۆ سەردەمێ شاهـ ئاشور پانیپالی (٦٨٨- ٦٢٦) پ.ز ژ ئەنجامێ سەرکەفتنا وی ل سەر عیلامییان و

داگیرکرنا پایتەختێ وان (شۆش) ڤەدگەرینن[13].

لێ ل سەر ناڤێ دهۆك ژێدەرێن سریانی دناکۆکن و چەندین بووچۆن و شرۆڤەکرن دەربارەی وێ هەنە ژوان:

١-د ماوێ چەوساندنا چلی دا ئەوا شاهێ ئیرانی شاپوورێ دووێ (٣٠٩- ٣٧٩)ز دژی مەسیحیان کری، شماس مارایتالاها ل گەل هەڤالێ خۆ عقبشما و کاهن یوسف هاتنە ئەشکەنجەدان و زیندانکرن، و مارایتالاها برنە دەستکرد(دهۆکا نها) و ل وێری ل سالا ٣٧٦ز ب رەجماندنێ هاتە کوشتن، هەر ل جهێ شەهیدکرنا وی دارەکا میتك (أس) شینبوو و زەردەشتیان ژ کەرباندا ژنی ئینادەر، و پەیکەرەك بۆ مارایتالاها ل سەر گرەکی ل هنداف دهۆکێ بۆ هاتە دانان ئەوا هەر زوو بوویە مەزارەکێ ناڤدار[14].

٢-ژبەر کو دهۆك دکەڤیتە ژێر دو کێلیێن تیژ ناڤێ هەر ئێکێ (سەرێ دهۆك) ئانکو سەرێ تیژ، و ناڤێ دوویان ( دوسەردهۆك) پیتێن (و، س، ر) بۆ ئاسانی و سڤککرنێ هاتنە لادان و کورتیبا وێ بۆ دهۆك[15].

٣-پتریا مەسیحییێن گۆندێن دەوروبەرێن دهۆکێ و یێن سەر ب پارێزگەها نەینەوا دبێژنە دهۆکێ (ئاتوك) ئانکو ب زمانێ عیبری (بنارا چیایی) و ڤیابیت ڤێ ناڤکرنێ بنەمایەك هەبیت و ڤەکۆلەرێ خودانێ ژێدەرێ دیارنەکریە ئەڤ بۆچوونە ل سەر چ بنەمایەکیە[16].

## بەلاڤبوونا مەسیحیێ و رێکخستنا دێرا رۆژهەلات:

ب گەهشتنا ئۆلا ئاینێ مەسیحی بۆ دەڤەرا کوردی ل داویا سەدسالیا ئێکێ و دەستپێکا سەدسالیا دووێ زاینی ل دووڤ ژێدەرێن کەنیسێ و دەستپێکا سەدسالیا سیێ ل دووڤ ژێدەرێن رۆژهەلاتناسێن تایبەتمەند ب سریانیێ، رێکخستنا دێرا رۆژهەلات ب شێوەیێ لێکڤەکرنا سەرۆکاتی (هیرارخی) دەستپێکر[17].

ل کومتی (جاثلیق) یان بەتریارك هەیە کو ئەبرەشیەکا هەرە مەزن هەیە دهێت، دووڤدا مەتران یان سەرۆکێ ئەسقەفان دهێت و هەر ئێکی ژ وانا (مطرافولیطیة) باژێرەکێ گرنگ هەیە، ل دووڤ وان ئەسقف دهێن و هەر ئێکی ئەبرەشیەك یان ئەسقفیەك هەیە برێڤەدبەت و قەشە و سەرۆکێن دێرێن خۆجهی کو ل دەرڤەی باژێران دبەلاڤبوون هاریکاریا وی دکرن[18].

ل دووڤ ئەڤا بوری دەڤەرا نوهەدرا هەر ژ سالا ٤١٠ێ وەکو ئەبرەشیا ئەسقەفی هاتە نیاسین و ئەسقەفەکی دگۆتنێ ئیسحاق ب رێڤەدبر و هەمی کارێن کۆمدێرا (مجمع) مارئیسحاق ئیمزادکرن، و ل دووڤ نەخشەیا لێکڤەکرنا جوگرافی یا ئەبرەشێن دێرا رۆژهەلات ئەسقەفیا نوهەدرا سەر ب مەترانی یا حدیاب (هەولێر) ڤە بوو، ئەوا سەر ب ئەبرەشیا سلوقی – تەیسەفون – سەلمان پاك (باشوورێ بەغدا) ڤە[19].

ل دۆر دەستنیشانکرنا جهێ کەڤن یێ ئەسقەفیا نوهەدرا ب بووچۆنا (الاب) یوسف حبی و ل دووڤ چیرۆکا مار دانیال ئەوا ئەدی شیری د پەرتووکا شەهیدێن رۆژهەلات (شهداء المشرق) دا ئینای، تلخش ئەوا دکەڤیتە سەر رێکا شاهانە[20] دووراتیا ٤ کم رۆژئاڤای فەیدیێ و ٦ کم باشوورێ رۆژئاڤایێ ئەلقۆش ئەو بارەگایێ ئەسقەفیێ بە و هێش شوینەوارێن (دێرا مامليس) دبەرچاڤن[21]. ل کۆمدێرێن پشتی کۆمدێرا مارئیسحاق دهێن تێبینیا ئەسقەفیەکا دیتر یا مەعلاتا- مالتا دهێتەکرن ب دروستی کۆمدێرا (الجاثلیق)پاپایێ ئێکێ سالا ٤٩٧ز و کەسەك ب ناڤێ یوخەنان سەرۆکاتیا ڤێ ئەسقەفیێ دکر[22].

هەژی گۆتنێ بە کو ڤەکولەرێ کەنیسێ ئەلبیر ئەبونا گوندێ مالتا ب سەنتەرێ ئەسقەفیا نوهەدرا ددەت نیاسین و پێڤەدچیت و دبێژیت کو عەرەبان مەبەست پێ موسلمانن دەمێ گەهشتینە دەڤەرێ ب ناڤێ باهەدرا ددانیاسین[23].

هەژی ئامارەکرنێ یە کو هەڤدژی د ژێدەرێن سریانی دا دەربارەی ناڤکرنا چیایێ نوهەدرا دا هەنە، چنکو چەندین زنجیرە چیا ل دەڤەرێ هەنە ژێدەرە دبێژنە هەموویان نوهەدرا، وەکو چیایێ ئەلقوش، زاوە- چیایێ رەش ل ژێریێ دهۆکێ، بێخێر – چیایێ سپی و ئەڤە بو ئەگەرا هەڤدژیێ ل دور جوگرافیا جهێن دێران و هندەك

روودانێن ل دەڤەر و ئەسقەفیێن دی روودای وەکو داسن و ئەلمەرج و بیت بغاش و یێن دی .

ب دیتنا من ڤەکولەرێن سریان هێشتا نەشیاینە ڤێ کێشەیێ چارەسەربکەن، سەرباری کو ڤەکولەرێ دومینیکی جان موریس فییە ڤەکولینەکا زانستی یا بهادار د پەرتووکا خۆ یا ب فرەنسی (ئاشوریێ مەسیحی یان مووسلا مەسیحی(أشور المسیحیە او الموصل المسیحیە) ژێر خزمەتا ڤەکۆلەران دا دانایە. وەسا دیارە کێشەیا ناڤکرنێ و هەولا بۆیاخکرنا هەمو دەڤەرێن کوردی ب بۆیاخا ئارامی – سریانی د چەرخێن کەڤن دا و بۆیاخا ئاشووری د سەدسالیا نوی دا ئەو کارێ ڤان کەسانە، لەورا هەڤدژی د گۆتن و دەستنیشانکرنا دەڤەران دا و بتایبەت جهێن دێران ژ ڤەکۆلەرەکی بۆ ڤەکۆلەرەکێ دی روودایە.

**پێکهاتا دێرێن هەردو ئەبرەشییێن نوهەدرا معلاتایا**

| ز | ناڤێ کۆمدێرێ و دیرۆکا وێ | (ناڤێ ئەبرەشیا نوهەدرا دهۆك | ئەسقەفی ئەبرەشیا مەعلتا- مالتا | مەترافولیتە مەتروبولیتات |
|---|---|---|---|---|
| ١ | کۆمدێرا مار ئیسحاق ٤١٠ز | ئیسحاق | | حەدیاب(ئەربیل) |
| ٢ | کۆمدێرا دادیشوع ئەلجاسلیق ٤٢٤ز | | | حەدیاب(ئەربیل) |
| ٣ | کۆمدێرا ئەلجاسلیق بابای ٤٩٧ز | صموئێل (شموئیل) | یوحەنان | حەدیاب(ئەربیل) |
| ٤ | کۆمدێرا مار ئابا ٥٤٤ ز | | شەمعون | حەدیاب(ئەربیل) |
| ٥ | کۆمدێرا یوسف ئەلجاسلیق ٥٥٤ | یەزدفنە | یەزدفنە | حەدیاب(ئەربیل) |
| ٦ | کۆمدێرا ئەلجاسلیق حزقیال ٥٧٦ ز | | برشیسا | حەدیاب(ئەربیل) |
| ٧ | کۆمدێرا ئیشو عیابێ ئێکێ ئەلجاسلیق ٥٨٥ | سبرائیشوع | برشیسا | ئاشوور (نەینەوا) |
| ٨ | کۆمدێرا ئەلجاسلیق گریگوری ئێ ٦٠٥ ز | یوحەنا | | |
| ٩ | کۆمدێرا سالا ٦٤٠ ز | عەبد یەشوع | کلیلیشوع | ئاشوور (نەینەوا) |
| ١٠ | کۆمدێرا دیماهیا سەدسالیا حەفتێ | ئیسحاق | | |
| ١١ | کۆمدێرا ٩٦٣ ز عەبدیەشوع یەهبالاها | | | |

## ژێدەر و پەراوێز:

١. د. یوسف حبی: ابرشیە نوهەدرا، گۆڤارا (بین النهرین)، ژمارێن ٥٥- ٥٦، ١٩٨٦، مووسل، ص٤٣.

٢. د. یوسف حبی: هەمان ژێدەر، ص ٤٣-٤٤.

٣. زانستیانە دیاربوو کو زاراڤێ کورد یان وارێ کوردان بۆ سەدسالیا چارێ زایینی ڤەدگەریت، پشتی کو یا زانابوو، کو ئەڤ ناڤکرنە بۆ سەدسالیا دوازدێ زایینی ڤەدگەریت، دەربارەی ڤێ بنێرە: تواریخ سریانیيە من القرون ٧-٩، المجمع العلمي العراقي- الهیئة السریانیة، نقل و تحقیق یوسف حبی، ص ١٨٠ ؛ ادی شیر: تاریخ کلد و اپور، بیروت- ١٩١٣، ص١٢٠.

٤. البلاذري: فتوح البلدان، میسر پەرتووکخانا بازرگانی، ص٣٣٧ توێژاندن رضوان محمد. (مرج) دەڤەرا ئاکرێ یە و باهدری بابەتێ ڤەکۆلینا مە دەڤەرا دهۆك و زاخۆیە، باعدری؛ باعەدرێ بارەگایێ سەرۆکێ ئێزدخانێ یە دگەلدا ئێسفنێ و شێخان، (حبتون) بلنداهیا زێ مەزنە، نها بارزان و گوندێ رێزانە، (الحیانە) ئێك ژ دەڤەرێن سەر زێ بچووکە دبیت رانیە بیت، (المعلة) ب رامانا دەرازینك یان دەرگەهـ وەکو دەربەند د کوردیێ دا و دکەڤیتە دەرگەهێ دەرکەفتنا زێ مەزن ژ چیا ل بێخمە، (داسر) دەڤەرەکە دکەڤیتە باشووری ئامێدیێ دبیت بەرێ گارەی بیت.

٥. دەربارەی ڤێ بنێرە: ئەلبیر ئەبونا، تاریخ الکنیسة الشرقیة من الاسلام حتی العصر العباسي، دار المشرق بیروت، چاپا ئێکێ١٩٩٣ێ، نەخشەیا هەڤپێچ ل داویا پشکا دوویێ ، یوسف حبی: کنیسة المشرق الکلدانیة الاشوریة، کسلیك لوبنان ٢٠٠١، ص ٢١- ٣٤.

٦. تواریخ سریانیة. نقل و تحقیق یوسف حبی، ص١٨٠.

٧. روبنس دوفال: تاریخ الادب السریاني. منشورات مطرانیه السریان الکاثولیك، بغداد-١٩٩٢، ص ١٦٩، ٣١٣، ٤٢٦.

٨. ادی شیر: تاریخ کلدو اشور، پ٢ ص١٢٠.

٩. ایشو عدناح: الدیوره، الموصل- ١٩٣٦، تعریب البطریارك بولص شیخو و عده مواضع.

١٠. هنری س. عبودی: معجم الحضارات السامیه، لبنان جروس برس، ص ٩٢-٩٧.

١١. کلین دانیال: موسوعه علم الاثار، سلسله دار المامون، بغداد- ١٩٩٠ ترجمه لیون یوسف، ج ١ ص٤٣-٤٦.

١٢. حملة العشرة الاف فارس، ترجمه یعقوب افرام منصور، الموصل١٩٨٥، ص ٥٣.

١٣. د. هاشم خضیر الجنابي: مدینة دهوك دراسة في جغرافیة المدن، الامانة العامة للثقافة و الشباب في منطقة الحکم الذاتي، ١٩٨٥، ص٦.

١٤. حمید المطبعي- رحلتی الی شمال العراق، بغداد، ص ١٧٩

١٥. ادی شیر شهداء المشرق، پ٢ ص٨٣-٨٤.

١٦. البیر ابونا: ادب اللغه الارامیه،لبنان- ١٩٧٠، ص٢٦١.

١٧. یعقوب النجار: دیر مار ایثالاها و مدینه دهوك، کوڤارا (الصوت الکلداني) ژمارە ٤، ١٩٩٩ ص ٢٤؛ لدور ناڤکرنێ ب دێرا بەرانی ئەم نزانین چەند راستە و چەند دگەل هۆش و لۆژیکێ دگونجیت، لێ لاندری دبێژیت: کەسەك بناڤێ عەلی کەنجوێ شڤان پەزێ خۆ ل ناڤ دێرێ دچەراند سەرباری هۆشدارێن خەلکی کو خۆ نێزیك دێرێ نەکەت، ل رۆژەکێ پەزێ خۆ برە ناڤ دێرێ و ل نێزیك هەیکەلی دەردۆر پیسکرن، دەملدەست کۆرەبوو، ئەڤجا کرە قیری و هاوار و خەلکی برنە مال و پاشی برنە لایێ قەشەیێ دێرێ و چیرۆکا خۆ بۆ قەشەی ڤەگێرا، قەشەی فەرمان لێکر د دێرێ ڤە قوربانەکێ ل سەر هەژار و خەلکی بەلاڤبکەت و دێرێ پاکژ بکەت و ب باوەری نڤێژێ بکەت. عەلی کەنجو ژێ پرسی بەر ب کیش رووگەهێ بکەت. قەشەی گۆتی چاوا بڤێت بلا ڤەکوژیت. ئەڤجا عەلی گەنجوی بەرانەك مەزن کری و برە دێرێ و سەرژێکر و ل خەلکی بەلاڤکر و دێر پاکژ کر و نڤێژکر، دەملدەست چاڤێن وی ڤەبوون، ژ ڤێ رووداێ ناڤێ دێرا بەرانی هاتییە. هەمان ژێدەر، ص ٢٨- ٢٩.

١٨. یوسف حبی: ابریشه نوهدرا، ص ٥٢.

١٩. یوسف حبی: کنیسه المشرق الکلدانیه الاثوریه،الکسلیل لبنان، ٢٠٠١، ص ٣١.

٢٠. ادی شیر: تاریخ کلدو واثور، پ٢ ص ١٥٨.

٢١. یوسف حبی ابرشیه نوهدرا، ص ٥٢

٢٢. المطران یوسف بابانا، القوش عبر التاریخ، بغداد ١٩٧٩، ص ٢٢٤- ٢٢٥.

٢٣. ادی شیر: تاریخ کلدو و اپور،پ٢ ص١٠٣.

٢٤.توما اسقف المرج: کتاب الرؤساء، عربة و وضع حواشیه الاب البیرابونا، مطبعة دیانا، بغداد- ١٩٩٠، ص١٠٠.

# بەهدینان
# ل سەردەمێ ئەمەوییان

**پ.د.فەرسەت مەرعی**
**زانکۆیا زاخۆ- کۆلیژا زانستێن مرۆڤایەتی**
**وەرگێران: کۆڤان ئیحسان**

## بەراهی:

پتریا ژێدەرێن بەردەست ئەڤێن گەهشتینە مە ل سەر دیرۆکا ئەمەوییان بۆ چەرخێ خەلیفەیێن عەباسییا دزڤرن، کو ب دوژمنێن دژوارێن ئەمەوییان دهێنە نیاسین، ژبەر ڤێ چەندێ یا بزەحمەتە کو ڤەکۆلەر بشێت سەنگ و بێ لایەنییا خۆ دنڤێسینا دیرۆکا ئەمەوییان دا پارێزیت. کێمەك ژ ریوایەتێن دیرۆکی مەدحێن ئەمەوییان دکەن، نەخاسمە ڤەگێڕانا وێ قۆناغێنە یا ئێکسەر پشتی هەرفتنا دەستەلاتێ ئەمەوییان هاتی. ژ بلی خەلیفەیێ ئێکێ «موعاویە کورێ ئەبو سفیانی ٤١- ٦٠مش»، ژ بەرکو ئێك ژ صەحابیێن پێغمبەری (سلاڤێن خودێ ل سەربن) بوو، دیسان خالێ بوسلمانا بوو «دەیکا حەبیبە خویشکا وی بوو»، زێدەباری خەلیفەیێ بەرکەفتی «عومەرێ کورێ عەبدولعەزیزی ٩٨-١٠١مش»، ژبەر ڤێ چەندێ هەمی ئەوێن ئاڤری دایە ئەمەوییان، پەسنا ئەمەوییان دکەن، کو خەلکەکێ نە دیندار بوون، د سەرەدەریکرنێن خۆ دا پتر سەر ب بیروباوەرێن عەشیرەتیێ بوون نەك بیروباوەرێن ئیسلامی، « ئەڤە ژی وەك ئاڤریەك بۆ هەڤڕکییا دناڤبەرا مەوالی و عەرەبا دا».

دیرۆکڤانێن دوژمنێن ئەمەوییان ئەڤا دەلیڤە بۆ خۆ دیتییە، نەخاسمە کو ئێکسەر پشتی خەلیفەیێن راشدی هاتینە، ئەو پیڤەرێن ل سەر خەلیفەیێن راشـدی دانایین، جارەکا دی بۆ هەلسەنگاندنا خەلیفەیێن ئەمەوی ژی هاتینە بکارئینان، بێ کو وێ ئیمبەراتۆرییا خودان ڕووبەرەکێ بەرفرەهـ بەرچاڤ وەربگرن، نەخاسمە کو ل سەردەمێ ئەمەوییان گەلەك بەرفرەهـ ببوو «چین رۆژهەلاتا وێ بوو هەتا دگەهشتە فرەنسا کو رۆژئاڤایێ وێ بوو»، لڤێرە ئەو پیڤەرێن دهاتنە بکارئینان بۆ هەلسەنگاندنا سەردەمێ راشدییا نابیت بێنە بکارئینان بۆ هەلسەنگاندنا سەردەمێ ئەمەوییان.

## جوگرافییا دەڤەرا بەهدینان:

د راستی دا ئەو ناڤێ ل سەردەمێ ئەمەوی

دگەل دەڤەرا بەهدینان کو ڤەکۆلینا مە ژێ دگریت، دگونجیت ناڤێ (بانوهذرا)یە، کو هندەك جارا دهێتە گۆتن (بیث نوهدرا) یان (نوهەدری). نە دووره رامانا ناڤێ وێ (توخیب) بیت، ژبەرکو ئەڤ دەڤەرە وەکی توخیبەکێ بوو دناڤبەرا ئیمبرتوریا فارسییا ساسانی و رۆما بیزەنتی دا[١]. ژ لایێ جوگرافی ڤە ئەڤ ناڤە بۆ ڤێ هەرێمێ هەمیێ دهێتە گۆتن، مەرەم کو دەشتا نەینەوا ژێ ڤەدگریت، ئەڤا دکەڤیتە دناڤ دەشتێن دۆلا ناڤبەرا دو رووباران و چیایێن کوردان دا «مەرەم ژێ کوردستانە»، ژبەرکو توخیبێن رەسەن ئەڤێن ڤێ هەرێمێ ژ هەرێمێن دی جودا دکەن بڤی رەنگی نە: رووباری دیجلە ژ لایێ رۆژئاڤایی ڤە ڤێ هەرێمێ ژ هەرێما (بیث عربایێ) جودا دکەت، زێیێ مەزن ژلایێ رۆژهەلاتی و باشووریێ رۆژهەلاتی ڤێ هەرێمێ ژ هەرێما حەدیاب (مەرەم ژێ هەولێره) جودا دکەت، ل ڤێره جوداهییەکا دناڤبەرا ژێدەرا دا هەی ل سەر کەتنا هەرێما مەرکا (ناڤ کور) دناڤ توخیبێن هەرێما (نوهەدرا)دا[٢]. چنکو هندەك ژێدەر وەکی (هەرێمەکا سەربەخۆ) ئاڤرێ دەنێ، دبینین کو رووبارێ خازری ئەو خالە یا هەردو جها ژێکڤەدکەت[٣]. بەلێ پێکڤەکرنا هەردو هەرێما: نوهەدرا و مەرکا، بێ دو دلی دێ مەبەتە سەر دەڤەرا نها یا بەهدینان، ژ لایێ جوگرافی ڤە یا ئێك توخیبە دگەل هەردو هەرێمێن نوهەدرا و مەرگا، زێدەباری هندەك هەرێمێن دی، وەکی (داسن)[٤] و (حبتون)[٥].

دەڤەرا نوهەدرا و مەرگا دکەڤنە د ناڤ هەرێمەکا مەزن دا، ل سەردەمێ یونانییا دگۆتێ میزۆپۆتامیا (Mesopotamia)[٦]. د ژێدەرێن سریانی دا دگۆتێ (هەرێما ئاڤۆر). ب وەلاتێ (جزیرا فوراتی)[٧] د ژێدەرێن عەرەبی و ئیسلامی دا هاتییە نیاسین[٨].

سەبارەت توخیبێن دەڤەرا بەهدینان، نەخاسمە ل سەردەمێ ئیسلامێ، هەمی دکەڤیتە دناڤ هەرێما جزیرا فوراتی دا، هەروەکی جوگرافیناسێن بوسلمانا توخیبێن وێ دیارکرین، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەم دو دل نینین هەکە بێژین بازێرێن (العمادیه و معلثایا و الحسینیه و عقر الحمیدیه) (ئامێدیێ و مالتایێ و حسێنیێ و ئاکرێ یا حەمیدی) دکەڤنە دناڤ ڤێ هەرێمێ دا[٩].

## عەشیرەتێن کوردی ل دەڤەرا بەهدینان:

عەشیرەتینی و تایێن وان، هەر ژ کەڤن هەتا سەردەمێ ئیسلامێ رەنگێ ژیانا کوردابوو، هەتا ئەڤرۆ ژی ئەڤ دیاردە ل دەڤەرێن کوردا دهێتە دیتن. د جڤاکێ کوردی دا سەروبەرێ رێڤەبرنێ پتر ژ پەیمانێن عەشیرەتی و رێکخستنێن عەشیرەتی پێکدهێت، نەخاسمە ئەڤە دەستۆدارێ برێڤەبرنێ بوو د دیرۆکا وان دا، ئەڤ سەرۆبەرە پتر پشتا خۆ ب بنیاتێن رەوشەنبیریێ راستدکەت، «یەك زمان» و هەریمی «جوگرافی»، یان برەنگەکێ دی هەمی د ئێکەتییەکا سیاسی دا خرڤەدبن، نە ئێکەتییەکا نفشی یە [١٠]. گەلەك کێم جاران پشتبەستنێ ل سەر نفش و بنیاتەکێ هەڤپشك هەروەکی ل جەم عەشیرەتێن عەرەبی هەی دکەت.

ل سەر ڤی بنیاتی ئەم دشێن بێژین کو تیرا کوردی پتر تیرەکا ئەردی یە (پتر ب ئەردووڤە یا گرێدایە) نەك ب نفش و رەسەناتیێ، ئەو د بنواشێ خۆ دا پتر یا نێزیکی گوندی یە، وارگەهێن هاڤین و زڤستانی هەنە کو بەردەوام هاتنوچوونێ لێ دکەن [١١].

«ئیبن حەوقەل» ئاڤرییەکێ ددەتە لڤینا عەشیرەتا کوردی، پتر بۆ مە روهن دکەت دەمێ دبێژیت (ل هاڤین و زڤستانا، کێمەك تێ نەبن بەلێ بێن دی ل جهێن چەروان و دەشت و زۆزانا خرڤەدبن، ئەو کێمە ل سەر توخیبێن دەڤەرێن سار «صرود» دمینن، بەلێ خەلکێ جهێن گەرم «أهل جروم» ناهێنە خوارێ و جهێت خۆ ناڤەگوهێزن، بەلکی دناڤبەرا وان دەڤەرێن وان هەین هاتنو چوونێ دکەن....) [١٢].

نیڤشکێ ڤی بابەتێ ئەم ڤەکۆلینێ بۆ دکەین، هەبوونا کوردایە ل دەڤەرا بەهدینان، نەخاسمە ل پشکێن رۆژهەلاتێ دەڤەرا جزیرا فوراتی، کورد ل دەڤەرا مووسلێ بەلاڤن، (ئیبن حەوقەل) دبێژیت (مووسلێ

| ر | ناڤێ دێری | ناڤێ دامەزرێنەری و دیرۆکا وێ | جهێ جوگرافی | زڤرینا دێری | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | دێرا «مارئیثالا» دێرا بەڕانی.[٢٠] | ٣٥٨ز_ مارئیثلاها | دناڤ باژێرێ دهۆکێ دا بەرامبەری سەرۆکاتیا زانکۆیا دهۆکێ | نەستوریێن کلدانی | مارئیثلاها ل سالا ٣٥٨ز و ل سەر دەستێ ساسانییا ل هەڤلێرێ هاتە بدارڤەکرن و کەلەخێ وی ل دەڤەرا «دەستکرد» دهۆکا نها هاتە ڤەشارتن. |
| ٢ | دێرا مارئەوراها[٢١] | ئەبراهم ئەوراها ٦٢٨_٦٤٦ز | نێزیکی مومێنتێ باتمایا | نەستوریێن کلدانی | |
| ٣ | دێرا رەبان هورمزی[٢٢] | رەبان هورمزێ فارسی | دکەڤیتە سەر چیایێ ئەلقۆشێ و نێزیکی «٢کم» ژ ئەلقۆشێ یا دووره | نەستوریێن کلدانی | هەتا نها ژی یا تژی رەهبانە و گۆرێن چەند پەتریاکا دناڤدایە، نەخاسمە پەتریاکێن کەنیسا رۆژهەلاتی یێن کلدانی و ئاشووری. |
| ٤ | دێرا مارمەتی[٢٣] | مارمەتی ل دووماهیا چەرخێ پێنجێ زایینی | دکەڤیتە سەر چیایێ ئەلفانا «مەقلووبی» | سریانێن ئارسودوکسی | هەتا نها یا ئاڤایە، گوری دیرۆکڤان «ئیبن عبری» دناڤدایە، ئەڤێ لسالا ١٢٨٦ز مری. |
| ٥ | دێرا غاباتی «بیث عابی»[٢٤] | رەبان یەعقوبێ لاستومی | باشووری گوندێ «خربە شمال» رۆژئاڤایێ قەزا ئاکرێ | نەستوریێن کلدانی | چ ژ دێرێ نەمایە، بتنێ کاڤل و کۆمەکا گۆڕا کو بۆ دامەزرێنەر و رەبانێن بەراهیێ دزڤرن |
| ٦ | دێرا مار یاقویی یعقوب[٢٥] | مارئیشو عەباب نوهەزری سەدسالیا ٦-٧ز | دکەڤیتە گوندێ قەشەفرێ ل چیایێ بێخێری ل نێزیك قەزا سێمێلێ | نەستوریێن کلدانی | هاتییە نوژەنکرن ل سەردەستێ «ئرساليا دومینیکانی» سالا ١٨٥٠ز بەلێ پشتی رویدانێن ئەنفالا هاتییە کاڤلکرن |

ژ گەلەك گوند و تاخا پێكدهێت، ل دانسالێ هاڤینی دەمێ خۆ هەمیێ لجهێن هاڤینی دبۆرینن، زڤستانێ ژی ل زڤستانگەها (كۆزان) دبۆرینن، ژ تاخێن عەرەبا و تیرەیێن رەبیعە و مضرێ و یەمەنێ، زێدەباری تاخێن كوردا وەكی هەزبانی و حەمیدی و لاری)[١٣]. دیسان ئەو ل گوندێ گویزێ (گوندەكە دكەڤیتە دەڤەرا بەرێگارێ) د خۆجهن، ل چیایێن هەكاری ژی عەشیرەتا هەكاری هەیە كو ناڤێ ڤێ هەرێمێ ژ ناڤێ وێ عەشیرەتێ هاتییە[١٤].

زێدەباری ڤێ چەندێ كورد ل گوندێ (جنكجی) ئەڤا دكەڤیتە رۆژهەلاتێ مووسلێ دبەلاڤن، خەلكێ وێ ژ كوردێن باجەلانی نە [١٥]. دیسان ل چیایێ داسن ژی د خۆجهن، ئەڤێ دكەڤیتە باكوورێ مووسلێ ژ رەخێ رۆژهەلاتێ رووبارێ دیجلە، دبێژنە وان (تیرەیێن داسنی)[١٦]. بەلێ عەشیرەتا (حەمیدی) ل ئاكرێ یا خۆجهە، ژبەر ڤێ چەندێ دبێژنێ (عقر الحمیدیە) [١٧]. زێدەباری گوندێ شۆشێ[١٨] ئەڤێ دكەڤیتە رۆژهەلاتێ رووبارێ دیجلەی، كو ئێكە ژ كەلایێن عەشیرەتا حەمیدی، كو دكەڤیتە نێزیكی ئاكرێ یا حەمیدی (عقر الحمیدیە) بەلێ ژێ بلندتر و مەزنترە[١٩].

## تائیفێن دینی یێن بەربەلاڤ ل دەڤەرا بەهدینان ل سەردەمێ ئەمەوییان:

دگەل هاتنا سەردەمێ ئەمەوی، پتریا كوردا باوەری ب دینێ ئیسلامێ ئینابوو، ژبلی هندەك كوردا و خەلكێ دی «مەرەم ژێ تائیفێن دی یێن نە بووینە ئیسلام» كو ل سەر دینێن خۆ یێن كەڤن مابوون.

پتریا ژێدەرا د هەڤبیرن ل سەر هەبوونەكا مشە یا فەلا ل دەڤەرا بەهدینان، گرۆڤ ژی هەبوونا كۆمەكا دێر و كەنیسا ل سەر چیا و دەشتا دناڤبەرا گوند و باژێرۆك و باژێرا دا، ژ ناڤدارترینێن وان دێرا:

ژلایەكێ دووڤە، ژێدەرێن سریانی ئاڤرێ دەنە

ئاڤاكرنا چەند باژێر و گوندا ژ لایێ فەلاڤە، پاشی ل ڤان گوند و باژێرا خرڤەبووینە، هەتا نها ژی لێ د خۆجهن، وەكی: تكریت و دەوروبەرێن وێ، مووسل و باژێرۆكێن وێ باخدیدا «قەرەقۆش»، بەعشیقە، بەرتایێ، بازوایێ، باسخرا، بەحزانێ، بەتنایە، تلكێفێ، تلسقف، كرملیس، باقوفا، باتۆفانە، ئەلقوش، بانوهەدرا، ئاكرێ و كەرخ سلوخێ و شنگار و..هتد [٢٦].

دناڤ خەلكێ دەڤەرا بەهدینان دا «ژكەڤن» دو مەزهەبێن فەلا هەبوون، ئەو ژی: نەستۆری و موتەوەفستی «خودانێن ئێك تەخ- یەعقوبی»، هەر ئێك ژ ڤانا كەنیسە و دێرێن خۆ هەبوون ل جهێ ئەم ڤەكۆلینێ بۆ دكەین، مالتایێ و بانوهەزرا و مركا... هتد بەربەلاڤبوون[٢٧].

## كوردێن بەهدینان ل ژێر سیبەرا دەستەلاتا ئەمەوییان (٤١-١٣٢مش/ ٦٦٢-٧٥٠ز)ێ

پشتی شەهیدكرنا خەلیفە «عەلی كورێ ئەبو تالبی» ل سالا (٤٠مش/٦٦١ز)ێ، موعاویە كورێ ئەبو سوفیانی بوو خەلیفەیێ بوسلمانا، دەولەتا ئەمەوی ل سەردەستێ معاویەی هاتە دامەزراندن، ئەڤا هەتا سالا (١٣٢مش/٧٥٠ز)ێ دەستەلاتداری كری، دەمێ ل سەردەستێ عەباسیا بدووماهیی هاتیی، و دووماهیك خەلیفەیێ ئەمەوی «مەروانێ كورێ محەمەدی كورێ مەروانی» ل گوندێ «بەحصیر» سالا (١٣٢مش/٧٥٠ز)ێ ل باشوورێ مسرێ هاتییە كوشتن.

بۆ كوردا دەستۆدار گەلەك نەهاتە گوهورین، بتنێ كریارا بوسلمانبوونا جڤاكی كو بتەناهی برێڤە دچوو، بلەزتر لێ دهات و هەمی ئاستەنگ یێن رێ ل بەر كریارێ دگرت رامالین، ئەڤەژی ژ ئەنجامێ «فتوحاتێن ئیسلامی» ئەڤێن هەمی دەڤەرێن كوردی ڤەگرتین، ژ سەری بۆ خواری نەخاسمە ل سەردەمێ راشدییا[٢٨].

زێدەباری كو هندەك كوردا پشتەڤانیا هندەك بزاڤێن دژی خەلافەتا ئەمەویان دكر، نەخاسمە ل هندەك جها وەكی شەهرەزۆر و چەند جهێن دی، بەلێ پتریا كوردا بزاڤدكر بەرگریێ ژ «دەولەتا خەلافەتێ» بكەن، نەخاسمە دژی دوژمنێن وێ، بۆ نموونە كورد دڕێكا هێرشێن «خرزا» راوەستان[٢٩]، ئەڤێن ل سالا (١١٢ز)ی گەهشتینە نێزیكی دەوروبەرێن باژێرێ مووسلێ، بەلێ پشتی چەند سەدسالەكان هندەك بزاڤێن سیاسی ل جەم كوردان دەركەڤتن كو داخواز و گازیا ڤەگەراندنا خەلافەتا ئەمەویان دكر[٣٠].

ل ڤێرە پێدڤییە ئەم ئاڤرییەكێ بدەینە وی پویتەی ئەڤێ كوردا ب خەلیفەیێن ئەمەویان كری، نەخاسمە خەلیفە «یەزید كورێ موعاویەی» دەمێ سلاڤ دكرێ، گۆت (سلاڤ ل تەبن ئەی ئیمامێ دادپەروەریێ، سلاڤ ل تەبن ئەی خەلیفەیێ خودێ ل سەر ئەردی، سلاڤ ل تەبن ئەی پسمامێ پێغەمبەری، سلاڤ ل تەبن ئەی ئەمیرێ بوسلمانا «رحمة الله و بركاته» خودێ ب تاعەتێ تە فایدێ مە بدەت، مە بەتە ناڤ هەدارا «شەفاعەت» دا و پلەكا بەهەشتێ، وەكی مە ل دنیایێ هەلگرتی، خوتبەخوینێ وان دگۆت: یا خودێ تۆ ژ موعاویەیێ خال و یەزیدێ هەرە باش رازی بی[٣١].

ژ لایەكێ دووڤە هندەك ژێدەر دیاردكەن، كو كوردێن (شەهرەزۆرێ) لایەنگرێن خەلیفەیێ ئەمەوی «عومەرێ كورێ عەبدولعەزیزی ٩٨- ١٠١مش» بوون، ژبەركو ب عەدالەتا خۆ یێ ناڤدار بوو و كوتەكی «زولم» ژێ رەتدكرن[٣٢].

ژبەر كو وەلاتێ كوردا «كوردستان» دكەڤیتە دەڤەرەكا ئستراتیجی دا، لەشكەرێن داگیركەر بەردەوام وەكی رێكەكێ بكاردئینا ژ رۆژهەلاتی بەرەڤ رۆژئاڤایڤە. ژ بەرڤێ چەندێ ئەڤ دەڤەرە كەڤتە بەر ئاگرێ ڤان هێرشا. لسالا «١١٢مش/٧٣٠ز» ێ خزرا هێرشكرییە سەر هەرێما ئەرمینیا و ئەزەربێجانێ، دەستێ خۆ داناسەر، بەربەركێن لەشكەرێ وان گەهشتنە باژێرێ مووسلێ، تشتەكێ خۆرستییە گەهشتنا وان بۆ مووسلێ، رامانا وێ ئەوە كو لەشكەرێ وان د دەڤەرا بەهدینان را بوورییە و دەڤەر هاتییە خرابكرن، ژبەركو دەڤەرا بەهدینان كلیلكا رێكێ یە بو وانا یێ ژ ئەرمینیا و ئەزەربێجانێ ڤە بۆ مووسلێ دهێن[٣٣].

خەلیفەیێ ئەمەوی «هشام كورێ عەبدولمەلیكی ١٠٥_١٢٥مش/٧٢٣_٧٤٢ز»ێ پێرابوونێن دژوار گرتنەبەر دا كو هێرشێن وانا ب راوەستینیت، ل ڤێرە ئێك ژ سەركردا بناڤێ «سەعید كورێ عومەرێ حرشی» پالدا دا كو شەرێ وان بكەت، ئەو شیا ل بەرسینگێ وان راوەستیت، نەهێلا زێدەتر بهێن، پاشی گڤاشتن ئێخستنە سەر دا ژ دەڤەرێ دەربێخیت. دەڤەرا بەهدینان ژی كەڤتە بەر نەخۆشی و سەرەدەرییێن وان یێن دوژمنانە، بۆ ڤێ چەندێ «ئیبن ئەلكوفی» دبێژیت (ئەو ب چ باژێرێن جزیرێ دا نە دبووری، ڤیابا خەلكێ وێ كێشابا دناڤ شەری دا، ژ هەر باژێرەكی هندەك ل دووڤ گازیا وی دهاتن و ب تایبەت ئەوێن حەز ژ جیهادێ دكر[٣٤]) ، هەتا لڤینێن وی گەهشتینە باژێرێ ئەرزە [٣٥]. هژمارا وان زەلامێن گەهشتینێ ببوو نێزیكی «سیهـ هزار» زەلامان، پتریا وان ژی كورد بوون، پاشی «موجاهدێن» كوردا و خەلكێ دی شیان «هێزا وان بشكێنن» و هەمی مال و تشتێن بها یێن ژ خەلكی هاتینە دزین بۆ بزڤرینەڤە، نە هێلا «كورد و تورك» وەلاتێ خۆ بەردەن، ژبەركو وەكی مە گۆتی «كوردستان» رێكا سەرەكی بوو و ژ بۆ راوەستاندنا هێرشێن وان ل سەر توخیبێن دەولەتا ئەمەوی، زێدەباری ڤێ چەندێ ئەو ئانكو خزر د دیرۆكێ دا ب سیاسەتا كوشتنێ و رەڤاندنا ژنكا و زرییەتێ و دزینا مالێ خەلكی دناڤداربوون[٣٦].

## هەلویستێ كوردێن بەهدینان ژ بزاڤێن «دژی» دەولەتا ئەمەوی

ل سەردەمێ خیلافەتا ئەمەویان، گەلەك بزاڤێن دژی وێ پەیدابوون، هەكە خەلیفەیێن ئێكێ دهشیارنەبان و لەشكەرێ وان ب هێز نەبا، دا دەولەتا ئەمەوی ژناڤبەن، بەلێ ڤان بزاڤا گەلەك نەڤەدكێشا،

ژلی بزاڤێن ژ دەرڤە، کو ببوو ساخلەتەکا وی سەردەمی، د هەیامێ دەولەتا ئەمەوی دا، دژایەتییا خۆ بۆ دیاردکر، ژ بەرچاڤترین ڤان لڤینا:

## ئێك: بزاڤا (ئەلزەیدیە)
## ٦٤-٧٣م/ ٦٨٣-٦٩٢ز:

ئەڤ بزاڤە دزڤریتەڤە بۆ صەحابی «عەبدوولایێ کورێ زوبەیری کورێ عەوامی» ئەڤێ شۆرشەك ل مەکەهێ ب دژی رژێما خەلیفەیێ ئەمەوییان «یەزیدێ کورێ موعاویەی ٦١-٦٤مش/ ٦٨٠-٦٨٣ز» راگەهاندی، ل سەردەمێ خەلافەتا «یەزیدێ کورێ موعاویەی» رویدانا کەربەلا ١٠ موحەرەما سالا ٦١مش» ێ چێببوو، ئەڤا بوویە ئەگەرا شەهیدبوونا «حسینێ کورێ عەلی» و «مالباتا وی»، ڤێ چەندێ پتر دەنگێ خەلکی ل سەر دەولەتا ئەمەوی بلندکر، کۆمەکا شۆرش و سەرهەلدانا ب دژی وان رابوون، بەلێ چ ژوانا سەرکەڤتن نەئینا.

پشتی «یەزید» مری، «عەبدوولایێ کورێ زوبەیری» راگەهاند کو ئەو خەلیفەیێ بوسلمانایە، (بەیعە) ل (حجازێ و مسرێ و عیراقێ و جزیرێ) بۆ هاتەکرن[٣٧] ئەڤا کورد پتریا خەلکێ وێ پێکدئینیت، نەخاسمە ل پشکێن باشوورێ رۆژهەلاتی «دەڤەرا بەهدینان».

## دو: بزاڤا «موختار ئەلثەقفی»
## ٦٥-٦٧مش/ ٦٨٤-٦٨٦ز:

ئەڤ بزاڤە بۆ «موختار کورێ ئەبی عوبەیدێ ثقفی» دزڤریت، ئەڤا ب «موختار»یێ ناڤدار، ژ سەخلەتێن ڤێ بزاڤێ، دژایەتیکرنا دەولەتا ئەمەوی و جەڤەنگێ عەلەوییا ژێ بلندکرییە.

موختاری ب زیرەکاتییا خۆ چەند دەلیڤە دیتن، هەڤرکییا دناڤبەرا عەرەب و «مەوالی»یا دا ژلایەکیڤە، هەڤرکییا دناڤبەرا کەنکەنێن عەرەبا و سەپانێن «عبد» وان ژ لایەکێ دووڤە، شیا دەستهەلاتێ خۆ دانیتە سەر بازێرێ کوفە، نەخاسمە پشتی کوشتنا بکوژێن «حسێنێ کورێ عەلی» راگەهاندی.

پشتی موختاری دەستێ خۆ دانایە سەر بازێرێ کوفە، تۆبەدار «تەوابین» و عەشیرەتێن یەمەنییا بسەرکردایەتییا «ئەبراهیم کورێ مالکێ ئەشقەرێ نەحەفی» پشتەڤانییا خۆ بۆ دیارکر و هاتنە دگەلدا، زێدەباری موالییا «ئیرانیا»، سەرکەڤتە مینبەرێ و بەرنامێ خۆ بۆ خەلکی دیارکر، والیێن خۆ فرێکرنە «ئەرمینیا و ئازەربێجانێ و مووسلێ و چیایی» دا کو دەستەلاتێ ب ناڤێ وی بکەن.

ژبەرکو دەڤەرا بەهدینان ل وی سەردەمی سەر ب مووسلێ ڤەبوو، کەڤتە بن دەستەلاتا موختاری.

د وی هەیامی دا «مەروانێ کورێ حەکەمی کورێ عاصی» دەستەلاتا دیمەشقێ وەرگرت و بۆ خەلیفەیێ دەولەتا ئەمەوی، ل ڤێرە بریار دا لەشکەرەکێ ب هێز ب سەرکردایەتیا «عەبدوولایێ کورێ زیادی کورێ ئەبیە» بۆ هەرێما جزیرێ ب هنێریت، دا دەستەلاتا خۆ دانیتە سەر پاشی بەرەڤ دەڤەرێن «فوراتی»ڤە بچیت، دوژمنێن دەولەتێ دەربێخیت، کو پشتەڤانێن «موختاری و زوبەیری» ژ وانابوون[٣٨].

موختاری «عەبدولرەحمانێ کورێ سەعیدی کورێ قەیسێ هەمەدانی» هنارتبوو مووسلێ داکو ب ناڤێ وی دەستەلاتێ بکەت، بەلێ پشتی زانی کو لەشکەرێ ئەمەوییان گەهشتە مووسلێ، نامەیەك بۆ موختاری هنارت، موختاری گۆتێ «مووسلێ بهێلە و وەرە تکریتێ»، هەر دوی دەمی دا لەشکەرەك ژ سێ هزار شەرڤانان پێك هاتبوو، ب سەرکردایەتییا «یەزیدێ کورێ ئەنسێ ئەسەدی» هنارتە مووسلێ، بۆ نوینەرێ خۆ نڤیسی «بهێلە دناڤبەرا یەزیدی و وەلاتی دا»، پاشی «یەزید کورێ ئەنسی» دگەل لەشکەرێ خۆ بەرەڤ مووسلێ ڤە هاتن، ل باتلێ «بەرتلا نها ل رۆژهەلاتێ مووسلێ« مان، پاشی «عەبدوولایێ کورێ زیادی» دگەل لەشکەرێ خۆ بەرسینگێن وان گرتن، شەرەکێ مەزن دناڤبەرا هەردو لایادا قەومی، چەند رۆژا ڤەکێشا، سەرکەڤتن باهرا لەشکەرێ موختاری بوو، بەلێ ژ بەر نەخۆشکەڤتنا «یەزیدێ کورێ ئەنسی» نەگەهشتنە سەرکەڤتنا داویێ، ئەو بوو لەشکەرێ «موختاری» خۆ ڤەکێشا، ل سالا

(٦٧مـش/٦٨٦ز)ێ مووسل بجهـ هێلا، لەشکەرێ «عەبدوولایێ کورێ زیادی» هاتە دناڤدا[٣٩].

ژبەر ئەڤا چێبووی «موختاری» لەشکەرەکێ دی ب سەرکردایەتیا «ئیبراهیمێ کورێ ئەشقەری» هنارت، داکو هاتنا لەشکەرێ ئەمەوییان بۆ عیراقێ ب راوستینیت، ئەڤ سەرکردە شیا سەرکەڤتنێ ل سەر ئەمەوییان بینیت، د شەرەکی دا کو ل نێزیکی رووبارێ «خازری_ئێکە ژ جۆکێن ئاڤا زێ مەزن» ئەڤێ دکەڤیتە دەڤەرا بەهدینان، روودا بوو، ئەڤ شەرە ل رێکەڤتی «١٠ موحەرەمێ ٦٧مش/ ٦ تەباخا ٦٨٦ز»ێ چێببوو، سەرکەڤتن باهرا لەشکەرێ «موختاری» بوو، سەرکردێ لەشکەرێ موختاری «ئبراهیمێ ئەشقەری» شیا «عەبدوولایێ کورێ زیادی» بکوژیت، ژبەرکو ئەو ئەگەرێ سەرەکی یێ کوشتنا «حسێنێ کورێ عەلی» بوو، پاشی هەر ئێك ژ «حەصینێ کورێ نەمیرێ سکوینی» و «شەرحەبیلێ کورێ زی کلاعی» ژی هاتنە کوشتن، زێدەباری خەلکەکێ دی ژ «خەلکێ شامێ» بەلێ ئەڤێن رەڤین بن ئاڤ بوون[٤٠].

هوسا هەرێما «جزیرێ» کەڤتە بن دەستێ موختاری، کورێ ئەشقەری بەرەڤ مووسلێ ڤە هات، لایەنگرێن خۆ بۆ باژێرێن جزیرێ هنارتن، برایێ خۆ «عەبدولرەحمان» هنارتە باژێرێ «نەصیبینێ»، «سەفاحێ کورێ کروسی» هنارتە شنگارێ، «عەبدوولایێ کورێ موسلمی» هنارتە «میافارقینێ»، هاتە راسپاردن دا ل دووڤ بەرمایێن ئەمەوییان ب کەڤیت، ئەڤێن رەڤینە وێرێ و دناڤ کوردا دا ل دەڤەرێن چیایی ماین. هوسا «موختاری» دەستێ خۆ دانا سەر ژێدەرێن ژیانا ئابووری ل جزیرێ، هەمی پارێن جزیرێ بۆ دەمێ «هەژدە هەیڤا» بۆ وی دهاتنە خرڤەکرن[٤١].

## سێ: بزاڤێن «خەوارجا»

خەوارج وەکی ئێك گرۆپ مان، بەردەوام هزر و پرەنسیبێن «مبادئ» نوی بەلاڤدکرن، هەتا پشتی مرنا «یەزیدێ کورێ موعاویەی»ژی ل سالا ٦٤مش.

بەلێ پشتی وی دەمی هێدی هێدی ژێکڤەبوون، هەردەمێ ئێك ژ وان یێ هەڤبیر نەبا دگەل یێ دی، دا جودابیت و گرۆپەکێ تایبەت بۆ خۆ چێکەت، هەتا هژمارا وان گەهشتیە پتر ژ (٣٠) گرۆپا[٤٢]، ناڤدارترینێن وان ئەڤەنە:

١- ئەزارقی[٤٣].
٢- نەجدات[٤٤].
٣- بیهسی[٤٥].
٤- صفری[٤٦].
٥- ئەباضیە[٤٧].

## شۆرشێن «خەوارجا» ل دەڤەرا جزیرێ

ل دەمێ دەستەلاتا ئەمەوییان «خەوارجا» دەهان سەرهەلدان ب دژی خەلافەتا وان کرینە، بەلێ یا جهێ پویتەدانا مە، ئەو بزاڤێن ئەڤێ ل دەڤەرا «جزیرێ»چێبووین، ژبەرکو دەڤەرا بەهدینان پشکەکا گرنگە ژ لایێ رۆژهەلاتێ جزیرێ ڤە، زێدەباری کو رێکەکە بۆ گەهشتن بۆ دەڤەرا «شەهرەزۆرێ» کو ئێك ژ کەلایێن هەرەگرنگێن «خەوارجا» بوو. کوردا ژی وەکی هەمی مللەتێن دی یێن خۆجهـ ل دەڤەرا جزیرێ، پشکداری د ئەڤان بزاڤا دا کربوو، ئەڤ چەندە ب روهنی د دەقەکی دا دیاردبیت، ئەڤا «ئیبن مهلهلی» ل سەر شەهرەزۆرێ نڤیسی، دبێژیت: خەلکێ وێ ل سەر سولتانی د یاخی نە، دو بەرەکی گرت و خۆ دا رەخەکی[٤٨]. دیسان دبێژیت: کوردا خۆ ب سەر میرا ئێخست، گوهداریا خەلیفەیان نەدکر[٤٩].

(ئیبن عەبد رەبە) پەسنا جزیرێ و لایەنگریا وێ دکەت، دبێژیت: جەزیرە هەردەما پشتەرێ یە[٥٠].

ئەڤ چەندە بۆ ئەگەرا بەلاڤبوونا «خەوارجا» دناڤ کوردا دا، «مەسعودی» ڤێ چەندێ پشتراستدکەت، دەمێ دبێژیت: رەئیا هندەك کوردا وەکی رەئیا خەوارجایە، بێ گونەهبوون ژ هەردو

خەلیفا «عوسمان و عەلی» خودێ ژێ رازیبیت[51]. دیسان «ئەلدوەیهی» پتر ڤێ چەندێ روهن دكەت، دەمێ دبێژیت: پتریا خەلكێ وێ خەوارجن[52].

## ١-بزاڤا «شەبیب كورێ یەزیدێ شێبانی» خەوارجێن صفری

د دەمەكیدا كو خەوارجێن «ئەزرەقی» گەف ل باژێرێ بەصرا دكرن، خەوارجێن صفری گەفا خۆ دانابوو سەر باژێرێ كۆڤە، گەفێن وان ژی ژ دەڤەرا مووسلێ و جزیرێ ڤە دهاتن، هەر ژ سالا «٧٦مش/ ٦٩٥ز» ێ ب سەركردایەتییا هەر ئێك ژ «سالحێ كورێ مەسرەحێ تەمیمی» و «شەبیب كورێ یەزیدێ شێبانی» ب سەر عیراق و دەڤەرا جزیرێ دا گرت، پشتی ل سەر لەشكەرێ ئەمەوی دا سەركەڤتین، نەخاسمە ئەڤێن بەرسینگێ وانا دگرت. وانا هاتن و چوون دناڤبەرا باژێرێن (شنگار و دارا و نەصیبین و ئامەد و داقوقێ) دا دكر، داكو «دەعوا» خۆ دناڤ خەلكی دا بەلاڤ بكەن[53].

دیارە كو هێزا وان هێشتا پێدڤی ب شیانێن مەزن هەبوو، داكو پتر بشێن دەستەلاتا خۆ ب سەپینن، مەرەم ژێ بجهئینانا سەركەڤتنێن بلەزبوو، داكو دەولەتا ئەمەوی بێ هێزبكەن[54].

ژلایێ خۆڤە ئەمەویان هێزێن «شامێ» تەرخانكرن داكو بەرسینگێن خەوارجێن «صفری» بگرن، ژبەركو هێزێن عیراقێ نەشیابوون هەڤركییا وان بكەن. «حەجاجی» بخۆ چەند كریارەكێن «هەڤركی و بەردانە ب دووڤە كرن، شیا كۆمەكا سەركەڤتنا سەر واندا بینیت، دووماهی سەركەڤتن شەرێ رووبارێ «دجیل ٧٧مش/٦٩٦ز» بوو، ل ڤێرە هێزێن خەوارجا ب سەركردایەتییا «شەبیب كورێ یەزیدی» ب رێكا پرەكا گەمییا كو ل سەر رووبارێ هاتبوونە دانان پاشڤەهاتن، «شەبیب» بخۆ ژی كەسێ ئێكێ بوو كو پاشڤەكشیای، و دەمێ بزاڤدكر ژ رووبارێ دەربازبیت بن ئاڤبوو[55].

د قۆناغێن پاشتردا كورد و خەوارجان د بزاڤێن خۆ یێن سیاسی دا بێدەنگی هەلبژارت، نەخاسمە ل سەردەمێ خەلافەتا «عومەرێ كورێ عەبدولعەزیزی» دیارە گرێدانێت كوردا دگەل ئەڤی خەلیفەی گەلەك دباشبوون، دیسان خەوارج دناڤبەرا خۆدا خرڤەببون و گۆت بوو (ل سەر مە نینە ئەم شەری دگەل ڤی زەلامی بكەین)[56].

## ٢_ بزاڤا «سەعیدێ كورێ مەجدەلێ شێبانی»

پشتی «سەعیدێ كورێ مەجدەلی» یاخیبوون دژی دەولەتا ئەمەوی ل سالا ١٢٦مـش/٧٤٣ز ێ راگەهاندی، ئەو بەرەڤ دەڤەرا «قردێ» یان «جزیرا ئیبن عومەر_بۆتان»ڤە چوو، وی دەمی دگۆتنێ «جزیرا كوردا»، دیسان «دەڤەرا مەرج» یان «ناڤ كور»، ل ڤێرێ نێزیكی «پێنج سەد» زەلاما گەهشتنێ، زێدەباری «دوسەد» زەلامێن دی ژ خەلكێ جزیرێ بخۆ گەهشتنێ، هوسا بەرەڤ مووسلێ ڤە چوو، بەلێ خەلكێ وێ داخواز ژێ كر كو بچیت، رازیبوون داێ و پاشی بەرەڤ شەهرەزۆرێ ڤە چوو[57].

وەسا دیارە كو چوونا كوردان بۆ ناڤ رێزێن خەوارجا د وی دەمیدا بوو كو خەوارجا دەست بجهئینانا رەنگەكێ دی یێ سیاسەتێ كر، ئەو ژی وەرگرتنا هەركەسێ بڤێت بچیتە دناڤدا، ل دووڤ گۆتنا خۆ «هەركەسێ دژی مە نەبیت ئەو دگەل مەیە»، ل ڤێرە هژمارەكا مەزنا خەلكی گەهشتێ، كو بەری وی دەمی هژمارەكا كێم بوون[58]، رۆژهەلاتناسەك ل سەر ڤێ چەندێ دبێژیت (جەزیرە مەزنترین ناڤەند بوو كو هەمی توخمێن شۆرشگێران لێ خرڤەدبوون، و ئەو دبەرهەڤبوون كو برەنگەكێ بەردەوام دگەل سەركردەی دا بمینن)[59].

## ٣_ شۆرشا «ضحاكێ كورێ قەیسێ شێبانی»

پشتی دوبەرەكی دبنەمالا ئەمەوییاندا چێبووی، «مەروانێ كورێ موحەمەدی» شیا خۆ بكەتە خەلیفەیێ ئەمەوییان، دوبەرەكییا وان دوبەرەكی ئێخستە دناڤ تیرەیێن عەرەبان ژی دا، هندی كو

«قەیسی» بوون چوونە دگەل دا، بەلێ «یەمەنی» چوونە دگەل هەڤرکمانێن وی، نەخاسمە یێن بنەمالێ.

ل دەمێ خەلیفە «مەروانێ کورێ موحەمەدی» پێکۆل دکر جهێ خۆ بهێز بێخیت، داکو هندەك شەرا ب دژی کەسێن بنەمالێ بکەت، خەوارجێن عیراقێ دەلیڤە دیت و شۆرشەك ب سەرکردایەتیا «ضحاکێ کورێ قەیسی» راکر، نەخاسمە مژوولیا مەروانی دگەل لایێن دی بۆ خۆ ب دەلیڤە دیت[٦٠].

بزاڤا «ضحاکی» پتر بهێز کەڤت، نەخاسمە دەمێ هندەك ئەمەوی بخۆ چووینە دناڤدا، وەکی «سلێمانێ کورێ هیشامی کورێ عەبدولمەلیکی»، خەلکێ مووسلێ داخواز ژێ کر بهێتە دەڤ وان، ئەو ژی چوو مووسلێ و لایەنگرێن وی پتر لێ هاتن، هەتا بووینە پتر ژ «سەدهزار» کەسان، و ئەڤە جارا ئێکێ بوو کەسەکێ «خەوارج» بشێت هند مرۆڤان کۆمڤەبکەت، نەخاسمە ل سەردەمێ ئەمەوییان[٦١].

مەروانی ژ حمصێ ئاگەهـ ژ شۆرشا «ضحاکی» بوو، نامەیەك بۆ کورێ خۆ «عەبدوولایی» هنارت، کو وی دەمی ل جزیرێ بوو، داخواز ژێ کر بەرەڤ نسیبینێ بچیت، دا کو بەرسینگێن «ضحاکی» بگریت و نەهێلیت بچیتە دەڤەرا «جەزیرا فوراتی»، هوسا ئەو ب «هەشت هزار» شەرڤاناڤە چوو، بەلێ «ضحاك» شیا هێزێن «عەبدوولایێ کورێ مەروانی» دووریێچ بکەت، «مەروان» نەچاربوو کو د تانا کورێ خۆ بچیت، و شەرەکێ دژوار دناڤبەرا هەردو لایادا ل نێزیکی بازێرێ «کفرتونا نێزیکی مێردینێ« قەومی، خەوارج هاتنە دووریێچکرن، «ضحاك» هاتە کوشتن، مەروانی سەرێ وی فرێکرە «مەدائینا جزیرێ« و دەوروبەرێن وێ. پشتی «چحاك» هاتیە کوشتن، خەوارجا بۆ خۆ سەرکردەکێ دی بناڤێ «خنیری» هەلبژارت، بەلێ ئەو ژی هاتە کوشتن، پاشی یێ سیێ ب ناڤێ «شیبانێ کورێ عەبدولعەزیزێ حروری» هەلبژارت، زاڤایێ «سلێمانێ کورێ هشامی» بوو، ژێ داخوازکر بەرەڤ مووسلێ ڤە بچیت، ئەو دگەل «چل هزارا» بەرەڤ مووسلێ ڤە چوون، بەلێ «مەروان» شیا پشتی شەرەکێ مەزن کو شەش هەیڤا ڤەکێشای و دهاتە گۆتن کو نەهـ هەیڤا ڤەکێشایە ب سەرکەڤیت و وانا بشکێنیت، «شیبانێ کورێ عەبدولعەزیزی» بەرەڤ سجستیانێ رەڤی، و ل سالا ١٣٠مش/٧٤٨ز وەغەرکرییە[٦٢].

هەرچاوابیت هەلویستێ کوردا ژ بزاڤێن «خەوارج» و «مەروانێ کورێ موحەمەدی» نە دجهگیربوون، هندەك جارا لایەنگری بۆ دکر، هندەکێن دی ژی دچوونە دناڤ شۆرشێن خەوارجادا، نەخاسمە شۆرشا «ضحاکی»، پشکا ئێکێ ئەڤا خۆ نێزیکی «مەروانی» دکر، ل سەر بنیاتێ وێ چەندێ بوو کو دەیکا «مەروانی» کورد بوو. ئەو ژی جارییەکا «ئیبراهیمێ کورێ ئەشقەرێ نەحەفی» بوو، سەرکردێ ئەمەوی «موحەمەدێ کورێ مەروانی» د شەرێ دجێلدا «ئیبراهیم» کوشت و ئەو ژنە دگەل خۆدا ئینا، کورێ وێ «مەروان» داوی خەلیفەیێ ئەمەوییا بوو.

# ژێدەر و پەراوێز

١. جان موريس فييه الدومينيكي، آشور المسيحية إسهام في دراسات التاريخ و الجغرافية الكنسية الرهبانية في شمال العراق، ترجمة: نافع توما، مراجعة و تدقيق: يوسف توما، (بغداد - ٢٠١٣)، ج٢، ص ٣٢٤-٣٢٥.

٢. نوهدرا- باهدرا- باهدرێ: ئەو دبنواش دا ژ دەڤەرا (كورا مووسلن). ابن خرداذبة: المسالك و الممالك، ص ٩٤؛ الاصفهاني: الاغاني، ج٦، ص ٢٨٤؛ پشتی وێ «ياقوت الحموي» كو ئێكە ژ دەڤەرێن مووسلێ يە بەلێ بناڤێ «باهدرا» هاتيە.

٣. توما اسقف المرج: كتاب الرؤساء، عربه و وضع حواشيه: البيرابونا، (د.م_د.ت)، ص ٦٠ هامش (١). دەڤەرا كەنيسيا بانوهەدرا كەڤن ژ زێ مەزن وەكی باشوور دەستپێدكەت هەتا دگەهيتە نێزيكی گوندێ هلمون «توخيبێن عيراقێ و توركيا» وەكی باكوور، بەلێ توخيبێن مينوفيزينی «سريانيێ ئارسودوكسی» ل نيڤا دووێ يا چەرخێ شەشێ و دەستپێكا چەرخێ حەفتێ زايينی توخيب دكەن و دابەش دكەنە سەر دو پشكا: ل باشووری دەڤەرا نەينەوا يە، دەڤەرا بانەهەدرا كو گوندێ مالتايێ (ئەڤێ نۆكە دكەڤيتە دناڤ مەلبەندێ بازێرێ دهۆكێ دا) پايتەختێ وێ بوو، ئەم ناڤێن قەشێن وێ دزانين ژ مەعجەما سالا ٤٠١ز، هەمان ژێدەر.

٤. داسن: چيايەكێ مەزنە دكەڤيتە باكوورێ رۆژهەلاتا مووسلێ، گەلەك كوردێن ل وێرێ هەين دبێژنێ (داسن)، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ج٢، ص ٤٣٢.

٥. حبتون: چيايەكە دكەڤيتە دەوروبەرێن مووسلێ، ياقوت، ج٢، ص ٢١١.

٦. ليرخ: دراسات حول الاكراد، ص ١٤-١٥؛ دەڤەرێن كوردا ل وەلاتێ جزيرێ ب كاردوخيا «kardochia» يا ناڤداربوو، دگۆته خەلكێ وێ كاردوخی، بنێرە: زينفون: الاناباسيس او حملة عشرة الاف (حملة على فارس)، ترجمة: يعقوب افرام منصور، (موصل_١٩٨٥)، ص ١٦٦-١٨١.

٧. المقدسي: احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص ١٢١-١٢٢. د ژێدەرێن سريانی دا برەنگێ «ئاتور» هاتيە، رامانا وێ د زمانێ سريانی دا «وەلات»، ل سەر ڤێ چەندێ كو وەلاتێ كوردا د بنواشدا وەلاتێ رەسەنێ ئاراميێن كەڤنە لدووڤ ديتنا هندەكا و هندەكێن دی دبينن كو وەلاتێ ئاشووريا يێ كەڤنە، بنێرە: ابن العبري: تاريخ الزمان، نقله الى العربية: اسحاق ارملة، قدم له: جان موريس فيية، دار المشرق، (بيروت-١٩٨٦)، ص ١٠-٣٧-٣٩-١٩٨.

٨. ابن حوقل: كتاب صورة الارض، ص ١٨٩؛ ابن فقيه الهمداني: مختصر البلدان، ص ١٢٣؛ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ج٢، ص ٥٤.

٩. ابن خرداذبة: المسالك و الممالك، ص ٥٨؛ ابن الفقيه: مختصر البلدان، ص ١٢٥؛ ابن شداد: الاعلاق الخطيرة في ذكر ملوك الشام و الجزيرة، تحقيق: يحيى عبارة، ج٣، ق١، ص ٤.

١٠. شاكر خصباك: العراق الشمالي دراسة في نواحيه الطبيعية و البشرية، (بغداد: مطبعة المعارف-١٩٧٣)، ص ٧٥.

١١. عباس العزاوي: عشائر العراق الكردية، (بغداد: مطبعة المعارف_ ١٣٦٦ه/ ١٩٤٧م)، ص ٤٠٦.

١٢. پەرتووكا «صورة الارض»، ص ٢٤٠. «صرود» و كتا وێ «صردة» رامانا وێ دەڤەرێن سارن، بنێرە: هەژار موكريانی: فەرهەنگی كوردی- فارسی، ل ٤٠٦. «جروم» كتا وێ «جرمة» و رامانا وێ گەرمە، بنێرە: گيوی موكريانی: فەرهەنگا مهاباد، ل ٥١٠.

١٣. ابن حوقل: صورة الارض، ص ١٩٥

١٤. ياقوت الحموي: معجم البلدان، ١٥٢/٢، ٤٠٣/٥-٤٠٨.

١٥. ياسين العمري: منية الادباء في تاريخ الموصل الحدباء، تحقيق: سعيد ديوجي، (بغداد/ مطبعة الهدف-١٩٥٥)، ص ١٤٠.

١٦. ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٤٣٢/٢، ٥٣٨.

١٧. نۆكە ناڤەندا قەزا ئاكرێ يە و كورد دبێژنێ (ئاكرێ).

١٨. گوندەكە دكەڤيتە «رۆژهەلاتێ ئاكرێ» هەتا نۆكە ژی كورد لێ دخۆجهن، بەلێ هندەك ژێدەرێن سريانی ئاڤرێ دەنێ كو گوندەكێ فەلا بوو، ناڤێ وێ «شلمث باشوش» بوو، پاشی كورد شيان بكەنە گوندەكێ كوردی، بنێرە: جان فيية الدومينيكي: اشور المسيحية و اسهام في دراسات التاريخ و الجغرافية الكنيسية و الرهبانية في شمال العراق، ترجمة: نافع توما، مراجعة و التدقيق: يوسف توما، (بغداد-٢٠١١)، ج١، ص ٢٠٢-٢٠٤.

۱۹. ابو النداء: تقويم البلدان، ص ۳۳۵.

۲۰. فرست مرعي: دراسات في تاريخ اليهودية و المسيحية في كردستان. (اربيل/ دار اراس-۲۰۰۸)، ص ۷٤.

۲۱. سهيل قاشا: اصول النصارى في خلافة بني امية، (بيروت: مركز التراث العربي المسيحي- ۲۰۰۵م)، ص ۵۰٦.

۲۲. المرجع نفسه، ص ۵۰۵-۵۰٦.

۲۳. يوسف حبي: المرجع السابق، ص ۱۰۹-۱۱۰.

۲٤. فرست مرعي: المرجع السابق، ص ۷٤.

۲۵. سهيل قاشا: اصول النصارى في خلافة بني امية، ج۲، ص ۲۲۱-۲۲. ژ هەژی گۆتنێ یە کو هندەك ژ ڤان باژێرۆکێن کەڤن بۆ کوردا دزڤرن ژبەرکو دکەڤنە دناڤ دەڤەرێن کوردی دا، هەبوونا کەنیسە و دێرا لڤان گوندا گرۆڤەکە بۆ لێبۆرینا کوردی نەخاسمە پشتی بوسلمان ژی بووین.

۲٦. جان فيية الدومينيكي: اشور المسيحية، ج۲، ص ۷۸۰ و پێن پشتی وێ. ل ڤێرێ ئاڤرێ دەتە چەند کەنیسەکا کو گرێدایێ نەستوریانە، وەکی دێرا «هورمزی» ل ئەلقوشێ، دێرا «ماریاقویی» ل باکوورێ رۆژئاڤایێ دهۆکێ، دێرەبوونێ ئەڤا دکەڤیتە نێزیکی چیایێ بێخێری، دێرا «مارمەتی» یا سریانا ئەڤا دکەڤیتە سەر چیایێ مەقلوبی.

۲۷. فرست مرعي: كردستان في القرن السابع الميلادي. (سليمانية: مركز كردستان-۲۰۰٦)، ص ۲۰۳.

۲۸. خزر: چیایەکێ مەزنە ل ترکیا، وەلاتێ وان دکەڤیتە دناڤ دەرگەهێ دەرگەهان، دبێژنێ «دەربەند» (دەڤەرا قەوقاز ل سەر لێڤا دەریایا قەزوینێ)، هەر مللەتەکێ ژوان «حاکمێ» خۆ هەبوو، بنێرە: القزويني: اثار البلاد و اخبار القباد، ص ۵۸٤.

۲۹. ب رەنگەکێ روهن کوردا پشتەڤانیا خۆ بۆ دەولەتا ئەمەوی دیارکری، نەخاسمە پشتی دەرکەڤتنا «تەریقەتا صوفیگەریا عەدەوی» ئەڤا دەستودارەکێ (سیاسی) وەرگرتی و ل هەمی دەڤەرێن دەولەتا ئەمەوی بەلاڤبووی. بۆ پتر پێزانینا بنێرە: الغوطي: الحوادث الجامعة و التجارب النافعة في المائة السابقة، تحقيق: احسان عباس، (بيروت-د.ت)، ج۱، ص ۳۳٤-۳۳۵.

۳۰. الوهراني، ركن الدين محمد بن محمد بن محرز: منامات الوهراني و مقاماته و رسائله، تحقيق: ابراهيم شعلان، مراجعة: عبدالعزيز الاهواني، (قاهرة: دار الكتاب العربي لطباعة و النشر)، ص ٥٤_٥٥.

۳۱. ياقوت الحموي: معجم البلدان، ج۲، ص ۳۷۵؛ ابن المهلهل: الرسالة الثانية، ص ۱۹.

۳۲. الازدي: تاريخ الموصل، تحقيق: احمد عبدالله محمود، (بيروت: دار الكتب العلمية- ۲۰۰٦)، ج۱، ص ۲۰۰-۲۰۱.

۳۳. ابن اعثم الكوفي: كتاب الفتوح، حيدر اباد الركن، ج۸، ص ٤۵.

۳٤. ئەرزەن: باژێرەکێ کوردی یە دکەڤیتە داویا وەلاتێ کوردا ئەڤا هەڤتوخیب دگەل رۆما «ترکیا نۆکە».

۳۵. ابن اعثم الكوفي: الفتوح، ج۸، ص ٤۲.

۳٦. المسعودي: التنبيه الاشراف، ص ۲۸۲؛ ابن اعثم الكوفي: الفتوح، ج٦، ص ۲۲.

۳۷. فرست مرعي: الدولة الاموية عوامل الظهور و اسباب السقوط، (صنعاء: الوان الطباعة-۱٤۲۱م/۲۰۰۰ز)، ص ۱۷۲.

۳۸. ابن الاثير: الكامل في التاريخ، ج۲، ص ۳٦۵-۳٦٦؛ اليعقوبي: تاريخه، ج۲، ص ۱۷۵-۱۷٦.

۳۹. اليعقوبي: تاريخه، ج۲، ص ۱۷۵-۱۷٦.

٤۰. ابن الازرق الفارقي: تاريخ ميافارقين، ص ۲٤؛ الدينوري: الاخبار الطوال، ص ۲۹۹.

٤۱. الاشعري: مقالات الاسلاميين، ج۱، ص ۱۵۷ و ما بعدها.

٤۲. ئەزرافی: ئالیگرێن «نافعێ کورێ ئەزرەفی»نە، دژوارترین گرۆپ بوو د هزرکرنێ دا، حەزا کوشتنێ هەبوو، هەر کەسێ نەچیتە دناڤ دا ب «کافر» دزانن، مال و خوینا یێ بەرامبەر «حەلال» دکەن. المصدر السابق، ۱/ ۱۵۸.

٤۳. نەجدات: ئالیگرێن «نەجدە کورێ عامرێ حەنەفی»نە، دژواریا وان ژ ئەزرافیا کێمترە، گەلەك «تەکفیرێ» نادەنە یێ بەرامبەر و ناکوژن. هەمان ژێدەر، ۱۵۷/۱.

٤٤. بیهسی: ئالیگرێن «بیهسی» نە، ناڤێ وی «هەیصەم کورێ صابری»یە ژ بنەمالا «سەعەد کورێ صەبیحە کورێ قەیسی» یە، دژواریا وان یا کێمە هەکە هەڤبەری بکەین دگەل ئەزارفا، ئەڤێن دگەل بیروباوەرێن وان دا نەبن ب «منافقين» دزانن، کوتەکی ل سەر جیران و ژن و میراتێ وان دکر. بنێرە: ابن قتيبة: المعارف، ص ٦۲۲؛ الاشعري: مقالات الاسلاميين، ۱۷۷/۱.

٤٥. صفری: ئالیگرێن «زیادێ کورێ ئەصفەری»نە، ئەو دژی کوتەکێ نە ل سەر بچویکا وەکی ئەزرافی دکەن. الاشعري: هەمان ژێدەر، ١٦٩/١.

٤٦. اباضیة: ئالیگرێن «عەبدوولایێ کورێ ئەبازی»نە، ژ ئەزارفا دهێنە جوداکرن، کو ئەو دگەل وێ چەندێ نینن خەلك بەرسینگێن دەسەلاتێ ب «شیری» بگرن، بەلێ وان دڤێت «ائمة الجدر» ژ ناڤبەن، هەرکەسێ ژ وان بڤێت ببیتە «ائمة» ب شیری یان هەر رنکەکا هەبیت. هەمان ژێدەر، ١٨٩/١.

٤٧. الرسالة الثانية، ص ١٨_١٩.

٤٨. هەمان ژێدەر، ص ١٩_٢٠.

٤٩. العقد الفريد، ج٧، ص ٢٤٠.

٥٠. مروج الذهب و معادن الجوهر، ج٢، ص ٢٥١.

٥١. فائزة محمد عزت: الكرد في اقليم الجزيرة و شهرزور في صدر الاسلام، (دهۆك: مطبعة خاني_د. ت)، ص ١٥٠. هاتییە وەرگرتن ژ دەستنڤیسەکا پەرتووکا «عجائب البلدان و الجبال و الاحجار»، ورقة ٧٥_٧٦.

٥٢. المبرد: الكامل، ج٢، ٢٥٤.

٥٣. فرست مرعي: الدولة الاموية، ص ١٥١_١٥٢.

٥٤. الطبري: تاريخ الرسل و الملوك، ج٦، ص ٢٧٩_٢٨١.

٥٥. الدميري: حياة الحيوان الكبرى، ج١، ص ٦٩.

٥٦. خليفة بن خياط: تاريخ، ص ٣٧١_٣٧٢؛ الازدي: تاريخ الموصل، ج٢، ص ٦٠.

٥٧. فلهاوزن: الخوارج و الشيعة و الاسرائيليات، ص ١٠٥.

٥٨. ادم متز: الحضارة الاسلامية في القرن الرابع الهجري، ترجمة: محمد عبدالهادي ابو ريدة، (بيروت_د.ت)، ج٢، ص ٦٨.

٥٩. الطبري: تاريخ الرسل، ج٧، ص ٣٤٥؛ الازدي: تاريخ الموصل، ج٢، ص ٦٩.

٦٠. ضحاك ل سەردەستێ ئەمەوییا ل مووسلێ هاتە کوشتن (قطران کورێ ئەکمەی)، هوسا مووسل و دەوروبەرێن وێ کەڤتنە دەستێ خەوارجادا، ئەڤە ژی گرۆڤەکە کو دەڤەرا «بەهدینان» کەڤتبوو ژێر دەستهەلاتا «ضحاکی» و زەلامێن وی، بەری بهێتە کوشتن ل سەر دەستێ مەروانی.

٦١. الطبري: تاريخ الرسل، ج٧، ص ٣٨٥؛ ابن الاثير: الكامل في التاريخ، ج٥، ص ٣٥٥.

٦٢. المسعودي: مروج الذهب، ج٤، ص ٧١؛ ابن الكثير: البداية و النهاية، ج١٠، ص ٤٦، ژێدەر ئاڤرێ ددەنە ناڤێ وێ «ئەزیا»یە و هندەك دبێژن «لباية»، رۆژهەلاتناسەك ب ناڤێ «وليەم موير» دبێژیت: مەروانییان شیناتییا چاڤێن خۆ ژ شیناتییا چاڤێن دەیکا خۆ وەرگرتبوون.

# بەهدینان ل سەردەمێ عەباسیێ «دەستپێكێ»

پ.د.فەرسەت مەرعی
زانكۆیا زاخۆ-كولیژا زانستێن مرۆڤایەتی
وەرگێران: كۆڤان ئیحسان

خەلافەتا عەباسی د سەدسالیا ئێكێ یا ژیێ خۆ یێ درێژدا، د چەرخەكێ زێریندا یێ كو دبێژنێ (سەردەمێ عەباسیێ ئێكێ) دناڤبەرا سالێن (١٣٢ - ٢٣٢مش/٧٤٩ - ٨٤٦ز)ێ بووریە، ئەو چەرخێ شارستانیەتا وان تێدا گەهشتی و تمامبووی، پەیڤا ئێكێ و داویێ یا «خەلیفەیێ عەباسی» بوو، هەكە چەند دەستەلاتێن زەلام و هاریكارێن خۆ بەرفرەهـ كربان، بەلێ هەردەم ژی چاڤدێریا وان دكر، هەكە هات و گومانەك بۆ ژێ كربا دەملدەست دەستەلاتێن وان ژێ وەردگرتن، پتریا زەلامێن دەولەتێ ژ نەتەوا (عەرەبا) بوون، فارسێن ئیرانێ و كورد و دلێما و خەلكێ دی ژی هاریكاریا وان دكر، وان هندەك پلە «مناصب» د دەولەتێ دا وەرگرتبوون، و نڤیسەرێن دیوانان بوونە، وەكی ئەركێ بجهئینانا سیاسەتا خەلافەتا عەباسی، ئەوا ل دەمێ «دەعوا» عەباسی پێ دكرە گازی، ئەو ژی «یەكسانی دناڤبەرا توخمێ ئیسلامێ»دا بوو.

ب رەنگەكێ گشتی ئاخفتن ل سەر دیرۆكا كوردا ل سەردەمێ عەباسی، لێگەری دكێشیتە سەر ناڤێ ئێك ژ سەركێشێن عەباسیا ئەو ژی «ئەبو موسلمێ خوراسانیە كو ل سالا ١٣٧مش/٧٥٤ز مریبە»، هندەك ڤەگێران وی بۆ بنیاتەكێ كوردی دزڤرینن، بنیاتێ ڤان ڤەگێرانا ژی هندەك «بەیتێت شعرێ نە كو «ئەبو دەلامەی» نڤیسینە[1] دەمێ خەلیفەیێ عەباسی «ئەبو جەعفەرێ مەنصوری ١٣٥- ١٥٨مش/٧٥٢-٧٧٤ز» ئەبو موسلمێ خوراسانی كوشتی:

**ابا مجرم ما غير الله نعمة**
**على عبده حتى يغيرها العبد**
**أفي دولة منصور حاولت غدره [2]**
**الا ان اهل الغدر اباؤك الكرد[3]**

كێم ڤەگێران هەنە، بەحسێ پشكداریا كوردا د ژیانا سیاسی دا ل وی سەردەمی دكەن. ئەڤ دەستوداره ل سەر لایێ لەشكەری ژی دهێتە سەپاندن، ژێدەر د ئەڤی چارچۆڤەی دا وەكی پێدڤی دتانا مە ناهێن، بتنێ ژلایێ جڤاكیڤە نەبیت، «طبری» ڤەگێرانەكێ ڤەدگوهێزیت: كو خەلیفە «ئەبو جەعفەرێ مەنصوری» جاریەكا كوردی كڕیبە و ل دەڤ وی خۆشتڤی بوویە، كورێ وی «جەعفەرێ بچویك» ژێ

بوویە، خەلكی دگۆتێ (كورێ كوردیێ) [٤].

ل سەر وان ڤەگێرانێن بەحسێ پشتەرێبوونا كوردان ژ خەلافەتا عەباسی دكەن، «طبری» ئێك ژ ڤان ڤەگێرانا ل سەر رووادنێن سالا (١٤٨مش/٧٦٥ز)ێ ڤەدگوهێزیت: خەلیفە ئەبو جەعفەرێ مەنسوری «خالد كورێ بەرمەكی» كرە والیێ مووسلێ، دا ڤی باژێری ئێمنكەت، چ ئاڤرێ نادەتە «كوردا» كو ئێمناهیێ تێكددەن[٥]، بەلێ «ابن الاثیر» د رووادنێن سالا (١٤٨مش/ ٧٦٥ز)ێ ئاڤرییەكێ ددەتە ڤان رووادنا دەمێ دبێژیت مەنسوری «خالدێ كورێ بەرمەكی» دانا سەر مووسلێ، كو كورد ل وێرێ بەلاڤەببوون و دەست ب خرابكارێ كربوو، گۆتی كی دێ چیتە شەرێ وان، گۆتن «موسیبێ كورێ زوهێری»یە، بەلێ عمارە كورێ عەمرەی ئاڤرییەك دا خالدێ كورێ بەرمەكی، خەلیفەی ئەو ب وی ئەركی راسپارد و بەرێ وی دا وێرێ، بۆ خەلكێ باشبوو، خرابكار شكاندن و راوستاندن، خەلكێ وێرێ گەلەك ژێ دترسیان....)[٦].

ل ڤێرە پێدڤییە ئەم بزانین كو دەمێ «طبری» بەحسێ رووادنێن سالا (١٥٨مش/ ٧٧٤ز)ێ دكەت، نەخاسمە دەمێ «خالدێ كورێ بەرمەكی» بوویە والیێ مووسلێ، چ بەحسێ «یاخیبوونا» كوردا تێدا ناكەت[٧]. بەلێ یا «ابن الاثیری» بەرۆڤاژی ڤێ چەندێیە، ئاڤرێ ددەت كو كورد ل وێرێ بەلاڤبووینە، زێدەباری رێكخستنا كاروبار و دەستوداریێ ویلایەتێ ژ لایێ خالدێ كورێ بەرمەكی ڤە[٨]، ژ «ئەحمەدێ كورێ محەمەدی كورێ سوارێ مووسلی ڤەدگوهێزیت دەمێ دبێژیت: ((میرەكێ وەكی خالدی بۆ مە نەهاتییە، گەلەك ل سەر مە دگڤێشیت، دەستوداری مووسلێ باشبوو، كورد ژێ هاتنە دەرێخستن، خەلكێ وێ ئێمن و ل سەر توخیبێن خۆبوون))[٩].

ژ ڤان ڤەگێرانا دیاردبیت، كو بزاڤەكا كوردا ل دەڤەرا بەهدینان هەبوو، نەخاسمە كو دكەڤیتە سەر توخیبێن باكوورێ رۆژهەلاتێ مووسلێ، ئەو گەف بوون ل سەر ئێمناهییا وێ ل دووڤ وان ڤەگێرانا، ل ڤێرە پشتەڤانییەك بۆ دەستهەلاتا مووسلێ هاتەچێكرن دا دەستێ خۆ دانە سەر گەفا كوردا. بەلێ ڤەگێرانێن «طبری و ابن الاثیری» بۆ مە دیارنەكرییە كا چاوا و بۆچی كورد ل وێرێ بەلاڤبووینە، دەرئەنجامێن وێ چەندێ چ بوون.

ژلایەكێ دووڤە دیرۆكڤانێ مووسلی (ئەزدی) ڤەگێرانەكێ ژرووادنێن سالا (١٤٨مش)ێ ڤەدگوهێزیت، یا گرێدایە ب دەڤەرێن رۆژهەلاتێ مووسلێ ڤە، نەخاسمە دەڤەرا «باغەدرا»، تێدا هاتییە ((حەسانێ كورێ محیەددینێ یەحیای كورێ مالكی كورێ ئەجدەعێ وادعیێ هەمەدانیێ مووسلی، دەركەفت بۆ بەرهنگاربوونا خەلیفە «ئەبو جەعفەری» ل نێزیك گوندەكی كو دبێژنێ بافخاری[١٠] ژ گوندێن دەوروبەرێن مووسلێ یە، ل سەر توخیبێن«روابطێن»مووسلێ[١١] ئەو بوو شەری ب دژی «بن عبدالله»ی بكەن، صەقەرێ كورێ نەجدەی كورێ ئەزدیێ مووسلی، بۆ وانا دەركەڤت، ل بیستانەكێ نێزیكی باجلدا [١٢] ل باعەدرێ[١٣] لێككەفتن، شەركرن، حەسانی ئەو شكاند و بەرەف «پرا مووسلێ»ڤە چوو، بازارێ پرێ هاتە سۆتن و شەلاندن))[١٤].

هەر چەند ئەو رووادنا «ئەزدی» د دیرۆكێدا خۆ دا ڤەگوهاستی كو هندەك كەسێن عەرەب پێرابوون، بەلێ هندەك ڤۆناغێن وێ ل دەڤەرا بەهدینان نەخاسمە دەڤەرا باعەدرێ برێڤەچیبوون، ژ دیرۆكا «ئەزدی» دیاردبیت كو عەشیرەتێن عەرەبی ژ «ئەزدیێن ئەلیخانی» ل مووسلێ و دەوروبەرێن وێ دهێنەدیتن.

## بزاڤا جەعفەرێ كورێ میرخۆشێ كوردی دژی خەلافەتا عەباسی

زێدەر ئەگەرێن رابوونا بزاڤا «جەعفەرێ كورێ میرخۆشێ كوردی» دیارناكەن، بەرۆڤاژی بزاڤێن بەری وێ كو ب دژی وان رابووین، بەلێ هەكە ئەم بنێرینە رووادنێن دیرۆكی ئەڤێن باژێرێ مووسلێ و دەوروبەرا چێبووین، بزاڤێن «خەوارجا» و بهەمی «فرقێن» خۆڤە ل پتریا ئەردێ جزیرا فوراتی دبەلاڤبوون، كو باژێرێ مووسلێ ئێك ژ كەرتێن وێیە، هەر چەند دەولەتا عەباسی گڤاشتنێن خۆ ل سەر ڤێ بزاڤێ و ئالیكرێن

وێ زێدەدکرن، ئەوان بەرێ خۆ دا دەڤەرێن چیایی ئەڤێن دکەڤنە باکوور و رۆژهەلاتێ مووسلێ، ژبەرکو وەلاتێ کوردا خودان خورستەکێ چیایێ ئاسێیە دا خۆ ڤەشێرن و ئێمن بمینن[١٥].

دیسان ل دەڤەرا مووسلێ گەلەك هەڤرکی و هەڤدژی دناڤبەرا عەشیرەتێن عەرەبی یێن باکووری «نـزاری» و عەشیرەتێن باشووری و رەبیعە دا چێببوون، هەڤرکیا هەرە گەرم و خویناوی ئەو بوو یا د ناڤبەرا عەشیرەتێن هەمدان و ئەزدی دا رووداى بۆ دەست ب سەرداگرتنا دەڤەرێ[١٦]. ژبلی ڤێ چەندێ «تیرا شیبانی» یا ب دژواری و سەرداگرتنێ ناڤدار، ل دەوروبەرێن مووسلێ نەخاسمە رۆژهەلاتێ وێ بەلاڤببوون[١٧].

نابیت ئەم «سـەرەدەریـا» خـراب و سیاسەتا دژوارا والیێن عەباسییان ل مووسلێ ژبیرکەین، ڤێ چەندێ نەڤیانەك ل دەڤ عەرەب و کورد و خەلکێ دی ل بەرامبەری وان چێکربوو. ژ ڤەرێژا کارێن وانا ئەو کۆمکوژیا والیێ مووسلێ «محەمەد کورێ مول_مولی ضثعم» ب هاریکاریا والیێ مووسلێ یێ نوی- برایێ خەلیفەی«یەحیا کورێ محەمەدی کورێ عەبدوللایێ کورێ عەباسی» کو تێدا ب هزاران کەس ژ خەلکێ مووسلێ هاتنە کوشتن[١٨]، هوسا مووسلییان ب چاڤێ غەزەبێ دنێرا عەباسییان[١٩]، خەلك ب دژواری بەرامبەری وان راوەستا، هندەك ژ مووسلێ دەرکەڤتن و چوونە دەڤەرا (بابغیشێ) ئەڤا ژ مووسلێ دوور، زێدەباری «توپوگرافیا» وێ یا دژوار، دا کو شەری و تۆلڤەکرنێ دژی دەولەتا عەباسی بکەن، جەعفەرێ کوردی ژی دەمێ ژ دەولەتا عەباسییان پشتەرێبووی، ل دەڤـەرا بابغیشێ[٢٠] بزاڤا خۆ دەستپێکر.

## روودانێن بزاڤێ

هـەروەکـی دیرۆکنڤیس ل سـەر ناڤێ بابێ «جەعفەرێ کوردی» نە دهەڤبیربوون، هوسا ژی ل سەر سالا «جەعفەرێ کوردی» بزاڤا خۆ دەستپێکری، ژێك جودابوون، «طبری» دەمێ بەحسێ روودانێن سالا «٢٢٧مش» دکەت، دبێژیت ((د ئەڤێ سالێ دا جەعفەرێ کوردی...دوبەرەکی پەیداکر...))[٢١]، بەلێ «ئەزدی» ڤەگوهاستییە ((تێدا «رامانا وێ سالا ٢٢٤مش» جەعفەرێ کوردی ب دژی سولتانی رابـوو...))[٢٢]، بەلێ «ابن الاثیر» یێ هەڤبیربوو دگەل «ئەزدی» ل سەر دیارکرنا دەمێ دەرکەفتنا بزاڤا «جەعفەرێ کوردی» ب دژی دەولەتێ ((د ئەڤێ سالێ دا «٢٢٤مـش»ێ ل دەوروبـەرێـن مووسلێ، مرۆڤەك ژ سەرکێشێن کوردا ناڤێ وی جەعفەر بوو یاخیبوو...))[٢٣]، «ابن خلدون»ژی ل سەر ڤێ چەندێ دچیت و د بێژیت ((ل سالا بیست و چوارێ «موعتەصەمی» عبدوللایێ کورێ سەید کورێ ئەنەسێ ئەزدی کرە والیێ مووسلێ، ئەگەرێ دانانا ڤی والی ئەو بوو کو کەسەك ژ سەرکێشێن کوردا ناڤێ وی «جەعفەر»بوو... ل دەوروبەرێن مووسلێ یاخیببوو...))[٢٤].

تشتێ ل ڤێرێ ژ هەژی ئاڤرى پێدانێ ئەوە، کو ڤەگێرانا «طبری» گەلەکا کورت بوو، پیچەکێ ژ دو رێژا پتربوو[٢٥]، بەلێ ڤەگێرانێن «ابن الاثیری و ازدی» گەلەك ب درێژی و رەنگەکێ سەرەکی بەحسێ وێ کرییە، یا زانایە کو «طبری» پێزانینێن خۆ ل سەر رووداناب هویری ڤەدگوهاستن، زێدەباری دیارکرنا ژێدەرێ وان، بەلێ د ئەڤێ رووداننێ دا - گۆتنا وێ گەلەکا کورتکری بوو- بەحسێ دوبەرەکی و یاخیبوونێ ئەڤا «جەعفەرێ کوردی» پێرابووی نەکرییە، زێدەباری کو دەستپێکا دەرکەڤتنێ دیارنەکرییە.

ل دووڤ یا «طبری» ڤەگوهاستی، خەلیفە «موعتەصەمی» ئێك ژ سەرکردێن خۆ ب ناڤێ (ئیتاخ) بۆ ژناڤبرنا بزاڤا «جەعفەرێ کوردی» ل سالا ٢٢٧مـش فرێکرییە[٢٦]. کێمەك پشتی وێ دبێژیت کو خەلیفە موعتەصم ل رۆژا ئێکی/ موحەرەمێ/٢٢٧مش نەساخبوویە[٢٧]. یا بەرئاقل نینە کو موعتەصم بشێت لەشکەرەکێ مەزن ب سەرکردایەتیيا سەرکردێ خۆ یێ مەزن (ئیتاخی) فرێبکەت و ئەو نەساخێ مرنێ بیت، یا دروستر ئەوە

کو ڤەگێرانا «ابن الاثیر»ی هەرچەندە بێهێزکرییە بەلێ یا بەرئاقلترە، دەمێ دبێژیت ((گۆت: هێرشا ئیتاخی بۆ سەر جەعفەری ل سالا بیست و شەشێ بوو، خودێ دزانیت))[٢٨]. یا مە پتر رژدکەت و یا پتر ڤی دەستوداری روهندکەت ئەوە، کو «ابو الفضایل الحموی» کو دیرۆکنڤیسەکێ هەڤچەرخە دگەل «ابن الاثیر»ی، پشتی سالا ٦٣١مش/١٢٣٣ز مرییە، ڤەگێرانەکێ ڤەدگوهێزیت ((...موعتەصەمی ئافشین گازیکر، دو مێزەرکێن در و یاقیتا کرنەبەر، هەتا سالا دوسەد و بیست و پێنجی، موعتەصەمی «ئافشین» هەلاویست و سۆت، جەعفەرێ کوردی یێ کورد ب شووم پێ دهاتنە دیتن، هاتە کوشتن)) [٢٩].

دا کو بزاڤێ بکەین هەڤسەنگیەکێ دناڤبەرا ڤەگێرانێن «طبری» ژ لایەکیڤە، و ڤەگێرانێن «ئەزدی و ابن اثیری و حەمەوی» ژلایەکێ دووڤە، چێکەین، پێدڤییە بێژین کو جەعفەرێ کوردی ل دەڤەرا «بابغیشێ» ل دەوروبەرێن مووسلێ و ل سالا ٢٢٤مش ێ دژی خەلیفەیێ عەباسی پشتەرێ بوو[٣٠]، خەلیفە موعتەصەم ژی رابوو (عبدوللا کورێ سەید ئەنەسێ ئەزدی) کرە والیێ مووسلێ، فەرمان دایێ دا بەرسینگێن ڤێ بزاڤێ بگریت و ژ ناڤبەت، والی «عبدوللا کورێ ئەنەسێ ئەزدی» بەرەف دەڤەرا «بابغشێ»ڤە چوو، شیا جەعفەرێ کوردی ژ ئەوێ دەڤەرێ بکەتەدەر[٣١]، جەعفەرێ کوردی بەرەف دەڤەرا «داسن»ڤە هات[٣٢]، ئەڤا هەڤتوخیبا وێ ژ لایێ رۆژئاڤایڤە و خودان توپوگرافیەکا ئاسێ، زێدەباری کو یا نێزیکی مووسلێ یە، ئێك ژ زوزانێن ئاسێ یێن چیایی ب ناڤێ «بیندناس» کرە جهێ خۆ[٣٣]، ل دووڤ ژێدەرێن «سریانی یێن کەنسی» و دیرۆکی[٣٤] ئەوا دەڤەرا دگۆتێ (بغاش_بیت بغاش_بیث بغاش) گوندێ «بێخشاشێ»یە، ئەڤێ سەر ب عەشیرەتا شیروانیاڤە، مەلبەندێ «بیت بغاشێ» دکەڤیتە گوندێ بیاوێ «بیێ» ئەڤا سەر ب عەشیرەتا شێروانی ڤە، یا کو دکەڤیتە «قەزا مێرگەسورێ» سەر ب پارێزگەها هەولێرێڤە.

ل سالا «٢٢٥مـــش/٨٤٠ز»ێ والیێ مووسلێ عەبدوللایێ کورێ سەیدی کورێ ئەنەسێ ئەزدی دگەل لەشکەرەکی بەرەف دەڤەرا داسن ل رۆژهەلاتێ مووسلێ کەتە رێ، لەشکەرێ وی ب سەر زنجیرا چیایێ هنداڤی گوندێ «سوق الاحد» ب سەرکەت (دبیت ئەو چیایێ خێرێ بیت ل دەڤەرا شمکانا نۆکە ئەڤا دکەڤیتە دناڤبەرا ناحیا ئەترووش و مرێبا) داکو هێرشێ ببەتە سەر وی جهی یێ جەعفەرێ کوردی کرییە بارەگایێ خۆ، بەلێ جەعفەرێ کوردی ل گەلیەکێ تەنگ «کەمینەك» بۆ دانابوو، ل دووڤ یا «ئەزدی» دبێژیت ناڤێ وی «بنیدناس»بوو[٣٥]، جهەکێ گەلەکێ بلندە، ل دووڤ ڤەگێرانێن «ابن الاثیر»ی رێکا وێ گەلەکا تەنگە[٣٦]، بەلێ والیێ مووسل هەلباسکی وان زنجیرا چیایێن بلند و ئاسێ بوو، سەخمەراتی دا بگەهیتە جەعفەری و شەرێ وی بکەت و بزاڤا وی ژناڤببەت و ڤەمرینیت، هەروەکی ل بابغشێ کری. هەرچاوابیت لەشکەرێ مووسلێ کەڤتنە د کەمینەکێ دا کو جەعفەرێ کوردی بۆ دانابوو، تووشی شکەستنەکا مەزنکرن، والی «عەبدوللا کورێ سەیدێ ئەنەسێ ئەزدی» و پتریا لەشکەرێ وی هاتنە کوشتن[٣٧]، یێن دی ژی هاتنە دەستەسەرکرن ژوانا ژی دو ژ سەرکردێن وی بوون، مامێ وی «ئسحاق کورێ ئەنەسێ ئەزدی» و نێزیکێ وی «ئسماعیل کورێ عەونێ تەلیدی»، جەعفەری ئەوژی کوشتن و رێز ل خزمانیێ نەگرت ئەڤا وی ب «ئیسحاقێ کورێ ئەنەسی»ڤە گرێددەت[٣٨].

«ابن اثیر» ئەگەرێ شکەستنا والیێ مووسلێ بۆ وێ چەندێ ڤەدگەرینیت، کو کورد د شەهرەزابوون ل سەر دەڤەرێن چیایی ژبەرکو وەلاتێ وانە، زێدەباری کو ئەو دشیان شەری بکەن بێ کو ل هەسپا سویاربن، جهێ شەری ژی یێ گونجایی بوو بۆ ڤێ چەندێ.

پشتی دەنگوباسێن شکەستنا والیێ مووسلێ گەهشتنە دەف خەلیفە موعتەصەمی ل سامەرایێ، فەرمان دا سەرکردەیێ خۆ یێ تورکی «ئیتاخی» دا خۆ بەرهەڤبکەت بۆ ب داوی ئینانا بزاڤا جەعفەرێ کوردی ل رۆژهەلاتا مووسلێ، هوسا ئیتاخی خۆ

بەرهەڤکر. ل سالا ٢٢٦مش/٨٤٢ز ێ بەرەف مووسلێ ڤە هات، ژ وێرێ ژی بۆ رەخێ رۆژهەلاتی بەرەف سوق الاحد «ملێ سۆکا» ڤە هات[٣٩]، مەرەما وی چیایێن داسن بوو، جهێ شۆرشگێرێن کورد و سەرکێشیێ وان جەعفەرێ کوردی بوو[٤٠].

«ابن اثیر» ڤەگێرانەکێ ڤەدگوهێزیت، کو جەعفەر بێ بەرهەڤبوو شەری دگەل ئیتاخی و لەشکەرێ وی بکەت، ئەنجامێن ڤی شەری شکەستنا شەرڤانێن کورد بوو و سەرکێشێ وان جەعفەر هاتە کوشتن، زێدەباری کو گەلەك ژ وانا بوونە ئێخسیر[٤١]، ابن اثیر د ڤەگێرانەکا دی دا رەنگەکێ بێ هێزیێ ددەتێ و دبێژیت میرێ کوردی ژەهر ڤەخوار و دڤیا بمریت و خۆ نەدەتە دەستێن ئیتاخی[٤٢].هەرچاوابیت ئیتاخی ئێخسیر و ژن و بچویك خرڤەکرن و ڤەگوهاستنە باژێرێ تکریتێ[٤٣] سەرکردێ تورکێ ئیتاخی گەلەك زولم ل بێ گونەهێن کورد کر. هەر چ جەعفەر بوو کەلەخێ وی هاتە ڤەگوهاستن بۆ باژێرێ سامەرا، ل وێرێ ب رەخ «بابکێ خرمی» و «مازیارێ تەبرستانی» ڤە هاتە هەلاویستن ، ئەڤە باشترین بەلگەیە کو بزاڤا جەعفەرێ کوردی مەترسییەکا مەزن بوو ل سەر دەولەتا عەباسی، ئەو ژی وەکی بزاڤا بابکی و مازاویێ بوو.کریارێن موعتەصمی کارتێکرن ل سەر گیرۆبوونا پەیدابوونا «ڤەوارەیەکێ کوردیێ خودان سەربەخۆیا ناڤخۆیی» کر، یان ڤەوارەکێ سەربەخۆ ژ خەلافەتا عەباسی، بەرۆڤاژی برایێ وی «مەئمونی» کو رێك دابی ئێکەم میرگەها فارسی ل خوراسانێ پەیدابیت، ئەو ژی میرگەها «تاهری» بوو.

# ژێدەر و پەراوێز:

١. ئەبو دەلامەی: زەندێ کۆرێ ئەلجونی، کوفیەکێ رەشێ مەوالیا بوو، وی دوماهیك رۆژێن «بەنی ئومیە» دزانین، ل رۆژێن حوکمێ وانا یێ ناڤدار نەبوو، ل رۆژێت «بەنی عەباسدا» ب ناڤودەنگ کەفت، نێزیکی خەلیفە «ئەبی عەباس و ئەبو جەعفەری و محەمەد مەهدی» بوو، ب خۆشی دگەلدا د روینشتەخوارێ، ل سالا (١٧١مش) مرییە، هندەك دبێژن ل دەستپێکا خەلافەتا «هارۆن رەشیدی» مرییە. بنێرە: الدینوري، ابن قتیبة: الشعر و الشعراء، (بیروت-د.ت)، ج٢، ص ٦٦٠؛ ابن المعتز: طبقات الشعراء، (بیروت/ مؤسسة الرسالة-١٩٨١)، ج٧، ٣٧٤-٣٧٥.

٢. ابن قتیبة محمد بن مسلم: المعارف، حققه و قدم له: ثروت عکاشة، الطبعة الرابعة، (بیروت: دار الطلیعة-د.ت)، ص ٥٦؛ الدمیري، کمال الدین: الحیوان، (بیروت: دار احیاء التراث العربي-د.ت)، ج١، ص ١٠؛ ابن خلکان، ابو عباس شمس الدین احمد: وفیات الاعیان و اخبار الزمان، تحقیق: احسان عباس، بیروت، ج٣، ص ١٥٥.

٣. الطبري: تاریخ الرسل و الملوك، ج٨، ص ١٠٢؛ ابن حزم، احمد بن سعید: جمهرة انساب العرب، (بیروت: دار الکتب العلمیة-١٤٠٣ه/ ١٩٨٣م)، ص ٢١.

٤. الطبري: تاریخ الرسل و الملوك، ج٧، ص ٢١٤.

٥. ابن الاثیر: الکامل في التاریخ، ج٦، ص ٥٤-٥٦.

٦. طبري: تاریخ الرسل و الملوك، ج٨، ص ١٦٨.

٧. ابن الاثیر: الکامل في التاریخ، ج٦، ص ٥٧-٥٨.

٨. المصدر نفسه، ٦/ ٥٧-٥٨.

٩. بافخارێ: گوندەکە ل دەوروبەرێن مووسلێ، دکەڤیتە رۆژهەلاتێ مووسلێ، بن: یاقوت الحموي: معجم البلدان، ج٢، ص ٤٣.

١٠. روابط مووسلێ: د بنواشدا «روابض» یێن مووسلێنە، تیڤەرێزەکا پێکڤەگرێدانێ یە، رابط ئەو هێزا گرێدایە دا بەرگریێ ژ باژێری بکەن، بەلێ «ربض» ئەوا ل دەوروبەرێن باژێری وەکی خانی و قەزا، بنێرە: الازدي: تاریخ الموصل، تحقیق: علي حبیب، (القاهرة: المجلس الاعلی لشؤون الاسلامیة-١٩٦٧)، ص ٢٠٣.

١١. من ژ وەرگێرانا ڤی ناڤی د ژێدەرێن بەردەست دا نەدیتن (ڤەکۆلەر).

١٢. باعەدرێ: گوندەكە دكەڤیتە رۆژهەلاتا مووسلێ، ڤەكۆلەرێن «سریانی» دبینن كو ئەو پەیڤەكا سریانییە، رامانا وێ «عونة»، نۆكە ئەو جهێ میرێ تیرا ئیزدیایە، بنێرە: یاقوت الحموي: معجم البلدان، ج٢، ص ٤٠.
١٣. تاریخ الموصل، ص ٢٠٣-٢٠٤.
١٤. الازدي: تاریخ الموصل، ص ٣٤٣-٣٥٤، ٢٦٧-٢٦٨، ص ٢٧٥-٢٧٦.
١٥. الازدي: المصدر نفسه، ص ٣٣٢.
١٦. الهمداني، حسن بن احمد یعقوب: صفة جزیرة العرب، تحقیق: محمد علي الاكوع، (صنعاء: مركز الدراسات و البحوث الیمني-١٩٣٨)، ٢٧٤.
١٧. الازدي: تاریخ الموصل، ص ١٤٥، ١٥٣.
١٨. سعید دیوجي: تاریخ الموصل، (بغداد: مطبوعات المجمع العلمي العراقي_١٤٠٢ه_١٩٨٢)، ج١، ص ٧٩.
١٩. بابغیش: ناحیەكە دكەڤیتە دناڤبەرا ئازەربێجان و ئەردەبلێ دا كو رووبارێ زێ سەری (مەزن) تێرا دبووریت. یاقوت الحموي: معجم البلدان، ج١، ص ١٤٥. یاقوتی (ئەربل-ئەربیل وهەولێر) دگەل (ئەردەبلا ئازەربێجانێ) تێكهەلكریوون. بتنێ هەكە ئەم بێژین كو زێ مەزن ژ زۆزانا دزێت، ب دەڤەرا «داسن» را دچیت دەمێ بەرەف رووبارێ دیجلەڤە دچیت نەخاسمە ل باشوورێ باژێرێ مووسلێ، كو بۆ لایێ رۆژئاڤایێ بری را دچیت.
٢٠. تاریخ الرسل و الملوك، ج٩، ص ١١٨.
٢١. تاریخ الموصل، ص ٣٤٠.
٢٢. الكامل في التاریخ، مج٤، ص ٢٧٢.
٢٣. كتاب العبر و دیوان المبتدا او الخبر في ایام العرب و العجم و البربر و من عاصرهم من ذوي السلطان الاكبر، مج٤، ص ٥٦٧.
٢٤. تاریخ الامم و الملوك، ج٩، ص ١١٨.
٢٥. تاریخ الامم و الملوك، ج٩، ص ١١٨.
٢٦. المصدر نفسه، ج٩، ص ١١٨.
٢٧. الكامل في التاریخ، مج٤، ص ٢٧٣.
٢٨. التاریخ المنصوري - تلخیص الكشف في حوادث الزمان، عنى ب نشره و وضع فهارسه: بطرس غریاز ینویج، (موسكو: اكادمیة العلوم-١٩٨٠)، ص ١٠٦.
٢٩. كرفان امیدي: الكرد في كتابات المؤرخ ابن الاثیر الجزري، ص ١٢٦_١٢٧.
٣٠. الازدي: تاریخ الموصل، ص ٤٣٠؛ ابن الاثیر: الكامل في التاریخ، مج٤، ص ٢٧٢.
٣١. داسن: دەڤەرەكا چیایییە دكەڤیتە رۆژهەلاتێ مووسلێ، ل دووڤ ژێدەرێن سریانی دەڤەرا بەرگارێ و دەڤەرا عەشیرەتا مزووری و بەرواری ژێریبا ڤەدگریت.
٣٢. الازدي: تاریخ الموصل، ص ٤٣١، دبیت ئەڤ گوندە «بلمباسێ» بیت ئەڤە دكەڤیتە دەڤەرا بەرواری ژێریبا باكوورێ رۆژهەلاتا ناحیا ئەترێشێ ل پشت چیایێ (خێرێ) ئەوێ دكەڤیتە هنداڤی لایێ باكوورێ رۆژهەلاتی ل سەر ناڤەندا باژێرێ «سوق الاحد» ملێ سۆكا، كو ل دەمەكێ مەلبەندێ ڤێ دەڤەرێ بوو.
٣٣. یوسف حبي: مجامع كنیسة المشرق، ص ٧٨-٧٩، البیرابونا: تاریخ الكنیسة الشرقیة، ج٢، ص ١١٦-١١٧.
٣٤. تاریخ الموصل، ص ٤٣٠_٤٣١.
٣٥. الكامل في التاریخ، مج٤، ص ٢٧٢.
٣٦. ابن الاثیر: الكامل في التاریخ، مج٤، ص٢٧٢.
٣٧. الازدي: تاریخ الموصل، ص ٤٣١ ابن الاثیر د ڤەگێرانەكێدا ڤەدگوهێزیت و دبێژیت: ئیسماعیلێ كورێ عەونێ تەلیدی وەسا هزردكر كو جەعفەر دێ وی كوژیت و ئسحاقێ ناكوژیت ژبەركو خزمانیبا دناڤبەرا وان دا هەی، بەلێ جەعفەرێ كوردی « ئیسحاقێ كورێ ئەنەسێ ئەزدی» كۆشت پاشی ئسماعیل و یێن دی ژی كوشتن. بنێرە: الكامل في التاریخ، مج٤، ص ٢٧٣.
٣٨. سوق الاحد: كیلومەترەك و نیڤا یا ژ باشوورێ گوندێ بلان دوورە، نۆكە دبێژنە كاڤلێن وێ «ملێ سۆكا» دكەڤیتە سەر رێكا دناڤبەرا مرنیا و ڤەزا شێخان دا.
٣٩. ابن الاثیر: الكامل في التاریخ، مج٤، ص ٢٧٢.
٤٠. المصدر نفسه، مج٤، ص ٢٧٣؛ ابن خلدون: مقدمة، مج٣، ص ٥٦٨.
٤١. المصدر نفسه، مج٤، ص ٢٧٣.
٤٢. ابن الاثیر: الكامل في تاریخ، مج٤، ص ٢٧٣.
٤٣. الدینوري: اخبار الطوال، ص ٤٠٢.

# شەرەنیخا بووەیهییان دگەل هێزێن خۆجهی بۆ کونترۆلکرنا دەڤەرا بەهدینان

## (٣٣٤- ٤٤٧مش/ ٩٤٥- ١٠٥٥ز)


**پ.هـ.د. فەرهاد حاجی عەبوش**

**زانکۆیا دهۆك-کۆلیژا زانستێن مرۆڤایەتی**

**وەرگێران: موسەدەق تۆڤی**


## پێشەکی:

سەردەمێ بووەیهییان (٣٣٤- ٤٤٧مش/ ٩٤٥- ١٠٥٥ز) دهێتە هژمارتن گرنگترین سەردەمێن ئیسلامی بۆ کوردان، د ڤی سەردەمیدا رۆلێ سیاسی و شارستانیێ کوردان د پێڤاژوویا وان بۆ دامەزراندنا میرگەهێن خۆیێن سەربەخۆ و خودان دەستەلات ل وەلاتێ خۆ ب رەنگەکی بەرچاڤ دیاربوو، بووەیهی د سەرەدەرییێدا دگەل کوردان نەرم و لێبۆردەبوون، ئەڤە ژی بەرهەمێ وێ لێبۆردەییا بووەیهییان بوو دگەل کوردان، بووەیهی دبینن کو «دەولەتا وان هەڤالجێمکە- هەڤکویفە- دگەل دەولەتا کـوردان»[1]، بەلێ ڤێ لێبۆردەییێ گەلەك نەڤەکێشا، پەیوەندیێن ناڤبەرا بووەیهییان و کوردان تێکچوون، ئەڤە ژی ئەنجامێ وێ چەندێ بوو کو بووەیهییان دڤیا سنوورێ دەستەلاتداریا خۆ د ناڤ خاکێ کورداندا بەرفرەهکەن ب تایبەت ژی ل دەڤەرا بەهدینان، ئەڤەژی بۆ ئەگەرێ هندێ دەڤەرا بەهدینان گەلەك هەڤرکی و شەرێن د ناڤبەرا بووەیهییان و هێزێن خۆجهدا روودایێن ب خۆڤە ببینیت، وەك میرگەها حەمدانی (٢٩٣-٣٨١مـش/٩٠٥-٩٩١ز) و دەولەتا دۆستەکی (٣٧٢-٤٧٨ مش/٩٨٢- ١٠٨٥ز) ژ ئالیەکیڤە، و ژ ئالیێ دووڤە د ناڤبەرا کوردان و هێزێن حوکمداری ل دەڤەرا بەهدینان دکرن وەك میرگەها حەمدانی و میرگەها عوقەیلی (٣٨٠- ٤٨٩مش/٩٩٠- ١٠٩٦ز).

ب مەرەما کونترۆلکرنا دەڤەرا بەهدینان بووەیهی کەتنە د شەرەنیخەکا دژواردا دگەل هێزێن خۆجهـ، د دەمێ بووەیهییان ل سالا (٣٢٤مش/ ٩٤٥ز) دەستەلاتێ بەغدا گرتیەدەست حەمدانییان دەستەلاتداری ل مووسلێ و جزیری - ب دەڤەرا بەهدینانڤە- دکر، ئەڤە د پێکۆتی بوون ب هێزا خۆ و رۆلێ خۆیێ کاریگەر د بەرسنگگرتنا بووەیهییاندا، پاشتر دەولەتا دۆستەکی ژی کەتە د ڤێ شەرەنیخێدا هەتا ب کوشتنا میرێ وان باد کورێ دۆستەکی ب داویهاتی، دووڤرا پشتی کو میرگەها عوقەیلی شیای میرگەها حەمدانی ل

مووسلێ ژ ناڤبەت دەستێ خۆ دانا سەر میرگەها بەهدینان، پێنەڤێت ئەڤە ژی دێ بیتە هۆکارێ پەیدابوونا ناکوکیێ د ناڤبەرا وان و میرگەهێ و خودانکەلایێن دەڤەرا بەهدینان، هەرچەندە ژێدەرێن دیرۆکی گەلەك گرنگی نەدایە ب توومارکرنا دەنگوباسێن وان ناکوکییان ل دەڤەرێ و زانیاری دەربارەی وان رووداوان دکێمن، ئەو ژی تنێ ئاماژەنە ب ناڤێن هندەك کەلایێن دەڤەرێ و رۆلێ میرێن وان د ناکوکیێن ئاماژە پێکریدا کو دەڤەرێن کوردنشین ب تایبەت دەڤەرا بەهدینان بوو مەیدانا شەری د ناڤبەرا واندا.

هەژیە بێژین مژارا شەرنیخا بووەیهییان دگەل هێزێن خۆجهـ ل کوردستانێ تێرا خۆ ڤەکولینێن ئەکادیمی ل سەر هاتینەکرن(٢). بەلێ وان ڤەکولینان ب رەنگەکێ سەربەخۆ دووڤچوونا وی بابەتی ل دەڤەرا بەهدینان نەکرییە، ژبەر هندێ ژی گەلەك ئالیێن دی مانە پێدڤییە ڤەکۆلین ل سەر بێنەکرن داکو رۆناهییەکا پتر بەردەینە سەر رووداوان و راستیێن دیرۆکی، ل سەر ڤی بنیاتی ژی مە ئەڤ ڤەکولینە هەلبژارتییە، کو دبیتە سێ تەوەر، تەوەرێ ئێکێ شەرەنیخا بووەیهی- حەمدانییان ل سەر مووسلێ و دەڤەرێن سەر ب وی ڤە ژ وان ژی دەڤەرا بەهدینان ب خۆڤە دگریت، تەوەرێ دووێ شەرنیخا بووەیهییان دگەل دەولەتا دۆستەکی سەر دەڤەرا بەهدینان ب خۆڤە دگریت، هندیکە تەوەرێ سێێ یە شەرنیخا عوقەیلیان دگەل میرگەهێن کوردی وەك مەروانی و هەزبانی و خودانێن کەلایێن دەڤەرا بەهدینان ب خۆڤە دگریت، ئەو ژی ل سەر رێکا حەمدانییان چوون و خۆ ب خودانێن وان دەڤەرا دزانی.

## ١-شەرەنیخا بووەیهی- حەمدانی سەر دەڤەرا بەهدینان:

بەری بێینە سەر ڤێ مژارێ پێویستە کورتیەکێ دەربارەی بووەیهی و حەمدانییان بەرچاڤبکەین، بووەیهی د بنیاتدا ژ وەلاتێ دەیلەم[٣] هاتینە، نفشێ وان (ل دووڤ پتریا بۆچوونان) دزڤریتەڤە سەر شاهێن فارسان[٤]، ناڤێ خۆیێ ژ بوهیهێ کورێ فەناخسروی یێ ناڤدار ب (ابی شجاع) وەرگرتیی و وی کارێ ماسیگریێ دکر[٥]، دەمێ ئەبا شوجاع (ابی شجاع) مری سێ کور ل دووڤ خۆ هێلان ئەو ژی ئەبو ئەلحسەن عەلی (عیمادولدەولە- عماد الدولە)، و ئەبو عەلی ئەلحەسەن (روکنولدەولە- رکن الدولە) و ئەبو ئەلحەسەن ئەحمەد (موعیز ئەلدەولە- معز الدولە)[٦]، ڤان سێ بران دەسپێکر، ژ خزمەتا ڤی سەرکردێ دەیلەمی دچوونا خزمەتا یێ دی، هەتا ب دروستی جهێ خۆ دیتی و پێشکەتین بووینە خودان مولکێن ناڤدار، هێدی هێدی دەستەلاتێ وان ل گەشبوون و بەرفرەهیێ دا، هەتا جهێ یێ خۆ ل نێزیکی بارەگایێ خەلیفەیێ عەباسی کری، ئەڤە ژی هاریکاربوو ئەو بکارن نهێنیێن لاوازی و ب هێزیا دەستەلاتێ خەلیفەی بزانن، زێدەباری ڤێ چەندێ ژی دەستەلاتێ وەلاتێ فارسان و جهێن سەر ب وی ڤە د دەستاندا بوو، د ئەنجامدا ل سالا (٣٣٤مش/٩٤٥ز) ب سەر پایتەختێ عەباسیاندا گرت و کونترۆل کر[٧].

هندیکە حەمدانی نە بنیاتێ وان دزڤریتەڤە عەشیرەتا (بنی تغلب بن وائل)، ئەو ژی ژ عەرەبێن باکووری یان عەدنانی نە، ل بەراهیێ ل بانیێن نەجد و حیجاز و سنوورێن (تهامە) نیشتەجێ بووینە، حەمدانی ژ وان عەشیرەتانە یێن د سەردەمێ جاهلیەتێدا سەنگا خۆ هەی، ب تایبەت د شەرێ ناڤدار ب (حرب البسوس) ئەوێ ل سەدسالیا پێنجێ زایینی د ناڤبەرا وان و عەشیرتا (بکر بن وائل) دا رووداى، لەوما ناچار بوون ژ وێ دەڤەرێ دوورکەڤن و ل وەلاتێ شامێ و سنوورێن وێ ئاکنجی بوون، بەلێ ژبەر چەندین ئەگەران نەمانە ل ڤان جهان و ناچاربوون ژ وێرێ بەرەف وەلاتێ جزیرێ ب تایبەت وارێ رەبیعە (دیار الربیعە) بچن و ل وێرێ ئاکنجی بوون و میرگەها خۆ ل وێرێ دامەزراند[٨].

هندیکە حەمدانی نە ئەو د بنیاتدا دزڤرنەڤە سەر باپیرێ خۆ ئەبا عەباس حەمدان کورێ حەمدون کورێ حارسی کورێ لوقمانی کورێ راشدی کورێ موسەنای کورێ رافعی کورێ عوزێفی کورێ موحرەبەی کورێ حارسی کورێ مالکێ کورێ عودەی کورێ ئوسامەی

کورێ مالکێ کورێ بەکری کورێ حەبیبێ کورێ عەمروی کورێ غەنەم کورێ توغلوبێ توغلوبی[٩]، ئەڤێ داویێ کەڤنترین کەسێ ڤێ خێزانێ یە کو رۆلەك د دیرۆکێدا هەی، حەمدانێ کورێ حەمدونی هەشت کورێن مێرخاس هەبوون رۆلەك گرنگ د سەردەمێ خیلافەتا عەباسی دا گێرایە[١٠] و کەسێن هەرە ناڤدارێن وان ئەبو ئەلهەیجا عەبدوللا کورێ حەمدانی و حسێن کورێ حەمدانی نە، ئەوێن پشکداری د رووداێن سیاسیدا کری و شیاین سەرکەفتیانە بۆ خۆ دەستەلاتدارییەکێ ل مووسل و جزیرێ دامەزرینن کو بەهدینا ژی د ناڤ هەمان سنووردا بوو، ئەبو حەمدان خزمەتێن مەزن بۆ خیلافەتا عەباسی پێشکەشکرن و گەلەك ژ وان بزاڤ و مەترسییان ژناڤبرن یێن گەف ل دەستەلاتی عەباسی دکرن ژوانا بزاڤا خەواریج و قەرامیتا[١١]، هەروەسان بەرسنگێ مەترسیا تولۆنییان (الطولونیین) بەرسنگێ دەستەلاتێ سەرکردێن ترك دگرت کو هەیی و نەیێن خەلیفەی و کاروبارێن دەولەتێ ئێخستبوونە ژێر دەستەلاتێ خۆ، د ئەنجامێ ڤان چالاکیاندا سەروبەرێ وان د دەولەتا عەباسیدا بەرف پێشچوو چوو و پلە و جهێن بلند د دەولەتێدا گرتنە دەست[١٢].

پشتی کودەستەلاتێ حەمدانییان ل داویا سەدسالیا سێ مشەختی/ نەهێ زایینی ل مووسلێ زێدەبووی پەیوەندیێن وان دگەل کوردان د موکم بوون، ژبەرکو هەر زوو میرێن حەمدانی هەست ب هێز و مەترسیا کوردان ل سەر مووسلێ و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە کربوو و ئەو چەند ب باشی دزانی کو زەحمەتە ئەو ب هێزێ بکارن کوردان ملکەچ بکەن، لەوما ژی هەڤپەیمانی و خزمینی دگەل وان کرن، ئەو بوو بابیرێ وان حەمدان کورێ حەمدونی ژنەکا کورد ئینا[١٣]، هەروەسان هەڤژینا ئەبو ئەلهەیجا عەبدوللا کورێ حەمدانی(دایکا سەیفولدەولەی) کورد بوو[١٤]، هەروەسان ناسرولدەولە ئەلحەسەن کورێ ئەبوئەلهەیجا عەبدوللا کورێ حەمدونی ژنەکا کورد بناڤێ فاتما کچا ئەحمەدێ کوردی ئینابوو، ئەو فاتمایە کچا ئێك ژ مەزنێن کوردان یێن خودانێن کەلا ئەرمشتی[١٥] بوو، ئەبو توغلوب و ئەبو بەرەکات کورێن ناسرولدەولەی و کچەکا وی ب ناڤێ جەمیلا ژ ڤێ ژنێ بوون[١٦].

دوی سەردەمیدا دەڤەرا بەهدینان ل هەڤنێزیکبوونەکا کورد و حەمدانییان ب خۆڤە دیت، حەمدانی د ڤێ خزمینیا سیاسیدا د سەرکەفتی بوون، د ئەنجامدا پرانییا کەلایێن دەڤەرا بەهدینان ل ژێر دەستەلاتێ وان بوون و رێڤبەرنا وان کەلان ژی د دەستێن بریکارێن میرێن حەمدانی ژ کەسوکارێن فاتما کوردی بوون[١٧]، ناسرولدەولە و کورێ خۆ ئەباتەغلوب گەلەك باوەری ب خالێن خۆیێن کورد ئینابوو و هەردەم سامان و زێر و گەوهەرێن خۆ ل وان کەلان د پاراستن، دلسۆزیا ڤان کەلان بۆ حەمدانییان ل وی ئاستی بوو ب درێژیا سەردەمێ وان کەسەك ژ وان دژی دەستەلاتێ حەمدانییان نەرابوو[١٨].

هندیکە پەیوەندیێن بووەیهی و حەمدانییانن ب رەنگەکی گشتی د تەقەلەقێدا بوون، جار ل هەڤنێزیك دبوون و جار ژ هەڤ دوور دکەتن و دکەتنە د شەراندا، ڤان پەیوەندیان باندۆرەك مەزن ل سەر دەڤەرا بەهدینان هەبوو ژبەرکو ببوو مەیدانا شەری د ناڤبەرا هەردو ئالیاندا، حەمدانییان د دەمێ پێدڤیاتیێدا و ژ بەرکو کەلایێن دەڤەرێ د سەخت و ئاسێ بوون و رێکێن وێ ب زەحمەت و دژوار بوون و نەیا ب ساناهی بوو خەلکەك بگەهیتێ پەنا دئینا ڤێ دەڤەرێ و میرێن حەمدانی دەڤەر کربوو پەناگەها خۆ د دەمێ شەرێن خۆدا دگەل دوژمنان[١٩]. ناسرولدەولە یێ حەمدانی حوکمداری ل مووسلێ و جزیرێ و دەڤەرا بەهدینان ژی دگەلدا دکر، دەمێ ل سالا (٣٣٤مش/ ٩٤٥ز) بووەیهی گەهشتینە بەغدا و دەمێ دەستەلاتداری بۆ موعیزول دەولەیێ بووەیهی ئێکلا بووی دەملدەست ئەوی ب نیازا ناسرولدەولەیێ حەمدانی زانی کو ل بەرە جزیرێ وەك وەلاتەك سەربەخۆ راگەهینیت، ب تایبەت ژی وی بەرسنگێ دەستەلاتێ بووەیهییان ل بەغدا گرت دەمێ رازینەبووی وی دراڤی بۆ بەغدا بهنێریت کو بریار بوو ئەو وەلاتە بدەن یێن ل ژێر دەستەلاتێ وی،

ئەڤە ژی نیشانا باوەری نەئینانا حەمدانییان بوو ب ڤەگوهاستنا دەستەلاتێ مەلبەندی ل بەغدا بۆ دەستێ میرێ بووەیهییان، ئەڤ بریارە وەك راگەهاندنا زەنگا شەری بوو د ناڤبەرا بووەیهی و بەغدا دا بوو، ئەو بوو بووەیهییان چەندین هێرشێن لەشکەری برنە سەر حەمدانییان[20]، ئەوا گرنگ بۆ مە ئەوە کو دەڤەرا بەهدینان ببوو مەیدانا شەری د ناڤبەرا هەردو ئالیاندا و بووەیهییان چەندین هێرش برنە سەر مولکێ دەڤەرێن حەمدانییان و چەند ژ وان هێرشان ژی هاتنە سەر دەڤەرا بەهدینان، گرنگترینێن وان هێرشان:

هێرشا بەرفرەها میر موعیزولدەولەیێ بووەیهی بۆ سەر مولکێن میرگەها حەمدانی ل سالا (٣٣٧مش/ ٩٤٨ز)، ئەڤەژی ژ بەر هندێ بوو کو ناسرولدەولە رازی نەبوو پاران بۆ بەغدا بهنێریت، ئەو بوو موعیزولدەولەی بریاردا ب مەرەما گرتنا وێ بەرەف مووسلێ بچیت، هێزێن بووەیهییان ژ بەغدا بەرەف مووسلێ کەتنە رێ، موعیزولدەولە چوو د ناڤ مووسلێ دا و ناسرولدەولە ژ وێرێ رەڤی و چوو نسێبینێ[21]، ئەو بوو هێزێن بووەیهییان تێرا خۆ پێدڤیاتی ل مووسلێ دەست نەکەتن، لەوما زێدەگاڤی کرە سەر خەلکی و مال و مولکێن وان تالانکرن، ئارمانجێ موعیزولدەولەی ژ ڤان هێرشان ئەو بوو دەست ب سەر هەموو وان جهاندا بگریت یێن د دەستێن ناسرولدەولەی دا، بەلێ پشتی کو نامەك ژ برایێ وی روکنولدەولە گەهشتیێ، تێدا هاریکاریێن لەشکەری دژی لەشکەرێ خوراسان ئەوێن هێرش ئینایە سەر جورجان[22] و رەی[23] ژێ خواستین، لەوما ناچار بوو دگەل ناسرولدەولەی پێکبهێت و هەردو ل سەر ڤەکشیانا لەشکەرێ بووەیهییان ژ مووسلێ پێکهاتن، ئەو ژی ب وی مەرجی ناسرولدەولە سالانە گۆژمێ هەشت هزار دەرهەمان ژ پێش مووسل و جزیرێ و شامێ ڤە بدەت و خوتبە ل وان دەڤەران ب ناڤێ موعیزولدەولەی و برایێن وی بێنەخواندن، ژ بەر باوەری نەئینانا موعیزولدەولەی ب ناسرولدەولەی هەردو کورێن وی ئەلفەزل و ئەلحسێن وەك بارمتە دگەل خۆ برنە بەغدا[24].

ژبەرکو ناسرولدەولەیێ پەیمان شکێن بوو و ل دووڤ پێکهاتنێ پارە نە ددانە بووەیهییان، لەوما جارەکا دی دوژمناتی د ناڤبەرا بووەیهی و حەمدانییان دوبارەدبیتەڤە، موعیزولدەولە ل سالا (٣٤٧مش/ ٩٥٨ز) بریارا داگیرکرنا مووسلێ ددەت، بۆ ڤێ مەرەمێ لەشکەرەکێ مەزن بەرهەڤدکەت و دگەل ڤی لەشکەرێ بەرەف مووسلێ دچیت، دەمێ نێزیك بووی ناسرولدەولەی زانی وی شیانێن بەرخۆدانێ نینن، بریار دا بەرەف دەڤەرێن کوردان ڤەکشییت، پلانا وی د شەرێ بووەیهییاندا ئەو بوو ئەو جهێن ئەو ژێ ڤەدکشییێن ژ هەر تشتەکی ڤالا کەت یێ بووەیهی بۆ کارێن خۆیێن کاگێری یان مادی یان لەشکەری مفای ژێ ببینن، هەروەك ئیبنولئەسیر (٦٣٠مش/١٢٣٢ز مریە) دەربارەی ڤێ چەندێ ڤەدگێریت: « عەدەتێ ناسرولدەولەی ئەو بوو هەردەمێ ئێکی هێرش دئینا سەر مووسلێ ئەو ژێ دەردکەت و هەموو نڤیسەر و بریکار و کارمەند و هەرکەسەکێ تشتەك ژ زێدەرێن دراڤ و سامان و بەرژەوەندیێن دەستەلاتی دزانین دگەل خۆ دبرن و دبیت ژی دکرنە د کەلایێن کواشێ[25] و زەعفەرانێ[26] و یێن دووڤە[27]« هەروەسان ئیبنولخەلدون (٨٠٨مش/ ١٤٠٥ز مریە) داکوکیێ ل سەر وێ چەندێ دکەت کو: « ناسرولدەولە گەهشتە نسێبینێ و هەموو نڤیسەر و هەڤالێن وی و کارمەندێن دەربارێ وی و ئەوێن زێدەرێن تشتی دزانن دگەلدا بوون و دانانە د کەلا کواشێ و یێن دووڤە«[28].

ژ ئەڤا چوویی دیاردبیت کو کەلایێن کوردان ل دەڤەرا بەهدینان- وەك کەلا کواشێ و زەعفەرانێ- جهێ پویتەپێدانا حەمدانییان بوون، ئەو کەلا پەناگەهـ و جهێن ئاسێێن حەمدانییان بوون، هەروەسان وەك گەنجینەیێن میرێن حەمدانی بوون سامان و زێر و گەوهەرێن خۆ ل وێرێ عمباردکرن، هەرچەند ژێدەرێن دیرۆکی ئاماژە ب خودانێن وان کەلان نەکریە، لێ دوور ناهێتەدیتن کو هندەك میرێن کوردێن دەڤەرا بەهدینان ب تایبەت کەسوکارێن هەڤژینا میرێ

حەمدانی یا کورد مەزناتییا وان کەلان کرییت[٢٩].

پشتی کو ناسرولدەولە ژ مووسلێ ڤەکشیای موعیزولدەولەی دەست ب سەردا گرت، هندیکە ناسرولدەولە بوو هێزەك ژ ئالیگرێن خۆ پێکڤەنابوو ئەرکێ وێ ئەو بوو نەهێلن کەرەستێن خوارنێ و ئالیك بگەهنە ناڤ مووسلێ، لەوما ژی هێزێن موعیزولدەولەی تەنگاڤبوون، ئەو ژی ژ بەر کێمیا قویتی، گەلەك نەما ل وێرێ و ژ باژێری دەرکەت، پاشتر پشتی کو زانی گەلەك سامان و دراڤ ل نسێبینێ هەنە بەرەف وێرێ کەتە رێ، و د هەمان دەمدا هێزەکا لەشکەری بۆ هێرش کرنە سەر شنگالێ[٣٠] پێکئینا ، ئەڤە ژی دەمێ زانی کو هێزێن حەمدانییان ل جەم ئەلمەرجی و هیبەتوللا کورێن ناسرولدەولەی خرڤەبووینە، دەمێ گەهشتینە شنگالێ شەرەکێ د ناڤبەرا هەردو ئالیاندا روودا و د ئەنجامدا هێزێن بووەیهی تووشی شکەستنەکا مەزن بوون[٣١].

دەمێ موعیزولدەولەی بریار دای ب دووڤ ناسرولدەولەی ڤە بچیتە نسێبینێ، ئەڤێ داویێ زانی دەمدلەست رەڤی چوو میافارقینێ، ژ وێرێ بەرەف حەلەبێ بۆ جەم برایێ خۆ سەیفولدەولە ئەبو ئەلحەسەن عەلی (٣٣٣- ٣٥٦مش/٩٤٤- ٩٦٧ز) چوو، برایێ وی پێشوازی لێکر و گەلەك رێز لێ گرت[٣٢].

هندی پەیوەندی ب رۆلێ میر و خودانێن کەلایێن کوردێن بەهدینان د ڤان بۆیەراندا ڤە هەی، هندەك ژێدەر داکوکیێ ل سەر وێ چەندێ دکەن کو وان دژی حوکمداریێ بووەیهی پشتەڤانی ل ناسرولدەولەی دکر، و وانا بەرسنگێ بووەیهییان ل دەڤەرێن خۆ گرت و هندی شیاین شەرێ وان کر، هەروەك ئێك ژ ڤەکۆلەران ڤەدگێریت ناسرولدەولەی ئالیگرێن خۆ ژ کوردێن رۆژهەلاتێ مووسلێ راسپاردبوون دوورێچەکا ئابووری داننە سەر مووسلێ و نەهێلن پێدڤیاتی و کەرەستێن خوارنێ بگەهنە باژێری[٣٣]، هەروەسان دیرۆکنڤیسەکێ دی داکوکیێ دکەت کو مەزنێن کەلایێن کوردان هێرش دکرنە سەر لەشکەرێ موعیزولدەولەی و ژێ دکوشتن و ئەسیردکرن و رێکێن ئینانا کەرەستێن خوارنێ و پێدڤیاتییان ل بەر وان دگرتن[٣٤].

ئەڤە و دەمەکیدا کو یەك ژڤەکۆلەران ڤەگێرانەکا ژێدەر نەدیار ڤەدگێریت کو تێدا هاتییە هندەك ژ میر و خودان کەلایێن کوردان کربوو د دلێ خۆدا بەرسنگێ بووەیهییان بگرن، ئەو بوو میر بەختیار میرێ جزیرا بۆتان (جزیره ابن عمر) هەڤپەیمانییەك دگەل تاهرێ کورێ خودێدا میرێ کەلا کواشێ و میر قوباد کورێ خەندانێ سندی میرێ کەلا شابانیێ[٣٥]، و میر عیسا خودانێ کەلا هرورێ[٣٦]، گرێدا و ئەڤ هەڤپەیمانە پێکهاتن کو بەرسنگێ موعیزولدەولەی بگرن و ل باژێرێ ئامەدێ هێرشکرە سەر لەشکەرێ وی و شکاند و زیانێن مەزن ژ سەر و مالی گەهاندنێ[٣٧].

ژ ئەڤا چوویی دیار دبیت کو میر و خودان کەلایێن بەهدینان ئالیگریا خۆ بۆ ناسرولدەولەی و میرگەها حەمدانی پاراستبوو و بەرامبەر بووەیهییان ب تایبەت ل ئالیێ رۆژهەلاتێ مووسلێ کو دەڤەرێن وان ئانکو دەڤەرا بەهدینان دکەڤنە وێرێ بەرخۆدان کر.

ژئالیەکیڤە ژئەنجامێ ئەو دووریێچا ناسرولدەولەی و ئالیگرێن وی ژ کوردێن دەوروبەرێن مووسلێ دانایە سەر موعیزولدەولەی ژ ئالیێ دووڤە ژ ئەنجامێ لاوازیا سەروبەرێ ناسرولدەولەی سەیفولدەولە کەتە بەرەڤانیێ دناڤبەرا برایێ خۆ و موعیزولدەولەی دا و پەیام د ناڤبەرا هەردو ئالیاندا د هاتن و د چوون، لێ موعیزولدەولەی ژ بەر پەیمانشکێنییا ناسرولدەولەی و نەدانا پاران ژ ئالیێ وی ڤە باوەری ب وی نەبوو، لەوما سەیفولدەولەی گرەنتیا پاراستنا وەلاتی ژ پێش برایێ خۆ ناسرولدەولەی دا، موعیزولدەولە ژی یێ ناچار بوو بۆ ئیمزاکرنا پێکهاتنی دگەل وان ل سالا (٣٤٨مش/٩٥٩ز) چنکو یێ پێدڤی ب پارەی بوو و شیانێن راگرتنا سەروبەرێ وان دەڤەران نەبوون، ئەو بوو زڤریڤە بەغدا ب وی مەرجی سەیفولدەولە گۆژمێ دوهزار و نەهسەد دەرهەمان بدەتە حوکمداریێ بووەیهی موعیزولدەولەی و ناسرولدەولە ژی زڤریڤە مووسلێ دا کو بناڤێ برایێ خۆڤە حوکمداریێ ل مووسلێ بکەت پشتی کو رازیبوونا میرێ بووەیهی

وەرگرتی[٣٨].

ئاشتیا ناڤبەرا هەردو ئالیان هەتا سالا (٣٥٢مش/٩٦٣ز) یا بەردەوام بوو، د ڤێ سالێدا ناكوكی كەتە ناڤبەرا موعیزولدەولەیێ بوویهی و ناسرولدەولەیێ حەمدانی، ئەگەرێ ناكوكیێ ژی ئەو بوو كو ناسرولدەولەی دڤیا دانپیانانەكێ وەرگریت داكو كورێ وی فەزلوللا ئەلغوزەنفەر (فضل الله الغضنفر)یێ ناڤدار ب ئەبا تەغلەب وەلاتی بگریتەدەست و د بەرامبەردا ناسرولدەولە دەه هزار دینارێن دی بۆ میرێ بوویهی زێدەكەت، ل ڤێرێ موعیزولدەولەی بریاردا هێرشێ بكەتە سەر مولكێن ناسرولدەولەی و بۆ ڤێ مەرەمێ لەشكەرەكی مەزن بەرهەڤكر و ل دەسپێكا سالا (٣٥٣مش/ ٩٦٤ز) بەرەڤ مووسلێ كەتە رێ و دەست ب سەردا گرت، وەك عەدەتێ وی یێ هەرجار ناسرولدەولە ژ مووسلێ ڤەكشیا و بەرەڤ ئاسێگەهێن خۆ ل دەڤەرێن كوردان چوو و ل نسێبینێ خۆجهبوو، مەعیزولدەولەی پشتی كو ب مەرەما پاراستنێ و دابینكرنا پێدڤیاتیان پشكەك ژ لەشكەرێ خۆ ل مووسلێ هیلای دووڤ ناسرولدەولەی كەت[٣٩].

دەمێ ناسرولدەولەی ب ڤێ چەندێ زانی ژ نسێبینێ دەرەكەت بەلێ شیا رێكا چوونا خۆ ل بەر لەشكەرێ بوویهی بەرزەكەت، ئەو بوو موعیزولدەولەی دەست ب سەر نسێبینێ دا گرت، بەلێ ژ وێ چەندێ یێ نیگەران بوو نەكو ناسرولدەولە موناوەرەكا لەشكەری بكەت و بەرەڤ مووسلێ بچیت، لەوما ژی بریاردا بزڤریتەڤە مووسلێ، هێژ ئەو ل رێكا زڤرینێدا بوو لەشكەرێ وی كەتە بەر هێرشا ئەبا تەغلەبی و برایێن وی و زیانێن مەزن گەهاندنە لەشكەرێ وی و هەتاكو شیان كەژاوەیێن موعیزولدەولەی یێن ل مووسلێ بسۆژن بەلێ نەشیان باژێری ژدەستێن بوویهیان دەربێخن[٤٠].

هندیكە موعیزولدەولە بوو بەرەڤ باژێرێ برقعید[٤١] چوو و ل وێرێ زێرەڤانیا دەنگوباسێن ناسرولدەولەی دكر، ناسرولدەولەی ژی شێوازەكێ نوو د بەرخۆدانێدا بەرامبەری بوویهیان گرتە بەر، ئەو ژی ئەو بوو خۆ ژ لێكدانا روو ب روو دگەل وان ب پارێزیت و هاتنوچوونێن خۆ ل بەر وان بەرزە بكەت هەتا كو بشێت لەشكەرێ وان ل سەر بەرۆكێن جودا جودا بەلاڤە بكەت، هند بوو هندی موعیزولدەولەی زانی كو ناسرولدەولەیێ یێ ل باژێرێ جزیرێ، دووڤ وی كەت و چوو وێرێ، بەلێ ئەو ل وێرێ نەدیت، ژبەركو بەری ئەو بگەهیتە جزیرێ ناسرولدەولە ژ وێرێ دەركەتبوو، گۆتگۆتكەك هەبوو كو یێ چوویە حەسەنیێ (زاخۆ)، د دەمەكیدا كو موعیزولدەولە د ناڤبەرا جزیرێ و حەسەنیێ ل ناسرولدەولەی دگەریا نووچە گەهشتنە وی كو ناسرولدەولە دگەل كورێن خۆ و لەشكەرێ وان گەهشتینە هەڤ و پێكڤە هێرش برنە سەر مووسلێ و زیان گەهاندینە لەشكەرێ بوویهیان وسەركەتن ل سەر وان دەستڤەئینایە، گەلەك ژێ كوشتینە و سەركردێن وان ئەسیركرینە و دەست ب سەر هەموو دراڤ و سامان و چەكێن موعیزولدەولەی ل مووسلێ دا گرتیە و هەموو ئەو تشتە دگەل ئەسیران برینە كەلا ئەرمشتێ[٤٢].

دەمێ موعیزولدەولەی زانی چ ب سەر هێزێن وی هاتیە ب هەواركی بەرەڤ مووسلێ چوو، ئەو بوو ناسرولدەولە ژ مووسلێ بەرەڤ شنگالێ ڤەكشیا، د هەمان دەمدا كورێ وی ئەبو تەغلەب بەرەڤ دەڤەرێن زێیێ مەزن چوو و ل وێرێ خۆجهـ بوو، سەرەرای سەركەتنا حەمدانییان دەستڤە ئینای بەلێ ناسرولدەولەی داخوازا پێكهاتنێ ژ بوویهییان كر، بەلێ موعیزولدەولە ل سەر داخوازا وی رازی نەبوو، بەلێ ئەبو تەغلەبی مفا ژ رازینەبوونا موعیزولدەولەی كو پێكهاتنێ دگەل بابێ وی بكەت وەرگرت و پەیام بۆ هنارت ژێ خواست ئەو دگەل پێكبهێت و ل سالا (٣٥٣مش/ ٩٦٤ز) پێكهاتنەك د ناڤبەرا هەردو ئالییان هاتەگرێدان و ل دووڤ پێكهاتنێ موعیزولدەولەی وەلات دا دەست ئەبو تەغلەبی كو د بەرامبەردا ئەو سالانە گۆژمەكێ مەزنێ پارەی ب دەتە حوكمدارێ بوویهییان و ئەسیرێن بوویهییان ئازاد بكەت، پشتی كو پێكهاتن دگەل حەمدانییان موورکری موعیزولدەولە زڤریڤە بەغدا، ئەڤە ژی هەڤدەم بوو

دگەل داویهاتنا سەردەمێ حوكمداریا ناسرولدەولەی و كورێ وی ئەبو تەغلەبی ل شوونا وی حوكمداریا حەمدانییان گرتە دەست و بوو خودان دەستەلاتێ سیاسی ل مووسلێ و دەڤەرێن كوردان[٤٣].

ژ ئەڤا چوویی دیاردبیت كو دەڤەرێن كوردان ب تایبەت دەڤەرا بەهدینان ب دژواری كەتبوو ژێر كاریگەریا هەوێن موعیزولدەولەی دژی ناسرولدەولەیێ حەمدانی، دەڤەرێن كوردنشین و كەلاییێن وان مەیدانا شەرێ ناڤبەرا هەردو ئالیان بوون، ئەڤە ژی ئەگەرێ وێ چەندێ بوو تەناهیا دەڤەرێ تێكبچیت، خەلك ژ دەستێ زۆریا خویك و باجێن هەردو ئالییان بنالیت، حەمدانی پێدڤی ب گەلەك پارەی دبوون بۆ برێڤەبرنا سەروبەرێ خۆیێ لەشكەری داكو بشێن بەرامبەری بووەیهییان راوەستن، بۆ ڤێ مەرەمێ ژی گەلەك خویك و باج ل سەر خەلكێ دەڤەرێ سەپاندبوون و رێكێن دژوار و پڕ ئەشكەنجە بۆ وەرگرتنا وان دگرتنە بەر، ژ ئالیێ دووڤە و د هەمان دەمدا بووەیهی دهاتن و وان ژی خویك و باجێن خۆ ل سەر وی خەلكی د سەپاندن، هەموو ئەڤە ژی ئەگەرێ وێ چەندێ بوون بزاڤا ئابوورینێ خەلكی ل دەڤەرێن كوردان ب تایبەت دەڤەرا بەهدینان گەلەك لاواز ببیت[٤٤].

هەتا مرنا موعیزولدەولەی ل سالا (٣٥٦مش/٩٦٦ز) كار ب پێكهاتنێ هاتەكرن، كورێ وی عیزولدەولە بەختیار شوونا وی گرت، ئەو تنێ مژوولی رابواردن و كەیف و خوشیان بوو، لەوما كورێن ناسرولدەولەی ب تایبەت ئەبو توغلوبی ڤیا مفای ژ وێ دەلیڤێ وەرگرن و دەست ب سەر بەغدادا بگرن و مالباتا بووەیهی ژ بەغدا ب دەرێخن، لێ ناسرولدەولەی ئاموژگاری ل وان كرن لەزێ ل دەرێخستنا بووەیهییان ژ بەغدا نەكەن و بێهنا خۆ فرەهكەن، ئەڤ ئاموژگاریە ب دلێ ئەبوتوغلوبی نەبوو، لەوما ل سالا (٣٥٦مش/ ٩٦٦ز) بابێ خۆ گرت و كرە د زیندانا كواشێ ڤە[٤٥]، زێدەباری ڤێ چەندێ ژێدەرێن دیرۆكی ئاماژە ب دو ئەگەرێن دی یێن زیندانیكرنا ئەبو توغلوبی دكەن، ئەو ژی: دهێتەگۆتن كو فاتما كوردی هەڤژینا ناسرولدەولەی هاندانا كورێ خۆیێ مەزن ئەبو توغلوبی كریە دا

بابێ خۆ بگریت و بكەتە د زیندانێ ڤە[٤٦]، ئەگەرێ دووێ دبێژیت سەروبەرێ ناسرولدەولەی تێكچووبوو، ژیێ وی مەزن ببوو، رەوشتێ وی خرابببوو، بێ عاقل ببوو چ سەنگ و رێزگرتن ل جەم هەڤال و كەسێن خۆ نەمابوو لەوما ژی كورێ وی ئەبوتوغلوبی ئەو گرت[٤٧].

ناكوكی كەتە ناڤبەرا كورێن ناسرولدەولەی سەرا گرتنا بابێ وان ژ ئالیێ ئەبو توغلوبێ برایێ وانڤە، ئەڤە ژی دەسپێكا هەرفتنا دەستەلاتداریا حەمدانییان بوو ل مووسلێ و جزیرێ، هندەك ژ بران سەرا گرتنا بابێ خو خۆ دانە دگەل حەمدانێ كورێ ناسرولدەولەی هندەكان ژی خۆ دانە د گەل ئەبو توغلوبی، ئەڤە ژی دەسپێكا ناكوكی و هەڤركیێ بوو د ناڤبەرا مالباتا حەمدانی دا، سەخمەرات گرتنا دەستەلاتی ئەبو توغلوب ناچار ما هەوارا خۆ ببەتە بەر عیزولدەولە بەختیاری ل بەغدا و ژی خواست دوبارە باوەریێ ب دەستەلاتێ وی بینیت، داكو ب ڤێ باوەریێ لەشكەری پشتراستكەت و پشتگەرم بیت بەرامبەری برایێن خۆ ژ بەرهەلستكار و پشتەڤانان، عیزولدەولەی دوبارە باوەریا خۆ دا دەستەلاتێ وی ب مەرجەكی سالانە گۆژمەكێ مەزنێ پارەی بدەت[٤٨].

ڤێ پارچەبوونێ دەرگەهـ ل بەر بووەیهییان ڤەكر مایتێكرنێ د كاروبارێن ناڤخۆییێن حەمدانییان دا بكەن، شەری د ناڤبەرا ئەبو توغلوبی و برایێ وی حەمدانی رووداْ، ئەبو توغلوبی دەست ب سەر مولكێن برایێ خۆ حەمدانی ل جزیرێ دا گرتن، حەمدانی پەنا برە بەر میرێ بووەیهی عیزولدەولە بەختیاری ل بەغدا، وی ژی پەیمان دایێ كو پشتەڤانیا وی بكەت بەرامبەری برایێ وی، پشتی كو حەمدانی ناڤتێدانا وی كری عیزولدەولەی بریار دا بەرەڤ مووسلێ بچیت، دەمێ عیزولدەولە ب لەشكەرێ خۆڤە بەرەڤ مووسلێ چووی، ئەبوتوغلوب ژ مووسلێ بۆ شنگالێ ڤەكشیا پشتی كو ژ هەموو پێدڤیاتی و كەرەستەیێن خوارنێ ڤالا كری، وی ژی هەمان رێكا بابێ خۆ د بەرگریكرنێ ژ مولكێن خۆ گرتە بەر، پشتی كو چەند بەرەڤانەكان د ناڤبەرا واندا هاتنوچوون كری پێكهاتن بەلێ ب

وی مەرجی ئەبو توغلوب ئەو پارێن بریارە ل سەر پێ هاتییەدان دگەل سێ هزار (کر)ان[٤٩] دەخل و دانی بۆ بەغدا بهنێریت، و مولکێن برایێ خۆ حەمدانی ژ بلێ مێردینێ بۆ بزڤرینتەڤە، د بەرامبەردا ئەبو توغلوبێ ژێ خواست کو نازناڤەکێ سولتانی بدەتێ ئەو ب عیدەتولدەول (عدە الدولە) ناڤکر، هەروەسان ئەبو توغلوبی خواستبوو هەڤژینا وی کچا عیزولدەولەی بۆ بزڤرینتەڤە، پشتی ڤێ پێکهاتنێ ئەبو توغلوب زڤریڤە مووسلێ و عیزولدەولە ژی زڤریڤە بەغدا[٥٠].

دەربارەی هەلویستێ میر و خودانێن کەلایێن بەهدینان ژ وان رووداناں ژێدەران ئاماژە ب هەلویستێ وان نەکرییە، بەلێ وەسان دیارە کو وان پشتەڤانیا ئەبو توغلوبی دژی حوکمدارێ بووەیهی کرییە، ژبەر کەلایێن وان دکەتنە د ناڤ سنوورێ میرگەها حەمدانی یا عیزولدەولەی ژ سالا (٣٥٦مش/ ٩٦٦ز) ڤە باوەری داین.

پشتی ڤێ پێکهاتنێ هەڤرکیێ د ناڤبەرا کورێن مالباتا بووەیهی سەر دەستەلاتدارێ ل بەغدا دەسپێکر، ناکوکیێن مەزن د ناڤبەرا هەردو میرێن بووەیهی عەزدولدەولەیێ بووەیهی (٣٦٧- ٣٧٢مش/ ٩٧٧- ٩٨٢ز) و عیزولدەولە بەختیاری روودان، د ئەنجامدا عەزدولدەولەی ل سالا (٣٦٧مش/ ٩٧٧ز) دەستەلاتێ بەغدا گرتە دەست و عیزولدەولە ژ بەغدا دەرێخست، ئەڤێ داویێ ژی لگەل زاڤایێ خۆ ئەبو توغلوبی پێکهات کو شەرێ عەزدولدەولەی بکەن و وی ژ بەغدا دەرێخن، شەرەکی د ناڤبەرا واندا روودا، شەر ب سەرکەتنا عەزدولدەولەی و کوشتنا عیزولدەولەی و رەڤینا ئەبو توغلوبی ب لەشکەرێ وی ڤە بۆ مووسلێ ب داوی هات[٥١].

پشتی ڤێ بۆیەرێ عەزدولدەولەی ب مەرەما سزادانا ئەبوتوغلوبی کو پشتەڤانیا عیزولدەولەی دژی وی کرییە لەشکەرێ خۆ رێکخستەڤە و ل سالا (٣٦٧مش/ ٩٧٧ز) دەست ب هەوا دەرێخستنا حەمدانییان ژ مووسلێ و جزیرێ کر، پشتی کو تێرا خۆ پێدڤیاتی و کەرەستەیێن خوارنێ و کەسێن کارگێری دگەل خۆ برین بەرەف مووسلێ دا رێ، وی ئەزموون ژ شەرێن پێشتر دگەل حەمدانییان هەبوون دەمی مووسل ژ هەموو تشتێن پێدڤی ڤالا دکر و بەرەف جزیرێ ڤەدکشیان و پاشتر دەست ب کریارێن لەشکەری دکرن، عەزدولدەولە چوو دناڤ مووسلێ دا و دەمەکی ما ل وێرێ هەتا سەروبەرێ کارگێری رێکخستی، د هەمان دەمدا سیخورێن خۆ راسپاردن زێرەڤانیا لڤین و هاتنوچوونێن ئەبوتوغلوبی بکەن ل هەر جهەکی هەبیت، دەمێ ئەبوتوغلوبی هەست ب مەترسیا سەروبەری کری و باوەری ئینای کو عەزدولدەولە ب ساناهی ژ مووسلێ ناڤەکشیێت داخوازا پێکهاتنێ دگەل وی کر، بەلێ عەزدولدەولە ب داخوازا وی رازی نەبوو[٥٢].

د وی دەمیدا ئەبوتوغلوب ل باژێرێ میافارقینێ بوو، عەزدولدەولەی لەشکەرەك دووڤ وی را هنارتە وێرێ، دەمێ وی زانی دەملدەست رەڤی چوو بدلیسێ[٥٣]، پاشتر چوو حەسەنیێ، ژ وێرێ چوو د کەلا کواشێ و کەلایێن دی یێن بەهدینا ڤە و هەرچی پارە و گەوهەرێن خۆ لگەل خۆ هەلگرتن[٥٤]، دەمێ عەزدولدەولەی زانی کو ئەبو توغلوب یێ ل ئێك ژ کەلایێن بەهدینانڤە، پشتی کو شیای مەزنە کەسێن ئالیگرێن ئەبوتوغلوبی راکێشیتە ئالیێ خۆ هێرش برە سەر وی و ناچار کر ژ وێرێ ژی ب رەڤیت و عەزدولدەولە زڤریڤە مووسلێ پشتی کو ئەبوتوغلوب هێلایە بێ هێز و شیان و بێ چەك و چەکدار[٥٥].

عەزدولدەولە یێ بەردەوام بوو ل سەر راهێلانە ب دووڤ ئەبوتوغلوبی ڤە و لەشکەرەکێ دی هنارتە گیانێ وی، هەتا ناچار کری ب رەڤیتە وەلاتێ جزیرێ و ژ وێرێ ژی رێکا بدلیسێ گرتە بەر هەتا چووی ناڤ وەلاتێ رۆمێ، پاشتر زڤریڤە باژێرێ ئامەدێ، دەمێ ئەبوتوغلوبی زانی کو باژێرێ میافارقینێ وکەلایێن دەوروبەران یێن کەتینە دەست دوژمنی، ژ ئامەدێ دەرکەت و چوو روحبە (الرحبە)[٥٦]. ل سالا (٣٦٨مش/ ٩٧٨ز) ئەبو توغلوبی ژ روحبە شاندەك هنارتە جەم عەزدولدەولەی و داخوازا پێکهاتنێ و ئاشتیێ ژێ کر، بەلێ ئەڤەژی یا ژ خۆ بوو ب تایبەت

پشتی كو عەزدولدەولەی ئالیكرێن وی راكێشاینە جەم خۆ، دەمێ ئەبوتوغلوبی ئەڤ چەندە زانی ژ وەلاتێ جزیرێ ژی رەڤی و بەرەف وەلاتێ شامێ كەتە رێ هەتا ل سالا (٣٦٩مش/ ٩٧٩ز) ل روملە (الرملە) هاتییەكوشتن و ب كوشتنا وی دەستەلاتداریا حەمدانییان ب داویهات[٥٧].

دەمێ بووەیهی شیاین حوكمداریا حەمدانییان ل مووسلێ ب داوی بینن، عەزدولدەولەی ڤیا دەستەلاتێ وان ل جزیرێ ژی ب داوی بینیت، بۆ ڤێ مەرەمێ ژی بەرێ سێ لەشكەران دا كەلایێن بەهدینان پێن سەر ب ئەبوتوغلوبی ڤە، لەشكەرەك ب سەركردایەتییا ئەبا ئەلعەلا عەبدوللایێ كورێ فەزلێ نەصرانی هنارتە سەر كەلا ئەرمشتێ، لەشكەرەك ب سەركردایەتییا ئەبا ئەلقاسم سەعەد كورێ محەمەدێ حاجب هنارتە سەر كەلا شابانیێ و لەشكەرەك ب سەركردایەتییا ئەبا نەصر خرشید كورێ یەزدیارێ خازن هنارتە سەر كەلا هرووری[٥٨]، بەلێ ژێدەرێن دیرۆكی گەلەك زانیاری دەربارەی رۆلێ میرێن كوردێن وان كەلان د ناكوكیا ناڤبەرا ئەبو توغلوبێ حەمدانی و بووەیهییان بەرچاڤ نەكرینە، ئەرێ وان بەرگری ژ كەلایێن خۆ كرییە و د شەریدا پشتەڤانی ل ئەبوتوغلوبی دژی بووەیهییان كرییە یان ژی گەهشتینە رێزێن عەزدولدەولەیێ بووەیهی؟ ژبلی كەلا ئەرمشتێ كو هندەك ژێدەران ئاماژە ب رۆلێ وێ د ڤێ شەرەنیخێدا كرییە، ئەڤە ژی ژبەر هندێ كو ژ ئالیەكیڤە كەلایەكا مەزن و ئاسێ بوویە و ژ ئالیێ دووڤە بنكەهێ حەمدانییان بوو د تەنگاڤیاندا و عومبارا سامان و دراڤ و گەوهەرێن وان و زیندانا گرتییێن وان بوو[٥٩]، دو كەسان رێڤەبەریا وێ كەلایێ دكر، ئێك كەسەكێ كورد بوو ب ناڤێ سالحێ كورێ بانویە، یێ دی كەسەك بوو ب ناڤێ (طاشتم) ئەو ئێك ژ كۆلەیێن ناسرولدەولەی بوو، ئەلتەنوخی ئاماژە پێ دكەت كو كورێ بانویە سەرۆكەكێ كوردان بوو[٦٠].

سەركردەیێ بووەیهی ئەبا ئەلعەلایێ نەسرانێ یێ چوویە سەر كەلا ئەرمشتێ رۆلەكێ مەزن گێرا كو شیا تاگیریا كوردان راكێشیتە ئالیێ بووەیهییان و ژێ خواست بێنە د خزمەتا عەزدولدەولەیێ بووەیهی دا، و بۆ وان دیاركر كو دەستەلاتێ ئەبو توغلوبی ژ ناڤچوو، ب دراڤەكێ زێدە ئەو رازیكرن و ژێ خواست سەرۆكێ خۆ سالح كورێ بانویەی ژی رازیكەن دگەل وان بكەهیتە رێزێن بووەیهییان، دەمێ كورێ بانویەی زانی كو چ ب سەرێ ئەبوتەغلوبی هاتییە هەڤالێ خۆ (طشتم) یێ ئالیگرێ ئەبوتوغلوبی گرت و ئەرمشتێ را دەستی سەركردێ بووەیهی ئەبا ئەلعەلای كر[٦١]، بەلكی بووەیهی حوكمداریا كەلایێ بدەنە وی ژبەركو ئەو خودان سەنگەكا مەزن بوو د ناڤ كورداندا، بەلێ د پێڤاژوویا رووداناندا ناهێتەزانین كانێ كەلا ئەرمشتێ ما د دەستێن كورێ بانویەی دا یان نە، ژبەركو ژێدەران ئاماژە ب ڤێ چەندێ نەكرییە.

د دەمەكیدا كو هندەك ژێدەران ئاماژە ب ڤەگێرانەكا ژێدەر نە دیاركرییە كو دبێژیت ئەو سەرەدەریا نەرما بووەیهییان دگەل كوردان كری هاندەربوو بۆ ئاڤابوونا میرگەهەكا كوردی د وی سەردەمەیدا ب ناڤێ میرگەها تیراهی[٦٢] یا كو كەلا ئەرمشتێ كرییە پایتەختێ خۆ، و دەستەلاتێ وێ گەهشتە چیایێ داسن و وەلاتێ هەكاری، ئەڤە ژی ب پشتەڤانیا ئەبوتوغلوبێ حەمدانی بوو، بەلێ پشتی شەرەكێ مەزن د ناڤبەرا هەردو ئالیاندا عەزدولدەولە شیا ل سەر ڤێ میرگەهێ سەركەڤیت، بەلێ كوردان هێزێن خۆیێن ژ هەڤ بژالەبووین جارەكا دیتر كۆمكرنەڤە و دەست ب شەرێ بووەیهییان كرەڤە و بەرخودانا وان سال و نیڤان ڤەكێشا و ل بەراهیێ بووەیهی شكاندن، بەلێ شەرەنیخا ناڤخۆیی د ناڤبەرا واندا نەهێلا ئەو سەركەتنێ دەستڤەبینن، بووەیهییان مفا ژ ڤێ دەلیڤەیێ وەرگرت و شیان ڤێ میرگەها كوردی یا ب هاریكاریا حەمدانییان هاتییەدامەزراندن ژناڤببەن، هەمان ژێدەر د بێژیت كو زانایێن كوردان یێن ئایینی رۆلەك مەزن د سەركەتنا بووەیهییاندا هەبوو، ژبەركو وان فتوا دا كو شەر دژی تیراهییان جیهادە و باوەریا وان ناكوكە د گەل باوەریا

موسلمانان، گەلەك كورد كەتینە ژێر باندوورا ڤێ فتوایێ و هاریكاریێا بووەیهیيان كر د كریارا ژناڤبرنا ڤێ میرگەهێ و داگیركرنا كەلا ئەرمشتێ ژ ئالیێ بووەیهییانڤە[٦٣].

پشتی كو بووەیهییان دەست ب سەر كەلا ئەرمشتێ دا گرتی، عەزدولدەولەی فەرماندا یەك ژ باوەرپێكریێن خۆ بچیتی كەلایێ و سەرژمێرا هەمووو سامان و تشت و كەرەستەیێن تێدا بكەت دا ڤەگوهێزنە بەغدا، پاشتر فەرماندا كو(طاشتم) ل دەوارەكی سواركەن و بەرامبەری هەمووو كەلایێن كوردان یێن هێژ نەهاتینەگرتن بگێرن دا كو ترس سەرێ وان بگریت و دەستبەرداری كەلایێن هێژ دەستێن واندا بن، ژێدەرێن دیرۆكی ئاماژە ب چاوانیا گرتنا كەلایێن دێ یێن بەهدینان وەك: كەلا هرووری، كەلا شابانیێ و كەلا بەرقی و كەلا ملیسیێ نەكرییە، وەسان دیارە كو عزدولدەولەی نامە بۆ خودانێن وان كەلان هنارتینە و ژێ خواستیە بێنە ژێر دەستەلاتێ وی و د وان نامەیاندا سیاسەتا گەف و ترساندنێ گرتیە بەر و د ئەنجامدا خودانێن كەلان كەلایێن خۆ ل سالا (٣٦٨مش/ ٩٧٨ز) رادەستی بووەیهییان كرینە[٦٤].

ب مەرەما دابینكرنا تەناهیا مووسلێ عەزدولدەولەی ڤیا یێن مایی ل دەرڤەی دەستەلاتێ خۆ ژكەلایێن بەهدینان بێختە ژێر دەستەلاتێ خۆ، بۆ ڤێ مەرەمێ ل سالا (٣٦٩مش/ ٩٧٩ز) لەشكەرەكێ مەزن هنارتە سەر كەلایێن كوردان د ناڤ كووراتیا دەڤەرێن چیایێن بەهدیناندا، لەشكەر بەرەف وان جهان چوو و دەمەكێ درێژ ئەو كەلا دووریێچدان، خودانێن وان كەلایان خۆ د كەلایێن خۆڤە ئاسێ كریوو و گەف و هەرەشەیێن لەشكەرێ بووەیهییان چ ژ مۆرالا وان نەئینا خوار، خەلكێ دناڤ كەلایاندا هیڤیا وان ب وەرزێ زڤستانێ و گۆهرینا سەقای و بارینا بەفرێ هەبوو بەلكی ب بارینا بەفرێ بووەیهی دووریێچێ ژ سەر وان راكەن، بەلێ گیروبوونا بەفرێ خودانێن كەلان ناچاركرن داخوازا ئەمانێ ژ سەركردەیێ لەشكەرێ بووەیهی بكەن و ئەو ژی ل دووف داخوازا وان هات و وان ژی خۆ

و كەلایێن خۆ رادەستی لەشكەرێ بووەیهییان كرن، بەخترەشیا وان د وێ چەندێ دا بوو هێژ بۆ رۆژەكێ ئەو ژ كەلایێن خۆ دەرنەكەتین بەفرێ لێكر[٦٥]، هەرچەندە سەرلەشكەرێ بووەیهییان پەیمان دابوو چ زیانان نەگەهینتە وان، بەلێ غەدر لێكر و هەروەك ئیبنولئەسیر ڤەدگێریت: « سەرلەشكەرێ بووەیهی غەدر ل وان كر ئەو ل سێدارا دان و ل هەردو ئالیێن رێكا (معلثایا) مالتا مووسلێ هەلاویستن»[٦٦].

ددەمەكیدا كو ڤەكۆلەرەكێ دیتر ڤەگێرانەكێ ڤەدگێریت تێدا هاتییە: كوردێن دەڤەرا بەهدینان شۆرش بەرامبەری بووەیهییان بەرپاكر، چەند شەرەكان د ناڤبەرا واندا روودا، كوردان سەركەتنێن مەزن دەستڤەئینان، عەزدولدەولە ناچار بوو داخوازا ئاشتیێ ژ وان بكەت، كورد ژی ل دووڤ داخوازا وی هاتن، ئەو بوو كورد مێڤانكرن، بەلێ شەڤێ د دەمێ نڤستنێدا غەدر ل وان كر، پێنج ژێ كوشتن و سەرێن وان بۆ دەمێ سێ رۆژان ل مووسلێ هەلاویستن، داكو ببنە عیبرەت بۆ هەركەسەكێ بەرسنگێ وان راوەستیت[٦٧].

ب ڤی رەنگی پرانییا دەڤەرێن سەر ب هەرێما جزیرێ یا سەر ب حەمدانییانڤە – ژ وان ژی دەڤەرا بەهدینان- كەتنە ژێر كونترۆلا بووەیهییان، ب ڤێ چەندێ ژی سەردەمێ حەمدانییان ب داویهات پشتی كو ژ ئەنجامێ شەرێن خۆ دگەل بووەیهییان تنێ مالخرابكرن و وێرانی ل پاش خۆ هێلای.

## ٢-شەرەنیخا بووەیهییان دگەل دەولەتا دۆستەكی ل دەڤەرا بەهدینان.

ل چارێكا داویێ ژ سەدسالییا چوارێ مشەختی/ دەهێ زایینی وەلاتێ كوردان زنجیرەكا شەرەنیخێن ناڤخۆیی د ناڤبەرا هێزێن هەرێمایەتی ل دەڤەرێ بخۆڤە دیتن، ئەڤ شەرەنیخە بوونە ئەگەرێ پێكهاتا هندەك هێزان ژ سەر مەیدانێ بەرزە ببن و هندەكێن دیتر بێنە پێش، ژ وان هێزێن ژ نوو هاتینە پێش دەولەتا

دۆستەکی بوو ئەوا سالا (٣٧٢مش/ ٩٨٢ز) ل سەر دەستێ میر باد کورێ دۆستەکی هاتیەدامەزراندن و دەستەلاتێ وێ دەڤەرێن بەرفرەهـ ڤەگرتین و سنوورێ وێ گەهشتیە مووسلێ و هندەك دەڤەرێن بەهدینان[١٨] و رۆلەکێ بەرچاڤ د روودانێن سیاسی و لەشکەریدا گێرای دەمێ بووەیهییان دەست ب سەر مووسلێ و هەموو دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە دا گرتی، ئەڤێ ژی رێخوشکر شەرەنیخەکا نوو د ناڤبەرا دەولەتا دۆستەکی و بووەیهییاندا سەرا دەڤەرێن کوردنشین – ژ وان ژی دەڤەرا بەهدینان- پەیدابییت، دەسپێکا ڤێ شەرەنیخێ د زڤریتەڤە سالا (٣٦٧مش/ ٩٧٧ز) دەمێ عەزدولدەولەی دەست ب سەر مووسلێ دا گرتی و حەمدانی شکاندین، ب لەز میر و مەزنە کەسایەتییان بەرێ خۆ دا بووەیهییان و تاگریا خۆ بۆ وان و ئالیگریا خۆ بۆ دەستەلاتێ وان دیارکر، میر باد ئێك ژ ڤان میران بوو، دەمێ عەزدولدەولەی میر باد دیتی ژێ ترسیا و بزاڤا گرتن و کوشتنا وی کر، و گۆت « ئەڤ مرۆڤە مرۆڤەکێ ب هێز و چاڤنەترس و شەرخواز و غەدارە، نابیت بمینتە ساخ...» بەلێ بادی هەست ب ڤێ چەندێ کر و ب لەز ژ مووسلێ دەرکەت و بەرەڤ دیاربەکرێ چوو[١٩] .

دەمێ ل سالا (٣٧٢مش/٩٨٢ز) عەزدولدەولەیێ بووەیهی وەغەرا داویێ کری میر بادی دەست ب بەرفرەهکرنا سنوورێن دەستەلاتێ خۆ کر، دەست ب سەر ئامەدێ، میافارقینێ، حەسکێفێ[٧٠]، نسێبینێ و جزیرێ دا گرت، دەمێ ئەباکالیجار کورێ عەزدولدەولەی یێ ناڤدار ب سومسامولدەولە (صمصام الدوله) (٣٧٢- ٣٩٢مش/ ٩٨٢- ١٠٠٢ز) هەست ب وێ مەترسێ کری یا میر باد دروستدکەت، لەشکەرەکێ مەزن بۆ شەرێ وی بەرهەڤکر، سالا ٣٧٣مش/ ٩٨٣ز) لەشکەرێ هەردو ئالییان ل دەڤەرا بەهدینان ل گوندێ باجلێ (باجلایا) گەهشتنە ئێك و شەری دەسپێکر، شەر ب شکەستنا لەشکەرێ بووەیهییان و گرتنا هژمارەکا زۆرا چەکدارێن وان ب داویهات، هەلبەستڤانەکێ کورد ب ناڤێ ئەبو عەبدوللا ئەلحسێن کورێ داودێ بەشنەوی (ل دەوروبەرێن سالا (٤٦٥مش/ ١٠٧٣ز مریبە) هەلبەستەك ب مێر خاسی و قارەمانیا بەشنەوییان ڤەهاندیە تێدا هاتییە

**البشـــنویه أنصار لدولـتکم**
**ولیس فی ذا خفا فی العجم والعرب**
**أنار باد بأرجیش وشیعته**
**بظاهر الموصل الحدباء فی العطب**
**بباجلایا جلونا عنه غمغمه**
**ونحن فی الروع جلائون للکرب**[٧٢]

پشتی سەرکەتنا میر بادێ دۆستەکی ل سەر لەشکەرێ بووەیهییا دەستڤە ئینای رێك ل بەر وی هاتەڤەکرن بەرەڤ مووسلێ بچیت، ئەو بوو ل سالا (٣٧٣مش/ ٩٨٣ز) و پشتی کو خەلکێ مووسلێ ب خۆ ژی هاریکاریا وی کری لەشکەرێ میر بادی چوو د ناڤ مووسلێ دا، ئەڤە ژی ل دووڤ ئارەزوویا وان بوو کو ژ دەستەلاتێ بووەیهییان رزگار ببن، پشتی میر بادی سەروبەرێ کارگێرێ مووسلێ رێکئێخستی، خۆ دەستڤالا کر دا کونترۆلێ ل سەر دەڤەرێن دەوروبەرێن مووسلێ بکەت و باجا وان وەرگریت، گومان تێدا نینە کو دەڤەرا بەهدینان ژی کەتە د سنوورێ مولکداریا وی دا و وی نوونەرێن خۆ بۆ حوکمداریێ دانانە وێرێ[٧٣].

پشتی سەرکەتنا میر بادی د کریارێن لەشکەرێن ئاماژە پێکریدا هزر ل وێ چەندێ کر دەستەلاتێ خیلافەتا عەباسی ژ دەستێ بووەیهییان دەرێخیت، ئەڤە ژی دا ب گرتنا بەغدا و دەرێخستنا دەیلەمیان ژێ بجههێت، دەمێ ئەڤ نووچەیە گەهشتینە بەغدا سەمسامولدەولەی لەشکەرەکێ مەزن بۆ ژناڤبرنا میر بادی بەرهەڤکر، ئەو لەشکەر بەرەڤ مووسلێ کەتە رێ، باد ب لەشکەرێ خۆڤە دەرکەتنە پێشیا وی لەشکەری، ل سالا (٣٧٤مش/ ٩٨٤ز) شەرەکێ مەزن و دژوار دناڤبەرا هەردو ئالیاندا رووداز ئەنجامێ شەری شکەستنا لەشکەرێ بادی و ڤەکشیانا وی ژ مووسلێ و پەنا برنا وی بۆ ئامەدێ و خۆ ئاسێکرنا وی

بوو ل وێرێ، بەلێ بووەیهی ژی نەشیان سەركەتنەكا لەشكەریا مەزن ل سەر وی دەستڤە بینن، ئەو بوو میر باد جارەكا دی زڤریڤە مووسلێ، لەوما ژی بووەیهی ناچار بوون دانوستاندنان دگەل وی بكەن، ل سالا (٣٧٤مش/ ٩٨٤ز) میر باد ب پێكهاتنێ دگەل بووەیهییان رازی بوو، ل دووڤ پێكهاتنێ دیاربەكر و نیڤا تورعابدین[٧٤] بۆ میر بادی[٧٥] مان، ب ڤێ چەندێ جارەكا دی دەڤەرا بەهدینان كەتەڤە ژێر دەستەلاتێ بووەیهییان.

پشتی ڤێ پێكهاتنێ مووسل كەتە دناڤ دەستەلاتێ بووەیهییاندا، وان ژی سەعەد كورێ محەمەدێ حاجب (سالا ٣٧٧مش/ ٩٨٧ز مریبە) كرە والیێ باژێری، ژ بەر سەرەدەریا وی یا دژوار و خراب خەلكێ مووسلێ حەز ژوی نەدكر، د ئەنجامدا تەناهیا باژێری ئالوزیا، كوردێن هەكاری ئەڤ سەروبەرە ب دەلیڤە دیت، ل سالا (٣٧٦مش/ ٩٨٦ز) ژ نشكەكێڤە هێرش برە سەر مووسلێ و دەوروبەرێن وان تالانكرن و بەرێێن خەلكێ باژێری بەرتەنگكر و دەست ب سەر گەلەك سامان و دراڤی دا گرت، د ڤی دەمیدا میر باد ل حەسكێڤێ بوو وی خۆ ب خودانێ مووسل و پارێزەرێ خەلكێ وێ دزانی، لەوما ژی دەمێ ب ڤێ هێرشێ زانی ئەو ب لەشكەرێ خۆڤە ب لەز دەركەتن و بەرەڤ مووسلێ هاتن، ب شەڤێ هێرش ئینا سەر كوردێن هەكاری و پرانیا وان كوشتن و خەلكێ مووسل ژ بەلا وان رزگاركرن و دراڤی وان بۆ وان زڤراندەڤە، لەوما ژی خەلكێ مووسلێ گەلەك حەز ژ وی كر[٧٦].

ل سالا (٣٧٩مش/ ٩٨٩ز) هندەك ژ میرێن حەمدانییان كارەكێ خورت بۆ زڤراندنەڤا مووسلێ بۆ ژێر دەستەلاتێ حەمدانییان كر، هەردو میرێن حەمدانی ئەبو عەبدوللا ئەلحسێن و ئەبو تاهر ئیبراهیم كورێن ناسرولدەولەی دلێ هندێ هەبوو دەستەلاتێ خۆ ل دەڤەرێ بزڤریننەڤە، هەردو ناڤبری د خزمەتا شەرەفولدەولە كورێ عەزدولدەولەی بوون ل بەغدا، دەمێ شەرەفولدەولە مری وان ژ برایێ وی (بەهائولدەولە (٣٧٩- ٤٠٣مش/ ٩٨٩- ١٠١٢ز)

ی خواست رێكێ بدەتە وان بچنە مووسلێ، وی ژی مۆلەت دایێ، پاشتردەستەلاتێ بووەیهی ب مەترسیا چوونا ڤان دوبران بۆ مووسلێ زانی، بەهائولدەولەی ڤیا ب لەز دەست ب سەر سەروبەریدا بگریت، ئەو بوو پەیام بۆ والیێ مووسلێ هنارت نەهێلیت ئەو دو برایە بێنە د ناڤ مووسلێ دا، دەمێ خەلكێ مووسلێ گوهـ ل زڤرینەڤا ڤان دو میران بووی هاریكاریا وان كر كو بێنە د ناڤ باژێری دا، پاشتر هەردو برا ب هاریكاریا خەلكێ باژێری والیێ بووەیهی و بێن دگەلدا ژ باژێری دەرێخستنە بەغدا، ب ڤێ كریارێ جارەكا دی دەستەلاتێ بووەیهییان زڤریڤە مووسلێ[٧٧].

پشتی كو ئەبو عەبدوللا ئەلحسێن و ئەبو تاهر ئیبراهیمی مووووسل كونترۆلكری، میر بادی تەماعا مووسلێ كر، بەرهەڤی بۆ چوونا مووسل و داگیركرنا وێ كرن، پەیوەندی دگەل خەلكێ وێ كرن دا پشتەڤانیا وی بكەن، هندەك ژ وان ل دووڤ پەیوەندییا وی هاتن، میر باد دگەل لەشكەرەكی كو ل دووڤ گۆتنا (الروذراوی- ل سالا ٤٨٧مش/ ١٠٩٤ز مری) ژ (شەش هزار كوردان ژ جورێن جودا)[٧٨] پێكدهات بەرەڤ مووسلێ كەتە رێ، رێكا ئالیێ رۆژهەلاتی یێ رووبارێ دیجلە گرتە بەر، ئەڤە ژی ژبەر وێ چەندێ بوو كو ئەڤ ئالیە نێزیكی چیایێن دەڤەرا بەهدینان بوو داكو د دەمێ شكەستنێدا زوو بەرەڤ وان چیان ڤەكشییێت، د هەمان دەمدا ژی داخوازا هاریكاریا ژ خودانێ، كەلایێن كوردان ل دەڤەرێ كر[٧٩].

دەمێ میر باد گەهشتیبە ئالیێ رۆژهەلاتێ مووسلێ، كورێن ناسرولدەولەی دیتن وان شیانێن وی نینن و باوەریەكا موكم هەبوو كو لەشكەرێ حەمدانی ب تنێ نكاریت خۆ ل بەر لەشكەرێ بادی بگریت، لەوما پەیام بۆ میرێ بەنی عوقەیل ئەبا الذوئاد (ابی الذؤاد ) محەمەد كورێ ئەلموسەیبی (٣٨٠- ٣٨٧مش/ ٩٩٠- ٩٩٧ز) هنارتن و ژێ خواست هاریكاریا وان بكەت د شەرێ میر بادی دا، وی ژی بەرامبەر ڤێ چەندێ كرە مەرج ل سەر وان كو بۆ وی دەست ژ هندەك باژێرێن ژێر دەستەلاتێ خۆ وەك جزیرێ و نسێبینێ و بەلەد و هندەكێن دی بەردەن،

ئەو ژی ل سەر ڤان مەرجان رازیبوون، ئەو بوو میر ئەبو تاهرێ حەمدانی کەتە د شەریدا دگەل لەشکەرێ میر بادی و برایێ وی ئەبو عەبدوللایێ حەمدانی چوو جەم میر محەمەد کورێ ئەلموسەیبێ عوقەیلی و پێکهاتن ب مەرەما دووڕێچدانا لەشکەرێ میر بادی کو یێ مژوولی شەرێ میر ئەبو تاهرێ حەمدانی بوو ژ پشتێ ڤە ژ رووبارێ دیجلەی دەرباز بن، دەمێ میر بادی ب ڤێ پلانێ زانی ڤیا بەرەف پاش ڤەکشیێت داکو پشتا خۆ بدەتە چیایێ نێزیکی ئەوێ دکەڤیتە هنداڤ دەشتێ و ب چیایێ ئەلقوش دهێتەناڤکرن، بەلێ حەمدانییان زوو تر دەستێ خۆ دانا و ل دوورێن وی زڤرین لەوما ژی ئالوزی کەتە ناڤ لەشکەرێ میر بادی و دەرگەڤانێ (حاجب) وی عەبدوللا یێ ناڤدار ب (عروس الخیل) هاتەکوشتن، میر باد ب کوشتنا وی زۆر عاجز بوو و شەر د ناڤبەرا هەردو ئالیاندا گەرم بوو، هەسپێ میر بادی د شەریدا هەلنگفت، ڤیا ل هەسپەکێ دیتر سوار بیت، بەلێ کەتە سەر عەردی و هەستیێ ملێ وی شکەست و ب دژواری بریندار بوو، زەلامێن وی ئەوێ بریندار هێلا د مەیدانا شەریدا و بەرەف چیا ڤەکشیان، پشتی کو بەنو عوقەیلییان گەلەك ژێ کوشتین، میر باد ما دناڤ بریندارراندا هەتا کەسەك ژ بەنوعوقەیلیان ب سەر هەلبووی و ئەو کوشتی و سەرێ وی بۆ حەمدانییان بر، پاشتر تەرمێ وی برنە مووسلێ و ل ئاڤاهیێ میرگەهێ هەلاویستن، خەلکێ مووسلێ ب ڤێ کریارێ رازی نەبوون و رابوونە سەر خۆ و گۆتن: «ئەو کەسەکێ سەرلەشکەرە نابیت زێدەگاڤی ل سەر تەرمێ وی بێتەکرن» و ئەو ئینانە خوار و پشتی کفنکری نڤێژ ل سەر کرن و ڤەشارت، پرانییا خەلکێ ب کوشتنا وی خەمبار بوون و بەهی بۆ دانا و پێ دگۆت و بۆ دکرە گری، ئەگەرێ خۆشتڤیاتیا خەلکێ مووسلێ بۆ میر بادی ئەو بوو کو ئەو کەسایەتیەکێ ناڤدار بوو ل دەڤەرێ و د وی دەمیدا ژ مەزنترین موجاهیدین موسلمان بوو دژی رۆمێن بیزەنتی، هێرش دبرنە سەر دەڤەرێن سنوورێن رۆمان و ل دەڤەرا ئامەدێ بەرگری ژ خاکێ ئیسلامێ (دار الاسلام) دکر، پرانییا دیرۆکنڤیسان پێکهاتینە کو کوشتنا میر بادی ل سالا (٣٨٠مش/ ٩٩٠ز) بوو[٨٠].

کوشتنا میربادی ژ گرنگترین ئەنجامێن شەرێن ناڤبەرا دەولەتا دۆستەکی و مەروانی دا روودابن، کوشتنا میربادی و ڤەگوهاستنا دەستەلاتی بوو ژ مالباتا دۆستەکی بۆ مالباتا بەنو مەروانی، ژبەرکو میر بادی پەیوەندیێن سیاسی و لەشکەری دگەل حەمدانییان هەبوون و کار بۆ هندێ دکر مفای ژ سەروبەرێ دەوروبەرێن خۆ وەرگریت و دەستەلاتێ حەمدانییان ل مووسلێ و دەڤەرێن کوردی ب داوی بینیت، ژ ئالیەکێ دووڤە یەك ژ ئەنجامێن ڤی شەری شکەستنا دوا بزاڤا حەمدانییان بوو سەخمەرەت ڤەژاندنا میرگەها خۆ ل مووسلێ، ئەو بوو ئەو ل سەر دەستێ میر محەمەد کورێ ئەلموسەیبێ عوقەیلی ژناڤچوون دەمێ ب لەشکەرێ خۆڤە هێرش ئینایە سەر مووسلێ و ب هەمووو دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە گرتین، ب ڤێ کریارێ ژی ژ سالا ٣٨٠مش/٩٩٠ز) یڤە دەڤەرا بەهدینان کەتە د ناڤ دەڤەرێن سەر ب میرگەها عوقەیلی ڤە[٨١] .

## ٣-شەرەنیخا عوقەیلییان دگەل هندەك میرگەهێن کوردان و خودان کەلاییێن دەڤەرا بەهدینان.

مالباتا عوقەیلییان ئانکو بەنو عوقەیل یەك ژعەشیرەتێن مەزنێن عەرەبانە د بنیاتدا ژ عەشیرەتێن موزەری (المضریه)[٨٢]نە، دگەهنە بابکالکێ خۆ ئەلموقەلیدولئەکبەر کورێ جەعفەر کورێ عومەر کورێ ئەلمیهەنی کورێ عەبدولرەحمان کورێ یەزید کورێ عوقەیلێ کورێ کەعبێ کورێ رەبیعەیێ کورێ عامرێ کورێ صەعصەعەی ژ عەرەبێن عەدنانی یان ژووری نە[٨٣]، بنەکۆکا وانا بەراهیێ ژ بەحرەینێ یە، بەنو توغلوب و بەنو سەلیم دگەل وان ژیانە، شەری د ناڤبەرا بەنو توغلوب و بەنو عوقەیلییاندا

روودا د ئەنجامدا توغلوبی سەركەتن و بەنو عوقەیل ژ بەحرێنێ دەرێخستن و بەرەف وەلاتێ شامێ و جزیرێ و هەرێما جزیرێ چوون، بوونە ڤەحەواندیێن حەمدانییان خویك ددا وان و دگەل وان پشكداری د شەراندا دكر[٨٤].

بەری دروستبوونا میرگەها عوقەیلی ل مووسلێ عوقەیلییان رۆلەكێ بەرچاڤ د بۆیەرێن ل وەلاتێ شامێ و عیراقێ و وەلاتێ جزیرێ رووددان هەبوو و خودان پەیڤا خۆ بوون د بۆیەرێن وان وەلاتاندا، كەسایەتیێن ناڤدار ژ وان رابوون وەك نەسر كورێ شەبیبێ عوقەیلی (نصر بن شبث العقیلی) (سالا ٢١٠مش/٨٢٥ مریە) ئەوێ ل سالا (١٩٨مش/ ٨١٣ز) بزاڤەك دژی دەستەلاتێ فارسان د ناڤ دەولەتاعەباسی دا رابووی[٨٥]، هەروەسان ل وەلاتێ شامێ كەسایەتیەك ب ناڤێ زالم كورێ مەوهوبێ عوقەیلی ژ وان رابوو، ئەوێ د ناڤبەرا سالێن (٣٥٧- ٣٥٨مش/ ٩٦٧- ٩٦٨ز) باژێرێ دیمەشقێ ئێخستیە ژێر دەستەلاتێ خۆ، پاشتر ژی دەمێ قەرامەتیان وەلاتێ شامێ ل سالا (٣٦٠مش/ ٩٧٠ز) گرتییە دەست وی ب ناڤێ وانڤە حوكمداری ل شامێ دكر، پشتی ڤێ ژی ل سالا (٣٦٣مش/ ٩٧٣ز) ب ناڤێ فاتمییان حوكمداری ل ڤی باژێری دكر[٨٦]، ئەڤ هەمموو روودانە هاندەر بوون رۆلێ عوقەیلییان ل دەڤەرێ بهێز بكەڤیت و بەرهەڤی كرن كو دەستەلاتداریەكا تایبەت ب خۆ ل وێرێ دامەزرینن، ب تایبەت پشتی كو حەمدانی ل مووسلێ لاوازبووین و مووسل و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە ل سالا (٣٨٠مش/ ٩٩٠) كەتنە ژێر دەستەلاتێ بەنو عوقەیلییان.

پشتی كو ل سالا (٣٨٠مش/ ٩٩٠ز) بەنوعوقەیلییان د حوكمداریا وان دەڤەراندا شوونا حەمدانییان گرتی و هەتا ژناڤچوونا دەستەلاتێ دەولەتا بوووەیهی ل سالا (٤٤٧مش/ ١٠٥٥ز) وانا رۆلەكێ سیاسی لەشكەرێ بەرچاڤ ل وان دەڤەران _ ژ وان ژی دەڤەرا بەهدینان- دگێرا، ژبەركو عوقەیلییان دەڤەرا بەهدینان ب دەڤەرەكاسەر بخۆڤە دهژمارت و خۆ ب پارێزڤانێن وێ دزانی، هەرچەندە د وی سەردەمیدا گەلەك گرنگی ب تووماركرنا دەنگوباسێن بەهدینان نەهاتییەدان، پێزانین ل دوور وێ قوناغێ دكێمن، ئەوا هەی ژی تایبەتە ب بەرچاڤكرنا رۆلێ هندەك میرێن دەڤەرا بەهدینان د هەڤركیێن ناڤخۆیی و دەرڤەیێن عوقەیلییاندا، ژبەركو كوردێن دەڤەرا بەهدینان د وی سەردەمیدا بیوونە خەلكەكێ سەر ب وانڤە و دگەل وان پشكداری د شەراندا كریوو، ل سالا (٣٩٢مش/ ١٠٠١ز) موعتەمیدولدەولە ئەبو ئەلمەنیع قرواش كورێ ئەلموقەلیب كورێ ئەلموسەیبی (٣٩١-٤٤١مش/١٠٠٠-١٠٤٩ز) لەشكەرەكێ پێكهاتی ژ عوقەیلی و كوردان كو دگەهشتە حەفت هزار چەكداران برە شەرێ دەستەلاتداریا بوووەیهییان، شەری ل جهەكێ دبێژنێ (الصابونیە) ل نێزیكی كوفە روودا و سەركەتن باهرا بوووەیهییان بوو[٨٧]، گرنگیا ڤی شەری د یەككرتنا هێزێن عوقەیلی- كوردی دایە دژی بوووەیهییان، ئەڤە ژی گرۆڤێ بوونا هەڤكاریەكا باشە د ناڤبەرا هەردو ئالیاندا.

وەسان دیارە نیازێن عوقەیلییان د سەردەمێ هێزداریا واندا بۆ بەرفرەهبوونێ ل دەڤەرێن كوردان رێ دا هندێ كو دگەل چەند میرگەهەكێن كوردی وەك میرگەها مەروانیان بكەڤنە بەرامبەر یەك، ب رەنگەكی هەر ژ دەسپێكێ ئەو بەردەوام د كاودانێ شەریدا بوون دگەل مەروانیان و ئەڤ سەروبەرە هەتا قوناغێن پاشتر پێ بەردەوام بوو، هەرئێكی ژ وان دڤیا سنوورێ دەستەلاتێ خۆ ل سەر سنوورێ یێ دیتر بەرفرەه بكەت ب تایبت ژی ل دەڤەرا بەهدینان، ئەو بوو ل سالا (٤٤٠مش/ ١٠٤٨ز) ی میر قرواشێ عوقەیلی بەرهەڤی بۆ هێرشەكێ بۆ سەر میرگەها مەروانیان كرن، بۆ ڤێ مەرەمێ داخوازا هاریكاریێ ژ كوردێن حەمیدی و هەزبانی كر، ئەبا ئەلحەسەن كورێ عیسكانی مەزنێ كوردێن حەمیدی ل ئاكرێ ل دووڤ داخوازا وی هات و ئەو ب خۆ چوو مووسلێ، د هەمان دەمدا میرێ ئەربل ئەبو عەلی كورێ موسەكێ هەزبانی برایێ خۆ هنارتە هاریكاریا وان د شەریدا بەرامبەر نەسرولدەولەیێ كورێ مەروانی (٤٠٢- ٤٥٣مش/ ١٠١٢- ١٠٦١ز)، بەلێ وەسان دیارە میرقرواشێ عوقەیلی بێی شەر دگەل

نەسرولدەولەیێ مەروانی پێکهاتییە[٨٨].

ژ ئەگەرێ جهێ جوگرافیێ دەستەلاتداریا حەمدانییان پێدڤی بوو ل سەروان راستەوخۆ تێکەلیێ دگەل هندەك میرگەهێن کوردی وەك هەزبانیان و خودانێن کەلایێن کوردان ل دەڤەرا بەهدینان بکەن، ژبەرکو کورد ببوونە خەلکەکێ ژێر دەستەلاتێ وان، بڤێت و نەڤێت ئەڤە ژی دا ناکوکیێ دناڤبەرا هەردو ئالیاندا دروستکەت، ئەو بوو ل سالا (٤٤٠مش/١٠٤٨ز) ژ ئەنجامێ مایتێکرنا ئەبا ئەلحەسەن کورێ عیسکانێ مەزنێ حەمیدییان د هەڤرکیا ناڤبەرا مالباتا هەزبانییان ناڤبەرا کوردێن حەمیدی ل ئاکرێ و عوقەیلییان ئالوزیا، عوقەیلییان ئەڤ چەندە ب دەلیڤە دیت و خۆ ب پارێزڤانێن وێ مالباتێ دزانی و پەیوەندییا میرێ ئەربل ئەبو ئەلحەسەن کورێ موسکێ هەزبانی دگەل عوقەیلییان پەیوەندییەکا ب هێز بوو، دەمێ ئەو ب هاریکاریا ئەبا ئەلحەسەن کورێ عیسکانی حەمیدی ژ ئالیێ برایێ وی ئەبو عەلی کورێ موسکی ڤە ژ دەستەلاتێ میرگەهێ هاتییەلادان، میر قرواشێ عوقەیلی د بەرژەوەندییا ئەبو ئەلحەسەن هەزبانی دا مایتێکرن کر و کورێ عیسکانی حەمیدی گرت و دگەل پێکهات کو ئەو دێ وی ئازادکەت بەرامبەر ئازادکرنا ئەبوئەلحەسەنێ هەزبانی و زڤراندنەڤا وی بۆ سەر میرگەها وی، کورێ عیسکانی حەمیدی ب ڤان مەرجان رازیبوو و خێزان و کورێن خۆ و سێ کەلایێن خۆ وەك بارمتە هێلان هەتا ئەبا ئەلحەسەنێ هەزبانی رادەست دکەت، کورێ عیسکانێ حەمیدی ب مەرەما رادەستکرنا ئەربلێ بۆ ئەبو ئەلحەسەنێ هەزبانی پەیوەندی ب ئەبو عەلیێ هەزبانی ڤە کر و ئەو ژی رازی بوو و پێکڤە بەرەڤ مووسلێ چوون داکو دەستەلاتێ ئەربلێ بدەنەڤە دەست برایێ وی ئەبو ئەلحەسەنی، پشتی ڤێ پێنگاڤێ میر قرواشێ عوقەیلی بارمتەیێن کورێ عیسکانی ئازادکرن، ئەو بوو کورێ عیسکانێ حەمیدی و ئەبو ئەلحەسەنێ هەزبانی و برایێ وی ئەبو عەلیێ هەزبانی ب هەڤرا بەرەڤ ئەربلێ چوون دا کو دەستەلاتی رادەست بکەن، بەلێ د ڤێ ناڤبەرێدا کورێ عیسکانی و ئەبو عەلی پیلانەك ل سەر ئەبا حەسەنی بەرهەڤکربوو، ئەبا ئەلحەسەنی هەست ب ڤێ پیلانێ کر و هەڤالێن خۆ ل شوونا خۆ دگەل وان هنارتن داکو ژ پێش وی ڤە ئەربلێ وەرگرن، هەردوێن دی هەڤالێن ئەبا ئەلحەسەنی گرتن و بزاڤا گرتنا وی ژی کر بەلێ ئەو شیا برەڤیتە مووسلێ، ئەڤێ ژی ئالۆزیا ناڤبەرا عوقەیلییان و هەردی میرێن ئاکری و ئەربل پتر دژوار کر[٨٩].

هەروەسان میرێن عوقەیلی د هەڤرکی و ناکوکیێن خۆیێن ناڤخۆییدا مفا ژ میرێن کوردان وەرگرتییە، ل سالا (٤٤١مش/ ١٠٤٩ز) ناکوکی کەتە ناڤبەرا میر قرواشێ عوقەیلی و برایێ وی زەعیمولدەولە ئەبوکامل بەرەکە کورێ ئەلموقەلیدی (٤٤٢- ٤٤٣مش/ ١٠٥٠- ١٠٥١ز) و ئەڤ ناکوکییە گەهشتە شەرێ چەکداری، و هندەك ژ میرێن کوردان وەك سلێمان کورێ نەسرولدەولەیێ مەروانی و ئەبا ئەلحەسەن کورێ عیسکانێ حەمیدی و یێن دی پشتەڤانی ل میر قرواشێ عوقەیلی کرن و بەرەڤ مەعلاسایا (مالتایێ) چوون و تالانکرو ب سەرێکدا هەرفاند، و شەری د ناڤبەرا هەردو ئالیاندا ل دەڤەرا بەهدینان روودا بێی کو سلێمانێ مەروانی و کورێ عیسکانێ حەمیدی پشکداریێ تێدا بکەن و ئەو ژ قرواشی جودا بوون و چوونە جەم برایێ وی ئەبا کامل بەرەکەی و هندەك ژ وان شیان هندەکێ ژ لەشکەرێ قرواشی تالان بکەن، شەرێ ناڤبەرا هەردو برا ب سەرکەتنا ئەبا کاملی ب هاریکاریا میرێن کوردان ل سەر برایێ وی قرواشێ عوقەیلی و گرتن و دەستەسەرکرنا برایێ وی ل مووسلێ ب داوی هات[٩٠].

## پوختە

ل داویێ دشیاندایە بێژین دەڤەرا بەهدینان کەتییە ژێر باندۆرا ناکۆکی و شەرێن ناڤبەرا بووەیهی و هێزێن خۆجهی وەك میرگەها حەمدانی؛ و دەولەتا دۆستەکی ژ ئالیەکیڤە و ژ ئالیێ دووڤە ناڤبەرا کوردان و هێزێن حوکمداری ل دەڤەرێ دکرن وەك میرگەها حەمدانی و عوقەیلی، و هندەك ژ دەڤەرێن وێ ببوونە

گۆرەپانا شەرێ ناڤبەرا وان، وان شەران كاریگەریەك مەزن ل دەڤەرێ كر و بوو ئەگەرێ نەمانا تەناهیێ و تێكچوونا سەروبەرێ خەلكێ و ئەو خەلكە ب دەست رێژا زۆرا باج و خویكێن هەموو ئالییان دنالی، دهەماند دەمدا كەتبوو بەر هەوێن كوشتن و تالانكرن و دەربەدەری و برس و نەبوونێ، زێدەباری ڤێ هەموویێ ژی سەروبەرێ چاندنێ و بازرگانیێ ئێكجار لاواز ببوو و د ئەنجامدا چالاكیێن ئابوورییێن دەڤەرێن كوردنشین ب تایبەت خەلكێ دەڤەرا بەهدینان ب ئێكجاری ل كێمیێ دا بوو.

ب ڤی رەنگی پەیوەندییێن ناڤبەرا میرگەهێن كوردان و خودان كەلایێن دەڤەرا بەهدینان دگەل بووەیهییان ژ ئالیەكیڤە و دگەل حەمدانی و عوقەیلییان ژ ئالیێ دووڤە نە د سەقامگیر بوون، ب رەنگەكێ گشتی خولكێ دوژمناتیێ خۆ ب سەردا گرتبوو، ب ئالوزیێ دگەل حەمدانییان دەسپێكر پاشتر ب رەنگە باشبوونەكێ برێكا خزمینیێن سیاسی و هاریكارییێن لەشكەری بەردەوامی پێدا و حەمدانییان مفا ژ شیانێن كوردان یێن شەركرنێ و سروشتێ دەڤەرا وان وەردگرت و كوردان د شەراندا پشتەڤانییا وان دكر، هەروەسان حەمدانییان مفا ژ كەلایێن دەڤەرا بەهدینان وەرگرت كو ببوونە پەناگەهـ و ئاسێگەهێن وان د دەمێ تەنگاڤییاندا و مفا ژ وان جهێن سەخت و ئاسێ وەردگرت بۆ پاراستنا سەر و مالێن خۆ، سەرەرای ڤێ باشبوونا رێژەیی پشتی دەمەكی ب تایبەت سەردەمێ عوقەیلییان سەروبەر زڤریڤە نیگەرانی و ئالۆزیێ و یێ بێ شەر و لێكدان نەبوو و ئەڤ شەرە ژی ئەنجامێ ئارەزوویێن بەرفرەهكرنا دەستەلاتی یێ وان میران بوو.

## ژێدەر و پەراوێز:

١. مسكويه، أبو علي أحمد بن محمد بن يعقوب (٤٢١هـ/١٠٣٠م)، تجارب الأمم وتعاقب الهمم، اعتنى بالتصحيح: هـ.ف.أمدروز، مكتبة مثنى، (بغداد:د.ت)، ج٢،ص٢٨١.

٢. گرنگترینێ وان ڤەكولینێن ئەكادیمی: فوزيه يونس فتاح، علاقات الموصل مع الدولة العباسية (٢٩٢-٤٨٩هـ/٩٠٥-١٠٩٦م)، دار الدجلة، (عمان:٢٠١٠)؛ درويش يوسف حسن هروري، بلاد هكاري(٣٣٤-٧٣٧هـ/٩٤٥-١٣٣٦م) دراسة سياسية حضارية، مطبعة وزارة التربية، (اربيل:٢٠٠٥)؛ قادر محمد حسن، الامارات الكوردية في العهد البويهي- دراسة في علاقاتها السياسية والاقتصادية (٣٣٤-٤٤٧هـ/٩٤٥-١٠٥٥م)، مطبعة روزهەلات، (اربيل:٢٠١١)؛ روندك جبار جلبي، الكرد والحمدانيون (٢٥٤-٤١٤هـ/٨٦٨-١٠٢٣م) دراسة في العلاقات السياسية والحضارية، مطبعة الحاج هاشم، (اربيل:٢٠١٣).

٣. وەلاتێ دەیلەم: نێزیكی هەموو كەرتێن دكەڤنە باشوورێ دەریایێ خەزەر (قەزوین) وەك كەرتێن: گەیلان، تۆبرستان، قومس، جورجان و پشكەك ژ هەرێما چیان و هندەك پشكێن هەرێما ئازەربێجان و ئاران ڤەدگریت، بۆ زانیارییێن پتر بنێرە: : أبن حوقل، أبو القاسم النصيبي(ت ٣٦٧هـ/ ٩٧٧م)، صورة الأرض، ط٢،= = مطبعة بريل، (ليدن: ١٩٣٨)، ص ص٣٧٥-٣٩٨؛ المقدسي، أبو عبد الله محمد بن أحمد بن البناء البشاري(ت حوالي ٣٨٠هـ/ ٩٩٠م)، أحسن التقاسيم في معرفة الأقاليم، علق عليه ووضع حواشيه: محمد أمين الضناوي، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠٠٣)، ص ص ٢٦٧-٢٨٠.

٤. ابن البلخي(ت بعد ٥١٠هـ/ ١١١٦م)، فارس نامه، حققه وترجمه عن الفارسية وقدم له: يوسف الهادي، الدار الثقافية للنشر، (القاهرة: ٢٠٠١)، ص ٧٥؛ الفردوسي، حكيم أبو القاسم (ت ٤١١هـ/ ١٠٢٠م)، شاهنامه، ترجمها: عبد الوهاب عزام، دار الكتب المصرية، (القاهرة:د.ت)، ص٣٦٢؛ الثعالبي، أبو منصور عبد الملك بن محمد اسماعيل(ت ٤٢٩هـ/ ١٠٣٧م)، تاريخ غرر السير المعروف بكتاب غرر أخبار ملوك الفرس وسيرهم، مكتبة الأسدي، (طهران:١٩٦٣)، ص ٢٣٧؛ ابن الطقطقي، محمد بن علي بن طباطبا (ت ٧٠٩هـ/ ١٣٠٩م)، الفخري في الآداب السلطانية والدول الإسلامية، تحقيق وشرح: عبد القادر محمد مايو، دار القلم العربي، (حلب: ١٩٩٧)، ص ص ٢٧٠-٢٧١.

٥. ابن الأثير، عز الدين أبو الحسن علي بن أبي الكرم الجزري (ت ٦٣٠هـ/ ١٢٣٢م)، الكامل في التاريخ، تحقيق: أبي الفداء عبد الله القاضي، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٨٧)، مج٧، ص ص٨٧-٨٨؛ وفاء محمد علي، الخلافة العباسية في عهد تسلط البويهيين، المكتب الجامعي الحديث، (الاسكندرية: ١٩٩٠)، ص١٦.

٦. ابن الجوزي، جمال الدين أبو الفرج عبد الرحمن بن علي (ت ٥٩٧هـ/ ١٢٠٤م)، المنتظم في تاريخ الملوك والأمم، دراسة وتحقيق: محمد عبد القادر عطا ومصطفى عبد القادر عطا، ط٢، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٩٥م)، ج١٤، ص ص٤٢-٤٣؛ ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٧، ص ص٨٧-٨٨.

٧. بۆ پتر زانیاریان بنێرە: مسكويه، تجارب الأمم، ج٢،ص ص١١٥-ومابعدها؛ محمد حسين الزبيدي، العراق في العصر البويهي (التنظيمات السياسية والإدارية والاقتصادية) (٣٣٤ – ٤٤٧هـ/ ٩٤٥- ١٠٥٨م)، دار النهضة العربية، (بغداد: ١٩٦٩م)؛ وفاء محمد علي، الخلافة العباسية في عهد تسلط البويهيين، ص ص ١١-١٤١.

٨. ابن حزم، أبو محمد علي بن بن سعيد الأندلسي (ت ٤٥٦هـ/ ١٠٦٣م)، جمهرة أنساب العرب، دار الكتب العلمية، (بيروت:٢٠٠٣م)،ج٢،ص٣٠٣؛ فيصل السامر، الدولة الحمدانية في الموصل وحلب، مطبعة الإيمان، (بغداد: ١٩٧٠م)،ج١،ص٤٧؛ جواد علي، المفصل في تاريخ العرب قبل الإسلام، (بغداد: د.ت)، ج٤،ص٤٩٠.

٩. ابن حزم، جمهرة أنساب العرب،ج٢،ص٣٠٣؛ ابن خلكان،أبو العباس شمس الدين أحمد بن محمد (ت ٦٨١هـ/ ١٢٨٢م)، وفيات الأعيان وأنباء أبناء الزمان، حققه: إحسان عباس، دار صادر، (بيروت:١٩٩٤م)، ج٢،ص١١٤.

١٠. ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٦، ص ص٣٧٩، ٤٨٨؛ السامر،الدولة الحمدانية،ج١،ص ص ٢٧٠-٢٧٦.

١١. قەرامەتە(القرامطة)؛ سەر ب دامەزرێنەرێ خۆ حەمدان كورێ ئەشعەسی (الأشعث)نە یێ ب قورمت (قرمط) ئانكو چاڤسۆر هاتییەنیاسین، قەرامەتە ب بالێ لەشكەرێ شیعەیێن ئیسماعیلی دهێنەنیاسین، ئەوێن ل ژێرێ عیراقێ و یەمەنێ بەلاڤەبووین و دەولەتا خۆ ل بەحرەینێ دامەزراندنی. بۆ زانیاریێن پتر بنێرە: مصطفى غالب، القرامطة بين المد والجزر، دار الأندلس، (بيروت: د.ت)، ص ص ١١-ومابعدها؛ إسماعيل مير علي، القرامطة، دار مكتبة هلال، (بيروت: ١٩٨٣م)، ص ص ١٧-ومابعدها.

١٢. ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٧، ص ص٢٧، ٧٢، ١٦٣؛ رشيد عبد لله الجميلي، دراسات في تاريخ الخلافة العباسية،(بغداد:١٩٨٤م)، ص ص ٢٧٣-٢٧٥.

١٣. القرطبي، عريب بن سعد (ت ٣٦٦هـ/ ٩٧٦م)، صلة تاريخ الطبري، تحقيق: محمد أبو الفضل إبراهيم، ط٢،دار المعارف، (القاهرة:د.ت)،ص ٤٤.

١٤. السامر،الدولة الحمدانية،ج١،ص ١٨١؛ أحمد خليل، تاريخ الكرد في الحضارة الإسلامية، دار هيرو، (بيروت: ٢٠٠٧م)، ص١٨٣.

١٥. كەلا ئەرمشتی: دكەڤیتە سەر یەك ژ كومتێن چیایێ سپی و هنداڤ رووبارێ خابووری و دەشتا سندی ل باكوور و دەشتا سلیڤانەیی ل باشوور و گرەكێ ئاخێ بەرامبەرێ وێ یە، هێژ شوینەواریێن وێ ماینە، چەند كانی و ژوورێن ئاڤاهی لێ هەنە. بۆ زانیاریێن پتر بنێرە: دەرویش یوسف حەسەن هروری، كەلا ئەرمشتێ، كوڤارا دهۆك، كوڤارا سەرۆكاتیا بازێرڤانیا دهۆكێ، هژمار ٢٠، (دهۆك- ٢٠٠٣)، بپ ٣٣- ٤٣.

١٦. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢،ص ٣٩٢؛ ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٧، ص ٣١١.

١٧. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢،ص ٣٩٢.

١٨. المصدر نفسه ، ج٢،ص ٣٩٢.

١٩. ابن شداد، عز الدين محمد بن علي الأنصاري (ت ٦٨٤هـ/ ١٢٨٥م)، الأعلاق الخطيرة في ذكر أمراء الشام والجزيرة، حققه: يحيى عبارة، وزارة الثقافة والإرشاد القومي، (دمشق: ١٩٧٨م)،ج٣،ق٢،ص٥٤٢؛ فرهاد حاجي عبوش، المدينة الكوردية من القرن (٤ – ٧هـ/ ١٠- ١٣م) دراسة حضارية، دار سبيريز، (دهۆك:٢٠٠٤م)، ص٥٧.

٢٠. السامر،الدولة الحمدانية،ج١،ص ٢٥٧؛ الزبيدي، العراق في العصر البويهي،ص ص ٣١-٣٢.

٢١. نسێبین بازێرەكێ ئاڤایێ وەلاتێ جزیرێ یە، گرنگییەك مەزن هەبوو، ژبەركو دكەفتە سەر رێكا كاروانان د ناڤبەرا مووسلێ و وەلاتێ شامێ دا، جهەكێ پرێ ئاڤ و دەولەمەندە ب چەم و بیستانێن خۆ، بنێرە: ياقوت الحموي، شهاب الدين بن عبد الله الرومي الحموي (ت ٦٢٦هـ/ ١٢٢٨م)، معجم البلدان، دار صادر، (بيروت: ١٩٧٧م)، مج٥، ص ص ٢٨٨-٢٨٩.

٢٢. جورجان: بازێرەكە دكەڤیتە ناڤبەرا خوارزم و تبرستانێ(طبرستان)، گەلەك باران لێ دبارن و مشە رەنگێن فێقی لێ خرڤەدبن. بنێرە: ياقوت الحموي، معجم البلدان، مج٢، ص ص ١١٩-١٢٠؛ ابن سباهي زاده، محمد بن علي البروسوي (ت ٩٩٧هـ/ ١٥٨٩م)، أوضح المسالك إلى معرفة البلدان والممالك، تحقيق: المهدي عيد الرواضية، دار الغرب الإسلامي،

(بیروت، ٢٠٠٦)، ص ٢٦٦.

٢٣. رەی بازێرەکێ مەزنێ وەلاتێ دەیلەمە، دەولەمەند و خودان خێر و بێرە، ب تایبەت د بەرهەمئینانا پەمبی دا کو پتر دهنارتە عیراقێ. بۆ زانیاریێن پتر بنێرە: یاقوت الحموي، معجم البلدان، مج٣،ص ص ١١٦-١٢٢؛ ابن سباهي زاده، أوضح المسالك، ص ص٣٥٨-٣٥٩.

٢٤. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢،ص١١٥؛ ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٧، ص ص٢٢٧-٢٢٨.

٢٥. کواشێ: کەلایەکا سەخت و ئاسێ یە ل رۆژهەلاتێ مووسلێ تنێ رێکەک دچیتێ ئەو ژی بۆ زەلامەکی. یاقوت الحموي، معجم البلدان، مج٤،ص ٤٨٦؛ ابن سباهي زاده، أوضح المسالك، ص ٥٥٦. ئەڤ ژێدەرە داکوکیێ دکەت کو حەفتێ کانی لێ هەبوون، نها دکەڤیتە ناحیا باتیفێ و (١٠کم) ژسەنتەرێ قەزا سێمێلێ دوورە. بۆ زانیاریێن پتر بنێرە: درويش يوسف هروري، کەلا کواشێ، کۆڤارا دهۆك، هژمار ١٧، (دهۆك- ٢٠٠٢)، بپ ٢٩.

٢٦. زەعفەران: مەرەم ژێ دیرا زەعفەرانا ئەوا دکەڤیتە دانگا کەلا ئەرمشتێ، خەلکێ خودانی سامانەکی مەزن بوون، بۆ زانیاریێن پتر بنێرە: یاقوت الحموي، معجم البلدان،مج٢،ص٥١١.

٢٧. الكامل في التاريخ، مج٧، ص ٢٦٠.

٢٨. أبو زيد عبد الرحمن الحضرمي المعروف بإبن خلدون، (ت ٨٠٨هـ/ ١٤٠٥م)، تاريخ ابن خلدون المسمى العبر وديوان المبتدأ والخبر في تاريخ العرب والبربر ومن عاصرهم من ذوي الشأن الأكبر، تحقيق: خليل شحادة وسهيل عباس، ط٢، دار الفكر، (بيروت:١٩٨٨م)،ج٣،ص٥٢٦.

٢٩. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢،ص ٣٩٢.

٣٠. شنگال (سنجار) بازێرەکێ ناڤدارە ل دەڤەرێن جزیرێ، ژ باشترین بازێرانە و چیایێ وێ ژ باشترین چیانە، گەلەك بیستان لێ هەنە و دەولەمەندە ب ئاڤێ. بۆ زانیاریێن پتر بنێرە: یاقوت الحموي، معجم البلدان، مج٣،ص ص ٢٦٢-٢٦٣؛ ابن سباهي زاده، أوضح المسالك، ص ص٣٩٨-٣٩٩.

٣١. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢، ص ص١٧٠-١٧١؛ ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٧، ص٢٦٠.

٣٢. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢،ص ص١٧١-١٧٥؛ ابن العبري، أبو الفرج جمال الدين المطلي (ت ٦٨٥هـ/ ١٢٨٦م)، تاريخ الزمان، نقله إلى العربية: الأب إسحاق ارملة، قدم له: الأب جان موريس فييه، دار المشرق، (بيروت: ١٩٨٦م)، ص٦٠.

٣٣. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢، ص١٧٢.

٣٤. ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٧، ص٢٦١.

٣٥. کەلا شابانیێ: کەلایەکا ئاسێ یە، نها دکەڤیتە باکوورێ رۆژئاڤایێ بازێرکێ باتووفا کو ٢٥ کم ژ زاخۆ دوورە، بنێرە: درويش يوسف هروري و شڤان شوکری هروری، کەلا شابانیێ، کۆڤارا دهۆك، هژمار ١٤، (دهۆك- ٢٠٠١)، بپ ٣٣ و دووڤدا.

٣٦. کەلا هروری: ئاسێگەهەکا ئاسێ یە دکەڤیتە باکوورێ دەڤەرێن مووسلێ سەر ب وەلاتێ هەکاری ڤەیە، جهەکێ ئاڤی و دەولەمەندە ب خێر و بێرێن خۆ. بنێرە: درويش يوسف هروري و شڤان شوکری هروری، کەلا شابانیێ، کۆڤارا دهۆك، هژمار ١١، (دهۆك-٢٠٠٠) بپ ١٧- ٢٩.

٣٧. أنور المائي، الأكراد في بهدينان بحث تاريخي عن منشأ الأكراد وعقائدهم وعاداتهم وطبائعهم وآدابهم، ط٢، مطبعة خه بات، (دهۆك: ١٩٩٩م)، ص١٠٤.

٣٨. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢، ص١٧٥.

٣٩. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢، ص ٢٠٤ ؛ ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٧، ص ص ٢٨٢-٢٨٣.

٤٠. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢، ص ٢٠٤- ٢٠٥ ؛ ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٧، ص ص ٢٨٢-٢٨٣.

٤١. برقعيد: بازێرکەکە دکەڤیتە دەوروبەرێن مووسلێ ژ ئالیێ نسێبینێ ڤە بەرامبەری باشزێ، چەند کانیێن ئاڤا زەلال لێ هەنە شویرهە و بازار لێ هەنە، بنێرە: یاقوت الحموي، معجم البلدان، مج١،ص ص ٣٨٧-٣٨٨؛ ابن سباهي زاده، أوضح المسالك، ص ٢٠٦.

٤٢. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢، ص ٢٠٥؛ ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٧، ص٢٨٣.

٤٣. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢، ص ٢٠٦؛ ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٧، ص٢٨٣؛ السامر،الدولة الحمدانية،ج١،ص ٢٦٧ .

٤٤. درويش هروري، بلاد هكاري، ص ص ٨١-٨٢.

٤٥. ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٧، ص٣٠١؛ ابن شداد، الأعلاق الخطيرة، ج٣،ق١،ص٣٦.

٤٦. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢، ص ٢٥٥؛ ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٧، ص٣٠١.

٤٧. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢، ص ٢٣٨؛ ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٧، ص٣٠١.

٤٨. ا بن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٧، ص ص٣١١-٣١٣.

٤٩. كر (كێر) پیڤانەكا خەلكێ عیراقێ بوو، بەرامبەری شێست (قفیز) یان چل (اردب)ان بوو، (اردب) سەد و پێنجی كیلوگرامە، ب ڤی رەنگی هەر كرەك ١٥٠ ×٤٠ =٦٠٠٠كگم بۆ زانیاریێن پتر بنێرە: محمود الجليلي، المكاييل والأوزان والنقود العربية، دار الغرب الاسلامي، (بيروت:٢٠٠٥)،ص ص ٩٧-٩٩.

٥٠. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢، ص ٣١٨؛ ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٧، ص ص٣١٣، ٣٢١.

٥١. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢، ص ص٣٨٠-٣٨١؛ ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٧، ص ص ٣٧٧-٣٧٨.

٥٢. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢، ص ص٣٨٠-٣٨٣؛ ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٧، ص ص ٣٧٨-٣٨٠.

٥٣. بدليس: باژێركەكە دكەڤیتە دەڤەرا ئەرمەنیا نێزیكی خەلاتێ، گەلەك چەم و بیستان لێ هەنە، خۆدی كانیێن ئاڤێ و جوویێن وان د ناڤ باژێریدا دبۆرن، باژێرك دكەڤیتە ناڤبەرا چیان و ب سەرما و بەفرەكا دژوارە ل زڤستانان و ناڤدارە، بنێرە: ياقوت الحموي، معجم البلدان، مج١،ص ص ٣٥٨-٣٥٩؛ ابن سباهي زاده، أوضح المسالك، ص ١٩٧.

٥٤. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢، ص٣٨٦.

٥٥. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢، ص ٣٨٦؛ ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٧، ص ص٣٨١-٣٨٣.

٥٦. روحبة (الرحبة) باژێركەكە ل دەڤەرا دیاربەكرێ د كەڤیتە ناڤبەرا روقه و عانه، بۆ زانیاریێن پتر بنێرە: ابن سباهي زاده، أوضح المسالك، ص ٣٤٧.

٥٧. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢، ص ص٣٩١-٣٩٢.

٥٨. المصدر نفسه ، ج٢،ص ص٣٩٢-٣٩٣.

٥٩. المصدر نفسه ، ج٢،ص ص٣٩٢-٣٩٣.

٦٠. القاضي أبو علي المحسن بن علي المعروف بالتنوخي(ت ٣٨٤هـ/ ٩٤٤م)، كتاب الفرج بعد الشدة، تحقيق: عبود الشالجي المحامي، دار صادر، (بيروت: ١٩٧٥م)، ج٢، ص١٨٦.

٦١. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢، ص٣٩٣.

٦٢. تیراهی: ژ عەشیرەتێن ئێزدیانە، دەقەكێ ئارامی یێ ل سالا (٨٥٥مش/ ١٤٥١ز) ژ ئالیێ راهب رامیشوع ڤە هاتیەنڤیسین داكوكیێ ل سەر وێ چەندێ دكەت كو بابێ شێخ ئادی (الشيخ عدي) شێخێ ئێزدیان ژ كوردێن تیراهی بوویە، ل هاڤینان دچوونە زوزانان و زڤستان ژی ل دەوروبەرێن مووسلێ دبۆراندن، دەربارەی ڤێ چەندێ بنێرە: عبد الرزاق الحسني، اليزيديون في حاضرهم وماضيهم، منشورات المكتبة العربي،(بغداد:١٩٨٤)،ص ١٧؛ زرار صديق توفيق، القبائل والزعامات القبلية الكردية في العصر الوسيط، مؤسسة موكرياني (اربيل: ٢٠٠٧م)، ص٥٠.

٦٣. محمد أمين زكي بك، خلاصة تاريخ كرد وكردستان من أقدم العصور التاريخية حتى الآن، نقله إلى العربية وعلق عليه: محمد علي عوني، تقديم: كمال مظهر أحمد، دار الشؤون الثقافية (بغداد: ٢٠٠٥م)، ص ص ٢٠٦-٢٠٧؛ أنور المائي، الأكراد في بهدينان، ص١٠٤.

٦٤. مسكويه، تجارب الأمم، ج٢، ص ص٣٩٣-٣٩٤.

٦٥. ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٧، ص٣٩٠.

٦٦. بنێرە: الكامل في التاريخ، مج٧، ص٣٩٠.

٦٧. أنور المائي، الأكراد في بهدينان، ص١٠٤.

٦٨. بۆ زانیاریێن بەرفرەهتر دەربارەی ڤێ دەولەتێ بنێرە: الفارقي،أحمد بن يوسف بن علي بن الأزرق (ت بعد ٥٧٧هـ/١١٨١م)، تاريخ الفارقي، حققه: بدوي عبد اللطيف عوض، ط٢، دار الكتاب اللبناني (بيروت:١٩٧٤)؛ محمود ياسين التكريتي، الإمارة المروانية في ديار بكر والجزيرة، (رسالة ماجستير غير منشورة) مقدمة الى كلية الاداب، جامعة بغداد، (بغداد: ١٩٧٠)؛ عبد الرقيب يوسف، الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى، مطبعة الحوادث، ج١، (بغداد:١٩٧٢م)، ج٢، (أربيل:٢٠٠١م).

٦٩. الروذراوري، ابو شجاع ظهير الدين محمد بن الحسين (ت ٤٨٧هـ/ ١٠٩٤م)، ذيل كتاب تجارب الأمم،اعتنى بالنسخ والتصحيح: هـ.ف امدروز، مطبعة شركة التمدن الصناعية، (القاهرة:١٩١٦م)، ج٣، ص٨٤.

٧٠. حەسكیفێ (حصن كيفا)؛ باژێرك و كەلایەكا مەزنە دكەڤیتە هنداڤ رووبارێ دجلەی د ناڤبەرا ئامەد و جزیرێ دا، بۆ

زانیارییێن بەرفرەهتر بنێرە: یاقوت الحموي، معجم البلدان، مج۱،ص ص ۳۵۸-۳۵۹؛ سیبان حسن علي بنكلي، حصن كيفا- دراسة في تاريخها السياسي والحضاري، مطبعة وزارة التربية،(أربيل:۲۰۰۵).

٧١. باجلايا: ب كوردى دبێژنێ باجلێ، گوندەكە دكەڤیتە رۆژهەلاتێ باژێرێ زاخۆ ل ئالیێ چەپێ یێ رووبارێ خابووری، ئێك ژ وان رووبارانە یێن درژێینە سەر دجلەی، بنێرە: عبد الرقيب يوسف، الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى،ج۱، ص۹۲،هامش(۱).

٧٢. ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج۷، ص ص٤١٥، ٤٤٣.

٧٣. الروذراوري، ذيل كتاب تجارب الأمم، ج۳، ص٨٦.

٧٤. تور عابدين (طور عابدين)، باژێركەكێ سەر ب نسێبینێ ڤە یە ل ئالیێ چیاي، هنداڤی باژێرێ چیایێ جودی یە، مەلبەندێ دەڤەرا خۆیۆ. بنێرە: ياقوت الحموي، معجم البلدان، مج٤،ص ٤٨؛ ابن سباهي زاده، أوضح المسالك، ص ٤٥٩.

٧٥. الروذراوري، ذيل كتاب تجارب الأمم، ج۳،ص ٨٧.

٧٦. الروذراوري، ذيل كتاب تجارب الأمم، ج۳،ص ٨٥؛ الفارقي، تاريخ الفارقي، ص ص٥٥،٥٦

٧٧. الروذراوري، ذيل كتاب تجارب الأمم، ج۳،ص ص١٧٤-١٧٥؛ ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج۷، ص٤٤٠

٧٨. بنێرە: ذيل كتاب تجارب الأمم، ج۳،ص ١٧٦.

٧٩. ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج۷، ص ٤٤٣.

٨٠. الروذراوري، ذيل كتاب تجارب الأمم، ج۳،ص ص١٧٧-١٧٨؛ الفارقي، تاريخ الفارقي، ص٥٨؛ ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج۷، ص ص٤٤٣-٤٤٤.

٨١. ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج۷، ص ص٤٤٣-٤٤٤، ٤٤٦؛ خاشع المعاضيدي، دولة بني عقيل في الموصل والجزيرة، مطبعة شفيق، (بغداد: ١٩٨٦م)، ص٥٣.

٨٢. ستانلي لين بول، الدول الإسلامية، تصحيح: بارتولد وخليل أدهم، ترجمة: محمد صبحي فرزات، مكتبة الدراسات الاسلامية، (دمشق: ١٩٧٣م)، ق١، ص٣٢٩؛أحمد السعيد سليمان، تاريخ الدول الاسلامية ومعجم الأسر الحاكمة، دار المعارف، (مصر،د.ت)، ص٢٤٨.

٨٣. ابن خلكان، وفيات الأعيان ، ج٥،ص ص٢٦٠-٢٦١؛ فوزية يونس فتاح، علاقات الموصل مع الدولة العباسية، ص٩٨.

٨٤. القلقشندي،أبو العباس أحمد بن علي (ت ٨٢١هـ/ ١٤١٨م)، نهاية الأرب في معرفة أنساب العرب، تحقيق: علي الخاقاني، منشورات دار البيان، (بغداد:١٩٥٨م)، ص٣٣٨؛ خاشع المعاضيدي، دولة بني عقيل، ص ص ٢٧-٥٠.

٨٥. اليعقوبي، أحمد بن أبي يعقوب بن واضح الكاتب (ت ٢٩٢هـ/ ٩٠٤م)، تاريخ اليعقوبي، دار الصادر، (بيروت: ١٩٩٥م)، ج٢،ص ص٤٥٦-٤٥٩؛ خاشع المعاضيدي، دولة بني عقيل، ص٤٣.

٨٦. ابن القلانسي، ابي يعلي حمزة (ت ٥٥٥هـ/ ١١٦٠م)، ذيل تاريخ دمشق، تحقيق:هـ.ف. أمدروز، مطبع الآباء اليسوعيين، (بيروت: ١٩٠٨م)،ص٤؛ خاشع المعاضيدي، دولة بني عقيل، ص٤٥.

٨٧. هلال الصابيء، ابي الحسين هلال بن المحسن بن ابراهيم(ت ٤٤٨هـ/ ١٠٥٦م)، تاريخ الصابي، دار الكتب العلمية، (بيروت:٢٠٠٣)، ج٨،ص٥٢؛ خاشع المعاضيدي، دولة بني عقيل، ص ص٩٦-٩٧.

٨٨. ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٨، ص ص٢٨٤-٢٨٥؛ إبن خلدون، تاريخ ابن خلدون،ج٤،ص٢٦٣.

٨٩. الفارقي، تاريخ الفارقي، ص ص ١٦١-١٦٢؛ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٨، ص ص٢٨٤-٢٨٥.

٩٠. ابن الأثير، الكامل في التاريخ، مج٨، ص ص٢٨٧-٢٨٨؛ خاشع المعاضيدي، دولة بني عقيل، ص ص١٣٥-١٣٦.

# دروستبوونا میرگەهـ و میرێن کوردی ل بەهدینان

**د.زرار سەدیق توفیق**
**زانکۆیا دهۆك-کۆلیژا زانستێن مرۆڤایەتی**
**وەرگێران:موسەدەق توفی**

## ئێك: میرگەهێن سەردەمێ عەباسی

### أ- میرگەها حەمیدی

هەر وەکی پتریا میرگەهـ و دەستەلاتداریێن دی یێن کوردی، ب دروستاهی یا دیار نینە کا چەوا و کەنگی میرگەها حەمیدی هاتییە دامەزراندن، هەتا داویا سەردەمێ بوەیهی (سالا ٤٤٠مش/١٠٤٨ز)، چ بەحسێ میرێن ڤێ میرگەهی د مێژوویێ دا نەهاتییە تومارکرن، لێ هندەك دەنگوباس و پێزانینێن کێم دەربارەی ڤێ میرگەهێ د چوارچوڤێ هندەك بابەتێن دی دا هاتییە.

#### ١- مولکێن میرگەها حەمیدی

هەر ژ کەڤندا میرگەها حەمیدی ل دەڤەرا ئاکرێ و شۆشێ هژمارەکا کەلا و ئاسێگەهـ و چەپەر و گوندێن چیایی هەبوون، کەلا ئاکرێ کو ل سەر گرەکێ بلند بوو، کربوو سەنتەرێ رێڤەبرن و پایتەختێ سیاسی یێ میرگەها خۆ. هەتا ناڤێ ئاکرێ دگەل ناڤێ حەمیدیێ هاتییە گرێدان لەورا ب (عقر الحمیدیە) ئانکو ئاکرێ یا حەمیدیێ هاتییە ناڤکرن (معجم البلدان، ٣٧٢/٣، ١٣٩/٤، الکامل، ١٣/٩، صبح الاعشی، ٣٢٩/٤) و بوویە خودان میرگەهەکا نیمچە بەرزە و نەدیار هەروەکی هندەك عەشیرەتێن دی یێن کوردی یێن جیرانێن وان وەك عەشیرەتا هەزبانی ل ئەربیلێ و عەشیرەتا هەکاری ل ئامێدیێ و عەشیرەتا داسنی ل وەلاتێ داسن (دهۆك) و عەشیرەتا زەرزاری ل خەفتیان (رەواندوز).

و ل سەر زمانێ ئیبنولئەسیری (أبن الآثیر) هاتییە ((هەمی کەلایێن کوردێن حەمیدی)) (الکامل، ٨/ ٣٤٣) و ((هەمی کەلایێن کوردێن حەمیدی و ویلایەتێن وان)) (التأریخ الباهر،ص٤٨)، ژبلی کەلا ئاکرێ، چەندین ئاسێگەهـ و کەلایێن دی ل دەڤەرێن دەوروبەری وێ هەبوون، وەك کەلا شوشێ یا بناڤودەنگ کو ل سەر گرەکێ بلند هاتییە ئاڤاکرن و نێزیکی ١٢ فەرسەخان/ ٦٥ کیلومەتران ژ مووسلێ دویرە (الکامل، ٣٥٠/٩)، و دکەڤیتە ئالیێ رۆژئاڤایێ ئاکرێ ل سەر رێکا ئاکرێ-دهۆکێ، یاقوت ئەلحەمەوی دەربارەی ئاکرێ دبێژیت

((کەلایەکا مەزنا گەلەك بلندە... ژ ئاکرێ بلندتر و مەزنترە لێ د قەدەرێ خۆدا نە ل ئاستێ وێ یە)) ((قلعة عظيمة عالية جدا... هي اعلى من العقر واكبر منها ولكنها في القدر دونها)) (معجم البلدان، ٣٧٢/٣).

بەشەکێ گرنگ یێ ناڤودەنگیا دەڤەرا شۆشێ دزڤریت بۆ بەرهەم ئینانا دنکێن هنارا شوشێ کو ل گوندێ (شەرمله) یا راست (شەرِمن)ە د هاتە بەرهەم ئینان (معجم البلدان، ٣/ ٣٧٢، تقويم البلدان، ص٢٧٤).

هەردیسان دشیاندایە دەڤەرا بەرفرەها (مرج) بدەینە دگەل وەلاتێ حەمیدیان کو دەشتاهییەکە و هژمارەکا مێرگ و گوندان ب خۆڤەدگریت و کەلایێن بلند ل سەر چیایێن وێ هەبوون، سەر ب ڤێ میرگەهێ ڤەبوون (معجم البلدان، ١٠١/٥)، هەردیسان گوندێ عومران (عمراني) گوندەکێ مەزنێ هەڤسنوورە دگەل شۆش و مرج و جهێ چاندنێ و مێوێن تریە. (معجم البلدان، ٤/ ١٥٣).

ل سەردەمێ مەغولیان، ئاکرێ دهاتە هژمارتن دەڤەرەکا خودان ئاخەکا ب بەرەکەت و هەوایەکێ پاقژ و ساخلەم، هەردیسان یا ناڤدار بوو ب بەرهەم ئینان فێقی ب تایبەت تری و دروستکرنا ڤەخوارنان وبازرگان ب ڤان بەرهەمان دکر، داهاتێ بەرهەمێ وان ل داوییا سەردەمێ مەغولی گەهشتبوو ٢٧,٤٠٠ دیناران (نزهة القلوب، ص ١٥٩) و ل وی دەمی بەرهەمئینانا ڤەخوارنان ژ کارێن جوویان بوو کو بەشەکێ گرنگ ژ ئاکنجیێن ئاکرێ پێکدئینا و نێزیکی ٢٠٠ مالێن وان ل وێرێ هەبوون. (شرفنامه، ص ٢٥٧).

## ٢-میرێن میرگەها حەمیدی

### ١- میر ئەبوئەلحەسەن کورێ عیسکانێ حەمیدی:

ل داوییا سەردەمێ بوەیهی، میر ئەبوئەلحەسەن کورێ عیسکانێ حەمیدی خودانێ کەلا ئاکرێ بوو ئەوی ناکۆکی دگەل جیرانێ خۆ و خودانێ ئەربیلێ ئەبا ئەلحەسەن سلار کورێ موسکێ هەزبانی هەبوو، لەوما هاندانا برایێ وی ئەبا عەلی کورێ موسەکی دژی وی کر و پشتەڤانی لێکر داکو ئەربیلێ ژ دەستێن وی بینتەدەر. ئەوبوو ئەبا عەلی کورێ موسەکی دەست ب سەر ئەربیلێ دا گرت و سلار گرت و کرە دزیندانێڤە، هەردو میرگەهێن ئاکرێ یا حەمیدی و میرگەها ئەربیلێ یا هەزبانی پێگیری دەستەلاتێ میرێن میرگەها عەقیلی بان (٣٨٦ – ٤٨٩مش/ ٩٩٦ – ١٠٩٦م)بوون و گوهداریا وان دکر، دەمێ میر قەرواش کورێ موقەلدێ عەقیلی هەست ب پێشڤەچوونێن ناکۆکییا ناڤبەرا حەمیدی و هەزبانیان کری، ژ ڤی کریاری نەرازیبوو و خۆ ژ ئەبوئەلحەسەن کورێ عیسکانێ حەمیدی تۆرەکر و هوشداری دایێ ژبەر مایتێکرنا وی د کاروبارێن ناڤخۆیێن میرگەها هەزبانی یا سەر ب وی ڤە، و داخاز ژێ کر کو کەلا ئەربیلێ ب زڤرینتەڤە بۆ میر سلاری و شەرێ وان کەسان بکەت یێن پشتەرێ بووین، پاشی ئەبوئەلحەسەنێ حەمیدی ب مەرجێن میرێ عوقەیلی رازیبوو و کەلا وی بۆ زڤراند و لێ دەمێ میر سلار زڤریەڤە بۆ ئەربیلێ د رێکێ دا هەردو سەرکردان ئەبوئەلحەسەنێ حەمیدی و ئەبو عەلیێ هەزبانی خیانەت لێکر لەورا سلار زڤریڤە مووسلێ و هەڤالێن خۆ فرێکرن داکو بچن کەلایێ وەرگرن بەلێ وان ئەو دەستەسەکرن (الكامل، ٤٩/٨).

ل سالا ٤٤١مش/ ١٠٤٩ز میر ئەبوئەلحەسەن کورێ عیسکانێ حەمیدی دگەل هندەك میرێن دی یێن کوردی یێن ب هێزێن وانڤە گەهشتنەلەشکەرێ قرواش کورێ موقەلەدی داکو شەری دگەل برایێ وی زەعیمولدەولە ئەبا کاملی بکەن، و پاشی پێکڤە بەرەڤ دەڤەرا ملعەسایا نێزیك دهۆکێ چوون و ئەو دەڤەر وێران و تالانکر و پاشتر میر ئەبوئەلحەسەنێ حەمیدی و میر ئەبو حەربێ سلێمان کورێ نەصرولدەولە ئەحمەد کورێ مەروانێ کوردی جێگرێ بابێ وی ل جزیرا بۆتان ژ رێزێن قرواشی جودابوون و گەهشتنە زەعیمولدەولەی، لێ ئیبنولئەسیری ئەگەرێ ڤێ چەندێ دیار نەکریە (الكامل، ٥٠/٨).

ئەبوئەلحەسەنێ حەمیدی هەتا سالا ٤٥٦مش/١٠٦٣ز ل سەر میراتیا خۆ مابوو، ل ڤێ سالێ ئەو و میر ئەبا عەلیێ هەزبانی هاتنە گازیکرن بۆ دیوانا خەلافەتێ هاتنە خەلاتکرن. (مرئ الزمان، ص١١٠):

**٢- میر عیسایێ حەمیدی:**

پشتی دابرانێ بو ماوێ پتر ژ نیڤ سەدسالییەکێ، دووبارە ژێدەرێن میژوویێ بەحسێ میر عیسایێ حەمیدی دکەن یێ هەڤدەم بوو دگەل میرێ ئەتابەگی عیمادەدینێ زەنگی (٥٢١ - ٥٤١مش/ ١١٢٧ - ١١٤٦ز).

بەری کو میر عیمادەدینێ زەنگی ل سالا ٥٢١مش/ ١١٢٧ز دەستەلاتێ ئەتابەگیا مووسلێ بگرتیبەدەست میر عیسای حوکمداری ل دەڤەرێن ژێر دەستەلاتێ خودکر، دەمێ میر عیمادەدینی حوکم گرتیەدەست، میر عیسا هێلا ل سەر میرگەها وی و دەستەلاتێ وی یێ بوماوەیی، (التاریخ الباهر،ص٤٨-٨٠، الکامل، ٣٤٢/٨)، وەسان دیارە کو میر عیمادەدینی ئاگاهی ژ هێزو شیانێن لەشکەری و سەرکردایەتی و دەستەلاتێ میرێ حەمیدی هەبوو، لەوما وی دیت بو وی و ب ئێك جارینە ئەتابەگیا (میرگەها وی)یا نوو دامەزراندی باشترە میر عیسای بهێلیتە ل سەر دەستەلاتێ وی ل وەلاتێ وی.سەرەرای وەرگرتنا هەلویستەکێ ئەرێنی و ئاشتییانە ژلایێ میر عیمادەدینێ زەنگی بەرامبەر میرگەها حەمیدی، لێ میر عیسای بەردەوام هاریکاری یێن لەشکەری و هێزێن شەری پێشکێشی خەلیفێ عەباسی موسترشید بیللای دکرن دەمێ ل هەیڤا رەمەزانا سالا ٥٢٧مش/ ١١٣٢ز بو شەرێ میرێ زەنگی هاتییە مووسلێ، لێ پشتی خەلیفە نەشیای مووسلێ داگیر بکەت و هێزێن خو ڤەکێشاینەڤە، میرێ زەنگی هندەك هێرش کرنە سەر ئاکرێ و کەلایێن حەمیدییان و بو دەمێ سالەکێ دورپێچکرن، شەر ب هێز بوو و دووریێچێ هەتا سالا پاشتر ٥٢٨مش/ ١١٣٣ز ڤەکێشا، خو شیایی هەموو کەلان یەك ل دووڤ یەك داگیربکەن و میر زەنگی ب خو چوو سەر دیوارێن کەلا ئاکرێ، لێ ژێدەرێن دیروکی بومە دیارنەکرییە کا پاشەرۆژا میر عیسای یا چاوان بوو (التأریخ الباهر ،ص٤٨-٨٠ ،الکامل، ٣٤٠/٨-٣٤٣ ،مفرج الکروب ،٥٥/١).

ئەم دشێن بێژین پشتی ڤێ روودانێ میرگەها حەمیدی سەربەخویا خو ژ دەست دا و کەلا و عەردێن وێ مینا یێن دەڤەرێن هەکاری و ئەربیل و شارەزورێ بوونە پشکەك ژ مالیەتا ئەتابەگێن زەنگی، و پاشتر ئەتابەگیا مووسلێ و عەردێ وێ یێ ب خێر و بێر بو چاندنێ ل سەر کورێن خو لێکڤەکر، پاشی بەنیێن (مەمالیکێن) خو یێن تورك و تورکمان وەك بریکار ل وان دەڤەران دانان، لەورا یا سەیر نینە ئەگەر دەنگوباسێن حەمیدییان هەتا داوییا سەردەمێ میرێن ئەتابەگی د ژێدەرێن دیروکیدا بەرزەببن، پشتی مرنا سەیفەدین غازی کورێ مەودودێ کورێ زەنگی سالا ٥٧٦مش/ ١١٨٠ز دەڤەرا ئاکرێ یا حەمیدی کەفتە دەستێ کورێ وی یێ بچویك ناصرودین کەسکی (الکامل، ٩/ ١٥٠)، پاشتر میر نورەدین ئەرسەلان مەلك کورێ مەسعوودێ کورێ مەودودێ کورێ زەنگی بەری مرنا خو ل سالا ٦٠٧م/ ١٢١٠ز کەلا ئاکرێ یا حەمیدییان و کەلا شوشێ و ویلایەتا خو رادەستی کورێ خو یێ بچویك عیمادەدینێ زەنگی (یێ دووێ) کر و پاشی کورێ خو فرێکرە ئاکرێ و فەرمان دایێ کو ((وەلاتێ وی ب سەروبەر بکەت و ب پارێزیت و چاڤێ وی ل بەرژەوەندیێن وی بیت))، (الکامل، ٣٠٤/٩، ٣٢٠) پاشی عیمادەدینێ زەنگی ڤیا کەلایێن دەڤەرا هەکاری (کەلا ئامێدیێ و دەوروبەری وی) و کەلایێن دەڤەرا زوزان بدەتە دگەل ملکێ خو، ئەڤە ژی ل سالا ٦١٥مـ/ ١٢١٨ز دەست وی ڤە هات، لێ بەدرەدین لوئلوئی ئەتابەگێ مووسلێ ژ نشکەکێڤە ل شەڤەکا دەسپێکا سالا ٦١٦مش/ ١٢١٨ز هێرشکرە سەر میرعیمادەدینی ل کەلا ئاکرێ و ژ وێرێ دەرێخست، میرعیمادەدین رەڤی چوو ئەربیلێ (الکامل، ٣٢١/٩)، و ل سالا ٦١٨مش/ ١٢٢١ز بەدرەدین لوئلوئی دووربوونا عیمادەدینێ زەنگی ژ سەر عەردێ وی ب دەلیڤەدیت و هێرش کرە سەر کەلا شوشێ و بو ماوەیەکێ درێژ دورپێچ کر و دەمێ دیتی ئەڤ دووریێچە درێژ بوو ڤەگەریا مووسلێ و کارێ دورپێچکرنێ هێلا ب هیڤیا هەڤالێن خوڤە، و پاشتر دووریێچ ل سەر کەلایێ دژوارتر کر و بەرێن بەرگریکارێن کەلایێ تەنگکرن هەتا دەست ب سەر کەلایێدا گرتی. (الکامل، ٣٤٩/٩ - ٣٥٠).

**٣- میر عیزەدین محەمەد كورێ بەدرێ حەمیدی (؟ - ٦٢٧مش/ ١٢٣٠م):**

ئێك بوو ژ میرێن ئەلمەلكولئەشرەف كورێ ئەلمەلكولعادلێ ئەیوبی (٦١٥-٦٣٥مش/١٢١٨-١٢٣٧ز) ئەو ژی وەك میرێن دی یێن كورد گەهشتە لەشكەرێ ئەیوبی، بەلێ موزەفەرەدینێ گۆكبەرێ ئەتابەگێ ئەربیلێ (٥٨٦ – ٦٣٠مش/١١٩٠- ١٢٣٢ز) شیا ل سالا ٦١٥مـ/ ١٢١٨ز وی رازی بكەت و ب كێشیتە لایێ خۆ و بوو ئێك ژ سەركردێن وی یێن مەزن و گەلەك پشت بەستن دكرە سەر وی ب تایبەت ل شەڕان و كەلایەكا مەزن دگۆتنێ كەلا ساروا ل دەوروبەرێن ئەربیلێ دابێ (الكامل، ٩/ ٣٢٣، ٣٨٢، مفرج الكروب، ٤/ ٧٠).

میر عیزەدین محەمەد وەك حاكم و سەركردێ كەلا ساروا ما هەتا ب دەستێ توركمانان ل سالا ٦٢٧مش/ ١٢٣٠ز هاتییە كوشتن، ل ڤێ سالێ توركمانێن د گۆتنێ (قشتیالو) ل كوردستانێ ب سەركردایەتییا شەمسەدین صونج یێ شیای هژمارەكا مەزنا توركومانان ل دۆر خۆ خرڤە كەت، دەست ب دروستكرنا ئالۆزیێ و ئاژاوەیێ ل كوردستانێ كر، د چوونە د رێكا رێڤینگ و بازرگانان دا و تالان دكرن، ڤان توركومانان هێرش كرە سەر كەلا ساروا و دەستدرێژی كرە سەر میرێ وێ عیزەدین محەمەدی و كوشت و كەلا داگیركر، ل دووڤدا موزەفەرەدینی ڤیا كەلایێ دووبارە ژ دەستێ توركومانان بینتە دەرێ و لەشكەرەكێ مەزن ئامادەكر و كەلا دورپێچ كر لێ هەر نەشیا ژ دەستێن وان بینیتە دەرێ (الكامل، ٩/ ٣٨٢، محسن محمد حسین، اربیل فی العهد الاتابكی، ص ١٥٨ – ١٥٩).

**٤- میر و شاعر كەریمودین ئەبوئەلحەسەن محەمەد كورێ بەدری كورێ ئەبابەكرێ كورێ ڤەحتەبەیێ حەمیدی یێ ئاكرەیی (؟- ٦٢٧مـش/ ١٢٣٠ز):**

دوورناهێتەدیتن كو كەریمودین عەلی كورێ میر عیزەدین محەمەدی بیتن هەرچەندە ژێدەران چ بەحسێ ڤێ چەندێ نەكرییە، لێ دبێژن كو میر و سوارچاك و ئەدیب بوو ، لێ پەیوەندییا وی دگەل كەلا ئاكرێ و میرگەها حەمیدی نەهاتییە زانین، بەلێ ئەو ژی وەكی بابێ خۆ گەهشتییە رێزا میرێن ئەیوبی، و یەك ژ میرێن ئەلمەلك ئەلكامل كورێ ئەلمەلك ئەلعادلێ ئەیوبی (٦١٥ – ٦٣٥مش/ ١٢١٨ – ١٢٣٧ز) و ل سالا ٦٢٧مـ/ ١٢٣٠ز د شەڕەكی دا دناڤبەرا ئەلمەلك ئەلعادل و ئەلمەلك ئەلغالب كەیقوبادێ ئێكێ (٦١٦-٦٣٤مش/١٢١٩-١٢٣٦ز) مەلكێ رۆمێن سەلجوقی هاتییە كوشتن. (معجم الالقاب، ٤/ ٧٦).

**٥- ئەلموبارز كاك حەكەم (٦٤٠-٧١٠مش/ ١٢٤٢-١٣١٠ز):**

ئەلموبارز كاكی دناڤبەرا ٦٤٠-٧١٠مش حوكمداری كرییە دهاتە هژمارتن ئێك ژ كەسایەتیێن كورد و یێ ژ هەموویان ناڤدارتر ل سەدسالییا حەفتێ مشەختی/ سێزدێ زاینی و ئەو ب خۆ ژ بنەكوكا مازنجانییە كو ئێكە ژ ئویجاخێن عەشیرەتا حەمیدی (صبح الأعشی، ٤/ ٣٧٥ معجم الالقاب، ٤/ ٣٢٦ – ٣٢٧).

ئەلموبارز كاك (موبارزدین ئەبوبەكر كاك كورێ سەیفەدین محەمەد كورێ ئەبو ئەلجەیشێ حەمیدیێ مازنجانی)یە (معجم الالقاب، ٤/ ٣٢٦) ل دەستپێكا سەردەمێ عەباسییان دژیا و ب ناسناڤێ (مبارز الدین) ڤە ژلایێ دیوانا خەلافەتێ هاتە ناڤكرن وەك رێزگرتن بۆ زیرەكی و چاڤنەترسی و دلسوزییا وی د خزمەتكرنا خەلافەتا عەباسی دا، زەلامەكێ چاڤنەترس و مەردانە (التعریف بالمصطلح الشریف، ص ٥٩، صبح الأعشی،٤/ ٣٧٥، ٧/ ٣٠٧) و ژ مالباتەكا خودان (رەسەنایەتی بوون د میراتیێ و پایەكا بلندبوو د مەردینییێدا...((عراقة الأصل فی الإمره وقدم السؤدد فی الحشمه)) و ئەندامێن مالباتا وی دگوت( دەستەلاتێ میرگەهێ گرتەدەست و ب پشتەڤانییا خەلیفان كاروبارێن وێ ب رێڤەبرن (التعریف، ص ٥٩).

و دەمێ مەغولیان هێرشكرییە سەر هەرێمێن خەلافەتا عەباسی و ئەربیل و پتریا دەڤەرێن كوردستانێ داگیركرین، وان ئەلموبارز كاك گرت لێ

چ لێ نەكر و رێز لێ گرت و چ نەخۆشی و زیان نەگەهاندنێ، رێزلێگرت و هێلا د هەمان سەروبەرێ وی دا، هەردیسان دەڤەرێن ئاكرێ و شوشێ كرنە دەستێ وی دا و پاشی بازێركێ حەریر و بازێركێ گرێ حەفتون ژی كو سەر ب ئەربیلێ ڤە بوون ل سەر عەردێ وی زێدەكرن و پاشتر كرە بریكارێ خۆ ل سەر ئەربیلێ و نێزیكی ٥٠٠ سوار كرنە بن دەستێ ویڤە (صبح الأعشى، ٤/ ٣٧٥).

ژیێ ئەلموبارز كاكی یێ درێژبوو و نێزیكی ١٠٠ سالان ژیابوو، نێزیكی ٧٠ سالان ژ ژیێ خۆ حوكم دكر هەروەك دهێتەگۆتن (( هێشتا ژیێ وی بیست سال بوون و میراتی كەفتە د دەستێن ویدا و ما ژ ٩٠ سالان بۆری و هێژ وەكی گەنجان بوو)) (مسالك الابصار، ١٢٨/٣، صبح الأعشى، ٤/ ٣٧٥).

و ژ كارێن وی یێن باش دروستكرنا خواندنگەهەكا مەزن بوو و گەلەك ژ مولك و عەردێن خۆ بۆ كرنە وەقف (معجم الألقاب،٣٢٧/٤).

### ٣ میرگەها حەمیدی (مازنجانی) پشتی ئەلموبارز كاكی و ژناڤچوونا وێ

ل دەوروبەرێن سالا ٧١٠مش/١٣١٠ز ئەلموبارز كاكی وەغەركریە و كورێن خۆ ل پاش خۆ هێلانە ل سەر مولك و میرگەها خۆ (تأريخ أولجايتو، ص١١٥)، و پشتی دەستەلاتا میرگەهێ كەفتیە دەستێ كورێ وی عیزەدینی، ئەو ژی ل دووڤ رێبازا بابێ چوویە و شیایە دەستەلاتا میرگەهێ ب پارێزیت لێ هوسا دیارە گەلەك نەمابوو ل سەر دەستەلاتێ، دووڤدا برایێ وی نەجمەدینی جهێ وی گرت، ئەو ژی ل سەر رێبازا باب و برایێ خۆ چوو و تا رادەیەكی شیابوو دەستەلاتا سیاسی و هێزا میرگەهێ ب پارێزیت و پشتی وی دەستەلات كەفتیە د دەستێ كورێ وی شوجاعودینی دا، ئەو خۆدی كەسایەتییەكا لاواز بوو، نەشیا وێ ڤالاهیێ پركەتەڤە یا بابێ وی هێلای (التعريف، ص ٥٩، صبح الأعشى، ٣٠٧/٧).

هەرچەندە یا دیار نینە كا ب دروستاهی كەنگی دەستەلاتا میرگەها حەمیدی ب ئێكجاری ژناڤچوویە، لێ تشتێ دیار ئەوە كو ل سەردەمێ میر شوجاعەدینێ نەڤیێ ئەلموبارز كاكی میرگەهـ كەتییە د لاوازی و بێ هێزیێدا، دوور ناهێتەدیتن كو ئەگەر ژی ئەو بیتن كو ئەڤ میرگەهە كەفتبوو دناڤبەرا چەندین میرگەهێن دی وەكی میرگەها ئامێدیێ و سەهرانی و زرزاری و قرتاوی (گەردی) و چەندین میرگەهێن دی و ئەڤ چەندە ئێك ژ ئەگەرێ كەفتنا وێ بوو، هەردیسان میرێن حەمیدیێن مازنجانی ژی بەردەوام د شەرۆ و هەڤركیان دابوون دگەل زێبارییان خودانێن وەلاتێ زێباری (صبح الأعشى، ٤/ ٣٧٨).

## ب- میرگەها مەهرانی

### ١.مولكێن عەشیرەت و میرگەها مەهرانی

ل سەردەمێ ئەڤروكە دا چەندین شورهە و كەلایێن لەشكەری ل سەر سنوورێ جوگرافی یێ ڤەزا زاخۆ هاتینە دیتن كو ل سەردەمێن بەرێ ژ لایێ میر و سەركردێن عەشیرەتێن كوردی وەك مەهرانی و بەختی و هەكاری و سندی و چەندین كەلایێن دی دهاتنە ب رێڤە برن، ژ وان كەلایێن:

- كەلا حەسەنیێ (الحسنيه): ل سەردەمێن ئیسلامێ دەڤەرا زاخۆ ب حەسەنیێ دهاتە نیاسین، یاقوت دیاردكەت كو ئەڤ كەلایە بۆ (الحسن)ی دزڤریت (معجم البلدان، ٢/ ٢٦٠)، دهێتەگۆتن كو ئەڤ ئەلحەسەنە ئەوێ دەڤەرا حەسەنیێ ب ناڤێ وی ڤە هاتییەناڤكرن ناسرولدەولە ئەلحەسەن كورێ ئەبا ئەلهەیجائێ حەمدانی میرێ مووسلێ یە، و ب ساناهییە خەلەتییا ڤێ بۆچوونێ بێتەسەلماندن، چنكو ناڤێ حەسەنیێ د مێژوویەكا بەری سەردەمێ ناسرولدەولەی هاتییە (تاريخ الطبرى، ٣٨/١٠، حوادث سنه ٢٨١مش) و هەتا نهاژی ئێك ژ تاخێن زاخۆ یێن كەڤن ب حەسەنیكێ دهێتەناڤكرن.

دەڤەرا حەسەنیێ خودانی جهەكێ زۆر باشە و دكەڤتە سەر رێكا ناڤبەرا مووسلێ و جزیرا بۆتان و ل سەر لایەكێ رووبارێ خابوری ئەوێ ژ دەڤەرا زۆزانان

دزێت، ل وی سەردەمی مزگەفتەك ل نیڤا باژێری هەبوو و رووبارێ خابووری ژی گرنگییەکا تایبەت د دایێ ژبەرکو کاروانی مەجبور دبوون ژ ڤی رووباری دەرباز ببن و تنێ رێکا دەربازبوونێ ئەو قەنتەرە بوو یا نێزیکی حەسەنیێ ل سەر بەران هاتییەئاڤاکرن (پرا دەلالا نها)، ئەڤ پرە ل سەردەمێ ئەلمەقدەسی (٣٨٧مـش/ ٩٧٧ز مریبە) هەبوو (أحسن التقاسیم، ص ١٢٦) هەبوو، هەردیسان ئاڤا ڤی رووباری گەلەك عەردێن بەرفرەهـ ئاڤددان و چەندین گوندێن کارێ چاندنێ دکرن ل چیایێن باکووری مووسلێ هەبوون (معجم البلدان، ٢/ ٣٣١).

- **باجلی-باجلایا،** باجلایا (گوندی باجلی یێ نها) باژێرکەکێ ب ناڤودەنگ بوو ل سەردەمێ عەباسییان، ناڤێ وێ د پەرتووکێن جوگرافیناسێن موسلمان یێن دەستپێکی وەك ئیبن خەردازبە و ئیبن روستە و ئیبن ئەلفەقیە دا هاتییە و وان هزر دکر کو ئێکە ژ دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە (المسالك والممالك، ص ٨٥، الاعلاق النفیسە، ص٨٧، مختصر کتاب البلدان، ص١٢٥).
- **شەعبانیێ،** کەلایەکا کەڤنە و ئێکە ژکەلایێن ب ناڤودەنگێن مەهرانی، لێ جوگرافیناسێن موسلمان چ بەحسێ وێ نەکرییە، لێ هەتا نها ژی بەرمایکێن وێ وەك دیدەڤانانە ل سەر هەبوونا وێ و ب (کەلا شابانیا) دهێتەنیاسین و نێزیکی باژێرکێ باتیفایە کو سەنتەرێ ناحیا گولیانە و نهاژی تاخەك ل زاخۆ هەیە ب ناڤێ شەعبانیکێ.
- **کەلا ئەردەمشت (کواشێ):** کەلایەکا بلندە ل سەر گوپیتکا چیایێ ناڤبەرا گوندێ ئاردمشت (ئەرمشتێ) و کواشێ، لێ هندەك زێدەران ب شاشیڤە دایە دیارکرن کو دکەڤیتە سەر چیایێ جۆدی (معجم البلدان، ١/ ١٤٧، ٤/ ٤٨٦)، ڤێ کەلێ سێ لا هەبوون و ژلایێ خەلیفە (المعتضد) (٢٧٩ – ٢٨٩مـش/ ٨٩٢- ٩٠٢ز)ڤە هاتبوو خرابکرن و پاشی دووبارە ژ ئالیێ ناسرولدەولەیێ حەمدانی ڤە هاتییە ئاڤاکرن (معجم البلدان، ١/ ١٤٧).
- کەلا جەراحیێ ئەڤ کەلایە ژی سەر ب جزیرا بۆتان ڤە بوو (الآعلاق الخطیرە ٣، ٢١٥/).
- کەلا زەعفەرانیێ: ئێکە ژ کەلایێن مەهرانی کو دکەڤیتە سەر زنجیرا چیایێن سپی ل ئالیێ چەپێ یێ گەلیێ زاخۆ، ئەڤ کەلا ب ڤی ناڤی هاتییە ناڤکرن ئەوژی ژبەر شینبوونا برەکا مەزن یا گیایێ زەعفەرانێ ل وێ دەڤەرێ و خەلیفە (المعتضد) ل دێرا زەعفەران ل نێزیکی کەلێ ل سالا ٢٨١مـ/ ٨٩٤ز مابوو، هەتا نها ژی شوینوارێن دێرێ و کەلایێ مانە و هەر ب وی ناڤی دهێنە نیاسین، ژبلی ڤان کەلان چەندین کەلایێن دی ژی ل وێ دەڤەرێ هەبوون لێ ناڤدارییا وان کێمترە، وەك کەلایێن رابی و ئەلقی(ئەلکێ) و فەرەح و سروە(؟) و هەمی ژی کەلایێن مەهرانی بوون.

هەردیسان ئەو دەشتا بەرفرەهـ دناڤبەرا مەلعەسایا و فیشخابۆر (پێشخابۆر) د مێژوویێ دا یا بەرنیاس بوو ب دەشتا باهەزرا - بانوهەزرا و ئێك بوو ژ دەڤەرێن کشتوکالی یێن پر خێروبێر، و ل ڤێ دەڤەرێ هەمی جۆرێن بەرهەمێ دەخل و دانی دهاتنەبەرهەمئینان و دراڤ و سامانەکێ باش ژێ دگەهشتە خەلکێ دەڤەرێ، ئیبن حەوقەل دەربارەی باهەزرایێ دبێژیت: وارەکێ پڕ خێر و بێر و خودان داهاتەکێ باشە (صوره الآرض، ص ١٩٧).

ل سەردەمێ خەلیفە ئەلمەعتەمەدی (٢٥٦-٢٧٩مـش/٨٧٠-٨٩٢ز) هژمارەکا میرێن کورد ل دەڤەرا چیایی یا دکەفتە دەڤەرێن رۆژهەلاتێ مووسلێ دەرکەت وەك میر شەدادێ کوردی خودانێ کەلا حەسەنیێ میر جەعفەرێ خودانێ کەلا ئاردامشتی ئەوژی پشتی کو دەڤەر کەفتییە بن دەستێ خەوارجان و دەستەلاتا مەلبەندی لێ نەمایی، پشتی هینگێ سەرکردێن کورد هەڤپەیمانی دگەل خەوارجان و هندەك ژ میرێن عەرەبێن حەمدانییان کر و شیان کونترۆلێ ل سەر مووسلێ و دەڤەرێن وێ بکەن، پاشتر خەلیفە ئەلمعتەزەد (المعتضد) یێ کو ل شوونا مامێ خۆ خەلیفە ئەلمەعتەمەدی سالا ٢٧٩مـش/ ٨٩٢ز هاتییە سەر حوکمی یێ

رشدبوو رەهوریشالێن پشتەرێبوون و یاخیبوونێ ژ بنی هەلکێشیت ب تایبەت خەوارج و حەمدانی و سەرکردێن کوردان، ئەو بوو سالا ۲۸۱مش/ ۸۹٤ز بۆ جارا دووێ بەرەف مووسلێ چوو و پاشتر بەرێ خۆدا کەلا مێردینێ بارەگایێ سەرەکیێ حەمدانییان و ئێخستە ژێر دەستەلاتێ خۆ و ل دەمێ زڤرینێ ژی رێکا حەسەنیێ (زاخۆ)گرتەبەر و شەرێ میر شەدادی کر هەتا شکاندی و کەلا وی هەرفاندی (تاریخ الطبری، ۱۰/ ۳۸، الکامل، ٦/۷۷)، پاشی هێزێن وی هێرش کرە سەر کەلا ئەردەمشتێ و دووریێچ کر و بەلێ خەلکێ وێ رازینەبوون خۆ رادەستی وان بکەن، لەوما ژی خەلیفە بخۆ بەرەف وێرێ چوو و کەلا ستاند و ئەو ب خۆ چوو تێدا، ل ڤێرێ دیار دبیت کو میر جەعفەر ژ کەلایێ رەڤیبوو بەری هێزێن خەلیفەی بگەهنە وێرێ و خەلکێ کەلایێ خۆرادەستکر. خەلیفەی بریار دا کەلا بهێتە هەرفاندن و ل شوونا وێ کۆنەك ڤەدا (معجم البلدان، ۱/ ۱٤۷)، هندیکە میر جەعفەرە یێ بوویە ئێك ژ سەروکێن خەوراجان و د شەرەکی دا ل مووسلێ سالا ۲۸۲هـ/۸۹٥م هاتە کوشتن (الکامل، ۷۹/٦).

پشتی هینگێ دەنگوباسێن دەڤەرا زاخۆ ب تایبەت پشتی هەوا خەلیفەی (المعتضد)ی کریە سەر دەڤەرێ دناڤ ژێدەرێن دیرۆکی دا بەرزە دبن، د راستی دا دەڤەرێن هەکاری و زۆزان و دەوروبەرێن جزیرا بۆتان تووشی زنجیرەکا هەوێن لەشکەری بوون ب مەرەما داگیرکرنا وان. ل داوییا سالێن ۲۹۲مـ/ ۹۰٥ز خەلیفێ عەباسی ئەلموکتەفی (۲۸۹-۲۹٥مش/ ۹۰۲-۹۰۸ز) عەبدوللا کورێ حەمدانێ کورێ حەمدونێ تەغلوبی یێ ناڤدار ب (ابي الهيجاء الحمداني) کرە والیێ مووسلێ و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە و هینگێ دەڤەرا هەکاری ژی سەر ب مووسلێ ڤەبوو، لێ عەشیرەتێن هەزبانی و داسنی و حەمیدی ئەڤ چەندە ب توندی رەتکر سەرەرای کو دەیکا والیێ ناڤبری کورد بوو، لێ ڤان عەشیرەتان ب توندی بەرسڤا ڤێ چەندێ دا و بوونە شۆرش ل چیایێن داسن و دەوروبەرێن نەینەوا و خازر ئەنجام دان و و پشتی دو سالان شۆرشەکا دی ژلایێ میرەکێ کورد کو ناڤێ وی یێ دیار نینە هاتە کرن و شیا دەڤەرێن چیایی داگیر بکەت (تاریخ الطبری، ۱۰/۱۳۷، الکامل، ٦/۱۱۱-۱۱۲).

سالا ۳۱۷مـ/۹۲۹ز (ابا الهيجاء الحمداني) هاتە کوشتن، ئەو ژی دەمێ پشکداری د پیلانەکا سەرنەکەتیدا کری کو بۆ لادانا خەلیفە ئەلموقتەدری و دانانا ئەلقاهری ل شوونا وی، پشتی هینگێ خەلیفە المقتدری بریار دا کورێ وی ناسرولدەولە ئەلحەسەن کورێ ئەبا هەیجائێ حەمدانی ل شوونا وی بهێلیتە ل سەر مولکێن وی کو هەردو کەلایێن ڤردی و بازبەدی بوون (الکامل، ٦/۲۰۰، ۲۰۷) و کەلایێن حەسەنیێ-زاخۆ و ئاردەمشت و هرۆر و شەعبانی و ملێسیێ و بەرقی کەفتنە بن دەستەلاتا حەمدانییان (تجارب الامم ۲/۳۷٤-۳۸۷).

پشتی مرنا ناسرولدەولەی ل سالا ۳٥۸مـ/۹٦۹ز هەڤرکی و شەڕ دناڤبەرا کورێن وی دا ل سەر وەرگرتنا دەستەلاتێ پەیدابوو، کورێ وی ئەبو تەغلوب فەزلولڵا دەستەلاتێ مووسلێ و کەلایێن ب سەرڤە وەك کەلایێن عەشیرەتێن هەکاری و مەهرانی گرتەدەست، ئەڤ کورە ژ هەڤژینا وی فاتما کچا ئەحمەدێ بوو د بنەرەتدا کورد بوو (التنوخی ، نشوار المحاضره ۳/۲۲،الفرج بعد الشده، ۲/۱۰۸، الکامل، ۷/۳۲).

## ۲.گرتنا کەلایێن مەهرانیێ و هەکاری ژ ئالیێ عەزدولدەولەیێ بوەیهی ڤە.

ل سالا ۳٦۷مش/ ۹۷۷ز هەڤرکییەکا دژوار دناڤبەرا عەزدولدەولەیێ بوەیهی و ئەبو تەغلەب حەمدانیێ دەستەلاتدارێ مووسلێ و ئەو دەڤەرێن ب سەرڤە ژ وان ژی دەڤەرا هەکارییان پەیدابوو، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی ئەوبوو کو ئەبوتەغلەب گەهشتبوو رێزێن عیزولدەولە بەختیار غەنریم عەزدولدەولەیێ عیراقێ، پاشی هێزێن دەولەتا بوەیهی شیان ل سەر وان زال ببن و ئەڤ چەندە بوو ئەگەر بەختیار بهێتە کوشتن، ل هەیڤا زیلقوعدە بەرەف مووسلێ چوون ل دەوروبەرێن وێ جێگیربوون، نوونەرێن ئەبوتەغلەبی هاتنە جەم وی و داخوازا ئاشتیێ ژێ کرن و بەرهەڤیا خۆ بۆ دانا

هندەك پارەی دیارکر داکو بەلا خۆ ژ دەڤەرێن مووسلی دووربگرن، لێ سەرکردێن دەولەتا بوەیهی ل سەر ڤێ چەندێ رازی نەبوون و گوتە پەیامنێری (( مە ئەڤ دەڤەرە ب شیری و پشتی شەڕ و لێکدانێ یا گرتی و ئەم پێکهاتنێ ل سەر ناکەین)) ، و بۆ وان دیاربوو کو دەڤەرا مووسلێ و دیارەکرێ خوشتڤیترن بۆ وی ژ دەولەتا عیراقێ، أبا تغلب ئێدی نەشیا بەرەڤانیێ ژ مووسلێ بکەت و نەچاربوو وێرێ بجهـ بهێلیت و بەرەڤ کەلایێن خۆ ل وەلاتێ دیارەکرێ بچیتن، بەلێ ئەبوئەلوەفا تاهر کورێ محەمەدێ یەك ژ سەرکردێن عەزدولدەولەیێ هەتا میافارقین و ئەرزەنێ دووڤ وی کەت، ئەبو تەغلبی رێکا خۆ بەرەڤ هەکاری بادا و ل حەسەنیا نێزیکی خابوری هاتەخوار، ل وێرێ سەرکەتە کەلایێن خۆ ل زنجیرا چیایێن سپی – بێخێری: شیا ب گەهیتە ئاردامشتێ (کواشێ)، زەعفرەانیێ، (ب مەرەما سەردابرنێ هندەك پارە ل وێرێ هیلا)، ئەبوئەلوەفای عەزدولدەولە ل سەر یاخیبوونا ئەبوتەغلەبی ل دەڤەرێن مووسلێ و رەڤینا وی بەرەڤ کەلایێن هەکارێ و خۆئاسێکرنا وی ل وێرێ ئاگادارکر، عەزدولدەولەی لەشکەرەکێ مەزن و بهێز بەرهەڤکر و وی ب خۆ سەرکردایەتیا وی لەشکەری کر بەرەڤ شەرێ وی چوون، ئەبو تەغلەب بەرەڤ جزیرێ رەڤی ژ وێری بۆ بدلیسێ و ژ وێرێ خۆ گەهاندە ناڤ وەلاتێ رۆمێن بیزەنتی، ((ژبەرکو لەشکەرێ عەزدولدەولەی دووڤ وی ڤە بوون و دمجد بوون وی پارێ دگەل وی ژێ بستینن چنکو وان زانیبوو کو گەلەك پارە دگەل وی هەیە))، ب ڤی رەنگی ئەبو تەغلبی هەموو کەلا و مولکێن خۆ ل وەلاتێ هەکاری ژ دەستدان، بەلێ ((تشتەك ژ زێر و گەوهەرێن گرانبها و پارە و هەر تشتەکێ ببهابیت و ساناهی بێتەهەلگرتن نەهێلا ل پاش خۆ و دگەل خۆ برن)) (تجارب الآمم ٢/٣٨٧).

ئەبو تەغلەب کورێ ناسرولدەولەیێ حەمدانی ل سەر رێبازا بابێ خۆ د چوو، شیا چەندین کەسایەتی یێن کوردی ژ مرۆڤێن دەیکا خۆ فاتما کچا ئەحمەدی یێن نێزیك هەلبژێریت و فرێکەتە کەلایێن خۆ ل دەڤەرێن کوردی، ژ وان ژی بەرپرسێ کەلا ئەردامشت (ئەرمشتێ) سالح کورێ بانویە یان بادویە ((سەرۆکێ کوردان)) کرە بەرپرسێ وێ، داکو پارێزڤانیەکا باشتر و بەرفرەهتر بۆ کەلایێ دابینبکەت ئەبو تەغلەبی دگەل سالح کورێ بانویە بەندەکێ بابێ خۆ ب ناڤێ تاشتم دانا ل سەر وێ کەلایێ، ژبەرکو ئەڤە کەلایەیا (پڕی تشتێن بهاگران بوو ژ زێر و گەوهەر و نڤین و مەحفویر کەرەستێن دی یێن بهادار). دگەل ڤان تشتان ئەبو ئەلفەوارس محەمەد کورێ ناسرولدەولەی هەر ژ سالا ٣٥٨مش/ ٩٦٩ز ڤە یێ زیندان کری بوو د ڤێ کەلایێدا، ئەبو تەغلەبی رێڤەبرنا کاروبارێن ڤی زیندانی کرنە دەستێ ژنەکا کورد یا دانعەمر ب ناڤێ نازبانو، ژبەرکو (وی گەلەك باوەری پێ هەبوو و شیرەت کربوو کو ڤێ چەندێ نەبێژتە کەسێ و ڤێ نهێنیێ ل دەڤ کەسێن ل کەلایێ نە دەرێخیت) و وێ ژنێ ژی ب باشترین شێوە داخوازیێن وی بجهـ ئینان (الفرج بعد الشده، ٢/ ١٨٥-١٨٦، تجارب الامم، ٢/٣٩٢).

عەزدولدەولەیێ بوەیهی بریارا دەست ب سەرداگرتنا هەموو بازێر و کەلا و مولك و عەردو سامانێن ئەبوتەغلەبی و برایێن وی دا، د ناڤبەرا هەردو سالێن ٣٦٧-٣٦٨مش/ ٩٧٧-٩٧٨ز دەستێ خۆ دانا سەر مووسل و ئامەد و میافارقین و ماردینێ رەحبە و تەیای وارێ (مصر) پاشتر کەلایێن ئەردەمشت و شەعبانیێ (شابانیێ) و هرۆرێ کو رەسمی سەر ب ئەبوتەغلەبێ حەمدانی ڤە بوون یەك ل دووڤ یەك ئێخستنە ژێر دەستەلاتێ خۆ.دیروکنڤیس مەسکویی (٤٢١مش/١٠٣٠ز مربیه) ئێك بوو ژ ئەندامێن لێژنا ڤاڤارتن و هژمارتنا زەخیرە و کەلوپەلێن بهاگرانێن عومبارکری ل کەلا ئەردامشتێ یێن کو ئەبو تەغلەبی ل پشت خۆ هێلاین، ل دووڤ پیڤانا وی بهایێ وان تشتان گەهشتبوو بیست هزار هزار دەرهەمان، ئانکو بیست ملیون دەرهەمان (تجارب الآمم ٢/٣٩٣).

هەردیسان قەشە یوحنا ئاماژێ ب وێ وێرانکرنێ دکەت یا تووشی دەڤەرا داسنیا بووی پشتی کو لەشکەرێ عەزدولدەولەی هێرش کریە سەر دەڤەرێ( تاریخ یوسف بوسنایا،ص٥٥-٥٦).

عەزدولدەولەیێ بوەیهی ئەو کارێ بۆ هاتی

سەركەفتییانە ب داوی ئینا، پاشتر ئەبوئەلوەفا تاهر كورێ محەمەدی هێلا وەك والیێ مووسلێ و راسپارد ب ئەركێ ( رێڤەبەرنا كاروبارێن خەلكی و سەروبەركرنا بەرپرسێن جهان و دانانا قانوونێن پێدڤی و بەرهەڤكرنا دیوانان ئانكو تووماران) رابیت، عەزدولدەولە ب خۆ رڤریڤە بەغدا و ل مەها زیلقوعدە سالا ٣٦٨مش/٩٧٨ز گەهشتە بەغدا و ل وی دەمی خەلیفە (الطائع) (٣٦٣-٣٨١مـ/ ٩٧٣-٩٩١ز)ب خۆ هاتە پێشوازیا وی، (تجارب الامم، ٢/٣٩٧، المنتظم، ٩٩/٧،مـراه الزمان ،حوادث (٣٤٥-٤٤٧هـ،ص ٢٠٠).

و ل سەدسالییا پێنجێ مشەختی/ یازدێ زایینی، وارێ مەهرانیان و هەرێما جزیرێ تووشی چەندین هێرشێن عەشیرەتێن توركی بوو ل سالا ٤٢٦مش/ ١٠٣٥ز و پشتی هینگێ ژی كەفتنە بەر هێرشێن سولتانێ سەلجوقی تۆغرۆل بەگی ل سالا ٤٤٦م/١٠٥٤ز و سولتان ئەلب ئەرسەلانی سالا ٤٦٣مش/١٠٧١ز و مەلكشامي سالێن ٤٧٧ – ٤٧٨مش/ ١٠٨٥ – ١٠٨٦ز، و ئەڤ هەوێن بریكارێن سەلجوقی و ئەتابەگێێن مووسلێ د بەردەوام بوون ل سەر و هەرێمێن چیایی یێن كوردی ل رۆژهەلات و باكوورێ مووسلێ، و ل سالا ٥٠٩مـ/١١١٥ز سولتان محەمەدێ سەلجوقی دەڤەرا مووسلێ و دەوروبەرێن وێ دانە ژێر دەستەلاتێ سەركردێ تورك جیوش بەگی، دەملدەست ڤی میری چەندین هەوێن دژوار برنە سەر دەڤەرێن هەكاری و زۆزان و جزیرا بۆتان و و وەلاتێ بەشنویی و شیا كەلایێن میرێن كوردان دووربێچ بكەت و گەلەك ژ وان گرتن و گەلەكان ژی پەنا برنە بەر چیا و گەلی ونهالێن ئاسێ و نەشیان چەكی ژ ترسێن وی دا هەلگرن. (الكامل، ٣٠٩/٨).

سەرەرای ڤان هێرشان، مەزنێن مەهرانییان شیان هەتا سەردەمێ میر عیمادەدینێ زەنگی ئەتابەگێ مووسلێ (٥٢١ – ٥٤١مش/ ١١٢٧ – ١١٤٦ز) مەزناتییا مولكێن ژ بابێ بۆ كوری بپارێزن، لێ مەهرانیان چ دەستەهلاتێن ناڤخۆیی یێن ئێككرتی نەبوون و هەر چەند كەلایەك یان دەڤەرەك ل ژێر دەستەلاتا میرەكێ مەهرانی بوون ئەو ژی یێ جودا بوو ژ میرێن دی، میر عەبدوللا كورێ عیسا كورێ ئیبراهیمی مەزنترین میرێ مەهرانیان بوو دەستەلاتداری ل ئەلربە و ئەلقەی (ئەلكێ) و فەرحە و هندەك جهێن دیتر دكر و پشتی مرنا وی، كورێ وی عەلی جهێ وی گرت.

- میر ئبراهیمێ مەهرانی، ئێك بوو ژ مریدێن شێخ عەدی كورێ مسافرێ هەكاری (٥٥٧مـش/١١٦٢ز مریبە) و باوەری ب چاكی و كەرامەتێن وی هەبوو، و دگەل هژمارەكا كەسێن هەژار و سووفی بەردەوام سەرەدانا شێخی ل لالشێ دكر (قلائد الجواهر،ص٨٦)، و كورێ وی شەمسەدین عەبدوللا خزمەتا لەشكەرێ ئەتابەگی ل مووسلێ دكر و ئێك بوو ژ سەركردین مەزن و سالا ٥٩٤مـش/١١٩٨ز دگەل هندەك مێرێن دی ب نەخۆشیەكا ڤەگر گیانێ خۆ ژ دەست دا (التاریخ الباهر، ص١٩٣، الكامل، ٢٤٠/٩).
- میر حەسەن كورێ عومەر خودانێ كەلا شەعبانیێ
- میرەكێ دی هەبوو لێ مێژوونڤیسان ناڤێ وی ب دروستاهی نەئینابوو، ناڤێ وی ب شێوێ (خۆل و هارون) خودانێ كەلا كواشێ (ئاردامشت) توومارکریبە.

هەرئێك ژ میرێن مەهرانی سەرەرای قائیمی و سەختییا كەلایێن وی ژ وێ چەندێ لاواز تربوو كو خۆ ل بەر هێرشێن دەرەكی بگریت و بەرەڤانیێ ژ خۆ بكەت و ئەڤ چەندە بوو ئەگەر عیمادەدینێ زەنگی ب ساناهی بشێت هەمیان ژناڤببەت و دەڤەرێن وان داگیر بكەت، زەنگی و سەركردێن وی وەك قەراجا و نەسرەدین جقری و یێن دیتر شیان ب چەند هێرشەكێن لەشكەری كەلایێن مەهرانیان بگرن و ب ڤێ چەندێ ئەو نیمچە دەستەلاتێن سەربەخۆیێن مەزنێن مەهرانیان دامەزراندین ژناڤبرن. (الكامل، ٨/ ٣٤٣–٣٤٤).

## ج- میرگەها هەكاری

### ١-پەیدابوونا میرگەهێ

میرێن هەكاری ژی وەكی میرێن دەڤەرێن دەوروبەرێ خۆ شیان ل سەردەمێ عەباسییان دەستەلاتێ ل

سەر کەلا و ئاسێکەهێن د کووراتیا ناڤ چیایێن دەڤەرا هەکاری دا بگرنە دەست؛ وەك کەلایێن ئامیدا (ئامێدیێ)، ئاشەب، هرۆر، نوشی. هەردیسان ڤان میران پەیوەندی یێن خۆ دگەل حەمدانیێن دەستەلاتدار ل مووسلێ و دەوروبەرێن وێ هەر ژ سالا ٣١٧مـ/٩٢٩ز نەبرین، دەمێ عەزدولدەولەیێ بوەیهی دەستەلاتێ مووسلێ گرتییە دەست و ئەبو تەغلبێ حەمدانی د ناڤبەرا سالێن ٣٦٧-٣٦٨مـ/٩٧٧-٩٧٨ز دەرێخستی، گرتنا کەلایێن هەکاریێ کرە یەکەم ئارمانجێ خۆ داکو سەرکەتنێن خۆ یێن بەری هنگی پێ تەمامکەت، لەورا ژی وی هزرکر ئەگەر وی ب دروستاهی بڤێت دەڤەرا مووسلێ ب پارێزیت و تەناهیا وێ دابینبکەت دڤێت بەرمایێن هەڤرك بۆ دەستەلاتێ خۆ ل وەلاتێ هەکاریێ نەهێلیت، ل زڤستانا سالا ل دووڤدا لەشکەرەکێ مەزن ئامادەکر و بەرەڤ دەڤەرا هەکاریا چوو و کەلایێن وێ بۆ ماوەیەکێ درێژ دوورپێچ کرن. هەرچەندە ئاکنجی یێن کەلان ب چ ڕەنگان خۆ نەدانە دەستێ لەشکەری و ژێ نەترسیان ژبەرکو وان هزر دکر دێ بەفر هێت و رێژێن لەشکەری دێ تێکدەت و دێ ژ وێرێ چن، لێ ژ بەخت ڕەشیا وان بەفر د ژڤانێ خۆ یێ پێشبینیکری دا نەهات لەورا داخواز ژ سەرلەشکەرێن بوەیهیان کر کو ئەگەر گرەنتیا ئێمناهیا وان بدەنێ ئەو دێ کەلایێ ب دەست لەشکەری ڤە بەردەن، ئەو ژی ل دووڤ داخوازا وان هاتن (( بەلی تنێ رۆژەك ل سەر خو ب دەستڤەدانا وان بۆری و بەفرێ لێکر)) بەلێ سەرلەشکەرێ بوەیهیان ژ پەیمانا خۆ پەشیمان بووڤە و ب شێوەیەکێ گەلەك دژوار سەرەدەری دگەل کر و ل سەر رێکا مەلعەسایا- مووسلێ ب درێژیا پێنج فەرسەخان نێزیکی ٣٠کم ل هەردو ئالیێن رێکێ سێدارەدان و لەشێ وان هێلا هەلاویستی (الکامل، ١٠٢/٧، البدایە والنهایە، ٣٨٢/٧).

پشتی هینگێ بۆ دەمێ نێزیکی پێنجی سالان ژ داگیرکرنا کەلایێن کوردێن هەکاری عەزدولدەولەیێ بوەیهی ڤە ئیبن ئەلئەسیری چ ئاماژەیەك ب مەزن و میرێن کوردێن هەکاری نەکرییە، ژ روودانێن پشتی هێرشا عەزدولدەولەیێ بوەیهی دهێتەزانین کو هێرشان ب دروستی ئارمانجێن خۆ بجهـ نەئینابوون و ب دروستی ژی دەستەلاتێ هەکاریان ژ ناڤ نەبربوو، تنێ پشتی شەش سالان هەکاریان هێرشەك برە سەر مووسلێ و دووپێچدا و ئالیگرێن ئیبن سەعدانێ وەزیرێ (صمصام الدولە)یێ بوەیهی تەنگاڤکرن، هەژیە بێتەزانین مرنا عەزدولدەولەی ل مەها شەوالا ٣٧٢مش/٩٨٢ز و ئالۆزبوونا تەناهیا مووسلێ و تێکچوونا دەستەلاتێ بەنی حەمدان ل مووسلێ و هەڤرکیا بادێ کوردی دامەزرێنەرێ دەولەتا دوستەکی و(صمصام الدولە)یێ بوەیهی ل سەر مووسلێ، ژ وان ئەگەران بوون یێن هەکاریان بۆ خۆ مفا ژێ وەرگرتی و سەروبەرێ کەلایێن خۆ و لەشکەرێ خۆ رێکخستیەڤە و پاشتر ژی ژ نشکەکێڤە هێرش بریە سەر مووسلێ، د ڤی دەمیدا بادێ کوردی خۆ ب خودانێ مووسلێ و پارێزڤانێ خەلکێ وێ دزانی دەمێ ل ڤێ هێرشێ ئاگاداربووی ژ پایتەختێ خۆ باژێرکێ حەسکێفێ (حصن کیفا) دەرکەت بەرەڤ ژێری بەرەڤ مووسلێ کو ژ ئالیێ هەکاریانڤە هاتبوو دووپێچدان چوو، شەری د ناڤبەرا هەردو ئالیاندا دەسپێکر و بادێ کوردی سەرکەتن دەستڤە ئینا و گەلەك ژ لەشکەرێ هەکاریان کوشتن و گرتن و دەست ب سەر مال و سامانێ واندا گرت (تاریخ الفارقی، ص٥٦).

## ٢-هەوێن عەشیرەتا ئەلغز یێن ترك بۆ سەر دەڤەرا هەکاری

لەشکەرێ عەشیرەتا (الغز) یا ترکان ل نیڤا ئێکێ ژ سەدسالیا پێنجێ مشەختی/ یازدێ زاینی گەلەك ژ هەرێمێن ئیرانێ داگیرکرن هەتا گەهشتینە دەڤەرێن کوردی ل هەرێما ئازەربیجانێ، پشتی ئەنجامدانا شەڕەکێ مەزن دناڤبەرا لەشکەرێ تورك و کوردێن هەزبانی یێن هەرێما ئازەربیجانی، ژ ترسێن میر وەهسوزان کورێ مەملانێ کوردیێ هەزبانیێ رەوادی هژمارەکا مەزن ژ لەشکەری (الغز) ڤەبوون و عەردێ ئازەربیجانێ بجهـ هێلا و ژ نشکەکێڤە سالا

٤٣٢م/١٠٤٠ز ئەڤ عەشیرەتە ژ چیایێ سلماس را بۆرین و چوونە دناڤ دەڤەرا هەکاری دا، لێ کوردێن هەکاری هاتنە بەراهیا وان و شەرەکێ دژوار دناڤبەرا هەردو ئالیاندا رویدا، لێ کوردێن هەکاری د ڤی شەریدا شکەستن و لەشکرێ (الغز) دەست ب سەر مال و زێر و ژن و زارۆکێن واندا گرت و کوردان ژی خۆ ل ناڤ چیایان ئاسێکر (الکامل، ٣٤٠/٧)، لێ لەشکەرێ عەشیرەتێن تورکان ل دووڤ شوینوارێن وان چوون و دناڤ چیا و دول و نهالان ل وان دگەریان، کوردێن هەکاری شیان ل ناڤ گەلی و نهالان وان بێخنە داڤێن خۆ و گەلەك ئاستەنگ ل بەر دانن و زیانەکا مەزن ب گەهینە لەشکەرێ وان. ل دووڤ گۆتنا ئیبنولئەسیری نێزیکی هزار و پێنج سەد کەس ژێ کوشتن و هژمارەك ژی گرتن کو حەفت ژ وان میر و سەدەك ژی کەسایەتی و ماقوولێن وان بوون، هەروەسان کوردان هەمی تشتێن خۆ ئەوێن وان تالانکرین و برین ژێ ستاندنەڤە، ئەوێن مایی ژ (الغز) ان ل ناڤ گەلی و نهالان تەرا وبەرا بوون و خۆ ڤەشارتن و خۆبەرزەکرن، ژ کۆما پتر ژ ٣٠ هزار کەسێن (الغز) یێن ب سەر باژێر و هەرێمێن ئازەربێجان، هەکاری، زۆزان، قەردی و بازبەدی، حەسەنیێ، پیشخابوور و باژێر و دەڤەرێن دیاربەکرێ و مووسلێ داگرتی تنێ کێمتر ژ پێنج هزاران ب سلامەتی ژێ دەربازبوون (الکامل، ٣٣٩/٧-٣٤٢).

پشتی ڤان هەوێن عەشیرەتا ئەلغزێ، ژێدەرێن دیرۆکی هەتا گرێکا دووێ ژ سەدسالییا شەشێ مشەختی/سێزدێ زاینی چ پێزانینان ل دور سەروبەرێ ناڤخۆیێ یێ دەڤەرا هەکاری دیار ناکەن، یا زانایە کو دەرکەفتنا سەلجوقیا کو ئوێچاخەکا عەشیرەتا ئەلغەزێ بوون و چوونا وان بۆ بەغدایا پایتەخت ل سالا سالا ٤٤٧مش/ ١٠٥٥ز و داگیرکرنا هەرێمێن خەلافەتا عەباسی، ئەڤ چەندە بوونە ئەگەرێ هندێ مالباتێن کوردان یێن دەستەلاتدار ژناڤبچن، لەورا پەیدابوونا دەولەتا سەلجوقی کارتێکرنەکا نەرێنی ل سەر مێژوویا سیاسی یا کوردان ب شێوەیەکێ کاریگەر هەبوو، ب رەنگەکی کو پتریا میرگەهـ و دەڤەرێن کوردی یێن سەربەخۆ ژناڤ چوون ئەوژی پشتی کو کەفتینە بەر هێرشێن دژوارێن سێ سولتانێن مەزنێن سەلجوقیان تۆغرول بەگ (٤٢٩-٤٥٥مش/ ١٠٣٧-١٠٦٣ز)و ئەلب ئەرسەلان (٤٥٥-٤٦٥مش/ ١٠٦٣-١٠٧٢ز) و مەلکشاهـ (٤٦٥-٤٨٥مش/ ١٠٧٣-١٠٩٢ز)، کەفتنا میرگەها مەروانی یا ژ نیشکەکێڤە ل سالا ٤٧٨مش/ ١٠٨٧ز باشترین بەلگەبوو ل سەر سیاسەتا سەلجوقییان بەرامبەر میرگەهێن کوردی و شەرەفخانێ بەدلیسی ل سەر هەڤیێ بوو دەمێ گۆتی سەلجوقی یەکەمین کەس بوون یێن زێدەگاڤی کرییە سەر والیێن وەلاتپارێزێن کوردستانێ (شرفنامە، بپ ٦٠٧).

### ١.میر ئەبو ئەلهەیجا کورێ عەبدوللا کورێ ئەبا خەلیلێ کورێ مەرزەبانێ هەکاری (؟- ٥٣٠مش/١١٣٦ز)،

ئێکەم میرێ بەرنیاسێ هەکارییان بوو، و دەستپێکا سالێن چالاکی یێن وی یێن سیاسی ڤەدگەریت بۆ سالا ٤٨٩مـ/١٠٩٦ز دەمێ خەلیفێن گەل میر محەمەد کورێ شەرەفولدەولە کورێ موسلمێ کورێ قورەیشێ عەقیلی (٤٧٨-٤٨٩مـ/١٠٨٥-١٠٩٦ز)بوو (الکامل، ١٨٠/٨).

سەروبەرێ هەرفتنا میرگەها عوقەیلی ل سالا ٤٨٩مش/ ١٠٩٦ز و کاودانێ نەئارام و ئالوزێ مووسلێ ژ ئەنجامێ هەڤرکیا ناڤبەرا سەرکردێن تورکان کو چەند سەرکردەکێن لەشکەرێن توندرەو ب زۆری دەست بسەر حوکمداریێدا دگرت، میر ئەبوئەلهەیجایێ هەکاری ئەڤە بۆ خۆ ب دەلیڤە دیت و هەولدا هێدی هێدی خۆ ب هێز بێخیت و ب گرتنا شورهە و کەلایێن جیرانێن خۆ دەستەلاتێ خۆ بەرفرەهتر لێ بکەت داکو د ئەنجامدا میرگەهەکا بهێز دامەزرینیت (الکامل ١٦٦/٨، ١٨٠، ٢١٠، ٢٣٨، ٢٤١ ،تأريخ أبو الفداء ٢/ ٣٣، ٤٠-٤١).

ئەم دشێن بێژین کو میر ئەبوئەلهەیجایێ هەکاری شیا رەزامەندیا خەلافەتا عەباسی ب دەست

خۆڤە بینیت و دانپێدانێ ب میرگەها وی بکەن، و دەستەلاتێ خیلافەتا عەباسی دەستەلاتێ وی ل سەر کەلا و ئاسێگەهێن ئاشەپ، ئامیدا(ئامێدیێ) و ئەلجەدیدە) و گەلێن گەهیجە و نوشی پەسەندکر (التاریخ الباهر، ص ٦٤، الکامل، ٢٤٣/٨).

د راستی دا خەلیفێ عەباسی پێدڤی ب هەڤالینی و خزمەتا میرێن کورد و عەرەبان بوون داکو د شەرەنیخا دژوارا ناڤبەرا وان و سەلجۆقیاندا هاریکاریا وی بکەن، ژبەرهندێ ژی هەردەم باوەری و پەسەنکرنا دەستەلاتێ میراتیێ ددا هەرمیرەکێ داخواز ژ وان دکر، هندیکە میرێن کوردان بوون وان ژی دەستەلاتێ روحی و هێزا مەعنەویا خەلیفەی هەردەم ب باشتر د دیت ژ هەردەستەلاتەکێ دی و میرێن کوردان د شەرەنیخا ناڤبەرا عەباسیان و سەلجۆقییان تنێ دەستەلاتێ خەلیفەی ب دەستەلاتێ شەرعی دزانی و پشتەڤانی لێ دکر هەرچەندە پارسەنگا شەرنیخێ د پتریا دەماندا د بەرژەوەندیا سەلجوقیاندا بوو.

دەمێ ل سالا ٥٢٧مش/١١٣٣ز خەلیفێ عەباسی ئەلموستەرشد باژێرێ مووسلێ دوورپێچدای و بەرپێن نەسرەدین جقرێ بریکاری (نائب)ێ عیمادەدینێ زەنگی ل باژێری و خودانێ کەلا باژێری بەرتەنگکرین و دەمێ دوورپێچێ درێژبووی، هەریەك ژ میر ئەبو هەیجایێ هەکاری و میر عیسایێ حەمیدی میر ئاکرێ هاریکاریا خەلیفەی کرن و هێزێن پێدڤی دانێ و د ڤێ روودانێدا لەشکەرەکێ زۆر دگەل میرێ هەکاری هەبوو(المنتظم، ٣٠/١٠، الکامل، ٢٤٣/٨).

و پشتی خەلیفە نەشیای بچیتە دناڤ مووسلێ دا و داگیر بکەت، بۆ بەغدا ڤەکشیا، لێ پشتی هینگێ میر عماد الدین زنکی بریاردا زنجیرەکا هێرشان بکەتە سەر کەلاێن میرگەهێن حەمیدی و هەکاری و مەهرانی و ب کەلاێن حەمیدی دەسپێکر، ئەڤ چەندە ب خۆ ئاماژەیەك بوو میرێن هەکاری و بەری هەموویان ژی بۆ میر ئەبوئەلهەیجایێ هەکاری یی کو دزانی کو کەلا و مولکێن وی دێ بنە ئارمانجێ پاشترێ هێرشێن زەنگی، لەوما ژی نوونەرەکێ خۆ دگەل گۆژمەکی پارەی هنارتە جەم زەنگی دا خۆ ل بەر وی بچەمینیت و پێگیریا خۆ ب فەرمانێن وی دیاربکەت، پاشتر ئەو ب خۆ چوو مووسلێ و لێ ئاکنجی بوو، وەسان دیار کو میر ئەبوئەلهەیجایێ هەکاری د وی دەمیدا کەسەکێ پیرەمیر بوو، گرۆڤێ ڤێ چەندێ ژی ئەوە کو کورێ وی هەڤرکیا وی دکر ل سەر مولکێن وی، دەمێ میر ئەبوئەلهەیجای قەستا مووسلێ کری ئەحمەدێ کورێ خۆ ژ کەلا ئاشەبێ دەرێخست دوورکـرە کەلا نوشێ نەکو دەلیڤا دووربوونا بابێ خۆ ببینیت و دەست ب سەر کەلاێدا بگریت، و میرەکێ کورد ب ناڤێ باوێ ئەرجی ل شونا خۆ هێلا دەستەلاتدار ل سەر کەلایێ دا ب ئەرکێ سەریەرشتیا (وصی) کورێ وی یێ بچووك عەلی رابیت.(الکامل، ٢٤٣/٩).

ل دووڤــدا پشتی دەمەکـێ نـەدرێـژ میر ئەبوئەلهەیجای ل مووسلێ وەغـەرا داویـێ کـر ، کورێ وی یێ مەزن ئەحمەدی خۆ بەرهەڤ دکر داکو دەستەلاتێ شوونا بابێ خۆ وەربگریت، ژبەرکو وی خۆ هەژیتر بۆ دەستەلاتی ژ برایێ خۆ یێ بچویك عەلی ددیت، لەوما ژ کەلا نوشێ بەرەڤ کەلا ئاشەبێ دارێ داکو ژ دەستێ باوێ ئەرجی بینتەدەرێ، باوی خۆ د کەلاێدا ئاسێکر و شەری د ناڤبەرا هەردو ئالیاندا دەسپێکر، دەمێ میرێ زەنگی ب هەڤرکیا ناڤبەرا میرێن کوردا زانی، ئەڤە بۆ خۆ ب دەلیڤە دیت کو دەست ب سەر کەلاێن هەکارێ دا بگریت، ب لەز ب لەشکرێ خۆڤە بەرەڤ کەلا ئاشەبێ چوو ب حنێرەکا سیاسی و خاپاندنا ئەو کەسێن د کەلاێدا بەرگری دکر دەست بسەر کەلاێدا گرت، گەلەك ژێ کوشتن، خوینا وان کەسان رێشت یێن هاتینە پێشوازیا وی گوهداریا خۆ بۆ فەرمانێن وی دیارکری ژ وان ژی باوێ ئەرجی، د ڤەگێرانەکا دیدا کو ژ ئالیێ ژ ئالیێ زانا و نووچەڤەگێرێن کوردانڤە دهێتەگۆتن دەمێ زەنگی کەلا ئاشەبێ گرتی کەلا هەرفاند و ل شوونا وێ کەلا ئامێدیێ (الکامل، ٣٤٣/٨-٣٤٤، تأریخ أبو الفداء، ٧١/٢).

ل دووڤدا زەنگی زڤری مووسلێ پشتی پشکەکا پلانا خۆ بۆ داگیرکرنا دەڤەرا هەکاری بجهئینای،، لێ

هەردو کەلایێن هروری و (جبل صور) وەك خۆ هیلانە د دەستێن خودانێن واندا ژبەرکو ل دووڤ بۆچوونا خۆ هزرا ترسەکێ ژ وان نەدکر، پشتی زەنگی بریکاری وی و پارێزڤان (دژدار)ێ کەلایێن وی نەسرەدین جقری بەردەوامی ب هێرشاندا بۆ گرتنا ئەوێن مایی ژ کەلایێن دەڤەرا هەکاریان ب ڕەنگەکی و کەلایێن ئاشب و نوشی و خلی کەهیجی (گەلیێ کەهیجە) و جەلاب (کولاب) داگیرکرن و هەرفاندن، هەردیسان لەشکەرێ خۆ بەرەڤ کەلایێن عەشیرەتا مەهرانی هنارت و شیان کەلایێن شەعبانی و زەعفەران و فەرەح و کواشێ و سروە هەمیان داگیر بکەن و ب ڤی رەنگی بسەر دەڤەرێن چیاییدا زاڵبوون. (الکامل ٨/٣٤٤).

ل ڤێرێ پێدڤییە بێژین کو ئیبن ئەلئەسیر ب خۆ باوەرێ دئینیت کو کو ئەو ب دروستی وان سالان نزانیت یێن تێدا زەنگی و بریکارێ وی نەسرەدین جقری ئەڤ کەلایە داگیرکرین و دبێژیت کو تاکە ژێدەرێ وی هژمارەکا ڤەگێر (الرواة) و نووچەڤەگوهێزێن کوردانە، ڤەگێرانێن وان ژ ئێکی بۆ یێ دی دجودانە، بۆ نموونە د پەرتووکا خۆ (الکامل)دا دیاردکەت کو زەنگی ل سالا (٥٣٧مش/١١٤٢ز) کەلا ئاشەب گرت و هەرفاند و ل شوونا وێ ئامێدیێ ئاڤاکر(الکامل ٩/٥-٦)، د پەرتووکا خۆیا دی (الباهر)دا دبێژیت زەنگی کەلا شەعبانیێ دووریێچدا و گرت و هەرفاند و ل شوونا وێ فەرمانا ئاڤاکرنا ئامێدیێ دا (التاریخ الباهر، بپ٦٤).

لێ هندەك کەلایێن دی یێن هەکاریێ ئەوێن دکەفتنە دەڤەرێن دوورێن رۆژهەلاتێ وەلاتێ هەکاریێ هەتا پشتی کوشتنا عیمادەدینێ زەنگی ل سالا ٥٤١مش/ ١١٤٦ز ژی ڕەنگەکێ دەستەلاتداریا خۆ پاراستبوو، بەلێ پرانییا وان کەلایێن بچووك و خۆدی دیرۆکێن بەرزەنە.

ل سالا ٥٣٩مش/ ١١٤٤ز نەسیرەدین جقر ل سەردەستێ ئەلب ئەرسەلانێ کورێ سولتان مەحموودێ سەلجەقی هاتەکوشتن، د دەمێ ڤێ کوشتنێدا نێزیکبوو عیمادەدینێ زەنگی دەست ب سەر کەلا (البیرە) ئێك ژ کەلایێن وەلاتێ شامێدا بگریت، دەمێ نووچەیێ ڤێ کوشتنێ گەهشتییە زەنگی دەملدەست دەست ژ دووریێچا کەلایێ بەردا و ب لەز بەرەف مووسلێ زڤریڤە نەکو خەلکی مووسلێ مفای ژ دووربوونا وی وەرگرن و دەست ب سەرهلدانەکێ دژی دەستەلاتێ وی بکەن، دەمێ گەهشتی زەنگی زەینەدین عەلی کوچەك کورێ بەکتەکینی دامەزرێنەری ئەتابەگیا ئەربیلێ ل شوونا بریکارێ خۆیێ کوشتی دانا بریکار ل مووسلێ.

زەینەدین عەلی کوچەك هەتا سالا ٥٦٣مش/ ١١٦٨ز بریکار بوو ل سەر مووسلێ، و دەڤەرێن ئامێدیێ و دەوروبەری وێ دانەڤ ئێك ژ بەندێن خۆ ب ناڤێ قراجا، ڤی بەندەی دەست ب داگیرکرنا وان کەلایێن هەکاری کر یێن زەنگی داگیر نەکرین وەك دەڤەرێن چیایێ صور (جلصوری-گەلیێ سوری) و هرۆر و مەلاسی و مابرما و بابوخکێ و باکزا و نەسباس، و ب ڤی رەنگی ڤۆناغەکا دی ژ ڤوناغێن سەربەخۆییا ناڤخۆییا عەشیرەتێن کوردێن هەکاری ب داویهات و زەینەدین عەلی کوچەك بوو حوکمدارێ راستەوخۆیی یێ هەموو وەلاتێ هەکارێ و ئەربیل و شارەزور و ئاکرێ کەلا و شوورهە و ئاسیگەهێن وان. (الکامل٨/٣٤٣).

**٢-میر مویارەزەدین ئەبو ئەلفەزل کورێ ئەحمەد کورێ حەسەنێ هەکاری:**

ئەڤ میرە(مبارز الدین أبو الفضل أحمد بن الحسن الهکاري) دژێدەرێن دیروکی دا یێ بەرزەیە، نەهاتییەزانین کەنگی دەستەلاتێ میرگەها هەکاری گرتییەدەست و پەیوەندییا وی دگەل میر ئەبو ئەلهەیجای چ بوو، ئیبولفوتی (أبن الفوطی) د بێژیت (ئەو ئێك بوو ژ میرێن کوردی یێن دەستەلات ل دەڤەرێن چیایی یێن هەکاری کری، کەسەکێ خودان رێزبوو، ب مێرخاسی و مەردینی هاتبوو ناسین. (معجم الألقاب،٤/٣٢٢).

## ژێدەر و پەراوێز:

### ئێك:ژێدەرێن عەرەبی و وەرگێرای بۆ عەرەبی:-


- الابشيهي، بهاء الدين ابو الفتح محمد بن احمد بن منصور (ت٨٥٤هـ/١٤٥٠م).
- المستطرف في كل فن مستظرف، دار الفكر (بيروت ١٩٩٩).
- أبن الاثير، عز الدين أبو الحسن علي بن أبي الكرم محمد بن محمد الجزري (ت٦٣٠هـ/١٢٣٢م).
- التاريخ الباهر في الدولة الاتابكية، دار الكتب الحديثة (القاهرة ١٩٦٣).
- الكامل في التاريخ، دار الفكر (بيروت ١٩٧٨).
- اللباب في تهذيب الانساب، مكتبة المثنى (بغداد (د.ت)).
- -البرزالي، علم الدين القاسم بن محمد بن يوسف الاشبيلي(ت ٧٣٩هـ/١٣٣٨م).
- المقتفي على كتاب الروضتين(تاريخ البرزالي)، تحقيق د.عمر عبدالسلام التدمري، المكتبة العصرية(صيدا- بيروت، ٢٠٠٦).
- البدليسي، الأمير شرفخان بن شمس الدين (ت١٠١٠هـ/١٦٠١م).
- شرفنامه، ترجمة محمد جميل الملا احمد الروزبياني، ط٢ (اربيل٢٠٠١).
- البلاذري، أبو الحسن احمد بن يحيى بن جابر (ت٢٧٩هـ/٨٩٢م).
- فتوح البلدان، دار الكتب العلمية (بيروت١٩٧٨).
- التادفي، محمد بن يحيى الحلبي (ت٩٦٣هـ/١٥٥٦م).
- قلائد الجواهر في مناقب الشيخ عبدالقادر، دار احياء التراث العربي (بغداد١٩٨٤).
- التنوخي، القاضي أبو علي المحسن بن علي (ت٣٨٤هـ/٩٩٤م).
- الفرج بن الشدة، دار صادر (بيروت، ١٩٧٨).
- نشوار المحاضرة واخبار المذاكرة، دار صادر (بيروت ١٩٧٢).
- المنتظم في اخبار الملوك والامم ،الدار الوطنية (بغداد١٩٩٠).
- حاجي خليفة، مصطفى بن عبدالله جلبي (ت١٠٦٧هـ/١٦٥٧م).
- كشف الظنون في اسامي الكتب والفنون،دار الفكر (بيروت١٩٩٤).
- أبن حجر العسقلاني، الحافظ شهاب الدين احمد بن علي (ت٨٥٢هـ/١٤٤٨م).
- انباء الغمر بابناء العمر، تحقيق حسن حبشي (القاهرة ١٩٩٤-١٩٩٨ ).
- الدرر الكامنة في اعيان المئة الثامنة، دار الكتب العلمية (بيروت١٩٩٧).
- ابن حوقل،ابوالقاسم محمد بن علي النصيبي(ت٣٦٧هـ/٩٧٨م).
- صورة الارض،دار مكتبة الحياة( بيروت١٩٧٩).
- أبن خردابه، أبو القاسم عبيدالله بن عبدالله (ت٢٨٠هـ/٨٩٣م).
- المسالك والممالك، دار احياء التراث العربي (بيروت١٩٨٨).
- الخزنداري ، قرطاي العزي (ت بعد ٧٠٨ هـ / ١٣٠٨ م ) .
- تاريخ مجموع النوادر مما جرى للأوائل والأواخر ،تحقيق عمر عبد السلام تدمري،المكتبة العصرية (صيدا ٢٠٠٣) .
- أبن خلكان، أبو العباس شمس الدين احمد بن محمد بن أبي بكر (ت٦٨١هـ/١٢٨٢م).
- وفيات الاعيان وانباء أبناء الزمان، تحقيق احسان عباس، دار صادر (بيروت ١٩٧٧).
- الدمشقي، ناصر الدين محمد بن شمس الدين عبدالله بن محمد القيسي(ت ٨٤٢هـ/١٤٣٨م).
- توضيح المشتبه، تحقيق محمد نعيم المرقسوسي، مؤسسة الرسالة(بيروت، ١٩٩٣).

- الذهبي، شمس الدين محمد بن عثمان بن قايماز (ت٧٤٨هـ/١٣٤٧م).
- تاريخ الاسلام ووفيات الممةلكير والاعلام، دار الكتاب العربي (بيروت ١٩٩٨-١٩٩٩).
- -ذيل تأريخ الأسلام،دار الكتاب العربي(بيروت٢٠٠٤).
- سير اعلام النبلاء، دار الفكر (بيروت١٩٩٧).
- أبن رسته، أبو علي احمد بن عمر (ت٢٩٠هـ/٩٠٣م).
- الاعلاق النفيسة، دار احياء التراث العربي (بيروت ١٩٨٨).
- السبكي، تاج الدين أبي نصر عبدالوهاب بن علي بن عبدالكافي (ت٧٧١هـ/١٣٧٠م).
- طبقات الشافعية الكبرى، دار احياء الكتب العربية(القاهرة ١٩٦٤).
- السخاوي،شمس الدين محمد بن عبدالرحمن (ت٩٠٢هـ/١٤٩٧م).
- الجواهر والدرر في ترجمة شيخ الاسلام ابن حجر، دار ابن حزم (بيروت ١٩٩٩).
- الضوء اللامع لأهل القرن التاسع، دار مكتبة الحياة (بيروت (د.ت)).
- السمعاني، أبو سعيد عبدالكريم بن محمد بن منصور (ت٥٦٢هـ/١١٦٧م).
- الأنساب، دار الفكر (بيروت ١٩٩٨).
- السلفي، صدر الدين أبو طاهر احمد بن محمد بن احمد الاصفهاني (ت٥٧٦هـ/١١٨٠م).
- معجم السفر، منشورات وزارة الثقافة والاعلام (بغداد ١٩٧٨).
- أبوشامة، شهاب الدين عبدالرحمن بن اسماعيل المقدسي، (ت٦٦٥هـ/١٢٦٦م).
- الروضتين في اخبار الدولتين النورية والصلاحية، دار الكتب العلمية (بيروت ٢٠٠٢).
- ذيل الروضتين، دار الجيل (بيروت ١٩٧٤).
- ابن شداد، بهاء الدين يوسف بن رافع بن تميم (ت٦٣٢هـ/١٢٣٤م).
- سيرة صلاح الدين الايوبي (النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية)، دار المنار (القاهرة ٢٠٠٠).
- أبن شداد، عزالدين محمد بن علي بن ابراهيم (ت٦٨٤هـ/١٢٨٥م).
- الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الجزيرة، تحقيق يحيى زكريا عبارة، ج١ (دمشق، ١٩٩١)، ج٣ (دمشق ١٩٧٨).
- تاريخ الملك الظاهر، باعتناء احمد حطيط (بيروت ١٩٨٣).
- الشطنوفي، نور الدين أبو الحسن علي بن يوسف اللخمي (ت٧١٣هـ/١٣١٣م).
- بهجة الاسرار ومعدن الانوار، مطبعة شركة التمدن الصناعية (القاهرة ١٣٣٠هـ).
- أبن الشعار، كمال الدين أبي البركات المبارك بن الشعار الموصلي (ت٦٥٤هـ/١٢٥٦م).
- قلائد الجمان في فرائد شعراء هذا الزمان، تحقيق كامل سليمان الجبوري، دار الكتب العلمية (بيروت: ٢٠٠٥)، ج٣، دار الكتب للطباعة والنشر بجامعة الموصل (الموصل ١٩٩٢).
- الوافي بالوفيات، دار احياء التراث العربي (بيروت ٢٠٠٠).
- الطبري، أبو جعفر محمد بن جرير (ت٣١٠هـ/٩٢٣م).
- تاريخ الطبري (تاريخ الرسل والملوك)، دار المعارف ( القاهرة ١٩٧٧-١٩٧٩).
- -أبن عربمةلك،شهاب الدين أحمد بن محمد بن عبدالله الدمشقي(ت٨٥٤ هـ /١٤٥٠م).
- عجائب المقدور في نوائب تيمور، مطابع دار نافع (القاهرة ١٩٧٩).
- العماد الاصفهاني، عماد الدين بن محمد بن حامد (ت٥٩٧هـ/١٢٠٠م).
- الفتح القسي في الفتح القدسي، الدار القومية للطباعة والنشر (القاهرة ١٩٦٥).
- العمري، شهاب الدين احمد بن يحيى بن فضل الله (ت٧٤٩هـ/١٣٤٨م).
- التعريف بالمصطلح الشريف، دار الكتب العلمية (بيروت ١٩٨٨).
- مسالك الابصار، السفر الثالث (مخطوط) نسخة المجمع العلمي العراقي.

- أبن العماد الحنبلي، أبو الفلاح عبدالحي (ت١٠٨٩هـ/١٦٧٨م).
- شذرات الذهب في اخبار من ذهب (بيروت (د.ت)).
- الفارقي، احمد بن يوسف بن علي بن الازرق (ت بعد ٥٧٧هـ/١١٨١م).
- تاريخ الفارقي،تحقيق بدوي عبداللطيف عوض (القاهرة ١٩٥٩).
- من تأريخ آمد و ميافارقين، حققه الدكتور سهيل زكار ونشره في الجزء الحادي عشر من الموسوعة الشامية في تاريخ الحروب الصليبية (دمشق ١٩٩٥).
- أبو الفداء، الملك المؤيد عماد الدين اسماعيل بن علي (ت٧٣٢هـ/١٣٣٢م).
- تقويم البلدان (باريس ١٨٤٠).
- أبن الفقيه، أبو بكر بن محمد الهمذاني (ت٣١٠هـ/٩٢٣هـ).
- مختصر كتاب البلدان، دار احياء التراث العربي (بيروت ١٩٨٧).
- الفيروزآبادي، مجد الدين محمد بن يعقوب (ت٨١٧هـ/١٤١٤م).
- القاموس المحيط، دار احياء التراث العربي ، ط٢(بيروت ٢٠٠٠).
- القلقشندي، أبو العباس احمد بن علي (ت٨٢١هـ/١٤١٨م).
- صبح الاعشى في صناعة الانشا، دار الكتب العلمية (بيروت ١٩٨٧).
- فوات الوفيات و الذيل عليها،دار صادر (بيروت ١٩٧٣).
- أبن كثير، عماد الدين اسماعيل بن كثير الدمشقي (ت٧٧٤هـ/١٣٧٢م).
- البداية والنهاية، دار الكتب العلمية (بيروت ١٩٨٧).
- مؤلف مجهول (القرن الثامن الهجري / الرابع عشر الميلادي).
- كتاب الحوادث، دار الغرب الاسلامي (بيروت ١٩٩٧).
- أبن المستوفي، شرف الدين أبي البركات المبارك بن احمد اللخمي (ت٦٣٧هـ/١٢٣٩م).
- تاريخ اربل، دار الرشيد للنشر (بغداد ١٩٨٠).
-المسعودي، أبو الحسن علي بن الحسن بن علي (ت٣٤٦هـ/٩٥٧م).
- التنبيه والاشراف، دار مكتبة الهلال (بيروت ١٩٨١).
- مروج الذهب ومعادن الجوهر، دار الفكر، ط٥، (بيروت ١٩٧١).
- مسكويه، أبو علي احمد بن محمد بن يعقوب (ت٤٢١هـ/١٠٢٩م).
- تجارب الامم، مطبعة التمدن الصناعية (مصر ١٩١٤-١٩١٥)، أعادت طبعه مكتبة المثنى ببغداد.
- المقدسي، أبو عبدالله محمد بن احمد البشاري (ت٣٨٠هـ/٩٩٠م).
- احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، دار احياء التراث العربي (بيروت ١٩٨٧).
- المقريزي، تقي الدين أبي العباس احمد بن علي (ت٨٤٥هـ/١٤٤١م).
- السلوك لمعرفة دول الملوك،٤مجلدات(القاهرة١٩٤١_١٩٧٢).
- الخطط المقريزية، دار الكتب العلمية (بيروت ١٩٩٧).
- كتاب المقفى الكبير، تحقيق محمد البعلاوي، دار الغرب الاسلامي (بيروت ١٩٩١).
- المنذري، زكي الدين أبو محمد عبدالعظيم بن عبدالقوي (ت٦٥٦هـ/١٢٥٨م).
- التكملة لوفيات النقلة، مؤسسة الرسالة، ط٤ (بيروت ١٩٨٨).
- النابلسي، أبو عثمان الصفدي (ت ٦٥٦هـ/١٢٥٨م).
- تاريخ الفيوم وبلاده، دار الجيل (بيروت ١٩٧٤).
- أبن واصل جمال الدين محمد بن سالم (ت٦٩٧هـ/١٢٩٧م).
- مفرج الكروب في اخبار بني ايوب، ج١، ج٢، ج٤ (القاهرة ١٩٥٣،١٩٦٠،١٩٧٢)،ج ٦(صيدا-بيروت٢٠٠٤).

- یوحنا بن كلدون (القرن العاشر الميلادي).
- ياقوت ئەلحەمەوی، شهاب الدين أبو عبدالله ياقوت بن عبدالله الرومي (ت٦٢٦هـ/١٢٢٩م).
- معجم البلدان، دار صادر (بيروت ١٩٧٩).
- تاريخ يوسف بوسنايا، ترجمه وعلق عليه القس يوحنان جولاغ (بغداد ١٩٨٣-١٩٨٤).

**دوو:ژێدەرێن فارسی:-**

- جلال الدين رومي، مولانا محمد بن محمد بن حسين بلخي (ت٦٧٢هـ/١٢٧٣م).
- مثنوي معنوي، به تحقيق رينولد نيكلسون، جابخانه نصر، جاب أول (تهران ١٣٧٧ هـ.ش).
- نزهة القلوب، كتابخانه طهوري (تهران ١٣٦٣ هـ.ش).
- رشيد الدين فضل الله الهمداني (ت٧١٨هـ/١٣١٨م)
- جامع التواريخ، جاب دوم، بكوشش بهمن كريمي، انتشارات اقبال (تهران ١٣٦٢هـ.ش).
- القاشاني، أبو القاسم عبدالله بن محمد (ت٧٣٨هـ/١٣٣٧م).
- تاريخ اولجايتو، باهتمام مهين همبلي، انتشارات علمي وفرهنكي (تهران ١٣٨٤هـ.ش).

**سێ: لێ ڤەكەرێن عەرەبی و وەرگێرایی بۆ عەرەبی:-**

- هدية العارفين في اسماء المؤلفين وآثار المصنفين، دار الفكر(بيروت١٩٩٠).
- برصوم، مار اغناطيوس افرام الاول.
- تاريخ طور عابدين، ترجمه إلى العربية كريكوريوس بولس بهنام، ١٩٦٣م.
- -الحسني، عبدالرزاق.
- اليزيديون في حاضرهم وماضيهم، منشورات المكتب العربي (بغداد ١٩٨٤).
- عبدالرقيب يوسف.
- الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى، الجزء الاول- التاريخ السياسي (بغداد ١٩٧٢).
- الجزء الثاني- التاريخ الحضاري، ط٢، (اربيل٢٠٠١).
- محسن محمد حسين.
- اربيل في العهد الاتابكي، مطبعة اسعد (بغداد ١٩٧٦).

**چار:لێ ڤەكەرێن فارسی:-**

- اسماعيل فتاح قاضي.
- كرد در دائرة المعارف اسلام ،انتشارات مركز صلاح الدين ايوبي (اورمية ١٣٦٧هـ.ش).
- عبدالرزاق بيك دنبلي.
- تجربة الاحرار وتسلية الاسرار، چاپخانه شفيق (تبريز ١١٣٦٩هـ.ش).

**پێنج:گۆڤار:-**

- مجلة لالش، العدد (٢-٣) (دهۆك ١٩٩٤)، العدد (٦) (دهۆك ١٩٩٦).

**شەش:مالپەر:-**

- www.alwaraq.com

# بادینان لەسەردەمی سەلجوقی

**پ.د.قادر محەمەد حسن**
**زانكۆی سەلاحەدین-كۆلیژی ئەدەبیات**

سەردەمی سەلجووقی بە ماوەیەكی تارادەیەك فراوانی سەردەمی ئیسلامی و بەدیاریكراوی لەسەردەمی عەبباسی دەگوترێت، كە سەرەتاكەی لە گرتنی شاری بەغداو كۆتایی هێنان بە ماوەی فەرمانڕەوایی بوەیهییەكان لەساڵی ٤٤٧ك/١٠٥٥ز دەست پێدەكات و بە پەیدابوونی بەكاوە خۆی ئەتابەگەكان لە سەرەتای سەدەی شەشەمی كۆچی/سەرەتای سەدەی دوازدەیەمی زاینی، بەرە بەرە دەپوكێتەوە و سەردەمی ئەتابەگەكان دەست پێدەكات كە لەسەر دار و پەردوی سەردەمی سەلجوقی دامەزرابوون هەندێك وەكو درێژەپێدەر سەردەمەكەی دەبینن .

سەلجوقییەكان بنەماڵەیەك بوون لەبنەچەدا لە هۆزی غەز (الغز) كە لە میللەتانی تورك زمانی دەڤەری ئاسیای ناوەڕاست بوون، یەك لەهۆزە قەوغاكانی ناوچەكەبوون، لەسەرەتای سەدەی پێنجەمی كۆچی /یازدەیەمی زاینی، بەرەبەرە، لەبەر زۆربوونی حەشیمەتیان و بۆخاتری پەیداكردنی بژێوی پتر و لەوەڕگا، لە زێدی خۆیانەوە بەرەو ناوچەكانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی كۆچیان كردووە[1] سەرەنجام بە كەڵك وەرگرتن لە بێ سەرو بەری حوكمی بوەیهییەكان لەبەغداو لاوازی و پەڕیوتی پێگەی خەلیفەكانی بەغدا، سەلجوقییەكان بەسەركردایەتی تەغرول بەگ لەساڵی ٤٤٧ك/١٠٥٥ز توانییان دەست بەسەر بەغدادا بگرن و ئیدی سەردەمێكی نوێ لە مێژووی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی دەستی پێكرد[2] .

لە سەردەمی سەلجوقییەكان دەڤەری بادینان كە ئەو كات پتر لەنێو چوارچێوەی ووەلاتی هەكاری بوو ،چەند دەسەڵاتدارییەتیەكی كوردی خۆجهێ لەوێ ئاواكرابوون كە ڕیشەی هەندێكیان بۆ پێش هاتنی سەلجوقییەكان دەگەڕایەوە، دیارە ئەو ناوچەیە لەبەر سروشتی بەچیاو چۆڵ و سەختی و هەروەتر ،بوونی چەندان هۆزی بەهێزی لەگوێن: حەمیدی و هەكاری و مەهرانی وایكردبوو كە كوردانی وێندەرێ هەمیشە لەهەلپەی خۆسەری دابن و مل بۆ داگیركەرو خۆسەپێنان دانەنەوێنن. بۆیە لەو ماوەیەدا كوردانی حەمیدی خودان دەسەڵاتی سەربەخۆی خۆیان بوون بە سەر ئاكرێ (عقر) و قەڵای شوش و لەسەردەمی بوەیهییەكانەوە دەسەڵاتی خۆیان بەهێزكردبوو بۆیە لەلایەن هێزە و دەوڵەتانی ناوچەكە حیسابیان بۆ دەكرا[3]،لەماوەی هاتنی سەلجوقییەكان دەسەڵاتی حەمیدییەكان بەردەوام بوو، بە ڕۆشنی نازانرێ هەڵوێستی سەلجوقییەكان لەبارەیانەوە چۆن

بووە ،بەلام بە لەبەرچاوگرتنی ئەو سیاسەتەی کە سەلجوقییەکان دواتر پێی ناسران کە سیاسەتی سەپاندنی دەسەلاتی راستەوخۆی خۆیان بوو بەسەر هەموو ئەو ناوچانەی لەژێر قەلەمرەویان دابوون، پێدەچێت بەو هۆیەوە کوردە حەمیدییەکان نەیان توانیبێ لە درێژەدان بەدەسەلاتی سەربەخۆیان وەکو جاران بەردەوام بن .

جێی ئاماژەیە کە دەسەلاتی کوردە حەمیدییەکان بەسەر ناوچەی ئاکرێ و شوش و دەوروبەریان بەشێوەیەك لەشێوەکان هەر بەردەوام بووە ،بەبەلگەی ئەوەی کە لەسەردەمی عیمادولدین زەنگی ئەتابەگی موسل، کوردە حەمیدییەکان دەسەلاتی خۆجهی خۆیان هەبووە، کە میر عیسای حەمیدی سەرکردایەتی کردووەو لەلایەن زەنگیەوە دان بەدەسەلاتەکەیدا بەسەر ئاکرێ و شوش و سەرجەم ئەو ئاوەدانی و قەلایانەدا نراوە کەلەبن دەستی دابوون هەروەکو کە میر عیساش دانی بەفەرمانڕوایی زەنگی داناوە[٤].ئەمەش سەلمێنەری ئەو ڕاستییەیە کە دەسەلاتی کوردە حەمیدییەکان لەسەردەمی سەلجوقی ئەگەر بە سنورداریش بووبێ درێژەی هەبووە فەرمانڕەوایەتیەکەش فراژوبووی مێژوویەکی دێرینترە کە دیاریکردنی سەردەمەکەی ئاسان نیە ،هەروەها ئەم دانپێدانانە دەرخەری پێگە و توانای میر عیسای حەمیدی و دەسەلاتداریەتیەکەیەتی کە عیمادولدین زەنگی بەهەندی وەرگرتووە، کەواتە دەسەلاتی سەلجوقییەکان لەو بەشەی بادینان (ئاکرێ و دەوروبەری) مکوم نەبووە و سیاسەتی حوکمی ڕاستەوخۆی سەلجوقییەکان بەناچاری لە بەرامبەر ترادسیونی دەسەلاتی هۆزایەتی کوردانی ئەوێ پاشەکشەی کردووە .

دیارە میر عیسای حەمیدی هەر لەنێو چوارچێوەی جغزی دەسترۆیشتوویی زەنگی دا نەماوەتەوەو لەو ناکۆکیەی کە لە سالی ٥٢٧ك/١١٣٢ز کەوتە نێوان زەنگی و خەلیفە ئەلموستەرشید بیللای عەبباسی (٥١٢-٥٢٩ك/ ١١١٨-١١٣٤ز)، میر عیسا بێلایەن نەبووەو پشتی خەلیفەی گرتووە، بۆیە لەلایەن زەنگیەوە دژایەتی کراوەو لەسالی ٥٢٨ك/١١٣٣ز هێرش کراوەتە سەر ناوچەکانی شوش و قەلای ئاکرێ و توانیویەتی ئەو ناوچانە داگیر بکاو کۆتایی بە فەرمانڕەوایی کوردە حەمیدییەکان بەسەر ئەو ناوچانەی دەڤەری بەهدینان بێنێ[٥].

بەشێکی دیکەی ناوجەرگەی دەڤەری بەهدینان کە ناوچەی ئامێدییە و ئەو سەردەمە پێکهاتبوو لە قەلاکانی ئاشەب و نوشی و هرور چەند قەلایەکی دیکە، لەم ناوچەیەشدا دەسەلاتداریەتی کوردی لەسەردەمی سەلجوقییەکان بوونی هەبووە کە ڕوون نیە سەرەتاکەی بۆ کەنگی دەگەرێتەوە، لەسەروبەندی دەرکەوتنی دەسەلاتداریتی ئەتابگیەی زەنگیەکان لە موسل، ئەو ناوچەیەی بەهدینان لەژێر فەرمانڕەوایی میر ئەبولهیجا کوڕی عەبدوللا کوڕی ئەبوخەلیل کوڕی مەرزەبانی هەکاری دابووە[٦] .

سەلجوقییەکان لەبەر سەختی ناوچەکەو بەهێزی هۆزە کوردەکانی وێندەرێ ناوچەی بن دەستی ئەوانیان بەشێوەی ڕاستەوخۆ حوکم نەکردووە، هەرچەندە والی موسل کەناوی جیوش بەگ بوو سەلجوقییەکان دایانمەزراندبوو جاری یەکەم لە سالی ٥٠٧ك/١١١٣ز جاری دووەم لەسالی ٥٠٩ك/١١١٥ز ویلایەتی موسلی لەبن دەست بووەو یەك لەکارەکانی لەماوەی کورتی ویلایەتەکەیدا سەرکوتکردنی کوردانی ناوچەی هەکاری بوو کە دەڤەری بادینان بەشی باشووری ئەوێی پێکدەهێناو بە شێوەیەکی زۆر ترس و بیمی لە ناوچەکەدا بلاوکردەوە[٧].ئەمەش وادەردەخات لەو ناوچانەدا دەسەلاتی هۆزایەتی –خۆجهی هەبووە کە سەلجوقییەکان بەمەترسییان زانیوە، بەلام لەگەل ئەو سەرکوت و لەشکرکێشیانەشدا نەیانتوانیوە لەناویان ببەن و وا لەکوردەکانی دەڤەرەکە بکەن دەستو پەنجە لەگەل حوکمی سەلجوقی نەرم بکەن .

بۆیە وای تێدەگەین دەسەلاتی خۆجهی فەرمانڕەوایانی ئامێدی لەبنەمالەی مەرزەبان دا درێژەی هەبووەو کە عیمادولدین زەنگیش لەناوچەکەدا

بەهێزبوو بەتایبەتی دوای زاڵ بوون بەسەر ناوچەكانی كوردە حەمیدییەكان، ئیدی میر ئەبولهیجا ترسی لێ نیشتوە نەبادا ناوچەكەی ئەویش بەدەردی ئاكرێ و شوش بچێ بۆیە بۆ خۆی پارەی بۆ زەنگی ناردووە وەكو دەم چەوركردن بۆ ئەوەی ووەلاتەكەی داگیر نەكات ،هەر بەمەشەوە نەوەستا بەڵكو بارودۆخی ناوخۆی دەسەلاتەكەی رێكخست و قەلای نوشی دایە كوڕە گەورەكەی كە ناوی ئەحمەد بوو وە میرێكی كوردی بەناوی باوی ئەرجی لەجێی خۆی لە ئاشەب داناو بۆ خۆی لەساڵی ٥٢٨ك/١١٣٣ز چوو بۆ موسڵ بۆ لای عیمادولدین زەنگی و لایەنگری و پابەندی بۆ دەربڕی پاش مانەوەی بۆماوەیكی كورت هەر لەهەمان ساڵدا لەموسڵ كۆچی دوایی كردووەو لەوێ نێژراوە[٨] .

دابەشكردنی دەسەلاتە خوجهییەكانی فەرمانڕەوایيەكەی بەم شێوەیەی ئاماژەمان بۆ كردو و چونی میر ئەبولهیجا بۆ موسڵ و لایەنگیری كردنی بۆ زەنگی و مانەوەی لەوێ و نەگەڕانەوەی بۆ زێدی خۆی، پرسیاری جیاجیا سەبارەت بە خودی میر ئەبولهیجا و مێژووی ئەو ناوچەیەی بەهدینانی ئەو كات دەوروژێنێ. وای دەبینین میر ناچار بووە ئەو هەنگاوانە هەڵبێنێ، وە چوونی بۆ موسڵ بەمانای وازهێنانی لەدەسەلاتەكەی و خۆ رادەستكردنی بە زەنگی ناگەیەنێ ئەگەر بەو نیازەبا ئەوا لەبری دانانی كەسێك بەناوی (باوی ئەرجی) ئەوا یەكێك لە كوڕەكانی لەجێی خۆی دادەنا، بەلام گومانی لەوە هەبو كەدانانی ئەحمەدی كوڕی لەجێی خۆی ڕەنگە سەرئێشەی بۆ دروستبكات چونكە تێی گەیشتبوو كەكەسێكی مەزنخوازەو دەیەوێ بۆ خۆی ببێتە میر، بۆیە بەمەزەندە وای دەزانی لەكاتی گەڕانەوەی لەموسڵ ئەوا ڕەنگە كوڕەكەی ڕێگری لێبكات و واز لەدەسەلات نەهێنێ، بۆیە میر ئەبولهیجا وای بەباش زانی كەسێكی دیكەی دەرەوەی بنەماڵەی خۆی لەجێی خۆی دابنێ بۆ ئەوەی خودانی ئەو شەرعیەتە نەبێت مەترسی بۆ سەر ئایندەی دەسەلاتداریەتییەكەی دروستبكات و كەی بیەوێت بتوانێ لەسەر كاری لابدات. مردنی میر ئەبولهیجا لەموسڵ و نە ناردنەوەی تەرمەكەشی بۆ بەهدینان و ناشتنی لەموسڵ وای لێ دەخوێندرێتەوە كە ئەو میرە ڕەنگە لەوێ ناچاری مانەوە كرابێ و ڕێی پێنەدرابێت بگەڕێتەوە ،ئەگەر وانەبا دەبو وەكو دابێكی كوردەواری لانی كەم لە زێدی خۆی تەرمەكەی بەخاكسپێردرابا

بەلام خوێندنەوەی میر ئەبولهیجا لەجێی خۆی نەبووە، چونكە هەر دوای مردنی ناكۆكی كەوتە نێوان ئەحمەدی كوڕی و باوی ئەرجی، چونكە كوڕەكەی هەر بەزانینی هەواڵی مەرگی باوكی، گەمارۆی قەلای ئاشەبی دا، بەلام باوی ئەرجی بەرگری كردو وای نیشاندا كە بۆ مافی كوڕە بچوكەكەی میر كەناوی عەلی بوو تێدەكۆشێت و دەسەلاتداریەتیەكە دەپارێزێت تا گەورە دەبێ و ڕادەستی دەكات، بەلام لەنێو ئەو ململانێیانەدا ئەوەیان لەبیر چووبو كە فەرمانڕەوایەتیەكەیان بەردەوام لەژێر هەڕەشەی زەنگی دایە، بۆیە زەنگیش كەلەو پەرەسەندنانە بێ ئاگا نەبوو سەركردایەتی سوپایەكی گەورەی خۆی كردو گەمارۆی قەلای ئاشەب ی دا، پاش بەرگریكردنی كوردانی وێندەرێ سوپای زەنگی بەفیڵی ئەوەی گەمارۆی شكاندوە وای نیشاندا پاشەكشە دەكات بۆیە دوای دوركەوتنەوەیەكی كەم لە شورەی ئاشەب لەناكاو بەسەری دادانەوەو توانی پاش كوشتارو وێرانییەكی زۆر دەست بەسەر قەلایەكەدا بگرێت و چەندان سەركردەی گەورە بكوژێت كە باوی ئەرجی لەناویاندا بوو [٩].

دوای ئەو لەشكركێشییە وگەڕانەوەی زەنگی بۆ موسڵ، جارێكی دیكە ئەو ناوچانەی بادینان كەڵكەڵەی خۆسەریان هاتۆتەوە سەرو دەسەلاتی زەنگییان خستۆتە مەترسیەوە، بۆیە یەك لە جێگرانی زەنگی كەناوی نەسیرەدین جقر بووە لەساڵی ٥٣٧ك/١١٤٢ز جارێكی دیكە هێرش دەكاتەوە بۆ سەر ناوچەكەو ئەمجارە وێڕای ئاشەب، قەلاكانی هرور و نیروەش دەكاتە ئامانج كە دیارە لەبن دەستی كوردانی ناوچەكەدابوون و دەیانخاتە بن دەستی خۆی هەرلەم سۆنگەیەوەیە زەنگی فەرمانی بەجقر كردووە قەلای ئاشەب بروخێنێ و یەكی دیكەی

لەجێگادا بنیات بنێتەوە[10].

هەندێك لەسەرچاوەكان ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە عیمادولدین زەنگی لەبەر ئەو بەرخودانەی لە كوردانی قەڵای ئاشەب دا بینی و لەبەر سەختی قەڵایەكە بڕیاری داوە بیڕوخێنێ و سەرلەنوێ بینای بكاتەوە كەلەم بارەیەوە بۆ چوونی جیاجیا هەیە بەڵام سەرجەمیان كۆكن لەسەر ڕوخاندنی قەڵایەك و ئاواكردنەوەی قەڵایەكی دیكە جا لەجێگایەكی جیاواز یان لەسەر داروپـــەردوی هەمان قەڵا كە واپێدەچێت هەر قەڵای ئامێدی بێت[11] .

لە دیارترین ئەو گۆڕانكاریانەی بـەدوای ئەو داگیركاریەی زەنگیەكان بۆ ئەو ناوچانەی بەهدینان هات ئەوەبوو كە وێرانكاریەكی زۆر لە ئامێدی و ئەو ناوچانە ئەنجامدراوە گرێدران بە ئەتابەگییەی زەگیەكانەوە و سەربەخۆیی ئەو ناوچانە پاش چەندان ساڵ ئەگەر بۆماوەیەكیش بێت كۆتایی هات .

زەنگیەكان حوكمی ناوچەی هەكاری كە دەڤــەری بادینانیش بەشی سەرەكی بوو سپارد بە نەسیرەدین جقر كەپاش كوژرانی لە ساڵی ٥٣٩ك/١١٤٤ز زەینەدین عەلی كچك جێگای گرتەوە كە ئەویش یەكێكی بەناوی قراجە كــردە میر بەسەر ئەو ناوچانەوە كە واپێدەچێت نەیتوانیبێ بەڕاستەوخۆ حوكمی ئەوێ بكات بۆیە دوای ساڵی ٥٤١ك/١١٤٦ز لەشكركێشیەكی كردۆتە سەر هرور و چیای سورا و ملاسی و مابرما و چەندین قەڵاو ناوچەی دیكە[12] ئەمەش نیشانیدەدا كە نەتوانراوە هۆزە كوردیەكانی ناوچەكە جڵەوبكرێن و بهێنرێنە ژێر ركێفی دەسەڵاتدارانی ئەتابەگی و جێگرەكانیان بۆیە بەردەوام هێرشیان كراوەتە سەر .

لەوەی ئاماژەمان پێدا سەبارەت بە دیرۆكی بادینان لە سەردەمی سەلجوقی بە چەند ئەنجامێك دەگەین كەبەم شێوەیە دەیانخەینە ڕوو :

- لەسەروبەندی پەیدابوونی سەلجوقییەكان ناوچەی بادینان كە بەشێكی دیاری دەڤەری هەكاری بوو، خودان دەسەڵاتداریەتی خۆجهی هــۆزە كوردیەكانی حەمیدی و هەكاری بوو كە دەسەڵاتیان لە سنوورێكی بەر تەسكی جوگرافیدا بوو بەڵام مكوم و دامەزراو هەڵقوڵاوی پێداویستییە سیاسی و جڤاكییەكانی كۆمەڵگای كوردی ناوچەكە بوو .
- ئەوەی تێبینی دەكرێت لەو دەسەڵاتداریەتییە كوردیانەی لەناوچەكەدا هەبوون، وێڕای بوونی نەیارو دوژمنی هاوبەش كە ویستویەتی خاكیان داگیربكاو دەسەڵاتیان نەهێڵێ كەچی نەك هەر هیچ هەماهەنگییەك و یەككرتوییەك لەنێوانیاندا بەدیناكرێت بەڵكو لەسەرچاوە مێژووییەكاندا تەنانەت ئاماژە بۆ بوونی نیاز یان هەوڵێكیش بەو ئاقارەدا نەكراوە ،ئەمەش دەردێكی لەمێژینەیەو كاریگەرییەكانی سنووری دیرۆكیان بەزاندوە و بەرهەڤی بەردەوامیان لەپەرسەندنی كۆمەڵگای كوردیدا هەبووە .
- بادینان لەماوەی سەلجوقییەكان و جێگرەوە ئەتابەگییەكانیشدا نەتوانراوە بۆ داگیركاری ئەوان ڕام بكرێت و هەرگیز بۆیان نەلواوە ڕاستەوخۆ حوكمی ئەوێ بكەن هەمیشە جێگرو نوێنەریان بۆ داناوەو ئەوانیش لە مووسڵ دانیشتون و وەكو دەسەڵاتداری دەڤەرەكە ناسێنراون بەڵام ئەوەی لەبارەی حوكمی ئەوانەوە لەناوچەی بەهدینان توومارکرابێ ئەوەیە بەبیانوی پاراستنی تەنایی و سەقامگیری و ڕاونانی دەسەڵاتیان ناوەناوە هێرشیان بردۆتە سەر دەڤەرەكە و دابی تاڵانی و وێرانی داگیركەرانیان درێژە پێداوە .

## ژێدەر و پەراوێز:


١. بروانه : الراوندي،راحة الصدور وآية السرور في تاريخ الدولة السلجوقية، نقله الى العربية،ئيبراهيم امين الشواربي و آخرون ،(القاهرة:١٩٦٠) ص١٦٠. الحسيني، زبدة التواريخ اخبار الأمراء والملوك السلجوقية ،تحقيق: محةمةد نورالدين، (بيروت:١٩٨٦) ص ٢٨

٢. ابن القلانسي، ذيل تاريخ دمشق،(بيروت:١٩٠٨) ص ٨٧، ابن العمراني،الأنباء في تاريخ الخلفاء، تحقيق ودراسة:قاسم السامرائي، (ليدن:١٩٧٣) ص١٨٩.

٣. بروانه: ياقوت الحموي،معجم البلدان، دارصادر (بيروت:د.ت) ج٤، ص١٣٦؛عمادالدين خليل، عمادالدين زنكي (الموصل:١٩٨٥) ص١٠٤.

٤. ابن الأثير، الكامل في التاريخ، تحقيق واعتناء:عمر عبدالسلام تدمري، (بيروت:٢٠٠٦ ) ج٩ ص٥٢.

٥. ابن الأثير ،التاريخ الباهر في الدولة الأتابكية (بالموصل) تحقيق:عبدالقادر احمد طليمات، (مصر:١٩٦٣) ص٤٨.

٦. ابن الأثير ،الكامل،ج٩، ص٥٣؛ ابن واصل، مفرج الكروب في أخبار بني أيوب ،تحقيق:جمال الدين الشيال، (القاهرة:١٩٥٣) ج١،ص٥٥.

٧. بروانه :ابن العبري، تاريخ الزمان، نقله الى العربية: الاب اسحاق ارملة(بيروت:١٩٩١) ص١٣٨؛ درويش يوسف حسن، بلاد هكاري ٩٤٥-١٣٣٦م دراسة سياسية حضارية(دهۆك:٢٠٠٥)ص١٠٨-١٠٩.

٨. ابن الأثير، الكامل،ج٩،ص٥٣

٩. المصدر نفسه، ج٩ص٥٣؛ عماد الدين خليل، عمادالدين زنكي،ص ١٠٨.

١٠. ابن واصل ،مفرج الكروب،ج١ص٥٦

١١. ابن الأثير،التاريخ الباهر،ص٦٤؛ ابن واصل ،مفرج الكروب،ج١،ص٥٥.

١٢. ابن الأثير، الكامل،ج ٩ ص٥٤-٥٩؛ درويش يوسف،بلاد هكاري، ص١٢٥-١٢٧.

# بەهدینان و هەوێن عیمادەدینێ زەنگی و نوونەرێن وی

## (٥٢١-٥٣٧هـ/١١٢٧-١١٤٢م)

**پ.هـ.کاروان عەبدولعەزیز محەمەد عەلی**
**وەرگێران: شێرزاد نایف**

## پێشەکی

ل چەرخێن ناڤین عەشیرەتێن کوردی پشکداری د دروستکرنا سیمایێن شارستانیا ئیسلامی دا کرینە، ژ بەر کو دەڤەرێن ئەو تێدا ئاکنجی ستراتیژییەکا گرنگ هەبوو، لەورا هەر دەم د ناڤ جەرگێ رووداناندا بوون، نەخاسمە ل سەردەمێن دەولەتا زەنگی و ئەیوبی، ل دەڤەرا بەهدینان یا نها، یا کو وی دەمی ب وەلاتێ هەکاری دهاتە نیاسین، گەلەك ژ عەشیرەتێن کوردی شیان ل دەسپێکا سەدسالیا شەشێ مشەختی/ دوازدێ زایینی میرگەهێن ب هێز ب دامەزرینن، د هەمان دەمی دا ل سالا (٥٢١مش/١١٢٧ز) دەولەتا زەنگی ب سەرکێشیا عیمادەدینێ زەنگی ل مووسلێ و دەڤەرێن ب رەخ دەڤەرا بەهدینان ڤە دەرکەفت.

هەر ژ دەمێ زەنگی دەسەلاتداریا مووسلێ وەرگرتی، د ناڤبەرا پازدە سالاندا دەست ب سەر دەڤەر و باژێر و کەلایێن وەلاتێ هەکاری ل ئامێدیێ و ئاکرێ و زاخۆ دا گرت، ئەڤە ژی پشتی چەندین شەر و بەرسینگگرتنان و پلانێن موکم، هەر وەسا هندەك جارێن دیتر ژی ب رێککەفتن و پەیمانان ب مەرەما دەست ب سەرداگرتنا عیمادەدینی ل سەر باژێرێن بەهدینان.

ڤەکۆلین هاتییە پارڤەکرن بۆ پێشەکییەکێ و دو ڤەکۆلینان، ڤەکۆلینا ئێکێ دەسپێکەکێ ل دۆر عیمادەدینێ زەنگی ل مووسلێ ب خۆڤە دگریت و میرگەهێن بەهدینانی، یا حەمیدی ل ئاکرێ، هەکاری ل ئامێدیێ و مەهرانی ژی ل زاخۆ، ئەڤە ژی ل دەسپێکێن سەدسالیا شەشێ مشەختی/دوازدەیا زایینی، هەر وەسا ڤەکۆلینا دووێ چاوانییا ب سەرداگرتنا عیمادەدینێ زەنگی ل سەر دەڤەرا بەهدینان ب خۆڤە دگریت، دەمێ دەست ب دەسەلاتیێن زالبوونا خۆ ل سەر دەڤەرا ئاکرێ و کەلایێن وێ کری، دەسەلاتا میرگەها حەمیدی تێدا ل سالا (٥٢٨ مش/١١٣٤ز) ب داویهات، پشتی هینگی قەستا دەڤەرا ئامێدیێ کر و ب سەردا گرت و دەستەلاتا میرگەها هەکاری د ناڤبەرا سالێن (٥٢٨-٥٣٧ مش/١١٣٣-١١٤٢ز) ب

داویهات، ل داویێ ژی قەستا دەڤەرا زاخۆ و کەلا و ئاسێکەهێن وێ کر و ب سەرداگرتنا میرگەها مەهرانی ل سالا (٥٣٧مش /١١٤٢ز) کر.

ژبەر کو گەلەك جاران ناڤێن کەلا و باژێر و ئاسێگەهان هاتیە و ژ بەر دانەنیاسینا پەراوێزان زێدە نەبن، مە نەخشەیەکێ دەڤەرێن بەهدینان و پارێزگەها دهۆکێ هەڤپێچکریە، کو جهێن کەلا و باژێران تێدا هاتیە روونکرن، هەر دیسا د ڤەکولینێ دا گەلەك ناڤێن میرێن کورد ژ عەشیرەتێن بەهدینانی یێن جودا جودا هاتینە، لێ ئەم دەربارەی ژیانا وان چو نزانین ژ بلی تشتێ د ڤەکولینێ دا هاتی، ژ بەر هندێ ژی دەسپێکا دیاربوونا وانە و هەتا کو جاران پاشەرۆژا وان نەیا بەرنیاسە. ڤەکولین ژ کۆمەکا جۆرا و جۆر ژ ژێدەرێن دیرۆکی یێن هەڤچەرخ بۆ رووداندان هاتیە و گرنگترینێن وان: بەرهەمێن ئیبن لئەسیری (٦٣٠مش/١٢٣٢ز مربیە) د ڤان هەر دو پرتووکان دا: (الکامل فی التاریخ) و (التاریخ الباهر في دولة الاتابکة) کو ڤەکولەرێ دیرۆکا کوردی نەشێت دەست ژێ بەردەت و دهێتە هەژمارتن ژ ژێدەرێن سەرەکی یێن ڤەکولینێ، چونکو ڤەکولەر هەڤچەرخێ وان رووداندانە و دیرۆکنڤیسەکێ خێزانا زەنگی یە و یێ ل مووسل ئاکنجی بوو، کو یا نێزیکی دەڤەرا بەهدینانە، ئیبنولئەسیر ب تنێ د ناڤا دیرۆکنڤیسان دا باسێ قەوارەیێن سیاسی یێن میرگەهێن کوردی یێن بەهدینانی کو ل پارێزگەها دهۆکا نها دکەت، کو د پێکهاتەیێن خۆ دا وەکو میرگەهێ یە، هەر وەسا رۆناهی بەردایە سەر گرنگترین کەلایێن ل بن دەسەلاتا وان، زێدەباری دیارکرنا ناڤێن هەژمارەکێ ژ میر و سەرکردەیێن وان، سەرەراری بێلایەنیا ئیبن لئەسیری د دیارکرنا دەنگوباسێن وان دا، لێ سیمایێن سەرەکی یێن دیرۆکا عەشیرەتێن بەهدینانی ل دەڤەرا هەکاری و حەمیدی و مەهرانی، دیار بووینە د ناڤا ڤەگێرانا رووداندێن وان دا ب تێر و تەسەل ل گەل زەنگییان و چاوانیا زالبوونا زەنگییان ل سەر کەلایێن بەهدینانی د ناڤبەرا سالێن (٥٢٨-٥٣٧مش/١١٣٣-١١٤٢ز) و پشتی هینگی کەفتینە ژێر دەولەتا زەنگی.

## ئێکێ:میرگەهێن کوردی ل بەهدینان و عیمادەدینێ زەنگی

عیمادەدین کورێ ئاق سنقرێ سەرب عەشیرەتەکا مەمالیکێن تورکانڤە[1]، شیا ل سالا (٥٢١ مش /١١٢٧ز)دەولەتا زەنگی ل مووسلێ دامەزرینت[2]، پشتی کو ستوونێن دەولەتا خۆ سەپاندین، بەرێ خۆ دا جێبەجێکرنا تایێ ئێکێ ژ پلانا خۆ بۆ مەرەما دامەزراندنا دەولەتەکا خودان سیستەمەکێ میراتی دارێژتی، هەرووەسا بەرفرەهکرنا وێ کو میرگەهێن دەوریەری مووسلێ ل جزیرێ و وەلاتێ شامێ و دەڤەرێن رۆژهەلات بێخیتە ب سەر ڤە، ژ وان ژی دەڤەرا بەهدینان و ئێکبێخیت دگەل دەولەتا خۆ یا نوی پێکەهشتی، وەکو دەسپێکەك بۆ ڤەگوهاستنێ بۆ قۆناغا دووێ ژ پلانا خۆ، کو بەرسینگگرتنا خاچهەلگران بوو[3].

ل دەسپێکێن سەدسالیا شەشێ مشەختی دووازدێ زایینی دەڤەرا بەهدینان ب توخیبێن خۆ یێن ئیداری یێن نها ڤە، گۆرەپانەك بوو ژبۆ پەیدابوونا هژمارەکا میرگەهێن کوردی یێن بچووك، لێ د گرنگ ژ لایێ جهێ خۆ یێ ستراتیژ ڤە بۆ دەولەتا زەنگی، هژمارەکا عەشیرەتێن کوردی یێن بەهدینانی و ژوان حەمیدی و هەکاری و مەهرانی شیان میرگەهێن خۆ ل جهێن کەلا و ئاسێگەهێن خۆ میرنشینێن خۆ ب دامەزرینن[4]، دیسا ژی بەهدینانا نها پشکەك بوو ژ دەڤەرەکا مەزن کو ل چەرخێ ئیسلامی ب ناڤێ وەلاتێ هەکاری هاتبوو ب ناڤکرن، ژ بەر هندێ دەمێ د ژێدەران دا باس ل وان میرگەهان دهێتە کرن، ئاماژە ب وان دەڤەر و کەلایێن ئەو هۆز تێدا د ئاکنجی ل وەلاتێ هەکاری دهێنەکرن[5].

عەشیرەتێن بەهدینان شیان میرگەهان ئاڤابکەن، ل دەڤەرێن زاخۆ و باژێر و کەلایێن دەوروبەران و ل باژێرێ ئاکرێ و دەردۆرێن وێ ژ کەلا و ئاسێگەهان و هەر وەسا ژی ل باژێرێ ئامێدیێ و ب نێزیکی ژ کەلا و ئاسێگەهێن موکم، کوردێن حەمیدی میرگەها خۆ ل دەڤەرا ئاکرێ دامەزراندن یا کو ب ئاکرا حەمیدی هاتیە ب ناڤکرن[6]، ئەڤێ ژی چەندین کەلا وەکو

شۆش و هندەکێن دیتر ب خۆڤەگرتن[7]،د ژێدەران دا ناڤێن گەلەك ژ میرێن وان ل وی سەردەمی هاتینە، ژ وان ژی عیسایێ حەمیدی کو هەڤچەرخێ سولتان عیمادەدینێ زەنگی بوو، ئەوێ بوویە میرێ ئاکرێ و شۆشێ و هندەك جهێن دی ژ کەلایان، ئەو ژی ب فەرمانا زەنگی ب خۆ بوو ل سالا (٥٢١مش/١١٢٧ز)[8].

دەربارەی دەڤەرا ئامێدیا نها کو هینگی هاتبوو نیاسین ب کانیا عەشیرەتێن کوردێن هەکاری یێن بەهدینانی، ئەوێن شیایین بۆ خۆ میرگەهەکێ لێ دابمەزرینن و بازێر کەلایێن ب رەخڤە ژ وان ژی ئەشب و جزیرە (الجدیدە) و نۆشێ و سۆرێ و هرۆر و نێروە و هندەك کەلایێن دیتر ئاڤابکەن[9]، دیرۆکا دامەزراندنا میرگەهێ نا هێتە زانین و چو تشتان ژ دەسپێکێن دروستبوونا وێ نزانین و ئیبن ئەسیر ناڤێ میر ئەبۆ هەیجا بن عەبدوللایێ هەکاری دیار دکەت یێ کو عیمادەدینێ زەنگی ل دووڤرا هاتی و شوونگریا وی کری ل سەر کەلایێن ئامێدیێ و دەوروبەران سالا (٥٢٨مش/١١٣٤ز) و پاشی پشتی وی ژی کورێ وی ئەحمەد کورێ ئەبی لهەیجایی هاتی دا کو دەسەلاتداریێ ل میرگەهێ بکەت[10].

هینگی عەشیرەتا مەهرانی ل دەوروبەرێن باکوور و باکوورێ رۆژهەلاتی مووسلێ د ئاکنجی بوون، نەخاسمە کەلا حەسەنیێ (زاخو) و رەخێن وێ، کو نها سنوورێن جوگرافی یێن قەزا زاخۆ یا سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤە پێکدئینیت. هینگی د ناڤ گەلەك کەلا و ئاسێکەهێن نێزیکی هەڤ دئاکنجی بوون[11]، هەر وەکو مە دیارکری کو دەڤەرا کەلایێن وان تێدا د بەربەلاڤ ب وەلاتێ هەکاری دهاتە نیاسین، لەورا ژی دبینین کو پرانییا دیرۆکنڤیسان ئاماژە نەدابوو وان کەلان وەکو کەلایێن مەهرانی، لێ وەك کەلایێن وارێ هەکاریێ[12]، هینگی دەسەلاتەکا هەڤگرتی نەبوو کو مەهرانییان خرڤەبکەت، لێ د ناڤ چەندین کەلا وئاسێکەهان دا دبەربەلاڤ بوون، کو هەر ئێکێ ژ وان سەریخووبوونا خۆ هەبوو[13].

ئیبنولئەسیر دهێتە هژمارتن وەکو ژێدەرێ مە یێ سەرەکی یێ وی دەمی ژ مێژوویا مەهرانییان، ئاماژێ ددەتە هژمارەکا وان کەلایێن سەر ب وانڤە، ئەو ژی شەعبانیێ و کواشێ و ئەرمشتێ (ئەردەمشتێ) و زەعفەرانیێ و فەرەح و ئەلقی - ئەلکی - و شێرەوا و رابیە و گۆت ((ئەو جهێن خۆپاراستنا مەهرانییانە))[14]، لێ هندەك کەلا هەنە یێن وی ئاماژە پێ نەکری وەکو جەراحیێ و حەسەنیێ، چونکو جەراحیێ میرەکێ مەهرانی دەسەلاتداری لێ دکر ئەو ژی ئیبراهیمێ مەهرانی بوو [15] زێدەباری حەسنیێ کو هێشتا شوونوارێن وێ هەتا نها ماینە[16].

دەمێ ئیبن واسلی زانیاری ژ ئیبن ئەسیری ڤەگوهاستی ل دۆر هندەك کەلایێن مەهرانی، ژ وان ژی شەعبانی و زەعفەرانی و کواشێ و فەرح و ب شاشی نڤیسیە - و رەنگە ژی ژ شاشیا کوپیکەری بیت - و گۆت ((حصون الهذبانیە))[17]، چونکو ئەو کەلا دکەڤنە سەنتەرێ جوگرافی یێ کو هینگی ل ژێر دەسەلاتا کوردێن مەهرانی بوو، زێدەباری ڤێ چەندێ کو وەلاتێ کوردێن هەزبانی دوورە ژ جزیرا بۆتان و زۆزان یا کو کەلایێن مەهرانی تێدا د بەربەلاڤ، هەر وەکو ئیبن حەوقەل دیارکری (٣٦٧مش/٩٧٧ز)مرییە کو جهێ هەزبانیان د کەڤیتە دەڤەرا د ناڤبەرا زێیێ مەزن و یێ بچووك[18].

ئیبن لئەسیر ناڤێن چەندین ژ میرێن هۆزا مەهرانی دیارکرن، ژ وان میران ژی ئەڤ هەردویە میر عەبدوللا کورێ عیسا کورێ ئیبراهیم و کورێ وی عەلی، هەر وەسا هەر دو میرێن دی ئیبراهیم و برایێ وی عیسا کورێن ئەلحسەن کورێ ئەبی تالب کورێ بارۆخ خودانێن کەلا جیراحیێ، هەر وەسا میر ئەلحسەن کورێ عومەر خودانێ کەلا شەعبانیێ و میر خۆل و هارۆنێ مەهرانی خودانێ کەلا ئەرمشتێ و کواشێ [19].

## دوو: دەست ب سەرداگرتنا عیمادەدینێ زەنگی ل سەر وەلاتێ هەکاری (بەهدینان و شەمدینان) :

ب حوکمێ پەیوەندیێن هەڤسوینیێ یێن دەولەتا زەنگی ب دەڤەرێن بەهدینیێ ڤە گرێددەت، یێن کورد

لێ دئاکنجی، عیمادەدینێ زەنگی (٥٢١ – ٥٤١مش/ ١١٢٧ – ١١٤٦ز) هەر ژ دەسپێکێ گرنگییەکا مەزن پێ دابوو، کو هینگی ناڤەندەکا کوردێن حەمیدی و هەکاری و مەهرانی بوو[٢٠]. هەر وەسا تشتەکێ سرۆشتی یە کو پەیوەندی د ناڤبەرا زەنگیان و کوردان دا بهێنە گرێدان، نەخاسمە ئەڤ پەیوەندییە چ یێن دۆستاتی بن یان وەکو دیتر، زەنگیان هەر ژ دەسپێکێ کار بۆ دەست ب سەرداگرتنا دەڤەرێن بەهدینان و باژێر و کەلایێن وێ و خستنا وان بۆ ژێر دەسەلاتا خۆ دکر ب مەرەما دابینکرنا توخیبێن رۆژهەلات و یێن باکوورێ رۆژهەلاتێ دەولەتا خۆ[٢١].

عیمادەدینێ زەنگی دەست ب هەولێن خۆ کرن بۆ ئێککرنا دەڤەرێ کو باژێرێن نێزیکی وێ بێخنە ژێر دەسەلاتێ خۆ، ئەو ژی ژ بەر لاوازی و ژێکڤەبوونا وان ژ هەڤ و بەرتەنگیا رووبەرێ وان، کو بەری هینگێ والیێن مووسل نەشیاین سەردابگرن ئانکو وی دەستەلاتی ژ وان بستینن یێ سەلجۆقیان دایە وان، ب حوکمێ مووسل و جزیرێ و باکوورێ شامێ بۆ دەستەلاتەکا ب کریار، ژ بەر هندێ ژی زەنگی بزاڤ کر کو ڤان جهێن سەربخۆ بشکێنیت دا کو دەستەلاتا وی ل وان دەڤەران ببیتە تشتەکێ ژبواری[٢٢].

عیمادەدینێ زەنگی گرنگی پێدڤیاتیا کۆنترۆلکرنا هێز و میرگەهێن کوردی یێن دەوروبەر دزانی، نەخاسمە ئەوێن دکەڤنە د دەڤەرێن بەهدینان، ژ میرگەهێن حەمیدی و هەکاری و مەهرانی ئەوێن هەردەم گەف ل سەر ئارامیا دەولەتا زەنگی دکرن[٢٣]. ئەو ژی ژ بەر گەلەك نێزیکیا وان ژ زەنگییان زێدەباری شیانێن دەڤەرا بەهدینان یێن ئابووری یێن بەرز و داهاتێن وێ یێن مشە[٢٤].

## ١ - دەست ب سەرداگرتنا وی ل سەر ئاکرێ و شۆشێ:

هینگێ کوردێن حەمیدی دەستەلاتداری ل ئاکرێ و کەلایێن دەوروبەرێ وێ دکرن، هەر ژ دەمێ عیمادەدینێ زەنگی دەستەلاتداریا مووسلێ ل سالا (٥٢١مش/١١٢٧ز) وەرگرتی پەیوەندییەکا چاك و دۆستاتی دگەل وی هەبوون، و هەر وی ب خۆ بریار ل سەر حوکمداریا میر عیسایێ حەمیدی ل سەر کەلایێن ئاکرێ و شۆش و یێن دیتر دابوو و ((چ تشتان رێگری لێ نەکربوو))[٢٥]، لەورا ژی وێ دەڤەرێ جۆرەکێ سەرخۆبوونا سیاسی و ئابووری ب سەرکرداتیا حەمیدییان هەبوو[٢٦]. ئەڤ دۆخە بۆ دەمێ حەفت سالان (٥٢١-٥٢٧ مش/١١٢٧-١١٣٢ز) بەردەوام مابوو و د ڤان سالاندا دەسەلاتێ دەڤەرا ئاکرێ د دەستێن میر عیسایێ حەمیدی دا بوو بێی روودانا چو ئاریشەکێ دگەل عیمادەدینێ زەنگی[٢٧].

رەوشا دەڤەرا مووسل و دەوروبەرێن وێ ژ باژێر و دەڤەرێن بەهدینان هاتە گوهارتن و چوو د گێژەڤانەکا شەرێن مەزندا دەمێ ل سالا (٥٢٧مش/١١٣٢ز) خەلیفەیێ عەباسی ئەلموستەرشدبیللا (٥١٢-٥٢٩ مش/١١١٨-١١٣٤ز) دەست ب دووربێچکرنا باژێرێ مووسلێ ناڤەندا دەولەتا زەنگی کری، د ڤێ بۆیەرێدا میر عیسایێ حەمیدی دەستدا هاریکاریا خەلیفەیێ عەباسی د کریارا دووربێچکرنا باژێرێ مووسلێ دا و هەر تشتێ ژێ هاتی ژ پێچێبوونێن خۆ ل دەڤەرا ئاکرێ، ژبۆ خزمەتکرنا خەلیفەیی تەرخان کر و ((کورد ل دۆر خرڤەبوون لەورا زێدەبوون))[٢٨]، لێ خەلیفە د دووربێچکرنا خۆ دا ب سەرنەکەفت و نە شیا بچیتە د باژێرێ مووسلێ دا و بەر ب بەغدایێ ڤەگەریا پشتی کو ل گەل زەنگی ئاشتبووی[٢٩]، بێی کو میر عیسایێ حەمیدی ببیتە لایەنەك د وێ ئاشتبوونێ دا و خەلیفەی ئەو هێلا بەرامبەر چارەنڤیسێ خۆ دگەل عیمادەدینێ زەنگی راوەستیت، ژ لایەکێ دووڤە عیسایێ حەمیدی تەماعکاری د پشتەڤانیا وی دا بۆ خەلیفەی هەبوو کو توخیبێن دەڤەرا خۆ بەرفرەهـ بکەت و دانپێدانەکا رەوا ژ لایێ خەلیفەیی ڤە ب دەستڤە بینیت و پشتەڤانیا وی بکەت، ئەڤە زێدەباری مەترسیێن وی ژ تەماعکاریێن عیمادەدینێ زەنگی و دەستپێکرنا وی بۆ داگیرکرنا دەڤەرا ئاکرێ[٣٠].

دەملدەست پشتی ڤەگەریانا خەلیفەی بۆ بەغدا، عیمادەدینێ زەنگی فەرمان ل هێزێن خۆ کر کو دەڤەرا ئاکرێ و باژێر و کەلایێن وێ دووربێچ بکەن و هەر

وەسا هەلویستێ میر عیسایێ حەمیدی ژبیر نەکر ژ قەیرانا دووریێچکرنا خەلیفەی ل سەر مووسلێ و راوەستانا وی ل بەر سینگی، ئەڤ دووریێچکرنە ل داویبا سالا (٥٢٧ مش/١١٣٢ز) هاتە سەپاندن، لێ عیسایێ حەمیدی و خەلکێ دەڤەرێ ب هەمی هێزا خۆ بەرهنگاریا دووریێچی کرن لەورا ((بازێر بۆ دەمەکێ درێژ ما دووریێچکری و شەرەکێ دژوار دکرن))[٣١]، پشتی هینگێ شیان ل سالا (٥٢٨مش/١١٣٣ز) ب سەرکێشییا عیمادەدینێ زەنگی بخۆ دەڤەرا حەمیدیان کونترۆل بکەن و ((وی ب خۆ هێرش برە سەر خودانێن کەلا ئاکرا حەمیدی و ئەو ب خۆ د چیایێ وێ را سەرکەتە سەر شویرها وێ و جهێ وی هەتا نها یێ بەرنیاسە))[٣٢]، لێ ژێدەر پشتی هینگێ چارەنڤیسێ میر عیسایێ حەمیدی دیار ناکەن و رەنگە ژی کو زەنگی ئەو کوشتییە چونکو بەرهنگاریا لەشکرێن مووسلێ کربوو[٣٣].

ژ ئەنجامێ دەست ب سەرداگرتنا دەڤەرا ئاکرێ و هەمی کەلاێن حەمیدییان عیمادەدینێ زەنگی چەندین ئارمانجێن خۆ بجهئینان، ژ وان ئارمانجان دابینکرن و پاراستنا توخیبێن مووسلێ یێن هەڤتوخیبێن وان ژ مەترسییا وان زێدەباری جهێ حەمیدییان یێ گرنگ، نەخاسمە وەك ئیبنولئەسیری دیارکری کو خەلکێ مووسلێ ژ داویهاتنا حوکمێ حەمیدییان پشتراستببوون، چونکو ژ سەرەدەرییا وان د دۆخەکێ بەرتەنگ دا بوون، چونکو مالێن وان تالان دکرن و وەلاتێ وان خرابدکر[٣٤]. لێ یا خۆیایە کو ئیبنولئەسیر وەکو دیرۆکنڤیسەکێ زەنگییان بوو کو ئەو گۆتن و هەلویستێن ل هەمبەر عەشیرەت و تائیفەیێن کوردی ئەنجامێ وێ چەندێ بوون[٣٥]. ب ڤێ سەرکەفتنا خۆ عیمادەدینێ زەنگی بۆ خۆ جهـ پێیەك دیت ژ بۆ ب سەرداگرتنێ ل سەر میرگەهێن دیتر یێن کوردان ل دەڤەرا بەهدینان و ئێدی رێ ل بەرامبەری وی ما ڤەکری کو بچیتە د ناڤا کووراتییا دەڤەرێن دی یێن بەهدینانی دا [٣٦]، دوور ناهێتەدیتن کو عیمادەدینێ زەنگی بریکارێ خۆ نەسیرەدین جقر ل مووسلێ راسپاردبیت کەلاێن حەمیدیان ب رێڤەببەت.

## ٢- ب سەرداگرتنا وی ل سەر دەڤەرا ئامێدیێ و کەلاێن دەوروبەران :

هینگی بازێرێ ئامێدیێ یێ نها و نەخاسمە کەلا وێ یا ناڤدار و بەرنیاس وی دەمی ب کەلا ئاشەبێ (ئشب) ناڤەندا دەسەلاتداریا میرگەها هەکاری بوو یا کو ژ ئالیێ عەشیرەتا هەکاریا بەهدینی ڤە هاتییە دامەزراندن و گەلەکا گرنگ بوو، زێدەباری وێ ژی ئیبنولئەسیر گەلەك باسێ کەلا و ئاسێکەهێن (حصن) وێ دەڤەرێ دکەت و ژ وان ژی جزیرە (مەرەم پێ کەلا جیدیدە یە)، هەر وەسا نووشێ (نیشە)[٣٧] ، هینگێ میر ئەبۆلهەیجا کورێ عەبدوللا کورێ ئەبی خەلیل کورێ مەرزەبانێ هەکاری دەسەلاتداری لێ دکر[٣٨]، ئەڤجا ئەوان کونترۆل ل سەر دەڤەرێن بەرفرەهـ ژ وەلاتێ هەکارییان دکر، لێ هندەك ژێ هەنە نا چنە د ناڤا توخیبێن دەڤەرا بەهدینان یا نها دا و ژ وان ژی نووشێ یە یا کو دکەڤیتە رۆژئاڤا بازێرێ جولەمێرگێ کو دهێتە نیاسین ب گوندێ نیشە[٣٩]، هەر وەسا کەلا جدیدە یا کو ئەو ژی دکەڤیتە دەڤەرا جولەمێرگێ بازێرێ بێت شەباب (ئەلکێ).

ژ بەر نەزانینا ئیبنولئەسیری یا هوور ل سەر پێزانینێن وی ل دۆر دەڤەرێن بەهدینان خرڤەکرین و پەیوەندییا وان ب دەولەتا زەنگی ڤە ل وی دەمی کو پێزانینێن خۆ ژ پتر ژ ژێدەرەکی ب رێبێن زارەکی ب دەستڤەئینابوون و ئاماژە ب گەلەك ژ کەلاێن بەهدینان دکەت کو سەر ب میرگەها هەکاری ڤە بوون و ژ وان ژی جل سۆرا و هرۆر و بابۆخا (بابۆخکێ) و باکۆزا و یێن دی و ب ئاشکرایی گۆت ئەو دیرۆکا ڤەکرنا وان کەلان نزانیت لێ دیارکر کو پشتی کوشتنا عیمادەدینێ زەنگی ل سالا (٥٤١ مش/١١٤٦ز) هاتە ڤەکرن[٤٠]. پشتی کو میر عیمادەدینێ زەنگی دەست ب سەر میرگەها حەمیدی و کەلاێن وان ل بازێرێ ئاکرێ و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە گرتی، ئەو سەرکەفتنێن خورت یێن د دەمەکێ نموونەیی دا ل سەر مەزنێن کوردان ب دەستڤەئینان، ئێدی ترس ژ هێزا زەنگییان کەڤتە گیانێ هەکارییان و ل پێشییا وان ژی میر ئەبولهەیجایێ کورێ عەبدوللا یێ

هەكاری، لەورا گۆژمەكێ دراڤی بۆ میر عیمادەدینی زەنگی هنارت و داخواز ژێ كر كو تووشی دەڤەرێن دەسەلاتا وی نەبیت، هەر وەسا ئەو ب خۆ سالا (٥٢٨ مش/١١٣٣ز) هاتە مووسلێ ل دەڤ عیمادەدینێ زەنگی بەرهەڤ بوو[٤١].

بەری كو میر ئەبولهەیجا ژ كەلا ئاشەبێ دەركەڤیت و قەستا باژێرێ مووسل بكەت، كۆمەكا پێرابوونان وەرگرتن و ژ وان ژی فەرماندا كورێ خۆ ئەحمەد قەستا كەلا نووشێ بكەت ژ ترسێن هندێ نەكو د دەمێ نەبەرهەڤبوونا وی دەست ب سەر دەستەلاتێ وی دا بگریت و دەستەلات ل ناڤەندا میرگەهێ كەلا ئاشەبێ رادەستێ میرەكێ كورد ب ناڤێ باوێ ئەرجی (باء الارجي) كر[٤٢] كو ژیانا وی یا ناسیار نینە. ئبنولئەسیر پالدەرێن سەرەكی یێن ڤان پێرابوونان دیارنەكرینە، لێ دبیت كورێ وی ئەحمەد نەیێ خودان شیان بوو یان ژی سەرۆكاتییا میرگەهێ دا هەڤركییا بابێ خۆ دكر[٤٣]، لێ ڤەكۆلەرەك دوور نابینیت كو باوێ ئەرجی، سەرۆكێ ئێك ژ عەشیرەتێن كوردی یێن نە هەكاری بیت، دوور نینە ژی كو ژ هۆزا هەركی یان ئەرگۆشی بیت یان یێ بەرچی بیت كو گوندەكێ نێزیكی ئامێدیێ یە[٤٤].

ل سالا (٥٢٨ مش/١١٣٣ز) میر ئەبولهەیجا كورێ عەبدوللا مالئاڤیی كر، ئەو دەم بوو كو ل باژێرێ مووسل ل جەم عیمادەدینێ زەنگی یێ ئاكنجی و ل وێرێ ل گرێ ئەلتەوبە ژی هاتە ڤەشارتن[٤٥]، ئەگەرێن مرنا وی ئەو دۆخێن هینگی ئەو تێدا ل دەمێ ئاكنجیبوونا خۆ ل مووسلێ ژی نەهاتینە زانین، و هەر دەمێ كورێ وی ئەحمەد كورێ ئەبو هەیجایێ هەكاری گوە ل پەیامێ وەغەرا بابێ خۆ بووی، كاركر دا بەرێ خۆ بدەتە كەلا ئەشب ناڤەندا میرگەهێ ب ئارمانجا دەستداگرتنا كاروبارێن دەسەلاتێ كو جهێ بابێ خۆ ل ناڤا میرگەها هەكاری بگریت، لێ میر باوێ ئەرجی ل بەرامبەر ئارمانجێن وی راوەستا و خواست كو حوكمێ میرگەهێ بكەڤیتە دەستێ عەلی كو كورێ بچووكێ میرێ وەغەركری بوو[٤٦]، رەنگە ژی ب ڤێ چەندێ ئەوی خواستبیت كو دەستەلاتێن میرگەهێ د دەستێن وی دا بن چونكی كورێ وی ب ژیێ خۆ یێ بچووكە، یان ژی بۆ بجهئینانا وەسیەتناما میرێ وەغەركری ب دوورخستنا كورێ وی ئەحمەدی ژ دەستەلاتێ بیت و رەنگە ژی عیمادەدینێ زەنگی پشتەڤانییا ئەڤێ داوێ ئانكو كورێ خوێ بچویك كربیت و ئەو بەریژارێ وی بیتن بۆ میراتییا میرگەهێ.

مرنا ئەبولهەیجائێ هەكاری و بارودۆخێن ناڤخویی یێن خراب ل میرگەهێ و شەرەنیخا ناڤبەرا مالباتا میرگەهێ كانێ دێ كی حوكمدارییا میرگەهێ گریتەدەست، بوونە دەلیڤە بۆ عیمادەدینێ زەنگی و بەرێ لەشكرێ خۆ دا كەلا ئەشەبێ ناڤەندا میرگەهێ دا دەستێ خۆ دانیتە سەر، بۆڤێ چەندێ ژی پلانەكا سەربازی یا موكم دانا ب دوور ئێخستنا هژمارەكا زۆرا خەلكێ ئاشەبێ ژ كەلا وان و ژ نشكەكێ ڤە عیمادەدینێ زەنگی لەشكەرێ خۆ ل دۆر وان زڤراند و شكاندن و هژمارەك گەلەك ژ خەلكێ كەلایێ و سەربازێن وێ كوشتن و دیلكرن، ل داوێ ژی شیا كونترۆلێ ل سەر كەلایێ بكەت و بدەتە دگەل مولكێ خۆ، و ئەوێن كو شەرێ وی كرین و ل پێشییا وان ژی میر باوێ ئەرجی ئینانە بەر سنگێ خۆ و كوشتن، پشتی هینگی زەنگی ڤەگەریا باژێرێ مووسل[٤٧].

پاشی جێگرێ خۆ نەسیرولدین جقر ل مووسل راسپارد كو ب سەر كەلایێن مایی یێن هەكارییان دا بگریت و پشتی ئاشەب كاڤلكرین كەلا ئامێدیێ پێشڤە ئاڤاكر، هەروەسان دەست ب سەر دەڤەرێن چیایی – كلی كهیجە و نیشە داگرتن، لێ ژێدەران ئاماژە نەدانە سالا دەست ب سەرداگرتنا وان[٤٨]. وەدیارە د ناڤبەرا سالێن (٥٢٨-٥٣٧ مش/١١٣٣-١١٤٢ز) ئەو شیان كونترۆلێ ل سەر هەمی ئەرد و كەلا و باژێرێن هەكاری بكەن، چونكو وان دەست هێرشكرنێ كر ل سەر كەلایێن كوردێن مەهرانی كر ل دەڤەرا زاخۆ یا نهو ل سالا داوێ یا دیاركری، هەر وەسا باژێرێن هەكاری و دەڤەرێن ئامێدیێ بۆ خۆ كربوونە ناڤەندەك بۆ مەرەمێن بەرەڤانیكرنێ و

كۆمكرنا ئازۆقەی و چەكی و وەكو خالەكا دەسپێكرنا هێرشێن لەشكەری بۆ بەرفرەهكرنا دەستەلاتا خۆ ل دەڤەرا مایی ژ بەهدینان نەخاسمە ژی دەڤەرێن مەهرانییان [٤٩].

لێ زانیاری و بۆچوونێن ل سەر باژێرێ ئامێدیێ و دەستنیشانكرنا جهێ وێ د ناكۆك و ژێكجودانە و ب تایبەت ل دەڤ ئبنولئەسیری دەمێ ل سەر عیمادەدینێ زەنگی و كونترۆلكرنا وی ل سەر كەلایێن وان دبێژیت ((مولكداریا كەلا شەعبانیێ كر و خراب ژی كر و فەرمانا ئاڤاكرنا كەلا ئامێدیێ پێشڤە دا)) [٥٠]، هەر وەسا ل جهەكێ دیتر دبێژیت ((كەلا جەلاب كەلا ئامێدیێ یە)) [٥١]، هەر دیسا د ڤەگێرانەكا دی دا ((كەلا ئاشەب .. فەرمانا خرابكرنا وێ دا و ئاڤاكرنا كەلا ناسیار ب ئامێدیێ پێش وێڤە)) [٥٢]، دیرۆكنڤیسان ئەڤ ڤەگێرانە ب هەمان شێوە ژ وی ڤەگوهاستینە [٥٣].

## ٣ - ب سەرداگرتنا كەلایێن مەهرانی ل دەڤەرا زاخۆ:

زاخۆ یان (حەسەنیا پێشتر) و دەوروبەرێن وێ ژ باژێر و كەلان وەك وارێ عەشیرەتا مەهرانییا بەهدینانی ئەوا میرگەها مەهرانی دامەزراندی هاتیبەنیاسین، ئەڤجا هینگی ئەوێ دەستەلاتی ل سەر گەلەك كەلان دكرن وەكو كواشێ و ئەرمشتێ و جیراحیێ و زەعفەرانیێ و شەعبانیێ و ئەلكێ و ئەلفەرەح و شارەوا و رەبیە زێدەباری حەسەنیێ ب خۆ [٥٤]، هینگی میرگەهێ ناڤەندەكا ب تنێ نەبوو كو لێ خرڤەببن لێ د ژێكبژالەبوون د كەلایێن نیمچە سەربەخۆ ژ هەڤدو، هەر كەلایەكێ یان كۆمەكا كەلان میرەكێ ب تنێ هەبوو دەستەلاتی ل وان دكر و ژ وان ژی میر عەبدوللا كورێ عیسا كورێ ئیبراهیم و كورێ وی عەلی ل رەبیێ و ئەلكی و فەرەحێ، هەروەسا میر حەسەن كورێ عومەر ل كەلا شەعبانیی و میر ئیبراهیم و برایێ وی میر عیسا كورێ ئەلحەسەن ل كەلا جیراحیێ و میر خۆل و هارۆن ل كەلا كواشێ [٥٥].

چ میرگەهـ و هێزێن كوردی یێن خودان شیان نەمانە ل بەر سینگێ زەنگی ژ بلی مەهرانییان و ل سالا (٥٣٧ مش/١١٤٢ز) دەست ب بەرهەڤیێن خۆ كرن بۆ كونترۆلكرنێ ل سەر وان ژی لێ دودلییەك د دەستنیشانكرنا وێ سالێدا هەیە یا تێدا زەنگی كەلایێن مەهرانیان ڤەكرین، نەخاسمە ل دەڤ ئیبنولئەسیری، كو جارەكێ ئاماژە دایە هندێ كو ل سالا (٥٢٨ مش /١١٣٣ز) دەست ب سەرداگرتییە [٥٦]، جارەكا دی دیاركرییە كو ئەوی ل سالا (٥٣٧ مش/١١٤٢ز) [٥٧] كونترۆل ل سەر كرییە، هەروەسان ئیبنو لقەلانسی (٥٥٥ مش/١١٦٠ز مرییە) و ئەلعوزیمی (٥٥٦ مش/١١٦١ز مرییە) گۆتییە كو ئەوی ل سالا (٥٣٧ مش/١١٤٢ز) كونترۆل ل سەر وان كلان كرییە [٥٨]، لەورا ئەم ئەڤا داویێ نێزیكتر بۆ راستیێ دبینین بۆ هەڤچەرخییا وان ل گەل رووداںان و ژ بۆ پشتەڤانیكرنا ڤێ دیرۆكێ ژ ئالیێ پرانییا دیرۆكنڤیسان [٥٩]، لێ پێزانینێن ئبنولئەسیری نە دهوور و دروستبوون چونكو ئەو هەڤچەرخێ رووداںێ نەبوو، زێدەباری نەبوونا ژێدەرێن توومارکری ل دەڤ وی لێ هەما گۆتنێن وی د زارەكی بوون و یێن ژ هندەك ژ هەڤالێن خۆ یێن كورد گوهـ لێبووین هەر وەكو وی ب خۆ خۆیاكری، زێدەباری وەرگرتنا پێزانینێن خۆ ژ دو تائیفەیێن كوردان وەكود دەقەكی دا هاتی كو ((و هاتیە ڤەگێران ژ هندەك زانایێن كورد .. و ب رەنگەكی دی ژ هندەك چاكێن كورد هاتیە ڤەگێران گوهارتن تێدا هاتیەكرن)) [٦٠]، ژ بەر ڤێ چەندێ ژی ب دروستاهی دیرۆكا گرتنا ڤان كەلان نەهاتیە زانین و ب دانپێدانا وی ب خۆ ((من دیرۆكا ڤەكرنا ڤان كەلان نەزانییە لەورا ژی من ل ڤێرە دیاركرینە)) [٦١].

دبیت هەوێن زەنگی ل سەر كەلایێن حەمیدی و هەكاریان ل ئاكرێ و ئامێدیێ(٥٢٨ – ٥٣٧ مش/ ١١٣٣ – ١١٤٢ز) بهێنە هژمارتن وەكو هەوێن دەسپێكی بۆ زانینا چەندییا هێزا میرێن وان كەلان و موكمییا كەلان و چاوانییا گرتنا وان ئەگەر دشیاندا بیت، پشتی ڤێ زەنگی دەست ب هەوەكا لەشكری یا بەرفرەه بەر ب كەلایێن كوردی یێن ماین كر [٦٢].

سەركردەیێن زەنگی ل دەمێ نەئامادەبوونا

عیمادەدینێ زەنگی، دەست ب هەوا خۆ ل سەر كەلاێن مەهرانیان كرن، چونكو ئەو ڤەگەریا بوو مووسلێ و بێ مژوولی شەرێن خۆ بوو ل گەل دەسەلاتدارێن دیمەشقێ[١٣]، ئەتابەگی نەسیرەدین جقر جێگرێ وی ل مووسل فەرماندەیا هێرشان بۆ سەر كەلاێن مەهرانی كر[١٤] و دووربێچكرن، وەسان دیارە زەنگیان گەلەك لەشكرێن خۆ بۆ ڤێ مەرەمێ كۆمكربوون، هەروەسا ژی ئیبنول عیبەری دیاركر كو ((ل وی دەمی عیمادەدینی هێزێن خۆ خرڤەكرن..)) [١٥].

ژ ئەنجامێ ئەگەرێن دەرەكی و ناڤخۆیی سەروبەرێ مەهرانییان تێكچوو و ب رەنگەكێ نەرینی باندۆرا ل سەر وان كر و هەلویستێ وان لاوازبوو و ڤێ چەندێ ژی رێك خۆشكر بۆ ساناهیكرنا داگیركرنا كەلاێن وان و ژ وان ئەگەران ژی: ـ

١-زەنگیان سەركەفتنێن مەزن و ب رەنگەكێ ب لەز ل پرانییا كەلاێن حەمیدییان و هەكارییان ل ئاكرێ و ئامێدیێ دەستڤەئینان، كو ئەڤە بوو ئەگەرێ بەلاڤبوونا ترسێ و لەرزێ ل دەف مەهرانییان[١٦].

٢-دەستەلاتدارییا مەهرانی یا دابەشكری بوو ل سەر چەند كیانێن سیاسی یێن سەربەخۆ ژ هەڤدوجودا د گەلەك كەلان دا و هەر ئێك ژ وان كار بۆ بەرژەوەندییا خۆ دكر و دناڤخۆدا د هەڤگرتی نەبوون .

٣-هەوێن زەنگییان ل سەر كەلاێن مەهرانییان رێككەفت بوو دگەل مالئاڤاهیكرنا میر عەبدوللا كورێ عیسا كورێ ئیبراهیم خودانێ كەلا رەبیێ كو دهاتە هژمارتن ژ مەزنترین میرێن مەهرانییان[١٧].

٤-تەماعكارییێن زەنگی د بەرفرەهكرنێ دا ب هەر بهایەكێ هەبیت، ئێك بوو ژ ئەگەرێن رێ بۆ زالبوونا وان ل سەر كەلاێن وەلاتێ هەكاری و كەلاێن مەهرانی ب ساناهی كری، زێدەباری هاندانا وان د ئاڤاكرنا بەرەكێ ئێكگرتی دا بۆ موسلمانان بۆ بەرسنگگرتنا خاچهەلگران. ئەڤە گرنگترین ئەو فاكتەر بوون یێن بووینە ئەگەرێن سەركەفتنا زەنگی د هەوێن داگیركرنا كەلاێن مەهرانییان دا.

هێزێن نەسیرەدین جقرێ جێگرێ زەنگی ل مووسل دەست ب بەرهەڤیێ كرن بۆ كونترۆلكرنێ ل سەر كەلاێن مەهرانی، لێ سەروبەر وەسان هاتەپێش كو میر عەبدوللا كورێ عیسا كورێ ئیبراهیمێ مەهرانی خودانێ كەلاێن رەبیە و فەرەح و ئەلكێ (القی) و یێن دیتر ژ كەلاهان وەغەركر، كورێ وی عەلی كورێ عەبدوللایێ مەهرانی پشتی وی دەستەلات گرتە دەست، ب ڤێ چەندێ هەلویستێ مەهرانییان ل بەرامبەر زەنگییان لاوازبوو، میر عەلی كورێ عەبدوللایێ مەهرانی ژی رابوو ب ئەنجامدانا دانوستاندنان ل گەل وان، دبیت ئەڤ چەندە بهێتە هژمارتن وەكو دەسپێكێن خۆرادەستكرنێ، و ئەڤ چەندە بوو دەسپێكا چاككرنا پەیوەندییان د ناڤبەرا هەردو لایەنان دا، لەورا میری دایكا خۆ خەدیجە كچا ئەلحەسەنێ مەهرانی بۆ داخوازكرنا ئێمناهیێ بۆ وی هنارتە دەڤ برایێن وێ ئیبراهیم و عیسا كورێن ئەلحەسەنی یێ مەهرانی خودانێن كەلا جەراحیێ، كو ئەو هەردو وەكو دو میر د خزمەتا زەنگی دا بوون ل مووسلێ[٦٨].

زەنگی ئەڤ چەندە ب دەلیڤەك دیت بۆ بەرفرەهكرنا كونترۆلا خۆ ل سەر وان كەلان ب ساناهیترین رێیان، ئەڤجا رازی بوو ل سەر داخوازا وی و میرێ مەهرانی سووند بۆ خوار بۆ پێگیری و ملكەچیا خۆ ب فەرمانێن وی و كاركرن د خزمەتا وی دا دیار كرن، ئەڤجا عەلی كورێ عەبدوولایێ مەهرانی هاتە خزمەتا زەنگییان و وان ژی هێلا دەستەلاتدار ل سەر كەلاێن وی، لێ ئەو رێككەفتنا د ناڤبەرا وان دا هاتییە كرن، رێگر نەبوو ل بەرامبەر زەنگییان بۆ سەرداگرتنا كەلاێن مەهرانی یێن مایی و هەر وەكو رێككەفتن بۆ دابینكرنا كەلاێن میر عەلی كورێ عەبدوللای ب تنێ بوو، لەورا نەسیرەدین جقر رابوو ب سەرداگرتنا كەلا شەعبانیێ یا ل ژێر دەسەلاتا

میر ئەلحەسەن کورێ عومەرێ مەهرانی[٦٩]، ڕەنگە ژی زەنگی ب ڤێ چەندێ خواستبیت کو میرێن مەهرانییان و کەلایێن وان ژێك دوور بێخیت دەمێ کونترۆل ل سەر کەلا شەعبانیێ کری[٧٠]، دا کو رێ ب ساناهی بکەڤیت بۆ کونترۆلکرنێ ل سەر کەلایێن دیتر یێن هەتا ڕادەکی د ئاسێ، یان ژی وی مفا ژ وێ ژێکڤەبوونێ وەرگرت یا کو دناڤبەرا مەهرانییان دا هەی کو هەر ئێکی ژ وان بۆ بەرژەوەندیێن خۆ ئارمانجێن خۆ یێن تایبەت کاردکر.

ئەوپێکهاتنا د ناڤبەرا عیمادەدینێ زەنگی و میر عەلی کورێ عەبدوللایێ مەهرانی دا ب ڕێیا دایکا وی و خالێن وی هاتییە کرن بێی ئاگاداریا نەسیرەدینێ جقر یێ بریکارێ عیمادەدینێ زەنگی بوو، ڤێ چەندێ نەسیرەدین نیگەران کر، لەورا د دلێ خۆدا بەرامبەر میر عەلی کەربگرتی بوو و ژ بەر ڤێ چەندێ ((نەسیرەدین جقری کەرب ژ عەلی ڤەدبوون))، چونکو ئەو بوو هەڤرکێ وی یێ سیاسی و ئیداری، و نێزیکی زەنگی ببوو وەکو دەسەلاتدارەکێ سیاسی و وەك بریکارێ ئیداری ل سەر کەلایان باوەری دابوویێ، لەورا ژی نەسیرودین جقر ڕابوو ب دارێتنا پیلانا تەپکەکێ ل هەمبەر وی و زەنگی ڕازی کر ب دەستەسەرکرنا وی، و وەسان باوەری بۆ زەنگی چێکر کو ئەو گەفە ل سەر ئەتابەگیێن زەنگی، لەورا عیمادەدینێ زەنگی سۆزا خۆ گەل میر عەلی کورێ عەبدوللایێ مەهرانی شکاند ژ لایێ خۆڤە و دەلیڤە دا جقری کو وی دەستەسەر بکەت و کرە د زیندانێ دا، لێ تشتێ سەرنج ڕاکێش پەشێمانییا زەنگی یە ل سەر سەرەدەریا خۆ ل هەمبەر میرێ مەهرانی[٧١]، چونکو ب ڤێ چەندێ گۆرەپان بۆ جقری ڤالا کر، لەورا زەنگی فەرمان دا جقری کو ژ زیندانێ ئازاد بکەت، لێ پشتی مفا نەمای و د زیندانێ دا وەغەرکری و هاتییە گۆتن کو ((نەسیرەدینی یێ کوشتی))[٧٢].

پشتی ئەو شکەستنێن ب سەرێ مەهرانییان هاتین هەلویستێ وان لاوازبوو نەخاسمە پشتی شکەستنا کەلایێن میر عەلی ل بەرامبەر هەوا زەنگی، پاشی نەسیرودین جقری بەردەوامی دا کریارا گرتنا کەلایێن وان و لەشکرێ خۆ هنارتە کەلا ڕەبیێ و د دەمەکێ کورت دا کونترۆل ل سەر کر، ژ بەر هێرشەکا ژ نشکەکێڤە ل سەر، پاشی هەر کەسێ د نیڤا کەلایێدا دیلکر ژ وانان ژی کەس و کارێن مالباتا میرێن دەستەلاتدارا میرگەهێ وەك کوڕ و برا و خووشکێن عەلی کورێ عەبدوللایێ مەهرانی یێ کوشتی، لێ دایکا وی خانم خەدیجا مەهرانی وی دەمی نە ل وێرێ بوو، دەمێ کو عیمادەدینێ زەنگی گوە ل نووچەیێ گرتنا کەلا ڕەبیێ بوویی، کەیفا وی ب وێ چەندێ هات و فەرمان دا بریکارێ خۆ جقری کر کو قەستا کەلایێن دیتر یێن میرێ کوشتی کر، ئەڤجا دووریێچکرن لێ ژ بەر بەرخودانا مەهرانییان ئەو نەشیا وان کەلان بگریت و دووریێچکرنێ دەمەکێ درێژ ڤەکێشا[٧٣].

زەنگی دیت کو یا باشتر ئەوە سیاسەتا خۆ یا توند ل هەمبەر مەهرانییان بگوهۆریت و کار ل سەر نازاندنا وان بکەت و سۆزان ب دەتێ (لەورا زەنگی پەیام بۆ هنارتن و سۆزێن چاکیێ دانێ))، دا کو کەلایێن خۆ بێی شەرکرن ڕادەستی وی بکەن، پشتی دانوستاندن و دیالۆگان، مەهرانی ل سەر داخوازا وی ڕازیبوون ب مەرجێ ئازادکرنا مەهرانیێن د ناڤ کونجێن زیندانا وی دا ل مووسلێ، نەخاسمە تاکێن خێزانا میر عەلی کورێ عەبدوللای و زەنگییان کرە مەرج بەرامبەری ڤێ چەندێ کەلا کواشێ ڕادەستی وان بکەن[٧٤].

وی دەمی کەلا کواشێ د دەستێ میر خۆل و هارۆنێ مەهرانی دا بوو، خەدیجا مەهرانی ژی ڕابوو قەستا میرێ ناڤبری کر بۆ ڕازیکرنا وی کو دەست ژ کواشێ بەردەت بۆ زەنگییان، لەورا داخوازا وێ بجهئینا بۆ ڕازیبوونێ ل سەر ڤێ دەست بەردانێ[٧٥]، دشێین بێژین کو خەدیجا مەهرانی هەمی دانوستاندن د ناڤبەرا مەهرانییان و زەنگییاندا ب ڕێیا برایێن خۆ ل مووسلێ ب ڕێڤەدبرن، ئەڤە ژی ژ بەر گەلەك ئەگەران ژ هەمیان گرنگتر ئەوە کو کوڕێن وێ ل نك زەنگی دگرتی بوون و ئەو ل چارەسەریەکێ دگەریا کو وان ژ زیندانێ دەربێخن[٧٦]، ل داویێ میرێ کواشێ ڕازی بوو ل سەر دەست بەردانێ ژ کەلا

كواشىٰ پێخەمت ئازادكرنا ديلكرێن مەهرانى، دەمىٰ عيمادەدينىٰ زەنگى گوهـ ل پەيامىٰ رازيبوونىٰ بووى، گۆت: ب گۆتنا ژنەكىٰ دەست ژ جهێن وەك كواشىٰ بەرددەت، دڤێت ئەو كەسە ژ هەموو مرۆڤان مێرتر بيت و كەسىٰ نازڤرينتەڤە يىٰ پەنايىٰ بۆ ناڤمالا وى دبەت، يان ژى دڤێت ئەو مرۆڤە ژ هەموو كەسان بىٰ عاقلتر بيت ((ينزل عن مثل كواشى لقول أمراه، فإما أن يكون أعظم الناس مرووه لا يرد من دخل بيته، وإما أن يكون أقل الناس عقلا))[٧٧] هەر وەسا دبيت بۆيەرا مە باس ژىٰ كرى وەك ئێك ژ هەلويستێن هەڤگرتيىٰ د ناڤبەرا مەهرانيان دا بهەژمێرين، چونكو بەرى دەمى ژى چێنەبوويە كو ميرەكىٰ مەهرانى پشتەڤانيا ميرەكىٰ وەكى خۆ كربيت و دەست ژ مولكێن خۆ بەردابيت، زێدەبارى ڤىٰ چەندىٰ ژى گەلەك ئەگەرێن ديتر هەنە پالدانا وى كرينە بۆ بەرسڤدانا داخوازيا خانما خەديجا مەهرانى، بۆ پلەيا وىٰ وەكو هەڤژينا

**نەخشەيىٰ كەلا و باژێرێن دەڤەرا بەهدينان**
**(حەميدى، هەكارى، مەهرانى ل باژێرێن ئاكرى و ئاميدىٰ و زاخۆ- حەسەنيىٰ)**




ژێدەر: نەخشە ژ كارێ ڤەكۆلەرى يە ب هاريكاريا: (دەرويش هرۆرى، بلاد هكارى، ص ٢٨١، كاروان عبدالعزيز، الكرد المهرانيه، ص٢٠٢، هلبين رەفيق، الكورد الحميديه، ص ١٦٢).

مەزنترین میرێن مەهرانی كو ئەو ژی عەبدوللایە و دایكا میر عەلی و خووشكا هەر دومیرێن مەهرانی ئیبراهیم و عیسای، هەر وەسا حەزا خۆل و هارۆن پێنگاڤەكا دیرۆكی بوو سەخمەرات نەهێلانا رێتنا خوینی د وی دەمیدا[78].

ژێدەران ئاماژە پێ نەدایە پشتی كو زەنگیان ئەو كەلایە كونترۆلكرین كێ دەستەلاتداری ل وان كەلایان كرییە، لێ بارا پتر نەسیرودین جقر دەستەلاتدارییا وان كەلا كربوو ب رەنگەكێ نە راستەوخۆ ب رێیا بریكارێن خۆ(79)، د دەرئەنجامدا عیمادەدینێ زەنگی شیا دەستێ خۆ ب دانیتە سەر پرانییا مولكێن تائیفە و میرگەهێن كوردی ل دەڤەرا بەهدینان ب كێمتر ژ پازدە سالان و دابینكرنا ئێك ژ سنوورین گرنگێن دەولەتا خۆ كو مەترسی بوو ل سەر وی.

پشتی دەولەتا زەنگی كونترۆلا خۆ ل سەر هەمی كەلایێن بەهدینان باش موكم كری، ئبنولئەسیری ئەو پێنگاڤ وەك وەرچەرخانەكا دیرۆكی هەژمارت و ل دووڤ گۆتنا وی دیاركر كو مووسل و دەڤەرا بەهدینان قورتال بوو و ئارامبوون پشتی ڤێ چەندێ ژ مەترسییا وان و كریارێن وان یێن خرابكارانە لەورا گوت: خەلكێ گوند و ئاقارێن مووسلێ یێن جیرانێن وی مللەتی تەنابوون، كو هەردەم دگەل وان د تەنگاڤییێدا بوون ژ تالانكرنا مالێ وان و خرابكرنا وەلاتێ وان ((فاطمأن اهل سواد الموصل المجاورون لهؤلاء القوم، فأنهم كانوا معهم فی ضائقه كبیره من نهب أموالهم وخراب البلاد))[80]، هەروەسان گۆتییە: دەڤەرا چیا و زۆزانان سەقامگیر بوو و ژیانا كوردێن ئالیگر تەنابوو ((استقام الجبل والزوزان، وأمنت الرعایا من الآكراد)) [81] هەروەسان گۆتییە، ویلایەتا چیان سەقامگیر بوو ((استقامت ولایە الجبل))[82]هەروەسان گۆتییە: وان خرابكاری ل وەلاتی زێدەكر ((أكثروا فی البلاد الفساد))[83] ، هەروەسان ئیبن واسیل (ابن واصل) گۆتییە: ئەو هەردەم دگەل وان دتەنگاڤییەكا مەزندا بوون ((أنهم كانوا معهم فی ضر عظیم)) [84].

ژ وان دەقان ئەم د گەهینە گەلەك ئەنجامان وەكو:

1-كوردێن بەهدینی ب هێز و ب خورتی ل دژی بەرژوەندیێن زەنگیان و مایتێكرنێن وان د كاروبارێن وان یێن ناڤخۆ یێن تایبەتدا رادوەستیان.

2-خۆیایە كو ئبنولئەسر دیرۆك بۆ زەنگییان دنڤیسی و دەربرین ژ نێرینێن وان دكر، شانازی ب كریارێن وان ب هەرە مەزن دادانەنیاسین و یێن بەڤلێن وان یێن سیاسی ب دەڤێن وەكی ڤان بێ بهادكرن.

## ژێدەر:


1. ابن خلكان، وفیات الاعیان وانباء الزمان (بیروت: 1977)، 1/217-218 ؛ عمادالدین خلیل، عمادالدین زنكی (الموصل: 1985)، ص31.

2. ابن الاثیر، الكامل فی التاریخ (بیروت: 2007)، 8/665-666، محمد سهیل طقوش، تاریخ الزنكیین فی الموصل و بلاد الشام (بیروت: 1999)، ص ص 83-88.

3. محمد سهیل طقوش، تاریخ الزنكیین، ص 98-99.

4. ابن الاثیر، الكامل، 8/704-705؛ ابن خلدون، تاریخ ابن خلدون (بیروت: 1988)، 5/269-271؛ عمادالدین خلیل، عمادالدین زنكی ص ص 101-111 ؛ درویش یوسف حسن الهروری، بلاد هكاری 945-1336م (اربیل: 2005)، ص ص 113-124.

5. ابو شامة، الروضتین فی اخبار الدولتین النوریة والصلاحیة (بیروت: 2002)، 1/169 ؛ النویری، نهایة الارب فی فنون الادب (بیروت: 2004)، 27/98؛ زرار صدیق توفیق، كورد وكوردستان لە رۆژگاری خیلافەی ئیسلامیدا (هەولێر: 2012) ص ص 240-245.

6. یاقوت الحموی، معجم البلدان (بیروت : 1995)، 4/136؛ ابن الاثیر، التاریخ الباهر فی الدولة الاتابكیة (القاهرة: 1963)، ص 48 ؛ توفیق، القبائل، ص 85-91.

٧. ابن الاثیر، الکامل، ٧٠٣/٨، تاریخ ابن خلدون، ٢٦٩/٥؛ بۆ پتر پێزانینان ل سەر کەل و دەڤەرێن وان کو پترن ژ (١٤) باژێر و باژێرك و کەل و ئاسێ گەهان بنێرە : نەخشێ بادینان ل دوماهیا بابەتی؛ هلبین رفیق محمد سعید، الکورد الحمیدیة و دورهم الساسی والحضاری خلال القرون ٣-٨٥/٩-١٤ز (اربیل: ٢٠١٣)، ص ص ١٤-٣١؛ نەخشێ بادینان .

٨. ابن الاثیر، الکامل، ٧٠٣/٨؛ تاریخ ابن خلدون، ٢٦٩/٥ .

٩. ابن الاثیر، الکامل، ٧٠٤/٨؛ تاریخ ابن خلدون، ٢٦٩/٥؛ بۆ پتر شارەزابوون ل سەر جهێن وان کەلان بنێرە : نەخشێ بادینان .

١٠. ابن الاثیر، الکامل، ٧٠٤/٨؛ تاریخ ابن خلدون، ٢٦٩/٥؛

١١. ابن الاثیر، الکامل، ٨/ ٧٠٣-٧٠٥؛ تاریخ ابن خلدون، ٢٧٠/٥-٢٧١؛ توفیق، القبائل، ص ١٦٥.

١٢. ابو شامة، الروضتین، ١٦٩/١ ؛ النویری، نهایة الارب، ٩٨/٢٧.

١٣. خلیل، عمادالدین زنکی، ص ص ١١٠-١١٢؛ توفیق، القبائل، ص ص ١٦٥-١٦٦؛ کرفان احمد محمد امیدی، الکرد فی کتابات المؤرخ ابن الاثیر (دهۆك: ٢٠٠٦)، ص ص ٣٠٨-٣١٢.

١٤. الکامل، ٧٠٤/٨-٧٠٥.

١٥. التادفی الحنبلی، قلائد الجواهر (بغداد : ١٩٨٤)، ص ٨٦؛ النبهانی، جامع کرامات الاولیاء (بیروت: ٢٠٠٧)، ٢٧٢/٢ .

١٦. توفیق، القبائل، ص ١٦٥؛ بۆ پتر پێزانینان ل سەر وان کەلان بنێرە : الکرد المهرانیة دورهم الساسي والحضاری خلال القرنین ٦-٧ه/١٢-١٣م (دهۆك : ٢٠١٣) ص ٢٩-٤٣؛ نەخشەیێ بادینان.

١٧. مفرج الکروب (القاهرة: ١٩٥٣)، ٥٦/١ .

١٨. صورة الارض (بیروت: ١٩٨٧)، ص ٢٨٨ ؛ عمادالدین خلیل، عمادالدین زنکی، ص ١١٠.

١٩. ابن الاثیر، الکامل، ٧٠٤/٨-٧٠٥ ؛ ابن الشعار، قلائد الجمان (بیروت: ٢٠٠٥) ؛ مج ٢، ج٢٤٠/٣ ؛ التادفي الحنبلي، قلائد الجواهر، ص ٨٦؛ النبهاني، جامع کرامات الاولیاء، ٢٧٢/٢ .

٢٠. ابن الاثیر، الباهر، ص ص ٤٨، ٦٤ ؛ الکامل، ٧٠٣/٨- ٧٠٥ ؛ تاریخ ابن خلدون، ٢٧٠/٥- ٢٧١ .

٢١. عمادالدین خلیل، عمادالدین زنکي، ص ص ١١١- ١١٢ .

٢٢. محمد علی الصلابی، عمادالدین زنکي، ص ٧٧ .

٢٣. کاروان عبدالعزیز، الکرد المهرانیة، ص ٢٥ ؛ هلبین رفیق، الکورد الحمیدیة، ص ١٠١- ١٠٢ ؛ عمادالدین خلیل، عمادالدین زنکي، ص ١٠٤- ١٠٥ ؛ درویش هروری، بلاد هکاري، ص ١١٣ .

٢٤. محمد سهیل طقوش، تاریخ الزنکیین، ص ١٠٤ .

٢٥. ابن الاثیر، الکامل، الباهر، ص ٤٨؛ ٧٠٣/٨ ؛ ابن واصل، مفرج الکروب، ٥٥/١ ؛ النویری، نهایة الارب، ٩/٢ ؛ تاریخ ابن خلدون، ٢٧٠/٥.

٢٦. درویش هروری، بلاد هکاری، ص ١١٤.

٢٧. ابن الاثیر، الکامل، ٧٠٣/٨ ؛ الباهر، ص ٤٨.

٢٨. ابن الاثیر، الباهر، ص ٤٨؛ الکامل، ٧٠٣/٨؛ ابن واصل، مفرج الکروب، ٥٥/١؛ النویری، نهایة الارب، ٩٠/٢٧.

٢٩. ابن الاثیر، الباهر، ص ٤٧- ٤٨؛ الکامل، ٧٠٣/٨- ٧٠٤،

٣٠. درویش هروری، بلاد هکاری، ص ١١٥.

٣١. ابن الاثیر، الکامل، ٧٠٣/٨؛ تاریخ ابن خلدون، ٢٧٠/٥.

٣٢. ابن الاثیر، الباهر، ص ٨٠.

٣٣. درویش هروری، بلاد هکاری، ص ١١٦.

٣٤. الکامل، ٧٠٥/٨؛ ابن واصل، مفرج الکروب، ٥٥/١.

٣٥. الکامل، ٧٠٣/٨- ٧٠٥

٣٦. عمادالدین خلیل، عمادالدین زنکی، ص ١٠٥؛ محمد سهیل طقوش، تاریخ الزنکیین، ص ١٠٦؛ محمد علی الصلابی، عمادالدین زنکی، ص ٨٣.

٣٧. درویش هروری، بلاد هکاری، ص ١١٦.

٣٨. ابن خلکان، وفیات الاعیان، ١٨١/١؛ ابن الاثیر الکامل، ٧٠٤/٨، الیونینی، ذیل مراة الزمان (الهند : ١٩٦٠)، ٢٤٢/٢.

٣٩. درويش هروري، بلاد هكاري، ص ١١٦؛ كرفان ئاميدي، الكرد في كتابات ابن الاثير ص ٣٠٥.
٤٠. الكامل، ٧٠٤/٨؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٥٥/١؛ تاريخ ابن خلدون، ٢٧٠/٥؛ بۆ پتر پێزانینان ل جهێن وان كەلان بنێرە نەخشێ بادینان ل دوماهیا ڤی بابەتی.
٤١. الكامل، ٧٠٤/٨؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٥٥/١.
٤٢. الكامل، ٧٠٤/٨؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٥٥/١.
٤٣. الكامل، ٧٠٤/٨؛ تاريخ ابن خلدون، ٢٧٠/٥.
٤٤. درويش هروري، بلاد هكاري، ص ١١٨؛ احمد محمد عبدالكريم البرزنجي، الكرد في عهد الاتابكية الزنكية (اربيل: ٢٠١٠)، ص ٢٨ .
٤٥. ابن الاثير، الكامل، ٧٠٤/٨.
٤٦. ابن الاثير، الكامل، ٧٠٤/٨؛ عمادالدين خليل، عمادالدين زنكي، ص ١٠٨، درويش هروري، بلاد هكاري، ص ١١٨؛ احمد البرزنجي، الكرد في عهد الاتابكية الزنكية، ص٢٨.
٤٧. ابن الاثير، الكامل، ٧٠٤/٨؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٥٦/١؛ عمادالدين خليل، عمادالدين زنكي، ص ١٠٨.
٤٨. ابن الاثير، الباهر، ص ٦٤؛ الكامل، ٧٠٤/٨؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٥٦/١.
٤٩. ابن الاثير، الباهر، ص ٦٤؛ الكامل، ٧٠٤/٨.
٥٠. الباهر، ص ٦٤.
٥١. الكامل، ٧٠٤/٨.
٥٢. الكامل، ١٤/٩.
٥٣. ابو شامة، الروضتين، ١٦٩/١؛ النويري، نهاية الارب، ٩٨/٢٧.
٥٤. بۆ پتر پێزانینان ل سەر جهێن وان كەلان بنێرە نەخشێ بادینان ل دوماهیا بابەتی .
٥٥. الكامل، ٧٠٤/٨؛ تاريخ ابن خلدون، ٢٧٠/٥.
٥٦. الكامل، ٧٠٣/٨.
٥٧. الباهر، ص ٦٤.
٥٨. تاريخ دمشق (دمشق: ١٩٨٣)، ص ٤٣٢؛ تاريخ حلب (تاريخ العظيمي) (دمشق: ١٩٨٤)، ص ٣٩٦.
٥٩. ابو شامة، الروضتين، ١٦٩/١؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٩٠/١ ؛ النويري، نهاية الارب، ٩٨/٢٧.
٦٠. الكامل، ٧٠٣/٨- ٧٠٤.
٦١. هەمان ژێدەر، ٧٠٤/٨.
٦٢. ابن الاثير، الكامل ٧٠٣/٨؛ ابن واصل، مفرج الكروب،٥٦/١- ٥٧؛ هروري، بلاد هكاري، ص ١٢١.
٦٣. ابن الاثير، الكامل ٧٥٣/٨؛ خليل، عمادالدين زنكي، ص ١٢٠ و ل ديڤدا.
٦٤. ابن الاثير، الكامل ٧٠٣/٨؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٥٥/١- ٥٦.
٦٥. تاريخ الزمان (بيروت: ١٩٩٨)، ص ٢٥٤.
٦٦. ابن الاثير، الكامل ٧٠٤/٨؛ تاريخ ابن خلدون، ٢٣٠/٥.
٦٧. ابن الاثير، الكامل ٨/ ٧٠٣- ٧٠٥.
٦٨. ابن الاثير، الكامل ٨/ ٧٠٤؛ تاريخ ابن خلدون، ٢٣٠/٥.
٦٩. ابن الاثير، الكامل ٨/ ٧٠٤.
٧٠. خليل، عمادالدين زنكي، ص ص ١١١- ١١٢؛ محمد فتحي الشاعر، الاكراد في عهد عمادالدين زنكي (القاهرة: ١٩٩١)، ص ٤٣.
٧١. ابن الاثير، الكامل ٧٠٥/٨.
٧٢. ابن الاثير، الكامل ٧٠٤/٨.
٧٣. الكامل، ٧٠٥/٨.
٧٤. الكامل، ٧٠٥/٨.

٧٥. الكامل، ٧٠٥/٨؛ تاريخ ابن خلدون، ٢٣٠/٥.
٧٦. الكامل، ٧٠٥/٨؛ تاريخ ابن خلدون، ٢٣٠/٥.
٧٧. الكامل، ٧٠٥/٨؛ تاريخ ابن خلدون، ٢٣٠/٥.
٧٨. آميدي، الكرد، ص ص ٣٠٠- ٣١١.
٧٩. خليل، عمادالدين زنكى، ص ٢٥٤.
٨٠. الكامل، ٧٠٣/٨؛ تاريخ ابن خلدون،٢٢٩/٥.
٨١. الكامل، ٧٠٧/٨؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٥٦/١؛ تاريخ ابن خلدون، ٢٧٠/٥- ٢٧١.
٨٢. الكامل، ٧٠٥/٨.
٨٣. الباهر، ص ٦٤؛ ابو شامة، الروضتين، ١٦٩/١.
٨٤. مفرج الكروب، ٥٦/١.

# رۆلێ عەشیرەتێن دەڤەرا بەهدینان د جیهادێدا د شەرێن خاچهەلگراندا

**پ. هـ کاروان عبدالعزیز محمد علی**

## پێشەکی

سـەردەمـێ خەلافەتێن ئیسلامی چەندین عەشیرەتێن کوردی هاتنە پێش، و زۆربەیا وان رۆلەکێ کاریگەر د رووداناندا هەبوو و شیان توانایێن خۆ یێن مرۆڤی و سرۆشتی ل جهێن خۆ بێخنە د خزمەتا دروستکرنا میرگەهـ و قەوارەیێن سیاسی یێن ناڤخۆییدا، و خودان دەستەلاتەکا مەزن بوون ل دەڤەرێن خۆ، ئەو دەڤەرا نها ب بەهدینان دهێتەنیاسین، ل سەردەمێ دەسەلاتداریا ئیسلامی یا بەرنیاس بوو ب وەلاتێ هەکاری چەندین عەشیرەتێن کوردی وەك هەکاری و مەهرانی و حەمیدی لێ د ئاکنجیبوون، ل دەسپێکا سەدسالیێ شەشێ مشەختی/دووازدێ زایینی شیان چەندین میرگەهێن بچووك ل کەلایێن خۆ دروست بکەن، بەلێ هەردەم چاڤێ والیێن مووسلێ ل ڤان کەلایان بوو و د ڤیان بێخنە ژێر کونترۆلا خۆڤە تا عیمادەددین زەنگی (٥٢١-٥٤١کـ/١١٢٧-١١٤٦ز) شیای کونترۆلکەتن، پشتی مالباتا ئەیوبی دەرکەتی مەزنێن عەشیرەتێن بەهدینان گەهشتنە سولتان سەلاحەددینێ ئەیوبی (٥٦٤-٥٨٩کـ/١١٦٨-١١٩٣ز).

چەندین کەسان ژ عەشیرەتێن بەهدینان ژ هەکاری و مەهرانی و حەمیدی رۆلەکێ مەزن دناڤ د لەشکەرێ ئەیوبیدا گێران ب تایبەت ل سەردەمێ سولتان سەلاحەددینی و بەرگریکرنێ ژ خاکا موسلمانان دژی شەرێن خاچهەلگران و ل شامێ و مسرێ پشکداری د جیهادێدا د رێکا خودێ دا کرن، بەلێ رۆلێ ڤان عەشیرەتان د جیهادێدا پشتی مرنا سولتان سەلاحەددینی کێم بوو وەکی هەمی عەشیرەتێن دیێن کوردی پشکداربوون د ململانێن د ناڤ خێزانا ئەیوبیدا ل سەر دەسەلاتێ دروستبووین.

ڤەکۆلین دابەش بوویە ل سەر پێشەکی و شەش پشکان و دەرئەنجامان و نەخشەکی و لیستەکا ژێدەران، پشکا ئێکێ دەرازینکەکە ل سەر دەڤەرا بەهدینان و عەشیرەتێن وێ دەمێ تێدا د ئاکنجی مینا هەکاری و مەهرانی و حەمیدی، و چەوان گەهشتنە لەشکەرێ ئەیوبی، پشکا دووێ باسێ پشکداریا بەهدینییان د دەولەتا ئەیوبیدا هەر ژ دەمێ دامەزراندنا وێ تا شەرێ حتینێ یێ بناڤودەنگ، پشکا سیێ بەحسێ سەرکەفتنێن بەهدینییان

دکەت ب تایبەت مەهرانییان د شەری حتیندا سالا (٥٨٣مش/١١٨٧ز) دا و ئەو شەرێن د ڤێ سالێدا چێبووین، دەربارەی پشکا چوارێ رۆلی بەهدینییان یێ مەزن د شەرێ دووریێچکرنا باژێرێ عەکادا هاتییە دیارکرن و بۆ دەمێ دو سالان ڤەکێشابوو، پشکا پێنجێ ل دۆر دووریێچکرنا باژێرێ یافا و پێکهاتنا رەملە دناڤبەرا سەلاحەددین و خاچپەلگران و رۆلێ بەهدینییان تێدا هاتییە دیارکرن، پشکا شەشێ بەحسێ عەشیرەتێن بەهدینان د جیهادێدا پشتی مرنا سولتان سەلاحەددینی د کەت.

ناڤێ گەلەك باژێرێن وەلاتێ شامێ د ڤێ ڤەکۆلینێدا دووبارە بووینە، دا پەراویز تژی نەبن ژ پێناسێن وان، مە ل پشتا ڤەکۆلینی نەخشەکێ وەلاتێ شامێ دروست کرییە و تێدا ئەو باژێر هاتینە دەست نیشانکرن.

ڤەکۆلینێ پالپشتی ب چەندین سەرچاوەیێن گرنگ کرینە و هەڤچەرخێن رووداناان بوون ژ واناان (الكامل فی التاریخ) یا ئیبن ئەسیری (٦٣٠مش/١٢٣٢ز) و د هێنە هەژمارتن ژ سەرچاوەیێن گرنگ بو ڤەکولەرێن کوردان، د سەردەمێ ئەیوبییاندا کۆمەکا مەزنا ژێدەران د بەر دەستێ ڤەکۆلەراندا، دانەرێن وان نێزیکی جهێ بریارێ بوون لەورا ئەم د شێن بێژین ئەو بخۆ دیدەڤان بوون ل سەر رووداناان و ژوان ئەسفەهانی(٥٩٧مش/١٢٠٠ز) خودانێ پەرتووکا (الفتح القسي في الفتح القدسي) و تێدا هەمی دەنگوباسێن سولتان سەلاحەددینێ ئەیوبی تێدانە و د گەلەك تێکستادا بەحسێ بەهدینییان کرییە، هەروەسا ژ پەرتووکێن گرینگ ب ژیانا سولتان سەلاحەددینی (النوادر السلطانیه والمحاسن الیوسفیه) یا ئیبن شەدادی (٦٣٢مش/١٢٣٤ز)، بەحسێ چەندین رووداناان د سەردەمێ ویدا ل مسرێ و شامێ و رۆلێ عەشیرەتێن دەڤەرا بەهدینان د شەرێن دژی خاچپەلگراندا کرییە.

هەروەسا مفا ژ پەرتووکا (تاریخ دوله الاكراد) هاتییە وەرگرتن، خودانێ وی نە نیاسە (٧مش/١٣ز مریبە) و دهێنە هەژمارتن ژ ژێدەرێن رەسەن و بەرفرەه بو مێژوویا دەولەتا ئەیوبی و تمامکەرا وان ژێدەرانە یێن بەری نها مە بەحس کرین، زێدەباری ژێدەرێن (الروضتین فی اخبار الدولتین النوریه والصلاحیه) یا ئەبو شامە (٦٦٥مش/١٢٩٦ز مریبە)، و پەرتووکا (مفرج الكروب فی اخبار بنی ایوب) یا خودانێ وێ ئیبن واسیل (٦٩٧مش /١٢٩٧ز مریبە) و تێدا ب تێر و تەسەلی و ب شێوەیەکێ ئاسان بەحسێ کوردان ب تایبەت عەشیرەتێن مەهرانی و هەکاری و حەمیدی د سەردەمێ دەولەتا ئەیوبیدا تێدا هاتینەکرن.

زێدەباری ڤان ژێدەران و گەلەکێن دی مە پشت ب چەندین ژێدەرێن دی یێن دیرۆکی یێن ئەکادیمی بەستییە و نێزیکی ڤەکۆلینێنە، ژ وانان ( المشطوب الهكاری و دور الهكاریین فی الحروب الصلیبیه) یا نەبەز مەجید ئەمین، نامەکا ماستەرێیە و تا نها نە هاتییە بەلاڤکرن، و پەرتووکا (القبائل والزعامات الكردیه فی العصر الوسیط) یا دکتور زرار سەدیق تەوفیق، هەروەسا پەرتووکا (الجیش الایوبی فی عهد سەلاح الدین الایوبی) یا محسن محەمەد حەسەن، پەرتووکا (الكرد المهرانیه دورهم السیاسی والحضاری خلال القرنین ٦-٧هـ/١٢-١٣م) یا دانەرێ وێ کاروان عەبدولعەزیز محەمەد عەلی، وپەرتووکا (الكرد الحمیدیه دورهم السیاسی والحضاری خلال القرون ٣-٨هـ /٩-١٤م) یا دانەرا وێ هلبین رەفیق محەمەد سەعید باجلۆری، ژ پەرتووکێن نێزیك و گرنگ و د هاریکاربوون بۆ ڤێ ڤەکۆلینێ.

## ئێك:دەرازینکەك ل دۆر دەڤەرا بەهدینان و عەشیرەتێن وێ و چوونا وان ب هەرەما جیهادێ بو ناڤ ریزێن ئەیوبییان

دەڤەرا بەهدینان یا نها ب سنوورێن خو یێن کارگێرییێن بەرنیاس د سەردەمێن ئیسلامیدا د گوتنێ وەلاتێ هەکاری نەخاسمە دەڤەرێن زاخۆ و ئاکرێ و ئامێدیێ و عێن سفنی-شێخان کو بەری دەرکەفتنا ئەیوبییان سەنتەرێ میرگەهێن کوردی بوون ب تایبەت دەسپێکا سەدسالیێ شەشێ مشەختی/دووازدێ زایینی، هندیکە باژێرێ زاخۆ و کەلایێن دەور و بەرێن

وێ لاندکا میرگەها مەهرانی بوون ئەوا عەشیرەتا مەهرانییا کوردی دامەزراندی[1]، دەربارەی بازێری ئاکرێ وکەلایێن نێزیکێ وێ سەنتەرێ میرگەها حەمیدی بوو ئەوا ل سەر دەستێ مەزنێن عەشیرەتا حەمیدی هاتیە دامەزراندن[2]، دەربارەی بازێری ئامێدیێ و کەلا وێ یا بەرنیاس و گرنگ جهێ دەستەلاتداریا میرگەها هەکاری بوو ئەوا ژ ئالیێ عەشیرەتا هەکاری ڤە هاتیەدامەزراندن[3]، ل سەدسالیێن پێنجێ وشەشێ مشەختی/یازدێ و دووازدێ زایینی، ڤانان ل جهێن ئاکنجیبوونا خۆ کو پرانی کەلا و ئاسێگەهـ بوون میرگەهێن خۆ دامەزراندن، و د دەمێ بووەیهیباندا (٣٣٤-٤٤٧مـــــش/٩٤٥-١٠٥٥ز) کو سیاسەتەکا نەمەلبەندی د حوکمداریێ دا د گرتەبەر و دەلیڤەکا باش بۆ دامەزراندنا ڤان میرگەهان پەیدابوو[4]، زۆربەیا ڤان ژ وانان ژی مەهرانی و حەمیدی و هەکاری د سەردەمێن دیرۆکیێن جودادا خودان هێزەکا بالا دەستبوون ل دەڤەرێن خو[5].

عەشیرەتێن دەڤەرا بەهدینان ئەڤێن هاتینە ناڤ مەیدانا روودانێن سیاسی ب تایبەت ل دەسپێکا سەدسالیێ شەشێ مشەختی/دووازدێ زایینی و پشتی عیمادەددینێ زەنگی (٥٢١ –٦٣١مـش / ١١٢٧– ١٢٣٣ز) دەستێ خو دانایە سەر کەلایێن وان د ناڤبەرا سالێن (٥٢٨- ٥٣٧مش/١١٣٤- ١١٤٢ز) پشتی ڤێ روودانێ ناڤودەنگێن وان ل هەمی جیهانا ئیسلامی دەنگڤەدا و بوونە خودان مێژوویەکا زێرین و نها تێکێستێن ژێدەران باشترین بەلگەنە بو ڤێ چەندێ[6]، پاشان چوونە د ناڤ رێزێن ئەتابەگییا زەنگیدا، و ب رێکا وانرا ب مەرەما جیهادێ دژی خاچهەلگران گەهشتنە سولتان سەلاحەددین ئەیوبی[7].

دەرکەفتنا ئەیوبییان و ب هێزبوونا وان د رووداناندا نیڤا دووێ ژ سەدسالییا شەشێ تا داوییا سەدسالیێ حەفتێ مشەختی/دووازدێ و سێزدێ زایینی ڤۆناغەکا گرنگە د دیرۆکا کوردان یا چەرخێن ناڤیندا، و زەلامێن عەشیرەتێن کوردان یەك ژ ستوونێن سەرەکی بوون یێن ئەیوبییان بۆ موکمکرنا دەولەتا خۆ پشتا خۆ پێ قایمکری[8]، و زۆربەیا میر و سەرکردەیێن کورد گەهشتنە ئەسەدەددین شێرکو کورێ شادی (٥٦٤مش/ ١١٦٩ز مریبە)، و گەلەك ژوان د مێرخاس و قارەمان بوون و دگەل هێرشێن ویدا بۆ سەر مسرێ د پشکداربوون، پاشان گەهشتنە کورێ برایێ وی سولتان سەلاحەددینی دەمێ بوویە سولتانێ دەولەتا ئەیوبی ل مسرێ و شامێ[9].

ئەیوبی شیان لەشکەرەکی ژ کورد و تورك و چەندین رەگەزێن دی دروست بکەن[10]، بەلێ د ڤی بیاڤیدا کوردان رۆلەکێ مەزنتر ژ هەمی رەگەزێن دیتر ب تایبەت سەردەمێن دەسپێکا دامەزراندنا دەولەتێ هەبوو، و دناڤا واندا چەندین سەرکردەیێن ب هێز هەبوون و ژێدەرا ئاماژە ب ڤێ یەکێ کریە[11]، ب باشترین رێك کارێن خو ئەنجامدان ب پشکداربوونا عەشیرەتێن وان یێن جودا جودا د زۆربەیا شەراندا[12]، د ناڤا لەشکەرێ ئەیوبیدا بەرامبەری پێدانێن پارەیەکێ زۆر وەك مەهانە[13]، د ڤی دەمیدا عەشیرەتێن مەهرانی و هەکاری و حەمیدی بوونە ستوونێن سەرەکیێن لەشکەرێ ئەیوبی ل سەر هاتیەدامەزراندن، و بەشداری د زۆربەیا شەرێن سولتان سەلاحەددینی ئەنجامدابن کرینە، بەلێ زۆربەیا جاران دەمی ژێدەر ئاماژێ ب وان ددەن بتنێ بەحسێ سەکردەیان دکەن بێی کو بەحسێ وێ هێزا شەرکەرێکەن یا د شەر و جیهادێدا پشتا خوپێ گەرمدکەن.

هەر ژ دەسپێکا دامەزراندنا لەشکەرێ ئەیوبی زەلامێن هەرسێ عەشیرەتان ئامادەبوونەکا باش تێدا هەبوو، و پشکداری د بەرخودانێن موسلماناندا دژی خاچهەلگران کرینە[14]، ئو وەسا هاتنە پێش کو هێزەکا لەشکەریا خودان شیانێن مەزنە و پشکداری د زۆربەیا سەرکەفتنێن سولتان سەلاحەددینیدا کرینە، وەکی عەشیرەتێن دیێن کوردی دوبەرەکییەکا مەزن د ناڤا رێزێن واندا هەبوو، و هێزێن دەولەتێن جیران هەمی دەمان گەف ل وان دکرن، بەلێ تێکەلیا وان دگەل لەشکەرێ ئەیوبییان پاراستنەك بوو بۆ وان و د هەمان دەمدا ئەگەرێ ئێککرتنا وان[15].

پەیوەندی کرنا وان بۆ ناڤ رێزێن دەولەتا ئەیوبی

خالەكا وەرچەرخانا گرنگ بوو د مێژوویا واندا، ئەم دشێن بێژین رۆلێ وان د ڤێ قۆناغێدا سەردەمێ زێرینێ وان بوو د روودانێن سیاسی و لەشكەریدا، و ئەو نێرینا نەرێنی یا هندەكان بەرامبەری عەشیرەتێن كوردی ب تایبەت عەشیرەتێن مە پێ مەبەست هاتەگوهارتن وب چاڤەكێ باشتر ل وان نێرین لەورا ڤان ژێدەرا بەحسێ رۆلێ وان دژی خاچهەلگران كرینە [16]، هەژیە بێژین د دەمێ دەسەلاتداریا زەنگیان ژێدەران ب بەردەوامی ب نەرێنی بەحسێ كوردان كرینە.

ئەسفەهانی وەسان پەسنا وێرەكی و مێرخاسییا وان د شەریدا دەمێ دووربێچكرنا باژێرێ عەكا دا ژلایێ خاچهەلگران سالا (٥٨٥مش/١١٨٩ز) دكەت كو ل ئاستێ وان بیت، و دبێژیت: ((كل حميدى فى الروع حميد وبالحرب عميد. وكل هكاري على القرن عكار وفى الوغى كرار وللقنا جرار ...كل مهرانى فى القتال ماهر وللرجال قاهر وعلى الآبطال ظاهر)) [17]، دڤێ تێكستێدا ئەو جهێ مەزنێ عەشیرەتێن بەهدینی گەهشتینێ و ئەو زیرەكیا وان د شەراندا نیشاندای د هێنە دیاركرن، ب ڤی رەنگی كەتنە د ناڤ وان عەشیرەتێن مەزنێن كورداندا یێن لەشكەرێ ئەیوبی ب مەرەما دەستڤەئینانا ئارمانجێن خۆ پشتا خۆ پێ گەرمدكر، هوسان پشكداریا وان نە تنێ پشكدارییەكا تاكەكەسی یان چەند كەسەكان بوو وەك پشكداریا سەركردە و میران د رووداناندا بەلكی پشكدارییەكا تەبایی و بەرفرەهبوو د لەشكەرێ سولتان سەلاحەدینی دا، د سەردەمێ دووربێچا باژێرێن عەسقەلان و عەكا و بێروتێ و یێن دی ناڤێ عەشیرەتێن مەهرانی و هەكاری و حەمیدی د شەرێن جیهادێدا دژی خاچهەلگران هاتییە.

میر و مەزنێن عەشیرەتێن كوردێن بەهدینان پشكداری د شەرێن چارەنڤیسازێن موسلماناندا كرن و سەركەفتنێن بەرچاڤ توومارکرن ب تایبەت د گەل سولتان سەلاحەددینێ ئەیوبی، نەخاسمە شەرێ حتین و دووربێچكرنا باژێرێ صەیدا و عەسقەلان و عەكا و گەلەكێن دیتر، ئەڤە هاریكار بوو بۆ ب باشتر نیاسینا عەشیرەتێن كوردان ب تایبەت عەشیرەتێن بەهدینان. سیاسەتا عەشیرەتێن كوردی ژ وانان عەشیرەتێن دەڤەرا بەهدینان هاتە گوهارتن كو یا گونجای بوو د گەل سیاسەتا گشتییا دەولەتا ئیسلامی و بەرەڤانیكرن ژ عەردێ موسلمانان و كاركرن بو گەهشتنا ئارمانجێن مەزنێن خو [18].

ل سەر ڤی بنەمای رۆلێ كوردێن دەڤەرا بەهدینان د درێژیا سەردەمێ سولتان سەلاحەددینیدا د هێنە خویاكرن، كو ئەو سەردەمە ب قۆناغا دووێ یا پەیوەندیێن سولتانی دگەل خاچهەلگران دهێنە نیاسین، د چارچووڤێ ئامادەكاریێن وی بۆ بەرهەنگاربوونا وان [19]، و ل سەر ڤی بنیاتی دێ ب بەرفرەهی باسێ رۆلێ وان د وان روودانان‌دا كەین:

## دوو: بەهدینی و رۆلێ جیهادیێ وان د گەل ئەیوبییان تا شەرێ حتین

د چەندین قۆناغاندا و ژ دەسپێكا سەرهلدانا شەرێن خاچهەلگراندا كوردێن حەمیدی پەیوەندییەكا ئەرێنی د گەل دەولەتا ئەیوبی هەبوو، تا دگەهینە پشتی مرنا سولتان سەلاحەددینی سالا (٥٨٩مش/١٠٩٣ز) و دابەشكرنا دەولەتا ئەیوبی د ناڤبەرا كورێن وی و برایێن وی دا و دروستبوونا ململانێ د ناڤ خێزانا ئەیوبیدا، بەلێ قۆناغا كارتێكەر و گرنگ كو تێدا رۆلێ وان دیاردبیت پشتی سەركەفتنێن سولتان سەلاحەددینی بوون د شەرێ حتیندا سالا (٥٨٣مش/١١٨٧ز) [20].

دەربارەی كوردێن مەهرانی وان ژی رۆلەكێ سەرەكی و دەگمەن د توومارکرنا سەركەفتنان دگەل سولتان سەلاحەددینی (٥٨٣- ٥٨٨مش/١١٨٧-١١٩٢ز) د شەرێن حتین و عەسقەلان وعەكا و یافادا هەبوون [21].

هندی پەیوەندی ب كوردێن هەكاریڤە هەی دێ بینین و بەری عەشیرەتێن حەمیدی و مەهرانی گەهشتینە ئەیوبییان و دەمێ بەرەف مسرێ ڤە چووین دگەل ئەسەدەددین شێركوی و سەلاحەددینی پشكداری د رووداتێن سیاسی ولەشكەریدا كرینە،

چەندین میر و سەرکردەیێن لەشکەرێن هەکاری د گەل شێرکوی چووبوون، و ژ وانان زانایێ ئایینی زیائەددین عیسا هەکاری د هەرسێ هێرشێن ویدا بو مسرێ یێ پشکداربوو[٢٢]، و رۆلەکێ کاریگەر د سەرکردایەتییا لەشکەری ئەیوبیدا هەبوو و شارەزایی د بوارێن زانست و پینۆس و شیریدا هەبوو [٢٣]، و رێزەکا مەزن د ناڤ خەلکیدا ب شێوەیەکێ گشتی هەبوو و مفا ژ بیرو هزرێن وی هاتینە وەرگرتن و هەردەم شێوەرمەندییا وی هاتییەکرن[٢٤]، هەروەسا ژ راوێژکارێن مەزنێن سولتان سەلاحەددینی بوو و د چەندین هەلکەفتاندا پشتا خۆ پێ قائیمکرییە[٢٥].

پشتی کو زانا زیائەددین عیسایێ هەکاری هاریکاریا سولتان سەلاحەددینی د دانانا ستوونێن دەولەتا ئەیوبی ل مسرێ کری، د شەرێن وی دا بۆ بەرفرەهکرنا سنوورێن دەولەتا وی بەرەف وەلاتێ شامێ ل هەیڤا جمادی یا ئێکێ سالا (٥٧٣مش/١١٧٧ز) چوویە و سەرکێشییا هێزا مەزنا لەشکەرێ وی دکر و بەرەف بازێرێ عەسقەلانڤە چوو و سەرکەفتن ل سەر خاچهەلگران توومارکر[٢٦]، پاشان ئێکسەر بەرەف بازێرێ رەملەڤە چوو[٢٧] بەلێ رووبارێ (تل صافیە) کەتە درێکا واندا[٢٨]، لەورا دەربازبوونا لەشکەری گەلەك ب زەحمەت لێهات و قەرەبالغەکا مەزن پەیدابوو، زێدەباری بەربەلاڤبوونا وان، دەمێ ئەو دڤی کاودانیدا ژ نشکەکێڤە لەشکەرێ خاچهەلگران هێرش ئینانە سەر وان ب سەرکێشییا پرنس ئەرنات حوکمدارێ بازێرێ کەرەك و شاهێ شاهنشینا قودسێ بلدووینێ چوارێ (٥٧١ – ٥٨٢مش/ ١١٧٤ – ١١٨٥ز) هاریکاریا وی کر، عیسا هەکاری ب هەمی شیانێن خۆ پشکداری د شەریدا کر د گەل هەمی لەشکەرێ دیێ د گەل وی بەلێ نەشیان بەرسینگێ وان بگرن و تووشی شکەستنەکا مەزن بوون[٢٩]، تا گەهشتە وی رادەی پێکول بهێنەکرن سولتان سەلاحەددین بهێتە ئێخسیرکرن[٣٠]، بەلێ زانایێ ئایینی زیائەددین عیسا هەکاری و برایێ وی میر زەهیرەددین هەکاری کو د گەل ویدا بوو هاتنە ئێخسیرکرن[٣١]، بۆ ماوەیێ دو سالان ما ل دەڤ خاچهەلگران وەك ئێخسیر بەلێ سالا (٥٧٥مش/١١٧٩ز) هاتە ئازادکرن پشتی پێکگوهارتنا ئێخسیران و ب تایبەت میرێن وان د ناڤبەرا هەردوکاندا سولتان سەلاحەددین(٦٠) هزار دینار دان بەرامبەر رزگارکرنا زیائەددین عیسایێ هەکاری[٣٢]، هەروەسا برایێ وی زەهیرەددین هەکاری ژی پشتی دەمەکی هاتە ئازاد کرن ژ بەرکو ناڤێ وی دژێدەراندا هاتییە گۆتن کو ل سالا (٥٨٥مش/١١٨٩ز) د دووڕێپچکرنا عەکادا هاتییە شەهید کرن[٣٣].

ژێدەران بەحسێ چەند میر و سەرکردەیێن دی یێن هەکاری کرینە وەك محەمەد کورێ خوشترین، د هاتە نیاسین ژ مەزنە میرێن نورەددین مەحموود زەنگی (٥٤١-٥٦٩مش/ ١١٤٦-١١٧٤ز) و پشکداری د هێرشێن شێرکویدا ل سەر مسرێ کریبوو [٣٤]، هەروەسا د گەل سولتان سەلاحەددینی پشکداری د چەندین شەرێن دژی خاچهەلگراندا کرییە، و یێ ژ هەمیان بناڤودەنگتر شەرێ (مرج العیون) بوو[٣٥]، ئەڤێ ل سالا (٥٧٥مش/١١٧٩ز) دژی شاهێ خاچهەلگر بلدوینێ چوارێ کو تێدا موسلمانان سەرکەفتنەکا مەزن توومارکر هاتییە کرن[٣٦]، و میر محەمەد کورێ خوشترینێ هەکاری شیا بارزان بادەوین ئێخسیربکەت و ئەڤە ئێك ژ مەزنە میرێن خاچهەلگران بوو دوی شەریدا[٣٧]، میر خوشترینی هەڤرکییەکا مەزن د گەل سولتان سەلاحەددینی کر لەورا گەهشتە خەلیفەیێ عەباسی و د ئەنجامدا کارێ وی سەرنەگرت و جارەکا دی زڤری دەڤ سولتان سەلاحەددینی و داخوازا رازیبوونا وی کر[٣٨].

میر سەیفەددین عەلی کورێ ئەحمەد هەکاری بەرنیاس ب (المشطوب)[٣٩] ژ مەزنترین میرێن بێ رکابەرێن بەهدینی بوو، رۆلەکێ مەزن د شەرێن خاچهەلگراندا د گەل سولتان سەلاحەددینی گێرا و توومارا وی یا پری سەروەرییە ژ سەرکەفتنان، و پشکداری د هەرسێ هێرشێن شێرکویدا ئەوێن بو مسری برین کرییە[٤٠]، هەروەسا سالا (٥٧٣مش/١١٧٧ز) هاتە راسپاردن بو پاراستنا بازێرێن حەماه و دیمەشقێ پشتی والیێن وێ نەشیاین بەرگریێ ژێ بکەن بەرامبەری هێرشێن

خاچهەلگران، و د ڤی كاریدا سەركەفتنەكا مەزن توومارکر و د ئەنجامدا بوو جهێ باوەریێ ل دەف سولتان سەلاحەددینی، و ژ لایێ ویڤە ب چەندین كار و هەلكەفتێن گرنگ هاتە راسپاردن[٤١]، هەروەسا پشكداری د بەرەڤانیكرنێ ژ شویرها (الحصن) رعباندا كریە[٤٢]، دەمێ خاچهەلگران سالا (٥٧٥مش/١١٧٩ز) دووڕپێچكرین، شیان سەركەفتنێ ل سەر وان توومارکەن ب هەڤکاری د گەل هەڤالێن خۆ د لەشكەرێ ئەیوبیدا[٤٣].

میر بەدرەددین ئیبراهیم كورێ شەروەیێ هەكاری ئێك بوو ژ وان كەسێن د لەشكەرێ ئەیوبیدا خزمەت كرین و بوویە جهێ باوەریا سولتان سەلاحەددینی و تا كریە والیێ حمس و حەمات، و چەندین كەلایێن دی و هندەك پلەیێن كارگێری پێرا هاتنە بەخشین[٤٤].

## سێ: پشكدارییا وان د شەرێ حتین و شەرێن ل سالا (٥٨٣مش/١١٨٧ز) هاتینە كرن.

شەرێ حتین خالەكا وەرچەرخانێ بوو د مێژوویا ئیسلامی و شەرێن خاچهەلگراندا، و شكەستنا خاچهەلگران جهێ حێبەتییەكا مەزن بوو، ژ بەركو هەمی تەرازیێن هێزێ ل دەڤەرێ هاتنەگوهارتن، و كەتوارەكێ نوی هاتە رۆژەڤی، و كارتێكرنەكا نەرێنییا مەزن ل سەر خاچهەلگران كر و وانا بۆ ڤی شەری لەشكەرەك و چەكەكێ مەزن ئامادەكربوو بەلێ دگەل هێزەكا موكم و خودان باوەری روو ب روو بوونەڤە، ل هەیڤا رەبیعا داویێ (ربیع الاخرە) سالا (٥٨٣مش/١١٨٧ز) هێزێن ئەیوبی و خاچهەلگران شەرەكێ مەزن كر و د ئەنجامدا ئەیوبی شیان وان بشكێنن و سەركەفتنێ ل سەر وان دەستڤەبینن، ژێدەران ب مەزنی بەحسێ ڤێ سەركەفتنێ كرینە و خاچهەلگران كۆمەكا مەزنا كوشتی و دیلان د گۆڕەپانا شەریدا ل پشت خۆ هێلان، ئەو رۆژ بوو یا موسلمانان هەتا وی دەمی وەكی وێ نەدیتین[٤٥].

كوردێن مەهرانی رۆلێ هەرە گرنگ ومەزن د ڤی شەریدا هەبوو، و پشكداری تێدا كرینە، و ڤێ سەركەفتنێ كارتێكرنەكا خراب ل سەر رەوشا خاچهەلگران كر، و زۆربەیا سەركەفتنێن سولتان سەلاحەددینی ب دەست خو ئێخستین دەرئەنجامێ سەركەفتنێن شەرێ حتین بوون[٤٦]، رۆلێ سەركردەیێن مەهرانی د ڤی شەریدا ب شێوەیەكێ بەرچاڤ خویا بوو و شیان دو مەزنە سەركردەیێن خاچهەلگران ئێخسیربكەن، یەك ژوانا شاهـ بوو[٤٧]، ئەڤە بوو پالدەرەك ورەیا وان د شەریدا بلند بیت، دەمێ رێزا شاهان د شەرێن وەسادا د هێنە شكەستن ئەڤە وەرچەرخانەكا ترسناكە د پێڤاژوویا شەراندا و نەخاسمە د پێڤاژوویا شەرێن خاچهەلگراندا[٤٨].

میر عیزەددین درباز كورێ مەمێ مەهرانی، د هێتە هەژمارتن ژ مەزنە سەركردەیێن لەشكەرێ ئەیوبی رۆلێ هەرە بەرچاڤ د ڤی شەریدا هەبوو [٤٩]، ب زیرەكییا خۆ شیا سەروەریەكێ بۆ خۆ توومارکەت و هەتا نها دهێتە بەحسكرن دەمێ شاهەكێ خاچهەلگران ل سەر دەستێن وی هاتییە ئێخسیركرن، بەلێ نە روونییەك د ژێدەراندا دەربارەی دەست نیشانكرنا ناڤێ وی هەیە و دبێژن (الملك جفری)یە[٥٠]، ئێكێ دی د بێژیت ب (كی)[٥١]، یان ژی (كابی)[٥٢]، بەلێ یا دروست ئەوە یێ مێژوونڤیسێن خاچهەلگران گۆتی و ژوانان، ویلیەم سووری ( ٥٨٢مش/١١٨٥ز مرییە)، كو ل دەف شاهـ بلدوینێ چوارێ كاردكر، د بێژیت ناڤێ وی شاهی جای دی لوزینان (٥٨٢ – ٥٨٦مش/ ١١٨٦ – ١١٩٠ز) بوو، شاهێ شاهنشینیا قودسێ (مملكە بیت المقدس) بوو[٥٣]، د خیڤەتا ویدا ل سەر گرێ حتین هاتە گرتن[٥٤]، میر عزەددین درباز ژ سەركردەیێن لەشكەرێن مەیدانیێن مەزن بوو دناڤ لەشكەرێ ئەیوبیدا، و پشكداری د دووڕپێچكرنا هەردو بازێرێن عەكا و یافادا كرییە، و پشتی سولتان سەلاحەددین چوویە بەردلوڤانیا خودێ یێ بەردەوام بوو د تاگیریا خۆدا بۆ كورێن وی.

هەروەسا میر ئیبراهیم غولامێ مەهرانی ژ میرێن مەهرانی كو پشكداری د شەرێ دا كری[٥٥] ، ئێك بوو ژ مەزنە میرێن لەشكەرێ ئەیوبی و كاركرییە د مەیدانێن جیهادێدا دژی خاچهەلگران و شیایە

فەرماندارەکێ مەزنێ خاچهەلگران ئێخسیرکەت، کو د هاتە نیاسین ب بنگەهێ هێزا وان ل رۆژهەلاتی، ئەو ژی رینو دی شاتیون (ئەرنات) خودانێ باژێرێ کەرەك بوو[٥٦]، ئەرنات دوی سەردەمیدا ب مەزنترین دوژمنێن ئیسلامێ دهاتەنیاسین، بزاڤکرینە د لاندکا موسلماناندا درێ خۆ ل وان بدەت و کارێ وێ چەندێ دکر بەرەف هەردو باژێرێن پیرۆز (مەکەهێ و مەدینێ) هێرشێ ببەت و هەردەم ئەڤە د هزرا وی دا بوو، هەروی زۆربەیا رێکەفتنێن خۆ د گەل سولتان سەلاحەددینی شکاندینە، و هێرش برینە سەر کاروانەکێ بازرگانیێ موسلمانان، و سولتانی دو جاران سۆز دابوو کو ئەگەر ئێخسیرکر ب کەتە قوربانی[٥٧].

وەسا دیاردبیت میرێن مەهرانی ب رۆلەکێ کاریگەر و گرنگ د گوهۆرینا رێرەوێ شەرێ دا رابووینە ب تایبەت پشتی کو شیاین مەزنە میرێن خاچهەلگران ئێخسیربکەن[٥٨]، ژ بلی ئەگەرێن دی یێن هاریکار بۆ سەرکەتنا لەشکەرێ ئەیوبی وەك هێز و سەروبەرێ رێکخستنێ لەشکەری و د بەرامبەردا لەشکەرێ خاچهەلگران یێ لاواز و ژێکبەلاڤەبوو[٥٩].

ژێدەرێن سریانی بەحسی سەرکەفتنا موسلمانان ب تایبەت ئێخسیرکرنا سەرکردەیێن خاچهەلگران ژ لایێ مەهرانیاڤە کرییە، و دبێژن ئەڤە مەزنترین شەرمزاری بوو بۆ خاچهەلگران، و رۆلێ گرنگێ مەهرانییان د وێ چەندێدا دیاردبیت کو میرێن ل پشت پرانییا کورێن عەشیرەتێن خۆ بوون و هاندانا وان دکر و وەرەیا وان بلندکر، ئەڤە ژی د وێ هێزێدا دیاردبیت یا مەهرانییان د شەریدا دگەل سەلاحەددینی پشکداری تێدا کری کو میرەکێ مەهرانی ب ناڤێ میر عیزەددین درباس خۆ بگەهینتە خیڤەتا شاە جایێ خاچهەلگر و وی ب ئەسیری بگریت و ب ڤێ چەندێ ژی هەیبەتا شاهێ خاچهەلگران و شانشینا وان بەرامبەری جیهانێ بشکێنیت کو ئەڤ شاهە سەرێ هەرەمێ خاچهەلگران بوو ل رۆژهەلاتی و هەر ئەڤە ژی ب سەرێ ئەرناتێ خودانێ کەرەك ئینان.

ژێدەرێن سریانی ئاماژە ب سەرکەتنێن مەزنێن موسلمانان ل سەر خاچهەلگران ب تایبەت ئێخسیرکرنا مەزنە سەرکردەیێن وان ژ ئالیێ میرێن مەهرانی ڤە کرییە و پەسنا ڤێ چەندێ ب مەزنترین شکاندا روومەتا خاچهەلگران ئەوێن وان دەست ب هێرشان بۆ سەر جیهانا ئیسلامی کری کرییە، رەهاوی ئەلمەجهول د بێژیت فەرەنگ شکەستن و شکەستنەکا مەزن بسەرێ وان هات ((وانكسر الفرنج ومنوا بهزيمة نكراو))[٦٠]، هەروەسا مار میخائیل سریانی دبێژیت: پیسترین شکەستن شکەستن((فانهزموا شر هزيمه))[٦١]، و دەمێ سولتان سەلاحەددینی ئێخسیر دیتین کو مەزنە فەرماندێن خاچهەلگران بوون ژ کەیفادا کرە گری[٦٢]، ژبلی وان هەردو کەسانێن مەزنێن خاچهەلگران، دگەل ئێخسیرکرنا ڤانا گەلەکێن دی ژ مەزن و سەرکردەیێن لەشکەری و مەزنێن باژێرێن خاچهەلگران ب ئێخسیری کەتنە دەست لەشکەرێ ئەیوبی[٦٣]، ئەڤە پالدەرەکێ ب هێز بوو کو ئەیوبی بەردەوامیێ د شەرێن خۆ بدەن.

دەمێ سولتان سەلاحەددین چوویە د قودسێدا میر زیائەددین هەکاری راسپارد هەمی نیشانێن کەنەسی ب نیشانێن موسلمانان ب گوهۆریت[٦٤]، هەروەسا میر زیائەددین هەکاری د گەل سولتانی ل هەیڤا (جمادى الاولى) چوونە د ناڤا باژێرێ عەکادا و کۆمەما مەزنا سەرووەت و سامانی دایێ[٦٥].

هندیکە مەشتوبێ هەکارییە کو دگەل سەلاحەددینی بوو ئاماژە ب ناڤێ وی د شەرێ یێ جمادى الاخره نەهاتییەکرن، بەلێ یا پشکداری دگەل سولتانی کرییە دەمێ دەستێ خۆ ل هەیڤا جمادى یا ئێکێ[٦٦] سالا (٥٨٣مش/١١٨٧ز) دانایە سەر باژێرێ تبنین و ژ دەستێن خاچهەلگران دەرێخستن[٦٧]، هەروەسا د هەمان هەیڤدا دگەل سولتانی پشکداربوو دەمێ دەستێ خو دانایە سەر باژێرێن سەرفەند و صەیدا و ئەرنات ژ باژێرێ صەیدا دەرکەت بوو دەمێ زانی سولتان یێ بەرەڤ ویڤە دچیت، ویلایەتا باژێرێ صەیدا د هەیڤا جەمادی یا ئێکێ ب مەشتوبێ هەکاریرا بەخشی، و پاشان ویلایەتا بەیرووت ژی رادەستی وی کر دەمێ ژ دەستێ

خاچهەلگران دەرێخستی[٦٨].

د ڤی دەمیدا دەنگ و باسێن کومبوون و هاتنا خاچهەلگران بۆ بازێرێ سوور گەهشتنە سولتانی، و شیان بێخنە ژێر کونترۆلا خۆ، و ئێکسەر سولتانی بازێر دووربێچکر و چەندین میر و سەرکردەیێن کورد مینا میر زیائەددین عیسا هەکاری و میر عەلی مەشتوبێ هەکاری دگەلدا پشکداربوون، و هەردوکان سولتان پالدا بەردەوامیێ ب دەتە دووربێچکرنا بازێری، و رێکێ نەدەتە وان کەسێن دگەل ویدا یێن د بێژن دووربێچکرنێ داوی بینن ب تایبەت مەها رەمەزانێ بوو، و هەردەم هانا سولتانی ددان هێرشێ ب کەتە سەر بازێری[٦٩]، بەلێ سولتان نەشیا دەستێ خو ب دانتە سەر بازێری و شکەستن تێدا ئینا[٧٠].

دەمێ بازێرێ سوور دووربێچکرین سولتان گەهشتبوو باوەریێ ڤەکرنا ڤی بازێری نە کارەکێ ئاسانە، چونکی بازێر یێ ئاسێ یە[٧١]، لەورا بەرەف بازێرێ عەسقەلانڤە چوو، ئەڤە ئێکەمین بازێرە ل باشووری هێرشێ د کەنەسەر، ئەڤ بازێرە مەلبەندێ هێرشێن خاچهەلگرانبوو ل سەر مسرێ ژ لایەکی و برینا رێکێ د ناڤبەرا وێ و وەلاتێ شامێدا ژ لایەکێ دووڤە[٧٢]، سولتانی هێز و شیانەکا مەزن ل ڤێرێ مەزاخت[٧٣] و پێڤە وەستیا ژ بەرکو یا ئاسێ بوو و بەرەڤانکەرێن خاچهەلگر رژدی ل سەر خۆراگریێ کرن، و ل رۆژا ئێك شەمبی رێکەفتی ١٦ هەیڤا (جمادی الاول) سالا ٥٨٣مش/ داویا ئوگوستوس ١١٨٧ز دووربێچا بازێری دەستپێکر[٧٤].

کوردێن مەهرانی پشکداری د دووربێچکرنێدا کرن ئەوا ١٤ رۆژان ڤەکێشای، رۆلێ وانێ مەزن و کاریگەربوو، نە تنێ سەرکردە د پشکداربوون، بەلکو هێزەکا مەزنا لەشکەریا عەشیرەتا مەهرانی د دووربێچکرنێدا پشکداربوون، و شیان مەترسییەکا مەزن بێخنە سەر خاچهەلگران ئەڤێن ژ هێزا وان ل دۆر عەسقەلان ترسیاین[٧٥]، ئەو هێزە ب سەرکێشیا میر حوسامەددین ئیبراهیم کورێ حوسینێ مەهرانی بوو، دەستەکێ بالا د تووماركرنا سەرکەفتنێدا هەبوو[٧٦].

میر حوسامەددین مەهرانی و چەندین کەسان ژ عەشیرەتا وی رۆلەکێ مەزن دەمێ دووربێچکرنا بازێری و ئەو شەرێن گرانێن لێ رووداین رووداین هەبوو[٧٧]، ڤی میری خۆ کرە قوربانی و شەهید بوو، ئەصفەهانی ئاماژە ب شەهیدبوونا وی کرییە گۆتییە: (اول امیر افتتح بالشهادة واختتم بالسعادة))[٧٨]، دەرئەنجامی بزاڤ و پلانێن وی یێن بەردەوام بۆ ڤەکرنا بازێری شەهیدبوو، ئەڤە بو ئەگەرێ وێ یەکێ وەرەیا سولتانی و یێن دگەلدا بۆ ڤەکرنا بازێری مەزنتر لێ بهێت ب تایبەت شەرڤانێن عەشیرەتا مەهرانی داکو تۆلا سەرکردێ خۆ ڤەکەن.

بۆ دووربێچکرنا بازێرێ عەسقەلان سولتانی شاهـ جای دی لوزینان وجیرار مەزنێ هێزا داویە ژ دیمەشقێ دگەل خۆدا ئینابوون، و گۆتە وان هەکە هوین بازێری رادەستێ مە بکەن دێ ڤان هەردوکان رادەستی وەکەین، بەلێ خەلکی عەسقەلان ب ڤێ چەندێ رازی نەبوون و هاوارێن شاهێ خۆ پشت گوهـ هاڤێتن، بەرامبەری ڤێ چەندێ سولتان سەلاحەددینی دەست ب کونکرنا دیوارێن بازێری کرن و مەنجەنیق ئامادەکرن، ل ڤی دەمی خاچهەلگرێن دووربێچکری د ناڤ بازێرێ هەست ب مەترسیێ کرن لەورا هەوارا خو گەهاندنە سولتانی و داخوازا خۆ رادەستکرنێ و پاراستنا گیانێ وان ژێ کرن و سەلاحەددین ژی ب مەرجێن وان رازیبوو.

بەری نها مە ئاماژە ب وێ چەندێدا بوو کو سەرکردەکێ مەهرانییان د دەمێ دووربێچا عەسقەلان ب دەستێن خاچهەلگران هاتبوو کوشتن، و ڤێ چەندێ ترسەك د دلێ خاچهەلگراندا پەیداکر کو عەشیرەتا مەهرانی تۆلا خۆ ل وان ڤەکەن ((فخافوا عند مفارقه البلد أن عشيرته يقتلون بثأره))، لەورا وان داخواز ژ سولتانی کرن وان ژ عەشیرەتا مەهرانی ب پاریزن، د ئەنجامدا سولتان سەلاحەددین ل سەر ڤێ چەندێ رازی بوو و هەمی مەرجێن وان پەسەندکرن، و دەمی بازێر ل دەستپێکا هەیڤا (جمادی الآخره) سالا ٥٨٣مش/١١٨٧ز رادەستی سەلاحەددینی کرین ژن و زاروك و سەروەت و سامانێن وان برنە بازێرێ

قودسی[79].

ئەگەر ل دووف رووداني‌ن سالا (٥٨٣مش/١١٨٧ز) دا ب گەرین و ئەو سەرکەفتن و سەروەریێن تێدا هاتینە توومارکرن، دێ بینین شەرڤانێن عەشیرەتێن بەهدینی ژ ستوونێن سەرەکی بوون د ئێکلاکرنا ئەنجامێن شەری د بەرژەوەندیا ئەیوبییاندا، ومەهرانی و هەکاریان نە تنێ ل بەرۆکەکا شەری شەر دکرن، بەلکو ل زۆربەیا بەرۆکێن شەر دژی خاچهەلگران دهاتەکرن ئەو د بەریەلاڤبوون.

## چوار: پشکداریا وان د دووریێچکرنا عەکادا(٥٨٥-٥٨٧مش/ ١١٨٩-١١٩١ز):

عەکا د هێتە هەژمارتن ژ باژێرێن سەرەکییێن هەردو لایەنێن ئەیوبی و خاچهەلگران و گرنگییەکا تایبەت د داینێ دوی دەمیدا یێ شەر دناڤبەرا واندا روویدای، پشتی سولتان سەلاحەددینی ب خورتی ژ دەستێ خاچهەلگران سالا (٥٨٣مـــش/١١٨٧ز) رزگارکری، بۆ ماوەیێ دو سالا ئێمناهی و ئارامی کەتە باژێری بەلێ جارەکادی خاچهەلگران هێزێن خۆ خرڤەکرن و خۆ ئامادەکرن دا باژێری ژ بن دەستێن سولتانی ب دەرێخن و ب کەنە ژێر کونترۆلاخۆ[80]. لەورا سالا (٥٨٥مـــش/١١٨٩ز) وەیا خاچهەلگران بلندبوو ب تایبەت پشتی شاهـ جای دی لوزینان گەهشتییە وان، بەری چەندەکێ بوو سولتان سەلاحەددینی ب مەرج بەردابوو کو شەری دژی وی نەکەت، بەلێ ل سۆزا خۆ لێڤەبوو، و سەرکێشییا لەشکەرێ خاچهەلگرێن باژێرێ سوور کر و بەرەف عەکا ڤە هاتن[81].

لەشکەرێ خاچهەلگران دووریێچکرنەکا توندل دۆر باژێرێ عەکا ئەنجامدا و ڤێ دووریێچێ دوسالان (٥٨٥ – ٥٨٧مش/ ١١٨٩–١١٩١ز) ڤەکێشا و موسلمانان د ناڤا باژێری ب خۆدا بەرگری ژ باژێری دکر، و پشکەکا دی ژ لەشکەرێ ئەیوبی هێزێن خاچهەلگران ئەوێن ل دوور باژێری خرڤەبووین دووریێچکرن، مێژوونڤیسەکێ مێژوویا جیهادێ ل سەر دەمێ سولتان سەلاحەددینی دابەشی دو قۆناغان کرینە کو سالا (٥٨٥مش/١١٨٩ز) دکەڤیتە ناڤا هەردو قۆناغاندا، قۆناغا بەری ڤێ سالێ یا رێکخستن و هێرشان بوو، قۆناغا پشتی وێ قۆناغا بەرخودانێ بوو بەرامبەری وان هێرشان یێن خاچهەلگران دەست پێکرین[82].

شەرڤانێن عەشیرەتێن بەهدینی ژ مەهرانی و هەکاری و حەمیدی د دەمێ دووریێچا عەکادا ل سەر هەردو ئاستان رۆلەکێ کاریگەر هەبوویە، ل سەر ئاستێ ناڤخۆیی بەرگری ژ باژێری دکرن و ل سەر ئاستێ دەرەکی دگەل سولتان سەلاحەددینی بوون دا دووریێچا خاچهەلگران ل سەر بەرۆکێن شەری ب داوی بینن ژ لایەکێدووڤە هێرش دبرنە سەر خاچهەلگران دا بەرۆکا وان لاواز بکەن، و ژمارەکا مەزنا شەرڤانێن ڤان عەشیرەتان پشکداری د شەرەکیدا کرن یێ بناڤێ (المصاف الاعظم) ل سەر عەکا سالا (٥٨٥مش/١١٨٩ز) هاتییەکرن[83]، و چەندین شەرێن دن وەکی شەرێ (نوبه رأس الماء) سالا (٥٨٦مش/١١٩٠ز)[84].

میرێن عەشیرەتێن بەهدینان پشکداری د گەلەك بەرۆکاندا کر، و بەرەڤانی ژ باژێری کرینە و رۆلەکێ بەرچاڤ بۆ بەرسینگگرتنا خاچهەلگران گێراینە، و چەندین کارێن مەترسیدار ئەنجامدانە و زۆربەیا جاران د گەل سولتانی جڤیاینە بۆ دیتنا رێگە چارەیەکێ بۆ دەرێخستنا باژێری ژ ڤێ گرفتارێ، و چەندین پلان و بیسە دانانە و هێرش ب چەندین شێوازان برینە سەر خاچهەلگران، ژ وان دو میرێن برا دناڤ واندا د دیاربوون، ئەو ژی حوسامەددین حوسێن کورێ باریکێ مەهرانی و محەمەد کورێ باریکێ مەهرانی یێ داویێ ب ئێك ژ مێرخاسێن ئیسلامێ د هاتە نیاسین، هەروەسا هەردو میرێن برا عیزەددین درباز کورێ مەمێ مەهرانی و ئەیاز کورێ مەمێ مەهرانی، ئو میر حوسامەددین حوسین کورێ شەرەفەددین عیسایێ جیراحی و ئێك بوویە ژ میرێن کەلا جیراحیە[85]، هەروەسا چەندین میرێن هەکاری، مینا زانا زیائەددین عیسا و مەشتوبێ هەکاری وبرایێ وی جیناحەددین هەکاری ودەرگەڤان (الحاجب) خەلیلێ هەکاری و زەهیرەددین و برایێ وی جەناحودینێ هەکاری[86].

پشتی دووریێچا عەکا بوویە راستییەك

شەرڤانێن بەهدینانی جهێ خۆ د بەرۆکێن بەرگریێ ژ باژێری گرت، و ل هاڤینا سالا (٥٨٥مش/١١٨٩ز) سولتان سەلاحەددین شیا د دەمێ حەفتیەکێدا رێکەکێ بۆ ناڤا باژێری ڤەکەت[٨٧]، بەرامبەر ڤێ یەکێ خاچهەلگران د خۆ نیشادانەکا لەشکەریدا ئینجیل بلندکرن و ئەڤە هەڤریشی- تحرش- یەکا دیاربوو ب موسلمانان، ئەڤێ چەندێ وەکر سولتان سەلاحەددین داخواز ژ لەشکەرێ خو بکەت ئامادەبن بۆ شەری[٨٨]، ئەڤ شەرە ژێدەراندا ب(المصاف الأعظم) یێ بەرنیاسە[٨٩]، و هندەکان ب (الوقعه الكبرى) ناڤکریه[٩٠].

رولێ بەهدینییان د شەریدا ب شێوەیەکێ مەزن دیاربوو دەمێ سولتان سەلاحەددینی لەشکەرێ خۆ ل سەر لایێ نیڤەکێ -دل- و راستێ و چەپی دابەشکرێ و شەرڤانێن عەشیرەتێن بەهدینی دانانە لایێ چەپێ[٩١]، چاکترین و زیرەکترین میرێن وان سەرکێشی دکر، وەك سەیفەددین عەلی کورێ مەشتوبێ هەکاری بوو، ئەڤە ئێك بوو ژ مەزنە میرێن کوردان و پێشەنگێن وان، و میر مجلی کورێ مەروانێ هەکاری[٩٢]، هەروەسا زیائەددین عیسا هەکاری ل پێشیا نیڤەکا-دل- لەشکەری یێ پشکداربوو و ئەڤە داوی شەریوو پشکداری تێدا کری[٩٣]، و کۆمەکا دیا مەزن و میر و سەرکردە و ئەندامێن عەشیرەتێن مەهرانی و هەکاری کو ژێدەران ناڤێن وان نە ئینانە ل سەر پشکێن لەشکەری د دابەشکریبوون ل دووڤ وی هەیکەلێ سەلاحەددینی بۆ لەشکەرێ خۆ دانای[٩٤]، دەربارەی پشکداریا وان دواداری ( ٧٣٦مش/١٣٣٦ز مریبە) بەحسێ مەهرانییان د کەت و ستایشا وان ب ڤی شێوەی د کەت و دبێژیت خەلکەکێ زۆر ژ مەهرانییان پشکداری تێدا کریبە ((فی خلق عظیم من المهرانیه))[٩٥]، تێدا وێنەیەکێ گشتیێ قەبارێ پشکداریا مەهرانییان د ڤی شەرێ مەزندا دیاردکەت.

رۆلێ عەشیرەتێن بەهدینی د دەمێ روودانێن شەریدا دیاربوو، ب تایبەت دەمێ خاچهەلگر شیان بەرۆکا راستێ و ناڤجەرگێ لەشکەرێ ئەیوبی بشکێنن و ب گەهنە د خیڤەتا سولتانیڤە و (تەشتەدار)ێ وی ب کوژن[٩٦]، ل ڤێرێ کوردێن بەهدینی شیان ل رەخێ چەپێ یێ لەشکەری بەرامبەر خاچهەلگران خۆراگرن، کوردێن مەهرانی و میر مەشتوبێ هەکاری ل دوورێن میر موزەفەرەددین گوکبەری خرڤەبوون و مینا سکرەکێ بهێز بەرسنگێ دوژمنی گرتن و پاشتر هێرش برنە سەر لەشکەرێ خاچهەلگران و ژمارەکا زۆر ژێ کوشتن و خوسارەتی ب سەرکەفتنێ گوهارتن[٩٧].

دڤی شەریدا کۆمەکا سەرکردەیێن عەشیرەتێن بەهدینی هاتنە شەهیدکرن و ژوان میرێ دەرگەڤان (الحاجب) خەلیلێ هەکاری و میر موجلی کورێ مەروانێ هەکاری و میر زەهیرەددین برایێ میر عیسا هەکاری کو د هەسپێ خۆدا کەتبوو خواری[٩٨]، مێژوونڤیسەك بەحسێ هەلویستێ زانایێ ئایینی عیسا هەکاری د کەت دەمێ پێشوازیا خەلکی د کری ل بەهیا برایێ خو: من زانا عیسا دیت خەلکێ سەرخۆشیێ لێ دکەن و ئەوێ روونشتی دکەتە کەنی... و یێ دبێژیت ئەڤرو رۆژا خۆشیێ یە نە رۆژا بەهیداریێ یە (لقد رأيت الفقيه عيسى وهو جالس يضحك والناس يعزونه ... ويقول هذا يوم الهناء لا يوم العزاء)[٩٩].

میرێ زانا زیائەددین عیسا هەکاری ل (منزله الخروبه)[١٠٠] ل ٩ هەیڤا (ذی القعده) سالا ٥٨٥مش/١١٨٩ز چوو بەر دلۆڤانییا خودێ و ل دووڤ فەرمانا سولتان سەلاحەددینی ل باژێرێ قودسێ هاتە ڤەشارتن[١٠١]، د ڤی شەریدا رۆلێ مەزنێ عەشیرەتێن هەکاری و مەهرانی و سەرکردەیێن وان د روو ب رووبوونا خاچهەلگراندا بۆ سەر بەرۆکێن موسلمانان ب روونی دیاردبیت[١٠٢].

میر حوسامەددین حوسێن کورێ باریکێ مەهرانی یێ بەرنیاس ب (ابن کردم)[١٠٣]، دگەل سولتان سەلاحەددینی ل ١٣ هەیڤا رەمەزانا سالا٥٨٦مش/١١٩٠ز پشکداری د بەرگریێ ژ دیوارێن باژێرێ عەکادا دژی هێرشێن خاچهەلگران کر[١٠٤]، کۆمەکا دی میر و سەر لەشکەران دگەلدا بوون[١٠٥]، ئەسفەهانی بەحسێ وێ رۆژێ د کەت دەمێ میر

حوسامەددین د گەل کۆمەکا میران هاتینە نێزیکی شویرهێن عەکا و د بێژیت: وێ رۆژێ گەشاتی و زەلالییەك هەبوو وەکی وێ نەبوون (کان لذك الیوم رونق وصفاء لم یشبة رنق)[106]، و شیا ب زیرەکییا خۆ ورەیا (مەعنەویاتان) بۆ لەشکەرێ ئەیوبی ب زڤرینیت، و د گەل هەڤالین خۆ بەرخودان کر و دژە هێرش برنە سەر خاچهەلگران و تەرازییا هێزێ د بەرژەوەندییا ئەیوبییاندا گوهارت، و کۆمەکا دی یا سەرکردەیان مینا میر سەیفەددین غازی و عیزەددین قەیموری دگەل میر حوسامەددین مەهرانی بوون، ئەو شیان سەرکەفتنەکا مەزن ل سەر خاچهەلگراندا توومار بکەن، و هەر کەسێ مەیدانا شەری دیتبا دابێژیت هەر موسلمانەکێ شەرکربیت سێهـ چل، پێنجی یان پتر ژخاچهەلگر کوشتینە![107]، وەك دەربرین ژ خوینگەرمی و جوشوخرۆشا وان د شەریدا ل گەل سولتان سەلاحەددینی.

پشکدارییا میرێن بەهدینی ل ڤێ چەندێ نە راوەستییا، د هەمان سالدا و د دەمێ دووریێچێدا پشکداری د شەرێ (نوبة راس الماء)دا کرن، خاچهەلگر ل 11 شەوال 586مش/1190ز بەرەڤ بیرێن ئاڤێ یێن موسلمانان دروستکرین ل بن گرێ (تل الحجل) هاتن[108]، ژ بەر کو خاچهەلگران هەست ب تێهن و برسەکا مەزن دکرن، دڤی دەمیدا سولتان سەلاحەددینی هەمی لەشکەرێن خو ئاگەهدارکرن د ئامادەبن بۆ شەری، و لەشکەرێ خۆ دابەشی نیڤەك - دل- و لایێن راست و چەپێ کربوون[109]، و شەر ل 12 هەیڤا شەوالێ روویدا[110].

بۆ دووەمین جار سەرکردە و میرێن بەهدینی دانابوونە لایێ چەپێ یی لەشکەری، و ژمارەکا بەرچاڤا میرێن هەکاری وەکی میر سەیفەددین مەشتوبێ هەکاری و میر محەمەد کورێ خۆشترینێ هەکاری پشکداری د ڤی شەریدا کرن، زێدەباری کۆمەکا مەزنا شەرڤانێن عەشیرەتێن مەهرانی و حەمیدی و هەکاری کو زێدەران بەحس نەکرینە[111]، ئیبن شەداد و خودانێ پەرتووکا (دولە الاکراد) گۆتییە هەمی مەهرانییان پشکداری د شەریدا کربوو![112]، ڤی شەری دو رۆژان ڤەکێشا و ژمارەکا مەزنا خاچهەلگران تێدا هاتنەکوشتن[113]، د ڤی شەریدا میر نەسرەددین حەمیدی یەك ژ مەزنە سەرکردەیێن حەمیدی یێن دگەل لەشکەرێ ئەیوبی هاتەشەهیدکرن، ئەو میرەکێ بەرکەتی و خودان رێزەکا مەزن بوو، پشتی د شەریدا برینداربووی وەغەرا داویێ کر[114]، لەورا ئەسفەهانی د بێژیت (مضی حمیدا وشهد مقامه فی الجنه شهیدا وسعی دهره و حتی قضی سعیدا)[115].

میر مەشتوبێ هەکاری ل 16موحەرەما سالا 587مش/1191ز چوو د ناڤ بازێرێ عەکادا، دا شوینا بەرپرسێ لەشکەرێ بازێری ئەبو ئەلهەیجا ئەلسەمین بگریت[116]، مەشتوبێ هەکاری فەرمان دابوو ئەو کەسێن د گەل ویدا چووینە د ناڤا بازێریدا خوارن و ڤەخوارنێ تێرا سالەکێ د گەل خۆدا بینن دا بشێن خۆ ل بەر دوورپێچا خاچهەلگران بگرن، بەلێ گەمییا وانا یا خوارن و ڤەخوارنێ د ئاڤێدا نوقوم بوو[117]، گوهارتنا بەرپرسێ لەشکەرێ بازێری ب ئێك ژ فاکتەرێن لاوازبوونا بەرخودانا موسلمانان ل ناڤ بازێری دهێتەهژمارتن[118]، بەلێ مەشتوبێ هەکاری هەر ژ دەسپێکا هاتنا وی بۆ بازێری ژ دل و ب دلسۆزی کار کر، ل هەیڤا صەفەر بەرسینگێ هێرشەکا مەزنا خاچهەلگران گرت، د ڤێ هێرشێدا پارچەکا شویرها بازێری هەرفاندن، لێ هۆستایێن ئەیوبییان شیان د دەمەکێ کورتدا وێ پارچەیا شویرهێ جارەکا دی ئاڤاکەنەڤە[119]، وەك تۆلڤەکرن ژ ڤی کاری مەشتوب هەکاری هێرشەکا بلەز برە سەر خاچهەلگران و 12 خاچهەلگرێن ژن ئێخسیر کرن[120].

هەڤدەم دگەل دووریێچا بازێرێ عەکا یێ ل سالا (587مش/1191ز)، هەوا سیێ یا خاچهەلگران ب سەرکێشیا شاهێ فەرەنسی فیلیب ئوگوستوس و یێ ئینگلیزی ریچاردێ دلێ شێری (قلب الاسد) گەهشتنە رۆژهەلاتی، و د هەوارا خاچهەلگراندا یێن بازێرێ عەکا دووریێچدای هاتن، دا هاریکارییا وان بکەن و دەست ب سەر بازێرێ قودسێ دا بگرن، کونراد

مونتفراد خودانێ باژێرێ (صۆر) ئەگەرێ سەرەكیێ هاتنا ڤێ شالاوێ بوو ژ بەر كو وی هەوارا خو گەهاندە رۆژئاڤایی داكو خاچهەلگران ژ موسلمانان قورتال بكەن[١٢١]، شاهێ فەرەنسی بەرەف باژێرێ (صۆر) چوو، و شاهێ ئینگلیزی بەرەف باژێرێ عەكا ب رێكەت و ل هەیڤا (جمادی الاول) سالا ٥٨٧مش/ خزیرانا سالا ١١٩١ز گەهشتە باژێرێ عەكا، و ب ڤی شێوازی بەرۆكێ خاچهەلگران بەرامبەر بەرۆكێ ئەیوبی ب هێزكەت[١٢٢]، سەرەرای هەبوونا چەندین ئاریشەیان د ناڤبەرا هەردو شاهاندا لێ هەوێن وانا تەمامكەرێن هەڤدووبوون[١٢٣].

بەرامبەری ڤان پێشهاتێن نوو سەركردەیێن عەشیرەتێن بەهدینی هەمی ئامادەكاریێن خۆكرن دا ل باژێرێ عەكا خرڤەبن و ب رۆل خۆ رابن و ژوانان میرێن مەهرانی، كو دوی دەمیدا د بەرۆكێن شەریدا ل مسرێ و وەلاتێ شامێ د بەر بەلاڤبوون[١٢٤]، و دڤی دەمیدا میر عیزەددین درباز كورێ مەمێ مەهرانی ل دەسپێكا هەیڤا (جمادی الاول) سالا (٥٨٧مش/ ١١٩١ز) گەهشتە باژێرێ عەكا[١٢٥]، زێدەباری هاتنا كۆمەكا دیا هاریكاریێن لەشكەری د هەمان مەهدا ژ مسرێ و دناڤا واندا میر حوسامەددین حوسێن كورێ شەرەفەددینێ عیسایێ جیراحی بوو، و ژ وان كەسان بوو یێ سولتان سەلاحەددینی هەردەم پشتا خۆ پێ گەرمدكر و داخواز دكر د ناڤ كومبوونێن گرنگدا ئامادەبیت، ژ بەركو هێزەكا مەزنا مەهرانییان دبن دەستێن وی بوو[١٢٦].

د ڤان هەمی كەلەژانێن رووداناندا ورەیا میر مەشتوبێ هەكاری و كەسێن د گەل ویدا ل ناڤ باژێرێ عەكا گەلەك كێم بوو، لەورا د كوومبونەكێدا ل داوییا هەیڤا (جمادی الاخره) بریاردان نامەكێ بۆ سولتان سەلاحەددینی فرێكەن و نیازا خۆ تێدا دیاربكەن ئەگەر سولتان نەشیا ڤێ دووریێچێ ل دوور باژێری داوی بینیت خۆ رادەستی خاچهەلگران بكەن[١٢٧]، د هەمان دەمدا میر مەشتوبێ هەكاری دان و ستاندنێن خۆ د گەل خاچهەلگران بۆ خۆرادەستكرنێ دەست پێكرن، ئەو بخۆ بۆ دیتنا شاهێ فەرەنسی فیلیب ئۆگوستوس بەرەف لەشكەرگەهێ خاچهەلگرانڤەچوو، لێ د ئەنجامدا نەگەهشتنە هیچ پێكهاتنەكێ و جارەكا دی زڤری ناڤا باژێرێ عەكا دا بەردەوامیێ ب دەتە شەری[١٢٨]، پشتی زڤریەڤە عەكا و هەلویست بۆ میرێن خۆ ڤەگێرا و شرۆڤەكر و گەلەكا ژ وان میران پشتەڤانییا وی نەكرن كتەكا كێم تێ نەبن و ژوانان برایێ وی میر جیناحەددینێ هەكاری، و ئەڤێن دیتر هەمی د ترسێ وەربوون و ژ پاشەرۆژا خۆ ترسیبان[١٢٩].

بەرامبەری ڤێ چەندێ هێرشێن خاچهەلگران بۆ سەر شویرهێن باژێری زێدەتر لێهاتن و ژمارەكا مەزنا خەلكی د ناڤدا هاتنە كوشتن، ئەڤی كاری لەشكەرگەهێ ئەیوبی هەژاند و گەلەك ژ وانان نەرازیبوونا خۆ بەرامبەری سولتانی دیاركرن ب تایبەت عەشیرەتێن كوردی و چوونە دەڤ سولتانی و گوتنێ: (كیف یكون لاصحابنا مثلك وتضرب فی غدر رقابهم ونحن قعود)[١٣٠].

میرێن بەهدینی د گەل كۆمەكا دیا میرێن كورد كارێ هێرشەكا مەزن كرن و هێرش برە سەر خاچهەلگران و مێژوونڤیسەك ب ناڤێ (المصاف الاعظم بین الاكراد والفرنج) ناڤدكەت، نەخاسمە میرێن مەهرانی ب هێزەكا مەزن پشكداربوون و ئالایێ (سنجەقێ) مەهرانییان بلندكرن[١٣١]، ب تایبەت چەندین میرێن مەهرانی ژدەڤەرێن جودا پشكداری د ڤێ هێرشێدا كرن، مینا میر عیزەددین درباز كورێ مەمێ مەهرانی و میر حوسامەددین جیراحی[١٣٢]، و هەروەسا سنجەڤا میر جیناحەددین هەكاری پشكداربوو ژ بەركو بەرپرسێ وان ب خۆ د ناڤا باژێریدا یێ دووریێچكری بوو[١٣٣] ڤی شەری ل دەسپێكا هەیڤا (جمادی الاخره) سالا( ٥٨٧مش/ ١١٩١ز) روویدا، سەرەرای مەزنی و هێزا ڤێ هێرشێ بەلێ د ئەنجامدا كورد تووشی زیانەكا مەزن بوون و گەلەك كوردێن بەهدینی ل مەیدانا شەری هاتنە كوشتن ((وارمو صناجق المسلمین إلی الخندق وقتل من الآكراد الخلق الكثیر))[١٣٤].

بۆ جارا دووێ میر مەشتوبێ هەكاری و میر

حوسامەددینێ كورێ باریكێ مەهرانی ب مەرەما ئەنجامدانا دانوستاندنان چوونە دەف خاچهەلگران و ل سەر چەند مەرجێن دەسنیشانكری وەك زڤراندنا (صلیب الصلبوت) بۆ خاچهەلگران پێكهاتن[١٣٥]، ل داوییێ خەلكێ باژێری خۆ رادەستی خاچهەلگران كر و ئەڤ نووچەیە گەهاندنە سولتان سەلاحەددینی، و بەرامبەری ڤێ چەندێ داخوازا سلامەتییێ ژ خاچهەلگران كرن[١٣٦]، ل رۆژا ١٧ هەیڤا (جمادی الآخره) سالا ٥٨٧مش/١١٩١ز بەری سولتان سەلاحەددین ل سەر ڤێ رێكەفتنێ رازی بیت خاچهەلگر چوونە د ناڤ باژێرێ عەكادا [١٣٧]، كەتنا باژێرێ عەكا د دەستێن خاچهەلگراندا كارتێكرنەكا نەرێنییا مەزن ل سەر بارودۆخێ موسلمانان هەبوو و ئەڤە بۆ ئەگەرێ لاوازبوونا وان و بەرەڤ بەرگریەكا نەرێنیڤە چوون[١٣٨].

پشتی خاچهەلگران باژێر كونترۆلكری كۆمەكا میر و سەركردەیێن موسلمانان هاتنە ئێخسیركرن و ژوانان میرێن عەشیرەتێن بەهدینی وەك هەردو برا میر حوسامەددین حوسێن كورێ باریكێ مەهرانی و میر محەمەد كورێ باریكێ مەهرانی ئەوێن د ناڤا باژێریدا[١٣٩]، هەروەسا میر مەشتوبێ هەكاری وجیناحەددینێ هەكاری، دەمی د ئێخسیریا خۆدا هەردو میرێن بەهدینی حوسامەددین كورێ باریكێ مەهرانی و میر مەشتوبێ هەكاری، ب راسپاردنا خاچهەلگران رێڤەبەریا دانوستاندنان د ناڤبەرا سولتان سەلاحەددینی و خاچهەلگراندا د كر بۆ جێبەجێكرنا بەندێن رێكەفتنێ[١٤٠].

ژ بەر گرنگییا بۆیەرا ئەنجامدانا دانوستاندنان ئیبن شەدادی ئەڤ دەنگوباسە ب ناڤ و نیشانێ (ذكر خروج أبن باريك) ڤەگێرایە[١٤١]، خاچهەلگران باوەری دانە میرێ مەهرانی[١٤٢]و مەشتوبێ هەكاری كو ژیانا وان دێ یا پاراستی بیت[١٤٣]، نوینەرێن خۆ د گەل واندا فرێكرن، ل رۆژا ئەینی ٩ رەجەب سالا ٥٨٧مش/ ١١٩١ز، بەرەڤ سولتان سەلاحەددینی برێكەتن، دا وی ژ برگەیێن پێكهاتنێ ئاگادارکەن و خۆ پشتراستكەن كا (صليب الصلبوت) ل دەف سولتان سەلاحەددینی یە یان فرێكرییە بەغدا[١٤٤]، دەمێ پشتراست بووین (صليب الصلبوت) ل دەف سولتانییە جارەكا دی هەردو میرێن بەهدینی زڤرینە باژێرێ عەكا ل دەف خاچهەلگران[١٤٥]، وەك وەفاداری بۆ وێ سۆزا خاچهەلگران داییێ كو دێ ب سلامەت بن.

خاڤییەك ل دەف خاچهەلگران د جێبەجێكرنا بەندێن پێكهاتنێ پەیدابوو، ئەڤە بۆ جهێ مەترسیێ و گومانێ ل دەف سولتان سەلاحەددینی، گومانا سولتانی د جهێ خۆدا بوو، ژ بەر كو خاچهەلگران ل ٢٧ هەیڤا رەجەبا سالا ٥٨٧مش/١١٩١ز نێزیكی سێ هزار ئێخسیرێن موسلمانان ژ باژێرێ عەكا دەرێخستن و ل پێش چاڤێن سەلاحەددینی كوشتن[١٤٦].

بەلێ خاچهەلگران مەشتوبێ هەكاری و حوسامەددین كورێ باریكێ مەهرانی نە كوشتن، ئەگەرێ نەكوشتنا حوسامەددینێ ژبەر ترسا خاچهەلگران ژ تۆلڤەكرنا عەشیرەتا مەهرانی دزڤریت داكو خەلەتییا د دەمی دووریێچكرنا باژێرێ عەسقەلان دا رووداى دووبارە نەكەن، و میر حوسامەددینێ مەهرانی هەردەم ل رێكەكێ د گەرییا دا خۆ ژ ئێخسیریێ قورتال كەت لەورا د گەل میر شێركو كورێ باخلێ زەرزاری یێ كوردی پێكهات[١٤٧]، و ئەو ژی یێ ئێخسیركری بوو د ناڤا باژێریدا، پلانەكێ ب دانن دا ب رەڤن تا ل شەڤا ٢١ هەیڤا رەمەزانا سالا ٥٨٧مش/ ١١٩١ز بۆ وان دەلیڤە چێبووی، هەردو میر د بورجەكێ بلندڤە د بەندكری بوون، و میر حوسامەددینی كورێ باریكێ مەهرانی وەریسەك د سەرشوویەكێڤە بەری دەمەكی ڤەشارت بوو، و دگەل شێركوییێ زەرزاری رێكەفت ژ پەنجەرا بەندیخانێڤە ب رەڤن، و پاشان بەرەڤ شویرها ئێكێ یێ كەلایێ هات ب رێكا وی وەریسی، پاشان گەهشتە شویرها دووێ یا كەلا باژێری ئانكو دیوارێ ژ دەرڤە، بەلێ وەریسێ میرحوسامەددینێ مەهرانی قەتییا و ژ دیوارێ كەلایێ كەتە عەردی، و شێركوییێ زەرزاری ئەڤ سوحبەتە بۆ هەڤالێن ڤەگێرایە و ئیبن شەداد ژ زار دەڤێ وی ڤە ڤەدگێریت: (فرأه وقد تغير

من الوقعه فكلمه فلم يجيبه، وحركه فلم يتحرك، فهزه لعله ينشط فيسير معه فلم يقدر، فعلم أنه إذا أقام عنده أخذا جميعا، فتركه، وأنصرف...)) [١٤٨]، و ب ڤی شێوازی میر حوسامەددینی گیانێ خو ژ دەستدا، دەربارەی برایێ وی میر محەمەدی كورێ باریكێ مەهرانی وەسا دیاردبیت ئەو ژی هاتییە شەهیدكرن ژ بەركو ئەسفەهانی و ئیبن شەدادی داخوازا رەحمەتێ بۆ وی كرییە [١٤٩].

هەر دڤێ ڤۆناغێ دا و ل سالا (٥٨٧مش/١١٩١ز) ژێدەر ئاماژە ب ناڤێ میرەكێ دیێ مەهرانی د كەن، كو ب رۆلەكێ مەزن د بەرسینگگرتنا خاچهەلگران رابوویە، ئەوژی میر ئەیاز كورێ مەمێ مەهرانی برایێ میر عیزەددین دریازی، و ئێك بوو ژ میرێن مەزنێنن لەشكەرێ ئەیوبی، و ئەسفەهانی د بێژیت ژ سەركردەیێن مەزنێن تایبەت بوو، و رۆلەكێ مەزن دژی خاچهەلگران گێرایە و هێرش برینە سەر لەشكەرگەهێن وان، ل ١٦هەیڤا شەوال سالا ٥٨٧مش/ ١١٩١ز پشكداری د بیسەیەكێدا كرییە یا سەلاحەددینی ل نهالەكا نێزیكی بازێرێ عەكا كو بۆ لەشكەرێ خاچهەلگران ڤەدای دەمێ بۆ كۆمكرنا گیا و داران دهاتن [١٥٠]، میر ئەیاز كورێ مەمێ مەهرانی د ڤێ بیسێ دا و دەمێ پێكدادان د ناڤبەرا هەردو لایاندا هاتە شەهیدكرن، ل ڤێرە ئەم دشێین بێژین میر خودان وێرەكییەكا مەزن بوو تا هند خۆ نێزیكی سەربازێن خاچهەلگران بكەت، ژ بەركو كۆمەكا كێما موسلمانان دڤێ بیسەیێدا هاتنە شەهیدكرن، لەورا ئیبن شەدادی ناڤونیشانەكێ تایبەت د دەتە ڤی نووچەی دەمێ ڤەدگێریت: ئەو روودانا ئەیازێ مەهرانی تێدا شەهید بووی (واقعه التی استشهد فيها اياز المهرانی قدس الله روحه)، هەروەسا ستایشا شەهیدبوونا وی د كەت و د بێژیت كەسەكێ بەرنیاسێ موسلمانان هاتە كوشتن هەروەسان ئەسفەهانی ئاماژە پێ دكەت: (وسروا فی جنات النعيم بما اليه صاروا)..

خاچهەلگران میر مەشتوبێ هەكاری بەرامبەری (٥٠٠٠٠) دینار ئازادكرن، ل دەسپێكا هەیڤا (جمادی الآخره) سالا (٥٨٨مـــش/١١٩٢ز) گەهشتە دەڤ سولتان سەلاحەددینی وپێشوازییەكا گەرم لێكر [١٥١]، پشتی كەتنا بازێری عەكا بوویە راستی گەلەكا تال و نەخۆشبوو ل دەڤ سولتان سەلاحەددینی، لەورا ل هەیڤا (جمادی الآخره) سالا ٥٨٨مش/١١٩٢ داخواز كر میر و سەركردەیێن نێزیكی وی ل دەڤ وی كۆمبن بۆ دانوستاندنان، دا رێكە چارەكێ بۆ بەرسینگگرتنا خاچهەلگران ل بازێرێ عەكا بینن، هەروەسا نیازا شاهێ ئینگلیزی ریچارد (قلب الاسد) بۆ دەست ب سەرداگرتنا بازێرێ قودسێ بۆ وان بەرچاڤكر، كۆمەكا میر و سەكردەیان ل دەڤ وی ئامادەبوون و د ناڤا واندا میرێن عەشیرەتێن بەهدینی بوون، وەكی میر مەشتوبێ هەكاری و میر حوسامەددین حوسێن جیراحی و مەجدەددین هەكەندەری حەمیدی، و میرێن بەهدینی یێن ئامادە پشتەڤانییا سولتان سەلاحەددینی كرن بو پلانێن وی، ب تایبەت میر مەشتوبێ هەكاری [١٥٢]، بەلێ هەمی هیڤیێن سولتان سەلاحەددینی ژ ناڤچوون د جیهادێدا دەمێ میرێن نێزیكی وی ئامادە نەبووین هاریكارییا وی بكەن و ژ پشتەڤانیكرنا وی پاشكەز بووینەڤە [١٥٣].

## پێنج: رۆلێ بەهدینییان د دوورپێچكرنا یافا و پێكهاتنا رەملە(٥٨٨مش/١١٩٢ز):

سولتان سەلاحەددین دووركەتنا شاهـ ریچاردی ژ بازێرێ یافا ب دەلیڤەزانی، لەورا هێرشەك بەرەڤ وێرێ بر [١٥٤]، پشتی دووریێچێ بۆ دەمەكێ كورت ل ٢٠ هەیڤا رەجەبا ٥٨٨مش/١١٩٢ز هاتنە د ناڤا بازێریدا، بەلێ خاچهەلگران د كەلا بازێریدا بەرگرییەكا توندكرن و موسلمان نە شیان كونترولكەن [١٥٥]، دووریێچا بازێرێ یافا داوی روو ب رووبوونا لەشكەری بوو د ناڤبەرا سولتانی و خاچهەلگراندا [١٥٦].

چەندین میرێن عەشیرەتا مەهرانی دگەل سولتان سەلاحەددینی پشكداری د ڤەكرنا بازێری و دووریێچكرنا كەلا وێ دا كربوون [١٥٧]، ژ وان میران عیزەددین ڕباز كورێ مەمێ مەهرانی، ئەوێ شاهـ جای ل دیلكری [١٥٨]، و میر حوسامەددین حوسێن

جیراحی، ژ وان كەسان بوون یێن پشكداری د هێرشێ و دووریێچا بازێریدا كری[159].

دەمێ ریچاردی ئەڤ دەنگوباسە گولێ بووین، ژ عەكا بەرەف بازێرێ یافا هات دا ژ دەستێن سولتان سەلاحەددینی قورتالكەت[160]، ل رۆژا ٢١ هەیڤا رەجەبا (٥٨٨مش/١١٩٢ز) دەنگێ بوریزانا (بوق)ا خاچپەلگران هاتە بیستن كو یێ د هەوارا بازێری هاتین، سولتان سەلاحەددینی فەرماندا مێژوونڤیس ئیبن شەدادی بچیتە دەف مەلك زاهری (الملك الظاهر) و داخوازێ ژێ ب كەت زێرەڤانیێ ل دەرگەهێ باشووریێ بازێری بكەت، پاشان ئیبن شەداد بەرەف كەلایێڤە چوو د گەل چەندین میرێن دی وەكی عیزەددین ریاز كورێ مەمێ مەهرانی و میر حوسامەددین حوسێن جیراحی[161]، هەروەسا میر جوردیك و عەلەمەددین قەیسەر[162]، دا هێز هێزێن شاهێ بریتانیا ریچاردی نەگەهشتین ئەو خاچپەلگران ژ كەلایێ دەرێخن، بەلێ ژ بەركو كەلا گەلەكا ئاسێ بوو د ڤی كاریدا سەرنەكەفتن هەتا هێزێن د هەوار هاتنێ گەهشتینە وان و ریچارد شیا كەلایێ قورتال بكەت[163]، هەروەسا میر جیناحەددینێ هەكاری پشكداری د دووریێچكرنا بازێریدا كر، و ل سەر وان دەسكەفتان یێن كولەیێن سولتانی ژ بازێری برین دگەل سولتانی كەتە د بگر و ڤەكێشیێدا[164].

هندیكە پێكهاتنا رەملەیە ئەڤا د ناڤبەرا ئەیوبی و خاچپەلگراندا هاتییەمۆركرن، ب مەرەما گرێدانا ڤێ پێكهاتنێ ریچاردێ شاهێ بریتانی میر مەشتوبێ هەكاری هەلبژارد كو ناڤبەینكار بیت د ناڤبەرا وی و سولتان سەلاحەددینی، لەورا ل هەیڤا (جمادی الآخره) سالا ٥٨٨مش/١١٩٢ز شاهێ بریتانی نامەیەك بۆ مەشتوبێ هەكاری هنارت دا ب ڤی كاری رابیت بەلێ ڤێ جارێ یێ سەركەفتی نەبوو[165]، لێ پشتی چەندین دیتن و چاڤپێكەتن و نامە شاندنان د ناڤبەرا هەردو ئالیاندا گەهشتنە پێكهاتنەكێ كو هەتا نها ب پێكهاتنا رەملە یا بەرنیاسە و ل ٢٠هەیڤا شەعبانێ ٥٨٨مش/١١٩٢ز هاتە مۆركرن، ل سەر چەندین مەرجێن دەست نیشانكری پێكهاتن،

د دەمێ گرێدانا ڤێ رێكەفتنێدا چەندین كەس ژ مالباتا سولتان سەلاحەددینی و زێدەباری میر مەشتوبێ هەكاری ئامادەبوون و سووند خوارن[166]، میر مەشتوبێ هەكاری ل ٢٣هەیڤا شەوال سالا ٥٨٨مش/١١٩٢ز ل بازێرێ قودسێ چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ و هەر ل وێرێ ل مالا خۆ هاتە ڤەشارتن[167].

## شەش: رۆلێ وان پشتی مرنا سولتان سەلاحەددینی د جیهادێدا:

بەری سولتان سەلاحەددین ل سالا (٥٨٩مش/١١٩٣ز) ب چیتە بەر دلۆڤانیا خودێ مولكێ خۆ د ناڤبەرا كورێن خۆدا دابەش كربوو، بەلێ پشتی بۆرینا دەمەكێ كورت هەڤركییەكا مەزن سەرا دەسەلاتێ كەتە د ناڤا مالباتا ئەیوبیدا، و كێمەك مابوو دا شەرەكێ سەرانسەری دروستبیت و د ئەگەردا دەولەتا ئەیوبی ژ ناڤبچیت، نەخاسمە هێشتا وانا ململانێیەكا مەزنتر د گەل خاچپەلگران هەبوو و ئەو مەزنترین مەترسی بوون ل سەر موسلمانان ب شێوەیەكێ گشتی و دەولەتا ئەیوبی ب شێوەیەكێ تایبەت[168]، كورێن سولتان سەلاحەددینی، مەلك ئەلئەفزەل نورەددین ئەبولحەسەن عەلی (٥٩٢مش/١١٩٥ز مرییە)، و مەلك ئەلعەزیز عیمادەددین ئەبو لفەتیح (٥٩٥مش/ ١١٩٨ز مرییە)، و مەلك ئەلزاهر غیاسەددین ئەبولفەتح غازی (٦١٣مش/١٢١٦ز مرییە) د ناكۆكییەكا دژواردا بوون[169].

پشتی ڤان روودان و پێشهاتەیێن ترسناك یێن رووی ب رووی دەولەتا ئەیوبی بووین رۆلێ عەشیرەتێن دەڤەرا بەهدینان ژ هەكاری و مەهرانی و حەمیدیان وەك هێزەكا لەشكەریا چەلەنگ و كاریگەر د بەرسینگگرتنا خاچپەلگراندا ل كێمێدا و پیچ پیچ د ڤی كاریدا سستبوون، و رۆل خۆ یێ سەرەكی د رووداناندا ژ دەستدا، و ئەو ژی چوونە د ناڤا وێ ململانێ و ناكۆكیا مالباتا ئەیوبی تووشی بوویێ، وەكی هەمی هێزێن دیترێن كوردی عەشیرەتێن دەڤەرا بەهدینان د ناڤبەرا لایەنێن ناكۆكێن ئەیوبیدا

دابەشبوون، زێدەباری ڤێ چەندێ ب بۆرینا دەمی گۆرانكاریێن دیتر بەرسنگێ پشكداریا بەهدینانیان د مێژووا ئیسلامێدا گرت، ئەو ژی ژدەستدانا پەسنا پشكداریا وان ب هەڤرا د روودانێن سیاسی و لەشكەریدا و ئەو د ناڤبەرا بەرۆكێن جودادا بەلاڤبوون و وانا ئەو بەرهەڤیا بهەڤرا و ب هێز نەما، و پشتی مرنا سولتان سەلاحەددینی ب چەند سالەكان پشكداریا میرێن بەهدینی د رووداناندا گەلەك كێمبوو تا ل داویێ ما ل سەر چەند میرەكان و پشكدارییەكا تاكەكەسی وەسان كو دناڤبەرا رێزكێن ژێدەران ناڤێن هندەك میران ببینن[170]، بەروڤاژی سەردەمێ سولتان سەلاحەددینی[171].

میرێن عەشیرەتێن بەهدینان دگەل كورێن سولتانی مژوولی شەر و ناكۆكیێن ناڤخۆیێن وان بوون تا كەفتنا دەولەتا ئەیوبی سالا (٦٥٢مش/١٢٥٤ز)، ژ وانان ئەسەدەددین كورێ عەبدوللایێ مەهرانی (٦٢٦مش/١٢٢٩ز مرییە)[172]، شەرەفەددین شەروەیێ مەهرانی (٦٤٢مش/١٢٤٢ز مرییە)[173]، و میر عیزەددین درباز كورێ مەمێ مەهرانی (٥٩٥مش/١١٩٩ز مرییە)[174]، و میر حوسامەددین حوسێن جیراحی مەهرانی (٥٩٨مش/١٢٠١ز مرییە)[175]، هەروەسا میر مەجدەددین هەكەندەری حەمیدی[176]، زێدەباری میر سەفەددین توغرولێ مەهرانی[177]، د گەل میران عیمادەددین ئەحمەد كورێ مەشتوبێ هەكاری و عیزەددین كورێ بەدرەددین حەمیدی و عیزەددین كورێ موجلی هەكاری (٦٤٥مش/١٢٤٧ز مرییە) [178]، ئو میرێن حەمیدی سەعدەددین حەمیدی (٦٤٨مش/١٢٥٠ز مرییە)، و ئەسەد عیسا حەمیدی (٦٤٨مش/١٢٥٠ز مرییە) و شەمسەددینێ حەمیدی (٦٤٨مش/ ١٢٥٠ز) مرییە[179]، هەروەسا چەندین میرێن بەهدینی دگەل ئەیوبییان بەرەف وەلاتێ یەمەنێڤە چوون وەكی باخل حەمیدی سالا (٥٩٩مش/١٢٠٢ز)[180].

سەرەرای ئەڤا مە دیاركری هندەك پێزانینێن كێم دەربارەی پشكداریكرنا میرێن عەشیرەتێن بەهدینان د ڤێ قوناغێدا د جیهادێدا دژی خاچهەلگران د ژێدەراندا هەنە، ژوانان میر بەدرەددین محەمەد كورێ ئەبو لقاسم كورێ محەمەدێ هەكاری كو ل باژێرێ (طور) سالا (٦١٤مش/١٢١٧ز)[181]، و د ڤی دەمیدا خاچهەلگران هێرشەك ژ نیشكەكێڤە كرنە سەر باژێری و پشتی شەرەكێ دژوار د ناڤبەرا هەردو لایەناندا میر بەدرەددین هەكاری شەهیدبوو، دەمێ خاچهەلگران باژێر ب جە هێلاین مەلكێ موعەزەم سەرەدانا باژێریكر و ژبەر باشیا وی ل سەر كەلەخێ میر بەدرەددینێ هەكاری كرە گری، كەلەخێ وی هاتە ڤەگوهاستن بو باژێرێ قودسێ و ل وێری هاتە ڤەشارتن[182]، ل جهێ دگۆتنێ مورج سەفەر (مرج الصفر) مەلك موعەزەمێ ئەیوبی ل مەها (ربیع الاول) سالا ٦١٥مش/١٢١٨ز هەوارا خۆ[183]، گەهاندە هەردو میرێن بەهدینی عیمادەددین ئەحمەد كورێ مەشتوبێ هەكاری و عیزەددین كورێ بەدرەددینێ حەمیدی، دا ب لەز د هەوارا باژێرێ دومیات (دمیاط) بهێن دەمێ خاچهەلگران لەشكەرێ خۆ ل وێرێ ئینایە خوار ب مەرەما هێرشكرنێ[184].

كەسێ خێرخواز ئەبو لحەسەن موزەفەر كورێ مەنسووری كورێ ئەبو حەسەنێ كوردی یێ حەمیدی یێ بەرنیاس ب (الاطروش) ل دەڤەرا ئاكرێ ژ دایك بوویە و تێدا هاتییە پەروەردەكرن و گەهشتیە لەشكەرێ ئەیوبی و د گەل سولتان سەلاحەددینی پشكداری د جیهادێدا كرییە و ل سالا (٦٣٣مش/١٢٣٥ز) شەهیدبوویە و ل باژێرێ مێردینێ لەشێ وی هاتییە ڤەگوهاستن بو باژێرێ دونەیسەر[185].

تنێ خودانی پەرتووكا (تاریخ دوله الاكراد) بەحسێ میر سابیقەددین جزریێ مەهرانی كرییە، ئەڤە ئێك بوو ژمیرێن شاه سالح ئیسماعیل (٦٤٧مش/ ١٢٤٩ز مرییە)[186]، ژێدەر چ پێزانینان دەربارەی وی نا ڤەگێرن ب تنێ ئەو نەبیت كو دەمێ باژێرێ تەبەریە (طبریە) دووریێچكرین هاتییە شەهیدكرن[187]، دەمێ پێكۆلا كونكرنا دیوارێ كەلا تەبەریێ دكر و پەردە ل خۆ پێچا بوون، بەلێ خاچهەلگران د گەل كۆمەكا دیا میران ئەو ب شەڤێ سالا (٦٤٥مش/ ١٢٤٧ز) كوشتن[188]، بەلێ ژێدەران د دەمێ ئاماژە ب دووریێچا باژێرێ تەبەریە كری هیچ ئاماژە ب ناڤێ وی نەكرییە[189].

## داوی

دەرئەنجامێ خواندنا مە بۆ ڤان پێزانینان ل سەر رۆلێ عەشیرەتێن دەڤەرا بەهدینان د جیهادێدا د شەرێن خاچهەلگراندا، ئەم دێ گەهینە کۆمەکا دەرئەنجامان و ب ڤی شێوەیێ ل خوارێ دیارکری:

**ئێك:** عەشیرەتێن دەڤەرا بەهدینان د هێنە هەژمارتن ژ عەشیرەتێن گرنگ و دێرینێن کوردان، یێن د هەردو سەردەمێن ئەتابەگی (زەنگی) و ئەیوبی دا ب رەنگەکێ کاریگەر پشکداری د پێڤاژوویا روودانان ل کوردستانێ و وەلاتێ شامێ کری، ژ دەسپێکا سەدسالیا شەشێ مشەختی/ دووازدێ زایینی وەك هێزەکا سیاسی لەشکەری ل باژێر و کەلا و دەڤەرێن لێ دژیان هاتینەنیاسین و سەنگا خۆ دیار کرییە.

**دو:** بەهدینی ژ چەندین عەشیرەتان پێکدهاتن یێن پشکداری د لەشکەرێ ئەیوبی و دگەل سولتان سەلاحەددینی کرین، ژ وانان عەشیرەتێن مەهرانی و حەمیدی و هەکاری، و رۆلەکێ مەزن د جیهادێدا و د بەرسینگگرتنا خاچهەلگران و هێرشێن وان بۆ سەر ئاخا موسلمانان گێڕایە.

**سێ:** میر و سەرکردەیێن بەهدینی دیارترین کەسێن کوردبوون د ناڤا لەشکەرێ ئەیوبیدا، و پشکداری د تووماركرنا سەرکەفتناندا کرینە و ب تایبەت داستانا سەرکەفتنا لەشکەرێ ئەیوبی د شەرێ حتین دا و دو میرێن مەهرانی شیان دو مەزنە سەرکردەیێن خاچهەلگران ئێخسیرکەن ئێك ژ وان شاهـ بوو، و بەهدینییان وەکی تیمەکی د ناڤ لەشکەرێ ئەیوبیدا کاردکر، بەلێ پشتی بۆرینا دەمەکێ کورت ئەڤ خاسلەتە بەرەڤ نەمانێڤە چوو.

**چوار:** سەرەرای هندێ رۆلەکێ کاریگەر د سەر ئاستێ ناڤخۆیدا هەبوو، پشتی سولتان سەلاحەددین چوویە بەردلوڤانیا خودێ، تنێ رۆلێ وان یێ گرێدای بوو د شەر و ناکۆکی و ململانێیا ناڤخۆیی یا مالباتا ئەیوبیدا، و دابەش بوون د ناڤبەرا کورێن سولتانی و برایێن وی بۆ لایەنگرییێ بۆ ڤی و یێ دی ل دووڤ بەرژەوەندیێن خۆ، بەلێ ل سالێن داویێ ژ ژیێ دەولەتا ئەیوبی تنێ ئاماژە ب هندەك میرێن بەهدینی د هێنە کرن.

## ژێدەر و پەراوێز:

١. کاروان عبدالعزیز محمد علي، الکرد المهرانیة دورهم السیاسي والحضاري خلال القرنین ٦-٧هـ/١٢-١٣م، (دهۆك:٢٠١٣)، ص ص ١٩--٥٠.

٢. هلبین رفیق ، الکورد الحمیدیة دورهم السیاسي والحضاري خلال القرون ٣-٨هـ/٩-١٤م (اربیل:٢٠١٢)، ص ١٤ وما ورائها.

٣. زرار صدیق توفیق، القبائل والزعامات الکردیة في العصر الوسیط(اربیل:٢٠٠٧)، ص ص ١٨٣-١٩٣؛ نبز مجید امین، المشطوب الهکاري ودور الهکاریین في الحروب الصلیبیة( اربیل:١٩٩١)، ص ص ٤١-٥٢.

٤. توفیق، القبائل، ص ١٧.

٥. یاقوت الحموي، معجم البلدان (بیروت: ١٩٩٥)، ٣/ ١٥٨؛ ابن الاثیر، الکامل في التاریخ (بیروت: ٢٠٠٧)
٨/ ٧٠٣ - ٧٠٥؛ المقریزي، السلوك لمعرفة دول الملوك (بیروت: ١٩٩٧) ١/ ١٠١ - ١٠٢؛ الخطط المقریزیة (القاهرة:١٩٩٧) ٣/ ١١٢ - ١١٣؛ مرتضی الزبیدي، تاج العروس من جواهر القاموس(د.م:د.س)، ١٠٤/٩؛ عماد الدین خلیل، عماد الدین زنکي (الموصل: ١٩٨٥)،ل ل ١٠١ - ١١٦؛ درویش یوسف حسن الهروري، بلاد هکاري ٩٤٥ - ١٣٣٦م (أربیل: ٢٠٠٥)، ص ص ١١٣ - ١٢٤.

٦. ابن الاثیر، الکامل، ٥٢/٩-٥٤.

٧. ابن الاثیر، التاریخ الباهر في الاتابکیة (القاهرة: ١٩٦٣)،ل ل ١٦٢ - ١٦٣، ١٩٢ - ١٩٣ ؛ ابن شداد، النوادر السلطانیة والمحاسن الیوسفیة (دمشق: ٢٠٠٣)، ص ٣٦٧.

٨. الاصفهاني، الفتح القسي في الفتح القدسي (القاهرة:١٩٦٥) ص ص ١٥٢، ٣١٥؛ ابن الاثیر، الباهر، ص ص ٥٤، ٦٤؛ الکامل،

٥٢/٩-٥٤، ٩/٠/٩ ،٤٢٩، ٧٣/٤؛ أبو شامة، الروضتين في اخبار الدولتين النورية والصلاحية (بيروت: ٢٠٠٢) ، ١/ ١٦٩/٣، ١٩، ٥٢/٤، ٥٤، ٦٥، ٢٠٤؛ ابن واصل، مفرج الكروب في اخبار بني ايوب (القاهرة ١٩٥٣)، ١/ ٥٤ - ٥٩/٥٧،٢، ٦١، ٣٤٣؛ خليل، عماد الدين زنكي، ص ص ٩٦ — ١٠٥.

٩. ابن واصل، مفرج الكروب(القاهرة:١٩٥٣)،٢/ ١٦٣ - ١٧٠.

١٠. بۆ پتر پێزانینان لدور لەشکەرێ ئەیوبی و پێك هاتەیێن وی بنێرە: نظير حسان السعداوي، التاريخ الحربي المصري في عهد صلاح الدين الأيوبي (القاهرة: ١٩٥٧)؛ محسن محمد حسين، الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدين الأيوبي (اربيل: ٢٠٠٣).

١١. ينظرالأصفهاني، الفتح القسي،ل ل ٣٢٨، ٥٥٩؛ ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ص ٢٩٨، ٣٠١، ٣٨٦ - ٣٨٧ ؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد(دهۆك:٢٠١٠) ص ص ١٩٦، ١٧٢، ٢٠٧؛ الدواداري، الدر المطلوب في اخبار بني ايوب (القاهرة: ١٩٧٢)، ص ص ٩٨ ، ١٠٢.

١٢. الأصفهاني، الفتح القسي،ل ل ٣٢٨، ٤٤٢؛ ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ص ١٩٩، ٢٥٦؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ص ١٧١ - ١٧٢، ١٨٤؛ أبو شامة، الروضتين، ٤/ ٥٢، ١٣٢؛ حسين، الجيش، ص ص ٤٤- ٤٦؛ زرار صديق توفيق، چەند لێکولینەوەیەك دەربارەی مێژووی کوردی لە سەدەکانی ناوەراست دا (هەولێر: ٢٠٠٨)،بث بث٧٨ -٧٩.

١٣. هاملتون جب، صلاح الدين الأيوبي (بيروت:١٩٧٣)، ص ١٥٩.

١٤. توفيق، القبائل، ص ١٧٠.

١٥. جوتيار تمر صديق، الكرد القيمرية دورهم العسكري والعمراني خلال القرنين (٧-٨هـ/ ١٣ - ١٤م)، نامەکا ماستەری پێشکێشە بۆ زانکۆیا دهۆك کولیژا ئادابێ (دهۆك: ٢٠٠٩)، ص ص ٨ — ٩.

١٦. الأصفهاني، الفتح القسي،ل ل ٣٢٨، ٥٥٩؛ ابن شداد،النوادر السلطانية ،ل ل ٢٩٨، ٣٠١، ٣٨٦ - ٣٨٧؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ص ١٩٦،١٧٢، ٢٠٧؛ الدواداري، الدر المطلوب، ص ص ٩٨ ، ١٠٢.

١٧. الفتح القسي، ص ٣٢٨.

١٨. حيدر لشكري، الكرد في المعرفة التاريخية الإسلامية (اربيل: ٢٠٠٤)، ص ص ١٩٩- ٢١٤.

١٩. محمود ياسين احمد التكريتي، الأيوبيون في شمال الشام و الجزيرة (بيروت:١٩٨١)، ص ٢٤٢.

٢٠. هلبين رفيق، الكورد الحميدية، ص ص ٨٤-٨٧.

٢١. كاروان عبدالعزيز، الكرد المهرانية، ص ص ٦٧-٩٤.

٢٢. ابن الاثير، الكامل،١٦/١٠، ٧٧؛ ابو شامة، الروضتين، ٦٥/٤؛ ابن خلكان، وفيات الاعيان وانباء ابناء الزمان (بيروت:١٩٧٧)، ٤٩٧/٣-٤٩٨؛ ابن كثير، البداية والنهاية (بيروت:١٩٨٧)، ٣٣٤/١٢.

٢٣. الاصفهاني، الفتح القسي، ص ٣٢٨.

٢٤. ابن الاثير، الكامل، ٧٧/١٠.

٢٥. سبط ابن الجوزي، مراة الزمان(حيدر اباد:١٩٥١)، ٢٩٣/١/٨.

٢٦. سبط ابن الجوزي، مراة الزمان، ٣٤٣/١/٨؛ ابن الاثير، الكامل،٤٢٩/٩؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٥٩/٢.

٢٧. رەملە:باژێرەکێ مەزنە د کەڤیتە فلستینێ نێزیکی باژێرێ یافا، احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم (دمشق:١٩٨٠)، ١٥١/١؛ياقوت الحموي، معجم البلدان، ٦٩/٣؛الحميري، الروض المعطار في خبر الاقطار (بيروت: ١٩٨٠)، ص ٢٥.

٢٨. تل-طرى صافية:دەڤەرەکە سەر ب رەملەڤەیە نێزیکێ بيت جبرين، ياقوت الحموي، معجم البلدان، ٤٢/٢.

٢٩. ابن الاثير، الكامل، ٤٢٨/٩-٤٢٩؛ الذهبي، تاريخ الاسلام (بيروت: ٢٠٠٢)، ٢٢/٤٠؛ سعيد عبد الفتاح عاشور، الحركة الصليبية (القاهرة: ١٩٩٧)، ٧٥٧/٢؛ ستيفن رنيسمان، تاريخ الحروب الصليبية (بيروت: ١٩٦٩)، ٢/ ٦٧٢-٦٧٤.

٣٠. عبدالمنعم ماجد، الناصر صلاح الدين الأيوبي(بيروت: ١٩٦٧)، ص ١٠٦.

٣١. ابن الاثير، الكامل، ٤٢٩/٩؛ ابن شاهنشاه، مضمار الحقائق (القاهرة:١٩٦٨ )، ص١٨؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة في اخبار ملوك مصر والقاهرة (القاهرة:١٩٧٢)، ٢٧/٦.

٣٢. ابن الاثير، الكامل، ٤٢٩/٩؛ ابو شامة، الروضتين، ١٩/٣.

٣٣. الاصفهاني، الفتح القسي، ص ٥٧٩؛ ابن واصل مفرج الكروب، ٢٩٩/٢.
٣٤. ابو شامة، الروضتين، ٤٢٤/٢/١؛ المقريزي، اتعاظ الحنفا (القاهرة: ١٩٩٦)، ٢٧٩/٣.
٣٥. مرج عيون: دەڤەرەكا كناریە دكەڤیتە بیقاعێ لوبنانێ ل سەر دەریا سپی یا ناڤەراست، یاقوت الحموي، معجم البلدان، ١٠١/٥؛ الزركلي، الاعلام (دمشق:٢٠٠٢)، ١٥٣/٣.
٣٦. الاصفهاني، البراق الشامي(عمان:١٩٨٧)، ١٧١/٣؛ ابن الاثير، الكامل، ١١٠/١٠؛ ابن خلكان، وفيات الاعيان،١٩٣/٧؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٧٥/٢-٧٦؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ٣٠٢/١٢-٣٠٣؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ١٣٠/٢.
٣٧. الاصفهاني، البرق الشامي، ١٦٥/٣
٣٨. بو زێدەتر پێزانینان ل سەر ڤێ روویدانێ بنێرە، ابن شاهنشاه الايوبي، مضمار الحقائق وسر الخلائق (القاهرة: ١٩٦٨)، بپ بپ ١٢٦-١٢٩.
٣٩. دگوتنێ مەشتوب ژبەركو برینەك د سەرووچاڤێن ویدابوو، ابو شامة، الروضتين، ٢٠٤/٤؛ ابو شامة، عيون الروضتين في اخبار الدولتين النورية والصلاحية(بيروت:١٩٩٧)، ٣٤٠/٤.
٤٠. بو زێدەتر پێزانینان ل سەر ڤان هەوان بنێرە ، نبز مجيد، المشطوب الهكاري، بپ بپ ١١٧-١٤٣.
٤١. الاصفهاني، البرق الشامي ،٥٣/٣؛ ابن الاثير، الكامل،٤٢٩/٩؛ ابو شامة، الروضتين، ١٨/٤؛سبط ابن الجوزي، مراة الزمان ٣٤٣/١/٨؛ الحنبلي، شفاء القلوب في مناقب بني ايوب(القاهرة:١٩٩٦)، ص ٩٤؛ ابن واصل، مفرج الكروب،٦٤/٢؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ٢٢/٤٠.
٤٢. رعبان: دهێتە هژمارتن ژ شۆرایێن گرنگ د كەڤیتە ناڤبەرا حەلەب و سمیسات نێزیكێ دەریایا فورات و گەلەك گوند ب سەرڤەنە، یاقوت الحموي، معجم البلدان، ٢/ ٢٤٢، ٤٧٤، ٥١/٣.
٤٣. ابن الاثير،الكامل، ٤٤٢/٩؛ابن شاهنشاه، مضمار الحقائق، ص/١٩؛ الحنبلي، شفاء القلوب، ص٩٧؛ ابو شامة، الروضتين، ٩/٢.
٤٤. البنداري، سنا البرق الشامي(بيروت: ١٩٧١)، ص٦٤٣.
٤٥. ابن واصل، مفرج الكروب، ١٩٣/٢؛بو زێدەتر پێزانینان ل سەر شەرێ حتین بنێرە: سهيل زكار، حطين والفتح الصلاحي للقدس (بيروت:٢٠٠٢).
٤٦. سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٨/١/ ٣٩٢.
٤٧. مؤلف مجهول،تاريخ دولة الأكراد، ص ١٤٥.
٤٨. سعيد عبدالفتاح عاشور، مصر والشام في عصر الأيوبيين والمماليك (بيروت:١٩٧٢)، ص٥٢-٥٣؛قاسم عبده قاسم، تاريخ الأيوبيين والمماليك (القاهرة:٢٠٠٧)، ص٥٩-٦٠.
٤٩. سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٨/١/ ٣٩٢؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ١٤٥؛ أبو شامة، الروضتين، ٣/ ١٩٢؛ الذهبي، تاريخ الإسلام حوادث (٥٨١ – ٥٩٠هـ)، ص ٢٠.
٥٠. ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ١٥٥؛ ابن العديم، زبدة حلب في تاريخ حلب (بيروت: ١٩٦٨)، ٨٤٠/٣، جفري هو اسم أخو الملك.
٥١. ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ١٩٤.
٥٢. سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٣٩٣/١/٨؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ل ١٤٥؛ أبو شامة، الروضتين، ١٩٢/٣.
٥٣. وليم الصوري، الحروب الصليبية (مصر: ١٩٩٥)، ٤/ ٣١٨.
٥٤. ابن الاثير، الكامل، ٢٥/١٠.
٥٥. سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٣٩٢/١/٨.
٥٦. سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٣٩٢/١/٨؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ل ١٤٥؛ ابو شامة،الروضتين، ١٩٢/٣؛ السعداوي، التاريخ الحربي، ص١٨٣، سیبت ئیبن جەوزی و ئەبو شامە و زەهەبی ناڤێ وی ب ڤی شێوازی دئینن ب (درباس الكردی).
٥٧. ابن الاثير ،الكامل، ٢٥/١٠؛ ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ١٥٦؛ ابن العديم، زبدة حلب، ٣/ ٨٤٢؛ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ١٩٤؛ ستيفن رينسمان، تاريخ الحروب الصليبية(بيروت:١٩٦٩)، ٢/ ٧٠٦.
٥٨. تاريخ الرهاوي المجهول(بغداد: ١٩٨٦)، ٢/ ٢٢٨.
٥٩. عبدالمنعم ماجد، الناصر صلاح الدين الأيوبي، ص١٤٤-١٤٥.

٦٠. تاريخ الرهاوي المجهول ٢/ ٢٢٨.
٦١. تاريخ مار ميخائيل السرياني الكبير(حلب: ١٩٩٦) ٢/٣٧٠.
٦٢. ابن الاثير، الكامل، ٢٦/١٠؛ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ١٥٧؛ ابن الوردي، تتمة المختصر في تاريخ البشر(تاريخ ابن الوردي) (بيروت: ١٩٩٦)، ٩٢/٢.
٦٣. ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ١٥٥؛الرهاوي، تاريخ الرهاوي المجهول، ص ٢٢٨.
٦٤. ابو شامة ، عيون الروضتين، ٣٤٠/٤؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢٢٩/٢.
٦٥. ابن الاثير، الكامل، ٢٨/١٠؛مؤلف مجهول، تاريح دولة الاكراد، ص ١٤٦.
٦٦. تبنين: دەڤەرەكا چیاییە د كەڤیتە هنداڤی بازێرێ بانیاس ل سوریێ، یاقوت الحموي، معجم البلدان، ١٤/٢.
٦٧. ابن الاثير، الكامل، ٢٩/١٠-٣٠؛ ابن العديم، زبدة الحلب، ٩٧/٣.
٦٨. الاصفهاني، الفتح القسي، ص ١٥٢؛ ابن الاثير، الكامل،٢٩/١٠-٣٠؛ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ٨٠؛ ابن واصل مفرج الكروب، ٢٤٢/٢؛ العليمي، الأنس الجليل في تاريخ القدس والخليل(عمان:د.س)، ٣٤١/١.
٦٩. الاصفهاني، الفتح القسي،ل ل ١٥١-١٥٢؛ ابن الاثير، الكامل، ٢٩/١٠-٣٠؛ سبط ابن الجوزي، مراة الزمان، ٤٠٠/١/٨؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢٠٩/٢، ٢٤٢؛ محسن محمد حسين، الجيش الايوبي، ص ٢٤٩.
٧٠. الاصفهاني، الفتح القسي، ص ١٥٩؛ ابن الاثير، الكامل،٢٨/٩؛ السعداوي، التاريخ الحربي المصري، ص ١٩٨.
٧١. ابن العبري، تاريخ مختصر الدول (بيروت: ١٩٨٣)، ص ٢٢١؛ عبد الله سعيد محمد الغامدي، صلاح الدين والصليبيون (بيروت: ١٩٨٥)، ص ١٩٦.
٧٢. ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ٨٠؛ سعيد عبد الفتاح عاشور، الحركة الصليبية، ٢/ ٨١٧.
٧٣. سعيد عاشور، الحركة الصليبية، ٢/ ٨١٧ – ٨١٨.
٧٤. ابن الاثير، الكامل، ٣٢/١٠؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ٢٠٩.
٧٥. ابن الاثير، الكامل، ٣٣/١٠؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ٢١٠؛ تاريخ ابن الوردي، ٩٥/٢.
٧٦. الأصفهاني، الفتح القسي، ص ١١٣؛ الذهبي، تاريخ الاسلام (حوادث ٥٨١ - ٥٩٠هـ) ص ١٥٥؛ العليمي، الأنس الجليل، ٣٢٧/١، هندەك ژێدەران ناڤێ وی ب ڤی شیوازی دئینن ب (حسام الدين أبن المهراني)؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ل ١٤٨؛ الذهبي، تاريخ الاسلام (حوادث ٥٨١ - ٥٩٠هـ) ص ٢٨، و هندەكێن دی (إبراهيم بن حسين المهراني) الأصفهاني، الفتح القسي، ص ١١٣؛ العليمي، الأنس الجليل، ١/ ٣٢٧.
٧٧. الأصفهاني، البستان الجامع لجميع تواريخ أهل الزمان (الأردن: ٢٠٠٣)، ص ص ٤٢٤ - ٤٢٥.
٧٨. الفتح القسي، ل ١١٣.
٧٩. ابن الاثير، الكامل،٣٢/١٠-٣٣؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ٢٠٩-٢١٠.
٨٠. حسين، الجيش الأيوبي، ص ٢٦٥.
٨١. ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ٢٨٣ – ٢٨٤؛ سعيد عاشور، الحركة الصليبية، ٢/ ٨٥٣.
٨٢. حسين، الجيش، ص ٢٥٦.
٨٣. الاصفهاني، الفتح القسي، ص ٣٠٩؛ ابن الاثير، الكامل،٧٣/١٠؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢٢٩/٢؛ الدواداري، الدر المطلوب، ص.١٠٠.
٨٤. الاصفهاني، الفتح القسي، ص٢٦٢؛ ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ٢٥٦؛ بن واصل، مفرج الكروب، ٣٤٣/٢.
٨٥. ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ص ٢٩٨، ٣٠٠-٣٠١، ٣٤٤ ٣٤٥،٣٦٧؛مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ص ١٩٣، ٢٠٤-٢٠٥، ٢٠٧.
٨٦. ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ص ٢٩٨، ٣٠٠-٣٠١، ٣٤٤ - ٣٤٥،٣٦٧؛مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ص ١٩٣، ٢٠٤ - ٢٠٥، ٢٠٧.
٨٧. الأصفهاني، الفتح القسي، ص ٣٠٠؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ٢٩٣.
٨٨. ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ١٩٩؛ أبو شامة، الروضتين، ٥١/٤- 52.
٨٩. ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ١٩٩؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ١٧٠.

٩٠. ابن واصل، مفرج الكروب (القاهرة: ١٩٧٢)، ٤/ ٥٢.
٩١. مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ١٧١.
٩٢. ذكر مؤلف مجهول في تاريخ دولة الأكراد (الأمير مجلي المهراني)، ص ١٧٣؛إن الاصل هو الأمير مجلي بن مروان الهكاري، الأصفهاني، الفتح القسي، ص ٣٠٩، ومحقق كتاب دولة الأكراد بنفسه صحح الخطأ، ص ١٧٣.
٩٣. الاصفهاني، الفتح القسي، ص ٣٠٩؛ ابن الاثير، الكامل، ٧٣/١٠؛مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ١٧١؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢٩٢/٢-٢٩٥.
٩٤. ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ٢٠٠؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ١٧١؛ أبو شامة، الروضتين، ٥٢/٤؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ٢٩٢.
٩٥. الدر المطلوب، ص ٩٨.
٩٦. تەشتدار(بيت الطشت): پەیڤا (تەست) ب شێوەزارێ ڕەمەکی- سادە، ئەڤە د بنەرەتدا پەیڤەکا عەجەمییە و د بیت کوردی بیت، دەستێن سولتانی یان جلکێن وی تێدا د هاتنە شووشتن، و ئەڤە ژکارێن گرنگ بوون د دەولەتا ئەیوبیدا و ئێك ژ کەسێن نێزیکی سولتانی سەرپەرشتی دکر، القلقشندي، صبح الاعشى (بيروت: ١٩٨٧)، ٩/٤.
٩٧. ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ص ٢٠١ - ٢٠٢؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ص ١٧٢،١٧٤.
٩٨. الاصفهاني، الفتح القسي، ص ٣١٥؛ ابن الاثير، الكامل،٧٣/١٠؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ١٧٣؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ٤٦/٤١.
٩٩. مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ١٧٣؛ ابو شامة، الروضتين، ٥٤/٤؛ ابن واصل مفرج الكروب، ٢٢٩/٢.
١٠٠. منزلة خروبة: خربە ئێك ژ شوراێن کەناریە د کەڤیتە ل سەر دەریا سپیا ناڤەراست نێزیکی باژێرێ عەکا، ياقوت الحموي، معجم البلدان، ٣٦٢/٥.
١٠١. ابن الاثير، الكامل، ٧٧/١٠؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ١٧٤؛ ابو شامة، الروضتين، ٦٥/٤؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢٩٩/٢؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ٣٣٤/١٢؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ١١٠/٦.
١٠٢. نبز مجيد، المشطوب الهكاري، ل ١٨١، كاروان عبدالعزيز، الكرد المهرانية، ص ص ٨٣-٨٤.
١٠٣. ابن كردم — ب رامانا ئەس کورێ کوردامە.
١٠٤. الأصفهاني، الفتح القسي، ص ٤٣٤؛ أبو شامة، الروضتين، ٤/ ٩٦؛ السعداوي، التاريخ الحربي، ص ١٤٣.
١٠٥. أبو شامة، الروضتين، ٤/ ٩٧؛ دريد عبد القادر نوري، سياسة صلاح الدين في مصر والشام والجزيرة (بغداد: ١٩٧٦) ص٣٢٦.
١٠٦. الفتح القسي، ص ٤٣٢.
١٠٧. الدواداري، الدر المطلوب، ل ١٠٢.
١٠٨. تل-طرى الحجل: د کەڤیتە نێزیکێ باژێرێ عەکا، پەراوێزێن پەرتووکا تاريخ دولة الاكراد، ص١٨٣.
١٠٩. الأصفهاني، الفتح القسي، ل ٤٤٢؛ ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ٢٥٦؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ١٨٣؛ أبو شامة، الروضتين، ٤/ ١٣٢.
١١٠. مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ١٨٣.
١١١. الأصفهاني، الفتح القسي، ص٤٤٢؛ أبو شامة، الروضتين، ٤/ ١٣٢؛ابن واصل، مفرج الكروب، ٣٤٣/٢؛ ابن الفرات، تاريخ ابن الفرات (البصرة: ١٩٦٧)، ب٤،ت٢٤٠/١.
١١٢. النوادر السلطانية، ص ٢٥٦؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الاكراد ١٨٤.
١١٣. ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ٢٥٩.
١١٤. ابن واصل، مفرج الكروب، ٣٤٨.
١١٥. الفتح القسي، ص ٤٦٤؛ ابن الاثير، الكامل، ٨٦/١٠-٨٧.
١١٦. بۆ زێدەتر پێزانینان ل دور رۆلێ وی بنێرە :درويش يوسف هروري، ابو الهيجاء السمين ودوره السياسي والعسكري في الدولة الايوبية (٥٥٩-٥٩٤هـ/١١٦٤-١١٩٧م)، گوڤارا زانکۆیا دهۆك، بەرگێ ٣، ژمارە ٢، (كانون الاول:٢٠٠٠).

١١٧. ابن واصل، مفرج الكروب،٣٤٦/٢؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الاكراد ص ١٨٨.
١١٨. نبز مجيد، المشطوب الهكاري، ص ١٩٦.
١١٩. ابن واصل، مفرج الكروب، ٣٤٧/٢؛ مؤلف مجهول،تاريخ دولة الاكراد ١٨٩.
١٢٠. ابن واصل، مفرج الكروب، ٣٤٨/٢.
١٢١. الأصفهاني، الفتح القسي، ص ٤٨٤؛ ارنست باركر، الحروب الصليبية (بيروت:د/س)، ص ٨٦.
١٢٢. الأصفهاني، الفتح القسي، ص ص ٤٩٠ - ٤٩١؛ ابن الاثير ، الكامل،٨١/١٠-٨٣.
١٢٣. ستيفن رنيسمان، تاريخ الحروب الصليبية، ٣/ ٩٧.
١٢٤. أبو شامة، الروضتين، ٤/ ١٤٨ - ١٤٩؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ٣٥٤.
١٢٥. مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ١٩٣.
١٢٦. ابن شداد، النوادر السلطانية، ل ٣٦٧؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الاكراد، ص ٢٠٤؛العليمي، الأنس الجليل، ٤٨/١؛ الحنفي، الحضرة الأنسية في الرحلة القدسية (بيروت: ١٩٩٠) ص ٩٦، هندەك فەكولەر كەتنە د شاشییدا و یا ژوانڤە ئەڤ میرە نۆشدارێ تایبەتێ سولتان سەلاحەددینیە ژ بەر ناسناڤێ وی ب (الجراحي=الجراح) ژ بەر کو وان نە دزانی کەلهەك هەیە ب ناڤێ جیراحیە ل کوردستانێ، ئان ژی دگوتن ژ بنەمالا هەڤالبەند (ابي عبيدة بن الجراح)، كامل جميل العسلي، أجدادنا في ثرى بيت المقدس (عمان: ١٩٨١)، ص ص ١٠١ - ١٠٢؛ معاهد العلم في بيت المقدس، (عمان: ١٩٨١)، ص٣٤٣؛ مؤسسة شهيد فلسطين، الحي الجراحي في القدس، www.shahidpalastin.org
١٢٧. ابن الاثير، الكامل،٩٥/١٠-٩٦؛سبط ابن الجوزي، مراة الزمان، ٤٠٨/١/٨؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٣٥٦/٢؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الاكراد ١٩٦؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ٤٤/٦.
١٢٨. الاصفهاني، الفتح القسي، ص٥٠٥، ابن الاثير، الكامل،٩٦/١٠، ابن واصل، مفرج الكروب، ٣٥٧/٢؛ مؤلف مجهول،تاريخ دولة الاكراد ١٩٤-١٩٥؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ٧١/٤١؛ تاريخ ابن الفرات، ب٢/ث١٦/٢-١٧؛ محمد امين زكي، مشاهير الكرد و كوردستان(القاهرة: ١٩٤٧)، ٨٤/٢؛ الغامدي، صلاح الدين والصليبيون، ص ٢٦٣.
١٢٩. النوادر السلطانية، ص ١٦٨؛ ابن الاثير ،الكامل، ٩٦/١٠؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٣٥٨/٢.
١٣٠. مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ١٩٦.
١٣١. تاريخ دولة الاكراد، ل ١٩٦، سنجق: هێمایەکە د بیت ئالا بیت یان ژی ئامیرەکە ژ سفری چێ دکەن ب رەنگێ زەرە و لێك د دەن و دەنگەکێ تایبەت ژێ دەردکەڤیت، القلقشندي، صبح الأعشى، ٤/ ٨.
١٣٢. ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ٣٦٧؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ١٩٣.
١٣٣. مؤلف مجهول، تاريخ دولة الاكراد، ص ١٩٦، جیناحەددینێ هەکاری چوویە بەردلوڤنیا خودێ سالا ٦٠٥مش/١٢٠٨ز، ابن نظيف الحموي، التاريخ المنصوري (دمشق: ١٩٨١)، ص٥٧.
١٣٤. مؤلف مجهول، تاريخ دولة الاكراد، ص ١٩٦.
١٣٥. الاصفهاني، الفتح القسي، ص ٥١٣؛ ابن الاثير، الكامل، ٩٦/١٠؛ابن العديم، زبدة الحلب، ١١٩/٣-١٢٠؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٣٥٩/٢؛الحنبلي، شفاء القلوب، ص ١٧٠.
١٣٦. الأصفهاني، الفتح القسي، ص ٥١٣؛ ابن الاثير ، الكامل، ٩٥/١٠-٩٧؛ أبو شامة، الروضتين، ٤/ ١٥٢—١٥٤؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ٣٥٨ — ٣٥٩؛ تاريخ ابن الوردي، ١٠٠/٢.
١٣٧. ابن الاثير، الكامل،٩٦/١٠؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ١٩٧؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ٣٥٥- ٣٥٦؛تاريخ ابن الوردي،١٠٠/٢.
١٣٨. محمد علي الصلابي، صلاح الدين الأيوبي (القاهرة: ٢٠٠٨)، ٢/ ٣٤٠.
١٣٩. الأصفهاني، البستان الجامع، ل ٤٣٢؛ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ٢٩٨.
١٤٠. الأصفهاني، الفتح القسي، ص ٤٣٢؛ابن شداد، النوادر السلطانية ، ص٣٠٠ ؛ تاريخ ابن الفرات، ب ٤، ث٢٦/٢.
١٤١. النوادر السلطانية، ص ٣٠٠.

١٤٢. ناڤێ بابێ میر حوسامەددین ب چەندین شێوازان هاتییە، جارەكێ (تازیك)، ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ٣٦٢؛ تاریخ ابن الفرات، مج ٤،ث ٢/ ٢٦، و جارەكی ب ناڤێ (بازیك)، العلیمي، الأنس الجلیل، ١/ ٣٧٦، و جارەكا دی (باریك) و ئەڤە یا دروستە، الأصفهاني، البستان الجامع،ص٤٣٢؛الفتح القسي،ص٥١٣؛ ابن شداد، النوادر السلطانية، ص٢٩٨، ٣٠٠ – ٣٠١.

١٤٣. الأصفهاني، الفتح القسي، ص ٥١٣؛ أبو شامة، الروضتين، ٤/ ١٥٥.

١٤٤. الأصفهاني، الفتح القسي، ص ٥١٣؛ ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ص ٣٠٠ – ٣٠١؛ أبو شامة، الروضتين، ٤/ ١٥٦؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ١٦٣؛ الدواداري، الدر المطلوب، ص ١٠٨؛ تاریخ ابن الفرات،ب ٤،ث ٢/ ٢٦؛العليمي، الأنس الجليل، ١/ ٣٧٦.

١٤٥. ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ٣٠١.

١٤٦. الأصفهاني، الفتح القسي، ل ٥٢٨؛ سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٨/١/ ٤٠٨؛ ابن الاثير، الكامل، ٩٨/١٠؛ ابن العبري، تاريخ مختصر الدول، ل ٢٢٢؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ٣٦٤.

١٤٧. ل دۆر رۆلێ میر باخل و چەندین میرێن دیترێن زەرزاری د شەرێ عەكادا بنێرە: بەهار عباس جبرائیل، كوردە زۆرزارییەكان، نامەیەكی ماستەرە پێشكێشە بە كولیژی زانستە كومەلایەتیەكانی زانكوی كویە كردووە( ٢٠١٠)، بث بث ٦٠-٦٣.

١٤٨. النوادر السلطانية، ص ص٣٣٥- ٣٣٦.

١٤٩. الفتح القسي، ص٤٢٣؛ النوادر السلطانية، ص ٢٩٨.

١٥٠. الفتح القسي، ص ص ٥٥٩؛ ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ص ١٥٥،٣٤٤.

١٥١. الاصفهاني، الفتح القسي ص ٥٨٧؛ ابن خلكان، وفيات الاعيان، ١٨٢/١؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٣٨١/٢؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الاكراد، ص ٢٠٣؛ابو شامة، الروضتين،٢٠٤/٤؛ تاريخ ابن الفرات،ب ٤/ث٦٣/٢.

١٥٢. ابن واصل، مفرج الكروب، ٣٨٣/٢-٣٨٦؛مؤلف مجهول، تاريخ دولة الاكراد، ص ص ٢٠٥-٢٠٧.

١٥٣. الاصفهاني، الفتح القسي، ص ٥٥٨؛ابن واصل، مفرج الكروب، ٣٨٨/٢؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الاكراد، ص ٢٠٧.

١٥٤. ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ٣٩٠.

١٥٥. ابن الاثير، الكامل، ١١٠/١٠-١١١؛ ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ٣٨٦.

١٥٦. انتوني ويست، الحروب الصليبية (بغداد: ١٩٦٧)، ص ص ١٢٧ – ١٢٩.

١٥٧. بو پتر پێزانینان ل دۆر دووریێچكرنا بازێرێ یافا بنێرە: أبو شامة، الروضتين، ٤/ ١٨٢ - ١٨٩؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ٣٩٢ - ٤٠٠؛ ويست، الحروب الصليبية، ص ص ١٢٧ – ١٣٧.

١٥٨. ابن شداد،النوادر السلطانية، ص ٣٨٧؛ أبو شامة، الروضتين، ٤/ ١٨٦؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ٣٩٨؛ تاريخ ابن الفرات، ب٤، ث٢/ ٧٧ ؛ السعداوي، التاريخ الحربي، ص٢٩٤.

١٥٩. مؤلف مجهول، تاريخ دولة الاكراد، ص ٢٠٧.

١٦٠. ابن الاثير، الكامل، ١١٠/١٠؛ ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ٣٨٦.

١٦١. النوادر السلطانية، ص ٣٨٦؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ٢٠٧؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ٣٩٨.

١٦٢. ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ٣٨٧؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ٣٩٨؛ تاريخ ابن الفرات،ب ٤،ث ٢/ ٧٧.

١٦٣. سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان، ٤١٨/١/٨؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٢/ ٣٩٨.

١٦٤. ابن الاثير، الكامل، ١١٠/١٠-١١١.

١٦٥. ابن واصل، مفرج الكروب،٣٩٩/٢.

١٦٦. الاصفهاني، الفتح القسي، ٦٠٥؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الاكراد، ص ٢٠٩؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٤٠٢/٢-٤٠٤؛ الحنبلي، شفاء القلوب، ص ١٧٧؛ تاريخ ابن الفرات،ب٤/ث١٨٣/٢

١٦٧. مؤلف مجهول،تاريخ دولة الاكراد، ص ٢٠٩؛ابو شامة، الروضتين، ٢٠٤/٤-٢٠٥.

١٦٨. ابن الاثير، الكامل، ١٢٠/١٠-١٢١؛ ابن واصل، مفرج الكروب (القاهرة:١٩٥٧)، ٣/ ٣ – ٥؛ قدري قلعجي، صلاح الدين الأيوبي (بيروت: ١٩٩٧)، ص ٣٦١.

١٦٩. بو پتر پێزانینا ل سەر ڤێ ململانێ بنێرە: قاسم ،في تاريخ الأيوبيين والمماليك، ص ص٧٧-٩٩؛ عاشور، مصر والشام، ص

ص٦١-٦٨.
١٧٠. ابن نظيف الحموي، التاريخ المنصوري، ص ص ٩، ٢١؛ تاريخ دولة الاكراد، ص ص ٣٠٠، ٣٢٢، ٣٣١-٣٣٢، ٣٣٩؛ أبو شامة، الروضتين، ٤/ ٢٦٣.
١٧١. ابن شداد، النوادر السلطانية، ص ص ٢٠٠، ٢٥٦؛ مؤلف مجهول،تاريخ دولة الأكراد، ص ص ١٧١، ١٨٤، ١٩٦.
١٧٢. ابن الاثير ، الكامل ،٩/٥٢-٥٤؛ ابن الشعار، قلائد الجمان، ب٤،ث٥/٢٥٠؛ ابن نظيف الحموي، التاريخ المنصوري، ص ص ٤١ – ٤٢؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ٣٠٠.
١٧٣. ابن نظيف الحموي، التاريخ المنصوري، ل ١١٢، ٢٣٥؛ ابن شداد، الاعلاق الخطيرة(دمشق:١٩٩١) ،ج ٢، ق١/٢٥٠؛ النعيمي، الدارس في تاريخ المدارس، (بيروت: ١٩٩٠)، ١/ ٣٥٧؛عبدالقادر بدران، منادمة الإطلال ومسامرة الخيال (دمشق:١٩٨٦)، ص ص ١٥٠، ٢٩٦.
١٧٤. أبو شامة، الروضتين، ٤/ ٢٦٣؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٣/ ٩٧؛تاريخ ابن الفرات، ب ٤، ث٢/ ١١٣.
١٧٥. ابن نظيف الحموي، التاريخ المنصوري، ص ص ٩،٢١.
١٧٦. ابن واصل، مفرج الكروب، ٣/ ٤٧-٤٨؛ أبو شامة، الروضتين، ٤/ ٢٥٠؛ ابن الفرات، تاريخ ابن الفرات،ب ٤،ث ٢/ ١١٤-١١٥.
١٧٧. ابن نظيف الحموي، التاريخ المنصوري، ص ٩؛ ابن العديم، زبدة حلب، ٣/ ٨٩٠؛ أبو شامة، الروضتين، ٤/ ٢٦٣؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٣/ ٩٧، منزر حايك ناڤێ وی ب ڤی شێوازی دبێژیت (طغريل) لێ ژێدەر ب ڤی شیوەی دبێژە، العلاقات الدولية في عصر الحروب الصليبية(دمشق:٢٠٠٦)، ١/ ٩٨.
١٧٨. ابن الاثير، الكامل، ١٠/٣٠٦-٣٠٧، ٣٢٠-٣٢١؛ تاريخ دولة الاكراد، ل ٣٢٢-٣٢٣، ٣٨١-٣٨٢، ٣٩٩، ٤٤٥؛ ابن واصل، مفرج الكروب، ٤/١٦-١٨.
١٧٩. تاريخ دولة الاكراد، ص ٤٩٨؛ المقريزي، السلوك،١/٣١٤، ٣٦٩.
١٨٠. ابن نظيف الحموي، التاريخ المنصوري، ص ٣١.
١٨١. تورچیایەکە دکەڤیتە هنداڤی تەبەریا ل ئوردون و کەلایەکا موکوم تێدایە، ابن شداد، الاعلاق الخطيرة،١/٨٢؛ ياقوت الحموي، معجم البلدان، ٤/٤٧.
١٨٢. ابن شداد، الاعلاق الخطيرة، ١/ ٩٠؛الذهبي، تاريخ الاسلام،٤٤/٢٢٠؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الاكراد، ص ص ٣٠٩-٣١٠؛ ابن كثير، البداية والنهاية ، ١٣/٧٨؛ المقريزي، السلوك، ١/٣٠٨.
١٨٣. مرج الصفر: د كەڤيتە دەوروبەرێ بازێرێ دیمەشقێ، ياقوت الحموي، معجم البلدان، ٥/١٠١.
١٨٤. ابن الاثير، الكامل، ١٠/٣٢٠؛ مؤلف مجهول، تاريخ دولة الاكراد، ص ٣١٣.
١٨٥. المنذري، التكملة لوفيات النقلة (بيروت:١٩٨٨) ٣/٤١٧-٤١٨؛توفيق، القبائل، ص ٨٥؛ دونەیسەر: بازێرەکێ مەزنە، دکەڤیتە نێزیکێ بازێرێ مێردینێ ل کوردستانا باکوور، ياقوت الحموي، معجم البلدان، ٢/٤٧٨.
١٨٦. مؤلف مجهول، تاريخ دولة الأكراد، ص ٤٥٤.
١٨٧. تەبەریە یان تەبەریا: ئەڤ بازێرە د کەڤیتە باکوورێ روژهەلاتێ فلستینێ، ل سەر کنارێ باشوورێ روژئاڤایێ دەریا تەبەریا، سەر ب ئوردونێ ڤە،ياقوت الحموي، معجم البلدان، ٤/١٧.
١٨٨. مؤلف مجهول، تاريخ دولة الاكراد، ص ٤٥٤.
١٨٩. أبو شامة، الروضتين، ٥/ ٢٧٦؛ ابن واصل، مفرج الكروب (القاهرة:١٩٧٣)، ٥/ ٣٧٨؛ أبو الفداء، المختصر، ص٢٨٢.

# پشتەرێبوونا داودێ جوی ل ئامێدیێ ٥٥٦ مش -١١٦٠ز

دەرویش یوسف هروری
وەرگێران: خالد سالح

دیرۆکا هەبوونا جوییان ل وەلاتێ دناڤبەرا دو رووباراندا ڤەدگەریێتەڤە دووماهیا سەدسالیا هەشتێ پێشی زایینی، دەمێ شاهێ ئاشووری سەرجۆنێ دووێ (٧٢١-٧٠٥پ.ز)ی، دەستێ خۆ دانایە سەر باژێرێ (سامیرە)[1] و شاهنشینا جوییان ژ ناڤبری، و دەستەکەك ژ وان ڤەگوهاستنە عیراقێ[2]. ڤەکۆلەرەك ئاماژەیێ ددەتە وێ چەندێ کو پەیدابوونا یەکەم کۆما جوییان ل عیراقێ ڤەدگەریێتەڤە دوماهیا سەدسالیا شەشێ، یان دەستپێکا سەدسالیا حەفتێ پێشی زایینی ، و ئەڤ دیرۆکە یا هاودەمە د گەل دیرۆکا (السبی الاشوری) بۆ کوردستانێ، ل دەور و بەرێن سالا (٦٢٦ پ.ز)، کو ل دووڤ سیاسەتا ئیمبەراتوریەتا ئاشووری، ئەو دیلێن کەتینە ددەست واندا بەلاڤەدکرنە گەلەك جهێن ژێك جوداو دوور و ڤەدەر ژ جڤاکێن مرۆڤان، دا لێك خرڤەنەبن و هەڤبەندی و هەڤسۆزی د گەل کۆمەلگەهێن دی چێنەکەن، و دا نەشێن جارەکادی ڤەگەریێنەڤە جهێن خۆ یێن رەسەن کو ژێ هاتین، وەسان ئاشووریان دیلێن خۆ دوور ئێخستنە ناڤ چیایێن کوردستانێ[3].

ئەڤ جوییێن هاتینە کوردستانێ، شیان هندە گوندێن تایبەت ب وانڤە مینا ئاکنجییێن رەسەنێن دەڤەرێ کو هەمی کوردبوون[4] دروست بکەن، و جوی ل کوردستانێ دبەربەلاڤ بوون و کێم باژێر، یان باژێرك نەبوون ئەگەر جوی لێ نەبان و کێمەکا وان ل گوندان ژی هەبوون[5].

ل دەستپێکێ جوییان ل کوردستانێ کارێ چاندنێ دکرن، و کارێ وان یێ سەرەکی ئەو بوو. هەروەسان د دیار و بەرچاڤبوون ب خودان کرنا تەرش و کەوالی ژی ، و ب ڤێ چەندێ ژێدەرەکێ دراڤی ب دەست خۆ دئێخستن، کو دەبارا ژیانا خۆ پێ ب دەربازبکەن[6].

د سەدسالیا سیێ و چوارێ زایینی دا، و ب هاندانا پاشایێن ساسانی، ناڤەندا ژیانا جوییان پیچ پیچە ژ فەلستینێ هاتە ڤەگوهاستن بۆ عیراقێ و ژمارا جوییان پتر لێ هاتن و سامانێ وان ژی پتر گەشە کر[7].

هەر ژ سەدسالیا حەفتێ زایینی، و ب هاتنا ئیسلامێ و ڤەگرتنێن وێ، دەڤەرێن بەرفرەهـ ژ ئەفریکیا و ئاسیا ئێك گرتن و ژینگەهەکا دەولەمەند ژ لایێن کاری و سامانی و رەوشەنبیریێ و گیانێ

لێ بوورینێ بۆ جوییان پەیداکر. وان ب ڤێ چەندێ مفایەکێ مەزن دیتن و ژمار و گرنگییا وان پتر لێ هات، نە هەر ل عیراقێ ب تنێ، بەلکی ل ئیران و فەلستین و مسرێ ژی[٨].

ل سەدسالییا سیێ مشەختی/ نەهێ زایینی، پتریا جوییێن ل عیراقێ وەکی بویاغچی و مسکەر (سەفار) و گۆشتفرۆش کارکرینە، لێ ل سەدسالییا چوارێ مشەختی/ دەهێ زایینی، ئەڤ رەوشە هاتە گوهارتن و هندەك ژ وان بوونە بازرگان و پارەگوهور، هەروەسان هندەك ژوان بوونە فەرمانبەرێن کارگێری د دەولەتا عەباسیدا[٩]. و پارەگوهۆرێن جوی ل عیراقی رویەکێ باش هەبوو، لەوما مەزنە بەرپرسێن دەولەتا عەباسی پارە ددانانە نك وان[١٠]. ب ڤێ چەندێ جوییان هەر ژ سەدسالییا ئێکێ ژ حوکمێ عەباسییان، ب پلەکا مەزن هەست ب ئاکنجیبوون و ئارامی و گەشەکرنێ کرن[١١].

سەرۆکێ جوییان ل بەغدا ب سەرێ (مشیئە)، یان (سەرێ جالۆتی) د هاتە نیاسین، و وی دەستەلاتەکا مەزن ل سەر هەمی جوییێن عیراق و جەزیرە و یەمەن و ئەرمینیا و جهێن دی هەبوو، و سەرۆکێن جوییان بێی زانینا وی ل ڤان جهان نە دهاتنە دامەزراندن ، سەرۆکێ جالۆتی دەستەلاتێ ب نڤیسینەکێ کو ژ خەلیفەی ئاراستەی وی دکەن وەردگریت و دەستەلاتی ژ وی دهێتە ڤەگوهاستن بۆ نفشێ وی (بالوراثە)[١٢].

جوی ب پلەیێن جودا جودا ل باژێر و باژێرك و گوندێن ئەردێ دەولەتا عەباسی د بەربەلاڤ بوون و ژ وانان دەڤەرێن کوردی و ژ وانان ژی باژێرێ ئامیدیێ، و دەمێ دناڤبەرا سالێن (٥٦١-٥٦٩ مش/ ١١٦٥-١١٧٣ز) گەرۆکێ جوی (بنیامێن التطیلی) سەرەدان بریبە عیراق و دەڤەرا جزیرێ، هندە ژمارێن زندە پێشکێش کرن و گۆت: (نێزیکی بیست و پێنج هزار جوییان ل ئامێدیێ دژین، و د بەربەلاڤن ل سەر پتر ژ جهەکێ)[١٣] .

بنیامێنی پێزانینێن ب مفا ل سەر جوییێن ئامێدیێ پێشکێشکرینە، و دبێژیت ئەو ژ پاشڤەمایێن وان جوییانە یێن شاهێ ئاشۆری (شلمنصر) ئەو ب دیل گرتین[١٤] و ئەو ب زمانێ (الترجوم)[١٥] دناڤ خۆدا د ئاخڤن. و دناڤ وان بخۆدا گەلەك زانایێن مەزن هەنە، وان مینا هەمی جوییێن دەولەتا عەباسی خویك ددانە بسولمانان، و ناڤ و چەندیيا وی دراڤێ جوییان ددا دەولەتێ ژی دەسنیشانکرینە ب (دینار ئەمیری)[١٦]، یان کو دبێتە (مورابتییەك)[١٧]، و سیهێکا (مورابتی) زێر بۆ هەر کەسەکێ ژێ وی گەهشتیبە پازە سالان)[١٨].

هەر چەند ژێدەرێن دیرۆکی یێن هەڤچەرخ دا پالپشتییا وێ چەندێ ناکەن کو ژمارەکا هندا بۆش لێ هەبن، لێ ئەڤ پێزانینێن درێژ کو ل سەر وان هەبن دیار دکەن کو گەلەك جوی لێ هەبووینە، ژ ئەگەرێ گڤاشتنێن رۆمانییان کو جوی نەچارکرین ئێدی نەشیان بەردەوامیێ ب دەنە خواندنێ و بۆ خۆ ل تەناهی و ئازادیێ بگەرێن و ژمارەکا مەزن نەچاربوون بەرێ خۆ دانە ئامێدیێ[١٩] .

## داودێ روحی و پشتەرێبوونا وی :

بەری بچینە د ناڤ بابەتێ پشتەرێبوون و رویدانێن وێ دا، فەرە هندە تشتان ل سەر ژیانا وی یا کەسایەتی و ناڤ و مەزنبوونا وی دا بزانین. تاکە ژێدەرێ ناڤێ وی تێدا هاتی (السموؤل المغربی) یە، کو دبێژیت ئەو (مەناحیم کورێ سلێمانی) یە، یێ ناسیار ب (أبن الروحی)[٢٠]، ل جهەکێ دەوروبەرێن ئامێدیێ ب ناڤێ (شفتون)[٢١] کو هینگێ یا پری جوی بوو هاتییە سەر دونیایێ، لێ جهێ وێ نەهاتییە نیاسین[٢٢]ژ دایکبوویە، و دبێژیت ئەو یێ ل دەڤەرێن دەوروبەرێن مووسل[٢٣]مەزن بووی. پاش یێ هاتییە هنارتن بۆ بەغدا، دا ل سەردەستێ سەرۆکێ جالوتی (جسدي) زانستان بخوینیت[٢٤]. دیسان وانێن عەرەبیێ دگۆتن، کو هاتییە گۆتن وی داهێنان د زمان و ئەدەبێ مسولمانا دا کرییە(٢٥). دیسان شەهرەزایی د هۆنەرێ سێربەندی و (شعوذە) دا هەبوو[٢٦]. و هاتییە سالۆخدان کو یێ خشکۆك بوو، و رەنگێ وی سەر ب سۆری ڤەبوو [٢٧] .

دیرۆکنڤیسەکێ مینا (ئبن ئەلئەسیر) کو

هەڤچەرخێ وی بوویە، چ ل سەر ڤێ پشتەرێبوونێ نە نڤیسییە، هەر دیسان ئەو ژێدەرێن ل سەر ڤێ چەندێ ئاخفتین ژی د هەڤدژ و نە درێك و پێكن و پێزانینێن كێم ل سەر هەنە. ژ بەر ڤێ چەندێ ئەو جهێ جوگرافیێ كو چریسكا ڤێ فتنێ لێ سەرهلدای یێ بەرزەیە، لەوما ئەم ژی دێ ڤێ پشتەرێبوونێ ژ گەرۆكێ جوی بنیامین التطیلی ڤەگێرین، وەكی چەوان د پەرتۆكا (بذل المجهود فی افحام الیهود للسموأل المغربي) دا هاتی.

التطیلی، كو هەڤچەرخێ رویدانان و كەسەكێ نێزیكی وی بۆ دبێژیت: ل دەستپێكی ئاسێبوونا خۆ ل سەر شاهێ عەجەم راگەهاند – وەسان دیارە مەبەستا وی ژێ حاكمێ مووسل (الاتابك قطب الدین مودود (٥٤٤- ٥٦٥ مش/ ١١٤٩- ١١٦٩ز) بوویە - و ئەو جویێن ئاكنجییێن چیاییێن حبتون (ئەو دەڤەرا چیایی كو دكەڤیتە د ناڤبەرا زێیێ مەزن هەتا باشووری ئامێدیێ دا)* ل دۆر خۆ خرڤە كرن و دەست ب بەلاڤكرنا داخوازناما خۆ دناڤ جویان دا كر ب و ئەو پشتراستكرن وەكی وی دگۆت، كو خودێ مزگینییا ڤەكرنا قودسێ و رزگاركرنا وان ژ دەستێن مسولمانان و زالبوونا وان ل سەر جویان یا دایە وی. وان ژی باوەری پێ هینان و وەسان هزر كرن كو ئەڤە ئەو مەسیحە یێ ئەو چاڤەرێ دكەن. دەمێ دەنگ و باسێن پشتەرێبوونا وی گەهشتییە گوهێن سولتانێ سەلجوقی، كێشە مەزن بوو و هنارتە دووڤ وی را، ئەو ژی ل دووڤ داخوازییا وی چوو، و هاتەگرتن، لێ ئەو شیا ب رەڤیت، و دەمێ گەهشتیە ئامێدیێ ، چیرۆكا خۆ بۆ مریدێن خۆ گۆت. و سولتان ژی پەیامەك بۆ خەلیفەی - المقتفی لامر الله (٥٣٠- ٥٥٥ مش)هنارت و ئەو ل سەر داوی ئاگەهدار كر و داخواز ژێ كر كو ئەو زانایێن جوی بكەنە ناڤبژیوان كو كارتێكرنێ ل دەستەلاتا داوی بكەن، ئەگەر دێ فەرمانا تۆلڤەكرنێ ژ هەمی جویێن دەولەتا عەباسی كەت. لێ سەرۆكێ جویان نەشیا داوی ل دەستدرێژیێن وی یێن خراب رازی بكەت بێتە خوار و ئەنجام نەدەت. پشتی وەلی زین عەلی كچك كو ژ مریدێن شاهێ عەجەم بوو (جێنشینیا ئەتابكیا ل مووسل ٥٣٩- ٥٦٣مش گرتییە دەست)، تەپكەك بۆ داوی دانا كو بێخیتێ، ئەو ژی داخواز ژ زێرەڤانێ وی كر كو دەهـ هزار دیناران بدەتێ ئەگەر شیا وی ب كوژیت. زێرەڤانێ وی ژی چوو ژوور و ئەو ل سەر جهێن وی كوشت و فەرمانا وی ب دووماهی هات[28].

لێ (السموأل المغربي) كو كەسەكێ نێزیكی رویدانان بوو و ل سالا (٥٧٠مش/ ١١٧٤ز) وەغەر كرییە ب ڤی رەنگی ڤەدگێریت :

ئەو ژ وان جویێن ئاكنجییێن وێ دەڤەرا ناسیار ب (عمادیە- ئامێدیێ) سەر ب مووسل ڤەیە ، و هەڤالێ میرێ كەلا ئامێدیێ بوو، و میری گەلەك حەز ژێ دكر، ژ بەر كو باوەرییەكا باش پێ هەبوو، چونكی ژ زەلامێن جویێن دیندار بوو و میری بزاڤدكرن كو سەرەدانا وی بكەت، لێ تەمەعیا داوی چوو كەلێ و ڤیا ژێ بستینت و وی وەسان هزر د كر كو ئەو ل ئامێدیێ یێ لاوازە، و دەمێ كەلێ ژێ دستینت، دێ ڤێ ئاسێكەهێ پاریزیت، و ژ بۆ ڤێ چەندێ نڤیسین بۆ جویێن ئاكنجییێن ئازەربێجان و دەڤەرێن چیاییێن سەر ب ئامێدێ ڤە هنارتن و دنڤیسینێن وی دا هاتبوو كو ئەو دێ بزاڤەكێ دژی دەستدرێژیێن حوكمدارێن موسلمانان بۆ سەر جویان كەت، و داخواز ژ وان د كەت كو هەر ئێك ژ وان رەنگە چەكەكی ب نهێنی دگەل خۆ بینت و بهێنە ئامێدیێ، و ئەو ژی ل دووڤ بەرسڤا وی هاتن، و میرێ كەلێ وەسان هزر دكر كو ئەڤ جویێن هاتینە ئامێدیێ، ژ بۆ سەرەدانا الحبر(داوی) هاتینە، لێ ژ سەروبەرێ ئنیەتا ئەوی (جوی) بۆ میری دیار بوو، لێ ژ بەر دلۆڤانیا میری و ژ بۆ ژ نە رێشتنا خوینی، داوێ خودانێ فتنێ ب تنێ هاتە كوشتن، و دووڤەلانكێن وی یێن دی رەڤین و وەستیان و دووراندن و ژاری ب وان ما[29] .

هەڤبەركرن و بەراووردكرنا پێزانینێن ڤێ پشتەرێبوونێ د هەردو ژێدەران دا ئەم د گەهینە ڤی ئەنجامی:

**یەكەم**: وەسان دیارە ئەڤ فتنەیە ژ ئەنجامێ وێ ئازادییا جویان ل دەڤەرا ئامێدیێ و دەور و بەرێن

وێ دەمێ حوكمدارییا جێنشینێن ئەتابكیا ل مووسل ڤە هەی هاتە ئەنجام دان(٣٠).

**دووەم**: داودی ب ڤێ كریارا خۆ ئارمانجەكا كەسایەتی هەبوو، دڤیا دەستەلاتێ ل ڤێ كەلا ئاسێ بگریتە دەست و هەبوونا زۆرا جوییان ل دەڤەرێ ب دەلیڤە دیت كو وێ كریارێ ئەنجام بدەت[٣١].

**سێیەم**-: داود ب ڤێ پشتەرێبوونێ و وان درویشمێن مەزنێن وی هلگرتین كو دێ وان ڤەگەرینتەڤە ئورشەلیم، شیا جوییان راكێشیتە نك خۆڤە[٣٢].

هەرچەند ئەڤ پشتەرێبوونە شكەست و خودانێ وێ هاتە كوشتن، لێ كارتێكرنێن وێ ل سەر گشت جوییان و ب تایبەت یێن ئامێدیێ هەر مابوون، و بۆ ڤێ چەندێ (السمؤل المغربي) ل سەر دبێژیت:

(ئەو - واتە جوییێن ئامێدیێ - هەتا نها - واتە دەمێ سموئێلی - وی ژ پێغەمبەران پێشتر د ئێخن و هندەك وەسان هزر دكەن كو ئەو بخۆ ئەو مەسیحە یێ ئەو چاڤەرێ دكەن ... و هەر ل ڤێ دەڤەرێ هندەك ل سەر ئایینەكی هەنە ڤەدگەریننەڤە مناحیمێ خاپینەر )[٣٣].

## ژێدەر و پەراوێز:


١. سامیرة (السامرة)باژێرەكە، جهێ وێ نها ب سبطیە كو ناڤەكێ یونانییە ژ سیبستون هاتییە وەرگرتن، ب (المبجل) دهێتە نیاسین، ل سەر ناسناڤێ ئیمبراتۆرێ رۆمانی (اوغسطس) و (هیرودێ مەزن ) پشتی ل سالا (٢٧ پ . ز) ئاڤاكرییەڤە ئەڤ ناڤە دانایەسەر. بنێرە :طة باقر : مقدمة الحضارات القدیمة ، (بغداد : ١٩٥٦) ، ج ٢ ، ص٢٩٢ .

٢. جعفر حسین خصباك ، العراق فی عهد المغول الایلخانیین ، (بغداد : ١٩٦٨) ، ص ١٩٧

٣. یعقوب یوسف كوریة ، یهود العراق ، (عمان : ١٩٩٨) ، ص ٦

٤. هەمان ژێدەر .

٥. عبدالرقیب یوسف ، الدولة الدوستكیة فی كردستان الوسطی ، (اربیل : ٢٠٠١) ، ج ٢ ، ص ١٤٣ .

٦. كوریة : یهود العراق ، ص٦ .

٧. خصباك ، العراق فی عهد المغول ، ص ١٩٧ .

٨. هەمان ژێدەر .

٩. عبدالعزیز الدوری ، تاریخ العراق الاقتصادی .

١٠. یوسف رزق اللة غنیمة ، نزهة المشتاق فی تاریخ یهود العراق ، (بغداد : ١٩٢٤) ، ص ١٣٥ .

١١. خصباك ، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٩٨ .

١٢. هەمان ژێدەر ، بپ ٢٠٠

١٣. رحله بنیامین ، ترجمه عزرا حداد ، (بغداد : ١٩٤٥) ، ص ١٥٤ .

١٤. شلمنصر : وەسان دیارە كو مەبەست ژڤی شاهی ، شلمنصرێ پێنجێ یە، كو حوكم د ناڤبەرا سالێن (٧٢٦- ٧٢٢ پ .ز) كری، چونكی وی سەركێشییا هێرشەكێ دژی شاهنشینا ئسرائیلی كربوو و شاهێ وان (هوشع) ژ دەستەلاتێ ئینابوو خوار و بۆ دەمێ سێ سالان باژێرێ (سامیرة) دوورپێچكربوو. بنێرە : طه باقر ، مقدمة فی تاریخ الحضارات القدیمة، (بغداد : ١٩٧٣)، ج ١، ص ٥١٠- ٥١١ .

١٥. الترجوم : زمانێ ئارامێ رۆژهەلاتییە ، و هەر ئەو زاراڤە یێ عیسا سلاڤێن خودێ ل سەر بن پێ د ئاخفت و ب (الترجوم) د هاتە نیاسین. بنێرە: كوریة، یهود العراق، ص٦ .

١٦. دینارا ئەمیری : مەبەست ژێ ئەو دینارە كو ل سالا (٤٦٢مش) ل بەغدا ، ل سەر دەمێ (القادر باللە ) هاتییەچێكرن، ئەمیری

ل سەر ناسناڤێ جێنشینێ وی (ئەمیر کورێ خەلیفەی ) یێ ناسیار ب (الغالب باللة) ل سالا (٣٩١ مش) ێ. بنێرە : عباس عزاوی ، تاریخ النقود العراقیة، (بغداد: ١٩٥٨)، ص ٢٢١ .

٧. مرابطی : دراڤەکێ ئیسپانییە ، مرابطی یەکەم کەس بوون دروست کرین، و مرابطی یێ زێر بەرامبەری (١٤ شلنانە) ب دەراڤێ

ئینگلیزی و مرابگی یێ سفری (مس)، بەرامبەر دو فلسێن عیراقییە. بنێرە: عزاوی، تاریخ النقود، ص ٢٠٩ .

١٨. رحلة بنیامین، ص ١٥٤

١٩. محمد جاسم حمادی، الجزیرة الفراتیة والموصل ، (بغداد ، ١٩٧٧) ، ص ١٩٧ .

٢٠. بذل المجهود فی افحام الیهود ، قدم لة محمد الشامی، (القاهرة : ١٩٦٢) ، ص ٦٥ .

٢١. شفتون: جهێ وێ نەهاتییە نیاسین، دبیت مەبەستا ڤەکۆلەری (حبتون) بیت و (حبتون) جهێ وێ د ناڤ بابەتی دا یێ هاتییە دەست نیشان کرن .

٢٢. غنیمة، نزهة المشتاق، ص ١٢٤ .

٢٣. المغربی، بذل المجهود، ص ٦٥ .

٢٤. التطیلی، رحلة بنیامین، ص ١٥٤ ، غنیمة ، نزهة المشتاق ، ص ١٢٤ .

٢٥. التطیلی، رحلة بنیامین، ص ١٥٤ .

٢٦. غنیمة، نزهة المشتاق، ص ١٢٤ .

٢٧. المغربی، بذل المجهود، ص ٦٥ .

*. بنێرە: احمد الصفوی ، خطط الموصل، (الموصل : ١٩٥٣)، ج٢ ، ص ٧٤ .

٢٨. رحلة بنیامین، ص ١٥٥- ١٥٧ .

٢٩. بذل المجهود، ص ٦٥- ٦٦ .

٣٠. غنیمة ، نزهة المشتاق، ص ١٢٣ .

٣١. التطیلی، رحلة بنیامین، ص ١٥٤ .

٣٢. غنیمة، هەمان ژێدەرێ بەرێ، بث ١٢٤ .

٣٣. المغربی، بذل المجهود، ص ٦٦ .

# ژیانا جڤاكی ل دەڤەرا بەهدینان ل چەرخێن ئیسلامی یێن داویێ

(٧ - ٩مش/١٣ - ١٥ز)

پ. د. فائیزە محەمەد عیزەت
زانكۆیا دهۆك-كۆلیژا زانستێن مرۆڤایەتی
وەرگێران: موسلیح حەمزە

## ئێك: پێكهاتا ئاكنجییان:

پێكهاتا ئاكنجییان ل دەڤەرا بەهدینان ژلایێ نەتەوەیی و ئایینی ڤە جۆراو جۆرە، كورد ب هەمی عەشیرەتێن خۆ ڤە پێكهاتا سەرەكی بووینە تێدا.

عەشیرەتا (حەمیدی) ئەوا ئاكرێ بۆ خۆ كریبە بنگەهێ سەرەكی ناڤدارترین عەشیرەتێن كوردی یە، تاكو ناڤێ ئاكرێ ژی بناڤێ وێ ڤە هاتییە گرێدان لەوا هاتییە نیاسین ب(ئاكرێ یاحەمیدی)[1]. زێدەباری ئاكرێ یا حەمیدی هندەك كەلایێن دیتر هەبووینە وەك شۆشێ یا ناڤدار[2]، و هندەك باژێرك وگوندێن دیتر وەك جوجر، عومرانیێ، غەیزە، خلبتا، وهندەكێن دیتر[3].

حەمیدی ل سەر چەند ئویجاخەكا دابەشبووینە و مازنجانی ئێك ژ وان ئویجاخان بوویە[4]، ب رۆلەكێ گرنگ رابوو هەر ژ داوییا سەردەمێ عەباسی و ل سەردەمێ مەغۆلیان، بەلێ ب بەرفرەهبوون و مەزنبوونا دەستەلاتا عەشیرەتا زێباریا[5]. ل داوییا سەردەمێ مەغۆلیێن ئێلخانی دەستەلاتا وان نامینیت و دەستەلاتا زێباریا سەر ب مولك و كەلایێن وان وەك ئاكرێ وشۆش و عومران و بازێران(بارزان)دا گرت[6].

ژ هۆزین دیتر یێن دەڤەرا بەهدینان عەشیرەتا هەكاریبە، ل ئامێدیێ ئاكنجی بووینە زێدەباری جهێ وان یێ سەرەكی ل دەڤەرا هەكاری و جولەمێرگ وكەلا هارۆن[7]. ئیبن فەزلوللا ئەلعومەری دیاردكەت كو كوردێن (نستبكی) ل قومرانیێ و شكەفتا داوود ل دەڤەرا ئاكرێ هەبووینە[8]. زێدەباری هەبوونا هندەك ئویجاخێن كورد ئەوێن باوەری ب ئێزدیاتیێ ئینایین وەك (داسنی) كو ل دەڤەرێن چیایی ل باكووری مووسل دئاكنجی بوون[9]، كو پێكدهێت ژ زنجیرێن چیایی ئەوێن دناڤبەرا شێخان و ئەترویشێ و تا دهۆكێ، و عەشیرەتا دونبەلی ژی ل رەخ و روبێن مووسل ل

چیایێ مەقلوب وموختار د ئاكنجی بوون[١٠]، زێدەباری باوەریا دونبەلیا ب ئایینێ ئێزدییان بەلێ هندەك ژوان موسلمان بوون ل سەر ئاینزایێ سوننی[١١].

گەلەك بۆچوون سەبارەت جهێ رەسەن یێ دونبەلیا هەنە، بەدلیسی ل دۆر ئەڤێ چەندێ دو بۆچوونا بەرچاڤ دكەت، یا ئێكێ دبێژیت ئەو ژ وان عەرەبانە ئەوێن ژ شامێ هاتین و كۆچبەربووین، بەلێ ئەو بۆچوونا دبێژیت كو ئەڤ هۆزە یێن ژ ویلایەتا (بەختی - بۆتان) ب (دونبەلی بخت - دونبەلێن بۆتانی) هاتینە نیاسین ب راست تر دزانیت[١٢]، هەر چەوا بیت دونبەلی زێدەباری ئاكنجیبوونا وان ل دەڤەرا بەهدینان لێ ل هندەك جهێن دیتر یێن بەربەلاڤ و دویر ژ ئێك ئاكنجی بووینە لەوا ئەڤێ چەندێ ئەلعومەری پالدایە و سالۆخەت داینە و دبێژیت (د بەربەلاڤن ل وەلاتی و بژالەنە د هەموو نهالان دا)[١٣].

ژ عەشیرەتێن دیتر یێن كوردی عەشیرەتا سندی یە ئەوا ل زاخۆ و ل دەڤەرێن رەخ و رویێن وێ د ئاكنجی[١٤]، و وەسا دیارە كو عەشیرەتا سندی جهێ عەشیرەتا مەهرانی یا بەرنیاس گرتییە، عەشیرەتا مەهرانی د ماوێ سەدسالییا پێنجێ و شەشێ مشەختی/ یازدێ و دووازدێ زایینی باندۆرەك گرنگ و رۆلەكێ سیاسیێ بەرچاڤ ل دەڤەرێ هەبوو، بەلێ پشتی زۆربەی میرێن مەهرانییا دگەل چەكدارێن خۆ گەهشتینە ریزێن لەشكەرێ ئەیوبی ل مسرێ و شامی رۆلێ وێ نا مینیت[١٥].

سندی بووینە یەك ژ ناڤدارترین عەشیرەتێن كورد كو ب هژمارا خۆ یا زۆر دیار و ناڤدار بوون، و ئەلعومەری د پەسنا واندا دبێژیت (ژمارا وان دناڤ مللەتێ وان دا ژ هەمیا پترن و شیانێن وان ژێ بەرفرەهترن كو دگەهنە سیهـ هزار چەكداران[١٦]. تاكو جهێ ئاكنجیبوونا وان ژبەر هۆزا سندی ب ویلایەتا سندییان هاتییە ناڤكرن، و ل نێزیك سندییا عەشیرەتا سلێڤانی (سلێمانی) ئاكنجی بووین[١٧].

عەشیرەتا مزووریا دهێتە هژمارتن ژ كەڤنترین هۆزێن دەڤەرا بەهدینان، و بەدلیسی ئەو هژمارتینە ژ مەزنترین عەشیرەتێن ئامێدیێ و ب پلا ئێكێ دناڤ عەشیرەتێن دیتردا دانایە[١٨].

هەژی گۆتنێ یە كو ڤەكۆلەر عەباس عەزاوی سەرەرای پێزانینێن وی یێ مەزن و بەرفرەهـ ل دۆر بابەتێ عەشیرەتا، بەلێ یێ خەلەت و شاشبووی دەمێ گۆتی ئەو عەرەبن و ناڤێ وان ژ ناڤێ عەشیرەتا (مضر) یا عەرەبی هاتییە گهۆرین[١٩]، هەروەسا ئۆلمستەد (Olmesteed) پشتگەرمی ب وەكهەڤیا زاراڤی كرییە و گۆتییە مزووری یێن ژ بنەمالا مەیسوری یا ئاشووری هاتین ئەوێن ئاكنجی ل هەمان جهێ ئاكنجیبوونا مزووریا ل سەردەمێ شاهـ سەنحاریبێ ئاشووری[٢٠]. ب دیتنا مە وەكهەڤیا زاراڤان دناڤبەرا ناڤان دا ناهێنە هژمارتن وەك بەلگەكێ زانستی بۆ بابەتەكێ گرنگ وەك ئەڤی بابەتی، بەلكو ئەڤ چەندە پێدڤی ب سەلماندن وبەلگەنامێن دیرۆكی هەیە.

ژ عەشیرەتێن دیتر یێن بەهدینان عەشیرەتا برواری (بەرواری)یە[٢١]، ئەوا نها دبیتە دو تا بەرواری (ژووری) و بەرواری (ژێری)[٢٢]، و عەشیرەتا رادكانی ئەوا گشت كورد دبێژنێ رێكانی[٢٣]، بەلێ عەشیرەتا دۆسكی وەسا دیارە پشتی سەدسالییا دەهێ مشەختی هاتینە دەڤەرا بەهدینان[٢٤]، و ئەڤ ڤۆناغە ناكەڤیتە ژێر ڤەكۆلینامە.

زۆربەی عەشیرەتێن بەهدینان ژ باژێر و دەڤەرێن چیاییێن باكوورێ كوردستانێ قەستا دەڤەرێ كرینە، وەك عەشیرەتێن سلێڤانەی و بەرواری و هەكاری و گەلەكێن دیتر[٢٥]، و ئەڤە ب تشتەكێ سرۆشتی دهێتە هژمارتن ژبەر نێزیكبوونا جوگرافی ژلایەكی ڤە و ژبەر نەبوونا ناڤبرێن سیاسی دناڤبەرا هەردو دەڤەران دا ژ لایەكێ دی ڤە كو هەردو د ئێك هەرێم دا بوون كو ب (جەزیرە) دهاتە نیاسین[٢٦]. هەروەسا كۆچكرن وەك داب ونەریتەكێ بەردەوامێ عەشیرەتێن كوردان بوویە ودبیت ژ نەچاری بیت وەك سالێن خەلایێ و هشكاتیێ و گرانی و كاودانێن سیاسی[٢٧].

ژێدەرێن دیرۆكی یێن گرێدای ب چەرخێن ئیسلامی یێن داویێ ئاماژێ ب هەبوونا هندەك پێكهاتەیێن

نەتەوەیێن دیتر ل دەڤەرا بەهدینان نەداینە، بەلێ بەدلیسی د دەمێ ئاخفتنا خۆدا ل دۆر ئامێدیێ ئاماژە كرییە و دبێژیت(بەلێ... زمانێن وان تێكەلە ژ كوردی و عەرەبی)[٢٨]، و ئەڤە ژی بەلگەیە ل دۆر هەبوونا عەرەبان ل وێرێ.

بێ گۆمان هەبوونا عەرەبان ل گشت دەڤەرا بەهدینان دزڤریت بۆ ماوەكێ دیرۆكیێ زوو، دگەل ڤەكرنێن ئیسلامی بۆ دەڤەرێ[٢٩]، و هندەك هۆز شیاین دەستەلاتا خۆ یا سیاسی ب سەپینن ب رێ یا پێكئینانا میرگەهێن عەرەبی وەك (حەمدانی و عوقەیلیا) ئەوێن دەستەلاتا وان یا سیاسی تا هەرێما جەزیرە ژی بخۆڤە دگرت كو بەهدینان ژی ب سەر ڤە بوویە، بەلێ وەسا دیارە ب نەمانا دەستەلاتێ سیاسیێ وان میرگەهان[٣٠]، ژ ئەگەرێ تێكەلی و خزمانیێ عەشیرەتێن ناڤبری دناڤ كەتوارێ كوردی بەرزەبوون تاكو بوویە ئەگەرێ كێمبوونا وان ل دەڤەرێ ل چەرخێن ئیسلامی یێن داویێ[٣١].

بەلێ دگەل هاتنا سەلجوقی و تورك و ئەتابەگییان ل سەدسالییا (پێنجێ و شەشێ مشەختی/ یازدێ و دووازدێ زایینی) توركمانان قەستا باژێرێن كوردستانێ كرینە[٣٢]، و هاتنا وان د سەردەمێ حوكمدارییا مەغۆل وجەلائیری و قەرەقوینلو و ئاق قوینلویا یا بەردەوام بوو[٣٣].

سەبارت پێكهاتا ئاكنجییێن بەهدینان ژلایێ ئایینی ڤە، زۆربەی خەلكێ وێ موسلمان بووینە ل سەر ئاینزایێ (مەزهەبێ) شافعی[٣٤].

كوردێن بەهدینان د بەرنیاسن ب دینداری و گرێدانا وان ب بنەما و پرەنسیپێن ئیسلامێ، بەدلیسی ل دۆر كوردێن ئامێدیێ دبێژیت (هەمی د چاكن ب بچوویك و مەزنڤە گرێدای ئایینی نە، حەزا خێرخوازی و ئاروزوویا باشی وچاكیێ ل دەف وان هەیە)[٣٥]. بەلگە ل دۆر گرێدان و پەیوەندیا بەهدینان یا موكم ب ئایینێ ئیسلامێ ڤە هەبوونا مزگەفتانە ل باژێرێن وان ب شێوەكێ بەرفرەهـ[٣٦].

جوهی دهێنە هژمارتن ژ پێكهاتەیێن دیتر یێن ئایینی ل دەڤەرا بەهدینان، ل ئاكرێ هەبوون[٣٧]، هەر وەسا ل ئامێدیێ ژی، بنیامین توتەیلی دبێژیت ژمارا جوهییان ل ئامێدیێ بیست و پێنج هزار كەس بوون، ئەو ژی ژ پاشماییێن وێ رەڤەندێ بوون ئەوێن ل سەردەمێ شاهـ شلمانسەری هاتینە ئێخسیركرن، و ب زمانێ تەرجوم ئانكو ب زاراڤێ ئارامیێ رۆژهەلاتی دگەل ئێك و دوو دئاخڤن[٣٨]. بەلێ وەسا دیارە (توتەیلی) زێدەرۆویی د ژمارا وان دا كرییە ل ئامێدیێ چونكی كەلایەكا وەكی ئامێدیێ ئەڤێ ژمارێ ژ جوهییان نا راگریت.

بەشەكێ مەزن ژ ئاكنجییێن دەڤەرا بەهدینان ژ مەسیحییان پێكدهات، و د دابەشكری بوون ل سەر دو جوینان نەستووری (ئاشوری) و یەعقوبیان (أرثـودكـس). بەلێ نەستووری دگەهنە پەتریك نەستورێ قەستەنتینی یە، و یەعقوبی دگەهنە یەعقوب برذعانی[٣٩]. بەلاڤبوونا مەسیحییان ل دەڤەرا بەهدینان دزڤریت بۆ سەدسالیا ئێكێ زایینی دەمێ هنارتیێن (عیسا پێغەمبەر) بەرەف باژێركێن بەهدینانڤە چووین[٤٠]. هەژی گۆتنێ یە ل سەدسالییا چواردێ مشەختی/دەهێ زایینی مەسعودی ئاماژە كرییە بوونا دو جوینێن مەسیحی یێن كورد ئەوژی یەعقوبی و جۆرڤان (گوران) بوون و جهێ وان ل پشت باژێرێ مووسل و چیایێ جۆدی یە[٤١]، هەروەسا ل سەد سالییا (٨مـش/١٤ز) ماركو پولوی ئاماژە ب هەبوونا كوردێن مەسیحی ژ نەستوری و یەعقوبیان ل بەشێن چیایی ژ مووسلێ كرییە[٤٢].

تا رادەكێ مەزن مەسیحی د شاد بوون ب ئەوێ لێبوورینا ئایینی ئەوا ل دەڤەرا بەهدینان هەی، و هەبوونا گەلەك دێران باشترین بەلگەیە ل دۆر ئەڤێ چەندێ، و ناڤدارترین دێر ل دەڤەرێ دێرا (كۆم)ە ئەوا ل نێزیك ئامێدیێ، و دێرا (الكلب) یا نێزیك باعەدرێ و نها دهێتە نیاسن ب دێرا (قەشەفرێ) و دیرا (بیث عابی) ل باكوورێ رۆژئاڤایێ ئاكرێ، و دێر (مەنسور) دكەڤیتە سەر رووبارێ خابووری، و دێر (مەتی) ل سەر چیایەكێ بلند ل رۆژهەلاتێ مووسل[٤٣].

ژ ئاینێن دیتر یێن دەڤەرا بەهدینان ئێزدی نە، ب (عەدەوی) دهاتنە نیاسین ئەوێن دگەهنە مەزنێ

وان (عـودەی کـوڕێ مۆسافرێ هـەکـاری) (٥٥٥ یان٥٥٧مش/١١٦٠-١١٦١ز مریبە)[٤٤]، ئەوێ ل دەڤەرا لالش ئاکنجی بووی، و شیایە گەلەك لایەنگەرا ل خۆ کۆمبکەت، ئەوێن بەربەلاڤ ل باعەدرێ، داسن، شنگال، عێن سفنێ شێخان[٤٥].

سەرەرای بوونا پەیوەندیێن باش د ناڤبەرا کوردێن موسلمان و پێکهاتەیێن ئایینێن دیتردا، لێ ژێدەر ئاماژە ب روودانا چەند لێکدانەکان دناڤبەرا کوردێن موسلمان و مەسیحیان ژ ئالیەکیڤە و د ناڤبەرا مەسیحییان و کوردێن ئێزدی ژ ئالیەکێ دووڤە، ب تایبەت سەردەمێ حوکمداریا بەدرەدین لوئلوئی (٦٣١- ٦٥٧مش/١٢٣٣- ١٢٥٩ز) و کوڕێ وی ئەلمەلکولسالح (٦٥٧- ٦٦٠مش/ ١٢٥٩- ١٢٦٢ز) ل مووسلێ، هەژیە بێژین دەسپێکرنا شەرێ کوردێن موسلمان دژی مەسیحی و ئێزدیان ب هاندانا راستەوخۆ یا حوکمدارێ مووسلێ و کوڕێ وی بوو، ئەڤێ داویێ گەلەك دیاری و خەلات ددانە کوردان داکو شەرێ مەسیحییان بکەن ئەو ژی ب گونەها هندێ کو هاریکاریا مەغۆلان دکەن[٤٦]، د هەمان دەمدا بەدرەدین لوئلوئی هاندانا هندەك کوردێن موسلمان دکر شەرێ ئێزدیان بکەن ژبەر بیروباوەرێن وان یێن ئایینی، هەژیە د ڤی واریدا ئاماژە پێ بکەین کو هندەك ژ کوردان ئەڤ زێدەگاڤییە قەبوول نەدکر و ل سەر وێ چەندێ پێکهاتن کو کو زیانێ بگەهیننە حوکمدارێ مووسلێ، هەروەك ئەلغەسانی د ڤی واریدا دبێژیت: (ئەڤە ب دلێ کوردان نەبوو، د ناڤبەرا خۆدا کۆمبوون و پێکهاتن کو دەڤەرێن سەر ب مووسلێ ڤە تالان بکەن) ژبەرکو ئەڤ دەڤەرە مولکێن بەدرەدین لوئلوئی بوون[٤٧].

## دوو: تەخێن جڤاکی

دابەشبوون ل سەر بنیاتێ تەخایەتی وەك دیاردەکا جڤاکی ژ ساخلەتێن زۆربەی جڤاکێن مرۆڤایەتی یە، کو چ جڤاك دڤالا نینن ژ جیاوازیا تەخایەتی دناڤ ئاکنجیێن وێ دا بەلێ ب رێژێن جیاواز.

سەبارەت جڤاکێ بەهدینان د شیاندایە بهێتە پۆلینکرن ل دووڤ هندەك بنەمایێن سیاسی وئابووری و رەوشەنبیری بۆ تەخێن ل خوارێ دیارکری.

### ا- تەخا دەستەلادار:

تەخا دەستەلادار د پێکهاتا جڤاکیدا دگەل تەخا تایبەت دهێتە هژمارتن[٤٨]. د ماوێ سەدسالیا (٧ – ٩مش/ ١٣ ١٥ز) تەخا دەستەلادار ل بەهدینان ژ میر و خودان کەلا و مەزنێن عەشیرەتان پێکدهات ئەوێن د سەدسالیێن بەرێدا شیان و دەستەلاتداری هەی، و رۆلێ وان وەك تەخا حوکمدار ب داوی نەهاتبوو تا پشتی شکەستنا خیلافەتا عەباسی ل بەغدا سالا (٦٥٦مش/١٢٥٨ز)ێ، و سەرەرای وان وێرانکاریێن سەر ب باژێر و کەلایێن وان دا هاتین ژ ئەگەرێ هێرشێن مەغۆل و جەلائیری و تەیموری و قەرەقوینلو و ئاق قوینلویان، بەلێ شیان باژێر و کەلایێن خۆ ل دووڤ سیستەمێ دەرەبەگایەتیێ بپارێزن[٤٩].

سیستەمێ دەرەبەگایەتی شێوازەك بوو ژ شێوازێن رێکخستنا کارگێری و دارایی، وان هێزان ئەو سیستەم گرتبوو بەر داکو ل دووڤ بنەمایێن وی دەڤەر ب ناڤ سەر ب وانڤەبیت بەلێ خودانێ مولکێ (دەرەبەگاتیێ)دێ برێڤەبەت و د بەرامبەردا دێ کۆژمەکێ پارەی دەتە وان. مەغۆلا ئاکرێ و شۆش هێلا ل ژێر دەستێ میر (موبارەزەدین کەك) (؟ - ل نێزیکی ٧١٠مش/ ١٣١٠ز مریبە)، و ل دۆر ئەڤێ چەندێ ئەلعومەری دبێژیت: (موبارەزەدین کەك کرە نوینەرێ خۆ ل ئەربلێ و دەڤەرێن سەر ب وێڤە دەستەلاتێ دارایی و لەشکەریێ وێ دا وی و تەبایی ئاکرێ و شۆش ژی دانە وی...)[٥٠].

ل (٧٣٨ - ٨١٤مش/١٣٣٧- ١٤١١ز) جەلائیریان هەمان سیاسەت دگەل میر و سەرکردێن بەهدینان بکاردئینا، کو پارە ژی بناڤێ سولتان ئەحمەدێ جەلائیری (٧٨٤ - ٨٧٣مش/١٣٨٢ - ١٤١٠ز) ل ئامێدیێ و ئاکرێ هاتە لێدان[٥١]. لێدانا پارەی بەلگەیە ل سەر راگەهاندنا تەبەعییەتا کارگێری.

و ل سەردەمێ تەیمورلەنگی (٧٧١-٨٠٧مش/١٣٦٩ - ١٤٠٤ز) دەڤەر رادەستی سەرکردێن عەشیرەتێن

کوردی کرن بەرامبەر لایەنگەرێ و پێشکێشکرنا پارەی[52]، و بەدلیسی دیارکرییە و گۆتییە کو میر (زەینەدین) میرێ ئامێدیێ ئەوێ هەفچەرخی تەیمورلەنگی و کورێ وی (شاهرۆخ)ی د (د بەختەوەری و خۆشیێ دا بوون))[53].

حوکمدارێن قەرەقوینلو (٧٨٠-٩٠٨مش/١٣٧٨-١٥٠٢ز) دگەل میرێن بەهدینان ل سەر هەمان سیاسەت دچوون. قەرەیوسف (٧٩٠ - ٨٠٢مش/١٣٨٨-١٤٠٠ز) کەلا ئاشیتێ ئەوا ل نێزیك ئامێدیێ رادەستی (شێخ مەحمود)ی کر[54]. هەروەسا ل ئامێدیێ پارە بناڤێ (قرە یوسف)ی و کورێ وی (بیر بوداق)ێ قەرەقوینلویی هاتە لێدان[55].

میرێن بەهدینان د گۆپیتکا ستراکچەرێ (هەیکەلێ) پێکهاتا جڤاکێ خۆ دابوون، خودان شیان و دەستەلادار و دەولەمەندبوون، ئەلعومەری د پەسنا میرێن بەهدینان دبێژیت: (ئەو د بەرفرەهی و خۆشیەکا بەرچاڤ دا بووینە، و جل و بەرگێن باش و تازە، و ئاڤاهیێن نەخشاندی، بالندێن نێچیرێ یێن فێرکری، خۆلام و بەردەستکێن گەنج، و کەنیزەیێن جوان، و سترانبێژ و کەنیزەیێن دەنگخۆش)[56]. و هندەك میرێن وان خۆ ب شاهـ (مەلك) ناسناڤ کربوون، ئیبن ئەلفوتی دبێژیت (موبارەزەدین کەك ژ شاهێن(مەلکێن) ئەربل و چیا بوو و خودێ هێز و شیان دابوونێ)[57].

میرێن کورد رۆلەکێ بەرز هەبوویە د بیاڤێ ئاڤەدانیێ دا، و بازێرێن بەهدینان ئاڤەدانییەکا بەرچاڤ بخۆڤەگرتبوو، وەك ئاڤاکرنا مزگەفت و خواندنگەهـ...و هتد[58]. ئیبن ئەلفوتی دبێژیت (موبارەزەدین کەك)ی (خواندنگەهەکا مەزن یا خودان ئاڤاهیەکێ بلند ئاڤاکربوو و مولکەکێ گەلەك بۆ کربوو وەقف؟)[59].

میرێن بەهدینان د حوکمرانییا خۆدا ل دووڤ سیستەمێ میراتگری دچوون، کور پشتی بابێ دهات د حوکمرانیێ دا و هندەك جاران دەستەلات بۆ کەسەکێ دیتر دچوو دناڤ بنەمالێ دا ل دەمێ چ وێرس نەبان، ژبۆ هندێ تاکو دەستەلات بمینیتە دناڤ بنەمالێ و عەشیرەتێ دا[60].

میرێن بەهدینان د رێڤەبرنا میرگەهێن خۆدا ب پلە ئێك پشتگەرمێن کەسانێن عەشیرەتا خۆ بخۆ بوون، موبارەزەدین کەك میرێ ئاکرێ ( مللەتی وی یێ ب کەیف و خۆشی بۆ دەمێ ئەو یێ ب کەیف و خۆشی، و رۆژا وی دهاڤێتە سەر دوهی یا وی، و گەلەك میر دناڤ عەشیرەتا وی دا هەبووینە ژبەر کو ژ نفشێ وی بووینە، و وی پتر ژ میرێن دیتر دەستەلات هەبوو و گرنگی ب دەولەتێ ددا)[61].

دەمێ ئەم ل سەر تەخا حوکمدار دئاخڤین پێدڤییە ئاماژە ب سەرپەرشتێن کەلا (دزدار)ان بکەین[62]،چونکو ئەو ژی ژ تەخا تایبەت بوون، ژبەر کو زۆربەی بازێرێن کوردی کەلا بووینە لەوا پێدڤی بوو کەسەك بهێتە دامەزراندن ژ بۆ سەرپەرشتیێ ل پاراستنا وێ بکەت، کارێ (دزدار)ی ژ کارێن لەشکەری دهێتە هژمارتن یێ کو ل سەردەمێ حوکمێ ئەتابکیا ل سەر وان ویلایەتێن سەر ب وانڤە دەرکەفتی. و یێ ئەڤ کارە دگرتەدەست مینا حوکمدارێ لەشکەری دهاتەهژمارتن، عزەدین ئایبەك ل سەردەمێ ئیلیخان اباقاخان (٦٦٣-٦٨٠مش/١٢٦٥-١٢٨١ز) دزدارێ کەلا ئامێدیێ بوو و ئیلیخانیان ئەو هێلا بوو ل سەر حوکمرانییا ئامێدیێ ژبەرکو سیاسەتەکا باش دگەل خەلکێ وێ بکاردئینا لەوا ئەلفوتی د پەسنا وی دا دبێژیت (خودان رابردوویەکێ باش بوو، و ب باشی چاڤدێری ل ژێر دەستێ خۆ کرییە)[63].

## ب - تەخا کەسێن خودان زانست و ئەدەب:

ئەو چینە یا دناڤبەرا تەخا حوکمدار و یا گشتی دا و هەمی تەخێن رەوشنبیر دناڤ جڤاکێ بەهدینی دا یێن شارەزاییەکا باش د وارێ زانستێن ئایینی و ئەدەبی دا هەی بخۆڤەدگرت. دەڤەرا بەهدینان گەلەك زانا دبیاڤێن زانستی یێن جۆراوجۆردا هەبووینە، ئەلحەمەوی د ئاخفتنێن خۆدا ل دۆر بازێرێ ئاکرێ دبێژیت (دەستەیەکا خودان زانست ژێ پەیدابووینە)[64]. هەروەسا بەدلیسی د پەسنا

عەشیرەتێن سندی ل ویلایەتا سندیان دا دبێژیت (ل ئەڤی جهی پرانییا زانا و شێخێن ناڤدارێن كوردستانێ ژیاینە)[٦٥]. ل دۆر ئامێدیێ دبێژیت (ل هەمی جهێن ب سەر ئامێدیێ ڤە گەلەك شارەزایێن زانست و زانینێ لێ هەنە، و ل بن چاڤدێریەكا باش دان ژبۆ ب دەستڤەئینانا زانستێن عەقلی و خواندنا هۆنەرێن نەقلی ب تایبەت فەرمۆدەیێن پێغەمبەری و فیقە و سەرف و نەحوێ و ئاخفتن و لۆژیك و رەوانبێژیێ بەلكو هەمی زانستێن دی پێن بەردەست)[٦٦].

وەسا دیارە كو هەبوونا ژمارەكا مەزن ژ زانایان ل بەهدینان د بنیاتدا دزڤریتەڤە بۆ بوونا خواندنگەهێن ئایینی وەك دەزگایێن فێركرنێ، و پیتەدانا میرێن وێ ب زانست و زانایان ژ لایەكیڤە و ئاڤاكرنا خواندنگەهان ژ لایێ دووڤە، گۆتنا بەدلیسی پشتەڤانییا ڤێ چەندێ دكەت دەمێ دبێژیت: (حوكمداران خواندنگەه و مزگەفت ل ئەڤی باژێری ئاڤاكرینە تێدا زانا گرنگیێ ب كاروبارێن زانستێن ئایینی ددەن و دەرسان دبێژن و مفای دگەهینن و خەلك ژی مفای ژ وان دبینن)[٦٧].

هەروەسا میرێ ئامێدیێ زەینەدین كورێ بەهائەدین زانایەكێ شارەزابوو د زانستێ شەریعەتی و ستێران دا، و پەیوەندی و تێكەلییەكا موكم هەبوویە دگەل زانایان و رێز لێ دگرت[٦٨]. بەری نها مە ئاماژە ب ئاڤاكرنا خواندنگەهەكێ ل ئاكرێ كربوو كو ژلایێ میرێ وێ موبارەزەدینی ڤە هاتبوو ئاڤاكرن و دارایییەكێ مەزن وەك وەقف لێ د مەزاخت.

ژ زانایێن ناڤدار ل دەڤەرا بەهدینان (سەعید كورێ سەعدوللا كورێ عیسا یێ بەرنیاس ب سەیدا) (٦٢٧مش/١٢٢٩ز مربیە) ل ئێك ژ گوندێن نێزیك ئاكرێ دبێژنێ (خلبتا) شارەزاییەكا باش د وارێ ئەدەب و رێزمان (نەحوێ)دا هەبوویە، وی هندەك شیعر هەنە، ئیبن (ئەلشەعار)ی هندەك ژ وان د پەرتووكا خۆدا ئینانینە خوارێ[٦٩]. دیسان زانا ( ئەبو عەبدوللا محەمەد كورێ فەزلونێ عەدەوی یێ ئاكرەیی د وارێ رێزمان و زمانی دا یێ ناڤدار بوو، فەقی و خویندكارێن زانستی ژبۆ فێربوونێ و مفا وەرگرتنێ ل خواندنگەها وی قەستا وی دكرن، جوگرافیناس یاقوت ئەلحەمەوی چاڤپێكەفتن دگەل كربوو و گەنگەشە ل دۆر بابەتێن ئیعرابێ دناڤبەرا هەردولا چێ ببوو، وئەلحەمەوی دپەرتووكا خۆدا توماركرینە[٧٠]. هەروەسان ژ زانایێن دیتر زانا محەمەد كورێ ئەحمەدێ گرگاشی (٧٤٣مـــش/١٣٤٢ز مربیە) و یێ ناڤدار ب (الكوله) خودانێ پەرتووكا (الزیج و الهیئه)، و زانا عەبدولرەحمان كاشی (٨٠٦مش/١٤٠٣ز مربیە) خودانێ پەرتووكا (فصوص الحكم)[٧١] بەلێ د بیاڤێ بزیشكی دا حەسەن كورێ نوحێ قومری یێ بەرواری (ل ٨٦٢مش/١٤٥٧ز مربیە) ئەوێ پەرتووكەك ل دۆر زاراڤێن پزیشكی دروستكری[٧٢].

ژ زانایێن سندی زانایێ شەرعێ شافعی ئەبوبەكر كورێ ئیسماعیل كورێ یوسف سندی حەسكیفی یێ ناڤدار ب (الترابی)(٩٢٠مش/١٥١٤ز مربیە)، خودانێ پەرتووكا (شرح القصاری فی التعریف)[٧٣]. دیسان ژ زانایێن دیتر شێخولئیسلام ئەبو سعود محەمەد كورێ محەمەدێ ئامێدی (٩٥١ك/١٥٤٤زمربیە) خودانێ تەفسیرا دبێژنێ ( ارشاد العقل السلیم)، یا ناڤدارب (تفسیر ابی السعود العمادی)[٧٤].

زێدەباری زانایێن موسلمان، ژمارەكا زانایان ژ ئایینی جوهییان ژی ناڤدار ببوون، و شارەزاییەكا باش د زانستێ تەورات و تەلمودێ دا هەبووینە، و ئەلتوتەیلی ئاماژە ب وێ چەندێ كریە و دبێژیت (ژمارەكا زانایێن مەزن دناڤ وان دا هەبووینە)[٧٥].

زۆربەی تەخا خودان زانست د ژیانەكا بەختەوەردا دژیان، خودان سامان و جهێن هەژی بووینە ژبەر پیتەدانا میرا ب وان و پارەكێ مەزن بۆ وان خواندنگەهان تەرخاندكر پێن وان دەرس تێدا دگۆتن.

## ج- تەخا دەولەمەندان:

تەخا دەولەمەندان دهێتە هژمارتن ژ تەخێن جڤاكی پێن گرنگ، ئەو دناڤبەرا تەخا تایبەت و یا گشتیدانە، ئەڤ تەخە پێكهاتی بوو ژ خودان ئەرد و تەرش و كەوال و مەزنە بازرگانان، وئەڤێ تەخێ جهەكێ باش دناڤ جڤاكی دا هەبوویە چونكی خودان پارە و مولك بوون.

ژ كەڤندا عەشیرەتا مازنجانی یا جیاواز بوویە دناڤ عەشیرەتێن بەهدینان دا چونكی (د سەروبەرەكێ باش و دەولەمەندا بووینە)[٧٦] ، وان ( گەلەك گوند و وارێن چاندنێ هەبوون)[٧٧]، و خودان تەرش و كەوال بوون ژ پەز و بزن و چێل و هەسپان، زێدەباری حێشترا كو ل دەڤەرێن كوردی د كێم بوون و ئەڤە بەلگەیە كو مازنجانیا پێن هاوردەكرین[٧٨].

بازرگانی ژێدەرەكێ گرنگێ داهاتێ دەولەمەندا بوویە، سەرەرای ئەوێ سستی و لاوازیا سەروبەرێ بازرگانی دناڤبەرا سەدسالییا (٧ – ٩مش/١٣ – ١٥ز) ژ ئەگەرێ كاودانێن سیاسی و بەلاڤبوونا جەردەچییان بخۆڤە گرتی، بەلێ بزاڤا بازرگانی نە راوەستیا و كوردان د ئەڤی ماوەی دا رۆلەكێ سەرەكی و گرنگ دگێران ژبۆ پاراستنا رێكێن بازرگانی وەك هەكاریا (هەر ژ بوخارا تا جزیرێ نۆبەداری ل گەلەك جهان دگرتن)[٧٩]، هەروەسا عەشیرەتا دۆنبەلی ژی (د داخاز كری بوون بۆ نۆبەداریێ)[٨٠].

ئامێدیێ سەنتەرەكێ بازرگانی یێ بەرچاڤ بوو، بازرگانان قەست دكرێ، ئیبن ئەلعیبەری ئاماژە كرییە و دبێژیت دەمێ بەغدا كەفتییە ژێر دەستێ مەغۆلا (شێخ عەبدولرەحمان)ی بجە هێلا و بەرف مووسل ڤە چوو و بازرگانی دناڤبەرا وێ و ئامێدیێ دا كر[٨١].

هنگڤین ژ گرنگترین هناردەیێن دەڤەرا بەهدینان بوویە، زێدەباری جۆرێن فێقی وەك هناران، و داری، و هندەك كەرستا وەك ئاسنی و مومیا و لازۆرد و زەرنیخ و رەساسی، ژبلی جۆرێن پەنیر و سپیاتی[٨٢].

ژێدەرێن دیرۆكی پێزانین ل دۆر ناڤێ بازرگانان دیارنەكرینە ژبلی كێمەك ژ وان، وەك بازرگان ئەبو ئەلحەسەن عەلی كورێ ئەبو بەكرێ كورێ سولەیمان دونبەلیێ مەعلسائی (پشتی سالا ٦٧٤ مش/١٢٢٠ز مرییە)، كو (ژ نموونێن بازرگانان بوویە)[٨٣]، و بازرگان ئەوحەدەدین شنگالی ئەوێ هاتنوچوونا چینێ دكر، و گەرۆك ئیبن بەتوتەی چاڤپێكەفتن دگەل كرییە و دەربارەی وی گۆتییە (ئێك ژ كەسێن خودان قەدر و خودان مالیەتەكێ مەزن بوویە)[٨٤].

هەژی گۆتنێ یە كو جوهی ژ تەخێن جڤاكی یێن دەولەمەند بووینە د جڤاكێ بەهدینی دا [٨٥]، زێدەباری مەسیحییان ئەوێن خودان مولك، وەك بوترس ئەلنەسری دبێژیت (ل سالا (٦٢٨مش/١٢٣٠ز) گوندێ ئەدلەب ئەوێ دكەڤیتە دەڤەرا داسن و گوندێ باتوبە ل دەڤەرا ئاكرێ ب میرات ژ باب باپیران بۆ مار شەمعونی مایە[٨٦]. و مەزنە كەسایەتیێن ئایینیێن مەسیحی یێن دەولەمەند پارەك زۆر وەك وەقف بۆ دێر و كەنیسا د مەزاخت، ژ وانا پەتریك شەمعون ئەوێ ل سالا (٨٩٦مش/١٤٩٠ز)ێ هندەك ئەرد و ئاڤاهی ژ خودانان كری و سەكێن فەرمی ژ دەستەلاتا قەرەقوینلویا پێ وەرگرتی ژبۆ سەلماندنا مولكیەتا وی مولكی و كرییە وەقف بۆ دێران[٨٧]. دیسان مەسیحییان د سەردەمێ حوكمێ قەروقوینلویان دا كارێ بازرگانیێ دكرن (بەردەوام ژبۆ بازرگانیێ قەستا مسرێ دكرن)[٨٨].

## د- تەخا گشتی:

ئەڤ چینە ژ جوینێن جۆراوجۆر وەك جۆتیار و شەرڤان و خەلكێ كەلا و بازێران ژ پیشەكار و كارسازان، زێدەباری كۆچەران پێكدهات.

كاودانێن تەخا گشتی تارادەكێ مەزن گرێدای كاودانێن سیاسینە، ل دووڤ سەروبەرێ خۆ ئەو پتر ژ تەخێن دیتر یێن جڤاكی نەخۆشییان دبینن وەك وێرانكاری و خرابكاری و شەر و داگیركرنان.

سەبارەت تەخا گشتی ل بەهدینان، دگەل دەستپێكا هاتنا مەغۆلا ڤێ تەخێ بەرسینگگرتنا وان ب ستۆیێ خۆڤەگرتبوو، و ئەلعومەری هەلویستێ تەخا گشتی دڤان كاوداناندا بەرچاڤ كرییە و دبێژیت (ژ زەلامێن شیانێن شەری هەی چ كەس نەما بوون ژبلی ئاكنجیێن چیا و دەمێ گاور نەشییاین وان ژ ناڤ ببەن و بنبرێكەن و پشتراستبوون كو تیرێن وان ناگەهنێ ب فند و فێل سەرەدەری دگەل وان كر ل سەر دانا خەراجێ دگەل وان پێكهاتن ژ بۆ نەهێلانا ژ مهانەیان)[٨٩]. و پێدڤییە ئەم ژێرنەكەین كو ژ ئەگەرێ داگیركرنێن ل دووڤ ئێك بۆ سەر دەڤەرا بەهدینان هندەك عەشیرەتێن كوردی جهێن خۆ ب

جە هێلان وەك كوردێن داسنی كو گەلەك نەخۆشی و دەردەســەری ل سەر دەستێ هێزێن مەغۆلان دیتینە، ژ جهێن خۆ كۆچەربوون و ل دەڤەرێن دی بەلاڤبوون، ل دووڤدا هندەك ژ وان زڤرینەڤە جهێن خۆ، ئەلعومەری ل دۆر ڤێ چەندێ دبێژیت (داسنی ب ژمارە و شیان و مولكێن خۆ یێن ئێكێ بووینە، تا میرێ وان (بەدر كورێ كیایك)ی ب كەس و كارێن خۆ و ب نهێنی باركری، تاكو بەربەلاڤ و ژێكڤە بووین)[٩٠]. خەلكێ ئاكرێ و ئامێدیێ ژی نەخۆشی دیتینە ژ وێرانكاری و داگیركرنێن ئاق قوینلویان ل سەردەمێ (ئوزون حەسەن)ی (٨٧١-٨٨٣مش/١٤٦٦-١٤٧٨ز) ب سەركێشیا سولەیمان بێك بیزن ل سالا (٨٧٥مش/ز١٤٧٠ز)ێ، وهێرشێن وان كێمیر نە بووینە ژ درندایەتییا هێرشێن مەغۆلا[٩١].

هەروەسا تەخا گشتی ل بەهدینان د هندەك دەمێن دیرۆكی دا تووشی ئێش و دەردا بووینە، یاسین كورێ خەیروللای دبێژیت ل سالێن (٨٢٨مش/١٤٢٤ز) ێ و (٨٦٠مــش/١٤٥٥ز)ێ ئێشا تاعونێ گەلەك ژ خەلكێ ئامێدیێ و ئاكرێ كوشتینە[٩٢].

جۆتیاران رێژەكا مەزن ژ تەخا گشتی پێكدئینا، و پێدڤی بوو باجا خەراجێ دا با، چ رێژەكێ ژ بەرهەمی یان ب پارەی ل دووڤ تەخمینكرنا بەرهەمی بدەنە میرێن خۆ و ئەوان ژی بەشەك بۆخۆ دهێلان و یێ مایی ددانە حوكمدارێن مەغۆلا و ل دووڤ وان دا جەلائیری وتەیموری و قەرەقوینلو و ئاق قوینلویان، (ل سەر دانا خەراجێ دگەل وان پێكهاتن)[٩٣].

بەرهەمێ جۆتیاران ل بەهدینان یێ جۆرا و جۆر بوو، ل پلە ئێك چاندنا گەنمی و جەهی بوویە، ل دەڤەرا مەرج ( بەردەرەش) و مەعلەسایا(مالتا) و ل پلە دو چاندنا برنجی بوو، و گوندێن باژێرێ ئاكرێ د ناڤدار بوون ب چاندنێ نەخاسمە گوندێ جوجر، زێدەباری چاندنا جۆرێن فێقی و دارێن بەر وەك مێوێن تری و هنار... وگەلەكێن دیتر[٩٤].

سەبارەت رێكێن ئاڤدانێ جۆتیار ژبۆ ئاڤدانا بەرهەمێن وەكی جەە و گەنمی پشت گەرمێن باران بوون، ل دووڤدا ل سەر ژێدەرێن ئاڤا ژێر ئەرد بوویە وەك رووباران و ئەڤ چەندە د ڤەگێرانێن جوگرافیناس و گەرۆكاندا دیاردبیت دەمێ ئاماژە ب گوند و باژێرێن بەهدینان دكەن، دەربارەی ئامێدیێ گۆتینە: (ل سەر چیایەكێ كەڤری یە و د بن دا رووبار و باغچەنە)[٩٥]. و باژێرێ ئەلحەسەنیێ (زاخۆ) ( رووبارەكێ مەزن هەیە و ئاڤدان پێ دهێتە كرن و دچیتە سەر رووبارێ دیجلە)[٩٦]. هەروەسا ئاڤا ژێر ئەرد ژی ژێدەرەكێ دی یە ژ ژێدەرێن ئاڤدانێ وەك ل گوندێ خلبتا ل نێزیك ئاكرێ كو (كانیەكا تەزی لێ هەیە)[٩٧].

تەخا شەرڤانان دهێتە هژمارتن ژ تەخێن گرنگ دناڤ چینا گشتی دا، هەر میرگەهەكا كوردی ژمارەكا مەزنا شەرڤانان لێ هەبووینە و د خزمەتا میر و سەركردێن كوردی دا كاردكر، ئەلعومەری ب ژمارە رێژەیا شەرڤانێن كورد دیاركرییە (ژمارا شەرڤانێن حەمیدی ژ هزار چەكداران كێمتر نەبووینە. بەلێ هەكارێن ئاكنجی ل دەڤەرا ئامێدیێ ژمارا وان ژ چوار هزار چەكدارا پتر بووینە)[٩٨]. كارەكێ رەوا بوویە میرێن كوردا ژ بۆ دروستكرنا هێزێن خۆ پالپشتییا خۆ ب شێوەیەكێ سەرەكی بدانە سەر كەسانێن ژ عەشیرەتا خۆ چونكی دەزگایێ لەشكەری دهاتە هژمارتن وەك هێزا فیداكارا میرێن كورد ژبۆ پاراستنا میرگەهێ.

بەلێ مە چ پێزانینێن دروست ل سەر خەلكێ باژێر و كەلان ئەوێن خودان پیشە و فرۆشیار نینن، ئەلعومەری ئاماژە ب هەبوونا بازارەكی كرییە ل دەڤەرا زێبار و دبێژیت ئەو (خودان بازرگانی بووینە و وان باژێر و بازار هەبووینە)[٩٩]، و ئەڤ چەندە بەلگەیە ل سەر هەبوونا بازارەكێ ناڤخویی ل وێ دەڤەرێ و هەبوونا فرۆشیار و خودان پیشەیان ژ زێباریان.

یا زانایە كو جل و بەرگ و پێلاڤێن مللیێن كوردی (كلاش) پیشەسازییەكا ناڤخویی بوویە، دیسان زۆربەی خودان پیشەیان وەك ئاسنگەر و پنیدۆزی و تەڤنكاری ژ جوهی و مەسیحیان بــوون[١٠٠]. هەروەسا مەسیحی ژی دناڤدار ب چێكرنا مەی بوون، ئەلموستەوفی یێ قەزوینی ئاماژەكرییە كو تری د چێكرنا وێ دا ل دەڤەرا ئاكرێ دهاتە بكارئینان[١٠١].

گشت جوهی و مەسیحییان باجا جزیێ ددان، سەبارەت جوهیێن ئامێدیێ توتەیلی دبێژیت (جوهیێن ئامێدیێ وەك هەمی جوهیێن دیتر یێن ئاکنجی ل دەڤەرێن موسلمانان جزییە د دان )[١٠٢].
باجا جزیێ یا شەرعی بوو، بەلێ هندەك باجێن دیتر یێن تایبەت هەبوون نە د چارچوڤێ باجێن شەرعی و یێن بەردەوام دا بوون وەك ئەوێ باجا حوکمدارێ مووسل (بەدرەدین لوئلوئی)ی ل سەر کورێن شێخ عودەی کورێ موسافری ل دەڤەرا عێن سفنێ (لالش) سەپاندی، ل دۆر ئەڤێ چەندێ ئەلغەسانی دبێژیت ( ب هزارا تشت ب خۆرتی ژ کورێن عودەیێ کوردی وەردگرتن، ئەڤە و زێدەباری قەسێن کرێت و نەشرین ئاراستەی وی دکرن)[١٠٣].

و ل داویێ پێدڤییە بەحسی تەخەکا دیتر بکەین ژ چینا گشتی ئەوژی کۆچەرێن گەرۆکن، کو کارێ وان یێ سەرەکی چەراندنا تەرش و کەوالی یە، زڤستانا ل دەشت و نهالێن گەرم دژین و ل هاڤینان سەردکەڤنە چەروانێن چیایی (زۆزانان) دناڤ کویناندا دژین[١٠٤] و ئەوژی گەلەك جوینن، ژ وانا (ئەرتووشی) و ئویجاخێن وان (شەرەفان، هاجان، گەودان، قلیان، سادان، زێدك، شاوتە)، دیسان ژ کۆچەرێن دیتر (هەرکی) ل ئاکرێ و عەشیرەتا (گۆڤەیی)[١٠٥]. بەهدینان چەروانێن باش بۆ تەرش و کەوالی هەبووینە وەك دەڤەرا کوار (گەڤەرێ) (جهەکێ بەرفرەه و چەروانەکێ باش بۆ گیانەوەرا و ل زۆربەی دەمێن سالێ یێ ب پیت و بەرەکەتە)[١٠٦].

کۆچەرێن گەرۆك دناڤدار بوون ب چێکرنا سپیاتی و رێچالی[١٠٧]، هەژی گۆتنێ یە کو باجەك ل سەر خودان تەرش و کەوالی هاتبوو سەپاندن نەخاسمە ل سەردەمێ جەلائیریان دگۆتنێ باجا (قوبجۆر)ی ئانکو باجا چەروانان، نەخجەوانی دیارکرییە و دبێژیت دەولەتا جەلائیری هندەك فەرمانبەر دەستنیشانکربوون ل هەمی گوند و دەڤەرێن کۆچەراتی دگەریان ژبۆ ئامارکرنا تەرش و کەوالی، و پشکا دەولەتێ سەرەك بۆ ژ هەر سەد سەران. و ئەڤێ ژ میرێن مەغۆل و تاجیك و کورد و عەرب و تورك ژی دگرت[١٠٨]. دەمێ سلێڤانەیا ل وەرزێ بوهارێ قەستا زۆزانێن ب پیت و بەرەکەت ل بەدلیسێ دکرن پێدڤی بوو ژ هەر سێ سەد سەرێن پەزی پەزەك وەك باج دابا حوکمدارێن بەدلیسێ[١٠٩].

## سێ: ژێرخانا جڤاکیا جڤاکێ بەهدینی:

شێوازێ عەشیرەتایەتی یێ زالبوو ل سەر جڤاکێ بەهدینی، چونکی عەشیرەت پشکا خودان زەڤەر و شیان بوون دناڤ جڤاکێ کوردی دا و وەك دەزگایێن رێکخستی ب هەمی کار و کریارێن گرێدای ب ژیانا جڤاکی رادبوون. تاکێ عەشیرەتێ پتر شانازیێ ب عەشیرەتا خۆ دبەت ژ کەسایەتییا خۆ، ب گوهدارەکێ دلسۆزێ سەرۆکێ عەشیرەتێ هاتییەنیاسین، کەسانێن سەرب عەشیرەتێ ژبۆ پشتەڤانیا وی و قوربانیدانێ ب جان و سامانێ خۆ پێخەمەت وی ج جاران دەست نەداهێلاینە، و ئەڤ چەندە نهێنیا سەرکەتنا هندەك سەرۆك عەشیرەتا دگەهینیت دەمێ میرگەهێن خۆ یێن تایبەت دامەزراندین و بەردەوامی پێ دای سەرەرای وان وێرانکاری و ئازارێن ب سەرب بازێران دا هاتین. سەرۆك عەشیرەتێ کاروبارێن وێ برێڤەدبرن و سیاسەتا وێ دیاردکر و ل دووڤ سیستەمی میراتگری سەرۆکاتییا وێ دکر. و ئەو بەرپرس بوو ژ چارەسەرکرنا ناکۆکییا ل دووڤ هندەك بنەمایێن بەرنیاس و ئاشکەرا ل دەف خەلکێ هۆزێ کو وەك یاسایەکا ناڤخوویی و نەیا نڤیسی بوو[١١٠].

عەشیرەتگەری ل دەڤەرا بەهدینان ل سەر بنیاتێ گرێدان ب ئەردی ڤە دهێتە رێکخستن، زێباری ب ناڤێ وەلاتێ خۆ زێبار هاتینە نیاسین، داسنی ل دووڤ وەلاتێ وان داسن، و هەر ب ئەڤی شێوەی سەبارەت عەشیرەتێن دیتر وەك سندی و بەرواریا[١١١].

عەشیرەتێن بەهدینان دابەشبووینە بۆ ئویجاخ و بنەمالان، مازنجانی ئویجاخەکە ژ حەمیدیان[١١٢]، و سلێڤانەیی دابەشبووینە بۆ هەشت ئویجاخا

وەك: بانوكی، هووەیدی، دلخێران، بوجیان، زکزیان، برازی[113]، و ژ تایێن عەشیرەتا زێبار: بەرۆژ، مزووری، شێروان، برادۆست، گەردی، هەركی[114].

پەیوەندییا دناڤبەرا عەشیرەتێن بەهدینان ب زۆریا ناكۆكییان دناڤبەرا وان دا هاتییە نیاسین، و ئەگەرێن سەرەكی دزڤرن بۆ هەڤرکییا پێخەمەت حوكمرانیێ و بەرفرەهكرنا دەستەلاتێ ژبۆ ب دەسڤەئینانا ئەرد و مولكی، ئەلعومەری د پەسنا شەرێن مازنجانی و زێباریان دا دبێژیت (شەری دناڤبەرا وان و مازنجانیان دەمەكێ درێژ ڤەكێشابوو)[115]. و ژ ئەنجامێن وێ زێباریان سەرب هەمی مولكێن مازنجانیان داگرتن وەك ل پێش وەخت مە دیاركری.

## چوار: بیر و باوەر و داب و نەرێت

جڤاكێ بەهدینی هندەك داب و نەریتێن عەشیرەتگەری ل دەف هەنە كو هەمی عەشیرەتێن دی یێن كوردی دگریت، وەك: تۆلڤەكرنێ، بەدلیسی یێ راستگۆ بوو دەمێ ئاماژە پێ كری و گۆتی: (مللەتێ كورد... نە پێگیری فەرمانایە و حوكم و یاسایا جێ بەجێ ناكەت...حەزا تۆلڤەكرنێ ل دەف هەیە)[116].

و ژ داب و نەریتێن دیتر یێن بەربەلاڤ (خوینە)، و جیاوازی هەیە د وەرگرتنا وێ دا ئەو ژی چ كوژمەكێ پارەی بیت یان ژنەكێ یان چەند هەسپەكا ددەنە خودانێ خوینێ. ژ داب و نەریتێن دیتر ڤەحەواندنە، ئەو ژی دەمێ سەرۆكێ عەشیرەتێ ب پاراستنا وی كەسی رادبیت ئەوێ ڤەست دكەتێ تاكو كەسانێن چاكساز و خێرخواز مایتێكرنێ د ئاریشا وان دا دكەن و چارەسەر دكەن، ژ داب و نەریتێن دیتر وەك وەسكە، حشم (وشر) كو سەرۆك عەشیرەت وەردگریت ژلی خوینێ، ئەڤە وەك ڤەرەبۆكرنەكێ سەرۆك عەشیرەتێ وەك سزایێ شكاندنا ڤەحەواندنێ وەردگرت، و دبیت سزایەكێ دژوار بیت لەوا كەس وێرەكێ ناكەت سەرپێچییا وێ بكەت[117].

هەرەسا مژارا (غسل العار) كو ب كوردی ب تۆلا (شویشتنا) ناموسێ دهێتەناڤكرن، ژ وان داب و نەریتێن بەربەلاڤ دناڤ گشت جڤاكێ كوردی دا و جڤاكێ بەهدینی یێ ژێ دوورنینە، دەمێ مێر یان باب یان برا ب كوشتنا ژنێ رادبیت كو ئەو هزردكەن نامیس و سەربلنداهییا وان هاتییە بنپێكرن[118].

سەرەرای پاراستنا شێوازێ خۆ یێ عەشیرەتگەری، بەلێ جڤاكێ بەهدینی خۆ دگەل ژیانا شارستانی گونجاندییە، پەیدابوونا میرگەهێن كوردی هۆكارەكێ مەزنێ پێشكەفتنا وێ بوویە، و كۆمەكا سازی و دەزگەهێن ئایینی و رەوشنبیری و ئابووری و ساخلەمی ژ ئالییێن ڤان میرگەهانڤە هاتنەدامەزراندن كو ئەو بخۆ سیمایێن جڤاكێن شارستانی بوون، دیسان هەمەرەنگییا پێكهاتەیا ئاكنجییان ل دەڤەرا بەهدینان ژ هەبوونا نەتەوە و ئۆلێن ئایینی یێن جیاواز كارتێكرنەكا مەزن كرییە سەر تێكەلبوون و خۆگونجاندنا وان دگەل شارستانیەتێ ب شێوەیەكێ گشتی.

جڤاكێ بەهدینی هندەك بنەما و شێوازێن رەفتاری وەك میراتگەری دەستە بۆ دەستە وەرگرتینە، و ل دووڤدا بووینە داب و نەریتێن بەربەلاڤ و ب كارئینانینە دگەل داب و نەریتێ عەشیرەتگەری.

رێزگرتن و مەردینی دگەل مێهڤانی وەك رەفتارەكا جڤاكی و ئایینی و عەشیرەتی دهێنە هژمارتن ژ داب و نەریتێن بەربەلاڤ د جڤاكێ بەهدینی دا، ئیبن بەتوتەی پەسنا كوردێن شنگالێ ب مەردینی كرییە[119]. هەروەسا كوردێن زاخۆ گەلەك رێز ل مرۆڤێن بیانی دگرت[120]. هندەك كەسان ئەڤ داب و نەریتە پاراستینە و ئەو دویری بازێرێن خۆ، ئیبن ئەلجەزری ئاماژەكرییە و دبێژیت ئێك ژ كەسایەتیێن ناڤدار ژ خەلكێ ئامێدیێ دگۆتنێ سابقەلدین لاجین ئامێدی ئەلجەزری (٦٩٠مش --١٢٩٠ ز) (گەلەك حەز ژ بیانییان دكر نەخاسمە خەلكێ جەزیرا ئەلعومەری و دەمێ حوكمرانییا قوص وەرگرتی گەلەك ژ خەلكێ جزیرێ قەستا وی د كرن و وی ژی ب چاكی سەرەدەری دگەل وان كر و باشترین شێوە پێشوازی ل وان كر)[121].

و ژ داب و نەریتێن بەربەلاڤ ل بەهدینان سەرەدانا مەزارگەهایە ژبەر گەلەك ئەگەران وەك پیرۆزی و

دوعاکرنێ کو ئەو ل وێ باوەریێ بوون سەرەدانا وان بۆ ئەوان جهان دێ داخوازی و مەرەمێن وان ب جه هێن ب تایبەت ل دەمێ تەنگاڤییا، و ژ بەر کارتێکرنا ئایینی یا ب هێز ل سەر وان باوەریەکا موکم ب مرۆڤێن چاك و شێخا هەبوویە.

یاقوت ئەلحەمەوی دبێژیت شکەفتا داوود ئەوا دکەڤیتە کەلا ئەلعومرانی یێ ل نێزیك شۆشێ مەزار بوویە[122]. هەروەسا خەلکێ ئاکرێ بەردەوام سەرەدانا مەزارێ (شێخ عەبدولعەزیزێ گەیلانی) کورێ شێخ عەبدولقادرێ گەیلانی خودانێ رێ یا قادری د (تەسەووفێ) دا دکرن[123]. دیسان مەزارێ شێخ عودەی کورێ موسافری (٥٥٧مـش-١١٦٢ز مرییە)، ژ (مەزارگەهێن ناڤدار و ژ جهێن قەستکرنێ بوویە)[124].

پێشکێشکرنا نەدران (النذور) ژ داب و نەریتێن بەربەلاڤ بوویە ل دەڤەرێن شۆش و ئاکرێ، ئەوژی دەمێ کەسەك پەیمانێ ل سەر خۆ ددەت کو دێ کوژمەکێ پارەی کەتە سەدەقە یان دێ سەرەکی بۆ خێرا خودێ و کەسێن چاکدەت ئەگەر ئەو هیڤیا وی بجههات یا وی ئەو سەر بۆ دای، خەلکێ ئاکرێ و شۆش نەدرێن خۆ ددانە میر موبارەزەدین کەکی ژبەرکو وی وەسان رادگەهاند(کو ئەو ژ وەلیانە (ژ پەیڤا اولیاو یا عەرەبی) و نەدران قەبویلدکەت و دگەهینتە خێرێ و خەلکەکی ژی ب مەرەما خۆنێزیککرنێ هندی د شیانێن واندا بوو نەدر بۆ وی ددان و نەوەبیت کو باوەری پێ هەبیت، ب ڤی رەنگی دانا نەدران ب ساناهی دکر، وی ژی دەمێ نەدر بۆ دهات هندی وێ ژ مالێ خۆ ددانا سەر و هەموو دکرە سەدەقە ئانکو دکرە خێر)[125].

ب مەرەما چارەسەرکرنا نەخۆشییان و رێکێن چارەسەریێ هندەك داب و نەریتێن بەربەلاڤ ل دەڤ خەلکێ بەهدینان هەبوون وەك دوعا و چێکرنا نڤشتی و بازبەندان ل جەم شێخ و مەلان[126]. بەهدینان مفا ژ وان کانزایا دیتییە ئەوێن ل دەڤەرا وان هەی وەك (لازۆرد)ی ئەوژی بەرەکێ شین بوو دهاتە بکارئینان بۆ چارەسەرکرنا هندەك نەخۆشیێن دەروونی رەنگەکێ خۆشی و بێهنڤەدانەکا دەروونی بۆ نەساخی چێ دکر و چارەسەرییا دەردێ (تەبێ) و ب هێزکرنا دیتنا چاڤا[127]. دیسان خەلکێ هەرۆرێ مفا ژ (مومیایێ) ددیتن د چارەسەرکرنا خەلاندن و شکاندنێ... و گەلەك کارێن دیتر[128]، هەروەسا زەرنیخ بکاردئینان ژبۆ چارەسەری و نەهێلانا موی ل سەر لەشی، زێدەباری بکارئینانا وێ بۆ هندەك نەخۆشیێن پیستی[129].

ژ داب و نەریتێن بەربەلاڤ ل بەهدینان پاراستن و هەلگرتنا پارێ کەڤن، کو ئافرەتان وەك ستڤانك دکرنە ستۆیێ خۆ و ل سەر سەرێ زارۆکان د هەلاویستن، دیسان ل ژێر عەرد و عومباران د ڤەشارتن[130]. ئەڤی داب و نەریتی بها و سامانەکێ دیرۆکی یێ مەزن هەبوویە دەمێ شوینوارناسا ل سالا ١٩٧٣ێ بکارێ لێگەریان و ڤەکۆلینێ ل دەڤەرا ئامێدیێ رابووین د ئەنجامدا هەشت هزار پارچێن پارەی دیتین زۆربەیا وان دزڤرین بۆ سەردەمێ حوکمرانییا ئیلخانی و جەلائیری و تەیموریا و تورکۆمانێن قەرەقوینلو و ئاق قوینلو[131].

پێدڤییە ئاماژێ ب دیاردا سحرێ و فیلبازیێ بکەین نەخاسمە ل ئامێدیێ، کو باهرا پتر جوهی پێ رادبوون، ئەلتوتەیلی ئاماژە کرییە و دبێژیت ئێك ژ کەسایەتیێن جوهییا دگۆتنێ (داوود کورێ روحی) گەلەکێ زانا و شارەزا بۆ د هۆنەرێ سحرێ و فێلبازیێ دا[132]. و بۆ ئەڤێ مەرەمێ گەلەك مفا ژ زانستێ کیمیایێ دهاتە وەرگرتن[133]. تا دزدارێ کەلا ئامێدیێ عزەدین ئایبەك گەلەك حەز ل سەر پیشەسازییا کیمیایێ هەبوو و چەوانییا بکارئینانا وێ دکارێ سحرێ و دەرکرنا ئەجنا دا[134]. پێدڤییە بێژین کو کوردان ژی هندەك جۆرێن گیا و و کانزا وەك (بوخێرییا کوردان) و کانزایێ لازۆرد بکارئینانینە بۆ مەرەمێن خۆپاراستنێ ژ سحرێ و ئەجنا و چاڤ هاڤێژان[135].

ل دەڤەرا بەهدینان هندەك بیر و باوەر هەبوون گرێدای ب رۆژەکا دیارکری وەك رۆژەك کور (شویم)، و رۆژا چوارشەمبی رۆژەکا شویم بوو ل جەم کوردێن موسلمان[136]. بەروڤاژی جوهییان کو رۆژا چوارشەمبی بۆ وان رۆژا خۆشی و بەختەوەریێ بوو و

تەرخان دکرن بۆ بێهنڤەدان و سەرشویشتنێ، ئیبن ئەلجوزری ئاماژە ب چیرۆکەکا سەیر کرییە ل دۆر ئێك ژ کەسایەتیێن خەلکێ ئاکرێ ئەو ژی میر بەدرەدین یوسف کورێ ئەبو دریاسی کورێ یوسفێ حەمیدی (٦٩٠مش/١٢٩١ز مرییە)، یێ رۆژا چوارشەمبی وەك چاڤلێکرن بۆ جوهییان بکاردئینا بۆ سەرشۆشتنێ و دوور کەڤن ژ ئەوێ بیر و باوەرا بەربەلاڤ (بەردەوام رۆژا چوارشەمبیان دچوو سەرشوویێ و نەدڤیا ڤی عەدەتی بهێلیت)[١٣٧].

## پێنج: سیمایێن ژیانا جڤاکی

پێزانینێن ل دۆر زۆربەی سیمایێن ژیانا جڤاکی ل دەڤەرا بەهدینان د کێمن، بەلێ ژبۆ دیارکرنا دیمەنەکێ وان سیمایان دێ هەول دەین مفای ژ ئەوی تشتێ کێم یێ د ژێدەران دا هەی وەرگرین، و دێ ب نەخشێن باژێر و کەلایێن وێ وەك دەستپێکەك بۆ زانینا وان سیمایان دەستپێکەین.

سەبارەت شێوازێ باژێر و خانیێن بەهدینان بێ گۆمان دکەڤنە ژێر کارتێکرنا هۆکارێن جوگرافی نەخاسمە سەقای، و زۆربەی باژێرێن وێ د پێکهاتی بوون ژ کەلا و ئاسێگەها، وەك ئامێدیێ دکەڤیتە سەر چیایەکێ کەڤری یێ گرۆڤر و گەلەك بلند و ژووردانی، رێکێن وێ د ئاسێ بوون، و ل بن دا باغچە و جۆ و رووبارن[١٣٨].

دیسان شۆش ژی کەلایەکا مەزنە و گەلەك بلندە و مەزنتر و بلندترە ژ ئاکرێ[١٣٩]. بەلێ هرۆر ئاسێگەهەکا ئاسێ و تێر ئاڤ و خێر و بێر بوو[١٤٠]. هندیکە ئاکرێ یە دکەڤیتە سەر چیایەکی وەکی باژێر و گوندێن چیایێن کوردان، خانیێن وێ ئێك د سەر ئێکی دا یە[١٤١]. و ئیبن بەتوتە د پەسنا ئاکرێ دا دبێژیت (ئاکرێ دکەڤیتە سەر رووبارێ دیجلە، کەلایەك ل هنداڤی وێ هەیە، و ل بن دا خانا بەرنیاس ب خانا ئاسنگەرا یە، تاوەرێن زێرەڤانیێ و ئاڤاهی لێ هەنە، هەر ژ وێرێ تا مووسل گوند و ئاڤاهی ل دووڤ یەکن)[١٤٢].

بەلێ حوسەینیێ (زاخۆ) (رووبارەك لێ هەیە دبێژنێ خابوور و قەنتەرەك ل سەر هەیە کو سەیرترین قەنتەرەیە ل دونیایێ ژ لایێ ئاڤاکرنێ و بلنداهیێ ڤە)[١٤٣].

دەزگایێن خزمەتگوزاری وەك مزگەفت و خواندنگەهـ و سەرشوو ل باژێرێن بەهدینان هەبووینە، و گەلەك رێك بکارئینانە ژ بۆ دابینکرنا پێدڤیێن وان دەزگا و خانییان و گەهاندنا ئاڤا پێدڤی بۆ وان، وەك کەلاشتنا جۆیێن ئاڤێ ژ رووبار و کانییا و مفا وەرگرتن ژ بیرا، ل ئامێدیێ دو بیر د نیڤا کەلایێ دا کۆلا بوون ژ بۆ گەهاندنا ئاڤێ بۆ خواندنگەهە و سەرشوویێ و گەلەك جهێن دیتر، بەلێ ئاڤا ڤەخوارنێ خەلکی بۆ خۆ ب پشتا دەواران ژ دەرڤەی باژێری دئینا[١٤٤].

هندەك یارییێن مژویلکرنێ ل دەڤەرا بەهدینان د بەربەلاڤبوون ئەوێن ب شێوەیەکێ سەرەکی گرێدای ب داب و نەریت و شێوازێ عەشیرەتگەری یێ کوردی وەك هەسپ سوپاریێ، مازنجانیان(دناڤ کورداندا تایبەتمەندییەك د سوارچاکیێ دا هەبوو)[١٤٥]. هەروەسا میرێن مازنجانیا ب کارێ نێچیرێ رادبوون[١٤٦]. وەك ئارەزوو و بۆراندنا دەمی و مفا وەرگرتن ژ گۆشت و پیستێ نێچیرێ، دیسان ل هەمان دەم دا نێچیر وەك پیشە و رێکەکا دابینکرنا ژیانێ بوو. و هەر ژ چەرخێن کەڤندا خەلکێ دەڤەرا بەهدینان پیشەیا نێچیرێ بکارئینایە، کو شوینوارناسان دیمەنێن نێچیرێ یێن نەخشکری ل شکەفتا گوندك دیتینە، ئەو شکەفتا دکەڤیتە رۆژهەلاتێ شۆشێ کو دیرۆکا وێ دزڤریت بۆ هزار سالیا سیێ بەری زایینی[١٤٧]. مازنجانیان بالندێن نێچیرێ بکاردئینان (ئەو د کەیف و خۆشییا دا بوون... و خودانێ بالندێن نێچیرێ یێن مەشقدای بوون)[١٤٨]. و گرنگترین بالندێن بۆ نێچیرێ بکاردئینان بازی و ئەلهو بوون[١٤٩].

مۆزیك و سترانبێژی ژ گرنگترین رێکێن دەم بۆراندنێ بوون ل دەڤەرا بەهدینان، تاکو بۆ وان هەر ژ کەڤندا بووینە دو ساخلەتێن پێکڤە گرێدای[١٥٠]. و مازنجانیا ئامیرێن مۆزیکێ ژی هەبووینە[١٥١]. یاسین کورێ خەیرولا ئەلعومەری ئاماژەپێدایە کو ل ئامێدیێ ئامیرێ تۆمبلکێ هاتییە بکارئینا[١٥٢]. و

ئەلمەسعودی ئاماژە ب هەبوونا ئامیرێ (بلویلێ) هەر ژ کەڤندا کرییە و دبێژیت (شڤانێن کوردان جۆرەکێ فیتێ ڤەد دان و دەمێ پەزێ وان بەلاڤەدبوو ب ئەوێ فیتیێ کۆمڤە دبوون))[153].

دناڤ کوردان دا مۆزیکژەنێن شارەزا دەرکەفتینە، بتنێ بۆ نموونە (جەمالەدین ئەبو سەعیدێ عومەر کورێ خوزرێ دەشتی یان داسنیێ کوردی (٧٤٨مش/ ١٣٤٨ز مریبە)، ئەوێ پەرتووکەك ل دۆر هۆنەرێ مۆزیکێ هەی ئەوا بەرنیاس ب (کنز المکلوب فی الدوائر و الچروب)[154]. هەژی یە بێژین کو مەسیحیان ژی ئامیرێن موزیکێ و ئاواز د هەلکەفتێن خۆدا دناڤ دێران دا بکاردئینان[155].

بەلێ سەبارەت جەژنا و ژبەر هەبوونا فرە ئایینی ل دەڤەرێ، کارەکێ رەوا بوویە خودان هەر ئایینەك جەژن و هەلکەفتێن خۆ بگێریت، کو جەژنێن بەرنیاس بووینە، و کوردێن موسلمان جەژنا رەمەزانێ و یا قوربانی دگێرن[156]. بەلێ جوهییان جەژنا (سەرێ هشیان) ئانکو جەژنا سەرێ سالێ هەبوویە ئەوا دکەڤیتە رۆژا ئێکێ ژ هەیڤا چریا ئێکێ، و ئەو هزر دکەن کو ئەڤە ئەو رۆژە ئەوا پێغەمبەر ئیسحاق سلاڤێن خودێ لێ بن تێدا کریبە قوربان[157]. و جەژنا سۆماریا (رۆژیا مەزن)، ئەوا ل سەر وان هاتییە سەپاندن و ماوێ وێ (٢٥) دەمژمێرن و نابیت بکەڤیتە د رۆژێن ئێك شەمبی و سێ شەمبی و ئەینیێ دا، و ل دووڤ هزرا وان کو خودێ د ئەڤێ رۆژێ دا دێ وان ژ هەمی گونەها ئازا کەت بتنێ زنا نەبیت.

ژ جەژنێن دیتر یێن جوهییان جەژنا لێبورینێ (عید الفصح)ە یان جەژنا (الفکیر) ئەوا دکەڤیتە رێکەفتی ٢٥ نیسانێ و ماوێ وێ حەفت رۆژن و د ئەڤێ رۆژێ دا خوارنا وان هەڤیرێ ترشنەبوویە وەك بیرهاتنا دەرکەفتنا وان ژ مسرێ ل سەد سالیا سێزدێ بەری زایینی. دیسا جەژنا (التدپین) ئەوژی هەشت رۆژن، و ژ سیمایێن وێ بەرهەڤکرنا خوارنەکا بەرفرەه و گۆتنا سروودا و قەستا جهێن پەرستنێ دکەن ژبۆ پیرۆزیێ و ئازاکرنێ[158].

بەلێ گرنگترین جەژنێن مەسیحییان (جەژنا قیامەتێ)یە و دبێژنێ (عید الفصح) ئانکو جەژنا لێبورینێ، و جەژنا بۆنا مەسیح سلاڤێن خودێ لێ بن، و جەژنا سەرێ سالێ و هەروەسا دبێژنێ جەژنا (القلنداس) و جەژنا شەعانیان (الشعانین) و د ئەڤێ رۆژێ دا مەسیح سلاڤ لێ بن چوویە قودسێ کو ئەڤ رۆژە رێکەفتی رۆژا ئەوێ ئێك شەمبی یە ئەوا دکەڤیتە بەری رۆژا جەژنا لێبورینێ (عید الفصح) ئانکو ل رۆژا حەفتێ ژ رۆژیگرتنێن وان[159].

سەبارەت جەژنێن ئێزدییان (جەژنا سەرسال) دهێتە هژمارتن ژ گرنگترین جەژنێن وان، هەروەسا دبێژنی جەژنا (تاووس مەلك) یان (چارشەمبا سۆر)، و ل ئێکەم چوارشەمبی ژ هەیڤا نیسانێ دکەنە جەژن، ژ رێ و رەسمێن وێ ئێزدی رادبن ب کۆمکرنا ژمارەکا مەزن ژ هێکێن کەلاندی و ل دووڤدا رەنگا و رەنگ دکەن، ژ جەژنێن دیتر (رۆژی و جەژنا چلێ هاڤینێ) و ئەڤ جەژنە رێکەفتە دگەل داویا هەیڤا تیرمەهێ، د ئەڤێ جەژنێ دا ئێزدی قەستا پەرستگەها لالش دکەن، دیسان جەژنا (جەمایێ)، و رێ و رەسمێن وێ ژی بۆ ماوێ حەفت رۆژان ل پەرستگەها لالش دهێنە گێران. زێدەباری جەژنێن دیتر وەك جەژنا (ئێزید)، و جەژنا (بیلندا)، و جەژنا (رۆژیێن چلێ زڤستانێ) ، و جەژنا (خدر الیاس) و جەژنا قوربان [160].

زێدەباری ئاهەنگێن ئایینی کوردان هندەك جەژنێن نە ئایینی ژی هەنە وەك ئاهەنگگێرانا (جەژنا نەورۆزێ) ئەوا کو دهێتە هژمارتن ژ کەڤنترین جەژن د کەلتۆرێ مللی یێ کوردی دا، و د قۆناغێن دیرۆکێ دا ئاهەنگ پێ گێراینە و داب و نەریت و کەلتۆرێ وێ یێ هەڤپشك دگەل مللەتێن دیتر پاراستی[161].

# ژێدەر:


١. ياقوت الحموي، معجم البلدان، دار صادر، (بيروت: ب. م)، ١٣٦/٤.

٢. م. ن، ٣٧٢/٣.

٣. دەربارەی وان گوند و باژێران، بنێرە: هلبين رفيق باجلوري، الكورد الحميدية ودورهم السياسي والحضاري خلال القرون (٣ - ٨ هـ/ ٩- ١٤م)، مطبعة الحاج هاشم ، (اربيل : ٢٠١٢)، بث بث ٢٥- ٣١.

٤. ابن فضل الله العمري، مسالك الابصار في ممالك الامصار، تحقيق د. محمد عبد القادر خريسان و اخرون ، مركز زايد للتراث والتاريخ (الامارات العربية المتحدة : ٢٠٠١)، ١٧١/٣.

٥. زێبار: پەیڤەكا لێكدایە و یا پێكهاتییە ژ (زێ) و رامانا (بار) رەخ و روبێن وێ، ئانكۆ ئەو عەشیرەتا ئاكنجی ل رەخ و روبێن وێ، شرفخان البدليسي، شرفنامە، وەرگێران: محمد جميل الملا الروزبياني، ض ٢ ، دەزگایێ موكریانی، (اربيل: ٢٠٠١) بث ٢٥٤.

٦. العمري، مسالك الابصار، ١٧٦/٣، البدليسي، شرفنامە، ص٢٥٧.

٧. القلقشندي، صبح الاعشى في صناعة الانشا، شرحه وعلق شرحه وعلق عليه محمد حسين شمس الدين، ض ١، دار الكتب العلمية، (بيروت : ١٩٨٧)، ٣٧٨/٤.

٨. مسالك الابصار، ١٧٨/٣، ناڤێ (النستبكية) ل نك القلقشندى ب شێوێ (التنبكية) هاتییە، ژڤرین بۆ صبح الاعشى، ٣٧٨/٤.

٩. ياقوت الحموي، معجم البلدان، ٤٣٢/٢، صديق الدملوجي، امارة بهدينان الكردية، مراجعة د. عبد الفتاح علي بوتاني، ض ٢، دار ئاراس، (اربيل : ١٩٩٩)، بث ٣٦ .

١٠. ناڤێ الدنبليە ب شێوەكێ دروست د پەرتووكا (مسالك الابصار)دا هاتییە ئەوا ژ لایێ مهدي النجم ڤە هاتییە تویژاندن، دار الكتب العلمية ، (بيروت : ٢٠١٠) ، ٢٠٧/٢ بەلێ ئەوا ژلایێ د. محمد عبد القادر خرايسان ڤە هاتییە تویژاندن ب شێوێ (الدنيكية) هاتییە، ١٧٨/٣.

١١. البدليسي، شرفنامە، بث بث ٥١٣ -٥١٥ .

١٢. م . ن ، بث ٥١٣- ٥١٥.

١٣. مسالك الابصار، ١٧٨/٣.

١٤. البدليسي ، شرفنامە، بث ٢٥٧.

١٥. زرار صديق توفيق، القبائل والزعامات القبلية الكردية في العصر الوسيط، مؤسسة موكرياني، (اربيل: ٢٠٠٧)، بث بث١١٣،١٦٤.

١٦. مسالك الابصار، ١٧٨/٣ .

١٧. البدليسي، شرفنامە، بث ٢٥٧، علي سيدو الكوراني، من عمان الى العمادية او جولة في كردستان الجنوبية، پێشەكی د.سعد ابو دية، دار البشير، ض ٢، ( عمان :١٩٩٦)، بث ١٦٠.

١٨. البدليسي ، شرفنامە بث ٢٥٦.

١٩. عشائر العراق، ضاپخانا المعارف، (بغداد: ١٩٤٧)، ١٩٧/٢.

٢٠. هاتییە ڤەگوهاستن ژ انور مائي، الاكراد في بهدينان، ض ٣، چاپخانا هاوار، (دهۆك: ٢٠١٠)، بث ٨٩.

٢١. البدليسي، شرفنامە، بث ٢٥٧.

٢٢. الدملوجي، امارة بهدينان، بث ٩٥، جمال بابان، اصول اسماء المدن والمواقع العراقية، ض٢، چاپخانا الاجيال، (بغداد: ١٩٨٩)، ٥٦/٢.

٢٣. البدليسي، شرفنامە، بث ٢٥٧.

٢٤. الدملوجي، امارة بهدينان، بث بث ١١٠ - ١١١.

٢٥. م . ن ، بث بث ٩٩- ١١١.

٢٦. فائزة محمد عزت،الكورد في اقليم الجزيرة وشهرزور في صدر الاسلام، مطبعة خاني،(دهۆك: د.ت )،بث بث ٢٦ - ٨١.

٢٧. الدملوجي، امارة بهدينان، بث ١١١.

٢٨. شرفنامه، بث ٢٥٤.
٢٩. بەلازری ئاماژە ب كوچكرنا عەشیرەتێن عەرەبی بۆ شنگالێ كرییە، و سەركردە هەرسەمە كورێ عەرەفەجەی عەرەب ل مووسلێ و دەڤەرێن ب سەرڤە ئاكنجی كرینە، و هاتنا عەرەبان یا بەردەوام بوو د سەردەمێ حوكمرانییا خەلیفە ئوسمان كورێ عەفانی دا (رازیبوونا خوێ ل سەر بیت) كو عەشیرەتێن تەمیم و رابیە و مازحین و مودەبیر و هندەكێن دیتر ل بازێرێن جەزیرێ ئاكنجیكرینە. بنێرە: فتوح البلدان، تحقیق رضوان محمد رضوان، دار الكتب العلمیة، (بیروت : ١٩٩١)، بث ١٨٢، فائزة محمد عزت، الكورد في اقلیم الجزیرة وشهرزور، بث بث ١٤٢ – ١٤٣.
٣٠. عبد الله ناصرین سلیمان الحارثي، الاوضاع الحضاریة في اقلیم الجزیرة الفراتیة في القرنین ( ٦ -٧هـ)/ ١٢ – ١٣ م) تحقیق سعید عبد الفتاح عاشور، تقدیم أ.د. مصطفى عبد القادر النجار، الدار العربیة للموسوعات، (بیروت: ٢٠٠٧)، بث بث ٤٤١ – ٤٤٢.
٣١. ل دۆر خزمانییا دناڤبەرا عەشیرەتێن كوردی و عەرەبی دا بنێرە: فائزة محمد عزت، الحیاة الاجتماعیة للكورد بین القرنین (٤ - ٩ هـ /١٠ – ١٥ م)، مطبعة الحاج هاشم، (اربیل :٢٠٠٩)، بث ٨٢.
٣٢. عبد الله الحارثي، الاوضاع الحضاریة ، بث بث ٤٤٥ - ٤٤٦.
٣٣. رابیعە فەتاح شیخ محەمەد، كوردستان لە سەدی پازدەی زاینیدا، چاپخانەی رۆشنبیری، (هەولێر: ٢٠٠٥ ) ، بث ٣٣٩.
٣٤. البدلیسي ، شرفنامه، بث بث ٥١ ، ٢٥٧.
٣٥. م . ن ، بث ٢٥٤.
٣٦. م . ن ، بث ٢٥٤.
٣٧. م . ن ، بث ٢٥٧.
٣٨. رحلة بنیامین، ترجمة عن الاصل العربي عزرا حداد، ط ١، المطبعة الشرقیة، (بغداد: ١٩٤٥)، ص١٥٤.
٣٩. بناز اسماعیل عدو، اهل الذمة في بلاد الكرد في العصر العباسي، مؤسسة موكریاني،(اربیل: ٢٠١١ )، ص ٥٥.
٤٠. ل دۆر بەلاڤبوونا مەسیحیەتێ ل بەهدینان بنێرە: فائزة محمد عزت ، الكورد في اقلیم الجزیرة وشهرزور، بث بث ٩٤ – ١٠٠.
٤١. مروج الذهب ومعادن الجوهر، بنێرە محمد محي الدین عبد الحمید ، ض ٥ ، دار الفكر ، (بیروت: ١٩٧٣)، ٢/ ١٢٤.
٤٢. رحلة ماركو ابولو، ترجمها الى العربیة عبد العزیز جاوید ، ط ٢، الهیئة المصریة العامة (د.م: ١٩٩٥)، 56/1.
٤٣. ل دۆر دێران بنێرە : یاقوت الحموي، معجم البلدان، ٢/ ٥٣٠ – ٥٣٨.
٤٤. ابن خلكان، وفیات الاعیان وانباء ابناء الزمان، تحقیق احسان عباس، دار صادر، (بیروت: ١٩٧٠)، ٢٥٤/٣.
٤٥. عباس العزاوي، عشائر العراق، ٢/٢٠٠-٢٠٤، انور مائي، الاكراد في بهدینان، بث بث ١٢٤- ١٣٥.
٤٦. ابن العبري، تاریخ مختصر الدول، المطبعة الكاثولیكیة (بیروت: ١٩٥٨)، ص ٢٨٣ ؛ ابن العبري، تاریخ الزمان، ترجمة الاب اسحق، دار المشرق، (بیروت:١٩٩١)، صص ٣٢٠- ٣٢١.
٤٧. الغساني، العسجد المسبوك، و الجوهر المحكوك في طبقات الخلفاء و الملوك، تحقیق محمود عبدالمنعم، دار البیان، (بغداد: ١٩٥٧)، ص ٦٠١.
٤٨. الجاحظ، التاج في اخلاق الملوك ، دار نوبلیس ، (بیروت: ٢٠٠٥)، ص ص ١٢١، ١٢٣.
٤٩. ل دۆر دەرەبەگایەتی و جۆرێن وێ بنێرە: نوري عبد الحمید العاني، العراق في العهد الجلائري (٧٣٨ – ٨٠٤هـ/ ١٣٣٧ –١٤١١ م)، ط١، دار الشؤن الثقافیة، (بغداد:١٩٨٦)، ص ص ١٩٢- ٢٠٠؛ سوادي عبد محمد، الاحوال الاجتماعیة و الاقتصادیة في بلاد الجزیرة الفراتیة خلال القرن ٦هـ/١٢م ، ط ١ ، دار الشؤون الثقافیة (بغداد : ١٩٨٩)، بث بث ٢٣٥ – ٢٤٧.
٥٠. مسالك الابصار، ١٧٢/٣.
٥١. نوري عبد الحمید العاني ، العراق في عهد الجلائري، ص ص ٥٣- ٥٤.
٥٢. جاسم مهاوي حسین، تاریخ الغزو التیموري للعراق والشام، رسالة ماجستیر غیر منشورة، جامعة بغداد، (بغداد: ١٩٧٦)،ص٣٣٠.
٥٣. شرفنامه، بث ٢٥٨.

٥٤. م.ن، ٥٠٣، علاء محمود خليل القداوي ، العراق في القرن التاسع الهجري/ الخامس عشر الميلادي، اطروحة دكتوراه غير منشورة، جامعة الموصل، (الموصل: ١٩٩٣)، بث٥٠٢.
٥٥. زرار صديق توفيق، كردستان في القرن الثامن الهجري، ط١، مطبعة وزارة الثقافة، (اربيل ٢٠٠١)، بث ٣٢٥.
٥٦. التعريف بالمصطلح الشريف، تحقيق محمد حسين شمس الدين، ط ١، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٨٨)، بث ٥٩.
٥٧. مجمع الاداب في معجم الالقاب ،تحقيق محمد الكاظم، ط١، وزارة الثقافة والارشاد القومي، (طهران: ١٤٧٦هـ )، ٣٢٦/٤-٣٢٧.
٥٨. البدليسي، شرفنامه، بث ٢٥٤.
٥٩. مجمع الاداب، ٣٢٥/٤ - ٣٢٧.
٦٠. العمري مسالك الابصار ، ١٧٢/٣ - ١٧٣ .
٦١. م. ن، ١٧٢/٣ .
٦٢. دزدار: پەیڤەكا فارسی یە پێكهاتییە ژ دو برگا (دز) رامانا وێ كەلایە و(دار) رامان ژێ خودانە یان ئەوێ د پارێزیت، لەوا دێ بیتە پارێ زەرێ كەلایێ یان ئەوێ سەرپەرشتیا وێ دكەت، بنێرە. درويش يوسف حسن هروري، بلاد هكاري ٩٤٥ – ١٣٣٦م دراسة سياسية حضارية، (دهۆك ٢٠٠٥)، بث ٢٠٥.
٦٣. مجمع الاداب ١-١٠٠ – ١٠١.
٦٤. معجم البلدان ، ١٣٦/٤.
٦٥. شرفنامه، بث ٢٥٧.
٦٦. م . ن ، بث٥٣.
٦٧. م . ن ، بث ٢٥٤.
٦٨. انور المائي، الاكراد في بهدينان، بث بث ١٨٢ – ١٨٣.
٦٩. قلائد الجمان في فرائد شعراء هذا الزمان، تحقيق د.نوري حمودي القيسي ومحمد نايف الدليمي، ط١، دار الكتب للطباعة والنشر، (الموصل: ١٩٩٢ )، ٣١/٣ – ٣٢.
٧٠. معجم البلدان، ١٣٦/٤، ياقوت الحموي، المشترك وضعا والمفترق صقعا، طبعة كوتنكن، ١٨٤٦، بث بث ٣١٣- ٣١٤.
٧١. انور مائي، الاكراد في بهدينان، بث بث ٢٥٠ – ٢٥١.
٧٢. القداوي ، العراق في القرن التاسع الهجري، بث ٣٣٣.
٧٣. زرار صديق توفيق، القبائل والزعامات، بث ١١٤.
٧٤. انور مائي ، الاكراد في بهدينان، بث بث ٢٥٠ – ٢٥١ .
٧٥. رحلة بنيامين، بث ١٥٤.
٧٦. الاصطخري، المسالك والممالك، تحقيق محمد جابر عبد العال الحسني، الهيئة العامة لقصور الثقافة، (القاهرة : ٢٠٠٤ )، بث٧٢.
٧٧. م . ن، بث ٧٢.
٧٨. فائزة محمد عزت، الحياة الاجتماعية للكورد، بث ٤٠.
٧٩. العمري، مسالك الابصار، ١٧٨/٣ .
٨٠. م . ن ، ١٧٨/٣.
٨١. ابن العبري، تاريخ الزمان، ترجمة الاب اسحق ارملة ن دار المشرق، بث ٢٥٠، درويش يوسف، بلاد هكاري، بث ٢٢٥.
٨٢. ل دۆر هەناردەیێن بەهدینان بنێرە: ياقوت الحموي معجم البلدان، ٢٥١/٤، ٤٠٣/٥، العمري، مسالك الابصار، ١٧٥/٣ – ١٧٦، درويش يوسف، بلاد هكاري، بث بث ٢٢٢ – ٢٢٣.
٨٣. مجمع الاداب، ٥١١/٣.
٨٤. رحلة ابن بطوطة المسماة تحفة النظار في غرائب الامصار، شرحة و كتب هوامشة طلال حرب، دار الكتب العلمية، (بيروت:د. ت)، بث بث ٦٣٥ - ٦٣٦.

٨٥. هلبین باجلوري، الكورد الحمیدیة ـ بث ٤٤.
٨٦. نقلا عن درویش یوسف، بلاد هكاري، بث ٢٢٥.
٨٧. نقلا عن زرار صدیق، كردستان ، بث ٢٨٥.
٨٨. البدلیسي ، شرفنامه، بث ٢٣٩.
٨٩. مسالك الابصار، ١٧٢/٣.
٩٠. م ٠ ن ، ١٧٨/٣.
٩١. البدلیسي، شرفنامه، بث ٢٥٨، رابیعة فتاح، كوردستان، بث بث ١٦٣ -١٧٠ ، ٢٦٩.
٩٢. زبدة الاثار الجلیة في الحوادث الارضیة، تحقیق عماد عبد السلام رؤوف، مطبعة الاداب، (النجف: ١٩٧٤)، بث بث ٥٦، ٥٨.
٩٣. العمري، مسالك الابصار، ١٧٢/٣، و گوندی خلبتا دەهێكا بەرهەمی دىا، ل دویف گوتنا ئەلحەمەوی (چەم و بیستانێن وان دەهكى بوون ((واتە یەك ژ دەهێ)) بنێرە: معجم البلدان، ٣٨١/٢.
٩٤. یاقوت الحموي، معجم البلدان، ١٧٨/٢، ٣٧٢/٣، درویش یوسف، بلاد هكاری، بث ٢١٣.
٩٥. ابو الفداء، تقویم البلدان، ض ١، مكتبة الثقافة الدینیة، ( القاهرة : ٢٠٠٧)، بث ٣١٥.
٩٦. یاقوت الحموي، المشترك وضعا، بث ١٣٤.
٩٧. یاقوت الحموي ، معجم البلدان ، ٣٨١/٢.
٩٨. مسالك الابصار، ٣/ ١٧١-١٧٧.
٩٩. م ٠ ن، ١٧٦/٣.
١٠٠. علي سیدو الكوراني من عمان الى العمادیة، بث بث ١٤٠، ١٦٠، صدیق الدملوجي، امارة بهدینان الكردیة، بث بث ١٣٦ - ١٣٧.
١٠١. نزهة القلوب، تحقیق محمد دبیرسیاقي، مطبعة الحیدري، (طهران: ١٣٣٦ ش )، بث ١٢٤.
١٠٢. رحلة بنیامین، بث ١٥٤ .
١٠٣. العسجد المسبوك و ... ، (بغداد: ١٩٧٥)، ص ٦٠١.
١٠٤. فائزة محمد عزت، الحیاة الاجتماعیة للكورد، بث ٥٧.
١٠٥. صدیق الدملوجي، امارة بهدینان الكردیة، بث ١٣٢.
١٠٦. العمري، مسالك الابصار، ٣/ ١٧٦.
١٠٧. المقدسي، احسن التقاسیم في معرفة الاقالیم، تحقیق محمد مخزوم، دار التراث العربي، (بیروت ك١٩٨٧)، بث ١٢٨.
١٠٨. ڤەگوهاستن ژ زرار صدیق توفیق، كردستان، بث ٣٢٢.
١٠٩. البدلیسي، شرفنامه، بث ٤٤٤.
١١٠. فائزة محمد عزت، الحیاة الاجتماعیة للكورد، بث ٧٧ — ٨٠.
١١١. بنێرە عباس العزاوي، عشائر العراق ن ١٣/٢ ، ١٩٠، فائزة محمد عزت، الحیاة الاجتماعیة للكورد، بث بث ٧٨ - ٧٩.
١١٢. العمري، مسالك الابصار، ١٧١/٣.
١١٣. البدلیسي، شرفنامه، بث ٤٤٣ - ٤٤٤.
١١٤. عباس العزاوي، عشائر العراق، ١٩٥/٢ - ١٩٦.
١١٥. العمري، مسالك الابصار، ١٧٦/٣.
١١٦. شرفنامه، بث ٥٩ .
١١٧. ل دۆر وان داب و نەریتان بنێرە: عباس العزاوي، عشائر العراق، ٢٤٠/٢ -٢٤٢.
١١٨. مەلا محمودی بایەزیدی، داب ونەریتی كوردەكان، وەرگێران شكریە رسول، چاپخانا واوفیست العدالة، ( بغداد: ١٩٨٢)،بث ٢٦.
١١٩. رحلة ابن بطوطة، بث ٢٥١.
١٢٠. علي سیدو الكوراني، من عمان الى العمادیة، بث ١٦٠.

١٢١. تاريخ حوداث الزمان وانباءه ووفيات الاكابر والاعيان من ابنائه المعروف بتاريخ ابن الجزري، تحقيق د. عمر عبد السلام تدمري،
ض ١، المكتبة العصرية، (بيروت: ١٩٩٨)، ٧٧/١.
١٢٢. معجم البلدان، ١٥٣/٤.
١٢٣. خطيب العمري، منهل الاولياء ومشرب الاصفياء من سادات الموصل الحدباء، تحقيق سعيد الديوه جي، مطبعة الجمهورية، (الموصل: ١٩٦٧)، ٦٧/١، دەمەلوجی وەسا هزر دكەت كو ئەڤ مەزارە نەیێ شێخ عەبدولعەزیز گەیلانی یە چونكی ناڤبری یێ ل ئێك ژ گوندێن شنگالێ مری دبێژنێ(حەیال) بەلكو هزر دكەت كو ئەڤ مەزارە دزڤریت بۆ ئێك ژ نفشێن
شێخ عەبدولقادری، بنێرە: امارة بهدينان الكردية، بث ١٢٧.
١٢٤. ابن خلكان، وفيات الاعيان، ٢٥٤/٣.
١٢٥. العمري، التعريف، بث بث ٥٨- ٥٩.
١٢٦. انور مائي، الاكراد في بهدينان، بث ٢٨١.
١٢٧. ل دۆر بكارئینانا لازوردی بنێرە: الانصاري، نخبة الدهر في عجائب البر والبحر، ض ٢، دار احياء التراث العربي، (بيروت:١٩٩٨)، بث ٩٧، درويش هروري، بلاد هكاري، بث بث ٢٢٠ – ٢٢١.
١٢٨. ياقوت الحموي، معجم البلدان، ٤٠٣/٥، درويش هروري، بلاد هكاري، بث ٢٢١.
١٢٩. ل دۆر بكارئینانا زەرنیخی بنێرە: اوليا جلبي، رحلة اوليا جلبي في كوردستان ترجمة رشيد فندي، ط ١، مطبعة خاني،(دهۆك، ٢٠٠٨)، بث ١٨٥.
١٣٠. نيبور، رحلة نيبور، بث ٧٧.
١٣١. زرار صديق توفيق، كردستان، بث ٣٢٤.
١٣٢. رحلة بنيامين، بث ١٥٤.
١٣٣. دريد عبد القادر نوري، العلوم العقلية، موسوعة الموصل الحضاري، دار الكتب للطباعة والنشر (الموصل: ١٩٩٢)، مج ٣، بث بث ٢٠١- ٢٠٢.
١٣٤. مؤلف مجهول، الحوادث الجامعة والتجارب النافعة والمنسوب لابن الفوطي تحقيق د. بشار عواد، د. عماد عبد السلام رؤوف، ط ١، دار الغرب الاسلامي، (بيروت: ١٩٩٧)، بث ٤٦٨.
١٣٥. فائزة محمد عزت، الحياة الاجتماعية للكورد، بث ١٠١.
١٣٦. البدليسي، شرفنامه، بث ٢٣٩، رابعة فتاح، كوردستان، بث بث ٣٦٢ – ٣٦٣.
١٣٧. ابن الجزري، حوادث الزمان وانبائه، ٧٩/١.
١٣٨. ابو الفداء، تقويم البلدان، بث ٣١٥، نيبور، رحلة نيبور، بث ٧٦.
١٣٩. ياقوت الحموي، معجم البلدان، ٣٧٢/٣.
١٤٠. م. ن، ٤٠٣/٥.
١٤١. فائزة محمد عزت، الحياة الاجتماعية للكورد، بث١٣٢.
١٤٢. رحلة ابن بطوطة، بث٢٤٨.
١٤٣. الانصارى، نخبة الدهر، ٢٥٥-٢٥٦.
١٤٤. البدليسى، شرفنامة، بث٢٤٥.
١٤٥. العمرى، مسالك الابصار، ١٧/٣.
١٤٦. العمرى، التعريف، بث٥٩.
١٤٧. عبد الرقيب يوسف، الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى ط٢ ، دار ئاراس، (اربيل: ٢٠٠١ )، ٢/ ١٥٢.
١٤٨. العمري، التعريف، بث ٥٩.

١٤٩. م. ن، بث بث ٣٠٢ - ٣٠٣.

١٥٠. انور مائي، الاكراد، بث ٢٨٠.

١٥١. العمري، التعريف، بث ٥٩.

١٥٢. زبدة الاثار الجلية، بث بث ٦٧ - ٦٨.

١٥٣. مروج الذهب، ٢٢١/٤.

١٥٤. العسقلاني، الدرر الكامنة في اعيان المائة الثامنة، دار الجيل، (بيروت:١٩٩٣ )، ١٦٤/٣، الحاج هاشم محمد الرجب، الموسيقيون والمغنون خلال الفترة المظلمة، (بغداد: ١٩٨)، بث بث ٢٦ - ٢٧.

١٥٥. بناز اسماعيل، اهل الذمة، بث ١١٤- ١١٥.

١٥٦. دەربارەی گێرانا ڕێورەسمێن جەژنێن رەمەزانێ و قوربانی ژلایێ كوردان ڤە بنێرە: فائزة محمد عزت ، الحياة الاجتماعية للكورد، بث بث ١٤٠ -١٤٢.

١٥٧. ئەوێ بوویە قوربان نە ئیسحاق پێغەمبەر بوویە بەلكو ئیسماعیل پێغەمبەر بۆ سلاڤێن خودێ ل سەر بن.

[illegible] دۆر جەژنێن جوهییان بنێرە: البيروني، الاثار الباقية عن القرون الخالية، (ليبزك: ١٨٧٦)، بث بث ٢٧٥ — ٢٨٥، النويري، نهاية [illegible]ب في فنون الادب، تحقيق د. مفيد قميحة، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠٠٤)، ١٨٤/١ - ١٨٦، بناز اسماعيل عدو، اهل الذمة، بث بث ٩٩-١٠٠.

١٥٩. ل دۆر جەژنێن مەسیحییان بنێرە: البيروني، الاثار الباقية، بث بث ٣٠٩ — ٣١٥، النويري، نهاية الارب، ١٨٠/١ — ١٨٤، بناز اسماعيل عدو، اهل الذمة، بث بث ١٠١ -١٠٤.

١٦٠. عدنان زبان فرحان، الكرد الايزيديون في اقليم كردستان، مركز كردستان للدراسات الاستراتيجية، (السليمانية: ٢٠٠٤ )، بث بث ٢٣٨ - ٢٤٣.

١٦١. ل دۆر ئاهەنگێن گشت كوردان ل جەژنا نەوروزێ بنێرە: فائزة محمد عزت، الحياة الاجتماعية للكورد، بث بث

# بادینان لەسەردەمی مەغۆلی ئیلخانی

**پ.د.قادر محەمەد حسن**
**زانکۆیا سەلاحەدین - کۆلیژا ئەدەبیات**

مەغۆلەکان لە بنەچەدا کۆمەڵەهۆزێك بوون کە لە باکووری تبت و ڕۆژهەڵاتی تورکستان و بەگشتی لە ئاسیای ناوڕاست و ڕۆژئاوای چین بڵاو بوو بوونەوەو بەپەرش و بڵاوی خەریکی ماڵات بەخێوکردن بوون و ژیانیان سەخت و بێ ئیرو بوو، بۆیە بایەخی زۆریان بە شەڕو جەنگاوەری داوەو بۆ بژێویان پشتیان بەتاڵان و بڕۆی جەنگی بەستوە[1].

بەدەرکەوتنی جەنگیزخان بوونی بە سەرکردەی مەغۆلەکان بەتایبەتی کە لەساڵی ٦٠٣ك/١٢٠٦ز بە خانی مەزنی مەغۆلان دیاریکرا، ئیدی مێژووی مەغۆلەکان و هەروەتر ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیش دەچێتە قۆناغێکی دیکە، چونکە لەسۆنگەی ئەو بێهێزیەی خەلافەتی عەباسی تێکەوتبوو هەروەها ئەو هەڤرکی و وێرانکارییەی دەوڵەتی خوارزمی لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی هێنابوویە ئاراوە، ئیدی هەلو مەرج گونجاو بوو بۆ وەی جەنگیزخان لەساڵی ٦١٦ك/١٢١٩ز هێرش بکاتە سەر جیهانی ئیسلامی و بەرەبەرە هێرشەکانیان بەردەوام بوون تا توانیان بەسەرکردایەتی هولاکو لەساڵی ٦٥٦ك/١٢٥٨ز شاری بەغدا بگرن وکۆتایی بە خیلافەی عەباسی بهێنن[2]. ئەو دەوڵەتەی هولاکو بنیادی ناو جێگرەوەکانی درێژەیان پێدا بە مەغۆلی ئیلخانی بەناوبانگە کە هەتا ساڵی ٧٣٦ك/١٣٣٦ز درێژەی هەبوو هەشتا و دوو ساڵی خایاند.[3]

لەگەڵ بڵاوبوونەوەی مەغۆلەکان لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی،کوردستانیش بەشێوازی جیاجیا دەرگیری هێرشەکانیان بۆتەوە[4]، دەڤەری بەهدینانیش بەدەر نەبووە لەو گۆڕانکاری و پێشهاتانەی ناوچەکەی گرتبۆوە،بەڵام چونکە دەڤەرەکە لەو سەردەمەدا بەشێك بووە لە قەڵەمڕەوی (بەدرەدین لۆلۆ)[5]کە لە موسڵەوە هەمەکارەیی ناوچەکانی بەهدینانیشی دەکردو لە ئامێدی کەسێك وەکو نوێنەری ئەو حوکمی دەکرد کە ناوی (عزەدین ئایبك) بوو[6]. وە بەدرەدین لۆلۆ هەر لەگەڵ لەشکرکێشی مەغۆلەکان دژایەتی نەکردن و دۆستایەتی لەگەڵ بنیات نان، بۆیە لەو ناوچانەی ئەو دەسەڵاتدار بوو کەمتر شاڵاوو وێرانکاری مەغۆلەکان لەسەرچاوە مێژوویەکاندا ئاماژەی پێکراوە.

بەڵام بەشێکی دیکەی دەڤەری بەهدینان کە ناوچەی ئاکرێ و شوش و دەورو بەریان بوو ،دەسەڵاتێکی خۆجهی کوردی لەوێ باڵادەست بوو کە میرێکی کوردی بەناوی (مبارزالدین كك ) سەرکردایەتی دەکردو ئەویش پەیوەندی لەگەڵ مەغۆلەکان هەبوو ،ئەوانیش ڕێزیان لێگرتووە و لەلای هولاکۆ پێگەیەکی تایبەتی هەبووەو ئاکرێ و شوشیان بەتەواوی پێبەخشیوە[٧]. بۆیە لەو ویرانکاری و ململانێیانەی ئەوکات ناوچەکەی گرتبۆوە، قەڵەمڕەوی مبارزالدین كك سەلامەت و پارێزراو بوو ئەمەش بەهۆی سیاسەتی لەبارو سەرکەوتوی ئەو میرە کوردە و چونیەتی مامەڵەکردنی لەگەڵ پەرەسەندن و گۆڕانکاریەکانی سەردەمەکەی[٨] .

دوای مردنی بەدرەدین لۆلۆ لەساڵی (٦٥٧ك/١٢٥٩ز) بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ قەڵەمڕەوەکەی لەنێو کوڕەکانیدا دابەش بوو، کوڕەگەورەکەی کەناوی(مەلیك صالح ئیسماعیل) بوو بە دەسەڵاتداری موسڵ کوڕەکەی دیکەی کەناوی عەلائەدین بوو ناوچەی شنگال بەرکەوت و کوڕکەی دیکەشی بوو بەدەسەڵاتداری ناوچەی جزیرەی بۆتان ،بەو پێیەش بێت دەڤەری بەهدینان(دەڤەری ئامیدی و قەڵا و ئاوەدانیەکانی دیکەی) دەکەوتە نێو چوارچێوەی قەڵەمڕەوی مەلیك صالح ئیسماعیل کە بۆ خۆی لە موسڵ دادەنیشت و لەرێی جێگرەکانییەوە حوکمی ئەو دەڤەرانە دەکرد[٩].

دیار ئەو پەرەسەندن و پێشڤەچونانەی کە ئەوکات ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیان گرتبۆوە، کاریگەری بەرچاویان بەسەر دیرۆکی دەڤەری بەهدینانەوە بە جێهێشتبوو ،کە لەهەموویان گرنگتر لەسەردەمی ئیلخانیدا ئەوەبوو کە هەندێك لەو هێزانەی لەناوچەکەدا باڵادەست بوون و بەدۆستایەتیان بۆ مەغۆلەکان ناسرابوون ،لەگەڵ بەهێزبوونی دەوڵەتی مەمالیك لە میسر و شام ،بەرەبەرە هەڵوێستیان لە دۆستایەتی مەغۆلەکان دەگۆڕێت بەتایبەتی کە مەغۆلەکان تائەوکاتیش نەبوو بوونە موسوڵمان و هەروەها ئەو پێگە بەهێزەشیان لەلاوازیدا بوو کەلەسۆنگەی لەشکرکێشی و توندوتیژیەکەیانەوە بۆخۆیان چێکردبوو .

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستیەی ئاماژەمان پێدا کوڕەکانی بەدرەدین لۆلۆ لەسەر هەڵوێستی باوکیان لەدۆستایەتیکردنی مەغۆلەکان بەردەوام نەبوون ،بۆیە هەریەکە لە عەلائەدین فەرمانڕەوای شنگال و دواتریش مەلیك ساڵحی برای کە فەرمانڕەوای ناوچەی موسڵ و ئامێدی بوو وە سەیفەدین ئیسحاقی حاکمی جزیرەی بۆتانیش داینە پاڵ مەمالیك ئەمە لەساڵی ٦٥٩ك/١٢٦١ز[١٠]. پاش ئەو هەڵوێستەیان مەلیك زاهیر بیبرس سوڵتانی مەمالیك نووسراوێکی دامەزراندن و پێدان (التقلید) ی پێبەخشین کە بەپێی ئەو نووسراوە مەلیك ساڵح ئیسماعیل کراوە بەفەرمانڕەوای هەموو موسڵ بە قەڵا و دەڤەر و ناوچەکانی کە لەناویاندا ئاماژە بە قەڵای ئامێدی و ناوچەکانی و هەروەها ئاکری و شوش و ناوچەکانی سەربەوێ و وە هرور و کەواشی و جلسورا و ناوچەکانیان کراوە[١١]، کە ئەمەش دەری دەخات کە دەڤەری بەهدینان لە نێو ئەو قەڵەمڕەوەدا بووە کە بەو فەرمانەی سوڵتانی مەمالیك دراوەتە مەلیك ساڵح ئیسماعیل ،هەرچەندە مەمالیکەکان دەسەڵاتداری موسڵ نەبوون و ئەو ناوچانە نەکەوتبۆ بن دەستیان و هەر لەژێرکاریگەری سیاسەتی مەغۆلەکان دابوو،بەڵام ئەمە سەلماندن و دوپاتکردنەوەی هەمان ئەو سنوری قەڵەمڕەوە بوو کە پێشتر بنەماڵەی بەدرەدین لۆلۆ تێیدا باڵادەست بوون.

مەلیك ساڵح ئیسماعیل پاش ئەو فەرمانەی لەلایەن سولتانی مەمالیکەوە بۆی دەرچوو ،هەوڵی گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی بۆ موسڵ دا هەرچەندە توانی بۆماوەیەکی کەم بیگرێت، بەڵام لەلایەن سوپای مەغۆلەوە گەمارۆ دراو لەساڵی ٦٦٠ك/١٢٦١ز

کوژرا، بەڵام لەناوچەی ئامێدی و دەوروبەری هێشتا ئەو جێگرە فەرمانڕەوابوو کە پێشتر لەلایەن بەدرەدینەوە دانرابوو کە ئەویش (عزەدین ئایبك) بوو، کەواپێدەچێت توانیبێتی دۆستایەتی خۆی لەگەڵ مەغۆلەکان درێژە پێبدات و ئەوانیش بە فەرمانڕەوای ناوچەکە هێشتبوویانەوە، بەم شێوەیە ناوچەی ئامێدی جارێکی دیکە لەنێو ئەو شەڕ و کوشت و کوشتارەی سەردەمی مەغۆلەکان پارێزراوبوو[١٢].

دوای مردنی هولاکو لەساڵی ٦٦٣ك/١٢٦٤ز کوڕەکەی بەناوی ئەباقاخان جێگای گرتەوە کەلەسەر هەمان سیاسەتی باوکی ڕۆیشت و ئەوەی پەیوەست بێت بە مێژووی بەهدینان لەو سەردەمەدا ئەوەیە کە عزەدین ئایبك دەسەڵاتداری ئامێدی سەردانی ئەباقاخانی کردوە لە مەراغە لەساڵی ٦٦٧ك/١٢٦٨ز[١٣].هەرچەندە نازانرێ ئەو سەردانە بەچ مەبەستێك بووە بەتایبەتی کەدوای چوار ساڵ لەدەستبەکار بوونی ئەباقاخان بووە ،ئەگەر لەسەرەتادابا ڕێی تێدەچوو بۆ پیرۆزبایکردن با لەوەی کەبووەتە خانی مەغۆل وە بۆ ئەوەی حوکمی ناوچەی ئامێدی پێبسپێرێتەوە وەکو سەردەمی هولاکو ،بەڵام هەرچۆنێك بێت سەردانی دۆستانە بووە وسەلمێنەری ئەوەیە کە عزەدین ئایبك هەر هەمەکارەی مەغۆلەکان بووە بەسەر ئامێدیەوەو بەناوی ئەوان درێژەی بەحوکم داوە .

دوای ئەوە چارەنووسی ئایبك بەناڕۆشنی ماوەتەوە نازانرێ کەنگێ کۆتایی بە حوکمی هاتووەو، هەرلەو سەرو بەندانەدا کەسێك والی موسڵ بووە بەناوی (مسعود البرقوطی) کە خەڵکی گوندێکی نزیکی هەولێر بووە، دیارە والی مەغۆلەکان بووە لەو دەڤەرە ،لەو کاتەش دەڤەرە شاخاویەکانی بەهدینان وە بەتایبەتی لە ئامێدی و دەوروبەری دوبرا بەناوەکانی ئەبوبەکر و عەلی لەدژی مەغولەکان سەرکردایەتی ڕاپەڕینێك دەکەن کە بەرقوتی بەفێڵ و چاووڕاو دەتوانێ میر ئەبوبەکر بکوژێت، بەڵام میر عەلی برای هەر لەوناوچانە لە دژی مەغۆلەکان درێژە بە یاخی بوون دەدات کە دیارە پێگەی دەسەڵاتەکەی لە قەڵای هرور بووە، پاش مردنیشی کوڕەکەی بەناوی(غرس الدین) جێگای گرتۆتەوە[١٤].

بەم شێوەیە دەردەکەوێت کە ناوچەی بەهدینان وبەتایبەتی دەڤەری ئامێدی و قەڵای هرورو دورماندوریان جارێکی دیکە لەلایەن کوردانی ناوچەکەوە فەرمانڕەوایی کراونەتەوەو بەپشتیوانی هۆزەکوردیەکان توانراوە حوکمی خۆجهی کورد لەو ناوچانە کە ڕیشاژوی چەندان ساڵ بووە، درێژەی پێبدرێت .

لە ئالیەکی دیکە دەڤەری ئاکرێ و شوش هەر لەلایەن (مبارزالدین کك) فەرمانڕەوایی کراوە و میرنشینی مازنجانی دامەزراندوە، پێدەچێت لەلایەن جیگرەوانی هولاکۆوە دەسەڵاتەکەی سەلمێنرابێ و ئەو پێگەیەی کەلەدەوڵەتی هولاکۆدا هەیبوە یارمەتیدەر بووە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی بەردەوام بەسەر ئەو ناوچانەوە دەست ڕۆیشتوو بوو بێت .ماوەی درێژی حوکمکردنی کە نزیکەی حەفتا ساڵ بووە چونکە هەتا دەوروبەری ساڵی ٧١٠ك /١٣١٠ز فەرمانڕەوا بووە، هۆکار بووە بۆئەوەی لەماوەی فەرمانڕەواییەکەیدا چەند کارێکی ئاڤەدانی ئەنجام بدات ئەوەی مێژوو لەم بارەیەوە پاراستویەتی ئەوەیە کە قوتابخانەیەکی مەزنی بنیادناوە و وەقفێکی زۆری بۆ تەرخانکردووە[١٥].

لەدوای مبارزالدین کك فەرمانڕەوایی بەشێکی دیاری دەڤەری بەهدینان لە ئاکرێ و شوش و دورماندۆریان دەکەوێتە دەستی کوڕەکانی کە هەریەکە لە عزالدین و براکەی بەناوی (نجم الدین خضر) لە کۆتاییەکانی سەردەمی دەوڵەتی مەغۆلی ئیلخانی حوکمی ئەو ناوچەیەیان کردووە[١٦]کە ئەوانیش بەهەمان شێوەی باوکیان توانیویانە هاوسەنگی بپارێزن لەنێوان قایلکردنی مەغۆلەکان و دۆستایەتیکردنی مەمالیکەکان، ئەمەش

لەرێگای ناردنی باجی سالانەی میرایەتیەکەیان بۆ دەسەلاتدارانی مەغۆل و لەهەمان کاتیشدا پاراستنی پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ مەمالیك[17].

هەر لەو سەردەمەدا دەڤەری بەهدینان و بەدیاریکراوی لە ئاکرێ و شوش و دەروبەریان ناوی هۆزی (زێباری) دێت کە لەسەردەمی ئیلخانیەکان لەلایەن دوو میرەوە فەرمانرەوایی کراون و نیمچە میرنشینێکیان هەبووە، ئەوانیش میر ئیبراهیم کوڕی میر محەمەدی زابی و شەهابەدین کوڕی محەمەد برش بوون کە پێنسەد جەنگاوەریان هەبووە و لەبەر نزیکی ناوچەکانیان لەقەڵەمڕەوی مازنجنییەکان کە (مبارزالدین کك) سەرکردایەتی دەکردن، تێبینی دەکرێت کە لەناکۆکی بەردەوام دابوون و لەدوای مەرگی میر ئیبراهیم لەبەر بێهێزی جێگرەوانی تێبینی دەکرێت (مبارزالدین كك) توانیویەتی سنووری دەسەلاتەکەی لەسەر حیسابی ئەوان فراوان بکات ،بەلام دوای مەرگی میر مبارزالدین دەرفەت بۆ زێبارییەکان هاتە پێش تا دەسەلاتی جارانیان بگێڕنەوەو بەڵکو بەرەبەرە توانییان کۆتایی بەفەرمانڕووایی مازنجانیەکان بهێنن[18].

هەرچی دەڤەری ئامێدیە بۆماوەیەکی زۆر لە کۆتایی سەدەی حەوتەم و سەرەتای سەدەی هەشتەم /کۆتایی سەدەی سێزدەیەم وسەرەتای چواردەیەم لە سەرچاوە مێژوویەکاندا ئامازە پەرەسەندنە سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووریەکانی نەکراوەو لە کۆتایی سەردەمی ئیلخانیەکان دەڤەری ئامێدی لەلایەن کەسێکەوە فەرمانرەوایی کراوە بەناوی حاجی کوڕی عومەر[19]، کەنازانرێ کێ یە و چ وابەستەییەکی بە ماڵە میرانی ئامێدی پێش خۆیەوە هەیە؟ .

ئەوەی جێگای سەرنجە لەماوەی دەسەلاتداریەتی مەغۆلی ئیلخانی دا دیرۆکی بەهدینان هەرچەندە زۆر زەلال نیە و بەلام بەشێوەیەکی گشتی پەرەسەندنی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە، کە دیارترینیان درێژە پێدانی فەرمانرەوایی خۆجهی کوردی بووە کەلەچوارچێوەی ترادسیۆنی هۆزایەتیدا لەنێو ململانێیەکی گرگرتوو خوێناوی نێوان مەغۆل و نەیارانیدا توانیویەتی لەحوکمکردن بەردەوام بێت و هەروەتر مەغۆلەکانیش وێرای ئەو ئاکار توندیەی پێی ناسرابوون نەیانتوانیوە دەسەلاتی ڕاستەوخۆی خۆیان بەسەر ناوچەکەدا بسەپێنن، بەڵکو ناچار بوون دان بەدەسەلاتی هۆزە کوردیەکانی دەڤەرەکەدا بنێن و بەوە ڕازی بن کەبەناوی ئەوان حوکمی ناوچەکە بکەن هەرچەندە دەسەلاتداریەتی بەناوی مەغۆلەکانیشەوە هەمیشە مەیسەر نەبووە و جار جارە کوردەکانیش یاخی بوون و حوکمی خۆسەری تەواویان هەبووە . بەلام دیرۆکی ناوچەکەش بەدەر نەبووە لەململانێی ناوخۆیی و جا چ لەسەر ئاستی بنەماڵەی دەسەلاتداری نیمچە میرنشینەکان دا بوویێت یان لەنێوان خودی ئەو دەسەلاتداریەتە خۆجهیانە هەریەکەیان لەگەڵ ئەوەی دیکە لەپێناوی فراوانکردنی قەڵەمڕەوو دەستکەوتی زیاتر .

# ژێدەر و پەراوێز:


١. بروانه: عباس إقبال،تاريخ المغول منذ حملة جنطيزخان حتى قيام الولة التيمورية ،ترجمة:عبدالوهاب علوب،( ابوظبي:٢٠٠٠ ) ص٥١-٥٧.

٢. عطاملك الجويني، تاريخ جهانكشاي، تصحيح: محەمەد قزويني،(تهران:١٩٩٩)ج٣،ص١٠٧-١١٥، رشيدالدين فضل الله الهمذاني، جامع التواريخ، نقله الى العربية: محەمەد صادق نشأت وآخرون،(القاهرة:١٩٦٠م)مج٢ج١ ص٢٦٦-٢٦٧.

٣. ابوالفضل نبئي،اوضاع سياسي و اجنماعي ايران در قرن هشتم هجري،(مشهد:١٣٨٤) ص دوازدة.

٤. بۆ پتر زانیاری لەم بارەیەوە بروانه:عبدالله العلياوي، كوردستان في عهد المغول،(السليمانية:٢٠٠٥) ؛عبدالحليم عبدالله فارس العزاوي،دور الكرد في مقاومة الغزو المغولي (٦٥٦ه/١٢٥٨م) .

٥. بەدرەدین لۆلۆ:کەبە الملك الرحيم ناسراوە ،لەبنیاتدا ئەرمەنیە و لەدەرباری نورەدین ئەرسەلان شا و لەلای ئەتابکەکانی موسل پیگەیشتووە ،ماوەیەکی زور دەسەلاتی بەسەر موسل و ناوچەکانی جزیرەو وولاتی هەکاری دا هەبووە و دوستی مەغولەکان بووە ،لەسالی ٦٥٧ك/١٢٥٨ز مردووە .ابن العبري،تاريخ مختصر الدول،(بيروت:١٩٥٨م)ص٢٧٩؛سوادي عبد محەمەد،امارة الموصل في عهد بدرالدين لؤلؤ،(بغداد:١٩٧١م)ص٢٢-٢٧.

٦. ابن العبري، تاريخ الزمان،نقله الى العربية ،الاب اسحاق ارملة،(بيروت:١٩٩١)ص٣٢١؛ابن الفوطي، مجمع الآداب في معجم الألقاب،تحقيق:محەمەد الكاظم،(طهران:١٤١٦) ج١ص١٠٠-١٠٢.

٧. القلقشندي،صبح الأعشى في صناعة الإنشا،علق عليه: محەمەد حسين شمس الدين،(بيروت:١٩٨٧)ج٤ ص٣٧٥.

٨. عبدالله العلياوي،كوردستان في عهد المغول،ص ١٣٤.

٩. ابن العبري، تاريخ مختصر الدول،ص٢٧٩؛ درويش يوسف حسن، بلاد هكاري ٩٤٥- ١٣٣٦م دراسة سياسية حضارية،(دهۆك:٢٠٠٥) ص ١٧٠-١٧١.

١٠. ابن شداد، تاريخ الملك الظاهر،باعتناء: احمد حطيط،(فيسبادن:١٩٨٣) ص٣٣١-٣٣٢.-

١١. بروانه:ابن عبدالظاهر،الروض الزاهر في سيرة الملك الظاهر،تحقيق:عبدالعزيز الخويطر،(الرياض:١٩٧٦) ص١١٥.

١٢. ابن العبري، تاريخ الزمان ،ص ٣٢١-٣٢٣.

١٣. ابن الفوطي،مجمع الآداب ،ج١،ص١٠٠-١٠١.

١٤. ابن فضل الله العمري،مسالك الأبصار في ممالك الأمصار ،تحقيق:كامل سليمان الجبوري (بيروت:٢٠١٠) ج٣،ص ٢٠٥-٢٠٦

١٥. ابن الفوطي ،مجمع الآداب،ج٤،ص٣٢٧.

١٦. القلقشندي،صبح الأعشى ،ج٤٣٧٥-٣٧٦.

١٧. درويش يوسف،بلاد هكاري،ص ١٨٨-١٨٩.

١٨. ابن فضل الله العمري،مسالك الأبصار ،ج٣،ص٢٠٥.

١٩. القلقشندي،صبح الأعشى،ج٧،ص٢٧٦.

# بادینان لەسەردەمی جەلائیری

**پ.د.قادر محەمەد حسن**
**زانکۆیا سەلاحەدین - کۆلیژا ئەدەبیات**

دەوڵەتی مەغۆلی ئیلخانی بە مردنی سوڵتان ئەبوسەعید بەهادرخان لەساڵی ٧٣٦مـش/١٣٣٥ز ململانێی بنەماڵەیی بەخۆوە بینی، ئەمەش پتر بەهۆی ئەوەی کە سوڵتان وەجاخ کوێربوو، وە میرو کاربەدەستەکانیشی لەبەرناکۆکی نێوانیان و هەڵپەی بەردەوامیان بۆ بەرژەوەندی و دەسەلاتداریەتی، نەیانتوانی تەمەنی دەوڵەتەکە لەوە زیاتر درێژبکەنەوە، لەو نێوەدا، شێخ حەسەنی بزرگ (گەورە) کە هەمەکارەی ئاسیای بچووك (رۆم) و هەندێك دەڤەری دیکە بوو، توانی خۆی وەکو دەسەلاتدارێکی بەهێز بسەپێنێ و دەڤەرەکانی ئازربیجان و بەشی زۆری کوردستان بخاتە بن دەستی خۆی وە بنەماڵەیەکی دەسەلاتداریەتی بەناوی جەلائیریەکان کە ئیلکانیەکانیشیان پێدەگوترێت دابمەزرێنێ[1]. سەردەمی جەلائیری هەتا پەیدابوونی تەیمور لەنگ و دواتر بەهێزبوونی قەرەقوینلوە کان لەسەرەتای سەدەی پازدەیەمی زاینی بەردەوام بوو.

دوای دەرکەوتنی بنەماڵەی جەلایری وەکو جێگرەوەی ئیلخانیەکان بەشی زوری کوردستان هەر لەبن دەستیان مایەوە کەلەو ماوەیەدا گۆڕانکاری و پەرەسەندنی دیار دەڤەری گرتۆتەوەو کاریگەری بەسەر کۆی دیرۆکی کوردستانە وە بەجێهێشتووە[2]. دەڤەری بادینانیش وەکو بەشێکی کوردستان بەدەر نەبووە لەو پەرەسەندن و گۆڕانکاریانە کە هەندێکیان هەر درێژبووەی سەردەمی ئیلخانی بوون و ئەوەی تێبینی دەکرێت ناوچەکە کاریگەری سیاسەتی مەمالیکەکانیشی بەسەرەوە بووە و رەنگرێژی هەندێك لەو پەرەسەندنانەی کردووە کە کۆی دەڤەرەیان گرتۆتەوە.

لە ناوچەی ئاکرێ و شوش لەدوای مبارزالدین کك فەرمانڕەوایی ئەو ناوچانە دەکەوێتە دەستی کوڕەکانی کە هەریەکە لە: عزالدین و نجم الدین خضر لە کۆتاییەکانی سەردەمی دەوڵەتی مەغۆلی ئیلخانی حوکمی ئەو ناوچەیەیان کردووە[3] دەسەلاتداریەتیەکەیان هەر درێژبووەی سەردەمی مەغۆل بوو، ئەوانیش بەهەمان شێوەی باوکیان لە میرایەتیکردنی ناوچەکانی خۆیان بەردەوام بوون و درێژەیان بە پاراستنی هاوسەنگی لەنێوان قایلکردنی مەغۆلەکان و دۆستایەتیکردنی مەمالیکەکان داوە، ئەمەش لەرێگای ناردنی باجی سالانەی میرایەتیەکەیان بۆ دەسەلاتدارانی مەغۆل و لەهەمان کاتیشدا پاراستنی پەیوەندی دۆستانە

لەگەڵ مەمالیك[٤].هەرچەندە ماوەی فەرمانڕەوایی ئەو میرانە بە ساڵ لەسەرچاوە مێژووییەکاندا دیاری نەکراوە،بەلام مەزەندە دەکرێت بەشێکی ئەو ماوەیە لەدەستپێکی سەردەمی جەلائیری بووبێت .

میر نەجمەدین خضر کەدوای مەرگی میر عزەدینی برای فەرمانڕەوایی دەسەلاتداریەتی مازنجانییەکانی لە ئاکرێ وشوش وەرگرتووە، لەلایەن دەسەلاتدارانی مەمالیکیش ڕێزی لێنراوەو نامە گۆڕینەوەی لەگەڵیان هەبووە، وا پێدەچێت پتر خەریکی ڕابواردن وخۆشگوزەرانی و بایەخدان بە ئەدەب و خۆشخوانی بووە لەم بارەیەوە مێژوو نووسی هاوچەرخی سەردەمەکەی (ابن فضل الله العمري (م ٧٤٩ك/١٣٤٨ز)) نووسیویە:( ..وإنبساط في اللذات وشرف بالعرض والذات ،ويد لاتقصر بالادب،ولاتبالي بلاغتها بما تنفق من كنوز الفضه والذهب)[٥] ئەمەش وای لێ دەخوێنرێتەوە کە میر نەجمەدین بابایەکی مەجلیس گەرم و دەست بلاویش بووە .

نازانرێ میر نەجمەدین کەنگی کۆچی دوایی کردووە، بەلام دوای خۆی کوڕەکەی کەناوی شوجاعودین بووە جێگای گرتۆتەوە، ئەویش چونکە بوەتە جێگرەوەی میرێکی لاواز، نەیتوانیوە دۆخی میرایەتیەکەی ڕاست بکاتەوەو بەسەردەمی میر موبارزدینی باپیری شاد بکاتەوە،بۆیە گرفتی ناسەقامگیری ولەبارچوونی تەناهی و بلاوبوونەوەی دیاردەی دزی و ڕاوو ڕووت وبەرۆکی دەسەلاتداریەکەی گرتبوو، خودی میرو دارو دەستەکەی بێ دەرەتان و دەستەپاچە بوون و نەیانتوانیوە کۆتایی بەناجێگیری و ناهەمواری دۆخە کە بهێنن بۆیە بەرەبەرە دەسەلاتەکەیان بەرەو پوکانەوە چووە[٦].

ئاکرێ لە باسکردنی دیرۆکی بادینانی پەیوەست بە میرنشینی مازنجانی لە ئاکرێ و شوش بەتایبەتی لە مەسەلەی کۆتایی هاتنی فەرمانڕەوایی میرنشینەکە لەسەردەمی جەلایری ئاماژە بە ڕۆڵی هۆزی زێباری نەکەین کە ئەو کات وەکو هۆزێکی دیاری ناوچەکە ناوی دێت و پێدەچێت جۆرێك لەحوکمی خۆسەریان هەبووبێ لەو سەردەمەدا ئاماژە بۆ دوو میری زێباری کراوە ئەوانیش میر ئیبراهیم کوڕی میر محەمەدی زابی و شەهابەدین کوڕی محەمەد براش بوون، وادیارە ناوچەکانیان تخوب بەتخوبی قەڵەمڕەوی مازنجنییەکان بووە، ناکۆکی ناوخۆیشیان هەبووە، لەسەروبەندی لاوازی مازنجانییەکان بەتایبەتی لەماوەی فەرمانڕەوایی میر شوجاعودین دەرفەت بۆ زێبارییەکان هاتە پێش تا دەسەلاتی جارانیان- کە بەهۆی بەهێزی مازنجانییەکان واز بوو بوو- بگێڕنەوەو وە ڕێی تێدەچێت هەر بەهۆی ئەوانەوە کۆتایی بە دەسەلاتی مازنجانییەکان هاتبێت[٧]. بەلام جێگای سەرنجە کە مێژووی هۆزی زێبار دواتر ڕۆشن نیەو زانیاری ئەوتۆ لەبەر دەست دانین کە بتوانین لەسەردەمی جەلائیری وێناکردنێکی زەلال لەبارەیانەوە بەدەستەوە بدەین.

لەسەردەمی جەلائیری ئاماژە بە هۆزی سندی کراوە کە ئێستاش یەك لە هۆزە دیارەکانی دەڤەری بادینانە، لەو سەدەمەدا وەکو یەکێك لەگەورەترین هۆزە کوردیەکان ناوی هاتووە و وا نیشاندراوە کە هیچ هۆزێکی کوردی دیکە شان لەشانیان نادات و لەهەموان قەوغاتر و جەنگاوەرترن، ژمارەی شەرکەرانیان خۆی لە (٣٠٠٠٠) کەس داوە[٨]. جێگای سەرنجە کەلەسەرچاوە مێژووییەکانی بەردەستەکانی سەردەمی جەلائیری دا زانیاری دیکە لەبارەی ئەو هۆزە گەورەیەی دەڤەری بادینان ئاماژەیان پێنەکراوە ،بەلام ئەمە بەو مانایە نیە کەلەدیرۆکی سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووری ناوچەکەدا ڕۆڵی کەم و پەراوێزخراو بووە .

هەرچی کوردە داسنییەکانیشن کە زێد و شوێنەیێ ئاکنجی بوونیان چیای داسن و دەروبەری بووە لەباکووری موسڵ، بەهۆی هێرش و وێرانکاری مەغۆلەکان پەرش و بلاوبوون، میری گەورەیان ناوی بەدر کوڕی کیابك بووە، بەلام پاش ئەو نەهامەتییانەی بەسەریان هاتووە سەرکردایەتییەکی یەکگرتویان نەماوە، لەسەردەمی جەلائیری هەندێکیان لەمووسڵ گیرساونەتەوە بەسەرۆکایەتی میر عەلائەدین کوڕی کورك کوڕی ئیبراهیم وە هەندیکی دیکەیان لەلایەن

دوو میرەوە بەناوەكانی عومەر كوڕی ئەبوعەلی و موسی كوڕی بەهادین سەركردایەتی كراون، كەئەمەش بەڵگەی زۆری ژمارە و بەهێزی پێگەیانە كەلەو بارەیەوە مێژوونووسێكی هاوچەرخی سەردەمەكە نووسیویەتی:(الداسنية كانوا أوفى عدد وعدد وجمع ومدد ثم تشتت شملهم وتفرق جمعهم ...)[٩].

ئەوەی كە پەیوەندی بە دەڤەری ئامێدی و دەوروبەری هەبووە ئەوا لە و سەردەمەدا زانیاری پچڕ پچڕ لەو بارەیەوە یاداشت كراوە، مێژوونووس قەلقەشەندی ئاماژەی بەوە كردووە كە لەساڵی ٧٤٠ك/١٣٣٩ز كەسایەتییەك بەناوی حاجی كوڕی عومەر نامەی بۆ سوڵتانی مەمالیك لەمیسر،[١٠] نووسیوە كە ئەو - واتا حاجی- خودانی قەلای ئامێدیە[١١]. جێگای سەرنجە ئەو زانیاریانە هەر لە دیوانی فەرمی مەمالیكەكان جەختی لەسەر كراوەتەوەو هیچ ئاماژەیەكی دیكە لەبەردەست دانیە كە لەئالییەكی دیكە هەمان ئەو زانیاریانە یان بوونی كەسایەتییەك بەو ناوە دوویات بكەنەوە.

هەرچەندە لەبارەی میر حاجی كوری عمر زانیاریەكی ئەوتۆ لەبەر دەستدا نیە، بەلام رێی تێدەچێ كوری میر بەهائەدین عمر كوری ئیبراهیم ی هەكاری بێ كە هەر لەو سەروبەندانەدا ناوی هاتووە و لە قەلای گورگیل (حزدقیل) لەووەلاتی جەزیرە میرایەتی كردووە، دیارە نێوی حاجی لەو بنەماڵەیە باوبووە هەتادامەزرێنەری فەرمانرەوایی گورگیل بە میر حاجی بدر ناسراوە[١٢] وەلە ناو میرە هەكاریەكانی ئەو سەردەمەدا تەنها ئەو میر بەهائەدین عومەرە بەو ناوە ناسراوە.

گرنگترین پەرەسەندنی سیاسی لەدیرۆكی بادینانی ئەو كاتە دەركەوتن و سەرهەڵدانی میرنشینی بادینان كە ڕیشە مێژووییەكانی و چۆنیەتی دامەزراندنی جێگای گەنگەشە و بیرو بۆچوونی جۆراوجۆرن.

لە دەورووبەری ناوەراستی سەدەی هەشتەمی كۆچی- چواردەمی زاینی مێژووی ئامێدی روون نیە و دیار نیە كە كێ دەستەلاتداری ئەوێ بووە، بۆ ئەو سەردەمە، چەند ناوێكی میرە كوردەكانی دەڤەرەكەمان بە گشتی لە بەر دەست دایە كە دەیانخەینە روو قسەیان لە سەردەكەین:

- هەردو میر بەهائەدین كوری قوتبەدین (قطب الدين) و دواتر ئامۆزاكەی شەمسەدین كوری داود كە لە بنەماڵە هەكارییەكانی ناوچەی جولەمێرگ بوون لە گەل مەغۆلەكان پێكهاتوون كەدەڤەرەكەی خۆیان جێ بهێلن، لە ناوچەیەكی دیكە جێگیر بن كە لەوانەیە لە ئامێدی گیرسابنەوە[١٣]، ئەمە مێژووەكەی دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی یەكەمی سەدەی هەشتی كۆچی/چواردەهەمی زایینی، و تارادەیەك لەگەل ئەو زانیاریانەی شەرەفخانی بدلیسی دێتەوە كە یاداشتی كردووە. بەهائەدین و شەمسەدین و مەنتشا سێ برابوون و خزمایەتیان لە گەل میرانی هەكاری هەبووە و هەر یەكەیان لە جێگایەك دەسەلاتی ڕۆناوە و لەناویاندا میر بەهائەدین لە ئامێدی گیرساوەتەوە[١٤].

- هەروەها یەك لەو میرانەی كە لە هەمان سەردەمدا واتە دوای ناوەڕاستی سەدەی هەشتەم لە دەڤەرەكەدا حوكمی كرد وە ناوی بنكەی دەسەلاتداریەكەی بە (الرابيه) هاتووە كە قەلایەكی دەڤەری هەكارییە و فەرمانڕەوای بەناوی میر شەمسەدین كوڕی بەهائەدین بووە [١٥] كەئەویش ناوەكەی نزیكە لە بنەماڵەی دەسەلادارانی ئامێدی، پێدەچێ لە ماڵەمیرانی ئامێدی بێ[١٦].

- میر عیمادەدین كوری علی كوری موسا ئەودەمە وەكو خاوەنی ئامێدی (صاحب العماديه) ناوی هاتووە باس لەوە كراوە كە خاوەنی قەلای هروریش كەسێكە بەناوی بەهائەدین حەسەن كوری عیمادەدین[١٧]

بەلەبەرچاوگرتنی ئەو زانیاریە مێژووییانەی كەلەو بارەیەوە لەبەرچاومان گرتوون و دەگەڕێنەوە بۆسەردەمەكە، لە ووەلاتی هەكاری بەگشتی و لەدەڤەری ئامێدی بە تایبەتی، لەسەدەی هەشتەمی كۆچی-چواردەیەمی زاینی چوار كەسایەتیمان بەناوی (بەهائەدین)ەوە هەن یەكەیان میرو دەسەلاتدار یان

لەبنەماڵەی میران بوون ئەوانیش :

* بەهائەدین کوڕی ئیبراهیمی هەکاری
* بەهائەدین کوڕی قوتبەدین
* شمس الدین کوڕی بەهائەدین
* بەهائەدین حسن کوڕی عیمادەدین ئیسماعیل

کەڕوون نیە کێ هەیان ئەو بەهائەدینەیە کەمیرانی بادینانی لێ کەوتونەوە ؟[١٨]

بەشێوەیەکی گشتی مێژووی بادینان لەسەردەمی جەلائیری وێڕای نارۆشنی و کەمی زانیاریەکان لەبارەیەوە، بەڵام مکوم بوونی زیاتری دەسەڵاتی سیاسی کوردی بەخۆوە بینیوە کە خۆی لەدامەزراندنی میرنشینی بەهدینان دا دەبینێتەوە ،کە ڕوونە ناوەکەی هەر لە بەهادینی باپیرە گەورەی میرانی میرنشینەکەوە هاتووە و دواتر بووە تە شوناسی دەسەڵاتێکی سیاسی و بەرەبەرە لەسەردەمی نوێشدا بووەتە ناوی پانتاییەکی جوگرافی کە هەتا ئەمڕۆش بەو ناوە دەناسرێتەوە کە ئێستا پتر لە چوارچێوەی پارێزگای دهۆك دایە .

## ژێدەر:


١. بروانە: الهروي، تاريخ شيخ أويس (لاهة:١٩٦٦) ص ١٦٠-١٦٧.،ابوالفضل نبئي، اوضاع سياسى و أجتماعي ايران در قرن هشتم هجري،(مشهد:١٣٨٤) ص٣٧-٤٢.

٢. بو زياتر زانياری لەبارەی دیرۆکی کوردستانی ئەو حەلە بروانە: زرار صديق توفيق،كردستان في القرن الثامن الهجري،(اربيل:٢٠٠١).

٣. القلقشندي،صبح ألأعشى ، ج٥ ٤٣٧ -٣٧٦.

٤. درويش يوسف، بلاد هكاري، ص ١٨٨-١٨٩.

٥. مسالك ألأبصار ،ج٣ص ٢١٠.

٦. ابن فضل الله العمري، التعريف بالمصطلح الشريف،تحقيق:محەمەد حسين شمس الدين،(بيروت:١٩٨٨) ص٥٩-٦١.

٧. ابن فضل الله العمري، مسالك الأبصار ،ج٣،ص٢٠٥.

٨. المصدر نفسه،ج٣،ص٢٩٧.،القلقشندي ،صبح ألأعشى،ج٤،ص٣٧٨.

٩. ابن فضل الله العمري، مسالك الأبصار ،ج٣،ص٢٠٧.،همزة كاكة ياسين،كورد لة كتيبى(مسالك الأبصار في ممالك ألأمصار) ابن فضل الله العمري،نامەی دکتورای بلاونەکراوە ،پیشکەشی ئەنجوومەنی کولیجی ئاداب زانکۆی سەلاحەدین کراوە،(هەولیر:٢٠١٤) ل ١١٩.

١٠. سولتانی مەمالیك لەو سەردەمەدا

١١. صبح الأعشى، ج٧، ص٣٠٩

١٢. شەرفخانی بەدلیسی، شەرەفنامە ، وەرگیرانی : مامۆستا هەژار ، چاپی سێەم ( هەولێر، ٢٠٠٦ )، ل٢٠٤.

١٣. ابن فضل الله العمرى، مسالك ألأبصار ،ج٣،ص ٢٠٤.

١٤. شەرەفنامە،ل٢٨٠،زرار صديق ،كردستان في القرن الثامن الهجري،ص١٣٩.

١٥. ابن ناظر الجيش، كتاب تثقيف التعريف بالمصطلح الشريف، تحقيق: رودلف ظسلى (القاهرة:١٩٨٧)، ص ٨٠،بەراوردی بکە لەگەل: القلقشندى، صبح ألأعشى، ج٧، ص٣١١.

١٦. زرار صديق ،كردستان في القرن الثامن الهجري ،ص١٧١.

١٧. ابن ناظر الجيش، تثقيف التعريف ،ص ٨٠،٧٧.

١٨. بو زياتر زانیاری لەو بارەیەوە بروانە: قادر محەمەد پشدەری،دامەزراندنی میرنشینی بادینان توێژینەوەیەکی مێژوویی شروڤەکاری ،گۆڤاری ئەکادیمی،(هەولێر:٢٠٠٩) ژمارە :١٠ ل ١٥-٤٥.

# بادینان لە بەردەم داگیرکارییەکانی تەیمور لەنگدا

## (٧٨٩-٨٠٧ك/١٣٨٧-١٤٠٥ز)

رابیعە فەتاح شێخ محەممەد
زانکۆی سەلاحەدین - کۆلیژی ئەدەبیات

تەیمور کوڕی تورغای ناسراو بە تەیمورلەنگ (٧٣٦-٨٠٧ك/ ١٣٣٥-١٤٠٥ز) پادشای وەلاتی جوغاتای لە ئەودیوی رووبار، کە پایتەختەکەی سەمەرقەند بوو، بە درێژایی دوو دەیە (٧٨٧-٨٠٧ك/ ١٣٨٥-١٤٠٥ز) هەڵمەتی داگیرکاری بۆ رۆژهەلاتی ئیسلامی دەست پێکرد.لەو داگیرکاریانەدا تەیمور توانیی شکۆی دەوڵەتی جەلائیری بشکێنێ و بەهۆیەوە هێزی دیکە(قەرە قویونلو و ئاق قویونلو) لەناو جەرگەی کوردستان نەشونما بکەن و دواتر ئێران و کوردستان و بەشێکی دەوروبەری بخەنە قەڵەمڕۆی خۆیان.

داگیرکارییەکانی تەیمور لە کوردستاندا بەشێوەیەکی گشتی نەیتوانی میرنشین و قەوارەکوردییەکان لە ناوبا، بەلام تەرازووی هێزی گۆڕی لە کاتێکدا سوڵتان ئەحمەدی جەلائیری هێندە نەبوو ململانێکانی لە بەرژەوەندیی خۆی یەکلاکردبۆوە، شوێنەواری داگیرکارییەکانی تەیمور لەنگ سەرەتا سنووری دەوڵەتەکەی لێ پارچە پارچە کرد و دواتر لە ناوی برد.

بەرلە داگیرکارییەکانی تەیمور لەنگ میرنشینی بەهدینان میرنشینێکی بەهێز بوو، لە ناوچەیەکی بەرفراوان حوکمی گێڕاوە، سەنتەریشی شار و قەلای بەناوبانگی ئامێدی(عەمادییە) بووە، کە گرتنی لەبەردەم نەیارانیدا سەخت بووە، قەلای ئامێدی بەیەکێك لە سەختترین قەلاکانی کوردستان ژمێردراوە.

میرانی بەهدینان توانیویانە یەکێتی خێڵەکی لە ناوچەکە بپارێزن و بەهۆیەوە کۆمەڵێك خێڵ و هۆز لە خۆیان کۆبکەنەوە، لەوانە هۆزی (عەشیرەت) زێباری، هۆزی رێکانی -رادکانی- و هۆزەکانی مزوری و سندی و سلێڤانی و بەرواری و دۆسکی و نەهێلی،کە یەکێتی خێڵەکانی بەهدینانیان پێکهێناوە .تەواوی ناوچەکانی نێوان رووباری دیجلە و زێی گەورە بۆماوەی چەند سەدەیەك لە ژێر قەڵەمڕۆیان دا بووە، میرنشینی جزیرە کەوتبوە باکوری رۆژئاوای، میرنشینی هەکاری کەوتبوە باکوری. مێژوونووسانی مەملوکی (میسری) بەرلە داگیرکارییەکانی تەیمور لەنگ ئاماژەیان بەوە

داوە ،میرنشینی بەهدینان وەکو میرنشینێکی بەهێز بوونی هەبووە و میرەکانی خاوەن کەسایەتی بەرز بوون و لە ئاست دەسەلاتدارییەتی مەغول ملکەچییان نەکردووە و لە دەڤەرەکەیان سەربەخۆیی خۆیان پاراستووە، لە ساڵی (٧٣٦ك/١٣٣٦ز) دەوڵەتی مەغۆلی ئیلخانی رووخا و دوایی ئەوە سەرچاوەیەکی مەملوکی باسی لە خاوەنی ئامێدی کردووە، لە ناوەراستی سەدەی هەشتەمی کۆچی/ چواردەهەمی زایینی بەدواوە میرانی ئامێدی خاوەن میرنشین و سەربەخۆیی خۆیان بوون، جێگەی ئاماژەیە وەك شەرەفخان باسی کردووە، میرانی بەهدینان لە ناوچەی هەکاری یا میرانی هەکارییەوە میرنشینی بەهدینانیان بنیادناوە، بە گوێرەی سەرچاوە فارسییەکان بەشێوەیەکی بەرچاو باسی پەیوەندیی میرانی هەکاری و تەیمور لەنگیان کردووە، لەگەڵ ئەوەی تەنیا شەرەفخان ئاماژەی بە میری بەهدینان و سەردەمی تەیمور و کوڕەکەی داوە، کەچی سەرچاوە فارسییەکان لە باسی تەراتێنی هێزەکانی تەیمور لەنگ لە ناوچەکە درێغییان نەکردووە.

سەرچاوە مەملوکییەکان باسیان لەوە کردووە، حاجی محەممەدی وەزیری ماردینی ئورتوقی لە ساڵی(٧٩٦ك/١٣٩٣ز) بە سوڵتان بەرقوق(مەملوکی) ی راگەیاندووە، کە کورد چووەتە ژێر باڵی تەیمور و بووەتە پاشکۆی، هەروەها ئیبن فوراتی مێژوونووسی مەملوکی ئەو هەواڵەی پشتراستکردووتەوە، وردتر بابەتەکەی باسی کردووە و ئاماژەی بەوە داوە، کە مەلیك عیمادەدین مەلیکی کوردان ملکەچی تەیمور بووە.توێژەرێك پێی وایە، بەو پێیەی سەرچاوەکان باس لەوەناکەن ئەو عیمادەدینە کێیە؟ و لە کوێ حوکمڕانیی کردووە؟ سەرچاوە تەیمورییەکان باسیان لەو عیمادەدینە نەکردووە، پێدەچێ میر عیمادەدین ئیسماعیل کوڕی عەلی کوڕی موسا خاوەنی عەمادییە(ئامێدی)بێت. دەبێ لە ماوەی ئابڵوقەی تکریت، ملکەچی شێخ عەلی ئەویرات خاوەنی هەولێر و یار عەلی قەرەقویونلو خاوەنی موسڵ و وەلامی قاسید تەیموری دابێتەوە.

دوای شەڕی زۆر لە رۆژهەلاتی کوردستان تەیمور لەنگ بەرەو هەرێمی دیاربەکر کشاوە، لە هێرشی بۆ سەر میرنشینی هەکاری ساڵی(٧٨٩ك/١٣٨٧ز) میرعزەدین شێر لە قەلا سەختەکانی ناوچەی هەکاریدا سەنگەری گرتووە، و هێزەکانی تەیمورلەنگیش لەپێشڕەویاندا تووشی کێشە و گرفتێکی زۆربوونەوەو عزەدین شێر چۆتە قەلای وان تا بەرگری بکا، هێزەکانی تەیمور هێرشیان بۆبردووە، ئەویش دوای دوو رۆژ لایەنگیری خۆی نیشانداوە، تەیمورلەنگ لەگەڵ ئەوەی دەڤەری هەکاری داگیرکرد، بۆی دەرکەوت کە ناتوانێ بەبەردەوامی لە هەکاری بمێنێتەوە، لەبەر ئەوە دانی بەدەسەلاتی میری گەورە نا و عزەدین شێر بەسەر ویلایەتی دا مایەوە، و بەپاشای گشتی بەسەر کوردستان دایمەزراند، دان پیانانی تەیمورلەنگ بەعزەدین شێر و ناوزەدکردنی بەپاشای گشتی کوردستان، پلە وپایە و شکۆیی میری هەکاری نیشانداوە، کە لەناوچەکانیدا توانیویەتی سەروەری نێو قەلا و شارو شارۆچکەکان بپارێزێ، زۆر رێی تێدەچێ ئەم بارودۆخە کاریگەری بەسەر میرنشینی بەهدینانەوە هەبێت، چونکە تا رادەیەکی زۆر هەردو میرنشین بەیەکەوە بەستراونەتەوە و جێگەی باسکردنە پتەوترین پەیوەندیی سیاسی نێوان کورد و تەیمورلەنگ، پەیوەندیی میر عزەدین و تەیمور لەنگە و بەو هۆیەوە ستراتیژی ناوچەکە رۆڵێکی گرنگی هەبووە، تا تەیمورلەنگ لەشالاوەکانیدا ئاشتی لە هەکاری و ناوچەکە بێنێتەکایەوە، چونکە ململانێی توندی لەگەڵ هەکاری وسەرکوت کردنیان، وایدەکرد، کە کوردستان ببێتە لەمپەرێك بۆخواستەکانی لەنێوان ئێران لەلایەك، و عوسمانی و قەرەقویونلوو مەمالیك لەلایەکی دیکەوە. سەرەڕای ئەوەی مەترسی تەیمورلەنگ لەهێزی گەشەسەندووی قەرەقویونلو، بووە پێویستییەك لە هەکاری و دەوروبەریدا ئارامی بێنێتەکایەوە، تاکو لەهەرێمی دیاربەکردا سەنگەرێکی هەبێ، لێی پشوو بدات، چونکە هێزەکانی تەیمورلەنگ بەیارمەتی هەندێ لەکوردەکان لەدیاربەکردا رووبەڕووی بەرگری سەخت

وبگرە تووشی تێکشکانیش بوونەوە.

لە کاتی شالاوەکانی تەیمور بۆ دەڤەرەکەی میر زەینەدین حوکمی میرنشینی بەهدینانی کردووە، هیچ سەرچاوەیەك باسی لە رووبەرووبوونەوەی هێزی تەیمور و میرنشینەکە نەکردووە، شەرەفخان لەوە دواوە میر زەینەدین ماوەیەکی زۆر حوکمی گێڕاوە، سەرەڕای ئەوەی هێزەکانی تەیمور بەدرێژایی داگیرکارییەکان لە ناوچەکە تەراتێنییان کردووە، بە تایبەتی موسڵ و جزیرە و هەولێر و شنگال و دەوروبەری بگرە چوونەتە سنووری مەمالیکیش، کە بەهدینان زۆر لێی نزیك بووە، لەبەر میر زەینەدین توانیویەتی لەبەردەم ئەو شالاوانەدا میرنشینەکەی بپارێزێ، هیچ ژێدەرێك باسی داگیرکاریی تەیموری بۆ سەر میرنشینی بەهدینان نەکردووە، هەواڵەکانی ئەو میرنشینە لە ژێر هەواڵی میرنشینی هەکاری بزر بووە و لەلایەکی دیکەوە شەرەفخان گوتویەتی میر زەینەدین لە ماوەی دەسەڵاتدارییەتیدا ئارامی و خۆشگوزەرانیی پاراستووە، لەبەر ئەوە هەمان سیاسەتی تەیمور بەسەر هەکاریدا بۆ ئەویش پەیڕەو کراوە، چونکە یەك ئەنجام و شوێنەوار بەسەر هەردو میرنشین دەرکەوتووە. سەرباری ئەوەی میر زەینەدین لەگەڵ شارۆخی کوڕی تەیمور پەیوەندی دۆستانەی هەبووە.هەموو ئەمانەش هاوسەنگە لەگەڵ ستراتیژیی تەیمور لەنگ بەتایبەتی بۆ پاراستنی ناوچە و رێڕەویی بازرگانی، کەقەڵەمڕوی بەهدینان بەشێکی ئەو ستراتیژە بووە.

## ژێدەر:


١. تاريخ ابن الفرات: ج٩، تحقيق: قسطنطين زريق، المطبعة الامريكانية، (بيروت ١٩٣٦). ابن قاضي شهبة: كما الدين ابو الفضل(ت٧٢٣ه/ ١٣٢٣م)

٢. تاريخ ابن قاضي شهبة:ج٣، تحقيق: عدنان درويش(دمشق ١٩٧٧).
شرف خان بدليسي: شرف خان بن شمس الدين بن شرف خان(و-١٠١٠ه/١٦٠١م)

٣. شرفنامه(تاريخ مفصل كردستان)، تعليقات: محمد عباسي، نشر حديث،(تهران:١٣٧٣ه.ش)، ض٣.
العمري: ابو العباس شهاب الدين احمد بن يحيى بن فضل الله(٧٤٩ه/١٣٤٨م)

٤. مسالك الابصار في ممالك الامصار، تحقيق: محمد عبدالقادر و اخرون دار العين ، (العين٢٠٠١).

٥. التعريف بالمصطلح الشريف، تحقيق:محمد حسين شمس الدين، دار الكتب العلمية،(بيروت:١٩٨٨).
ابن ناظر الجيش: عبد الرحمن محمد التميمي الحلبي(ت-٧٨٦ه/١٣٨٤م)

٦. كتاب تثقيف التعريف بالمصطلح الشريف، تحقيق: رودلف كسلي، منشورات الثقافة (القاهرة ١٩٨٧).
ياسين العمري: ياسين بن خيرالله الخطيب الموصلي(ت- ١٢٣٢ه/١٨١٦م)

٧. منية الادباء في تاريخ الموصل الحدباء، تحقيق: سعيد الديوةجي، مطبعة الهدف،(الموصل:١٩٥٥).
زرار صديق توفيق:

٨. كردستان في العهد الجلائري،مركز الدراسات الكوردية و حفظ الوثائق،(دهوك:٢٠٠٩).
رابيعە فەتاح شێخ محەممەد:

٩. کوردستان لە سەدەی پازدەی زایینیدا، وەزارەتی رۆشنبیری هەرێمی کوردستان، (هەولێر:٢٠٠٥).

# بادینان لە سەردەمی قەرەقویونلو و ئاق قویونلودا

## (٨١٤-٩١٤ك/١٤١١-١٥٠٨ز)

رابیعە فەتاح شێخ محەممەد
زانکۆی سەلاحەدین-کۆلیژی ئەدەبیات

بە درێژایی سەدەی نۆیەمی کۆچی/ پازدەی زایینی کە هەردو دەوڵەتی قەرە قویونلو و ئاق قویونلو بەسەر کوردستاندا دەسەڵاتداربوون، دەڤەری بادینان هەر تەنیا جێگە ستراتیژییەکەی نەبۆوەتە هۆی گرنگی و بایەخپێدان، بگرە سەرباری ئەوە قورسایی و مەرکەزییەتی میرنشینەکانی بە تایبەتی میرنشینی بادینان بەواتا بە پلەی یەکەم چالاکی سیاسی قەوارەی کوردی، نەخشەی ستراتیژیی دەڤەرەکەیان کێشاوە. لەو سەدەیەدا دەڤەری بادینان لەرووی سیاسییەوە خاوەن تایبەتمەندیی خۆی بووە، بە هەر هۆکارێك بووبێت ئەو دەڤەرە خۆی رەسمی سیاسەتی خۆی کردووە، شەرەفخانی بدلیسی و سەرچاوە مەملوکی(میسری)یەکان ئاماژەی بەرچاویان پێداوین لەو دەڤەرەدا کە میرنشینی بادینان نەبۆتە پاشکۆی هیچ قەوارەیەکی دیکە و توانیویەتی حوکمی سەربەخۆیی خۆی بپارێزێ.

قەرەقویونلو و ئاق قویونلو دوو خێڵی کۆچەریی تورکمان بوون، لەرووی مەزهەبییەوە قەرەقویونلو شیعە بوو، ئاق قویونلوش سوننە بوو، هەردو خێڵ لە باکووری کوردستان لەرووی سیاسییەوە گەشەی بەرچاویان کرد، قەرەقویونلو لە ناوەڕاستی سەدەی هەشتەمی کۆچی/چواردەی زاینییدا توانی لە پاشماوەی سوپای ئیلخانی لە باکووری کوردستان فیدراسیۆنێکی خێڵەکی گەورە پێك بهێنێ و ململانێی بنەماڵەی ئیلخانی و جەلائیری لەسەر دەسەلات قۆزتەوە و خۆی بەهێز کرد، تا لە شالاوەکانی تەیموورییەکاندا، قەرەیوسف سەرداری خێڵەکە، پاش مردنی تەیموری لەنگ لە سالی (٨٠٧ك/١٤٠٥ز) تەورێزی گرت و دەوڵەتی قەرەقویونلوی دامەزراند،دواجار سوڵتان ئەحمەدی جەلائیریی دەسەڵاتداری بەغدا (عێراقی عەرەبی) و بەشێکی کوردستان لەساڵی(٨١٤ك/١٤١١ز) لە شەڕێکدا لە ناوبرد و تەواوی کوردستان کەوتە ژێر دەسەڵاتی قەرە قویونلو. لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەتی قەرەقویونلو کە نزیکەی شەست ساڵ درێژەی کێشا، بەڵام بە هیچ جۆرێ نەیتوانی قەوارەی سیاسیی ئاق قویونلو لە هەرێمی دیاربەکر سەرکوت بکا، هەرچەندە ناوبەناو هەڵمەت و هێرشی بۆ دێنا. گرنگیی راستەقینەی خێڵی ئاق قویونلو لەسەروبەندی شالاوەکانی تەیمورلەنگ لە دەسپێکی سەدەی نۆیەمی کۆچی/پازدەی زایینی

دەركەوتووە، عوسمان قەرەیولوك سەرداری خێڵی ئاق قویونلو چووە خزمەت تەیمورلەنگ، ئەویش هەندێ شاری باكووری كوردستانی پێ دا. تا دواجار لە یەكێك لەو هێرشانەی جیهانشای سوڵتانی قەرەقویونلو لە دەسپێكی حەفتاكانی سەدەی نۆیەمی كۆچی/ پازدەی زایینی بۆ سەر ئاق قویونلو كردی، شكستی هێنا و بەكوژرانی لەلایەن ئوزون حەسەنی سەرداری ئاق قویونلو، تەواوی كوردستان كەوتە ژێر دەسەڵاتی ئاق قویونلو، تا لە ساڵی(٩١٤ك/١٥٠٨ز) شا ئیسماعیلی سەفەوی لە موسڵەوە بۆ داگیركردنی بەغدا بەرێ كەوت و كۆتایی بە دەسەلاتی ئاق قویونلو هێنا. بە شێوەیەكی گشتی هەردو دەوڵەت لە میانەی سیاسەتییان بەرامبەر كورد و میرنشینە كوردییەكان لە میرنشینی بادینان و دەڤەرەكەیان روانیوە، ئەمەش پەیوەندیی كورد و هەوردوكیانی روون كردۆتەوە.

لەراستیدا زۆربەی ئەو سەرچاوانەی لە دەوڵەتی قەرەقویونلو دواون بەپلەی یەكەم بەزمانی فارسین، لەبەر ئەوە ئەگەر باسی كوردیان كردبێ زیاتر بەشێوەیەكی گشتی لێی دواون، باسی وردەكارییان نەكردووە، گومان لەوەدانییە لە نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەمی كۆچی/چواردەی زایینی لە دەڤەری بادینان دوای نەمانی دەسەڵاتی مەركەزیی مەغۆلی ئیلخانی و ململانێی میر و سەركردەكانیان، میرنشینی بادینان خاوەن قەوارەیەكی سیاسیی مەزن بووە، شەرەفخانیش ئاماژەی داوە بەوەی سەرەتا میرەكانی لە ناوچەی شەمدینانی قەڵەمڕۆی میرنشینی هەكارییەوە هاتوونەتە ناوچەكە و قەڵای ئامێدییان دووبارە بنیادناوەتەوە، لەبەر ئەوە زۆر پێدەچێ لە ماوەی جەلائیری و هەردو دەوڵەتی قەرەقویونلو و ئاق قویونلودا، ئامێدی شارو قەڵایەكی بەناوبانگ بووە و لەسەر ترۆپكێكدا كە شێوەی هێلكەییە وەك قەڵایەك هەڵكەوتووە و گرتنی سەخت بووە لەبەردەم نەیارانیدا لە كاتێكدا دواجار میرنشینی هەكاری لە سەردەمی ئاق قویونلو داگیركرا، میرانی بەهدینان زیاتر كەوتنە چالاكی سیاسیی و سنووری میرنشینەكەیان فرەوانتر كردووە،لەبەر ئەوە میرانی بەهدینان تەواوی دەڤەرەكانی نێوان رووباری دیجلە و زێی گەورە بۆماوەی چەند سەدەیەك لە ژێر قەڵەمرەویان دا بووە، میرنشینی بۆتان كەوتۆتە باكووری رۆژئاوای، میرنشینی هەكاری كەوتۆتە باكووری، میرنشینی داسنی(ئێزیدی) لەرۆژئاوای هەڵكەوتووە، هەرچی باشووریەتی وەلاتی سۆران - جموجوڵی تازەی میرنشینی سۆران-لە خۆ گرتووە ، قەڵەمرەوی بەهدینان بەزۆری قەڵا لەسەر لوتكە و شاخە قوچەكانیدا ناسراوە، لەوانە قەڵاكانی شوش، كەلاتی، عومرانی، بازیران - بارزان- ئاكرێ(عەقرە)، بشێری(رۆژئاوای بەردەرەش)و دێرا، هەروەها كۆمەڵێك هۆزی لە خۆگرتووە، وەك هۆزی زێباری، هۆزی رێكانی -رادكانی- هۆزەكانی مزوری و سندی و سلێڤانی و بەرواری و دۆسكی و نەهێلی، یەكێتی خێڵەكانی بادینانیان پێكهێناوە .

قەڵاكانی ئامێدی بە قەڵا سەختەكانی هەكاری( كوردستان) ژمێردراون، نەیاران بەردەوام چاویان تێبڕیووە، ویستویانە بیكەنە سەنگەرێك لەبەردەم قۆناغەكانی لەشكرە زەبەلاحەكانیان، بەگرتنی عەمادییە رێگایان لەبەردەم ئاسان بووە، قەڵەمرەوی میرنشینی بادینان لەسەدەی(٩ك/١٥ز)و سەرەتای سەدەی(١٠ك/١٦ز)دا، كاریگەر بووە بەبارودۆخی سیاسی ناوچەكە، بۆیە لەپەیوەندییان بە زلهێزەكانەوە لەلایەك و پەیوەندییان بە میرنشینە كوردییەكان لەلایەكی ترەوە، سەرباری كەسایەتی میرەكانیان، سنووریان گۆڕانی تێكەوتووە.

لەژێر سەرنجی بارودۆخی گشتیی پەیوەندیی كورد و قەرەقویونلو، بۆمان دەركەوتووە سەرانی قەرەقویونلو هەمان پەیوەندییان لەگەڵ بادینان هەبووە، لەكاتێكدا قەرەیوسف تەواوی كوردستانی كەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی و قەرەیوسف لەگەڵ میرە كوردەكان پەیوەندیی زۆر خۆش بووە، لە قەڵەمڕۆی قەرەقویونلودا میرنشینەكوردەكان خاوەنی سەربەخۆیی خۆیان بوون و بەهیچ جۆرێ نەبوونەتە مایەی مەترسی بۆ سەر تەورێز(پایتەخت) و لە

هەندێ مەترسی بۆ سەر قەرە قویونلو هاوكاری سوپای قەرە قویونلویان كردووە و تا بەوە گەیشتووە خوازێنی سیاسی لە نێوان قەرە یوسف و میری بدلیس رووی داوە.

لە میانەی پەیوەندی میرنشینی هەكاری و قەرەیوسف بۆمان دەركەوتووە، میر عزەدین شێری هەكاری لە ساڵی(٨١١ك/١٤٠٨ز)دا عەلائەدەولەی كوڕی سوڵتان ئەحمەدی جەلائیری لای باوكی هەڵاتو لەدەوروبەری شاری خوی سەربازانی هەكاری گرتیان و بردیانە لای میرعزەدین، ئەویش سەرەتا پێشوازی لێ كرد و رێزی لێنا و نزیكەی دوو مانگ لای مایەوە، پاشان قەرەیوسف نووسراوێكی بۆنارد، كە شازادە عەلائەدەولەی جەلائیری بێ روخسەتی باوكی هاتووە، ئێمە بەم هۆیەوە فەرمانمان دەركردووە داڵدە نەدرێ، لەبەرئەوە دەبێ لەویلایەتی خۆت دووری بخەیتەوە، بەمجۆرە میرعزەدین مانەوەی عەلائەدەولەی لەلا بەبەرژەوەندی نەزانی و ئازادی كرد، ئەم رووداوەش دەری خستووە، میر عزەدین لەگەڵ ئەوەی میرێكی مەزن بووە، پیاوێكی ئاشتیخوازیش بووە، بەگشتی ویستویەتی پەیوەندیی دۆستانەی لەگەڵ هێزەكانی دیكەی كوردستان و دەوروبەریدا درێژە پێ بدات و هەروەها سنووری دەڤەرەكەشی پاراستووە و پەیوەندیی میرانی هەكاری وقەرەیوسف پەیوەندییەكی دۆستانە بووە، دانی بەدەسەڵاتی فەرزكراوی قەرەیوسف ناوەو وەك نزیكترین دەسەڵات لەمیرنشینەكەی مامەڵەی لەگەڵدا كردووە.

لەحوكمڕانی قەرەیوسفدا پلەوپایەی میرانی هەكاری بە گشتی و میرە كوردەكانی دیكە هەرتەنها بەوە نەوەستاوە، قەرەقویونلو دانی بەدەسەڵاتی سەربەخۆیی كوردان ناوە، میر عزەدین لەو سەردەمدا توانیویەتی هاوسەنگی ململانێكان رابگرێت، لەساڵی(٨١٢ك/١٤٠٩ز)دا قەرەیوسف خۆی بۆ هێرشی شێخ ئیبراهیم شای شێروانشا ئامادەكردووە، بەڵام هەوڵی دیبلۆماسی میر عزەدین وایكردوە، كە ناوچەكە ئارام بێتەوە و نەهێڵێ شەڕ رووبدا وهەردولای ئاشتكردوەتەوە.

شەرەفخان لە باسی هەردو میرانی بادینان و هەكاریدا باسی لەوە نەكردووە، هەردو میرنشین بەیەكداچووبن، لەبەر ئەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی هەرچەندە ژێدەرە فارسییەكان(بێجگە لە شەرەفنامە) ئاماژەیان بەهیچ پەیوەندییەكی روونی نێوان میرانی بادینان و قەرەقویونلو نەكردووە، ناكرێ میرنشینی بادینان سوودی لەو پەیوەندییەی كورد و قەرەیوسف وەرنەگرتبێ، چونكە لە تەواوی سەردەمی قەرەقویونلو میرنشینی بادینان لەرووی سیاسییەوە سنووری بەرفراوان بووە و گەشەی بەرچاوی كردووە، سەرەتا میر زینەدین كە لە ماوەی حوكمڕانی قەرە یوسف میری بادینان بووە، لەگەڵ سەران و سەركردەكانی سەردەمی خۆی لە پەیوەندیی دۆستانە بووە و سەردەمێكی خۆشگوزەرانیی بەرێ كردووە و لەهەمان كاتیشدا پەیوەندیی دۆستانەی لەگەڵ میرنشینە كوردییەكانی دیكەش پاراستووە.

مەقریزیی مێژوونووسی مەملوكی لە رووداوەكانی ساڵی(٨١٧ك/١٤١٤ز)دا لە باسی هێرش بۆ سەركوردە ئێزیدییەكانی هەكاری، لەگەڵ ئەوەی لەتەك میرە كوردەكان ناوی میری بەهدینانی نەهێناوە، كەچی عەباس عەزاوی مێژوونووسی عێراقی ئەمەی بەدەرفەتێك داناوە تا میرزەینەدین دەسەڵاتی فراوان بكا، عەزاوی پێی وایە لە كاتی قەرەیوسف، میرزەینەدین موسڵی گرتووە و توانیویەتی ئاكرێش بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، لەراستیدا لەم سەردەمەدا سەرچاوەكان باسیان لە گەرمیان و كوێستانی قەریوسف كردووە، كەچی ئاماژەیان بە دەستبەسەرداگرتنی موسڵ لە لایەن ئامێدییەكانەوە نەكردووە و رێی تێدەچێ میرانی بادینان لەو بارودۆخە سوودیان وەرگرتبێ و بێجگە لە موسڵ سنووریان فراوانتر كردبێ.

میرزەینەدین لە قەڵەمڕەوەكەیدا گرنگی بەزانست و دەزگای كۆمەڵایەتیی و بیناسازی داوە، و زاناو پیاوانی ئاینیی لای خۆی كۆكردۆتەوەو لە كاروباری دەوڵەتدا بەشداری پێكردوون، لەسەردەمی ئەودا ئاسایش و ئارامی لەئارا دابووە. پاش مردنی میرزەینەدین،

شەرەفخان باسی هیچ کوڕێکی نەکردووە تەنیا سەیفەدینی کوڕی نەبێت،کە دەسەڵاتی وەرگرتووە و باسی لەوە نەکردووە ئایا لە سەردەمی کامە سوڵتانی قەرەقویونلو حوکمی گێڕاوە، دەردەکەوێ میرسەیفەدین لەسەردەمی جهانشای کوڕی قەرە یوسفدا حوکمی گێڕا بێت و لەسەر ڕێڕەوی باوکی ڕۆیشتووەو گەشەی بە بەهدینان داوە و میرێکی دادپەروەر بووە، هەرچەندە پەیوەندیی لەگەڵ زلهێزەکانە دەڤەرەکەدا روون نییە، بەڵام لە ئیدارەی ناوخۆدا سەرکەوتووبووە و توانیویەتی وەك باوکی سەربەخۆیی میرنشینەکە بپارێزێ.

ئەبووبەکر تارانیی مێژوونووسی دەربارەی ئاق قویونلو لەوە دواوە، لە ناوەراستی دەیەی پەنجاکانی سەدەی نۆی کۆچی/پازدەی زایینی پاش سەرکەوتنی جیهانشای قەرەقویونلو بەسەر نەوەکانی تەیمور لەنگ، سوپای ئوزون حەسەن ناوچەکەیان تالان کردووە و شەو لە دهۆك ماونەتەوە ودواتر چوونە بۆ مەزار نەبی یونس، لەگەڵ ئەمەشدا باسی لە قەڵەمڕۆی میرنشینی بادینان نەکردووە.

میر سەیفەدین پێدەچێ لە سەردەمی دوادواییەکانی دەسەڵاتی قەرەقویونلو کۆچی دوایی کردبێ، پاش خۆی دوو کوڕی جێ هێشت حەسەن و بایرەك، حەسەنی کوڕە گەورەی جێگەی گرتەوە. میر حەسەن سەرکەوتنەکانی ئوزون حەسەنی سەرداری ئاق قویونلو بەسەر قەرەقویونلودا و نەمانی ئەو دەوڵەتی قەرەقویونلوی بەچاوی خۆی دیوە، لە درێژەی شاڵاوەکانی ئوزون حەسەن بۆ سەر میرنشینە کوردییەکان لەساڵی (٨٧٣ك/١٤٦٧ز) سلێمان بەگ بیژەن سەرکردەی سەربازیی ئاق قویونلو هێرشیکردە سەر دەڤەری بادینان و سنووری میرنشینەکەی بەزاند و سەرەتا هەندێ سەرکەوتنی بەدەست هێنا و توانیی قەڵای ئاکرێ و شوش داگیر بکان دواتر رووی لە قەڵای ئامێدی کرد، هەرچی هەوڵێك هەبوو دای، بەڵام نەیتوانی قەڵاکە داگیر بکا، ئەبووبەکر تارانیی مێژوونووسی دەرباری ئاق قویونلو لە باسی داگیرکردنی قەڵاکانی کوردستان، هەر تەنیا باسی سەرکەوتنەکانی کردووە و باسی شکستەکانی سەرکردەکانی ئاق قویونلوی نەکردووە، لەو باسەیدا نزیکەی بیست سەرکردەی سەربازیی گەورەی ئاق قویونلوی نزیك لە ئوزون حەسەن بەشدارییان کردووە ،تیایدا حاکمی موسڵ و شنگال و تەللەعفەری سەر بە ئاق قویونلو بەشدارییان کردووە و دوای چەندان ئابلوقە سوپای ئاق قویونلو نەیتوانیوە قەڵای ئامێدیی مەرکەزی میرنشینەکە بگرێ و میر حەسەن سەربەرزانە بەرگریی کردووە و سوپای ئاق قویونلو بێجگە لە راکردن هیچی بۆ نەماوەتەوە و دواجار ریشەی ئاق قویونلوی لە ناوچەی خۆی دەرکێشاوە. ئەمەش ئەوەی گەیاندووە، کە قەڵای ئاکرێ و شوشی لە ئاق قویونلو سەندوتەوە.

هەرچەندە لە سەردەمی دەسەڵاتدارییەتی ئوزون حەسەن و یەعقوبی کوری(٨٧٣_٨٩٦ك/١٤٦٧-١٤٩٠ز) ئاق قویونلو بەشێوەیەکی مەرکەزیی چڕ حوکمیان گێڕاوە و میرەکوردەکانیان کوشتووە و یان دووریان خستوونەتەوە، کەچی لە بەرانبەر میرانی بەهدینان دەستەوسان بوون و هیچ سەرکردەیەك نەیتوانیوە هێرشی بۆ ببا، بە بەڵگەی ئەوەی میر حەسەن هەر ماوەتەوە و خزمەتی دەڤەرەکەی کردووە، بگرە سنووری میرنشینەکەی فراوانتر کردووە، ئەمەش حەکیمی و لێزانی ئەو میرە دەسەلمێنێ.

میر حەسەن دوای خۆراگریی بەرانبەر ئاق قویونلو و مردنی سوڵتان یەعقوب و ململانێی نەوەکانی ئوزون حەسەن لەسەر دەسەڵات ، لە ساڵی (٩٠٦ك/١٥٠٠ز) لەگەڵ کۆمەڵی میری گەورەی دیکەی کورد رووی لە شا ئیسماعیلی سەفەوی نا و ئەویش بە گەرموگوڕی پێشوازیی لێکرد و لە شوێنەکەی خۆی داینایەوە و بە سەربەخۆیی دەسەڵاتی بەڕێوەبردووە، ئەو هەلەشی قۆستۆتەوە تا سنووری میرنشینەکەی گەورە و فراوانتر بکا، لەبەر ئەوە لە کاتێکدا سندی وەك هۆزێکی گەورە لەسەدەی(٧ك/١٣ز)دا، ناوی هاتووە و ژمارەی پیاوانی زۆر بووە، ژێدەرە مەملوکییەکان باسیان لەوە کردووە، لەنێو کوردەکاندا نزیکەی سی هەزار شەرکەری هەبووە و لەساڵی(٨١٧ك/١٤١٤ز)

میر تەوەککولی کوردیی میری قەڵای شرانس، کە تەواوی کوردە سندییەکانی لەخۆی کۆکردبۆوە، لەهەڵمەتی میرە کوردەکان بۆ سەر ئێزیدیەکانی هەکاری بەشداری کرد و گۆڕی شێخ عەدی هەکاری) یان هەڵکوڵی و لەساڵی(٨٦٢ك/١٤٥٧ز)دا سەربازانی سندی هێرشیان بۆ سەر گوندی باسبریناى مەسیحی بردووە، ئەمەش دەریدەخا هۆزی سندی پەیوەندییەکانیان لەچوارچێوەی میرنشین بووە، جگە لە هۆزی سندی، هۆزی سلێڤانی لەناوچەی زاخۆ و دەوروبەری ژیاون، تا لەکۆتاییەکانی(٩ك/١٥ز)دا، میرحەسەنی کوڕی سەیفەدینی ئامێدی، و دەستی گرتووە بەسەر زاخۆ و قەڵەمڕەوی سندییەکانی خستۆتە ژێر رکێفی، دواجار بۆتە سەربە ئامێدی و بەمەش چالاکی سیاسیی میر حەسەن گەیشتووتە خاڵێکی بەرز، چونکە نەك هەر تەنیا ئەو میرنشینی سندی خستەر سەر قەڵەمڕۆی، میرنشینێکی بچووکی دیکە کە ناوی داسنی بوو لە باکوری موسڵ، لەدەوروبەری چیای داسنی(شێخانی) هەڵکەوتبووە، کوردەکانی ئەوێ بەداسنی ناسراوبوون، کەپێگەی نیشتەجێبوونی ئێزیدییەکانە، هەروەها بە میرنشینی شێخانیش ناسراوبوو و شەرەفخان لەریزبەندی میرنشینەکاندا ناوی هێناوە، کەچی لە ناوەڕۆکدا بەهیچ شێوەیەك وەك میرنشینەکانی تر باسیان ناکات، لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆی کۆچی/ پازدەی زایینی، میرحەسەن دەستی بەسەر میرنشینەکە داگرت، قەڵای دهۆك و دەوروبەری خستە نێو سنووری خۆی، لەبەر هەموو چالاکییەکانی دەتوانین بڵێین میر حەسەن بەهێزترین میری بادینانە لە سەدەی سەدەی نۆی کۆچی/ پازدەی زایینی و یەکێکە لە بەهێزترین میرە کوردەکانی هەمان سەدە.

میرحەسەن لە ململانێی سەفەوی و عوسمانییەکاندا، سەرەتا هەڵوێستێکی روونی لێ بەدیارنەکەوتووە، وەك دیارە پاراستنی میرنشینەکەی لاگرنگ بووە ، پاش سەرکەوتنی عوسمانی لە شەڕی چاڵدێراندا، بەهۆی مەلا ئیدریسی بەدلیسییەوە لەتەك میرەکانی دیکە پەیوەندیی بە سوڵتان سەلیم کردووە و دواتر سوڵتانی عوسمانی رێزی لە میرە کوردەکان گرتووە مونجیم باشی مێژوونووسی عوسمانی لەوە دواوە،کە کۆمەڵێ میری کورد چوونەتە لای سوڵتان سەلیم ، بەڵام بە وردی ناوی میرە کوردەکانی نەهێناوە، وەك لە رێککەوتنامەکەی مەلا ئیدریسی بەدلیسی و میرەکوردەکان لەگەڵ سوڵتان سەلیم دا دەرکەوتووە، میر حەسەن لەبەڕێوەبردنی کاروباری میرنشینەکاندا بەسەرۆکی گشتی ناوزەد کراوە.

پاش مەرگی میر حەسەن، حەوت کوڕی لە دوای خۆی جێ هێشتووە،کە ناویان حسێن و سیدی قاسم و مرادخان و سلێمان و پیر بوداق و میرزا محەممەد و خان ئەحمەد بووە و حسێنی کوڕە گەورەیان جێگەی باوکی گرتوتەوە. میرانی کورد لە نێویاندا میر حسێن یەکێ لەو کەسانە بووە وای کردووە، سەفەوی بۆ هەتایە هەرێمی دیاربەکر و ناوچەکانی باشوور و رۆژهەڵاتی هەرێمەکە لەدەست بدا.

بەدرێژایی سەدەی نۆی کۆچ/ پازدەی زایینی دەڤەری بەهدینان لە نەخشەی سیاسیی کوردستاندا شوێنەیێکی ستراتیژی و پڕ بایەخی هەبووە، لەلای رۆژئاواوە لە دەولەتی مەملوکی نزیك بووە و ژێدەرە مەملوکییەکان گرنگییان پێداوە و باسیان کردووە، لە باکوورەوە چەندان میرنشینی بەهێزی کوردی هەبوو، بە تایبەتی لەسەردەمی قەرەقویونلدا باکووری کوردستان ناوەندی چالاکی میرنشینە کوردییەکان بووە،لەوانە میرنشینی بدلیس و جزیرە و هەکاری و هی دیکە. هەروەها لە نێوان دیاربەکر و موسڵ و بەغدا بووە و بۆوەتە رێڕەو و جموجولی هێزە سیاسییەکان و سەرباری ئەوەی لە شاری موسڵ نزیك بووە و جاری وابووە شارەکەی کۆنترۆڵ کردووە.

جێگەی سەرنجە میرنشینی بادینان لە سەردەمی هەردو دەوڵەتی قەرەقویونلو و ئاق قویونلودا بەواتا لە بەرانبەر هەردو ستراتیژی ئیجابی قەرەقویونلو و سەلبی ئاق قویونلو، بە گەشاوەیی ماوەتەوە و توانیویەتی سەربەخۆیی خۆی بپارێزێ، چ لە ناوخۆیدا و چ لە دەرەوەیدا، بۆیە شەرەفخان لە باسی میرەکانیدا

ئاماژەی بەوە داوە بەردەوام لە ئاشتی و ئاسایش ژیاون، ئەمەش مانای ئەوەیە لەگەڵ میرەكوردییەكانی میرنشینە بەهێزەكانی دەوروبەریان پەیوەندیی دۆستانەیان هەبووە و هەم لە نێوان یەكتریدا لەگەڵ خۆیان ململانێیان نەبووە و هەم بەرانبەر خەڵك (رەعییەت) دادپەروەر بوون، و بەتایبەتی لەو سەردەمدا میرەكانیان ماوەیەكی زەمەنی درێژ حوكمیان گێڕاوە و دەڤەری بادینان لە یەكێتی چەندان خێڵ و هۆز و تیرە دروست بووە و لە هەموو روویەكەوە بەهدینان گەشەی بەرچاوی بە خۆیەوە دیوە.

## ژێدەر:


أبو بكر طهراني:(٨٨٦هـ/١٤٨١ز)

١. كتاب دياربكريه، تصحيح: نجاتي لوغال وفاروق سومر،كتابخانة طهوري، (تهران:١٣٥٦ه.ش)، ض٢.

شرف خان بدليسي : شرف خان بن شمس الدين بن شرف خان(و-١٠١٠ه/١٦٠١م)

٢. شرفنامه(تاريخ مفصل كردستان)، تعليقات: محمد عباسي، نشر حديث،(تهران:١٣٧٣ه.ش)، ض٣.

العمرى: ابو العباس شهاب الدين احمد بن يحيى بن فضل الله(٧٤٩ه/١٣٤٨م)

٣. مسالك الابصار في ممالك الامصار، تحقيق: محمد عبدالقادر و اخرون دار العين ، (العين٢٠٠١).

٤. التعريف بالمصطلح الشريف، تحقيق:محمد حسين شمس الدين، دار الكتب العلمية،(بيروت:١٩٨٨).

ابن ناظر الجيش: عبد الرحمن محمد التميمى الحلبى(ت-٧٨٦ه/١٣٨٤م)

٥. كتاب تثقيف التعريف بالمصطلح الشريف، تحقيق: رودلف كسلي، منشورات الثقافة (القاهرة ١٩٨٧). حسن روملو: حسن امير سلطان روملو(و- بعد ٩٨٥ه/١٥٧٧م)

٦. احسن التواريخ،به اهتمام: عبد الحسين نوائى، بنطاة ترجمة و نشرى كتاب،(تهران:١٣٤٩ه.ش)، جلد١٢،١١.

ياسين العمرى: ياسين بن خيرالله الخطيب الموصلى(ت- ١٢٣٢ه/١٨١٦م)

٧. منية الادباء فى تاريخ الموصل الحدباء، تحقيق: سعيد الديوەجى، مطبعة الهدف،(الموصل:١٩٥٥).

زرار صديق توفيق:

٨. كردستان في العهد الجلائري، مركز الدراسات الكوردية و حفظ الوثائق،(دهۆك:٢٠٠٩).

رابیعە فەتاح شێخ محەممەد:

٩. كوردستان لە سەدەی پازدەی زایینیدا، وەزارەتی رۆشنبیری هەرێمی كوردستان، (هەولێر،٢٠٠٥).

# دو بەرپەر ژ دیرۆکا کەڤنا دهۆکێ

**پ.د.زرار سەدیق توفیق**

## دیرۆکنڤیس ئەبوبەکرێ تەهرانی و یەکەم ناڤ ئینانا دهۆکێ

ئەبوبەکر ئەلتەهرانی ژ دیرۆکنڤیسێن دیارێن مەزنە دچاخێ دەستەلاتا تورکمانێن ( قەرە قوینلو و ئاق قوینلو) دا. واتە ل سەدساڵیا نەهێ کۆچی/ پازدەی زایینی. ئەو بخۆ مێژوونڤیسێ سولتان ئوزون حەسەن (حەسەنێ درێژ) بوو (۸۵۷-۸۸۲مش/ ۱٤٥۳-۱٤۷۷ز)، لێ پێزانین ل سەر وی گەلەك دکێمن و ژیانا وی رەنگە شێلیەك یا ل سەر هەی، و ئەوێن ل پشتی وی هاتین چ ل سەر ژیانا وی نە نڤیسینە، و تا سالێن پێنجیان وەسان دهاتە زانین، کو پەرتووکا وی ژ پەرتووکێن بەرزەیە، و هەمی ئەو پێزانینێن ل سەر وی، یێن ژ نڤیسینێن وی بخۆ هاتینە دەرئێخستن، وەکی وی هندە جاران چەند ئاماژەکێن کێم پێ داین، دەمێ ل سەر دیتنەکێ یان رووداناکێ دیتی یان پشکداری تێداکری دئاخڤیت. وەکی چەوان (فاروق سومەر) توێژەر و نڤیسەرێ پێشەکیا پەرتووکا مێژوویێ یا نڤیسەری وێ چەندێ دوبات دکەت.

مێژوونڤیس خۆ ددەتە نیاسین کو ئەو(ئەبو بەکر ئەلتەهرانی ئەلئەسفەهانی)یە و تەهران گوندەك بوو سەر ب ئەسفەهانێ ڤە. د هەیڤا شەوالا ساڵا (۸۷۳مـش/ نیسان-گولان ۱٤٦۹ز) ئەبوبەکر ئەلتەهرانی ل سەر داخوازیا ئوزون حەسەنی بخۆ، ل باژێرێ ئەردەبیل وەکی راوێژکار پەیوەندی پێڤە کر، و بوو کەسەکێ نێزیکی وی و هەردەم دگەلدابوو و مێژوو بۆ دنڤیسی و ب (صاحب قران) ب ناڤ دکر.

عەباس ئەلعەزاوی ل سەر ئەبی بەکر ئەلتەهرانی دبێژیت:مێژوونڤیسەکێ بەرێزە و پەرتووکا وی ژ ژێدەرێن دەگمەن و هەڤچەرخ و نوی یە.

ئەبو بەکرێ تەهرانی پەرتووکەکا دیرۆکی ب زمانێ فارسی ل دووڤ بابەتان دانایە، نە ل دووڤ سالان و ب (دیاربەکرییە) ناڤکرییە، (دیار بەکرییە) ل دووڤ حسابا ئەبجەدی دبیتە ساڵا (۸۷٥مش) و ئەڤە ئەو سالە یا نڤیسەری پەرتووکا خۆ ل دووڤ سالناما مشەختی نڤیسی(۱٤۷۰-۱٤۷۱ز) وەکی چەوان دانەرێ پەرتووکێ بخۆ ئاماژە ب وێ چەندێ ددەت، دیسان ل سەر ناڤێ دەڤەرا دیاربەکر ب ناڤ کرییە، کو ئوزون حەسەن لێ بووی و مەزن بووی.

مێژوونڤیس دپێشەکیا پەرتووکا خۆ د، ژیانا میرێن ئاق قوینلو یێن دەستپێکی و بابکالێن چیڤانۆکێن ئوزون حەسەنی تا دگەهیتە (شێپ کورێ ئادەم)ی بەرچاڤ کرییە، و ل سەر ئوزون حەسەنی د دەقێ عەربی دا دبێژیت: ( أبو النصر

والظفر غياث السلطنة معين الخلافة المنتظر امامته في الاسلام من سالف الزمان، سلطان حسن بهادر صاحب قران ) ب کوردی:(خودانێ سەرکەتن و مێرخاسیێ و دەستەلاتداریێ جێنشینێ ئیمامێ ژ مێژڤە چاڤەرێکری بۆ سەرکردایەتییا موسلمانان کو چاڤەرێی دادپەروەرییا وی نە ل ناڤ موسلمانان ددوا چەرخێن ژیانا مرۆڤایەتیێ، سولتان حەسەن بەهادر صاحب قەران).

هەر چەند نڤیسەرێ دیاربەکرییە ب رەنگەکێ جودا و دیار رۆلێ ئوزون حەسەنی بەرچاڤ کرییە، لێ دیاربەکرییە دهێتە هژمارتن ژباشترین و باوەرپێکرترین ژێدەر، یێ ب بەرفرەهی ل سەر دیرۆکا میرو هۆزێن دەڤەرێن کوردی د سەدسالییا نەهێ مشەختی/پازدەی زایینی دا ئاخفتی. نەمازە ل سەر هێرشێن بەربەلاڤێن ئوزون حەسەنی ل سەر کوردستانێ کرین و ستاندنا وی بۆ گەلەك جهێن بەرفرەهـ ژ دەڤەرێن کوردی و پەیوەندیێن وی دگەل بەگ و سەرۆك عەشیرەتێن کوردان. هەروەسان پەرتووك پێزانینێن کێم وێنە ل سەر میرێن کوردان، خودانێن بەدلیس و جەزیرە (بۆتان) و سێرتێ و کەلا چمشکزاك و یێن مایی. ل سەر هۆزێن کوردان ژی: سلێمانیە (سلیڤانی) و زرقیە (زەراکی) و قەرە کەچەلو و رۆژکی و بەختی بەرچاڤدکەت. ب ڤێ چەندێ ئەڤ پەرتووکە پێزانینێن پەرتووکا شەرەفنامێ ب داوی نەئینابن تەواو دکەت، و چەند گۆتنێن نە دروست کو بەدلیسی ل سەر میرێن کوردان ل چەرخێ پازدەی زایینی ئاماژە پێ داین راستڤەدکەت، چونکی مێژوونڤیس یێ دگەل وان رویدانان ژیای یان هەڤچەرخێ وان بوو. ژبەر کو دگەل ئوزون حەسەنی بوو، وەسان توومار دکرن وەکی وی دیتین دگەل لایەنگرییەکا ب هێز بۆ سەروەرێ خۆ (صاحب قران)ی .

مێژوونڤیسی دپەرتووکا خۆ دا ئاماژە ب هندە ناڤێن نوی بۆ هندەك جهـ و باژێران کرییە، کو بەری هینگێ د چ ژێدەرێن مێژوویی دا نەهاتینە، ژ وانان ناڤێ باژێرێ دهۆکێ .

دهۆکا نهو وەکی دیار باژێرەکێ نوییە، و یێ وەسا نەبوو وەکی ئەم ئەڤرۆ دبینین. واتە چ ناڤ و دەنگێن خۆ دناڤ مێژوویا کەڤن و ناڤین دا نەبوون.

ناڤێ دهۆکێ خۆ وەکی گوند ژی د چ نڤیسینێن گەرۆك و جوگرافیناسێن دیرۆکێن موسولمانان‌دا نە هاتییە و نە ژی ئاماژە پێ کرینە. (ئیبن ئەلئەسیر) کو ل مووسل ژیای و ئاگەهـ ژ دەنگ و باسێن بەهدینان هەبوو، و پتر ژ جارەکێ ناڤێ معلثایا (مالتا) و أردشت و ئامێدیێ پێ هینای، ناڤێ چ جهان یان کەلا نەهینایە ب ناڤێ دهۆك. خۆ جوگرافیناسێ ب ناڤ و دەنگ یاقوت ئەلحەمەوی (٦٢٦مش-١٢٢٩ز) کو دەڤەرا بەهدینان و أربل و خفتیان (رەواندوز)دیتی و ژ بۆ بازرگانیێ گەلەك چوویە وێرێ، د فەرهەنگا خۆ یا جوگرافییا مەزن دا ناڤێ دهۆکێ نەئینایە. لێ ناڤێ چەند گوند و باژێر و چیایێن دەڤەرێ یێن گۆتین و یێن داینە نیاسین. معلثایا و بامردنی (بامەرنێ) و ئامێدیێ و هرۆر و زەعفەرانیێ و ئەردمشت (کواشێ) و دێر الکلب (قەشەفرێ) و دێر أبونا (دێربوون) و چیایێن داسن (چیایێن ئەتریش-شێخان) و چیایێ ئەلجار (چیایێ گارە) و یێن مایی .

د چەرخێن ناڤین دا ناڤ و دەنگ یێ باژێرکێ معلثایا (گوندێ مالتا - تاخێ مالتا یێ نهو) بوو و وەسان دهێتە هزر کرن کو مالتا، باژێرێ (مالیاتی) بیت، ب واتایا دەربازگە و دەرگەهـ، و ئەو بخۆ چەپەرەکێ سەربازی بوو کو ستراتیجییەتا خۆ دچاخێ ئاشوریێن داویێ دا هەبوو.

دبیت ئەڤە ژی وێ چەندێ ب گەهینت کو دهۆك هێژ نەبوو یان گوندەکێ بچویك بوو و جەمیل رۆژبەیانی وەسان دبینت کو ناڤێ دهۆك یێ ژ (دە - دی) ب واتایا گوند و (أوك) نیشانا بچویك کرنێ. واتە گوندێ بچویك. مرۆڤ دشێت بێژیت کو (ئەبو بەکر ئەلتەهرانی) تا - نها- دهێتە هژمارتن یەکەم کەس کو ناڤێ دهۆکێ ب ڤی ناڤێ نها هەی گۆتی، و ل سەر رووداننێن سالێن (٨٤٩ - ٨٦١مش/ ١٤٤٦- ١٤٤٩ز) وەکی دەق (ب فارسی) دبێژیت : ( بموصل کهنه نزول فرمود و رستم مراد و علی قوجه حاجی را با دو هزار کس بدهوك مليطه روانه ساخت ...) (دیاربکرییە،

بـپ٢٤٢-٢٤٣). و وەرگێرانا وێ (كـەرەمكـر - ئانكـو ئوزون حـەسـەن- ل باژێرێ مووسـلا كـەڤن بنه جهـ بوو و بەرێ رستم موراد و عـەلـى قوجه ب سـەركێشيیا دو هزار زەلامان بده دهۆك مەليته). ددەقێ ئەبى بەكر ئەلتەهرانى ئەم دشێین ب گەهینه ڤێ ئەنجامى :

١ – پەیدابوونا ناڤێ دهۆكێ ب ڤى رەنگێ نها هەی ب كێماسـى ڤەدگەریێتەڤە ناڤەراستا سەدسالییا نەهێ مش/ پازدەی زایینی.

٢ – ئەبو بەكر ئەلتەهرانى وەسان ل قەلەم ددەت كو دهۆك و مالتا ئێك باژێرن نه دو باژێر، لێ بیاڤێ د ناڤبەرا وان دا حەفت كیلومەتربوو و وەسان دیاره دهۆك و مالتا دوی چاخى دا دوو ناڤن بۆ ئێك باژێر و باراپتر دێ مالتا نها بیت .

٣ – ناڤێ دهۆكێ پیچ پیچ زال بۆ ل سەر ناڤێ مالتایێ . و ناڤێ مالتایێ دناڤ ژێدەراندا بەره بەره بەرەڤ نەمانێ ڤە چوو .

٤ – ب گەهشتنا سەدسالییا دەهێ مش/ شازدەی زایینی، ناڤێ دهۆكێ ب تەمامى جهێ ناڤێ مالتایێ گرت، بۆ نموونه بەدلیسى ناڤێ كەلا دهۆك هینا بێ مالتا، كو ل ژێر دەستێ هۆزا داسنى بوو - الداسنیه، لەوما دهۆك ب دهۆكا داسنیان هاته ب ناڤ كرن .※

## ئێكەمین میرێ ناڤدارێ دهۆكێ بەری پتر ژ ٥٤٠ سالان

ئەگەر ئەم گەهشتینه وێ باوەرێ ئەڤە یەكەم ئینانا ناڤێ دهۆكێ یە د بەربەرێن دیرۆكێدا، یا فەره ئاماژه ب یەكەم كەس بكەین یێ بەرپەرێن دیرۆكێ ئاماژه پێ كریبت كو حوكمدارى ل دهۆكێ كریبت، لێ بەرى ئاماژه ب ڤى حوكمدارى بكەین پێویستە بێژین: هەروەك ل ڤان سالێن داویێ ژى چەندین شوینەوار و پەیكەرێن مێژووی دناڤ باژێرێ دهۆك هاتینه دیتن كو هەمى بەلگەو نیشانەنه بو دێرینى وكەڤناریا دهۆك، لێ وەك مە د یەكەم ناڤئینانا دهۆكێ ژى ئاماژەپێكرى دیرۆكێ گەلەك درەنگ ب ناڤێ دهۆكێ كریيە، هەر ب ڤى رەنگى ژى درەنگتر ئاماژه ب كەسەكى كریيە یێ ل دهۆكێ و دەڤەرا وێ دەستەلاتدارى كرى. ئەوا هەتا نها ل بەر دەستێ مە هندەك پێزانینێن گرنگن ل سەر میرەكێ باژێرێ دهۆكێ كو بەرى نێزیكى ٥٤٠ سالان حوكمدارى ل ڤى باژێرى و دەڤەرێ كریيە..

ژێدەرێن چەرخێن ناڤیندا ناڤێ دهۆكێ نەهاتییە و چ پێزانین ل سەر نەهاتینه توومارکرن، لێ ل سەر دەمێ دەسەلاتداریا مەغول وتوركومانانندا، بتایبەت ل سەدسالییا نەهێ مشەختى/پازدێ زایینى بو یەكەم جار دهۆك وەك ناڤەندەكا ئاڤەدانى دەركەت و د ژێدەرێن عەرەبى و فارسى ناڤێ وى هاتییە توومارکرن، ل هەروەك بەریا نها مە دیاركرى ل نیڤا یەكەما سەدسالییا نەهێ مشەختى/ پازدێ زایینى د دەڤەكێ دیرۆكیێ زمانێ فارسیدا ناڤێ دهۆكێ هاتییە، ژ وى بۆ مە خویا دبیت دهۆك ژوى سەردەمیڤە بوويه باژێرەكێ ناڤدار وبارەگایێ دەستەلاتدارییەكا كوردى كو پەیوەندى دگەل مەملوكیان ل مصر و شامێ هەبووینه، مێژوونڤیسەكێ مصرى بناڤێ زین الدین عبدالباسط بن خلیل بن شاهین الحنفى(٨٤٥-٩٢٠ك/١٤٤١-١٥١٤ز) ل كتێبا خۆ (من كتاب المجمع المفنن بالمعجم المعنون)بەحسێ میر (اسد الكردى) كریيە و دبێژیت خودان و شاهـ یێ دهۆكێ بە وئێكە ژناڤدارترین و مەزنترین پاشایێن كوردان و ب ناڤودەنگە ل وەلاتێ خو، و پاشایەكى پایەبەرز و خوشمێره و بدەستەلاتە، و دەڤەرەكا مەزن ل ژێر دەستێ وى یە ل وەلاتێ موصل و خەلكێ وەلاتێ وى ژێ دترسن وتایبەتى سالا ٨٧٠ك/١٤٦٦ز هەر مابوو، ئەڤەژى دەقێ ئاخافتنا وى یە بزمانێ عەرەبى:

(اسد الكردي. صاحب دهۆك، وملك تلك النواحي. هو من أجل ملوك الاكراد، وله الشهره والصيت ببلاده، وعنده شهامه زائده ويخشاه سائر اهل تلك البلاد. وكان موجودا في سني ما بعد السبعين وثمانمائه[٨٧٠هـ/١٤٦٦م] وما عرفت شيئا من حاله بعد ذلك، وبلاده واسعه بنواحي الموصل واحوازها).

مخابن ل دووڤ ئاگاداریا مە تنێ ئەڤ پێزانینە ل سەر ڤی میرێ مەزن هەیە و چ ژێدەرێن دیدا دەنگوباسێن وی بەرچاڤێن مە نەكەتینە، ئەڤەژی بەلگەكێ دیارێ دیبە كو مێژوویا دەڤەرا بەهدینان وكوردستانێ هەتا چ رادەیەك هاتییە فەراموشكرن ویشت گوهخستن.

هەروەسا دیارنینە كا ئەڤ میرە ژ مالباتەكا سەربەخویە یان لقەك بوویە ژمالباتا میرێن ئامێدیێ.

سەبارەت ناڤێ وی (اسد الكردی)كو د راستیدا ئەڤە ناسناڤێ وی یە و (اسدالدین الكردی)ناڤە و هاتییە كورت كرن و ل سەردەمێن ئیسلامیدا میرو كەسایەتیین زانستی و ئایینی نازناڤ هەبوون كو چەمكەكێ ئایینی هەبوو وەكی (سیف الدین، عزالدین، شرف الدین، ضیاء الدین وهتد...) هیڤیدارین پتر دووڤچوون وڤەكولین ل سەر مێژوویا مە بهێتەكرن.

لایەنەكێ دی یێ گرنگێ ڤی تێكستێ مێژوویی ئەوە بەرسڤەكا زانستی یە بو كەس و لایەنێن ناحەز كو دبێژن دهۆك دكەڤندا پتر فەلەنشین بووە.*


## ژێدەر:

- هەتا ڤێرێ د دەمێ خۆدا د كوڤارا دهۆك، هژمار ۱۰- سالا ۲۰۰۰ێدا ب عەرەبی هاتییەبەلاڤكرن.
- هەتا ڤێرێ د دەمێ خۆدا د رۆژناما ئەڤرۆ هژمار هاتییەبەلاڤكرن

- التعريف بالمؤرخين فى عهد المغول التركمان ،ص ٢٤١.
- یشەكییا دیاریكریە ، بث ٨ .
- دیار بكریە، بث ٧ .
- بۆ نموونە بنێرە بث ٣٢ ، ٢٥٤ ، ٢٦٦ ، ٢١٤ ، ٥٤٢ ، ٥٤٤ ).
- طه باقر و فؤاد سعر : المرشد الى مواطن الاثار والحضارة ، الرحلة الثالثة ، بغداد – الموصل ، ١٩٦٦ ، ص ٤٧ – ٤٩ ) .
- داقوق ((دقوقاء) في التاريخ، مجلة المجمع العلمي العراقي- الهيئة الكردية، المجلد العاشر- ١٩٨٣، ص ٣٧١.
- شەرەفنامە ، ١ / ١٤١
- المجمع المفنن بالمعجم المعنون، تحقيق أ.د. عمر عبدالسلام تدمرى، المطبعة العصرية(صيدا-بيروت:٢٠١١)، ٢/٥٥)

# خواندنەك د بەلگەنامەیەكا دیرۆكییا گرنگ دا كو جارا ئێكێ یە دهێتە دیتن

محەمەد ئەمین دۆسكی

كریارێن تالانكرن و شەلاندن و دزیێ د درێژاهییا دیرۆكێ دا نە تنێ پەرتالێ مرۆڤێ كورد ڤەگرتی یە بەلكو یێ گەهشتییە میراتێ وی یێ رەوشەنبیری و پاشمایێ شارستانی ژی، نەخاسمە پشتی پەیدابوونا حەزا ئیمپیریالیزمی و دیاردا گورگەیێ ل سەر مللەت و شارستانییا و ب كارهینانا وان ژبۆ بەرژەوەندییا خۆ، زێدەباری پەیدابوونا هزرا نەتەوەپەرێسی دناڤبەرا وان مللەتێن ل بن ئالایێ ئیسلامێ.

مللەتێ كورد وەكی هەر مللەتەكێ بندەست بووە قوربانێ ڤان هەڤركیا و حەزێن نە مرۆڤینی، و هێشتا یێ ژ بەر ئەنجامێن وان هەڤركێ و حەزا دنالیت، یێن كو بەهرا پتر ژ سامانێ وی یێ نەتەوەیی و شارستانی و ڤەرێژا هزری بووینە قوربان كو مرۆڤێ كورد دڤیا ئاڤاهیێ خۆ یێ شارستانی پێ مكوم بكەت و مللەتێ خۆ ژ ناڤ گەراڤێن پاشڤەمانێ و تەقنا نەزانینێ دەربێخیت، و رێكا زانینێ و زانستی و رۆناهیێ بۆ ب ڤەوژێریت و خۆش بكەت.

ئەگەر ئەم باش ل دیرۆكا مللەتێ كورد بنێرین، نەخاسمە وەرچەیێن وێ دێ بینین ژ لایێ سەرگەرمی و قوربانیدانێڤە یێ كێمتر نینە ژ مللەتێن ڤۆناغەكا مەزن بەر ب پێشكەفتنێ ڤە برین هەتا كو كەتینە پێشی مللەتێن پێشكەتی، بەلێ پا دوژمن ب سەر وی دا زالبوون و شیان میراتێ وی یێ رەوشەنبیری و شیانێن وی یێن شارستانی ژێ بستینن، و د ئەنجام دا ئەو پێزانینێن ل نك وی هێلان یێن كو نەبنە هاریكارێن وی د كارێ نیاسینا دیرۆك و رابردوو د شارستانییا خۆدا، ئەو پێزانینێن بێخێر نەبن كو بكێر نەهێن و نە بنە بەهانە و دەلیل.

بێ گومان ب هزاران پارچەیێن شوینوارا و بەلگەیێن دیرۆكی و دەستخەتێن كێم وێنە و پەرتووكێن ژێك جودا یێن كەتینە دەست بیانییا و یێن هاتینە دزین و یێن چووینە د مۆزەخانە و پەرتووكخانەیێن مللەتێن سەردەست دا وەك بەرهەمێ شارستانییەتا وان هاتینە پیشاندان، و هێشتا سەرێن ڤالا یێن ڤێ دیاردەیێ ب خودان دكەن و ب هەمی رێكا بێ ئەگەرێن مانێ بۆ دابین دكەن.

بۆ نموونە ل نیڤا دووماهیێ ژ سەدسالیا بیستێ حكۆمەتێن ل دووڤ ئێكێن عیراقێ شیان كولتۆرێ شارستانی یێ مللەتێ كورد ژێ بستینن، نەخاسمە رژێما بەعس یا كو بەهرا پتر ژ وێ جینایەتێ بوویە بەهرا وێ، ئەڤ رژێمە شیا دەستێ خۆ دانیتە سەر(٣٢٠) دەستخەتا كو ل نك بنەمالا مفتیێ ئامێدیێ بوون)[1]، و ل مۆزەخانێن عیراقێ بدانیت، وەك بەرهەمێ رەوشەنبیریا عەرەبی پیشان بدەت.

نه تشتەکێ سەیرە کو چارەنڤیسێ ڤان دەستخەتا ل سەر دەستێ وێ رژێما دیرۆکا ئیسلامێ ژ دەستێ وێ سەرساخ نەدەرکەتی و تێکدای و ب عەرەبکرنا وی رابووی یێ هۆبت، ژ بەر کو کارێ وێ ئەوە هەر تشتەکێ رەسەن و ریالیزمی تێکبدەت.

ژ بەلگەنامە و دەستخەتێن خواندنگەها قوبەهان یا کو سولتان حوسێنێ وەلی (٩٤٠- ٩٨٤مش/ ١٥٣٤-١٥٧٦ز) دانای تنێ کێمەك یێن قورتال بووین، و ئەڤ بەلگەنامەیا ئەم ل سەر د ئاخڤین تنێ بەرپەرەکە ژ وان بەلگەنامە و دەستخەتێن ژ بەرزەبوون و تالانکرنێ قورتال بووین، هێژایێ مەحموود مفتی[٢] ئەو دناڤ بەرپەرێن کتێبەکێ ژ وان کتێبا دا دیت یێن کو پشتی مرنا بابێ وی ل نك ماین، و ئەوی ژ چاکیا خۆ ب سۆپاسیڤە رادەستی مە کر.

**دەقێ بەلگەیێ**

«... و میر هاجی و میر ئیسماعیل کورێن میر مجلیێ کورێ میر عەلائودینی بوون، و یێ ئامێدیێ ژ شاه تازی ستاندی و میراتی لێ کری میر هاجی بوو، پاشی پشتی وی میر ئیسماعیلی میراتی لێ کر، پاشی بەهدینی، پاشی میر محەمەدی، پاشی میر سێڤدینی، پاشی کورێ وی حەسەن بەگی حەفتێ سالا میراتی لێ کر، پاشی برایێ وی سولتان حوسێنی، پاشی ئیبێ سولتان ل دەمێ دو هەیڤان، پاشی حەسەن بەگێ ناڤێ وی هاتیە گۆتن، پاشی کورێ وی سولتان حوسێنی، پاشی کورێ وی قوباد بەگی، پاشی کورێ وی سەید خان بەگی، پاشی کورێ وی مراد مراد خان بەگی ل دەمێ هەیڤەکێ، پاشی برایێ وی سولتان حوسێنی، پاشی برایێ وی عەبدلا خانی، پاشی برایێ وی حەسەن بەگی، پاشی برایێ وی سولتان مەسیدی، پاشی کورێ وی سولتان حوسێنی، پاشی برایێ وی قوباد بەگی، پاشی برایێ وی ئوسمان بەگی، پاشی برازایێ وی بەهرام بەگی».

## چەند تێبینی ل دۆر بەلگەنامەیێ:

ژ خواندنا بەلگەنامەیێ دیاردبیت کو نڤیسەرێ وی د زمانێ عەرەبی دا باش یێ شەهرەزا نەبوو، ژ بەر کو زمانێ وێ یێ لاوازە و هندەك شاشیێن زمانی تێدا هەنە، و ژ گەلەك لایانڤە کێماسی تێدا هەنە، هیچ دیرۆکەك ل سەر نە هاتیە نڤیسین، بەلێ ئەم دشێین بێژین کو ل سەردەمێ میر بەهرام بەگی یا هاتیە نڤیسین، یێ کو ناڤێ وی د چ ژێدەرێن دیرۆکی دا نەهاتی، دیسا میری ل دووڤ وی ژی هاتی، ژ بەر کو ل دووڤ ناڤێ میر بەهرام بەگی مۆرێن شاهدانن، کو بەرێ سۆزنامە و پەیماننامە ژ لایێ شاهـ و میر و ماقوولێن جڤاکی ڤە پێ د هاتنە مۆرکرن، ژ لایەکێ دی ڤە ئەو پیتا ل دەستپێکێ هاتی دەلیلە کو ئەڤ دەقە تمامکەرەکێ بەری خۆیە، و قەتاندنا پێڤەچوونی ژ خواندنا دەقی دیار دبیت، و دەمێ نڤیسەرێ ڤێ بەلگەنامەیێ زمانێ عەرەبی باش نە دزانی (ئەلف و لام) یێن ژ پەیڤا (أمیر) ئێخستین، و هندەك جاران ژی پیتا (ألف) یا ژ پەیڤا میری ب خۆ ژی ئێخستی و (الملك الطازی) یێ کریە (ملك طاری)، ژ بلی شاشیێن دی یێن رێنڤیسێ.

هەر وەسا پیتا (ێ) یا فارسی کو دبیتە پیتا (ە) یا ب کارئینای، و (ئیبی سلطان) یێ کریە (ایبە سلطان)، (ابراهیم) ژی ل نك کرمانجان دبیتە (ئیبێ) دەمێ دکەنە ناسناڤ، بەلێ سۆرا دکەنە (ئیبە) یان (بلە).

**ناڤەرۆکا دەقی**

بێ گومان ئەڤ پێزانینێن د ڤێ بەلگەنامێ دا نە وەکی وان پێزانینانە یێن کو د بەهرا پتر د ژێدەرێن دیرۆکی دا ژ دەستخەت و پەرتووکێن چاپکری ل دۆر میرگەها، و میرێن ئامێدیێ، و ژ وانان ژی دەستخەتا زێوکی یا کو دیرۆکا نڤیسینا وی دزڤریتە سەردەمێ ئیسماعیل پاشایێ ئێکێ(١١٨٢-١٢١٣مش/ ١٧٦٨-١٧٩٨ز)(١/٩٤-٩٥)، و ب دروستی سالا (١٢١٠مش/١٧٦٥ز) هەر وەکی د وێ بخۆ دا هاتی. و میراتی ب ڤی رەنگی هاتیەکرن:

١- شاهـ تازی (دیارە نە ژ بنەمالا میرێن ئامێدیێ بە).
٢- میر هاجی کورێ میر مجلی.
٣- میر ئیسماعیلێ کورێ میر مجلی.

**بەرپەرەك ژ دارا بنەمالا میرێن ئامێدیێ ل سەر دەمێ بەهرام بگیدا هاتیە نڤیسین، ژ پەرتوکخانا موفتیێ ئامێدیێ محمد شکری ئەفندی**


وأمير هاجي وأمير اسماعيل كانا ابني أمير مجلي ابن امير علاء
الدين والذي اخذ العمادية من ملك الطاري هو أمير هاجي
وتولى الامارة بها ثم بعده تولى الامارة امير اسماعيل ثم الى امير
بهاء الدين ثم الى محمد ثم الى امير زين دين ثم الى امير بهاء الدين
ثم الى امير سيف الدين ثم الى ابنه حسن بك سبعون سنة ثم الى اخيه سلطان
حسين ثم الى ابن اخيه سلطان شهر حسن ثم الى حسن بك المذكور ثم
الى ابنه سلطان حسين ثم الى ابنه قباد بك ثم الى ابنه سيد خان بك ثم
الى ابنه مراد خان شهرا ثم الى اخيه سلطان حسين ثم الى اخيه عبد الله
خان ثم الى اخيه حسن بك ثم الى اخيه سلطان سيد ثم الى ابنه سلطان
حسين ثم الى اخيه قباد بك ثم الى اخيه عثمان بك ثم الى ابن اخيه
بهرام بك

٤- میر بەهدینێ ئێکێ.

٥- میر محەمەد.

٦- میر زەینەدین.

٧- میر بەهدینێ دووێ.

٨- میر سێڤدین.

٩- سولتان حەسەن بەگێ ئێکێ کورێ میر سێڤدینی.

١٠- سولتان حوسێن بەگێ ئێکێ کورێ میر سێڤدین.

١١- سولتان ئیبراهیمێ کورێ سولتان حوسێنێ ئێکێ.

١٢- سولتان حەسەن بەگێ کورێ میر سێڤدینی، کو جارەکادی بوویە میر پشتی سولتان ئیبراهیمی.

١٣- سولتان حوسێن بەگێ دووێ کورێ حەسەن بەگێ ئێکێ.

١٤- میر قوباد بەگێ ئێکێ کورێ سولتان حوسێن بەگێ دووێ.

١٥- سولتان سەید خان بەگێ کورێ قوباد بەگی.

١٦- میر مراد خان بەگێ کورێ سولتان سەید خان بەگی.

١٧- سولتان حوسێن بەگێ سیێ کورێ میر مراد خان بەگی.

١٨- میر عەبدلا خان بەگێ کورێ سولتان سەید خان بەگی.

١٩- میر حەسەن بەگێ کورێ سولتان سەید خان بەگی.

٢٠- سولتان سەیدێ کورێ سولتان سەید خان بەگی.

٢١- سولتان حوسێن بەگێ چوارێ کورێ سولتان مەسیدی.

٢٢- میر قوباد بەگێ کورێ سولتان مەسیدی.

٢٣- میر ئوسمان بەگێ کورێ سولتان مەسیدی.

٢٤- میر بەهرام بەگێ کورێ سولتان حوسێنێ چوارێ.

## میرێن تنێ خودانێ بەلگەنامەیێ ناڤێن وان ئینایین

ئەڤ بەلگەنامە یا ڤەدەرە ژ گشت ژێدەرێن دیرۆکی ب تووماركرنا ناڤێن پتر ژ دەه میرێن ناڤێن وان ژ بەر هندەك ئەگەرێن نە دیار د چ و پەراوێزێن وان دا نەهاتین، بەلێ ئەڤێ بەلگەنامەیێ ئەو خەلەكا بەرزەبووی ژ زنجیرا رویدانێن دیرۆکی یێن میرگەها بەهدینان زڤراندەڤە، و دوور نینە ئەڤ میرە و میرێن ناڤێن وان د ژێدەرێن دی ژی دا هاتین ژ ئێك بنەمال بن، و ئەڤ چەندە تشتەکێ رەوایە ژ بەر کو گەلەك ناڤ و نەقلناڤ وەکی ئێکن، و ئەو میر ژی ئەڤەنە:

١- میر هاجی کورێ میر مجلیێ کورێ میر

عەلاودینی.

ل دووڤ بەلگەنامەیێ یا دیارە کو میر هاجی، ئامێدیێ یا ژ شاهـ تازی ستاندی، هەر چەندە خودانێ دەستخەتا زێوکی دبێژیت شاهـ خەلیلێ کوڕێ عزەدینی یەکەم کەس بوو حوکم ل کەلا ئامێدیێ کری (٣٢/٢). بەلێ خودانێ شەرەفنامێ دبێژیت میر بەهدین بوو یێ ژ کەلا (تاروونێ) هاتیە ئامێدیێ (١٠٢/٤)، و ئەنوەر مایی دبێژیت: میر بەهدینی ل سالا (٦٥٩مش/ ١٢٦٢ز) (١٢٠/٣) خۆ کرە میرێ ئامێدیێ، بەلێ ڤەکۆلەرەك دامەزراندنا میرگەها بەهدینان بەری ڤێ سالێ ددانیت، دەمێ دبێژیت: شەرەفخانێ بەدلیسی دەمێ میراتیا میر بەهدینی ل بەر چاڤ ناوەرگرت دەمێ گۆتی «گۆتنا ژ هەمیا دروستتر ئەوە کو نها (١٠٠٥مش/١٥٩٦ز) چوارسەد سال پێن ل سەر میراتیا کوڕێن میر بەهدینە بوورین» (١٤٦/٥)، و د خواندنەکا دی دا ئەڤ بۆچوونە پتر یا هاتیە سەلماندن و ئەنجامەکێ ژ گۆتنا بەدلیسی هاتیە چێکرن دبێژیت: میراتیا میر بەهدینی و کوڕێن وی ل توخیبێ سالا (٦٠٥مش/ ١٢٠٨ز) (٣٤/٦) یا هاتیە دەستپێکرن، و خودانێ خواندنێ وەکی بەدلیسی ناکەت و میراتیا میر بەهدینی ددەتە دگەل، ئەڤە هەمی ژی شاشیا بۆچوونا ئەنوەرێ مایی د سەلمینت، ژ بەر کو میراتیا میر بەهدینی دژڤریتەڤە بەری سالا (٦٠٥مش/ ١٢٠٨ز)، و دوور نینە میر بەهدینێ دووێ بت یێ کو ل سالا (٦٥٩مش/ ١٢٦٢ز) بوویە میر، ژ بەر کو دو میرا میراتیا کری د وی دەمێ دناڤبەرا دەمێ میراتیا وی و میراتیا میر بەهدینێ بەری وی دا کو دبنە میر محەمەد و میر زەینەدین.

٢- میر ئیسماعیلێ کوڕێ میر مجلیێ کوڕێ میر عەلاودینی.

٣- سولتان حوسێنێ کوڕێ میر سێڤدینی.

٤- سولتان ئیبراهیم، کو د بەلگەنامەیێ دا (ابیە سولطان).

٥- سولتان حوسێن بەگێ سێ کوڕێ سولتان سەید خان بەگی. کو دوور نینە ئەو بیت یێ ل سالا (١٠٠٩مش/١٦٠١ز) حوکم ل مووسلێ کری ل سەردەمێ میر سەید خان بەگی (٦٩/١).

٦- میر مراد خان بەگێ کوڕێ سولتان سەید خان بەگی.

٧- میر عەبدلا خان بەگێ کوڕێ سولتان سەید خان بەگی.

٨- میر حەسەن بەگێ دووێ کوڕێ سولتان سەید خان بەگی.

٩- سولتان مەسید بەگ.

١٠- سولتان حوسێن بەگێ چوارێ کوڕێ سولتان مەسیدی.

١١- میر قوباد بەگێ کوڕێ سولتان مەسیدی.

١٢- میر ئوسمان کوڕێ سولتان مەسیدی بەگی.

١٣- بەهرام بەگێ کوڕێ سولتان حوسێنێ بەگێ چوارێ.

## میرێن ناڤێن وان د ژێدەران دا هاتی و خودانێ بەلگەنامەیێ ناڤێن وان نەئینایـن

**١- میر عەلائودین:**

کوڕێ شاهـ خەلیلی یە، بابێ وی ئەو کرە میرێ ئامێدیێ، و پشتی وی کوڕێ وی میر مجلی بۆ میرێ وێ (٦١/١).

**٢- میر مجلی:**

کوڕێ میر عەلاودینی یە، پشتی بابێ خۆ یێ بوویە میر (٥٠/٢) تنێ مەحفۆزێ عەباسی بەحسێ وی یێ کری، و د ڤێ بەلگەنامەیێ دا هاتیە کو وی ئامێدیێ یا ژ شاه تازی ستاندی:

**٣- میر بەهدین:**

کوڕێ میر عەلاودینی یە، پشتی میر ئیسماعیلی هەر وەکی د بەلگەنامەیێ دا هاتی یێ بوویە میر، بەلێ ئەنوەر مایی وی دکەتە یەکەمین میرێ میراتی ل ئامێدیێ کری کو ل سالا (٦٥٩مش- ١٢٦٢ز) (٥١/٣)

بوو، ئانكو پشتی ستاندنا بەغدا ژ لایێ مەغۆلا ڤە ب سێ سالا.

**٤- میر محەمەد:**

كورێ میر موبارەكی یە ل دووڤ گۆتنا دەستخەتا زێوەكی (٤١/٢)، بەلێ مەحفۆزێ عەباسی ژ سامرائی ڤەدگوهێزیت و دبێژیت ئەو كورێ میر بەهدینی یە (١٢١/١)، و ئەڤە دگەل بەلگەنامەیێ یا رێكەفتی یە، ژ بەر كو وی میراتی پشتی میر بەهدینی یا كری، بەلێ وێ ژی دبێژیت كو میر محەمەد پشتی هەردو براێن خۆ میر زەینەدین و میر نورەدینی میراتی یا كری(٦٢/١).

**٥- میر بەهدینێ دووێ:**

كورێ میر محەمەدی یە، پشتی مامێ خۆ میر زەینەدینی هەر وەكی د بەلگەنامەیێ دا هاتی یێ بوویە میر، بەلێ مەحفۆزێ عەباسی دبێژیت: ئەو پشتی برایێ خۆ میر سێڤدینی یێ بوویە میر (٦٢/١).

**میرێن بەلگەنامە و ژێدەرێن دیرۆكی ل سەر ناڤ و كریارێن وان رێكەفتین**

**١- میر سێڤدین:**

كورێ میر محەمەدی یە، ل ژیێ شازدە سالیێ یێ بوویە میر (١٢٣/٣) و بنەمالا میرێن ئامێدیێ ب ناڤێ وی یێ هاتییە ناڤكرن و بوویە (میر سێڤدینا)، ئەوی دو كور ل پاش خۆ هێلان حەسەن بەگ و بایرك بەگ (٦٢/١)، بەلێ ئەنوەر مایی دبێژیت حەسەن بەگ و زەینەدین بەگ بوون، و زەینەدین بەگ ب ناڤێ باپیرێ وی هاتبوو ناڤكرن و ب ناڤێ (باپیر) ب ناڤ و دەنگ ببوو (١٣٤/٣).

**٢- سولتان حەسەن بەگێ ئێكێ:**

پشتی بابێ خۆ ببوو میر، و میراتیا وی حەفتێ سالا ڤەكێشا هەر وەكی د بەلگەنامەیێ دا هاتی و دگەل یا شەرەفنامێ دا هاتی رێكەفتی (١٠٤/٤)، بەلێ مەحفۆزێ عەباسی دبێژیت:

پشتی مامێ خۆ میر بەهدینێ دووێ یێ بوویە میر (٥١/٢) و ل سالا (٩٤٠مش/ ١٥٣٤ز) (١٢٧/٣) یێ مری، و ئەڤە وێ چەندێ دگەهینت كو ئەو ل سالا (٨٧٠مش/١٤٦٥ز) یێ بوویە میر، ئەڤە ئەگەر بەلگەنامەیێ دەمێ میراتییا وی بەری برایێ وی سولتان حوسێنێ ئێكێ و پشتی وی حسێب كربیت، و ئەگەر دەمێ میراتییا وی یا پشتی برایێ وی حسێب نەكر بیت دەمێ میراتییا وی ژ حەفتێ سالا پتر لێ هێت و ڤەگەریتە بەری سالا (٨٧٠مش/١٤٦٥ز)ێ.

**٣- سولتان حوسێن بەگێ دووێ (وەلی):**

كورێ سولتان حەسەن بەگێ ئێكێ یە، پشتی مرنا بابێ سالا (٩٤٠مش/١٥٣٤ز) (٥٤/٢) بوویە میر، و میراتیا وی (٤٤) سالا ڤەكێشایە، و ل سالا (٩٨٤مش/١٥٧٦) مرییە (٥٩/٢).

**٤- میر قوباد خان بەگێ ئێكێ:**

كورێ سولتان حوسێنی دووێ یە (وەلی)، پشتی مرنا بابێ خۆ یێ بوویە میر، ئانكو ل سالا (٩٨٤مش/١٥٧٦ز)ێ ژ برایێ خۆ بەهرام بەگێ یێ بچویكتر بوو، لێ ژ بەر مو ئەو كورێ دۆتماما بابێ خۆ (نالیا خاتوینێ) بوو ئەو ژ وی باشتر دانان و بەری وی كرنە میر، دەیكا بەهرام بەگێ ژی ژ بنەمالا (شەنبووی) بوو میرێن هەكاریا، و خویشكا زەینەل بەگێ میرێ هەكاریا بوو (١٣١/٣). هندەك رویدان دناڤبەرا میر قوباد بەگێ ئێكێ و برایێ وی بەهرام بەگێ دا چێبوون، د ئەنجام دا بەهرام بەگ ژ بەر وی رەڤی و قەستا شاهـ ئیسماعیلێ سەفەویێ دووێ كر. ل ڤی دەمی مزووری ل میر قوباد بەگێ رابوون و ئەو ژ میراتیێ ئێخست و پسمامێ وی سلێمان بەگێ كورێ زەینەدین بەگێ كورێ سێڤدین بەگێ دانانە شوینا وی، سلێمان بەگێ ژی لەشكەرەك ئامادەكر و هێرش كرە سەر قوباد بەگێ ل دهۆكێ و كوشت.

**٥- سولتان سەید خان بەگ:**

كورێ میر قوباد خان بەگێ كورێ سولتان حوسێن بەگێ دووێ (وەلی) یە، ل سالا (٩٧٠مش/١٥٦٢ز) یێ بووی، و ل سالا (٩٩٣مش/١٥٨٥ز) ل دووڤ بریارا سولتان مراد خانێ ئوسمانی بوو میر، یێ كو بریارا ئێخستنا میر بەهرام بەگێ ژ میراتیێ دایی، میراتییا سەید خان بەگی (٤٤) سالا ڤەكێشا، و ل سالا (١٠٢٩مش/ ١٦٢٩ز) مر (٧٥/١).

هندەك تێبینیێن دی:

بەری نها مە ئاماژە دابوو وی دەرئەنجامێ دو ڤەکۆلەر گەهشتینێ، ئەو ژی ئەوە کو دەستپێکا حوکمێ کورێت میر بەهدینی ل سنوورێ سالا (٦٠٥مش/١٢٠٨ز) بوویە، ڤێجار پێنەڤێت کو حوکمێ میر بەهدینی و حوکمێ میر مجلی ڤەدگەریتە نیڤا دووێ ژ سەدسالیا شەشێ مشەختی، و ئەڤە بێ گومان دسەلمینت کو ڤێ بنەمالێ چ پەیوەندی ب دویندەها عەباسییان ڤە نینن، و ناگەهنە وان، هەروەسان دوپات دکەت کو وێ بۆچوونێ چ راستی ژێو نینە یا کو میرێن جولەمێرگێ- کو ئەو و میرێن بەهدینان ژ ئێك دویندەهێ نە- دکەنە دویندەها عوتبێ کورێ ئەبو سفیانێ ژ بنەمالا ئومەییە (٣٨٣/٧). لێ سەبارەت دیرۆکا کەلا ئامێدیێ ئیبن ئەسیر یێ کو ل سالا (٦٣٠مش/ ١٢٢٣ز مرییە) د رویدانێن سالا (٥٣٧مش/ ١١٤٢ز) دا دبێژیت: عیمادولدینی کورێ نورەدینێ کورێ عیمادولدینێ زەنکی، لەشکەرەك هنارتە کەلا ئاسب[٣] یا کو دبیتە مەزنترین و ئاسێترین کەلا هەکارییا و شیا بستینت، و فەرمان دا بهێتە وێرانکرن و ل شوینا وێ‌کەلا ئامێدیێ بهێتە ئاڤاکرن، و ئەڤ کەلە ئانکو کەلا ئامێدیێ ژ کەلێن وان یێن مەزن بوو و ئەو نەشیابوون بپارێزن (٩/٥-٦) ئەڤە ژی باشتر دەلیلە ل سەر کەڤناریبا وێ، حوکمێ شاهـ تازی[٤] ل ئامێدیێ پشتی ڤان رویدانان پەیدا ببوو، ژ بەر کو ل دووڤ ئاخفتنا بۆری، ئامێدیێ یا ئاڤابوو بەری عیمادولدینێ زەنکی فەرمانا ئاڤاکرنا وێ جارەکادی بدەت، و دیرۆك ژی بەحسێ چ تشتا ل دۆر میرێن وێ یێن بەری وێرانکرنا وێ ناکەت، نەخاسمە ئەوێن حوکم لێ کری و دامەزراندی و بنیاتێ وی موکم کری[٥].

دیسا ئەگەر پشکێت دی یێن ڤێ بەلگەنامەیێ هاتبانە دیتن، دا بۆ مە هندەك تشتێن دی یێن نە دیار و بەرزە یێن ژ لایێ دیرۆکنڤیساڤە نەهاتینە بەحسکرن دیاربن، و هندەك لایەنێن دی ژ دیرۆکا میرگەها بەهدینان هێنە رۆنکرن، دوور نینە بەری ڤێ بەریەرێ قورتالبووی چ بەریەرێن دی یێن گرنگتر نەبن ل دۆر دەنگوباس و رویدان و زەلامێن وان هینگێ رۆلێ خۆ هەبوو د کارێ ئاڤاکرنا میرگەها بەهدینان و بەرفرەهکرنا وێ دا، و ئەڤ بەلگەنامەیە ژ لایێ ماقوولێن میرگەهێ ڤە نە دهاتە مۆرکرن ئەگەر گرنگییەکا باش نەبایە ژ لایێ راستی و دروستیێ ڤە.

ب کورتی ژ بەر کێمیبا ژێدەرێن دیرۆکی، ب تنێ من پشتا خۆ یا ب چەند ژێدەرێن کێم ڤە یا بەستی، ژ بەر کو ئەو ئەنجامێ زەحمەتەکا زۆر بوونە د کارێ تویژاندنێ دا، کو پشکەکا باش ژ تویژاندنا دیرۆکا بنەمالا میرسێڤدینا ڤەگرتییە.

ئەڤ بابەتە ئەگەر تویژاندن ژی نەبیت، ڤەژینکرنەکا پێدڤییە ژێو زیندی هێلانا ڤێ بەلگەنامەیا گرنگ و پاراستنە، ئەگەر ئەڤە هەمی ژی نەبیت، بەلکو کارێ من سەرنجراکێشانا تایبەتمەند و بسپۆران بیت ئەڤێن د ڤی بیاڤی دا کاردکەن، دا کو ئەو ژیانێ بدەنێ، یان پاشماوێن وێ ژ بەرزەبوونێ قورتال ببن، بەلکو کوژیەکێ دی ژ دیرۆکا ڤێ میرگەهێ گەش ببیت.

## ژێدەر:

١. بنەمالا عوبەیدوللا ئەفەندی کورێ مەلا ئەسعەدێ ئامێدی، یێ کو بوویە مفتیێ ئامێدیێ ل سەر دەستێ والیێ عیراقێ داود پاشای (١٨١٦-١٨٣١ز).

٢. مەحموود مفتی کورێ محەمەد شوکری یێ کورێ عوبەیدوللا ئەفەندی یە، ل سالا (١٩٤٥) ل ئامێدیێ ژ دایکبوویە، خواندنا سەرەتایی ل ئامێدیێ و یا ناڤنجی و ئامادەیی ل بەغدا ب دووماهی ئینایە، و سالا (١٩٦٤) ل پشکا کوردی یا رادیۆیا بەغدا هاتیە دامەزراندن، پاشی چەندین پلەیێن کارمەندی وەرگرتینە و پلەیا دووماهیێ بوویە رێڤەبەرێ ئەمینداریا گشتیا بازرڤانی و چاڤینگەهان. سالا (١٩٩٠)هاتیە خانەنشینکرن.

٣. کەلا (ئاشب) هێشتا شوینوارێن وێ ل دەڤەرا سەرسنکێ هەنە و هێشتا دبێژنێ (ئامێدیکا خراب). سەبارەت کەلا ئامێدیێ، عیمادولدینێ زەنکی نە ئەو ئاڤاکرییە و نە ژی نووژەنکرییە و بەری وی هەبوویە، و دەمێ کەلا ئاشب وێرانکری خەلکێ وی رەڤینە کەلا ئامێدیێ یا کو هینگیێ دگۆتنێ (کەلا جەللاب) یان (عین بەقێ) و خانی بۆ خۆ لێ ئاڤاکرن.

٤. دبێژن ئەو ژ بنەمالا مەلکا ئیزی یە (٣٠/٣) یا کو ژ ئێلا تیاریا نەستۆری، یا کو ل کوردستانێ ل دەڤەرا هەکاریا ئاکنجی، هەژییە بێژین کو ڤێ ئێکێ ناڤێن سەر و ئێلێن خۆ دکرنە (مەلك).

٥. دبێژن میرێ بەری ئیسلامێ حوکم ل ئامێدیێ دکر ناڤێ وی (کەکە میر) بوو، وی سەرکردەیەکێ ژێهاتی هەبوو دگۆتنێ (کەنگرە). دەمێ لەشکەرێ موسلمانا قەستا کەلا ئامێدیێ کری و ل دەمێ شەش هەیڤا دوورپێچکری و نەشیای بستینت و گەهشتییە وێ باوەریێ کو ستاندنا وێ ب هیچ رەنگەکی نابیت، هزرا خۆ د خاپاندنەکێ دا کرکو پێ بستینت، ئینا رابوو نامەیەك بۆ خەلکێ وێ فرێکر و دگەل وی ئاشت بوو کو وی ل بەرە بچیتە هندە دەڤەرێن دی، و ژ وان خواست هندەك سندۆقا وەك ئێمانەت ل نك خۆ بپارێزن هەتا کو لێ بزڤریت و ئەگەر لێ نە زڤری بۆ وان بن، سندۆق ژی برنە د کەلێ ڤە، چ مال دناڤ سندۆقا دا نەبوو، بەلکو زەلامێن ب چەك تێدابوون، و دەمێ لەشکەرێ موسلمانا چووی و دویرکەتی، خەلکێ کەلێ دەست ب کەیف و ئاهەنگا کرن ب هەلکەفتا نەمانا دوورپێچێ، دگەل ڤێ چەندێ زەلام ژ سندۆقا دەرکەتن و هێرش کرنە سەر زێرەڤانێن دەرگەهێ کەلێ، و ل دووماهیێ شیان بۆ لەشکەرێ موسلمانا ڤەکەن، یێ کو خۆ ل نێزیکی دەرگەهی ڤەشارتی و ل هیڤیا ڤەکرنا وی مایی. بڤی رەنگی کەلا ئامێدیێ هاتە ستاندن، و ئەو هەولدانێن بەرگریێ یێن سەرکردەیێ وێ (کەنگرە) بوویە قوربان ب ئاڤێ دا چوون

(دچاڤپێکەتنەکێ دا دگەل بەرێز مەحموود مفتی ل رۆژا ١٩٩٥/١٠/١٢ وی بۆ من ئەڤ رویدانە بەحسکر).

## ژێدەر:


١. محفوظ العباسی، العباسیون بعد احتلال بغداد، دار الشؤوون الثقافیة، (بغداد: ١٩٩٠).

٢. محفوظ العباسی، امارة بهدینان العباسیة، مطبعة الجمهوریة، (الموصل: ١٩٦٩).

٣. انور المائي، الاكراد في بهدينان، مطبعة الحصان، (الموصل: ١٩٦٩).

٤. شرفخان البدليسي، الشرفنامة، ترجمة محمد علي عوني، راجعه وقدم له يحيى الخشاب، دار احياء الكتب العربية.

٥. عبدالفتاح علي يحيى، الملا يحيى المزوري وسقوط امارة بهدينان، مجلة كاروان، العدد ٢٤٢، آذار ١٩٨٦.

٦. تحسين ابراهيم الدوسكي، أمراء بهدينان وسقوط النسب العباسي، مجلة السراط المستقيم، العدد ٦، ١٩٩٣.

٧. أبو العباس احمد بن علي القلقشندي، صبح الاعشى في صناعة الانشا، المؤسسة المصرية للتأليف والترجمة والطباعة والنشر.

٨. ابن الاثير الجزرى، الكامل في التاريخ، طبعة دار الكتاب العربي، الجزء الثاني، (بيروت: ١٩٨٠).

# میرێن بەهدینان
# هەتاکو ڤەگرتنا ئوسمانی

**پ. د عیماد عەبدولسەلام رەئووف**

**پ.د زرار صەدیق توفیق**

**وەرگێران:موسەدەق تۆڤی**

## ١-دەروازە

هەر ژ سەدسالیيا حەفتێ مشەختی/سێزدێ زایینی رۆژهەلاتا ئیسلامی گورانکارێن سیاسی و لەشکەری یێن دژوار و ل دووڤ ئێك ب خۆڤە دیتن، ئەڤ گورانکاریە ژئالییەکیڤە پێکهاتیبوون ژ گۆهورینا دەستەلاتداران، ژلایەکێ دووڤە گۆهورینا پەیوەندیێ د ناڤبەرا دەستەلاتدار و دەستەلات لێ کریاندا، پێشکەڤتنا هێرشێن مەغولان و عەشیرەتێن دیتر ژ وەلاتێن خۆ ل ناڤەراستا ئاسیا بۆ رۆژئاڤایێ وێ، بوو ئەگەرێ رۆخاندنا سیستەمێن پێشتر حوکمداری ل دەڤەرێ دکر[1]، ل دەستپێکا وان ژی خیلافەتا عەباسی، ئەڤ روخاندنە رێخوشکەرەك بوو بۆ دەستپێکرنا قوناغەکا پری ئاژاوە و ئالوزا پێکهاتی ژ سەپاندنا دەستەلاتێ هندەك هوزێن پاشڤەمای ل سەر هندەك هەرێمێن رۆلێ خۆ د وارێ شارستانیدا هەی. لگەل دیاربوونا دیاردا ئێککرتنا عەشیرەتان، سەرکردایەتیێن وان ئێککرتنا وەکو حکومەت و دەولەتان لێ هاتن، هەرچەندە وان شیانێن دەولەتبوونێ ل دووڤ تێکەهێن وی سەردەمی نەبوون، هەڤرکیێن دژوار، کو بەهرا پترا وان دخویناوی بوون، بوونە سیمایێن هەموو وی سەردەمی، میر و سەرکردە مژوولی لێکدان و شەرێن هەڤدو بوون، وەلات یێ نقووم بوو د دەریایا ئابووریيەکا راوەستیای و لاواز و جڤاکەکێ پاشڤەمای و ئالۆز و سەر ب ئاریشەدا، چالاکیێن ناڤ بازێران ژی تنێ د بەرژەوەندیا هێزێن چەکدارێن عەشیرەتاندا بوو و تنێ دەنگێ چەکان بەرگوهێن خەلکی دکەفت.

کوردستان نە یا دووربوو ژ ئەوان گورانکاریێن ل دەوروبەرێن وێ روودان، سەرکردێن عەشیرەتێن بهێز ئەوێن وەسان رادگەهاند کو شەرعییەتا وان ژ وێ پەیوەندیێ یە ئەوان دگەل خیلافەتا عەباسی هەی، سەرەرای لاوازیيا وێ و دەولەتێن ئیسلامی ئەوێن شەرعیەتا خۆ ژ وێ وەرگرتی، سەروبەر هاتەگۆهارتن ئەڤ شەرعیەتە تنێ ما د وێ هێزێدا ئەوا وان ب کریار ل سەر عەردی هەی، ئەڤ هێزە یا پێکهاتیبوو ژ کەلایێن ئاسێ و زەلامێن مەشقپێکری یێن شیانێن هەلگرتنا چەکی ل هەر دەمەکی هەی، زێدەباری سروشتێ دەڤەرێ یێ ئالوز کا چەوا دێ مفای ژێ وەرگرن داکو سەربەخۆییا خۆ ب پاریزن، هەروەسا

ئەوان سەركردایەتییان میرگەهـ پێكئینان، كو شیان هەبوون و سیاسەتا خۆ ل سەر دەڤەرێن كوردستانێ یێن جیاواز بسەپینن، ژ ئالییەكێ پێدڤی بوو ل سەر ڤان میرگەهان هەڤسەنگییێن خۆ یێن تایبەت دناڤ بەرا دەولەتاندا رابگرن كو زۆربەیا وان ل سەر بنیاتێن عەشیرەتی بوون كو كیانێ وان یان بكێمی ئێمناهییا وان بپارێزیت.

دەمێ ل نیڤا سەدساڵیا هەشتێ (چواردێ زایینی) دەولەتا مەغولی یا ئیلخانی كەفتی، دو دەولەت ل پاش خۆ هێلان، ئەو ژی دەولەتا جۆبانیان ل ئازەربێجانێ و دەولەتا جەلائرییان ل عیراق و باشووری كوردستانێ، میرگەهێن كوردی نەچاربوون هەڤپەیمانیێ گرێدەن، یان بكەڤنە بن دەستەلاتا ئێك ژ وان دەولەتێن هەڤرك، ئەڤەژی بوو ئەگەرێ تاگیرێن جودا جودا د ناڤبەرا میرێن كورداندا.

دگەل بەردەوامیا هاتنا عەشیرەت و داگیركەران ژ رۆژهەلاتێ، ل سەر ڤان میرگەهان بوو رووبرووبێ چارەنڤیسێ خۆ ببن، و بەردەوام بۆ خۆ ل هەڤپەیمانێن بهێز بكەرن.

هاتنا هێرشێن تەیموورێ لەنگ ل داوییا سەدساڵیا هەشتێ مشەختی دەڤەر پتر توشی ئاژاوەگێری و بێ سەروبەریێ كر، كریارێن ڤركرنا خەلكێ ئەوێن وی ئەنجامداین و ژناڤبرن و هەرفاندنا دەستەلاتدارێن خۆجهی، ترس و لەرزەك مەزن ئێخستە كوردستانێ هەروەكی ئێخستییە وەلات و دەڤەرێن دیتر، د ڤی سەردەمیدا دیرۆكا كوردان دو پەسن ب خۆڤە دگرتن، ئەو ژی: شۆرش بوون دژی وی و خۆ پاراستن بوو ژ بەلا و شەرێ وی ئەو ژی ب دیاركرنا خۆشكاندنێ بۆ دەستەلاتێ وی.

هێژ مەترسیا تەیمووری ب مرنا وی ب داوی نەهاتی، گورانكارییەكا نوو د سەنتەرێن هێزاندا ل وەلاتی پەیدابوون، ئەو گورانكاری پێكهاتیبوو ژ دەركەتنا دو ئێككگرتنێن عەشیرەتێن توركومانی، و پێكئینانا وان بۆ دو دەولەتا ئەوژی قەرە قوینلو و ئاق قوینلو بوون، دەست ب گەهاندنا دەستەلاتێ خۆیێ لەشكەری بۆ سەر كوردستانێ كر، یا ئێكێ دەستەلات ل سەر عیراقێ و هندەك كوردستانا رۆژهەلاتی و باشووری كر، و یا دووێ دەستەلات ل سەر جزیرێ و مووسل و رۆژهەلاتێ ئەنادولێ كر. سەردەمێ كونترۆلكرنا ڤان هەردو دەولەتان پتر ئاژاوە و دژواری بەلاڤبوون و خەلك هاتە چەوساندن و ئازاردان. دەستەلاتداریا ئاق قوینلو ل سەر جزیرێ و مووسلێ و ئامێدیێ و ل پشكەكا ئەنادۆلا رۆژهەلاتی ئەڤ دەڤەرە گەهاندنە گۆپیتكا ئالوزیێن سیاسی و شارستانی[1].

هوسا كاودان د خوشبوون بۆ پەیدابوونا هێزێن سیاسی یێن نوو ل باشووری كوردستانێ، كو وێ ڤالاتییا ژ ئەنجامێ نەبوونا دەستەلاتەكا ناڤەندی یا بهێز پەیدابووی تژیبكەت، داكو ژ ئالیەكیڤە توخیبەكی بۆ وان زێدەگاڤییان دانن یێن عەشیرەتێن ئاق قوینلو دكرن و ژ ئالیەكێ دووڤە تەناهییەكا جڤاكیا وەسان دابین بكەن دشیاندا بیت شوونا وان خرابكرن و وێرانكاریێن د سەردەمێن چوویبدا هاتینەروودان ئاڤاكەنەڤە..

## ٢- دامەزراندنا میرگەها ئامێدیێ- بەهدینان

هندی پەیوەندی ب میرگەها بەهدینانڤە هەی، ل داوییا سەدساڵیا هەشتێ مشەختی/چواردێ زایینی سەنگ و گرنگییا كەلا ئامێدیێ یا ئاسێ ل زێدەهیێ ددا، ب رەنگەكی دەولەتا مەمالیكلان ل میسرێ و شامێ گرنگی ددا بابەتێ گرێدانا پەیوەندیێن دبلوماسی دگەل میرێن وێ[2]، ئەڤە ژی ب وێ مەرەمێ بوو داكو پشتگەرمێن هەڤپەیمانییەكێ ژ میرگەهێن كوردان بن كو رێگربیت ل هەر شكەستنەكا سیاسی لەشكەری ل سنووری وانێ رۆژهەلاتی هەروەكی بەری هنگی رووداى، هەروەسان داكو میرێن وان نەكەڤنە ژێر هەیمەنەتا وان داگیركەران یێن گەفان ل وان دكەن هەروەك رووداى دەمێ میرێ وان گوهداریا دەستەلاتێ تەیمورێ لەنگ كری دەمێ وی ل ساڵا ٧٩٦مش/١٣٩٤ز ب سەر دەڤەرێدا گرتی.

مخابن هند بەلگەنامە ل بەردەست نینن تێرا

هندێ بکەن قوناغێن دەسپێکێ ژ دیرۆکا میرگەها بەهدینان ئەوا کەلا ئامێدیێ کرییە سەنتەرێ خۆ بەرچاڤبکەین، هەروەسان ڤەگێرانێن دیرۆکییێن جودا ل دور دامەزراندنا ڤێ میرگەهێ هەنە، هەروەك ئەم دزانین ڤالاهی د لیستێن ناڤێن میرێن بەراهیێ یێن میرگەهێدا هەیە.

دبیت شەرەفخانێ بەدلیسی کەسێ ئێکێ بیت ب شێوازێ بەرچاڤکرنێ ئاماژە ب ڤێ چەندێ کربیت و ڤەگێرانەکا بەربەلاڤ د ناڤ خەلکیدا ڤەگوهاستیە کو تێدا هاتییە: (نڤشێ بەهائەدینی - دامەزرێنەرێ میرگەهی- نێزیکی چوارسەد سالان دەستەلاتدارێ ل حکومەتا ڤێ دەڤەرێ کرییە[3].

دهێتەزانین کو شەرەفخانی پەرتووکا خۆ ل سالا ١٠٠٥ مش/١٥٩٦- ١٥٩٧ز نڤیسیە، ئەڤە وێ چەندێ دگەهینیت کو میرگەها ئامێدیێ ل دەسپێکا سەدسالیا حەفتێ مشەختی/سێزدێ زایینی دیاربوویە، ژ بلی ڤێ ڤەگێرانا زاردەڤ و بەربەلاڤ د ناڤ خەلکیدا و ئێکی بۆ یێ پاش خۆ ڤەگێرای تشتەکێ دی دەربارەی میرگەهێ د شەرەفنامێدا نەهاتییە.

د ژێدەرێن دیرۆکیێن هەڤچەرخێن روودانان نە ئاماژەیەك نە ژی سڤکەدیتنەك هەیە پشتەڤانیێ ل ڤەگێرانا بەدلیسی بکەت یان وێ ڤەگێرانێ بپەژرینیت، هەروەسان د نیڤا ئێکێ ژ سەدسالیا (٧مش/١٣ز) سەروبەرێ سیاسی ل دەڤەرا ئامێدیێ- بەهدینان نە یێ هاریکاربوویە بۆ دروستبوونا دەستەلاتداریەکا خۆجهی ل وێرێ، ئیبنولئەسیر ئەوێ ل (٦٣٠مش/١٢٣٣ز مری) و هەڤچەرخێ رووداران بوویە ل مووسلێ دژیا، ب بەرفرەهی دەربارەی شەرەنیخا دژوارا ناڤبەرا میرێن ئەتابەگیێن زەنگیێن داویێ و بەدرەدین لوئلوئێ خودانێ مووسلێ ل سەر کەلایێن ئامێدیێ و هرورێ و ئەرمشتێ (اردمشت) و یێن دی نڤیسییە[4].

## -میر حاجی کورێ عومەری:

ل جەم مە هاتییە سەلماندن کو ل سالا ٧٤٠مش/ ١٣٣٩ز میر حاجی کورێ عومەری (الحاجی بن عمر) خودانێ ئامێدیێ بوو[5]، تشتەك ژ پەیوەندی یان تێکەلییا مرۆڤایەتیێ د ناڤبەرا وی و خودانێن بەری وی یێن ئامێدیێ ناهێتەزانین، گومان تێدا نینە کو ئەو (میر هاجی)یە ئەوێ ناڤێ وی د وێ بەلگەنامێدا هاتییە یا ل ڤێ داویێ هاتییەبەلاڤکرن[6] رۆناهییەکێ بەردەدەتە سەر ڤێ قوناغا بەراهیێ ژ میرگەهێ، ئەڤ بەلگەنامەیە راشکاوانە ناڤێ میر حاجی کورێ موجەلی کورێ عەلائەدینی (حاجي بن مجلي بن علاء الدين) دئینیت کو ل سالا ٧٤٠مش/ ١٣٣٩ز خودانێ ئامێدیێ بوو و یەکەم کەس بوو چوویە ناڤ ئامێدیێ پایتەختێ میرگەهێ، ل دووڤ هژمارا نڤشان - بحساب الاجيال[7] - ئانکویا ڤێ چەندێ ئەوە کو سەردەمێ عەلائەدینێ بابێ موجەلی تێدا ژیای ب دروستی دکەڤیتە داویا سەدسالیا حەفتێ.

هەروەسان د بەلگەناما ب (الشجره الزيوكيه)[8] دهێتەناڤکرن دێ خوینین کو یەکەم کەسێ چوویە دناڤ ئامێدیێ دا (مەلك خەلیل)ە و وی کورەك ب ناڤێ عەلائەدین هەبوو و پشتی وی دەستەلاتداری کرییە و پشتی وی ژی کورێ وی میر موجەلی دەستەلات گرتیە دەست[9].

ب ڤی رەنگی دێ سەردەمێ عەلائەدینی ل گرێکێن داویێ ژ سەدسالیا هەشتێ مشەختی بیت، پتر باوەری بۆ هندێ دچیت کو ئەوە د بەلگەنامەیا ئێکێدا هاتی کو تێدا دیارکرییە عەلائەدین باپیرێ حاجی کورێ موجەلی میرێ ئامێدیێ بوو، ب تایبەت کو ئەڤ حاجی یە یێ بەرنیاس بوو ل جەم دەولەتا میسرێ[10].

دیرۆکنڤیس (ابن ناظر الجيش) ئەوێ (٧٨٦مش/١٣٨٤ز مری) پشتراستدەت دکەت کو (ل بەراهیێ حاجی کورێ عومەری ل ئامێدیێ بوو (كان بها أولا الحاجي بن عمر) بەلێ د پەرتووکا (صبح الاعشى-٣٠٩/٧) ئەڤ دەستەواژەیە ب شاشی بۆ(کورێن حاجی کورێ عومەری لێ بوون (كان بها أولاد الحاجي بن عمر) هاتییەگۆهارتن، ئەڤە ژی وێ چەندێ دیاردکەت کو دبیت حوکمداریا ئامێدیێ ژ خێزانەکی بۆ یا دیتر هاتییە ڤەگۆهاستن،

ئەگەر ڤەگێرانا بەربەلاڤ دەربارەی بنیاتێ میرێن ئامێدیێ بەرچاڤ وەرگرین، دڤێت ئەڤ مالباتا داویێ ژ شەمدینان هاتینە و ژ مالباتا حوکمدار ل جولەمێرگێ جودابوونە، ئەوا پتر ڤێ باوەریێ موکم دکەت بوونا ناڤێ میرەکێ جولەمێرگێ یە ب ناڤێ بەهائەدین کورێ قوتبەدینی[11].

ل جەم دیرۆکنڤیسێن نوو گەلەك بۆچوون دەربارەی سالا دامەزراندنا میرگەها ئامێدیێ دروستبوونە، لونگریك وەسان دبینیت کو میرگەهـ ل داویا سەدسالیا هەشتێ مشەختی/ چواردێ زایینی هاتیە دامەزراندن[12]. دیرۆکنڤیس و ڤەکولەر سدیق ئەلدەمەلوجی وەسان دبینیت کو میرگەهـ بەری ڤەگرتنا ئوسمانی بۆ دەڤەرێ (٩٢٠مش/١٥١٤ز) ب سەدسالیەکێ هاتیەدامەزراندن[13]، عەباس ئەلعەزاوی ڤێ دیرۆکێ بەرەڤ پاش بۆ پشتی سالا ٧٤٠مش/ ١٣٣٩ز[14] دزڤرینیت، هندیکە ئەنوەر مایی یە دیاردکەت کو ل سالا ٦٥٩مش/١٢٦١ز بەهائەدینی دەست ب سەر کەلا ئامێدیێ دا گرتیە و دبێژیت بەهائەدین دامەزرێنەرێ میرگەهێ کورێ شەمسەدین کورێ شوجاعودین کورێ نەجمەدین کورێ خدر (خضر) کورێ موبارز کەکی یە[15].

د کەتواریدا ژیلی مالباتا بەهائەدینی پتر ژ مالباتەکا دیترا هەکاری ل دەسپێکا سەردەمێ مەغولییان ب شێوازێ میراتگری حوکمداری ل کەلایێن ئامێدیێ و هرورێ و جەرزەڤیل (گورکیل) و دەڤەرێن سەر ب وانڤە کریە وەك مالباتا بلس مەمەوی و مالباتا تورانشی- تروانشی، جەرزەڤیل یەك ژ کەلایێن سەر ب جزیرێ یە ل نێزیکی چیایێ جودی و ل سەردەمێ عەباسییان بنگەهێ شاهنشینا (مملکە) کوردێن بوختی بوویە[16].

ل سەردەمێ مەغولان ئامێدیێ د دەستێن محەمەد کورێ ئەبوبەکرێ تورانشی- تروانشی و هروور د دەستێ پسمامێ وی عیزەدین کورێ عەلی دابوون[17]، و حەزدەڤیل د دەستێن میرەکێ دی یێ هەکاری دابوو ئەو ژی بەهائەدین کورێ عومەر کورێ ئیبراهیمێ هەکاری دابوو[18]، دوورناهێتەدیتن ئەڤ بەهائەدین کورێ عومەر کورێ ئیبراهیمێ هەکاری بەهائەدین کورێ قوتبەدینی ب خۆ بیت، و ژ دەسپێکا سەدسالیا هەشتێ مش/چواردێ ز پلا (مەنصەبێ) خودانێ ئامێدیێ (صاحب العمادية) د ژێدەرێن مەمالیکاندا هاتیە بێ کو ئاماژە ب ناڤی بکەن[19]، هەموو ئەڤە وێ چەندێ دیاردکەت کو د ڤێ قوناغێدا ئامێدیێ بوویە مەلبەندێ کیانەکێ سیاسی.

## - میر بەهائەدین:

ئەوا بەربەلاڤ دەربارەی بنیاتێ مالباتا حوکمدارا ئامێدیێ دهێتەگۆتن ئەوە کو باپیرێ وانێ ئێکێ یێ ب بەهائەدین دهێتەناڤکرن ژ سەردەمێ ئیلخانیانڤە ژ دەڤەرا شەمدینان هاتیە ئامێدیێ، و بابوباپیرێن وی ل کەلا (طارون)ا سەر ب شەمدینانڤە حوکمداری دکر[20]، و ئەڤ بەهائەدینە کورێ قوتبەدینی و پسمامێ شەمسەدین داودی یە و حوکمداری ل دەڤەرەکا هەکاری کریە و شەرێ مەغولان کریە[21]، ناڤکرنا بەهدینان بۆ بەهائەدین کورێ قوتبەدینی دزڤریتەڤە و میرێن میرگەهێ ژی ژ رڤشتا وی نە.

د (الشجرە الزيوكيە) ناڤێ میرەکی ب هەمان ناڤهاتیە و ب رەنگێ ژێری ئاماژە ب دوندەها وی کریە: بەهائەدین کورێ سەیفەدین کورێ موجەلی کورێ مەلك خەلیلی، و ئەڤە دبیتە یەکەم میرێ وان، ڤەگێرانا شەرەڤنامەیێ ژ ئەڤا د (الشجرە الزيوكيە) دا هاتیی جودادبیت ب وێ چەندێ کو یەکەم کەسێ مولکداریا ئامێدیێ کری مەلك خەلیل کورێ عیزەدینی یە هەروەسان ئەوا د بەرپەرێ دوسکی دا هاتی کو هاجی کورێ مەجەلی یە[22].

## - میر عیمادەدین ئیسماعیل کورێ عەلی کورێ موسای:

ل سەر دەمێ (ابن ناظر الجيش) ئەوێ ل (٧٨٦مش/١٣٨٤ز) ئامێدیێ د دەستێن عیمادەدین ئیسماعیل کورێ عەلی کورێ موسای دا بوو، هرورێ د دەستێن بەهائەدین حەسەن کورێ عیمادەدینی و قومریێ (کەلا قومریێ) د دەستێ میر بەهائەدینی دا

بوو[٢٣]، پتر هزر بۆ هندێ دچیت (بەهائەدین حەسن) و (بەهائەدین) یەك كەس بن ئەو ژی كورێ عیمادەدین ئیسماعیلێ خودانێ ئامێدیێ یە، هەروەسان هرور و قومریێ هەردو ناڤێن كەلایەكێ نە، دكەڤیتە ناڤبەرا هەردو گوندێن هرورێ و قومریێ یێن سەر ب ناحیا بەرواری بالا یا قەزا ئامێدیێ.

چ پیزانینێن دیتر ل سەر میر عیمادەدین ئیسماعیلی دەست مە نەكەتینە و د رووداینێن سالا ٧٩٦مــش/١٣٩٤زدا هاتیە كو مەلك عیمادەدینێ (مەلكێ كوردان) ملكەچی تەیموری لەنگ بوو[٢٤]، هزر پتر بۆ هندێ دچیت عیمادەدین ئیسماعیل ئەوێ خودانێ ئامێدیێ ب خۆ بیت، دگەل ئاماژە پێكرنەكێ ل دووڤ گۆتنا بەدلیسی كو خودانێ ئامێدیێ ل سەردەمێ تەیمووری لەنگ و كورێ وی شاهرۆخی (٨٠٧-٨٥٠مــش/١٤٠٥-١٤٤٦ز) میر زەینەدین بوویە و دشیاندایە بێژین ئەو جهێ میر عیمادەدین ئیسماعیلی گرتییە.

ل سەدسالییا هەشتێ مش/چواردێ ز ڤە ئامێدیێ مەزن و بەرفرەهبوو و هێزا وێ یا لەشكەرێ ل مەزنی و زۆربوونێ دا هەتا گەهشتییە چوار هزار زەلامان، دەولەتا مەمالیكان باوەری پێ ئینا و نامە و نڤیسار دگەل گۆهارتن و دەورەكێ مەزن هەبوو د پاراستنا رێكێن بازرگانیێن هەرێما جزیرێ دگەل هەرێمێن رۆژهەلاتی گرێددا[٢٥]، هەرچەند هێز دەستەلاتێ خۆ نەگەهاندبوو كەلا نێروە و شابانیێ و هارۆن و هەریەك ژ وان كەلایان مالباتا خۆیا حوكمدار هەبوو[٢٦].

## - میر زەینەدین:

بەدلیسی ڤەگێرایە كو ئەو هەڤچەرخێ تەیمورێ لەنگ و كورێ وی شاهرۆخی (دەسپێكا سەدسالییا هەشتێ مشەختی) بوو، لێ ئاماژە ب نڤشێ وی نەكرییە، بەلێ دناڤ وان میراندا دایەنیاسین یێن دكەڤنە بەری میر حەسەن بەگی (ل ٨٧٥مش/١٤٧٠ز دەستەلاتێ میرگەهێ وەرگرتییە)، هەروەسان دبێژیت:(وی د بەختەوەری و خوشگوزەرانیێدا حوكمداری كرییە) و ئەو یێ دلسۆز بوو بۆ هەڤالێن خۆ و یێ دژوار بوو دگەل دوژمنێن خۆ، د سەر ڤێ چەندێ را ناڤێ وی د (الشجره الزیوكیه) و كاغەزا دوسكی دا نەهاتییە، و ئاماژەیەك هەیە بەلێ نڤشێ وی ب خۆڤە نەگرتییە كو تێدا هاتییە میرەكی ب ناڤێ بەهائەدینی پشتی میر ئیسماعیلی حوكمداری كرییە (الشجره الزیوكیه ئاماژە ب ڤی ئیسماعیلی نەكرییە) و پشتی وی میر محەمەد هاتییە و پشتی ڤی ژی یێ ناڤێ وی بەهائەدین هاتییە، پتر هزر بۆ هندێ دچیت كو ئەو یێ ئێكێ ب خۆیە[٢٧].

## -میر سەیفەدین:

بەدلیسی دبێژیت ئەو كورێ میر زەینەدینی یە و (الشجره الزیوكیه) دبێژیت ئەو كورێ میر (محەمەد ئیقبال)یە، بەدلیسی دبێژیت: (ئەوی شوونا بابێ خۆ د حوكمدارییا وەلاتیدا گرت، دادوەری و دلوڤانی بەلاڤەكرن و مللەت بەرەڤ پێش بر)، و ب خودان باوەرییا باش (حسن الاعتقاد) پەسنا وی كر، ئەڤ پەسنە نیشانا هندێیە كو سونی مەزهەب بوو. مەحفوزێ عەباسی دبێژیت ئەو باپیرێ مەزنێ مالباتێ بوو یا ب مالا سێڤدینان (آلسیف دینا) ناڤدارن، و ژبەر ناڤێ وی حكومەتا بەهدینان ل بەراهیێ ب (حكومەتا سێڤدینان) دهاتەنیاسین هەروەكی ل سەر كێلیا گورێ میر حەسەن بەگی (ئەوێ ل ٩٤٠مش/١٥٣٣ز مری) هاتییەچەسپاندن ئەو كێلیا د ناڤ گورستانا مالا میران (المقبره السطانیة) ل ئامێدیێ هاتییەدیتن[٢٨].

## -میر حەسەن بەگ كورێ سەیفەدینی:

مەزنترین كورێن بابێ خۆ بوو، پشتی وی دەستەلاتێ میرگەهێ گرتیەدەست و پتر ژ حەفتێ سالان حوكمداری كرییە، موكمكرنا بنیاتێن میرگەهێ و بەرگریكرن ژێ بۆ وی دژڤریتەڤە، حوكمدارییا وی هەڤچەرخ بوویە دگەل دەولەتا ئاق قوینلۆیا توركمانی كو پایتەختێ وێ ل دیاربەكرێ بوو، دەولەتا ئاق قوینلۆ د ئەو پەری هێزا خۆدا بوو سولتانێ وێ حەسەنێ درێژ (حسن الطویل) لەشكەرێ خۆ ب سەركردایەتییا

سلێمان بەگ بێژن ئوغلۆ ب مەرەما داگیرکرنا ئامێدیێ و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە هنارتە شەرێ وان، ئەڤ لەشکەرە بەرف پێش هات و هەردو کەلایێن سەختێن ئاکرێ و شوش گرتن و بەرەف ئامێدیێ هات و دووریێچدا، ل دورێن شویرها ئامێدیێ گەلەك بزاڤ بۆ گرتنا وێ کرن بەلێ د بێ ئەنجامبوون، بەدلیسی ڤەدگێریت کو سەروبەر ب سەرێ هێرشکەراندا شکەست، سەرکردێ وان گەلەك بێهنتەنگ بوو، ئەڤە نیشانا هندێ یە کو د شیانا هێزێن میرگەهێ دا بوو دژە هێرشان بکەنە سەر وان، زێدەباری ڤێ چەندێ عەشیرەتێن ل دەوروبەرێن ئامێدیێ شیان ب رەنگەکێ کاریگەر شەرێ بەرخۆدانێ بەرامبەری وانا بکەن و زیانێن مەزن بگەهیننێ، ڤێ چەندێ سلێمان بەگ ناچار کر جهێن خۆ ل دەوروبەرێن ئامێدیێ بەردەت و بەرەف بارەگایێن خۆیێن پێشیێ بچیت، ب ڤی رەنگی ئامێدیێ سەرکەتن ل سەر داگیرکەران دەستڤەئینا. د کەتواریدا شکەستنا دووریێچا ئامێدیێ و ڤەکشیانا لەشکەرێ ئاق قوینلۆ ژ ویرێ نیشانا دەمەکێ گرنگ بوو د دیرۆکا میرگەها بەهدینانیدا، ژ ڤێ دیرۆکێڤە سەربەخۆییا وێ هاتەسەلماندن و پشتەڤانیا عەشیرەتان و خرڤەبوونا وان ل دور میرگەهێ بەرچاڤبوو، ئەڤە ژی دەسپێکا پرۆژێ پێشڤەچوونەکا بەردەوام بوو ل میرگەهێ، حەسەن بەگی تێدا سەرکەتن دەستڤە ئینا و کورێ وی سولتان حسێن وەلی گەهاندە گوپیتکا پێشڤەچوونێ. ئەڤ روودانە هەڤچەرخ بوون دگەل دامەزراندنا دەولەتا سەفەوی ل ئیرانێ و داگیرکرنا عیراقێ ژ ئالیێ وێ ڤە و چوونا وێ بەرەف جزیرێ و شەرێ وێ دگەل دەولەتا ئاق قوینلۆ. ل ڤێرێ میر حەسەنی پێدڤی دیت دوستینیێ دگەل ڤێ دەولەتا نوو دروستبکەت، بەرف شاهـ ئیسماعیلێ سەفەوی چوو، وی ژی ب گەرمی پێشوازی لێکر ژبەرکو ئەو میرە بوویێ ئاق قوینلۆ شکاندی، ئاق قوینلۆ ژی دوژمنێن سەفەوی یانە و میر حەسەن بوو شیای وان ژ کوردستانێ یا هەڤسنوور دگەل ئیرانێ دووربێخیت، میر حەسەنی مفا ژ هەڤپەیمانیا خۆ دگەل دەولەتا سەفەوی وەرگرت، دەست ب سەر کەلا دهۆکێ دا گرت ئەوا هەتا وی سەردەمی ل ژێر کونترۆلا داسنییان و دا دگەل میرگەها خۆ، هەروەسان دەست ب سەر میرگەها سندی دا گرت و ئەو ژی دا دگەل میرگەها خۆ[29]، ب ڤێ چەندێ ژی سنوورێ میرگەهێ ژ ئالیێ رۆژئاڤایڤە درێژبوو هەتا دگەهیتە رووبارێ دیجلە. دەمێ سولتان سەلیمی ل سالا ٩٢٠مش/١٥١٤ز دەست ب هێرشا خۆیا مێژوویی بۆ لێدانا دەولەتا سەفەوی ل باکوورێ ئیرانێ کری، میرێن کوردان ل دووڤ چەمکێ هاریکاریێ دگەل وی و تاگرێ بۆ دەولەتا ئوسمانی هاتن، ئەڤە ژی ئەو چەمکە بوو یێ میرێ کورد مەولانا ئیدریسێ بەدلیسی بانگەواز بۆ کری و بنەجهـ کری.

ژێدەرێن بەردەست چ تشتەك دەربارەی هەلویستێ میر حەسەنی ل سەر بانگەوازا ئیدریسێ بەدلیسی بەرچاڤ نەکرییە، ناڤێ وی دناڤ ناڤێن وان میرێن کورداندا نە هاتییە یێن گەهشتینە مە کو پشکداری د سەرکەتنا ئوسمانییاندا ل شەرێ چالدیران کری، بەلێ ئەڤە ب تنێ نابیتە نیشانا هندێ کو ئەو د ناڤ واندا نەبوویە، ئەوا جهێ سەرنجراکێشانێ ئەوە ئەوا گەرۆکێ ترك ئولیا چەلەبی ڤەگێرای، چەلەبی پشتی هەفت گرنکێن سەدسالیێ د ڤێ دەڤەرێرا بۆرییە، ئەو دبێژیت: سولتان سەلیمێ ئێکێ ئامێدیێ بۆ هەتا هەتایێ بۆ مەلا ئیدریسێ بەدلیسی ڤەبری، ئەڤ بریارە ب رەسمی هاتییەتوومارکرن، ئەڤە ژی سەرکردێ لەشکەرێ ئوسمانی محەمەد بەیقەلی پاشای ڤەگوهاستیە دەمێ د پەسنا قەنجیا بەدلیسی دا گۆتی:(ئەوێ د شەرێ چالدیراندا د هەوارا مە هاتی)[30]، ئەگەر ئەڤە ب ڤی رەنگی بیت کو مەلا ئیدریسێ بەدلیسی ل سەردەمێ شەرێ چالدیران ٩٢٠مش/١٥١٤ز حوکمداری ئامێدیێ بیت، دیارە ئامێدیێ بەری ڤێ دیرۆکی ب رەنگەکێ هەتا هەتایی بۆ وی هاتییەدان، ئانکو میرێ ئامێدیێ حەسەن بەگ نە د دەستەلاتێ میرگەها خۆدابوویە، هوسان دێ چاوان پەیوەندیا باشا ناڤبەرا میری و سولتانی شروڤەکەین، ئەوا د وێ نامەیێدا دەربرین ژێ

هاتیبەکرن ئەوا میرێ ئامێدیێ ب مێژووا ٢ شەعبان ٩٢٢مش/٣١ تەباخا ١٥١٦ز دەربارەی سەروبەرێ ئیرانێ بۆ دەستەلاتداریا ئوسمانی هنارتی ؟[٣١]. ل ڤێرێ تنێ دڤێت مگرتیبەکێ بەرچاڤ وەرگرین کو سولتان سەلیمی دەمێ بەرەڤ چالدیرانێ چووی حەسەن بەگ ژ دەستەلاتداریا ئامێدیێ ڤەدەرکریبە، بەلێ ژبەرکو ڤەگێرانەکا نە سەلماندی هەیە ئاماژە ب وێ چەندێ دکەت کو هێزەکا پێکهاتی ژ ٥٠٠٠ شەرڤانێن کورد ژ ئامێدیێ پشکداری د ڤی شەریدا کریبە[٣٢]، ئەڤە دیارە کو دبیت ئەو هاتبیتە زڤراندن بۆ سەر میراتییا وی و ب تەواوی ژی هاتیبەپەژراندن هەتا ئاستەکی کو ئەو بریارا ئولیا چەلەبی ڤەدگێریت کو تێدا بەدلیسی وەك میرێ ئامێدیێ هاتیبەدامەزراندن و ئامێدیێ بۆ هەتا هەتایێ بۆ وی هاتیبەڤەبرین هاتیبەلادان، هەمان گەرۆك ئاماژە ب فەرمانەکا سولتانێ ئوسمانی دکەت کو تێدا فەرماندایە ئامێدیێ ب رەنگێ میراتگری بۆ مالباتا بەهدینانی بیت، هەروەسان دبێژیت: (ئیالەتا ئامێدیێ دەڤەرەکا هەرە مەزنە و ژ کەڤنڤە میراتییا وێ بۆ حوکمدارێن وێ مایە، و ئەو خەتێ پیروز (فەرمان) د دەستێن واندایە)[٣٣]، زانیاریێن مە ل سەر میر حەسەن بەگی سەرەرای گرنگیا رۆلێ وی د رنڤەبرنا میرگەهێدا د کێمن، بەلێ د بەریەرەکیدا کو نڤیسکارێ وی نەهاتیبەزانین ئاماژە دکەت کو وی حەفتێ سالان حوکمداری کریە[٣٤]، ئەڤە ژی ب دروستی دەمەکی درێژە، ئەگەر ئەڤ زانیارییە راست بیت ئەڤە وی ل سالا ٨٧٠مش/١٤٦٥ز دەستەلاتێ میرگەهێ گرتیە دەست.

ل هاڤینا ٢٠٠٩ێ مە کێلیا گورێ وی یا پتریا وێ د گورستانا مالا میرادا هاتیبەڤەشارتن دیت، کێلیەکە ب خەت و زەخرەفەکی جوان هاتیبەنڤیسین و ناسناڤێن وی ب ڤی رەنگی تێدا دیارن (الأکرم الأعظم الأفضل المرحوم المغفورالعادل المحسن، بیك حکومة سیفالدینا بن محمد) ئەڤە ژی یەکەم جارە د دیرۆکا کوردستانێ یا نوودا ناڤێ (حکومەت) ێ دهێت، و (سیفالدینا) وەك ل دەڤەرێ دبێژنێ سیفدینان ناڤێ مالباتا سەیفەدینێ دامەزرێنەرێ ڤێ حکومەتێ یە. کورێ وی یێ مەزنتر سولتان حسێن وەلی پشتی وی دەستەلات گرتیەدەست[٣٥].

## ژێدەر:


١. بنێرە: عباس إقبال: تاریخ المغول، ترجمة عبد الوهاب علوب، أبو ظبي، ب ث ٤٤٥- ٤٦٧ و زرار صدیق توفیق: کردستان في القرن الثامن الهجري، أربیل ٢٠٠١، ب ث ٢٤٧-٢٦٨.

٢. بنێرە: ب. شرفخان: حول قیام إمارة العمادیة، مجلة متین، العدد ٦٨، أیلول ١٩٩٧، ص١٠١-١١٢.

٣. شرفنامە، ص٢٥٣ .

٤. الکامل، ٦٧١/٩، ٧٤٩-٧٥١.

٥. ابن ناظر الجیش ،تثقیف التعریف،ص٧٧ .

٦. محمد أمین دوسکي: وثیقة تاریخیة هامة یکشف عنها النقاب لأول مرة، مجلة (ڤەژین )، عدد ٢، ١٩٩٦، ص١٤٩.

٧. دیارکەرێن نڤشان (النسابون) پێکهاتینە کو هەر نڤشەك ل دووف ئیدیۆمێ نڤشناسیێ ب سیهـ یان چل سالان دهێتەدەستنیشانکرن.

٨. دانەیەك ژی ل جەم شێخ تەها کورێ مەزهەرێ مایی ل دهۆکێ هەبوو، (محفوظ العباسي) پشکەك ژ ڤێ دەستنڤیسێ پەرتووکا خۆ (امارة بهدینان العباسیة) بێی شروڤەکرن یان هەلسەنگاندن بەلاڤکریە، بەلکی ب بەلگەنامەیەکا دیرۆکیا گرنگ دەستنیشانکریە و باوەری ب هەموو وان زانیاریان ئینایە یێن تێدا هاتین. ؛پاشتر د. عماد عبدالسلام رؤوف دگەل ڤەکولین و تویژاندنێ بەلاڤکریە

٩. الشجرة الزيوكية، وثيقة نسب أمراء بهدينان وتاريخهم، تحقيق عماد عبد السلام رؤوف ص٥٢-٥٣.
١٠. صبح الاعشى في صناعة الاعشاء، كتب علمية (بيروت ١٩٨٧)ج٧/ص ٣٠٩، بنێره: د.عماد عبدالسلام رؤوف: المعجم التاريخي لإمارة بهدينان، أربيل ٢٠١١ ، ص٣٧٠.
١١. مسالك الابصار، ٢٦٨/٣.
١٢. اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ترجمة جعفر الخياط، ص ١٩.
١٣. امارة بهدينان، ص ١٨.
١٤. العراق بين الاحتلالين، ٤/ ٤١.
١٥. الاكراد في بهدينان، ص ١١٨.
١٦. معجم البلدان، ٤٦/٢.
١٧. مسالك الابصار، ٢٦٨/٣ .
١٨. ابن ناظر الجيش، تثقيف التعريف،ص٧٨، صبح الاعشى، ٣٠٩/٧ .
١٩. الدواداري، الدر الفاخر في سيرة الملك الناصر (القاهيرة ١٩٦٠)، ص ٢٣٠،صبح الاعشى، ٣٠٩/٧.
٢٠. شرفنامة، ص ٢٥٣.
٢١. مسالك الابصار، ٢٦٨/٣-٢٦٩.
٢٢. الشجرة الزيوكية ص٧٤ ، محمد أمين الدوسكي: وثيقة تاريخية هامة يكشف عنها النقاب لأول مرة، مجلة ظةذين، عدد٢، ١٩٩٦، ص١٤٩.
٢٣. تثقيف التعريف، ص ٨١، صبح الاعشى، ٣٠٩/٧-٣١٠.
٢٤. تاريخ ابن الفرات، ٣٦١/٩
٢٥. صبح الاعشى، ٣٧٨/٤.
٢٦. تثقيف التعريف، ص٧٤-٨١، صبح الاعشى، ٣٧٥/٧، ٣٧٨-٣٧٩.
٢٧. شرفنامه ص١٤٠، محمد أمين الدوسكي: وثيقة تاريخية هامة ص
٢٨. كێليا گورێ مير حەسەنى ل ناڤ گورستانا مالا ميران ل ئامێديێ، شرفخان البدليسي: شرفنامه، ص١٤٠، كاوه شاولي: إمارة بهدينان ١٧٠٠-١٨٤٢ دهۆك ٢٠٠٠ص٥١ ، بابا مردوخ: تاريخ مشاهير كرد، أمرا وخاندانها، طهران ١٣٨٢ه.ش، ج٢ مج٣ ص١٣٤.
٢٩. شرفنامة، ص ١٤٦.
٣٠. رحلة أوليا جلبى في كردستان، ترجمة: رشيد فندي، أربيل ٢٠٠٩، ص ٣٩.
٣١. عبد الله حداد: رسالة حسن بك أمير العمادية، مجلة زاكروس الثقافية، العدد٣ أيلول ١٩٩٧.
٣٢. The Encyclopaedia of Islam، New Edition، London ١٩٨٦،Vol.٤،P.٤٥٩
٣٣. أوليا جلبي سياحتنامة سي، فصل عربه محمد جميل روزبياني بعنوان بغداد الجنة العامرة، بغداد ١٩٩٨، ص٦٦
٣٤. محمد امين الدوسكي، وثيقة تاريخية هامة، ص ١٤٩
٣٥. عماد عبد السلام رؤوف ونرمين علي: شواهد المقبرة السلطانية في العمادية، أربيل ٢٠١١، ص ١٠٣ وعماد عبد السلام رؤوف: السلطان حسين الولي أمير بهدينان، أربيل ٢٠٠٩ ص٨-١٦، محمد عبد الله ئاميدي: سه ردمى زيرين ل ميركەها بهدينان، نشر في كتاب: ديداراْ ديروكى ل دور ئاميديى، دهۆك ٢٠٠٩، ص١٧٧-١٨٨.

# میرێن بەهدینان ل هەردو سەدسالیێن شازدێ و هەڤدێ

پ. د. عیماد عەبدولسەلام رەئوف
زانکۆیا سەلاحەدین- کولیژا ئاداب
وەرگێران سالح یوسف صوفی

ژ وی دەمێ میرگەها بەهدینان ل دەستپێکێن سەدسالیا دەهێ یا مش (شازدێ یا ز) و دەستپێکێن سەدسالیا دوازێ یا مش (هەژدێ یا ز) تەڤلی میرگەهێن دەولەتا ئۆسمانی بووی، ئەو میرگەهـ ب کارگێڕیا ئۆسمانیا ناوەندیا ل ستەنبۆل ڤە هاتە گرێدان و پەیوەندی و نامەگوهورینێن فەرمی ل ناڤبەرا سولتانێ ئۆسمانی و میرێ بەهدینان ب ئاوایەکێ ئێکسەر دهاتنە کرن و یێ داویێ خۆ نەددا پاش ژ هوور بەحسکرنا هەر تشتەکی ل سەر کاروبارێن ناڤخۆیی و دەرڤەیی یێن میرگەها خۆ بۆ سولتانی، هەروەسا سولتان ژی یێ دوودل نەبوو بۆ ئاخڤتنێ دگەل میرێ بەهدینان د کاروبارێن دەڤەرێ دا و هندەك ناسناڤێن رێزلێنانێ بۆ زێدە دکرن وەك نیشان بۆ پێگەهێ وی یێ تایبەت ل ناڤ میرێن دی، وەکی:(هەر یێ شکۆدار بیت) و (هەر یێ سەرفەراز بیت) (دامت معالیە) و (دام عزە) و یێن دی یێن وەسا.

بەلگەنامەیێن فەرمی یێن ئۆسمانی ب ژێدەرەکێ دی یێ نوو و گرنگ ل سەر وی سەردەمێ مە ئاماژێ پێدای دهێنە ل قەلەمدان، چونکی نامەیێن ل ناڤبەرا میرێن بەهدینان و سولتانێن ئۆسمانی تێدا هەنە، ئەڤە ژی بەری کاروبارێن دەرڤەیێن میرگەهێ ل دەستپێکا سەدسالیا ۱۲مش (هەژدێ ز ب والی یێن بەغدا ڤە بهێنە گرێدان. ئەڤ نامە لایەنێن گرنگێن دیرۆکا میرگەها بەهدینان د هەردو سەدسالێن دەهێ و یازدێ یێن مش (شازدێ و هەڤدێ یێن ز) دیار دکەن و بەحسێ کێشەیێن ناڤخۆیی یێن میرگەهێ و هەڤرکییێن ل ناڤبەرا ئەندامێن بنەمالا حوکمدار و پەیوەندییێن وێ دگەل هۆزێن کوردی دکەن یێن پشتەڤانیا وێ کرین، یان هەڤپەیمانی دگەل کرین، یان ژی یێن هەڤرکی و دژایەتیا وێ کرین، ئەڤە سەرباری هندەك کاروبارێن دی یێن پەیوەندی ب رۆلێ میرگەهێ د هەڤرکیا ئۆسمانی - ئیرانی دا و ب کاروبارێن سەربازی و تەناهیێ ڤە هەین.

ئەڤ بەلگەنامەیێن ئۆسمانی بەحسێ وان سەردەمان دکەن یێن میرێن خوارێ یێن میرگەها بەهدینان حوکمرانی لێ کرین:

١- سولتان حسێن کورێ سولتان حەسەن (٩٤٠-٩٨١ مش/١٥٣٣-١٥٧٣ز).

## دەڤەرێن میرگەها بەهدینان و گرنگترین كەلا و هۆزێن وێ




## قوناغێن دیرۆكیێن بەرفرەهبوونا میرگەها بەهدینان



٢- سولتان قوباد خان بەگ (٩٨١-٩٩١ مش/١٥٧٣-١٥٨٣ز).

٣- سولتان سیدی خان بەگ(٩٩٢-١٠٢٩ مش/١٥٨٤١٦١٩ز).

٤- سولتان یوسف خان بەگ (١٠٤١-١٠٤٨ مش/١٦٣١-١٦٣٨ ز).

٥- سولتان ئۆسمان خان بەگ (١٠٩٣-١١١١ مش/١٦٨٢-١٦٩٩ ز).

## سولتان حسێن کوڕێ سولتان حەسەن:

ل سالێن ئێکێ یێن سەدسالییا دەهێ یا مش (داوی یێن سەدسالییا پازدێ ز) ژ دایکبوویە، کوڕێ نەخرێ سولتان حەسەنە و ل سەر نەریتێن نێزیکی رێبازا قادری یا وی دەمی بەربەلاڤ پەروەردە بوویە، نەخاسمە ژی ل سەر دەستێ شێخێ خۆ پیر مەحمود زێوکی یێ قادری، وی گرنگی ب زانست و پاراستنا وان دەستنڤیسان ددا یێن گەلەك کێم ب دەست دکەڤتن کو ئەڤە ژی بوو ئەگەرێ وێ چەندێ پشتی هنگی ل سەر رێبازا وی ب رێڤەبچیت.

سولتان حسێن ل دووڤ فەرمانا ل سالا ٩٤٠مش/١٥٣٣ز یا ژ سولتانێ ئۆسمانی سلێمان قانوونی دەرکەڤتی هاتە سەر حوکمی و پشتەڤانییەکا کاریگەر یا سەربازی پێشکێشی لەشکەرێ وی کر دەمێ لەشکەرێ وی هاتییە کوردستانێ، هەروەسا دەمێ ل سالا ٩٤١مش/١٥٣٤ز سلێمان گەهشتییە بەغدا، سولتان حسێن ئێك بوو ژ میرێن کوردێن ئامادەی پێشوازیکرنا وی بووی و بوو سەرپەرشتیارێ گشتی یێ میرگەهێن کوردی، وی (ب تایبەتی) گرنگی دا بنەجهکرنا تەناهیێ ل میرگەها خۆ، سەخمەراتی وێ چەندێ ژی دەست ب لێدانا دەستەلاتا داسنی یێن ئێزدی کر کو بەردەوام دەستەلاتا وان ل دەڤەرا دهۆك بەرفرەهـ دبوو، ئەڤە ژی پشتی ئەڤ دەڤەرە ل سەردەمێ میر حەسەنێ بابێ وی بوویە پشکەك ژ تەناهیا بەهدینان، پاشی دەرئێخستنا ئێزدیان ژ وان دەڤەرێن هەولێر و مووسل ب ستۆوێ خۆڤە گرت یێن ژ لایێ وان ڤە هاتبوونە کۆنترۆلکرن و شیا دەولەتا ئۆسمانی رازی بکەت بۆ ژ ناڤبرنا حسێنێ داسنی یێ دەستەلاتا ئۆسمانی کرییە حوکمداری هەولێر و وی سێدارە بدەت، هۆسا، سولتان حسێن کوڕێ سولتان حەسەن ل سۆران بوو خودانێ پەیڤا بلند و ب ڤی پێگەهێ خۆ دەست ب رێکخستنا کاروبارێن ناڤخۆیی یێن عەشیرەتێن هەڤرکێن وێرێ و دامەزراندنا میرێن لایەنگرێن خۆیێن وێ دەڤەرێ کر[1].

ب ڤێ چەندێ ژی سولتان حسێن شیا تەناهیێ ل وەلاتێ خۆ بنەجە بکەت و (دز و حەرامخۆر و رێگران) ژ ناڤ ببەت[2] و رێ یێن بازرگانیێ مسۆگەر بکەت، هەروەسا ژ بەرکو کێشەیا داسنییان، هەروەکی ژ وی سەردەمی دیارە، ئالۆزتر و مەزنتر بوو ژ شیانێن وی یێن سەربازی، ئینا هاریکاری دگەل حوکمدارێن شارەزوور و ئامەد (دیاربەکرێ) و مووسل کر بۆ ژ ناڤبرنا رێبەرێن داسنییان و مشەختکرنا وان ژ هندەك گوندان، هۆسا شیا دەستەلاتا خۆ درێژ بکەتە عەردێن بەرفرەهێن ل ناڤ میرگەها سۆران ل پشت رووبارێ زێ یێ مەزن، هەروەسا سلامەتیا وان گوند و رێ یێن بازرگانی ژی مسۆگەر کر یێن دکەڤنە ناڤبەرا میرگەها وی و ئەیالەتێن دی یێن ئۆسمانی، نەخاسمە ژی ئەیالەتا مووسل، هەروەسا ژ بەر وێ رەوشا ئالۆز یا میرگەها بابان تێرا دبۆری، پشتی بنەمالا وێ یا حوکمدار قڕ بووی، سولتان حسێن (سلطان حسين الولی) بزاڤ کر فەرمانەکا سولتانی بهێتە دەرئێخستن بۆ دەستنیشانکرنا کاندیدەکی ژ بنەمالەکا نوو کو هەر وی ناڤی هەلگریت داکو ب سەرپەرشتیا نەئێکسەر یا میرێ بەهدینان حوکمداریا میرگەها بابان بکەت.

ب ڤێ چەندێ ژی سولتان حسێن دەستەلاتا خۆ هەتا دەڤەرەکا گرنگ درێژ کر یا کو ژ لایێ باشوورێ رۆژهەلات ڤە ب میرگەها وی ڤە گرێدای بوو، ئەڤە ژی ب رێیا هەڤپەیمانییەکا نەفەرمی ل ناڤبەرا بنەمالا وی و بنەمالا بابانی یا حوکمداریا وان دەڤەران دکر، هەروەسا رەوشا دەڤەرا برادۆست ژی گەلەك یا جودا

نەبوو ژ رەوشا دەڤەرا بابان، ل ڤێ دەڤەرێ هەڤرکییا ل ناڤبەرا میرێن موکری و ئەو ئاژاوەگێری و فرە لایەنگرییا ب دووڤرا هاتی، پێتڤی هندێ بوو دەولەت دەستەلاتا خۆ ل سەر ڤێ دەڤەرێ یا ب رەخ ئیرانا سەفەوی ڤە بسەپینیت، سولتان حسێن هێرشەکا مەزن کرە سەر هێزێن موکریان و ئەندامەکێ وێ بنەمالێ وەك میرێ میرگەها برادۆست دامەزراند، ب ڤێ چەندێ ژی بۆ دەمەکێ درێژ (دلسۆزییا تاگرییا خۆ) بۆ سولتانی مسۆگەر کر[٣].

سیاسەتا سولتان حسێن نە تنێ ب بەرفرەهکرنا چارچۆڤێ میرگەها خۆ و درێژکرنا دەستەلاتا خۆ ل دەڤەرێن رۆژهەلات و باشوور راوەستییا، بەلکی دەست ب دانانا پلانان کر داکو وی دەستەلات ل دەڤەرێن باکوور و رۆژئاڤایێ میرگەهێ ژی هەبیت کو ئەو دەڤەر ل بن کۆنترۆلا میرگەها هەکاری بوون، ئینا وی هەڤرکییا دژوار یا ل ناڤبەرا ئەندامێن بنەمالا حوکمدارا وێ میرگەهێ کو هەر ئێك ژ وان تاگرییەك جودا هەبوو، بۆ خۆ ب دەلیڤە دیت داکو مایێ خۆ د کاروبارێن میرگەها هەکاری دا بکەت و ئێك ژ وان وەك هەڤپەیمانێ خۆ هەلبژارت و بزاڤ کر فەرمانەکا سولتانی بۆ وی بهێتە دەرێخستن، ب ڤێ چەندێ سولتان حسێن دوو تشت مسۆگەر کرن: یا ئێکێ لایەنگرییا وی بۆ دەولەتا ئۆسمانی و یا دووێ ژی لایەنگرییا وی بۆ خۆ کو وەك هەڤپەیمانێ پشتەڤانێ وی بوو ل جەمدەولەتێ ، وەسا دیارە ژی وی هەر ئەو تشت دگەل میرێن دی یێن بۆتان(جزیرێ) ژی کرییە و هەتا رادەیەکێ وەسا بوویە سەرپەرشتیارێ میرێن وان ژی[٤].

ژ لایەکێ دووڤــە، پەیوەندییا میرگەها وی دگەل ئەیالەتا مووسل پەیوەندییەکا موکم بوو و هاریکارییەکا تمام و هەماهەنگی ل سەر کاروبارێن هەڤپشك ل ناڤبەرا وان هەبوو و گەلەك فەرمانێن ژ سولتانێ ئۆسمانی بۆ دهاتن هەڤشێوەیێ وان لبان بوون یێن بۆ میرێ میرێن مووسلێ دهاتنە هنارتن داکو هاریکارییا ئێك و دو بکەن و وان ئەرکان بجهـ بینن یێن ب وان دهاتنە سپاردن کو پتریا وان مۆرەکا ئێمناهیێ هەبوون، لێ ل سەر ئاستێ دەرڤەیی، میرێ بەهدینان سەرکەڤتنەکا مەزن د بەرەڤانیکرنا دەولەتا ئیسلامی دا ب دەستڤەئینا، هەر بۆ نموونە، ل سالا ٩٥٤ ێ مـش/١٥٤٧ ێ ز سەرکردایەتیا مەفرەزەیەکا لەشکەرێ خۆ کر کو ژ (میرخاسێن کورد) پێکهاتبوو[٥] دەملدەست چوو ناڤ ئازەربایجانا رۆژئاڤایێ ئیرانێ کو ئەڤە تشتەکێ نشکاڤەیی بوو بۆ هێزێن مەزن یێن سەفەوی یێن ل دەڤەرا (تەخت سلێمان) ل سەر رێیا ل ناڤبەرا تەڤرێز و زەنجان خرڤەبووین داکو بەرەڤ بەغدا و دەردۆرێن وێ پێشرەویێ بکەن.

ب ڤێ چەندێ، هێرشا ڤێ مەفرەزێ، بەری هێرشا سەرکەڤتیا هێزێن ئۆسمانی بوو یا ب سەرکردایەتییا سولتانێ ئۆسمانی سلێمان قانوونی بەرەڤ باکوورێ ئیرانێ دهاتەکرن، ئەڤ مەفرەزە شیا دریەکێ پێشوەخت داوەشینیتە سەفەوییان و ئەنجامێ وێ ژی رزگاربوونا بەغدا بوو، ژ بەر هندێ، سولتان قانوونی رێز لێ گرت و (کەیفا وی هات و حسێن بەگ خەلات کر و ئەیالەتا وی زێدەکر)، لێ هێشتا دو سال ب سەرڤە نەچووین ، شۆرشەکا بەرفرەهـ ل دەڤەرا ئەهوارێن باشوورێ عیراقێ ب سەرکردایەتییا عەلی کورێ عەلیان روودا و بوو مەترسییەکا مەزن ل سەر هەبوونا ئۆسمانی ل وێ دەڤەرێ، ئینا سولتانێ ئۆسمانی فەرماندا سولتان حسێن (ب کاروبارێن سەربازی یێن پێتڤی رابیت) و پشکداریێ د شەرێ دا بکەت کو ب سەرکردایەتییا والیێ بەغدا ئەسکەندەر پاشا بوو دژی وی شۆرشگێری[٦].

پشکدارییا سولتان حسێن د رێڤەچوونا شەرِ و هنگامێن ل وێ ژینگەها ب زەحمەت دهاتنە کرن پشکدارییەکا گرنگ و کاریگەر بوو، کو ب تمامی نەوەکی وێ ژینگەهێ بوو یا سەربازێن وی ل سەر راهاتی، ئۆپەراسیۆنێن ڤان هێزان کرین ل دۆرێن دو سالان ڤەکێشان، د وی ماوەی دا سولتان حسێنێ بەهدینانی پتر ژ سوپاسی و خەلاتکرنەکێ وەرگرتن، کو ئێك ژ وان ئەو نڤیسار بوو یا ئەسکەندەر پاشا میرێ میرێن بەغدا/ سەرکردەیێ گشتی ل رۆژا ٢١

ی رەجەبا ٩٧٥مش/١٥٧٦ز بۆ هنارتی و تێدا بەحسێ کریارێن میرێ میرێن شارەزووری و هێزێن وی کری بۆ ژ ناڤبرنا چەپەران و ئاڤاکرنا کەلاان، وێ فەرمانێ (رێزگرتنا سولتانی و رێنمایێ وی یێن بلند ب خۆڤەدگرت و فەرمانێ ددەتێ ل سەر کار و خەباتێن خۆیێن باش و دلسۆزانە بەردەوام بیت سەخمەراتی دەولەتا بلند)، هەروەسا فەرمانەکا هەڤشێوە ئاراستەی (سولتان حسێن بەگێ حوکمدارێ ئامێدیێ» هاتییەکرن[٧].

ئەڤ شەرە ژی وی دەمی ب داوی هاتن دەمێ هێزێن ئۆسمانی زیانەکا مەزن گەهاندییە هێزێن کورێ عەلیان و وان هۆزێن ل دۆر کۆمبووین، د وێ ئۆپەراسیۆنێ دا پلانێن سەربازی و ئالاڤێن وەسا هاتنە ب کارئینان کو دگەل خۆرستێ ب زەحمەتێ دەڤەرێ بگونجن، د وی شەڕیدا کورێ عەلیان ب خۆ ژی خۆرادەست کر و دانپێدان ب دەستەلاتا ئۆسمانی کر، ئینا سولتان حسێن هاتە خەلاتکرن (کو ئەو خەلات ژی کورکەکێ شاهانەیێ گرانبها بوو یێ سولتانی پێشکێشی وی کری بەرامبەری وان خزمەتێن وی دگەل میرێ میرێن بەغدا و میرێن دی یێن هێژا د سەفەربەرا(=شەرێ) کورێ عەلیان دا کرین)[٨].

شەرێن سولتان حسێن نە تنێ شەرێن بەژاهی و شەرێن ناڤ ئەهواران بوون، بەلکی شەرێن دەریایی ژی کرینە، هەر بۆ نموونە ل سالا ٩٧٩ێ مش/١٥٧١ێ ز ب هێزێن مەزن پشکداری د هەوەکا دەریایی یا مەزن دا بۆ ستاندنا قوبرس کرییە، پشتی کو ئەڤ گزیرتە بوویە ئاسێگەهەك و ژ لایێ خاچهەلگران ڤە دهاتە ب کارئینان بۆ برینا رێیا هاتن وچوونا دەریایی یا ئیسلامی، هەروەسا هێزێن کوردی ژی ژ ئامەدێ (دیاربەکرێ) پشکداری د وی شەری دا کرن، ب ڤێ چەندێ هژمارا شەرکەران گەهشتە دۆرێن ١٠٠٠٠٠ شەرکەران کو ٤٠٠ گەمییێن چەکدار دهەلگرتن، پشتی شەرێن دەریایی و بەژاهی یێن دژوار یێن سێزدە هەیڤان ڤەکێشاین، ئەو گزیرتە هاتە ستاندن و بوو ویلایەتەکا ئۆسمانی، پاشی ئەو هێز ژێ دەرکەڤتن و ڤەگەریانە وارگەهێ خۆیێ بەرێ، ب ڤێ هەلکەڤتێ سولتانێ ئۆسمانی سەلیمێ دووێ د فەرمانەکا رێزگرتنێ دا سوپاسییا میرێ بەهدینان کر (بۆ وان قارەمانی یێن میرێن کورد د شەرێن دژی کافران دا توومار کرین).

سولتان حسێن گرنگی ب لایەنێن شارستانی یێن میرگەها خۆ ددا، هەر بۆ نموونە، رێ ل پشکێن بەرفرەهێن میرگەها خۆ ڤەکرن و ئەو رێ بۆ ب ساناهیکرنا هاتن وچوونا کاروانێن بازرگانی پێکڤە گرێدان و هژمارەکا (خان)ان ل سەر رێیان دانان داکو ببنە ویستگەهـ بۆ حەواندنا کاروانییان، چەندین پر و ڤەنتەرە ژی بۆ ب ساناهیکرنا دەربازبوونێ ل سەر وان رووباران چێ کرن یێن دبوونە ئاستەنگ د رێ یێن سەرەکی یێن هاتن وچوونێ دا، هەروەسا خواندنگەهـ و مزگەفت ئاڤاکرن و نووژەنکرن، ژ وانا: خواندنگەها قوبەهان، مزگەفتا مەزن، بازێرێ ئامێدیێ ب خۆ ژی باش ئاسێ کر و بارەگەهێ حوکمرانییێ لێ دامەزراند، وی ب تنێ یان ژی ب هەڤپشکی پشکداری د ئاڤاکرنا هژمارەکا کەلان ل دەڤەرێن میرگەها خۆ و دەرڤەی وێ دا کر، ئەڤە سەرباری بنجەهکرنا رێسایێن حوکمرانی و کارگێری و دارایی ل میرگەهاخۆ. سولتان حسێن ل هەیڤا رەجەبا سالا ٩٨١مش/١٥٧٣ز وەغەرا داویێ

**مۆرا سولتان حسێن هەروەکی د دەستنڤیسێن پەرتووکخانا خواندنگەها قوبەهان دا هاتی**



## دارا دووندەها سولتان حسێن




**گۆڕێ سولتان حسێن:**
**سندۆقا داری یا ل سەر گۆڕێ سولتان حسێن د سالێن پێنجی یێن سەدسالییا بۆری دا**



کریبە و تەرمێ وی ل ئامێدیێ یا پایتەختێ وی هاتیبە ڤەشارتن و گۆمبەتەکا جوان ل سەر گۆڕێ وی هاتیبە ئاڤاکرن و دیوارێن وێ ب هندەك نڤیسینان هاتینە نەخشاندن کو دیرۆکا مرنا وی دیار دکەن، سەردەمێ وی ژ لایێ هزری و ئاڤەدانی و ئابووری ڤە ب پێشکەڤتیترین و ب هێزترین و ب خێر و بەرەکەتترین و پڕ بەرهەمترین سەردەمێن میرگەها بەهدینان دهێتە ل قەلەمدان[٩].

ل سالا ٩٨١مش تەرمێ سولتان حسێن بەگ ل گۆڕستانا سولتانی یا دکەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ ئامێدیێ هاتەڤەشارتن، ل سەر گۆڕێ وی گۆمبەتەکا مەزن هاتەئاڤاکرن کو هەتا ئەڤرۆ ب ئێك ژ دیارترین شوونوارێن مایی یێن میرگەهێ دهێتە هژمارتن، گۆمبەت رووبەرەکێ هەشتگۆشە ب خۆڤە دگریت و درێژیا هەر باسکەکی ل ناڤبەرا ٢،٦٠-٢،٦٤ مەترایە و بلندیا دیوارێن وێ ٤،٤٠ مەترە و ژ بەرێن نکلاندی و کەرەستەیێ گێچێ ب تنێ هاتیبە ئاڤاکرن، کولەکێن بچووك د هەردو دیوارێن رۆژهەلات و رۆژئاڤا ب ئاوایێ نیڤ لاکێشە بۆ هاتن وچوونا بای و رۆناهیێ هەنە، ل سەر ڤان دیواران گۆمبەتەکا نیڤ بازنەیی هەیە و ئەو ژی ب بەرێن نکلاندی هاتیبە ئاڤاکرن و ل سەر گۆمبەتەکا ناڤخۆیی هەیە یا بەرێن وێ باش ل بەرئێك هاتینە دانان، هەروەسا گۆمبەتێ دەرۆکەکێ کڤانەیی یێ وەکی قەنتەرێ هەیە کو بەرێن وێ دنکلاندینە دکەڤیتە دیوارێ باکوورێ وێ و دەرگەهەکێ داری هاتیبە پێڤەکرن، د سەردا ژی ئەڤ دەستەپەیڤە ب تیڤارێژەکا(شریتەکا) نڤیسینێ یا ژ جۆرێ (خط الثلث) هەیە: (قال الله سبحانه وتعالی کل شیء هالك إلا وجهه توفي السلطان الاعظم الاعدل سلطان حسین بیك فی شهر شعبان سنة ٩٨١)، (ئانکو، خودێ بێ هەڤپشك و مەزن گوتیبە: هەر تشتەك دێ ژ ناڤچیت و نامینیت، ژ بلی روویێ وی، سولتانێ مەزنتر و دادپەروەرتر سولتان حسێن بەگ ل هەیڤا شەعبانا سالا ٩٨١ ێ مریە).

ل ناڤ و ل دەرڤەی گۆمبەتێ ژی هندەك نەخش ونیگارێن ئەندازیاری و رووەکی هەنە کو ب شێوەیێ بلند هاتینە چێکرن، هەروەسا تیڤارێژەکا دی یا نەخشاندنا رووەکی ب پانیا ١١ سانتیمەتران هەیە کو ب رەنگێ رەش هاتیبە چێکرن و ل نیڤا گۆمبەتا گۆڕی یە و سندۆقەکا ژ دارێ چام (صاج)ێ هاتیبە

گۆمبەتا ل سەر گۆڕێ سولتان حسێن ل گۆڕستانا سولتانی



چێکرن ل سەرە و ب نەخشەیێن ئەندازیاری ب رێیا داگرتن و د ناڤ ئێکراپرنێ هاتییە نەخشاندن کو دەربرینێ ژ ستێر و سێگۆشەیان و تشتێن دی دکەن[١٠].

## سولتان قوباد خان کورێ سولتان حسێن:

سەردەمێ سولتان قوباد بەگ کورێ سولتان حسێن بەگێ بەهدینانی حوکم تێدا کری ب قووناغا وەرگوهێزا دیرۆکا میرگەها بەهدینان دهێتە ل قەلەمدان و د وی سەردەمی دا حوکمێ میرگەهێ بەرەڤ لاوازیێ چوو، پشتی میرێن بەرێ یێن بەهدینان ب دادپەروەری و خودێنیاسیێ خۆ ژ لایەکی ڤە شیاین شەنگستەیێن ب هێز بۆ ستوونێن میرگەها خۆ دانن و ژ لایەکێ دووڤە ژی شیاین هەڤپەیمانی یێن عەشیرەتان بۆ پشتەڤانیکرنا میرگەهێ پێك بینن، د حوکمێ قوباد بەگێ دا خەمساری و پشتگوهڤەهاڤێتنەکا بەرچاڤ د هەردو لایەناندا دهێتە دیتن، هەرچەندە ژی ئەو کورێ ب شیانترین و سیاسەتمەدارترین میرێن میرگەهێ بوو، لێ وی ژ ڤان هەمی تشتان چ وەك میرات ژ بابێ بۆ نەما، هەر بۆ نموونە، رێڤەبرنا وی بۆ کاروبارێن ناڤخۆیی یێن میرگەهێ شەپرزەیی پێڤە دیاربوو و کاروبارێن گرنگ و یێن گرنگییا وان کێمتر ژێك جودا نەدکرن ، هۆسا گەلەك جاران نەدشیا کاروبارێن گرنگ ئێکلا بکەت، وەکی: تاوانێن مەزن و خیانەتکرنێ، ئەڤە ل وی دەمێ بەردەوام بوو ل سەر سزادانا خودان زێدەگاڤێێن بچووك[١١]، ئەڤە ژی بوو ئەگەرێ وێ چەندێ عەشیرەتێن پشتەڤانی لێ دکرن، رێزێ لێ نەگرن.

هەروەکی دیارە دەستەلاتا ئۆسمانی ژی تێبینیا وێ لاوازیێ کرییە و ئاگەهـ ژێ هەبوویە، هەر بۆ نموونە د بەلگەنامەیا رۆژا ١٦(ربیع الاول) یا ٩٨٢مش/١٥٧٤ز دا[١٢] ئاماژەیەکێ دبینین کو فەرمانەك بۆ حوکمدارێ ئامێدیێ و دادوەرێ وێ دەرکەڤتییە کو (پەیوەندی ب دەستەسەرکرنا هندەك گەندەلکارێن خرابکار ل وێرێ هەیە، ژ وانا: مەحمود کورێ شکراللە، ئەحمەد، ئەبوبەکر زێر و تاجدین کو دەستدرێژی کربوونە سەر خەلکی و تاوانێن کوشتن و تالانکرنێ ل دژی

نڤیسینا ل سەر بەرێ ل سەر گۆڕێ سولتان حسێن تێدا ناڤێ وی و دیرۆکا مرنا وی دیار دبیت



وان ئەنجامدانە) و تێدا هاتییە كو (بەری نۆكە ژی فەرمانەك هەر ل سەر وی بابەتی دەركەڤتبوو، لێ ژ ناڤبرنا وان خرابكاران هەتا نۆكە بجهـ نەهاتییە) و دەقێ فەرمانێ ژی ب ڤی ئاوایی بوو: (رێكارێن پێتڤی ل دووڤ شەرعێ دادپەروەر بهێنە ئەنجامدان)، لێ مخابن ژی ژێدەرێن بەردەست ناسنامەیا وان (گەندەلكارێن خرابكار) رۆهن ناكەن و دیار ناكەن كا دەست د چ جۆرێن ئارێشەیان دا هەبووینە كو ئەو دەنگ و باس دگەهشتنە سولتانێ ئۆسمانی ب خۆ ژی.

ژ لایەكێ دووڤە، هەڤركییا وی یا بەردەوام دگەل بەهرام بەگێ برایێ وی یێ مەزن سەرا حوكمكرنا میرگەهێ، زیان گەهاندە مەزنی وسەنگا بنەمالێ ل ناڤ وان عەشیرەتان هەتا وەلێ هاتین هەر ئێك ژ وان پشتا ئێك ژ وان برایێن هەڤرك بگریت كو ئەڤە ژی تشتەكێ ترسناك بوو و رامانا وێ ژ بەرێكچوونا هەڤپەیمانییا عەشیرەتان بوو یا چەندین سەدسال بوو بوویە ئەگەرێ بنەجهبوونا رەوشا سیاسییا میرگەهێ.

ئێكەمین هێزا عەشیرەتییا لاوازییا میرگەهێ بۆ خۆ ب دەلیڤە دیتی، میرگەها داسنی بوو یا كو هێشتا بیرهاتنا هەڤركی یێن وێ دگەل هەڤسوییێن وێ یێن ب هێز د بیردانكا دووڤكەڤتیێن وێ دا مابنە، هەر بۆ نموونە د بەلگەنامەیا رۆژا ١٠(جمادی الاول) یا سالا ٩٨٢مش/١٥٧٤ز دا هندەك زانیاریێن گرنگ ل سەر هندەك لڤینێن وان عەشیرەتان هەنە یێن ل بن رێبەرییا وێ میرگەهێ بوون، فەرمانەك د وێ بەلگەنامەیێ دا هەیە كو ئاراستەی میرێ میرێن بەغدا هاتییە كرن و تێدا هاتییە كو (قوباد بەگێ حوكمدارێ ئامێدیێ نڤیسارەك بۆ سولتانی هنارتییە و تێدا بەحسێ هەردو كۆمەلێن داسنی و ئێزدی یێن شەرۆكی و خرابكار كرییە یێن ل سەر ئاژاوەگێری و تاوانكرن و تاوانێن كوشتن و تالانكرن و دزیێ راهاتین، ژ وانا: شێخ عزەددین و شێخ بەرەكاتێ كورێ وی و دووڤكەڤتیێن وی، هەروەسا فەرمانەكا بلند بۆ ژ ناڤبرنا وان دەركەڤتبوو و ل دووڤ وێ فەرمانێ شەرێ وان هاتەكرن و هندەك ژێ هاتنە كوشتن و هندەكێن دی ژی شیان برەڤن، لێ هێشتا شێخ بەرەكات و تاوانبارێن دزێن دگەل وی دبەردەوامن ل سەر خرابكاریێن خۆ ل دەڤەرێن مووسل و هەولێرێ (ئەربیلێ)، حوكمدارێ ئامێدیێ د نڤیسارا خۆ دا داخواز ژ سولتانی كرییە دەستەلاتدارییا چ دەڤەران نەدەنە كەسێ ژ وان، هەروەسان تێدا هاتییە ژی كو پێتڤییە ئەوێن تاوانبار بێنە راهێلان و بێنە دەستەسەركرن و ل دووڤ شەریعەتێ دادپەروەر رێكارێن پێتڤی دەرهەقێ وان بێنە كرن، بێی هندێ چ كێشە بۆ كەسانێن بێگونەهـ بێنە چێ كرن. ل ڤێرە پێتڤییە بێژین كو ئەڤ كێشە ژ سولتان حسێنێ میرێ بەرێ یێ بەهدینان بۆ قوباد بەگێ كورێ وی مابوون.

ژ هژمارا نامەیێن میرێ میرێن بەغدا بۆ سولتانێ ئۆسمانی هنارتین تێدگەهین كا كێشەیێن داسنییان چەند جهێ پویتەدانا بەرپرسێن بەغدا بووینە، چونكی ئەو كێشە دبوونە گەف ل سەر رێیا بازرگانی یا ل ناڤبەرا مووسل و بەغدا، هەر بۆ نموونە، د بەلگەنامەیا رۆژا ٢٠ سەفەرا ٩٨٢مش دا[١٣] فەرمانەك ئاراستەی حوكمدارێ ئامێدیێ هاتییە كرن و تێدا هاتییە كو (عەلی میرێ میرێن بەغدا (هەر د خۆشییان دا بیت) نڤیسارەك بۆ سولتانی هنارتییە تێدا گۆتییە كو خەلكێ ژ مووسل دهێنە بەغدا ب رێڤە ئەشقیا و رێگر تووشی وان دبن و دەمێ ڤەكۆلین دگەل دهێتە كرن، دیار دبیت كو ئەو ئەشقیا ژ كوردێن جزیرێ نە و ژ تیرەیا داسنی یا ل ئامێدیێ نە، ژ بەر هندێ فەرمان هاتییەدان راهێلانا وان كەسان بێتە كرن و بهێنە دەستەسەركرن و ل دووڤ شەریعەتێ بلند و شكۆدار پێخەمەت پاراستنا سلامەتییا خەلكی و ئاسایشا رێكێ بهێنە سزادان، هەر د وێ فەرمانێ دا هاتییە كو ئەو دێ یێ بەرپرسیار بیت و دێ گازندە ژێ هێنە كرن هەكە ئەڤ چالاكیێن خرابكاری ل ئەیالەتا وی دبەردەوام بن).

هەروەسا بەلگەنامەیا رۆژا ١٠(جمادی الاخرە) یا سالا ٩٨٢مش/١٥٧٤ز بەحسێ پەیدابوونا نیشانێن

ناكوكیێن ل ناڤبەرا عەشیرەتان دكەت یێن دێ ل سەردەمێ میرێن پشتی هینگی بەفرەه دبن، ئێكەمین پشتەڕێبوونا ل سەر بنەمالا حوكمدار هاتیە روودان ژی ئەو بوو یا هەردو عەشیرەتێن سندی و سلێمانی(سلیڤانەیی)كری كو هەردو گرنگترین ستوونێن قولپا عەشیرەتی یا میرگەهێ بوون، دەقێ فەرمانەكێ د ڤێ بەلگەنامەیێ دا هاتیە كو ئاراستەی میرێ میرێن بەغدا هاتیەكرن و پەیوەندی ب نڤیسارەكێ ڤە هەیە كو (ژ قوباد بەگێ حوكمدارێ ئامێدیێ (هەر یێ شكۆدار بیت) گەهشتیە سولتانی و تێدا دبێژیت كو عەشیرەتا سیدی (هۆسا هاتیە و یا دروست سندی یە) و عەشیرەتا سلێمانی(سلیڤانەیی) ل وێ لیوایا بۆ بەهرامێ برایێ وی (هەر یێ سەرفەراز بیت) دان بەردەوامن ل سەر پشتەڕێبوون و خرابكاریێ و و ئەوێ هانددەت و هاریكاریا وێ دكەت بەدر بەگە و ڤێ عەشیرەتێ رێ نەدایە برایێ وی بچیتە ناڤ لیوا وی) د وێ فەرمانێ دا هاتیە كو (میرێ میرێن بەغدا ڤەكۆلینێ د وێ مەسەلێ بكەت و فەرمانێ ددەتێ نڤیسارەكێ و زەلامەكی ژ لایێ خۆڤە بهنێریتە نك بەدر بەگێ ناڤهاتی و ب رژدی داخوازێ ژێ بكەت كو گوهداریكرن و رێك و پێكیێ ل ناڤ عەشیرەتا خۆ بنەجهـ بكەت و نەهێلیت زێدەگاڤیێ ل سەر فەرمانێن بلند بكەت و كەسانێن خرابكارێن ركمانەییێ دكەن دەستەسەر بكەت).

لێ ئەڤ بەلگەنامە ناسناما بەدر بەگێ ناڤهاتی رۆهن ناكەت، ژ ناسناڤێ وی (بەگ) ژی دیارە كو دبیت میرێ لیوایەكێ یێ دەڤەرێ بیت، لێ تشتێ د بەلگەنامەیێ دا هاتی كو دڤێت رێك وپێكیێ ل ناڤ (عەشیرەتا خۆ) بنەجە بكەت، رامانا وێ ئەوە كو ئەو سەرۆك عەشیرەتەك ژی بیت، ئەڤە سەرباری كو میرێ لیوایەكێ بیت، لێ زانیارێن بەردەستێن ل سەر كارگێڕیا كوردستانێ ل سەردەمێ ئۆسمانی هەین تێدا دیار نینە كو لیوایەك ب وی ناڤی هەبیت، وەسا دیارە ژی كێشە هەتا سالا پاشتر وەكی خۆ مایە، چونكی د بەلگەنامەیا رۆژا ١٤ موحەررەما سالا ٩٨٣مش/١٥٧٥ز دا[١٤] فەرمانەكا ئاراستەكری بۆ میرێ میرێن بەغدا هەر ب وێ ناڤەرۆكا بەرێ دبینین، ژ بلی مەسەلەیەكێ ب تنێ، ئەو ژی ئەوە كو هاندەرێ خرابكاریێ د ناڤ هەردو عەشیرەتان دا (شێخ ئەمیر)ە و نە (بەدر بەگ)ە، ڤێجا ئەم نزانین كا ئەرێ هەردو ناڤێن كەسەكینە یان ژی دوو كەسێن ژێكجودانە، د ڤێ بەلگەنامەیێ دا نڤیسارەكێ دخوینین كو ژ حوكمدارێ ئامێدیێ قوباد بەگێ بۆ سولتانی هاتیە و تێدا بەحسێ(خرابكاری و كرێتیا هەردو عەشیرەتێن سندی و سلیڤانەیی هاتیە كرن و دیار كریە كو شێخ ئەمیر هاندەرێ خرابكاریێ یە، ئەو سەرۆكێ ئەشقیانە، ئینا ئەو دەستەسەر كر و زیندان كر، ل دووڤ دەقێ حوكمی دڤێت شێخێ ئاماژە پێ هاتییەدان ل جڤاتا شەرعی و دادگەهێن وێ ئامادە ببیت و روو ب روویێ نەیارێن وی بهێتە كرن، ڤێجا هەكە راست بیت وی ئەو خرابكاری و كرێتی كرین، ل دووڤ شەریعەتێ دادپەروەر دڤێت رێكارێن پێتڤی دەرهەقێ وی بێنە كرن، لێ وێ بەلگەنامەیێ دیار نەكریە كا بۆچی شێخ ئەمیر ئەو (خرابكاری) هاندایە یا ئاماژە پێ هاتیە دان.

ل رۆژا ٢ رەجەبا ٩٨٣مش/١٥٧٥ز[١٥] فەرمانەكێ دبینین كو ئاراستەی میرێ میرێن بەغدا (كو وی دەمی عەلی پاشا ئەلوەند زادە بوو) هاتیە كرن و وێ فەرمانێ پەیوەندی ب نڤیسارەكێ ڤە هەیە یا ژ وی هاتی، تێدا پێگیریا خۆب دیتن و بۆچوونا میرێ بەهدینان دەربڕیە ل سەر كێشەیا بەهرامێ برایێ وی و تێدا هاتیە: (هندەك كەس و كارێن قوباد بەگ و رێبەرێن عەشیرەتێن ئامێدیێ رێیا زولم وزۆری و پشتەڕێبوونێ گرتییەبەر و دەستدرێژیێ دكەنە سەر خەلكی) د دەقێ حوكمی دا هاتیە كو (ئەو بهێنە دەستەسەركرن و ل دووڤ شەریعەتێ دادپەروەر بێنە دادگەهـ كرن، داكو كاروبار وەكی بەرێ بزڤڕنەڤە و خودان ماف بگەهنە مافێ خۆ).

میرێ میرێن بەغدا هەردەم ل بەرامبەری سولتانێ ئۆسمانی پشتگیری و ب باشی پەسنا قوباد بەگی دكر، بۆ نموونە، هەر د بەلگەنامەیا وێ

رۆژێ دا[١٦] فەرمانەکا ئاراستەکری بۆ قوباد بەگێ حوکمدارێ ئامێدیێ هەیە و تێدا هاتییە: (میرێ میرێن بەغدا نڤیسارەك بۆ سولتانی هنارتییە و تێدا دەستخۆشی ل حوکمدارێ ئامێدیێ کرییە و گۆتییە کو ئەو ب دادپەروەریا خۆ د حوکمی دا و ب ماقوولی و باش رێڤەبرنا کاروبارێن هەڤوەلاتیان و خەلکی دا و د ئەنجامدانا رێ ورەسمێن ئاینێ پیرۆز و بەلاڤکرنا سوننەتێن سەروەرێ پێغەمبەران و ب خەمسارینەکرنێ د رێیا دەولەتا بلند دا بەرنیاسە).

هەروەسا دوو بەلگەنامەیێن دی یێن گرنگ هەر دیرۆکا وێ رۆژێ ئانکو ژی رۆژا ١٥شەوالا سالا ٩٨٣ مش/١٥٧٥ز ل سەرە[١٧]، یا ئێکێ فەرمانەکە کو ئاراستەی میرێ شەهرەزول(=شارەزوور) هاتییە کرن و تێدا هاتییە کو (قوباد بەگێ حوکمدارێ ئامێدیێ نڤیسارەك بۆ سولتانی هنارتییە و تێدا بەحسێ خرابکاریا برایێ خۆ بەهرامێ میرێ لیوایەکا بەسرا و کرێتی یێن وی کرییە) و د دەڤێ فەرمانێ دا هاتییە کو (ئەو بهێتە دەستەسەرکرن و زیندانکرن)، لێ د بەلگەنامەیا دووێ دا رێیەکا ب حیلە وحەوالە بۆ دەستەسەکرنا بەهرام بەگێ دهێتە نیشادان دەمێ ئەو ل لیوایەکا شارەزوور ئامادە دبیت، فەرمانەکا ئاراستەکری (بۆ حوکمدارێ ئامێدیێ ل سەر بابەتێ بەرێ هەیە) و تێدا هاتییە کو (فەرمانەکا بلند ژ میر لیوایێ شارەزوور دەرکەڤتییە بۆ دەستەسەرکرنا بەهرام بەگێ، لێ ب سیاسەت، ئەوژی ئەوە کو بەهرام بۆ بەرزەحفییەکێ ل نك خۆ بهێتە ڤەخواندن و بهێتە گرتن و زیندانکرن).

تێبینیا وێ چەندێ دکەین کو قوباد برایێ خۆ ب میرێ میرێن بەسرا ل قەلەم ددەت، چ پێ نەڤێت ژی کو ئەو نەگەهشتییە وێرێ، چونکی هەکە وەسابا، میرێ میرێن شارەزوور نەدشیا بەهرام ڤەخوینیتە وێ مێڤانداریا وەکی تەپك بۆ هاتییەدانان، دبیت ژی پلان ل سەر وی بنواشەی هاتبیتەدانان دەمێ کو ئەو د رێیا خۆ دا ژ شارەزوور دەرباز دبیتە بەسرا بۆ وەرگرتنا پۆستێ خۆ، بۆ وێ بەرزەحفیێ بهێتە ڤەخواندن، هەر چەوان بیت، هندەك ئاستەنگێن نەدیار هەنە بووینە ئەگەرێ وێ چەندێ نەگەهیتە بەسرا پشتی چەند هەیڤەکان ڤەکێشایە، بەلگەنامەیا بهێت ژی ئەشکەرا دکەت کو بەهرام پۆستێ (میرێ میرێن بەسرا) وەرنەگرتییە، بەلکی تنێ پۆستێ میرێ لیوایەکا وێرێ وەرگرتییە، چونکی د بەلگەنامەیا رۆژا ٢٠(ربیع الاول) یا سالا ٩٨٤مش/١٥٧٦ز دا[١٨] فەرمانەك هەیە و تێدا هاتییە (لیوایەکا ل بەسرا ئاراستەی پێشەوایێ میرێن رێزدار بەهرام — هەر یێ سەرفەراز بیت — کورێ حوکمدارێ ئامێدیێ سولتان حسێن بەگ هاتییە کرن).

وەسا دیارە ژی بەهرام زانییە ئارمانج ژ دامەزراندنا وی ل بەسرا چ بوویە، چونکی هەر ئەو بەلگەنامە دبێژیت (لێ هەتا نۆکە ئەو نەگەهشتییە جهێ کارێ خۆ و ئەرکێ پۆستێ خۆ وەرنەگرتییە، د دەڤێ فەرمانێ دا بەحسێ هنارتنا زەلامەکی ژ لایێ وی ڤە بۆ نك وی هاتییە کرن داکو زوو بگەهیتە بارەگەهێ کارێ خۆ)، ب ڤی ئاوایی، بەهرام هەر ب ئێکجاری نەچوویە بەسرا و د شارەزوور را دەرباز نەبوویە داکو بکەڤیتە د وێ بویسێ دا یا ل وێرێ بۆ هاتییە دانان، وی خۆ ل ناڤ وان عەشیرەتان ئاسێ کر یێن ل لیوا جزیرێ (کو میرگەها بۆتان لێ بوو) هەڤپەیمانی دگەل کری ب وێ هیڤیێ داکو خۆ بۆ ستاندنا میرگەها باب وباپیرێن خۆ ل بەهدینان یا نێزیکی میرگەها بۆتان ئامادە بکەت، بەلگەنامەیا رۆژا ١٩(جمادی الاول) یا سالا ٩٨٤مش/١٥٧٦ز دا[١٩] فەرمانەك تێدا هەیە کو ئاراستەی میرێ میرێن شارەزوور هاتییەکرن و پەیوەندی ب نڤیسارەکێ ڤە هەیە یا ژ دادوەرێ مووسل هاتی و تێدا گۆتییە کو لیوایا (قورنە) یا ل بەسرا ئاراستەی بەهرامێ کورێ حسێن بەگێ وەغەرکرییێ حوکمدارێ بەرێ یێ ئامێدیێ هاتییەکرن، لێ ئەو نەچوویە لیوایا ناڤبری و ل ناڤ عەشیرەتا خۆ ل جزیرێ (بۆتان) مایە و هژمارەکا زۆر یا ئەشقیا ل دۆر خۆ کۆمکرینە، پاشی چوویە عەشیرەتا زێباری ل ئامێدیێ و داخوازا هندەك دەڤەر و کەلایێن ل ئامێدیێ کرییە داکو ب رێیا لیوایێ بێنەدان بۆ وی.

هەروەسا دادوەر د ڤێ نڤیسارا خۆ دا دبێژیت:

(ڤی بەهرامی رێیا ئاژاوەگێری و خرابکاریێ گرتییە بەر و هندەك زەلامێن عەشیرەتا زێباری ل دۆر خۆ کۆمکرینە و خۆ ئامادە دکەت هێرشێ بکەتە سەر قوباد بەگ ـــ هەر یێ سەرفەراز بیت - و رێیا بازرگانیێ ل ناڤبەرا ئامێدیێ و مووسل ببڕیت، ئەڤە ژی بوویە ئەگەرێ وێ چەندێ بزاڤا بازرگانی ل ناڤبەرا هەردو باژێران بهێتە راوەستاندن، د دەڤێ فەرمانێ دا هاتییە کو هێزەکا سەربازی بهێتەرەوانەکرن بۆ ژ ناڤبرنا خرابی و چالاکیێن خرابکاریێن وی، هەروەسا هندەك فەرمانێن دی یێن هەڤشێوە ئاراستەی میرێ لیوا مووسل و حوکمداری جزیرێ هاتینە کرن).

ئەڤ بەلگەنامەیا گرنگ هژمارەکا مەسەلەیان ئەشکەرا دکەت، یا ئێکێ ئەوە کو بەهرام ژ داخوازییا خۆ بۆ حوکمکرنا میرگەها بابێ خۆ لێڤەبوویە هەروەکی دیارە ئەڤە خۆچەماندن بوویە بۆ دیفاکتۆیێ و داخواز کرییە تنێ هندەك کەلا و دەڤەرێن ئامێدیێ د دەستێ وی دا بن، ئانکو وەك لیوا حوکمدارییا وان بکەت، ئەو رازی بوو حوکمێ وی ل سەر بنواشەیێ دامەزراندنێ بیت ژ لایێ دەولەتا ئۆسمانی ڤە و نە ل سەر بنواشەیێ میراتگریێ بیت هەروەکی ئەوێن وی سەردەمی حوکم ل میرگەهێ دکرن، هەروەسا ژ بەرکو بەلگەنامەیێ د بنەکۆکا خۆ دا پشتا خۆ ب سکالایەکا دادوەرێ مووسل گەرم کرییە، ئاماژەیێ دکەتە لڤاندنا سکالایەکێ یا قوباد بەگ بۆ دادوەری بلندکری داکو مەسەلە فۆرمەکێ (شەرعی) وەرگریت، دوور نینە ژی ژ لایێ میرێ میرێن مووسل ڤە بیت بۆ ژێستاندنا هندەك کەلا و دەڤەرێن میرگەها بەهدینان داکو بەرامبەری ئەیالەتا مووسل ب خۆ لاواز ببیت، تشتێ دڤێت ئاڤرووی لێ بهێتە دان ئەوە کو بەلگەنامە ئاماژەیێ دکەتە وێ چەندێ کو عەشیرەتا زێبار پشتەڤانییا میرێ هەڤرك بەهرام بەگێ کرییە، بۆ زانین ژی، هەر ژ دەستپێکا پێکهاتنا ڤێ میرگەهێ، ڤێ عەشیرەتا ب هێز پشتەڤانی لێ کرییە، بەلکی ئێك بوو ژ ستوونێن ڤێ میرگەهێ[20]، ل ڤێرە دڤێت بپرسین کا چ ئەگەر بوون وەلێ کرین دژی قوباد بەگێ میرێ بەهدینان راوەستێت، چ بەرسڤ بۆ ڤێ پرسیارێ نینن، تنێ هەکە ژ بەر هندێ بیت کو وێ عەشیرەتێ وەسا دیتییە بەهرام بەگ خودان شەرعیەتە چونکی کوڕێ نەخرێ سولتان حسێن بەگێ یە و نە قوبادە هەرچەندە یێ داویێ ل سەر کورسییا بابێ خۆ ل ئامێدیێ روونشتییە، رامانا ڤێ ژی ئەوە کو هەڤرکی ل ناڤبەرا هەردو برایان بوویە ئەگەرێ نەمانا وێنەیێ شەرعیەتا حوکمی د چاڤێن هێزێن پشتەڤانێن میرگەهێ دا.

ناکوکیا ل ناڤبەرا هەردو برایێن هەڤرك گەهشتە رادەیەکا وەسا دەستەلاتا ناوەندیا ئۆسمانی ل ستەنبۆلێ دلگران ببیت، ڤێجا ب رێیا میرێن هەڤسوو پێکۆل کر لهەڤهاتن (سازان) ب هەر رێیەکا بیت ل ناڤبەرا وان بهێتە کرن، د بەلگەنامەیەکێدا کو هەر د وێ رۆژێدا ئانکو رۆژا ٢٠ (ربیع الاول)[21] هاتییەنڤیسین، فەرمانەك بۆ حوکمداری جزیرێ (ل میرگەها بۆتان) هاتییە ئاراستە کرن کو پەیوەندی ب (ناکوکیێن ل ناڤبەرا قوباد بەگێ حوکمداری ئامێدیێ و برایێ وی بەهرام بەگێ) ڤە هەیە، ژ ناڤەرۆکا بەلگەنامەیێ دیار دبیت کو قوباد بەگ بەردەوام بوویە ل سەر سکالایێن خۆ ل دژی برایێ خۆ، د وێ بەلگەنامەیێ دا هاتییە کو وی نڤیسارەك بۆ سولتانێ ئۆسمانی هنارتییە و تێدا گۆتییە کو بەهرامێ برایێ وی سەرداچوویە و خرابکارییان دکەت و دگەل خرابکاران رێککەڤتییە و ئێککرتن دگەل کرییە بۆ پەیداکرنا ئاژاوە و ئالۆزیێ ل وەلاتی و زیانگەهاندنا خەلکی)، د دەڤێ وی حوکمی دا هاتییە کو (شیرەتێ ل هەردو بران بکەت و وان ئاگەهدار بکەت دەست ژ ناکوکیێن ل ناڤبەرا خۆ بەردەن و پێکڤە ب ڤیان و خۆشی و تەناهی بژین)، لێ وەسا دیارە سیاسەتا (ریسواکرنا ناکوکیان) چ مفایێ خۆ نەبوویە بەرامبەری سکالایێن بەردەوامێن قوباد بەگێ، کو ئەڤە ژی ببوو ئەگەرێ وێ چەندێ سولتانێ ئۆسمانی ل هەیڤا (جمادی الاخرە) یا سالا ٩٨٤مش/١٥٧٦ز[22] فەرمانەکێ ئاراستە بکەت کو پەیوەندی ب نڤیسارەکێ ڤە هەیە یا وی بۆ سولتانی هنارتی و تێدا دبێژیت کو (برایێ وی بەهرام ژ سنوورێ گوهداریکرنێ و پێگیربوونێ ب فەرمانان دەرکەتییە

و ل سەر رێیا ئاژاوەگێری و خرابیێ دچیت)، د دەقێ حوکمی دا هاتییە کو (بهێتە دەستەسەرکرن و کەلەپچەکری و گرێدای و ل بن زێرەڤانییەکا شدیای یا زەلامێن وی یێن هێزدار بۆ ستەنبۆلێ بێتە هنارتن).

هەرچەندە ڤان سکالایان گونەهبارێن ترسناک ب خۆڤە گرتبوون، وەکی (رێککەڤتن دگەل خرابکاران) و (رەفتارێ رێیا ئاژاوەگێریێ) و یێن دی، قوباد بەگ پشتی چەند هەیڤەکان (ب دروستی ژی رۆژا ١٥ شەوالا سالا ٩٨٤ مش/١٥٧٦ز[٢٣] یێ دوودل نەبوو داخوازێ ژ سولتانێ ئۆسمانی بکەت کو لیوایەکا ئامەدێ (دیاربەکرێ) رادەستی بەهرامێ برایێ وی بێتەکرن، رامانا ڤێ ژی ئەوە کو ئەو گونەهباری تنێ گۆتگۆتکێن بێ بنەما بووینە و ئارمانج ژێ ژ ناڤبرنا وێ هەڤرکیێ بوویە یا دگەل برایێ خۆ هەی بۆ حوکمداریکرنا ئامێدیێ و دەڤەرێن وێ ب تنێ، هەروەکی دیارە ژی، دەستەلاتا ئۆسمانی ئاگەهـ ژ راستییا وان پالدەران هەبوویە، هەکە نە، (د دەقێ حوکمی دا نەدهات دهەوارا داخوازییا وی بچن دەمێ لیوایەکا ڤالا لێ هەبیت) (هەمان بەلگەنامە).

پێکۆلێن قوباد بەگێ بۆ مژوولکرنا برایێ خۆ ب وەرگرتنا هندەک لیوایێن دیاربەکرێ داکو داخوازا حوکمێ بەهدینان نەکەت، هەڤرکییا ل ناڤبەرا وان ب داوی نەئینا، بەلکی د بەلگەنامەیان دا گرۆڤە هەنە کو بەردەوام سکالا ل سەر برایێ خۆ بۆ سولتانێ ئۆسمانی هنارتینە، هەتا وەلێ هاتی سولتان هەلویستێ خۆ ژ بەهرامی بگوهوڕیت و ڤێ جارێ بڕیارا سزادانا وی بدەت، هەر بۆ نموونە د بەلگەنامەیا رۆژا ٩(ذی القعدە) یا ٩٨٤مش/١٥٧٦ز دا[٢٤] فەرمانەک هاتییە کو ئاراستەی هژمارەکا والی و میران هاتییە کرن }کو ئەو ژی میرێن شارەزوو، بەغدا، دیاربەکر و جزیرێ (جزیرا بۆتان) محەمەد(میر محەمەدێ کوڕێ بەدر کوڕێ شاهـ عەلی) و سوهرانی سلێمان بەگ (میرێ سۆران) و قوباد بەگێ حوکمدارێ ئامێدیێ نە، ڤێ فەرمانێ پەیوەندی ب نڤیسارەکێ ڤە هەیە یا یێ داویێ بۆ سولتانی هنارتی و تێدا دبێژیت کو بەهرامێ برایێ وی و هژمارەکا دی یا ئەشقیایێن

خرابکار ژ وانا عەلی حەمزە زێدەگاڤییان دکەن و بەردەوامن ل سەر سەردابرنا خەلکی و وان بەرەڤ پشتەرێبوونێ هانددەن، د دەقێ فەرمانێ دا هاتییە کو دڤێت ئەو میرە د ناڤبەرا خۆدا پێکبهێن و د هەڤگرتی بۆ گرتنا وان ئەشقیا و سزادانا وان ل دووڤ شەریعەتی، ژ هژمارا وان (والی و میر)ێن هاتینە راسپاردن بۆ ب جهئینانا وێ فەرمانێ کو ئێک ژ وان میرێ میرێن بەغدا بوو، وەسا دیار دبیت کو مەسەلە وەکی ژ ناڤبرنا شۆڕشەکا ب راستا بیت یا دەڤەرێن بەرفرەهێن کوردستانا باکوور و باشوور ڤەگرتی.

جهێ حێبەتیبوونێ ژی ئەوە دەولەت ب ڤی ئاوایی پشتا خۆ ب سکالا قوباد بەگێ گەرم بکەت، چونکی چ بەهانە بۆ وێ چەندێ نەبوون، ئەرێ ئەو بەهرامێ ژ ب دەستڤەئینانا حوکمێ میرگەها بابێ خۆ بێ هیڤی بووی شیایە رێبەرییا شۆڕشەکا مەزن یا هۆسا بەرفرەه بکەت کو بۆ ژ ناڤبرنا وێ پێتڤی ب کار و ئەرکێن وان هەمی والی و میران بیت؟!

ئەڤە ئەو تشتە یێ وان بەلگەنامەیان رۆهن نەکری، لێ دشێین ل دووڤ وێ مگرتیێ بچین کو ب راستا بەهانەیێن هەلبوونا شۆڕشەکێ هەبووینە، چونکی دەولەت ل سەر رازیکرنا بەهرام یا رژد نەبوو و لیوایەکا دیاربەکرێ رادەستی وی نەکر و ئەو مەسەلە پاشئێخست (هەتا وی دەمێ ڤالاتی هەبیت)، کو ئەڤە ژی مەسەلەیەکا دەستنیشان نەکرییە، هەروەسا پشتەڤانییا عەشیرەتا زێبار بۆ وی هەروەکی ئەو بەلگەنامەیا ئۆسمانی دیار دکەت و پشتەڤانییا عەشیرەتا مزووری (کو گرنگترین عەشیرەتە ل وێ دەڤەرێ) هەروەکی شەرەفنامە ئاماژەیێ بۆ دکەت[٢٥]، نیشانە بۆ هێزا هەڤپەیمانی یێن عەشیرەتان یێن بەهرام ل وان دەڤەران شیای پێک دینیت، کو ئەڤە بۆ وی ببوو هاندەر ل شوونا داخوازکرنا حوکمی، داخوازا بزاڤەکا بەرفرەها وەسا بکەت یا دەستەلاتا ئۆسمانی گەلەک ژێ بترسیت.

ئەڤە د بەلگەنامەیا رۆژا ٣ رەمەزانا ٩٨٦مش/١٥٧٨ز دا[٢٦] پشتڕاست دبیت کو فەرمانەک تێدا هەیە (بۆ قوباد بەگێ حوکمدارێ ئامێدیێ هاتییە ئاراستە کرن

و پەیوەندی ب کرارێن خرابکاری یێن تیرەیەکا کوردێن ئامێدیێ ل مووسل و دەڤەرێن وێ ڤە هەیە هەروەکی دادوەرێ مووسلێ بۆ سولتانی بەرچاڤکری)، د وێ فەرمانێ دا هاتییە کو (دڤێت کوردێن ئەشقیایێن ل وەلاتێ وی بهێنە دەستەسەر کرن و هەمی رێکارێن پێتڤی بهێنە ب کارئینان بۆ ژناڤبرنا چالاکی یێن وان یێن خرابکاری)، هەروەکی دیارە ژی مەبەست ژ (تیرە) عەشیرەتێن کورد بووینە یێن خۆداینە دگەل بەهرام بەگێ یێ ب ئاوایەکێ چەکداری داخوازا حوکمێ میرگەها بەهدینان دکر، ناڤئینانا وان ب ئەشقیا و و سالۆخدانا بزاڤا وان ب (چالاکیێن خرابکاری) یا گونجای بوو دگەل سکالایێن قوباد بەگێ برایێ وی و هەڤپەیمانێن وی و دەربرین بوو ژ ئاستێ وێ هەڤرکییا ل ناڤبەرا ل ناڤبەرا هەردو برایان گەهشتیێ کو هەڤرکییەکا دژوار و توندوتیژ بوو.

مەسەلە نەتنێ ب پشتەڕێبوونا بەهرام بەگێ راوەستییا، بەلکی بەرفرەه بوویە و لایەنێن دی یێن بنەمالا بەهدینانی ڤەگرتیە، هەر بۆ نموونە، د بەلگەنامەیا رۆژا ٢٢هەر وێ هەیڤێ دا[٢٧] (فەرمانەك هەیە و ئاراستەی قوباد بەگێ حوکمدارێ ئامێدیێ هاتییەکرن کو پەیوەندی ب نڤیسارەکا وی ڤە هەیە یا ئاراستەی سولتانی هاتییەکرن و تێدا دبێژیت کو هندەك کەس وکار و دووڤکەڤتیێن وی پشتەرێ بووینە، ژ وانا: سەید قاسم و شاه روستەم و داخوازێ ژ سولتانی دکەت فەرمانەکا بلند دەربێخیت بۆ ژ ناڤبرنا وان)، د دەقێ حوکمی دا هاتییە کو (هەر کەسێ خۆ ل سەر فەرمانێن بلند ئاسێ کری و پشتەڕێبوون ل سەر کری، پێتڤییە بهێتە دەستەسەرکرن و زیندان کرن و ستەنبۆل ب وێ چەندێ بهێتە ئاگەهدار کرن و هەمی هوورکاری بۆ بهێنە دیار کرن)، ڤێجا هەکە مە زانی سەید قاسم کورێ سولتان حەسەنێ میرێ بەهدینانە و شاه روستەم ژی کورێ کورێ سلێمان بەگێ کورێ سولتان حەسەن ب خۆیە، دەملدەست دێ مەترسییا وێ تیکێ (دەرزێ) بۆ مە دیار بیت یا کەڤتییە بنەمالا حوکمدار، بەلگەنامەیا رۆژا ٤شەعبانا ٩٨٣مش/١٥٧٥ز[٢٨] دیار دکەت کو وان کەسان دەرمالەیێن دارایی هەنە ژ بەرکو ژ بنەمالا حوکمدارن، لێ یێ رازی نەبووینە، هەروەکی بەلگەنامە وێ چەندێ دیار دکەت، کو فەرمانەك تێدایە و ژ سولتانێ ئۆسمانی مرادێ سیێ (٩٨٢-١٠٠٣مش/١٥٧٥-١٥٩٤ز) دەرکەڤتییە و تێدا هاتییە کو ل سەردەمێ باپیرێ وی خودێ ژێ رازی سولتان سلێمانێ قانوونی فەرمانەکا بلند بۆ دەستەسەرکرن و سزادانا وان دەرکەڤتبوو و فەرمانێ ددەتێ ناڤەرۆکا وێ حوکمی بجهـ بینن و داکو زۆری و کوتەکیێ ل خەلکی نەکەن و دەستدرێژیێ نەکەنە سەر مافێن وان).

ژ بەرکو ئەڤ هەڤرکییە ببوونە ئەگەرێ لاوازبوونا میرگەهێ و زیان گەهاندبوو سەهم و سەنگا وێ ل ناڤ میرگەهـ و هێزێن هەڤسوو، قوباد بەگ بزاڤ کر هندەك هەڤپەیمانێن دی بۆ خۆ ژ وان هێزان چێ کەت یێن هەتا رادەیەکێ دووری هێتوونا وان هەڤرکییان بوون، ب ڤی ئاوایی وی پشتەڤانییا میرێ لاجان (لاریجان) یێ ل سەر سنوورێ خۆیێ رۆژهەلات کر دەمێ میرێ شارەزوور پێکۆلا لادانا وی کری، د بەلگەنامەیا رۆژا ١٠هەیڤا (ربیع الاخر) یا سالا ٩٨٤مش/١٥٧٦ز دا[٢٩] فەرمانەك هەیە کو ئاراستەی میرێ میرێن شارەزوور هاتییە کرن و تێدا هاتییە کو (ل دووڤ نڤیسارا وی یا بەرێ یا بۆ سولتانی هنارتی، میرێ لیوا لاجان عومەر ـــ هەر یێ سەرفەراز بیت - ژ پۆستێ وی هاتییەلادان ئەڤە ژی ژ بەر وێ زۆلم و زۆرییا برا و زەلامێن وی ل خەلکی کرین و وان دەستدرێژیێن کرینە سەر مافێن وان، لیوا لاجان رادەستی حسێن میرێ لیوا کۆیە - هەر یێ سەرفەراز بیت - هاتییە کرن، میرێ بەرێ محەمەد - هەر یێ سەرفەراز بیت - ل لیوا کۆیە هاتییە دامەزراندن، لێ قوباد بەگێ حوکمدارێ ئامێدیێ - هەر شکۆدار بیت - نڤیسارەك ئاراستەی سولتانی کرییە و تێدا پشتگیرییا عومەر کرییە - هەر یێ سەرفەراز بیت - و تێدا گۆتییە: ئێکێ دی نەشێت کۆنترۆلێ ل سەر کاروباران بکەت و کاروبارێن لیوا لاجان ب رێڤە ببەت و مانا وی ل وی پۆستی چێتر و باشترە ژ دامەزراندنا ئێکێ دی ل وێ

لیوایێ)، د دەقێ فەرمانێ دا هاتییە کو (دووبارە بۆ لیوا خۆ بێتە ڤەگەڕاندن و میر حەسەن ـــ هەر یێ سەرفەراز بیت ـــ وەکی بەرێ ڤەگەڕینتە لیوا کۆیە، لێ میر محەمەد دێ لیوایەکا گونجای ل وان دەردۆران بۆ هێتە دابینکرن).

ل سەر تشتێ پەیوەندی ب ڤێ مەسەلێ ڤە هەی، قوباد بەگ یێ نەرم بوو دەمێ هندەك عەشیرەتێن میرگەها وی دەوار و بارگیر فرۆتینە ئیرانییان، ژ بەرکو ئەڤە ژێدەرەکێ ئابووریێ وان عەشیرەتان بوو، د بەلگەنامەیا رۆژا ٢٤ رەجەبا سالا ٩٨٤مش/١٥٧٦ز[30] دا فەرمانەك هەیە کو ئاراستەی (قوباد بەگێ حوکمدارێ ئامێدیێ) هاتییە کرن و تێدا هاتییە کو (وی پەیوەندی ب سولتانی کرییە ئەو پێحەساندییە کو ئەیالەتا وی هێستر و هەسپان دفرۆشیتە ئیرانییان، هەرچەندە کو فرۆتنا وان بارگیران بۆ وان ل سەر رێپێدانا تایبەتییا سولتانی راوەستایە و فەرمانێ ددەتێ سولتان دەستووریا وی بدەت بەری دەست ب فرۆتنا وان بارگیران بێتە کرن).

سەرباری ڤان هووركاری یێن ڤان بەلگەنامەیێن ئۆسمانی ل سەر میرگەها بەهدینان پێشکێش کرین کو د بەلگەنامەیێن دی یێن وی سەردەمی دا ناهێنە دیتن، لێ تشتێ تێدا ب دەست ناکەڤیت ئەوە چ تشتێ وەسا تێدا نابینین کو رەوشا ب داویهاتنا هەڤڕکییا ل ناڤبەرا هەردو بران و داوییا حوکمێ قوباد بەگ رۆهن بکەت، لێ دبیت بەدلیسی[31] ئەڤ چەندە رۆهن کرییت دەمێ کورتییەکا دیرۆکی ل سەر رووداێن پشتی هنگی پێشکێش دکەت، کورتییا وی گۆتی ئەوە کو بەهرام نەچار بوویە قەستا ئیرانێ بکەت و ل وێرێ (دەلیڤە بۆ چێ بوو سەرەدانا شاه ئیسماعیل بکەت و شیا هندەك ژڤانێن باش و هندەك سۆزێن هەژی ژێ ب دەسڤەبینیت)، لێ پشتی چەند رێزەکان، بەدلیسی ب خۆ دبێژیت کو بەهرام یێ زیندانکری بوو ل نك شاهـ محەمەدێ، لێ رۆهن نەکرییە چەوان مێڤان بوویە زیندانی و ئەو سۆزێن ئیرانی چ بووینە یێن شاهێ ئیرانی داینێ، کو ب راستی چ بەرهەمێ خۆ نەبووینە، بەلکی تنێ زیندانکرنا وی بوو ل کەلایەکا ڤەدەر یا ئیرانێ.

هەر چەوان بیت، بەهرام بەگ شیا پشتەڤانییەکا سەربازی ژ زەینەل بەگێ حوکمدارێ هەکاری ب دەستڤە بینیت یێ ئەو ژ زیندانێ ئازادکری پشتی گوژمەکێ مەزن یێن پارەی پێشکێش کری و پاشی جارەکا دی قەستا ئامێدیێ کری بۆ داخوازکرنا حکومەتا میراتەیا خۆ، وەسا دیارە ژێ هندەك گوهۆرینکاری یێن وەسا هاتبنە روودان ببنە پالدەر کو قوباد بەگ باژێرێ خۆ بهێلیت و برەڤیتە مووسل و ژ وێرێ ژی بچیتە دیاربەکرێ و پاشی قەستا ستەنبۆلێ بکەت کو سۆزەك ب دەستڤەئینابوو هاریکارییا وی بهێتە کرن ببیتە حوکمدارێ ئامێدیێ، لێ ڤێ جارێ کێشە ل ناڤبەرا وی و هەڤڕکەکێ دی یێ بنەمالا وی چێ بوو کو ئەو ژی سلێمان کورێ بایرام کورێ سەیفەددین بوو یێ رێبەرییا عەشیرەتا مزووری دکر، وان هەیامەکێ قوباد ل کەلا دهۆکێ دووریێچ کر و شیان وی و کورەکێ وی و هژمارەکا هاریکارێن وی بکوژن، ب ڤێ چەندێ حوکمێ وی ل بەهدینان ب داوی هات و دەلیڤە بۆ بەهرامێ برایێ وی یێ دوژمن پەیدا بوو پشتی وی حوکمدارییا میرگەهێ بکەت.

## سلێمان خان بەگ کورێ بایرام بەگ کورێ سەیفەددین:

ل سالا ٩٨٤ ی مش/١٥٧٥ی.ز ب پشتەڤانییا عەشیرەتا مزووری حوکمدارییا میرگەهێ کر پشتی پسمامێ وی قوباد بەگ لادای، دڤیا وی هەر ل دەستپێکا حوکمدارییا خۆ هەڤڕکی دژی قوبادێ ناڤبری و بایرام بەگێ برایێ قوباد کربا کو وی ژی داخوازییا حوکمی دکر، هندی قوباد بوو گۆڕەپان هێلا و بەرەڤ مووسل و شنگال رەڤی، لێ بایرامی حوکمدارییا زاخۆ ب دەستڤە ئینا، لێ هەر زوو خۆ ل بەر روودانان ڤەنساند و چاڤدێرییا پێشهاتێن وان روودانان کر، ل داویێ ژی قوباد شیا قەستا ستەنبۆلێ بکەت و ل وێرێ پشتەڤانییەك ب دەستڤەئینا داکو وەك میرێ ئامێدیێ بێتە دامەزراندن، وەسا دیارە وی

هاریكارییەكا سەربازی ژی ب دەستڤەئینایە، چونكی هەر زوو دەمێ گەهشتییە دهۆك، دەست ب لێدانا عەشیرەتێن دژی خۆ كر، سلێمان خان ژی هەست ب مەترسیێ كر كو گەف بوو ل سەر حوكمێ وی، ئینا دگەل میر مەلك رێبەرێ عەشیرەتا مزووری رێككەڤت بۆ بەرسینگگرتنا نەیارێ وی یێ هاتی، سلێمان خان دگەل هەڤپەیمانێ خۆ هێرش كرە سەر كەلا دهۆكێ كو قوبادێ ناڤبری خۆ لێ ئاسێ كربوو، سلێمان خان شیا لایەنگریا ئاكنجیێن كەلایێ بۆ خۆ ب دەستڤە بینیت، ئینا وان دەرگەهێ كەلاێ بۆ ڤەكرن و قوباد و كوڕەكێ وی و هندەك هاریكارێن وی هاتنە دەستەسەركرن و دەملدەست سێدارەدان. ڤەگێڕانا بەدلیسی یا پشتی هنگی هندەك شەپرزەیی پێڤە دیارە یان ژی هندەك هووركاری ژێ دكێمن بۆ رۆهنكرنا وی تشتێ هاتییە روودان، ئەو دبێژیت: (دەمێ دەنگ وباسێ ڤی شەڕی گەهشتییە بایرام، ئەو رەڤی زاخۆ داكو بگەهیتە عەشیرەتێن پشتەڤانێن خۆ)، لێ وی ئەگەرێ رەڤینا وی نەگۆتییە، دبیت ژی ترسیابیت نەكو چارەنڤیسێ وی وەكی چارەنڤیسێ برایێ وی لێ بهێت و دبیت ژی ڤیابیت خۆ بۆ روو ب رووبوونا سلێمان بەگ و هەڤپەیمانێن وی یێن مزووری ئامادە بكەت، لێ سەرهاتی ئاماژەیێ دكەتە تشتەكێ دی یێ ب تەمامی ژێ جودا، وی گۆتییە كو سلێمان و میر مەلك چووینە نك وی و ئەو ئینایە و حكومەتا ئامێدیێ رادەستی وی كرینە، وی ژی ژ نەچاری یان ژی نەژدل حوكم لێ كرییە، بێی هندێ شرۆڤەیەكێ بۆ ڤی هەلویستێ هەڤدژ پێشكێش بكەت، بەلكی خۆ بێدەنگ كرییە و دیار نەكرییە كا ژ بەر چ سلێمان خان دەست ژ حوكمداریا ئامێدیێ بەردایە، پشتی گەهشتییە وی پۆستی و پشتەڤانییا عەشیرەتا مـزووری ب دەستڤەئینای كو ئێكە ژ گرنگترین عەشیرەتێن وێرێ، هەروەسا دیار نەكرییە ژی كا بۆچی مزووریان ژ نشكێڤە دەست ژ لایەنگریا سلێمان خان بەردایە و لایەنگریا بایرام كرییە، دیسا رۆهن نەكرییە كا بۆچی یێ ئێكێ ل سەر مەرجێن دژبەرێن خۆیێن بەرێ رازی بوویە بۆ وەرگرتنا حوكمێ

كێلیا گۆڕێ سلێمان خان بەگێ.



میرگەهێ، هەروەسا چەوان ژ هەردوان پشتڕاست بوویە كو بەری هنگی ژ ترسان ژ بەر وان رەڤی بوو، ب زەحمەتە ژی وەسا بینینە پێش چاڤێن خۆ كو وی پۆستێ میرگەهێ نەڤیابیت كو وان ب خۆ ئەو وەك میرێ خۆ ژێكرتبوو.

ژێدەر زانیاریێن وەسا نادەنە مە چارەنڤیسێ سلێمان خان دیاربكەن پشتی وی ب خۆ رێیا دەستبەردان ژ حوكمی بۆ خۆ ژێكرتی، هەمی تشتێ ژێ دزانین ئەوە كو وی قەسرەك بۆ (حەبیبە خان) ا دەیكا خۆ ئاڤاكرییە لێ ژێدەرێن سەردەمێ وی یێن سالا ١٠٩١مش/١٦٨٠ز چ ئاماژەیان بۆ ناكەن، هەروەسا ژێدەرێن دیرۆكی ژی خۆ ژ دیاركرنا سالا مرنا وی كڕ كرینە[٣٢]، لێ مە كێلیا گۆڕێ وی ل گۆڕستانا سولتانیێ ل ئامێدیێ دیتییە و سالا مرنا وی ل سەرە كو سالا ١٠٢٠ ێ مشیە[٣٣].

## سولتان سیدی خان:

رەوشا ململانێیا دژوار ل ناڤبەرا هەردو برا قوباد بەگ میرێ بەهدینان و هەڤرکێ وی بەهرام بەگ ل داویێن سەدسالیا دەهێ مش شازدێ ز بوو ئەگەرێ لاوازبوونا سەهم وسەنگا بنەمالا حوکمدار نەتنێ ل ناف عەشیرەتێن کوردی یێن هەڤپەیمانی دگەل وێ بنەمالێ هەین، بەلکی ل ناف ناڤەندێن حوکمدارێن ل ستەنبۆل ژی، ژ بەر هندێ، ل سەردەمێ حوکمێ بەهرام بەگ (پێ پشتی کوشتنا قوباد بەگ ب دەستێ هەڤرکێ سیێ ل کەلا دهۆکێ ل دۆرێن سالا ٩٨٨ ێ مش/ ١٥٧٩ ێ ز هاتییە سەر حوکمی) ئارێشەیێن سیاسی یێن کاریگەر پەیدابوون، کو یا ژ هەمیان دیارتر پیلانگێڕییا سیدی خان بەگێ کوڕێ قوباد بەگێ بوو دەمێ سولتانێ ئۆسمانی مرادێ سیێ (٩٨٢-١٠٠٣مـــش/١٥٧٤-١٥٩٤ز رازی کری کو ئەو ژ بەهرامێ مامێ خۆ هەڤترە حوکمێ بەهدینان بکەت.

پێ داویێ ژی (ئانکو بەهرام) هند زیرەکییا سیاسی نەبوو بشێت ب سەر سەرەداڤێن وێ پیلانگێڕیێ هەلبیت یا ل دژی وی دهێتە راچاندن، ئینا ل سەر فەرمانا سولتانی رازی بوو پشکداریێ د هەوا ئۆسمانی دا ل بەرەیێ گورجستانێ بکەت، هەڤدەم فەرمان بۆ (میرێ میرێن بەغدا و میرێ میرێن شارەزوور و هەمی میر و حوکمدارێن کوردستانێ) دەرکەڤتن کو هاریکارییا سیدی خان بکەن داکو بچیتە ئامێدیێ پایەختێ میرگەهێ و حوکمدارییا وێ بکەت، ب راستی ژی ل نیڤا هەیڤا (ذی الحجە) یا سالا ٩٩٣مش/١٥٨٤ز[٣٤] حوکمداری ل وێرێ کر، بەهرام ب خۆ ژی ژ لایێ فەرهاد پاشایێ سەرکردێ ئۆسمانیێ بەرەیێ گورجستانێ ڤە هاتە دەستەسەرکرن و رادەستی سیدی خان کر و وی ژی وەك تۆلڤەکرنا بابێ خۆ ئەو کوشت[٣٥].

ب ڤی ئاوایی حوکمێ پێ داویێ (ئانکو سیدی خان) دەست پێ کر داکو ببیتە ئاماژەیەك بۆ قووناغەکا نوویا قووناغێن پەیوەندیێن میرگەها بەهدینان دگەل دەستەلاتا ناوەندییا ئۆسمانی، کو د ڤێ قووناغێ دا مایتێکرنا دەستەلاتا ناڤبری د کاروبارێن ناڤخۆیی یێن میرگەهێ دا بەرچاڤتر بوو.

بەلگەنامەیێن ئۆسمانی یێن وی سەردەمی بەحسێ هندەك لایەنێن حوکمێ سیدی خان دکەن کو لایەنێن هەڤشێوەیێن وەسا ژ ژێدەرێن دی یێن هەڤچەرخ دا نابینین، ئێکەمین بەلگەنامە ژی یا رۆژا ٢٨ شەعبانا سالا ٩٩٩مش/١٥٩٠ز یە[٣٦] و فەرمانەك تێدایە کو ژ سولتانێ ئۆسمانی دەرکەڤتییە و ئاراستەی حوکمدارێ ئامێدیێ سیدی خان و هەردو دادوەرێن ئامێدیێ و مووسل هاتییە کرن و پەیوەندی ب نڤیسارەکێ ڤە هەیە یا ژ میرێ مووسل مەلك ئەحمەد ـــ هەر د خۆشییان دا بیت ـ[٣٧] گەهشتییە سولتانی و تێدا دبێژیت کو هەژدە ئەشقیایێن تیرەیا داسنی هێرش کرینە سەر کوڕێ میر فەرهادی دەمێ دگەل هندەك زەلامێن خۆ ژ ئامێدیێ ب رێیا خۆ بەرەڤ مالا خۆ دچوو و ئەو و چوار زەلامێن وی کوشتینە و پارەیێن وان ژی برینە... د دەقێ حوکمی دا هاتییە کو پێتڤییە ئەو تاوانبار بێنە دەستەسەرکرن و ل دووڤ شەرعێ دادپەروەر بێنە دادگەهکرن و حوکم ل سەر بێتە دان، لێ بەلگەنامەیێ ناسنامەیا ڤی فەرهادی رۆهن نەکرییە و دیار نەکرییە ژی بۆچی ب دەستێ وان داسنییان هاتییە کوشتن.

بەلگەنامەیەکا دی ژی کو رۆژا ١٠شـــەوالا سالا ٩٩٩مـــش/١٥٩٠ز[٣٨] ل سەرە ئاماژەیێ دکەتە فەرمانەکا بۆ سیدی خان و هژمارەکا میران دەرکەڤتی، ژ وانا: میرێ میرێن شارەزوور، میرێ میرێن مووسل، میرێ سۆران، میرێ قەرەداغ، حەسەنێ میرێ میرێن بەرێ و میرێن هندەك لیوایێن دی، فەرمانێ ژ ناڤبرنا تیرەیا داسنی ددەتێ ل جهەکێ د ناڤبەرا مووسل و هەولێری دژیت ل سەر کنارێ رووبارەکێ ل وێرێ ب ناڤێ زابدە (هۆسا هاتییە، دبیت زابدە بیت هاتبیتە گوهۆرین کو رووبارێ زێ یە) ژ ناڤ ببەن.

هـەروەسـا بەلگەنامەیەکا دی کو هەیڤا موحەررەما ١٠٠١مش/١٥٩١ز ل سەرە[٣٩] فەرمانەك تێدا هەیە کو ئاراستەی حوکمدارێ ئامێدیێ هاتییە کرن، هەرچەندە ناڤێ وی نەئینایە، لێ ئەو سیدی

خان ب خۆیە، چونکی ئەو بەلگەنامە ل سەردەمێ وی دەرکەفتییە، ئەو فەرمان میرێ ناڤبری رادسپێریت بەرهەڤیان بۆ وێ هەوا سەربازی بکەت یا ب سەرکردایەتییا خدر بەگێ میرێ میرێن بەغدا[٤٠] دژی (موبارەکێ خرابکار) دهێتەکرن کو مەبەستا وی پێ موبارەکێ موشەعشەعی یێ حوکمدارێ دسەفۆل(دیزەفول) و حویزەیە ل وارێ ئەهواز و دڤێت (ئەو دگەل زەلام و دووڤکەفتی و عەشیرەتێن خۆ ل نك وی ئامادە ببیت و ل بن سەرکردایەتییا وی کار بکەت و هەمی شیانێن خۆ ب کار بینیت بۆ ب جهئینانا هندەك خزمەتێن بەهانە بۆ هەبن سەخمەراتی دەولەت بلند).

وەسا دیارە ژی کو هەلویستێ عەشیرەتا زێبار یا پشتەڤانییا بەهرام بەگێ دکر دژی رێبەرییا قوباد بەگێ بابێ سیدی خان، هێشتا ب داوی نەهاتبوو، هەروەسا کەرب وکینا پشتەڤانییا وێ عەشیرەتێ بۆ وی میری ئازراندی هێشتا مابوو خۆ پشتی سیدی خان ب خۆ ژی بوویە حوکمدارێ میرگەهێ، هەر بۆ نموونە، فەرمانەك د بەلگەنامەیا هەیڤا شەوالا ١٠٠١مش/١٥٩٢ز داهەیە[٤١] (کو پەیوەندی ب دەستەسەرکرنا هەمزە ئاغایێ عەشیرەتا زێبار هەیە ژ بەر نەگوهداری و ڤاریبوونا وی ل سەر حوکمدارێ ئامێدیێ و تێدا هاتییە کو فەرمانێن بلند و فەرمانێن بلند بۆ میرێ میرێن مووسل، دیاربەکرێ، حوکمدارێ جزیرێ ــ بۆتان ــ، هەکاری، بەدلیس و یێن دی دەرکەفتینە بۆ ژ ناڤبرنا وی ئەشقیێ ناڤبری و زەلام و هاریکارێن وی، هەروەسا وی حوکمی داخوازنامەیەك ئاراستەی حوکمدارێ ئامێدیێ کرییە بۆ نەهێلانا ناکوکی و بۆ پێگیریکرنێ ب لایەنێ گوهداریکرنێ، لێ هەکە وێ چەندێ نەکەت، دێ نامەیەکێ بۆ میر و حوکمدارێن ناڤبری هنێریت و دێ داخوازێ ژێ کەت ل سەر وێ رێچکێ بچن بۆ ژ رەهـ و رویشال هەلکێشانا زێدەگاڤی و خرابکاری یێن وی).

ژ ناڤەرۆکا بەلگەنامەیێ دیارە کو ئەڤ شۆرشا زێبار ژ دەڤەرێن رەسەنێن خۆ یێن میرگەها بەهدینان دەرباز ببوو و دەڤەرێن دوور ژی ڤەگرتبوو، وەکی: دیاربەکر، بۆتان، هەکاری و بەدلیس ل کوردستانا باکوور، چ شرۆڤە ژی بۆ لەزاتییا ڤێ بەلاڤبوونێ نینن یا شۆرشا وان ب دەستڤەئینای، بەلکی تنێ ژ بەر سەرکەفتنا وان بوویە د گرێدانا هەڤپەیمانی یێن نوو دا دگەل عەشیرەتێن وان دەڤەران، هەروەسا هندەك ئەگەرێن هەڤپشك ژی هەنە کو هەتا نۆکە باش ددیار نینن کو ل وێرێ ببوونە ئەگەرێ هەلبوونا گوریا شۆرشێ دژی دەستەلاتا ئۆسمانی. ئەم د وێ باوەرێدانە شۆرشا زێبار هەژی هندێ یە ڤەکۆلەر ل سەر راوەستێن کو ژێدەر ل سەر هەنە و ئێك بوویە ژ سەرهلدانێن زۆر یێن کورد ل سەردەمێ ئۆسمانی پێ رابووین و ژێدەرێن وی سەردەمی خۆ ژێ بێدەنگ کرینە، یان ژ بەر هەر ئەگەرەکێ بیت رۆهنکرن ل سەر نەدانە.

پێتڤی بوو میر سیدی خان هاریکاریا سەربازی پێشکێشی هەوا ئۆسمانی کربا یا ل سالا ١٠١٢ مش/١٦٠٣ز ب سەرکردایەتییا نەسوح پاشایێ والیێ دیاربەکرێ پێشرەوی بەرەڤ بەغدا کری بۆ ژ ناڤبرنا بزاڤەکا خۆسەریێ یا ئێك ژ سەرکردێن وی یێن سەربازی پێ رابووی کو ناڤێ وی (محەمەد کورێ ئەحمەد الطویل) بوو[٤٢]، ب راستی ژی میری پشکداری د وی هەوێ دا کر، لێ وی ژ بنڤەبنڤە تشتەکێ دی دکر، وی ب ئاوایەکێ نەپەنی هاریکاری دگەل کورێ (الطویل) دکر، کو ئەڤە ببوو ئەگەرێ شکەستنا ئۆسمانییان و بریندارببوونا نەسوح پاشا ب خۆ ژی و پاشی خۆڤەکێشانا وی بۆ بەغدا، نامەیەك گەهشتە نەسوح پاشا کو سیدی خان ب ئاوایەکێ نەپەنی بۆ (الطویل) هنارتبوو و تێدا نەرازیبوونا خۆ ژێ دەربری بوو ژ بەر وێ هاریکاریا بۆ دوژمنێ وی کری، لێ سەرباری هندێ، ئەم چ ئاماژەیان د رووداێن دیرۆکی دا نابینین کو سیدی خان سەرا ڤی هەلویستێ خۆ بەرهنگاری چ سزایان ببیت، گرۆڤە ژی بۆ وێ چەندێ ئەوە کو دەولەتا ئۆسمانی جارەکا دی پشتا خۆ پێ گەرم کربوو دەمێ هەوەکا مەزن ب سەرکردایەتییا حافز ئەحمەد پاشایێ میرێ دیاربەکرێ ئامادەکری بۆ ژ ناڤبرنا پشتەرێبوونا بەکر

سۆباشی ل بەغدا ل سالا ١٠٣٢مش/١٦٢٢ز، بەلکی سیدی خان راسپاردبوو ژی نامەیەکێ ژ یێ داویێ وەرگریت و رادەستی وی پشتەڕێی بکەت داکو رازی ببیت و دەست ژ پشتەڕێبوونا خۆ بەردەت و ب دانا حوکمداریا بەغدا بۆ وی وی دسەرداببەن[٤٣].

هەرچەندە ژێدەران خۆ ژ چارەنڤیسێ سیدی خان بێدەنگ کریە پشتی پشتەڕێبوونا سوباشی بوویە ئەگەرێ وێ چەندێ دووبارە بەغدا ژ لایێ ئیرانێ ڤە بهێتە داگیر کرن، لێ تشتێ مسۆگەر ئەوە وی دگەل هێزێن ئۆسمانی یێن خۆڤەکێشای، خۆڤەکێشایە پایتەختێ میرگەها خۆ ل ئامێدیێ و ل وێرێ هاتیە راسپاردن پشتەڤانیا بەرەیێ ئۆسمانی ل کوردستانێ بکەت، نەخاسمە ژی پشتەڤانیا میرێن لیوایێن سنووری یێن دهاتە پێشبینی کرن ئەو لیوا بەرهنگاری مەترسیا هێرشێن ئیرانێ ببن، گرۆڤە ژی بۆ ڤێ چەندێ، د بەلگەنامەیا رۆژا ٢٣ ی (ذی القعدە) ١٠١٩مش/١٦١٠ز دا[٤٤] فەرمانەك هەیە کو ئاراستەی سیدی خانێ حوکمدارێ ئامێدیێ - هەر یێ شکۆدار بیت - هاتیە کرن و تێدا هاتیە کو گەلالی - هەر یێ سەرفەراز بیت - میرێ میرێن لاجان نامەیەك بۆ سولتانی هنارتیە و تێدا گۆتیە کو لیوایا وی ل سەر سنوورییە و ئەڤ لیوایە رادەستی وی هاتیەکرن بەرامبەری وان خزمەتێن وی بۆ دەولەتا بلند کرین و ئەو ل نێزیکی دوژمنییە و دبیت ئەڤ دوژمنە دەستدرێژییەکێ بکەتە سەر، ژ بەر هندێ، پێتڤیی هاریکاریێ یە بۆ بەرسینگگرتنا وی دوژمنی، د دەقێ وێ فەرمانێ دا هاتیە کو داخوازیا وی بێتە ب جهئینان و دهەوارا وی بچن دەمێ پێتڤی وێ هاریکاریێ دبیت).

وەسا دیارە ژی کو هێزێن میرگەها بەهدینان شارەزایی د شەڕێن ئەهوارێن باشوورێ عیراقێ دا پەیداکربوو، هەتا وەلێ هاتین جارەکا دی سولتانێ ئۆسمانی د شەڕێن وەك وان هەر ل وێ دەڤەرێ پشتا خۆ پێ گەرم بکەت، هەر بۆ نموونە، ل سالا ١٠٠١ مش/١٥٩٢ز سەید موبارەکێ حوکمدارێ دیزەفول و حویزە کو ئێك بوو ژ میرێن موشەعشەعی یێن وێرێ، هژمارەکا کەسێن بەلگەنامەیا رۆژا ئێکی موحەررەما وێ سالێ[٤٥] ب (ئەشقیا و رێگر) ناڤکرین کۆمکربوون بۆ (دەستدرێژیکرنێ ل سەر بازرگان و رێڤینگان ل سەر رێ یێن بەغدا و بەسرا)، د وێ بەلگەنامەیێ دا داخوازنامەیەك هەیە کو ئاراستەی (حوکمدارێ ئامێدیێ) هاتیە کرن داکو (پشکداریێ د هەوەکا سەربازی دا بکەت دژی موبارەکێ خرابکار) کو میرێ میرێن بەغدا ئامادەکاری بۆ وێ هەوێ دکر و پێتڤییە (ئەو و زەلام و دووڤکەڤتی و عەشیرەتێن خۆ ل نك وی ئامادە ببن) و ل بن سەرکردایەتیا وی کار بکەن بۆ ژ ناڤبرنا وی موبارەکێ ناڤبری، بێی هندێ ئەو بەلگەنامە ناڤێ ڤی حوکمدارێ ئامێدیێ دیار دیار بکەت، کو بێگومانە دێ سولتان سیدی خان بەگ بیت. دڤێت ژی ئەم زەحمەتیا پشکداریکرنا وان هێزان د شەڕێن ل دەڤەرێن ئەهوار و گەران (زەلکاوان) دا دهێنە کرن دانینە بەر چاڤێن خۆ کو ئەو دەڤەر مشتی لەڤەن و قەرەمن و پلا گەرمێ لێ بلند دبیت و رێژەیا شهێ هەتا رادەیەکی لێ زێدە دبیت، کو پتریا سوارێن وان هێزان ل سەر شەڕێن چیایی د سەقایەکێ پتریا جاران سڕوسەقەم دا هاتبوونە مەشقدان، بێگومان ژی ئەو هێزە د شەڕێن بەسرا دا (یێن هاتینە بەحس کرن) ببوونە خودان سەربۆر و شارەزایی وەرگرتبوون و وەلێ هاتبوون بشێن دگەل ڤێ ژینگەها نوو رابهێن کو نەوەکی خۆڕست و سەقایێ ژینگەها وان بوو.

## میر یوسف خان کوڕێ سولتان سیدی خان بەگێ:

ناڤبری ژ سالا ١٠٤١هەتا ١٠٤٨مش/١٦٣١-١٦٣٨ز حوکم ل میرگەها بەهدینان کریە، ژێدەرێن دیرۆکی یێن خۆجهی چ زانیاریان ل سەر وی پێشکێشی مە ناکەن، لێ ژێدەرێن ئوسمانی دیار دکەن کو وی رۆلێن گرنگ د ئۆپەراسیۆنێن زڤراندنا مووسل و کەرکوك دا ژ بن کۆنترۆلا سەفەویان هەبووینە بەری مرادێ چوارێ ل عیراقێ ل سالا ١٠٤٨مش/١٦٣٨ز دەست ب

هەوا خۆیا مەزن بکەت.

هەر بۆ نموونە بەلگەنامەیا رۆژا ١٥ ی شەعبانا ١٠٤٦مـــش/١٦٣٦ز[٤٦] فەرمانەك تێدا هەیە کو ئاراستەی حوکمدارێن مەهران، ئامێدیێ، بابان و تاووس هاتییە کرن کو پێتڤییە کوردان رۆلەکێ دیار و بەرچاڤ د وان شەراندا هەبن (یێن پەیوەندی ب کاروبارێن بەرگریکرنێ ژ مووسل و کەرکوك ڤە هەین) هۆساهاتییە، ئەڤە ل وی دەمێ کو وی سەردەمی هەردو بازێر ل دەرڤەی دەستەلاتداریا ئۆسمانی بوون، هەر ئەو فەرمان هندەك رێنمایان ب خۆڤە دگریت ل دۆر (کارێ هەڤپشك و هاریکاریا موکم ل ناڤبەرا وان د وێ مەسەلێ دا)، لێ وێ بەلگەنامەیێ ناڤێ حوکمدارێ ئامێدیێ نەئینایە، لێ گرۆڤەیێن دیرۆکی دیار دکەن کو ئەو سولتان یوسف خان کوڕێ سولتان سیدی خانێ ناڤبرییە.

ئەولیا چەلەبی ژی د پەرتووکا گەڕیانا خۆ (ئەولیا چەلەبی سیاحەتنامەسی) دا سەرهاتییەك ڤەگێڕایە کورتییا وێ ئەوە کو ئەڤ یوسف خانە (کو ب میرێ مزووری ناڤکرییە و دبیت ژ بەر هندێ بیت چونکی ئەڤە ب مەزنترین عەشیرەتا ل بن رێبەریا وی دهاتە هژمارتن) نەهاتبوو بەغدا داکو (کەرەمکەتە) دیدارا مرادێ چوارێ پشتی عیراق ژ دەستێ ئیرانییان رزگارکری، کو ئەڤە ببوو ئەگەرێ تنگژینا سولتانی هەتا وی رادێ برِیارا کوشتنا وی بدەت، ڤێجا ئەڤ بەلگەنامەیە بۆ مە رۆلەکێ سەربازی ئەشکەرا دکەت و ژێدەرێن سەردەمێ وی ئاماژە نەدایێ و دڤێت ئەم ل ڤێرە ئاماژەیێ بدەینە وێ چەندێ کو راسپاردنا ڤی ئەرکی ب میرێ بەهدینان، نەهورینییا هندەك ژێدەرێن پاشتر هاتینەنڤیسین[٤٧] دکەت یێن ئاماژەکرینە وێ چەندێ کو سولتان مرادێ چوارێ چ ژ میرگەها بەهدینان نەزانییە وی دەمی نەبیت دەمێ هاتییە (جول نسێبینێ) کو ل وێرێ میرێ وێ ل سالا ١٠٤٨ ێ مش/١٦٣٨ ێ ز د رێ رەسمەکێ پەیماندانێ دا قوباد خان بەگێ دووێ ب وی دابوو نیاسین، ئینا سولتانی حوکمێ میرگەها بەهدینان ب رێیا سیستەمێ میراتگرێ رادەستی وی کر، ب ڤی ئاوایی، بەلگەنامەیێن ئۆسمانی پشتڕاست دکەن کو سەلتەنەتا ئۆسمانی بەری ڤێ دیرۆکێ ب ماوەیەکێ درێژ هەر تشتەك ژ میرگەها بەهدینان و شیانێن وێ یێن سەربازی زانینە، هەروەسا محەمەد ئەمین زەکی ئاماژە کرییە وێ چەندێ کو مەلك ئەحمەد پاشا دەست ب سەر ملك ومالێ وی دا گرتبوو و هەیامەکێ ژی ل دیاربەکر زیندان کربوو، لێ پشتی گوژمەکێ مەزن یێ پارەی دای ژ زیندانێ دەرکەڤتییە و ڤەگەڕیایە میرگەها خۆ، لێ ژێدەران ئەڤ زانیارییە توومار نەکرینە[٤٨].

## میر سەعید خان بەگێ دووێ کوڕێ یوسف بەگێ:

ل سەردەمێ یوسف خان بەگێ کوڕێ بایرام بەگێ کوڕێ سولتان حسێن و ب رێپێدانا وی، ماوەیەکێ کورت کو ژ هەشت هەیڤێن سالا ١٠٤١مش/١٦٣١ز نابۆریت حوکم ل میرگەهێ کرییە و ئەگەرێن ڤێ رێپێدانێ نەهاتینە زانین کا ئەرێ ژ بەر تووشبوونا وی ب نەساخییەکێ بوویە، یان ژ بەر هندێ بوویە کو چوویە گەشتەکێ و نەشیایە ئامادە ببیت، یان ژێ ڤیایە وی بکەتە شوونگرێ خۆ دەمێ مرنا وی نێزیك دبیت و میرگەهێ ب وی راسپێریت، هەڤچەرخەکێ وی یێ دەستنڤیسەك ژبەر یا دی نڤیسیەڤە وی ب (حوکمدارێ دادپەروەر) سالۆخ ددەت و دبێژیت کو ئەو (بابەکێ دلۆڤانێ خویندکار و هەژاران بوو) و گەلەك مخابنییا خۆ ژ مرنا وی دەربڕییە[٤٩].

## میر قوباد خان بەگێ دووێ:

د ناڤ دارا بنەمالا حوکمدارێن بەهدینان دا رەهـ ورڤشتا وی ناهێتە نیاسین و ئاماژەیا ئێکانەیا پێ هاتییە دان ژ لایێ (یاسین العمری) ڤە بوویە و وی گۆتییە کو دەمێ سولتان مرادێ چوارێ ل سالا ١٠٤٨مش/١٦٣٨ز ل (جول نسێبینێ) بوویە مێڤان و میرێ وێ د رێ ورەسمەکێ پەیماندانێ دا قوباد بەگ (وەك ئێك ژ لەشکەرێن وی یێن کورد) پێ

دایە نیاسین، سولتانی حوکمێ میرگەها بەهدینان وەك میراتە رادەستی وی کرییە، ڤێجا هەکە ئەڤ سەرهاتییە یا دروست بیت، زنجیرا وی د حوکمدارێن بەهدینان دا دێ پشتی یوسف خان بەگێ کورێ سەعید خان بەگێ بیت[٥٠].

## میر مراد خان بەگێ کورێ یوسف خانێ کورێ بایرام بەگێ:

دیار نینە میر مراد خانی کەنگی حوکمێ میرگەهێ کرییە و کا چەوان گەهشتییە سەر حوکمی، دشیاندایە وی د زنجیرا میرێن بەهدینان دا دانینە پشتی قوباد خان بەگێ دووێ، وی گرنگی ب لایەنێ سەربازی دایە و لەشکەرێ خۆ رێکخستییە و هژمارا وی لەشکەری زێدەبوویە هەتا گەهشتییە دەهـ هزار سوار و دەهـ هزار سەربازێن پیادە، هەروەسا گرنگی دایە رێکخستنا پەیوەندی یێن سەربازی دگەل میرگەها داسنی ل شێخان و وێ میرگەهێ هاریکاریا سەربازی پێشکێش دکر هەر دەمێ میرێ بەهدینان داخواز ژێ کربا، ئەڤ پەیوەندییە سەرکەڤت و ل سالا ١٠٤٨مش/١٦٣٨ز میرێ داسنی میرزا (یێ پاشی بوویە پاشا) پشتەڤانییەکا مەزن یا سەربازی پێشکێشی هەوا سولتان مرادێ چوارێ د شەرێ دەرئێخستنا بەغدا دا ژ دەستێ سەفەوییان کر، ئەڤە سەرباری هێزێن دی یێن کوردی ب سەرکردایەتیا قوباد بەگێ پسمامێ مراد خان بەگێ کو پشکداری د وێ هەوێ دا کریوون، ژ لایەکێ دووڤە، یێ داویێ شیا دەڤەرێن باکوور یێن میرگەها خۆ بزڤرینیت کو بەری هنگی ل سالا ١٠٦٠مش/١٦٥٠ز هەکاریان دەست ب سەردا گرتبوو، بەلکی شیا ب هێزێن خۆ پێشرەویێ بکەت و دەڤەرێن میرگەها هەکاری ب خۆ ژی بستینیت، دیارە ژی وی نەڤیایە وان دەڤەران ل بن کۆنترۆلا خۆ بهێلیت، یان ب ئێکجاری همبێز بکەتە میرگەها خۆ، بەلکی تنێ بۆ پاشڤەبرنا هەڤسوویێن خۆ بوویە، چونکی هەر زوو پشتی بەرگەریانا هندەك شێخێن ئێزدی، خۆ ژ وێ میرگەهێ ڤەکێشایە. مراد خان بەگ هەڤژینی دگەل (میرە بەگ)ا خووشکا میرێ سۆران کرییە و ئەڤ خزمانییە بوویە ئەگەرێ بنەجهبوونا رەوشا دەڤەرێن رۆژهەلاتێ یێن سنوورێ میرگەهێ، وی حەز ژ زانستی دکر، چونکی مە دیت خواندنگەهەك ل ئامێدیێ دامەزراندییە و ب ناڤێ وی هاتییە ناڤکرن و پەرتووکێن پڕبها بۆ پەیداکرینە، نڤیسەرەکێ پشتی هنگی ژی ئەو ب کەسەکێ ئاقلدار، خودان دیتن وبۆچوونەکا هەڤسەنگ، خودان تەگبیر و رێڤەبرنەکا باش، ب کەسەکی تۆرە بلند سالۆخدایە، تشتێ ڤێ سالۆخدانێ ژی پشتڕاست دکەت ئەوە کو هەتا گاڤا داویێ یا ژیانا خۆ ب دووڤ حوکمی ڤە نەبەزییە، هەروەکی حوکمدارێن سەردەمێ وی کری، بەلکی دەست ژ حوکمی بەردایە و قوباد بەگێ پسمامێ خۆ وەك میر ل شوونا خۆ دانایە[٥١].

## میر قوباد خان بەگ کورێ سەعید خان بەگێ:

ل سالا ١٠٧٢مش/١٦٦٢ز ب هاریکاریا مراد خان بەگێ کورێ یوسف خان بەگێ پسمامێ خۆ هاتییە سەر حوکمی، گرنگی ب کاروبارێن لەشکەری یێن میرگەهێ دایە و هژمارا شەڕکەرێن وێ زێدەکرییە هەتا هژمارا وان گەهشتییە دۆرێن بیست هزار شەڕکەران کو نیڤا وان سوار بوون و نیڤا دی پیادە، ب ڤێ چەندێ شیا بزاڤەکا سەربازی کو ژ لایێ مەهدینیخوازەکی (المهدویە) دهاتە سەرکردایەتیکرن ژ ناڤ ببەت، هەروەسا ل سەردەمێ وی بزاڤەکا جوداخواز ل دەڤەرا بەرواری بالا ب سەرکردایەتیا عەبدال بالۆکی کو ناڤبری ئێك بوو ژ سەرۆکێن بەرواری بالا و میرێ هەکاری خالد بەگێ کورێ عیمادەدین بەگێ سەرهلدا، قوباد بەگ ئاوایەکێ دیپلۆماسی بۆ ژ ناڤبرنا ڤێ بزاڤێ ب کارئینا، وی فەرماندا مەلك عەزیز کو ئێك بوو ژ نەیارێن میرێ هەکاری، هێرشێ بکەتە سەر عەبدال بالۆکی و هەڤپەیمانێ وی، وی ژی هێزەکا سەربازی ب سەرکردایەتیا کەلائی یێ کورێ خۆ بۆ بجهئینانا وی ئەرکی هنارت، لێ وی چێتر دیت چ شەڕان دگەل نەکەت، ئینا دەست ب خاپاندنەکێ کر و یێ شیا

عەبدال و هەر پێنج كوڕێن وی و ١٢ خزمەتكارێن وی بكوژیت، وەسا دیارە ژی ئەڤ رووданە ئێك بوو ژ ئەگەرێن ژ بەرێكچوونا هەڤپەیمانییا ل ناڤبەرا بەرواری و هەكاریان ژ لایەكی و ژ لایەكێ دووڤە دامەزراندنا بنەمالەكا نوو ژ لایێ مەلك عەزیز ڤە بۆ حوكمداریكرنا بەرواری بالا و وێ بنەمالێ ب درێژییا حوكمێ میرگەها بەهدینان حوكم ل بەرواری بالا كر و هەتا ئەو نەكەڤتی ئەو ژی نەكەڤت، ل سالا ١٠٤٨مش/١٦٧٤ز ژی هێزێن قوباد بەگێ هێرشەكا لەشكەرێ هەكاریان ب سەركردایەتییا میر خالد بەگێ شكاند. میر قوباد خان بەگێ گرنگی ب زانست و زانا ددا، هەر بۆ نموونە د دەستنڤیسا (فتاوی ابن حجر المكی) دا یا سالا ١٠٨١مش/١٦٧١ز (سەنتەرێ نیشتمانیێ دەستنڤیسان ل بەغدا، هژمارە ١٦٩٢٢) كۆمێنتەك هەیە و نڤیسەرێ وێ مستەفا كوڕێ مەحمود دبێژیت كو (میرێ پایەبلندێ خودان قەنجیێن مەزن، بۆ رازیكرنا خودێ و ژ بەر باش تاشاندنا وی، فەرماندایە ل سەر زانایێن باژێركێ وی بهێتە نڤیسین، خودێ خێرا وی بنڤیسیت و حەز وڤیانێن وی ب جهـ بینیت، وی د وێ حالخۆشیێ دا، و وی د حكومەت و دادپەروەرییا وی دا بهێلیت و زانا هەر ل بەر دلێ وی دخۆشتڤی د خوشتڤی بن)[٥٢] قوباد بەگ ل سەر دەستەلاتدارییا خۆ بەردەوامبوو هەتا ل سالا ١٠٩٠مش/١٦٧٩زاینی وەغەرا داویێ كری و سێ كچ ل پاش خۆ هێلان، كو ئێك ژ وان هەڤژینا بارام خان بەگێ كوڕێ یوسف خان بەگێ بوو یێ پشتی وی بوویە حوكمدارێ میرگەهێ[٥٣].

## میر بارام خان بەگێ كوڕێ یوسف خان بەگێ:

دیرۆكا ژ دایكبوونا وی نەهاتییە زانین، لێ ل سالا ١٠٩٠مش/١٦٧٩ز ب هاریكارییا قوباد خان بەگێ مام و خەزیرێ خۆ بوویە حوكمدارێ میرگەها بەهدینان، ب كەسەكێ خودان بڕیار و گەلەك تێگەهشتی هاتییە نیاسین، پەیوەندیێن باش دگەل دەولەتا ئۆسمانی پاراستینە، ئینا ناسناڤێ (میرێ میران) ب دەستڤەئینا و ل سالا ١٠٩٣مش/١٦٨٢ز مریە دەمێ هەسپێ وی سەتمی و تێدا كەڤتی[٥٤].

## سولتان ئۆسمان بەگ:

وەك میرێ باژێركێ ئاكرێ(عقر) دەست ب ژیانا خۆ كرییە، وی دەمی وەلات ب رووданێن خوینەلۆ و ناكوكیێن چەكداری یێن ل ناڤبەرا هەردو عەشیرەتێن مزووری و زێباری ژ لایەكێ و ئێزدی ژ لایەكێ دووڤە دەرباز دبوو، ئەڤ لێككەڤتنە ب كوشتنا یێ بەری وی و برایێ وی میرێ بەرێ سەعید خان بەگێ دووێ ل سالا ١١١١ مش/١٦٩٩ز ب داویهات و پاشی وی وەك میرێ بەهدینان حوكم ل میرگەها بەهدینان كر، ل دووڤ تووماركەكێ یا ل سەر دەرگەهێ رۆژهەلاتێ یێ ئامێدیێ هاتییە نڤیسین ب (سولتان) ناڤێ وی هاتییە كو ئەڤە ژی ڤەژاندنا ڤی ناسناڤێ گرنگە یێ میرێن پێشەنگێن ڤێ میرگەهێ هەلگرتین، نەخاسمە ژی ل سەدسالییا شازدێ.

ئێك ژ وان كەسێن سالێن ئێكێ یێن حوكمێ وی دیتین وەسا سالوخ ددەت كو (ئاشتی ل وەلاتی بنەجهـ بوویە و خەلك د حالخۆشی و بەرفرەهیێ دا بوویە)، لێ ڤێ چەندێ گەلەك نەڤەكێشا و (هندەك رووданێن توندوتیژیێ چێ بوون و ئالۆزی ل سەرانسەری وەلاتی سەرهلدان)[٥٥] و گوند هاتنە تالانكرن و شەلاندن ل ناڤ خەلكی زێدەبوو، سولتان ئۆسمان ژی سەرباری كو خەمساری د چارەكرنا وێ كێشەیێ دا دكر، باج ل سەر خەلكی زێدە دكرن، كو ئەڤە ئەگەرەك بوو پسمامەكێ وی (یان برایەكێ وی) یێ ب ناڤێ زێبر بەگێ میرێ زاخۆ شۆڕشێ ل سەر بكەت و عەشیرەت ل دۆر خڕڤەبوون، ئینا ئۆسمان نەچار بوو پیلانەكێ ل دژی وی بگێڕیت ئەڤە ژی ب رێیا دەربڕینا دۆستایەتییا خۆ بۆ وی و خۆ وەسا دیار كر كو حەز دكەت خوون نەهێتە رێتن و داخواز ژێ كر بهێتە نك وی ل ئامێدیێ، لێ جوداهییەكا مەزن ل سەر چارەنڤیسێ وی هەیە، ل وی دەمێ ڤەگێڕانەك دبێژیت كو ئۆسمانی فەرمانا كوشتنا زێبر بەگ[٥٦] و كوڕێن وی یێن ل زاخۆ دایە، هندەك

سەرهاتیێن دی دبێژن کو ب دلێ خۆ دەست ژ حوکمێ بەهدینان بەردایە[57]، لێ نەبەرئاقلە ژیانا زێر ب ڤی ئاوایی ب داوی هاتبیت، چونکی پاشی دبینین کو ب فەرمانەکا سولتانی حوکم وەرگرتییە، ڤێجا هەکە ئەڤ دەستبەردانە ب راستا هاتبیتە رووداں، وی هەر زوو ئەو پۆست وەرگرتییەڤە و ئەو نڤیسارێن دەولەتا ئۆسمانی بۆ هنارتین دیار دکەن کو ئەو ل سالا ١١١٨مش/١٧٠٦ز ل وی پۆستی بوویە، د ڤان نڤیساران دا فەرمانێن ئێکلاکەر هەنە کو پێتڤییە سەرێن ئاژاوەگێڕیێ(هەروەکی هۆسا ناڤکرین) بێنە راهێلان و رادەستی والیێ مووسلێ بێنەکرن داکو بێنە سزادان، هەروەسا ژ بەرکو پتریا وان رێبەرێن هەردو عەشیرەتین زێبار و مزووری بوون، سولتان ئۆسمانی ئەو فەرمانا بۆ دەرکەڤتی بجهـ نەئینا[58]، دبیت ژی ئەڤە ژ بەر پەیوەندیا وی یا ب هێز دگەل هەردو عەشیرەتان بیت کو گرنگترین هێزێن پشتەڤانێن میرگەهێ بووینە.

ل سەردەمێ حوکمێ وی پەیوەندی یێن بەهدینان دگەل ویلایەتا بەغدا گەلەك ب لەز تێکچوون، ئەڤ تێکچوونە ژی ژ بەر وێ چەندێ بوویە چونکی سولتانێ ئۆسمانی کاروبارێن سەرپەرشتیکرنا میرگەهێ ب والیێ بەغدا حەسەن پاشای ڤە (١١١٦-١١٣٦مش/١٧٠٤-١٧٢٣ز) گرێدابوون، کو بەری هنگی ب ئاوایەکێ ئێکسەر ب وی ب خۆڤە د گرێدای بوون، هەر بۆ نموونە د بەلگەنامەیا رۆژێن داویێ یێن هەیڤا رەجەبا سالا ١١٢٦مش/١٧١٤ز دا فەرمانەکا سولتانێ ئۆسمانی هەیە کو ئاراستەی ئەحمەد پاشا هاتییەکرن و تێدا (چ پێ نەڤێت ب پشتبەستن ل سەر وی تشتێ یێ داویێ پێشکێش کری) بڕیاردایە کو (بنەجهکرنا تەناهی و رحەتیێ ل ئامێدیێ د

**خشتەیێ (١٣)**
**ژ بەرێ حەلانی هاتییە چێ کرن**



ستۆیێ والی حەسەن پاشادایە و هەکە پێتڤی بوو دڤێت ئەو سەرکردایەتیا هێزەکا خۆ بکەت و قەستا وێرێ بکەت بۆ چارەکرنا کێشەیێن ل وێرێ هەین) (٥٩).

هەر ل دووڤ وێ بەلگەنامەیێ سولتانێ ئۆسمانی، ئۆسمان بەگێ میرێ بەهدینان ژ پۆستێ وی لادایە و (بەهرام) ل شوونێ دانایە، کو ئەڤ مەسەلە ژی هەڤدژە دگەل زانیاری یێن خۆجهی یێن دیار دکەن کو پشتی ئۆسمان بەگ، قوباد بەگ پاشی زبێر پاشایێ ئێکێ ب دووڤ ئێکرا هاتینە سەر حوکمی، بەلگەنامە بەحسێ وێ چەندێ دکەت کو ئۆسمان بەگ نەرازیبوونا خۆ دەربڕییە شوونگرێ وی ل شوونا وی هاتییە دانان، تێدا هاتییە کو (رێگری لێ کرییە بگەهیتە جهێ کارێ خۆ و وەرگرتنا ئەرکێ پۆستێ خۆ)، هەروەسا بەحسێ(چالاکیێن خرابکاری یێن ئۆسمان بەگێ حوکمدارێ بەرێ یێ ئامێدیێ) ژی دکەت، لێ سەرباری هندێ، ئۆسمان بەگ - هەر وەکی هاتییە سالۆخدان - د فیقهـ و ئایینی دا دەستهەل بوویە و سەردەمێ وی ب سەردەمەکێ پێشکەڤتی دهێتە ل قەلەمدان، ئێك ژ کارێن وی یێن بیناسازی ژی نووژەنکرنا دەرگەهێ رۆژهەلاتێ یێ باژێرێ ئامێدیێ بوویە کو ب دەرگەهێ زێبار ناڤدارە و ئەڤ دەستەپەیڤە ل سەر ڤی دەرگەهی هەیە(رمم هذا الباب السلطان عثمان بك) ئانکو (ئۆسمان بەگ ئەڤ دەرگەهە نووژەنکرییە).

## میر زبێر پاشایێ کوڕێ سەعید خان بەگێ:

میر زبێر میرێ زاخۆ بوو دەمێ بابێ وی ل سالا ١١١١مش/١٦٩٩ز هاتییە تیرۆر کرن، قەستا ستەنبۆلێ کرییە داکو تاگریا خۆ بۆ دەستەلاتێ ئوسمانی ل دەرگەهێ بلند (باب العالی)دیار بکەت، ئینا فەرمانەك ب دەستڤەئینا بۆ وەرگرتنا حوکمێ میرگەها بەهدینان، سەرباری ڤێ پشتەڤانیێ، دەرگەهێ بلند فەرمانەك بۆ عەلی پاشایێ والیێ مووسل ژی دەرئێخست داکو هاریکاریا زبێر پاشا بکەت بۆ وەرگرتنا وی پۆستی، ئینا ل سالا ١١١٣مش/١٧٠١ز ب فەرمی ئەو پۆست وەرگرت، ئەوێ بەری وی حوکمداریا میرگەهێ دکر ئۆسمان پاشایێ مامێ وی بوو، لێ وی ب دلێ خۆ، هەروەسا بۆ ب جهئینانا فەرمانا سولتانی، بۆ زبێر پاشایێ برازایێ خۆ دەست ژ حوکمداریێ بەردا.

زبێر پاشا ب ئاقلمەندی و سیاسەتمەداریێ یێ بەرنیاس بوو، بۆ نموونە، وی خزمانی دگەل محەمەد بەگێ حوکمدارێ جزیرێ کر و ئەڤ نێزیکبوونە نەتنێ بوو ئەگەرێ وێ چەندێ رەوش ل ناڤبەرا هەردو میرگەهان بنەجهـ ببیت، بەلکی بوو ئەگەرێ وێ چەندێ ژی هاریکاریەکا سەربازیا مفادار ل ناڤبەرا هەردولا پەیدا ببیت، هەر بۆ نموونە، دەمێ میرێ هەکاری هێرش کرییە سەر دەڤەرێن باکوورێ میرگەها بەهدینان و هێزێن وی ب سەرکردایەتیا (چل قەدەر) ب سەر دەڤەرێن رۆژهەلاتێ بەرواری بالایا میرگەهێ گرتی، میرێ جزیرێ ب هێزێن خۆ هاریکاریا میرێ بەرواری بالا کر و هێزێن وی ب هاریکاریا هێزێن زبێر پاشای ب سەرکردایەتیا ئۆسمان بەگێ مامێ خۆ هنارتین، شیان هێزێن هەکاری بشکێنن و (چل قەدەر) و هژمارەکا سەرکردە و دووڤکەڤتیێن وی بکوژن. زبێر پاشای پەیوەندی یێن موکم دگەل سولتانێ ئۆسمانی و میر و والی یێن هەڤسوویێن خۆ هەبوون، ئەڤە ژی بوو ئەگەرێ وێ چەندێ رەوشا میرگەهێ ل سەردەمێ وی بنەجهـ ببیت، لێ ب دروستی نزانین کا ژ بەر چ بۆ بەهرام پاشایی کوڕێ خۆ دەست ژ حوکمداریێ بەردایە و تنێ زاخۆ د دەستێ خۆ دا هێلایە، کو هەتا مرنا خۆ ل سالا ١١٤٤مش/١٧٣١ز ل وێرێ ژیایە[٦٠].

# ژێدەر:


١. شەرفنامە، بپ ٢٦٩.

٢. دفتر مهمة ٧، ص ٢٢ ل ٢٢ ي سەفەرا ٩٧٦ مشەختی/١٥٦٨ زایینی.

٣. شرفنامە، بپ ٢٧٨.

٤. محفوظ العباسي: إمارة بهدينان العباسية ص ٥٨.

٥. أوليا جلبي في كردستان ص ٢١٢.

٦. دفتر مهمة ٦ ص ٥٧٨ في ١٣ ذي القعدة ٩٧٢هـ/١٥٦٤م..

٧. دفتر مهمة ٧ ص ٢٦٤

٨. دفتر مهمة ٧ ص ٥١٥، ذي الحجة ٩٧٥

٩. بۆ زانیاریێن زێدەتر بنێرە: الارشيف العثماني، بەلگەنامەیێن ئاماژە پێ هاتینەدان د ناڤەرۆکا ماددەی دانە، و الشجرة الزيوكية، و شرفنامە بپ١٢٧ و رحلة أوليا جلبي في كردستان ٢١٢ و سجل عثماني بەرگێ ٢ بپ ١٨٣ و١٣١ و إمارة بهدينان العباسية بث ٥٨ و الأكراد في بهدينان ص ١٣٠ و تاريخ العراق بين احتلالين بەرگێ بپ ٦٤ و١٠٨ و العزاوي: العمادية ص ٣٨ پەرتووکا مە: السلطان حسين الولي أمير بهدينان، أربيل ٢٠٠٩ و محمد عبد الله ئامێدي: سەردەمێ زێرین ل میرگەها بەهدینان، د پەرتووکا: (دیدارا دیرۆکي ل دور ئامێدیێ) هاتییە بەلاڤ کرن، دهۆك ٢٠٠٩، بپ١٨١-١٩١.

١٠. عماد عبد السلام رۆوف ونرمين علي: شواهد المقبرة السلطانية في العماديه، هەڤلێر ٢٠١١، بث ٣٦-٣٩ وعبد الله خورشيد: العمائر الإسلامية في العمادية، تێزا دکتۆرایێ یا نەبەلاڤکری کو پێشکێشي کولیژا ئادابێ یا زانکۆیا سەلاحەددین هاتییەکرن، هەڤلێر ٢٠٠٧، بەرپەرێن ١٥٢-١٥٧.

١١. أنور المائي: الأكراد في بهدينان ص ١٣١ و محفوظ العباسي: إمارة بهدينان العباسية بث ٥٨.

١٢. دفتر مهمة ٢٦ ص ٧٣.

١٣. دفتر مهمة ٢١ ص ٥٠.

١٤. دفتر ذيل مهمة ٢ ص ٢٤٠.

١٥. دفتر مهمة ٢٧ ص ٥٣.

١٦. دفتر مهمة ٢٧ ص ٩٨٣.

١٧. دفتر مهمة ٢٧ ص ٢٠٢.

١٨. دفتر ذيل مهمة ٣ ص ٢١١.

١٩. دفتر مهمة ٢٨ ص ٥-٦.

٢٠. شرفنامة، ص ١٣٩.

٢١. دفتر ذيل مهمة، بەرگێ ٣ ص ٣٢٢.

٢٢. دفتر مهمة ٢٨، ص ١٥٤.

٢٣. دفتر مهمة٢٩، ص ١١٤.

٢٤. دفتر مهمة ٢٩، ص ١١٤.

٢٥. شرفنامة، ص ١٤٣.

٢٦. دفتر مهمة، ص ٣٥.

٢٧. دفتر ذيل مهمة، بەرگێ ٣ ص ٢٦٢.

٢٨. دفتر مهمة ٢٧، ٣ ص ٧٣.

٢٩. دفتر ذيل مهمة ص ٢٩١.

٣٠. دفتر مهمة ٢٨، ص٢٧٠.

٣١. شرفنامە، ص ١٤٣.
٣٢. شرفنامە بپ١٤٣ و طارق ئامیدی، رۆژنامەیا الاتحاد. www. Alitthad.com.
٣٣. كێلێن گۆرستانا سولتانیێ ل ئامێدیێ، بپ ٥٩.
٣٤. عباس العزاوي: تاريخ العراق بين احتلالين جزء ٤ ص ٢٥٥
٣٥. شرفنامە بپ ١٤٥
٣٦. دفتر ذيل مهمة ٥، ص ١٤٣.
٣٧. ژ سالا ٩٩٩ ێ هەتا ١٠٠٠ مشەختی/١٥٩٠-١٥٩١زایینی حوكم ل مووسل كریە، عماد عبدالسلام رؤوف: الأسر الحاكمة ورجال الإدارة في العراق في القرون المتأخرة، بغداد ١٩٩١، ص ٢٣٤.
٣٨. دفتر ذيل مهمة ٥، ص ٩٨.
٣٩. دفتر ذيل مهمة ٦، ص ٦٠.
٤٠. هەر ژ سالا ١٠٠٠هەتا سالا ١٠٠١مشەختی/١٥٩١-١٥٩ ٢زایینی حوكم ل بەغدا كریە، الأسر الحاكمة، ص ٥٢.
٤١. دفتر مهمة ٧١، ص ٣٦٥.
٤٢. مرتضى نظمي زاده: كلشن خلفا، وەرگێرانا موسى كاظم نورس، بەغداد ١٩٧٠، ص ٢١١.
٤٣. عباس العزاوي: تاريخ العراق بين احتلالين، جزء ٤ ص ١٧٣.
٤٤. دفتر مهمة ٧٩، ص ٤٧٧.
٤٥. دفتر مهمة ٨، ص ٦٠.
٤٦. دفتر مهمة ٨٦، ص٨١.
٤٧. ياسين العمري: غاية المرام في تاريخ محاسن بغداد دار السلام، بغداد ١٩٦٨ ص ٩٣.
٤٨. أوليا جلبي سياحتنامه سي، والأكراد في بهدينان ص ١٤٠ و مشاهير الكرد وكردستان بەرگێ٢ بث ٤٣٠ و تاريخ مشاهير كرد، أمراء وخاندانها، جزء ٢ مج٣ ص١٣٤ و عماد عبد السلام رؤوف: دراسات وثائقية في تاريخ الكرد الحديث وحضارتهم، أربيل ٢٠٠٨، ص١٦٧-١٦٨.
٤٩. الأكراد في بهدينان بث ١٤٠ و١٨٦ و پەرتووكا مە: مراكز ثقافية معمورة في كردستان، أربيل ٢٠٠٨ ص ٢٤
٥٠. غاية المرام، ص ٩٣ و زبدة الآثار الجلية بەرپەرێن٦٧-٦٨.
٥١. المائي: الأكراد في بهدينان ص ١٤٠-١٤٣ و محفوظ: إمارة بهدينان العباسية ص ص ٦٧-٧٠.
٥٢. الأكراد في بهدينان، ص ١٤٦؛ امارة بهدينان العباسية، ص ٧٢؛ مسعود كتاني، مدرسة قوبا، دهوك، ٢٠٠٩،ص٣٥٥.
٥٣. بنێرە: المائي: الأكراد في بهدينان بەرپەرێن ١٤٤-١٤٦ و محفوظ: إمارة بهدينان العباسيه ص ص ٧٠-٧١.
٥٤. المائي ص ١٤٧ و محفوظ: ص ٧٢ و كتاني: مدرسة قوبا ص ٣٥٥.
٥٥. بعض الوقائع من تاريخ كردستان، جمعه من مخطوطات كلدانية أدي شير، ترجمة عن الفرنسية نرمين علي، دراسەوتعليق عماد عبد السلام رؤوف، مجلة الأكاديمية الكردية، هژمارە ٢٤ سالا ٢٠١٣، بپ٣٨٧.
٥٦. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٣٨٨.
٥٧. المائي: بث ١٤٧ و محفوظ: ص ٧٢
٥٨. دفتر مهمة ١١٥ ص ١٢٥ و ص ١٢٦ و١٦٣، ودفتر مهمة ١٢٢ ص ١٢٩ و المائي: الأكراد في بهدينان ص ١٤٨ و محفوظ: إمارة بهدينان العباسية ص ٧٣
٥٩. دفتر مهمة ١٢٢ ص ١٢٩
٦٠. الأكراد في بهدينان، بەرپەرێن ٢٢٩-٢٣٠ و إمارة بهدينان العباسية بەرپەرێن ٧٤-٧٧ و محمد علي قەرەداغي: مێژووی زانایانی كورد، بەغدا ١٩٩٨ بەرگێ ٤ بث٣٤٥، كو دەستنڤیسەكا پاراستی دا ل سەنتەرێ نیشتمانیێ دەستنڤیسان دا هاتیيە ئەو (حوكمدارە ل بازێركێ زاخۆ ل ئامێدیێ) و هەروەسا د دەستنڤیسەكا دی دا هاتیيە كو بەهرام پاشایێ حوكمدارێ ئامێدیێ ل سالا ١١١٨ ێ مشەختی/١٧٠٦ ێ زایینی مریە، ئەڤ دیرۆكە ژی دكەڤیتە ناڤ سالێن حوكمداریا زبێر پاشای، ڤێجا ئەم نزانین ئەو كیژ ئیسماعیلە یێ ڤێ سالێ مري. زانایانی كورد، بەرگێ ٣، بث ١٨٧.

# ئەولیا چەلەبی ل بەهدینان

د. نزار ئەیووب گولی
زانکۆیا زاخۆ- کولیژا زانستێن مرۆڤایەتی

## پێشگوتن:

گەروکێ تورك محمد زللی کورێ دەروێش یێ بەرنیاس ب ئەولیا چەلەبی سالا ١٦١١ یان ١٦١٦ز ل باژێرێ ستەنبۆلێ ژ دایکبوویە، ل سالا ١٦٨٢ز چوویە بەر دلوڤانییا خودێ و نێزیکی ٥٠ سالان ژ ژیانا خۆب گەریانێ دناڤ پتریا دەڤەرێن دەولەتا ئوسمانی وهندەك دەڤەرێن دەرڤەی ویڤە بوراندیە، ژ ئەنجامێ ڤێ گەریان و سەربورێ پەرتووکەکا ب ناڤودەنگ ب ناڤێ (سیاحەتنامە) دانایە کو ژ ١٠ پشکان پێکدهێت، بۆ ئێکەمین جار ٦ پشکێن ڤێ پەرتووکێ د ناڤبەرا سالێن (١٣١٤-١٣١٦مش/ ١٨٩٦-١٨٩٨ز) ژلایێ مێژوونڤیسێ تورك (ئەحمەد جەودەت) ب رێنڤیسا عەرەبی ل ستەنبۆلێ هاتنە چاپکرن[1].

ئەولیا چەلەبی پشکا چوارێ و هندەك ژ پشکا پێنجێ ژ پەرتووکا خۆ، بو کورد و کوردستانێ تەرخان کرییە[2]، وهەرچەندە ب دروستی دیار نەکرییە کو کەنگی وی دەست ب گەشتا خۆل کوردستانێ کریە بەلێ ب ئاشکەرایی دبێژیت کو ئەوی ل سالا ١٠٦٦مش/ ١٦٥٦ز سەرەدانا ئامێدیێ کرییە[3]، پاشی ل جهەکێ دی دبێژیت:(ئەز ١١ سالان ل وەلاتێ کوردستانێ گەریایمە)[4]. بڤی رەنگی دیار دبیت کو وی ل سالا ١٦٤٥ز بۆ ئێکەمین جار سەرەدانا کوردستانێ کرییە.

بەری ئەم بەحسێ سەرهاتیا ئەولیا چەلەبی ل بەهدینان بکەین پێدڤە بێژین کو ددانەیا چاپکریا ئەحمەد جەودەتی دا چ پێزانین سەبارەت ب ئامێدیێ و بەهدینان نینن! هەرچەندە وی سەرەدانا بەهدینان و جزیرا بۆتان ژی کرییە و پێزانینێن گرنگ ل سەر ڤان هەردو میرگەهان پێشکێشکرینە. هەروەسا د چاپا کوردی یا ڤێ پەرتووکێدا ئەوا ژلایێ مامۆستا سەعید ناکامڤە هاتییە وەرگێران ژی چ ئاماژە ب بەهدینان نینە.. و ژڤێ چەندێ دهێتەزانین کو مامۆستا سەعید ناکامی د وەرگێرانا کوردی یا ڤێ پەرتووکێدا پشت ب دانەیا چاپکریا ئەحمەد جەودەتی گرێدایە[5].

هەروەسا ئێك ژ کێماسیێن پەرتووکا سیاحەتنامە ئەوە کو هەتا نها چ دانەیێن تەمامێن وێ نەهاتینە دیتن، و ئەو دانەیا ئەم دڤێ گوتارێدا پشت پێ دبەستین تەمامترین دانەیا پەرتووکێیە، بەلێ ئەوژی پڕە ژ ڤالاهی و کێماسیان.

ژ لایەکێ دی ڤە ل دەمێ خواندنا پەرتووکا ئەولیا

### ئێکەمین چاپا پەرتووکا سیاحەتنامە


اولیا چلبی سیاحتنامه سی

مؤلفی :

اولیا چلبی محمد ظلی ابن درویش

دردنجی جلد

طابعی : احمد جودت

معارف نظارت جلیله سنك رخصتیله

ایلك طبعی

درسعادت ، اقدام ، مطبعه سی

چەلەبی دڤێت ئەڤ خالە ل بەرچاڤ بهێتەوەرگرتن:

١- پتریا ئەو پێزانینێن ئەولیا ژ بۆ سەردەمێن بەری خۆ ڤەدگێریت دبێ بناغەنە یان هندەك راستی تێدا هەنە!

٢- بۆ روودانێن سەردەمێ خۆ ئەولیا کەسەکێ زێدە راستگویە، بەلێ مخابن، سەرەرای گەڕیان و خواندنا خۆ، ئەو کەسەکێ زور سادە و خوش باوەر بوو، و هەر تشتەکێ وی بهیستی ئێکسەر د پەرتووکا خۆدا نڤیسیە بێی کو هزر د راستی یان نەراستییا وێدا بکەت!

٣- ئەولیا چەلەبی ب مەزنکرن و زیادەرەویێ دهێتە نیاسین، و بۆ خوینەرێ پەرتووکا وی دیار دبیت کو وی هەولدایە پەرتووکا خۆ وەکو شاهنامەیەکێ لێ بکەت کو پڕ بیت ژ بابەتێن سرنجڕاکێش و جهێ سەرسومانێ.

٤- بۆ دیار کرنا جهـ و سنوور و سەمتان زۆر جاران تووشی شاشیێ بوویە.

## میرێ بەهدینان ل ڤی سەردەمی کی بوو:

هەروەك هاتییە گوتن ئەولیا چەلەبی ل سالا ١٦٥٦ز سەرەدانا ئامێدیێ کرییە، ئەو دگەل کەسەکێ ب ناڤێ (کولە یووسف ئاغا) کو کەتخودایێ والیێ بەغداد مورتەزا پاشای بوو بۆ خواستنا کچا میری هاتبوو ئامیدیێ، و چاڤ ب میرێ وێ کەفتبوو. بەلێ ئەولیا ب دو شێوەیان ناڤێ میرێ بەهدینان دئینیت، هندەك جاران ب شێوەیێ سەیدخان و چەند جاران ب شێوەیێ (موسەیید خان)؟!.

ژێدەرێن ل بەردەست ل وێ باوەریێنە کو ل وی دەمی میرێ بەهدینان (موراخان بەگ کورێ یوسف بەگی) بوو[٦]. و بێ گومان ئەڤ بوچوونە خەلەتە چونکە دەمێ ئەولیا چەلەبی سەردەدانا ئامێدیێ کری بەحسێ خواندنگەها (مورادخانیە) کرییە کو بەری هینگێ ژلایێ میر مورادخانی ڤە هاتبوو ئاڤاکرن.

سەبارەت سەیید خانی ب دروستی دیار نینە کا ئەو کییە؟ و ئەم ب دوور نابینین کو سەیید خان هەمان (سەعید خان کورێ یوسف بەگی) بیت ئەوێ ناڤێ وی د رووداننێن سالێن ١٠٤١مش/ ١٦٣١ز هاتی[٧]. و ل دەمێ ئەولیا چەلەبی سەرەدانا ئامێدیێ کری چ میرەك ب ڤی ناڤی حوکم ل ئامێدیێ نەدکر. لەورا پتر هزر بۆ هندێ دچیت کو میرێ بەهدینان ل وی سەردەمی موسەیید خان بیت.

موسەیید خان میرەکێ بەهدینانە کو پێزانین ل سەر وی ئێکجار کێم و دەگمەنن. د بەلگەنامەیەکێدا هاتییە کو میرەکێ ب ناڤێ موسەیید خان کورێ موراد خان کورێ سەیید خانی بۆ ماوەیەکێ حوکم ل ئامێدیێ کرییە[٨]. و بێ گومان ئەڤە دێ هەمان ئەو موسەییەد بیت ئەوێ ئەولیا چەلەبی بەحس لێکری. و تشتێ ڤێ بۆچوونا مە پشتراست دکەت

ئەوە کو د بەلگەنامەیێدا ناڤێ هندەك کورێن وی ژێ هاتینە باس کرن و دو ژ وان ب ناڤێن سولتان حسێن و قوباد بەگ بوون. و ئەولیا ژی د گەشتا خۆدا بەحسێ دو کورێن موسەیید خانی کرینە ب ناڤێ سولتان حسێن کو میرێ ئاکرێ بوو و قوباد بەگ کو حوکم ل باژێرێ زاخۆ دکر - هەروەك دێ هێتە بەحسکرن-و هەرچەندە ئەولیا چەلەبی ناڤێ میرەکێ ب ناڤێ یووسف بەگ ژی دئینیت بەلێ ئەو دبێژیت کو یووسف بەگ میرێ سەنجەقا مزووری بوو. لێ تشتێ چ گومان تێدا نەبی ئەوە کو یووسف بەگ میرێ فەرمیێ بەهدینان بوو و ل سالا ١٦٣٤ز تووشی هێرشەکا میرێ هەکاریان عیمادودین بەگی بوویە(٩). و ل سالا ١٦٣٨ز ب فەرمانا سولتان موارادێ چوارێ (١٦٢٢- ١٦٤٠ز) هاتبوو گرتن بەلێ هەر زوو هاتەبەردان و حوکمێ وی بۆ هاتە ڤەگەراندن(١٠). لەورا ئەم ب دوور نابینین کو میرێ مزووری بۆ ماوەیەکێ دەست ب سەر حوکمێ بەهدینان دا گرتبیت!!.

## گەشتا ئەولیا چەلەبی ل بەهدینان

ئەولیا چەلەبی گەشتا خۆ بۆ بەهدینان ژ باژێرێ بەغداد دەستپێکر، ل بەراهیێ سەرەدانا دەڤەرا شەهرەزۆر و میرگەها سوران کر، ل دووڤدا سەرەدانا هەردو باژێرێن هەولێر و کەرکووك کر. پاشی ژ رووبارێ زێێ مەزن دەرباس بوو وهاتە دناڤ «میرگەها بەهدینان جهێ حوکمێ میر سەیید خانی»دا، و بەرەڤ باژێرێ ئاکرێ هات. و درێکا خۆدا سەرەدانا ڤان گوندان کر:

**بەرپەرەك ژ پەرتووکا سیاحەتنامە کو دەقێ هوزانا مەلا رەمەزانی تێدایە**



ژێدەر: ڤەکۆلەر

### ١-گوندێ زێبار:

ئەولیا چەلەبی ب ڤی رەنگی بەحسێ ڤی گوندی دکەت: گوندەکێ ئاڤەدانە، ژ ٢٠٠ خانیان پێك دهێت کو ژ بەر و ئاخێ هاتینە دروست کرن، مزگەفت و مەدرەسە و باغ و باغچە لێ هەنە.

### ٢-زێبارا عەلی [عالی؟]:

ب دووراتیا ٦ دەمژمێران دکەڤیتە باکوورێ گوندێ زێبار، ژ ٥٠٠ خانیان و مەدرەسە ومزگەفت وحەمام و باغ و باغچەیا پێکدهێت. و ئاڤەکا خۆش تێدا هەیە.

### ٣-گوندێ لەگاندیرLegandir :

گوندەکە دکەڤیتە باکوورێ زێبارا عەلی ب دووراتیا ٣ دەمژمێران، و دکەڤیتە دناڤ خاکا ئاکرێدا. ژ ٣٠٠ خانی و مزگەفت و مەدرەسە و خان وحەمام و باغ و بووستانان پێکدهێت. ل ڤی گوندی ئەو خەلاتێن [والیێ بەغداد] مورتەزا پاشای داینە مە ژ سەر پشتا هەسپی کەفتن و پارچە پارچە بوون!. پاشی ئەم بەرەڤ باکووری ڤەچووین و پشتی ٣ دەمژمێرێن دی ئەم گەهشتینە گوندێ (هووزدار).

### ٤-گوندێ هووزدارHuzdar:

ئەڤە ژی گوندەکێ دیبە سەر ب سەنجەقا(١١) ئاکرێ ڤە، ژ ١٠٠٠ خانیان پێکدهێت کو ژ بەر و تەڤنێ هاتینەئاڤاکرن، مزگەفت، مەدرەسە، حەمام، خان و ژمارەکا باش ژ دوکانان و باغ و باغچە تێدا هەنە. ژمارا زانایێن وێ ئێکجار زۆرن. یا راست چ گوندێن کوردستانێ بێ مەدرەسەنینن!. و پشتی ٧ دەمژمێرێن دی ئەم بەرەڤ باکووری ڤەچووین ئەم گەهشتینە باژێرێ ئاکرێ.

## -ئاكرێ:

ئێكەمین باژێرێ بەهدینان كو ئەولیا چەلەبی سەرەدانا وێ كری باژێرێ (ئاكرێ) یە، چەلەبی ب ڤی رەنگی بەحسێ ئاكرێ دكەتن:« ئەڤ شارە ژلایێ ئیمامێ عەلی ڤە هاتیيە فەتح كرن، ئەو دگەل چەند هزار كەسان ژ لەشكەرێ ئیسلامێ ژ كوفە دانەرێ و شیان باژێری ژ دەستێ حاكمێ وێ (قابووس) كو ژ دووندەها نەوشیروانی بوو دەربێخیت. ل وی دەمی دگوتنە خەلكێ ئاكرێ (حەمیدی)[12]. ئەو مللەتەكێ كەڤنن كو بۆ سەردەمێ حەزرەتێ یوونسی ڤەدگەرن. ل سالا ٣٦مش ئیمامێ عەلی ئەڤ حەمیدیە بۆ ئیسلامێ ڤەخواندن و وان هەمیان باوەری ب ئیسلامێ ئینان وهەتا نها خودان باوەرییەكا پاكن. ئەو سوننی و شافعی نە. ئەو كوردێن صافی و خوری نە، و چونكە ئیمامێ عەلی دوعایا خێرێ بۆ وان كرییە لەورا ئەو گەلەك ب نفش و دووندەهن و زارۆكێن وان گەلەكن. ل رۆژهەلاتا باژێری چیایێ ئاكرێ هەیە كو دكەڤیتە سەر سنورێ دگەل عەجەمان [صەفەویيان]. ل وی چیایی حەفت جورە كانێن باقژ هەنە ژ وان: زەرنیخ، جیز، ئاسن، سفر و زێر. باژێرێ جولەمێرگێ كو پایتەختێ هەكاریانە دكەڤیتە باكوورێ ڤی باژێری.

ل باشوورێ ئاكرێ باژێرێ نەینەوا هەیە كو جهێ یوونس (س)یە، یوونس جار ل ڤی باژێری و جار ل مووسلێ ئاكنجی دبوو، بەلێ ژبەر سەركێشی و سەرداچوونا كوردان نەچار بوو دگەل هندەك ژ كوردێن حەمیدی بەرەڤ رۆژئاڤا بچیت تا گەهشتییە دەریا سپی، و ل بەر لێڤا دەریای كولكەكێ خەمان {بەرستكەهەك} دروست كر و ب عیبادەتێ ڤە مژوول بوو[13]. دهندەك ڤەگێرانێن مێژوونڤیساندا هاتییە كو دەمێ یوونس مری ڤان كوردێن حەمیدی نەهەنگا وی ژی ب رەخ ویڤە ڤەشارتن!. و د هندەك ڤەگێرانێن مێژوونڤیساندا[14] هاتییە كو یوونسی زور حەز ژ ڤان كوردێن حەمیدی دكر و حەفت سالان دناڤ واندا ژیایە و خەلك بۆ باوەرییا ب خودێ داخواز كرییە و ل وێرێ هندەك موعجیزەیێن یوونسی ژی پەیدا بووینە.

### -حاكمێن ئاكرێ:

ل دویف یاسایا سولتان سلێمانێ قانوونی ئاكرێ سەنجەقەكا سەر ب حكومەتا ئامێدیێ ڤەیە، و ئامێدی ژی سەر ب ویلایەتا بەغداد ڤەیە، بەلێ میرێ ئاكرێ نە ژ ئوسمانیانە بەلكو میرێ ئامێدیێ جلكێ حوكمرانیێ بۆ دهنێریت و وی دكەتە خودان (طەبل و علم [دەهول و ئالا][15])، و ل دەمێ شەرێندا ل ژێر ئالایێ میرێ ئامێدیێ و ب فەرمانا والیێ بەغدادێ پشكداریێ دكەت. ئەردێ سەنجەقا ئاكرێ نابیتە (خواص همایوون)[16]، و د نڤیسینێن فەرمیدا ب ناسناڤێ (أمیر محترم= میرێ رێزدار) دهێتە بانگكرن. ودەولەتا ئوسمانی دەستێوەردانێ د باج و خەراج و داهاتێ وێ دا ناكەت، و ب هێچ شێوەیەكێ دناڤ ڤێ سەنجەقێدا (ئیقطاع[17] و زەعامەت[18]) نینن. كەلا و هەمی ئەردێ وێ دبن فەرمانا میرێ ویدایە و چ كەسەك ژ ئوسمانیان ب چ رەنگان مایتێكرنێ د حوكمێ ویدا ناكەت. تەنانەت قازیێن وێ ژی ژ لایێ میرێ ئامێدیێ بۆ كەسەكێ زانا و خودیناس دهێتەدان. و بەگێ وێ سەرداریيا ٣٠٠٠ كوردێن حەمیدی دكەتن. بەلێ دناڤ خاكا سەنجەقا ئاكرێدا نێزیكی ٢٠ هزار كوردێن (تفەنگدار) هەنە. ل باكوورێ وێ ب چوار قوناغان[19] وەلاتێ هەكاری هەیە، و ژلایێ باشوورڤە دگەل شەهرەزۆرێ هەڤسوویە و ل رۆژئاڤایێ وێ ب دووراتیا ٥ قوناغان باژێرێ ئامێدیێ هەیە. میرێ ڤێ كەلێ سولتان حسێن كورێ سەید خانی یە. دەمێ ئەز هاتیمە ئاكرێ (كولە یووسف ئاغا) كەتخودایێ والیێ بەغداد مورتەزا پاشای دگەل مندا بوو، و میرێ ئاكرێ پێشوازیيا من كر و هندەك توپ بۆ بخێرهاتنا مە هاڤێتن و ئەم ل سەرایا وی مێڤان بووین و وی خوارنێن خۆش و دیاری دانە مە.

### -ئەردێ كەلا ئاكرێ:

ب زمانێ كوردی دبێژنە ڤێ كەلێ (ئاكرا زێباری)، و ب زمانێ عەرەبی دبێژنێ (ئاكرەیا عەلی- عقرة علی)، و ب زمانێ عەجەمان [فارسی] دبێژنێ (تل ئاكرا)، و مەغوولان دگوتێ (تل مزووری)، و كوردێن زازا دبێژنێ

(تل گەردووم)، و یونان دبێژنێ (پترو بوغاس) ئانکو (کەلا بەری). و ب زمانێ کوردێن (لولو) دبێژنێ (کوهـ پولا).

ب کورتی، هەمی ل سەر وێ چەندێ رێکەفتینە کو ئاکرێ چیایەکێ بلندە. ل سەردەمێن کەڤندا ئاکرێ باژێرەکێ مەزن بوو. ل دەشتا دبندا کوردێن زێباری دژین، هەروەسا کوردێن (پەسان) و مزووری ژی هەنە، بەلێ مللەتێ حەمیدی ئێکجار زورن.

مللەتێ سولتان خانزادێ [سوران] هەڤسنورێ ئاکرێیە، وعەشیرەتێن مللەتێ خانزادێ بو بازرگانیێ دهێنە ڤی شاری. بەلێ هەرچەندە کو ئاکرێ ب رەخ سوران ڤەیە بەلێ باوەرییان ئاکرەییان گەلەك ب سورانییان ناهێت چونکە چەندین جاران وان هێرش کرینە سەر ئاکرێ، بەلێ چ جاران نەشیاینە ڤی باژێری بستینن. کەلا وێ ل سەر چیایەکێ یە کو سەر ب ئەسمانیڤە کێشایە، و شوورها وێ ب بەرێن رەق هاتیە ئاڤاکرن، و شێوەیێ وێ پێنج گوشەیە و کەلایەکا بێ خەندەکە و ب باغ و بووستانان دورپێچدایە. ئەڤ کەلایە بوویە هزرەتا گەلەك شاهـ و سولتانان، وهەر ژ بەرێدا چەندین جاران چاڤێ خۆ برینە ستاندنا ڤێ کەلێ بەلێ هەرجار تووشی شکەستنێ بووینە. دەشتا دبن کەلێدا ژ هەستیێن وان پربوویە!. ژمارەیەکا مەزن ژ خانییان ل سەر کەلێ و دبن کەلێدا هەنە و ئەو هەموو ب بەران هاتینەئاڤاکرن.

## - گوند و جهێن دناڤبەرا ئاکرێ و ئامێدیێ دا:

پشتی سەرەدانا ئاکرێ ئەولیا چەلەبی بەرەڤ پایتەختێ بەهدینان کەلا ئامێدیێ ڤە چوو و درێکا خۆدا سەردانا هندەك گوند و کەلایێن دی ژی کرن ئەو ژی:

### ١- بێکوفار:

گوندەکە سەر ب خاکێ ئامێدیێ ڤە و دبن حوکمێ میرێ کەلا (بەیتا نوور) یە. گوندەکە ژ ٣٠٠ مالان و مزگەفت و مەدرەسە و حەمام و باغ و باغچەیان پێکدهێت. بێکوفار ب زمانێ کوردان ئانکو (گوندێ مشکان)!. و براستی گەلەك مشك ل وێرێ هەبوون و پشیکێن وان کێم بوون!!.

### ٢- کەلا بەیتا نوور[٢٠] :

ب دووراتیا ٩ دەمژمێران ل باکوورێ بێکوفارێ یە. ناڤێ وێ یێ دروست (بێ تەنوور)ـە، ل سەر چیایێ ل هنداڤی وێ شکەفتەك هەبوو، ل سەردەمێن بەرێ ل رەخەکێ وێ شکەفتێ گەرماڤەك هەبوو و کەڤرێن وێ هند گەرم بوون کو خەلکی هەڤیرێ خۆل سەر دکرە نان!، لەورا کەسێ پێدڤی ب تەنووران نەبوو، ژ بەر هندێ دگوتنە ڤی جهی (بێ تەنوور)، و ب بورینا دەمی ناڤێ وێ بوویە (بەیتا نوور). هندەك مێژوونڤیسان گوتیە کو ئەو شکەفت تەنوورا حەزرەتێ نووحی بوو!. ئەو هاتبوو ڤێرێ و دڤێ شکەفتێ ڤە دووعا کربوون و کەڤرێن ڤێ شکەفتێ وەکی تەنوورێ لێهاتن!!.

ئاڤاکەرێ ڤێ کەلێ کەسەکە ژ مالباتا (آل زیادە)[٢١] ! ب ناڤێ (بەهستوڤان کورێ شەمکین)، بەهستوڤان شاهێ گورگان و تەبەرستانێ[٢٢] بوو. پاشی دەستێ خۆدانا سەر عیراق و شەهرەزۆرێ و ئەڤ کەلایە ل ڤێرێ ئاڤاکر. کەلا گەلەك بچووکە بەلێ زور ئاسێیە. ستاندنا کەلێ ب رێکا شەرێ مەحالە چونکە چ رێ ناچنێ. بتنێ رێکەك هەیە بۆ ستاندنا ڤێ کەلایێ ئەوژی دووریپێچدانا وێ بو چەندین سالان هەتا خەلکێ وێ برسی ببن ونەچار ببن خۆ رادەست بکەن. بێ تەنوور نها د ژێر حوکمێ میرێ (کەلا شخوی) دایە.

### ٣- کەلا شخوی[٢٣] :

ئاڤاکەرێ وێ کەسەکەب ناڤێ (مەرداڤیخ)[٢٤] کو ژ بنەمالا (زیادە)یە!. ئەڤە ژی سەنجەقەکا دیبا سەر ب ئامێدیێ ڤەیە. ئەو ژی ب ئوسمانیانڤە گرێدای نینە و تنێ فەرمانێن خۆ ژ میرێ ئامێدیێ وەردگریت. و د فەرمانێن سولتانیدا ب (أمیر محترم) دهێتە گازیکرن. ل وێرێ ژی ئەردێ سولتانی (خواص)

نینن، و داهاتێ وێ بو میرێ وێ یە، هەروەسا زەعامەت و تیمار ژی ل وێرێ نینن و نابیت لەشکەرێ ئوسمانی بچیتە دناڤ خاکا وێدا.

- شێوەیێ ئەردێ کەلا شخوی: دەمێ ئەز چوویمە وێرێ میرێ وێ کەسەك بوو ب ناڤێ (محەمەد بەگ)، و وی بخێرهاتنا من کر و هندەك توپ بو بخێرئینانا من هاڤێتن (...)[25] .

## ٤-کەلا ئازهر زاد:

«ئاڤاکەرێ وێ کەسەکە ژ مالباتا ئازەریان ب ناڤێ (ئازهر)، لەورا دبێژنێ (ئازهر زاد)، بەلێ کورد دبێژنێ ئازەرزار، ئەڤ کەلایە ژی وەکی کەلا بێتەنوورێ سەر ب میرێ کەلا شخوی محەمەد بەگی ڤەیە. کەلایەکا بچووك و ئاسێ یە». جهێ ئاماژێیە کو چەلەبی ئەڤێ کەلێ ب (دار الجهاد) ناڤ دبەت لەورا هزر بو هندێ دچیت کو خەلکێ ڤێ کەلێ مەسیحی یان ژی نەموسلمان بن.

## ئەولیا چەلەبی ل ئامێدیێ

«پاشی بو ماوێ ٦ دەمژمێران ئەم بەرەڤ رۆژئاڤاڤە چووین و ل وێرێ کەلا ئامێدیێ هاتە بەرچاڤێ مە. ل وێرێ کەتخودایێ میرێ ئامێدیێ دگەل هژمارەکا مەزن ژ بژاردەیێن لەشکەرێ ئامێدیێ ب زری و کورك ڤە بو پێشوازیا مەهاتن. دەمێ ئەم چووینە دناڤ کەلێدا ئالایەکێ مەزن ل پێشوازیا مەهاتبوو دانان و ب هاڤێتنا توپێن (شاهی) و (بالیومەز)[26] بخێرهاتنا مەکرن هەتا ئەم گەهشتینە سەرایا میری.

ل سەرایا میری هەمی زانا و ماقوول و خانەدانێن بازێری کو کورکێن ژ کەڤلێ سڤورەیان ل بەر بوون ئامادە ببوون، هەروەسا ١٠ هزار ژ بژارەیێن سەربازێن میرگەهێ، کو هەمیان شەل و شەبك ل بەر بوون و چارك [جورەك پێلاڤێن ب قەیتان] کربوونە پێن خۆ وهەمی تفنگدار و ب هەیبەت بوون، ئامادەبوون. ل لایێ راست و چەپێ دیوانێ دەرگەهڤان دەستێن خۆ دانابوونە سەرئێك و ب رێز و تورەڤە راوەستیای بوون. ئەو هەمی ب شاشك بوون و سەربەندێن زێر

و زیڤی دانابوونە سەر شاشکێن خۆ و پەرێن قولنگ و شاهینان دبەر شاشکێن وانرا بوون. و هەمی بەژنا وان ب زێر و زیڤی داپوشیای بوو! و دەمێ ئەم هاتین ژوورڤە (طەبل و نەفیر)[27] هاتنە لێدان. پاشی کەتخودایێ پاشایێ بەغدا مورتەزا پاشای نامەیا پاشای خواند. پاشی میر رابوو سەرخۆ وگوت:«ئەی خەلکێ ئامێدیێ، برایێ مە مورتەزا پاشا- ل دووڤ شەرعا پێغەمبەری- کچا مەیا پاك ژ مە دخوازیت. هوین چ دبێژن؟». هەمیا پێکڤە گوتن:«حەلال بیت خودێ بەرەکەتێ بێخیتێ». پاشێ شێخولئیسلامێ ئیمارەتێ گوت:» کانێ وەکیلێ مورتەزا پاشای؟ کانێ وەکیلێ خانی»[28] ؟. پاشی کەتخودایێ پاشای چوو نیڤا دیوانێ و دەستێ خۆکرە د دەستێ میریدا و ئهو پهری ل پاشای هاتەمارکرن و فاتحە هاتە خواندن. و چەندین هزار تاسێن ڤەخوارنێ [شەربەتێ] هاتنە ڤەخوارن. مورتەزا پاشای جلکەکێ کەڤلێ سڤورەی بۆ میری و کەتخودایێ وی و شێخولئیسلامی هنارتبوو. هەروەسا ١٥٠ جلکێن (زەردوز)[29] ژــو میرزادە و ماقوولێن ئامێدیێ هنارتبوون. هەروەسا سێ هێسترێن بارکری ژ تشتێن گرانبەها و نایاب، ئەڤە ژبلی زرێن (داوودی) و کومزرێن (طالوتی)[30] و١٠ هەسپێن جوان. پاشی میری فەرماندا چەندین هزار سێنیێن پر ژ خوارنێن خۆش ل مەیدانێ بهێنە دانان، ڤێجا ئەو مەیدان وەلێهات کو زمان نەشێت پەسنا وێ بکەت و قەلەم نەشێت بنڤیسیت.

ئەو رۆژێن ئەز ل ئامێدیێ، ئەز ل سەرایا میرێ مزووریان ئەوا دکەڤیتە نزیکی دەرگەهێ مووسلێ مێهڤان بووم، و رێزەکا مەزن ل من هاتە گرتن. و چەندین جاران ئەز بوومە مێهڤانێ میری ژی و من ئاخفتن دگەل کرن.

## - سالوخەتێ پایتەختێ بەهدینان و جهێ حوکمێ سەییدخانی:

هەمی مێژوونڤیس ل سەر هندێ رێکەفتینە کو ئامێدیێ بو سەردەمێ حەزرەتێ نووحی ڤەدگەریت.

چیایێ جودی دکەڤیتە جهەکێ نزیکی ئامێدیێ و ئەو کەسێن ژ کەشتیيا وی دەرکەفتین هەر ئێك ل جهەکێ بەلاڤ بوون. و کەسەك ب ناڤێ (بەهدینان کورێ گیومەرسی)[31] ل ڤی چیای بنەجهـ بوو!. پاشی ئامێدیێ بۆ ماوەیەکێ درێژ ژ شاهەکێ بۆ ئێکێ دی دەست بدەست بوو، و ل سەردەمێ حەزرەتێ عیسای کەفتە ددەستێ بنەمالا (آل زیادە) دا. و هەرئێك ژ مەلك مەرداڤیخ ومەلك شەمکین ومەلك بەهستەڤان ومەلك قابووس و مەلك مەنوچەهر و مەلك نوشیروانی حوکم ل ئامێدیێ و عیراق و مەدائینێ کرینە!.

ل دووماهیێ حەزرەتێ عەلی وموعاوییە ل نزیك رووبارێ فوراتێ شەرکرن، حەزرەتێ عەلی ژ موعاوییەی دلمای ما! و بەرەڤ کوفە چوو و ئەو کرە پایتەختێ خۆ، و ل وێ سالێ دگەل لەشکەرێ عەرەبان ئامێدیێ دورپێچ دا و پشتی حەفت هەیڤان شیا وی باژێری بستینیت و ژ دەستێ (ئامەدان کورێ نوشیروانی) دەرئێخست. و پشتی مرنا ئامەدانی بنەمالا وی ژی بداویهات. و گەلەك مێژوونڤیسێن عەرەب و عەجەمان ئەڤ بابەتە ڤەگێرایە، ژ وان مێژوونڤیس (یارمنیێ مەقدەسی)[32] کو ب جوانی بەحسێ ستاندنا ئامێدیێ ژلایێ موسلمانانڤە کرییە. وناڤێ ئامێدیێ ژناڤێ ڤی کەسی هاتییە کو داوی شاهێ بنەمالا (آل زیادە) بوو.

پشتی ئامێدیێ هاتییە فەتحکرن حوکمێ وێ کەفتە ددەستێ پسمامێ ئیمامێ عەلی ئەوێ ناڤێ وی (...)[33] کورێ عەبباسی. و هەر ئێك ژ میر سەیید خان و مورادخان و میرحاج خان و مەمکان خان و گەلەك خانێن دی ئەو هەمی ژ دووندەها عەبباسی نە[34]. هەروەسا میرێن جزیرێ و هەکاری و بەدلیس[35] ژی هەر ژ ڤی نڤشێ پاکن. مێرخاسێن ئامێدیێ وەکی سکرەکێ موکومن دناڤبەرا دەولەتا ئوسمانی و قزلباشاندا.

ل سالا ٩٤١مش [١٥٣٤ز] سولتان سلێمانێ قانوونی دگەل لەشکەرەکێ هندی دەریایەکێ بەرەڤ عیراقێ ڤە چوو، و میرێ ئامێدێ (...خانی)[36] پێشوازیيا وی کر، و وەلاتێ ئامێدیێ دگەل کلیلکێن ١٧٦ کەلایان تەسلیمی وی کرن، لەورا کەیفا سولتانی گەلەك هات و جارەکا دی حوکمێ وێ ب شێوەیێ (تەعبید و ئوجاقلق)[37] دا میرێ ئامێدیێ، لەورا میرێن ئامێدیێ هەتا نها دووعایێن خێرێ بو سولتان سلێمانی دکەن.

و ل سالا ١٠٤٨مش [١٦٣٨ز][38]میرێ ئامێدیێ دگەل ٤٠ هزار سەربازان پشکداری د دووبارە گرتنەڤا (فەتحکرنا) بەغداد دا کر، ل ڤێ سالێ جارەکا دی دەولەتێ دانپێدان ب حوکمێ میرێن ئامێدیێ کر ب شێوازێ (یورتلق و ئوجاقلق)[39].

## - رەوشا حاکمێن ئامێدیێ:

ئامێدیێ حکومەتەکا [40] مەزنە سەر ب ویلایەتا بەغدادڤە و هەلگرا دو (توغ)[41]انە ، ٤٠ هزار سەرباز و ٥٠ هزار زانا! و ٣٠٠ هزار خەلك تێدا دژین کو ژ مللەت و دینێن جودا جودانە. دڤێ حکومەتێدا پتر ژ (١٠٠) [42] میر عەشیرەت و ١٧٦ کەلا هەنە، ئەگەر خودێ حەز بکەت دێ هەر ئێك ژ وان د جهێ خۆدا بەحس کەم. ل دووڤ قانوونا سلێمانێ قانوونی ل دەمێ ئامادەبوونێ ل کوچکا سولتانی میرێ ئامێدیێ دبن والیێ شەهرەزۆرێدا دروونیتە خوار، و ل دەمێ شەراندا لەشکەرێ ئامێدیێ دگەل لەشکەرێ شەهرەزۆرێ دبنە چەرخچیێن لەشکەرێ ئوسمانی و لەشکەرێ والیێ دیاربەکرێ دبیتە پاشیا لەشکەری.

دناڤ وەلاتێ کوردستانێدا ئامێدی حکومەتا هەرە مەزنە، پاشی هەکاری و بەدلیس دهێن، پشتی وان حاکمێ جزیرێ دهێت، داهاتێ رۆژانەیێ میری ئێك (کەیلە)[43]. ب هیچ رەنگەکێ تیمار[44] و زەعامەت و میرێ ئینکیچەری[45] و سەردار و دزدار[46] و کەتخودایێن ئوسمانی دناڤ حکومەتا ویدا نین. ناڤێ میرێ وێ سەیید خانە و ب ناڤێ میرێ ئامێدی و میرێ عیمادییە و میرێ بەهدینان دهێتە نیاسین.

(ئامید) ناڤێ شاهەکییە کو دەمەکێ حوکم ل ڤی جهی و ل میرگەها خانزادێ [سوران] دکر، لەورا دبێژنە ڤی جهی ئامێدی. د زمانێ عبریدا دبێژنە ئامێدیێ (تل

حریر)، دزمانێ عەرەبیدا دبێژنێ (جبل عقرب) و فارسان دگوتێ (كوهێ كەردووم)، كوردێن لولو دگوتنێ (بەیتا نوور) و كوردێن زازا دبێژنێ (عمادیێ)، و مەغوولان دگوتێ (تل كەیووم) چونكە كیومەرسی ئەڤ جهە ئاڤا كریيە، و رومیان دگوتێ (دارا بیخادووس) ئانكو (هاڤینگەها دارای)، و ئەرمەنیان دگوتێ (...)[47].

د راستیدا من ل هەمی خاكێ عیراقێ كەلایەكا وەكی ڤێ نەدیتیە، ل ئەنادوولێ كەلا ئەفیوون و ل ئەرزەرومێ كەلا (كەماخ) و ل وەلاتێ ئەرمەنان كەلا وانێ و ل ئازەربیجانێ كەلا (ماكو) و ل دیاربەكرێ كەلا مێردینێ و ل عیراقێ ئەڤ كەلا ئامێدیێ هەیە كو زۆر ب ناڤودەنگە. هەتا (یەرمەنیێ مەقدەسی) دبێژیت كو دارا شاهی بۆ ماوەیێ سێ سالان خۆ دڤێ كەلا ئامێدیێ دا ئاسێكر و رۆمیان هندی بزاڤكرن نەشیان وێ بستینن و نەچار بوون ب سەرشوری پاشڤە بزڤرن. ل سەردەمێ تەیموورێ لەنگ ژی ئەوی نەشیا كەلایێن وان و ئەماسیە و مێردین و ڤێ كەلا ئامێدیێ بستینیت و ب بێ ئومێدی و خوسارەتیڤە زڤری. ل وی دەمی ئامێدیێ ژ ١٧٠٠ گوند و ئاڤەدانییان پێكدهات كو پر بوون ژ مرۆڤان لێ نها هەر وەك كەسانێن پیر و دانعەمر دبێژن- بتنێ ژ ٧٠٠ گوند و ئاڤەدانییان پێكدهێت و هەمی خەلكێ وێ دیندار و سوننی و شافعینە.

ژلی میری، ئامێدیێ قازییەك ژی هەیە كو ژ لایێ دەولەتا ئوسمانیڤە ٣٠٠ ئاقچە بۆ وی هاتینە تەرخانكرن، هەروەسا شێخولئیسلامێن [موفتی] هەر چوار مەزهەبێن سوننی ل وێرێ هەنە، ئەڤە ژلی (نەقیب الاشراف) و شاهبەندەر[48] و موحتەسب و (باجدار)ی.

**-(سەنجەق بەگێن) حكومەتا ئامێدیێ:**

حكومەتا ئامێدێ ژ (...)[49]سەنجەق بەگان پێكدهێت كو ئەو هەمی خودان طەبل و ئالانە، بەلێ ئەو نە ژ میرێن ئوسمانیانە بەلكو ئەو هەمی دانپێدانا خۆ ژ میرێ ئامێدیێ وەردگرن و جلكێ حوكمی ل بەر خۆ دكەن، و دناڤ واندا ژی حوكمێ (ئوجاقلق= پشتاویشت) هەیە. و د دەمێ شەڕاندا دگەل میرێ ئامێدێ پشكدار دبن، و د ناڤێ ئەردێ حوكمێ واندا ژی تیمار و زەعامەت نینن. و داهاتێ وان ژی وەك یێ میرێ ئامێدیێ ب ناڤ وان هاتییە توومارکرن، و ل دووڤ قانوونێ دەمێ ئێك ژوان دمریت میرێ ئامێدیێ دێ حوكمێ وێ د دەتە ئێك ژ كور یان كەسوكارێن وی پشتی والیێ بەغدادێ ئاگەهدار دكەت، و ئەگەر ئەوی چ كەسوكار نەبن میرێ ئامێدیێ دێ سەنجەقا وی دانیتە سەر ناڤێ كەسەكێ دی ب مەرجەكێ نیڤا داهاتێ (قەلەمیێ )[50] وێ سەنجەقێ بۆ میرێ ئامێدیێ رەوانە بكەت و نیڤا دی بو والیێ بەغداد بهنێریت و ئەڤە قانوونا سولتان سلێمانییە.

سەنجەق ژی ئەڤەنە:

١- میر لیوایا ئاكرێ

٢- میر لیوایا كەلا شخو ئەوا دبن دەستهەلاتا میر محمد بەگی دا،

٣- میر لیوایا زاخۆ كو دكەڤیتە بەر كنارێ رووبارێ خابوور و سەنجەقەكا مەزنە

٤- میر لیوایا دهۆك،

٥- میر لیوایا مزووری و ئەڤەسەنجەقا هەرەمەزن و خودان پایەیە،

٦- میر لیوایا زێبار و ئەڤەژی خودانێ ٢٠ هزار تفنگدارانە و دكەڤیتە دەشتا دبن ئاكرێدا.

**-(میر عەشیرەتێن)[51]بەهدینان:**

ل ئامێدیێ (...)[52] میر عەشیرەت هەنە، لێ ئەو خودان طەبل و عەلەم نینن، د ناڤ واندا میر عەشیرەتێن سندی و سلێڤانی زۆر مەزنن، ئەو هەردو عەشیرەتە سەر ب سەنجەقا زاخۆڤەنە، ڤان هەردو عەشیرەتان هندەك گوندێن مەزن هەنە كو تێدا مزگەفت، خان، حەمام، و بازارێن ب رەوش و ب هزاران خانی هەنە.

## سالوخدانا شێوەیێ ئەردێ ئامێدیێ:

ئەڤ كەلایە ل سەر چیایەكێ بلند و ئاسێ ژ كەڤرێن رەق ودوربێچدای ب باغ و دارستانان هاتییە ئاڤاكرن، هندەك رێكێن تەنگ و ئاسێ بۆ دچن،

ل هەر چوار كنارێن وێ چیایێن بلند هەنە، دبن كەلێدا گەلیەكێ كووره كو پره ژ دارێن فێقی و وەكی باغێ ئیرەمێ و مێرگێن رضوانییه. ل لایێ وێ یێ رۆژهەلاتێ ب چەند قوناغان كەلا ئاكرێ یە، ب چوار قوناغان ل باكوورێ وێ میرگەها هەكاریانە كو پایتەختێ وێ باژێرێ جولەمێرگێ یە، ل لایێ باكوورێ رۆژهەلاتێ وێ كەلا شخویە و ل باكوورێ كەلا شخو كەلا بەیتا نووره، ئەڤ هەردو كەلایە دكەڤنە سەر سنورێ دناڤبەرا بەهدینان و هەكاریدا. ل لایێ رۆژئاڤایێ ئامێدیێ كەلا دهۆكێیە. و بڤێ پێناسەیا كورت دیاردبیت كو ئامێدی دكەڤیتە نیڤا كوردستانێ و د ناڤبەرا ولاتێ عەرەب و عەجەماندا. و د ناڤ وی كەڤرێ دورێن ئامێدیێ گرتین سەدان هزار جورێن بالندەیان هێلینێن خۆ دروست كرینە!. ئەو رێكێن بۆ كەلێ دچن رەخێن وان وەكی چالا (غەیدان) و (دەركا ئەسفەل) كوور و بێ بنن!. دورێن وێ ب باغ و باغچەنە و ئاڤەكا وەكی ئاڤا حەیاتێ د ناڤرا دبوریت. هەرچەندە گەلەك كەلایێن دی یێن ئاسێ من دیتینە بەلێ ئەو هەمی بچووك بوون، لێ كەلا ئامێدیێ بانیەكا بەرفرەهە و سەر بانێ وێ وەكی مێرگەكێیە كو پره ژ باغ و باغچە و ئاڤاهی و دارێن بلند و كەڤرێن مەزن، و چەند دەمژمێرەك پێدڤییە داكو مرۆڤ بشێت ل دور وێ بزڤریت. خو گورستانا مریان ژی ل سەر بانێ وێ هەیە!، شێوەیێ وێ بازنەیەكێ راكێشایە... ئەڤێ كەلایێ دو دەرگەهـ هەنە: یا ئێكێ ل لایێ رۆژهەلاتێ كو دبێژنێ دەرگەهێ (زێباری)[53]، ئەڤ دەرگەهە ئاڤاهیەكێ دووقاتییە كو دكەڤیتە د ناڤبەرا كەڤرەكێ مەزندا، ل دەمێ فەتح كرنێ ئیمامێ عەلی ب شیرێ خۆ(ذوالفقاری) ئەڤ كەڤرە كەر كریوو، خو دێ بێژی خیاره ب چەقویێ هاتییە برین!!، و نها ئەڤ جهە بـ (مەقامێ عەلی) دهێتە نیاسین وخەلك سەرەدانا وێ دكەن.

ل لایێ رۆژئاڤایێ باژێری دەرگەهەكێ دی هەیە دبێژنێ (دەرگەهێ مزووری)، ئەڤی دەرگەهی ناڤەكێ دی ژی هەیە ئەو ژی دەرگەهێ (مووسل)[54]. ئەو ژی دەرگەهەكێ موكوم و ئاسێیە.

ل دورێن ڤێ كەلێ چ خەندەك نینن چونكە پێدڤی ب خەندەكێ نینە، و ل هەر چوار رەخێن وێ گڤانده و گەلیێن كوورن، ئەو كەلایەكا قودرەتییە [سروشتیە].

## - ئاڤەدانیا كەلا ئامێدیێ:

ل سەر بناخەیێ پێزانینێن دەفتەرا شاهبەندەری، ل ئامێدیێ (...)[55] مالبات و قەسر و خانیێن بلند و نزم هەنە كو ژ بەر و كەڤران هاتینە ئاڤاكرن. ئەڤ خانیە هەمی ب بەر و كسل و ئاخێ هاتینە دانان. یا ژ هەمیان مەزنتر سەرایا خانی (=میری) یە، كو ب رەخ دەرگەهێ مزووری ڤەهاتییە ئاڤاكرن، ئەڤ قەسرا مەزن وەكی كەلایەكێ یە د ناڤ كەلا ئامێدیێ دا، سەرایەكا زۆر مەزنە كو ژ ١٥٠ ژووران دگەل دیوانخانەیێ و حەمام و ئەیوانان پێكدهێت. بەری ١٠١٠ سالان هاتییە ئاڤاكرن وهەر ژوی دەمی هەمی میر ومەلكێن مالباتا عەبباسیان شوونتبلێن خۆ ل سەر هێلاینە. دناڤ ڤێ سەرایا مەزندا مەیدانەك هەیە و ل لایەكێ وێ باغچەیەكێ وەكی باغێ ئیرەمێ هەیە، دناڤ وی باغچەیدا دو سەروێن [كاژ] كەسك وەكی زومروودێ هەنە كو هند جوان و بلندن هەر كەسێ ببینیت نەشێت نەبێژیت ( سبحان الخلاق)، و ژبەر حێبەتیبوونێ تبلا خۆ بكەتە ددەڤێ خۆدا!!. ل نزیكی ڤی باغچەی كەڤرەك هەیە، دەمێ سولتان حسێن ل ئامێدیێ خودانێ پارەلێدان و خوتبەیێ بوو، ئەو بیرەكا ئاڤێ دناڤ ڤی كەڤریدا كولا بوو كو رووبەرێن وێ ٧٠ (گەزێن مەككی)[56] بوون. هەمی خەلكێ سەرایێ بۆ ئاڤێ پشت ب وێ دبەستن. و ل بەرامبەر ڤێ مەیدانێ دەرگەهەك هەیە دێ بێژی دەرگەهێ كەلایەكێ یە.

ل نێزیك سەرایا میری و ب رەخ دەرگەهێ مزووری ڤە قەسرا میرێ زێباریان ژی هەیە، ئەوژی سەرایەكا ئاڤەدان و ب ناڤودەنگ و خەملاندییە. هەر ل نزیك ڤی جهی و ل نزیك دەرگەهێ مزووری قەسرا میرێ مزووریان ژی هەیە، ئەڤە خانەدانێ بەرنیاسێ ئامێدیێ وهەمی كوردستانێ یە. دناڤ مەیدانا گورستانا

بازێریدا سەرایا قازی هەیە و ئەڤ جهە دادگەها شەرعیا میرگەهێ ژی یە. هەمی ژوورێن وێ دکەڤنە ب رەخ بەدەنا کەلایێ ڤە. هەروەسا سەرایا شێخولئیسلام (مەلا...)[٥٧] ژی دکەڤیتە نزیکی ڤی جهی.

## مزگەفتێن ئامێدیێ:

ئەولیا دبێژیت کو گەلەك مزگەفت ل ئامێدیێ هەنە بەلێ بتنێ بەحسێ دو ژوان کرییە:

### أ: مزگەفتا مەزن:

«دکەڤیتە نزیکی سەرایا میری، مزگەفتەکا کەڤنە کو ل دووف مەزهەبێ شافعی بتنێ ل وێرێ گوتارا ئەینیێ دهێتەخواندن. ژ گەلەك ستوون وکڤانان پێکدهێت. ستوونێن وێ ب (رساسی) نەهاتییە پێچان، بەلێ هەر ژ سەری هەتا بنی ب کسلا خوراسانی هاتییە هوونین. هەرچەندە مزگەفتەکا مەزنە بەلێ وەکی مزگەفتێن دی ب چلچرا ومەحفوورێن ئارمیشی نەهاتییە خەملاندن. بتنێ منارەیەك هەیە کو ژبەر ئەردهەژێ نیڤەکا وێ ویران بوویە». وهەرچەندە ئەولیا چەلەبی دیرۆکا ئاڤاکرنا وێ دیار کرییە بەلێ دهەمی دانەیێن پەرتووکا ویدا ئەو دیرۆك ژناڤچوویە و نەهاتییەخواندن!

### ب- مزگەفتا قوباد بەگ [کورێ سولتان حسێنی]:

«ل تەنشتا مزگەفتا مەزن هاتییەئاڤاکرن، لێ ب دروستی تەمام نەبوویە و هێشتا نیڤەروویە!، بەلێ منارا وێ ب تەمامی هاتییە ئاڤاکرن لەورا ژبو بلندکرنا بانگی ئەڤ منارەیە دهێتە بکارئینان، چونکە منارا مزگەفتا مەزن هەلوەشیایە. ژبلی ڤان هەردو مزگەفتێن مەزن هندەك مزگەفتێن دی ژی هەنە وەك (...)»[٥٨].

ل ڤێرێ پرسیارەك خۆ ئاراستەدکەت: ئەرێ ئەو منارا نها ل ئامێدیێ منارا کیژ مزگەفتێ یە؟ ئەرێ هەمان منارا مزگەفتا مەزنە و هاتییە نووژەنکرن یان ژی منارا مزگەفتا قوباد بەگی یە؟ و ب باوەریا مە ئەو منارا نهایا مزگەفتا قوباد بەگی یە، چونکە هەمی ئێك پارچەیە و چ شوونوارێن نووژەنکرنێ تێدا نینن!. هەرچەندە بەرسڤا دووماهیێ بو ڤێ پرسیارێ دێ بو شوینوارناسان بیت.

## خواندنگەهێن ئامیدیێ (دار التدریس):

١- ئەولیا چەلەبی دبێژیت هژمارەکا مەزن ژ خواندنگەهان ل ئامێدیێ هەنە ئەو ژی:

أ- مەدرەسا قازی: ئەڤ خواندنگەهە ژ هەمییا کەڤنترە، و هەرکەسێ ئێکجار دڤێ خواندنگەهێدا بێژیت (بسم الله) دێ بیتە موفەسسر و موحەددس!!. دڤێ خواندنگەهێ دا بیرەکا ئاڤا زەلال هەیە، و د حەوشا وێدا دارەکا کازێ هەیە وەسا بلند کو دگەهیتە ئەسمانی!، و بنهنا بەلگێن وێ دفنا قوتابیان پڕ دکەت[٥٩].

ب-خواندنگەها ئەمیر حاج: ئەڤێ مەدرەسەیێ گەلەك وەقف هەنە. دناڤ پەرتووکخانا وێدا ١٠هزار پەرتووکێن گرانبەها و نایاب هەنە!!!.

ج- خواندنگەها زێباری: ئاڤاهیەکێ مەزنە، پتریا قوتابیێن وێ ژ مللەتێ زێبارییانە.

د- خواندنگەها مورادخانیە: خواندنگەهەکا مەزنە دکەڤیتە نێزیکی سەرایێ، هەر سوختەیەکێ وێ حوجرە، خوارن و شەمالکێن وێ بو دهێنەبکارئینان.

هـ- خواندنگەها مەمخان: ئانکو (مەمی خان)، ئەو ژی ئێکا دی یە.

و: خواندنگەها مەلك ئێزدین: ئانکو مەلك عزالدین، رۆژانە دو جاران شوربایێ دابەش دکەت[٦٠].

ز: خواندنگەها سەییدخان: دبێژنێ (مەدرەسا نوی)، هێشتا نوییە و وەقفێن وێ دئاڤانە، ب رەخڤە کەڤرەك بلند هەیە و د بندا گەلیەکێ کوورە، حاکمێن بەرێ دەمێ ڤیابان ئێکێ بکوژن [سیدارەبدەن] دوی کەڤریدا دهاڤێنە خوارێ، و

ئەو کەسێ گونەهبار پارچەپارچە دبوو. بەلێ ب حیکمەتا خودێ جارەکێ کەسەکێ تاوانبار ژ زیندانێ دەرئێخستن و دڤی کەڤریدا هاڤێتنە خوار، بەلێ دەمێ ئەو مروڤ وەکی بالندەیەکێ ژووردا دهاتە خوار ژ قودرەتا خودێ ١٠ بازێن مەزن ژ کەڤرێ ئامێدیێ فرین و ئەو مروڤێ تاوانبار ب نووکل و پەنجێن خۆگرتن و ل پێش چاڤێن خەلکێ ئەو دانانە بەر سنگێ سەیید موراد خانی و بو هێلینێن خۆ زڤرین!!.

خەلکێ ئامێدێ هەمیان ئەڤ چەندە دیتن و مانەحێبەتی. ئێکسەر مورادخانی فەرماندا کو بەند و زنجیرێن وی بهێنەڤەکرن و گوت: ( ئەی مروڤ، راستیێ بێژە، تو خودانێ چ جورە سێحرەکێی؟ درەوان نەکە، راستیان بێژە، ئەز دێ تە بـەردەم!!). ئەوی جوامێری گوت: (ب خودێ خانێ من، من د خەو دا حەزرەتێ یووسفی دیت، ئەوی گوتە من: وەی تو ب خۆشی هاتی ئەی هەڤالێ من یێ زیندانێ!، ئەی مێهڤانێ رێزدارێ من! نەترسە، ب ئانەهییا خودێ سوباهی سپێدێ ئەم دێ تە ب ١٠ فریشتەیێن خودێ راسپێرین. تو ژی وەکی من دێ ب سەلامەتی ژ زیندانێ دەرکەڤی. پاشی سێ جاران هەمی کەلەخێ من ڤەگڤاشت و پاشی بەرزە بووا!!. پاشی ئەز ژ خەو هشیار بووم و من سەحکرێ هەمی بەند و زنجیرێن من یێن ڤەبووین!، ڤێجا ژترسێن زێرەڤانان من زوو جارەکا دی دەستێن خۆگرێدان. پشتی نڤێژا سپێدێ زێرەڤان هاتن و ئەز برم دەڤ جەلادی و بێ پرس و دووڤچوون هەما ئەز گرتم و دڤی زناریدا هاڤێتم خوار، دەمێ وان ئەز هاڤێتیم ژ بزاڤا گیانێ خۆ من سێ جاران گۆت (یا اللە)! پاشی من ١٠ فریشتە دیتن کو خۆ د من وەرکرن و ئەز هێدی دانامە سەر ئەردی)!.

دەمێ ئەو کابرا ژ گۆتنا خۆ تەواو بووی موردخانی دەستێ وی ماچیکر و لێ خۆش بوو و بەردا، و ٣٠٠٠ زێر ژی دانێ و فەرماندا رۆژانە خوارنا خێزانا وی ژی بهێتە دابینکرن. من ئەڤ چیروکە ژ هندەك ژ خەلکێ ئامێدیێ بهیست کو وان ئەڤ چەندە ب چاڤێن خۆ دیتبوون!!. و نها مەدرەسە ب رەخ وی کەڤریڤە هاتییە ئاڤاکرن، و گەلەك صوفی و زاهد سەرەدانا وی کەڤری دکەن، و هندەکێن دی ژبەر پیروزییا وی جهی سەرەدانا زیندانا وی دکەن و ل وێرێ عیبادتی دکەن[١١].

## ح: خواندنگەها سولتان حسێن [قوبەهان]:

پێزانینێن ئەولیا چەلەبی سەبارەت ئەڤێ خواندنگەهێ نوو و ئێکجار گرنگن، چونکە ئەوی ب خۆ سەرەدانا وێ کرییە و ب جوانی بەحسێ وێ کرییە، پێزانینێن وی گەلەك گەنگەشەیێن دناڤبەرا ڤەکولەرێن دیروکا ڤێ خواندنگەهێدا ئێکلایی دکەن. ئەولیا دبێژیت: « ئەڤ خواندنگەهە دکەڤیتە دبن کەلایێدا، دناڤ باغ و بووستاناندا، هند مەزنە دێ بێژی کەلایە، ل سەر بانێ وێ ١٦ قوببەیێن [گومبەدێن] موکوم هەنە، ژ ٦٠ حوجرەیان پێکدهێت، و دناڤ حەوشا وێدا برکەکا ئاڤێ و جوبار و نافورێن ئاڤێ هەنە، و ل هەردو رەخێن جادەیا وێ گول چاندینە. ل زڤستان وهاڤینان دناڤبەرا ٣٠٠-٤٠٠ قوتابیان تێدا دخوونن، وهەمی جورێن زانست وهۆنەران تێدا دهێنە خواندن، هەر ژ زانستێ ئەرستووی هەتا زانستێ سروشتی!. ژمارەیەکا مەزن ژ باغ و بووستان و دوکان و ئاشەکێ ئاڤێ ب رەخڤە هاتییە ئاڤاکرن و داهاتێ وان وەقفا مەدرەسێ یە، ئەڤە ژبلی داهاتێ دیر و کەلیسە وجزیا ٥٠ گوندێن مەسیحیان[١٢]. مامۆستایێ مەزنێ وێ [رێڤەبەرێ وێ] شێخولئیسلامێ [موفتیێ] میرگەهێ یە. ل مێڤانخانا وێ رۆژانە دو دانێن خوارنێ ددەت. و چونکە ئەڤ خواندنگەهە ب رەخ پرا (قوبەهان) هاتییە ئاڤاکرن لەورا ب ناڤێ (مەدرەسا قوبەهان) دهێتە نیاسین، بەلێ ئاڤاکەرێ وێ سولتان حسێنە، لێ پتریا کوردان دبێژنێ (مەدرەسا قوبا). ب کورتی دبێژم ئەز ١١ سالان ل وەلاتێ کوردستانێ گەریامە بەلێ من چ خواندنگەهێن وەکی ڤێ نە دیتینە!.

هەرووەسا ئەولیا چەلەبی بەحسێ خواندنگەهێن زارۆکان (دار التعلیم الصبیان) وتەکیەیێن دەروێشان ژی دکـەت، بەلێ مخابن دهەمی دەستخەتێن پەرتووکا ویدا ئەڤ بەرپەرە تێکچوویە یان ڤالایە و

بتنێ رستەیا «ژمارەیەك ژێ هەنە» مایە[٦٣].

ل داوییا ئاخفتنا خۆ ئەولیا چەلەبی دبێژیت:«ل ئامێدیێ چ خواندنگەهێن تایبەت ب حەدیس و خواندنا قورئانێ نینن، بەلێ دهەمی مەدرەسەیاندا زانستێ تەجوید و حەدیسێ دهێنەخواندن، بەلێ ئەو گەلەك گرنگیێ ب ژبەرکرنا قورئانێ نادەن ودبێژن: (کەس ب ژبەرکرنا قورئانێ نابیتە زانا)»![٦٤].

## - حەمامێن ئامێدیێ:

ل ڤی باژێری حەمام هەنە لێ وەکی یێن جهێن دی روهن نینن، حەماما وێ گەلەك مەزن و کەڤنە، بەلێ ژبەرکو خەلکێ ڤێرێ گەلەك ب غیرەتن لەورا حەمامێن ژنان نینن. بەلێ وان هەمییان حەمامەك ل مالێن خۆهەنە.

## - ئاڤا ئامێدیێ:

ل ژێریێ ئامێدیێ و دبن پرا قوبەهاندا دو رووبارێن ئاڤێ دبوورن، هەر ئێك ژ وان وەکی کانیا حەیاتێ و ئاڤا کەوسەرێ یە!، یا ئێکێ دبێژنێ « سەرکەهنیا موزگان- serkehniya m⊠zgan»، ژ چیایان دهێتەخوارێ و دبن ڤێ پرێ را دەرباس دبیت. یا دی دبێژنێ «کەهنیا خاتوونێ»[٦٥]. ژ چیایێن (بشیشێ) دهێتەخوار و درێکا خۆدا چەندین کەلا و گوندان ئاڤی دکەت، پاشی ل بن پرا قوبەهان دگەل رووبارێ دی تێکەل دبیت و باغ و بووستانێن ئامێدیێ ئاڤ ددەت. پاشی دگەل رووبارێ خابووری تێکەل دبن!! و ژلایێ خۆڤە خابوور ژی درێژیێتە رووبارێ دیجلەدا.

ل لایەکێ دی رووبارەکێ دی یێ بچووك دبن کەلێدا هەیە و باغ و بووستانێن میری ئاڤ ددەت. ئەڤی رووباروکێ دبێژنێ «کەهنیا سنجە»[٦٦]. ئەڤ کانییە ژی ژ چیای دهێتەخوار و ل نزیك پرا قوبەهان دگول کانییا خاتوونێ تێکەل دبیت.

ژبلی ڤان، رووبارێ (هیزل) ژی هەیە کو ژ چیای دهێتەخوار و ل نزیك کەلا زاخۆ دگەل رووبارێ خابوورێ سندیان تێکەل دبیت. و ئەو کەسێ بڤێت ژ جزیرێ بێتە ئامێدیێ ل بەراهیێ ل سەر پرەکێ دەرباس دبیت کو ل سەر دیجلەی هاتییە ئاڤاکرن، پاشی دێ پرا ل سەر رووبارێ هیزل دەرباس کەت و گەهیتە ئامێدیێ.

## - ژێدەرێن ئاڤێ ل سەر بانێ کەلێ:

ژمارەیەك ژ بیر و سێریچێن ئاڤێ ل سەر بانێ کەلا ئامێدیێ هەنە، یا ئێکێ بیرەکا مەزنە و دکەڤیتە د ناڤ سەرایا میری دا و دناڤ کەڤرەکێ رەقدا هاتییە کولان، زمان نەشێت پەسنا مەزنیا وێ بکەت، دەمێ سولتان حسێنی خیلافەت برێڤەدبر ئەوی خەرجییەکێ مەزن ل ڤێ بیرێ کر و ئەو دناڤ کەڤریدا نکراند و٧٠ (ئارشینان)[٦٧]کووره. هەر تێهنییەکێ هەبیت ژ وێ ئاڤێ ڤەدخوت و دوعایا بۆ خودانێ وێ دکەت. ب رەخ مەدرەسا قازی ڤە بیرەکا دی یا ئاڤێ هەیە، خەلکێ تاخی ژ وێ بیرێ ڤەدخون. ل نێزیك گورستانێ ل دەڤ دادگەهێ بیرەکا دی هەیە. ل مەدرەسا سەیید خانی ژی سێ بیرێن ئاڤی هەنە، هەر ئێك ژ یادی خۆشترە، بیرا ژ هەمیان مەزنتر دروست ٦٠ گەزان کووره. ل دەڤ دەرگەهێ مزووری ژی بیرەکا ئاڤێ هەیە دبێژنێ (لولووب) ئاڤا وێ وەکی ئاڤا کەوسەرێ یە!. هەروەسا بیرەکا ئاڤێ ل دەڤ حەمامێ هەیە، و بیرا مزگەفتا مەزن ژی ل هەیڤا تیرمەهێ ئاڤەکا وەسا تەزی ژێ دزێت دێ بێژی شلوڤەیە!.

زێدەباری ڤان بیران ژمارەیەکا سێریچان ژی ل ئامێدیێ هەنە کو دناڤ کەڤریدا هاتینەکولان کو هەرئێك وەکی دەریاچەیەکێ یە!. ئاڤا بارانان دناڤ وان سێریچاندا دهێتە ئەنبار کرن. هندەك کەسێن وەکی (فەرهادی)[٦٨] ئەو کەڤرە کولاینە و جوییێن ئاڤا بارانێ بۆ وان سێریچان کێشاینە، ل دەمێ شەڕ و دورپێچاندا خەلکێ ئامێدیێ تێهنا خۆب ئاڤا وان بیر و سێریچان دشکێنن.

## - سالوخدانا سەبیلخانەیان:

بو رێکا خودێ و ژ بو خێرخوازیێ ل هەمی قولاچ و قورنەتێن بازارێ ئامێدیێ دا هندەك سەبیلخانە هاتینە ئاڤاکرن داکو خەلکێ بیانی و دەربەدەر ژێ

ڤەخون. هەروەسا ل سەر رێکێن سەرەکی چەندین دەن و حەنەفیێن ئاڤێ هاتینەدانان داکو خەلك ژێ ڤەخون. ئاڤا ڤان سەبیلخانەیان ب رێکا کەر و دەواران ژ بیرێن ئاڤێ دهێنەکێشان.

## - سالوخدانا کەلیسا و دێرێن (نەپیروز!)[19]:

ژمارەیەك ژ دێر وپاتریك و قەشە و راهبێن مەسیحیان ل ئامێدیێ هەنە، بەلێ کلیسایێن فرەنگی و رۆمی و قوبتی ل ڤێرێ نینن، لێ ژ بو بازرگانیێ هاتنوچوونا گوندێن مەسیحیان دکەن، چونکە ل ڤی وەلاتی فرەنگی و رومی و سەگ وەکهەڤ دهێنە ل قەلەمدان و ب ئێکجاری حەز ژێ ناکەن!. مللەتێ ئامێدیێ ناچنە د وی جهی دا ئەوێ سەگ یان کەسەکێ مەسیحی تێدا بیت!. و ئەو تێکەلیا بازرگانی دگەل کافر [مەسیحی] و قزلباشان [صەفەوی- شیعە] ناکەن. مەسیحیێن ئامێدیێ ئەرمەنییێن یەعقووبی و(جیلو) نە[70].

ل چیایێن گەرمیانا ئامێدیێ کوردێن ئێزدی، چەکوانی، خالتی و باپیری دژین. ئەڤ مللەتە زۆر حەز ژ سەگان دکەن و سەگپەرەستن[71] !!، لەورا خەلکێ ئامێدیێ هەردەمێ وان ل ئامێدیێ ببینن ئێکسەر وان دکوژن!. ب کورتی خەلکێ ئامێدیێ گەلەك موسلمان و یەکتاپەرەست و سوننی و شافعی نە وخوگوریکەرێن رێکا خودێ نە.

## - ژیان و ژیارا خەلکێ ئامێدیێ:

پشکەك ژ خەلکێ ئامێدیێ لەشکەرێ میری نە، ئەو سەربەندێن (ئالاجە)[72] ب سەرێن خوڤە گرێددەن و پەرێن قولنگان یان کورێن حەفتیاران دکەنە د بەررا، دگەل کورکێن ژ کەڤلێ سڤورە و قوربەشك و رووڤیان و خفتانێن ئەتلەسی، و دبەر کەمەرا وانرا شویر خەنجەرێن وان دیار دکەن، و پێلاڤێن (پوچوکلی) دکەنەپێن خۆ و زێرەڤانیێ ل دەرگەهێن کەلێ دگرن. هەردەم مەتال و دەستبەند و زری وچەکێن دی ل بەر خۆدکەن و دخزمەتا میریدانە. گروپەکێ دی بازرگانن کو پرتالێ بەغداد، دیاربەکر، مووسل، شەهرەزۆر، حسن کەیف و مێردینێ دئیننە ئامێدیێ. هندەکێن دی خودان پیشەنە کو شەل و شەپك و پیلاڤێن (چارك) دکەنە بەر خۆ و دناڤ بازاریدا کار دکەن. هندەکێن دی زانا و موفەسسر و موحەددسن، و هەروەك د دەفتەرا تومارا (مەلا شیروی)[73] دا هاتی هژمارا وان ل ئامێدیێ ٤٣ هزار زانا و مەلانە!!، و ئەڤەهەمی ژ دانا خویك و باجان د ئازانە. بەلێ ئەڤ زانایە ژێ خودان شویر و خەنجەرن و ل دەمێ شەڕاندا وەکو پەهلەوان و قەهرەمانان پشکداریێ د شەڕاندا دکەن. پشتی ڤان خەلکێ ئاسایی دهێن.

## -زاراڤێ تایبەتێ ئامێدییان:

ژبەرکو کوردستان وەلاتەکێ مەزنە و هەمی چیا و دولن، لەورا خەلکێ وێ ژێ چیایی و پشتەرێ وسەرکەشن، پتریا مێژوونڤیسان گوتینە کو کورد ل سەر ٧٠٠٠ جوران دابەش دبن!!، بەلێ ل دووڤ گەریان و دیتنێن من وەلاتێ کوردان ژ ٢٤ هزار جهـ و واران پێکدهێت کو هەر هزارەك ژ وان جورەك ژ زاراڤ و دەڤوکان هەنە!. و هەرئێك ژڤان دشێت ب زاراڤێ ب رەخ خوڤە باخڤیت، بەلێ ئەگەر ئەوی ئەردێ دو ژڤان یەکەیان دەرباس کر هینگێ ژبو تێگەهشتنا زمانێ وان پێدڤی ب وەرگێرەکێ یە.

بۆ نمونەکوردێن کەلایێن: ئاڤنیك، ضیاءالدین، خنوس، کیغی، مامەرڤان و مەلازگرد ل ویلایەتا ئەرزەروم ب زاراڤەکێ تایبەت دئاخڤن، ل ویلایەتا وانێ پنیانشی و مەحموودی ب زاراڤەکێ تایبەت دئاخڤن و هەکاری، وپیزانی، شاتاخی، جولەمێرگی و جیلویی ب زاراڤەکێ دی دئاخڤن[74]. زاراڤێ بەدلیسیان رۆژکیە و زمانێ پسیانیان [بایەزید] جورەکێ دی یە. زمانێ زازا ب رەنگەکێ یە و زمانێ لولویان ب رەنگەکێ دی. مللەتێ باپیری ل چیایێ شنگارێ ب زمانەکێ سەیر دئاخڤن کو کورد تێناگەهن، و زمانێ خەلکێ حەریرێ [سوران] ژێ جورەکێ دی یە.

زمانێ ئەردەلان هەر چەندە زۆر پەتی و پاكە، لێ ئەو گەلەك كورتكرنان بكار دئینن، بو نمونە: پەیڤێن (آب بدە) دكەنە (ئاڤ بێهـ). و بڤی رەنگی چەند سەد هزار زاراڤێن جودا جودا هەنە كو ئەم نەشێن بەحسێ هەمیان بكەین. و زمانێ سورانی ژی جورەكێ دی یێ زمانێ نازكە.

هەروەسا كوردێن ئێزدیێن خالتی ژی ب زمانەكێ دئاخڤن كو ژ كوردەكێ دی تێناگەهیت، ئەوژی وەكی تەتارێن (بادجاك ل قرم و تەتارێن شیداك و تەتارێن چوپان و هوزا ئەرسەلان و هوزا نوروز و هوزا دەڤەی و هوزا ئولوتووغان و كوچی تووغان و ئورووم بەت و تووغای و تەتارێن كیلماخ، كا چەوا ئەڤە هەمی د ئەزمانێ ئێكودوو ناگەهن هەروەسا كورد ژی ژ ٢٤ زمانا پێكدهێن كو ئەو زمانێن ئێكودو نزانن.

زمانێ ئێزدیێن چەكوانی ژی تێكەلەكە ژ زمانێ ئەرمەنی، و زمانەكێ بێ سەروبەر و بەرمایێ زمانانە!.

هەرچەندە هاتییە گوتن (عەرەبی پەتیە، عەجەمی نازكە، توركی كرتەو یێن دی پیسن)[٧٥]!. بەلێ دناڤ كوردانداژی زمانێن پەتی و پاك هەنە وەكی كوردێن حەزو [ساسون] و كوردێن شیروی[٧٦] و كوردێن (...) [٧٧]. وێنە ٣

بەلێ دناڤ هەمی زمانێ كوردیدا پەتیترین، زەلالترین و سڤكترین زمان زمانێ خەلكێ ئامێدییا بەهدینانە، ب گوتنا زانایێن ئامێدیێ حەزرەتێ یوونس ب زمانێ كوردییا ئامێدیێ دئاخفت، و ئەو پشت ب حەدیسەكا دروست دبەستن كو دبێژیت: ( زمانێ خەلكێ بەهشتێ عەرەبی و فارسیا دەری یە[٧٨] )[٧٩].

ئەو دبێژن: (ئەگەر هوسا بیت زمانێ مەژی چەڤەكێ زمانێ فارسییە). و بڤی رەنگی خەلكی ئامێدیێ شانازیێ ب خۆ دبەن و بەیتێن جوانێن هوزانان ب زمانێ خۆدڤەهینن.

بەحسا هوزانێن ب زمانێ پاكێ كوردێن ئامێدیێ هاتینە گوتن هوزانا مەلایێ زانا رەمەزانێ عەبباسیان

رایێ ل (ئاصف) دكەن والە و حەیران عشق
دەرسێ ئەرەستوو ددەن سەرخۆەش و سەكرانێ عشق
عەقلێ كوللی ئەرێتە نێڤ مەكتەبا عشقێ دەمەك
دێ ببیتە موضحكێ طفلێ هەوەس خوانێ عشق
دەفع حەرارەت دكەت ما ژ دلێ زەمهەریر
لا یەزالی گەرمیا ئاتەشێ سوزانێ عشق
دێ بسوژت عالەمێ ئاهێ شەرەربارێ دل
گەر هەبتن كافكی مانع تووفانێ عشق
من حەسەدا كوفر بوو داغ ل ئیمانە لەو
سەرگەڕ و پێخواس دچووم دامەنێ راهبانێ عشق
داغێ نهانی مە لەو ئەشكرە ظاهر كرن
ئەمرێ چراغان كرە خوسرەوێ خوبانێ عشق
كێ ژ ضەمیری بخۆ[٨٠] خوو كو تەرەششوح دكەت[؟؟]
بیدە ببت مەعدەنێ لەعلێ بەدەخشانێ عشق
غونچەیێ بوستانی ئەگەر بەندێ نیقابێ ڤەكت
لال ببت بێ گومان مورغێ گولستانێ عشق
فاش مەكە رازێ خۆ ئەی رەمەزان كوردكی [٨١]
شەممە نسیمی دبی تازی و عوریانێ عشق[٨٢].

**پەرتووك ب تیپێن لاتینی یێن تركی**

Evliyâ Çelebi b. Derviş Mehemmed Zıllî

EVLİYÂ ÇELEBİ
SEYAHATNÂMESİ

IV. Kitap

Topkapı Sarayı Kütüphanesi Bağdat 305 Numaralı Yazmanın Transkripsiyonu - Dizini

Hazırlayanlar
Yücel DAĞLI - Seyit Ali KAHRAMAN

وێنەیێ (٤)
دەقێ هوزانێ ب تیپێن لاتینی

Der-beyân-ı eş'âr-ı pâkîze güftâr-ı
lisân-ı kavm-i Ekrâd-ı İmâdiyye,
güfte-i Monlâ-yı âlim-i Ramazân-ı
Abbâsiyân

*Re'yi'l-esef -i dikken, vâlih u hayrân-ı ışk*
*Ders-i Aresto diden, serhoş-ı sekrân-ı ışk*

*Akl-ı kül irbît -i nîf, mekteb-i aşkî dimek*
*Di bibitîn mudhıkî tıfif-ı heves hân-ı ışk*

*Def'-i harâret diket, Maj dilî- i zemherîr*
*Lâyezâl-i ger miyâ, âteş-i sûzân-ı ışk*

*Di basîjet âlemî, âh-ı şerer-bâr-ı dil*
*Ger hebeten kâfigî, mâni'-i tûfân-ı ışk*

*Men hasedâ küfr-i bu, dâğ-ı lâ yemân-ı lû*
*Sergerûbî hâs de çum, dâmen-i râhibân-ı ı*

*Dâğ nihânî-i meh lû, eşgere zâhir keren*
*Emr-i çerağân keren, Hüsrev-i hûbân-ı ışk*

*Kej zahîrî beho, hûn-ı kuter nesc-i diket*
*Dide dibet ma'deni la'l-i Bedahşân-ı ışk*

*Gonca-i bostân eğer, bende nikâbî feket*
*Lâl-i dibet bî-gümân, murg-ı gülistân-ı ışk*

*Fâş meke zâr-ı heve, ey Ramazân-ı Kürdig*
*Şemme nesîmî debî, tâzı vü uryân-ı ışk.*

خەلكێ ئامێدیێ گەلەك هۆزانێن پێنج بەیتی، موسەلەس، موخەممەس، موسەددەس، موسەببەع وموسەممەن ب كوردی دڤەهینن، ول رۆژێن نەوروزێ ئەو هەمی ب مەزن و بچووك و زانا و نەزانڤە ل سەر رێكان دراوەستن و هۆزانان دهاڤێنە بەر ئێكودوو)[٨٣].

سەیرانگەهێن ئامێدیێ: ل دەستپێكێ دبن كەلێدا و ل نزیك مەدرەسا قوبەهان و ب رەخ رووبارێ (كەهنیا سنجە) سیبەرەكا خۆش هەیە، و ل وێرێ بركەكا ئاڤێ هەیە كو وەكی دەریاچەیەكێیە، چەندین هزار دلدارێن راستگوییێن دلبەران دناڤدا مەلەڤانیێ دكەن، ل وێرێ جادەیەك هەیە ل هەردو رەخێن وێ چنار، بیشەنگ، كاژ، گول و گولستان هەنە كو عەقلێ مروڤی ژ سەرێ مروڤی دبەن! دبن ڤان سیبەراندا چەندین دیوان و توشك و كورسیك وجهێن روونشتنێ هەنە، خەلك دگەل كەسوكار و خوشتڤیێن خۆ ل ڤی جهی كوم دبن و صوحبەتێ دكەن. و ب سەدان هزار جورێن چیچك و بلبل و بالندەیێن خۆشخوان ب دەنگ و نەوایا خۆ رەوشا عاشقان بخەملتر دئێخن. ئەو جهـ هند خۆشە كو دناڤ عەرەب و عەجەمان و دناڤ هەمی كوردستانێدا جادەیا قوبەهانێ یا بناڤودەنگە. هەروهسا حەفتێ سەیرانگەهێن دی دناڤ چیایاندا و ل رەخێن كانییێن زەلال هەنە كو ئەگەر ئەز پەسنا وان هەمییان بكەم جهێ وان دناڤ ڤێ سیاحەتنامەیێدا ناكەت. ئەڤ سەیرانگەهە دكەڤنە پشت چیایێن بلندێن ل دورێن ئامێدیێ و دناڤ گەلیێن كووردانە، لەورا ژبو گەهشتنا وان سەیرانگەهان دڤێت ب هەسپان بچن، و ل وێرێ نێچیرا كەو و سووسك و پوران دهێتەكرن. و ل سەر وی چیایێ بلند پلنگ و كتكێن كیڤی (گیڤر) و پەز كیڤی و خەزالێن چیایی دهێنە دیتن. ل ڤی جهی هند كەو و سووسك دهێنە نێچیركرن كو شەش هەیڤێن تەمام خەلكێ باژێری بتنێ گوشتێ نێچیركری دخون!.

## - ژمارا باغ و باغچەیان:

ل دویف دەفتەرا شاهبەندەری (...)[٨٤] باغ و باغچە ل ئامێدیێ هەنە، دناڤ وان دا ئەو باغێن دكەڤنە بن كەلێ ب رەخ رووبارێ سنجەڤە یێن میرێ ئامێدیێ نە. باغەكێ وەسانە كو زمان ژ پەسنا وێ بێ شیانە. پاشی باغێ میرێ مزووریان و باغێ میرێ زێبارییان ژی دهێت. هەروەسا باغێن مەدرەسا قوبەهان و باغێ موفتی.

## - مێڤانخانەیێن ئامێدیێ:

سەرجەمێ وان ٦ مێڤانخانەنە، ل هەمی مەهێن سالێ دەرگەهێن وان ژ بۆ رێڤینگان و بۆ میر و گەدایان ڤەكرینە. یا ئێكێ دكەڤیتە سەر كەلایێ د ناڤ سەرایا میری. بەری ٨٠٠ سالان ژلایێ بنەمالا عەبباسیان ڤەهاتییە دانان، رۆژانە دو دانێن خوارنێ تێدا دهێنە دابەشكرن و ئاگرێ لێنانگەها وێ هێشتا نەڤەمریە!. هەروەسا ل هندەك مەدرەسەیان

ژی نەبتنێ بۆ خویندکاران بەلکو بۆ ڕێڤینگان ژی سێنیکەکا پـەلاڤ و شـوربایێ و نانەك دهێتە بەرهەڤکرن.

## - مەزارێن چاك و وەلیان ل دەرڤەی ئامێدیێ:

ل نزیك مەدرەسا قوبەهان مەزارێ ئیمام محەمەد باقری هەیە کو ئەو کورێ ئیمام زین العابدینی یە. بەلێ گەلەك کەس دبێژن کو ئەڤە نە محەمەد باقر بخۆیە، بەلکو کەسەکێ دی یە کو هەمان ناڤ هەیە!؟.

هەروەسا زیارەتگەهەکا دی ل دەڤ دەرگەهێ زێبار هەیە ئەو ژی کەڤرەکە کو ئیمامێ عەلی ب شیرێ خۆ کر بوو دو کەرا، هەروەسا مەزارێن سولتانێن کەڤنێن عەبباسیان کو باب و کالێن میرێ نها سەیید خانی نە.

سوپاس بۆ خودێ من سەرەدانا مەزارێن ئامێدیێ ژی کر. ئەز چەند رۆژان ل ئامێدیێ مام و من سەرەدانا چەندین کەلایێن کوردان کرن و من چەندین کەس ژ ماقوولێن مالباتا عەبباسیان نیاسین، ومن سەرەدانا چەندین جهێن سەیر و خۆش کر. ل وان رۆژان شەڤێن مە وەکی شەڤێن قەدر و رۆژێن مە وەکی جەژنا نەورۆزێ بوون. و ل رۆژا (...) هەیڤا (...)[85]سالا ١٠٦٦مش [١٦٥٦ز] ئەز و کەتخودایێ مورتەزا پاشای ژ ئامێدیێ دەرکەفتین پشتی مە خاترا خۆ ژ میری و دوست و هەڤالان خواستی. میری ٥ کیسێن زێری ژبۆ مەزاختنێن رێکێ و ٥ هەسپێن رەش و قەتارەکا هێستران ژ خوارن و نانێ تەنك و گەلەك تشتێن دی، و ئامانێن گرانبەها وقوماشێن ئارمیشی دانە کەتخودایێ پاشای. هەروەسا کیسەکێ پارێ زیڤی و دو هەسپ و بارێ سێ حێشتران ژ پەڕوکێن نایاب وگرانبەها و شویرەکێ شێخانی ب دەستکەکێ (مەعرڕەوی)[86] و خولامەکێ گورجی! پێشکێشی من کرن.

هەروەسا میری نامەیەك بو والیێ بەغداد مورتەزا پاشای و نامەیەکا خۆکێمکرنێ بۆ سەروەرێ من (مەلك ئەحمە پاشای)[87] هنارت. سێ ئالایێن تڤەنگداران ژبۆ زێرەڤانی دانە دگەل مە، دەمێ ئەم دگەل ٣٠٠ زێرەڤانان ژکەلایێ هاتینەخوار و گەهشتینە دەڤ ئاشێ ئاڤێ ئەوێ ل نێزیك مەدرەسا قوبەهان، کەتخودایێ مورتەزا پاشای گوتە من: ( ئەی ئەولیا، ئەز ئێکسەر ناچمە بۆ بەغدادێ، من گەلەك پارە ب قەر دایە هندەك ماقوولێن ئامێدی و جزیر و سێرتێ، و نها خۆش دەلیڤەیە کو ئەز وان قەران کوم بکەم، لەوڕا پێدڤیە ئەز بچمە وان دەڤەران).

و درێکا خۆدا مە سەرەدانا ڤان جهان کر:

### ١- کەلا ئەرزا شرین:

هندەك ژ کوردان دبێژنێ (ئەرس)، بەلێ د راستیدا ئەرس دکەڤیتە وەلاتێ عەجەمان دناڤبەرا رەوان و گەنجە و نیازئاباد دا[88] ، و ئەڤ ئەرزا ئامێدی یا کوردستانێ ژی ب ناڤێ ئەرس دهێتە نیاسین. ئاڤاکەرێ وێ کەسەکە ژ بنەمالا عەبباسیان[89] ب ناڤێ سولتان حسێن عەزاز، لەوڕا ناڤێ وێ بوویە (ئاراز)، پاشی ب شاشیڤە ل سەر زمانێ خەلکێ بوویە (ئەرز)!. کەلایەکا چوار گوشەیە دکەڤیتە سەر گوپیتکا چیایەکێ بلند، چ خەندەك ل دورێن وێ نینن و بتنێ دەرگەهەك هەیە. میرێ وێ کەتخودایێ میرێ ئامێدیێ یە و ناڤێ وی (...)[90] ئاغایە. خودانێ ٤هزار سەربازێن تفنگدارە. و چونکە ئەڤ کەلایە ئەردێ (خاص)ـێ میرێ ئامێدیێ یەو ژلایێ ئێك ژ کەتخودایێن وی ڤەدهێتە برێڤەبرن لەوڕا دبێژنێ (ئەرزا شرین)!.

### ٢- کەلا بالتا [مالتا]: ...

دبن حوکمێ میرێ ئامێدیێ دایە ودکەڤیتە سەر رێکا مووسلێ. قوناغەکێ ژ دهۆکێ دوورە. کەلایەکا بچووکە بەلێ گەلەك گەلەك ئاسێ یە. ئاڤاهیەکێ چوار گوشەیە و شوورهەکا زور موکوم هەیە و ل سەر گرەکێ بلند هاتیە ئاڤاکرن، بەلێ ئەز نەچوومە دناڤدا. ل وی دەمی حاکمێ وێ کەسەك بوو ب ناڤێ (شێخ پیرم ئاغا)، کەسەکێ مێرخواز و

ئازایە و خودانێ ١٠ هزار تفنگدارانە، بەلێ پتریا وان ژ کوردێن ئێزدی نە و موسلمانێن وێ هەمی سوننی و شافعی و میرخواز و عەگیدن.

## ٣- کەلا نیشابوورا کوردان:

دکەڤیت باکوورێ کەلا مالتا، باژێرەك ب ڤی ناڤی ل خوراسانێ ژی هەیە، بەلێ ئەڤ نیشابوورە دکەڤیتە دبن حوکمێ میرێ ئامێدیێ دا. وکەلا ب کەڤران هاتییە ئاڤاکرن، (...) ئەگەرێ ناڤلێکرنا وێ (...) .

## ٤- کەلا دهۆك:

(ئاڤاکەرێ ڤێ کەلێ ئێکە ژ وەزیرێن عەبباسیان ب ناڤێ (دهوکێ دەقان)! لەورا دبێژنێ (دهۆکا دەقانی). ب زمانێ کوردی دبێژنێ (دوو هووك D⊠h⊠k) و دەقان ناسناڤێ وی یە. ئەڤە ژی کەلایەکا سەر ب ئامێدیێ ڤەو خودانێ ٦ هزار سەربازانە، و دناڤ حکومەتا وێ دا تیمار و زەعامەت نینن. حاکمێ وێ ب شێوەیێ (مولکییەت) و(پشتا و پشت) حوکمێ وێ برێڤە دبەت. جهێ وێ دکەڤیتە رۆژهەلاتێ مووسلێ دناڤ چیایاندا و کەلا وێ کەلایەکا بەرفرەهە کو دکەڤیتە قونتارا چیایەکێ و ب کەڤرێن مەزن ورەق هاتییە ئاڤاکرن. ئەو کەلایەکا موکوم و شێوەیێ وێ پێنج گوشەیە).

هەژی گوتنێ یە کو ئەولیا چەلەبی ل دو جهێن دی ژی بەحسێ دهۆکێ دکەت، یا ئێکێ دەمێ سەرەدانا باژێرێ هەمەدان کری بەحسێ نەشتەرگەرەکێ دهۆکی دکەت و دبێژیت:(ل باژێرێ هەمەدان نەشتەرگەر زور کێمن، چونکە دڤی زانستیدا گەلەك (هەبلەنە)!، دەمێ هەڤالەکێ من ژ هەسپێ خۆ کەفتی و برینەکا بچووك بۆ چێببووی مە ب کوتەکی مرۆڤەك دیت کو نەشتەرگەریێ بۆ برینا وی بکەت، ئەو کەس ب ئەسلێ خۆ ژ دهۆکا ئامێدیێ بوو)![٩١].

یا دووێ دەمێ بەحسێ مزگەفتەکێ ب ناڤێ دهۆك ل باژێرێ قەزوین دکەت و دبێژیت:(کەسەکێ زانا ژ بنەمالا عەبباسیان ب ناڤێ شێخ دهۆك ئەڤ مزگەفتە ئاڤا کرییە، شێخ دهۆك هەر ئەو کەسە ئەوێ کەلا دهۆك ل ئامێدیێ ئاڤا کری)[٩٢]!. و دڤێت ژیر نەکەین کو ئەولیای بەری نوکە گوتبوو کو ئاڤاکەرێ دهۆکێ ئێك ژ وەزیرێن عەباسیانە ب ناڤێ دهۆکێ دەقان!.

## ٥- باژێرێ زانایێن کاشی، ئانکو کەلا کەواش:

ل وەلاتێ هەکاری درێکا وانێ دا باژێرەك ب ناڤێ کەواش هەیە[٩٣]، بەلێ ئەڤە سەر ب ئامێدیێ ڤەیە و ل ژێر حوکمێ (...)[٩٤]. ل سەر گرەکی هاتییە دانان لێ گەلەك ئاڤا نینە. بەلێ ل سەردەمێن کەڤن باژێرەکێ ئاڤەدان بوو، ژ کومەکا خانیان پێکهاتییە بەلێ کەلا وێ ل گڤاندەیەکێ هاتییە ئاڤا کرن و رێکا وێ گەلەك ئاسێ یە، کەلایەکا زور بچووکە بەلێ باژێر ل بندایە و باغ و باغچە و کانی تێدا هەنە، و گەلەك رێك دچنە ڤی باژێری. هەروەسا زانایێن وێ ژی گەلەك زۆرن، بۆ نموونە (تەفسیرا کەواشی) یا ب ناڤودەنگو ل ڤی باژێری هاتییە نڤیسین و نڤیسەرێ وێ ژی هەر ل ڤی باژێری هاتییە ڤەشارتن. ئەڤ باژێرە سێ قوناغان ژ ئامێدیێ دوورە.

## ٦- گوندێ ئەرمشت:

ئەڤ گوندە ل سەر دەستێ (گیومەرسی) هاتییە ئاڤاکرن پشتی حەزرەتێ نووح (س) دوعایێن خێرێ بۆ کرین!. گەلەك باغ و بووستان و خانی و حەمام و مزگەفت و خان تێدا هەنە، و ب خۆشیا خۆ وەکی بەهشتێ یە!

## ٧- کەلا زاخۆ:

کورد دبێژنێ زاخۆ (...)[٩٥]، ئەڤ کەلایە سەنجەقەکا سەر ب ئامێدیێ ڤەیە، قوباد بەگ کورێ سولتان سەیید خانی حوکمی لێ دکەت، ئەو خودانێ ٧ هزار سەربازانە، ئەوی قازی و موفتیێن خۆژی هەنە و گەلەك زانا ژی ل ڤی باژێری هەنە، کەلا وێ هند بلندە کو دگەهیتە ئەسمانی!، کەلایەکا گەلەك جوانە و شێوەیێ وێ چوار گوشەیە کو

ب كەڤران هاتییە ئاڤاكرن و دكەڤیتە سەر رووبارێ خابوورێ سندیان[٩٦]. ئەڤ خابوورە ژ چیایێن سندیان و چیایێن هەكاریان دهێتەخوار و دگەل رووبارێ هیزل دبیتەئێك، و ل جهەكێ دبێژنێ (...) دچتە سەر رووبارێ دیجلەی. ل بەرامبەر ڤێ زاخۆیێ پرەكا مەزن هەیە[٩٧]. هەردو عەشیرەتێن سندی و سلیڤانی دوو (عەشیرەت بەگێن) سەر ب زاخۆ ڤەنە، هەر ئێكێ ژ وان ١٠ هزار تفنگدارێن مێرخواز هەنە.

## ٨- بازاروكێ دێرەبوون:

(ناڤێ وێ ییێ دروست (دێرە بوون)ـە، دزمانێ كورداندا دبێژنە كەلیسەیێن مەسیحیان (دێر)، و چونكە ئێك ژ پاتریكێن مەسیحیان [ب ناڤێ ئابوون] ل ڤی بازێركی هاتییە ڤەشارتن لەورا دبێژنە ڤی جهی (دێرەبوون). ل جهەكێ بەرفرەهـ و خۆەش ل كنارێ رووبارێ هاتییە ئاڤاكرن. گەلەك باغ و باغچە و مزگەفت وحەمام وخان و مەدرەسە تێدا هەنە. ئەڤ جهە دكەڤیتە دناڤ خاكا ئامێدیێ دا و دكەڤیتە دناڤبەرا دهۆك و جزیرێدا، لەورا هندەك جاران دكەڤیتە ژێر حوكمێ میرێن ئامێدیێ، بەلێ نها ل ژێر دەستێ میرێ جزیرێدا یە).

ل ڤێرێ گەشتا ئەولیا چەلەبی ل بەهدینان ب داوی دهێت و ئەوی دڤێ گەشتا خۆدا پێزانینێن مەزن و گرنگ ل سەر ڤێ دەڤەرێ پێشكێشكرن. بهلێ ژبەركو دانەیا رەسەنا پەرتووكا وی نەمایە و دانەیێن دی ژی پرن ژ كێماسی و ڤالەهییان، لەورا هژمارەكا مەزن ژ پێزانینێن وی دناڤ دەستخەتێن پەرتووكا ویدا نەمانە. و ل ڤێرێ دێ ئاماژێ ب وان ناڤونیشانان دەین ئەوێن د پەرتووكا ویدا هاتین بەلێ ناڤەرۆكێن وان نەماین. ئەوژی ئەڤەنە:

١- قوتابخانەیێن زارۆكان
٢- تەكییەیێن زاهد و دەروێشان
٣- ناڤێن تاخان ل ئامیدیێ
٤- خانێن بازرگانان
٥- بازار و دوكانێن ئامێدیێ
٦- ناڤێن ماقوول و پێشكێشان
٧- ئەو هەڤالێن من نیاسین
٨- زانایێن ئامێدیێ
٩- نەشتەرگەرێن ئامێدیێ
١٠- شێخ و پیرێن ئامێدیێ
١١- نڤیسەر و هوزانڤانێن ئامێدیێ
١٢- غازی و جیهادكەرێن ئامێدیێ
١٣- سیمایێ پیر و گەنجێن ئامیدییان
١٤- جل و بەرگێن ژن و زەلامان
١٥- ناڤێن زەلامان
١٦- ناڤێن ژنان
١٧- ناڤێن كولە و خولامان
١٨- ناڤێن كەنیزەك و جاریهیان
١٩- ئاڤاهیێن ئامێدیێ
٢٠- ئاڤ و هەوایێ ئامێدیێ
٢١- ئاڤەدانییا كانیا ئاڤێ
٢٢- پێشەسازی و هونەرمەندییا بەهدینان
٢٣- دەرامەتێ چاندنا ئامێدیێ
٢٤- خوارنێن ئامێدیێ
٢٥- ڤێقیێن ئامێدیێ
٢٦- جورێن ڤەخوارنان ل ئامێدیێ
٢٧- هندەك پێزانینێن دی ل سەر كەلا ئامێدیێ
٢٨- كەلایێن بەهدینان (ئەوێن ل هەر چوار كنارێن ئامێدیێ).

بێ گومان ئەگەر پێزانینێن تیروتەسەلێن ئەڤان هەمی ناڤونیشانان پەیدا ببن دێ دیمەنەكێ تەمامتر ژ هەمی لایێن دیرۆكا بەهدینان ل سەردەمێ ئوسمانی ب گشتی و سەدسالییا ١٧ێ ب تایبەتی هێتە بەرچاڤكرن.

# زێدەر و پەراوێز

١. بنێرە: اولیا چلبی محمد چلبی ابن درویش، اولیا چلبی سیاحتنامەسی، طابعی: احمد جودت، ایلك طبعی، اقدام مطبعەسی، (استانبول: ١٣١٤)، دوردنجی جلد.

٢. بنێرە ژێدەرێ بەرێ و پشکا پێنجێ ژ پەرتووکێ کو ل سالا ١٣١٥ چاپ بوویە.

٣. liya çeleb ı s ı yahatnamesi، hazirlayanlar: Seyit Ali Kahraman، Yucel Da⊠li، (Istanbul:2000)، IV Kitap، s.310.

٤. Eyni Eser، s.٣٠٦.

٥. بو بەراوەردێ دناڤبەرا چاپا ئەحمەد جەودەت و وەرگێرانا کورد و عەربی بنێرە: اولیا چلبی سیاحتنامەسی. و ئەولیا چەلەبی، کورد لەمێژووی دراوسێیەکانیدا، وەرگێران: سەعید ناکام، کوری زانیاری کورد، (بغداد: ١٩٧٩). رحلة اولیا چلبي فی کوردستان، ترجمە: رشید فندی، ط٢، مطبعة محافظة دهۆك، (دهۆك: ٢٠١٤).

٦. المايي، انور، الاكراد في بهدينان، ط ٢، مطبعة خبات، (دهۆك: ١٩٩٩)، ص ١٤٢.

٧. عماد عبدالسلام رؤوف، تاريخ امراء بهدينان، ص ٣٧. www.alukah.net

٨. بنێرە دەقێ بەلگەیێ د: مسعود مصطفى الكتاني، مدرسة قوبا- قوبهان، مطبعة هوار، (دهۆك: ٢٠٠٩)، ص ٢٩٢.

٩. کاتبێ میر عمادالدینێ هەکاری (تومر خان) ئەڤێ چەندێ د پەرتووکا خۆدا بەحس دکەت. بنێرە: تومرخان یازجی، منظومە تاریخ أمراء هکاری (دەستنڤیس ب زمانێ فارسی)، ل ١٢٧.

١٠. Evliya çeleb ı s ı yahatnamesi، s.٢٤٤-١٠

١١. سەنجەق یان لیواء ب زمانێ ئەڤرۆ دبیتە قەزا. رێڤەبەرێن ڤان سەنجەقان ب ناسناڤێ (بەگ) دهاتنەنیاسین و سەر ب میرێ سەرەکیڤە بوون ل پایتەختێ میرگەهێ.

١٢. حەمیدی: ئێك ژ کەڤنترین ومەزنترین عەشیرەتێن کوردستانێ یە کو د ناڤبەرا زێێ مەزن و رووبارێ خازر دا دژیان. و ناڤێ وێ د چەندین ژێدەرێن دیروکیدا هاتییە. بو پتر بنێرە: د. زرار صديق توفيق، القبائل و الزعامات القبلية الكردية فی العصر الوسيط، آراس، (اربيل: ٢٠٠٧)، ص ٨٣-٨٥.

١٣. ل ڤێرێ ئەولیا ب درێژی بەحسێ چیرۆکا یوونس (س) دکەت. لەورا پێدڤی ب وەرگێرانێ نەبوو.

١٤. دیار نەکریە کا کیش مێژوونڤیسی بەحسێ ڤی بابەتی کرییە؟ و د ژێدەرێن بەردەستدا ئاماژە ب ڤێ چەندێ نەهاتییەکرن.

١٥. هەلگرتنا دەهول و ئالای هێمایێن ئاست و هێزا هەر قەوارەیەکا سیاسی یان کارگێری نە.

١٦. خاص همایون زارافەکێ ئوسمانی یە بۆ ئەردێ میری یان ئەردێ حکومەتێ دهێتە بکار ئینان.

١٧. پارچەیەکا ئەردییە کو ژلایێ دەولەتێڤە بۆ ئێك ژ سەرکردەیێن لەشکەری یان کارگێری دهێتەدان. ئەو میرگەهێن د ئاستێ (حکومەت) دا ب ئێکجاری نابیت ئەڤ جورە سیستەمە تێدا بهێتە پیادەکرن.

١٨. زەعامەت ئەو جورێ ئیقطاعی یە کو داهاتێ وێ بێ سالانە دناڤبەرا ٢٠,٠٠٠ و ٩٩,٠٠٠ ئاقچەیان بیت. و ئاقچە دەرهەمێ ئوسمانییە و بچووکترین یەکەیا دراڤییە ددەولەتا ئوسمانیدا.

١٩. قوناغ ل دەڤ مەزهەبێن حەنەفی و مالکی (٤٤,٥٢٠کم) و ل دەڤ حەنبەلی و شافعییان (٨٩,٠٤کم). بو زانین ئەولیا چەلەبی حەنەفی بوو لەورا دوور نینە مەبەستا وی ژ قوناغێ هەمان پیڤەرێ حەنەفی بیت

٢٠. ئەڤ کەلایە دکەڤیتە رۆژهەلاتێ زنجیرا چیایێ مەتینا. بارەگایێ میرێ عەشیرەتا بەرواریان بوو. ل سالا ١٦٣٤ میر عمادالدینێ هەکاری ئەڤ کەلایە ستاند و میرێ وێ گەلابی بەگێ بەرواری و برایێ وی ئەولیا بەگ کوشتن.

٢١. بنەمالا زیادە د ناڤبەرا سالێن ٢٠٣- ٤٠٩مش/ ٨١٩- ١٠١٩ز حوکم ل یەمەنێ دکر و چ پەیوەندیا وان ب کوردستانێ ڤە نینە. هەروەسا ئەو ناڤێن وی ئینایین نە ناڤێن میرێن ڤێ بنەمالێ نە!!.

٢٢. تەبەرستان ناڤێ کەڤنێ دەڤەرا مازندەرانە ل باکورێ ئیرانێ.

٢٣. کەلا شخو دکەڤیتە دووماهیا زنجیرا چیایێ مەتینی ل نزیکی گوندێ بابیرێ. کەلا شخو دووماهیك گوندێ عەشیرەتا دوسکیانە و پشتی وێ دەڤەرا بەرواری بالا دەسپێدکەت.

٢٤. مەرداڤیخ و یا دروست (مەرداویج) دامەزرێنەرێ دەولەتا (زەییاری) یە ل هەرێما گیلان ل باکورێ ئیرانێ، ئەڤێ دەولەتێ دناڤبەرا سالێن ٣١٦- ٤٧٥ مش / ١٠٨٢-٩٢٨ ز حوکمکریە. چ پەیوەندییا وان ب کوردستان و ئامێدیێ ڤەنینە!

٢٥. د بنیاتدا ڤالایە. هەروەك هاتییەدیارکرن پەرتووکا ئەولیای پرە ژ ڤالاهییان. بۆ زانین هەر جهەکێ هێمایێ (...) هاتبیتە دانان ئەو ددەقێ رەسەندا ڤالایە.

٢٦. شاهی و بالیومەز دو جورێن توپانە.

٢٧. (نەفیر) ئێك ژ رێورەسمێن پروتوکولیێن پێشوازییا مێڤانان بوو، ئەو ژی ب رێکا ئامادەباشییا لەشکەران. و هەتا نوکە ژی ئەڤ رێورەسمە ل هەمی جیهانێ هەیە.

٢٨. ئەولیای پەیڤا (کانێ) وەك خۆ ب کوردی گوتیە.

٢٩. زەردوز: ئەو جلکێ ب داڤێن زێری هاتبیتە درین.

٣٠. ئاماژەیە بو داوود پێغەمبەری و دوژمنێ وی طالوت. ئەڤ چیروکە ب کورتی د قورئانا پیروزدا هاتییە.

٣١. گیومەرس د ئایینێ زەرەدەشتیدا هەمان (ئادەم)ێ ئایینێن دی یە. د مێژوویا چیڤانووکییا ئیرانێدا گیومەرس ئێکەمین شاهێ ئیرانیانە.

٣٢. مە نەزانی کا ئەڤ مێژوونڤیسە کییە؟ و ناڤێ وی د ژێدەرێن بەردەستدا ل بەرچاڤێ مە نەکەفت!. ب دروستی دیار نینە کا ئەولیای پەرتووکا وی دیتیە یان ژ خەلکێ ئامێدیێ بەیستیە؟.

٣٣. دبنیاتدا ڤالایە.

٣٤. هەروەك دیار میرێن ئامێدیێ و هندەك میرگەهێن دی نەخاسمە هەردو میرگەهێن هەکاری و شەمدینان ئەسلێ خۆ بۆ خەلیفەیێن عەبباسی ڤەدگەراندن. وئەڤە هەولەك بوو بۆ پەیداکرنا شەرعیەتەکا مەزنتر بۆ دەستەلاتا خۆ، لێ د ڤەکولینێن هەڤچەرخ دا دیار بوویە کو ئەڤێ چەندێ چ راستی بو نینە.

٣٥. د راستیدا میرێن بوتان دگۆتن کو ئەسلێ وان دگەهیتە صەحابیێ پێغەمبەری (خالدێ کورێ وەلیدی) و میرێن بەدلیسێ ئەسلێ خو دگەهاندنە شاهێن (ساسانی). و چ راستیا بۆ هەردو بانگەشەیان نینە.

٣٦. دبنیاتدا ڤالایە. بەلێ میرێ بەهدینان یێ وی دەمی میر حەسەن کورێ میر سەیف الدینی بوو.

٣٧. تەعبید ئانکو بو هەروهەر، و ئوجاقلق ئانکو حوکمێ بنەمالێ- ئویجاخێ. و مەبەست ژ حوکمێ پشتا و پشتە.

٣٨. مەبەستا وی هێرشا سولتان مورادێ چوارێ یە ل سالا ١٦٣٨ز کو ب ستاندنا بەغدادێ ب داوی هات.

٣٩. یورتلق و ئوجاقلق: سەرەکیترین جورێ پەیوەندیان دناڤبەرا میرگەهێن کوردان ودەولەتا ئوسمانیدا بوو. یورتلق ب رامانا (وار) و ئوجاقلق ب رامانا (مالبات و خێزان) دهێت. ئەڤ جورێ میرگەهان ب تەمامی سەربەخۆ بوون و بتنێ هندەك ژ داهاتێ خۆ بۆ دەولەتێ دهنارتن. بەلێ ئەو یورتلقێن ژ جورێ (حکومەت) ئەو پارە ژی نەدهنارتن، و ب تەمامی سەربەخۆ بوون. تەنها ل دەمێ شەراندا پێدڤی بوو دگەل لەشکەرێ خوۆ پشکداری د شەریدا بکەت.

٤٠. حکومەت. بلندترین ئاستێ میرگەهێن کوردان بوو، ب تەمامی سەربەخو بوون. و ل دووڤ یاسایا سولتان سلێمانێ قانوونی دەولەتا ئوسماني چ دەستێوەردان د کاروبارێن وێ یێن سیاسی و ئابووریدا نەدکرن، و ئەردێ وان ب (مولکینی) ل سەر ناڤێ خێزانا دەستەلاتدار هاتبوو توماکرن. ژ بۆ پێناسەکرنا ڤان حکومەتان دەربرینا (مفروزة القدم و مقطوعة القلم) دهاتە بکارئینان و

رامانا وێ ئەوە کو پیێن چ سەربازان ب ناڤ وێ میرگەهێ ناکەڤیت و چ کارمەندێن دەولەتێ

٤١. داهاتێ وێ نانڤیسن. ل ویلایەتا بەغداد تەنها هەردو میرگەهێن بەهدینان و سوران ژ ڤی جورێ میرگەهان بوون.

توغ هێمایەکە ل سەر وی ستوونی دهێتە دانان ئەوێ ئالا پێڤە دهێتە گرێدان، ئانکو دکەڤیتە سەر دارێ ئالای. توغ پتر جاران ژ هێمایەکێ ئاسنی یان ژی ژ کوریا هەسپان دهاتە چێکرن. هژمارا توغان ئاماژەبوو بۆ هێز و ئاستێ میرگەهێ.

٤٢. د دانەیا رەسەندا ئەولیای ژمارە ب تەمامی گۆتیە، بەلێ تەنها پەیڤا (سەد) مایە و پەیڤا دووفدا ڤالایە، لەورا مەگوتیە: پتر ژ ١٠٠ میر عەشیرەتان.

٤٣. هەر ئێك كەیل (٤٠) كیلو یە.
٤٤. تیمار ئەو جورێ ئیقطاعێ یە کو داهاتێ وێ یێ سالانە دناڤبەرا ٢٠٠٠ و ١٩,٩٩٩ ئاقچهیان بیت.
٤٥. ئینکیچەری ناڤێ ئێك ژ هێزێن سهر ب دهولهتا ئوسمانی ڤهیه.
٤٦. دزدار (دژدار) ئانکو پارێزڤانێ کەلایێ.
٤٧. د بنیاتدا ڤالایە.
٤٨. شاهبەندەر سەروکێ بازرگانانە.
٤٩. دبنیاتدا ڤالایە. بەلێ ئەو ل چەند جهێن دی دیار دکەت کو بەهدینان ژ بلی ئامێدیێ ژ ٦ سەنجەقان پێك دهێت.
٥٠. داهاتێ (قەلەمی) ١٠٪ داهاتێ وی جهی یە.
٥١. میرعەشیرەت یان عەشیرەت سەنجەقی، بچووکترین یەکەیێن کارگێری بوون کو ژلایێ دەولەتا ئوسمانی ل کوردستانێ هاتبوون دامەزراندن. ئەڤ سەنجەقە ژ عەشیرەتەکێ بتنێ پێکدهاتن، و سەروکێ وان ناسناڤێ میر هەبوو بەلێ فەرمانێن خۆ ژ سەنجەق بەگان وەردگرت. د کوردستانێدا هژمارا وان ب سەدان بوون.
٥٢. دبنیاتدا ڤالایە.
٥٣. ئەڤ دەرگەهە ل سالا ١٩٣٨ ل دەمێ ڤەکرنا جادەیا ئەسفەلتی بۆ بازێری هاتە هەرفاندن.
٥٤. ئەڤ دەرگەهە هەتا نوکە ژی دمینیت و ب ناڤێ دەرگەهێ (سەقافا) ژی دهێتە ناسین.
٥٥. دبنیاتدا جهێ ژمارێ ڤالایە.
٥٦. هەر ئێك گەز ل دەڤ حەنەفیان ٤٦. ٣٧سم، و ل دەڤ مالکیان ٥٣سم و ل دەڤ شافعی و حەنبەلیان ٦١,٨٣سم.
٥٧. جهێ ناڤێ مەلای ڤالایە! بەلێ د بەرپەرێن بەێندا بەحسێ مەلایەکێ ب ناڤێ (مەلا شیروی) دکەت. دوور نینە ئەڤە هەمان ئەو کەس بیت.
٥٨. Evliya çeleb ı s ı yahatnamesi, s. 305.
٥٩. ناڤێ ڤێ خواندنگەهێ ل سەر دەستنڤیسەکێ هاتیە کو بو سالا ٧٧٦مش/ ١٣٧٤ز. بنێرە: محەمەد عەلی قەرەداغی، بوژانەوەی زانایانی کورد لەرێگای دەستخەتەکانیەوە، چاپخانەی ومیض، (بەغداد: ١٩٩٨)، بەرگێ ١، ل ٩٩.
٦٠. ناڤێ ڤێ خواندنگەهێ ل سەر دەستنڤیسەکێ هاتیە کو بو سالا ٩٨٩مش/ ١٥٨١ز. بنێرە: هەمان ژێدەر، ل ٩٩.
٦١. Evliya çeleb ı s ı yahatnamesi, 306.
٦٢. ل دور ئەڤان وەقفان بنێرە: احمد، المصدر السابق، ص١٦٦-١٧٣.
٦٣. Evliya çeleb ı s ı yahatnamesi, 305-306.
٦٤. Evliya çeleb ı s ı yahatnamesi, s. 307.
٦٥. ماموستا محمد عبدالله ئامیدی گۆتە مە کو ئەڤ کانیە نوکە هشك بوویە، هەرچەندە ل وی دەمی و هەتا دەمەکێ نزیك ڤەرێژا وێ وەکی رووبارەکێ بوو.
٦٦. هەمان (کانیا سنجێ) یە کو هەتا نوکە دمینیت.
٦٧. ئارشین پیڤەرەکێ ئوسمانییە. هەر ئێك ئارشین ٦٨ سم.
٦٨. مەبەستا وی چیرۆکا فەرهادی یە ئەوێ ل سەر خاترا خوشتڤیا خۆ شرینێ چیا و کەڤر سمتین.
٦٩. هوسا دەقێ رەسەن دا هاتییە! وئەڤە دەربرینێ ژ رەوشەنبیری و هووشیاری وی دەمی دکەت.
٧٠. دراستیدا مەسیحیین بەهدینان نەستووری و کلدانن، هەروەسا ئەو نە ئەرمەنینە بەلکو سریانن. (جیلو) مەزنترین هوزا نەستووریێن هەکاریە، و ئەولیای وەك ئاماژەیەك بو مەزهەبێ نەستووری ناڤێ وان ئینایە.
٧١. چ راستی بو ڤێ گوتنێ نینە و بیر و باوەرێن ئێزدیان دناشکەرانە.
٧٢. ئالاجە: پەروکەکێ رەنگا و رەنگە و ب سەری ڤە دهاتە گرێدان. هندەك جاران ئالاجە وەك ئالا ژی دهاتە بکار ئینان.
٧٣. دوور نینە ئەڤە هەمان شێخولئیسلامێ ئیمارەتێ بیت ئەوێ بەری نوکە ئاماژە پێ هاتییەکرن.
٧٤. ئەڤ چەندە نەراستە! و ئەو هەمی ب ئێك زاراڤ دئاخڤن ئەوژی زاراڤێ هەکارییە کو هەمان زاراڤێ ئامێدیێ یە.

٧٥. ددەڤێ رەسەندا هوسا هاتییە: العربية فصاحة و الفارسية ظرافة والتركية قباحة والبقية نجاسة.
٧٦. مەبەست ژ شیروی میرگەها شیروانە کو دکەڤتە باکوورێ رۆژهەلاتێ میرگەها بوتان ڤە. دناڤ نڤیسینێن ئوسمانیدا پتر ب شێوەیێ (شیروی) دهێتە نیاسین.
٧٧. جهێ ٨ ناڤان ڤالایە.
٧٨. فارسییا دەری شێوازێ کەڤنێ زمانێ فارسیە کو پتر ژ فارسیا ئەڤرۆ نزیکی کوردیێ یە.
٧٩. چ راستی بو ڤێ حەدیسێ نینە. زمانێ خەلکێ بەهشتێ نە عەرەبییە و نە فارسی!
٨٠. دبیت ئەڤ پەیڤە (باخڤە) بیت.؟
٨١. چێدبیت دروستییا ڤێ پەیڤێ (گەر دکی) بیت. ئانکو ئەگەر تە رازا خو ئاشکەرا کر دێ ب فرەکا بای رویس و تازی بی!.
٨٢. بنێرەدانەیا دەستخەت د:Evliya çeleb syahatnamesi (III VE IV Cilt), Hazirlayan: Seyyid Ali Kahraman, (Ankara: ٢٠١٣), Cilt. ٢, s. ٣٠٨b. دگەل ڤێ نڤیسینێ ژی هاتییە بەلاڤکرن .
٨٣. Eyni Eser, s.٣٠٩.
٨٤. دبنیاتدا ڤالایە.
٨٥. زمارێن رۆژ و هەیڤێ دبنیاتدا ڤالایە.
٨٦. مەبەست ژێ باژێرێ (معرة النعمان)ـە ل وەلاتێ سوریا ئەڤرۆ.
٨٧. مەلك ئەحمەد پاشا وەزیرێ مەزن و زاڤایێ سولتان موڕادێ چوارێ بوو.
٨٨. مەبەستا وی رووبارێ ئەرس= ئاراز ە.
٨٩. میرێن ئەرزێ کەسوکارێن میرێن بەهدینانە و ئەوژی خو دگەهیننە مالباتا خەلیفەیێن عەبباسی. و هەروەك هاتییە دیارکرن ئەڤ بوچوونا وان دروست نینە!
٩٠. د بنیاتدا ڤالایە
٩١. Evliya çeleb syahatnamesi, s. ٢٠٥.
٩٢. Eyni Eser, s.٢١٣.
٩٣. گەڤاش هەمان باژێرێ (وەستان)ـە کو ناڤێ وێ د پتریا ژێدەرێن ئیسلامیدا هاتییە. بەلێ ل وی دەمی و هەتا نوکە ب ناڤێ گەڤاش دهێتە نیاسین. دکەڤیتە باشورێ رۆژهەلاتێ باژێرێ وانێ ل نزیکی گولا وانێ.
٩٤. دبنیاتدا ڤالایە.
٩٥. دبنیاتدا ڤالایە
٩٦. شووناوارێن ڤێ کەلێ هەتا نها ژی ماینە، ب ناڤێ (قشلە) دهێنە نیاسین
٩٧. مەبەستا وی پرا دەلالە.

# میرگەها بەهدینان
# ژ سەدسالیا هەژدێ هەتا کەڤتنا وێ

پ.د عیماد عەبدولسەلام رەئوف
وەرگێران:سالح یوسف سوفی

د ڤی سەردەمیدا میرێن بەهدینان دیارکرن کو هێشتا وان کاریگەرییەکا مەزن ل سەر رەوشا گشتی یا دەڤەرێ نەخاسمە ژی ل سەر رەوشا عیراقێ هەبوویە، ژ بەر هندێ، ئۆسمانییان بەردەوام پشتا خۆ پێ گەرمدکرن بۆ ژ ناڤبرنا هێزێن نەیار و جوداخوازێن وی سەردەمی ل سەر شانۆیا سیاسی پەیدا دبوون، لێ ژ وی دەمێ ل دەستپێکا سەدسالیا هەژدێ حەسەن پاشا، پاشی ئەحمەد پاشایێ کورێ وی بووینە والی یێن بەغدا و دەڤەرێن سەر ب وێ ویلایەتێ ڤە، ئەڤ سیاسەتە ب سیاسەتەکا نوویا ناوەندی سەتمی یا دگۆت کو پێتڤییە ویلایەتا بەغدا بێتە ب هێزکرن و بەرپرسیاریا کاروبارێن گشتی یێن سەرانسەری عیراقێ ب ستۆوێ خۆڤە بگریت، کو ئەڤ سیاسەتە بوو ئەگەرێ وێ چەندێ ویلایەتا بەسرا پاشی ویلایەتا شارەزوور ب بەغدا ڤە بهێنە گرێدان، ل داویێ کاروبارێن بلندێن میرگەها بەهدینان ژی ب والیێ بەغدا ڤە هاتنە گرێدان، لێ خۆسەریا خۆیی یا میرگەهێ وەکی بەرێ ما دەمێ میرگەهـ تەڤلی دەولەتا ئۆسمانی بووی.

ب ڤێ چەندێ، دڤیا میرێ بەهدینان ئێکسەر ل شوونا سولتانێ ئۆسمانی، پەیوەندیێ ب والیێ بەغدا بکەت، هۆسا، بەهدینان ژی بوو لایەنەکێ وێ پلانا ب ناڤێ (پلانا عیراقی) دهاتە نیاسین کو یا تایبەت بوو ب کاروبارێن سیاسەتا ئۆسمانی ڤە ل عیراقێ، والی یێن بەغدا ژی، نەخاسمە ل سەردەمێ مەمالیکان(١٧٤٩-١٨٣١ز) ئەڤ گوهورینا نوو یا چێ بووی د بەرژەوەندیا خۆ دا ب کارئینا و هەتا پلەیەکا بلند پەیوەندیێن خۆ دگەل میرگەهێ موکم کرن و جۆرەکێ هەماهەنگیێ ل ناڤبەرا خۆ چێکرن داکو گڤاشتنێ بێخنە سەر والی یێن جەلیلی یێن ل مووسل(١٧٢٦-١٨٣٤ز) و تەڤلیکرنا وێ د تەوەرێ بەغدا دا کو مووسل ب تنێ ل دەرڤەی چارچۆڤێ ڤی تەوەری مابوو، هەتا وی دەمێ حوکمێ بنەمالا جەلیلی ب داویهاتی، هەرچەندە ژی ل داوییا حوکمداریا خۆ، خۆ نێزیکی وی تەوەری دکر.

ژ لایەکێ دووڤە، هەڤپەیمانیێن عەشیرەتان، هەرچەندە کو ب هێزێن پشتەڤانێن حوکمێ میرگەها بەهدینان دهاتنە ل قەلەمدان، لێ ل ڤی سەردەمی

پتر تووشی ژێرێكچوونێ بوون یان ژی هندەك جاران دەست ژ ڤی میری دهاتە بەردان و مرۆڤەكێ وی ل شوونێ دهاتە دانان، ئەڤە ژی بوو ئەگەرێ وێ چەندێ، ئەڤ هەڤپەیمانییە د وان هەڤركی یێن بنەمالەیی دا گڤاشتنان بكەن یان ژی ب كێمی كاریگەرییا خۆ د كاروبارێن حوكمی دا هەبن و بوونە ئەگەرێ لاوازبوونا میرگەهێ ل سەردەمێ وێ یێ داویێ، د بەرامبەر دا، میران پشتەڤانییا هەڤپەیمانیێن خۆ دگەل هەردو میرگەهان ب هێزكرن یێن د ناڤ میرگەهێ دا بوون كو ئەو ژی میرگەها بەرواری بالا (كو سەنتەرێ وێ كەلا قومریێ) و میرگەها شێخان یا ئێزدی (كو سەنتەرێ وێ باژێركێ شێخان) بوون، داكو مفا ژ سەنگا وان بێتە وەرگرتن و هەڤسەنگی دگەل هۆزێن ب هێزێن ل دەڤەرێ پەیدا ببیت، هەروەسا داكو ل دووڤ شیانان رەوشا وەلاتی بهێتە بنەجهـ كرن.

ل دۆرێن سەدسالەك و نیڤێن حوكمداریيا میرگەها بەهدینان د ڤێ قوناغێدا دەهـ میران حوكم ل ئامێدیێ كرییە، حوكمێ یێ ئێك و دووێ نیڤا وی ماوەی بوو، لێ یێن دی ماوێ مایی حوكم كرییە كو ئەو ژی ئەڤێن خوارێ بوون:

١-بەهرام پاشایێ مەزن١١٢٦-١١٨٢مش/١٧١٤-١٧٦٨ز.

٢-ئیسماعیل پاشایێ كورێ بەهرام پاشای ١١٨٢-١٢١٣مش/١٧٦٨-ز.

٣-محەمەد تەیار پاشایێ كورێ ئیسماعیل پاشای ١٢١٣-١٢١٤مش/١٧٩٨-١٧٩٩ز.

٤-مراد پاشایێ كورێ ئیسماعیل پاشای ١٢١٤-١٢١٨مش/١٧٩٩-١٨٠٣ز.

٥-قوباد بەگێ كورێ سولتان حسێن ١٢١٨-١٢١٩ مش/١٨٠٣-١٨٠٤ز.

٦- عادل پاشایێ كورێ ئیسماعیل پاشای ١٢١٩-١٢٢٣مش/١٨٠٤-١٨٠٨ز.

٧- زبێر پاشایێ كورێ ئیسماعیل پاشای ١٢٢٣-١٢٤٠مش/١٨٠٨-١٧٢٥ز.

٨- محەمەد سەعید پاشایێ كورێ محەمەد تەیار پاشای ١٢٤٠-١٢٥٠مش/١٨٢٥-١٨٣٤ز.

٩- مووسا پاشایێ كورێ محەمەد تەیار پاشای ١٢٥٠مش/١٨٣٥ز.

١٠- ئیسماعیل پاشایێ دووێ كورێ محەمەد تەیار پاشای ١٢٥١-١٢٥٨مش/١٨٣٦-١٨٤٢ز.

## میر بەهرام پاشایێ مەزن كورێ زبێر پاشای:

میر بەهرام ل سالا ١١٠٧مش/١٦٩٥ز ژ دایكبوویە، ل ئامێدیێ ل همبێزا بابێ خۆ ژیایە و عیسێ دەلا كو ئێك بوو ژ ئاقلدارێن سەردەمێ خۆ، وەك سەرپەرشتكارەكێ تایبەت بۆ دامەزراندیيە، وەسا دیارە ژی بابێ كور بۆ شوونگرییا خۆ ئامادە دكر، پاشی ل سالا ١١٢٦مش/١٧١٤ز سەخمەراتی كورێ خۆ دەست ژ حوكمداریيا میرگەهێ بەردایە.

سەردەمێ حوكمێ بەهرام پاشای ب شلقیانێن زۆر یێن ناڤخۆیی و دەرڤەیی هاتییە نیاسین، هەر بۆ نموونە، ل دەستپێكا سەردەمێ وی، سولتانێ ئۆسمانی فەرماندایێ هاریكاریێ دگەل یوسف پاشایێ والیێ رەققە بكەت بۆ ژ ناڤبرنا پشتەرێبوونا خەلیل پاشایێ رەشوانی یێ پشتەرێبوونا خۆ ل سەر دەولەتێ راگەهاندی، نڤیسەرەكێ چەرخێن پاشتر هنگی گۆتبوو كو رەشوانی یێ ناڤبری پشتی ب دارێ زۆرێ هاتییە ناڤ مووسل، پشتەرێبوونا خۆ ل وی باژێری راگەهاندبوو، ئەو نڤیسەر دبێژیت ژی كو هێزێن بەهرام پاشای ژ لایێ باكوور و هێزێن یوسف پاشا ژ لایێن رۆژئاڤاڤە باژێر دووربێچكرییە، لێ د ژێدەران دا، نەخاسمە د ژێدەرێن مووسلی دا[1] تشتەك نینە دیار بكەت كو چ پشتەرێبوون ل مووسل هاتبنە روودان، ئەڤە سەربارى كو ئەڤ سەرهاتییا نە دۆكیۆمێنتكری، بەحسێ دووربێچا لایێن رۆژهەلات و رۆژئاڤایێ باژێری نەكرییە، هەر چەوان بیت، رەشوانی نەچاربوویە خۆ رادەستی بەهرام پاشا بكەت و دەمێ وی رادەستی یوسف پاشای كری، یێ داویێ رەشوانی سێدارەدا، هەكارییان ژی، كو نەیارێن كلاسیكی یێن

میرگەها وی بوون، نەئامادەبوونا وی ل میرگەهێ بۆ خۆ ب دەلیڤە دیتن و هێرش کرنە سەر میرگەها بەرواری بالا یا سەر ب میرێن بەهدینانڤە و ب سەر بنگەهێ وێ (بێتەنووری) دا گرتن و حوکمدارێ وێ کەلائی بەگ و پتریا ئەندامێن خێزانا وی کوشتن، ژ بلی سەعید بەگێ کورێ وی یێ بچووک، تشتەکێ ئاسایی بوو ئەڤێ داویێ هەوارا خۆ ببەتە نك بەهرام پاشای داکو حوکمێ بابێ خۆ وەرگریت و تۆلا خێزانا خۆ ڤەکەت، ئینا بەهرام ب هێزەکا سەربازی هاریکاریا کەلائی کر و شیا بێتەنوورێ ژ دەستێ هەکاریان دەربێخیت و سەرۆژنوو بەرواری بالا بێخیتە بن سەروەریا میرگەها بەهدینان.

ل سەردەمێ بەهرام بەگێ هندەك جودابوونێن نوو د ناڤ بنەمالا حوکمداردا پەیدابوون، هەر بۆ نموونە، سەعید بەگێ برایێ وی شۆرش ل سەر کر و شەرولێکدان ل ناڤبەرا هەردولا هاتنە روودان کو شەرێ ژ هەمیان دژوارتر ل سالا ١١٢٦مش ل نێزیك سێمێلێ بوو و ب شکەستنا سەعید پاشای ب داوی هات، وەسا دیارە ژی کو یێ داویێ ژ لایێ حەسەن پاشایێ (١١١٦-١١٣٦مش/١٧٠٤-١٧٢٣ز) والیێ بەغدا دهاتە پشتەڤانیکرن، وی ژی هەر زوو ڤێکنەکرنا ل ناڤبەرا هەردو برا بۆ خۆ ب دەلیڤە دیت و مایێ خۆ د کاروبارێن ناڤخۆیی یێن میرگەها بەهدینان دا کر، هەتا وی رادەی هێزێن مەزن دگەل تۆپێن گران بهنێریتە ئامێدیێ، ئەو شیا باژێری دووربێچ و تۆپباران بکەت، دیارە ژی ئارمانجا وی پشتەڤانیکرنا سەعید پاشای بوو یێ داخوازا حوکمی دکر، لێ مرنا ژ نشکاڤەیی یا یێ داویێ ل سالا ١١٣١مش/١٧١٧ز و بەرگریا ئامێدیێ کری، ئەڤە سەرباری کو ژ لایێ سروشتی ڤە ئامێدیێ باژێرەکێ ئاسێ یە، ئەڤە هەمی بوونە ئەگەرێ وێ چەندێ ئەڤ هەوە ئارمانجا خۆ نەهنگێڤیت و خۆ ڤەکێشیتە دەرڤەی میرگەهێ، هەرچەندە ژی حەسەن پاشا هەلویستەکێ نەرێنی ل سەر بەهرام پاشای هەبوو، لێ ئەڤە نەبوو رێگر بێ داویێ پشکدارێ د هەوەکا دی یا مەزن نەکەت یا کورێ وی ئەحمەد پاشایێ والیێ بەغدا کرییە

سەر ئیرانێ پشتی حوکمێ سەفەوی ل وی وەلاتی هەلوەشیای، هەر بۆ نموونە، بەلگەنامەیا دەستپێکا (جمادی الاخرە) یا سالا ١١٣٩مش/١٧٢٦ز فەرمانەك تێدا هەیە و ئاراستەی حوکمدارێ ئامێدیێ هاتیە کرن و(فەرمانێ ددەتێ لەشکەرەکی ژ زەلامێن هۆز و عەشیرەتێن خۆ ئامادە بکەت داکو بگەهیتە والیێ بەغدا و ئەحمەد پاشایێ سەرلەشکەرێ(سەرکردێ بلند)ێ ل لایێ هەمەدان و ئەسفەهان)[٢]. ڤان هێزان ب سەرکردایەتیا ئەحمەد پاشای سەرکەڤتنێن مەزن د وان شەڕ وهنگامان دا دەستڤەئینان و چەندین گوندێن رۆژئاڤایێ ئیرانێ ستاندن، لێ پرۆپاگەندا ئایینی یا ئەفغانییان بەلاڤ کری کو وان ژی وی دەمی لایەکێ ئیرانێ ستاندبوو، بوو ئەگەرێ وێ چەندێ هێزێن کوردی خۆ ژ شەڕگەهێ ڤەکێشن و ئەحمەد پاشا بەرامبەری ئەفغانییان تووشی شکەستنێ ببیت، ژ بەر هندێ، پتر کەرێن وی ژ بەهرام پاشای ڤەبوون ژ بەرکو پتریا هێزێن خۆڤەکێشای یێن وی بوون، ئەڤە ل وی دەمێ بەلگەنامەیێن ئۆسمانی ب خۆ ژی رۆلێ گرنگێ هێزێن کوردی د وی شەڕی دا پشتراستدکەن، دیرۆکنڤیسەکێ هەڤچەرخ ژی وان هێزان هۆسا سالۆخ ددەت و دبێژیت:(کورد پێشەنگێن لەشکەرێ وەزیری بوون، ئەو ب سوارێن مێرخاس دهاتنە نیاسین»[٣]. سولتانی بەهرام پاشا راسپارد، سەرباری هەردو موتەسەرفی یێن بابان و کۆیە، دەڤەرێن کەرکوك ژی ب سەرباز و کەل ویەلێن لەشکەری ب هێز بێخیت(کو دشیاندایە ببنە جهێ باوەریێ و پشت پێ بهێتە گەرم کرن)[٤]، سولتانی کورکەکێ شاهانە یێ گرانبها وەك خەلات پێشکێشی وی کر وەك رێزگرتن بۆ خزمەتێن وی یێن هێژا بۆ ئایینێ پیرۆز و دەولەتا بلند)[٥]، لێ هێشتا چەند هەیڤەکێن کێم نەبۆرین، سولتانی ئەو راسپارد ب هێزەکا سەربازیا پێکهاتی ژ ٥٠٠ سەربازان[٦] و ٥٠٠ سواران[٧] هاریکاریا بەغدا بکەت، هەر ژ بەر وێ ئەگەرێ، دوبارە ل دەستپێکا هەیڤا شەعبانا ١١٤٧مش/١٧٣٤ز ژ لایێ سولتانی ڤە هاتە خەلاتکرن، ل دووف ڤەگێرانەکێ ژی[٨]، ژ بەرکو

ئەحمەد پاشای گەلەك کەرب ژ بەهرام پاشای ڤەدبوون، هەر ئەو سیاسەت دگەل ب کارئینا یا بەری هنگی بابێ وی دگەل ب کارئینای، ئەو ژی ب لێدانا وی ب هەڤرکەکێ دی یێ بنەمالا وی ب خۆ، ئەوێ بۆ ڤێ رۆلگێرانێ بەربژارکری عەلی خانێ پسمامێ بەهرامی بوو، وی ئەو هاندا گوهدارییا پسمامێ خۆ نەکەت و خرابکاری و رێگرییان ل میرگەهێ بکەت. ئەحمەد پاشا ب ڤێ چەندێ ب تنێ رانەوەستیا، بەلکی ب سەرکردایەتییا کەتخودایێ خۆ (جێگر و هاریکارێ خۆ) هێزێن خۆ ژی هنارتن داکو پشتەڤانییا عەلی خان بکەن، هەروەسا فەرماندا خانە بەگێ بابانی ژی بگەهیتە وان هێزان، ئینا هێزێن ناڤبری باژێرێ ئامێدیێ دووربێچدان و ب هەمی رێیان و پتر ژ جارەکێ پێکۆلا ب سەرداگرتنا باژێری کرن، لێ بەرهنگاری شکەستنەکا مەزن بوون، ئینا کەتخودا نەچاربوو پێکهاتنەکێ دگەل بەهرام پاشای گرێدەت، ل دووڤ وێ رێککەڤتنێ دڤێت بەهرام پاشا هەمی باجێن ل سەر هەین بدەت و عەلی ئاغا وەك حوکمدارێ دهۆك دامەزرینیت، هەروەکی دیارە ژی داخوازییا داویێ تنێ بۆ پاراستنا ئاڤرویا وێ هەوا سەربازی بوویە یا چ تشت ژێ ب دەستڤەنەهاتی، هەروەسا ئاشتبوونا د ناڤبەرا هەردولا هاتییە روودان، بوو ئەگەرێ دودلییا حەجی حسێن پاشا جەلیلی یێ والیێ مووسلێ ئەڤە ژی ژ بەر وێ نەیارییا ل ناڤبەرا وی و یێ داویێ هەی، ڤێجا چ پێ نەما و سەرکردایەتییا هەوەکا سەربازی بەرەڤ ئامێدیێ کر و ل سالا ١١٥١مش/١٧٣٨ز[٩] (هاتییە گۆتن ژی ل سالا ١١٥٣مش/١٧٤٠ز) ئەو باژێر دووربێچ کر، (ئینا بەهرام پاشا بەرامبەری گۆژمەکێ پارەی دگەل وی پێکهات)[١٠]. ژ بەر ڤێ هەوا سەربازی زیان گەهشتە رێ یێن بازرگانی، وەسا دیارە ژی کو هەوا والیێ جەلیلی، ئەحمەد پاشا ئاگەهدارکرییە کو دڤێت دەست ژ ئازراندنا کێشەیان دگەل بەهرام پاشای بەردەت، بەلکی دڤێت پشتەڤانیێ ژی ل حوکمێ وی بکەت، ب ڤێ چەندێ، پەیوەندی یێن ل ناڤبەرا هەردولا ب قووناغەکا نوویا هاریکاریێ را بۆرین، هەر بۆ نموونە، ل سالا ١١٦٠مش/١٧٤٧ز

ئەحمەد پاشا ب سەرکردایەتییا کەتخودا سلێمان ئاغا هەوەکا سەربازی هنارت بۆ سەرکوتکرنا پشتەرێبوونەکا سەربازی یا سولتان بەدرەددین بەگ سەرکردایەتییا وێ دکر دژی بەهرام پاشای، ئەو هەوا سەربازی د ئەرکێ خۆ دا سەرکەڤت و کەتخودا و میرێ بەهدینان ل سەر ب داوییئینانا هەمی ئەگەرێن ناکوکی یێن ل ناڤبەرا بەغدا و ئامێدیێ رێککەڤتن.

هەرچەندە ژی بەهرام پاشا بەرهنگاری پشتەرێبوونەکا دی بوو کو ڤێ جارێ ب سەرکردایەتییا بایرام بەگێ کورێ سولتان بەدرەددین بوو و وی ژی داخوازییا حوکمداریێ دکر، لێ مە چ ئاماژە نەدیتن کو ئەحمەد پاشای هاریکارییا ڤێ پشتەرێبوونێ کرییت، ژ بەر هندێ، بەهرام پاشا شیا وێ دووربێچێ راکەت یا بایرامێ ناڤبری پێرابووی و شیا زیانێن مەزن بگەهینیتە هێزێن وی، یێ داویێ (ئانکو بایرام بەگێ) زاخۆ دووربێچکر، ئینا یەحیا بەگێ حوکمدارێ وێ داخوازییا پشتەڤانییەکا سەربازی ژ بەهرامی کر، بەهرامی ژی هێزێن خۆ ب سەرکردایەتییا ئیسماعیل بەگێ(پاشتر ببوو پاشا) کورێ خۆ هنارتن و شەرەکێ دژوار ل ناڤبەرا هەردولا ل گوندێ (مەلکێ) هاتە روودان و شەڕ ب شکەستنا هێزێن بەهدینان ب داویهات، دەمێ دەنگ وباسێ وێ شکەستنێ گەهشتییە بەهرام پاشای، سەرکردایەتییا هێزێن خۆ کر و قەستا شەڕگەهێ کر، لێ وی دوژمنێن خۆ ل وێرێ نەدیتن، چونکی بایرام بەگێ خۆڤەکێشان چێتر دیتبوو و قەستا میرگەها بۆتان(جزیرێ) کربوو. (یاسین العمری) دبێژیت کو ئەو شەڕ ل سالا ١١٨٣مش/١٧٦٩ز هاتییە روودان، رامانا وێ ژی ئەوە کو پشتی مرنا بەهرام پاشای هاتییەکرن و ئیسماعیل بەگ وەك میرێ بەهدینان سەرکردایەتییا لەشکەرێ خۆ کرییە، ب ڤی ئاوایی، میرێ بەهدینان بێی هندێ چ شەڕان بکەت ڤەگەڕیایە پایتەختێ خۆ.

ژ بەرکو ئامێدیێ گەلەك جاران تووشی دووربێچکرنێ دبوو، بەهرام پاشای گرنگی دا کاروبارێن بەرگریکرنێ ژ وی باژێری، گرنگترین تشتێ وی ئینایە ناڤ ئامێدیێ تۆپخانە بوو و تۆپ ل سەر شوورهێن وێ

دانان داكو بەرسڤا تۆپێن هێرشكەرا بدەن، هەروەسا لایەنگریا رێبەرێن عەشیرەتان بۆ خۆ مسۆگەر كر دەمێ ئەو نەچار كرین هندەك ئەندامێن خێزانێن خۆ وەك بارمتە (رهینە) پێشكێش بكەن داكو پشتراست ببیت كو رێبەرێن وان عەشیرەتان دژایەتیا وی ناكەن. بەهرام پاشا ل هاڤینگەها (سەرێ ئامێدیێ) ل ئەلندا رۆژا دووشەمبی رێكەفتی ١٣شەعبانا سالا ١١٨٢مش/٤تیرمەها ١٧٦٨ز، د ژیێ ٧٣ سالیێ دا مریە[11]، هەڤچەرخێ وی (یاسین العمری) وی ب (بەرگەرێ رێككەفتنێن ل ناڤبەرا شاهێن كورد، یێ راست ودروست و خودان بریار، یێ ل رێزا مەردان) سالۆخ ددەت[12]. هەروەسا نڤیسەرەكێ مەسیحی ژی وی ب (حوكمدارێ باش وراست) سالۆخ ددەت[13].

## میر ئیسماعیل پاشایێ كورێ بەهرام پاشای:

ل دۆرێن نیڤا سەدسالیا ١٢ مش/١٨ز ژ دایكبوویە، ژ بەركو ئەو كورێ نەخری بوویە، پشتی مرنا بابێ خۆ ل سالا ١١٨٢مش/١٧٦٨ز[14] بوویە حوكمدارێ ئامێدیێ، سەرباری ڤی پۆستی، چەندین كێشەیێن كوور یێن حوكمداریێ وەك میراتە بۆ مان كو چارەكرنا وان یا ب زەحمەت بوو بێی ژ ناڤبرنا لایەنێن وان كێشەیان، وی ژی ئەو حەز، یان ئەو زڤریا پێتڤی نەبوو وێ چەندێ بكەت، ژ بەر هندێ، كێشە ب ئاوایەكێ وەسا بەرفرەهـ بوون ببنە گەف ل سەر پێكەهێ بنەمالا وی ل ناڤ عەشیرەتێن پشتەڤانیا رژێما وی دكرن، نووترین كێشە ژی بەردەوامبوونا لڤینا بایرام بەگێ كورێ سولتان بەدرەددین بوو ل دەڤەرا ئاكرێ و دەردۆرێن وێ، ئیسماعیل ل سەردەمێ بابێ خۆ ل بەرسینگێ ڤێ لڤینێ راوەستیابوو، دەمێ بابێ وی ئەو كریە سەركردەیێ هێزان و هنارتی داكو روو ب رووێ پێشرەویا هێزێن نەیارێ وی ببیت، بایرام بەگ ژی كو چاڤێ وی ل حوكمداریێ بوو، عەشیرەتا زێبار ل دۆر خۆ كۆم كر كو ئێكە ژ مەزنترین عەشیرەتێن میرگەهێ و ب وان كۆنترۆل ل سەر ئاكرێ و كندیر كر كو یا ئێكێ دووەمین كەلا گرنگ یا میرگەهێ بوو و ژ هەمیان ئاسێتر بوو، ب ڤێ چەندێ، بزاڤا وی هۆشدارییەك بوو بۆ دابەشبوون و دو پارچەبوونا میرگەهێ. بایرام هەست ب هێزا وی كر، ئینا قەستا ئامێدیێ كر بۆ داگیركرنا وێ باژێری و داكو ب زۆری خۆ ل سەر بسەپینیت، ئیسماعیل پاشا هەست ب مەترسیا مەسەلێ كر، ئینا ب هێزێن خۆ ژ ئامێدیێ دەركەڤت و قەست كرێ و شەرەكێ دژوار ل ناڤبەرا هەردوان هاتە روودان و بوو ئەگەرێ شكەستنا بایرام و رەڤینا وی ژ شەرگەهێ، هێزێن وی ژی تەراوبەرا بوون و تبابەكا زۆر یا تڤەنگ و شیر و خەنجەران بوونە دەستكەڤتیێن هێزێن ئیسماعیل پاشای، هەروەسا دو رێبەرێن عەشیرەتا زێبار ژی هاتنە كوشتن.

بایرام بەگ پێحەسیا كو نەشێت ب رێیا سەربازی ئیسماعیل پاشای ژ حوكمی لادەت، ئینا بریاردا ب ئاشتیانە و ب رێیەكا سیاسی وێ ئارمانجێ بهنگێڤیت، ژ بەر هندێ، ل سالا ١١٨٣مش/١٧٦٩ز قەستا والیێ بەغدا كر داكو فەرمانێ بدەت و وی وەك میرێ ئامێدیێ دامەزرینیت، والیێ بەغدا ژی ئەڤ داخوازییە بۆ خۆ ب دەلیڤە دیت داكو مایێ خۆ د كاروبارێن ناڤخۆیی یێن میرگەهێ دا بكەت، ئەڤە سەرباری ب دەستڤەئینانا گوژمەكێ زۆر یێ پارەی یێ وی وەك دیاری یان وەك بەرتیل ژ بایرام پاشای وەرگرتی، ژ بەر هندێ، والی دەملدەست فەرمانا دامەزراندنا وی دا، بۆ بهێزكرنا ڤێ فەرمانا خۆ ژی، محەمەد بەگێ موتەسەرفێ قەلاچوالان راسپارد هاریكاریا وی د ب جهئینانا وێ فەرمانێ دا بكەت هەكە ئیسماعیل پاشای رەتكر خۆ بۆ بچەمینیت. هۆسا، هێزێن میرێ قەلاچوالان بەرەڤ ئامێدیێ پێشرەوی كرن و بۆ ماوێ پێنج هەیڤان ئەو باژێر دووڕپێچكر بێی هندێ بشێت چ ب دەستڤە بینیت، ل داویێ ڤان هێزان خۆ ڤەكێشان و بایرام و شەركەرێن دگەل وی نەچاربوون خۆڤەكێشنە كەلا خۆ، ل وێرێ ژی ل دووڤ شیانێن خۆ عەشیرەت ل خۆ كۆمكرن، پاشی پێ بەرەڤ ئامێدیێ پێشرەوی كر، لێ بەری بگەهیتە وێرێ، دەنگ و باس گەهشتبوونە ئیسماعیل پاشای و ئەو ب هێزێن خۆ

بۆ دەركەڤت و هەردولا ل نێزیك گوندێ (هەمزیكێ) ل رۆژئاڤایێ ئامێدیێ گەهشتنە ئێك، ل وێرێ شەرەك ل ناڤبەرا وان هاتە روودان و ب شكەستن و رەڤینا بایرام بۆ چیایان ب داوی هات و ل وێرێ مر.

وەسا دیارە ژی روودانا ڤان لێككەڤتنان ل ناڤبەرا ئەندامێن بنەمالەكێ و مژوولبوونا ئیسماعیل پاشای ب وان لێككەڤتنان ڤە، حوكمدارێن هەڤسوویێن چاڤبرسی(تەماعكار) هاندان ڤێ دەلیڤێ بۆ بەرژەوەندیێن خۆ ب كار بینن، هەر بۆ نموونە، عەبدلباقی پاشا كو ئێك بوو ژ شاهێن بەغدا، هێرش كرە سەر گوندێن ئامێدیێ و هندی شیای تالانكرن، لێ د هێرشەكا تۆلڤەكرنێ یا رێبەرێن عەشیرەتێن زێباری و مزووری و بەرواری دا هاتە كوشتن. ل سالا ١١٨٩مــش/١٧٧٥ز ژی عەشیرەتا تیاری هێرشەكا دی كرە سەر گوندێن بــەرواری بــالا، لێ ل سالا ١١٩١مــش/١٧٧٧ز ئیسماعیل پاشا ب هاریكاریا محەمەد بەگێ والیێ جزیرێ شیا بەرسینگێ ڤێ هێرشێ بگریت و ب دژواری داگیركەران سەركوت بكەت و ٧٠ ێ زەلامـان ژێ بكوژیت، هەروەسا ل سالا ١١٩٧مش/١٧٨٢ز عەبدولباقی پاشایێ جەلیلی هێرش كرە سەر هەردو گوندێن (شاهـ قولی) و (كەرەملێس) یێن دكەڤنە بەر ویلایەتا مووسل[15].

ل سالا ١٢٠١مــش/١٧٨٦ز هەڤركیەكا نوویا بنەمالەیی دەستپێكر و ڤێ هەڤركیێ كاریگەریا خۆ ل سەر سەرانسەری ژیانا گشتی یا بەهدینان هەبوو، وێ سالێ چوار برایێن وی ل دژی وی رابوون كو ئەو ژی ئەڤێن خوارێ بوون: سەیفۆر بەگ، لوتفوللا بەگ، حاجی خان بەگ و حەسەن بەگ، ئینا ئیسماعیل پاشای ئەو ژ ئامێدیێ دەرئێخستن و بەرەڤ زاخۆ چوون كو عەشیرەتێن وێرێ پشتەڤانیا وان دكرن، ژ وانا هندەك عەشیرەتێن ئێزدی ب سەرۆكاتیا چۆلۆ بەگ، ئینا بازێرك ب ساناهی كۆنترۆل كرن و ئیسماعیل پاشا نەچاربوو هەوەكا سەربازی ب سەرۆكاتیا برایێ خۆ عەلی خان بەگ ئاراستەی وێرێ بكەت و شیا سەركەڤتنەكا بلەز ب سەر وان سەرهلدایان دەستڤە بینیت و ئەڤ سەركەڤتنە بوو ئەگەرێ ڤەگەڕاندنا زاخۆ و دەستەسەركرنا سەیفۆر و حاجی خان بەگێ، لێ لوتفوللا بەگ نەچاربوو بڕەڤیتە زێبار، حەسەن بەگ ژی چ دەنگ و باسێن وی نەمان و نەهاتە زانین بەرەڤ كیرێ رەڤییە، لێ سەرباری وێ سەركەڤتنا ئیسماعیل پاشای ب سەر نەیارێن خۆیێن نێزیك ب دەستڤەئینای، ب هندێ حەسیا كو دڤێت وان رازی بكەت داكو هەڤركیا ل ناڤبەرا وان ب داویبهێت كو ئەو هەڤركی ژ لایەكی ببوو گەف ل سەر بنەجهبوونا میرگەهێ، ژ لایەكێ دووڤە ببوو ئەگەرێ وێ چەندێ گەلەك لایەنگرێن خۆیێن گرنگ ژ دەست بدەت، نەخاسمە ژی ل زێبار ل رۆژهەلاتێ و ئێزدییان ل رۆژئاڤایێ.

ژ بەر هندێ، ل سالا ١٢٠٢مش/١٧٨٧ز ئیسماعیل پاشای بزاڤ كر كەلا گرنگ یا ئاكرێ بدەتە وان داكو رازی ببن[16]، لێ هەر زوو جارەكا دی پشتەرێبوونا خۆ راگەهاندن، ئینا نەچاربوو سەركردایەتیا هێزێن خۆ بكەت و قەستا وان بكەت و كەلا دوورپێچكر، هەتا وان چ دەلیڤە نەبوو بڕەڤن و قەستا مووسل بكەن، لێ ب بەرگەریانا هندەك ریهسپی و ماقوولان گەردەنا وان هاتە ئازا كرن و دەستووریا وان هاتە دان ڤەگەرێنە ئاكرێ، ب مەرجەكی گوهداریا فەرمانان بكەن و ڤاریبوونا خۆ ب داوی بینن[17]، لێ هێشتا سالەك نەبۆری، بۆ جارا سیێ پشتەرێبوونا خۆ ل سەر ئیسماعیل پاشای راگەهاندن، ئینا وی قوباد بەگێ برازایێ خۆ (پشتی دگەل ئاشتبووی) ئاراستەی وان كر كو ئەڤە ژی بۆ رازیكرنا وی بوو، چونكی وی ژی دڤیا حوكمداریا ئاكرێ بكەت[18] و بۆ هندێ بوو ژی تەماعكاران ڤێكرا بەردەت و شەرێ ئێك ودو بكەن، ب راستی ژی وەسا چێ بوو، قوباد ئاكرێ دوورپێچكر و دگەل هێزێن مامێن خۆ كەڤتە د شەری دا، پاشی ـــ ب حیلەوحەوالە ـــ شیا وان دەستەسەر بكەت و بهنێریتە نك مامێ خۆیێ ل ئامێدیێ[19]، لێ بێ داویێ ئەو ئازا كرن و كەلا (كندیر؟؟؟) دانە وان، لێ هەڤركی یێن بنەمالەیی ب وێ چەندێ ب داوی نەهاتن و هەر زوو قوبادی پشتەرێبوونا خۆ ل ئاكرێ راگەهاند و ئیسماعیل پاشا ل هەیڤا ئیلۆنا ١٧٨٩ ێ ز نەچاربوو

سەرکردایەتیا هێزێن خۆ بکەت و قەستا وی بکەت، ئینا چوو باعەدرێ و ئەو ژ حوکمی لادا و ئاکرێ ژ ڤراندەڤە و مرادخانێ کورێ خۆ وەك میرێ ئاکرێ دامەزراند. ژ بەرکو ئەڤ رەفتارە ب دلێ قوبادی نەبوو، وی قەستا عەبدلرەحمان پاشایێ بابانی حوکمدارێ سلێمانیێ کر داکو دووبارە وی بزڤرینیتە پۆستێ وی، وەسا دیارە ژی وی ئەو چەند بێی هەماهەنگیا تمام دگەل والیێ بەغدا نەکرییە، کو روودانێن پشتی هنگی هەڤالینیا وی دگەل والی پشتراست دکەن، قوباد ب پشتەڤانیا وی شیا ل سالا ۱۲۰۵مش/۱۷۹۰ز ئاکرێ بزڤرینیتە ڤە و ببیتە حوکمدارێ وێ، ئینا جارەکا دی ئیسماعیل پاشی هێزەکا سەربازی ب سەرکردایەتیا عەلی خانێ کورێ خۆ هنارت، وێ هێزێ باژێر دووربێچکر و قوباد بەگ نەچار بوو ژ باژێری دەرکەڤیت و دووبارە ئیسماعیل پاشای کورێ خۆ مراد بەگ وەك میرێ ئاکرێ دامەزراند و وی چ بێ دی نەما ژ بلی ژ ناڤبرنا چۆلۆ بەگێ رێبەرێ ئێزدی کو بەری هنگی پشتەڤانیا نەیارێن وی کریبوو، وی چۆلۆ بەگ و برایێ وی و هژمارەکا دووڤکەڤتیێن وی ب غەدر کوشتن و خەنجەر بەگێ هەڤرکێ وی وەك رێبەرێ ئێزدییان ل شوونا وی دامەزراند[20].

هەرچەندە برایێن ئیسماعیل پاشای شۆرش و پشتەرێبوون ل دژی وی دکرن لێ وی دڤیا وان رازی بکەت، هەر بۆ نموونە، ل سالا ۱۲۱۳مش/۱۷۹۸ز سەیفۆر بەگ، حاجی لوتفوللا و حاجی خان ئینانە نك خۆ و حەفت گوند دانێ داکو رازی ببن[21] و دگەل قوباد بەگێ برازایێ خۆ ژی ئاشتبوو و کرە حوکمدارێ زاخۆ، هەروەسا هەوەك ب سەرکردایەتیا خالەکێ خۆ هنارت بۆ بەرسینگگرتنا هێرشەکێ یا سالا ۱۲۰۹مش/۱۷۹٤ز هندەك عەشیرەتێن جزیرێ کریبە سەر زاخۆ و د وێ هێرشێ دا خالێ وی هاتە کوشتن، لێ ئەو عەشیرەت رەڤینە دەردۆرێن جزیرێ، ئیسماعیل پاشا ل رۆژا ۱۸ ی سەفەرا سالا ۱۲۱۳ ێ مش/۱۷۹۸ ێ ز ل بارەگەهێ خۆیێ هاڤینی ل (سەرێ ئامێدیێ) وەغەرا داویێ کرییە، ئەڤە ژی پشتی کورێ خۆیێ بچووك محەمەد تەیار بۆ حوکمداریا میرگەهێ دەستنیشان کری[22].

## میر محەمەد تەیار پاشا:

کورێ ئیسماعیل پاشایێ میرێ ئامێدیێ یە، بابێ وی ئەو ژێگرت داکو پشتی وی ببیتە میرێ بەهدینان، هەرچەندە وی دەمی هێشتا ئەو (سنێلە) بوو و برایێن ژێ مەزنتر هەبوون، ئیسماعیل پاشای (هەر تشتەکێ هەی ژ راژێرك و مەحفوور و زێر و زیڤ و چەك و تڤەنگ و مراری و دەرهەم و دینار و هەسپ ب خەملا وان ڤە و هەر تشتەکێ هەڤشێوەیێ وەسا ژ مالێ دنیایێ) رادەستی وی کرن، دەمێ بابێ وی ل سالا ۱۲۱۳مش/۱۸۱۳ز مری، سلێمان ئاغایێ کەتخودایێ بابێ وی شیا مایێ خۆ د مەسەلا لادانا وی دا ژ حوکمی بکەت، لێ (یاسین العمری) دبێژیت کو مایتێکرنا کەتخودای ب داخوازیا محەمەد تەیار ب خۆ بوویە و کەتخودای ب پشتەڤانیا مزووریان فەرمانا وی ب جهـ دئینا[23].

هەر چەوان بیت، یێ داویێ (ئانکو کەتخودای) ل ئامێدیێ کورێن ئیسماعیل پاشای گازیکرن و داخواز ژێ کر یێ باشتر ببیتە حوکمدار، ل سەر وی بنەمای ژی کو میراتگرێ شەرعی محەمەد تەیار بۆ وەرگرتنا دەستەلاتێ هێژ یێ بچووك بوو و دەمێ کورێ نەخری مرادخان بۆ وی پۆستی هاتییە ژێگرتن، محەمەد تەیار هاتە رازیکرن ببیتە حوکمدارێ ئاکرێ، لێ ژ برایێن خۆ یێ پشتراست نەبوو، ئینا نەچار بوو ژ ئامێدیێ دەرکەڤیت و (هەر تشتەکێ بابێ وی هەی) دگەل خۆ ببەتە کەلا قومریێ، لێ هەر یێ رازی نەبوو، ژ بەر هندێ، دگەل قوباد بەگ کورێ حسێن کورێ بەهرام پاشای و دگەل هەمی عەشیرەتان رێککەڤت شۆرشەکێ ل سەر مراد پاشای بکەن و یێ داویێ ژی ب وێ چەندێ هاتە ئاگەهدارکرن، وی ژی عەشیرەتێن پشتەڤانێن خۆ ل خۆ کۆم کرن، ژ وانا: دەنادی ل شێخان، خەلکێ شنگار، ب سەرکردایەتیا نەمر کورێ سیمۆ میرێ دەنادیان، شەر و هنگام ل ناڤبەرا هەردولا هاتنە روودان و تێدا ل دۆرێن ٤٠٠ کەسان هاتنە کوشتن کو پتریا وان مزووری و خەلکێ شێخان بوون و گەلەك گوند ژی هاتنە تالانکرن، پاشی وەزیر محەمەد پاشایێ جەلیلی والیێ مووسل

(١٢١٤-١٢٢١مش) ئەو پێكئینان كو بازێرێ زاخۆ بۆ میر قوباد بەگێ و بازێرێ ئامێدیێ و دەڤەرێن وێ بۆ بۆ مراد خان پاشا بن، لێ ل دووڤ ڤێ پێكهاتنێ چ تشت بۆ محەمەد تەیار پاشای نەمان و نەگەهشتە ملك و مالێ بابێ خۆ، دبیت ژی ب تنێ كەلا قومریێ بۆ مابیت[٢٤].

(یاسین العمری) دبێژیت كو هندەكان گۆتیێ ئەو (كەسەكێ مێرخواز و هەژی و خودان رەوشتەكێ بلند) بوویە[٢٥]، هەروەسا هۆزانڤان و نڤیسەر بوویە و هۆزان ب هەردو زمانێن فارسی و كوردی (ب هەردو دیالێكتێن بەهدینی و سۆرانی) هەنە، دیسان هۆزانێن نازك و دلڤەكەر هەنە و هندەك هۆزانێن هۆزانڤانێ كورد ئەحمەدێ جزیری پێنج خشتەكی كرینە و ل سالا ١٢٣١مش/١٨١٥ز دیوانا وی ب دەستخەتێ خۆ نڤیسیەڤە و تێدا ناڤێ خۆ ب ڤی ئاوایی نڤیسیییە: (محمد طیار بن اسماعیل باشا العباسی اصلا العمادی وطنا) ئانكو (محەمەد تەیار كورێ ئیسماعیل پاشایێ ب بنیات عەباسی، ئامێدیێ وەلاتێ وی)[٢٦].

## مراد پاشایێ كورێ ئیسماعیل پاشای:

كورێ نەخرێ ئیسماعیل پاشایە، سەرباری هندێ، پشتی مرنا وی حوكم رادەستی وی نەهاتییە كرن، بەلكی بۆ محەمەد تەیار پاشایێ كورێ وی یێ بچوكتر بوویە، د ژیانا خۆ دا بوویە حوكمدارێ ئاكرێ، دەمێ ئیسماعیل پاشا مری، یێ داوێ نەشیا دەستەلاتێ وەرگریت ئەڤە ژی ژ بەر وێ تگبیرا حەجی سلێمان ئاغایێ كەتخودا كری، یێ داخواز ژ كورێن مەزن یێن ئیسماعیل پاشای (كو ل دەرڤەی شوورهێن ئامێدیێ بوون) كری د ناڤ خۆ دا یێ باشتر هەلبژێرن داكو پشتی بابێ خۆ ببیتە حوكمدار، ژ بەركو محەمەد تەیار پاشا هێژ یێ بچووك بوو، مرادخان (پاشا) هاتە ژێگرتن و هاتە ناڤ ئامێدیێ (و بڕیار ل سەر بنگەهێن وێ دا)، لێ هەر زوو ڤێكنەكرن ل ناڤبەرا برا پەیدابوو و محەمەد تەیار پاشا و قوباد بەگێ برایێ وی دانپێدان ب برایێ خۆ نەكرن كو ببیتە حوكمدارێ ئامێدیێ و داخوازا پشتەڤانیێ ژ هەمی عەشیرەتان كرن، ئینا چەندین شەڕێن دی ل ناڤبەرا هەردولا هاتنە روودان و ل دۆرێن ٤٠٠ كەسان ژ هەردولا هاتنە كوشتن و گەلەك گوند هاتنە تالان كرن. ل دووڤ گۆتنا (یاسین العمری)، ژ بەر ڤێ ئاژاوەگێڕیێ رێ یێن بازرگانی هاتنە بڕین و ڤێ چەندێ ژی كارێگەرییەكا نەرێنی نەتنێ ل سەر وەلاتی، بەلكی ل سەر ویلایەتا مووسل یا هەڤسوو ژی هەبوو، بهایێ كەرەستەیێن ژ بەهدینان دچوونە بازاڕێن مووسل گران بوون، نەخاسمە ژی بهایێ داری و رەژوویێ و هندەك پیشە ژ كاركەفتن، وەسا دیارە ژی ژ بەر هندێ محەمەد پاشایێ والیێ مووسل (١٢١٤-١٢٢١ مش) بەرگەڕیان ل ناڤبەرا هەردولا كرییە و هەردولا پێكهاتن كو بازێرێ ئامێدیێ و دەڤەرێن وێ بۆ مراد پاشای و زاخۆ بۆ قوباد بەگێ بیت، جهێ حێبەتیبوونێ نینە ژی ئەندامێن بنەمالا حوكمدار حوكمدارییا بازێرێن میرگەهێ و كەلایێن وێ بكەن ب مەرجەكی كو حوكمدارییا گشتییا میرگەهێ ل بەهدینان د دەستێ میرێ ئامێدیێ دا بیت، لێ ئەو تشتێ ل ناڤبەرا هەردو برا هاتییە روودان، لێكڤەكرنەكا ب راستایا دەستەلاتێ بوو و رامانا وێ پارچەبوونا میرگەهێ بوو و ئەڤ دابەشبوون و نەمانا دەستەلاتا ناوەندی، بوو ئەگەرێ وێ چەندێ هەڤركیێن چەكداری ل ناڤبەرا هۆزێن پشتەڤانێن میرگەهێ پەیدا ببن، ئینا هەڤركی ل ناڤبەرا هۆزێن مزووری و دۆسكی هاتە روودان و هژمارەكا كەسان ژ هەردولا هاتنە كوشتن، ژ بەر هندێ، پێتڤی بوو والیێ بەغدا وەك لێڤەگێرێ بلندێ میرێن بەهدینان مایتێكرنێ بكەت، ئینا مراد بەگ ژ حوكمی لادا و قوباد بەگ ژێگرت و ل شوونێ دانا، كوركەكێ شاهانە كو هێمایێ دەستەلاتێ بوو بۆ یێ داوێ هنارت و ل سالا ١٢١٤مش كرە (حوكمدارێ ئامێدیێ)، لێ هەڤركی گەهشتبوونە گۆپیتكێ و عادل بەگێ كورێ ئیسماعیل پاشای بۆ خۆ ب دەلیڤە دیت برایێ خۆ لادەت یان ژی ب هندەك هەڤركی یێن

ل ناڤ میرگەها وی دهاتنە رووودان مژوول بکەت، عادل بەگ هاتە ناڤ ئامێدیێ و خۆ کرە میرێ وێ، لێ ژ بەرکو ب ئاوایەکێ نەرەوا(نەشەرعی) گەهشتبوو وی پۆستی، مراد پاشا شیا وی لادەت و دەستەلاتا ئامێدیێ وەرگریت، کو ئەڤە ژی ب دلێ والیێ بەغدا نەبوو چونکی وی دڤیا قوباد پاشا ببیتە حوکمدارێ ئامێدیێ، ژبەر هندێ، هەوەکا سەربازی ب سەرۆکاتیيا ئیبراهیم پاشایێ کوڕێ ئەحمەد پاشایێ بابانی یێ موتەسەرفێ سلێمانیێ هنارتە ئامێدیێ داکو قوباد ببیتە حوکمدارێ وێ، لێ ژ بەر بەرگریيا مراد بەگێ ژ لایەکی و پشتەڤانینەکرنا عەشیرەتان ل قوباد بەگێ ژ لایەکێ دووڤە ئەو هەوا سەربازی د ئەرکی خۆ دا سەرنەکەڤت، ئینا ئیبراهیم پاشایێ بابانی نەچاربوو دانپێدانێ ب وێ دیفاکتۆیێ بکەت یا میرێن بەهدینان ب خۆ سەپاندی و بڕیار هاتە دان مراد پاشا ببیتە حوکمدارێ ئامێدیێ و هەڤرکێ وی قوباد پاشا ببیتە حوکمدارێ ئاکرێ، ل سالا ١٢١٨مش ژی والیێ بەغدا شیا مراد پاشا لادەت و عادل بەگێ برایێ وی ل شوونێ دانیت.

جارەکا دی ژی و بۆ جارا داویێ ئاماژە ب ناڤێ مراد پاشا هاتییەدان دەمێ ل سالا ١٢٣٠مش ئاژاوەگێڕییەکا چەکداری ل ناڤبەرا دەنادیيا و خەلکێ خڕکی (دبیت خوڕکێ بیت) هاتییە رووودان[٢٧].

## قوباد بەگێ کوڕێ سولتان حسێن بەگێ کوڕێ بەهرام پاشای:

چ زانیاری ل سەر دەستپێکا ژیانا وی نینن، لێ تشتێ ژێ دهێتە زانین شۆڕش ل سەر ئیسماعیل پاشایێ مامێ خۆ کرییە و داخواز ژێ کرییە ببیتە حوکمدارێ ئاکرێ و مامێ وی ب داخوازیيا وی رازی نەبوویە، لێ پشتی ل سالا ١٢٠٣مش/١٧٨٨ز شیای پشتەرێبوونا برایێن خۆ سەرکوت بکەت، ئیسماعیل پاشا نەچار بوویە وی بکەتە میرێ ئاکرێ، لێ هەر زوو ژ وی پۆستی لادا و مراد بەگێ کوڕێ خۆ ل شوونێ دانا.

پشتی مرنا ئیسماعیل پاشای، قوباد بەگ شیا خۆ نێزیکی عەلی پاشایێ والیێ بەغدا (١٢١٧-١٢٢٢مش/١٨٠٢-١٨٠٧ز) بکەت، ئینا پشتی لادانا مراد پاشای ل سالا ١٢١٨ێ مش/١٨٠٣ز قوباد وەك میرێ بەهدینان دامەزراند، لێ نەشیا بهێتە ناڤ ئامێدیێ چونکی عادل پاشایێ میرێ وێ و برایێن وی ئەو دامەزراندن رەتکربوون، ئینا جارەکا دی نەچاربوو داخوازا هاریکاریێ ژ والیێ بەغدا بکەت و وی ژی هەوەك ب سەرکردایەتیيا ئیبراهیم پاشایێ بابانیێ موتەسەرفێ سلێمانیێ بۆ هنارت، لێ وێ هەوێ ئارمانجا خۆ نەهنگاڤت و قوباد بەگ نەگەهاندە کورسیيا حوکمی ل ئامێدیێ، چونکی هۆزا سلێڤانەیی ل دۆر مراد پاشای و برایێن وی کۆم ببوون و بەرەڤانی ژ حوکمێ وی دکرن، هۆسا، ژ بەر زیانێن نەپێشبینیکری یێن ب هێزێن والیێ بەغدا کەڤتین، کو ژ وانا ٥٠ زەلامێن بابانی ژی بوون، ئیبراهیم پاشا نەچاربوو دانپێدانێ ب دیفاکتۆیێ بکەت کو مراد پاشا حوکمدارێ ئامێدیێ بیت، لێ قوباد بەگ کرە حوکمدارێ ئاکرێ، لێ د پەرتووکا (الدر المکنون) دا هاتییە کو کرییە حوکمدارێ زاخۆ. قوباد بەگ پشتەڤانییەکا مللی یا وەسا نەبوو پێ بشێت حوکمێ خۆ موکم بکەت، هەر بۆ نموونە، عەشیرەتا سلێڤانەیی زاخۆ دووریێچکربوو، ئەو ژی نەچاربوویە ل کۆچکا خۆ خۆ ئاسێ بکەت و بەرگریێ بکەت، وەسا دیارە ژی ئەڤ دابەشکرنا دەستەلاتێ ل دووڤ هیڤی یێن قوباد بەگی نەبوویە، ژ بەر هندێ دبینین قەستا بەغدا کرییە، لێ ڤێ چەندێ مفایێ وی نەکرییە و رێبەرێن هۆزێن ل ئامێدیێ عادل پاشا وەك میرێ بەهدینان ژێگرت و والیێ بەغدا ژی ئەو گوهوڕین پەسند کر و ئەڤە ژی دەمێ فەرمانا دامەزراندنا وی دای و کورکەکێ شاهانە وەك رێزگرتن بۆ هنارتی پشتی نعمان پاشا جەلیلیێ والیێ مووسل بەرگەریان بۆ کری، ل داویێ ژی عادل پاشا ب هاریکاریيا هندەك عەشیرەتان شیا قوباد دەستەسەر بکەت و بینیتە ئامێدیێ و ل وێرێ زیندان بکەت و وێ عەشیرەتا کوردی ژی دەستێ خۆ

دانا سەر ملك ومال و سامانێ وی.

هۆسا، هەرچەندە والیێ بەغدا گەلەك پشتەڤانیا قوباد پاشای دکر، لێ ڤێ جارێ دەست ژێ بەردا و کاندیدەکێ دی ژێگرت ببیتە حوکمدارێ میرگەهێ کو ئەو ژی ئەحمەد پاشایێ کوڕێ سولتان حسێن بەگێ بوو و ب هێزێن زۆر یێن بەغدا و ب هێزێن کوردی ب سەرکردایەتییا عەبدلرەحمان پاشایێ موتەسەرفێ سلێمانیێ پشتەڤانی لێ کر، لێ دەمێ ئەڤ هەوە د دامەزراندنا ئەحمەد پاشایێ ناڤبری دا سەرنەکەڤتی، جارەکا دی عەلی پاشایێ والیێ بەغدا خۆ بۆ ڤێ دیفاکتۆیێ چەماند و (ب بەرگەریانا محەمەد پاشا جەلیلی) ل سالا ١٢٢٠مش/١٨٠٥ز عادل پاشا وەك میرێ بەهدینان دامەزراند و پشتی وێ دیرۆکێ ناڤێ قوباد پاشای نەهاتە بهیستن[٢٨].

## عادل پاشایێ کوڕێ ئیسماعیل پاشای:

کوڕێ چوارێ یە د زنجیرا هەر پێنج کوڕێن ئیسماعیل پاشای دا و یێ بچووکتری هەڤژینا وی یا ئێکێ یە، پشتی مرنا بابێ خۆ ل سالا ١٢١٤مش/١٧٩٩ز شیایە ماوەیەکێ کێم حوکمداریا ئامێدیێ بکەت و پشتەڕێبوونا خۆ ل سەر برایێ خۆ مراد پاشای رابگەهینیت، سالا پاشتر ژی ل دووڤ دابەشکرنەکا ئیبراهیم پاشایێ بابانێ نوونەرێ عەلی پاشایێ والیێ بەغدا ئەنجامدای، بوویە حوکمدارێ زاخۆ، لێ وەسا دیارە ئەو ب وەرگرتنا ڤی پۆستی ب تنێ نەڕاوەستیایە، بەلکی خۆ ئامادە کرییە حوکمداریا میرگەها ئامێدیێ ژی بکەت، هەر بۆ نموونە، ل سالا ١٢١٩مش/١٨٠٤ز ب هاریکاریا عەشیرەتا مزووری ب سەر مراد پاشایێ برایێ خۆ سەرکەڤتییە و گەهشتییە پایتەختێ میرگەهێ، وی ئەڤ مەسەلە پێشکێشی والیێ بەغدا کر، والی ژی ئەو کرە حوکمدارێ میرگەهێ و کورکێ شاهانە دایێ[٢٩] (غرائب الاثر ص ٦٤)، هەروەسا شیا هەردو مامێن خۆیێن ل بەرامبەری وی رابووین لوتفوللا و حاجی خان بەگێ و قوباد کوڕێ سولتان حسێنێ برایێ خۆ ل زیندانا تاری زیندان بکەت، ب راستی ژی، والیێ بەغدا باریا ئازراندن و ئالۆزکرنا ئاریشەیان ل میرگەهێ ب کار دئینا، چونکی وی هەڤدەم ئەحمەد پاشایێ کوڕێ سولتان حسێن کوڕێ بەهرام پاشای ژی هەر ل وی پۆستی دانابوو، ب ڤێ چەندێ، رەوش کمباختر لێ هات[٣٠].

عادل پاشای حوکمێ خۆ ب روو ب رووبوونا ئەحمەد پاشای دەستپێکر کو وی وەسا ل قەلەم ددا ئەڤێ داوێ ل سەر پشتەڕێ بوویە، ڤێ جارێ وی ب بەرگەریانا والیێ مووسل محەمەد پاشا جەلیلی پەنابرە بەر پارەی و وی پارەیەکێ زۆر دا والیێ بەغدا داکو فەرمانا دامەزراندنا وی وەك میرێ بەهدینان دەربێخیت، ب راستی ژی ئەو بەرگەریان سەرکەڤت و تشتێ وی ڤیای ب دەستڤەهات و محەمەد پاشا جەلیلی کورکێ شاهانە بۆ هنارت و حوکمداریا وی پەسند کر، لێ عادل پاشای تنێ سێ سالان خۆشی ب حوکمداریێ بر و ل سالا ١٢٢٣مش/١٨٠٨ ز ب نەخۆشیا تاعۆنێ وەغەرا داوێ کر، (یاسین العمری) وی ب کەسەکێ (مێرچاك و ژێهاتی)[٣١] سالۆخدایە و هۆزانڤان (دەردی) د هەلبەستەکا گرنگ دا پەسنێ وی کرییە و ب (والی، حوکمدارێ دادپەروەر، سولتانێ رێزدار) سالۆخدایە و شەڕێن ل (سراندری؟؟؟) و ل (بازێ) دژی هەکاریان کرین، ب نموونەیێن بێ وێنەیێن وێرەکی و هۆنەرێ شەڕی یێن وی ل قەلەمداینە.

## زبێر پاشایێ کوڕێ ئیسماعیل پاشای:

پشتی مرنا عادل پاشایێ برایێ خۆ ل سالا ١٢٢٣مش/١٨٠٨ز بوویە حوکمدارێ میرگەهێ و ژ لایێ سلێمان پاشایێ بچووك والیێ بەغداڤە بڕیار ل سەرحوکمداریا وی هاتییەدان، ئەڤە ژی دەمێ فەرمانەك بۆ هنارتی و داخواز ژێ کری دگەل قوباد پاشایێ مامێ خۆ ئاشت ببیت کو وی دەمی دۆرێن چوار سالان ل ئامێدیێ یێ زیندانکری بوو و داخواز ژێ کر وی ئازاد بکەت، ئینا زبێر پاشا ب ئاخفتنا والیێ بەغدا کر و قوبادێ مامێ خۆ ئازاد کر و کرە حوکمدارێ زاخۆ، ب مەرجەکی ل ئامێدیێ بمینیت و برایەکێ خۆ بهنێریتە وێرێ داکو ب ناڤێ وی حوکمی

ل وی بازێری بکەت، ئینا وی ژی وە کر و سەرفەراز تێدا ژیا.

ل سەردەمێ زبێر پاشای پەیوەندیێن ل ناڤبەرا بەهدینان و ویلایەتا مووسل تێکچوون، ئەڤە ژی دەمێ نەعمان پاشایێ جەلیلی یێ والیێ مووسل زانی کو ئارمانجا خۆنێزیککرنا سلێمان پاشای ژ میرێ بەهدینان بۆ چێکرنا قولپەکێ یە بۆ دووربێچکرنا مووسل داکو حکومەتا وێ نەچار بکەت رازی ببیت کو ئەحمەد پاشایێ کورێ بەکر ئەفندی بەربژارێ سلێمان پاشای ببیتە حوکمدارێ مووسل، کو ئەڤە ژی دبیتە مایتێکرن د کاروبارێن ناڤخۆیی یێن بنەمالا جەلیلی و د کاروبارێن مووسل ژی دا، لێ نعمان پاشا ل بەرامبەری ڤێ سیاسەتا بەغدا راوەستیا ئەڤە ژی دەمێ میرێ عەشیرەتا (الاسکریە) دەستەسەر کری و زیندان کری و پاشێ کوشتی کو ئەو عەشیرەت ئێکە ژ عەشیرەتێن بەهدینان[٣٢]، پاشی کارڤەدان دبەردەوام بوون و هەر لایەنەکی هەڤوەلاتیێن لایێ دی یێن ل وەلاتێ خۆ دەستەسەر دکرن، هەرچەندە ژی بزاڤێن ئازادکرنا هەمیان سەرگرتن ژی، لێ رژدیا والیێ بەغدا سلێمان پاشایێ بچووك بۆ پشتەڤانیکرنا بەربژارێ خۆ، بۆ ئەگەرێ پتر تێکچوونا پەیوەندیان ل ناڤبەرا وان، هەر بۆ نموونە، ئەحمەد پاشای فەرماندا هێزێن خۆ و عەشیرەتێن پشتەڤانێن خۆ ل کەلا کەشاف ل خالا ڤێککەهشتنا زێ یێ مەزن و دیجلە کۆم بکەت و داخواز ژ زبێر پاشای کر ل وێرێ بگەهیتێ داکو پێکڤە بچنە ناڤ مووسل، یێ دی ژی چ پێ نەما ل دووڤ داخوازیا وی هات و هێزەکا سەربازیا ب سێ هزار سوار و پیادەیێن عەشیرەتان ب سەرکردایەتیا مووسا بەگێ برایێ خۆ بۆ هنارتن[٣٣]، د پێشڕەوییا خۆ دا ژی گوندێن دکەڤنە بەر چیایێ مەقلووبی یێ سەر ب مووسل ڤەیە کۆنترۆل کرن.

قوناغا ئێکێ ژ ڤی شەڕی د بەرژەوەندییا هێزێن هەڤپشکێن بەهدینان و هەڤپەیمانێ وان ئەحمەد پاشای دا بوون، لێ ب کوشتنا ئەحمەد پاشای گوهورین کەڤتنە رێڤەچوونا شەڕی و ئەو گوهورین د بەرژەوەندییا هێزێن مووسلیان دا بوو، ئینا هێزێن میرگەها بەهدینان خۆ ژ شەڕگەهێ ڤەکیشان، چونکی چ ئارمانج نەبوون بزاڤێ بکەن ب دەستڤەبینن، هەر چەوان بیت، زبێر پاشای پێگیری ب هەڤپەیمانییا خۆ دگەل والیێ بەغدا کر و هێشتا چەند هەیڤەکێن کێم نەبۆرین فەرمانەك ژ یێ داویێ بۆ هات کو تێدا داخواز ژێ کربوو عەشیرەتێن ئێزدی هان بدەت گوندێن خەلکێ مووسل تالانبکەن، وی ژی بێ دوودلی ئەو فەرمان ب جهـ ئینا و داخواز ژ وان عەشیرەتان کر گوندێن مووسل تالانبکەن، هەرچەندە ژی ئەڤ عەشیرەتە ژ ترسا ئەنجامان ل سەر ب جهئینانا وێ فەرمانێ د دودل بوون، لێ تشتێ دیار ئەوە کو هەڤرکی ل ناڤبەرا هەردولا گەهشتبوو گۆپیتکێ و دڤیا ب رێیا سەربازی هاتبا ئێکلاکرن، ئینا ل سالا ١٢٢٥مش/١٨١٠ز هێزێن زبێر پاشای و مەحمود پاشایێ والیێ مووسل ل نێزیك گوندێ ئالۆکا بەربوونە ئێك و ژ بەر وان هاریکاریێن ژ میرێ بۆتان دگەهشتنە زبێر پاشای، شەڕ ب شکەستنا هێزێن والیێ مووسل ب داوی هات، پاشی هەردولا پێکهاتن و والیێ بەغدا هژمارەکا زۆر یا گوندێن بەرێ ل مووسل ستاندین بۆ مەحمود پاشای زڤڕاندن[٣٤].

ئەڤ شلقیانە بوونە ئەگەرێ مرنا مەحمود پاشای ل رۆژا ٢٢ ی شەوالا سالا ١٢٢٥مش/١٨١١ز و دامەزراندنا سەعدوللا پاشایێ برایێ وی وەك والی ل شوونا وی ل نیڤا هەیڤا (ذی الحجة) یا سالا ١٢٢٥ مش/١٨١١ز، وی ژی چێتر دیت کارێن هەڤدژیکرنێ ب داوی بهێن و دگەل هندێ بوو دگەل زوبێر پاشای پێك بهێت، پشتی هنگی، دڤیا بەرسینگێ هێرشێن عەشیرتێن تیاری ل دەردۆرێن دەڤەرێن باکوورێ میرگەها خۆ بگریت پشتی کو ئیسماعیل پاشایێ وی بابێ وی ئەو عەشیرەت (وەلێ کرین دووبارە فەرمانان ب جهـ بینن)[٣٥]، وی هێزەکا سەربازی ب سەرکردایەتیا وەیسی بێدوهی هنارتبوو دەڤەرا هەکاری و وێ هێزێ جهێن تیاریان ستاندبوون و ئاسایشا سنوورێن میرگەها خۆ بنەجهـ کربوو.

زبێر پاشای ل سالا ١٢٤٠مش/١٨٢٤ز وەغەرا داویێ کرییە و پشتی هنگی چ تشتێ دی ل سەر

نەهاتیە گۆتن، هەروەسا د (مجموعە تواریخ) دا د دەستنڤیسەكاسەنتەرێ نیشتمانیێ دەستنڤیسان دا هاتیە كو ئەو ل سالا ١٢٣٢مش/١٨١٦ز ژ لایێ عەشیرەتان ڤە ژ وی پۆستی هاتیە لادان و محەمەد تەیار پاشا ل شوونێ هاتیە دانان، لێ یا دروست محەمەد سەعید كورێ تەیار پاشایە و ل سالا ١٢٣٥مش/١٨١٩ز ل كەركوك وەغەرا داویێ كریە، هندەك نڤیسەرێن پشتی هنگی ژی ب زەلامەكێ ئاقلدار و كار ب رێڤەبەرەكێ دادپەروەرێ دیندارێ حەز ژ زانایان دكەت سالۆخدایە[٣١].

## محەمەد سەعید پاشایێ كورێ محەمەد تەیار پاشای:

ل ئامێدیێ ژ دایكبوویە، هەرچەندە بابێ وی میر بوو، لێ وی حوكمداری نەكریە چونكی پشتی مرنا بابێ وی، مامێن وی: مراد خان پاشا، قوباد پاشا، عادل پاشا، زبێر پاشا ببوونە حوكمدار، وەسا دیارە كەسەكێ ئاقلدار و رژد بوویە، وەك پێنگاڤەك ژی بۆ گەهشتنا حوكمی، شیایە ئیسماعیل بەگێ برایێ خۆ رازی بكەت كو تاگریا وی بكەت دژی هەردو برایێن خۆ یێن دی میران بەگ و مووسا بەگێ، دەمێ ل سالا ١٢٤٠مش/١٨٢٥ز (دبیت ژی بەری هنگی بیت) بوویە حوكمدارێ میرگەهێ، ئالۆزی ل میرگەهێ پەیدابوون و مەلا عەبدلقادرێ مایی رێبەرێ بێدوهیان و بەرواریان دژی وی پشتەرێ بوو، وی زانی كو ئەڤ مەسەلە ب چ رێیان ناهێتە چارەكرن ب ئاقلمەندی و ئاقلداری نەبیت، ب ڤێ رێكێ ئەو شیا رێبەرێ پشتەرێبوویان رازی بكەت كو لایەنگریا خۆ بۆ وی رابگەهینن، لێ مەسەلە ل ڤی توخیبی ب تنێ نەراوەستیا و نیشانێن ژ بەرێكچوون و پشتەرێبوونێ ل ناڤ عەشیرەت و هێزێن بەری هنگی پشتەڤانیا میرگەهێ كرین دیار بوون، ئینا مستەفا ئاغایێ زێباری دژی وی رابوو، وی پێكۆل كر بێزاریا عەشیرەتا مزووری دژی خۆ ژ ناڤ ببەت و نەهێلیت، ئینا میرێ ئێزدیان هاندا عەلی ئاغایێ بالەتەیی بكوژیت كو ئێك بوو ژ دیارترین رێبەرێن وان و مامێ زانا مەلا یەحیایێ مزووری بوو، لێ ڤێ مەسەلێ هەر زوو هندەك رەهەندێن نوو ژێ پەیدابوون و نیشانێن هندەك گرفتاری یێن زندەتر دەركەفتن، محەمەد سەعید پاشای رۆلێ سیاسیێ مەزنێ زانایێن ئایینی یێن میرگەها خۆ بەرچاڤوەرنەگرت و گوهداریا یەحیا مزووری نەكر دەمێ قەست كریێ و داخواز ژێ كری تۆلا كوشتنا مامێ وی ڤەكەت، بەلكی دووڤكەفتیێن وی هەتا كورەكێ مەلا یەحیایێ مزووری ب خۆ ژی ب ناڤێ مەلا عەبدلرەحمان بوو كوشت.

ژ بەر ڤی هەلویستی، مەلا یەحیایێ مزووری قەستا میرێ سۆران یێ بەرفرەهخواز محەمەد پاشای(میرێ كۆرە) كر نە تنێ بۆ تۆلڤەكرنێ، بەلكی بۆ ژ ناڤبرنا میرگەها بەهدینان ب خۆ ژی، هەروەسا رەوش كمباختر لێ هات دەمێ برایەكێ وی كو ئەو ژی مووسا بەگ بوو شیای بگەهیتە میرێ سۆران و داخوازا پشتەڤانیێ ژێ كری داكو بگەهیتە حوكمی، ب ڤێ چەندێ ژی دڤیا محەمەد سەعید پاشا د ئێك دەم دا بەرسینگێ هژمارەكا روو ب رووبوونان بگریت، كو یا ئێكێ شۆرشا عەشیرەتێن مزووری و یا دووێ ژی ژێكجودابوونا بنەمالا حوكمدار و تەڤلیبوونا برایێ وی بوو بۆ ناڤ بەرۆكا نەیارێ وی و یا سیێ ژی تەماعكاریا بەرفرەهخوازیا ئەشكەرایا میرێ سۆران بوو یێ حەز دكر ئامێدیێ ژی بگریتە ژێر دەستەلاتێ خۆ و ل سەر ملكێ خۆ زندە بكەت، كو دبیت ئەڤ بەرفرەهخوازییە ببا ئەگەرێ وێ چەندێ سەرانسەری میرگەهێ كەڤتبا د دەستێ وی دا، زانایێن میرگەهێ ژی ل دووری وان روودانان دراوەستیای نەبوون، بەلكی یەحیا مزووری، ژ بەر پشتەڤانیا ڤێ بنەمالێ بۆ ئێزدیان دژی عەشیرەتێن مزووری، ب هاریكاریا وان زانایان شیا رایەكا گشتی دژی بنەمالا حوكمدار پێك بینیت.

محەمەد سەعید پاشای پێكۆل كر بەرسینگێ لەشكەرێ محەمەد پاشایێ سۆران بگریت یێ بەرەڤ ئامێدیێ پێشرەوی كری، هەروەسا بەرسینگێ لەشكەرەكێ دی ژی بگریت كو ب سەركردایەتیا

رەسول بەگێ جودابووی قەستا ئاكرێ دكر، لێ د وێ چەندێ دا سەرنەكەڤت و نەچاربوو خۆ ل ئامێدیێ ئاسێ بكەت و ل بەندا بەرسینگگرتنا وی لەشكەرێ بیت یێ قەستا ویرێ دكەت، ل داویێ ژی محەمەد پاشا گەهشتە دورێن باژێری و هەیامەكێ دووربێچكر و هەمی هۆیێن سەربازی بۆ ب سەرداگرتنێ ب كار ئینان، لێ نەشیا، ئینا نەچاربوو خاپاندن و تیرۆركرنێ ب كار بینیت و ل جودابوویان بگەرێت، ل داویێ ژی شیا عومەر ئاغایێ كتانی سەركردێ لەشكەرێ ئامێدیێ بكوژیت و خۆ ژێ رزگار بكەت، پاشی ب سەر باژێری دا بگریت و كۆنترۆل بكەت و محەمەد سەعید پاشای دەستەسەر بكەت. ئەنوەر مایی ژی دبێژیت كو میر محەمەدێ سۆران (رێز لێ گرتییە و پێشوازی لێ كرییە و دگەل خۆ بریە سەربازگەها خۆ)، لێ ڤەگێرانەكا دی دبێژیت كو محەمەد پاشای ئەو و هەردو كورێن وی حسێن و قاسم بەگ كوشتینە، لێ كورێ وی یێ نەخری محەمەد پاشا دگەل (پەریخان)ا هەڤژینا خۆ دگەل هەردو كورێن خۆ (حەسەن و خالد) مێڤانێن زاڤایێ خۆیێ میرێ بۆتان بوون، ژ بەر هندێ، ئەو و خێزانا خۆ ژ كوشتنێ رزگار ببوون[٣٧].

## مووسا بەگێ كورێ محەمەد تەیار پاشای:

كورێ ناڤێ یە، ل نیڤا ئێكێ یا سەدسالیا ١٣ مش/١٩ز ژیایە، بۆ وەرگرتنا دەستەلاتێ هەڤركی دگەل برایێن خۆ كرییە و تاگریا میران بەگێ برایێ خۆ كرییە دژی برایێ خۆ محەمەد سەعید پاشایێ ئەوێ بوویە میرێ بەهدینان، پاشی دژی مراد پاشایێ مامێ خۆ هەڤركی كرییە، هەرچەندە ئەو نەشیایە ببیتە حوكمدارێ ئامێدیێ، لێ وی وەسا رەفتار دكر هەروەكی ئەو حوكمدارێ بەهدینان بیت، مووسا بەگێ لاوازیا دەستەلاتا ناوەندی بۆ خۆ ب دەلیڤە دیت كو دگەل دووڤكەڤتیێن خۆ ل دەڤەرێن میرگەهێ بگەرێت و هەر تشتەكێ بڤێت دەستێ خۆ دانیتە سەر و هەر كەسەكێ بڤێت زیندان بكەت و فەرمانان بۆ وەلاتییان دەربێخیت، ژ وانا: وی ب گرۆپەكا دووڤكەڤتیێن خۆ هێرش كرە دێرا رەبەن هورمز ل بەتەنا چیایێ مەقلووبی و قەشەیێ وێ دەرئێخست و هەمی كەل وپەلێن وێ تالانكرن و پارێ وان دەستەسەركرن، هەروەسا هێرش كرە سەر ئەلكویش (ئەلقۆش) یا نێزیكی وێ، ژ وێرێ ژی قەستا دهۆك كر هەروەكی ئەڤە سالنامەیێن هورمزدی د روودانێن سالا ١٢٤٤مش/١٨٢٨ز دا توومارکرین[٣٨]، پاشی سەرەدانا بەغدا كر و ل وێرێ شیا فەرمانا دامەزراندنا خۆ وەك میرێ ئامێدیێ ب دەستخۆ بێخیت، چ پێ نەڤێت وی گوژمەكێ مەزن یێ پارەی بۆ وێ چەندێ دایە، هەر ب وی ئاوایی عادل پاشا شیا فەرمانەكا هەڤشێوە هەر ژ وی والی دەستڤەبینیت و ل شوونا مووسا بەگێ ببیتە میرێ بەهدینان، لێ محەمەد سەعید شیا حوكمداریا میرگەهێ بزڤرینیت و ببیتە میرێ ئامێدیێ هەتا هێرشا میرێ كۆرەیێ میرێ سۆران ل سالا ١٨٣٣ز، كو د وێ سالێ دا میرێ كۆرە ئەو لادایە و ژ لایێ خۆڤە مووسا بەگ وەك میرێ ئامێدیێ زڤراندەڤە، لێ خەلكێ ئامێدیێ وەسا بەرێ خۆ دایێ ئەو هاریكار یان كرێگرتییەكێ میرێ سۆران بیت، ئینا هەر زوو شۆرش ل سەر كر و لادا و ژ باژێرێ خۆ دەرئێخست[٣٩].

وەسا دیارە ژی مووسا بەگێ چارەنڤیسێ خۆ ب چارەنڤیسێ میرێ سۆران ڤە گرێدابوو، هەتا كو یێ داویێ وێ سالێ ئەو كرییە سەركردەیێ ئێك ژ تیپێن خۆیێن سەربازی و هندەك ئەركێن سەربازی ژی پێ راسپاردبوون، ل سالا ١٢٥٠مش/١٨٣٤ز محەمەد پاشایێ میرێ سۆران پشتی دووربێچەكا دژوار، دووبارە شیا ب سەر ئامێدیێ دا بگریت و محەمەد سەعید پاشای ئێخسیر بكەت و رەسول پاشایێ برایێ خۆ ل شوونێ دانیت[٤٠]، لێ پشتی هنگی چ بەحسێ وی نەهاتییە كرن، فیرزەر ژی وی ب كەسەكێ سەرەڤێ كار دگەل نەهێتە كرن، یێ ژ خودێ نەترس، یێ تەلەدین و كەسێ نەڤیای سالۆخ ددەت[٤١].

# ئیسماعیل پاشایێ دووێ کورێ محەمەد تەیار:

میرێ داویێ یێ میرگەها بەهدینانە، ل سەردەمەکی ژیایە یێ دەولەتا ئۆسمانی برپاردای حوکمێ میرگەهـ و رێڤەبرنێن خوجهی بێن وان ب داوی بینیت و ب ئاوایەکێ ئێکسەر دەستەلاتێ ل سەر وەلاتێ خۆ بکەت، ژ بەر هندێ، حوکمێ حوکمدارێن ل بەغدا و بەسرا و شارەزوور، هەروەسا حوکمێ جەلیلیان ل مووسل و حکومەتێن میرگەهێن کوردی ئێك ل دووڤ ئێك کەفتن، هەروەسا وی بەرسینگێ بەرفرەهخوازیا میرگەها سۆران کر ل سەردەمێ میرێ وێ یێ هێزدار محەمەد پاشا (میرێ کۆرە).

دیرۆکا ژ دایکبوونا ئیسماعیل پاشایێ دووێ دیار نینە، لێ وەسا دیارە ل ئامێدیێ پێگەهشتییە و بابێ وی ئەو کرییە حوکمدارێ ئاکرێ و ماوەیەکی حوکم لێ کرییە، هەروەسا دەمێ سەعید پاشایێ برایێ وی داخوازا حوکمێ میرگەها بەهدینان کری لایەنگریا وی کرییە دژی برایێن وی یێن دی کو وان ژی داخوازا حوکمێ میرگەهێ دکرن و پشتی حوکم کەفتییە د دەستان دا پشتەڤانییا وی کر، لێ هەر زوو میرێ سۆران محەمەد پاشا میرێ کۆرە ل سالا ١٢٤٤مش/١٨٣٢ز هێرش کرە میرگەها بەهدینان و قەستا ئاکرێ کر، ئینا ئیسماعیل پاشای سەرکردایەتییا بەرگرییەکا کاریگەر کر بۆ بەرسینگگرتنا هەوا میرێ کۆرە، وی گەلی و دەربازگەهێن وێ ئاسێ کرن و شەرێن دژوار ل ناڤبەرا هەردولا روودان، لێ هێزێن میرێ رواندزێ ب سەرۆکاتییا رەسول بەگێ برایێ وی بۆ دووربێچکرنا ئاکرێ پێشڕەوی کرن، وێ دووربێچێ ل دۆرێن هەیڤەکا دەراندەر ڤەکێشا، ئیسماعیل پاشا نموونەیێ مێرخازیێ بوو د بەرەڤانیکرنا وی باژێری دا، پاشی بەری بکەڤیتە لەپێن دوژمنێن خۆ، نەچاربوو ل دەستپێکا سالا ١٨٣٢ز ژ باژێری دەرکەڤیت و قەستا زێبار بکەت کو وان ئەو پاراستبوو هەتا گەهشتییە ئامێدیێ پایتەختێ میرگەها خۆ یا وی دەمی میر محەمەد سەعیدێ برایێ وی حوکم لێ دکر، لێ هەر زوو محەمەد پاشایێ رواندزی ب هێزەکا درب وەشێن یا لەشکەرێ ئەڤ باژێرە ژی دووربێچکر.

هەرچەندە ژی ڤەگێرانێن کێمێن بەحسێ ڤێ روودانێ دکەن خۆ ژ رۆلێ ئیسماعیل پاشای ل دەمێ ڤێ دووربێچێ بێدەنگ دکەن، لێ تشتێ مسۆگەر ئەوە کو وی پێگەهەکێ سەرکردایەتیێ د بەرەڤانیکرنێ دا ژ وی باژێری هەبوو، دەمێ ل سالا ١٨٣٣ز کەڤتنا ئامێدیێ مسۆگەر بووی، شیا دگەل گرۆپەکا دووڤکەفتیێن دلسۆز خۆ ژ هێرشکەران رزگار بکەت و بچیتە دەرڤەی شوورهێن وێ، ئەڤە ژی ب رێیا تۆنێلەکا نەپەنییا وی دزانی ل کیرێ یە[٤٢]، پاشی سەرکردایەتییا بەرگرییەکێ دژی هێزێن محەمەد پاشای کر، پاشی قەستا نێروە ل رۆژهەلات کر، ئینا کەلا وێ نووژەنکر و خۆ تێدا ئاسێ کر، ڤەگێرانەکا نەجهێ باوەریێ ژی دووپێچکرنا کەلاێ ژ لایێ میرێ کۆرە و دووربێچکرنا وێ ژ لایێ هێزێن ئۆسمانی ڤە تێکەلی ئێك کرییە و ئەو ڤەگێران دیاردکەت کو هێزێن داویێ بوون یێن ئامێدیێ دووربێچکرین و پشتی میرێ رواندز ب سەر ئارمانجێن وان هەلبووی، هندەك هێزێن خۆ هنارتن داکو بکەڤنە ژێر سەرکردایەتییا هەردو برایێن وی رەسول بەگ و ئیسماعیل بەگێ، چونکی وی وەسا ددیت کو میرێ بەهدینان ئەو شیان هەنە میرگەهێ بپارێزیت و ئەو ژ هەر کەسەکێ دی یێ بیانیێ نەخەلکێ میرگەهێ چێترە[٤٣].

ب دیتن وبۆچوونا مە ئەڤ ڤەگێرانە نەیا باوەریێ یە، چونکی بەرئاقل نینە میرێ رواندز ب ڤێ لەزێ هەلویستێ خوێنێ هەڤدژ ژ بەهدینان بگوهوریت بێی هندێ بەهانەیەك بۆ هەبیت، وەسا دیارە ژی ئیسماعیل پاشا د ڤی دەمی دا هێشتا ب حوکمدارێ ئۆسمانی یێ ئامێدیێ دهاتە ل قەلەمدان و ڤیایە دەستپێکەریێ بۆ دوژمنێن خۆ بکەت، ئەو ژ نێروە دەرکەفتییە و قەستا (شنۆ) ل کوردستانا ئیرانێ کرییە، ل وێرێ ژی دەست ب کۆمکرنا تاگرێن خوێنێ ژ میرگەها خۆ و ژ میرگەها هەکاری ژی کرییە، وی میرێ میرگەها هەکاری نورەددین بەگ وەك پشتەڤان و هەڤپەیمانێ خۆ ددیت، وەسا دیارە ژی کو یێ داویێ داخواز ژێ کربوو بهێتە نك وی و ل میرگەها وی

سەرکردایەتیا ئۆپەراسیۆنێن سەربازی بکەت، چونکی مە دیت یێ قەستا جۆلەمێرگێ پایتەختێ میرگەها هەکاری دکەت، ل ویرێ ل دۆرێن ٤٠ رۆژان دمینیت و نامەگوهورین دگەل ڕێبەرێن تاگرێن خۆیێن ل میرگەها خۆ کریی[٤٤].

ل داویێ ژی ئیسماعیل پاشا ب سەرکردایەتیا هێزەکا هەکاری کو ژ ١٥٠ شەرکەران زێدەتر نەبوو دەست ب لڤینێ کر، لێ ئەگەرێ هژمارە کێمیا وێ هێزێ نەهاتیە زانین، نەخاسمە کو هەڤپەیمانێ وی میرێ هەکاری ژی ترس ژ پێشرەوییا محەمەد پاشا میرێ کۆرە هەبوو، هەردوان دزانی کو هێزەکا ب هژمارەکا هۆسا دگەل قەبارێ وان هێزێن هێرشکەر ناگونجیت یێن پتریا پشکێن میرگەها بەهدینان داگیر کرین، هەروەسا نەهاتییە زانین ژی بۆچی هێزێن بەهدینان، نەخاسمە عەشیرەتان پشکداری د ڤێ هێزێ دا نەکرییە، کو دهاتە پێشبینی کرن هێزێن وان ڕێبەران گەهشتبانێ یێن نامەگوهورێن دگەل کرین و سۆزا پشتەڤانیکرنێ داینێ دەمێ ل ناڤ میرگەها خۆ پێشرەوی دکر، لێ (وەسا دیارە) چ تشتێ وەسا نەروودایە، چونکی مە دیت پێشرەوی ب ئاوایەکێ دی ب ڕێڤە دچیت و نیشانێن ترسێ لێ دیارن یان هەر چ نەبیت گەلەك ب هشیاری ئەو پێشرەوی دهاتە کرن، پاشی رەوش وەلێ هات ئیسماعیل پاشا ب شەرکەرێن خۆڤە بگەهیتە ئامێدیێ و دەرگەهێن وێ بەرامبەری خۆ ڤەکری ببینیت، چونکی میرێ وێ مووسا بەگێ ژ لایێ محەمەد پاشا میرێ کۆرە ڤە هاتییە دامەزراندن دگەل پتریا هێزێن پشکداری د دووریێچکرنا بازێری دا کرین ژێ دەرکەڤتبوون، ژ بەر هندێ، وی چ زەحمەتی نەدیتن دەمێ هاتییە ناڤ بازێری و کۆنترۆل ل سەر رەوشا گشتییا وێ کری، لێ ئەڤ ڕێچکا روودانان نەوەکی ڤەگێڕانەکا دی یە یا دیار دکەت کو هێزێن ئۆسمانی یێن ئامێدیێ دووریێچکرین ب سەرکردایەتیا محەمەد پاشا ئینجە بەیرەقدار بوون و وی دەمی ئیسماعیل پاشا ل کەلا نێروە بوو و حوکمدارێ ئامێدیێ ژی رەسول بەگێ برایێ میرێ سۆران بوو و نە مووسا بەگ بوو و ئەو بوو یێ دگەل سەربازێن خۆ ل دەرڤەی ئامێدیێ[٤٥].

ل دووڤ ڕێڤەچوونا روودانێن مە دیارکرین، دەمێ مووسا بەگێ ناڤبری زانی کو ئیسماعیل پاشای ئامێدیێ ستاندییە، رەڤییە و قەستا حەسەنکێڤێ کرییە و ئیسماعیل پاشا شیایە سەرانسەری دەڤەرێن میرگەها وی کۆنترۆل بکەت و حوکمێ باب وباپیرێن خۆ بۆ بزڤرینیت، هەروەسا موکریانی ڤەگێڕانەکا دی دئینیت و دبێژیت کو ئیسماعیل پاشای پەیوەندی ب محەمەد پاشا میرێ کۆرە کرییە و هیڤی ژێ کرییە وی وەك حوکمدارێ دهۆك دامەزرینیت، وی ژی گەردەنا وی ئازا کرییە و ل ویرێ دامەزراندییە و کاروبار بۆ ڕێکخستینە[٤٦]، لێ ڕێڤەچوونا روودانان ڤێ ڤەگێڕانێ پشتراست ناکەن، دوور نینە ژی موکریانی ڤیا بیت رۆلێ میرێ رواندز مەزن بکەت، لێ ڤێ چەندێ ل شەرمێدانا ئیسماعیل پاشای سڤك نەکر، چونکی هێزێن ئۆسمانی یێن ڤێ جارێ ئامێدیێ دووریێچکرین ژ هێزێن هەڤپشکێن محەمەد پاشا ئینجە بەیرەقدارێ والیێ مووسلێ و عەلی رەزا پاشایێ لاز یێ والیێ بەغدا پێکهاتبوون و ب ئنیەتا وێ چەندێ بوون ب ئێکجاری ڤێ میرگەهێ و میرگەهێن دی یێن کوردی ژ ناڤ ببەن کو ئەڤە ژی بجهئینانا وێ پلانا گشتی بوو یا سەرکردێ ئۆسمانی رەشید پاشایێ والیێ سێواس دانای، ژ بەر وێ دووریێچێ ئیسماعیل پاشا نەچاربوو ب ڕێیا تۆنێلەکا نەپەنی ژ بازێری دەرکەڤیت و قەستا میرگەها بۆتان ل جزیرێ بکەت و پەنایێ ببەتە نك بەدرخان بەگێ میرێ وێ، لێ لەشکەرێ ئۆسمانی چوو ناڤ ئامێدیێ و چەند رۆژەکان ل ویرێ ما و ئێك ژ ماقوولێن وێ کو ئەو ژی یونس ئاغا کێلی بوو وەك قائیمقام لێ دامەزراند، ژ بەرکو یێ داویێ کەسەکێ دلسۆز بوو بۆ ئیسماعیل پاشای، داخواز ژێ کر ڤەگەرێتە پایتەختێ خۆ، کو د سالنامەیێن هورمزدیە دا ژی[٤٧] وی دەمی ئیسماعیل ل بەغدا بوو و ژ ویرێ قەستا پایتەختێ خۆ کرییە و جارەکا دی ل سالا ١٢٥٨مش/١٨٤٢ز هاتییە ئامێدیێ و خەلکێ وێ ب گەرمی پێشوازی لێ کرییە، ئەڤە ل وی دەمێ (الصائغ) گۆتییە کو ئەو (ژ جهەکێ

كوردستانێ ڤە هاتییە)[48].

هەر چەوان بیت، ئەو وێ سالێ ل ئامێدیێ بوویە، چونكی دبینین وی ل رۆژا 1 نیسانا سالا 1842ز ئەلكویش(ئەلقوش) كۆنترۆلكرییە، ئەڤە ل وی دەمێ محەمەد پاشایێ رواندزی ل رۆژا 15ئادارا وێ سالێ، هەروەكی د كۆمێنتەكا وی دا ل سەر دەستنڤیسەكێ ل ئاكرێ[49] و د ڤەگێرانەكا دی دا هاتی یا (العزاوی) ژ كۆمەكا دەستنڤیسێن (عبدالرحمن السهروردی) (كو ئەو بوو یێ مێڤانداریا ئیسماعیل پاشا ل بەغدا كری هەروەكی دێ بەحسێ وی هێتە كرن ڤەگوهاستی، كو ئینجە بەیرەقدار، ئیسماعیل پاشا ب دەستێن كەلەپچەكری هنارتییە مووسلێ و ژ ویرێ ژی بۆ بەغدا هاتییە دوورئێخستن[50]، ڤەگێرانا موكریانی ژی ئاماژێ دكەتە وێ چەندێ كو قەستا بەغدا كرییە[51]، لێ ژ بەركو دیرۆك ل سەر نینە، راستییا وێ زانیارێ نزانین، لێ دگەل وی تشتی دگونجیت یێ د سالنامەیێن ناڤبری دا هاتییە گۆتن كو هۆزانڤانەكێ بەغدادی پەسنێ عەلی رەزایێ والیێ بەغدا كرییە و وەسا ژێ دهێتە تێگەهشتن كو والی ئامێدیێ ستاندییە و (والیێ وێ) رسوا و شەرمەزار كرییە، ڤەكۆلەر وەسا دبینیت[52] كو ئەڤ ستاندنە ل سالا 1837ز(كو بەرامبەری /1252-1253مش) یە هاتییەروودان، هەروەسا هۆلیدای دبێژیت: كو حوكمدارێ ئامێدیێ ل سەردەمێ وی ل سالا 1839ز/1254مش سەلیم پاشا بوو كو پاشایەكێ كوردە و سەر ب والیێ بەغدایە[53]، لێ (العزاوی) دبێژیت كو والیێ بەغدا دووبارە ئیسماعیل پاشا زڤراندییە ئامێدیێ و كرییە حوكمدارێ وێ و حوكمداری لێ كرییە هەتا ل سالا 1258مش/1842ز ژ لایێ محەمەد پاشا ئینجە بەیرەقدار هاتییە ئێخستن هەروەكی بەحسێ وی دێ هێتە كرن، كو دبیت ئەڤ ڤەگێرانە وەسا بیت، لێ پێتڤییە ئەو چەند بهێتە شرۆڤە كرن كا بۆچی ئیسماعیل پاشای پێكۆلەكا دی كرییە دەستەلاتا ئۆسمانی رازی بكەت داكو جارەكا دی حوكمی ل میرگەها خۆ (میرگەها بەهدینان) بكەت، چونكی هەكە ئەو وەك میر هاتبا زڤراندن، وی دەمی وێ پێكۆلێ چ بهایێ خۆ نە دما.

هەر چەوان بیت، ئیسماعیل پاشای ب رێ یێن دیپلۆماسی پێكۆلكرییە ئەو تشتێ ژ دەستدای بزڤرینیت، وی نڤیسارەك بۆ بەیرەقداری هنارت و تێدا هیڤی ژێ كر وی وەك میرێ ئامێدیێ بهێلیت، لێ داخوازییا وی ب ئێكجاری هاتە پشتگوهڤەهاڤێتن، هەڤدەم هێزێن ئۆسمانی دەست ب لڤینێ كرن داكو بازێرێ وی دوورپێچبكەن، وی چ رێ ل بەر نەمان ژ بلی رێیا داوێ كو ئەو ژی شەڕكرنە، هەروەسا ڤەگێرانەكا دی ژی هەیە كو تنێ ژ لایێ موكریانی ڤە هاتییە گۆتن، ئەو ژی ئەوە كو ئیسماعیل پاشای هزرا پیلانگێرانەكێ بۆ تیرۆركرنا محەمەد پاشا بەیرەقدار ل سەربازگەها وی دكر، لێ بەحسێ دیرۆكا وێ نەكرییە، هەروەسا موكریانی دبێژیت كو وی دووبارە حوكم ل زاخۆ و ئامێدیێ كرییە، لێ جارەكا دی دهێت و دبێژیت كو حوكمێ ئامێدیێ د دەستێ رەسول بەگێ برایێ میرێ رواندز دا مابوو، لێ ئەڤ ڤەگێرانە دگەل رێڤەچوونا وان روودانان ناگونجیت، چونكی هەمی ژێدەر ئاماژێ دكەنە روو ب رووبوونەكا سەربازییا ئێكلاكەر ل ناڤبەرا هەردولا ل نێزیك گوندێ ئێتووتێ ، كو د وی شەڕی دا میرێ بەهدینان شكەستبوو و هێزێن خۆ ڤەكێشابوونە ئامێدیێ ئاسێگەها خۆیا داوێ داكو بەرەڤانیێ ژێ بكەت یا ماوێ چوار هەیڤان ل بن دوورپێچكرنەكا دژوار بوو.

ل ڤێرە موكریانی بەحسێ ڤەگێرانەكی دكەت و دبێژیت كو ئیسماعیل پاشا د وی شەڕی دا سەركەڤتبوو و بەیرەقدا شكەستبوو و رەڤی بوو مووسل و پشتی هنگی شكەستنێن وی دبەردەوام بوون و محەمەد پاشا میرێ كۆرە سێ هزار سەربازێن خۆ هنارتبوون بۆ هاریكارییا ئیسماعیل پاشای، لێ بەیرەقدار گەهشتە ئامێدیێ بەری ئیسماعیل پاشا بگەهیت، ژ بەر هندێ، وێ هێزێ چ نەكر، لێ وێ ڤەگێرانێ نەگۆتییە یێ داوێ ل كیرێ بوو، هەروەكی دیارە ژێ موكریانی ئەڤ سەرهاتییە ڤەگێڕایە داكو

رۆلگێرانا میرێ رواندز پشتراست بكەت كو هەر ژ بەر هندێ ئەو پەرتووك دانایە[٥٤]، هەروەسا ئاماژەیەك هەیە كو شـەرەك ل ناڤبەرا هـەردولا ل گوندێ شێخكان هاتیە روودان، لێ شەر ب شكەستنا وی و خۆڤەكێشانا وی بۆ ئامێدیێ ب داوی هاتیە[٥٥].

وەسـا دیـارە ژی رەوشـا ئامێدیێ خۆ ل بەر كێشەیێن زێدەتر نەدگرت، چونكی هەژاری و برسێ سەرانسەری باژێری ڤەگرتبوو و رۆژانە ژ لایێ تۆپخانا ئینجە بەیرەقدار دهاتە تۆپباران كرن، ئەوێن بەرەڤانی ژ كەلایێ دكرن هەر چەكەكێ ل بەر دەستێ خۆ ب كار دئینان، وەكی: تڤەنگ، تیروكڤان، نەچاربوون ژی مەنجەنیق و بەردەقانییان ژ بلنداهیا شوورهان ب كار بینن، هەروەسا چەكەكێ كەڤن ب كار د ئینان كو ئەو ژی ئاگرێ گریكان بوو كو پێكهاتییە ژ تێكەلەیەكێ زەیت و كبریتێ یێ ب جۆرەكێ ستركێ(سیكۆتینێ) دهاتە لێكدان و ب بۆریێن ژ سفری هاتینە چێكرن دهاتە هاڤێتن و دبوو ئەگەرێ هەلبوونا گومتلەكێ مەزن یێ گوریا ئاگری.

هەرچەندە ئیسماعیل پاشا بەرگرییەكا نموونەیی ژ ئامێدیێ كر لێ ل داویێ نەچاربوو ب مەرجێن بەیرەقداری رازی ببیت، كو مەرجێ ژ هەمیان دیارتر خۆرادەستكرنا وی بوو دگەل مسۆگەركرنا سلامەتیا وی و بەرگەریانێ بۆ بكەت ببیتە حوكمداریێ ویلایەتەكێ، ب ڤی ئاوایی وی و خێزانا خۆ خۆرادەستی هێزێن ئۆسمانی كرن، سالنامەیێن هورمزدی ژی رۆژا٢٧ تەباخا سالا ١٨٤٢ز بۆ ستاندنا ئامێدیێ دەستنیشانكرییە و تێدا هاتییە كو ئیسماعیل پاشا ژ وێرێ رەڤیبوو تیارێ و ژ لایێ هێزێن بەیرەقدار ڤە هاتبوو راهێلان، ڤێجا هەكە ئەڤ ڤەگێرانە یا راست ودروست بیت، ئیسماعیل پاشا ل دەرڤەی ئامێدیێ هاتییە دەستەسەركرن، هەر چەوان بیت، بەیرەقدار هەر وێ سالێ ئەو دگەل پارە و كەل وپەلێن وی هنارتییە بەغدا و حوكمێ میرگەها بەهدینان ب تمامی ب داوی هاتییە. ئیسماعیل پاشا و خێزانا وی ل داوییا سەردەمێ والیێ بەغدا عەلی رەزا پاشایێ لاز (١٢٤٧-١٢٥٨مـــش/١٨٣١-١٨٤٢ز) گەهشتینە بەغدا كو وی رێزگرتنەكا تایبەت بۆ هەبوو، ڤێجا چ راستی بۆ نینە كو هاتبیتە زیندان كرن[٥٦].

زانیاریێن بەردەست ل سەر ژیانا وی وەسا دیار دكەن كو ئەو ل ناڤ جڤاكێ بەغدادی یێ ئازاد بوویە و گەلەك رێز لێ هاتییەگرتن، هەر بۆ نموونە، دەملدەست دەمێ گەهشتییە بەغدا ژ لایێ (عبدالرحمن السهروردی العباسی) هاتییە پێشوازیكرن ژ بەركو هەردو ژ ئێك رڤشت بوون و ئەڤێ داویێ ئێك بوو ژ خانەدان و زانایێن بەغدا، ئینا وی ب هەمی رێز و قەدرگرتن ڤە ل مالا خۆ مێڤانكر و هەیامەكا نەدەستنیشانكری ل نك وی ما و ژ وێرێ نەچوو هەتا والیێ بەغدا نامق پاشا (١٢٦٨-١٢٦٩مش/١٨٥١-١٨٥٢ز) ئەو وەك والیێ شارەزوور دامەزراندی كو هەیامەكێ ل وی پۆستی بوو و پاشی ڤەگەریا بەغدا و گوژمەكێ مەزن یێ پارەی كرە بێش بۆ نووژەنكرنا خواندنگەهەكا سەر ب مزگەفتا مەزن یا شێخ (عمر السهرودی) ڤە كو دكەڤیتە دەردۆرێـن رۆژهەلاتێ یێن بەغدا، هەروەسا ئەیوانەكا مەزن ل بەر دەرگەهێ چوونە ژوورا وێ مزگەفتێ و بەرسڤكەك و جهەك بۆ ئاڤ ڤەخوارنێ و بیرەك بۆ زێدەكرییە، هەروەسا جۆیەكا ژ ڤافكی(قرمیدی) هاتییە چێ كرن یا ئاڤ ژ كناریێ دیجلە ڤەدگوهاستە مزگەفتێ و بركا ئاڤا ڤەخوارنێ ژ وێ جۆكێ دهاتێ ل سـالا ١٢٧٤مـــش/١٨٥٧ز نووژەنكرن، هەروەسا قەسرەكا مەزن بۆ خۆ ل نێزیك مزگەفتا (السهرودی) ئاڤاكر و دیوانەك ژی چێ كر و ل وێرێ پێشوازیا ریهسپی و ماقوولێن بەغدایێن خودان زانست و ئەدەب دكر، قەسر ژی هەتا مرنا وی هەر یا ئاڤا بوو، پاشی حكومەتێ كرە سەنتەرێ جەندەرمان و وەسا ما هەتا سالا ١٣٣٣مش/١٩١٤ز ژ ئەگەرێ لەهییەكێ هەرفی[٥٧].

ئەڤ كارێن وی، كو پتریا وان یێن خزمەتگوزاری و خێرخوازی بوون، ببوونە جهێ رێزگرتنا خەلكێ بەغدا، هەر بۆ نموونە، هۆزانڤان (عبدالباقی العمری) هەلبەستەك ب هەلكەڤتا ڤەكرنا ڤان پرۆژان ڤەهاند، هەروەسا هاتییە گۆتن كو عەلی رەزا

پاشای ئەو وەك موتەسەرفێ کەربەلا دامەزراندییە و هەیامەکێ ل وی پۆستی مایە[58]، لێ ئەم ناڤێ وی ل ناڤ موتەسەرفێن سەردەمێ وی والی نابینین، بەلکی ل هەردو سالێن ١٢٨٦-١٢٨٧مش/١٨٦٩-١٨٧٠ز ل سەردەمێ مەدحەت پاشایێ والیێ بەغدا موتەسەرفێ وێرێ بوویە، پاش ئێکسەر وەك قائیمقامێ بەغدا هاتییە دامەزراندن و نزانین پشتی هنگی چ پۆست وەرگرتینە، لێ ئیسماعیل پاشا ل سالا ١٢٨٩مش/١٨٧٢ز وەغەرا داویێ کرییە و تەرمێ وی د رێ ورەسمەکێ هەژی دا ل گۆرستانا شێخ عەبدلقادر گەیلانی هاتییە ڤەشارتن و هۆزانڤانان هۆزان پێگوتینە[59].

## ژێدەر:


١. محمد أمين العمري: منهل الأولياء تحقيق سعيد الديوه جي، مووسل ١٩٦٨ جز الاول ١ ص ١٤١ وزبدة الآثار الجلية ص ٢٢٧.
٢. دفتر مهمة ١٣٣، ص ٤٣٨.
٣. حديقة الزوراء ص ٣١٥.
٤. دفتر مهمة ١٣٩، بەرپەرێن ١٠-١١ێ کورکێ شاهانە (ب عەرەبی خلعة، ب تورکی Hilat یان قەفتان)، ئەو کورکە یێ شاهـ یان سولتانێ ئۆسمانی ددا میرەکی، والییەکی، وەزیرەکی، فەرمانبەرەکی دەمێ بەرپرسیارییەك یان ئەرکەك رادەستی وی دکر یان پۆستەك و پلەیەك ددایێ یان ژی رێز لێ دگرت، ڤی کورکی ژی ل دووڤ کەسێن وەردگرت جۆرێن خۆ هەبوون و یێ ئەو کورك پێشکێش دکر دگوتنێ قفتان ئاغاسی ـ وەرگێر ـ
٥. دفتر ١٣٩ ص ١٢٢ ل نیڤا رەمەزانا ١١٤٥ مشەختی/١٧٣٢ زایینی.
٦. دفتر مهمة ١٤٠، ص ٣٧٢.
٧. دفتر ١٤٠ ص ٣١٠.
٨. عبد الرحمن السويدي: حديقة الزوراء في سيرة الوزراء، بتحيقنا، بغداد ٢٠٠٣ ص ٥٩٠ و المائي: الأكراد في بهدينان ص ١٥٣.
٩. قەرەداغی: زانایانی کورد بەرگێ ٣ بپ ١٣٦.
١٠. العمري: زبدة الآثار بث ٩٤ وغاية المرام ص ١٠٨
١١. بنێرە: مذكرات دومنيكو لانزا ص ٦٢ و رحلة نيبور إلى العراق، ترجمة محمود الأمين ص ٧٦ ومنهل الأولياء جزء الاول٢ ص١٤١ وغاية المرام ص١٠٧ و زبدة الآثار الجلية ص ٩٤-٩٥ و ص ١٢٨ و تاريخ العراق بين احتلالين جزء ٥ ص ٢٦٣ و دوحة الوزراء ص ٩٣ و المائي: الأكراد في بهدينان ص ص ١٥٢-١٥٥ و محفوظ: إمارة بهدينان العباسية ص ٧٨-٨١ و خضر العباسي: صفحات خالدة ص ٣٤ و شاولي: إمارة بادينان ص ٥١-٦٣ تاريخ مشاهير الكرد، أمراء وخاندانها ص ١٣٦.
١٢. ياسين العمري (منسوب إليه) روضة الأخبار في ذكر أفراد الأخيار، ص ١٧٢.
١٣. إيليا أبونا: تاريخ بطاركة البيت الأبوي، مووسل ٢٠٠٩ ص ١٠١.
١٤. ياسين العمري: غاية المرام ص ١٠٢، ١٠٧.
١٥. ياسين العمري: الدر المكنون في المآثر الخالية من القرون، ص ١٣٣
١٦. ياسين العمري: غرائب الأثر ص ١٩-٢٢
١٧. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٢٢.
١٨. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٢٣.
١٩. الدر المكنون، پەرێ ١٣٧ و ١٥٥.
٢٠. غاية المرام ص ١٠٠
٢١. ياسين العمري:غرائب الأثر في حوادث ربع القرن الثالث عشر، مووسل ١٩٤٠ ص ٣٦

٢٢. هەروەسا بنێرە: منهل الأولياء جزؤ الاول ١ ص ٦٨ و (إسماعيل بيك بن إبراهيم بيك) وغرائب الأثر بەرپەرێن ٤٧-٥١ وغاية المرام ص ١٠٥ والدر المكنون، پەرێن ١٢٨ و١٣٣ و١٣٧ و١٤٠ و١٤٨ و١٥٤ وزبدة الآثار الجلية بەرپەرێن ١٢٩، ١٣٢، ١٥١-١٥٥، ١٦١-١٦٤ و١٧٦ و بعض الوقائع الهامة ص١٤٧ ويوحنا هرمزد: سيرة ذاتية بقلمه، بطرس حداد كرية عەرەبی، كۆڤارا بين النهرين، هەردو هژمارە ٣٤-٣٥(سال ٩، ١٩٨١) ص ٢٥٠ والمائي: الأكراد في بهدينان ص ١٥٩ و محفوظ: إمارة بهدينان العباسية بەرپەرێن ٨٧-٨٩ و شاولي: إمارة بادينان ص ٦٤-٧١. پەرتووكا مە: الموصل في العهد العثماني، فترة الحكم المحلي، نەجەف ١٩٧٥ بەرپەرێن ١٦٤، ١٦٧، ١٧٠-١٧٥ وتاريخ مشاهير كرد، أمراء وخاندانها بث ١٣٦ و دائرة المعارف الإسلاميه بەرگێ ٧ بپ ٢٤٩، مادة بهدينان.

٢٣. الدر المكنون، ص ١٥٤

٢٤. أنور المائي: الأكراد في بهدينان ص ١٥٩ و العزاوي: العمادية بەرپەرێن ٥٠-٥١ و محفوظ العباسي: تاريخ إمارة بهدينان العباسية بەرپەرێن ٨٩ و طارق الباشا عمادي: معركة ئيتوت، كۆڤارا دهۆك، هژمارە٢٩، كانونا ئێكێ یا ٢٠٠٥.

٢٥. الدر المكنون، ص ١٥٤ و غرائب الأثر ص ص٤٧-٤٨ و غاية المرام ص ص ١٠٦-١٠٧ ، هەروەسا بنێرە: تاريخ مشاهير كرد، أمراء وخاندانها، ج٢ مج٣ ص ١٣٤، و محمد عبد الله ئاميدي: هۆزانڤان دەردی، كۆڤارا سیلاڤ، هژمارە ١١، ئادارا ٢٠٠٧، بەرپەرێن ٣٠-٣١ و هۆزانڤان محەمەد تەیار باشا، كۆڤارا سیلاڤ، هژمارە ٩، كانوونا دووێ یا ٢٠٠٧، بەرپەرێن ٢٣-٢٤.

٢٦. قەرەداغی: زانایانی كورد بەرگێ ٣ بپ ١٨٨.

٢٧. غرائب الاثر بەرپەرێن ٤٧-٦٤ و غاية المرام بەرپەرێن ١٠٣،١٠٥،١٠٦ و الاكراد في بهدينان ص ١٦١ و امارة بهدينان العباسية بەرپەرێ ٨٩-٩٤ و العمادية ص ٥١ و تأريخ مشاهير الكرد، تاريخ امراء و خاندانها ج ٢ مج ٣ ص ١٣٤ و دەستنڤیسا هژمارە (٢٠٨٣٦) ل سەنتەرێ نیشتمانیێ دەستنیڤسان.

٢٨. بنێرە: الدر المكنون، پەرێ ١٥٥ و١٦٧ وغاية المرام ص ٢٠٤-٢٠٨ وغرائب الأثر، ص ٩٨ و تاريخ مشاهير كرد، أمراء وخاندانها، ج٢ مج٣ ص ١٣٤ و سعيد الحاج صديق: زاخو، الماضي والحاضر ص ٢٤ و٢٥.

٢٩. غرائب الاثر، ص ٦٤.

٣٠. الدر المكنون، بەرپەرێ ١٥٣) و (غرائب الاثر ص ٦٤.

٣١. غرائب الأثر، ص ٧٠ و غاية المرام، بەرپەرێن ١٠٤-١٠٥.

٣٢. غرائب الأثر ص ١٠٠ ودوحة الوزراء ص ٢٤٦

٣٣. غرائب الأثر ص ١٠٠.

٣٤. غرائب الأثر بەرپەرێن ٧٢-٩٩، ١١٢-١١٨.

٣٥. عبدالرحمن مزوري: بعض الوقائع الهامة في بهدينان، كۆڤارا كاروان، هژمارە٨١، كانوونا ئێكێ یا ١٩٨٩ بپ ٤٨.

٣٦. بنێرە: ياسين العمري، غرائب الأثر بەرپەرێن ٨٠، ١٠٠، ١١٢-١١٨ و غاية المرام بث ١٠٥ و رسول حاوي الكركوكلي: دوحة الوزراء بث ٢٤٧ و خضر العباسي: تاريخ بلدة زاخو بث ١١ وصفحات خالدة بث ٣٥-٣٦ والعزاوي:العمادية بث ٥٣ و المائي: الأكراد في بهدينان بەرپەرێن ١٦٤-١٦٥ و محفوظ: إمارة بهدينان العباسية بەرپەرێن ٩٨-١٠١ و شاولي: إمارة بادينان بەرپەرێن ٩٦-١٠٠ و طارق الباشا عمادي: معركة ئيتوت، كۆڤارا دهۆك، هژمارە ٢٩، كانوونا ئێكێ یا ٢٠٠٥ێ.

٣٧. المائي: الأكراد في بهدينان، ص ص ١٦٨-١٧٠ محفوظ : امارة بهدينان العباسية ص ١٠٢ و طارق الباشا عمادي: معركة ئيتوت، كۆڤارا دهۆك، هژمارە ٢٩، كانوونا ئێكێ یا ٢٠٠٥ێ.

٣٨. الحوليات الهرمزدية بث ٩٠.

٣٩. هەر ئەو ژێدەر، بپ ؟؟؟.

٤٠. بعض الوقائع من تاريخ كردستان، ئادی شێر ژ دەستنڤیسێن كلدانی كۆمكرینە، نەرمین عەلی ژ فرەنسی وەرگێراینە، ڤەكۆلین و ل سەر نڤیسین عیماد عەبدلسەلام رەئوف، كۆڤارا ئەكادیمیای كوردی، هژمارە ٢٤ یا سالا٢٠١٣، بپ ٣٨٩. ژێدەرێ پاراستییە: إمارة بهدينان العباسية بەرپەرێن ٩٩-١٠٩ و سليمان الصائغ، تاريخ الموصل بەرگێ ١ بەرپەرێن ٣١٢-٣١٣ و المائي: الأكراد في بهدينان بەرپەرێن ١٧٣-١٧٦ شاولي: إمارة بادينان ص ١٤١ و طارق الباشا عمادي: معركة ئيتوت، كۆڤارا دهۆك، هژمارە ٢٩، كانوونا ئێكێ ٢٠٠٥ێ.

٤١. رحلة فريز إلى العراق سنة ١٨٣٤، ترجمة جعفر خياط، بەغدا ط ٢، بيروت ٢٠٠٧ ص ٢٦.
٤٢. المائي: الأكراد في بهدينان بث ١٧٣ و محفوظ: إمارة بهدينان العباسية ص ١٠٩.
٤٣. جليل من تاريخ الامارات ص ٢٠٢ و شاولي: إمارة بادينان ص ١٥٥.
٤٤. Badger،The Nestorians،p ٢٦.
٤٥. حسين حزني موكرياني: موجز أمراء سوران، وەرگێرانا محمد الملا عبدالكريم، بەغدا ١٩٦٣ ص ٦٣و إمارة بادينان ص ١٥٥.
٤٦. موجز أمراء سوران ص ٦٤.
٤٧. ؟؟؟ بەرگێ١ بپ ١٤٨.
٤٨. تاريخ الموصل جزء الاول ١ ص ٣١٠.
٤٩. فهارس المخطوطات السريانية في العراق، بەغدا جزء الاول ٢ ص ٣٠.
٥٠. تاريخ العراق بين احتلالين جزء الاول ٧ ص ٣٥.
٥١. موجز أمراء سوران، ص ٥٦.
٥٢. إمارة بادينان ص ١٦٠.
٥٣. Letters from Mr.J.merrick ،٢٠٥،٢٣٧،Salibi، Reports from Northern Iraq.I.
٥٤. موجز أمراء سوران، بەرپەرێن ٦٣ و ٦٤.
٥٥. الحوليات الهرمزدية، جزء الاول ١ ص ١٩٧.
٥٦. الفردوس المجهول، پەرێ ٢٨.
٥٧. محمد سعيد الراوي: خير الزاد في تاريخ مساجد وجوامع بغداد، تحقيق عماد عبد السلام رووف، بەغدا ٢٠٠٦ بەرپەرێن ٣٠٩-٣١١ و خضر العباسي: صفحات خالدة، ص ١٩.
٥٨. هەر ئەو ژێدەر، بپ ؟؟؟
٥٩. خير الزاد، بپ ٣١١ و محمود شكري الآلوسي: مساجد بغداد وآثارها، بەغدا ١٣٤١، بپ ٥٣ و سەرباری ژێدەرێن ناڤهاتی د دەھمەنا مادەی دا، بنێرە: رحلة فريزر إلى بغداد ١٨٣٤، وەرگێرانا جعفر الخياط، چاچا٢، بەیروت ٢٠٠٧ بپ٢٢، و أنور المائي: الفردوس المجهول، پەرێ ٢٨ و تێدا هاتییە کو ئەو ل سالا ١٤٩٢مشەختی/١٨٧١زایینی وەغەرا دووماهیێ کریە و جليل: من تاريخ الإمارات بەرپەرێن ١٠٢ و ١١٤ و عباس العزاوي:عشائر العراق الكردية ص ١٩١ و تاريخ الدول والإمارات الكردية، ص ٣٩٨ و تاريخ مشاهير كرد، أمراء وخاندانها ص١٣٧ والعزاوي: العمادية ص ٥٣ و سعدي عثمان: كردستان والإمبراطورية العثمانية بەرپەرێن ٢٠٥-٢٠٧ و كاميران الدوسكي: كردستان في العهد العثماني، بەرپەرێن ١١٢-١١٣عبد الفتاح البوتاني: الملا يحيى المزوري وسقوط إمارة بادينان، کۆڤارا دهۆك، هژمارە ٤، تەباخا ١٩٩٨ و طارق الباشا عمادي: معركة ئيتوت، کۆڤارا دهۆك هژمارە ٢٩، کانونا ئێکێ ٢٠٠٥ و مشاهير الكرد بەرگێ١ بث ١١٠ و Badger;The Nestorians،p ٢٦٥.

# ئامێدیێ د پەرتووکێن هژمارەکا گەڕۆك و مزگینیدەرێن بیانی دا ل سەردەمێ ئۆسمانی (١٥١٤-١٩١٨ ز)

پ.هـ.د.فەرهاد حاجی عبوش
زانکۆیا دهۆك-کۆلیژا زانستێن مرۆڤایەتی
وەرگێران: سالح یوسف سوفی

## پێشگۆتن:

ژ مێژە گەڕۆکێن (گەڕیدەیێن) بیانی قەستا کوردستانێ و باژێڕێن وێ یێن وەکی: نسێبین، رها(ئۆرفە)، ئامێدیێ، ئۆرمیێ و یێن دی کرینە، لێ تشتێ بۆ مە گرنگ باژێڕێ ئامێدیێ یە کو ئێکە ژ بنکەهێن گرنگێن وەلاتێ کوردان یێ ژ سەردەمێن ئیسلامی وەرە بوویە سەنتەرەك بۆ حوکمداریا میرگەها بەهدینان[1]، هەرچەندە ژی ئامێدیێ باژێڕەکێ مەزن نینە لێ ل سەردەمێ ئۆسمانی (١٥١٤- ١٩١٨ ز) ب دەهان گەڕۆکێن بیانی بۆ خۆ راکێشاینە و وان ژی تێبینی و دیتنێن خۆ ل سەر توومارکرینە کو وان دیتن و بۆچوونان بهایێ خۆیێ زانستی هەنە و چ ڤەکۆلەرێن ل سەر دیرۆکا کوردی دنڤیسن نەشێن وان توومارکرنان پشتگوهڤە بهاڤێن.

هەرچەوان بیت، پەرتووکێن گەڕیانان (گەشتنامە) ژ ژێدەرێن سەرەکی یێن ڤەکۆلینا دیرۆکا کورد و کوردستانێ نە د هەمی سەردەماندا، گرنگی ژی نە تنێ د هژمارە زۆریێ دایە[2]، بەلکی گرنگی د وی مادده و وێ میتۆدێ دایە یێ بۆ سالۆخدانا وارگەهـ و باژێڕ و رێ و بیناسازی و جلکێن خەلکی و دەنگ وباس و داب ونەریت و خولکێ وان و تشتێن سەیر و ئنتیکە و دیارۆکێن خۆڕستی و .. هتد. دا هاتییە ب کار ئینان و ئەڤ ژێدەرە زانیاریێن زۆر پێشکێشی وان دکەن یێن ل سەر دیرۆك و جۆگرافیا و شوینوار و بیاڤێن دی دنڤیسن[3].

هەکە سەردەمێ حوکمداریا ئۆسمانی بێتە هەڤبەرکرن ل گەل سەردەمێن دی، ب سەردەمەکێ پێشکەڤتیێ ئەدەبێ گەڕیانان دهێتە ل قەلەمدان، چونکی گەڕۆك و گەشتیارێن بیانی د دەولەتا ئۆسمانی دا زۆر ببوون و ب ناڤ و ناڤکرن و ناڤ ونیشانێن جودا جودا دەست ب گەڕیانێ ل دەڤەرێن وێ دکرن و هندەك ژ وان گەڕۆك و گەشتیار یان

ئەندازیار و نوژدار بوون، هندەك ژی لێگەرێن شوینواران و مسیۆنێر و بازرگان یان ڤەکۆلەر و شارەزا یان ژی ب گەلەك ناڤێن دی بوون[٤]، پێدڤییە ئاماژێ بکەینە وێ چەندێ ژی کو گەلەك پالدەرێن ژێکجودا بۆ وان گەریانان هەبوون، ژ وانا: سیخوریکرن و کۆمکرنا زانیاریان، یان زانینخوازی و سەرکێشیکرنێ، یان حەزکرنا زانینێ و ڤەدیتنا تشتێن سەیر و ئنتیکە، یان حەزژێکرنا گەریان و گەشتکرن و باشترکرنا رەوشنبیریێ و هتد.[٥].

پالدەرێن گەریانێن بیانییان بۆ کوردستانێ نەخاسمە ژی بۆ ئامێدیێ چەند بن و چ جۆر بن، زانیاریێن وان توومارکرین گرنگییەکا مەزن هەنە، لێ دگەل هندێ ژی، هەر تشتەکێ د وان توووماران دا هاتی یێ راست و دروست یان ژی ژیواری ئامێدیێ نینە، چونکی دڤالا نینن ژ کێماسییان و بۆ ب جهئینانا هندەك ئارمانجێن خۆ یێن کەسۆکی یێن دیار و بەرچاڤ هندەك تشتێن دی کرینە د ناڤ دا و مرۆڤ دشێت ب ساناهی ل سەر راوەستێت، نەخاسمە ژی هەکە دو ژ وان یێن ل دەمەکێ نێزیکی ئێك سەرەدانا ئامێدیێ کرین وەکی ئێك ئەو زانیاری توومار نەکرین و وێ چەندێ ژی دێ د ڤێ ڤەکۆلینێ دا دیار کەین.

ل داویێ ژی دڤێت ئاماژەیێ بکەینە وێ چەندێ کو ب تنێ مە پشتا خۆ ب هژمارەکا پەرتووکێن وەرگێراییێن گەریانێن بیانییان گەرمکرییە یێن شیاین ب دەست خۆ بێخین، لێ مخابن نەشیاین پێداچوونێ د هەمی پەرتووکێن گەریانان دا بکەین کو بۆ ڤێ ڤەکۆلینێ د پێدڤی بوون، هەروەسا مە هندەك مەسەلە پشتگوهڤە هاڤێتینە داکو بابەت گەلەك درێژ نەبیت و تنێ مە گەلەك گرنگیدایە رەوشا سیاسی و بیناسازی و رەوشنبیری و ئابووری و جڤاکی یێ ئامێدیێ.

## ئێك - ژیانا سیاسی:

### أ- میرگەها بەهدینان:

ئامێدیێ پایتەختێ میرگەها کوردی یا بەهدینان بوو، ل سەر دیرۆکا دامەزراندنا ڤێ میرگەهێ ژی (المقیم البریطانی)کلۆدیۆس جێمس ریچ (١٨٢٠ ز) نڤیسییە کو ئەڤ میرگەهە ل نیڤا ئێکێ یا سەدسالییا (٧مش/١٣ز) هاتییە دامەزراندن[٦]، لێ لۆنگریك وەسا دبینیت میرگەها بەهدینان ل سالێن داویێ یێن سەدسالییا (٨ مش/١٤ز) هاتبیتە دامەزراندن[٧].

هەروەسا مزگینیدەرێ (مسیۆنێرێ) دۆمینیکۆ لانزا ناڤێ میر بەهرامێ مەزن (١٧١٤-١٧٦٨ ز) ئینایە کو ب جوامێری و مەردینی و دلسۆزیا خۆ بۆ خەلکی ناڤدار بوویە[٨]، لێ کارستین نیبۆر یێ ل سالا (١٧٦٦) ێ زایینی سەرەدانا ئامێدیێ کری دبێژیت کو بەهرام پاشا حوکمدارێ ئامێدیێ بوو و ئەو ژ بنەمالا بەهدینان بوویە یێ ژ سەردەمێ خەلیفەیێن بنەمالا عەباسییان حوکم لێ کرین، پێدڤی بوو ژی ئەڤ حوکمدارە یێ خۆسەر با، لێ وی باج و دیاری ددانە پاشایێن هەڤسوویێن خۆ داکو گوندێن خۆ یێن ل دەشتێ ژ وێرانبوون و کاڤلبوونێ بپارێزیت[٩]، هەروەسا قەشەیێ ئیتالی جۆزیپی کامپانیلێ (١٧٦٢-١٨٣٥ ز)ێ د پەرتووکا خۆ (تاریخ منطقة کوردستان و الفرق الدینیة التي فیها) دا بەحسێ ئامێدیێ و بەهرام پاشای کرییە و گۆتییە: (ئامێدیێ بازێرەکێ گەلەك کەڤنە و گەلەك جاران حەفت وەزیران و پاشایێن دی یێن هەڤسنوور پێکۆلکرییە وی بازێری بستینن، لێ پێکۆلێن وان چ مفایێ خۆ نەبووینە و ب تۆپێن خۆ یێن کێمێن بچووك ـــ شیایە ـــ خۆ ژ هێرشا هەر لەشکەرەکێ ئاسیایی یێ خودان شیان بپارێزیت و ئەڤ تۆپە ئەو بوون یێن بەهرام پاشای ئینانە وی بازێری)[١٠].

ژ یا بۆری دیار دبیت کو بەهرام پاشا ب هندێ ناڤدار بوویە کو ب زیرەکی سەرەدەری دگەل دەولەتا ئۆسمانی و حوکمدارێن وێ یێن خۆجهییێن پاشایێن بەغدا و مووسل کرییە، وی بەرتیل وەك دیاری یان وەك هاریکاری یێن ماددی یێن سەربازی بۆ رازیکرنا کوچکا سولتانێ ئوسمانی (الباب العالي)یێ ئۆسمانی ژ لایەکی و بۆ ب دەستڤەئینانا پشتەڤانییا وان یا فەرمی ژ لایەکێ دووڤە پێشکێشی وان دکرن،

سەرباری هندێ، وان پاشایان پیلان ل دژی وی دگێڕان، لێ وی ب ئاقلمەندیا خۆ، شیا خۆ ژ پیلانگێڕانێن وان پاشایێن نەیار رزگار بکەت و ئەو تشتێ مزگینیدەر لانزا نڤیسی پشتەڤانیا وێ چەندێ دکەت دەمێ دبێژیت: (حکۆمەتا ئۆسمانی چەندین جاران دژایەتیا وی کریە و کەس و کار و داروەستەکێن وی ل دژی وی هاندانە، بۆ گرتنا وی تەپك ل بەر ڤەنانە، لێ ب ئاقلمەندیا خۆ شیایە خۆ رزگار بکەت و خۆ ل باژێرێ خۆیێ ئاسێ بپارێزیت و چ پویتە ب دوژمنان نەکەت، ژ بەر هندێ، وی گەلەك کەرب ژ حکۆمەتا ئۆسمانی ڤە دبوون و حەز دکر د چاڤێن ئەورۆپییاندا بێتە شکاندن.[11]

هەروەسا دۆمینیکۆ لانزا پشتراست دکەت میرێ ئامێدیێ بەهرام پاشایێ مەزن ل سالا (١٧٦٨ز) مریە و پشتی وی کورێ وی ئیسماعیل پاشایێ ئێکێ (١٧٦٨- ١٧٩٨ز)[12] بوویە حوکمدارێ ئامێدیێ، دۆمینیکۆ وی هۆسا سالۆخ ددەت و دبێژیت: «ئەو ژ بەر بێرەوشتی و سیاسەتا خۆ، ژ لایێ داروەستەکێن خۆڤە نەیێ خۆشتڤی بوو»، ژ بەر هندێ، ئێك ژ کەس و کارێن وی ب ناڤێ (بەیرام بەگێ کورێ سولتان بەدرەددین) پشتەرێبوونا خۆ ل دژی وی راگەهاند و چوو نك عومەر پاشایێ (١٧٦٤-١٧٧٥ز) والیێ بەغدا داکو (لەشکەرەکی بینیت و پێ بشێن ئامێدیێ بستینیت) کو ئەڤ کارێ وی (دگەل سیاسەتا تورکان دگونجا بۆ بژالەکرنا ڤان رەگەزێن هەڤسوو داکو خۆ ژ کێشەیێن وان بپارێزیت و گوژمێن مەزن یێن پارەی ژی ب دەستڤە بینیت، ژ بەر هندێ، پاشا رازی بوو داخوازیا بەیرام بەگێ ب جهـ بینیت و وی وەك میرێ ئامێدیێ دامەرزاند)، پاشی نڤیسارەك بۆ محەمەد بەگێ بابانی (١٧٦٣-١٧٧٣ز) یێ میرێ قەلاچوالان هنارت و تێدا داخواز ژێ کر پشتەڤانیا بەیرام بەگێ بکەت بۆ ب جهئینانا وێ فەرمانێ، ئینا لەشکەرێ وی بەرەڤ ئامێدیێ ب رێ کەڤت و هژمارەکا کوردان و پشکەکا ئێزدیان ژی گەهشتنێ یێن تەبایی دگەل میرێ خۆ نەبوون و ئەو لەشکەر شیان دەڤەرێن دەردۆرێن ئامێدیێ کۆنترۆل بکەن و

کوچکا میرگەها بەهدینان



دووربێچەکا دژوار داننە سەر ئامێدیێ[13].

لێ ئیسماعیل پاشا (ل کەلا خۆ ل ئامێدیێ ما بێی هندێ چ ترسا دوژمنان ل سەر وی هەبیت) و چو پویتە ب هێزێن دووربێچکەر نەکر، چونکی باوەری ب ئاسێیی یا کەلا خۆ و مێرخاسییا زەلامێن خۆ هەبوو، ئینا ڤی شەڕی چەند هەیڤەکان ڤەکێشا و ل سالا (١٧٧٠)ێ ب مرنا بەیرام بەگێ ب داوی هات[14].

پشتی مرنا ئیسماعیل پاشای ژی ئالۆزی ل ناڤبەرا میرێن ئامێدیێ و پاشایێن بەغدا و مووسلێ دبەردەوام بوون، هەر بۆ نموونە گەرۆکەکێ بیانی دبێژیت کو جەلیلی یێن[15] ل مووسل هەڤرکیا ل ناڤبەرا بنەمالا میرێن بەهدینان ل سەر دەستەلاتێ بۆ خۆ ب دەلیڤە دیتبوون و مایتێکرنێن خۆ د کاروبارێن میرگەهێ دا زێدە کربوون، تشتێ میرێن جەلیلی ل سەر ڤی هەلویستی هاندایین وەك ئێکیا دیتن و بۆچوونێن ل ناڤبەرا وان و والی یێن بەغدا بوو[16].

هەروەسا ئۆلیڤیێ یێ گەرۆکێ فرەنسی کو ل باژێرێ مووسل بوو، مرادخان پاشایێ دووێ یێ (١٧٩٨-١٨٠٤ز) ێ میرێ بەهدینان کو میرێ ئاکرێ بوو ب حوکمدارەکێ نەخۆشتڤی ل نك خەلکی سالۆخ ددەت و دبێژیت: «سەربازێن ل دۆرماندۆری وی حەز ژێ ناکەن و کەرب ژێڤە دبن.. ئەو پێدڤی لەشکەرەکییە داکو ل سەر خۆسەریا خۆ بمینیت .. دەمێ دەردکەڤیت ژی خۆ ب هێزەکا توندوتیژ دپارێزیت و چ نابهیسیت ژ بلی دەنگێ هەزاران یێ پێ دئێشیت

...»[١٧]، پێدڤییە ئاماژەیێ بكەینە وێ چەندێ ژی كو سالۆخدانا ئۆلیڤیێ یا ڤالا نینە ژ زێدەرۆییێ، چونكی وی سەرەدانا ئاكرێ نەكرییە و میر مرادخان پاشا نەدیتییە، وەسا دیارە ئەو تشتێ وی گۆتی ژی ژ خەلكێ مووسل بهیستییە[١٨].

هەروەسا جۆن كینیر ل دەستپێكا سەدسالیا نۆزدێ یا زایینی تێدیتنێن باش ل سەر پاشایێ ئامێدیێ نڤیسینە و گۆتییە كو «ئەو میرەكێ خۆسەرە و حوكمێ ئەو دكەت ب میراتە بۆ مایە، ئەو ژ نڤش و نوونەرێ بنەمالا ملكدارا (عەباسییە)[١٩] و ژ وی دەمێ خەلیفە ژ بەغدا هاتینە دەرئێخستن باب وباپیرێن وی حوكم ل ئامێدیێ كرینە، ئەو ئێكە ژ زەنگینترین و ب هێزترین رێبەرێن كوردستانێ و كۆچكا وی ل ئامێدیێ یە...)[٢٠].

منارا ئامێدیێ



هەروەسا هندەك گەرۆكێن بیانی ئاماژە كرینە وێ چەندێ كا ژ بەر چ و چەوان ل سالا (١٨٣٣)زێ میرگەها بەهدینان ل سەردەمێ محەمەد سەعید پاشا (١٨٢٤-١٨٣٣ز) كەڤتییە د دەستێ محەمەد پاشایێ رەواندزی یێ میرێ میرگەها سۆران دا و كرییە پشكەك ژ میرگەها خۆ[٢١]، گەرۆك فریزەر ژی بەحسێ لاوازیا رەوشا وی دەمی یا ئامێدیێ دكەت و دبێژیت: «پاشایەكێ ژ بنەمالەكا بەرنیاسا كوردی حوكم لێ دكر، لێ بێسەروبەریا حوكمێ وی و ژ بەر چاڤپێنەرابوونا یێن دی و هەڤركی یێن ناڤخۆیی، ئەڤە هەمی ببوونە ئەگەرێ كەڤتنا وی، ئینا میرگەهـ ب سەر هندەك سەرۆكاتییێن خۆجهی یێن بچووك دابەش بوو و وان سەرۆكاتییان بۆ چ تشتان ئاڤرووی ل پاشایێ حوكمدارێ لاواز نەددان... پاشای دەسەلات و حوكمێ خۆ ل سەر خەلكی ژ دەست دا و خۆ د كۆچكا خۆ یا ئاسێ ڤە یا ل ئامێدیێ ئاسێ كر، ئەڤە ل وی دەمێ میر محەمەدێ پاشایێ رەواندزی ب سەر وەلاتی دا دگرت و ئەو سەرۆكاتییێن كەسۆكی ئێك ئێكە ژ ناڤ دبرن، هەروەسا میری كەرب و كین و ڤێكنەكرنێن بنەمالەیی و خیانەتكرن بۆ خۆ ب دەلیڤە دیتن و بەرتیلێن باش دانە وان و چوو ناڤ وێ كەلا گرنگ، ل وێرێ ژی چالاكتر و هەمی شیانێن خۆ بۆ ژ ناڤبرنا كەلاییێن دی یێن میرگەهێ ب كار ئینان»[٢٢].

ژ یا بۆری دیار دبیت كو خیانەت و دابەشبوونێن د ناڤ بنەمالا حوكمدار دا گرنگترین ئەگەرێن كەڤتنا ئامێدیێ بووینە[٢٣] و دكتۆر روس پشتراست دكەت كو ل رۆژا شەشی خزیرانا سالا (١٨٣٣)زێ ئامێدیێ كەڤتییە د دەستێ میرێ سۆران دا[٢٤] و خەلكێ ئامێدیێ پێشبینی نەدكرن كەلا وان هۆسا ب ساناهی بكەڤیتە د دەستێ وی میری دا و ل وێ باوەرێ بوون كو چ هێزێن جیهانی یێن وی دەمی نەشێن كەلا وان یا ئاسێ بستینن، هەتا میرێ رەواندز ب خۆ ژی چاڤەرێ نەدكر ئامێدیێ هۆسا ب ساناهی بێتە ستاندن[٢٥].

## ب- سیستەمێ حوكمی و كارگێری:

سیستەمێ حوكمی و كارگێری ل سەردەمێ

دەستەلاتا بەهدینان یا سادە و ئالۆز نەبوو، لێ هەڤدەم یا ب هێز بوو، هەر بۆ نموونە، هندەك گەرۆكان بەحسێ سیستەم و پێكهاتێن وێ یێن كارگێری یێن وی دەمی كرییە، ژ ئاخفتنا ریچ ژی وەسا مرۆڤ تێ دگەهیت كو میرێ بادینی ل سەرێ پیرامید(هەرەم)ا كارگێری بوویە كو سەنتەرێ سەرەكی ل ئامێدیێ بوویە[٢٦] و میری ب ئاوایەكێ میراتە كاروبارێن میرگەهێ ب رێڤە برینە[٢٧] و كەتخودا Kethuda(كیخیا Kahya =كهیە) ژی كو د پیرامیدا كارگێری دا وەكی سەرۆك وەزیری بوو هاریكاریا میری دكر، هەروەسا سەرۆك هۆز ژی ل بەهدینان هەبوون و دهاتنە ئامێدیێ و د كاروبارێن كارگێری دا هاریكاریا میرێ وێ دكرن، میری ژی ل جڤاتا خۆیا تایبەتی دیتن و بۆچوونێن وان سەرۆك هۆزان بۆ بەرێخودانا پرسێن گرنگێن پەیوەندی ب میرگەهێ ڤە هەین وەردگرتن[٢٨]، هەروەسا سەركردێ لەشكەری ئامادەی جڤاتا كارگێریا ئامێدیێ دبوو[٢٩] كو لەشكەر ئێك ژ ستوونێن سەرەكی یێن میرگەهێ بوو، ل سەر ڤێ چەندێ ژی تافرینیێ دبێژیت كو میرێ بەهدینی دشیا (هەشت هزار هەتا دەهـ هزار سوار و هێزەكا پیادە كۆمبكەت كو ئەڤە ژ هێزا هەر بەگەكێ دی پتر بوو)[٣٠].

هەروەسا هندەك گەرۆكان بەحسێ رەوشا بنەمالا حوكمدار و پێگەهێ وێ ل نك خەلكێ بەهدینان كرییە، هەر بۆ نموونە ریچ نڤیسییە كو بنەمالا حوكمدار ل ئامێدیێ ئێكە ژ جوامێرترین و خۆشمرۆڤترین بنەمالێن دەڤەرێ و بەهدینییان ب چاڤێ (پیرۆزكرنێ بەرێخۆددانە رڤشتا تاكێن وێ یێن دگەهشتنە خەلیفان)[٣١]، ریچ پێڤە دچیت و دبێژیت: «میری ب خۆ هند پیرۆزی ل نك عەشیرەتان هەبوو كو د گەرمترین شەراندا چەك ژ دەستێ وان دكەڤت، دەمێ میر نێزیكی وان دبوو)[٣٢]، ئەڤە ل وی دەمێ فریزەر دبێژیت كو پاشایێ ئامێدیێ (ژ بنەمالەكا كوردا بەرنیاسە)[٣٣]، لێ هنری لایارد ل سەر پێگەهێ میرێن بەهدینان ل نك خەلكێ دەڤەرێ نڤیسییە و دبێژیت: «ئامێدیێ گرنگییەكا مەزن هەبوو.. و پاشا و رێبەرێن دەرەبەگ حوكم لێ كرییە و پرۆپاگەندا وێ چەندێ كرینە كو دگەهنە خەلیفەیێن عەباسی، ئەو خودان پێگەهەكێ بلند بوون و گەلەك گرنگی پێ دهاتەدان و رێزگرتنەكا مەزن یا ئاینی ل ناڤ كوردان هەبوون»[٣٤].

ریچ تێبینیا هندەك رەفتارێن میرێن داویێ یێن بەهدینان كرییە و د یاردكەت كو ئەو چاڤ ل رەفتارێن خەلیفەیێن عەباسی دكەن، ریچ بەحسێ هندەك لایەنێن ژیانا میر زوبێر پاشایێ دووێ (١٨٠٨-١٨٢٤ز)ێ دكەت و دبێژیت: «ئەو وەكی خەلیفەیێن داویێ یێن عەباسی دكەت، ئەو رۆژا خۆ ب ڤەدەركرنێ دبۆرینیت، خزمەتكارەك خوارنێ بۆ دئینیت و ژێ دگەرێیت هەتا ب داوی دهێت، پشتی تێر خوارنێ دخۆت، یا د ئامانی دا مای راستڤە دكەت داكو كەس تێبینی نەكەت ژ كێژ رەخی خوارییە، پاشی گازی خزمەتكارەكی دكەت داكو بهێت مێزا خوارنێ راكەت و مەسینەكی و تەستەكێ بۆ بینیت داكو دەستێن خۆ بشۆت، پاشی قەلوونەكێ بۆ دئینیت و ژ نك دچیت»[٣٥]، هەروەسا ریچ دبێژیت كو هندەك میرێن بەهدینان ژ وانا میر ئیسماعیل پاشایێ ئێكێ ژی (زێدەرۆیی د خۆڤەشارتنێ دا كرینە و دەمێ دەردكەڤتنە گەشتان روویێ خۆ ب پێچەیان دنخاڤتن داكو چاڤین نەبن، یان بەرۆڤاژی هندێ، داكو چاڤێن وان ب تشتێن چەپەل و حەرام نەكەڤن)[٣٦].

ریچ ئاماژە كرییە جڤاتا میرێ ئامێدیێ و چەوانییا گرێدانا كۆمبوونان و نڤیسییە: (میرێ ئامێدیێ هەكە بڤێت كۆمبوونەكێ ل دیوانا خۆ گرێدەت، ل پێشیێ كەتخودا (سەرۆك وەزیر) ب ژوور دكەڤیت و وەكی ئیرانییان ب خۆچەماندنێ سلاڤێ دكەتێ و وەك رێزگرتن ل دوورییەكێ ژ میری درووونیتە خوارێ، پشتی وی سەرۆكێ عەشیرەتا مزووری ب ژۆر دكەڤیت و ل نك كەتخودای درووونیت، پاشی سەرۆك هۆزێن دی یێن ل بن دەستەلاتا وی هەر ئێك ل دووڤ پێگەهێ هۆزا خۆ ب ژۆر دكەڤن، وی دەمی پاشا فەرمانا ئامادەكرنا قەلوونان ددەت و تنێ خزمەتكارەك دهێت و قەلوونان دابەش دكەت، هەكە میری ڤیا دیوان ڤەرەڤیت،

فەرمانا ئینانا قەهوێ ددەت، قەهوەچی ژی د پەنجەرێ را بەرێ خۆ ددەتە دیوانێ داکو هژمارا ئامادەبوویان بزانیت و ل دووڤ هژمارا وان فنجانان داگریت و دکەتە د سینییەکێ دا و پاشی ب ژوور دکەڤیت ئێك ئێك دانیتە بەر وان، هۆسا دیوان ڤەدرەڤیت ژ بلی هندەکێن پاشا حەز دکەت ل نك بمینن داکو پێکڤە ل سەر هندەك کاروباران گەنگەشێ بکەن[٣٧].

لێ زانیاری ل سەر سیستەمێ حوکمی و کارگێری ل ئامێدیێ پشتی کەڤتنا میرگەها بەهدینان ل سەر دەستێ دەولەتا ئۆسمانی ل سالا (١٨٤٢ز)ێ گەلەك دکێمن، چونکی ئامێدیێ ببوو باژێرەکێ ئاسایی و نە وەك سەنتەرەك بۆ میرگەهەکا کوردی، ژ بەر هندێ، گەرۆکان کێم گرنگی دداێ و سەر ب مووسل بوو و قائیمقامەکێ تورك ب هاریکاریا هندەك ئەفسەر و سەربازێن ئۆسمانی ب رێڤە دبر[٣٨]، هەروەسا هەردو برا ویگرام ل سالێن داویێ یێن سەردەمێ ئۆسمانی پشتراست کرییە کو ئامێدیێ بارەگەهێ ئێکانەیێ حکومەتێ بوو ل دەڤەرێ[٣٩] و ل سالا (١٨٨٥ز)ێ (کەسەکێ رەوشنبیر و جوامێر) قائیمقامێ ئامێدیێ بوو هەروەکی د (گەریانا هنری پندیێ بۆ کوردستانێ) دا هاتی[٤٠].

## دو - رەوشا ئاڤەدانیێ:

پەرتووکێن گەرۆکان پرن ژ ئاماژەپێکرنێ ب دەهان سەنتەرێن ئاڤەدانی و شارستانی ل باژێر و باژێرك و گوندێن کوردستانێ، ژ وانا ئامێدیێ و هژمارەکا گەرۆکێن بیانی و مزگینیدەران ل سەردەمێ ئۆسمانی پەسنێ وان سەنتەران کرینە، ئەڤە ژی ژ بەر رۆلێ سیاسیێ وی یێ بلند د دیرۆکا دەڤەرێ دا چونکی بنکەهەك و سەنتەرەکێ کارگێری و سیاسیێ میرگەها بەهدینان بوو، ژ بەر هندێ پێدڤی بوو گەلەك سەنتەرێن وەسا لێ هەبن، لێ ژ بەر شەرێن زۆر و هەڤرکییان ئەو باژێر د رەوشەکا نەبنەجهـ دا دژیا، ئەڤە ژی بۆ ئەگەرا وێ چەندێ ئەو سەنتەر غەوارە ببن و ژ ناڤ بچن، ژ بەر هندێ، زانیارێن ل بەر دەست یێن د پەرتووکێن گەرۆك و مسیۆنێران دا هەین تنێ تشتەکێ کێمە و وێنەیێ راستێ وان سەنتەران دیار ناکەن.

تافرنیێ یێ ل سالا (١٦٤٤ز)ێ سەرەدانا دەڤەرێ کری دبێژیت کو ئامێدیێ نە باژێرکەکێ مەزنە و نە ژی یێ بچووکە، ل نیڤا رێیا وێ، سێ یان چوار کانی د ناڤ کەڤران را دزێن و ژ بەرکو ئاڤ ل ئامێدیێ نینە، خەلکێ وێ سپێدە و ئێڤارییان دگەل تەرش وکەوالێن خۆ دهێنە وان کانییان و کونکێن خۆ یێن مەزن تژی ئاڤ دکەن[٤١]، هەروەسا دۆمینیکۆ لانزا ژی دبێژیت کو ئامێدیێ باژێرەکێ دێرینە و (د بەرێ دا قەشە لێ هەبوون.. و ل دەروازا باژێری ژی رووکارێ دێرەکا مەزن یێ ب بەرێ مەرمەری ل سەر شێوازێ کەڤن هاتییە چێکرن هەیە)، هەروەکی پشتراست دکەت کو مزگەفتەکا مەزن و کەلایەك ل ئامێدیێ هەنە[٤٢]، لێ گەرۆك فریزەر یێ ل سالا (١٨٣٤ز)ێ سەرەدانا دەڤەرێ کری ئاماژێ دکەتە وێ چەندێ کو قەسرەکا ئاسێ یا میرێ بەهدینان ل ئامێدیێ هەیە[٤٣].

هنری پندیێ ژی بەحسێ ئامێدیێ و رەوشا وێ یا ئاڤەدانی و شارستانی کرییە و دبێژیت کو د بەرێ دا کەلایەکا گرنگ بوویە و سێ دەرگەهـ هەبووینە[٤٤]، دەرگەهێ رۆژهەلات (دەرگەهێ زێبار) دەرگەهەکێ مەزن بوویە و ژ ئاسنی هاتییە چێ کرن و سەرەدەرکا کڤانی ل سەر هەیە، لێ دەرگەهێ رۆژئاڤا (دەرگەهێ مووسل) دەرگەهەکێ گەلەك ئنتیکەیە و گەلەك نەخش و نیشان ل سەر هەنە، ژ وانا: مار و بالندەیەکێ وەکی سیمەرخی و نەخشێن (ئەندازیاری یێن ب نەخش و نیگارێن عەرەبی هاتینە جوانکرن) هەنە[٤٥]، پندیێ پێڤە دچیت و دبێژیت: «ئامێدیێ تنێ کۆمەکا کاڤلایە و خەلکەکێ سادە لێ دژیت، قەسرا والی (قائیمقامی) ئاڤاهییەکێ مەزنە لێ د رەوشەکا خراب دایە»[٤٦]، هەروەسا بەردەوام دبیت و دبێژیت: «ئامێدیێ وەسایە هەروەکی ب هزاران گوللە تۆپان هاتبیتە هنگافتن هەتا هۆ لێ هاتییەهە، جار جارە کۆخەکێ لێ دبینین .. کو دبیت

ب كێر حەواندنا مالەكا هەزار بهێت»[٤٧]، هەروەسا ل ئامێدیێ (كاڤلەخانەكا كەڤن هەبوویە وەكی هەر جهەكێ دی یێ كاڤل)[٤٨].

لێ هەردو برا ویگرام ئامێدیێ هۆسا سالۆخ ددەن و دبێژن: «پلا شارستانییا وێ ژ یا مووسل كێمترە»[٤٩] و «بازێركەكە ل سەر بانییەكا مەزن یا ڤەدەرە.. و شوورهێن وێ یێن خۆرستی هەردەم تێرا پاراستنا وێ هەبووینە و هۆیێن وێ یێن بەرەڤانیێ ژی بەسە هەردو دەرگەهێن وێ یێن ئێكانە بپارێزن، نۆكە ژی بازێرك كۆمەكا مالانە.. قەبارێ وان ژ قەبارێ گوندەكێ مەزن زێدەتر نینە»[٥٠] و پێڤە دچن و دبێژن كو ل ئامێدیێ گرتیخانەیەك ژی هەبوویە[٥١]، هەروەسا كرنیلۆس ڤان دیك ئامێدیێ سالۆخدایە و دبێژیت: «ئامێدیێ خودان كەلایەكە ئاڤ دبن را دچیت و پتریا خانیێن وێ كاڤل بووینە»[٥٢].

## سێ- ژیانا رەوشنبیری:

وەسا دیارە كو ئامێدیێ ب هەبوونا هژمارەكا خواندنگەهان ناڤدار بوویە و هژمارا خواندنگەهێن ل وێرێ هەین ژ هەر دەڤەرەكا دی پتر بوویە و زانستخوازان ژ هەر دەڤەرەكێ قەستكرینێ داكو ل وێرێ بخوونن و ل خواندنگەهێن وێ فێری زانستی ببن و چەندین زانایێن ناڤدار خواندنگەهێن وێ دەرچووینە و پشكداری د بەلاڤكرنا زانست و رەوشەنبیریێ دا ل دەڤەرێ كرینە، دڤێت ئاماژێ بكەینە وێ چەندێ كو ژ وی دەمێ میرگەها بەهدینان ل ئامێدیێ هاتییە دانان، بزاڤەكا رەوشەنبیری ل وێرێ دەست پێ كرییە و هژمارەكا میرێن وێ ب حەزژێكرنا زانستی و هاندانا زانایان ناڤدار بووینە و چەندین خواندنگەهـ ل ئامێدیێ و گوندێن رەخ و چانێن وێ دامەزراندینە[٥٣]، سەرباری ڤێ هەمیێ، پەرتووكێن گەرۆكان ئاماژە نەكرینە ژیانا رەوشەنبیریا ئامێدیێ، ژ بلی ئاماژەیا مسیۆ ئەلیكساندەر ژابا یێ ل سەر ژیانا رەوشەنبیری ل كوردستانێ ب گشتی ل سەدسالیا نۆزدێ زایینی ئاخفتی و گۆتی: «وی دەمی ل وەلاتێ كوردان هژمارەكا مەزن یا خواندنگەهان هەبوون و وەسا دیارە ژی خەلكێ وێ گەلەك حەز ژ زانستی كرییە، ل هەر بازێرەكی و ل هەر كانتۆنەكێ یان ل گوندەكێ وەلاتێ كوردان مرۆڤی خواندنگەهەك یان دو یان سێ یا پتر ددیتن و حوكمدار و خەلكی ژ هەمی دلێ خۆ ئەو خواندنگەهـ و زانا دپاراستن و بچووك و مەزنان گەلەك رێز ل هۆنەری و زانستی دگرتن و مامۆستایێن نایاب ل جزیرێ، ئامێدیێ، سۆران، سێرتێ و.. هتد. هەبوون[٥٤].

## چوار- ژیانا ئابووری:

ئابووریا ئامێدیێ رۆلەكێ كاریگەر د هەمی لایەنێن ژیانا جڤاكێ كوردی دا دیتییە و كاریگەریا خۆ ل سەر لایەنێن جڤاكی و سیاسی هەبوویە، چونكی ژ مێژە ئامێدیێ ب چاندنێ ناڤدارە و دكەڤیتە نیڤا دەڤەرەكا بەرفرەها گەلەكا ب زاخ بۆچاندنێ[٥٥] و تێرئاڤ و ب خێروبێر، ژ بەر هندێ ئامێدیێ سەنتەرەك بوویە بۆ بەرهەمئینان و هنارتنا سامانێن چاندنێ یێن وەكی تووتن و مازی[٥٦] و گەنمی و سپیندار و فێقی و.. هتد.[٥٧]، هەتا ل رۆژانێن حوكمداریا ئۆسمانی بوویە عمبارەكا مەزن یا دەخل ودانی و هەر سال تێرا چەند هەیڤەكێن دان ودكاكێ مووسل و دەڤەرێن دی دكر و بەرێ چاندن و گیانداری یێ ل وێرێ دهاتە بەرهەم ئینان ژ پێدڤیا خەلكێ ئامێدیێ زێدەتر بوو[٥٨].

هەژی ئاماژەكرنێیە بێژین كو مووسلێ پتر ژ هەر دەڤەرەكا دی پشتا خۆ ب بەرهەمێ كوردستانێ ب گشتی و ئامێدیێ ب تایبەتی گەرمدكر، دۆمینیكۆ لانزا د یاداشتێن خۆ دا دبێژیت: «هەكە شەرەك ل دەڤەرا بەهدینان بێتە روودان و چەند هەیڤەكان ڤەكێشیت، دێ زیانەكا مەزن گەهیتە مووسلێ چونكی ئەو گەلەك كەل و پەلان دهنێریتە ئامێدیێ و تشتێن دی یێن گرنگ ژێ هاوردە دكەت»[٥٩].

دڤێت ئاماژێ بكەینە وێ چەندێ ژی كو هەردو برا ویگرام پشتراست دكەن كو (ل ڤێ ڤانا عەردی چ بازێركێن دی ژ ئامێدیێ چێتر نینن بۆ ب دەستڤەئینانا زانیارێن سەیر و نەئاسایی ل سەر رێ یێن ژیانێ ل ڤان دەڤەرێن ڤەدەر)[٦٠]، مرۆڤ وەسا ژ دەقێ بۆری تێدگەهیت كو ئامێدیێ جهەك بوو بۆ چالاكیێن

جودا جودایێن ئابووری ژ لایەکی و جهەك بۆ ژیارا گەلەك كەسێن دی ژ لایەكێ دووڤە.

هەروەسا دیار دبیت کو پیشە و پشەسازی یێن جودا جودا ل سەردەمێ ئەڤ ڤەکۆلینە ڤەدگریت ل ئامێدیێ هەبووینە و پتریا ڤان پیشە و پیشەسازیان یێن دەستی بووینە، ل سەر ڤێ چەندێ گەڕۆکێن بیانی د پەرتووکێن خۆ دا بەحسێ هندەك ژ وان پیشەیان کرینە، هەر بۆ نموونە، جۆزیپی کامپانێلێ پشتڕاست دکەت کو ل ئامێدیێ (چ چالاکی یان پیشەسازی نەبووینە ژ بلی هندەك تەڤن و پیشەیێن گلینەیی (فخار)[61]، هنری پندیێ ئاماژە کرییە گرنگترین پیشەیێن خەلکێ ئامێدیێ کو ئەو ژی رێسان و ڤەهاندن و پەڕۆك چێکرن ب پیشەسازییەکا دەسپێکی[62].

هەروەسا گەڕۆك نیبۆر دووپاتیێ ل سەر هەبوونا (گەلەك کانێن رساسی و ئاسنی) ل دەڤەرا ئامێدیێ دکەت کو خەلکێ وێ وان کانزایان دەردئێخن و بۆ چێکرنا ئامیر و ئالاڤێن خۆ ب کار دئینن یان ژی دهنێرنە دەڤەرێن دەردۆرێن خۆ[63].

تشتەکێ دیارە ژی کو هەبوونا چاندنێ و پیشەسازیا دەستکرد و کانزایان ل ئامێدیێ و زێدەبوونا داخوازیا بازرگانان ل سەر ببیتە ئەگەرێ پەیدابوونا بازاڕان ل وێ باژێری، ل سەر ڤێ چەندێ تافرنیێ دبێژیت: «ل نیڤا ئامێدیێ ڤەیسەرییەکا مەزن هەیە و دکانێن وێ هەمی جوونێن بازرگانان لێ هەنە»[64]، هەروەسا دۆمینیکۆ لانزا پشتڕاست دکەت کو بازاڕ ل ئامێدیێ هەنە و زەرزەوات و فێقی لێ دهێتە فرۆتن[65]، لێ هنری پندیێ پشتڕاست دکەت کو بازاڕەکا بچووك ل ئامێدیێ هەیە و ب تایبێ داران دهاتە پاراستن و رۆناهییا رۆژێ بۆ دابین دکر[66]، ئەڤە ل وی دەمێ کارل مای دبێژیت کو بازاڕێن ئامێدیێ ژ هەر دیمەنەکێ ژیانێ دڤالا بوون[67].

## پێنج- ژیانا جڤاکی:

د ڤێ ڤەکۆلینێ دا دیار دبیت کو مۆرا هۆزایەتی(عەشیرەتی) و مۆرا ئایینی(تیرەیی) ب سەر جڤاکێ کوردی دا زال بوویە و هەڤبەندی ل ناڤبەرا تاکێن وی جڤاکی ل سەر وان بنەمایان بووینە و د پەرتووکێن گەڕۆکێن بیانی دا بەحسێ لایەنێن جڤاکی یێن دەڤەرا ئامێدیێ هاتییە کرن، هەر بۆ نموونە، تافرنیێ پشتڕاست دکەت کو ئامێدیێ یا مشتی ئاکنجی بوویە[68]، هەروەسا فریزەر پشتڕاست دکەت کو هژمارەکا زۆر یا ئاکنجییان ل وێرێ هەبووینە و ژ هندەك جوامێرێن خەلکێ ئامێدیێ ڤەدگوهێزیت کو (ئامێدیێ دووازدە هزار گوندێن نە بچووك لێ هەبووینە، هەر ئێك ژ وان ژ هژمارەکا خێزانان (یان مالان) پێکهاتییە کو ل ناڤبەرا ٢٠٠ هەتا ٣٠٠ خێزانانن)[19]، لێ جۆزیپی کامپانێلێ پشتڕاست دکەت کو ئامێدیێ ژ چوار هزار گوندان پێك دهات[70]، لێ جۆن کینیر پشتڕاست دکەت کو ٣١ دەڤەرێن ئاڤایێن ب ئاوایەکێ باش خەلك لێ هەی ل ئامێدیێ هەنە[71]، سەرباری زێدەڕۆیی یێ د ڤان هژمارەیان دا، لێ نیشانێن هژمارە زۆرییا ئاکنجیێن ئامێدیێ و دەردۆرێن وێ نە.

ئامێدیێ ژ هەر دەڤەرەکا دی یا کوردی پتر فرەپێکهاتا ئەتنیکی و ئایینی لێ هەبوویە و هندەك پەرتووکێن گەڕۆکێن بیانی بەحسێ وێ چەندێ کرینە، هەر بۆ نموونە، دۆمینیکۆ لانزا دبێژیت: «گەلەك ئەرمەنی و یۆنانی ل ئامێدیێ هەنە»[72]، هەروەسا جۆن کینیر پشتڕاست دکەت کو (کورد و نەستۆری و کلدان و کاسۆلیك لێ دئاکنجینە)[73]، لێ هنری لایارد پشتڕاست دکەت کو (کلدانی و نەستۆری و کۆمەکا جوهییان) ل ئامێدیێ هەنە[74].

هندەك گەڕۆك ژی ئاماژێ دکەنە بلندیا رێژەیا جوهییان ل ئامێدیێ[75]، هەر بۆ نموونە، هنری پندیێ یێ ل هاڤینا سالا (١٨٨٥ز)ێ سەرەدانا ئامێدیێ کری دبێژیت: «تنێ جوهی لێ دئاکنجینە، ئەو پشکەکا مەزن یا خەلکێ ئاکنجیێن وێ نە»[76]، لێ ئەڤ دیتن و بۆچوونە راست نینە، چونکی پتریا خەلکێ ئامێدیێ کوردێن موسلمانن و هاڤینێ دچنە ناڤ زەڤی و رەزێن خۆ یێن ل دەرڤەی ئامێدیێ، لێ جوهی کو پتریا وان بازرگانن ل ناڤ باژێری دمینن[77]، هەروەسا ریچ ڤێ

دیتن وبۆچوونێ یان ڤی ئاراستەی پشتراست دكەت و دبێژیت: «ل هاڤینێ هەوایێ ئامێدیێ یێ گەرمە و بۆ ساخلەمیێ یێ گونجای نینە، ژ بەر هندێ، خەلكێ وێ قەستا هاڤینگەهێن خۆ دكەن كو دو دەمژمێر و نیڤان دووری باژێرینە»[٧٨].

ل سەر هژمارا خەلكێ ئامێدیێ ژی، پتریا گومانان بۆ هندێ دچن كو ئەڤ هژمارە یا بنەجهـ نەبیت، هەر بۆ نموونە، جۆزیپی كامپانیلێ دبێژیت كو هژمارا ئاكنجیێن ئامێدیێ (ل دۆرێن ٣٠٠٠ هزار كەسان بوویە، ژ وانا مەسیحی یێن كاسۆلیكی ژ ١٠٠ كەسان كێمتر بووینە، لێ نەستۆری كێمتر ژ وێ هژمارێ ژی بووینە و جوهی ژی ل دۆرێن ٨٠ كەسان بووینە)[٧٩]، هەروەسا ریچ د گەریانا خۆ دا بۆ ئامێدیێ پشتراست دكەت كو ئامێدیێ (نێزیكی هزار مالێن موسلمان و ٢٠٠ خانیێن جوهی و ٥٠ خانیێن نەستۆری و هندەك خێزانێن یەعقوبی و ئەرمەنییان بووینە)[٨٠]، دڤێت ئاماژەیێ بكەینە وێ چەندێ كو پێكڤەژیانەكا باش و مرۆڤایەتی ل ناڤبەرا وان ئایینان هەبوویە و هنری پندیێ ژی وێ چەندێ پشتراست دكەت دەمێ گۆتی كو جوهیێن ئامێدیێ (ب خۆشی و بستەیی لگەل موسلمانان دژین و هندەك جاران كچێن جوهی شوو ب موسلمانان دكەن)[٨١].

هەروەسا هندەك گەرۆكێن دی بەحسێ خولك و دروڤێن لەشی یێن خەلكێ ئامێدیێ كرینە، هەر بۆ نموونە هنری پندیێ دبێژیت كو خەلكێ ئامێدیێ (دبەژن بلند نینن و خولكێ دێمێ وان ژی یێ ناڤنجییە، ل سەر ژنان ژی دبێژیت كو هەڤژنییا ل ناڤبەرا رەگەزێ جوهی و رەگەزێ كوردی دهاتە كرن چ ئەنجامێن باش نەبووینە، ئەو دكورت و بەركەڤتی نینن، لێ دێمێ وان نەیێ كەشەفرێتە و ژ بەر گەلەك زوو شووكرنێ لەشێ وان ئەو دەلیڤە نەبوویە یێ بكەهیت، ڤێجا رەگەز هەمی ئێشاندییە)[٨٢]، هەروەسا هندەك گەرۆكێن دی بەحسێ تبعەتێ خەلكێ ئامێدیێ كرینە، بۆ نموونە گەرۆك لایارد دبێژیت: «ئامێدیێ گرنگییەكا مەزن هەیە، خەلكێ وێ ژی خودان تبعەت و رەوشتەكێ جوانن»[٨٣]، ئەڤە ل وی دەمێ مارك سایكس دبێژیت كو (گوهـ لێ بوویە خەلكێ ئامێدیێ یێ مەرد و دەست ڤەكرییە)[٨٤].

گەرۆكان بەحسێ جلكێن خەلكێ ئاسایی یێ ئامێدیێ نەكرییە، لێ ئاماژەیەكا ب تنێ بۆ جلكێن میرێ بەهدینی هەیە كو ئەو ژی ژ لایێ ریچ ڤە هاتییە گۆتن و دبێژیت: «پاشا ب جلكێن خۆ یێ كەشخە و رێك و پێكە و جلكێن وی نێزیكی مۆدێلا مووسلیيانە و كشمیرییەكێ دكەتە سەرێ خۆ و ل دۆر كولاڤەكێ سۆر یێ بۆ پشتێ هاتییە خواركرن دئالینیت كو دبێژنێ فێس (تەربۆش)... هەروەسا دەمێ پاشا دچیتە نێچیرێ ل دەڤەرا نێچیر لێ دهێتەكرن ل نێزیك ئامێدیێ جلكێن خۆ دگوهوریت و جلكێن خەلكێ ئاسایی یێ چیایی دكەتە بەر خۆ و پێ هەلباسكی بلنداهییان دبیت و خۆ درێژ دكەتە عەردی و خۆ ل بەر پەزكووڤییان دڤەنسینیت ... ئەڤ جۆرێ نێچیرێ و راڤ و تەلهەڤەدان و تەقەكرن و نێچیرا كەوان ب تەیرێ بازی، وەرزشا ئێكانەیە ل دەڤەرا ئامێدیێ دهێتە كرن، چونكی ئەو دەڤەرەكا چیایی یە و دشیاندا نینە ل سەر پشتا هەسپان ئارمانجانێ بێتە كرن)[٨٥].

ژ ئاخڤتنا بۆری یا ریچ دیار دبیت كو جلكێن میرێ بەهدینان جلكێن كوردی نەبووینە، بەلكی ئۆسمانی بووینە.

## ژێدەر:


١. بۆ زانیاریێن زێدەتر ل سەر دیرۆکا ئامێدیێ بنێرە: صديق الدملوجي. امارة بهدينان الكردية او امارة العمادية، تقديم ومراجعة: عبدالفتاح علي بوتانى، چاپا ٢، (اربيل: ١٩٩٩)؛ عباس العزاوي. العمادية في مختلف العصور حمدي عبدالمجيد السلفي و عبدالكريم فندي، (كوردستان: ١٩٨٨)؛ محفوظ محمد عمر العباسي. امارة البهدينان العباسية، الموصل ١٩٦٩؛ كاوه فريق احمد شاوەلي ئامێدي. امارة بادينان ١٧٠٠-١٨٤٢، دراسة سياسية اجتماعية ثقافية،( اربيل: ٢٠٠٠).

٢. هندەك ڤەکۆلەرێن نووخواز هژمارا وان گەریانان ب ٣٠٠ گەریانان تەخمین دکەن، لێ لۆنگریك دیار دکەت کو ٩٨ گەریان بووینە، بنێرە: اربعة قرون من تأريخ العراق الحديث، وەرگێرانا: جعفر الخياط، چاپا ٧، (بغداد: ١٩٨٥) ٣٩٨-٤٠٨؛ فلاح حسن عبدالحسين. بعض الجوانب الاقتصادية والاجتماعية لمدينة البصرة كما اوردها الرحالة الاوربيون في العصر الحديث، مجلة المورد، بەرگ ١٨، هژمارە (٤)، (بەغدا: ١٩٨٩)، بث ٥.

٣. ئامێدي، امارة بهدينان، بپ ٢١-٢٢ ؛ محمد حسن علي مجيد. ادب الرحلات العراقي في القرن التاسع عشر ومطلع القرن العشرين، کۆڤارا المورد، بەرگ ١٨، هژمارە (٤)، (بەغدا: ١٩٨٩)، بپ ٢٨.

٤. مجيد. ادب الرحلات، بپ ٢٨.

٥. عبدالحسين. بعض الجوانب، بەرپەرێن ٥-٧.

٦. رحلة ريح الى العراق عام ١٨٢٠، وەرگێرانا: بهاء نورالدين، (بەغدا:١٩٥١)، ١٠٧/١.

٧. اربعة قرون، بپ ١٩.

٨. الموصل في القرن الثامن عشر حسب مذكرات دومينيكو لانزا، وەرگێرانا قەشە روفائيل بيداويد، ٢، (مووسل: ١٩٥٣)، بث ٦٢.

٩. رحلة نيبور الى العراق في القرن الثامن عشر، وەرگێرانا: محمود حسين الامين، (بەغدا: ١٩٦٥)، بپ ٧٦.

١٠. ميريلا غاليتي. التراث الكوردي في مؤلفات الايطاليين، وەرگێرانا: يوسف حبي، کۆڤارا (المجمع العلمي العراقي) (الهيئة الكوردية)، بەرگێ ٨، (بەغدا: ١٩٨١)، بەرپەرێن ٢٨١-٢٨٢.

١١. الموصل، بپ ٦٢.

١٢. لانزا. الموصل، بەرپەرێن ٦٢-٦٣.

١٣. لانزا. الموصل، بپ ٦٢-٦٣.

١٤. لانزا. الموصل، ئامێدی، امارة بادينان، بپ ٦٦.

١٥. جەلیلی: مالباتەکە ل سالێن (١٧٢٦-١٨٣٤ز) ێ حوکم ل مووسلێ کریە، ل سالا (١٦٠٠ز) (عبدالملك)ێ باپیرێ ڤێ مالباتێ ژ دیاربەکرێ بۆ کاروبارێن بازرگانی هاتبوو مووسل و هەر ل وێرێ مریە و کورەکێ ئێکانە ب ناڤێ (عبدالجليل) ل پاش خۆ هێلایە و ئەڤ مالباتە ب ناڤێ وی هاتیە ناڤکرن، ڤێ مالباتێ پەیوەندیێن سەنترالی دگەل دەسەلاتا ئۆسمانی هەبوون. بۆ زانیاریێن زێدەتر، بنێرە: سيار كوكب علي الجميل. الموصل خلال الحكم الجليلي، موسوعة الموصل الحضاري، (الموصل: ١٩٩٢) بەرگێ ٤، بەرپەرێن ٣١-٥٤.

١٦. ابي طالب خان. رحلة ابي طالب خان الى العراق واوربا سنة ١٧٩٩، وەرگێرانا مصطفى جواد، (بغداد: ١٩٦٩)، بەرپەرێن ٤٠٠-٤٠١)؛ ئامێدی. امارة بادينان، بپ ١٠٨.

١٧. رحلة الى العراق ١٧٩٤-١٧٩٦، وەرگێرانا يوسف حبي، (بەغدا: ١٩٨٨)، بث ٥٣، لێ ئەنوەر مایي دبێژیت کو مراد خان پاشایێ دووێ کەسەکێ مێرخاس و مەرد و د ئایینی دا شارەزا و دیندار بوویە و خەلکێ بەهدینان ئەو گەلەك ڤیایە. بنێرە: الاكراد في بهدينان، چاپا دووێ، (دهۆك: ١٩٩٩)، بەرپەرێن ١٤٣-١٤٤).

١٨. ئامێدی. امارة بادينان، بەرپەرێن ١٢٠-١٢١.

١٩. مەسەلا گەهشتنا رەهێن میرێن بەهدینان بۆ خەلیفەیێن عەباسي تشتەکێ نەدروستە و وەسا دیارە ژی میرێن بەهدینان پرۆپاگەندا وێ چەندێ بۆ خۆ کرینە پشتي پشتراست بووین کو خەلکێ بەهدینان ب تایبەتی و کورد ب گشتی گەلەك حەز ژ (ال البيت) دکەن، داکو حوکمێ خۆ ب هێزتر و موکمتر لێ بکەن و خەلك بەردەوام گوهداریيا وان بکەت پرۆپاگەندا وێ چەندێ دکرن کو دگەهنە خەلیفێن عەباسی. بنێرە: ئامێدی. امارة بادينان، بەرپەرێن ٢٩-٣١.

٢٠. میرلا کالیتي. المدن الکوردیة من خلال زوارها الاوربیین، وەرگێرانا هەوراز سوار، کۆڤارا مەتین، هژمارە ١٠٦، (دهۆك: ٢٠٠٠)؛ ١٢٠/١-١٢١.

٢١. محەمەد پاشایێ رەواندزێ (میرێ کۆرە)؛ محەمەد کورێ مستەفا بەگێ رواندزیە، ل دۆرێن سالا (١٧٨٨)آ ل رەواندز ژ دایك بوویە و هەر ل وێرێ پێگەهشتییە و خواندییە، ئشتي تمامکرنا خواندنا خۆ ژێ، ل سالا (١٨١٣)آ بوویە میرێ میرگەها سۆران، ل سالا (١٨٣٧)ێ مریە. بۆ زانیاریێن زێدەتر بنێرە: جمال نبز. الامیر الکوردي محمد الرواندزي الملقب ب (میرى کۆرە)، (ڤیەننا: ١٩٨٨)، بپ بپ ٣١-١٥٤.

٢٢. رحلة فریزر الی بغداد في ١٨٣٤، وەرگێرانا جعفر الخیاط، (بەغدا: ١٩٦٤)، بث ١٥.

٢٣. فریزر، رحلة، بپ ١٥.

٢٤. فریزر، رحلة، بپ ٢٢.

٢٥. فریزر، رحلة، بپ ٢٢.

٢٦. رحلة ریچ، بپ ١٠٧.

٢٧. کالیتي. المدن الکوردیة؛ ١٢١/١.

٢٨. رحلة ریچ، بپ ١٠٧.

٢٩. رحلة ریچ، بپ ١٠٨.

٣٠. العراق في القرن السابع عشر، وەرگێرانا: بەشیر فرەنسیس و طورطیس عەواد، (بەغدا: ١٩٤٤)، بپ ١١٨.

٣١. رحلة ریچ، بپ بپ ١٠٦-١٠٧.

٣٢. رحلة ریچ، بپ ١٠٧.

٣٣. رحلة فریزر، بپ ١٥.

٣٤. ژ العباسی هاتییە ڤەگوهاستن، امارة بهدینان، بپ ١٢١.

٣٥. رحلة ریچ، بپ ١٠٧.

٣٦. رحلة ریچ، بپ ١٠٨.

٣٧. رحلة ریچ، بپ ١٠٧-١٠٨.

٣٨. هنري بندیە. رحلة الی کوردستان في بلاد مابین النهرین، وەرگێرانا یوسف حبي، (اربیل: ٢٠٠١)، بپ ٣٣.

٣٩. دبلیو. اي ویگرام و ادگار. تي. اي. ویگرام، مهد البشریة في شرق کردستان، وەرگێرانا جرجیس فتح اللة، چاپا ٣، (اربیل: ٢٠٠١)، بپ ٢٦٦.

٤٠. رحلة الی کوردستان، بپ ٢٤.

٤١. العراق في القرن السابع عشر، بپ بپ ١١٧-١١٨.

٤٢. الموصل، بپ ٦٣؛ کالیتي، المدن الکوردیة: ١١٩/١.

٤٣. رحلة فریزر، بپ ١٥.

٤٤. ئەو ژێ: دەرگەهێن مووسل و زێبار و سەرایا کەڤنن، بۆ زانیاریێن زێدەتر بنێرە: وصفي حسن ردێنی (من اثار مدینة العمادیة)، کۆڤارا الحکم الذاتی، سالا هەشتێ، هژمارە ٤، (اربیل: ١٩٨٤)، بپ بپ ١٣-١٤.

٤٥. رحلة الی کوردستان، بپ بپ ٣٣-٣٧.

٤٦. رحلة الی کوردستان، بپ بپ ٣٢-٣٣.

٤٧. رحلة الی کوردستان، بپ ٣٤.

٤٨. بندیە، رحلة الی کوردستان، بپ ٣٥.

٤٩. مهد البشریة، بپ ٢٧٦.

٥٠. مهد البشریة، بپ ٢٦٦.

٥١. مهد البشریة، بپ ٢٧٦.

٥٢. كرنيلوس ڤان ديك الاميركاني، كتاب المرأة الوضية في الكرة الارضية، چاپا ٣، (بەيرۆت: ١٨٨٦)، بپ ١٠٢.
٥٣. بۆ زانیاریێن زێدەتر، بنێرە: العباسي. امارة بهدينان. بث بث ١٣٦-١٩٥؛ ئامێدی. امارة بهدينان، بپ بپ ٢٠٨-٢٢٦.
٥٤. بلەج شيركو. القضية الكردية ماضي الكرد وحاضرهم. (بەيرۆت: ١٩٨٦)، بپ ٣٨.
٥٥. فريزر، رحلة فريزر، بپ ١٤؛ بنديه. رحلة الى كردستان، بپ بپ ٣٢، ٣٧.
٥٦. تافرنيه. العراق في القرن السابع عشر، بث ١١٧؛ كاليتي. المدن الكوردية: ١٢٠/١.
٥٧. ريج. رحلة ريج، بپ ٧٣؛ سالمێ جاسم. كارل ماي (د ناڤ كوردستانا هۆڤ را) راستي و فانتازی، كۆڤارا هاڤيبون، هژماره (١١)، (دهۆك: ٢٠٠٢)، پشكا سیێ، بپ ١٤٢، بۆ زانین، كارل ماى سەرەدانا كوردستانێ نەكريە، بەلكی بۆ زانیاریێن خۆ پشتا خۆ ب یێن دی گەرم كریە.
٥٨. نيبور، رحلة نيبور، بث ٧٦؛ بنديه. رحلة الى كردستان، بپ بپ ٣٢،٣٧.
٥٩. الموصل، بپ ٦٣.
٦٠. مهد البشرية، بث ٢٧٢.
٦١. كاليتي. المدن الكوردية: ١١٩/١-١٢٠.
٦٢. رحلة الى كردستان، بپ بپ ٣٤-٣٥.
٦٣. رحلة نيبۆر، بپ ٧٦.
٦٤. العراق في القرن السابع عشر، بپ ١١٨.
٦٥. كاليتي. المدن الكوردية: ١١٩/١.
٦٦. رحلة الى كردستان، بپ ٣٥.
٦٧. جاسم. كارل ماي، بپ ١٤٢.
٦٨. العراق في القرن السابع عشر، بپ ١١٨.
٦٩. رحلة فريزر، بپ ١٤.
٧٠. كاليتي. المدن الكوردية: ١١٩/١.
٧١. كاليتي. المدن الكوردية: ١٢١/١.
٧٢. كاليتي. المدن الكوردية: ١١٩/١.
٧٣. كاليتي. المدن الكوردية: ١٢١/١.
٧٤. البحث عن نينوى، وەرگێرانا ميخائيل عبدالله، (سويد: ١٩٩٤)، بپ ٢٠.
٧٥. بنديه. رحلة الى كردستان، بپ ٣٢، الاميركاني. كتاب المرأة الوضية، بپ ١٠٢.
٧٦. بنديه. رحلة الى كردستان، بپ ٣٤.
٧٧. بنديه. رحلة الى كردستان، بپ بپ ٣٢،٣٤.
٧٨. رحلة ريج، بپ بپ ١٠٨-١٠٩.
٧٩. كاليتي. المدن الكوردية، ١٢٠/١.
٨٠. رحلة ريج، بپ ١٠٦.
٨١. رحلة الى كردستان، بپ ٣٤.
٨٠. رحلة الى كردستان، بپ بپ ٣٤-٣٥.
٨٣. ژ العباسي هاتيیە ڤەگوهاستن، امارة بهدينان، بپ ١٢١؛ العباسيون بعد احتلال بغداد (٦٥٦ە-١٤٠٩ م/١٢٥٨ ە-١٩٨٩ م؟؟؟؟)، (بەغدا: ١٩٩٠) بپ ١٢٥.
٨٤. ژ العباسي هاتيیە ڤەگوهاستن، امارة بهدينان، بث ١٢١؛ العباسيون، بپ ١٢٥.
٨٥. رحلة ريج، بث ١٠٨.

# باژێرێ ئاكرێ ل سەردەمێ ئوسمانی د نڤیسینێن دیرۆكنڤیسێ مووسلی یاسین كورێ خەیروللا ئەلعومەری دا

**د. غەسان وەلید ئەلجەوادی**
**زانكۆیا زاخۆ-كۆلیژا زانستێن مرۆڤایەتی**
**وەرگێران: موسەدەق تۆڤی**

## كورتی

ئاكرێ دهێتە هژمارتن یەك ژ گرنگترین باژێرێن میرگەها بەهدینان ل سەردەمێ ئوسمانی، بەلێ سەرەرای ڤێ گرنگیێ ل سەر ئاستێ خواندن و ڤەكولینێن زانستی هند گرنگی پێ نەهاتییەدان، دیرۆكنڤیسێ مووسلی یاسین كورێ خەیروللایێ ئەلعومەری هەتا ئاستەكێ باش گرنگی ب ڤی باژێری دایە و د نڤیسینێن خۆدا ئاماژە ب پشكداریا ئاكرێ د رووداینێن میرگەهێ و گرنگیا وێ یا بازرگانی و دەركەتنا چەندین زانایێن ناڤدار ژ ڤی باژێری كرییە، پشتكەرم ب هندەك پەرتووك و نڤیسینێن ئەلعومەری ئەوێن تێدا زانیاریێن بهادار دەربارەی ئاكرێ هاتینە توومارکرن ئەڤ ڤەكولینە هاتییەنڤیسن، ئەو ژی ب وێ مەرەمێ دا رۆلێ باژێری د وێ قوناغێدا بێتەبەرچاڤكرن، هەروەسان ئارمانج ژ ڤەكولینێ ئەوە هاندانا ڤەكولەران بكەت ب رەنگەكێ بەرفرەهتر ب مفاوەرگرتن ژ ژێدەرێن دیتر ژ وانا ژی ئەرشیفێ ئوسمانیێ دەولەمەند ڤەكولینا دیرۆكا باژێری بكەن داكو باژێر ب رەنگەكێ بەرفرەهتر و بەربەلاڤتر بێتەنیاسین و ئەو ڤالاهیێن پەیوەندی ب دیرۆكا دێرینا ڤی باژێریڤە هەین بێنەپڕكرن.

## پێشەكی

ژبەر نەبوونا زانیاری و نڤیسینێن توومارکری ل سەر دەسپێكا دامەزراندنا میرگەها بەهدینان بۆچوون دەربارەی دەسپێكا دامەزراندنا وێ گەلەكن[1]، یەك ژ ڤان بۆچوونان بۆ هندێ دچیت كو میرگەهـ ل دەوروبەرێ ١٣٠٠ز هاتییەدامەزراندن و د سەدسالییا یەكەم ژ دەستەلاتێ خۆ كەلا ئامێدیێ و دەوروبەرێن وێ ب خۆڤە دگرتن و پاشتر بەرفرەهبوویە و دەست ب سەر كەلایێن دەوروبەرێن خۆدا گرتیە[2]، پاشتر میر حەسەن كورێ سەیفەدینێ (١٤٦٥- ١٥٣٣)زێ

شیایە ل دورێن سالا (١٤٧٠ز)ێ دەڤەرا زاخۆ و دهۆك و ئاکرێ ژی بدەتە دگەل میرگەها خۆ[٣]. دامەزراندنا ڤێ میرگەهێ قەبخواستنەك بوو بۆ وێ ئالۆزی و ئاژاوەیێ ئەوا ژ ئەنجامێ نەبوونا دەستەلاتداریەکا مەلبەندی کو بەر سنگێ هێزێن دەرڤە و ژ وان ژی عەشیرەتێن ئاق قوینلو ئەوێن نەشیاین تەناهیێ ل دەڤەرێ بنەجهبکەن بگریت[٤]. میرگەها ئامێدیێ سنوورەکێ دیارکری نەبوو، ئەڤە ژی ئەنجامێ کاودانێن سیاسی و لەشکەریێ دەڤەرێ بوو، بەلێ ئەم دکارین بێژین میرگەهێ دەڤەرێن دکەڤنە ناڤبەرا رووبارێ دیجلەی ل رۆژئاڤای و زێیێ مەزن ل رۆژهەلاتی و سنوورێ نهایێ ترکیا و عیراقێ ل باکوور و چیایێ مەقلوبی ل ژێری ب خۆڤە دگرتن و هەر ژ دامەزراندنا وێ هەتا سالا (١٨٤٢ز)ێ پایتەختێ وێ باژێرێ ئامێدیێ بوو[٥]. ئەڤ میرگەهە ب پێکهاتا خۆیا لەشکەری و کارگێری ب هێزترین دەستەلاتێ سیاسیێ دەڤەرێ بەلێ دهاتەهژمارتن پشتی ویلایەتا بەغدا ل ژێری[٦]. سەرەرای ڤێ جهێ گرنگێ میرگەهێ گرتی، ئەم نابینین زانایێن کوردان ئەوێن هەڤچەرخێن بۆیەران ئەو گرنگیە ب تۆمارکرنا ڤێ دیرۆکێ کریت، ئەڤە ژی ئەنجامێ مژوولبوونا وان بوو ب دەلیڤێن دی یێن زانستی وەك ئەدەبیات و شیعر و زانستێن ئایینی، ژ بەر ڤێ چەندێ ژی چەندین خەلەکێن بەرزە د دیرۆکا ڤێ میرگەهێدا هەنە و کارەکێ دژوارە ڤان بۆیەران ب هەڤرا گرێدەین[٧]. وەسان دیارە ئەو زانیارێن دەربارەی میرگەهێ و باژێرێن وێ گەهشتینە مە ئەون ئەوێن د نڤیسینێن دیرۆکنڤیسێ مووسلی یاسین خەیروللایێ ئەلعومەری (١٧٤٥-١٨٢٥)ێ و دیتنێن هندەك گەرۆکێن رۆژئاڤا دا هاتین ئەوێن سەرەدانا ڤێ میرگەهێ کرین، هندەك ژی ئەون یێن د بەلگەنامەیێن ئوسمانی یێن پێگۆتی ب دەولەمەندیا خۆ دا هاتین، ئەڤ زانیاریە ڤەکۆلەری پشتگەرم و دەولەمەند دکەن ب زانیاریان و ڤالاهیێن مەزن ژ ڤێ دیرۆکێ پردکەنەڤە. لەوما پشتگەرم ب ئەو زانیارێن د چەندین نڤیسینێن یاسین خەیروللا ئەلعومەری دا هاتین ئەم ژی د ڤێ ڤەکۆلینێدا دێ ئاماژە ب چەند رووودانەکێن باژێرێ ئاکرێ کەین و د چوارچووڤێ ڤەکۆلینێدا دێ وێنەیەکی ژ سەروبەرێ سیاسی، هزری، ئابووری و جڤاکیێ باژێرێ ئاکرێ بەرچاڤکەین و د هەمان دەمدا دێ مفای ژ هندەك ژێدەرێن دی وەرگرین بۆ پتر رۆهنکرنا سەروبەرێ ئاماژە پێکری.

## یەك: یاسین کورێ خەیروللا ئەلخەتیب ئەلعومەری

ل سالا ١٧٤٥ێ ل باژێرێ مووسلێ هاتیەسەردنیایێ، هندەك بەلگە ئاماژە ب هندێ دکەن کو ل سالا ١٨٢٠ێ وەغەرا داویێ کریە، ئانکو ل سەردەمێ مالباتا جەلیلی ئەوێن د ناڤبەرا (١٧٢٦-١٨٣٦)ێ دەستەلاتداری ل مووسلێ کری ژیایە[٨]، ئەو ب خۆ ژی ژ مالباتەکا ناڤدارە ب زانست و ئەدەبیات و چەندین زانا ژێ رابووینە و پشکداریەکا بەرفرەهـ د بزاڤا زانستیدا کریە و بەرهەمێن ل پاش خۆ هێلاین نیشانا رۆلێ وانێ ئاماژەپێکریە[٩].

والیێن مالباتا جەلیلی گرنگیەکا بەرچاڤددا بزاڤا زانستی ب تایبەت نڤیسینا دیرۆکێ، شێوازێ نڤیسینا دیرۆکێ ل سەردەمێ جەلیلیان ب وێ چەندێ هاتیەنیاسین کو شێوازەکی هەمەرەنگ و هەمە رێباز بوو، نڤیسینا دیرۆکێ جهێ پویتەپێدانا رەوشەنبیرێن وی سەردەمی بوو و والیێن جەلیلی ژی گرنگی ب ناڤتێدا نڤیسینا بەرهەمێن دیرۆکی ددا دا د وێ رێکێ را دەستەلاتێ خۆیێ خۆجهی پتر بنەجهبکەن و روویەکێ شەرعیتر بدەنێ[١٠]. د ڤی سەروبەریدا ئەلعومەری ب نڤیسینا هەڤدە پەرتووکێن دیرۆکی خزمەتا عیراقێ کریە، ب ڤێ چەندێ ژی یەکەمین دیرۆکنڤیسێ عیراقێ یە یێ ب بەرهەمێن خۆ ل سەدسالیا هەژدێ و گرنگا ئێکێ ژ سەدسالیا نۆزدێ دیرۆکا عیراقێ دەولەمەند کری، ئەو ژی ب رێکا ڤەگێرانا رووودانێن بچووك مەزن، زێدەباری پاراستنا ب سەدان ژیاننامەیان[١١].

ئەلعومەری د نڤیسینێن خۆدا یێ پشتگەرم بوو ب ئەو ژێدەرێن دیرۆکیێن بەری سەردەمێ وی یێن ل بەردەستێ وی هەین، هندیکە روودانێن سەردەمێ وی بووینە ئەو ب خۆ دیدەڤان بوویە ل سەر روودانێن مووسلێ[12] و ب وێ چەندێ یێ ناڤداربوویە کو یێ ئاگادار بوو ل سەر روودانێن دەرڤە ب رەنگەکێ گشتی ئەوێن پەیوەندی ب دەولەتا ئوسمانی ڤە هەین[13]. هەرچەندە ئەو ژ باژێرێ مووسلێ دەرنەکتییە. ئەو ب خۆ ژی ئاماژە ب ڤێ چەندێ دکەت دەمێ دبێژیت: «ب چ گەشتان ئەز ژ باژێرێ خۆ دەرنەکەتیمە و چ جاران ب دووراتییا فەرسەخەکی ئەز ژ شوورها وی دوورنەکەتیمە، ئەڤە د سەردەمێ گەنجێتییێدا بوو، گەلۆ نها دێ چاوان بیت کو من ئەو هێزە نەمایە و نە ئەو شیان و نە ئەو پێچێبوونە«[14]. ژبەر ڤێ چەندێ بوویە د ڤەگێرانێن خۆدا بۆ رووداوان پشتگەرمێ وا ن ڤەگێرانان بوویە یێن ژ رێڤینگ و بازرگانان دبهیستن یان ئەو زانیارێن ژ نڤیسار و نامەیاندا دەستخۆڤە دئینان[15]. ئەلعومەری د یەك ژ ڤوناغێن ژیانا خۆدا د خزمەتا والیێ مووسلێ سەعدوللا بەگ کورێ حسێن پاشا (1745-1812)یێ جەلیلی دا کارکرییە، وەسان دیارە ئەلعومەری ب نڤیسینا پەرتووکێن دیرۆکێ و پێداگۆتنێ (المدح) ژێدەرێ ژیارا خۆ دابیندکر، پاشتر ئەڤ پەرتووکە د کرنە دیاری بۆ میر و ماقویل و مەزنە فەرمانبەر و قازی و پشکێنەران، ئەو ژی ب مەرەما وەرگرتنا پاداشتەکی، هەرچاوان بیت ئەلعومەری دهێتە هژمارتن دیرۆکنڤیسێ دەربارێ جەلیلیان[16]. ژبەرکو ئەلعومەری دیرۆکنڤیسێ دەستەلاتداریا جەلیلیان بوو لەوما ژی مفا ژ ڤێ چەندێ وەرگرتییە و بەرێ رەخنە و تانەلێدان و ترانەپێکرنێن خۆ دایە وان ئالییان ئەوێن ناکوکی و هەڤرکی دگەل جەلیلیان هەین، ب تایبەت میرگەها بەهدینان و هندەك هێزێن کوردی[17].

هەرچەندە ناکوکیێن میرگەها بەهدینان دگەل دەستەلاتداریا جەلیلی ب بەراورد دگەل ناکوکیێن وێ دەستەلاتداریێ دگەل ئالیێن دی وەك عەشیرەتێن عەرەبی و ئێزدی کێمتربوون[18]. بەلێ ئەلعومەری ئەڤ ناکوکییە بۆ مەرەما تانەلێدان و ترانەپێکرنێ بۆ خۆ وەك دەلیڤە دیتین ئەڤە ژی نە تنێ بەرامبەری میرێن ئامێدیێ بەلکی بەرامبەری خەلکێ باژێرێن سەر ب میرگەهێڤە هەموو ئەڤە ژی ب مەرەما خۆ نێزیککرنێ بوو ژ مالباتا جەلیلیان[19]. نموونە ژبۆ ڤێ چەندێ هەروەك ئەلعومەری د روودانێن سالا 1740ێ ڤەدگوهێزیت:» دووراتی کەتە ناڤبەرا وەزیر حاجی حسێن پاشایێ جەلیلی[20] و بەهرام پاشای[21] والیێ ئامێدیێ، حاجی حسێن پاشایێ جەلیلی ب لەشکەرەکیڤە ژ مووسلێ دەرکەت، گوندێن دوبانێ و ناڤکورێ تالانکرن و ئامێدیێ دووربێچدا، بەهرام پاشا ل سەر دانا پارەی دگەل وی پێکهات و ئەو زڤریڤە مووسلێ، د وی دەمیدا کەس ژ خەلکێ ئاکرێ نەهاتبوو مووسلێ، مەها رەمەزانێ ل بەر وان بەرزەبوو و ل شەعبانێ ب رۆژی بوون، دەمێ پێکهاتنا ئاماژەپێکری هاتییەکرن حسێن پاشای یەك ژ میرێن خۆ دگەل نڤیسارا پێکهاتنێ هنارتە ئاکرێ، رۆژا ئێکێ ژ رەمەزانێ گەهشتە وێرێ دیت خەلکێ ئاکرێ د خەملاندینە، پرسیار ژ وی خەلکی کر گۆتنێ ئەڤرۆ جەژنا رەمەزانێ یە، وی کرە کەنی و گۆت ئەڤرۆ یەکەم رۆژا رەمەزانێ یە و نڤیسار دا دەست میرێ وان دەمێ ڤەکری دیت مێژووا 29 شەعبانێ ل سەر هاتییەنڤیسین، بەلێ وان باوەرنەکر ئەو بوو کەسەك هنارتە مووسلێ و دووڤچوونا بابەتی کر، دەمێ زڤرییەڤە راستییا بەبەتی بۆ وان گۆت وان ژی سەرژنوو رۆژیێن خۆ گرتنەڤە و ب ڤی رەنگی دو هەیڤان ب رۆژی بوون، ژبەر ڤێ چەندێ ژی شاعرێ مووسلی مەلا قاسم ئەلرامی (هەجووا) وان کرییە«[22].

دیارە ئەلعومەری زێدەرۆییێ د ترانە ب کوردان کرنێ تانەلێدانا وان کرییە، ئەو چیرۆك هەروەك مە ڤەگێرای ل سەر کوردان ناگونجیت ژبەرکو ئەم دزانین ژ باشتر تیتالێن کوردان پێگیرییە ب ئایینی و ئەداکرنا رێورەسمێن ئایینی و گەلەك کێم دێ ئێکی

ژ وان بینی نڤێژان ناکەت و مەها رەمەزانێ پیرۆزییەکا مەزن ل جەم وان هەیە[٢٣]. دوورناهێتەدیتن خەلکێ باژێری د دەسنیشانکرنا سەرێ رەمەزانێ دا ب رۆژەکێ یان دووان خەلەت بن، بەلێ خەلەتبوون ب هەیڤەکێ ئەڤە ب ئێکجاری ناهێتەباوەرکرن، ب تایبەت ژی کو موسلمان ب رەنگەکێ گشتی ب مەرەما ئەداکرنا ڤی فەرزێ ئایینی د دەمێ خۆدا زێرەڤانییا دەرکەتنا هەیڤێ دکەن.

ئەڤە وێ چەندێ دیارناکەت کو ئەلعومەری د نڤیسینێن خۆدا هەر نووچەیەکێ میرگەها بەهدینان ڤەگوهاستبیت ب ڤی رەنگی سەرەدەری دگەلدا کرییە، بەلکی چاکییا وی ل بەرچاڤە د ڤەگوهاستنا زانیاریان ل سەر چەندین رووداناں کو گرنگییا خۆ بۆ دیرۆکا کوردستانێ هەیە و چ دیرۆکنڤیسەکێ دی یێ عیراقی ئاماژە ب وان زانیاریان نەکرییە، ژ وانا داگیرکرنا میسرێ ژ ئالیێ فرەنساڤە ل سالا ١٧٩٨ێ د ڤی واریدا ئاماژێ ب پشکدارییا کوردان د جیهادێدا و بەرخۆدانێ دگەل براییێن خۆ موسلمانێن میسری بەرامبەری هێرشا فرەنسییان دکەت، هەروەسان د رووداناێن سالا ١٨٠١ێ ڤەدگێریت،» د وێ سالێدا ئێك ژ ئەهلێ جیهادێ ب ناڤێ پیر رەجەب کورێ حسێنێ زێباری کوردێ ئاکرێ ژ میسرێ هاتە مووسلێ وەك وی ڤەگێرای د خەونا خۆدا پێغەمبەرێ خودێ (س) دیتبوو فەرمانا دایێ جیهادێ بکەت و مزگینیا دایێ ئەگەر ئەو گەهشتە میسرێ ب سێ رۆژان دێ دووریێچ رابیت، وەسان بوو وەك پێغەمبەری مزگینی دایێ، ئەو دگەل بیست زەلامێن کورد بەرەف میسرێ چوون و گەهشتە سەربازگەها موسلمانان، دەمێ نووچەیێ وی گەهشتییە سەرۆکوەزیران رێز ل وی گرت و قەبارەکێ باشێ دراڤی دایێ و فەرمانەك ب چل ئاقچەیان[٢٤] ژ داهاتێ مووسلی بۆ وی نڤیسی و ب وێ فەرمانێڤە هاتەڤە مووسلی»[٢٥]. ئەڤە بێی کو زانیاریێن بەرفرەهتر دەربارەی ڤی نووچەی یێ تنێ وی ڤەگێرای بەرچاڤ کەت وەك رێکا چوونا وان بۆ میسری و دەمێ ڤەمانا وان ل وێرێ و باژێرێن وان دیتین و زانیاریێن دیتر، بەلێ گرنگ ئەوە کو کورد ب خۆ نە د دووربوونە ژ رووداناێن ل جیهانا ئیسلامی رووددان، هەروەسان ئەلعومەری دووڤچوونا نووچەیێن گرنگییا خۆ هەی دکر و د پەرتووکێن خۆدا تووماردکرن.

## دو: ئاکرێ

ل سەردەمێ میرگەها بەهدینان باژێرەك و کەلایەکا سەر ب ئامێدیێ ڤە بوو و ژ گرنگترین دەڤەرێن وێ بوو[٢٦]، ئەلحەمەوی د پەسنا وێ دا دبێژیت:(کەلایەکا ئاسێیە ل چیایێن مووسلێ، خەلکێ وێ کوردن، دکەڤیتە رۆژهەلاتێ مووسلێ ب (عقر الحمیدیە) ئاکرێ یا حەمیدییان دهێتەنیاسین، خەلکەك ژ هەلگرێن زانستان ژێ رابووینە)[٢٧]. هەروەسان کەلا ئاکرێ دکەڤیتە هنداڤ باژێری و ل بنێ وێ ب سەدان خانی هاتینەئاڤاکرن و شێوازەکێ ئاڤاکرنێ یێ دەگمەنە و ئەو ب خۆ یا چوارگوشەیە درێژییا هەر ئالییەکێ وێ ١٠٠م[٢٨] سروشتێ عەردێ چیایی و رەنگ چیایی ل کوردستانێ باندۆرا خۆ کرییە سەر بەلاڤبوونا باژێران و تیراتییا هژمارا خەلکێ وان، وەك باژێرێن دی یێن کوردستانێ ئاکرێ ژی ب بچووکییا خۆ و هژمارا کێما خەلکێ خۆ هاتییە نیاسین، ئەڤە ژی ئەگەرێ هندێ بوو داهاتێ باژێری تێرا وی بکەت و پێدڤی ب پایتەختی نەبن[٢٩] هەروەسان ئاکرێ و گوندێن وێ وەقفا مزگەفتا مەزنا ب ناڤێ (النوری) یا مووسلێ بوو ئەو مزگەفتا نورەدینێ زەنگی ل سالا ١١٨٢ێ ئاڤا کری[٣٠]، کەلا شوشێ ئەوا ب بلنداهییا خۆ ناڤدار لێ گرنگییا وێ ژ یا کەلا ئاکرێ کێمتر بوو ژ دەڤەرێن سەر ب ئاکرێ ڤە بوو[٣١]. هندی پەیوەندی ب خەلکێ وێ ڤە هەی ب هندێ هاتبوو نیاسین کو فرەئایینە، موسلمان و مەسیحی و جوهی لێ دژیان[٣٢]. زانیاریێن هوور ل سەر هژمارا خەلکێ وێ ل سەردەمێ ئوسمانی نینن، بەلێ دشیاندایە ئاماژە ب وان زانیاریان بکەین یێن د سالناما ئوسمانی یا سالا ١٨٩٤ێ بکەین کو خەلکێ وێ ب نێزیکی ٧١٨٩کەسان تەخمینکرینە[٣٣].

بۆچوون ل دۆر ناڤكرنا وێ ژ هەڤجودانە، ناڤێ وێ ل جەم گەرۆك و جوگرافیناسێن عەرەب ب (عقرە) هاتیە، د ژێدەرێن دیرۆكا ئیسلامیدا ب (عقرە الحمیدیە) هاتیە ناڤكرن ئەڤە ژی پالدایە بۆ عەشیرەتا حەمیدی ئەوا ل وێ دەڤەرێ دژیا، ئەو ب خۆ ناڤێ بەربەلاڤ ل جەم كوردان (ئاكرێ)یە، كو ژ پەیڤا ئاگر هاتیە و ئەو ژی نیشانا پاقژی و ئەڤین و خێرێیە[٣٤]. دیارە ئەڤ ناڤە پتر نێزیكی راستیێ یە.

## سێ: رووداتێن سیاسێ

ئەلعومەری د نڤیسینێن خۆدا ئاماژە ب هندەك بۆیەران كریە یێن ل میرگەها بەهدینان رووداین و بازێرێ ئاكرێ ژبەر پشكداریا حوكمدار و كەسایەتیێن وێ پشكا خۆ د بۆیەراندا هەبوویە، بەلێ ل پێشیی دڤێت ئاماژە ب وێ چەندێ بكەین كو میراتگریا حوكمداریا میراتگری (الوراثة) رولێ خۆ د وێ چەندێدا هەبوویە كو میرێن ئامێدیێ پشتگەرمێن برا و كورێن خۆ بن د رێڤەبرنا بازێر و كەلایێن سەر ب میرگەهێ ڤە، وان ژی ئەوا ل سەر ملێن وان ژ كاروبارێن لەشكەری و كارگێری ئەدا دكر، ژ ئالیێ دووڤە ڤان حوكمداران دەستەلاتداری ل گوند و عەشیرەتان دكر ژبەركو وان نوونەراتیا یەكێتیا میرگەهێ و شەرعیەتا وێ د دەستەلاتداریا وەلاتیدا دكر[٣٥].

میری ل كەلا ئاكرێ دەست ب كارێ خۆ دكر و مالا حوكمداری ژی هەر ل وێرێ بوو، ژبەر گرنگیا جهێ وێ یێ ئاسێ و كونترۆلا وێ ل سەر دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە ئەڤ كەلایە هەردەم جهێ گرنگی و پویتەپێكرنا میرێن ئامێدیێ بوو، ژ وانا ژی سولتان حسێن وەلی (١٥٣٣- ١٥٧٣) كو وەك مەلبەندەكێ كارگێری و بەرگریێ ژ میرگەها خۆ سەرەدەری دگەلدا دكر و ئەوا پێدڤی دبیتێ ژ خزمەتگوزاریان ب تایبەت ئاڤێ بۆ دابیندكر[٣٦]. بەلێ ئەلعومەری د پەرتووكێن خۆدا ئاماژە ب ناڤێن حوكمدارێن ئاكرێ نەكریە، تنێ ناڤێ هندەكان ئینایە، ژبەر هندێ یا ب زەحمەتە ناڤێن هەموویان و سالێن حوكمداریا وان بێنە زانین، بەلێ دكتور عیماد عەبدولسەلام رەئوف شیایە ناڤێن هندەكان ژ وان تووماربكەت:

١- میر حەسەن كورێ سەیفەدین ١٠١٥ز
٢- قاسم (هاشم)
٣- سلێمان بەگ كورێ میر حەسەنی
٤- مرادخان
٥- سەیدخان
٦- عوسمان خان كورێ یوسف خان ١٥٨٥
٧- حوكمدارێن نەهاتینەنیاسین.
٨- بایرام بەگ كورێ سولتان بەدرەدینی
٩- فەتحوللا بەگ
١٠- لوتفوللا بەگ، صەیفور بەگ، حاجی خان، عەلی بەگ ١٧٨٧
١١- قوباد بەگ ١٧٨٨- ١٧٨٩
١٢- موراد بەگ كورێ ئیسماعیلی ١٧٨٩- ١٧٩٠
١٣- قوباد بەگ (بۆجارا دووێ)١٧٩٠
١٤- موراد بەگ (بۆجارا دووێ) ١٧٩٠
١٥- محەمەد تەیار پاشا ١٧٩٨
١٦- قوباد پاشا ١٨٠٠- ١٨٠٣
١٧- حوكمدارێن نەهاتینەنیاسین
١٨- ئیسماعیل بەگ كورێ محەمەد تەیار پاشای ١٨٢٢
١٩- سلێمان پاشا ١٨٢٢- ١٨٣٤[٣٧].

ژ گرنگترین رووداتێن ل میرگەها بەهدینان رووداین ب تایبەت پشتی مرنا بەهرام پاشایێ مەزن ل سالا ١٧٦٨ێ هلبوونا ناكوكیێ بوو د ناڤبەرا ئیسماعیل پاشایێ حوكمداری گرتیە دەست و یەك ژ پسمامێن وی كو بەیرەم بەگ كورێ سولتان بەدرەدینی ئەوێ چوویە ئاكرێ و كندیرێ و كونترۆلكری، ئەوبوو ئالیگرێن وی ل دور كۆمبوون و كەتنە شەرێ لەشكەرێ میرگەهێ یێ شیای سەركەتنێ سەر

وان دەستڤەبینیت و ژ ئاكرێ دەرێخیت[38].

پشتی قوناغەكا تەناهیێ ل سالا ١٧٨٧ێ زنجیرەكا دی یا ناكوكیان د ناڤبەرا ئیسماعیل پاشای و برایێن وی لوتفوللا بەگ و صەیفور بەگی ئەوێن دەست ب سەر باژێرێ ئاكرێ دا گرتی روودان، ئیسماعیل پاشا ناچاركر كەلا ئاكرێ دووربێچدەت و هندەك مالێن وێ ژی تالانكرن، بەلێ پرانیا جاران ناكوكی ب پێكهاتنێ ب داوی دهات ئەو ژی پشتی كو نەشیای وان ژ كەلایێ دەرێخیت دا رازی بیت ل سەر دەستەلاتداریا وان و حوكمداریا وان ل سەر ئاكرێ چەسپینیت[39]. هندە جاران ئیسماعیل پاشای هاریكاری ژ هندەك برایێن خۆ دخواست دژی یێن دی[40]. وەك وێ جارێ كو داخوازا هاریكاریێ ژ برایێ خۆ قوباد بەگی كری و وەك حوكمداریێ ئاكرێ دامەزراندی پشتی كو برایێ خۆیێ دیتر ژێ دەرێخستی، بەلێ ئیسماعیل پاشا پەیمانا خۆ دگەل برایێ خۆ تێكداڤە و دگەل وی كەتە د شەریدا[41].

عەشیرەتێن زێباری ئەڤ ناكوكیێن ناڤبەرا میرێن مالباتا حوكمدار بۆ خۆ ب دەلیڤە دیتن مایێ خۆ د كاروبارێن میرگەهێدا بكەن و پشتا ڤی ئالیێ ناكوكیێ دژی یێ دی بگرن[42]. هەروەسان ئەڤ ناكوكییە دەلیڤەبوون بۆ والیێن بەغدا داكو پشتەڤانییێ ل وی ئالی بكەن یێ پەنایێ دبەتە بەر وان دژی ئالیێ دی و هەرتشتەكێ پێدڤی دبنێ بدەنێ بۆ بەردوامیدان ب شەری[43]. پشتی مرنا ئیسماعیل پاشای ل سالا ١٧٩٨ێ ناكوكیێ د ناڤبەرا مالباتێدا دەسپێكرەڤە، ئیسماعیل پاشای وەسیەت كربوو كورێ وی محەمەد تەیار پشتی وی دەستەلاتی بگریتەدەست، بەلێ رایەدارێن مالباتا حوكمدار مورادخان بۆ میراتییێ هەلبژارتن و باژێرێ ئاكرێ دا محەمەد تەیاری وی ژی هەموو سامانێن بابێ خۆ دگەل خۆ برنە ئاكرێ و دگەل قوباد بەگ كورێ سولتان حسێن كورێ بەهرام پاشای كۆمبوو و پێكهاتن ب هەڤرا شەرێ مورادخانی بكەن و هندەك عەشیرەتێن شێخان ژی هەڤپەیمانی دگەل وان گرێدا و شەری د ناڤبەرا هەردو ئالییان دەسپێكر، گوند هاتنە سۆتن و خەلك تووشی نەخۆشیان بوو و ژ ئەنجامێ شەری زیان گەهشتنێ[44].

باندۆرا والیێن بەغدا و شوینەدەستێن وان ب تایبەت د رێڤەبرنا هندەك دەڤەرێن بەهدینان د ڤان رووداناندا دیاردبیت، ژ وانا والیێ بەغدا سلێمان پاشای (١٧٨٠- ١٨٠٢) موراد خان وەك حوكمدارێ ئامێدیێ ژ بلی باژێرێ ئاكرێ بنەجە كر، ژبەركو ل دووڤ فەرمانا والیێ بەغدا ئاكرێ بوو مولكێ قوباد بەگی[45].

نە تنێ ئەڤە بەلكی ئاكرێ وەك باژێرێن دیێن گرنگ پشكەك بوو یان ئالییەك بوو دروودانێن دەرەكیدا (دەرڤەدا)، ژوانا ئەم دكارین ئاماژە ب كریارا دووربێچكرنا باژێرێ مووسلێ ژ ئالیێ نادر شاهێ ئیرانیڤە ل سالا ١٧٣٤ێ بكەین دەمێ هێزێن نادر شاهی گوندێن دەوروبەرێن ئاكرێ تالانكرین و ب دەهان ژ وان گوندان وێرانكرین[46].

د ڤەهینوكەكا فەتحوللا قادری دا ل دۆر ڤێ كریارێ هاتییە:

**وقام طهماز اللعين أت**
**لنحونا يبتغي للشتات**
**أجناده أرسلها في القفر**
**حتى انتهت نحو قرايا العقر** [47]

دڤێت د سەرەرا نە بۆریت كو ئەلعومەری جارنا ئاماژە ب ژیاننامەا هندەك حوكمدارێن ئاكرێ كرییە و پەسنێن هندەكا بەرچاڤكرینە وەك ڤەگێرانا وی دەربارەی فەتحوللا بەگی دەمێ دبێژیت:(كەسەكێ چاكێ خودێ پەرست بوو نە حسێبا دەرهەمان دزانی نە ژی یا دیناران)[48]. هەروەسان دەربارەی قوباد بەگی گۆتییە:(خودان داهێنان و مێرخاسی بوو و كەسەكێ رێڤەبەربوو بەلێ كاودان نە هاریكار بوون دگەل وی)[49].

هەروەسان د نڤیسینێن خۆدا ئاماژە ب ناڤێ هندەك ژ وان عەشیرەتان كرییە یێن ل ئاكرێ و دەوروبەرێن وێ دژیان ژ وانا عەشیرەتا زێباری كو پەسنا وێ وەك بهێزترین عەشیرەتا دەڤەرێ دكەت[50] و ڤێ

عەشیرەتێ گەلەك كەلا هەبوون وەك كەلا شۆشێ و ئیمرانی و بازیران و یێن دی و بەرگریا وان ژی خۆ ب خۆیی بوو چ بۆ مەزنێن مللەتی چ بۆ خەلكێ دیتر[٥١]. هەروەسان ئاماژە ب عەشیرەتێن دی كرییە وەك عەشیرەتا هەركی یا كۆچەراتی د ناڤبەرا دەشت و زۆزانان‌دا دكر و عەشیرەتا سۆرچی كو دو جوینن، كۆچەر و ئاكنجی[٥٢].

## چوار: بازرگانییا ئاکرێ دگەل مووسلێ

تێكەلییا ئاكرێ دگەل مووسلێ ب بوونا پەیوەندیێن بازرگانی د ناڤبەرا هەردو باژێراندا یا ناڤدار بوو، سەرەرای هندێ كو خەلكێ ئاكرێ كوردبوون بەلێ زۆربیا تێكەلیێ و سەرەدانێن وان بۆ مووسلێ ب مەرەمێن بازرگانی و سەرەدانێن مووسلییان بۆ ئاكرێ ژبەر خێروبێرێن وێ پرانییا خەلكێ وێ ب عەرەبی ژی دپەیڤین، هەروەكی ئەلعومەری ئاماژەپێدكەت خەلكێ مووسلێ دگۆتنە ئاكرێ (گچك اسلامبۆل) ئانكو ستەنبۆلا بچووك، ژ بەر دەولەمەندییا بەرهەمێن ئاكرێ و ئەو بەرهەمێن ژ ڤی باژێری بۆ مووسلێ دهاتنەهنارتن وەك: مازی، برنج، هری و موو، پەمبی، پیست، هنگڤین و شەربەتا وێ، گەزو بۆ مووسلێ د هنارتن، هەروەسان ئاكرێ یا ناڤدار بوو ب ماستێ خۆش و بەرهەمێن رێچالی و رەنگێن زۆر و جودا یێن فێقی، د هەمان دەمدا ئاكرێ ژی پەرۆك و بۆیاغ و جلكێن رەنگا و رەنگ ژ مووسلێ دكرین[٥٣] . نیپۆرێ گەرۆك ئاماژە ب وی برنجی كرییە یێ ل دەڤەرێن سەر ب ئاكرێ ڤە دهاتەچاندن، و ناڤدارییا ڤی رەنگی برنجی ل گەلەك دەڤەران یا بەربەلاڤبوو[٥٤]. ژبەركو مووسل پایتەختێ ئابووریێ باكوورێ عیراقێ بوو گەلەك ژ مالباتێن كوردان ل وێرێ بنەجهبوون و ل وێرێ بازرگانی دكر[٥٥].

وەسان دیارە شێوازێ بازرگانی د ناڤبەرا ئاكرێ و مووسلێ دا پێككگۆهارتن بوو، پرانییا جاران بازرگانییا وان گرێدایی وەرزی بوو، وەك وەرزێ درووینی و وەرزێ زانا پەزی، خودانێن وان بەرهەمێن خۆ ل بازارێ مووسلێ بۆ فرۆشتنێ بەرچاڤدكرن[٥٦]. بازرگانییا ئاكرێ نە تنێ دگەل مووسلێ بوو بەلكی بەرهەمێن وێ دگەهشتنە ئیرانێ و ئۆیرسی (رووسیا) ژی، ئەڤە ژی ئەنجامی چاكی و ساخلەمییا وی بەرهەمی بوو[٥٧].

ژبەر گرنگییا سەروبەرێ ئابووریێ ناڤبەرا مووسلێ و ئاكرێ هەردەم دەستەلاتدارێن مووسلێ بزاڤكرینە سەروبەر ل دەڤەرێن چیایی یێ تەنا بیت و ئازادییا بازرگانی بێتەدابینكرن و بۆ ڤێ مەرمێ و سەخمەرات بەردەوامییا بازرگانیێ دگەل دەڤەرێن كوردی پویتەكێ باش دایە رێكێن مووسلێ دگەل هەریەك ژ ئاكرێ و ئامێدیێ و دهۆكێ گرێددەت[٥٨]. هەروەسان گرنگییا ڤێ رێكێ د وێ چەندێرا بوو كو مووسل دگەل دەڤەرێن دەولەمەند ب بەرهەمێن خۆیێن هەمەرەنگ گرێددا، و هەردەمێ ئەڤ رێكە د هاتنەبرین ئەڤە بازارێن مووسلێ ژ ڤان بەرهەمێن چیایی هاتنە بێ باهركرن[٥٩]. ئەڤە و ئەلعومەری ئاماژە ب تێكچوونا پەیوەندیێن ناڤبەرا والیێ مووسلێ حسێن پاشایێ جەلیلی و میرێ ئامێدیێ بەهرام پاشای ل سالا ١٧٤٠ێ كرییە و كاریگەریا نەرێنی كرییە سەر بازرگانییا ناڤبەرا هەردو باژێران[٦٠]. هەر ب ڤی رەنگی ژی هندی پەیوەندی ب میرگەهها ئامێدیێ ڤە هەی بەردەوام میرگەهێ سەخمەرات پاراستنا گوندێن خۆ كار بۆ باشتركرنا پەیوەندیێن خۆ دگەل مووسلێ دكر و خۆ ژ لێكدان و تەڤچوونان دگەل مووسلێ دووردگرت، داكو میرگەه بكاریت مفای ژ بەرهەمێن خۆیێن ئاسنی و رەساسی وەرگریت و ڤرێكەتە مووسلێ، هەروەسان بەهرام پاشای خویك (الجزية) ددا والیێ مووسلێ دا پەیوەندیێن باش د ناڤبەرا واندا د بەردەوام بن[٦١]. هەر ب ڤی رەنگی نەئارامی و ناكوكیێن بەردەوامێن ناڤبەرا مالباتا حوكمدار ل ئامێدیێ نە د بەرژەوندییا مووسلێ دا بوون، كاریگەرییەكا نەرێنی كرە سەر ئابوورا مووسلی و بازارێن وێ ژ بەرهەمێن میرگەهێ بێ باهردكرن[٦٢].

## پێنج: ئالیێ هزری

ئاکرێ ژی وەك باژێرێن دی یێن میرگەها بەهدینان ب هندێ هاتبووناسین کو هژمارەکا گەلەکا زانایان د وارێ زانستێن ئایینی دا ژێ رابووینە و گەلەك خواندنگەهـ ل باژێری و گوندێن سەر ب باژێریڤە هەبوون، ژبەر ڤێ چەندێ ژی میرێن ئامێدیێ گرنگییەك باش پێ دایە، ژ وێ گرنگیێ ژێ خواندنگەها ئاکرێ ئەوا سولتان حسێن وەلی (١٥٣٣- ١٥٧٣) میرێ ئامێدیێ دامەزراندی و عمبارەکا پەرتووکان و گەلەك دەستنڤیس لێ هەبوون، ژ وان زانایان یێن دەرس لێ گۆتین و فتوا لێ داین شێخ مەلا محەمەدێ زیارەتی ئەوێ ل سالا ١٧٨١ێ مری، زانایێ ناڤدار شێخ جەرجیسێ ئەربیلی ١٧٩١ێ[٦٣] و خواندنگەها باکرمان کو یەك ژ مەلبەندێن زانستی بوو ل سەردەمێ میرگەها بەهدینان[٦٤].

ژ زانایێن ناڤدارێن ئاکرێ مەلا ئەحمەدێ زێباری هەروەك ئەلعومەری د پەسنا وی دا دبێژیت: «یەك ژ زانایێن ناڤدارێن دەگمەن بوو د زانستاندا»[٦٥] و مەلا یەحیایێ مزووری « زانایێ زانستانە بێی گومان سەرزانایێ هەموو واران و چاکخواز و زاهد و دەهمەنپاك و سەرکەتی»[٦٦]، زانایێ خودان چاکی و شارەزایێ فیقهێ شافعی مەلا محەمەدێ حەجوکێ زێباریێ کورد[٦٧]، شێخ حەسەنێ کورێ یوسفێ زێباریێ خیلافەتی و سالح کورێ جبرائیلێ کورێ عوسمانێ سراجی یێ ئاکرەیی[٦٨]، تویژەرێ پەرتووکا (غایە المرام) دەربارەی ڤان کەسایەتییان دبێژیت: (وەلاتێ کوردان یێ گەش بوو ب زانایێن هەرە ناڤدار)[٦٩].

کارو چالاکیێن زانایێن ئاکرێ نە تنێ د ناڤ باژێریدا بوون، بەلکی گەلەك جاران چ بۆ وەرگرتنا زانستان، چ بۆ دانا دەرسان ل خواندنگەها سەرەدانا باژێرێن دی ژێ دکرن، مالباتا جەلیلیان د سەردەمێ حوکمداریا خۆ ل مووسلێ هژمارەك ژ کوردان ژ وانا ژی تەخەکا زانایان ئینانە مووسلێ، یەك ژ وانا زانایێ زانستێن شەرعی مەلا دەرویشێ ئاکرەیێ شافعی بوو ئەوێ هاتییە مووسلێ ل مزگەفتا (العمریە) دەرس گۆتین و چەند ژ زانایان ل بەر دەستێ وی خواندینە مینا ئەمین ئەلعومەری و عوسمان ئەفەندیێ ئەلعومەری و عەلی ئەلعومەری و یێن دی[٧٠]، هەروەسان شێخ یونسێ شوشی ل گەلەك جهان خواندییە و باوەرنامە د زانستێن ئەدەبی و شەرعیدا وەرگرتییە ل سەر دەستێ زانایێن مەزن مینا شێخ موسا ئەلحەدادی فێربوویە، و گەهشتییە پەیسکەکا بلند، مالا وی ببوو رووگەها مێهڤانان و خودانێن پێدڤییان و پەناگەها هەژار و دەستکورتان و خەلکەکی ژ هەرجهەکی بن قەستا وی دکرن[٧١].

## شەش: کارەسات و نەخۆشیێن ب سەرێ باژێری هاتین

ئەلعومەری د پەرتووکێن خۆدا ئەوێن مە پشتا خۆ پێ گەرمکری ئاماژە ب چەندین کارەسات و نەخۆشییان کرینە یێن ژبەر چەندین ئەگەران ل میرگەها بەهدینان رووداین، ب تایبەت ژی گەلەك جاران ئاماژە ب وان دکەت ئەوێن ل باژێرێ ئاکرێ رووداین و ئەو کاریگەریێن خرابێن کرینە سەر ژیانا خەلکێ باژێری چ د وارێ ئابووریدا، چ د وارێ جڤاکیدا و هندەك ژ ڤان کارەساتان دەسنیشانکرینە وەك: خەلا، بەفرێن گران، سەرما دژوار، باران، ناکوکیێن ناڤبەرا مالباتا حوکمدار ل ئامێدیێ، هەروەسان پێلێن بەردەوامێن ئێشا کولکا رەش (الگاعون) ل چەندین دەڤەرێن کوردستانێ، وەك ئەوا ل سالا ١٤٥٦ێ رووداى و ئێشا کولکا رەش گەلەك دەڤەر ژ وانا جزیرێ، مووسلی، شارەزورێ و ئاکرێ ڤەگرتی کو ئەلعومەری ب کولکا رەشا مەزن (الگاعون العقیم) ناڤکرییە، هەروەسان ئەلعومەری دیارکرییە کو ل سالا ١٧٧٢ێ پێلەکا کولکا رەش عیراق ڤەگرتییە، ژ باژێر و گوند ژێ دەربازنەبوون، خەلکێ وێ ڤەگرت و ب هزاران کەس ژ باژێرێن جودایێن عیراقێ کرنە قوربانی[٧٢]. سالا ١٧٩٠ێ باژێرێ ئاکرێ ڤەگرت و وەك جارێن پێشتر کارەساتێن مەزن ل پاش خۆ هێلان[٧٣].

ل سالا ١٧٩٨ێ پێلەکا بەفرێ بازێرێ مووسلێ ڤەگرت و گەهشتە ئاکرێ ژی، ستووراتیا بەفرێ گەهشتە سێ گەزان و تەرگەکا مەزن دووڤرا هات چاندنا سەد گوندان خرابکر و گەلەك گیانەوەر ژ ناڤبرن[٧٤]. ئەلعومەری د پەسنا وێ تەرگێدا ئەوا ل سالێن ١٨٠١- ١٨٠٢ێ ل بازێرێ ئاکرێ دای دبێژیت مەزناتیا بێن مەزن دگەهشتە قەبارێ هێکەکێ و بێن بچووك ژی ژ قەبارێ بندەقەکێ کێمتر نەبوون، ڤێ پێلا سەرمایێ زیانگەهاندنە کوینان و گەلەك ژێ دراندن و بەرهەمێ داران و چاندنێ ژی ژناڤبر و گەلەك ژ پەزی کوشتن[٧٥]. سەرما سالا ١٨١٠ێ سەرمایەکا دژوار بوو، تنێ ل ئاکرێ چل بچووك ژ سەرمادا مرن، سەرما ل ئاستەکی بوو ژن و زەلامان ژ سەرمادا خۆ د ناڤ کاپێدا د ڤەشارت[٧٦]. ئەلعومەری د ڤەگێرانا رووداێن سالا ١٨٠٥ێدا دبێژیت: پێلەکا گرانییێ گەلەك دەڤەر ژ دیاربەکرێ و مووسلێ و ئاکرێ ڤەگرتن و بوو ئەگەرێ گرانبوونا بهایێن تشتی هەروەك رتلەکێ (الرگل) گەنمی ب دەرهەم و نیڤان دهاتەفروشتن، رتلەکێ جەهی گەهشتە دەرهەمەکی، د ئەنجامدا دزی زێدەبوون، گەلەك گوند هاتنەتالانکرن، ئەگەرێ ڤێ چەندێ دزڤریتەڤە بۆ زۆرداری و ستەما حوکمداران و بەربەلاڤبوونا زۆرا گەندەلیێ د ناڤ واندا[٧٧].

ئەلعومەری ژ بیرا خۆ نابەتەڤە کو ئەگەرێ گەلەك ژ وان کارەسات و نەخۆشییان ئەو ناکوکی و هەڤرکییە بوون یێن د ناڤبەرا میرێن ئامێدیێ سەرا دەستەلاتی رووددان، ئەگەرێ دی ژی پەیوەندیێن خرابێن وان بوون دگەل جیرانێن وان ل مووسلێ و میرگەهێن دیتر، هەروەك شەرێ ل سالا ١٧٤٠ێ د ناڤبەرا میرگەها بەهدینان و مالباتا جەلیلییاندا روودای و د ئەنجامدا گوندێن سەر ب ئاکرێ ڤە هاتینەتالانکرن ژ وانا گوندێن ناڤکۆرێ و دوبانێ[٧٨]. ئەڤە ژی ژبەر وێ چەندێ بوو کو میرێ ئامێدیێ ژبەر خێر و بێر و دەولەمەندیا ڤی بازێری ب رەنگەکێ دەرەبەگی ددا کەسێن مالباتا خۆ ئەڤە ژی ئەگەرێ ناکوکیێ بوو د ناڤ بەرا کەسێن مالباتا حوکمدار[٧٩].

ل سالا ١٧٨٨ێ ناکوکی و ژ هەڤجودابوون کەتە ناڤبەرا مالباتا حوکمدار ل ئامێدیێ و بوونە دو دەستەکێن دژهەڤ: دەستەکا ئێکێ ب سەرۆکاتیا ئیسماعیل پاشای و یا دووێ ب سەرۆکاتیا هندەك برایێن وی و ئاکرێ مەیدانا شەری بوو د ناڤبەرا واندا، یەك ژ ئەنجامێن ڤی شەری ژی ئەو بوو کو گەلەك ژ خەلکێ ئاکرێ یێن د ئەنجامێ شەرێن زۆردا گەلەك نەخۆشی و تەنگاڤی دیتین و ب مەرەمکرنا دابینکرنا تەناهیا ژیانا خۆ مشەختبوونە ئاکرێ و هەر د وی سەروبەریدا دەست ب سەر سامانێ بازرگانان و خەلکێ بازێریدا هاتەگرتن[٨٠]. شەرێ ناڤبەرا مالباتا دەستەلاتدار ل سالا ١٨٠٠ێ دوبارەبووڤە و ئاکرێ ئالییەك بوو ژ شەری و گوندێن وێ هاتنەتالانکرن و گەلەك ژ خەلکێ وێ بوونە قوربانی[٨١]. هەروەسان ل سالا ١٨٠٩ێ هێزێن میر محەمەد بەگی و ب هاریکاریا والیێ بەغدا هێرش کرنە سەرگوندێن ناڤکۆرێ و تالانکرن و ئەڤ دەڤەرە وێرانکرن و زیان گەهاندنە خەلکێ وان و هەرتشتەکێ کەتیە بەردەستێن وان شەلاند[٨٢]. و چەندین نموونێن وەك ڤان یێن بووینە ئەگەرێ بلەزکرنا ژناڤچوونا میرگەهێ و نەمانا شیانێن وێ کو بکاریت خۆ ل بەر وان ئاریشەیان بگریت یێن بەرسنگێ وێ دگرتن.

ئەنجام

دشیاندایە د ئەنجامێ ڤی ڤەکولینێدا بگەهینە چەند ئەنجامەکان ژ وانا: سەرەرای بچووکیا ئاکرێ و کێمیا هژمارا خەلکێ وێ بەلێ دیرۆکنڤیسێ مووسلی یاسین کورێ خەیروللایێ عومەری گرنگی پێدایە، ئەو ژی ژبەر گرنگیا وێ یا ئابووری و پەیوەندیێن وێ یێن بازرگانی دگەل مووسلێ و هەروەسان ژبەرکو یەك ژ بازێرێن گرنگێن میرگەها ئامێدیێ بوو و ژ ئالیێ سیاسیڤە پشکداری د رووداێن میرگەهێدا کریە و بزاڤەکا زانستیا گەش ب خۆڤە دیتییە و گەلەك زانا د وارێن زمان و زانستێن شەرعی و تەفسیرێدا ژێ دەرکەتینە.

## ژێدەر و پەراوێز:


١. عباس العزاوي، العمادية في مختلف العصور، (اربيل، لات)،ص١٠.

٢. ب. شرفخاني، «حول قيام إمارة العمادية»، مجلة متين، ع ٦٨، أيلول، دهۆك ١٩٩٧، ص ١٠٠.

٣. خالد محمد شريف السندي، زاخو وإمارة سنديان، (بغداد، ٢٠٠٥)، ص ١١٢.

٤. عماد عبد السلام رؤوف، السلطان حسين الولي أمير بهدينان من ٩٤٠ إلى ٩٨١ه ١٥٣٣ – ١٥٧٣م، مطبعة كوفار (اربيل، ٢٠٠٩)، ص ص ٤ – ٥.

٥. كاميران عبد الصمد أحمد الدوسكي، كوردستان العثمانية في النصف الأول من القرن التاسع عشر، دار سبيريز للنشر والطباعة، (اربيل ٢٠٠٢)، ص ١٠٣.

٦. عماد عبد السلام رؤوف، الموصل في العهد العثماني فترة الحكم المحلي ١١٣٩ – ١٢٤٩ه ١٧٢٦ – ١٨٣٤م، مطبعة الأدب، (النجف الأشرف، ١٩٧٥)، ص ص ١٥٩ – ١٦٠.

٧. عبد الرقيب يوسف، الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى، ج١، (لام، لات)، ص ١٥.

٨. بيرسي كيمب، الموصل والمؤرخون الموصليون في العهد الجليلي ١٧٢٦ – ١٨٣٤، ترجمة محب أحمد الجليلي وغانم العكيلي، مركز دراسات الموصل، (الموصل، ٢٠٠٧)، ص ص ١٥٢- ١٥٣.

٩. ينظر ص ص ٧ – ٨ من المقدمة التي كتبها سعيد الديوه جي في، ياسين بن خير الله العمري، منية الأدباء في تاريخ الموصل الحدباء، ط٢، (الموصل، ٢٠٠٩).

١٠. إبراهيم خليل أحمد، (الحياة الفكرية في الموصل في العهد العثماني)، في موسوعة الموصل الحضارية، ج٤، (الموصل، ١٩٩٢)، ص ٤٠٣.

١١. بيرسي كيمب، المصدر السابق، ص ١٥٣؛ سيار كوكب علي الجميل، «طبيعة الحياة الثقافية في الموصل»، في موسوعة الموصل الحضارية، ج٤، (الموصل، ١٩٩٢)، ص ٣٢٤.

١٢. خليل علي مراد، «اقتصاديات الموصل في العصر العثماني من خلال كتابات مؤرخها ياسين بن خير الله العمري»، مجلة أوراق موصلية، جامعة الموصل، مركز دراسات (الموصل، ٢٠٠١)، ص ٤.

١٣. عماد عبد السلام رؤوف، التاريخ والمؤرخون العراقيون في العصر العثماني، (بغداد: ١٩٨٣)، ص ١٤٩.

١٤. غاية المرام في تاريخ محاسن بغداد، دار منشورات البصري، (بغداد: ١٩٦٨)، ص ٢٦٤.

١٥. ينظر، ص ٢١ المقدمة التي كتبها عماد عبد السلام رؤوف، في ياسين بن خير الله العمري، زبدة الآثار الجلية في الحوادث الأرضية، (النجف، ١٩٧٤)، تحقيق عماد عبد السلام رؤوف.

١٦. بيرس كيمب، المصدر السابق، ص ص ١٥٢ – ١٥٣.

١٧. صديق الدملوجي، إمارة بهدينان أو إمارة العمادية، مطبعة الاتحاد، (الموصل، ١٩٥٢)، ص ٢٦.

١٨. سيار كوكب الجميل، «الحياة الاقتصادية والاجتماعية لولاية الموصل في العهد الجليلي (١٧٢٦ – ١٨٣٤)» بحث في الحياة الاجتماعية في الولايات العربية أثناء العهد العثماني، (زغوان، ١٩٨٨)، ج١و ٢، ص ص ٢٧٣ – ٢٧٤.

١٩. صديق الدملوجي، المصدر السابق، ص ٢٦.

٢٠. حسێن پاشایێ جەلیلی (١٦٩٧- ١٧٥٧) دهێتەهژمارتن دامەزرێنەرێ راستەقینەیێ مالباتا والیێن جەلیلی، هەروەسان شارەزاتر و خودانشیانترین والیێن وان بوو، دەستەلاتداریا وی ل مووسلێ ب درێژیا ٢٨ سالان پچر پچر بوویە و نە ل دووڤ یەك بوویە، ژ ناڤدارترین كارێن وی بەرسنگرتنا هێرشا نادر شاهی بوو بۆ سەر مووسلێ ل سالا١٧٤٣، بۆزانیاریێن پتر بنێرە: سیار الجمیل
زعماء وأفندية الباشاوات العثمانيون والنهضويون العرب البنية التاريخية للعراق الحديث ، ( عمان ١٩٩٩) ص ص ٧٠-٧١.

٢١. بەهرام پاشا كورێ زبێر پاشای (١٦٩٥- ١٧٦٨)، ل سالا ١٧١٤ێ بابێ وی دەست ژ دەستەلاتی بۆ وی بەردا، سەردەمێ حوكمداریا

وی ب ئالوزیێن ناڤخۆیی و ژهەڤجودابوونان د ناڤ مالباتا حوکمدار دهێتەنیاسین زێدەباری ئالوزیێن دەرڤە، بۆ پتر زانیاریان بنێره: عماد عبدالسلام رؤوف، المعجم التاريخي لامارة بهدينان، (أربيل ٢٠١١ ) ص ٨٥.
٢٢. الدر المكنون في المآثر الماضية من القرون، دار استنبولي، (الموصل، لات)، ج٢، ص ٨٩٥؛ زبدة الآثار الجلية، ص ص ٩٤ – ٩٥، دگەل بوونا جوداهیێ د ڤەگێرانێ دا د دو ژێدەراندا، ڤێ تانە لێدانێ نە تنێ بەرۆکا ئاکرێ ڤەگرتیە، بەلکی بەرۆکا بازێرێن دی ژی ژ وانا زاخۆ گرتییە، بنێره: یاسین العمري، غاية المرام، صفحات متفرقة.
٢٣. محفوظ العباسي، إمارة بهدينان العباسية، مطبعة الجمهورية، (الموصل، ١٩٦٩)، ص ٢٢٦.
٢٤. کەڤنترین دراڤێ ئوسمانییە، دیرۆکا چێکرنا وی دزڤریتەڤە سالا ١٣٢٨ز و هەتا نیڤا ئێکێ ژ سەدسالییا نوزدێ یەکەیا دراڤیا ئەندازەییێ بوو ل دەولەتا ئوسمانی، خليل علي مراد، « النظام المالي « موسوعة الموصل الحضارية ، مج ٤، جامعة الموصل ، ( الموصل ١٩٩٢ ) ص ٢٤٨
٢٥. بنێره: غرائب الأثر في حوادث ربع القرن الثالث عشر، مطبعة أم الربيعين، (الموصل، ١٩٤٠)، ص ٥٨؛ الدر المكنون، ج٢، ص ص ٩٨٥ – ٩٨٦؛ غاية المرام، ص ص ١١٠ – ١١١.
٢٦. عماد عبد السلام رؤوف، المعجم التاريخي ، ص ٢٣٩.
٢٧. معجم البلدان، مج٤، دار إحياء التراث العربي (بيروت، لات)، ص ١٣٦.
٢٨. فائق أبو زيد ئاكري ، نبذة تاريخية عن قلعة ئاكرى الأثرية ، مجلة لالش ، العددان ١٨-١٩ ، أيلول ٢٠٠٢ ، ص ٨٦
٢٩. عبد ربه سكران ابراهيم الوائلي ، اكراد العراق ١٨٥١-١٩١٤ دراسة في التاريخ الاقتصادي والاجتماعي والسياسي ، ( بغداد ٢٠١٣ ) ص ص٢١٢-٢١٣
٣٠. ياسين العمري، منية الأدباء، ص ٣٠ وكذلك ص ١٨٤.
٣١. محمد أمين بن خير الله العمري، منهل الأولياء ومشرب الأصفياء في سادات الموصل الحدباء، تحقيق سعيد الديوه جي، (الموصل، ١٩٦٧)، ص ٦٧.
٣٢. ولاية الموصل في المصادر العثمانية، ترجمها فيصل الدباغ، (بغداد، ٢٠٠٩)، ص ١٦؛ مردخاى زاكن، يهود كردستان ورؤوساؤهم القبليون، ترجمة سعاد محمد خضر، مطبعة شفان، (السليمانية، ٢٠١١)، ص ٩١.
٣٣. سالنامة ولاية الموصل ١٣١٢ه/ ١٨٩٤م، ص ٢٧٩.
٣٤. جمبد شكري، ئاكرى (عقرة) في العهد الملكي، دار سبيريز للطباعة والنشر، (اربيل، ٢٠٠٨)، ص ص ١٩ – ٢٠
٣٥. عماد عبد السلام رؤوف، السلطان حسين الولي، ص ص ٧٩ – ٨٠.
٣٦. هەمان ژێدەر، بث ١٢٩؛ رحلة طه الكردي الباليساني في العراق وبلاد الشام والأناضول ومصر والحجاز، تحقيق عماد عبد السلام رؤوف، ط٢، مؤسسة موكرياني للبحوث والنشر، (اربيل، ٢٠٠٧)، ص ٤٦.
٣٧. المعجم التاريخي، ص ٢٤١.
٣٨. ياسين العمري، غاية المرام، ص ص ١٠٦ – ١٠٧.
٣٩. ياسين العمري، غرائب الأثر، ص ١٩؛ زبدة الآثار، ص ص ١٦١ – ١٦٢؛ روضة الأخبار في ذكر أفراد الأخيار، مؤلف غير معروف، تحقيق عماد عبد السلام رؤوف، (السليمانية، ٢٠١٠)، ص ٦٥.
٤٠. ياسين العمري، الدر المكنون، ج٢، ص ٩٥٨.
٤١. ياسين العمري، المصدر نفسه، ج٢، ص ٩٥٨؛ غرائب الأثر، ص ٢٢.
٤٢. ياسين العمري، غاية المرام، ص ١٠٧.
٤٣. ياسين العمري، غرائب الأثر، ص ٥٣.
٤٤. ياسين العمري، الدر المكنون، ج٢، ص ص ٩٧٥ – ٩٧٦.
٤٥. المصدر نفسه، ج٢، ص ص ٩٨٢ – ٩٨٣.
٤٦. سيار كوكب الجميل، حصار الموصل الصراع الإقليمي واندحار نادر شاه صفحة لامعة في تكوين العراق الحديث، (الموصل: ١٩٩٠)، ص ١٤٣.

٤٧. یاسین العمري، منیة الأدباء، ص ٢٢٤.
٤٨. یاسین العمري، غایة المرام، ص ١٠٧.
٤٩. هەمان ژێدەر، بث ١٠٧.
٥٠. هەمان ژێدەر بث ٩٣.
٥١. جلیلي جلیل ،من تاریخ الامارات في الامبراطوریة العثمانیة ،الاهالی للطباعة والنشر ، (دمشق ١٩٨٧) ص ٦٢
٥٢. سالنامة ولایة الموصل ١٣٣٠ه – ١٩١٢م ، ص ١٩٤
٥٣. یاسین العمري، غایة المرام، ص ص ٩٦ – ٩٧.
٥٤. رحلة نیبور إلى العراق في القرن الثامن عشر، ترجمة محمود حسین الأمین، (بغداد، ١٩٦٥)، ص ٧٦.
٥٥. سیار كوكب الجمیل، الحیاة الاقتصادیة والاجتماعیة، ص ٢٧٢.
٥٦. علي شاكر علي، ولایة الموصل العثمانیة في القرن السادس عشر، دراسة سیاسیة – إداریة – اقتصادیة، منشورات دار غیداء، (عمان، ٢٠١٠)، ص ٢١٩.
٥٧. ولایة الموصل في المصادر العثمانیة، ص ٣٢.
٥٨. یاسین العمري، غرائب الأثر، ص ٥٧.
٥٩. طه الهاشمي، مفصل جغرافیة العراق، مطبعة دار السلام، (بغداد، ١٩٣٠)، ص ١٩٣.
٦٠. غایة المرام، ص ٩٧؛ الدر المكنون، ج٢، ص ٨٩٥.
٦١. رحلة نیبور، ص ص ٧٥ – ٧٦.
٦٢. یاسین العمري، غرائب الاثر، ص ٤٨.
٦٣. عماد عبد السلام رؤوف، مراكز ثقافیة مغمورة في كردستان، مؤسسة موكریاني للبحوث والنشر، (اربیل، ٢٠٠٨)، ص١١٣.
٦٤. عماد عبد السلام رؤوف، المعجم التاریخي، ص ٦٦.
٦٥. غایة المرام ، ص١٠٨
٦٦. هەمان ژێدەر، بپ ١٠٨.
٦٧. یاسین العمري، الدر المكنون، ج٢، ص ٩٠١.
٦٨. عماد عبد السلام رؤوف، المعجم التاریخي، ص ٦١، ص ١١٨..
٦٩. غایة المرام، ص ١٠٩.
٧٠. یاسین العمري، الدر المكنون، ج٢، ص ٩١٣.
٧١. أمین العمري، منهل الأولیاء، ج٢، ص ص ٢١١ – ٢١٢؛ محفوظ العباسي، المصدر السابق، ص ١٧٠.
٧٢. ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٣٥.
٧٣. الدرر المكنون، ج٢، ص ٩٤٢.
٧٤. یاسین العمري، الدرر المكنون، ج٢، ص ٩٧٤.
٧٥. ژێدەرێ بەرێ، بەرگێ ٢، بی ٩٨٨ ؛ غرائب الأثر، ص ٥٦.
٧٦. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٥.
٧٧. دژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٧.
٧٨. زبدة الآثار، ص ٩٤.
٧٩. عبدالفتاح علي بوتاني ، ئاكرى مدینة العیون والینابیع ، مجلة دهۆك ، العدد ٣ نیسان ١٩٨٨، دهۆك ، ص٧٧
٨٠. غرائب الأثر، ص ٧١.
٨١. ژێدەرێ بەرێ، بث ٥٣.
٨٢. ژێدەرێ بەرێ، بث٩٥.

# هەلویستێ خەلکێ بەهدینان ژ هێڕشا میر محەمەدێ رەواندزی د بەلگەنامەیەکا دیرۆکی دا

**تەحسین ئیبراهیم دۆسکی**

گەلەك لایێن دیرۆکا کوردان ب گشتی و یا دەڤەرا بەهدینان ب تایبەتی، پێدڤی زەلالکرنێ هەیە، ژ بەر کو ئەو ب دورستی نەهاتینە نڤیسین و پاراستن، و بەلکی کارێ ڤەوژارتن و دوبارە نڤیسینا گەلەك ژ ڤان لایێن ژێکۆتی هێشتا د شیاندا بت، ئەگەر هات و مە کار بۆ پەیداکرنا وان ژێدەران کر یێن ڤی کاری ل بەر مە ب ساناهی دئێخن، و ئێك ژ گرنگترین وان ژێدەران ئەو بەلگەنامەنە یێن حەتا نوکە د ئەرشیفێن رەسمی و نەرەسمی دا پاراستیماین، بەلکی ئەرشیفێ دەولەتا ئۆسمانی ئێك ژ دەولەمەندترین سەرەکانی و ژێدەرێن پەیداکرنا وان بەلگەنامەیان بت یێن هاریکاریا مە ل سەر ڤێ چەندێ دکەن.

دەم بۆ دەمی و ژ ئەنجامێ گەڕیانا ڤەکۆلەران د ناڤ ڤی ئەرشیفێ دەولەمەند دا، هندەك بەلگەنامەیێن حەتا نوکە دڤەشارتی، ژ نوو دئێتە دیتن و بەلاڤکرن تشتێ دبتە ئەگەرا ب دەستکەفتنا هندەك زانین و ئاگەهیێن نوو یێن کو خزمەتا دیرۆکا مە دکەن.

ڤێ جارێ ئەم دێ ئێك ژ وان ڕەنگە بەلگەنامەیان ل بەرچاڤێن ڤەکۆلەر و خواندەڤانان دانین، کو دانەیا ڕەسەنا وێ ل بازێڕێ ستەنبۆلێیە، د ناڤ ئەرشیفێ ئۆسمانی دا.. ئەڤ بەلگەنامەیە سیناهییێ ددەتە سەر لایەکێ تاری ژ دیرۆکا دەڤەرا بەهدینان ل دەمەکێ وەسا مخابن پتریا وی هێشتا بۆ مە روهن و زەلال نەبوویە، ئەو ژی دەمێ هێڕشا میرێ رەواندزێ محەمەد بەگی یە ئەوێ ب ناسناڤێ میرێ کۆرە دئێتە نیاسین بۆ سەر دەڤەرا بەهدینان، دەمێ میرگەها بەهدینان ل خرابترین دەمێ خۆ دژیا، ژ بەر وێ ژێکڤەبوون و لێککەفتنا کەفتییە ناڤبەرا پاشا و میرزادەیێن مالباتا میرێن ئامێدییێ ئەوا ب ناڤێ مالباتا میر سێڤدینا دهاتە نیاسین.

ئەڤ بەلگەنامە، وەکی دێ بۆ خواندەڤانان ئاشکەرا بت، هەلویستێ خەلکێ دەڤەرا بەهدینانە ژ هێڕشا میرێ کۆرە بۆ سەر دەڤەرێ بەرچاڤ دکەت، و هندەك ڕاستییان نیشا مە ددەت، بەلکی حەتا نوکە د چو ژێدەرێن دیرۆکی دا نەهاتبن. گرنگییا ڤێ بەلگەنامەیێ نە ب تنێ ژ ڤێ چەندێ دئێت، بەلکی ئەو ناڤێن (٣٣) مەزن و گرگرە و ماقویلێن ڤێ دەڤەرێ ژی بۆ مە بەرچاڤ دکەت، یێن کو دەورەکێ بەرچاڤ د

بەرگریبا هێرشا میرێ کۆرە دا هەبوو، و پێدڤییە ئەم کاری بۆ هندێ بکەین کو ب رێکا هێشتا ژێدەرێن دیرۆکی، ڤان کەسان بنیاسین، و زانینان ل دۆر کۆم بکەین، و بدانینە بەر دەستێ ڤەکۆلەر و خواندەڤانان.

## هێرشا میرێ کۆرە ل سەر بەهدینان:

ب راستی من نەڤێت ل ڤێرێ بەحسێ ڤێ روودانا دیرۆکی بکەم، چونکی مژارا مە یا سەرەکی ئەو نینە، بەلێ دا کو بابەتێ ڤێ بەلگەنامەیێ بۆ خواندەڤانان باش روهن و ئاشکەرا ببت، دڤێت ئەم ب کورتی بەحسێ ڤێ روودانێ بکەین.

ژێدەرێن دیرۆکی ددەنە ئاشکەراکرن کو ل سەدسالییا داویێ ژ ژیێ میرگەها ئامێدییێ، کو دبتە نیڤا دووێ ژ سەدسالییا هەژدێ و نیڤا ئێکێ ژ سەدسالییا نۆزدێ، سەروبەرێ میرگەهێ زێدە تێکچوو بوو، و ئێك ژ ئەگەرێن وێ تێکچوونێ ئەو هەڤرکیێن بەردەوام بوون یێن د ناڤبەرا میرزادەیێن مالباتا میر سێڤدینا پەیدابووین، تشتێ بوویە ئەگەرا هندێ کو گەلەك دەستێن خراب ل ناڤخۆیی و دەرڤەییا میرگەهێ بۆ تێکڤەدانێ بێنە درێژکرن، و ئاگرێ فتنێ گەش بکەن.

ل سالا(١٨٢٤ز/١٢٤٠مش) محەمەد سەعید پاشایێ کورێ محەمەد طه یار پاشایی ل جهێ مامێ خۆ زوبەیر پاشایی بوو میرێ بەهدینان، و هەر ژ سەری هەڤرکی د ناڤبەرا وی و براێن وی دا دژوار بوو، و وەسا چێبوو ئەو و برایێ خۆ ئیسماعیل پاشا -حاکمێ ئاکرێ- بوونە قولپەك دژی برایێ خۆ یێ دی مووسا بەگێ، ئەوێ پشتی شکەستی رەڤی و وەك پەنابەر قەستا رەواندزێ کری، ل نك میرێ سۆران محەمەد بەگێ (میرێ کۆرە)، و داخوازا هاریکارییێ دژی براێن خۆ ژ وی کری.. و د گەل ڤێ روودانێ وەسا چێبوو نەیارەتی د ناڤبەرا عەلی ئاغایێ بالەتەیی و میرێ شێخان عەلی بەگێ دا پەیدابوو، و د ئەنجام دا میرێ ئێزدییان ب غەدر عەلی ئاغا و کورێ وی سنجان د مالا خۆ دا ل باعەدرێ کوشتن، پشتی ئەو ب هێجەتا کریڤاتییێ داخوازکرینە قەسرا خۆ، و وەسا دیاربوو کو میرێ ئامێدییێ محەمەد سەعید پاشایی بەرێ وی دابوو ڤێ رێکێ، و ژ بەر کو عەلی ئاغا مامێ -یان پسمامێ- زانایێ ناڤدار مەلا یەحیایێ مزویری بوو، مەلا یەحیایی ب کارەکێ شەرعی بۆ خۆ دیت کو ئەو داخوازا خوینا مامێ خۆ بکەت، و دەمێ وی ئەڤ چەندە ژ میرێ ئامێدییێ خواستی و دیتی میری چو پویتە ب گۆتنا وی نەکر، رابوو چوو ئاکرێ و ئەڤ داخوازە ژ برایێ وی ئیسماعیل پاشایی ژی کر، بەلێ چونکی ئەو و میر ئێك قولپ بوون، وی ژی گوهدارییا مەلا یەحیایی نەکر، بەلکی کورێ مەلا یەحیای ب خۆ ژی مەلا عەبدررەحمان د بارودۆخەکێ شێلی دا هاتە کوشتن، تشتێ مەسەلە پتر ئالۆز کری! و پشتی بۆ مەلا یەحیایی ئاشکەرا بووی کو میر محەمەد سەعید پشتەڤانێ عەلی بەگی یە، بەلکی ئەوە یێ عەلی بەگ بۆ ڤی کاری پالدای، ئەوی وەکی مووسا بەگێ -برایێ میرێ ئامێدییێ- قەستا رەواندزێ کر و داخواز ژ میرێ کۆرە کر کو ئەو هاریکارییا وی د ستاندنا تۆلا مامێ وی دا بکەت.

ب ڤی رەنگی هندەك ژ دەستەلاتا سیاسی (مووسا بەگ) و هندەك ژ دەستەلاتا دینی (مەلا یەحیا) یا بەرهنگار بۆ میرێ ئامێدییێ ل نك میرێ سۆران کۆمبوو، و وان هەردویان میرێ کۆرە پالدا کو ئەو هێرشێ بکەتە سەر دەڤەرێ، و دیارە وان ئەو وەسا تێکەهاند کو ئەو ل دەسپێکێ هێرشێ بکەتە سەر ئێزدییان ب هێجەتا ڤەکرنا تۆلا عەلی ئاغایی، و ئەڤە د چاڤێ خەلکی دا - و ل دووڤ قانوونا عەشیرەتێ- دێ کارەکێ دورست بت، و هنگی میرێ ئامێدییێ دێ ئێت پشتا میرێ شێخان گریت، و گاڤا وی ئەڤ چەندە کر، هێجەتا میرێ کۆرە دێ خۆش بت کو هێرشێ بکەتە سەر وی ژی، و دەستێ خۆ بدانتە سەر دەڤەرێ هەمییێ، و وەسا چێبوو وەکی وان هزرکری، پشتی لەشکەرێ سۆران هێرش کرییە سەر دەڤەرێن ئێزدییان، محەمەد سەعید پاشایێ میرێ ئامێدییێ، و ئیسماعیل پاشایێ حاکمێ ئاکرێ، هێزەك هنارتە شەرێ وان، بەلێ لەشکەرێ سۆران

شیا هەر زوی دەڤەرێن ئێزدییان بستینت، و هێجەتا وان خۆش بوو کو ئەو هێرشا خۆ بۆ دەڤەرێ بەرفرەهـ بکەن، هندەك ژ وان هێرش دا سەر ئاکرێ و ستاند، و ئیسماعیل پاشا نەچارکر بەر ب ئامێدیێ ڤە برەڤت، و هندەکێن دی ب سەرۆکاتییا میرێ کۆرە هێرش دا سەر ئامێدیێ ب خۆ، و پشتی شیای وێ ژی بستینت، محەمەد سەعید پاشا ژ تەختێ میراتییێ لادا، و برایێ وی مووسا بەگ دانا جهێ وی.. پاشی میرێ کۆرە زڤری رەواندزێ. و پشتی دەمەکی خەلك دژی مووسا بەگێ رابوون و ئەو ئێخست و برایێ وی محەمەد سەعید جارەکا دی کرە میر، و گاڤا میرێ کۆرە ئەڤ چەندە زانی دوبارە هێرش کرە سەر ئامێدیێ و ڤێ جارێ ب دژواری سەرەدەری د گەل خەلکی کر، و گەلەك کوشتن و ئێخسیرکرن، و ئێك ژ وان یێن وی گرتین محەمەد سەعید پاشا ب خۆ بوو، و د ڤێ روودانێ دا ئیسماعیل پاشا شیا جارەکا دی برەڤت و خۆ قورتال بکەت.

دەسپێکا هێرشا میرێ رەواندزێ بۆ سەر ئێزدییان ل پائیزا سالا (١٨٣٢ز/١٢٤٨مش) بوو، و ڤان روودانان نێزیکی دو سالان ڤەکێشان[1].

## دەورێ مەلا یەحیایێ مزویری:

وەکی مە گۆتی مەلا یەحیایێ مزویری (بالەتەیی) ئەوێ میرێ ئامێدیێ محەمەد سەعید پاشایی مامێ وی ب دەستێن عەلی بەگێ ئێزدی دایە کوشتن، وی دگەل مووسا بەگێ برایێ میری چەپەرەکێ بەرهنگارییێ دژی میرێ ئامێدیێ دورستکر، و وەسا چێبوو ئەو هەردو ل رەواندزێ ل نك میرێ کۆرە گەهشتنە ئێك، و پشتی بەرژەوەندییا وان و یا میرێ رەواندزێ کەفتیە دگەل ئێك، وان میر پالدا کو ئەو هێرشێ بکەتە سەر دەڤەرا بەهدینان، و وان سۆز دا میری کو ئەو رێکێ بۆ وی خۆش بکەن، و دلێن خەلکێ بەهدینان ب نك وی ڤە بکێشن؛ دا هێرشا وی ب ساناهیتر لێ بێت.. و ئەڤ چەندە ل دلێ میری هات!

ب راستی مەلا یەحیایی - وەکی ژ ڤێ بەلگەنامەیێ ژی ئاشکەرا دبت- دەورەکێ مەزن د ڤێ چەندێ دا گێرا، لەو ئەڤ دەورێ وی هێژای بەحسکرنێیە، بەلێ بەری بەحسێ ڤی دەورێ وی بکەین، دڤێت بزانین مەلا یەحیا کی بوو، و چاوا ئەو شیا ڤی دەوری بگێرت؟

مەلا یەحیا دئێتە هژمارتن ئێك ژ زانایێن مەزن یێن دەڤەرا بەهدینان، سالا بوونا وی ب دورستی د چو ژێدەران دا نەهاتیە، ب تنێ کتێبا مەلا ئەنوەرێ مائی تێ نەبت، ئەو دبێژت: مەلا یەحیا ل سالا(١١٨٥مش /١٧٧١ز) هاتبوو سەر دنیایێ، بەلێ ئاشکەرایە کو مەلا یەحیا و مەلا خەلیلێ سێرتی پێکڤە فەقی بوون ل ئامێدیێ ل نك مەلا مەحموودێ بەهدینی، و وان هەردویان ئیجازە ژ وی وەرگرتبوو، و دیرۆکا بوونا مەلا خەلیل یا ئاشکەرایە کو سالا (١١٦٤)یە، بەلێ مەلا خەلیل چەند سالەکان ژ مەلا یەحیای مەزنتر بوو، و نیشان ل سەر ڤێ چەندێ ئەوە: مەلا یەحیایی هندەك کتێبێن خۆ یێن رێزێ ل نك مەلا خەلیلی خواندینە، تشتێ هندێ دگەهینت دەمێ مەلا یەحیا بوویە سوختە، مەلا خەلیل موستەعید بوو، هەروەسا مەلا خەلیلی دەستنڤیسەك هەیە ل مەدرەسا قوبا ل ئامێدیێ نڤیسیبوو، دیرۆکا نڤیسینێ وەکی ل سەر هاتی سالا(١١٩٣) مشەختییە، و دەمێ مەلا خەلیل ژ ئامێدیێ چوویە جزیرا بۆتان، داخواز ژ مەلا یەحیایی کر کو ئەو دەستویرییێ ژ بابێ خۆ بخوازت کو ئەو دگەل وی بچتە جزیرێ دا خواندنا خۆ تمام بکەت، بەلێ بابێ وی دەستویری نەدایێ. لەو مەلا خەلیل ب تنێ چوو.. ژ ڤێ هەمییێ ئەم دشێین بێژین: دبت دیرۆکا بوونا مەلا یەحیایێ مزویری ل دۆرێن سالێن ١١٧٠- ١١٧٥ بت، و ئەڤە هندێ دگەهینت کو دەمێ میرێ کۆرە ب سەر دەڤەرا بەهدینان دا گرتی ژیێ مەلا یەحیایی هەر چ نەبت (٧٥) سال بوون.

پشتی مەلا یەحیایی ل دۆرێن سالا١١٩٣ (یان پشتی هنگی ب چەند سالەکێن کێم) ئیجازا مەلاتییێ ژ مفتییێ ئامێدیێ مەلا مەحموودێ بەهدینی وەرگرتی، دەست دا کارێ مەلاتی و دەرسگۆتنێ، ل ئامێدیێ و مووسلێ، و دەمێ ئەو چوویە حەجێ وی د رێکا خۆ دا ل شامێ هندەك ئیجازێن دی یێن علمی و حەدیسێ وەرگرتن، و دەمێ زڤرییە ئامێدیێ ناڤ و

دەنگێن وی بەلاڤ بوون، و دەمەك هات ئەو ل دەڤەرێ وەك زانایێ ئێكێ هاتە هژمارتن.

پەیوەندییێن وی یێن علمی د گەل زانایێن بەهدینان و سۆران و بابان و مووسل و بەغدایێ هەبوون، و وان هەمییان وەك سەیدایێ زانایان بەرێ خۆ ددا وی، و دەمێ روودانا میرێ كۆرە چێببووی، ئەو نێزیكی پێنجی سالان بوو مەلا یەحیا مژوولێ مەلاتی و دەرسگۆتن و نڤیسنێ بوو، و ئەو مەلایێن ل ئامێدییێ فەقیاتی ل سەر دەستێ وی كری، و ئیجازە ژێ ستاندی، و ل دەڤەرێ بەلاڤبووین، و بووینە شێخ و مەلا و ئەدیب و كەسێن پێشكێش، بەلكی ب سەدان بن، و وان هەمییان ئەو وەك سەیدا و (مەرجع) بۆ خۆ دزانی، و ژ گۆتنا وی دەرنەدكەفتن، و ئاشكەرایە كو ل وی دەمی ئاخفتنا كەسەكێ هندی یا شێخ و زانایێن دینی جهێ خۆ د دلێن خەلكی دا نەدكر، و ڤێ چەندێ عەردەكێ وەسا بۆ مەلا یەحیایی بەرهەڤكر كو ئەو بشێت كاری ل خەلكێ دەڤەرێ بكەت، و تشتێ بڤێت باوەریێ بۆ وان پێ چێ بكەت.

دەمێ پەیوەندی د ناڤبەرا مەلا یەحیایی و مالباتا میرێن ئامێدییێ دا تێكچووی، وی جهـ و مەنصبێ خۆ وەك زانایێ ئێكێ یێ دەڤەرێ، بۆ خۆ ب دەلیڤە زانی، و ب رێكا هەڤال و دویكەفتییێن خۆ ژ شێخ و مەلایێن بەهدینان كو بارا پتر ژ وان د وەختی دا فەقییێن وی بوون، شیا كارەكێ بەرچاڤ ل خەلكێ دەڤەرێ بكەت، كو كەرێن وان ژ میری ڤەببن، و كاری بۆ نەیارەتییا وی بكەن..

و وەسا دیارە كو تشتێ پتر مەلا یەحیایی (و هەڤالێ وی مووسا بەگێ) مفا ژێ دیتی كو خەلك دژی میری راكەن، سێ ئەگەر بوون:

ئێك: چاوا میر، ئەوێ خۆ ب عەبباسی و ژ بنەمالا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) ددەتە نیاسین، مەزنەكێ موسلمانان (كو عەلی ئاغایێ بالەتەیی بوو) ب دەستێ مەزنەكێ ئێزدی (كو عەلی بەگ بوو) ددەتە كوشتن؟ ئەڤە پالدەرەكێ دینی!

دو: خەلك هەمی دزانن كو كوشتنا عەلی ئاغایی ب غەدر بوو، و حوكمێ عەشیرەتێ ڤێ چەندێ قەبوول ناكەت، ڤێجا چاوا میر ڤێ چەندێ قەبویل بكەت، و پشتەڤانییا ڤێ غەدرێ بكەت، نە بەس هندە.. بەلكی ئەو ب خۆ خودانێ ڤێ پیلانێ بت؟ ئەڤە پالدەرەكێ عەشائیری!

سێ: ئەو هەڤركییا بەردەوام د ناڤبەرا برا و پسمامان دا ژ میرزادەیێن مالباتا میر سێڤدینان، نەرحەتی ل دەڤەرا بەهدینان پەیدا كریوو، و بووبوو ئەگەرا هندێ تەناهی نەمینت، و نەیارەتی د ناڤبەرا عەشیرەت و ئاغا و ماقویلێن دەڤەرێ پەیدا ببت، كو هەر ئێك ژ وان پشتا میرزادەیەكی دگرت، و حەتا جیرانێن میرگەهێ ژی گەلەك جاران دلێ خۆ دبرە هندێ تەعداییێ ل خەلكێ دەڤەرێ بكەن، ئەڤێ كەربەك د ناڤ خەلكی دا دژی میران پەیدا كریوو.

مەلا یەحیایی (و چەپەرێ وی!) ئەڤ چەندە بۆ خۆ (ئستغلال) كر، و دەمێ میرێ كۆرە بەرهەڤییا خۆ بۆ هێرشا ل سەر بەهدینان ئاشكەرا كری، ما ل وێرێ مەلا یەحیا مەنصبێ خۆ ئستغلال كەت بۆ هاڤێتنا دو پێنگاڤان وەك پشتەڤانی بۆ میرێ كۆرە:

یا ئێكێ: فەتوایەكێ دژی ئێزدییان بدەت، و كو كوشتنا وان حەلالە، دا میرێ كۆرە ب دلەكێ رحەت ڤی كاری بكەت، و خەلك ژی ڤی كارێ وی ب جیهاد و كارەكێ شەرعی و دورست بزانت، و بەرهنگارییا وی نەكەن.

یا دووێ: ئەو خەلكی (ب تایبەتی ئاغا و مەزن و ماقویلان) وە تێ بگەهینت كو میرێ كۆرە ژ نك خۆ و بێی ئاگەهدارییا دەولەتێ ب ڤی كاری رانابت، بەلكی ئەو یێ فەرمانا سولتانێ ئیسلامێ ب جهـ دئینت.

و وەسا دیارە - وەكی ژ ڤێ بەلگەنامەیێ دئێتە وەرگرتن- كو هژمارەكا مەزن یا خەلكی ل دەسپێكێ ب ڤان گۆتنێن مەلا یەحیایی هاتنە خاپاندن، و ئەگەر وان پشتەڤانییەكا ب كریار نەدابتە میرێ كۆرە ژی، هەما هند بەس بوو ل سەری پترییا وان خۆ ل سەر ڤێ هێرشێ بێ دەنگ كر.. بەلێ پاشی بۆ وان دیار بوو كو مەسەلە وە نینە وەكی مەلا یەحیایی ئەو تێگەهاندین.

## بەلگەنامەیا مەزن و زانایێن بەهدینان:

ئەڤ بەلگەنامەیە، وەکی مە گۆتی، ئێك ژ وان گەلەك بەلگەنامەیانە یێن پەیوەندی ب دیرۆکا مە ڤە هەی، و مخابن حەتا ڤێ گاڤێ د ئەرشیڤێ ئۆسمانییان دا ڤەشارتی ماین و چاڤەرێی هندەك خەمخوران کو دەستێ خۆ درێژکەنێ و تۆزێ ژێ داقوتن، ئەڤ بەلگەنامەیە هەلویستێ خەلکێ دەڤەرا بەهدینان ژ هێرشا میرێ کۆرە ئاشکەرا دکەت، و بەلکی ئەڤە جارا ئێکێ بت ئەڤ لایە ژ مەسەلێ دئێتە زەلالکرن، و هەلویستێ میر و ئاغا و شێخ و زانایێن بەهدینان ژ دەڤێ وان ب خۆ دئێتە وەرگرتن، بێی بێژین: فلان کەس دبێژت، و بێڤان کەس هزر دکەت.. بەلگەنامە وەکی ئاشکەرا هیڤی و رجایا مەزن و گرگرێن دەڤەرێیە ژ سولتانێ دەولەتێ (دەولەتا ئۆسمانی) کو ئەو د هەوارا خەلکی بێن، و ئەو -چ ب جامێری بت چ ب هێز بت- میرێ کۆرە ژ دەڤەرا وان دەربێخن، ئەگەر نە ئەو دێ دەڤەرێ خراب کەت!

ل سەری ئەم دەقێ فارسی یێ ڤێ بەلگەنامەیێ دێ ل بەرچاڤ دانین، وەکی وێ، و بۆ زانین ئەو ب زمانەکێ فارسی یێ سادە، هاتیە نڤیسین، و هندەك خەلەتیێن زمانی و ئیملائێ ژی تێدا هەنە، و پشتی دەقێ بەلگەنامەیێ ئەم ناڤەرۆکا وێ ژی ب کوردی دێ ڤەگێرین، و پشتی هنگی هندەك تێبینییێن خۆ ل سەر دێ ئاشکەرا کەین.. بەلگەنامە دبێژت:

(**عرض داشت كمترين بندگان بندهء عرض نواب مستطاب فلك جناب سپهدر كاب افاخم اعاظم جاه حضرت سلطانم.**

تا معروض ان نواب عالي و مشكل گشا كرد و كة دونيا (درين) مسلماني است داد پی داد رجا بصد رجا امید بصد امید آن عالیجاه پرسش بر حال این فقیران گمراه و پیچاره كه امیر رواندز مسلمانی خلاص كرد، هیچه مسلمانی نماند، آخر مخدوما در هیچ زمان این گونه ندیدهئم و نشنیدهئم نه از پدران خود، و نه از پدران ثدران خود، كه اوجاغ میر سیفدینان اهل عباس بی بونیاد بشوند كه اوجاغ میر سیفدینان از دولت سر آن نواب عالی این هفتی هشتی بابست این جا میخورند، و جائی بهدینان از دولت به مالكانه به اوجاخ میر سیفدینان انعام و اكرام كرده است، حد هیچ كس نیست حكومت بی امر دولت بر جائی میر سیفدینان بكنند، و هنوز امیر رواندز بی امر دولت و بی امر آن نواب عالی به ظور به میخورد و ایخسیر و عیال میر سیفدینان، و ایخسیر و عیال و دولت مایان به رواندز میبرد، و نه به امر دولت و نه بهـ امر آن نواب عالی این چونین میكند، و پس مخدوما در هیچ زمان این گونه نبوده كه عیال مسلمانان ایخسیر بكنند و فروخته دارند، مخدوما مطاعا مایان نة عجم هستیم، و نه فرەنگ هستیم، كه ایخسیر مایان به رواندز ببرد و فروخته بكند، كه این كارها از خدا و رسول خدا خوش نمی آید، آخر مخدوما این بدبخت هیچه امر خدا و رسول خدا فرموده بجا نمی آرد، آخر مسلمانی خلاص شد، و هیچه مسلمانی نماند، آخر اگر ایخسیر و اگر عیال مایان و عیال میر سفدینان أهل عباس همه بروانذز بردند، و از بهر خود فروخته كردند، مخدوما مطاعا مایان این كارها در هیچ زمان ندیدهئم، و از دولت سر شما این كارها ازو قبول نمیكنیم، كه این كارها بی امر دولت و آن نواب عالی بكند، و در جائی میر سیفدینان حكومت بكند، آخر أمید بصد امید از آن مشكل گشا میكنیم، از دولت سر خود بزودیی ثرسش بر حال این بندهگانان گمراهـ و بیچاره بكنند، و از دست این بی بخت مارا خلاص یابند، رجا بصد رجا بزودی تدبیر از بهر این بیچارهگانان بكنند، كه مایان نتوانیم بر حكم این بدبخت بنشینم، و تا هنوز به حیله و بدروغ ملا یحیی ازو قبول كردیم، ازین ثس از دولت سر شما چون مایان دانستیم بی امر دولت و آن نواب عالی این چونین كارها میكند، ازو قبول نداریم و اگر شما پرسش بزودی بر حال این بندهگانان نكنی، مایان نتوانیم بنشینم، مایان بلجومله با ایخسیر و عیال خود به دولت میردین (میروین!) و این جا چول نمائم، و بر حكم این بدبخت ننشینیم، و چون میر

سیفدینان ازین جا بی بهره باشند لازمست مایان هم بی بهره باشین (باشیم)، و مایان از جائی آن بدبخت بدر شوین (شویم)، رجا بصد رجا از آن نواب عالی و مشکل گشا میکنیم، که چشم مرحمت از طرف مایان قطعة و کوتاه ندارند، و بزودیی از دولت سر خود پرسش بر حال این گمراهان بکنند، و پس مخدوما مطاعا از کرم خدائی تعالی و آن نواب عالی اوجاغ میر سیفدینان خلاص نشده‌اند، پسر آن محمد طیار پاشا از دست آن بی بخت خلاص شده‌اند و اینك اسماعیل پاشا از طرف آن مخدومیم بطرف مایان آمده است، و در نزد خود نهاده‌ئیم، و مایان بلجوملە از خوب و خراب تفاق خود کردیم، از بهر خدمت آن نواب عالی و اسماعیل پاشا و آگاهی از گرف امیر حکاریان و جمله عشیران بوطان و خان محمود هستیم، و سخن خود یك کردیم، و مکتوب آن نواب عالی و عرضه حال خود از ملا و سیدان و عشیران همه بلجوملە به نزد وزیر بغداد روانه کردیم، ولی تا هنوز جواب مایان باز نآمده‌است، امید است بار دیگر از بهر خاطر این گمراهان تکرار دیگر بر وزیر بغداد بکنند آخر خدا میبینیم (می بینیم) و پس آن نواب عالی هیچه پناه دیگر نیستیم، امید است بصد امید تدبیری از بهر این بنده‌گانان بکنی، چند مقدار عسکر و یك خلعت فرح بخش از بهر مخدوم مایان اسماعیل پاشا انعام و إکرام دارند، چه از طرف خود، و چه از طرف محمد پاشا در میردین، و چه از گرف وزیر بغداد.

**آخر امید است تدبیری از بهر این بنده‌گانان بکنی، آخر دست مایان در دامان شما و دست شما در دامان خدا و رسول خدا، مایان ازین گرداب خلاص یابی، آخر همه کارها از دولت سر شما بخود گرفتیم، (خداوند کردن عسکر) و کیسها و زخیره و دعوا (شهرا) همه غم خود او و غم این بنده‌گانان، و هم قلعهء عمادیه تسلیم نمائیم و هم رواندز ان شاء الله خراب بکنیم، آخر درین بار اختیاری جان خود کردیم، ان شاء الله خدمت چونان درین بار میکنیم که از بهر این بنده‌گانان به خدمت و به غلامی حساب نمایند، و پس مرحمت پناها ز خود سلیم پاشا بنام عجم رفت که به بغداد برود، آخر این بی بخت همه راه بغداد درین طرف گرفته‌اند پس چون بنام عجم رفت، از قدرت خدا در آن روزها شهزاده‌و عجم بمرد و بدار الفنا رفت، و هم برف بسیار آمده است، در آنجا نپی (نه پی) راه رفتن بدست افتد و نه راه باز آمدن، آخر اینك اسماعیل پاشا در نزد مایان است، هیچ فرق در میان آنان نیست و مایان چونین از دولت سر آن نواب عالی میخواهیم که یك خلعت و چند عسکر از بهر اسماعیل پاشا انعام و اکرام بکنند، آخر صاحب اختیار هستی چه از طرف خود، و چه از طرف محمد پاشا، و چه از طرف وزیر بغداد، علاجی بزودی از بهر این بنده‌گانان بکنند، هم ایش و کارها به این بنده‌گانان رسید ان شاء الله و تعالی، و پس مخدوما اگر درین سال بزودی تدبیری بران بدبخت نکنند، و بزودی او را منعدم نکنندی، بماند تا سال دیگر درین جا خود را محکم میکند، و مایان خراب میکند، پس هیچ کار از مایان نماید، و پس مخدوما به ظور به بر مایان کرده، که مهر خود جمله عشیران و شیخان و سیدان و افندیان بر مکتوب بزنند که این مردم، یعنی امیر رواندز بخواهش خود آورده‌ئین، مایان این میخواهیم هیچه دیگر نمیخواهیم، ولی مخدوما اگر از بهر ان نواب عالی روانه بکند اعتبار ندارند، آخر به ظور به بمایان نوشته‌کرده است اعتبار ندارند، آخر مهرها میشناسی مهر مایان اینست ازین ها اعتبار دارند**

## ناڤەرۆكا بەلگەنامەیێ ب كوردی:

بلا ل بەر چاڤێ جەنابێ هەوە بت كو هیڤی و رجایا مە ڤان هەژارێن سەرێ رێكان ل بەر بەرزەبووی و بێچارە ئەوە هوین پسیارا حالێ مە بكەن ژ بەر كو میرێ رەواندزێ موسلمان خلاصكرن، و چو موسلمان نەمان! ئاخری مە ڤان خزمەتكاران نەدیتییە و گوهـ ژی لێ نەبوویە، نە ژ بابێن خۆ و نە ژ باپیرێن خۆ، كو ل چو زەمانەكی مالباتا میر سێڤدینان ئەوێن ژ دووندەها عەبباسییان بێ بنیات مابن، و مالباتا

میر سێڤدینان ژ دەولەت سەرێ وی نووابێ عالی، ئەڤە حەفتێ حەشتێ بابە ئەڤ جهە - کو جهێ بەهدینانە- د دەست دا بوویە و ئەو ژ لایێ دەولەتێ ڤە ب ملکینی بۆ وان هاتییەدان، و حەددێ کەسێ نینە بێ ئەمرێ دەولەتێ حوکمی ل جهێ میرێن مالباتا سێڤدینان بکەت، پاشی ئەمیرێ رەواندزێ بێ ئەمرێ دەولەتێ و بێ ئەمرێ نووابێ عالی ب زۆری ئەو ژ دەست وان ئینادەر، و عەیالێ میر سێڤدینان و عەیالێ مە ئێخسیرکرن و بەر ب رەواندزێ ڤە برن، و وی نە ب ئەمرێ دەولەتێ و نە ب ئەمرێ نووابێ عالی ئەڤ چەندە کرییە، پشتی هنگی ڤان خزمەتکاران گوهـ لێ نەبوویە کو ل هیچ زەمانەکی عەیالێ موسلمانان بێنە ئێخسیرکرن و فرۆتن، و ئەم ئەڤ خزمەتکارە نە عەجەمین و نە فرەنگین، کو ئەو ئێخسیرێن مە ببەتە رەواندزێ و بفرۆشت!

نە خودێ و نە پێغەمبەرێ خودێ ب ڤان کاران دخۆش نینن، و ئەڤی بێبەختی نە ئەمرێ خودێ و نە یێ پێغەمبەرێ خودێ ب جهـ ئینایە، و وی موسلمان خلاص کرن، و هیچ موسلمان نەمان، و ئاخری چ عەیالێ مە بن چ عەیالێ میر سێڤدینان یێن عەبباسی بن، وی ئەو هەمی برنە رەواندزێ و ژ بێبەختی فرۆتن، مە ڤان خزمەتکاران ئەڤ رەنگە کارە ل هیچ زەمانەکی نەدیتییە، و ئەڤ رەنگە کارە ژ دەولەتا هەوە یا بلند نائێنە قەبوولکرن، کو ئەڤ کارە بێ ئەمرێ دەولەتێ و نووابێ عالی هاتییەکرن، و حوکمەت ل وەلاتێ میر سێڤدینان هاتییەراکرن، ئەم ئومێد و سەد ئومێدان ژ وی ڤەگەرێ گرفتارییان دکەین، ژ دەولەتا هەوە یا بلند، کو زوو هوین پرسەکێ ل حالێ مە ڤان بەندەیێن رێبەرزە و بێچارە بکەن، و ژ دەستێ ڤی بێبەختی خلاص بکەن، هیڤی و سەد هیڤی تەدبیرەکێ ل حالێ ڤان بێچارەیان بکەن، چونکی ئەم نەشێین ل بن حوکمێ ڤی بێبەختی روینین، حەتا نوکە مە ژ حیلە و درەوێن مەلا یەحیای باوەر دکر، بەلێ ئێدی ڕاستی ل بەر مە دیاربوو، و وەکی مە زانی ئەڤ کارە بێ ئەمرێ دەولەتێ و ئەمرێ نووابێ عالی چێبوویە، لەو ئێدی ئەم وی قەبوول ناکەین.

ڤێجا ژ دەولەت سەرێ خۆ ئەگەر هوون زوی پرسا حالێ ڤان بەندەیان نەکەن، ئەم نەشێین روینین، ئەم پێکڤە ب عەیال ڤە دێ ڤێرێ چۆل کەین، و قەستا دەولەتا مێردینێ کەین (هۆسا مە بەلگەنامە خواندییە، ڤێجا نزا کانێ دورست ئەو مێردینە یان نە!)، و ئەم ل بەر حوکمێ ڤی بێبەختی نامینین، ژ بەر کو میرێن سێڤدینان ژ ڤی جهی بێبار بووینە، و ئەم ژ وان بێبار بووینە، و ئەم کەفتینە بن دەستێ ڤان بێبەخت و بەدرەوشتان، ڤێجا هیڤی سەد هیڤی ژ نوابێ عالی و ڤەگەرێ گرفتارییان، کو ب چاڤێ دلۆڤانییێ بەرێ خۆ ب لایێ مەڤە بدەت، و ژ دەولەت سەرێ خۆ زوی پرسا حالێ مە ڤان رێبەرزەیان بکەت. پاشی ژ کەرەما خودایێ مەزن و ژ کەرەما نوابێ عالی مالباتا میر سێڤدینان خلاص نەبووینە، کورێ محەمەد تەیار پاشایی شیایە خۆ قورتال بکەت، و ئیسماعیل پاشا ژ نک وی مەخدوومی (پاشایێ بەغدا) هاتییە نک مە و مە ئەو ل نک خۆ پاراستییە، و مە باش و خراب پێکڤە بریار دایە کو گوهداریا وی نوابێ عالی و ئیسماعیل پاشایی بکەین.

مە میرێ هەکاری و هەمی عەشیرەتێن بۆتان و خان مەحموود ژێ ئاگەهدار کرینە، و مە گۆتنا خۆ کرییە ئێک، و مە نامەیا عەرزوحالا خۆ ژ لایێ مەلا و سەیید و عەشیران ڤە پێکڤە بۆ وەزیرێ بەغدا هنارت، بەلێ حەتا نوکە مە چو بەرسڤەک نەستاندییە، جارەکا دی ئومێدا مە ئەوە ژ بەر خاترا ڤان رێبەرزەیان تەدبیرەکێ ل حالێ ڤان بەندەیان بکەن، چەند مقدارێ عەسکەران و خلعەتەکا کەیفبەخشێ بکەنە بارا مەخدوومێ مە ئیسماعیل پاشایی چ ژ لایێ هەوە ڤە بت، چ ژ لایێ محەمەد پاشایی ڤە بت ل مێردینێ، چ ژ لایێ وەزیرێ بەغدا ڤە بت.

ئومێد ئەوە تەدبیرەکێ ل حالێ ڤان بەندەیان بکەن، ئاخری دەستێ مە یێ ب دەهمەن و دەستێ هەوە ڤە، و دەستێ هەوە ب دەهمەنا خودێ و پێغەمبەرێ خودێ ڤەیە! مە ژ ڤێ فتنێ خلاص بکەن، و ژ دەولەت سەرێ هەوە مە هەمی کار ب ستویێ خۆ ڤە گرتینە، سەرداریا لەشکەری، کیسێن پارە

و چەك و زەخیرەیێ شەڕی، ئەڤە خەما وی (ئانکو: ئیسماعیل پاشایی) و خەما مەنە، ئەم دێ کەلا ئامێدیێ ستینین، و هەر ئەم - ئەگەر خودێ حەز بکەت- دێ ڕەواندزێ ژی خراب کەین! چونکی ڤێ جارێ مە گیانێ خۆ یێ دانایە سەر ڤی کاری، ئەگەر خودێ حەز بکەت ئەم دێ کارەکێ وەسا کەین ئەو بۆ مە ڤان بەندەیان وەك خولامی بێتە هژمارتن.

ژ خۆ سەلیم پاشا ب ناڤێ عەجەمان چوویە بەغدا، چونکی ئەڤی بێبەختی هەمی ڕێێن دچنە بەغدا گرتینە، و ژ قودرەتا خودێ ل ڤان ڕۆژان شاهزادێ عەجەمان ژی مر، و وان ڕۆژان بەفرەکا وەسا باری نە ڕێکا چوونێ هەبوو نە یا هاتنێ.

ئیسماعیل پاشا نوکە یێ ل نك مە، و چو فەرق د ناڤبەرا مە و ئیسماعیل پاشایی دا نینە، ئەم ژ دەولەت سەرێ نوابێ عالی دخوازین کو خلعەتەکێ و چەند عەسکەران ب لایێ ئیسماعیل پاشایی دا بهنێرت، چ ژ لایێ خۆ ڤە چ ژ لایێ محەمەد پاشایی، چ ژ لایێ وەزیرێ بەغدا ڤە، هەر زوی ئەو چارەیەکێ بۆ ڤان بەندەیان ببینت، و هەمی ئیش و کاران بسپێرتە وان بەندەیان، و ئەگەر د ئەڤ سالە دا ئەو تەدبیرەکا زوو دگەل ڤان بێبەختان نەکەت و زوو وی ڕانەکەت و حەتا سالەکا دی ئەو ل ڤی جهی بمینت، ئەو دێ خۆ موکم کەت و مە خراب کەت، و هیچ کارەك مە نەمایە، و ئەوی زۆری ل مە کرییە کو ئەم عەشیر و شێخ و سەید و ئەفەندی مۆرێن خۆ ل سەر مەکتووبا وی زەلامی، یەعنی: میرێ ڕەواندزێ، بدانین. ڤێجا ئەگەر وی کاغەزا خۆ بۆ هەوە هنارت بلا نوابێ عالی چو ئعتبارێ نەدەتێ، چونکی وی ئەو ب زۆری ب مە دایە نڤیسین، و هوین مۆرێن مە دنیاسن. ئەڤ مۆرەنە یێن ل خوارێ و ئعتیبار بۆ وان هەیە[٢].

## ئەو کەسێن ئەڤ نامەیە مۆرکری:

ئەڤە ئەو نامە بوو یا هژمارەکا مەزنێن دەڤەرا بەهدینان بۆ سولتانی هنارتییە ستەنبۆلێ، و تێدا داخواز ژ وی کری ئەو د هەوارا وان بێت، و میرێ کۆرە دەربێخت، و جارەکا دی ئیسماعیل پاشایی بزڤڕینتە سەر تەختێ میراتییا بەهدینان.

و ئەو کەسێن مۆرا خۆ دانایە سەر ڤێ نامەیێ ل دووڤ هاتنا ناڤێن وان ئەڤەنە:

١- بندە مصطفی بیك أمیر برواریان:

ژ مۆرا وی دئێتە زانین کو ناڤێ وی موصطەفایێ کوڕێ خان ئاڤدەلییە.

٢- بندە علی بیك أمیر شیخان:

ئەڤ عەلی بەگە کوڕێ حەسەن بەگێ کوڕێ جۆلۆ بەگێیە، میرێ ئێزدییان بوو، و ئەو بوو یێ عەلی ئاغا و کوڕێ وی سنجان ئاغا ل قەسرا خۆ ل باعەدرێ کوشتین، پشتی ئەو بۆ کریڤاتییێ داخوازکرینە مالا خۆ، و دەمێ میرێ سۆران هێرش کرییە دەڤەرێن ئێزدییان هژمارەکا مەزن ژ خەلکێ مالا وی هاتنە گرتن، ژ وان کوڕێ وی حەسەن بەگ و کچا وی فاتما خاتوون، و گەلەك ژێ هاتنە کوشتن، و هندەك موسلمان بوون ژێ.

هندەك دیرۆکنڤیس ل وێ باوەڕێنە کو عەلی بەگ ب دەستێ سۆران هاتە ئێخسیرکرن، و وان ئەو برە وی جهێ نوکە دبێژنێ: گەلییێ عەلی بەگ، و ل وێرێ کوشت.. بەلێ دیارە چو ڕاستی بۆ ڤێ گۆتنێ نینە، چونکی پشتی ستاندنا دەڤەرێن ئێزدییان و ڕاکرنا فەرمانا وان ب نێزیکی سالەکێ، ئەڤە ئەم دبینین ئەو د گەل هژمارەکا مەزنێن بەهدینان نامەیێ بۆ سولتانی مۆر دکەت، لەو گۆتنا صەدیق دەمەلۆجی پتر دئێتە باوەرکرن دەمێ دبێژت: د سالنامەیا موسلێ یا سالا ١٣١٢ هاتییە کو والییێ مووسلێ عەلی بەگ د گەل هندەك ئاغایان ل جهەکێ دبێژنێ: گرێ عەرەبا کوشت، و سەرێ وی بری و هاڤێتە درووبارێ خازر دا.. و دەمەلۆجی ل وێ باوەڕێیە کو ئەڤ رووداںە ل سالا ١٢٥٤ مش چێبوویە[٣].

یەعنی: پشتی نڤیسینا ڤێ بەلگەنامەیێ ب چار سالان.

و ئەڤ عەلی بەگە باپیرێ باپیرێ تەحسین بەگێ میرێ ئێزدییان یێ نهایە.

٣- بنده صادق بيك أمير نيرويان.

٤- بنده سليم خان بيك أمير برادوستان:

ناڤێ وی د مۆرا وی دا ب ڤی ڕەنگی هاتییە: (محمد سليم).

٥- بنده أوليا بيك أمير ريكانيان:

ناڤێ وی د مۆرێ دا هاتییە: ئەولیا کوڕێ عززەدینی.

٦- بنده حسن أغای ارگوشيان:

ناڤێ وی د مۆرێ دا هاتییە: حەسەن کوڕێ عومەری.

٧- بنده خليل أغای دنان:

د مۆرا وی دا هاتییە: بەندە خودا خەلیل.

٨- بنده شاهين أغای دوسكيان:

د مۆرا وی دا هاتییە: شاهین کوڕێ ڕەشۆ، و ل دووڤ گۆتنا مەلا ئیبراهیمێ چێیی کو ئێك ژ عەمردرێژ و ناڤدارێن چێییانە، ئەڤ شاهین ئاغایە ژ باپیرێن سەعیدێ ئاغایێ گەرماڤی یە، و مەلا ئیبراهیم دبێژت: مە دگۆتە مالا سەعید ئاغایی: مالا شاهین ئاغایی.. و ئاشکەرایە کو د ناڤبەرا شاهین ئاغایی و سەعید ئاغایی شێست حەفتێ سالەکن.

٩- بنده براهيم أغای سليفانيان:

د مۆرا وی دا هاتییە: ئیبراهیم کوڕێ محەمەدی.

١٠- بنده حامد أغای سنديان:

دیرۆکا (١٢٥٠) ل سەر مۆرا وی هەیە، تشتێ هندێ دگەهینت کو ئەڤ نامەیێ ل ڤێ سالێ هاتبوو نڤیسین.

١١- بنده اسماعيل أغای گوليان:

د مۆرا وی دا هەر وەکی ئیسماعیل کوڕێ ئیبراهیمی هاتییە.

١٢- بنده عبد القادر أغای گرديان (گەردییان).

١٣- بنده زبير أغای بروژيان (بەڕۆژییان).

١٤- بنده عبدی أغای مزوريان:

د مۆرا وی دا هاتییە: عەبدی کوڕێ سلێمانی، و ئەم نزانین کانێ پەیوەندییەکا وی ب عەلی ئاغایێ بالەتەیی ڤە هەیە یان نە.

١٥- بنده شڤان أغای سورجيان (سوورچییان).

١٦- بنده بهرام أغای هركيان (هەرکییان).

١٧- بنده عمر أغای زيباريان (زێبارییان).

١٨- بنده قپلان أغای شرفان (شەرەفان).

١٩- بنده كلش ريش سفيد اركوشيان:

ئێك ژ ڕێهسپیێن ئەرگۆشییانە، و د مۆرا وی دا هاتییە: عەبد (یان عبده) کەلەش.

ئەڤە ئاغا و بەگێن دەڤەرێ بوون، و ژ شێخ و مەلا و سەیدان، ئەڤ ناڤە ل سەر بەلگەنامەیێ هەنە:

٢٠- داعی شيخ نور الدين بزرگترين شيخان مزوريان:

و ئاشکەرایە کو ئەو شێخ نورەددینێ بریفکییە، و د هندەك ژێدەران دا هاتییە کو شێخ نوورەددین ژ پشتەڤانێن مەلا یەحیایێ مزویری بوو، بەلێ ئەڤ خەلەتییا وێ بۆچوونێ ئاشکەرا دکەت، و بەلکی شێخ نوورەددین ژی ل دەسپێکێ ئێك ژ وان کەسان بت یێن باوەر ژ گۆتنێن مەلا یەحیایی کری، پاشی پشتی هنگی نەدورستییا گۆتنێن مەلا یەحیایی بۆ وی ئاشکەرا ببت، لەو وی ژی خۆ دابتە د گەل ڤان مرۆڤان، و ئاشکەرایە کو شێخ نوورەددین ئێك ژ فەقیێن مەلا یەحیایی بوو. و د مۆرا شێخی دا هاتییە: (عبده نوری ١٢٥٠) و ژ ڤێ ژی دئێتە زانین کو نامە ل ڤێ سالێ هاتییە نڤیسین.

٢١- داعی شيخ عبد الغفور بزرگترين شيخان بريفكيان:

د مۆرا وی دا هاتییە: عەبدلغەفوورێ کوڕێ محەمەدی.. و د شەجەرا مالباتا شێخ شەمسەددینێ قوطب دا، ئەوا ژ لایێ شێخ مەمدووحێ بریفکی ڤە هاتییە دورستکرن شێخەك ب ناڤێ عەبدلغەفوور هەیە دبتە کوڕێ ئەحمەد (نەکو موحەممەد) کوڕێ شەمسەددین کوڕێ ئیسلام، کوڕێ شەمسەددین، کوڕێ شێخ عەبدررەحمانێ کوڕێ شێخ شەمسەددینێ مەزن یێ ئەخلاتی.. و ئەز نزانم ئەڤە دێ هەر ئەو بت یان نە؟!

٢٢- داعی سيد عبدالله مفتی زاخو:

د مۆرا وی دا هاتییە کو ناڤێ وی عەبدللاهێ کوڕێ مەحموودییە.

٢٣- داعی سید عبدالله مفتی عقره:

د مۆرا وی دا هاتییە کو ناڤێ وی عەبدللاهێ کوڕێ طاهایە.

٢٤- داعی شیخ یونس نقیب شیخ سوسندی:

ئەڤ پەیڤا دویماهییێ من نەزانی باش بخوینم کانێ سوسندی یان سوستری یان تشتەکێ دیە، د مۆرا وی دا هاتییە: یوونسێ کوڕێ خەلەفی.

٢٥- داعی سلطان نقیب شیخ عبد العزیز:

د مۆرێ دا هاتییە: عەبد (یان عبده) سلگان.

٢٦- داعی سید رشید سید قلعه عمادیه:

د مۆرێ دا هاتییە: ڕەشید کوڕێ موحەممەدی، دبێژت: زیارەتەکێ ناڤدار ل ئامێدییێ هەبوو دگۆتنێ: زیارەتێ سەید محەمەد ڕەشیدی، هەر وەسا مزگەفتەك ژی ب ناڤێ وی هەبوو، و بەلکی ئەو ئەڤە بت.

٢٧- داعی ملا أسعد مفتی قلعة و عمادیة:

د مۆرا وی دا هاتییە: موحەممەد کوڕێ عوبیدی، و دبت ناڤێ وی یێ تمام محەمەد ئەسعەد بت، بابێ وی عوبەیدوللاهـ ئەفەندی کوڕێ مەلا مەحموودێ بەهدینی یێ ناڤدارە، کو سەیدایێ مەلا یەحیایێ مزووری و مەلا خەلیلێ سێرتی بوو، بنیاتێ وان ژ گوندێ (بەهۆس)ێنە کو ئێك ژ گوندێن مزووری ژۆرویانە، و ئەو ژ مالباتەکا علمی یا ناڤدارن ل دەڤەرێ، مەلا ئەسعەد ل جهێ بابێ خۆ ل سالا ١٢٤٣ مش (١٨٢٧ ز) بوو مفتییێ ئامێدییێ و حەتا مرنا خۆ ل سالا ١٢٥٦ ژی هەر مفتی بوو.

٢٨- داعی ملا محمد قاضی قلعەء عمادیە:

د مۆرا وی دا هاتییە: موحەممەد کوڕێ حەسەنی.

٢٩- داعی ملا محمد خطیب عقره.

ئەڤە وەك شێخ و سەید و زانا، و ژ بلی وان چار ماقویلێن ئامێدییێ ژی مۆرا خۆ دانایە سەر ڤێ بەلگەنامەیێ ئەو ژی ئەڤەنە:

٣٠- داعی سلیمان معقول قلعەء عمادیە.

٣١- داعی عبد الله معقول قلعەء عمادیە.

د مۆرا وی دا هاتییە: عەبدوللاهـ کوڕێ ئەحمەدی.

٣٢- داعی ابراهیم معقول قلعەء عمادیە.

د مۆرا وی دا هاتییە: ئیبراهیم کوڕێ ئەحمەد.

٣٣- داعی عمر معقول قلعەء عمادیە.

د مۆرا وی دا هاتییە: عومەر کوڕێ مووسایی.

## ئەڤ نامەیە کەنگی هاتییە نڤیسین:

هەر چەندە دیرۆکا نڤیسینێ ل سەر ڤێ بەلگەنامەیێ نینە ژی، بەلێ پتر ژ نیشانەکێ د ناڤەرۆکێ دا هەنە دیرۆکا نڤیسنێ بۆ مە ئاشکەرا دکەن، کو سالا (١٢٥٠) مشەختییە (بەرانبەر سالا ١٨٣٤ز)یە.. ژ وان:

ئێك: ئەڤە دیرۆکە ب ئاشکەرایی ل سەر مۆرا شێخ نوورەددینێ بریفکی، و حامد ئاغایێ سندی دئێتە دیتن.

دو: د جهەکی دا ژ بەلگەنامەیێ هاتییە: ((ژ خۆ سەلیم پاشا ب ناڤێ عەجەمان چوویە بەغدا، چونکی ئەڤی بێبەختی هەمی ڕێیێن دچنە بەغدا گرتینە، و ژ قودرەتا خودێ ل ڤان ڕۆژان شاهزادێ عەجەمان ژی مر))، و وەسا دیارە کو ئەڤ سەلیم پاشایێ بەحس ژێ هاتییەکرن ئەوە یێ ڕەسوول بەگێ برایێ میرێ کۆرە حاکمێ ئاکرێ پشتی ئەو ستاندی و ئیسماعیل پاشا ژێ ڕەڤی و قەستا برایێ خۆ محەمەد سەعید پاشایی کری ل ئامێدیێ. و شاهزادێ عەجەمان یێ کو ئیشارەت بۆ مرنا وی هاتییەدان شاهـ عەبباس میرزایێ کوڕێ فەتح عەلییە ئەوێ ل سالا ١٨٣٤ مری.

سێ: بەری نوکە مە گۆتبوو ل پائیزا سالا ١٨٣٢ میرێ کۆرە هێرش کرە سەر دەڤەرا ئێزدییان، و ل سالا د دووڤ دا وی هێرش کرە سەر ئامێدییێ، و پشتی دووریێچەکا درێژ ئەو شیا ئامێدییێ بستینت، و هنگی محەمەد سەعید پاشا و برایێ وی ئیسماعیل پاشا شیان بڕەڤن و خۆ قورتال بکەن، و میرێ کۆرە مووسا بەگێ برایێ محەمەد سەعید پاشایی دانا سەر

تەختێ میراتییێ ل ئامێدییێ و ڤەگەریا رەواندزێ، ئەڤ چەندە ل سالا (١٢٥٠مش) بوو، و پشتی میرێ کۆرە زڤرییە رەواندزێ، خەلك دژی مووسا بەگێ ڕابوون و ئەو ئێخست و برایێ وی محەمەد سەعید جارەکا دی کرە میر، و گاڤا میرێ کۆرە ئەڤ چەندە زانی دوبارە هێرش کرە سەر ئامێدییێ و ڤێ جارێ ب دژواری سەرەدەری د گەل خەلکی کر، و گەلەك کوشتن و ئێخسیرکرن، و ئێك ژ وان ییێن وی گرتین محەمەد سەعید پاشا ب خۆ بوو، و هندەك ژێدەرێن دیرۆکی ئاشکەرا دکەن کو میرێ کۆرە ئەو د گەل دەیکا وی و دو کورێن وی حوسێن بەگ و قاسم بەگ کوشتن[٤].

و د ڤێ روودانێ دا ئیسماعیل پاشا شیا جارەکا دی برەڤت و خۆ قورتال بکەت، و قەستا دەڤەرا نێروەییان بکەت، و پشتی دەمەکی ژ مانا وی ل وێرێ وی قەستا میرگەها هەکارییان کر، و داخوازا هاریکارییێ ژ میرێ جولەمێرگێ نوورولڵاهـ بەگێ کر.

ژ ناڤەرۆکا بەلگەنامەیێ دئێتە زانین کو دەمێ محەمەد سەعید پاشا هاتییەگرتن، و ئیسماعیل پاشا رەڤی و خۆ ڤەشارتی، هنگی ئەڤ نامە بۆ سولتانی هاتبوو نڤیسین؛ چونکی خودانێن نامەیێ پتر ژ جارەکێ ب ئاشکەرایی دبێژن: ئیسماعیل پاشا یێ ل نك مە، و مە ئەو پاراستییە.. و دەمێ ئەو داخوازێ ژ سولتانی دکەن کو ئەو خلعەتێ بۆ ئیسماعیل پاشایی بهنێرت، و وی بکەتە میر، بەلکی ژێ بێتە زانین کو محەمەد سەعید پاشا نەمابوو، ئەگەر نە.. ئەو دا ژ سولتانی خوازن ئەو ببتە میر؛ چونکی بەری هنگی میر ئەو بوو، بەلێ ئەڤە نیشانە کو میرێ کۆرە هنگی ئەو کوشتبوو. و هەر چاوا بت، ئەڤ روودانە ل سالا (١٢٥٠مش) یێ چێبووبوون.

ژ بەر ڤێ چەندێ ئەم دبێژین: دیرۆکا نڤیسینا ڤێ بەلگەنامەیێ دڤێت سالا (١٢٥٠مش/١٨٣٤ز) بت.

### هندەك تێبینی ل سەر ناڤەرۆکا بەلگەنامەیێ:

ب خواندنا ڤێ بەلگەنامەیێ هندەك تێبینی ل دۆر ناڤەرۆکا وێ ل نك مرۆڤی پەیدا دبن، ئەو ژی ب کورتی ئەڤەنە:

١- وەسا دیارە کو مەلا یەحیایێ مزویری دەورەکێ مەزن د خاپاندنا خەلکێ دەڤەرا بەهدینان دا گێرابوو، حەتا وان بۆ میرێ کۆرە بکەتە پشتەڤان، و وی مەنصبێ خۆ یێ دینی بۆ ڤێ ئارمانجێ ب کارئینابوو، و فەتوایەکێ دینی ئێخستە د خزمەتا سیاسەتەکا خەلەت دا، و ژ گۆتنا خودانێن ڤێ نامەیێ دئێتە زانین کو ((حەتا نوکە مە ژ حیلە و درەوێن مەلا یەحیای باوەر دکر، بەلێ ئێدی راستی ل بەر مە دیاربوو، و وەکی مە زانی ئەڤ کارە بێ ئەمرێ دەولەتێ و ئەمرێ نوابێ عالی چێبوویە، لەو ئێدی ئەم وی قەبوول ناکەین..)) و ژ ڤێ گۆتنا وان دئێتە زانین کو دبت مەلا یەحیایی خەلك وەسان تێ گەهاند بت کو هێرشا میرێ کۆرە ب ئەمرێ سولتانی و دەولەتێیە و ب ئاگەهدارییا وانە، بەلێ پشتی هنگی بۆ وان دیاربوو کو ئەڤ گۆتنە درەو و حیلە بوو، و نە سولتانی و نە دەولەتێ ئاگەهـ ژ ڤێ مەسەلێ نینە، لەو ئێدی ئەو گۆتنێن مەلا یەحیایی قەبویل ناکەن.

٢- هێرشا میرێ کۆرە بۆ سەر دەڤەرا بەهدینان فەرمانەکا دژی ئێزدییان نەبوو، و ئەو جیهاد ژی نەبوو، وەکی ژ هندەك لایان ڤە دئێتە سالۆخدان، هەر چەندە ئەو ب وی ناڤی هاتبووکرن، و پشکا ئێزدییان د قوربانیدانێ دا ژ یا هەر ئێکێ دی پتر بوو، بەلکی ئەو تشتێ لەشکەرێ سۆران ئینایە سەرێ کوردێن ئێزدی - وەکی ژ ڤێ بەلگەنامەیێ دئێتە وەرگرتن- وەکی وێ ئینابوو سەرێ کوردێن موسلمان ژێ، و ئەگەر وان خۆ ب هندێ قانع کربت کو ئەوا وان دژی ئێزدییان جیهاد و خزمەتا دینی بت، ئەرێ وان ب چ هێجەت خۆ ب وێ قانع کربوو یا وان ئینایە سەرێ موسلمانان؟!

٣- نڤیسەرێن (گازندەنامەیێ) ب ئاشکەرایی دبێژن: ئەوا میرێ کۆرە و لەشکەرێ وی ئینایە سەرێ موسلمانێن دەڤەرێ (بەلێ، موسلمانان ژێ و نە ب تنێ ئێزدییان) چو جاران وان ب چاڤ نەدیتییە و ب گوهـ ژێ ژ باب و باپیرێن خۆ نەبهیستییە.. ئەو ژێ ئەڤەیە موسلمان ژن و مێر بێنە ئێخسیرکرن و فرۆتن وەك عەبد و جارییان، کو لەشکەرێ سۆران ئەڤ چەندە کرییە، و ئەگەر کەسەك بێژت: بەلکی

ئەڤە مەزنكرنەك بت بۆ مەسەلێ ژ لایێ وان ڤە دا ئەو پشتەڤانییا دەولەتێ پێ ب دەست خۆ ڤە بینن، ئەم دێ بێژین: ئیمزاكرنا دەهـ ژ شێخ و سەیید و مفتی و مەلایێن دەڤەرێ ل ئاكرێ و ئامێدییێ و زاخۆ و بریفكان.. هندێ دگەهینت كو ئەڤ خەبەرە تشتەكێ ڕاستە و درەو تێدا نینە، ئەگەر چاوا ئەو دا مۆرا خۆ هاڤێنە سەر ڤێ درەوا هندە مەزن؟!

٤- ئەو ئاغا و زانا و ماقویلێن ئەڤ نامەیێ بۆ سولتانی مۆركری ل دویماهییا نامەیا خۆ ئاشكەرا دكەن كو میرێ ڕەواندزێ كوتەكی ل وان كرییە كو ئەو نامەیەكێ بۆ ستەنبۆلێ بهنێرن، تێدا پشتەڤانییا خۆ بۆ وی نیشا سولتانی بدەن، بەلێ دڤێت كەسێن پەیوەندیدار ل ستەنبۆلێ باش بزانن كو ئەڤ نامە، نە كو یا دی ئەوا ب كوتەكی ل سەر ناڤێ وان هاتییە نڤیسین، دەربڕینێ ژ بۆچوونا وان یا دورست دكەت، و كو ئەو نە د گەل میرێ ڕەواندزێنە، و قەت ب حوكمێ وی درازی نینن.. لەو ئەگەر ل پاشەڕۆژێ نامەیا دی ب ناڤێ ڤان كەسان د ئەرشیفێ ئۆسمانییان هاتە دیتن و تێدا ئەو پشتەڤانیا میرێ كۆرە بكەن، دڤێت بێتە زانین كو ئەو ژ درەو و ب كوتەكی ل سەر ناڤێ وان هاتییە نڤیسین.

٥- دەمێ ڤان مرۆڤان ئەڤ نامەیە نڤیسی میرێن مالباتا میر سێڤدینان تەڕا و بەڕا بووبوون، هندەك ژ وان دگرتی و كوشتی بوون، و هندەك ڕەڤی بوون و دەربدەر بووبوون، و چو دەستەلات وان نەبوو، لەو نائێتە هزركرن كو وان كوتەكی ل ڤان مرۆڤان كربت حەتا ئەو ڤێ نامەیێ بنڤیسن، و بۆ سولتانی بهنێرن.

٦- تشتێ بالكێش د نامەیێ دا ئەوە هەر جارەكا ئەو بەحسێ میرێ كۆرە و كۆما وی دكەن، ئەو وان ب ناسناڤێ بێبەخت و بێڕەوشت ناڤ دكەن، تشتێ هندێ دگەهینت كو زولما وان ژ توخیبان دەرباس بووبوو و كێر گەهشتبوو سەر هەستی!

٧- ژ لایەكێ دی ڤە هەبوونا مۆرا میرێ شێخان یێ ئێزدی و ئاغایێ دەنان، ب ڕەخ مۆرا شێخەكێ وەكی شێخ نوورەددینێ بریفكی، و مفتییێن ئاكرێ و ئامێدی و زاخۆیێ، د گەل مۆرێن ئاغایێن هەمی عەشیرەتێن بەهدینان، هندێ دگەهینت كو هەلویستێ كوردێن بەهدینان ب موسلمان و ئێزدی ڤە ئێك هەلویست بوو، و ئەو هەمی ئێك دەست بوون، و وان ب ئێك چاڤی بەرێ خۆ ددا ڤێ زولما لەشكەرێ میرێ سۆران د گەل خۆ ئینای، و موسلمانێن دەڤەرێ ئەڤ كارە وەك كارەكێ هۆڤانە و بێبەخت ددیت نە كو جیهاد و كارەكێ پیرۆز، وەكی مەلا یەحیای و پشتەڤانێن وی دڤیا خەلكی تێ بگەهینن.

## ژێدەر:

١. سەرهاتییا هێرشا میرێ كۆرە بۆ دەڤەرا بەهدینان، د گەلەك ژێدەران دا هاتییە، و ل ڤێرێ مە كورتییەك ژ وان ژێدەران وەرگرتییە، ژ وان ژێدەران -بۆ نموونە-: (تاریخ العراق بین احتلالین) یا عەبباس ئەلعەززاوی، (الیزیدیة) یا صەدیق دەمەلۆجی، (الأكراد في بهدینان) یا ئەنوەر مائی، (الأمیر الكردي میر محمد الرواندزی) یا جەمال نەبەز، و ئەو كتێبێن ل سەر دیرۆكا میرگەها بادینان هاتینە نڤیسین.
٢. ب هاریكارییا هەردو هەڤالان نزار گولی و ئایمان گەڤەری ئەڤ بەلگەنامە هاتییە ڤەگوهاستن، لەو ئەم سوپاسییا وان دكەین.
٣. صدیق الدملوجی: الیزیدیة، چاپا دووێ ٢٠١٠، ص ٧٠.
٤. د. عماد عبد السلام رؤوف: المعجم التاریخي لإمارة بهدینان، أربیل، ٢٠١١، ص ٣٣٢.

# کوتاهییا میرگەها بەهدینان و میرێ وێ یێ زانا و وەلاتپەروەر ئیسماعیل پاشایێ دویێ

سەعید دێرەشی

ئامێدیێ، پایتەختێ میرگەها بەهدینان، وەکی گەلەك باژێر و پایتەختێت دی یێت میرگەهێت کوردا، جهێ وەرارا ئاڤەدانی (حضارە) و باژێرڤانییا کوردا بوویە. دیسا وەکی گەلەك میرگەهێت کوردا دیرۆکا وێ ژی هێشتا نەهاتییە موخل و بیژینك کرن و گەلەك راوەستگەهێت بەرکەفتی ژی د مێژوویا وێدا هێشتا دڤەشارتینە. ئەم دشێین ب رێکا ڤەکۆلینان ل سەر شوینوارێت وێ و دیسا میر و زانایێت وێ گەلەك کوژی و قولاچێت تاری رۆهن کەین.

## رەوشا دەولەتا ئوسمانی د دەسپێکێت سەدسالییا نۆزدێ دا

هەردو ئمپراتۆریێت کەڤن و خلۆلە و هەرفتە یێت ئسلامێ، ئیمپراتۆریا ئوسمانی و یا ئیرانی (قاجاری)، د چەرخێت دویر و درێژ دا خۆ ل سەر کوتەکی و زولم و زۆرێ ئاڤاکربوو و ب ناڤێ دینی هەمی ملەت و دیانەت و هزرێت جودا دهەرشاندن و بنپێ دکرن. دنیا هاتەگوهرین، ئەوروپا بەر ب ئاڤەدانیێ و پێشکەفتنێڤە چوو، پێلێت بایێ پێشکەفتنێ هەر دارەك ل دنیایێ هژاند، بەلێ ئەڤ هەردو دەولەتێت کەڤنار هەر مانە سەر کوتەکی و زۆریا خۆ.

د گرێکا ئێکێ ژ سەدسالییا نۆزدێ ژی دا ، ترکیا ئوسمانی ل سەر وان لێکڤەکرنێت رێڤەبەریێ ئەوێت سولتانێ ئوسمانی مرادێ سێیێ (١٥٧٤-١٥٩٥) چێکرین، هەر ما. ئانکو وەلات ل سەر ٢٦ ئیالەتا هاتبوو لێکڤەکرن، ئیالەت ژی ل سەر ١٦٣ لیوایا هاتبوو لێکڤەکرن، هژمارا لیوایا گەهشتبوو ١٨٠٠ان، ئو ئەڤ لێکڤەکرنە هەتا سالا ١٨٣٤ێ نەهاتنە لڤاندن و وەکی خۆ مان[1].

پشتی سالا ١٨٣٤ێ، حوکمەتا ئوسمانی پێکۆلێت مەزن کرن کو سەروبەرێ خۆ یێ ئابووری و عەسکەری و رێڤەبرنێ بگوهۆریت. وێ چاڤدا دەولەتێت ئەوروپی یێت پێشکەفتی و خودان قانون و سیستێم. دەولەتا ئوسمانی ژی دەست ب گوهۆرینا کر، گەلەك تشت ل سەر کاغەزێ گوهرین، گەلەك قانون دەرێخستن، بەلێ کەسەك د دەولەتێدا نەبوو وان قانونا بێخیتە دبیاڤێ کریارێ دا. هەمی فەرمانبەر و خەباتکارێت

ئمپراتۆریێ دگەنی بوون و ئەڤ سەروبەرکرنە (اصلاحاتە) چ ژ وانا نەهاتنە بجهئینان، چمکی حوکمەتا ئوسمانی هەر ل دویڤ ئاقلێ بەرێ برێڤە دچوو. ئەوێ دڤیا سەروەرییەکا شەرگەهی (مەرکەزی) چێکەت و سەروبەرێ ئەشیری و نزاما میرگەهان بهەرفینیت و هەر کارەك د بن سیبەرا وێدا برێڤە بچیت. ئەڤێ چەندێ ژی دربەکا مەزن ل سەروەریا میرگەهێت کوردا دا، ب هەمی لایاڤە کورد کەڤتنە بن گڤاشتنێ و دەرگەهێت شەڕ و جەنگا ل سەر هاتنە ڤەکرن، ئێدی نەچاربوون بەرەڤانیێ ژ خۆ و میرگەهێت خۆ و سەروەریا خۆ بکەن.

هەر د ڤان دەما دا، ئانکو: «هاڤینا سالا ١٨٣٩ێ، لەشکەرگەها ئوسمانییا هەمبەرێ هێزێت محەمەد عەلی پاشایێ مسرێ ل (نزیپێ) هەلوەشیا. کورتەدەمەکی پشتی وی شەڕی، سولتان مەحموودێ ئوسمانی ل پایتەختی مر و سولتان عەبدولمەجید بوو سولتانێ نوی یێ ئوسمانییا. پاییزا ١٨٣٩ێ، فەرمانا تەنزیماتێ ل پایتەختی هاتە هەلدێران، ئەڤ فەرمانهەلدێرانە هەم د دیرۆکا ئوسمانییان و هەم ژی دیرۆکا میرگەهێت کوردان دا خودانێ خۆ گرنگییەکا گەلەك مەزنبوو. ژ بەرکو، ب وێ فەرمانێ، سیاسەتا ئوسمانییان یا ل سەر بنیاتێ هشمەندییا (ئادەم-ێ مەرکەزی)» هات ڤەگوهاستن بۆ پەرگالەکێ نوی یێ (مەرکەزی)[٢].

ژبەر هەرفتەبوون و خلۆلەبوونا ڤێ ئمپراتۆریێ، ئێدی خەلکێ بیانی چاڤێ خۆ بەردا میراتگریا وێ یا بەرفرەهـ ژ رەخەکی ئویرسی هندەك پارچە ژ لەشێ وێ ڤەقەتاندن و ژ رەخەکێ دی ئەورۆپا گەلەك پارچە ژ لەشێ وێ ڤەقەتاندن. ئێدی هەڤرکیا دەولەتا ل سەر قەرقوودێ وێ دژوار بوو، بەلێ دیسا ژی وان نەدڤیا دەولەتا ئوسمانی ب دروستی بکەڤیت، ژ هندەك لایاڤە پارچە پارچە کر و ژ هندەك لایاڤە ژی دەستێ خۆ ددا بەر کو نە کەڤیت.

ژبەرکو کورد گەلەك نیزیکی شەرگەها دەولەتا ئوسمانی بوون و کوردستان دکەڤتە سەر توخوبێ پایتەختی، دەولەتا ئوسمانی پێکۆلێت مەزن کرن کو کوردستانێ وەك ملکێ خۆ بهێلیت و بۆ وێ بمینیت. دەولەتێت ئەوروپی ژی رێك لێ نەگرت و بەلکی هاریکاریا وێ ژی دژی سەرهەلدانێت کوردا کر و کوردستان کرە گۆری مەسلەحەتێت خۆ.

ناڤدارێ ئەلەمان یێ لەشکەر مارشال هێلمۆت فۆن کارل مۆلتکێ{١٨٠٠-١٨٩١} ئەوێ کو باب العالی د سالا ١٨٣٤ هەتا ١٨٣٩ێ بۆ خۆ کریە هاریکار کو لەشکەرێ ئوسمانی لدویڤ ئاوایێت هەڤچەرخ بسەروبەر بکەت، ئەو وەکی مفەتتش کەڤتە دناڤ لەشکەرێ حافز پاشای دا و کەڤتە دناڤ شەڕادا دژی وان کوردێت بەرامبەر سەروەریا ئوسمانی یا هنگی سەرهەلداین[٣].

هەر ل سەر داخازا مۆلتکێ و سولتان مەحموودی، مەلکێ پرووسیا فریدریش ڤیلهێلمێ دویێ چار ئەفسەرێت دی هەر بۆ مەرەما نویکرنا لەشکەرێ ئوسمانی ل پاییزا ١٨٣٧ێ هنارتنە ستەنبۆلێ[٤].

گەلەك هاریکارییێت دی ژی بۆ دەولەتا ئوسمانی ژ لایێ ئەوروپاڤە هاتن و ئەڤان هاریکاریا ئێکا وەکر کو ئوسمانی بشێن ئێك ل دویڤ ئێکێ میرگەهێت کوردا بهەرفینن، کو ئێك ژ وانا میرگەها بەهدینان بوو، یا کو ئیسماعیل پاشایێ کوڕێ مەحەمەد تەیار پاشایی برێڤە دبر. کو د چەند بەرپەرێت بهێت دا ب درێژی دێ ل سەر ڤی میری و خۆڕاگریا وی بەرامبەری ئێریشێت میرێ کۆرە ژ لایەکی و پاشی ئێریشێت دەولەتا ئوسمانی بۆ سەر میرگەها بەهدینان بەحس کەین.

## سەرهاتیا ئیسماعیل پاشای دگەل میرێ کۆرە و پاشی دەولەتا ئوسمانی

### کورتیەك ل سەر ژینا وی

ئیسماعیل پاشا ل کیرێ ژ دایکبوویە؟ ئەم نزانین! ژبەرکو بابێ وی محەمەد تەیار ل گەلەك جهێت بەهدینان خۆجهبوویە، ژبەر ڤێ چەندێ ئەم ب دروستی نزانین کا ل ئاکرێ، ئامێدیێ، کەلا قومریێ ئان ل جهەکێ دی یێ ڤی وارگەهی هاتییە

سەر دنیایێ!. دیسا ئەم نزانین ژی کیژ سال بوویە، بەلێ دێ پێکۆلێ کەین کو هندەکێ ژ ژیندارییا وی ڤەرویشینین، بەلکی بشێین خۆ نێزیکی سالێت ژدایکبوونا وی بکەین.

ل ١٨ صەفەرا سالا ١٢١٣مش. ١٧٩٨ز ئیسماعیل پاشا (باپیرێ ڤی ئیسماعیلی) کورێ بەهرام پاشایێ خودانێ ئامێدیێ مر. کورێ خۆ یێ بچویك محەمەد تەیار کرە میراتگرێ خۆ[٥].

ئەڤ ئیسماعیل پاشایێ دویێ، کورێ محەمەد تەیاری یە. محەمەد تەیاری ئەو ب ناڤێ بابێ خۆ ئیسماعیل پاشایێ ئێکێ ناڤکریە. محفوظ العباسی دبێژیت: (محەمەد تەیار کورێ ئسماعیل پاشایێ ئێکێیە و ژ هەمی برایێت خۆ یێت ژنا ئێکێ بچویکترە)[٦]. مەلا ئەنوەرێ مایی ژی دبێژیت: محەمەد تەیار ژ هەمی برایێت خۆ بچویکتر بوویە، وەختێ بابێ وی مری، هێشتا تۆلاز بوو و ژیێ وی ژ ١٦ سالا نەدبۆری[٧].

وەختێ محەمەد تەیار د ژیێ ١٦ایێدا دبیتە میراتگرێ بابێ خۆ، یا بەرئاقل ئەوە کو وی زوی ژن ئینایە. ئەم دشێین ب گۆترە وەسا دانین کو پشتی هنگی ب دەهـ سالا ئیسماعیل پاشا ژ دایکبوویە. ب ڤێ لێکدانا هەنێ ژ دایکبوونا ئیسماعیل پاشایێ دویێ دێ کەڤیتە نێزیکی سالا ١٨٠٨زا. مرنا وی ژی کو دێ ب درێژی بەحس کەین، سالا ١٨٧٢ ل بەغدا چوویە بەر دلۆڤانیا خودێ. ل دویڤ ڤێ لێکدانێ ئیسماعیل پاشایێ دویێ ٦٥ سالا ژیایە.

## پشتی محەمەد تەیاری کی بوویە میرێ بەهدینان؟

پشتی محەمەد تەیار مری، وی میرگەهـ سپارتە ئیسماعیلی[٨]، بەلێ برایێت وی لێکنەگرتن و دوتایی د ناڤبەرا واندا چێبوو.

سالا ١٢٤٠مـــش/١٨٢٤ز. زوبەیر پاشا چوو بەر دلۆڤانییا خودێ و چ دوندەهـ (زوریەت) ژی پاش خۆڕا نەهێلان، ژبەر وێرێ ژی کورێت برایێت وی میران بەگ، مووسا بەگ، سەعید بەگ و ئیسماعیل بەگ کەڤتنە دهەڤرکێیدا ل سەر میرگەهێ[٩].

سەعید پاشا و ئیسماعیل پاشا هەردو دبنە کورێت محەمەد تەیار پاشای. سەعید پاشا شیا برایێ خۆ ئیسماعیل پاشای قایل کەت و بکێشیتە رەخێ خۆ و پاشی ل سەر میران بەگێ و مووسا بەگێ بسەرکەڤیت. بەلێ پا بەری دەست ب حوکمی بکەت سەرهەلدان و ئاریشێت ناڤخۆیی ئێك ل دویڤ ئێکێ پەیدا بوون[١٠].

د وی دەمیدا میر ئیسماعیل دبیتە میرێ ئاکرێ و سەعید پاشایێ برایێ وی ژی دبیتە میرێ بەهدینان ل ئامێدیا پایتەخت حوکمێ خۆ دگێڕینیت.

## سەرهەلدانا ئارێشێ

(میر ئیسماعیل ب بەردەوامی د شەڕیدا بوو، هەم ل دژی مرۆڤێت خۆ، هەروەسان دژی ئێرشێت میرگەها سۆران یێت میر محەمەدێ کۆرە بۆ سەر ئاخا سەروەرییا وی کرین)[١١].

(پشتی عەلی ئاغایێ مزووری ب دەستێت میرێ ئێزدییا عەلی بەگێ هاتییە کوشتن، عەلی ئاغا ژی مامێ مەلا یەحیایێ مزووری بوو. مەلا یەحیای داخاز ژ میرێ بەهدینان سەعید پاشای کر کو تۆلێت وی ژ ئێزدییا ڤەکەت، دیاربوو کو سەعید پاشا تاگیرێ میرێ ئێزدییا بوو و چ بۆ نەکر، ئینا رابوو چوو ئاکرێ نك ئیسماعیل پاشای، کو هنگی ئەو حاکمێ وێرێ بوو، وی ژی گوهێ خۆ نەدا مەلا یەحیای. ئێدی بۆ مەلا یەحیای مسۆگەر بوو کو دەستێت بنەمالا میرسێڤدینان، میرێت بەهدینان، د کوشتنا ویدا هەیە، ئو مەلا یەحیای بڕیار دا کو تۆلا خۆ ژ میرێت بەهدینانێ ڤەکەت [١٢].

مەلا یەحیا رابوو (قەستا رەواندزێ کر و چوو نك میرێ وێ یێ سەرگەرم محەمەد پاشای، ئەوێ ناڤدار ب (میرێ کۆرە) کو ئێرشێ بکەتە سەر میرگەها بەهدینا و ئێزدییا، ئەڤە گەلەك ژ دلێ میری هات و مەلای ژی فتۆ بۆ لێدا و حەلال کر، وەسا دانا کو دەسپێکێ ئێرشێ بکەتە سەر ئێزدییا، ئەگەر ئەڤە

کر، هەلبەت دێ میرێ بەهدینانێ د هەوارا وان چیت، ئێدی هنگی شەرێ وان ژی یێ حەلالە، چمکی میرێت بەهدینانێ هاریکاریا کافرا کر[١٣].

## جارا ئێکێ ئێریش بۆ سەر ئێزدیخانێ

((سالا ١٢٤٧مش/(١٨٣١-١٨٣٢)زا) میرێ رەواندزێ لەشکەرەکێ مەزن هەلگرت و ل زێیێ بەهدینانێ دەرباز بوو و پێ خۆ دانا سەر ئاخا کوردێت داسنی، قرکرنەکا بێ هەژمار لێکر. عەلی بەگێ میرێ داسنی ب لەشکەرێ داسنیاڤە چوو پێشیێ، پشتی شەڕ و کوشتنەکا گران، هەمی رێك لێ گرتن و دووڕێچ کر و رەڤی و مال و بچویکێت خۆ هەلگرتن و چوو تۆرعابدین ل ناڤ چیا و رێل و دۆل و نهالادا خۆ ڤەشارت و پتریا وان بەر ب میسلێ رەڤین.

میری ب شەڕ و کوشتنێ هەلقوتا سەر وان و ل گرێ (کوینجك) گەهشتە عەلی بەگێ و دووڕێچ کر، پشتی هندەك ژێ کوشتین، عەلی بەگێ ب سۆزەکێ خۆ و مال و بچویکێت خۆ دا دەست، میری ب لەز بارکرن و هنارتنە پایتەختێ خۆ کو رەواندز بوو[١٤].

پشتی میرێ کۆرە ڤرا ئێزدیا ئینایەڤە و دیتی کو میرێت بەهدینا بەرەڤانی ژ ئێزدیا کر، ئێدی دەست ب بجهئینانا فتۆیا مەلا یەحیای کر، کو قەتلا خەلکێ بەهدینان ژی یا حەلالە ژبەر کو وان پشتەڤانییا کافرا کر.

## دەسپێکا ئێریشێ بۆ سەر هەمی دەڤەرا بەهدینان

(سالا ١٢٤٨مش/١٨٣٢ز. میرێ سۆران محەمەد پاشا (میرێ کۆرە) ئێرش کرە سەر میرگەها بەهدینان و بەر ب ئاکرێ ڤە چوو. ئیسماعیل پاشای بەرهنگارییەکا بهێز بەرامبەری ڤێ هەوێ کر، دەراڤ و رێکێت دەڤەرێ گرتن و ئاسێکرن، شەرێت دژوار د ناڤبەرا واندا چێبوون، بەلێ پا هێزێت میرێ رەواندزێ ب سەرکێشیا برایێ وی رەسوول بەگێ پێشڤە هاتن و ئاکرێ ئێخستە

(١) دەسخەتێ محەمەد سەعیدێ مهری




دووڕێچێ. ڤێ دووڕێچێ نێزیکی هەیڤەکێ ڤەکێشا. ئیسماعیل پاشای مێرینیێت مەزن کرن و بەرەڤانییەکا دژوار کر. پاشی نەچاربوو کو بەری بکەڤیتە دەستێت دژمنێت خۆ، ئاکرێ بەردا. ددەسپێکا سالا ١٨٣٢زا. ئاکرێ بەردا و خۆ گەهاندە ناڤ ئەشیرەتێت زێباریا. زێباریا ئەو پاراست حەتا گەهشتیە ئامێدیێ، پایتەختێ میرگەها خۆ. کو د وی وەختیدا د بن سەرووەریا برایێ وی محەمەد سەعید پاشای دابوو[١٥].

د دەسنڤیسەکا کەڤندا ژی کو ب دەستێ محمد سەعیدێ مهری هاتیە نڤیسین سالا ١٢٤٨مش/١٨٣٢ز ئێرشا میرێ کۆرە دەسپێکرییە، د نڤیسیت: ((میرێ رەواندزێ سالا ١٢٤٨مش، هاتیە و شەڕ دگەل خەلکێ زێبارێ کریە))، کو ب عەرەبی هۆسا نڤیسیە: (مجئ أمیر الرواندوز ومحاربة أهل الزيبار مع عسكره في سنة ١٢٤٨)
[١٦].

دۆکومێنت وەسا دیاردکەن، کو وەختێ میرێ

كۆرە ئاكرێ ستاندی، هێزێت خۆ بەر ب زێبارێ هاژۆتینە، شەڕەكێ مەزن د ناڤبەرا وان و هێزێت زێبارییادا چێبوویە و سەلمان ئاغایێ زێباری كو ئێك بوویە ژ سەرلەشكەرێت ئیسماعیل پاشای، د وی شەڕیدا هاتییە كوشتن. كو دێ د بەرپەرێت بهێت دا درێژتر ل سەر ڤی شەڕی راوەستین.

(ئیسماعیل پاشا گەهشتە ئامێدیێ. ئەوی دگەل دەستەكا چەكدارێت خۆ یێت دلسۆژ خۆ د كەلا ئامێدیێ دا ئاسێ كر. پشتی هنگی میر محەمەد رابوو هێزێت خۆ و یێت برایێ خۆ رەسوول بەگێ كرنە ئێك و فەرمان دا برایێ خۆ كو بەر ب ئامێدیێ بمەشیت. وێ هێزێ دەڤەر هەمی د رێكا خۆ دا رامالی هەتا گەهشتینە رەخودۆرێت ئامێدیێ و وان كەلا ئامێدیێ دووربێچ كر. خەلكێ ئامێدیێ بەرەڤانییەكا دژوار ل بازێری كر، سێ هەیڤا كەلا ئامێدیێ خۆ راگرت. پاشی بەرەڤانێت كەلێ پشتی سێ هەیڤا ژ برسیبوونێ دەرگەهێت كەلێ ڤەكرن و تەسلیم بوون. پشتی بازێر كەڤتی و سەعید بەگ ژی گرتی، برایێ وی ئیسماعیل پاشا دگەل هندەك هەڤالێت خۆ رەڤین و چوونە چیا)[17].

وەختێ ئیسماعیل پاشای مسۆگەر زانی كو ئامێدیێ كەڤت، كو ئەڤە ژی سالا ١٨٣٣ز. بوو، شیا ئەو و هندەك تاگیرێت خۆ یێت دلسۆژ خۆ خلاس كەن و ب رێكا تەنباڤەكا ڤەشارتی كو بەس ئەو و یێت خۆراگری بەرامبەری هێزێت محەمەد پاشای دكر، پێدحەسیان و ل شویرهێ دەركەڤتن. پاشی بەرێ خۆ دا رۆژهەلاتێ و بەر ب (نێروە) چوون. كەلا وێ ئاڤاكر و خۆ تێدا حساردا[18].

د. رۆسۆ د رۆژنۆرێت (یومیات) خۆدا نڤیسییە، ل ٦ خزیرانا (یونیو) سالا ١٨٣٣ وی گوهـ ل بدەنگوباسێت كەڤتنا ئامێدیێ بوو. ل شوینا سەعید بەگێ، برایێ وی مووسا بەگێ تاگیرێ میر محەمەدی كرە حاكمێ ئامێدیێ[19].

## لڤینێت ئیسماعیل پاشای بۆ زڤراندنا پایتەختی

پشتی ئامێدیێ كەڤتی و ئیسماعیل پاشا ژی بەر ب نێروە چووی، وەسا دیارە د وی وەختیدا، وی داخازا لەقەبا پاشاتیێ ل ستەنبۆلێ كریە و ئەو بوویە پاشایێ رەسمی یێ ئامێدیێ. ئێدی ژنوی ل ڤێرێ ئیسماعیلی دەست ب لڤین و بزاڤێت دژوار كریە كو میرگەها بەهدینا ژ نەمانێ رێزگار كەت.

بارێ گران یێ زڤراندنا میرگەهێ ژ دەستێت بیانییا، كەڤتە سەر ملێت ئیسماعیل پاشای و پێدڤی وێرێ بوو كو هەڤال و تاگیرا بۆ خۆ پەیداكەت و هێزێت خۆ بسەروبەركەت و ئامێدیێ، پایتەختێ میرگەهێ بزڤرینیت. ئەوبوو (ژ نێروێ دەركەڤت و چوو (شنۆیێ) ل كوردستانا ئیرانێ، دیسا دەسپێكر تاگیرێت خۆ ل میرگەها خۆ و میرگەها هەكارێ ژی كۆمكرن و ئەو و نورەدین بەگێ میرێ هەكاریا بوونە قولپەك. یا دیار كو میرێ هەكاریا داخازا وی كر بچیتە نك وی و كریارێت خۆ یێت لەشكەری د وەلاتێ ویدا دەسپێبكەت، ژبەركو ئەم دبینێن ئەو (ئیسماعیل پاشا) ڤێ جارێ یێ چوویە جوولەمێرگا پایتەختێ هەكارێ و چل رۆژا تێدا مایە و كاغەز بۆ گرەگر و مەزنێت تاگیرێت خۆ د میرگەها خۆدا هنارتینە)[20].

(دووماهیا بێ دووماهی هێزەك كو ژ ١٥٠ كەسا نەدبۆری ژ هەكاریا چێكر و بەر ب ئامێدیێ لڤیا... ئەو و شەركەرێت خۆ گەهشتنە ئامێدیێ، دیت دەرگەهـ هەمی بۆ دڤەكرینە، میرێ وێ مووسا بەگێ تاگیرێ محەمەد پاشایێ كۆرە دگەل هەمی وان هێزێت پشكداری د دووربێچێدا كری ژێ دەركەڤتینە. چوو د ئامێدیێ دا و كەس بەرهنگاری وی نەرابوو، زوی دەستێ خۆ دانا سەر سەروبەرێ وێ)[21].

## قووناغا دویێ یا ئێریشا میرێ كۆرە

(پشتی هنگی میرێ كۆرە بەر ب زاخۆیێ چوو و ئەو ژی ستاند و ل وێرێ چوو جزیرێ و حەسكیڤێ، كەلا مێردینێ و نسێبینێ ژی كەڤتنە دبن گەفا ویڤە)[22].

(میرێ كۆرە ژ وان شەڕ و ئێرشا زڤری و دیت كو خەلكێ ئامێدیێ دژی داردەستێ وی مووسا پاشای یێت رابووینە سەر خۆ و ئەو یێ ل وەلاتی دەرێخستی و سەعید پاشا یێ دانایە شوینا وی، ژبەر ڤێ چەندێ

كەربێت پاشای گەلەك ڤەبوون و لەشكەرەكێ بەدهەوار ل رەخودۆرێت میسلێ كۆمكر، ئینا سەهم كەڤتە دلێ خەلكێ وێ، ترس و لەرزەكا مەزن د ناڤ واندا بەلاڤ بوو. بەلێ پاشای دەستێ خۆ نەگەهاندە وێ بازێری، ئێكراست بەر ب ئامێدیێ چوو و سێ هەیڤا رەخودۆرێت وێ گرتن، هەتا كەڤتیە دەستێ وی و سەعید پاشایێ والیێ وێ خۆ تەسلیمی پاشایێ مەزن (میرێ كۆرە) كر. ئێدی هەمی كەربا خۆ رێتە سەر خەلكێ ئامێدیێ، شۆلەكا ستویر مرۆڤ لێ كوشتن. پاشی برایێ خۆ رەسوول بەگ كرە حاكم ل سەر ئامێدیێ و ئێخستە بەر بازێرێ رەواندزێ[٢٣].

ستیڤن هێمسلی لۆنگریك د كتێبا خۆ یا ب ناڤێ (چار چەرخ ژ دیرۆكا ئیراقێ یا نوی)دا دبێژیت: پشتی (میرێ كۆرە) سەعید پاشا ژ تەختی ئینایە خارێ، برایێ خۆ یێ ناڤێ وی (رەسوول) كرە میرێ هەمی بەهدینانێ و دهۆك و زاخۆ ژی كەڤتنە بن ئمپراتۆریا ویڤە، ب كوتەكی و زۆریا خۆ زەبت كر، ئەڤ زەبتە چجارا ل ڤان دەڤەرا نەبوو. پاشی خەزایا خۆ بەر ب چیایێ شەنگارێ بر، هەلقوتا سەر هندەك گوندێت نیزیكی میسلێ، جزیرا ئبن عومەر (جزیرا بۆهتان) ستاند و سەهم ئێخستە سەرێ بەدرخانییا ل حەسكیفێ و گەڤ ل نسێبینێ و مێردینێ ژی كرن، بەلێ ل ڤێرێ تخویبێ وی بوو و لێ راوەستیا[٢٤].

## كەڤتنا میرێ كۆرە

لۆنگریك دبێژیت: «دیاربوونا (رەشید)ی، ئەوێ هاتیە هەلبژارتن كو شەمبۆزیا وی (ئانكو یا میرێ كۆرە) راوەستینیت ئان ژی وی نەهێلیت، دەملدەست گەڤێت وی راوەستاندن.... كوردێ كۆرە پاشڤە زڤری بۆ پایتەختێ خۆ، ئەو هەردەم یێ بسەهم بوو پتر ژ وێرێ كو یێ خۆشتڤی بیت، پاشی گەلەك تاگیرێت وی خیانەت لێ كر، ئێدی نەشیا خۆ راگریت، پشتی سۆز دایێ كو سەرەدەریەكا ڤەنج دگەلدا بهێت كرن، خۆ رادەستی (حوكمەتێ) كر. ئینا ڤرێكرە ستەنبۆلێ، گەلەكا ئەو هزر دكر كو دێ زڤریت وەكی تاگیرێ تركا، بەلێ پا ئەو ب رەنگەكێ نەپەنی هاتە بەرزەكرن، بۆ گۆری هشیارییا تركا و خیانەتا تركا پێكڤە[٢٥].

محەمەد ئەمین زەكی ژی ب ڤی رەنگی سالۆخا هاتنا رەشید پاشای دكەت: ((ئو د ڤی دەمیدا حوكمەتا ئوسمانی رەشید پاشایێ (الصدر الأعظم)[٢٦] یێ بەرێ و والیێ (سێواسێ) سپارتە وی كو تەناهیێ ل وان جها پەیداكەت، فەرمان بۆ والیێ بەغدایێ و موتەسەررفێ میسلێ دەرێخست كو بكەڤنە بن فەرمانا (صەدرێ) ناڤبری و هاریكارێت پێتڤی بۆ پێشكێش بكەن، ئینا رەشید پاشا هات، دەست ب كۆمكرنا لەشكەری و بەرهەڤكرنا پێتڤیێت لەشكەری كر داكو ب كارەكێ ڤەبڕ رابیت. ئینا محەمەد پاشای (میرێ كۆرە) خۆ ڤەكێشا جهێ خۆ و ما ل هیڤیێ كا دێ چ قەومیت. لەشكەرێ رەشید پاشای د رێكا جزیرێ و زاخۆ ڕا گەهشتە میسلێ، ل وێرێ گەهشتە لەشكەرێ (ئینجە بەیرەقدار ئۆغلی) و هەردو پێكڤە بەر ب رەواندزێ مەشیان، پاشی لەشكەرێ بەغدایێ ژی گەهشتە دەشتا حەریرێ، هەمی پێكڤە ل وێرێ كۆمبوون.... رەشید پاشا رابوو كاغەزەك بۆ محەمەد پاشای ڤرێكر داخازا پێكهاتنێ ژێ كر و سۆز دانێ كو ئەگەر ئەو گوهدارییا فەرمانێت وان بكەت دێ وی عەفو كەن و زڤریننەڤ جهێ وی. ژبەركو دا خوین نە رژێیت و ژبەر وان سۆزێت رەشید پاشای دایێ، محەمەد پاشا (میرێ كۆرە) چوو لەشكەرگەها ئوسمانی دلسۆزی و پێگیرییا خۆ ب فەرمانێت وان دیار كر، ئینا رەشید پاشای ڤەدرێ وی گرت و ڤرێكرە ئەستانێ. ب راستی ژی شیا كو عەفویێ بۆ دەربێخیت و ئزنا وی بدەت بزڤریتەڤ وەلاتێ خۆ، بەلێ پا ڤەدەرێ تشتەكێ دی ڤیا، ئینا د وی دەمیدا رەشید پاشا مر، چ تشتەك ژ ئەڤان بۆ نەكر. عەلی رزا پاشایێ والیێ بەغدایێ هەڤركێ رەشید پاشای بوو و دژمنێ میرێ كۆرە بوو، ب نەپەنیڤە ڤرێكرە ئەستانێ.... ئەستانە ژی نەچار بوو كو فەرمانا حوكمێ ل سێدارەدانێ بۆ میرێ كۆرە دەربێخیت و ب نەپەنیڤە بۆ والیێ سێواسێ ڤرێكەت. ئەڤ فەرمانە گەهشتبوو دەستێ والیێ

سێواسێ و میرێ کۆرە ژی گەهشتبوو وێرێ، ئینا هەر ب لەز حوکمێ سێدارەدانێ دانا سەر[٢٧].

## دیسا پێکۆلێت ئیسماعیل پاشای بۆ زڤراندا میرگەهێ دبەردەوامن

د وان دەمێت کو میرێ کۆرە بەر ب رەواندزێ ژبەر لەشکەرێ ئوسمانی رەڤی و دەقا لەشکەرێ وی ژی ل هەمی بەهدینا شکەستی، ئینا ئیسماعیل پاشایێ میرێ بەهدینان ب دەلیڤە دیت، رابوو پەیێك ل سەروبنێت بەهدینا و گەلەك جهێت کوردستانێ رەشاندن.

هەر د وان دەمادا (ئانکو ل سالا ١٢٥٠مش) گرەگر و زانا و سەرۆکئەشیرەتێت بەهدینان پەیێکەکا بەرفرەهـ ل سەر کریار و گونەهکارییێت میرێ کۆرە ل بەهدینانێ کرین، نڤیسی و بۆ سولتانێ دەولەتێ هنارت، (کو هێژا تەحسین ئبراهیم دۆسکی ب دێژی ل سەر ناڤەرۆکا ڤێ پەیێکێ نڤیسیە و شرۆڤە کریە و دەقا دۆکۆمێنتێ یا ب فارسی و وەرگێرایە کوردی و د ڤێ ئینسکلۆپیدایێ و کۆڤارا (دیرۆك) هژمار ٧سالا ٢٠١٥یدا هاتییەبەلاڤکرن[٢٨]. ئەڤ دۆکۆمێنتە ددەتە دیارکرن کا خەلکێ بەهدینان چەند نەخۆشی و دەردەسەری ل سەر دەستێ میرێ کۆرە دیتینە.

ئیسماعیل پاشای لەشکەر ل هەمی دەڤەر و ئەشیرەتا کۆمکرن و خەلکێ بەهدینا ژی یێ ژ میرێ کۆرە کێرەداخ بوو، میرێ ئامێدیێ ب لەشکەرەکێ مەزنڤە میرگەها بەهدینان هەمی ژبن زۆرداریا میرێ کۆرە دەرێخست.. ئێك ژ وان پەیێکێت بۆ گرەگرێت کوردستانێ ڤرێکرین، ئەوە یا ب ئەزمانێ فارسی بۆ نائیبێ هەڤلێرێ ئبراهیم ئەفەندی، ڤرێکری. د ڤێ پەیێکێدا ئسماعیل پاشا مزگینیێ ددەتێ، کو وی لەشکەرەکێ بێقام کۆمکریە و پتریا بەهدینا زڤراندییەڤە و داخازێ لێ دکەت کو ئەو ژی (ئبراهیم ئەفەندی) بگەهیتە لەشکەرێ بەهدینان. ئەڤە ژی دەقا وێ پەیێکێیە ب کوردی:

((بەری نهۆ من بۆ هەوە مزگینیا فەتحکرن و گرتنا کەلا ئامێدیێ و کەلا قومریێ و کەلا چەلکێ و کەلا شخۆیێ دابوو هەوە. پاشی ب ئانەهیا خودێ ئەز گەهشتمە سەرێ گوندێ ئەلکیشێ و من ئەو ژی فەتح کر و ئەو هەمی گوندێت نێزیکی گوندێ ئەلکیشێ هەتا چیایێ مەقلیبی من گرتن و تالان کرن و هەمی دەسکیس و دەلیلێت وان کوشتن و هندەك دەسکیس ژی مە ئێخسیر کرن، دیسا کەلا ئاکرێ ژی من گرت و من فەرمان دا کو فتح الله بەگێ بکەمە میر سەر ئاکرێ. مە هەمی عەشیرەتێت بەهدینان و هندەك ژ عەشیرەتێت هەکاریان د گوندێ شێخان دا قەیم و خۆجە کرینە، ژ گوندێ شێخان هەتا چیایێ مەقلیبی ژ مشەیی و گەلەکیا لەشکەری کەس نەشێت ل وێرێ هاتن و چوونێ بکەت و دەرباز ببیت، هەرگاڤا ئەڤ نڤیسینە گەهشتە هەوە، هنگ ژی خیرەتێ بکێشن و ل دویڤ پێچێبوونا خۆ ب لەشکەرێت سیار و پەیادە بگەهنە لایێ مە. ئەڤە

(٢) دەقا دەسنڤیسا پەیێکا ئیسماعیل پاشای بۆ ئبراهیم ئەفەندی



رۆژا همەمەتێ یە، ئەوێ د ڤێ مەسەلێدا خزمەتێ بكەت، دێ بەرێ رێنج و زەحمەتا خۆ بینیت، ئەو كەسێ ڤێ نڤیسینێ بۆ هەوە دئینیت، دێ بدەڤ ژی هندەك ئاخڤتنا بێژیتە هەوە[29].

## ئێریشا حكومەتا ئوسمانی بۆ سەر بەهدینانێ و خۆراگریا میرێ وێ

هەروەكی مە گۆتی، حوكمەتا ئوسمانی هەر ل سالا ١٨٣٤ز. بڕیارا نەهێلانا میرگەهێت كوردا دابوو و ئەوروپا ژی هاریكارا وێ بوو. بەلێ هەروەكی د رۆژبۆرێت وی دەمیدا دیار دبیت، حوكمەتا ئوسمانی هەڤسارێ میرێ كۆرە بەردابوو داكو ئێرشێت خۆ بكەتە سەر میرگەهێت بهێزێت كوردی، ئەو میرگەهێت كو هزرا ملەتینیێ د ناڤدا هاتیبە چاندن، نەخاسمە بەهدینان و بۆهتان، وان ژ هێز و ڤەژەنێ بێخیت، داكو ئەگەر وەخت هات حوكمەتا ئوسمانی ژی ب ساناهی وان میرگەها بهەرفینیت. ئەوان باش ژی دزانی كو میرێ كۆرە ب كاغەزەكێ دێ خۆ تەسلیم كەت. ئو ب راستی ژی پشتی هنگی ب كاغەزەكێ میرێ كۆرە، ئەوێ خۆ كریە خودانێ ئیمپراتۆرییەكا مەزن، خۆ رادەستی هێزێت ئوسمانییا كر. یا دیار ژی غەزوێت میرێ كۆرە بۆ سەر هەردو میرگەها، چەپەرێت موكوم بەرامبەری لەشكەرگەها ئوسمانییا لەواز كرن، كو بۆ وان ژی هەلكەڤت ئێدی ل (هاڤینا سالا ١٨٣٩ێ، پشتی شكەستنا ئوسمانییا ل (نیزیبێ) والیێ بەغدایێ دەستەلات دانە ئینجە بەیرەقداری، كو ئەو، میرگەها ئامێدیێ یا كوردی برێڤە ببەت، كو هێشتا ئێزدیێت شێخانێ ژی تاگیرێت وێ (میرگەهێ) بوون. بەلێ پا میرێ ئامێدیێ یێ ناڤدار ب ئیسماعیل پاشا هەمبەری وێ دەستەلاتێ رابوو، بەلێ ئەو ل ئاكرێ شكەست و گرت و ل میسلێ كرە دگرتیخانێڤە. مرۆڤەكێ وی كو ناڤێ وی محمد سەعید پاشا بوو ل شوینا وی ل ئاكرێ دانا و نەهێلا ئەو بچیتە د ئامێدیێدا، وان هێزەكا لەشكەری دانا ژوورێ ئامێدیێ[30].

پشتی كو ئیسماعیل پاشا هاتییە گرتن و ل میسلێ كریە د گرتیخانێڤە، ئەم نزانین كا چەند مایە تێڤە! بەلێ یا دیارە كو گەلەك نەمایە، ژ میسلێ بۆ بەغدایێ هاتییە ڤەگوهاستن و چار سالا ل بەغدا مایە.

پشتی چار سالا والیێ بەغدایێ ئەو ڤرێكریە میسلێ ل نك والیێ میسلێ كو ل وێرێ خۆجهـ بكەن و شۆلەكی بۆ ببینن. هەروەكو د پەیێكا والیێ میسلێ یا كو ب دیرۆكا ٢٩ موحەرەما سالا ١٢٥٨مش، (١٢ ئادارا ١٨٤٢). بۆ (الصدر العالي) نڤیسی. بەحسێ هاتنا ئیسماعیل پاشای بۆ میسلێ بدرێژی كریە و وی ڤیایە شۆلەكی ل وێرێ بۆ ببینیت، بەلێ (تەعصصوبا وی یا قەومی) هەروەكو والی دبێژیت، ئیسماعیل پالدا كو بچیتە نك بەدرخان بەگێ موتەسەللمێ جزیرا بۆهتان. ئو ل وێرێ تفاق د گەل وی و خان مەحموودی و برایێ وی خان ئەبدالی و نور الله بەگێ هەكاری و ئەشیرەتێت دی بێت (وانێ) و تیرەیا تیاریا كریە. والیێ میسلێ ژ ڤێ چوونا وی ترسیایە، كو ئەو جارەكا دی میرگەها خۆ بزڤرینیت.

پشتی ئیسماعیل چوویە تیارێ، ل وێرێ یێ ڤیای ئێریشێ بكەتە سەر ئامێدیێ، رابوویە دیسا پەیێك بۆ شێخ و گرەگرە و سەرۆكئەشیرێت بەهدینانێ هنارتینە كو خۆ ژ دەولەتا ئوسمانی ڤەكێشن و ئەڤ چەندە ژی هەروەكی د پەیێكەكێدا كو ب دەستێ ئیسماعیل پاشای بخۆ هاتییە نڤیسین و بۆ شێخ تاهرێ بامەرنی ڤرێكریە. ئیسماعیل پاشای ئەڤ پەیێكە ب دیرۆكا ٢٩ صەفەرا ١٢٥٨مش (١١ نیسانا ١٨٤٢زا) بۆ شێخ تاهرێ بامەرنی ڤرێكریە[31] و گلی و گازەندە لێ كرینە كا بۆچی ئەو بوویە هاریكارێ دەولەتا ئوسمانی و بەرامبەری ملەتێ خۆ راوەستایە. ئیسماعیل پاشا ل جهەكی د ڤێ پەیێكێدا دبێژیت كو (ئەڤە چار سالە ئەز كەڤتیمە بەغدایێ) ژ ڤێ ئاخڤتنا وی دهێتە زانین، كو ئەو (ئیسماعیل پاشا) ل سالا ١٢٥٤- ١٢٥٥مش/١٨٣٩ز. هاتییە گرتن و رەوانەیی بەغدایێ كریە، چار سالا ل بەغدا

مایە، پاشی ڤەگەڕیایە و دیسا میرگەها ئامێدیێ ئێخستیە بن دەستێ خۆ و د صەفەرا سالا ١٢٥٨ێدا ئەڤ پەییکە نڤیسییە.

ئەڤا خارێ ژی دەقا پەیکا والیێ میسلێ یە یا کو ب دیرۆکا ٢٩ موحەرەما سالا ١٢٥٨مش، (١٢ ئادارا ١٨٤٢). بۆ (الصدر العالي) نڤیسی:

بەری چەند هەیڤا والیێ بەغدایێ، ئیسماعیل پاشایێ ئامێدی ئەوێ ئەڤە چەند سالە خۆجهـ ل بەغدایێ ڤرێکرە دەڤ من، داکو تشتێ پێتڤی بۆ بکەم و ل میسلێ خۆجە بکەم ژبەر سەروبەرێ وی یێ نەخۆش ل وێرێ، پشتی کو ژ سەروبەرێ وی پشتراست دبم د لیوایەکا بن دەستێ خۆ بکاربینم، ژبەر وێ چەندێ مە هەیڤانە و راتبێت وی ڤەبرین، مە باش و باش سەخبێرا وی کر، پشتی جەڕاندنا وی کێم مابوو کو کارەکی ژ کارا بدەینێ، بەلێ تەعەصصوبا وی یا قەومی ئەوا ل دەڤ وی هەی پالدا کو ل دویڤ ئەخلاقێ خۆ برێڤە بچیت، رابوو چوو نك موتەسەللمێ جزیرە و بوهتانێ، ئو هەروەکو وی دگۆت یێ هاتییە ئاگەهدارکرن کو ژ وێرێ دێ چیتە (دار السعادة) ل دویڤ ئاخڤتنێت وی، ئو دگەل وێرێ هێشتا حورمەتا وی ل لایێ مە بوو، ئو ل دویڤ هەروەکو موشیرێ دەڤەرا (اقلیمێ) ئەرزەرۆمێ دەولەت خەلیل کاملی پاشا هاتییە ئاگەهدارکرن د دەسپێك و دویماهیا کو میرێ ناڤبری تفاقا دگەل سەرداچوویێت کوردان خان مەحموودی و برایێ وی خان ئەبدالی و نەوار بەگێ میرێ هەکاریا و دگەل ئەشیرەتێت دی یێت وانێکری کو دەست ب کارێت فەسادێ بکەت و گەلەك جارا لەشکەر بۆ وان دەڤەرا یێت هاتینە هنارتن داکو هاریکاریا وان بکەن، ئو ئەو هێشتا یا ددلێ خۆ دا ل من ڤەدشێریت، دبەرێ دا ژی ئەڤ پاشایە ب کریارێت فەسادێ و پشتەرێبوونێ ل ئامێدیێ رابوو، هەتا کو من و والیێ ناڤبری ب لەشکەرەکێ کۆك و بەرکەڤتی ڤە چووینێ و مە ئەو بخۆ ژێ گرتی. رەڤینا وی ب ڤی رەنگی بۆ دەڤەرا میرێ ناڤبری ژ ڤالاتیێ نەهاتییە، ئو نە یا بەرئاقلە کو ئەو سەفەرێ بکەتە (دار السعادة). یا ژ هەمیا

**(٣) پەییکا والیێ میسلێ**
**٢٩ موحەرەما سالا ١٢٥٨مش، (١٢ ئادارا ١٨٤٢)**



نێزیکتر ئەوە کو ئەو ل وێرێ بمینیت و هەڤکرتنێ دگەل سەرداچوویێت (عصاة) کوردا و ئەشیرەتێت ئامێدیێ و تیرەیا هەکاری و تیرەیا تیاری دیسا دەست ب کریارێت خرابی و فەسادێ بکەتەڤە. هەر ژ نهۆ ئەز رابووم من مەقامێ (الصدارة العالية) پێ ئاگەهدار کر کو ئەگەر رۆژەکێ فەسادا پاشایێ ناڤبری ل رەخودۆرێت ئامێدیێ دیار بوو و ئاشکرا بوو کو بەدرخانێ ناڤبری هاریکاریا وی دکەت هنگی سەروبەر وەسا دخازیت کو ئەز بەر ب وان ڤە بچم. هیڤیە دهشیارین فەرمان یا هێژایێ فەرمان ددەستادایە.

۲۹ موحەرەما سالا ۱۲۵۸ (۱۲ ئادارا ۱۸٤۲).

پشتی هنگی ب ۱٦ رۆژا، ئانکو د ۱۵ صەفەرا سالا ۱۲۵۸ێ، والیێ میسلێ پەیێکەکا دی بۆ (باب العالی) ڤرێکر. وەسا هاڤێتیە تێدا: کو بەدرخان بەگێ داخاز ژ ئیسماعیل پاشای کریە بچیتە نك. ئیسماعیل پاشای ڤیایە کەلا زاخۆ بستینیت، لەشکەرەکێ مەزن و گەلەك کەلوپەلێت لەشکەری ژێ بەدرخانی بێت دایێ. ل دویڤ ناڤەرۆکا پەیێکێ ئیسماعیل ب لەشکەرێ خۆڤە بەر ب (سندیا)ڤە مەشیایە، کو وان دەڤەرا هەمیا پاقژ کەت و پاشی بچیتە د زاخۆیێ دا، بەلێ یا هەر د وی دەمیدا ئوسمانییا لەشکەرەکێ مەزن ب چەکەکێ گرانڤە هنارتیێ، وەسا دیارە بەرهنگاریا وی لەشکەرێ مەزن یا بزەحمەت بوویە، ژبەر وێرێ ژێ ئیسماعیلی بەرێ خۆ دایە ناڤ ئەشیرەتا تیاریا. والیێ میسلێ ژ ئیسماعیل پاشای ترسیایە کو ل تیارێ ئێکراست بەر ب ئامێدیێ بچیت و بێخیتە بن دەستێ خۆ.

ئەڤا خارێ ژێ دەڤا وێ یە:

خودان دەولەت و چاڤدیری و دلۆڤانی و خودان هممەت ئەزبەنی

هەروەکو من د پەیێکا خۆ یا بەرێدا ئەوا بۆ (دار العليه) پێشکێشکری بدرێژی بەیانکربوو، (موتەسەللم) بەدرخان بەگێ موتەسەللمێ جزیرێ داخاز ژ ئیسماعیل پاشایێ ئامێدیێ کریە کو بچیتە نك، داکو فتنە و فەسادا خۆ پتر زێدکەت، هزرا وی یا گەنی داخاز ژێ کر کو کەلا زاخۆیێ بستینیت. گەلەك پێزانین هاتینە کو وی هژمارەکا مەزن ژ لەشکەری و کەل و پەلێت لەشکەری دانە پاشایێ ناڤبری (ئانکو ئیسماعیل پاشای) و دیسا مال و دراڤ ژێ دانێ و برایێ خۆ صالەح بەگ و میر سۆرین و هندەك کەسێت دی ژێ دگەلدا ڤرێکرن کو بچنە ناڤ عەشیرەتا (سندیا)، دیسا کێما مای کو ئەو زابتێت من ل وێرێ تەعیین کرین دەربێخیت و عەشیرەتا ناڤبری بزۆخینیت و بەرێ خۆ بدەنە زاخۆ. ئینا ئەز رابووم من کورێ برایێ خۆ مصتەفا پاشا دگەل هندەك لەشکەری و تۆپا ڤرێکرن، وەختێ وان زانی کو لەشکەر ژ وی رەخی لڤیان، پاشایێ ناڤبری ژ ڤێ لێڤەبوو و چوو ناڤ عەشیرەتا تیاریا، بەلێ یا میرێ ناڤبری (ئانکو بەدرخان) هەر ب بەردەوامی هاریکاریا پاشایێ ناڤبری کر کو ل سەر فتنە و فەسادا خۆ نەهێتە خارێ. د پەیێکەکێدا ڤێ دویماهیێ ژ لایێ مشیرێ ئەیالەتا ئەرزەرۆمێ دەولەت خەلیل کاملی پاشای ڤە هاتیە، کو وی د وی دەمیدا لەشکەر بەر ب وانێ و بدلیسێ پالداینە، ئو وی بریار دایە کو بەردوام شەرێ سەرداچوویێت کوردا بێت وەکی خان مەحموودی و برایێ وی خان ئەبدالی و میرێ هەکارێ نووران بەگێ و عەشیرەتێت وان دەڤەرا بکەت. ئەو یێ پێکۆلێ دکەن ئەگەر ئەو بشێن دێ ژ نژکێڤە بسەر کەلا وانێ دا گرن و فتنەیەکا مەزن ل کوردستانێ پەیدا کەن. ئێدی نابیت باوەری ب ڤی میری بهێتە دان، ئارمانجا وی ژێ ئەوە کو وان جهێت ل بن دەستێ خۆ بکەتە ملکێ خۆ، ژبەر وێرێ وی هەڤسۆزی دگەل پاشایێ ناڤبری (ئیساعیل پاشا) و دگەل سەرداچوویێت کوردا و ئەشیرەتێت ئامێدیێ و تیرەیا تیاری کر داکو فتنێ ل دەڤەرا ئامێدیێ هەلدەت. ئو ل سەر ڤێ چەندێ واجبە ل سەر من ئەگەر پێتڤی بوو بەر ب وان ڤە بلڤم. ئو مە بۆ هەوە بادەکەکا کاغەزێ ڤرێکریە کو ب ئەزمانێ فارسیە و مە ب دەست گرتیە پاشایێ ناڤبری (ئیسماعیل پاشای) بۆ خەلکێ قەزا زاخۆ ل دۆر ڤێ فتنێ ڤرێکریە. هیڤیە ئاگەهداریا باب العالی ل سەر ڤێ چەندێ بهێتە

**(٤) پەیکا والیێ میسلێ ئینجە بەیرەقدار د ١٥ صەفەرا سالا ١٢٥٨مش**

کرن.

١٥ صەفەرا سالا ١٢٥٨ێ

پشتی هنکی ب چەند رۆژا، ئانکو ل ٢٣ صەفەرا سالا ١٢٥٨ پەیکەکا دی بۆ والیێ میسلێ هاتییە هنارتن، تێدا بەحسێ ڤەرێژا لڤینێت ئیسماعیل پاشای، هەروەکی د وێ پەیکا بەرێدا ل ١٥ صەفەرێ هاتی، دکەت. ب هجەتا وێرێ کو ئسماعیل پاشا بچیتە (دار السعادە)، چوو جزیرێ و بەرێ خۆ دا زاخۆ کو کەلا وێ بستینیت، گەلەك کریار ل زاخۆ کرن، زابتێ شەرانشێ تالانکر و دەرێخست، خەلکێ دەڤەرا سندییا هەمی گەهشتنێ. ئینا ئەوبوو لەشکەرەکێ مەزن چوو سەر ئیسماعیلی و ئەو نەشیا یا وی ڤیای بکەت. بەلێ سەعید بەگێ حاجی بەهرامی بەرامبەری هێزێت ئوسمانییا راوەستیایە و ڤەزا حاجی بەهرامێ د دەستێ ویدایە و سەعید بەگ بەر

ب زاخۆیێ لڤیایە.

ئەڤا خارێ ژێ دەڤا وێ یە:

I.M.M. ٣٢/١٢٢٥

صۆرەتێ وێ پەیکا ژ لایێ منڤە هاتییە نڤیسین و بۆ والیێ میسلێ هاتییە ڤرێکرن

ئیسماعیل پاشایێ ئامێدی ب هەجەتا وێرێ کو دێ چیتە (دار السعادە) هاتە جزیرێ. بەلێ ئەو نەچوو وێرێ، بەلکی وی بەرێ خۆ دا زاخۆیێ. هیڤیا وی یا گەنی هەمی ئەو بوو کو کەلا وێ بستینیت. گەلەك کریارێت خراب ل وێرێ کرن. جرعەت دا خۆ کو زابتێ گوندێ شەرانشێ تالان کەت و دەرێخیت، کو ئەو ژ گوندێت زاخۆیە، ئەو رابوو خەلکێ دەڤەرا سندی کێشانە لایێ خۆ. مە ژ لایێ کورێ برایێ هەوە مصطفا پاشای ڤە گوهێ خۆ دا فەرمانا هەوە کو دگەل هندەك لەشکەر و تشتێت پێتڤی ڤە بچینە

**(٥) پەیبکا هژمار I.M.M. ١٩L١٢٢٥ ب دیرۆکا ٢٣ صەفەرا سالا ١٢٥٨**

وی ب zhkmiddh خودێ وی ل وێرێ قەلب دەین و تەناهی و نزامی بزڤرینینەڤ وێرێ. دەولەت سەرێ هێز و شیانێت مەولانا سولتانی، چ کریار و لڤینێت نە ب دلێ رزایا عالی ل وێرێ چێنەبوون، ئەو بخۆ یا پێتڤی بوو ئەو کەسێت خرابی و فەساد بەلاڤکری بهێنە پویچکرن و تەناهی و رەحەتییا خەلکی و ژار و بەلەنگازا بخۆ وەکی رزایا عالی دڤیا بهێنە دەمانکرن و پاراستن، بۆ بەرهەڤکرنا لەشکەرەکێ باش و نێرینا هەوە بۆ لێدانا پاشایێ ناڤبری و زڤراندنا سەروبەری بۆ جهێ وی، د جهێ خۆدابوو، ئەڤە مە کر کو ب دلێ هەوە بیت و ب قەنجی بنێرنێ، من داخازا سەرکەڤتنێ بۆ سەعادەتا هەوە هەیە. بەلێ یا سەعید بەگێ حاجی بەهرامی د گەل هندەك لەشکەرا یێ بەر ب زاخۆیێ چووی، ژبەرکو زاخۆ ب رەخ حاجی بەهرام ڤەیە، ئو حاجی بەهرام وەلاتێ وی یێ عەسلی یە، یا گەهشتییە گوهێت من کو سەعید بەگێ ناڤبری پێکۆلێ دکەت کو خەلکی پالدەت و خرابی و فەسادێ ل دەڤەرێت قەزایا حاجی بەهرامێ بەلاڤکەت، ژبەرکو ئەڤ لڤینێت ژ سەعید بەگێ ناڤبری چێدبن تەناهی و رێز و تەرتیبان ل وان جها خراب دکەن، لەوانێ مومکن نینە هنگ ب ڤی تشتی درازیبن، ئەز داخازێ ژ دەولەتا هەوە دکەم هوین فەرمانێ و هشیارێ بدەنە سەعید بەگێ ناڤبری کو نە ئەو و نە کەسێ دی دژی خەلکێ قەزایا حاجی بەهرامێ نەرابیت و عێجز نەکەت، بلا ل دویڤ تشتێ پێتڤی یێ ب وی هاتییە سپارتن کو دژی پاشایێ ناڤبری رابیت، بکەت، داکو چ نەهەڤسەنگی نەکەڤنە سەروبەرێ وەلاتی. ٢٣ صەفەرا سالا ١٢٥٨

ئەڤەژی پەیبکەکا دیبە، کو ل ٢٤ صەفەرا

سالا ١٢٥٨. هاتیە نڤیسین و مژارا وێ ژی هەر ل سەر پێڕابوونێت ئیسماعیل پاشاینە ل دەڤەرێ و سەروبەرێ قەزا حاجی بەهرامێ و سەعید پاشای.

ئەڤە ژی دەقا وێیە:

I.M.M. ١٩L١٢٢٥

صۆرەتێ وێ پەیکا من بۆ بەدرخانی نڤیسی، کو بەرسڤەکە ل سەر پەیکا وی یا بۆ مە ل دۆر وان لەشکەرێت والیێ میسلێ محەمەد پاشای ڤرێکرینە زاخۆ ئو دیسا ل سەر کێشا جزیرێ.

ئەز ل سەر پەیکا هەوە ئاگەهداربووم، کو هەوە د وێ پەییکێدا ئاشکەرا کریە، کو والیێ میسلێ محەمەد پاشای هژمارەکا باش ژ لەشکەر و پیتڤیان ڤرێکرینە، وی ئەڤە کریە دا کو ئەو فەسادا ئیسماعیل پاشای ل دەڤەرێت زاخۆ چێکری رامالیت و تەناهی و رەحەتیا خەلکی و بەلەنگازا بپارێزیت، وەختێ لەشکەر گەهشتینە وێرێ سەعید بەگ یێ حازر بوو، چمکی مادەم هەڤبەندیا قەزا زاخۆ دگەل قەزا حاجی بەهرام هەیە، ئێدی میرێ ناڤبری ژی دەستا ناداهێلیت، بەلکی دێ دەست ب وێرێ کەت کو خەلکی دەربازکەتە لایێ دی، ئو پێتڤیە کار بۆ ڤی سەروبەری بهێتە کرن. ئەم ل سەر وێ پەییکێ ژی هەلبووین ئەوا ژ ناڤبری ل سەر سەروبەرێ پاشایێ ناڤبری گەهشتیە هەوە. بەری نهۆ ژی هەوە بۆمە ل سەر ئنیەتا سەعید بەگێ نڤیسیبوو کو حاجی بەهرامیا ڤەکوهێزنە رەخێ دی؟ ئو هەر ل سەر ڤێ چەندێ من ئەڤە بۆ والیێ میسلێ یێ ئاڤرێ پێکری نڤیسی، هەروەکی ڤێ دویماهیێ خەبەر گەهشتیە هەوە، ئو هەر وەکی د پەییکا یێ ئاڤرێپێکریدا هاتی و گەهشتیە هەوە، هەر وەکی هاتیە ڤەگێڕان کو لەشکەر بچیتە دەڤەرا زاخۆ ئارمانجا چوونا لەشکەران ئەوە کو وێ فەسادا هەروەکو دبێژن ئیسماعیل پاشای ل دەڤەرا زاخۆ چێکری بهێتە راکرن، تنێ ژبەر ڤێرێ یە و نە تشتەکێ دی، ئو تشتەک دژی خەلکێ قەزایا حاجی بەهرامێ ژ سەعید بەگێ دیار نەبوو، ل سەر ڤێ چەندێ پێدڤیە ل سەر تە یێ رژدبی ل سەر ویرێ کو چ کریارێت خرابیێ ل وێرێ نەقەومن، ئو ئەو تشتێ د وێ پەییکا ژ یێ ئاڤرێ پێدایی گەهشتیە هەوە ئەو یێ راستە. ئو ئەگەر ئەو خرابیێت ل سەر ئیسماعیل پاشای هاتینە گۆتن راست بن، مەعنا ئەڤ سەرەدەریا دگەل هاتیە کرن یا دروستە. ئو د وی دەمێ کو واجب بوو هاریکاریا پێدڤی بۆ رەخێ میسلێ بهێتە پێشکێشکرن، کو فەسادێ ل وێرێ راکەن، ل ڤێرێ و وێرا هەمی ملکێ دەولەتا عللیەیە. ڤێ دویماهیێ بۆ محەمەد

**ب دیرۆکا٢٤ صەفەرا سالا ١٢٥٨. I.M.M. ١٩L١٢٢٥(٦) پەیکا هژمار**



پاشایێ ئاڤرێکری هاته نڤیسین کو هاریکاریا پێتڤی پێشکێش کەت و خاترا والیێ میسلێ بێ ناڤبری نەشکێنیت و نەهێلیت سەعید بەگ و بێت دی چ کارێت خراب بەرامبەر قەزایا حاجی بەهرام و هەمی جهێت ل بن دەستێ مە بکەن. ئەگەر هات و سەعید بەگ رابوو خەلکێ قەزایا ناڤبری عاجزکرن، ئان ژی مشەختێت وان دەرباز کرنە رەخێ دی، ئێدی دەستویریا وی بۆ ڤێ چەندێ ناهێتە دان و پاشی دێ ب خێرا هێزا مەولانا سولتانی سەرەدەریا پێتڤی دگەل هێتە کرن. ئو ل سەر ڤێ چەندێ هیڤیە هوین سەروبەری ل وێرێ بگەهیننە مە. ٢٤ صەفەرا سالا ١٢٥٨.

دەهمەن: ئەگەر ڤرێکرنا لەشکەری یا ئاڤری پێکری محمد پاشای بۆ ڤان دەڤەرا گرێدایی بیت ب کێشەیا جزیرێ ڤە نە ب کێشەیا ئیسماعیل پاشای، مە (مەحزەرا ئەهالی) ئەوا هەوە بۆ (سەلتەنا سنیە) ڤرێکری، کو پێتڤیە ڤان رۆژا بەرسڤا وێ بهێتە دان، ئو سەروبەرکرنا ئەڤ مەسەلا هاتیە گۆتن ب دروستی ژ لایێ دەولەتێڤە دێ هێتە بجهکرن. لەورا ئەم ژ تە پشتراستین کو تو چ سەرەدەریێت نە ب دلێ (رزایا عالی) ناکەی.

د ڤێ رێپۆرتا خارێدا یا محەمەد پاشا بەیرەقدار ل ٢٨ صەفەرا سالا ١٢٥٨ێ، بۆ سەرخۆدا ڤێرکری، تێدا دیارە، کو پشتی ئیسماعیل پاشا بەر ب زاخۆیێ و هەکارێڤە چوویی، وی هەڤسۆزیێت بهێز ل گەل بەدرخانی و خان مەحموودی و نوراللە بەگێ هەکاری و تیرەیا فەلان یا تیارێ و هەمی ئەشیرتێت بەهدینانێ و هەتا رەسوول بەگێ برایێ میرێ کۆرە ژی، چێکرینە(٣٢). کو ب راستی ژی ڤێ هەلێ ئیسماعیل پاشا بێ شیای پرانیا کوردا ل سەر ئێك گۆتن و ئێك ئارمانج کۆمبکەت و بەرێ وان بدەتە رێکا سەرفەرازی و رزگاریێ. سەروەرێت ئوسمانی دبێژن: ((مادەم کو ئەڤ فتنە یا تەڤایی بە، ئێدی چێنابیت ئەم باوەریا خۆ ب کوردا بینین، ئو ئەگەر تەنگستی د ڤێ مەسەلێدا هاتە کرن، ئێدی فتنە دێ مەزن بیت و ل هەمی دەڤەرا بەلاڤ بیت.)) دیارە کو ڤێ جارێ ئیسماعیل پاشا ب ئاقلداریا خۆ بێ شیای هەمی کوردا ب «تەڤایی» د بن ئێك ئالاڤە کۆم بکەت، ژبەر وێرێ ژی دبێژیت: ((ئێدی چێنابیت ئەم باوەریا خۆ ب کوردا بینین)). دیسا سەروەرێت ئوسمانیا وەسا هزر دکەن کو ((.. ئەڤ فتنا کوردستانێ ژمێژوەرە هاتیە بەرهەڤ کرن و ب ڤی رەنگی ئاگرێ وێ خۆش بوو)). ئەم د ڤێرێدا دبینین کو د هەمی دیرۆکا کوردادا جارا ئێکێ بوویە، سەروەرەکێ کوردا ملەتێ خۆ هەمی دژی دژمنێت خۆ کریە ئێك قولپ، لەوانێ ژی ئەم دبینین پایتەختێ میرگەهێ (ئامێدیێ) بساناهی کەڤتیە دەستێ ئیسماعیلی. رزگارکرنا ئامێدیێ ژی ژ دەستێت حکومەتا ئوسمانی ب ئاشکراتر د کاغەزا پشتی ڤێ دا هاتیە، دبێژیت: ((چوونا ئیسماعیل پاشایێ ئامێدی بۆ ناڤ کەلا ئامێدیێ)) ئێکا وەکر کو هەمی دەڤەر و ئەشیرەتێت کوردا ببنە ئێك.

ئەڤە ژی دەقا رێپۆرتێ:

I.M.M ٣٣/١٢٢٥

خودانێ دەولەت و چاڤدێری و دلۆڤانی و دلنەرمی هممەت بلند خۆشمێر ئەزبەنی

هەروەکی بەری نهۆ موشیرێ ئەیالەتا ئەرزەرۆمێ دەولەت خەلیل کاملی پاشا خەبەر گەهاندیە من، ئو هەروەکی تە ب درێژی بەحسێ جهێ مشیراتیا وی کری کو کوردێت ئەرزەرۆمێ و وانێ و دەڤەرێت رەخۆ دۆرێت هەردوکان سەرەدەریا کافرێت مورە دگەل هاتە کرن کو ژ رەحمەتێ بهێنە دەرێخستن، ئینا خۆ سپارتە بەغی و فەسادێ، ئو ب پالدانا ئیسماعیل پاشایێ ئامێدی دگەل عەشیرەتێت تیارێ و هەکارێ و ئامێدیێ بوونە هەڤسۆز، ئینا ب هندەك کریارێت زۆرداریێ ل دەڤەرێت ئامێدیێ رابوون، ئینا من برایێ خۆ مصطفا پاشا ڤرێکرە وێرێ دگەل تابوورەکا لەشکەرێ نزامی و هندەك لەشکەرێت نە نزامی و هژمارەکا توپا، هەروەسا من خەزینەداری ئەلئاغا ل دۆرێت پێنسەد سیار و پەیادا و هەمی ئالاڤێت دی، ل دویڤ واندا هنارتن. هەردیسا پشتی وان جار بۆ جارێ من لەشکەرێت دی هنارتن. لێ ئالۆزیێت ئامێدیێ نەبەس کارێ پاشایێ ناڤبری ب تنێ بە، بەلکی هاریکاریا

خۆ ژ سەرداچوویێت کوردا ژ وان دەڤەرا وەردگرن، ئێدی ئەو تشتێ موشیرێ ئاڤرێدەر گەهاندی، ئاشکرا بوو. مادەم کو ئەڤ فتنە یا تەڤایی بە، ئێدی چێنابیت ئەم باوەریا خۆ ب کوردا بینین، ئو ئەگەر تەنگستی د ڤێ مەسەلێدا هاتە کرن، ئێدی فتنە دێ مەزن بیت و ل هەمی دەڤەرا بەلاڤ بیت، سەروەریا (سننیە) دێ هەڤرویشی ئارێشەکا مەزن بیت. یامایی یا مە دڤێت بێژین کو هندەك ژ لەشکرێت من ل (صەفووقێ) و هندەکێت دی ژی ل دەڤەرێت ماردین و شەنگار و تەلەعفەرێ بەلاڤبووینە، ئو هەروەکو دهێتە ڤەگێران کو موشیری ژی هژمارەکا مەزن ژ (حیطە) و (ئەرنائوتا) د گەلدانە. ئەڤجا موشیر دشێت مەسرەڤا هزار کەسا ژ ڤان لەشکەرێت پیادێ بدەت و دشێت سەرۆکەکێ هەژی بۆ وان دانیت کو مەسرەڤا سەفەرا وان پاڤێژتە سەر قایمقامێ مێردینی ئان ژی سەر صەررافێ من ئو ب دەمەکێ بلەز ڤرێکەتە وی لایی من ژی شك د ڤێرێدا نینە. بەلێ پا ئەڤ فتنا کوردستانێ ژمێژوەرە هاتیە بەرهەڤ کرن و ب ڤی رەنگی ئاگرێ وێ خۆش بوو، ئەگەر ئەڤە ڤەکێشیت، دێ کارێت هەمی مەئموورێت دەولەتا عللیە هێنە راوەستاندن، مادەم رەوش هۆسایە، یا باش ئەوە بەری بگەهیتە ڤێ خالێ سەروبەر بهێتە تەناکرن، هەر دیسا دەولەتا عللیە جوداهی و ڤاڤارتنێ مابەینا زەلامێت وێ ناکەت، ئو پێتڤیە موشیرێ ناڤبری ب ڤێ چەندێ بێتە ئاگەهدارکرن چمکی ئەو جیرانێ ڤان دەڤەرایە، داکو ئەو هزار لەشکەرا ئان ئەگەر بشێت پتر، ژ ئەرنائووت و حیطا ب زویترین وەخت ڤرێکەتە دەڤەرێت میسلێ، من ئەڤە بۆ گەهاندنا ڤێ فتنێ نڤیسی بۆ هشیارکرن. هیڤیە هوین ئاگەهداربن و فەرمان یا هەوەیە ئەزبەنی.

٢٨ صەفەرا سالا ١٢٥٨ عبدە محمد

پشتی ڤێ پەییکا بەیرەقداری ب رۆژەکێ، ئانکو د ٢٩ صەفەرا ١٢٥٨مش (١١ نیسانا ١٨٤٢ز) دا، هەروەکی بەری نهۆ ژی مە ئاڤرۆ پێ دای، ئیسماعیل پاشای پەییکەك بۆ شێخ تاهرێ بامەرنی ڤرێکریە[٣٣] و گلی و گازەندە لێ کرینە کا بۆچی ئەو بوویە هاریکارێ دەولەتا ئوسمانی و بەرامبەری ملەتێ خۆ راوەستایە. ئیسماعیل پاشا ل جهەکی د ڤێ پەییکێدا دبێژیت کو (ئەڤە چار سالە ئەز کەڤتیمە بەغدایێ) ژ ڤێ ئاخڤتنا وی دهێتە زانین، کو ئەو (ئیسماعیل پاشا) ل سالا ١٢٥٤- ١٢٥٥مش، بەرامبەر ١٨٣٩ز. هاتیە گرتن و رەوانەیی بەغدایێ کریە، چار سالا ل بەغدا مایە، پاشی ڤەگەڕیایە و دیسا میرگەها ئامێدیێ ئێخستیە بن دەستێ خۆ و د صەفەرا سالا ١٢٥٨ێدا ئەڤ پەییکە نڤیسیە.

ئیسماعیل دبێژیتە شێخ تاهری، (تە خەلەتیەکا مەزن کر کو تە پشتەڤانیا محەمەد پاشا ئینجە بەیرەقداری کر، هنگە پشتەڤانیا وی کر بەس هنگە چ فایدە ژێ دیت! ئەڤ وەلاتە کەڤتە ددەستێ ویدا، ئەم و هنگ وەکی گرتیاینە). پاشی ئیسماعیل پاشا بەحسێ سەروبەرێ خۆ یێ خراب ل بەغدایێ دکەت و دبێژیت: (من دیت کو مال و دراڤێ من ژ من وەردگرن و من رەزیل دکەن و ئەڤ چەندە من قەبیل کر و بۆ دەمێ چار سالا ل بەغدا ئاکنجی بووم و ژبەریکا خۆ من خۆ خودانکر، بەس من دیت کو وان ب چ ئاوایەکی باوەری ب من نینە و هەردەم ژ جانێ خو پشت راست نەببوم (د دبن گەڤێ دا بووم)). ژ ڤێ ئاخڤتنا وی دهێتە زانین کو ئیسماعیل چار سالا بەردەوام د بن چاڤدێریەکا دژوار دابوویە و حوکمەتا ئوسمانی باوەری پێ نەهاتیە و دراڤێ وی و مالێ وی ژێ وەرگرتیە داکو پێچێنەبیت بزاڤێت خۆ بۆ زڤڕاندنا دەولەتا خۆ بکەت. بەلێ دیسا ژی ئیسماعیل نەراوەستیایە و بەردەوام هەڤبەندی و تێکهەلی دگەل خەلکێ میرگەها خۆ کریە، وی دەردێ هەژار و بەلەنگازێت بەهدینانێ باش زانییە. ئیسماعیل دبێژیت کو: (هەمی خەلکێ ویلایەتا بەهدینان، عەشیرەت و رەعیەت ژبەر وێ زولم و زۆرا ل وان هاتیە کرن، جابا من هنارت کو بگەهمە وان و د هەوارا وان بچم. ل سەر خاترا خەلکێ ژار و بەلەنگاز من داخازا وان بجهئینا و چووم، سوپاس بۆ خودێ، ژ کەرەما خودایێ مەزن، د هەیامێ دەهـ رۆژادا کەلا ئامێدیێ و کەلا قومری و شێخۆ و چەلکێ مە

ستاندن، كو هەمی خەلكێ بەهدینا ب غیرەت و رویسپیاتی ئاخڤتنا خۆ بجهئینا).

ئیسماعیل پاشا وەسا ددەتە ئاشكراكرن، كو بنگەهێ هەبوونا هەر مرۆڤەكی وەلاتێ ویە، ئەگەر وەلات نەما مرۆڤ ژی نامینیت، وەختێ وەلات كەڤتە ددەستێ دژمنیدا، ئەو وەلاتێ مرۆڤی ژی بۆ خۆ حسێب دكەت، لەوا گازندا دكەت و دبێژیت: (خودێ قەبیل ناكەت هەركەسەك دناڤ وەلاتێ خۆ روینیت و ئەم بێ وەلات بین). بەلێ یا ئیسماعیل پاشای هیڤیێت مەزن یێت هەین كو دێ ڤێ جارێ وەلاتێ خۆ یێ بەهدینان بەرفرەهتر لێكەت، ئەو ژی ب پێكهاتن و هەڤگرتنا خەلكێ بەهدینان: (ژبەركو تفاق و غیرەتا بەهدینان یا ڤێ جارێ وەسایە كو ئەم هیڤی دكەین كو وەلاتێ خوە بەرفرەهـ بكەین).

ئەڤا خارێ ژی دەقا پەیكا ئیسماعیل پاشایە و وەرگێرانا وێ یە ب كوردی:

(ئەڤە پەیكا شیخ تاهری یە بۆ اسماعیل بەگێ تێدا هندەك ئامۆژگاری و پەند لێكرینە و ئەڤە بەرسڤا وێ یە).

ئەزبەنی سولتانێ من (شێخ تاهر) قدس سرە

هەر تشتەكێ هەوە نڤیسی و رەوانەیی زەینەل بەگێ و عەبدولرحمان كری ئەم تێگەهشتین. هەوە گوتبوو كو نەبنە ئەگەرێت گونەهێت هندە قەدەر خەلكێ فەقیرو ژار و دیسا نڤیسی بوو كو ئەڤ هەڤیرە دێ گەلەك ئاڤێ ڤەخووت (ئەڤ ئارێشە یا مەزنە و بساناهی ناهێتە چارەسەر كرن). افندم، هەرتشتەكێ هاتییە نڤیسین ژ راستیێ زیدەتر نینە (ئانكو راستییە) بەس نزانم كو هەوە چ مفایەك ژێ (ژ ئینجە بەیرەقداری) دیتییە، ب خێرا تە ئەڤ وەلاتە كەڤتە دەستا بەلێ نۆكە هوین وەكی گرتییانە، تە چ خێر دیتییە و ئەگەر هوین بەحسێ خەلكێ ژار و فەقیر بكەن ئەو هند ژ دەستێ محمد پاشای عاجز بووینە كو ئەو ژ خۆ رازی و دلخوشن و هەروەسا ئەی هێژا تو دزانی ئەو رۆژا كو ژ كەلها نێروە دەركەڤتیم و هاتیمە دخزمەتا میرێ خۆ دا ئەز ب ڤیانا دلێ خۆ هاتم و من نەڤیا كو ئەو رەزیل ببن، چونكە من گوهـ لێ ببوو كو لەشكەرێ حافز پاشای یێ شكەستی، خودێ ژێ رازی (جهێ وی بەهەشت بیت) سولتان محمود یێ مری و من گۆت ژ ئەڤرۆ پێڤە دچمە خزمەتا ئەفەندیێ خوە و ئەز ب وێ مەرەمێ هاتبووم كو رحا خۆ یا شرین گوری خزمەتا وی بكەم، بەلێ من دیت كو دراڤێ (مال) من ژمن وەردگرن و من رەزیل دكەن، بەلێ من ئەڤ هەمی كارە قەبیل كرن و بۆ دەمێ چار سالا ل بەغدا ئاكنجی بووم و من ژبەرویكا خۆ، خۆ خودانكر، لێ من دیت كو وان ب چ ئاوایەكی باوەری ب من نینە و هەردەم ژ جانێ خۆ پشتراست نەبووم (دبن گەڤێ دا بووم)، (ژ لایەكێ دووڤە) و هەمی ویلایەتا بەهدینان و عشایر و ژ خەلكێ عادی (رعیت) ژبەر ئەو زولم و ستەما ل وان دهاتە كرن جابا من هنارت دا كو بگەهمە وان، من ژی بێخاتریا خەلكێ فەقیرو ژار نەكر و الحمدلله ژ كەرەما خودایێ مەزن د هەیامێ دەهـ رۆژان كەلها ئامێدیێ و كەلها قومریێ و شخوبێ و چەلكێ كەڤتنە دەستێ مەدا و مە فەتح كرن، بلا هەمی بەهدینان ب غیرەت و رویسپی و هەژیبن، وان گۆتنا خۆ ب جهئینا و نانێ خو حەلال كر (مەرەما وی ئەوە كو ئافەرین بۆ بەهدینان)، ب هیڤیا خودێ دێ رۆژ بۆ رۆژێ نامیس و غیرەتا وان زێدە بیت و هەر رۆژ انشاللە دێ مزگینییێت پڕەنگ گەهنە گوهێ هەوە و مە ژ موستەفا پاشای توپخانە و جەبلخانە وەرگرتن و من نەڤیا كو لەشكەری بكێشم، ئەگەر نە سەركەڤتن بەهرا مە بوو دا وان خلاس كەین، بەس انشاللە دو سێ رۆژەكێت دی برایێ پاشایێ ناڤبری ب خوە دێ ژ كەلێ دەرێخین و من دڤێت هوین بزانن كو من لەشكەرەك هنارتییە سەر وی و ئەز بخۆ دێ بەر ب ویلایەتا میسل چم. ئەز عەبدێ گوهدارێ میرێ خۆ مە و ئەوا من كری من ژ نەچاری و بێباوەری و ژ ترسا رحا خو من كریە، ئەگەر نە ئەز دەستێ خۆ ژ دەهمانا میرێ خۆ بەرنادەم (ئانكو تەنگسستیێ ناكەم) و ئەز دخزمەتا ویدا راوەستایمە، (بەس هوین بێهنا خۆ فرەهـ كەن) دێ بینن كا ئەز (دێ) چاوا خزمەتێ كەم و ئەز خولامەكێ چاوا مە، نێ ئەزبەنی

**(٨) پەیێکا ئیسماعیل پاشای یا د ٢٩ صەفەرا ١٢٥٨مش، دا بۆ شێخ تاهرێ بامەرنی ڤرێکری**



خودێ قەبیل ناکەت (انشالله) هەرکەسەك دناڤ وەلاتێ خۆ روینیت و ئەم بێ وەلات بین. هیڤیدارم د دوعایێت چاکیێ دا من ژ بیر نەکەی و دلێ هەوە ژ من نەمابیت. ژبەرکو تفاق و غیرەتا بەهدینان یا ڤێ جاری وەسایە کو ئەم هیڤی دکەین کو وەلاتێ خوە بەرفرەهـ بکەین و ژ دەرحەق دوژمنان دەرکەڤین.

والحمدلله کەلها ئامێدیێ ژ بەر رۆناهیا چاڤێ عەلی بەگێ کەڤتە دەستێ من و تەڤایا خەلکێ ژار و فەقیرێ ویلایەتێ دوعایا ژ بۆ من دکەن. انشالله دێ بینی و دێ سەحکەیێ کا دونیا دێ چ لێ هێت! وەسەلام(٣٤) .٢٩ صەفەرا ١٢٥٨مش. (اسماعیل) محفوظ العباسی چوونا ئیسماعیل پاشای د

ئامێدیێدا هۆسا نڤیسیە: (لەشكەرێ ئوسمانی چوو دئامێدیێ دا. چەند رۆژا تێدا مان و پاشی یوونس ئاغایێ كیلی كو ئێكبوو ژ كەنكەنێت ئامێدیێ دانا سەر ئامێدیێ و ئەو (لەشكەر) زڤڕی میسلێ. ئەڤ یوونس ئاغایە یێ دلسۆژ بوو بۆ ئیسماعیل پاشای، ژبەر وێری ژی رابوو جابا وی ڤرێكر و داخاز ژێ كر كو بزڤریتەڤ سەر تەختێ میرگەهێ. ئینا ل نیڤا شەڤێ زڤڕی و چوو دئامێدیێدا، ئەڤە ژی د سالا ۱۲۵۸مش ۱۸٤۲زا. بوو. خەلك ب گەرمی چوو پێشاهییا وی، بەلێ پا وی باش دزانی كو ئەگەر حوكمەتا ئوسمانی وی نەپەژرینیت فایدە ناكەت، رابوو داخاز ژ ئینجە بەیرەقداری كر، ئەگەر وەكی بەرێ میراتییا ئامێدیێ بۆ بزڤرینن، ئەو دێ فەرمانا بجهـ ئینیت، بەلێ بەرسڤا وی نەدا، ژبەركو حوكمەتا ئوسمانی كربوو د مەنهەجێ خۆ دا، كو دەولەت و میرگەهێت كوردی ئێك ل دویڤ ئێكێ پویچ كەت، ژبەر وێرێ ژی یا خۆرستی بوو كو هیڤییا وی بەلاش بچیت، بەلكی بەروڤاژی وێرێ، شۆلەكا ستویر یا لەشكەری كۆم كر و ڤرێكرە ئامێدیێ دا شەڕێ وی بكەن [٣٥].

ئیسماعیل پاشا چوو د ئامێدیێدا، ئامێدیەكا وەستیایی، یا وەستیایی ب دو ئێریشێت مەزنێت میرێ كۆرە ل سەر بەهدینا و دیسا ئێرشێت بەردەوامێت ئوسمانییا بۆ سەر بەهدینا. بەلێ پا (تەعەصصوبا وی یا قەومی) هەروەكی پاشایێت ئوسمانییا ئەو پێ گونەهبار دكر، نەدهێلا، ئەو میرگەها ب سەدێ سالا باب و باپیرێت وی حوكوم تێدا دكر، ب ساناهی تەسلیمی بیانییا (ئوسمانییا) بكەت. لەوڕا ڤێ جارێ ژی بڕیار دا كو شەڕێ ئێك ژ مەزنترین دەولەتێت دنیایێ بێت وی دەمی بكەت و ناڤەكی بۆ خۆ و ملەتێ خۆ د دیرۆكێدا بهێلیت.

ژ رەخەكێ دووڤە، ئوسمانییا خۆ ب نویترین چەكێ ئەورۆپی چەكداركر بوو، هێزێت خۆ بسەروبەر كربوون و بەر ب كوردستانێ هنارتن. كوردستانێ ژی سێ میرگەهێت خۆسەر و بهێز هەبوون، یێت ئوسمانییا سەنگەك بۆ دادنا (بۆهتان، بەهدینان و سۆران) بوون. میر محەمەدێ كۆرە پشتی میرگەها بەهدینا ژ هێز و ڤەژەنێ ئێخستی، وی خۆ و میرگەها سۆران تەسلیمی ئوسمانییا كرن. ئێدی میرگەهێت ڤێكاڤێ ئوسمانی ژێ دترسن، مانەڤە دو، (بۆهتان و بەهدینان). دەسپێكێ ئوسمانییا بەرێ شاپا لەشكەرێ خۆ یێ مەزن دا بەهدینان.

(ئەڤ هەڤركیا سۆروسۆر یا ئیسماعیل پاشای) بۆ ئینجە بەیرەقداری، كو وی سەروەرییا خۆ بەرفرەهتر لێكربوو، جزیرا بۆهتان ژی بۆ خۆ دانابوو، ئەڤێ هەڤركیێ پاشڤەژەنەكا (رد فعل) دژوار ل نك وی پەیداكر، والیێ میسلێ ئینجە بەیرەقدار تێرا خۆ فێلباز و زانابوو كو ئەو بۆ جارا ئێكێ ئێرشێ نەكەتە سەر بەدرخان بەگێ، بەلێ وی بەری هەمی جها دەستێ خۆ دانا سەر حامیا زاخۆ ، كو بەری هنگی حاكمێ كورد ل وێرێ كوشتبوو و تشتێت وی ژی هەمی ستاندبوون و هێزەكا لەشكەرێ خۆ دانابوێ. ئو ل رۆژهەلاتێ ژی ئاكرێ ستاند و میرێ وێ ژی ژ سەروەریێ قەلدا و دەستێ خۆ دانا سەر مەخزەنێت گەنمی، برنجی و پەمبوی و هێزێت ئوسمانییا دووربێچا خۆ یا سەربشك دانا سەر ئامێدیێ[٣٦].»

ئیسماعیل پاشا ب نەچاری كەڤتە دشەڕەكێ مەزن دا و ئالیسەنگییا شەڕی ژی ب لایێ حوكمەتا

(٩) دیرۆكا شەڕێ هیتیتێ ب خەتێ (مهری)


اخذ داشتن قلعهٔ عمادیه از رومیان
وكشته شدن علی اغای زیباری
در قلعهٔ مذكوره وكشته شدن حسین اغای
اركوشی وعلی اغای شرفان واسعد بك
سرواری وطاهر بیك وغیرایشان
از رؤسای بهدینان در قریهٔ ایتوش
سنه ۱۲۵۷

ئۆسمانیڤە بوو، ئیسماعیل پاشای بخۆ ژی ئەڤ تشتە د زانی، بەلێ ئوسمانی ب چ تشتەکی درازینەبوون، بژلی هەرفاندنا میرگەهێت کوردا، ژبەر ڤێرێ ژی، ئوسمانییا بەرێ لەشکەرێ خۆ دا وێ دەڤەرا کەسیرە و وەستیایی، بەلێ دیسا ژی لەشکەرێ بەهدینان ل گەلەك جها شەرێت مەزن کرن. گەلەك ژی هاتن کوشتن. زانایێ مەزن محەمەد سەعید مێهری (١٢١٠ - ١٣٠١مش ١٧٩٥ - ١٨٨٣زا) د رۆژبۆرێت خۆدا نڤیسیە: «کو ل سالا ١٢٥٧مش. رۆمیان (ئانکو تورکان) کەلا ئامێدیێ ستاند و عەلی ئاغایێ زێباریێ تێدا کوشت. دیسا هەر د وێ سالێدا حوسێن ئاغایێ ئەرگۆشی و عەلی ئاغایێ شەرەفانی و ئەسعەد بەگێ بەرواری و تاهر بەگ و بژلی وان چەندەکێت دی ژ سەرۆکێت بەهدینان ل گوندێ هێتیتێ کوشتن [٣٧].»

ئەڤ دیرۆکا هەنێ یا کو محەمەد سەعیدی بۆ ستاندنا ئامێدیێ و شەرێ هێتیتێ قەید کری، ب راستی گەلەك یا بەرکەڤتیە، بەلێ د هەمی ژێدەر و دۆکۆمێنتادا وەسا هاتیە کو سالا ١٢٥٨ێ مشەختی ئیسماعیل پاشا چوویە دئامێدیێ دا و هەر د وێ سالێ ژی دا ئامێدیێ کەڤتیە و شەرێ هێتیتێ ژی هەر د وێ سالێدا بەری کەڤتنا ئامێدیێ بوویە. ئەڤجا ئەم نزانین کا بۆچی مهری ئەڤ دیرۆکە هۆسا دانایە، بەلکی ژی یا دروست ئەڤە بیت. لێ هەرچاوا بیت ئینانا ناڤێت کوشتییێت سەرەوەرێت بەهدینان بۆ دیرۆکێ تشتەکێ هێژایە.

«وەختێ ئیسماعیل پاشای زانی کو محەمەد پاشا ئینجە بەیرەقداری لەشکەرەکێ مەزن بەر ب ئامێدیێ ڤرێکریە، نەچاربوو کو بچیتە مەیدانا لەشکەرێ ئوسمانییا، هەردو کۆم ل نێزیکی گوندێ هێتیتێ گەهشتنە ئێك، شەرەکێ دژوار د ناڤبەرا هەردو ئالییادا چێبوو، بەلێ پا نەهەڤسەنگیا هێزێ ئێکا وەکر کو لەشکەرێ بەهدینان بشکێت، لەشکەرێ ئینجە بەیرەقداری گەلەك زۆرداری و خوینرژاندن و تالان و پویرە ل گوندێت بەهدینانێ کرن، نەخاسمە ل ئەلکیشێ، ئو ئیسماعیل پاشا وەکی هەر جار زڤریڤە لەندا خۆ و خۆ د کەلا خۆدا ئاسێکر، بەلێ پا لەشکەرێ ئوسمانی چار هەیڤا دەراندەر (کەلا) دووربێچ کر، حاکمێ وێ یێ قەهرەمان ئیسماعیل پاشا نەچار بوو کو ب وان شەرتا رازی بیت ئەوێت ئینجە بەیرەقداری هاڤێتینە بەر، ئێك ژ وان ئەو بوو، خۆ تەسلیم کەت کو سلامەتییا وی بهێتە پاراستن و ل نك باب العالی واستەیێ بۆ بکەت ل ویلایەتەکێ مەنسبەکی بدەتێ، ئەو تشتێ محەمەد ئینجە بەیرەقداری ڤیای بۆ بجهـ هات، حاکمێ بەهدینی دگەل مالباتا وی و دەستەکا وی و هەمی مال و ملکێ وی دگەل خۆ هەلگرتن و ڤرێکرنە بەغدا، ئەڤە ژی د سالا ١٢٥٨مش. بوو.... ئو هۆسا لەشکەرێت ئوسمانی ژۆرکەڤتنە پایتەختێ میرگەها بەهدینان و ئەو وەلاتێت گرێدایی وێ ژی هەمی گرتن، ئامێدیێ و ئاکرێ هەیامەکی ب میسلێ ڤە گرێدان، پاشی ئامێدیێ ژێ ڤەکر و سالا ١٢٦٥مش. ١٨٤٨زا. ب (هەکارێ) ڤە گرێدا و ئاکرێ ژی هەر ما گرێدایی میسلێ [٣٨]».

## ئیسماعیل پاشا ل بەغدایێ

مژارا چوونا ئیسماعیل پاشای د ژێدەرادا گەلەك بەحس لێ نەهاتییە کرن، کەسێ کو پێنچەکێ ب درێژی بەحس کری، مەحفووز ئەلعەباسی یە، ژبەرکو ئەڤ قووناغە ژی د ژیانا ویدا یا فەرە، لەوا ئەم دێ پتر ژ هەمی ژێدەرا پشتا خۆ ب وی گەرم کەین!

مەحفووز العباسی دبێژیت: «وەختێ ئیسماعیل پاشا و مالباتا خۆ گەهشتینە بەغدا، عەبدو لرەحمانێ سەهرەوەردیێ عەباسی چوو پێشاهییا وان و دانانە دمالا خۆدا و قەدرێ وان گەلەك گرت و هەیامەکی تێدا مان.

د چاخێ وەزیر عەلی رزا پاشای دا، ئیسماعیل پاشا هاتە خەبتاندن (تعیین کرن) بۆ موتەصەرفێ (کەربەلایێ) و هەیامەکی ل وێرێ ما، د چاخێ وەزیر نامق پاشای دا، بۆ ویلایەتا شەهرەزۆرێ هاتە ڤەگوهازتن، کو هنگی سلێمانیێ و کەرکوکێ و

دەڤەرێن وان پێڤە دگرێدایی بوون. پاشی خاباتکاریا خۆ هێلا و زڤری بەغدایێ. جارەکا دی هاتەڤ مێڤانداریا سەهرەووەردی، ئەو ب نویژەنکرنا مەدرەسا سەهرەووەردیە رابوو، چمکی لەهیبا سالا ١٢٤٩مش. ١٨٣٣زا گەلەك تیك و دەرز ئێخستبوونێ، ئینا ئیسماعیل پاشای ژی پشکداری د نویژەنکرن و ئاڤاکرنا مەدرەسێدا کر، رابوو چل هزار (غرش رائج بغدادی) بێشکرن، ل سەر ئاڤاکرنا ئەیوانەکا مەزن کو دو شارەستینا ئەو ئەیوان هەلدگرت رەخ و دۆرا ئۆدیت ب روخامی و دارێ ساج یێ ب بها ئاڤاکرن، کو دکەڤنە هنداڤا دەرگەهی بەرامبەری بەیابانێ، نهانیێ رۆژهەلاتێ ژی نویژەنکر، جهەکێ ئاڤڤەخارنێ چێکر و بیرەکا دیوارێ وێ ب بەری ل نێزیکی حزرەتێ (مەرەم پێ: مەزارێ شێخ عەبدولقادرێ گەیلانی یە) کۆلا و کرە (سەبیلخانە) دا بەلەنگازێت رەندەکێ ژێ ڤەخۆن. بۆتا ئاڤا مزگەفتێ ئەوا حوسێن پاشایێ سیلەحدارێ والیێ بەغدایێ چێکری، نویژەن کر، جورنیێ ئاڤێ یێ مەزن ژی ئەوێ دکەڤیتە (سوق الفچل) ئاڤاکر، ئەڤە د سالا ١٢٧٤مش. ١٨٥٧زا. بوو.

زانایێ مەزن سەیدا عبد الباقی العمری ب ڤێ هەلکەڤتنێ دبێژیت:

**للتقی اسماعیل قد شاد بیتا**
**بات فی ظله الهدی موقوفا**
**بشهاب الدین الحنیف تسامی**
**شرفا فاغتدی مقاما شریفا**
**وبنی فیه خیر مدرسة للعـــــــ**
**ــــلم کانت للطالبین مضیفا**
**فقام عبد الحمن مقام الغیث**
**یروي الظمأ ویؤوی الضیوفا**
**ویها للصلاة یلقی الیفا؟**
**واماما وللصلاة حلیفا**
**وعلیها قدموا للعز قصرا**
**احرز المجد تالدا وطریفا**
**بالقصر علا بناء واضحی**
**بعلاه للمجد تدین الیفا**
**فارفع الکف داعیا یا مؤرخ**
**شاد عبد الرحمن قصرا منیفا** (٣٩)

پشتی ژ ڤی شولێ خێرێ یێ هێژا خلاس بووی، محەمەد نامق پاشای و مەزنێت دەولەتا وی پیرۆزباهی لێ (ل ئیسماعیل پاشای) کر و خانەدان و گرەگران بهایەکێ مەزن دا ڤی کاری، دیسا شاعر عەبدولباقی یێ عومەری ب ڤێ هەلبەستێ پەسنا وی کر:

**ان اسماعیل والي شهرزور**
**صاحب التدبیر والرأي المسدد**
**حب اهل الله قد صار له**
**دیدنا في کل حین یتجدد**
**مفرد ما بین ارباب العلا**
**کم له من نعمة لا تتعدد**
**خالصا لله من غیر ریا**
**لا ولا عن سمعة بالبر تقصد**
**سابقا کان بنی طارمة**
**خنصر الفضل علیها راح یعقد**
**ویتصدی لاحقا یتبعها**
**بنا طاق لأوج المجد یصعد**
**بالآثار تسامت وعلت**
**محتدا ابقی له الذکر المخلد**
**دام ملحوظا بعین الله من**
**کل سوء ومصونا ومؤید**
**فی مقام السهروردی ارخوا**
**حجر اسماعیل للعز تشید**

ئیسماعیل پاشای قەسرەکا مەزن و بلند ل نێزیکی مەکانێ سەهرەووەردی ئاڤا کر، کووچکەك تێدا چێکر زانا و تۆرەڤان و شاعر و زەلامێت دینی سەرلێددا، هەتا مەلا یەحیایێ مزووری ژی ئەوێ بوویە ئەگەرێ کەڤتنا میرگەهێ. جارەکێ ئیسماعیل پاشای پسیار لێکر، گۆتێ: «وەختێ تو ژ ئامێدیێ دەرکەڤتی تە سویند خاربوو کو تو نەکامیا مە نەکەی و ب خرابی بەحسێ مە نەکەی، ئینا مزووری بەرسڤ دا: ئەو وەیە، من پێکۆل کر هەوە ژ کورسیا بەهدینا بینمە خارێ، من هنگ ژ زۆرداری و دژمنداریێ دویر ئێخستن و من هنگ ژ ئاگرێ جەهنەمێ قورتال کرن، ئینا پاشا ژ بەرسڤا وی یا بلەز و بیرتیژیا وی ئەجێبکرتی بوو).

ئو عومەری گۆت:

**شاد عبد الرحمن في امر اسماعيـــــل**
**قصرا في حضرة السهروردي**
**قد تسامت اركانه واطلت**
**غرفات منه على روض ورد**
**يتحف الزائرين في طيب عرضها**
**نقلته الشمال من ارض نجد**
**وعليل النسيم فيه اذا هب**
**صباهم ينشر شبح ورند**
**تتراى للطرف منه جنات**
**بكروم تحلى قلائد عقد**
**نزه الناظرون فيها عيونا**
**نزيهة الطرف من محاسن ضد**
**شاده واعلى بناه نعيم**
**ساع فيما يعيد ويبدي**

پاشی حوکمەتا ئوسمانی پشتی مرنا ئیسماعیل پاشای (قەسرا) وی کرە مەخفەرا جەندرما، هەتا سالا ١٣٣٣مش ١٩١٤زا. یا ئاڤابوو، ژبەر لەهیبا ڤێ دویماهیێ ئەو و ئاڤاهیێ جامعێ کەڤتن.

شێخ عەبدولقادر باش ئەعیانێ عەباسی بۆ مە ڤەگێڕا: د دەستنڤیسێت وان د مەکتەبا (العباسیه) یا تایبەت ل بەسرایێ دا ئەڤ دەقە هاتییە دیتن: «میرێ میرا ئیسماعیل پاشایێ عەباسی یێ ئامێدی سالا ١٢٨٠مش ١٨٦٣زا. حاکم بوو ل بەسرایێ ب وەزیفێ (قایمقام) و نێزیکی سالەکێ تێدا ما...».

«د وان هەمی ویلایەتێت ئیسماعیلی حوکوم تێدا گێڕای، هەردەم یێ دەست پاقژ بوو و شۆل و کارێت هێژا تێدا کرینە و پرۆژێکتێت وەسا چێکرینە یێ بەرێ خۆ بدەتە وان شوینوارا هەتا نهۆ ژی بەحس ژێ دهێتەکرن. مە تێبینی کر کا چاوا ئەڤ قەهرەمانە د هەر زەمانەکی و د هەر مەیدانەکێدا یێ بوویە ئالایێ مەجد و شەرەف و خۆشمێری و مەردینیێ، ئەو شیان و پێڤەهاتنێت ڤی ئاقلدارێ مەزن بوونە جهێ قەدرگرتنا کرەکر و کەنکەنان هەتا پشتی کەڤتنا میرگەها وی ژی. مە ژ گەلەک کەسێت باوەرپێکری زانییە کو ئیسماعیل پاشا ژ رەخێ رەوشەنهزری و زانست و ئەدەب و دینی ڤە، گەلەکێ داگرتی بوو. (وی گەلەك جارا زەلامێت خۆ دجەرباندن سەرێت وان ب هشکی دتراشتن.. دا هویکەتە نەخۆشیا[٤٠].

دیسا عەباسی نڤیسییە:

سالا ١٢٨٩مش ١٨٧٢زا. ئیسماعیل پاشا مر و چ دووندە پاش خۆڕا نەهێلا و د گۆڕستانا گەیلانی دا هاتە ڤەشارتن، ڤەشارتنا تەرمێ وی ب شاهیەکا مەزن هاتە برێڤەبرن، والی و سەروەر و زانا و خانەدان تێدا مەشیان. ئەحمەد عزەت پاشایێ عومەری یێ شاعر زێمارەك پێ گۆتیە:

**يا قبر اسماعيل فيك مهذب**
**نعم الأمير له الفخار دليل**
**يا قبر اسماعيل فيك مهذب**
**نعم الأمير له الفخار دليل**
**رجل من البشوات ينسب للعلى**
**زان احتفاظ المجد وهو جليل**
**هو من بني العباس نال مفاخرا**
**وله فروع قد زكت واصول**
**كم من وزير سار يرقب نعشه**
**والظن منه بالفقيد جميل**
**يا تربة للقادرية تنتمي**
**قد حل فيها للجنان سبيل**
**يا من يخلد ذكره بقريضة**
**دهرا فدهرا والزمان طويل**
**فاذا له ارخت حي مبشرا**
**وافى الى الفردوس اسماعيل**[٤١]

دیسا مفتیێ بەغدایێ محەمەد فەیزی زەهاوی ژی زێمارەك پێ گۆتیە.

**وافيت بغداد اسماعيل عن شرف**
**من العمادية اهتزت امانيها**
**من بعدما سقطت قهرا امارتها**
**حيث انتهى من بنى العباس ماضيها**
**فاستقبلتك من الزوراء عن ثقة**
**اشرافها الغر يا بشرى وواليها**
**قد كنت شهما تقيا عالما ورعا**

مهذبا قد كفى السن تكافها
سعى الى الخير عباسي مفخرة
دامت له وهو عن فضل مواليها
حتى استقام في بغداد التى شهدت
بفضله ودرى اسمى معاليها
ورام من صحبه من كان ذا ثقة
وطاب نفسا بها ادى مراميها
حتى ثوى في ضريح عز نصبه
بالقادرية بالتقدير كافيها
عليه رحمة رب العرش تتحفه
بجنة اظهر الغفران خافيها
كان الفقيد عفيفا طاهرا فطنا
والنفس منه قد زانت معانيها

مەلا ئەنوەرێ مایی دبێژیت: ئیسماعیل پاشا د گۆڕستانا شێخ عەبدولقادرێ گەیلانی دا ل بەغدایێ یێ هاتییە ڤەشارتن، تەرمێ وی ژ لایێ شێخ عەبدولرەحمانێ سەهرەوەردی و سەیید عەلی نەقیب کو ئێك بوو ژ کەنکەنێت بەغدایێ، ب ئاخێ هاتە سپارتن. تۆرەڤان عبدالباقی العمری مرنا وی ب ڤان مالکان ئێخستیە د مێژوویێدا:

يا قبر اسماعيل فيك مهذب
نعم الامير له الفخار دليل
رجل من البشوات ينسب للعلى
زان احتفاظ المجد وهو جليل

هەتا دگەهیتە:

فاذا له ارخت (حي مبشرا وافى الى الفردوس اسماعيل)

ئەڤ مێژوویە ب رەنگێ خارێ دهێتە ڤەکرن:

ح ٨+ ی ١٠: حي

م ٤٠+ ب ٢+ ش ٣٠٠+ ر ٢٠٠: مبشرا

و ٦+ أ ١+ ف ٨٠+ ی ١٠+، أ ١+ ل ٣٠+ ی ١٠: وافى الى

أ ١+ ل ٣٠+ ف ٨٠+ ر ٢٠٠+ د ٢+ و ٦+ س٦+: الفردوس

أ ١+ س ٦٠+ م ٤٠+ أ ١+ ع ٧٠+ ی ١٠+ ل ٣٠: أسماعيل

مرنا ئیسماعیل پاشای ل دویڤ ڤێ مێژوویا ب حەرفێت ئەبجەدێ هاتییە نڤیسین و من ڤەکری، هەر وەکی د ژێدەرادا هاتی، دبیتە سالا ١٢٨٩مش. بەرامبەر ١٨٧٢ز.

بەلێ ئەگەر ئەم حرفا (أ) ژی یا کو دکەڤیتە دویماهیا پەیڤا (مبشرا)، بهەژمێرین، سالا مرنا وی دێ بیتە ١٢٩٠مش ١٨٧٣ز.

مەلا ئەنوەر ئەڤ مێژوویە ڤەنەکریە، بەلێ ئاڤڕ دایە سالا مرنا وی و وەسا دانایە کو د سالا ١٢٩٢مش. بەرامبەر ١٨٧٦ز، مریە. هەرچەند ئەڤ سالا زایینی یا

**(١٠) بەرپەرێ ئێکێ ژ دیوانا مەلایێ جزیری ب خەتێ ئیسماعیل پاشای**



مەلا ئەنوەری بەرامبەری یا مشەختی دانای ناکەڤنە بەرێك، بەلكی سالا زايينی دبيتە ١٨٧٥.

د كتێبا (المعجم التاريخی لاماره بهدينان)دا ژی، مرنا ئیسماعیل پاشای بۆ سالا ١٢٨٩مش. ١٨٧٢زا، دانایە[٤٢].

ژ برایێت ئیسماعیل پاشای:

١. عبد القادر پاشا: ئەوێ پشتی میرگەه كەڤتی (ژێبش ویڤە) بوویە قایمقام[٤٣].

٢. سراج الدین پاشا: ژ وی وەیسی بەگ و عەبدوللا بەگ چێبوون.

٣. فتح اللە بگ: ئەوە یێ سالا ١٢٨٢مش ١٨٦٥زا. ل سەردەمێ خەلیفێ ئوسمانی سولتان عبد العزیز بازێرکێ (العزیزیە) ئاڤاکری و تێدا بوویە قایمقام

## ئیسماعیل پاشا یێ زانا و تێگەهشتی

دیرۆکا میرێت کوردا وەسا نیشا مە ددەت، کو میرێت وان پویتەیەکێ مەزن دایە علم و زانینێ، نەخاسمە میرێت میرگەها بەهدینان کو پتریا وان زانایێت مەزن بووینە و ژبەر وێرێ ژی هەم د بیاڤێ سیاسەتێ هەم ژی یێ زانینێ دا سەرکەڤتی بووینە و خۆیانی و بیانیا ب بلندی نێرایە لۆکا وان یا تێگەهشتن و زانینێ، ئەڤجا بگرە ژ سولتان حوسێنێ وەلی (سالا ٩٤٠مش ١٥٣٤زا دەستەلات گرتییەدەست) و هەتا دگەهیتە ئیسماعیل پاشایێ دویێ، میرێ داویێ یێ میرگەها بەهدینان. بەلکی ئەگەر ئەو تشتێ وان بۆ زانینێ پێشکێش کری و لۆکا وان یا زانینێ ب دۆکۆمێنت گەهشتبانە دەستێ مە، دا ئەم شێین ب رەنگەکێ بەفرەهتر ل سەر ڤێ مژارێ راوەستین، بەلێ هەر چاوا بیت ئەو پێزانینێت د دەستێ مە دا هەین، تێرا هندێ دکەن کو راستەیا (مستوی) زانین و تێگەهشتنا ڤێ میری بزانین.

بەری هەر تشتی ئەم دێ بەر ب وان نڤیسینانڤە چین یێت وی ژ زانایێت مەزن ڤەگوهاستین، ئانکو وی ب خەتێ خۆ دیوانێت وان ئان کتێبێت وان نڤیسین، وەکی مەلایێ جزیری و فزوولی و گەلەك شاعرێت دی یێت فارس و ترك و كورد.. ئو پیچەکێ ب درێژی ل سەر وان دەسنڤیسان راوەستین. ژبەرکو مرۆڤ دشێت ب رێکا وان دەسنڤیسان هندەکێ ژ راستیيا وی یا زانینێ بەرچاڤ کەت.

ئیسماعیل پاشای دەسنڤیسەکا هێژا پاشخۆڕا هێلایە، (کو برایێ هێژا تەحسین ئبراهیم دۆسکی پێشکێشی من کریە) ب راستی ئەڤ دەسنڤیسە گەنجەکا هندی بێژی زەنگینە هەم بۆ ڤەدیتنا گەلەك کوژی و قولاچا د ژیانا ئیسماعیل پاشای دا، هەم ژی بۆ ڤەکۆلینان ل سەر دەسنڤیسێت کوردی و هەلشکاڤتن و تویژاندنا وان دەڤێت تێدا ب دەستێ

**(١١) شعرەکا جزیرێ، ١٢٦٠مش ب خەتێ ئیسماعیلی**



(١٢) پەڕەکێ نەخشاندی ژ دەسخەتێ ئیسماعیل پاشای



ئیسماعیلی هاتینە نەخشاندن.

دەسنڤیس هۆسا هاتییە خەملاندن:

١. پشکا ئێکێ: دیوانا مەلایێ جزیری. دەسنڤیسا ڤێ دیوانێ، هەم وەکی دۆکۆمێنتەکا دیرۆکی کو ب دەستێ میرەکێ کوردا هاتییە مەشقکرن، هەم ژی وەکی لبەکا دەسنڤیس بۆ تویژاندنا دیوانا مەلایێ جزیری بهایەکێ مەزن هەیە.

٢. پشکا دویێ: غـەزەل و ئاخڤتنێت گەلەك شاعرێت فارس و کورد و تورك ب فارسی. ژ وان شاعرا: أبن حسام، مولانا رومی، شیخ عطار، حافف شیرازی، مخمس لاغر بر غزل احمد جزیری، فرمودئی صایب، فرمودئی خطیبی، جامی، شوکت، هلالی، صبوری، غازی بلخی، صفی، مخمس شوقی بر غزل جامی، مخمس غازی بر غزل رسوائی، مخمس حزنی بر غزل سعدی، مخمس فاتح بر غزل حسن، فرمودئی کلیم همدانی، عرفی، علی، طالب، خادم، اسماعیل عباسی (کو ئسماعیل پاشا بخۆیە).. ئو گەلەکێت دی. ئەڤ غەزەلە پتریا وان چاریەندی و پێنجبەندی و هەشتبەندینە (رباعی، مخمس، مپمن).

٣. پشکا سێیێ: دیوانا شاعرێ ناڤدار (فضولی) یە.

کۆپیێت رەنگین یێت وان دەسنڤیسێت ئیسماعیل پاشای ب خەتێ خۆ نڤیسین ل نك من هەنە [٤٤]. پاشایێ ناڤبری سالا ١٢٦٠مش. بەرامبەر ١٨٤٤زا. مەشقکرنا دەسنڤیسێ بدویماهی ئینایە. وی ب خەتێ (دیوانی) یێ فارسی دەسنڤیس خەملاندییە..

ئیسماعیل پاشای سێ جارا ناڤێ خۆ د دەسنڤیسێدا ئینایە:

١. ل دویماهیا دیوانا مەلایێ جزیری کو ب شعرا (یا رامی قلبی بسهام اللآهاتی) دویماهی پێ ئینایە، ناڤێ خۆ ب ڤی رەنگی نڤیسییە: (حرره اسماعیل ابن محمد طیار پاشا سنه ١٢٦٠).

٢. پشتی چاریەندی و پێنجبەندی و هەشتبەندیێت گەلەك شاعرێت کورد و فارس و ئوسمانی دنڤیسیت، ئێدی دەست ب نڤیسینا هندەك ئاخڤتنێت حافزێ شیرازی کریە و ل دویماهیا گۆتنێت وی ناڤێ خۆ نڤیسییە، بەس ئەو بەریەرێ وی ناڤێ خۆ تێدا ئینای،

جهێ هندەك پەیڤا دڕیایە و نەماینە، یا دیار تنێ ئەڤەیە: (حرره اسماعيل ابن محمد گیار عباسی).

٣. پشتی ڤێ ژی، نڤشتوكەكا شاعرێ ب ناڤودەنگ فضولی نڤیسییە. د دویماهیا نڤشتۆكێدا ناڤێ خۆ ب ڤی رەنگی نڤیسییە: (حرره اسماعیل ابن محمد طیار پاشا).

٤. د دویماهیا كتێبەكا فضولی دا، كو ئیسماعیل پاشای ب ناڤێ (كتاب فضولي) ناڤكریە، دیسا ناڤێ خۆ ب ڤی رەنگێ خارێ نڤیسییە: (تمت تمام شد كتاب حضرت خواجه فضولي بغدادي رحمهم الله وتعالى بعون الملك المنير من يد اضعف المسلمين اسماعيل بابن محمد طيار پاشا يسر الله له ما يشاء حررة وجمعة در ماه شوال سنة١٢٦٠).

ئیسماعیل پاشا نە تنێ كەسەكێ زانا و خاندەڤان و مەشقڤان بوویە، ئەو شاعر ژی بوویە و شعر نڤیسینە، هەروەكو د ڤێ دەسنڤیسێدا شعرەك ب فارسی نڤیسییە و ناڤێ خۆ ل دەسپێكا

**(١٣) بەرپەڕەكێ دی كو ناڤێ ئیسماعیلی تێدا هاتییە**



وێ دانایە (من كلام اسماعيل عباسی) ئەگەر ئەڤ شعرە باش بێتە راكرن و خاندن، ئەز د وێ باوەرێدامە دێ شعرەكا هێژا و بازبلند بیت. هەر ل سەر ڤێ چەندێ گەلەك یا بەرئاقلە كو وی شعر وەكی بابێ خۆ محەمەد تەیاری ب كوردی ژی نڤیسیبن، بەلێ پا نەگەهشتینە دەستێ مە.

گرۆڤەكێ دی ژی یێ كو ئەم پێ دزانین ئیسماعیل پاشا مرۆڤەكێ تێگەهشتی و زانا بوویە، ئەوە: وی چار زمان عەرەبی، فارسی، تركیا ئوسمانی و كوردی ب خاندن و نڤیسین و ئاخڤتن زانینە. ئەم د دەسنڤیس

**(١٤) ئیسماعیلی مێژویا رۆژا جومعێ هەیڤا شەوالێ ١٢٦٠ ل سەر ڤی بەرپەڕی دانایە**



(١٥) شعرەك ژ دانانا ئیسماعیل پاشای ب ئەزمانێ فارسی



و پەییك و دۆكۆمێنتێت ب دەستێ وی هاتینە نڤیسین بازا وی یا رەوشەنهزری و تێگەهشتنا وی دنیاسین.

مەحفووز عەباسی ژی د راستا زانین و تێگەهشتنا ویدا هۆسا نڤیسە: «... ئەو شیان و پێڤەهاتنێت ڤی ئاقلدارێ مەزن بوونە جهێ ڤەدرگرتنا گرەگر و کەنکەنان هەتا پشتی کەڤتنا میرگەها وی ژی، مە ژ گەلەك کەسێت باوەرپێکری زانییە کو ئیسماعیل پاشا ژ رەخێ رەوشەنهزری و زانست و ئەدەب و دینی ڤە، گەلەکێ داگرتی بوو»[٤٥].

## هزرا ملەتینیێ ل نك ئیسماعیل پاشای

هێژا سنان هاکان بۆ جارا ئێکێ ل سەر پێشکەڤتنا هشا ئیسماعیل پاشای یا نەتەوەیی نڤیسییە و نڤیسینا خۆ ب ناڤێ «رۆلێ ئیسماعیل پاشایێ ئامێدی (١٨٤٢) د پێشکەتنا هشیاریا ملەتپەروەریا کوردان دا» دبێژیت: «ئیسماعیل پاشایێ ئامێدی، ژ بۆ پێشکەتنا هزرا ملەتپەروەریا کوردا د دیرۆکا کوردستانێدا خودانێ رۆلەکێ گەلەك گرنگە. لێ بەلێ، باوەر دکەم کو رۆلێ وی یێ د وارێ رامان و هشیاریا کوردا دا ب ئاوایەکێ زەلال نەهاتییە راڤەکرن»[٤٦].

هێژایێ ناڤبری، ئەڤ ڤەکۆلینا خۆ ل سەر پەییکەکێ کو د وەختێ خۆدا ئیسماعیل پاشای بۆ شێخ تاهرێ بامەرنی ڤرێکرییە، ئاڤاکرییە، دیسا ئاڤرێ ددەتە وێ پەییکێ ژی یا کو ئیسماعیل پاشای بۆ برایێ میرێ کۆرە رەسوول بەگێ میرێ رەواندزێ ڤرێکری. بەلێ وی ئاڤر نەدایە وان دۆکۆمێنت و پەییکێت سەرورێت ئوسمانی بۆ ئێکودو و دیسا بۆ بابولعالی ڤرێکرین. ئەڤ دۆکۆمێنتە ب ئاشکرایی ئیسماعیل پاشای ب (تەعەصوویا قەومی) گونەهبار دکەن. هەرچەند ئەو دۆکۆمێنت ژی ل بەر دەستێ وی هەبووینە، بەلێ وی هند خۆ نێزیك نەکریە، دیسا ژی گەلەك ب چاڤەکێ بلند دنێریتە بزاڤا وی یا ملەتپەروەریێ:

«هەر چەندە سەرهلدان و بزاڤا ئیسمائیل

پاشای یا هەمبەرێ هێزێت ئۆسمانی ب داویا داوی سەرنەکەتبیت ژی، گۆتن و نێرینێت ئیسمائیل پاشای، ژ بۆ هزر و هشا ملەتپەروەریا کوردا خۆدانێ خۆ قەدرەکێ گەلەك بلندە. تایبەتمەندییەکا ئیسمائیل پاشا ژی ئەوە کو وەکی میرێت کوردان یێت هەڤدەم دۆزا میرەکاتییەکا کلاسیك ناکەت، یانی، کانیا دەستەلاتداریا خۆ نە وەکی مافەکێ ئرسی و مالباتی دبینیت، هەبوونا خوە، دسپێریتە داخواز، دلداری و پشتەڤانیا گەلێ خوە[٤٧].

وی وەختێ کو ئێریشێت ئوسمانییا ل سەر کەلا ئامێدیێ و کەلێت دی یێت بەهدینانێ دژواربوون، ئیسماعیل پاشا داخازا هاریکاریێ ژ میر و سەروەرێت کوردستانێ دکەت، ژ وانا رەسوول بەگێ رەواندزی و دبێژیتێ: «ئەڤە بەرەڤانیکرنە ژ کوردستانێ[٤٨]». ئەڤ گۆتنا «بەرەڤانی ژ کوردستانێ» وێ رامانێ ددەت، کو ئیسماعیل پاشا ژ هزر و بیرێت «دەڤەری» دەرکەڤتیە بۆ هزروبیرێت «ملەتینی». ئەڤ هزرە ژی بۆ وی وەختی مەعنایەکا بەرفرەه ددەتە پێشکەڤتنا هزرا قەومی ل نك میرێ بەهدینان یێ دویماهیێ.

رەسوول بەگێ برایێ میرێ کۆرە، یێ کو دوهی ئێرشێت مان و نەمانێ دکرنە سەر میر گەها وی (میرگەها بەهدینان) ئەڤرۆ ئیسماعیل پاشا یێ ب ناڤێ (غیرەتا کوردستانێ) بۆ دئاخڤیت، ئەو کوردستانا کو (ئەز) ئیسماعیل پاشا و دوژمنێ من یێ دوهی رەسوول بەگ، دڤێت پێکڤە بەرەڤانیێ لێ بکەین.

دیسا ب رەنگەکێ ئاشکرا سەوەرێت ئوسمانی ئیسماعیل پاشای ب هزروبیر و تەعەصصوبا قەومی گونەهبار دکەن. د پەیکا والیێ میسلێ دا، ئەوا ب دیرۆکا ٢٩ موحەرەما سالا ١٢٥٨مش، (١٢ ئادارا ١٨٤٢). بۆ (الصدر العالی) نڤیسی، دبێژیت: نهۆ ئیسماعیل پاشا ل نك مەیە، مە دڤیا کارەکی بدەینێ، ((بەلێ تەعەصصوبا وی یا قەومی ئەوا ل دەڤ وی هەی پالدا کو ل دویڤ ئەخلاقێ خۆ برێڤە بچیت، رابوو چوو نك موتەسەللمێ جزیرە و بوهتانێ...))

(١٦) پەیکا ئیسماعیل پاشای یا ب خەتێ خۆ بۆ رەسوول بەگێ رەواندزی ڤرێکری

«هەمی سەروەرێت کوردا یێت دژی ترکیایێ هەڤکرتنەك چێکر، یا ناڤدار بوو ب (هەڤگرتنا پیرۆز)، کو هەمی پێکڤە ب شۆرەشێ رابن و کوردستانێ رزگارکەن و د بن نیرێ حوکمەتا تورکی دەرکەڤن و دەولەتەکا کوردی یا خۆسەر ئاڤاکەن. حاکمێت مووشێ، هەکارێ، خیزانێ، قارسێ و ئەردەلانێ دڤێ هەڤگرتنێدا بوون و ڤێ هەڤگرتنێ ژی بەردخان

پاشای سەرڤەگێڕیا وێ دکر (٤٩).

مێژووڤانێت کورد وەختێ دهێنە سەر ڤێ هەڤسۆزیا کوردان یا کو دگۆتێ (هەڤگرتنا پیرۆز)، تنێ بەحسێ بەدرخان و خان مەحموود و هندەکێت دی دکەن، کەسێ بەحس نەکریە کو ئیسماعیل پاشا ژی کەسەکێ سەریشك بوویە د ڤێ هەڤگرتنێدا. بەلێ ئەگەر ئەم بنێڕینە پەیبك و ڕێپۆرتێت حوکمەتا ئوسمانی، دێ بینین ئیسماعیل پاشا ژ هەر سەروەرەکێ کوردا ڕژدتره بۆ ڤێ هەڤسۆزیێ، ئەو پتر ژ هەر میرەکێ دی د مەسەلا قەومی گەهشتیە، ژبەر وێرێ ژی پێکۆل و بزاڤێت وی حوکمەتا ئوسمانی ترساندینە. ٢/١٦

د پەیبکێدا ل سلال هاتیە، دبێژیت: کو ((موتەسەللمێ جزیرێ و زابتێ دەڤەرێت ناڤبری بەدرخان بەگێ هەڤسۆزیەك د گەل خان مەحموودێ نافدار و بیت بژلی وی ژ سەرۆکێت کوردا گرێدایە خۆ بەرهەڤ دکەن بۆ فتنێ، هەروەسا ئیسماعیل پاشایێ ئامێدی ب رنکەکێ ژ میسلێ رەڤیە و خۆ گەهاندیە بەدرخانی و پێکۆلێ دکەت کو هاریکاریا وی د ڤێ فتنێ دا بکەت)).

د ڤێ پەیبکێدا ئاشکرایە کو ئیسماعیل پاشا ژی د وێ هەڤگرتنێدایە. د پتریا پەیبکێت دەولەتا ئۆسمانیدا بەحسێ هەڤگرتن و هەڤبەندیا ئیسماعیل پاشای و بەدرخان بەگێ، وی و خان مەحموودێ موکسی و وی و میرێ هەکارێ هاتیە کرن، ژبەر ڤێ چەندێ ژی دهێتە زانین کو میرگەها بەهدینان ژی ب سەرۆکاتیا ئیسماعیل پاشای د ڤێ هەڤگرتنێدا جهگرتیە.

ژبەر ڤێ چەندێ ژی، حوکمەتا ئوسمانی پێکۆلێت بەرفرەه کرینە، خەلکێ بەهدینان ب وێرێ قایل کەت کو رابوونەڤا ئیسماعیل پاشای دژی ئیسلامێ یە، ژبەر وێرێ ژی هندەك شێخ و کەسێت دیندار ل میرگەهێ پشتا وی بەردایە و چووینە دگەل سێرەیا دەولەتا ئوسمانی یا بسورمان.

هەر د ڤێ راستێ دا سنان هاکان دبێژیت: «ل سەر داخازا سەروەرێت دەولەتا ئوسمانی، ژ ئولەمایێت کوردستانێ، بێت وەکی شێخ نوورەددین، شێخ یوسف و شێخ تاهری، بۆ مرۆڤێت ئیسماعیل پاشای، ژ بۆ کو دەڤ ژ پشتەڤانیا پاشای بەردەن، گەلەك پەیبك هاتینە نڤیسین. ل دویڤ ئارشیڤا ئوسمانیا ئێك ژ وان پەیبکا ب دەستێ شێخ تاهری هاتیە نڤیسین (٥٠).

د وێ ڕێپۆرتا کو محەمەد پاشایێ بەیرەقدار ل ٢٨ صەفەرا سالا ١٢٥٨ێ نڤیسی، د راستا ئیسماعیل پاشای دا دبێژیت: ((چوونا ئیسماعیل پاشایێ ئامێدی بۆ ناڤ کەلا ئامێدیێ)) ئێکا وەکر کو هەمی دەڤەر و ئەشیرەتێت کوردا ببنە ئێك.

هەر دیسا د ڕێپۆرتا محەمەد پاشایێ بەیرەقدار دا هاتیە دیارکرن، ئەوێ هزر و بیرێت (قەومی) هەلگریت، ئەو مورتەددە و دڤێت سەرەدەریا کافرێت مورتەد دگەلدا بهێتە کرن کو ژ رەحمەتێ بهێنە دویرێخستن. کوردێت ئەرزەرۆمێ و وانێ و دەڤەرێت رەخۆ دۆرێت هەردوکان دگەل عەشیرەتێت تیارێ و هەکارێ و ئامێدیێ ب مورتەد دهێنە هژمارتن، ژبەر چ! «ژبەرکو ب پالدانا ئیسماعیل پاشایێ ئامێدی» هەمی بووینە ئێك قولپ و ئێك بەرۆك. دبێژیت: «کوردێت ئەرزەرۆمێ و وانێ و دەڤەرێت رەخۆ دۆرێت هەردوکان سەرەدەریا کافرێت مورتەد دگەل هاتە کرن کو ژ رەحمەتێ بهێنە دەرێخستن، ئینا خۆ سپارتە بەغی و فەسادێ، ئو ب پالدانا ئیسماعیل پاشایێ ئامێدی دگەل عەشیرەتێت تیارێ و هەکارێ و ئامێدیێ بوونە هەڤسۆز».

هەر د ڤێ پەیبکێدا هاتیە: «لێ ئالۆزیێت ئامێدیێ نەبەس کارێ پاشایێ ناڤبریە، بەلکی سەرداچوویێت کوردا ژ دەڤەرێت هاریکاری و پشتەڤانیا وان دکەن، ئێدی ئەو تشتێ موشیرێ ئاڤرێدەر گەهاندی، ئاشکرا بوو. مادەم کو ئەڤ فتنە یا تەڤایی یە، ئێدی چێنابیت ئەم باوەریا خۆ ب کوردا بینین، ئو ئەگەر تەنگسستی د ڤێ مەسەلێدا هاتە کرن، ئێدی فتنە دێ مەزن بیت و ل هەمی دەڤەرا بەلاڤ بیت».

ئیسماعیل پاشا وەکی مرۆڤەکێ تێگەهشتی و زانا، وەکی کەسەکێ کو شرۆڤەکەر بۆ سەروبەرێ

کوردستانێ بێ وی دەمی، ئەوی بەری هەر تشتی بەرێ خۆ دایە دەوسا ملەتینیێ، دژمنێ میرگەها خۆ یێ دوهی ب رێکا ملەتینیێ کریە دۆستێ ئەڤرۆ. مرۆڤ باوەر دکەت ئیسماعیل پاشای هزر و بێرێت خۆ یێت ملەتینیێ ژ بەنەمالا خۆ وەرگرتینە، نەخاسمە بابێ خۆ محەمەد تەیاری، کو ئەو ژی مرۆڤەکێ زانا و تێگەهشتی بوو، دیسا شاعرەکێ ژێهاتی و دەستهەل بوو. هەر دیسا ژ دەسپێکا ئێرشێت میرێ کورە بۆ سەر میرگەها وی، ئەو پێحەسیایە کو ملەتێ وی یێ کەڤتیە بەرامبەر خەتەرەکا مەزن، ژبەر ڤێ چەندێ ژی سەرەوەرێت دەولەتا ئوسمانی وەسا نڤیسییە و هزرکریە کو: «ئەڤ فتنا کوردستانێ ژمێژوەرە هاتیە بەرهەڤ کرن و ب ڤی رەنگی ئاگرێ وێ خۆش بوو».

ب راستی ژی هشا (وعیا) ملەتینیێ ل نك ئیسماعیل پاشای هەوجەیی ڤەکۆلینێت کویرترن، بەلێ پا ئەڤ چەند رێزکە بەلکی ببنە بنگەهەك بۆ سەرهەلدانا هشا ملەتینیێ ب رەنگەکێ هەڤچەرخ ل بەهدینانێ. ل دویماهیێ دیسا دێ چەند رێزان ژ ڤەکۆلینا سینان هاکان ڤەگوهێزم، کا بێژەیا وی ل سەر ڤێ مژارێ چییە!:

«ئەم دشێین بێژین کو هشا ئیسماعیل پاشای، تەئسیر و باندۆرەکا فکر و رامانێ ل سەر پێشەنگ و سەرەوەرێت کورد یێت پشتی وی دەمی هێلایە. هزر و رامانێت ئیسماعیل پاشا یێت کو بزاڤ و خەباتا خوە بۆ رزگارکرنا فەقیر و فوقەران ژ زولما پاشایێت ئۆسمانیان و ژ بۆ "رزایا خوەدێ" سازکری، ب تایبەتی ل سەر مالباتێت شێخێت خالدی یێت کۆ پشتی میرەکێت کوردان د قادا سیاسەتا کوردستانێ دا جهێ خوە گرتینە، تەئسیرەکا گەلەك مەزن هێلایە. نەخاسمە دەمێ ئەم بزاڤ و سێرەیا (موقف) مالا شێخێت نێهری دنێرین، بۆ میناك سێرەیا شێخ ئوبەیدوللاە و یا شێخ ئابدولقادر تینین پێش چاڤێت خوە، دبینین کو چارچۆڤەیا سیاسی یا ئیسمائیل پاشای داخازکری، پشتی سالان، نك وان ژی هاتیە پەژراندن. نەخاسمە سەید ئابدولقادرێ نێهری یێ ئاڤاکەر و سەرۆکێ جڤاتا تەعالی یا کوردستان و سیاسەتڤانێ مەزنێ سەردەمێ ئاڤابوونا ترکیێ، ب هشمەندیا خوە و چارەنڤیس ژ بۆ کوردان دانی هۆلێ دا، فکرییەتا وی دەق و دەق مینا یا ئیسمائیل پاشایە. کورتڤەبڕی؛ داخوازا گەل، پاراستنا مافێت فەقیر و فوقەران، دژبەریا زولما سەرەوەرێن ئۆسمانیان یێت دەڤەرێ، رێڤەبرنەکا خوەسەر و سەداقەت و دلسۆزیەکا ب خلافەت و سەلتەنەتا ئۆسمانیان. ئەم دکارین بێژین ئەو چارچۆڤەیا کو ئیسمائیل پاشایێ ئامێدی هێژ سالا ١٨٤٢یێ د وان پەییکان دا دانییە هۆلێ، نە تنێ ژ بۆ مالا نێهری هەر وەسا ژ بۆ پرانییا بزاڤێت سیاسی یێت مالباتێت شێخێت کوردان یێت پشتی وی دەمی، بوویە خیم و بنگەهەکێ هش و هەستیاریێ[٥١].

## هندەك ژ وان قەهرەمانێت بەرامبەری ئێرشا میرێ کۆرە بەرەڤانی ژ میرگەها خۆ کری

### ١. سەلمان ئاغایێ زێباری

سەلمان ئاغا، ئێکبوویە ژ وان کەسێت بەرامبەری ئێریشا میرێ کۆرە رابووی. ئەم تشتەکی ژ ژیانا وی نزانین. بەلێ جارەکێ مەلا ئەنوەرێ مایی ناڤێ وی د کتێبا خۆ (الاکراد فی بهدینان)دا ئینایە، دبێژیت: میرێ کۆرە بەرێ لەشکەرێ خۆ دا زێباری، کو د وێرێرا بچیتە ئامێدیێ، چ بەرهنگاریەکا وەسا د رێکێدا نەبوو، بەس هندەك زێباری ب سەرۆکاتیا سەلمان ئاغای بەرامبەری لەشکەرێ وی رابوون[٥٢].

د سترانەکێدا ژی ب ناڤێ (هەرنێ)، میرێ کۆرە ئێریش کریە سەر گوندێ هەرنێ و هەمی رۆژێ ئێریش د چوونێ. سەلمان ئاغای د ڤی شەڕیدا سەرڤەگێری کریە، وەسا دیارە کو دویماهیێ سەلمان ئاغا یێ مایە بتنێ، ژبەرکو: «خەلکی گوهێ خۆ ددا ئاخڤتنا مەلا یەحیایێ مزویری و باندۆرا وی ل سەر خەلکی هەبوو، فتۆ دەرێخست کو هاریکاریا میرێت

بەهدینان ئەوێت ژ رێکێ ڤارێ بووین و ژ شریعەتی دویرکەڤتین، حەرامە. ئەڤ فتۆیا وی وەکی چاوا ئاگری بەردنە پویشی ئها وەسا گورِیا وی د ناڤ ئەشیرەتێت بەهدینان بەلاڤ بوو، ئێدی عەشیرەتا وەکی ئێکێ ژ رێکێ دەرکەڤتی و مولحد بەرێ خۆ ددا سەعید پاشای[٥٣].

دیسا ستران دیار دکەت کو میرێ کۆرە کاغەزەك بۆ خەلکێ زێبارێ ڤرێکریە و تێدا گەڤێت دژوار لێ کرینە و گۆتیێ «مە و زێباریا ئەڤجارە!». بەلێ دیسا ژی هەروەکی مە گۆتی، زێباریا ل گوندێ هەرنێ ب سەرۆکاتیا سەلمان ئاغای بەرامبەری ئێریشا میرێ کۆرە خۆ راگرتیە، هەتا دویماهیێ سەلمان ئاغا هاتیە کوشتن. پشتی کوشتنا وی، وان گوندێ هەرنێ سۆتیە و کاڤل و وێران کریە، ژبەر وێرێ ژی پشتی هەر نیڤ مالکەکێ مالك ب «کاڤلەرەشێ هەرنێ» تمام دبیت. ئەڤا خارێ ژی دەڤا سترانێیە:

هەرنێ

| | |
|---|---|
| هەرنێ های هەرنێ | کاڤلەرەشێ هەرنێ |
| هەرۆ ئێرشێ دچنێ | کاڤلەرەشێ هەرنێ |
| سەلمان ئاغا ما بتنێ | کاڤلەرەشێ هەرنێ |
| | |
| سەلمان ئاغا دبێژیتە | شێرێ سۆرێ دبێژیتە |
| چ کەسێ لێڤە ببیتە | لبەر ژنا خۆ بنڤیتە |
| | |
| هەرنێ لبەر زنارە | کاڤلەرەشێ هەرنێ |
| میر کاغەزەك هنارە | کاڤلەرەشێ هەرنێ |
| مە و زێباریا ئەڤجارە | کاڤلەرەشێ هەرنێ |
| | |
| هەرنێ لبن چیایی | کاڤلەرەشێ هەرنێ |
| سۆرانا لبن دانایی | کاڤلەرەشێ هەرنێ |
| سەلمان ئاغا نەمایی | کاڤلەرەشێ هەرنێ |
| | |
| هەرنێ لبن کەڤری | کاڤلەرەشێ هەرنێ |
| سۆرانا لبن ئەوری | کاڤلەرەشێ هەرنێ |
| سەلمان ئاغا یێ مری | کاڤلەرەشێ هەرنێ |

## ٢. پس ئاغایێ زێباری

حوسێن حوزنی موکریانی د کتێبا خۆ یا ب ناڤێ (مێژوویا میرێت سۆران) پێچەکێ ب درێژی بەحسێ پسا ئاغایێ زێباری کریە. وەختێ میرێ کۆرە ئێرش بریە سەر ئاکرێ، هنگی پس ئاغایێ زێباری سەرلەشکەرێ ئیسماعیل پاشای بوویە ل ئاکرێ و ئەو هاتیە سپارتن کو بەرڤانیێ ژ باژێری بکەت. موکریانی هۆسا بەحسێ وی دکەت:

«ئیسماعیل پاشای لەشکەر ب سەرکێشیا پس ئاغایێ زێباری هنارتە بەرۆکێت پێشیێ، دەرتەنگ و دۆل و شیڤ زەبت کرن. لەشکەرێ میری (میرێ سۆران) بەرهنگاری زێباریا بوو و کوشتن و خوینرشتن دژوار بوو، رەخێت زێباریا گرتن و هەلقاندن هەتا کو قوتاینە ناڤ کۆلانێت ئاکرێ. زێباریا خۆ گەهاندە کەلایێ و د کۆلانادا شەر کر. رۆژا دویێ یا شەری ئێك ژ مرۆڤێت میری، محەمەد شالی بەگ لەرانی، هاتە برینداركرن، گەلەك ژ لەشکەرێت میری هاتنە کوشتن. میری دەست ژێ نەبەردان، نێزیکی هەیڤەکێ ئاکرێ دووڕێچ کر. ل دۆرێت کەلێ شەر دهاتە کرن. هەرچەند میر ژبەر پرکوژیێ ددەستێت زێبارییادا دنالی بەلێ ڤیانا وی یا بەرفرەهکرنێ میر راگرتبوو. پس ئاغایێ زێباری زەلامەکێ زیرەك و تێهەیی و ناڤدار بوو، ب دژواری ئێرش دبرن و کەل دپاراست، گەلەك زەلامێت ناڤدار و زیرەك یێت میری هاتنە کوشتن.

میری فەرمان داکو ب شەڤێ هەلباسکی کەلێ ببن و بستینن، لەشکەرێ سۆران ب شەڤێ کەڤتنە ناڤ باژێری، پس ئاغا ل وان دەرکەڤت، نێزیکی دەە کەسا ژ چاویشێت میری هاتنە کوشتن و لەشکەرێت میری تەنگاڤ بوون. عەبدوللا سەهەنگێ ئاکۆیێ خەنجەر ددەست، فەرمان دا چاویشان کو سەرکەڤنە سەر بانێ کەلێ، ئێك ل دویڤ ئێکی ١٢ چاویشان زنجیر بەستن و عەبدوللا سەرهەنگ دانا پێشیێ و پالدان و سەرئێخستنە کەلێ.

ب ڤی رەنگی عەبدوللا سەرهەنگ نێزیکی دیوارێ کەلێ بوو، پس ئاغایێ زێباری ل سەردا، بۆ وان چوو خارێ.

عەبدوللا سەرهەنگ ستێرك ل تفەنگێ گرتبوو و پێشڤە دچوو، پس ئاغا نێزیك بوو، عەبدوللا سەرهەنگی تفەنگ تەقاند و ل سینگێ پس ئاغای دا و لنگێ وی گرت و هاڤێتە خارێ و گازی میری كر و مزگینی بیت كەلا ئاكرێ هاتە گرتن، میری فەرمان دا ل هەمی لایاڤە ئێرشێ ببەنە سەر كەلێ، زێبارییا بەرێ خۆ دا رەڤێ، زانا و گرەگرێت بازێری چوونە نك میری ب پێكهاتنێ كوشتن راوەستاند. ئیسماعیل پاشا رەڤی و بەرێ خۆ دا چیا و ل بەراهیا مەها ئیلوونا ١٨٣٢ێ ئاكرێ كەڤتە دەستێ میرێ كەورە [٥٤].

## ٣. زەینەل بەگێ هەرزی

هەرزێ (ئەرزێ) گوندەكێ بناڤودەنگە ل بەهدینا، مەزنێت وێ ب میر هاتینە نیاسین، ژ وانا ژی میر زەینەل بەگە یێ كو ئەڤ سترانە پێ هاتییە گۆتن. میر زەینەل بەگ ئێكبوویە ژ وان قەهرەمانێت بەرهنگاری میرێ كۆرە رابووی و بەرەڤانی ژ میرگەها بەهدینا كری و بوویە ئێك ژ دروڤێ سترانا كوردی.

پشتی میر زەنەل بەگ ب دەستێت میرێ رەواندزێ دهێتە ئێخسیركرن و دبەنە رەواندزێ، خویشكا وی ژ دلسوتنیا خۆ ئەڤ سترانا تژی ژ مێرانی و دلۆڤانیێ پێ ڤەهاندیە. ئەڤا خارێ ژی دەقا وێیە:

زەینەل بەگ[٥٥]

لێ لێ میرۆ برا كەكۆ زەینەل بەگۆ

هەرزێ خۆش هەرزێ

هەیلێ میرۆ كەكۆ زەینەل بەگۆ، م گۆ هەرزێ لێ خۆش هەرزێ

بەژنا كەكێ میر زەینەل بەگ دبوو تاكێ حەراما ڤێ نێرگزێ

هەیلێ لێ لێ لێ لێ لێ لێ لێ لێ

هەیلێ میرێ منۆ.. ئیشەلا خودێ خراب كەت مالا میرێ كۆرە

دەستێت كەكێ میر زەینەل بەگ كرنە دارێ كەلامچێ

پێت كەكێ میر زەینەل بەگ كرنە مەربەتێت گران

بەرێ كەكێ میر زەینەل بەگ دابوو قەسركێت رەواندزێ

***

لێ لێ هەیلێ لێ لێ میرۆ برا كەكۆ ززەینەل بەگۆ،

كەلیا هەرزێ بلندە یا دەرێ دۆلێ،

هەیلێ میرێ منۆ.. من گۆت كەلیا هەرزێ بلندە یا دەرێ دۆلێ،

هەسپێ كەكێ من زەینەل بەگ یێ ڤالە ل ئەختەخانێ یێت كەتەڤە حەرامێ دەستكۆلێ.

ئاخ هەیلێ لێ لێ لێ هەیلێ لێ لێ لێ لێ

ئیشەلا خودێ خراب كەت مالا میرێ كۆرە،

دەستێت كەكێ میر زەینەل بەگ كرنە دارێ كەلامچێ،

پێت كەكێ میرزەنەل بەگ كرنە مەربەتێت گران،

بەرێ كەكێ میر زەنەل بەگ دابوو قەسركێت ستەنبۆلێ.

***

لێ لێ هەیلێ میرۆ.. برا كەكۆ ززەینەل بەگۆ

واشیتێ خۆش واشیتێ،

هەیلێ م گۆ واشیتێ خۆش واشیتێ،

چەند جوومن، هند كانی تێ،

هەیلێ میرێ منۆ

مانێ تە تفەنگا قوتە شەشخانە ل سەر چۆخكێ سپی تێ.

***

لێ لێ میرۆ برا كەكۆ زەینەل بەگۆ

م گۆ كەلیا هەرزێ یا بەرینە،

م گۆ كەلیا هەرزێ یا بەرینە،

هەیلێ میرۆ برا كەكۆ زەینەل بەگۆ، م گۆ سەردەریا و بن دەریا نێ د بن مەدا رەشمال و كینە

هەیلێ میرێ منۆ چەند جار من گۆتە تە دێ تو نەچە باشووكا وێران، تە چ میر و حاكمێت خۆ لێ نینە

***

هەیلێ میرۆ برا كەكۆ زەینەل بەگۆ، م گۆ بهارە ئاڤكۆكێت كانیا تەمێ زمزمێن،

**هەیلێ میرۆ برا كەكۆ زەینەل بەگۆ، م گۆ بهارە ئاڤكۆكێت كانیا تەمێ زمزمین،**
**لێ لێ میرا برا كەكۆ زەینەل بەگۆ، م گۆ تاخما..... بێ ل بندا حەراما دو رەشكولین،**
**ئاخ هەیلێ میرێ منۆ، چەند جار من گۆتە تە دێ تو نەچە باشووكا وێران، تۆ بێ بێ میری بێ بێ حاكمی.**

٤. میر عەلی بەگێ میرێ ئێزدیا: (ئـەز بۆ كەڤچكەكێ خوینێ ناقەهرم)

هەروەكـی بەری نهۆ ژێ هاتییە گۆتن: «سالا ١٢٤٧ێ میرێ گەورە لەشكەرەكێ مەزن هەلگرت و ل زێیێ بەهدینانێ دەرباز بوو و پێێ خۆ دانا سەر ئاخا كوردێت داسنی، ڤركرنەكا بێ هەژمار لێكر. عەلی بەگێ میرێ داسنی ب لەشكەرێ داسنییاڤە چوو پێشیێ، پشتی شەڕ و كوشتنەكا گران، هەمی رێك لێ گرتن و دوورێچ كر و رەڤی و مال و بچویكێت خۆ هەلگرتن و چوو تۆرعابدین ل ناڤ چیا و رێل و دۆل و نهالادا خۆ ڤەشارت و پتریا وان بەر ب میسلێ رەڤین.

میری ب شەڕ و كوشتنێ هەلقوتا سەر وان و ل گرێ (كوینجك) گەهشتە عەلی بەگێ و دوورێچ كر، پشتی هندەك ژێ كوشتین، عەلی بەگێ ب سۆزەكێ خۆ و مال و بچویكێت خۆ دا دەست، میرێ كۆرە، ب لەز باركرن و هنارتنە پایتەختێ خۆ رەواندزێ[٥٦].

پشتی عەلی بـەگ هاتییە گرتن، هندەك خۆراگری و شەڕ ل دەڤەرا شەنگارێ و ل هندەك جهێت دی دژی میرێ كۆرە هاتنە كرن. «میرێ گەورە، ئەو سەرهەلدان و رابوونەڤێت داسنییا كرە ستویێ عەلی بەگێ میرێ داسنییا و گۆت، وی ئەو پێت پالداین، گازیكرە نك خۆ و گۆتێ: ئەڤە سێ سالە تو ل رەواندزێی و هێشتا تو پێ فتنێ دهەلدەی.

عەلی بەگێ میرێ داسنییا گۆتێ: (ئـەز بۆ كەڤچكەكێ خوینێ ناقەهرم).

میرێ گـەورە دەگـری و كەرێت وی ڤەبوون و ئێكراست فەرمان دا، عەلی بەگ كوشت، سێ رۆژا تەرمێ وی ب پرا رەواندزێ ڤە هەلاویست و دویماهیێ ڤەشارت.

حسین حزنی موكریانی دبێژیت: «هەروەكی من ژ زەلام و پیرێت رەواندزێ بهیستی، گەلەكێ رند و لاوچاك و زیرەك و خشكۆك بوو، نە هەژی كوشتن و خەندقاندنێ بوو، بەلێ پا میرێ گەورە ب تەپكدانانا مەلایێت دیندار ژ عەلی بەگێ خاستبوو كو بسورمان ببیت، عەلی بەگێ ژێ گوهێ خۆ نەدا میری[٥٧].

## ژنا عەلی بەگێ میرێ ئێزدییا

پشتی میرێ كۆرە دەڤەرێت ئێزدییا گرتین و گەلەك مرۆڤ ژێ ڤركرین و عەلی بگ ژی ئێخسیر كری و میر زڤرییە رەواندزێ، ژنا عەلی بەگێ داسنی دكەڤیتە رێكێ و كومەكا مەزن یا داسنییا ل خۆ كوم دكەت و دچیتە سەر كەلا شەنگارێ. بابەكر ئاغایێ ئیشك ئاغاسی میر ب سوباشی ل سەر شەنگارێ دانابوو، رەشەیێ سوباشی و بابەكر ئاغا د گەل سەهـ كەسا ژ لەشكەرێ سۆرانا د كەلێدا بوون و هایا وان ژ بزاڤا داسنییا نەبوو، بێ منەت روینشتبوون، داسنی هوریانە سەر وان و ل هەر چار كنارا ئەو خانیێت سۆران تێڤە ئاگر بەردایێ، د وی دەمیدا زەلامەكێ بەكر ئاغای چووبوو دەرڤە سەر ئاڤێ، وەختێ زانی، رەڤی و بەر ب رەواندزێ چوو، بژلی وی زەلامی كەس قورتال نەبوو هەمی سۆتن. بابەكر ئاغا و رەشە سوباشی و بیست و نەه كەس سۆتن.

سالا ١٢٥٠مـش دیسا شەڕ دناڤبەرا سۆران و داسنییادا قەومی، وەك دهێتەگۆتن: وەختێ میری عەلی بەگ كوشتی، ژنا عەلی بەگێ هیڤی ژ میری كر كو تەرمێ عەلی بەگێ ببەتەڤ ئێزدیخانێ، ئەوی بۆ پێكهاتنا داسنی و سۆرانا تەرمێ وی ب ٢٥ سیاراڤە هنارتە شەنگارێ، ژنا عەلی بەگێ ئەو ٥٢ كەسە دانە كوشتن. سەید حوسنی رەشوانی ژ بۆ وێرێ میر ل وی خۆش ببیت، ب لەشكەرڤە چوو سەر ئێزدییا و كۆمكوژی لێ كرن و ژنا عەلی بەگێ ژی ب ئێخسیری هنارتە (گرمامك) و ل پێش لەشكەرێ میری ل سێدارێ دا.[٥٨]

# ژێدەر و پەراوێز:


١. جليلى جليل. من تاريخ الإمارات في الإمبراطورية العثمانية. دمشق ١٩٨٧، ص ٣٣

٢. سنان هاکان. (رۆلێ ئیسماعیل پاشایێ ئامێدی -١٨٤٢- د پێشکەتنا هشیاریا ملەتپەروەریا کوردان‌دا)، گۆڤارا (دیرۆك) هژمار ١ زڤستانا سالا ٢٠١٣ێ .

٣. د. كمال مظهر أحمد. كردستان في سنوات الحرب العالمية الأولى. ترجمة محمد الملا عبد الكريم. الطبعة الثانية. بغداد ١٩٨٤، ص ٢٩

٤. سالمێ جاسم. رەوشا سیاسی و جڤاکی ل کوردستانا ئۆسمانی د نامەیێن هێلمۆت فۆن مۆلتکێ دا. گۆڤارا «هاڤیبوون» هژمار ٥ سالا ١٩٩٩، بث ٥١.

٥. ڤەکۆلینا مە یا ل سەر (ئیسماعیل پاشایێ ئێکێ میرێ بەهدینان). گۆڤارا دیرۆك هژمار (٤) بهارا ٢٠١٤. ژ د. عماد عبد السلام رئوف. المعجم التاريخى لامارة بهدينان. اربيل ٢٠١١، ص ٣٨.

٦. محفوظ العباسى. العباسيون بعد احتلال بغداد ٦٥٦هـ - ١٤٠٩هـ ١٢٥٨م – ١٩٨٩م. بغداد ١٩٩٠، ص ٩٨.

٧. انور المايى. الأكراد فى بهدينان. الطبعة الثانية. دهوك ١٩٩٩، ص ١٤٣.

٨. المحامي عباس العزاوي. العمادية في مختلف العصور. تحقيق: حمدي عبد المجيد السلفي و عبد الكريم فندى. دهوك ١٩٩٨، ص ٥٣.

٩. انور المايى. الأكراد فى بهدينان. ص ١٤٧.

١٠. انور المايى. الأكراد فى بهدينان. ص ١٤٧.

١١. د. برگێت ڤارا هاڤیبوون، هژمار ٢٥ و ٢٦، سال ٢٠١٠، بپ ٨٤.

١٢. انور المايى. الأكراد فى بهدينان. ص ١٤٨.

١٣. انور المايى. الأكراد فى بهدينان. ص ١٤٨.

١٤. داماو حسین حزنی موکریانی. مێژووی میرانی سۆران. چاپخانا کوردستان. هەولێر ١٩٦٢، بپ ٧٤ــ٧٦.

١٥. الدكتور عماد عبد السلام رؤوف. المعجم التاريخى لامارة بهدينان. مطبوعات الأكاديمية الكردية. اربيل ٢٠١١، ص ٣٩.

١٦. بەرپەرەکێ دەستنڤیس، ب ناڤێ (حوادث تاريخية ــ قەومینێت دیرۆکی) ژ ئەرشیڤێ ڤەکۆلینڤانێ چەلەنگ بلند محەمەد شوکری، کو د گەل ڤەکولینا وی یا ب ناڤێ (محمد سەعید مهری) موفتی و هۆزانڤان و زانا و دیرۆکناسێ ئاکرێ و بهدینان) د گوڤارا (دیرۆك) هژمار ٨ دا، هاتیه بەلاڤکرن.

١٧. جليلى جليل. من تاريخ الإمارات في الإمبراطورية العثمانية. دمشق ١٩٨٧، ص ٨٨.

١٨. المعجم التاريخى لامارة بهدينان، ص ٣٩.

١٩. جليلى جليل. من تاريخ الإمارات في الإمبراطورية العثمانية. دمشق ١٩٨٧، ص ٨٨.

٢٠. الدكتور عماد عبد السلام رؤوف. المعجم التاريخى لامارة بهدينان. ص ٤٠.

٢١. هەر ئەو ژێدەر، بث ٤٠.

٢٢. محمد امين زكى. خلاصة تاريخ الكرد وكردستان من أقدم العصور التاريخية. ترجمة: محمد على عونى. القاهرة ٢٠٠٩، ص ٢٢٧.

٢٣. محمد امين زكى. خلاصة تاريخ الكرد وكردستان. ص ٢٢٧ــ٢٢٨.

٢٤. المستر ستيفن هيمسلى لونطريك (اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث) ترجمة: جعفر الخياط. الطبعة السادسة-بغداد ١٩٨٥ . ص ٣٤٣.

٢٥. المستر ستيفن هيمسلى لونطريك (اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث)، ص ٣٤٣.

٢٦. الصدر الاعظم: ب ئۆسمانی ( صدر أعظم) ئان (وزير أعظم) مەنصبێ ژ هەمیا بلندترە دبن سولتانیدا، دەستهەلاتێت وی سەرپەردایینە، خەتما سولتانی یا لنك، خەبتاندن و ژ کارهاڤێتنا وی بەس ب دەستێ سولتانییە.

٢٧. محمد امين زكى. خلاصة تاريخ الكرد وكردستان، ص ٢٢٨-٢٢٩.
٢٨. بنێرە: گۆڤارا (دیرۆك) هژمار ٧ زڤستانا سالا ٢٠١٥ێ.
د وەختێ خۆ دا نڤیسەڤان سنان هاکان ژێ بەحسێ ڤێ دۆکۆمێنتێ کریە، دبێژیت: «دەرکەتنا وی (شکرا ئیسماعل پاشای) بۆ ناڤ دیرۆکا کوردستانێ، سالا ١٨٣٦ێ، د سەردەمێ سەرهەلدانا میرێ کۆرە، میر محەمەدێ رەواندزی دایە. گۆری بەلگەنامەیێت ئارشیڤا ئۆسمانییان، دەمێ لەشکەرێ ئۆسمانی د بن سەرداریا رەشید پاشا دا هاتییە سەر میر محەمەدێ کۆرە، ب موهرا ٣٣ێ گرەگر و مەزنێت ژ هەرێما ئامێدیێ کو د بن حوکمێ میر محەمەد دا بوون، نامەیەك بۆ رەشید پاشا هاتییە نڤیساندن، گلی و گازنج ل میر محەمەد هاتینەکرن. «گۆڤارا (دیرۆك) هژمار (١)، هاڤینا ٢٠١٣، دەستگەها (وار)، دهۆك ٢٠١٣. بپ ٦.»
٢٩. ئەڤ دۆکۆمێنتە و د گەل چەندەکێت دی، سالا ٢٠٠٨ێ، دیرۆکڤانێ هێژا سنان هاکانی ژ ئەرشیڤێ ئۆسمانیا ل ستەمبۆلێ کۆپیکرن و بۆ من ڤرێکرن.
٣٠. جون س. طيست. الحياة بين الكرد .. تاريخ الايزديين. ترجمة: عماد جميل مزوری، دهۆك - سپیرێز ٢٠٠٥، ص ١٨٩.
٣١. سنان هاکان. گۆڤارا (دیرۆك) هژمار ١ زڤستانا سالا ٢٠١٣ێ.
٣٢. کو پەییکەکا نەمازە ژ لایێ ئیسماعیل پاشای ڤە، بۆ رەسوول بەگێ هاتییە ڤرێکرن.
٣٣. سنان هاکان. گۆڤارا (دیرۆك) هژمار ١ زڤستانا سالا ٢٠١٣ێ.
٣٤. ئەڤ دۆکۆمێنتە ژ لایێ خاتین (نەسرین جالمەندی)، دیسا هێژا نزار ئەیوب گولی ڤە ژ فارسی هاتییە وەرگێران بۆ کوردیێ.
٣٥. محفوظ العباسى. العباسيون بعد احتلال بغداد، ٦٥٦ هـ = ١٤٠٩هـ ١٢٥٨م = ١٩٨٩م. بغداد ١٩٩٠، ص ١١٢=١١٣.
٣٦. جون س. طيست. الحياة بين الكرد.. تاريخ الأيزديين. ترجمة: عماد جميل مزوری. سپیرێز ٢٠٠٥، بپ ٢٠٤.
٣٧. بەرپەرەکێ دەسنڤیس، ب ناڤێ (حوادث تاريخية ــ ڤەومینێت دیرۆکی) ژ ئەرشیڤێ ڤەکولینڤانێ چەلەنگ بلند محەمەد شوکری، کو د گەل ڤەکولینا وی یا ب ناڤێ (محمد سەعید مهری) موفتی و هۆزانڤان و زانا و دیرۆکناسێ ئاکرێ و بهدینان) د گۆڤارا دیرۆك هژمار ٨ دا، هاتییە بەلاڤکرن.
٣٨. محفوظ العباسى. العباسيون بعد احتلال بغداد، ٦٥٦ هـ = ١٤٠٩هـ ١٢٥٨م = ١٩٨٩م. بغداد ١٩٩٠، ص ١١٣=١١٤.
ئەڤ چەند مالکە من ل سەر حەلانەکێ ل بن سیڤاندێ مەدرەسێ دیتن.
٣٩. محفوظ العباسى. العباسيون بعد احتلال بغداد، ٦٥٦ هـ = ١٤٠٩هـ ١٢٥٨م = ١٩٨٩م. بغداد ١٩٩٠، ص ١١٨.
٤٠. مەحفووز عەبباسی دبێیت: ئەڤ چەند مالکە من ل سەر حەلانەکێ ب رەخ گۆرێ ویڤە وەختێ هێشتا یێ بلند دیتن، پشتی عبد الله الصائغێ رێڤەبەرێ ناڤخۆیا گشتی سەر ویدا ڤەشارتی ئەو شینوار نەمان.
٤١. المعجم التاريخي لامارة بهدينان، ص ٤٤.
٤٢. محفوظ العباسى. العباسيون بعد احتلال بغداد، ٦٥٦ هـ = ١٤٠٩هـ ١٢٥٨م = ١٩٨٩م. بغداد ١٩٩٠، ص ١١٣=١١٤.
٤٣. هەڤالێ هێژا و چەلەنگ تەحسین ئبراهیم دۆسکی دەسنڤیسا وی پێشکێشی مە کریە.
٤٤. محفوظ العباسى. العباسيون بعد احتلال بغداد، ٦٥٦ هـ = ١٤٠٩هـ ١٢٥٨م = ١٩٨٩م. بغداد ١٩٩٠، ص ١١٨.
٤٥. گۆڤارا (دیرۆك) هژمار (١)، هاڤینا ٢٠١٣، دەستگەها (وار)، دهۆك ٢٠١٣.
٤٦. سنان هاکان. رۆلێ ئیسماعیل پاشایێ ئامێدی (١٨٤٢) د پێشکەتنا هشیاریا ملەتپەروەریا کوردان دا. گۆڤارا (دیرۆك) هژمار (١)، هاڤینا ٢٠١٣، دەستگەها (وار)، دهۆك ٢٠١٣.
٤٧. سنان هاکان. کورد و بەرخۆدانەکانی ١٨١٧ــ١٨٦٧ لە بەلگەنامەکانی ئەرشیفی عوسمانیدا. وەرگێران ژ تورکی: بەکر شوانی، هەولێر ٢٠١٢، بپ ١٥٩.
٤٨. د. س. لازاريف وآخرون. تاريخ كردستان. ترجمة: د. عبدى حاجى سپیرێز ١٩٩٩، ص ١٢٤.
٤٩. دیرۆك بپ ٩.
٥٠. سنان هاکان. رۆلێ ئیسماعیل پاشایێ ئامێدی (١٨٤٢) د پێشکەتنا هشیاریا ملەتپەروەریا کوردان دا. گۆڤارا (دیرۆك) هژمار (١)، هاڤینا ٢٠١٣، دەستگەها (وار)، دهۆك ٢٠١٣.
٥١. انور المايى. الأكراد فى بهدينان، الطبعة الثانية، دهوك ١٩٩٩، ص ١٤٩.
٥٢. ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٤٩.

٥٣. داماو حسین حزنی موکریانی. مێژووی میرانی سۆران. چاپخانا کوردستان، هەولێر ١٩٦٢، بپ ٦٩.
٥٤. ئەڤ سترانە رۆژا ٢٠١٥/٤/٢٢ ل دیرەلۆکێ من ژ زاردەڤێ عبدالله محەمەد مستەفا رەشاڤەیی کو ژیێ وی ٧٤ سالە، وەرگرتیە.
٥٥. دەقەکا ڤێ سترانێ هێژا محەمەد ئەمین دۆسکی ژی د کتێبا خۆ یا ب ناڤێ (ئەرزێ و بەکر بەگێ ئەرزی)دا، بەلاڤکریە.
٥٦. داماو حسین حزنی موکریانی. مێژووی میرانی سۆران. چاپخانا کوردستان، هەولێر ١٩٦٢، بی ٧٤ــ٧٦.
٥٧. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٦.
٥٨. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٧٨ــ٧٩.

# پەیوەندییێن میرگەها هەکاری دگەل میرگەها بەهدینان ل سەردەمێ ئۆسمانی

**د.نزار ئەیوب حەسەن**
**زانکۆیا زاخۆ-کولیژا زانستێن مرۆڤایەتی**
**وەرگێران: سالح یوسف سوفی**

ئەو پەیوەندییێن میرگەها هەکاری دگەل میرگەها بەهدینان هەین، نەوەکی وان بوون یێن دگەل میرگەهێن دی یێن کوردی هەین، چونکی ئەو پەیوەندی وێڤەی توخیبێ پەیوەندی یێن سیاسی بوون و دگەهشتنە پەیوەندییێن ڕەهـ و ڕڤشتێ هەڤپشك، چونکی بنەمالا حوکمدار یا هەردو میرگەهان پڕۆپاگەندا وێ چەندێ دکرن کو ڕەها وان دگەهیتە عەباسییان و هەر وی بابکالکی کو ئەو ژی (محمد المستنصر)ە ـــ هەروەکی مە ئاماژە پێ دای ـــ هەروەسا میرگەها بەهدینان هەر ل سەر وی رووبەرێ جوگرافی پەیدا ببوو یا میرگەها هەکاری ل سەر پەیدا بووی بەری میرێن وێ قەستا جۆلەمێرگێ بکەن پشتی پایتەختێ وان باژێرێ ئامێدیێ کەڤتییە د دەستێ ئەتابەگی یێن مووسل و وان مەغۆلان دا یێن پشتی وان باژێڕ کەڤتییە د دەستان دا[1].

هەر چەوان بیت، بەری قۆناغا کۆنترۆلا ئۆسمانی، چ زانیاری ل سەر پەیوەندییێن د ناڤبەرا هەردو میرگەهان نینن، لێ ل دووڤ زانیارییێن بەردەست، پەیوەندییێن ل ناڤبەرا هەردوان ب درێژاهییا سەدسالییا شازدێ هەتا نیڤا سەدسالییا هەڤدێ پەیوەندییەکا دۆستانە بوویە و تێکگەهشتن ل ناڤبەرا وان هەبوویە، ئەڤ پەیوەندییە ژی هاتنە دەستپێکرن پشتی میر سولتان حسێن بوویە حوکمدارێ میرگەها بەهدینان (١٥٣٣-١٥٧٣)، بەدلیسی ل سەر ڤی میری دبێژیت: « چ میرێن سەردەمێ وی نەدشیان خۆ نێزیکی وی بکەن، میر و حوکمدارێن کوردستانێ قەستا وی دکرن دەمێ کارەك ل دەرگەهێ بلند (بابی عالی) ل ئستانبۆل هەبانە و ل دووڤ وێ پلانێ دچوون یا ژ لایێ وی ڤە دهاتە دانان... ئەو ل نك دەرگەهێ بلند کەسەکێ گراڤی و قەدرگران بوو...»[2].

دەمێ ل سالێن (١٥٥١-١٥٥٤)ێ ڤێکنەکرن د ناڤبەرا زەینەل بەگێ هەکاری و میر سەید محەمەد مامێ وی پەیدا بووی، پێ داویێ ب هاریکارییا عەشیرەتا پنیانش شیا میر زەینەل ژ سەر حوکمی لادەت، ژ

بەر هندێ، میر زەینەل نەچار بوو کێشەیا خۆ ببەتە دەرگەهێ بلند، بەرگەرێ وی ژی د ڤێ مەسەلێ دا میر سولتان حسێن بوو یێ شیای سەرۆك وەزیر رۆستەم پاشای رازی بکەت کو حوکمێ میرگەهێ رادەستی میر زەینەل بهێتە کرن، هەروەسا دەولەتا ئۆسمانی ژی میر سولتان حسێن راسپارد کێشەیێن ل ناڤبەرا میر زەینەل و پسمامێن وی چارە بکەت، نەخاسمە ژی دگەل میر کلابی* بەگێ کورێ سەید محەمەد بەگێ پەنابرە ئامێدیێ و خۆچەماندنا خۆ بۆ میرێ بەهدینان راگەهاندی، هۆسا، ل رۆژا ٦ ی جمادا ئێکێ یا ٩٥٩ ێ مشەختی/ ٢٩ ی نیسانا ١٥٥٢ زایینی فەرمانەك بۆ میرێ بەهدینان دەرکەڤت و تێدا هاتیە: «پسمامێ زەینەل بەگێ هەکاری رەڤییە نك تە و یێ داویێ هەر ژ مێژە سەر ب زەینەل بەگێ بوویە، ژ بەر هندێ، فەرمانێ ددەمە تە یێ داویێ بهنێرییە نك زەینەل بەگێ، هەروەکی دزانی ژی — ل دووڤ یاسایا مە یا کەڤن [٣]— نابیت چ کەس ڤێجا چ سەرۆك عەشیرەت یان کورێ میری یان هەر کەسەکێ دی یێ عەشیرەتان بیت خۆچەماندنا خۆ بۆ میرگەهەکا دی رابگەهینیت»[٤]، هەروەسا هەر وێ رۆژێ، فەرمانەك بۆ کلابی بەگ ب خۆ ژی دەرکەڤتیە و تێدا هاتییە: «بۆ زەینەل بەگێ پسمام یێ ناڤدار ب کلابی*، بەری نۆکە دگەل زەینەل بەگێ میرێ هەکاریان هاتبوویە نك من و ژ بەر ئنیەت و نیشتمانپەروەرییا تە یا پاقژ ل ناڤ هەمی هێزێن کوردستانێ، تە دلۆڤانی و دلپێڤەبوونا من ب دەستڤە ئینابوون، مە ژی وەك نەریتەکێ خۆ یێ دێرین، بریاردا هەر کەسێ جارا ئێکێ دگەل میری بهێت... (هندەك ژێ کێمە (ص)) ژ بەر هندێ، ل دووڤ نەریتێ مە یێ دێرین فەرمانێ ددەمە تە دگەل میر زەینەل بهێیە نك مە و چ کارێن دی یێن بەرۆڤاژی هندێ نەکەی، زەینەل بەگ دلۆڤانی یێن مە یێن زێدەتر وەرگرتینە و پەروەردەیا وی یا باش بوویە جهێ رازیبوونا دەرازینکا مە یا بەختەوەر، ژ بەر هندێ، پێدڤییە تۆ بەردەوام خزمەتێ ل بن سەرکردایەتییا وی بکەی»[٥]، هەروەسا سولتانی فەرمانەك بۆ میر زەینەل بەگێ دەرئێخست و تێدا دبێژیت کو وی فەرماندایە سولتان حسێن بەگێ حوکمدارێ ئامێدیێ کو پێدڤییە کلابی بەگ بهنێریت داکو ل بن ئالایێ میرێ هەکاری خزمەتێ بکەت و فەرماندا یێ داویێ ژی کو پێدڤییە ب زووترین دەم ئارێشەیێن خۆ دگەل کلابی بەگ چارە بکەت و هۆیێن وان ڤێکنەکرنان یێن دگەل هەبن نەهێلیت [٦].

پشتی ل سالا (١٥٥٤)ێ حوکمێ زینەل بەگێ ل هەکاری بنەجهـ بووی، چەندین جاران دگەل میر سولتان حسێن هاتە راسپاردن وان ئارێشەیێن د ناڤبەرا میرگەهـ و عەشیرەتێن کوردی دهاتنە روودان چارە بکەت [٧]، هەر بۆ نموونە، د هەیاما ئاشتیێ دا ل ناڤبەرا هەردو دەولەتێن ئۆسمانی و سەفەوی پشتی ئیمزاکرنا پەیمانا ئاشتیێ یا ئەماسیا ل سالا (١٥٥٥)ێ زایینی، هندەك حالەتێن ڤێکنەکرنێ ل سەر ملکدارییا هندەك گوندێن ل ناڤبەرا میرگەهـ و زەعامەت* و ئێلێن توخیبێن وان یێن هەڤپشك هاتبوونە روودان، د چارچۆڤێ هشیارییا وێ دا ژی بۆ پاراستنا ئاشتیێ، دەولەتا ئۆسمانی رژدی کر ئەڤ ئارێشە زوو بهێنە چارە کرن، بۆ ڤێ چەندێ ژی، دەولەتا ئۆسمانی ب ئاوایەکێ گشتی پشتا خۆ ب هەردو میرگەهێن هەکاری و بەهدینان گەرم کر داکو ئەو ئارێشە بهێنە چارە کرن، هەر بۆ نموونە: کێشەیا ل ناڤبەرا محەمەد بەگێ کورێ غازی قرانێ میرێ رواندز و میرەکێ دی یێ ب ناڤێ بەهائەددین عیمادەددین ل سەر حوکمکرنا ناحیا بەرازگرد هاتییە روودان[٨]، ئینا فەرمانەك بۆ زەینەل بەگێ هەکاری و قوباد بەگێ میرێ سولتان حسێنێ بەهدینانی دەرکەڤت کو پێدڤییە پشتەڤانییا میر بەهائەددین بهێتە کرن ژبەرکو وی پتر مافێ حوکمدارییا بەرازگرد هەیە«[٩]، ل رۆژا ٦ ی جمادا ئێکێ ٩٦٧ ێ مشەختی/ ٣ ی شواتا (١٥٦٠)ێ زایینی فەرمانەك بۆ میر زەینەل بەگێ دەرکەڤت کو پێدڤییە کێشەیا کوشتنا یوسف بەگێ میرێ سنجەقا لاجان* بهێتە چارە کرن، (کو بکوژان دگەل هندەك ئاغایێن وەکی شروین، عەلائەددین، شاهێ مەنسور، مراد، پیر غایب و بانیور؟ هێرش کربوونە سەر سنجەقا یوسف بەگێ هاتییە

كوشتن و گوندێن وی تالان كربوون و ل چیان بەلاڤە ببوون و رەتكربوون خۆ رادەست بكەن»، د وێ فەرمانێ دا داخواز ژ زەینەل بەگێ هاتبوو كرن هاریكاریێ دگەل میر سولتان حسێن بكەت بۆ كۆمكرنا زانیاریان ل سەر هووركارێن وێ روودانێ و چارەكرنا وێ كێشەیێ (ب رێیا شەرعی)[١٠].

هەروەسا ل رۆژا ٢٩ ی شەعبانا (٩٦٧)ێ مشەختی/ ٢٣ ی گولانا (١٥٦٠)ێ زایینی فەرمانەكا دی بۆ والیێ وانێ دەركەڤت كو پێدڤییە نەهێلیت سەعیدێ برازایێ رەسول بەگێ میرێ موكری و زەینەل بەگێ میرێ شنۆ و كوردێن برادۆست سەرپێچییان ل دەڤەرا سلدۆز بكەن[١١]، چونكی ئەڤە (بەرۆڤاژی مەرجێن ئاشتیێ نە)[١٢]، هەروەسا ژ بەلگەنامەیەكا دی دیار دبیت كو میر سولتان حسێن شیایە میر سەعیدێ ناڤبری دەستەسەر بكەت، لێ پاشی ب دەستەبەریا (كەفالەتا) میر زەینەل بەگێ هەكاری هاتییە ئازاد كرن، لێ دوبارە وی سەعیدی هێرش كرینە سەر عەردێن سەفەوی، ژ بەر هندێ، فەرمانەكا دی بۆ والیێ وانێ دەركەڤتییە كو پێدڤییە میرێ هەكاری بەرگەرپانێ د ڤێ كێشەیێ دا بكەت، ژ بەركو ئەو ئەو ببوو كەفیلێ میر سەعید[١٣].

ل رۆژا ٢٧ ی ربیع الاخر یا (٩٧٦)ێ مشەختی/ ١٩ ی چریا دووێ یا (١٥٦٨)ی زایینی فەرمانەكا دی گەهشتییە زەینەل بەگێ و تێدا هاتییە كو میر محەمەدێ میرێ برادۆست ب تمامی زێرەڤانیێ ل توخیبی دكەت و تەناهییا وێ دپارێزیت، هەروەسا داخوازنامەیێن تاگریێ بۆ وان سەرۆك عەشیرەتان نڤیسین (یێن ل دەڤەرێ بەلاڤە بووین) و شیایە وان دووبارە ل وارگەهێن وان ئاكنجی بكەت و تێدا دیار كر كو هەڤوەلاتی ژ میرێ برادۆست درازینە، ژ بەر هندێ، سولتانی فەرماندا زەینەل بەگێ كو پێدڤییە نامەیەكێ بۆ میر محەمەد بهنێریت و تێدا داخوازێ ژێ دكەت دبێژیتێ: (ل سەر دادپەروەریا خۆ یێ بەردەوامبە وشرۆڤەیان ل سەر رەوشا دەڤەرێ پێشكێشی مە بكە و تەمبەلیێ د وێ چەندێ دا نەكە)[١٤].

پشتی میر سولتان حسێن بەگ وەغەرا داویێ كری، قوباد بەگێ كورێ وی (١٥٧٣-١٥٨٤ ێ زایینی) بۆ حوكمدارێ بەهدینان كو سەرا حوكمداریا وێ میرگەهێ دگەل برایێ خۆ یێ مەزن بەهرام بەگێ كەڤتبوو د هەڤركییەكێ دا، سەرباری هەمی بزاڤێن حكومەتا ئۆسمانی بۆ چارەكرنا ڤێكنەكرنێن ل ناڤبەرا وان، لێ بەهرام بەگێ هەمی پێشنیارێن بۆ هاتینە پێشكێش كرن رەت كرن[١٥] و پشتی قوباد بەگ رازیبوونا ئستانبۆلا پایتەخت بۆ حوكمداریا میرگەها بەهدینان ب دەستڤەئینای، بەهرام بەگێ یاخیبوونا خۆ راگەهاند و ل هەیڤا رەمەزانێ یا سالا (٩٨٥)ێ مشەختی/ كانوونا ئێكێ یا (١٥٧٧)ێ زایینی دگەل ٤٠ زەلامان د دەڤەرا برادۆست و د سۆمای را قەستا ئۆرمیێ یا سەر ب دەولەتا سەفەوی كر و ژ وێرێ ژی قەستا تەورێز كر و ل وێرێ ب گەرمی هاتە پێشوازی كرن، پاشی ژ وێرێ ژی قەستا قەزوین كر و دگەل شاهـ ئیسماعیلێ دووێ كۆمبوو[١٦]، ژ بەر هندێ، ل رۆژا ٧ رەمەزانا (٩٨٥)ێ مشەختی/ ١٧ چریا دووێ یا (١٥٧٧)ێ زایینی فەرمانەك بۆ زەینەل بەگێ هەكاری و حەسەن بەگێ میرێ میرگەها مەحمودی دەركەڤت كو پێدڤییە كاری بۆ زڤڕاندنا بەهرام بەگێ بكەن یێ هەردەم ل سەر رەتكرن و خرپانێ دچیت (الذي اتخذ من الرفض و الالحاد دینا)، هەروەسا داخواز ژ وان هەردوان هاتە كرن كو (ل سەر زێرەڤانیكرنا توخیبی دهشیار و چاڤ ڤەكری بن) و وان میران دەستەسەر بكەن یێن بزاڤا دەربازبوونێ ژ توخیبی دكەن[١٧]، ئەنوەر مایی ژی دبێژیت كو ئەگەرێ راسپاردنا زەینەل بەگێ بۆ دووڤچوونا كێشەیا بەهرام بەگێ ئەوە كو یێ داویێ خارزایێ میرێ هەكاری بوویە[١٨].

ژ لایەكێ دووڤە، شاهـ ئیسماعیلێ سەفەوی ل سالا (١٥٧٨)ێ زایینی وەغەرا داویێ كر و - ژ بەر هندەك ئەگەرێن نەدیار- فەرمان ب شاهێ نوو محەمەد خدابەندە هاتەدان كو بەهرام بەگێ دەستەسەر بكەت و ل كەلا مرنێ ل باكوورێ ئیرانێ زیندان بكەت، لێ زەینەل بەگێ میرێ هەكاری ب

ناڤگینیا ئەمیرخانێ حوكمدارێ تەورێزێ شیا وی ژ زیندانكرنێ رزگار بكەت، ئەڤە ژی پشتی بەرتیلەك (سەرانەیەك) ب گوژمێ پێنج هزار فلۆری یێن زێری دایە شاهی[١٩]، بەدلیسی دبێژیت كو ئەگەرێ ڤێ بەرگەریانا زەینەل بەگێ د ڤێ كێشەیێ دا ژ بەر (كەریڤەبوونا وی بوو ژ قوباد بەگێ و ئەو نەدڤیا و یێ ژێ دلگران بوو)[٢٠]، لێ بەدلیسی ئەگەرێن ڤێ كەرب ژێڤەبوونێ دیار نەكرینە. بەهرام بەگێ یێ پشتەڤانییەكا سەربازی ژ زەینەل بەگێ ب دەستڤەئینای قەستا بازێرێ زاخۆ كر كو وی دەمی ل بن حوكمێ میر سەیدخان بەگێ كورێ قوباد بەگ بوو[٢١] و كۆنترۆل ل سەر وی بازێری كر، ڤێ پێنگاڤێ هندەك عەشیرەتێن بەهدینان یێن بەرهنگارێن قوباد بەگێ هاندان یاخیبوونا خۆ رابگەهینن[٢٢]، ئینا قوباد بەگ نەچار بوو برەڤیتە مووسل و ژ وێرێ ژی قەستا ئستانبۆل بكەت و ل وێرێ فەرمانا دووبارە حوكمكرنا ئامێدیێ ب دەستڤەئینا[٢٣]، د رێیا ڤەگەریانا خۆ دا بۆ ئامێدیێ گەهشتە كەلا دهۆك، لێ ل وێرێ ب دەستێ زەلامێن عەشیرەتێن ل دژی وی سەرهلداین هاتە كوشتن و بەهرام بەگ ژ زاخۆ بۆ حوكمكرنا ئامێدیێ ئینان و ل سالا(٩٩٢)ێ مشەختی(١٥٨٤)ێ زایینی وەك میرێ میرگەها بەهدینان هاتە دامەزراندن[٢٤].

حوكمێ میر بەهرام ژ سالەكێ پتر نەڤەكێشا و ل نیڤا هەیڤا زیلحجەیا(٩٩٣)ێ مشەختی/ نیڤا كانوونا ئێكێ یا (١٥٨٥)ێ مەلبەندی (ئستانبۆل) دەسەلات دا سەیدخان بەگێ كورێ قوباد بەگێ حوكمدارییا میرگەهێ بكەت و فەرهاد پاشایێ سەركردێ هەوا ئۆسمانی بەهرام بەگ دەستەسەر كر و رادەستی سەیدخان بەگێ كر و وی ژی وەك تۆلڤەكرنا بابێ خۆ، بەهرام بەگ كوشت[٢٥].

دەست ب كاربوونا سەیدخان وەك حوكمدارێ ئامێدیێ، هەڤدەم بوو دگەل دەركەڤتنا فەرمانا دەست ب كاربوونا میر زەكەرییا بەگێ بۆ حوكمدارییا هەكاری، ل سەردەمێ وان هەردوان پەیوەندییەكا دۆستانە ل ناڤبەرا هەردو میرگەهان بەردەوام بوو، ل سالا (١٥٨٨)ێ ژی میر مەلەك بەگێ كورێ زاهد بەگێ شیا سولتانێ ئۆسمانی رازی بكەت فەرمانا دامەزراندنا وی وەك حوكمدارێ ئامێدیێ بدەت، ئینا زەكەریا بەگ رەڤی ئامێدیێ ل نك سەیدخانێ حوكمدارێ وێ و یێ داوییێ میرێ كەلا بێتەنوورێ[٢٦] هنارتە پێشوازیكرنا وی و داكو دگەل بهێتە ئامێدیێ[٢٧]، پاشی ل نك وەزیر سینان پاشا جغالە زادە بەرگەریان بۆ كر داكو دووبارە زەكەریا بەگ ببیتە حوكمدارێ هەكاری بەرامبەری ١٠٠ هزار فلۆری یێن زێری (هەروەكی مە ئاماژە پێدای).

ژ لایەكێ دووڤە ل سالا (١٠٠١)ێ مشەختی/ ١٠٩٢ ێ زایینی یاخیبوونا حەمزە ئاغایێ رێبەرێ عەشیرەتا زێباری دژی حوكمێ سەیدخان بەگێ دەست پێ كر كو ئەڤ عەشیرەتە ژ عەشیرەتێن پشتەڤانێن بەهرام بەگێ دژی میر قوباد بەگێ بوو و وەسا دیارە ژی ئەڤ عەشیرەتە ل سەر دژایەتیكرنا حوكمێ سەیدخان بەگ ژی بەردەوام بوویە و فەرمان بۆ كۆمەكا میرگەهێن كوردی دەركەڤتن كو پێدڤییە ئەو میرگەهـ هێزێن خۆ بهنێرن داكو هاریكارییا میرێ بەهدینان بكەن بۆ ڤەمراندنا وێ یاخیبوونێ، كو ئێك ژ وان میران میرێ هەكاری زەكەریا بەگ بوو[٢٨].

پشتی میر عیمادەددین كورێ یەحیا بەگێ بوویە حوكمدارێ هەكاری (١٦٣٤-١٦٣٩)ێ زایینی) پەیوەندیێن ل ناڤبەرا هەردو میرگەهێن هەكاری و بەهدینان چوونە د قۆناغەكا نوو دا و د ڤێ قۆناغێ دا بۆ جارا ئێكێ هێزێن سەربازیێن هەكاری ب سەر میرگەها بەهدینان دا گرت، كو تشتەكێ هۆسا د چ سەردەمێن دی دا نەهاتبوو روودان، ب راستی ژێ، میر عیمادەددین كەسەكێ بەرفرەهخواز و سەركردەیەك بوو ل سەردەمێ حوكمدارییا وی چەندین هەوێن سەربازی ل سەر میرگەهێن كوردی یێن هەڤسوو هاتبوونە كرن، ئێكەمین هێرش ژی ب سەركردایەتییا میر عیمادەددین بوو دژی عەرد و عەشیرەتێن بەهدینان بەری ببیتە حوكمدارێ میرگەها هەكاری، عیمادەددین خۆ هەڤتر دیت ببیتە حوكمدارێ هەكاری ژ بەركو ئەو كورێ میرێ بەرێ یەحیا

بەگێ بوو، ژ بەر هندێ، دەست ب بەهانەئینانێ كر داكو میرشەرەفخانێ مامێ خۆ تەنگاڤ بكەت و رابكێشیتە هەڤركییەكێ دگەل خۆ، ب ڤێ پلانێ، دو هێرشێن ل دووڤ ئێك كرنە سەر عەشیرەتا مزووری ژووری و ٥٥ كەس ژێ كوشتن، هەجەتا وی ژی ئەو كو مزووری دەستدرێژیێ دكەنە سەر عەشیرەتێن هەكاری یێن ل دەڤەرا گەڤەرێ[٢٩] و تەرش و كەوالێ خۆ ل عەردێ وان دچەرینن و میر شەرەفخان ژ بەر وێ پەیوەندیا خزمانییا دگەل هەی، چاڤێن خۆ ژ كریارێن وان دنقینیت[٣٠].

پشتی میر عیمادەددین بوویە حوكمدارێ هەكاری، پەیوەندیێن ل ناڤبەرا هەردو میرگەهان ئالۆزتر لێ هاتن، نەخاسمە ژی كو ئامێدیێ و زەعامەتێن عەشیرەتێن سەر ب وێ ببوونە پەناگەهـ بۆ ئەوێن ژ حوكمێ میر عیمادەددین دڕەڤین، ل پێشیا هەمیان ژی بۆ مامێ وی زەینەل كوڕێ زەكەریا بەگێ رەڤییە ئامێدیێ، وەسا دیارە ژی وی یوسف بەگێ میرێ بەهدینان دژی میر عیمادەددین هان ددا، هەروەسا گلایی بەگێ رێبەرێ عەشیرەتا بەرواری بالا و میرێ كەلا بێتەنوورێ ئەوێ نەچار بووی پشتەڤانییا خۆ بۆ میرێ هەكاری دەرببڕیت پشتی یێ داویێ ل سالا (١٦٣٤)ێ زایینی دەڤەرا چەلێ[٣١] ستاندی، ئەو بۆ خۆ ل دەلیڤەیەكێ دگەڕیا تۆلا خۆ ژێ ڤەكەت، ل ڤێرە دڤێت ئامازەیێ بكەینە وێ چەندێ كو ژێدەرێ ئێكانەیێ بەحسێ ڤان رووداناـن كری پەرتووكا (منظومة تأريخ الامارة الهكارية)یە، فەرە بێژین كو دانەرێ پەرتووكێ دبێژیت كو ئەگەرێ ڤێ هەوا میر عیمادەددین ل سەر بەهدینان ژ بەر هندێ بوو كو میر زەینەل ل ئامێدیێ بوو و بۆ خۆ ل دەلیڤەیەكێ دگەڕیا حوكمێ عیمادەددین ل جۆلەمێرگێ ژ ناڤ ببەت، ل سالا (١٠٤٤)ێ مشەختی(١٦٣٤)ێ زایینی فەرمان ب میر عیمادەددین هاتە دان ئامادەكاریان بكەت و بۆ بەرسینگگرتنا هێرشەكا نێزیك یا قزلباشان قەستا توخیبی بكەت، ئینا میرێ بەرواری كلایی بەگ هنارتە نك زەینەل بەگێ داكو بێژیتێ كو میر عیمادەددین ژ جۆلەمێرگێ دەركەڤتییە و چ هێز ل میرگەهێ نەماینە و داخواز ژێ كر دەملدەست بهێت داكو پێكڤە هێرشێ بكەنە جۆلەمێرگێ، هەروەسا زەلامێن عەشیرەتێن پنیانش و ئەرتووشی و تخوب و تیاری ژی دگەل وان ل سەر وێ چەندێ رێككەڤتن، هۆسا، دەمێ میر عیمادەددین ل سەلماسێ بوو، دەنگ وباس گەهشتنێ كو زەینەل بەگێ مامێ وی یێ خۆ بۆ هێرشكرنا جۆلەمێرگێ ئامادە دكەت، ئینا هەر زوو ڤەگەڕیا پایتەختێ خۆ و لەشكەرەك ب سەركردایەتییا هەردو برایێن خۆ تەتەرخان و شێر بەگ ئامادە كر و ئەو لەشكەر هنارتە كەلا بێتەنوورێ، كلایی بەگ و برایێ وی ئەولیا بەگ ب (مێرخاسی) شەڕ كرن هەتا عیمادەددین نەچار بووی ئەو ب خۆ بۆ هاندانا زەلامێن خۆ بهێتە كەلێ [٣٢]، ئینا كلایی بەگ پشتی پشتڕاست بووی كو ژیانا وی دێ یا پاراستی بیت خۆڕادەست كر، لێ رۆژا پاشتر دەمێ پێكۆل كری ژ سەربازگەها هەكاری بڕەڤیت هاتە كوشتن (دەمێ دەنگوباسێ كوشتنا وی گەهشتییە میر عیمادەددین، فەرماندا ئەولیا بەگێ برایێ وی ژی بهێتە كوشتن)[٣٣].

پشتی كەلا بێتەنوورێ ستاندی، عیمادەددین هێزەكا مەزن بۆ ستاندنا بەهدینان(فەتحكرنا بەهدینان)[٣٤] پێك ئینا و پتریا عەشیرەتێن هەكاری پشكداری د وێ هێزێ دا كرن و میر عیمادەددین ب خۆ سەركردایەتییا ڤێ هێزێ كر، د رێیا خۆ دا ژی هندەك هێز بۆ ستاندنا كەلا نێروە هنارتن [٣٥] (چونكی نابیت وێ ل پشت خۆ بهێلن)[٣٦]، ئەوێ حوكم ل وێ كەلێ دكر میرەك بوو ب ناڤێ (میم غازی) یێ پشتی دەنگ وباسێن گەهشتنا هێزێن هەكاری گەهشتینێ ژ كەلا خۆ رەڤی و (بوداغ خان)ێ كوڕێ خۆ ل شوونا خۆ ل كەلێ هێلا، ژ لایێ خۆڤە خەلكێ كەلێ بڕیاردا برایێ میرێ رەڤی بایەزید بەگ وەك میرێ خۆ دامەزرینن ب مەرجەكی پەیوەندیێ ب میر زەینەددین بكەت و كەلێ رادەستی وی بكەت، ئینا میر عیمادەددین ئەو خەلات كر و دووبارە وەك میرێ كەلێ و دەڤەرا نێروە دامەزراند و بەیانەك (بەلاڤۆكەك) ژی (ب زمانێ كوردی) نڤیسی

و دانپێدان ب حوكمێ بوداغ بەگێ كر و گەف (ل هەر كەسەكی كرن یێ بزاڤا لادانا وی ژ حوكمی بكەت)[٣٧]، پاشی عیمادەددین ل سەر چوونا خۆ بەردەوام بوو هەتا گەهشتییە پرا بلبل، ئینا دووبارە پر ئاڤا كر پشتی ئاڤا رووباری پشكەك ژێ رامالی[٣٨]، دەمێ نێزیكی ئامێدیێ بووی، شاندەك هنارتە نك یوسف بەگێ میرێ وێ و داخواز ژێ كر یان شەری یان دووبارە نەخشەدانا توخیبێ ل ناڤبەرا هەردو میرگەهان هەلبژێریت، ئینا یوسف بەگ شیرەتكارێن خۆ كۆم كرن و هەمییان بریاردا كو یا باشتر ئەوە چارەكرنەك دگەل میرێ هەكاری بهێتە كرن، ل سەر ڤی بنواشەی، هەردولا گەهشتنە پەیمانەكا ئاشتیێ و ژ لایێ هەر ئێك ژ میر عیمادەددین و میر یوسف بەگ ڤە هاتە ئیمزا كرن[٣٩].

سەرداگەرتنا میرگەها بەهدینان ژ لایێ میر عیمادەددین ڤە بەربەرەكێ شەران ل ناڤبەرا هەردو میرگەهان ڤەكر، وەسا دیارە ژێ ئەو پەیمانا ل ناڤبەرا هەردولا هاتییە ئیمزا كرن نەشیایە ژ رەهـ وریشال هەڤركیێن ل ناڤبەرا وان چارە بكەت و میرێن بەهدینان بەردەوام بزاڤا زڤراندنا دەڤەرا بەرواری بالا دكرن، لێ تشتێ بەرچاڤ ئەوە ئەڤ دەڤەرە هەتا پشتی سالا (١٠٦٦)ێ مشەختی(١٦٥٦)ێ زایینی ل بن دەستێ هەكاری مایە، گرۆڤە ژێ بۆ وێ چەندێ ئەوە كو گەریدەیێ تورك ئەولیا چەلەبی وی دەمی سەرەدانا ڤێ دەڤەرێ كرییە و بەحسێ هێلا ل ناڤبەرا هەردو كەلێن بێتەنوورێ و كەلا شخۆ[٤٠] كرییە وەك توخیبێ باكوورێ میرگەها بەهدینان، ئەڤە ژێ نیشانێ هندییە كو دەڤەرا بەرواری بالا یا ل باكوورێ وێ هێلێ ل بن كۆنترۆلا هەكاری بوویە[٤١].

سالێن پشتی هنگی ژێ هندەك شەرێن سڤك و هێرش ل ناڤبەرا هەردو میرگەهان هاتنە روودان، هەر بۆ نموونە، ئەنوەر مایی دبێژیت كو ل سالا (١٠٨٤)ێ مشەختی(١٦٧٤)ێ زایینی خالد بەگێ میرێ هەكاری هێرش كرە میرگەها بەهدینان و شەرێ ل ناڤبەرا وان سێ هەیڤان ڤەكێشا و ل داویێ هێزێن بەهدینانی ب سەر لەشكەرێ هەكاری سەركەفتن[٤٢]، لێ رەخنە ل سەر ڤێ ڤەگێرانێ و ڤەگێرانێن دی یێن نڤیسەرێ ناڤبری ئەوە وی ئاماژە نەكرییە وی ژێدەرێ زانیاریێن خۆ ژێ وەرگرتین، ل وێ باوەریێنە وی زانیاریێن خۆ ژ ڤەگێرانێن زاردەڤ و فۆلكلۆری یێن دەڤەرێ وەرگرتبن، ئەڤە سەرباری كو ناڤێ خالد بەگێ د ناڤ ناڤێن رەهـ ورڤشتێن بنەمالا میرێن هەكاری دا نەهاتییە.

ل سالا (١٧٠١)ێ زایینی دووبارە شەر ل ناڤبەرا هەردو میرگەهان هاتنە روودان و ل دووڤ گۆتنا مایی، میرێ هەكاری سەركردێ خۆ یێ ب ناڤێ (چل قەدەر) دهاتە نیاسین هنارتنە دەڤەرا بەرواری بالا و كەلا بێتەنوورێ ستاند و میرێ وێ كوشت، ئینا زبێر پاشایێ(١٧٠١-١٧١٤) میرێ بەهدینان هێز ب سەركردایەتیا میر عەمەرێ رێبەرێ عەشیرەتا زێباری بۆ راوەستاندنا پێشرەوییا هەكاریان هنارتن، ل بەرامبەری ڤێ رەوشێ، چل قەدەر داخواز ژ میرێ هەكاری كر هێزێن زێدەتر بۆ تەوارا وی بهنێریت، ئینا میرێ ناڤبری (ئیبراهیم بەگێ برازایێ خۆ) دگەل هێزەكا مەزن هنارتە دەڤەرا بەرواری بالا و د شەرەكێ ئێكلاكەر دا یێ ل دەڤەرا گابنێركێ یا سرتا چیایێ مەتینا ل ناڤبەرا هەردولا هاتییە روودان، هێزێن هەكاری شكەستن و ئیبراهیم بەگ هاتە ئێخسیر كرن[٤٣]، لێ هەرچەندە ئەڤ ڤەگێرانە د كەلەپوورێ زاردەڤێ دەڤەرا بەهدینان دا هاتییە گۆتن و مایی د ڤەگێرانێن خۆ دا پشتا خۆ پێ گەرم كرییە[٤٤]، لێ ڤەگێرانەكا گەلەك مژوویە و شاشیێن دیرۆكی تێدا هەنە، ژ وانا: وی دەمی میرێ فەرمیێ هەكاری ئیبراهیم بەگ بوویە و ئەو میر كورێ محەمەد بەگێ بوویە و نە برازایێ وی بوویە هەروەكی مایی گۆتی[٤٥]، هەروەسا مایی دبێژیت كو ل سالا (١٧١٥)ێ زایینی دووبارە شەر ل ناڤبەرا هەردو میرگەهان هاتنە روودان و ڤێ جارێ ژ بەر ب سەرداگرتنا نشكاڤەییا كەلا بێتەنوورێ و كوشتنا كلائی بەگێ میرێ وێ و كورێن وی گەلەك هاریكارێن وی بوویە ژ لایێ هەكاریان ڤە و كەس ژ ڤێ كوشتارێ رزگار نەبوویە ژ بلی كورەكێ كلایی بەگ ب ناڤێ سەعید بەگ یێ ڤەستا ئامێدیێ كری و مەسەلا خۆ بۆ میر

بەهرام بەگ (١٧١٤-١٧٦٨)ێ زایینی) گۆتی، ئینا یێ داویێ هێزەك دایێ و سەعید بەگ پێ شیا دەڤەرا خۆ ژ دەستێ هەكاریان بزڤرینیتەڤە، ئەڤە ژی پشتی هێزێن هەكاری بەرهنگاری شكەستنەكا مەزن كری[٤٦].

ژێدەرێ ئێكانە و هەڤچەرخێ ڤان رووداناان، نڤیسەر ئیبراهیم بەگ (میرزا محەمەد یازجی)یە یێ ل چارێكا ئێكێ یا سەدسالیا هەژدێ ژیای و مری، لێ ڤەگێرانێن وی ژی دبێ كێماسی نینن، ژ وانا، تاگربیا وی یا روهن و ئەشكەرا بۆ میرێ هەكاری و هەروەسا سەرڤەسەرڤەیی یا ڤەگێرانێن وی، دبیت ئەڤە ژی ژ بەر بچووكیا ژیێ وی بیت چونكی نڤیسەرێ ناڤبری (ب زۆری ژیێ وی ژ هەڤدە سالیێ بۆرییە) [٤٧]، هەروەسا رەخنەیا مەزنتر ژی ل سەر زانیارێن وی ئەوە كو وی دیرۆك و سال نەگۆتینە، هەروەسا وی ئاماژە كرییە وێ چەندێ كو وی دەمی شەڕەكێ ب تنێ هاتییە رووودان بەرۆڤاژی مایی یێ ئاماژە كرییە رووودانا دو شەڕان یێ ئێكێ ل سالا (١٧٠١)ێ و یێ دووێ ل سالا (١٧١٥)ێ.

محەمەد یازجی دبێژیت: ئەگەرێ هەلبوونا شەڕی ل ناڤبەرا هەردو میرگەهان، ژ بەر دەستدرێژێن عەشیرەتا سوورچی بوو ل سەر خەلكێ هەكاری و ئەڤ عەشیرەتە ژ عەشیرەتێن كۆچەر بوو و وەرزێ هاڤینێ دچوو هەردو دەڤەرێن گەڤەرێ و شەمزینان و ب هاندانا هندەكێن (ساویلكە و گەمشۆ) دەستدرێژی دكرنە سەر خەلكێ وان هەردو دەڤەران، ژ بەر هندێ، وان داخواز ژ ئیبراهیم بەگێ میرێ هەكاری كرن د هەوارا وان بهێت، ئینا یێ داویێ لەشكەرەك پێكئینا و پێ شیا رەهـ وریشالێن وان ژ دەڤەرێ دەربێخیت و ملك و مالێ وان ل سەر ئاكنجیێن وێرێ بەلاڤ بكەت، ژ لایێ خۆڤە وان سوورچییان پەنابرنە بەر میرێ بەهدینان و ئەو هاندا دەستدرێژیێ و زۆری و كوتەكیێ ل بازرگانێن هەكاری بكەت، هەروەسا میری ب زەلام و چەكی هاریكاریا وان كر و هاندان هێرشێ بكەنە سەر عەردێ هەكاری، ئینا میرێ هەكاری هێزەك ژ تیاریان و عەشیرەتێن دەڤەرا چەلێ ئامادە كر و پێ هێزێن بەهدینان شكاندن و هندەك عەردێ وێ ژی وەك پشكەك ژ عەردێ میرگەها هەكاری هەمبێز كر، پاشی هێزێن هەكاری ل سەر پێشڕەوییێن خۆ بەردەوام بوون هەتا گەهشتینە چیایێن هنداڤی ئامێدیێ، ل وێرێ میرێ بەهدینان داخوازا ئاشبوونێ كر[٤٨]، محەمەد یازجی پێڤە دچیت و دبێژت كو میرێ هەكاری (كوركێ خۆ یێ پیرۆز دانا سەر كەڤرێ بلاكتۆن) وەك نیشان بۆ توخیبێ میرگەها خۆ، بلاكتۆن ژی كەڤرەكە ل (گەلیێ مزویركا) كو ب دووریا پێنج كیلۆمێتران ل باكوورێ رۆژئاڤایێ بازێرێ ئامێدیێ یە[٤٩]، رامانا ڤێ ژی ئەوە كو دووبارە هەكاریان سەرانسەری دەڤەرا بەرواری بالا كۆنترۆل كرییە، هەروەسا هاتنا ناڤێ ڤی كەڤری د فولكلۆرێ هەردو میرگەهان دا، نیشانێ راستیا ڤەگێرانا محەمەد یازجی یە[٥٠].

سالێن پشتی هنگی و هەتا سالا ١٨٣٣ ێ زایینی چ زانیارێن دی ل سەر پەیوەندیێن هەردو میرگەهان نینن، نەخاسمە ژی كو هەردو میرگەهـ چووبوونە د قۆناغەكا گەلەك لاواز و دژوار دا، ل سالا (١٨٣٢)ێ زایینی میرگەها بەهدینان كەڤتە بن كۆنترۆلا میرێ كۆرە (محەمەد بەگ)ێ میرێ سۆران و میرێ بەهدینان ئیسماعیل بەگێ كوڕێ تەیار بەگێ نەچاربوو بڕەڤیتە میرگەها هەكاری ل نك میر نورەللا بەگێ حوكمدارێ وێ[٥١]، د نامەیەكێ دا یا ل سالا (١٢٥٠)ێ مشەختی(١٨٣٤)ێ زایینی كۆمەكا سەرۆك عەشیرەتان و زانایێن ئایینی یێن بەهدینان بۆ سولتانێ ئۆسمانی هنارتی، تێدا گازندە كربوون ژ وێ زۆلم وزۆریا محەمەد بەگ لێ دكەت و داخوازێ كربوون میر ئیسماعیل بەگ وەك میرێ وان بهێتە دامەزراندن، هەروەسا ناڤێ نورەللا بەگێ میرێ هەكاری وەك میرەكێ پشتەڤانێ وان هاتییە[٥٢]، پشتەڤانیا میرێ هەكاری بۆ ئیسماعیل بەگێ هەر ئەڤە نەبوو، بەلكی ب هێزان ژی هاریكاریا وی كر و پێ شیا كەلا ئامێدیێ بستینیت و بۆ دەمەكێ كورت بوو حوكمدارێ وێ بەری دووبارە میرێ سۆران كۆنترۆلێ ل سەر كەلێ بكەت و دەست ب قوتبڕیا

خەلکێ وێ بکەت و رەسول بەگێ برایێ خۆ وەك حوکمدارێ وێ دامەزرینیت[٥٣]، ل سالا (١٨٤٢)ێ ژێ دەمێ دووبارە میر ئیسماعیل بەگ شیای کۆنترۆلێ ل سەر کەلا ئامێدیێ بکەت و حوکمدارێ ئۆسمانی ژێ دەربێخیت[٥٤]، نورەللا بەگێ میرێ هەکاری نامەیەك بۆ نڤیسی و تێدا خۆشحالیا خۆ ل سەر ڤی دەنگ وباسی دەربری (یێ خەم ژ من ڤەرەڤاندی) و پشتەڤانیا خۆ بۆ دەربری[٥٥].

پشکەکا سترانەکا فولکلۆری ل سەر هەوا میر عیمادەددین ل سەر میرگەها بەهدینان ل سالا (١٦٣٤)ێ:

**میر رابوو ژ جۆلەمێرگێ**
**لۆ میرۆ میر (عمادی)**
**ئالایێ سۆر هەژیا بوو**
**ل (ناڤسەرێ) پەیا بوو**

**میر هاتە (بادین کورتی)**
**بازیێ داڤێ گرتی**
**ل بەهدینان برن پرتی**

**میر هاتە (چەم مەندۆیێ)**
**دەست هاڤێتە نیمۆیێ**
**خوین دچت لەونێ جۆیێ**

**ناڤبەرا ئامێدیێ**
**سەررە بورین بەرپێ**
**ئاگر هاڤێت (قومریێ)**

**ناڤسەرێ یا ب تەراشە**
**هەکاریان بەستن شاشە**
**بەهدینی دانە پاشە**

**بەر بەرێ (بەلادینان)**
**کورتیێ زێر وەرینان**
**سنورێ مە بەهدینان**

**بەرێ بەلادینان برِی**
**کورتیێ زێر سەر زڤری**
**هەکاری ل بەهدینان خوری!**

بەرپەرەك ژ دەستنڤیسا (منظومة تاریخ امارة هكاری) یا بەحسێ هەوا میر عیمادەدین ل سەر کەلا (بێتەنورێ) دکەت



بەرپەرەك ژ دەستنڤیسا (مختصر احوال الامراء) یا بەحسێ هێرشا ئیبراهیم بەگێ هەکاری بۆ سەر بەهدینان دکەت



## ژێدەر:


١. بۆ زانیاریێن زێدەتر بنێرە: درویش یوسف هروری، بلاد هكاري، سپیرێز، (دهۆك، ٢٠٠٥)، بپ ١٢٥.

٢. البدلیسي: شرفخان، شرفنامة، ترجمة محمد جمیل الروژبیاني، ط٢، دار موكریاني، (اربیل: ٢٠٠١)، بەرپەرێن ٢٦١-٢٦٢.

٣. ل ڤێرە سولتان ئاماژێ دکەتە وێ فەرمانێ یا سالا ١٥١٥ێ زایینی بابێ وی سولتان سەلیمێ ئێکێ بۆ ئدریسێ بەدلیسی و تێدا گرنگی دابوو وێ چەندێ کو پێدڤییە میرێن کورد پێگیریێ ب توخیبێن میرگەهێن خۆ بکەن، داکو ل پاشەرۆژێ چ ڤێکنەکرن ل ناڤبەرا وان چێ نەبن.

٤. فەرمان بۆ میرێ ئامێدیێ سولتان حسێن بەگ ل رۆژا ٦ ی جمادا ئێکێ ٩٥٩ێ مشەختی/ ٢٩ ی نیسانا ١٥٥٢ای زایینی، (دفتر مهمة) هژمار ٨٨٨، حوکمێ ژمارة ٨٣٢، بپ ٢٧٧.

* تێبینی: ناڤێ (کلابی) ب ڤان ئاوایان ژی د ڤێ نڤیسینێ دا هاتییە: کلائی، کلابی، گلایی، کلایی.

٥. فەرمانەك بۆ کلابی بەگێ پسمامێ میر زەینەل بەگ ل رۆژا ٦ی جمادا ئێکێ ٩٥٩ێ مشەختی/ ٢٩ی نیسانا ١٥٥٢ێ زایینی، (دفتر مهمة)، هژمار ٨٨٨، حوکمێ هژمارە ٨٣٤، بپ ٣٧٨.

٦. فەرمانەك بۆ میر زەینەل بەگێ حوکمدارێ هەکاری ل رۆژا ٦ی جمادا ئێکێ ٩٥٩ێ مشەختی/ ٢٩ ي نیسانا ١٥٥٢ێ زایینی، (دفتر مهمة)، هژمار ٨٨٨، حوکمێ هژمارة ٨٣٥، بث ٣٨٩.

٧. هەر بۆ نموونە، بنێرە: دفتر مهمة، هژمارە ٣، حوکمێن هژمارە:١٤٠٦،٧٥٨،٧٥٧.

* (زەعامەت: تێرمەکێ ئۆسمانییە بۆ وی عەردی دهاتە گۆتن یێ داهاتێ وێ یێ سالانە ژ سەد هزار ئاقچەیان کێمتر بیت - ص -)

٨. بەرازگرد : ناڤێ وێ د بەلگەنامەیەکا ئۆسمانی دا هاتییە و ب فەرمانا میرێ ئامێدیێ، میرێ برادۆست حوکم لێ دکر، کو ئەو ژی دەڤەرەکا دەشتە دکەڤیتە ل ناڤبەرا چیایان و ب (دەشتا بەرازگرد) دهێتە نیاسین و ئێلا لۆلان لێ ئاکنجییە کو ئێکە ژ تایێن عەشیرەتا برادۆست، بەرازگرد دکەڤیە باکوورێ پارێزگەها هەولێر نێزیکی توخیبێ عیراقێ - تورکیا، بنێرە: فەرمانەك بۆ (قوباد بەگێ کورێ سولتان میرێ ئامێدیێ)، ل رۆژا ١٨ ی ذي القعدة ٩٦٦ێ مشەهتی/ ٢٢ی تەباخا ١٥٥٩ێ زایینی، دفتر مهمة، هژمارە ٣، حوکمێ هژمارە ٢٣٣، بپ ١٠٩.

* لاجان ئێکە ژ سنجەقێن ویلایەتا شارەزوور، لێ نێزیکي باژێرکێ (شنۆ ــ ئەشنویە) بوو کو نۆکە دکەڤیتە پارێزگەها ئازەربایجانا رۆژئاڤا ل ئیرانێ.

٩. فەرمانەك بۆ قوباد بەگێ(کورێ حسێن بەگ)، لبەك ژێ بۆ میر زەینەل بەگێ هەکاری و میر سولتان حسێن بەگێ بەهدینانی ل غەرەیا ذي لحیجة ٩٦٦ێ مشەختی/ ٥ی تەباخا ١٥٥٩ێ زایینی، دفتر مهمة ٣، حوکمێ هژمارە ٢٣٣، بپ ١٠٩.

١٠. فەرمانەك بۆ سولتان حسێن بەگێ میرێ ئامێدیێ ل رۆژا ٦ ي جمادا ئێکێ ٩٦٧ی مشەختی/ ٣ی شواتا ١٥٦٠ێ زایینی، دفتر مهمة ٣، حوکمێ هژمارە ٧٥٧، بپ ٣٣٥. فەرمانەك بۆ زەینەل بەگێ میرێ هەکاری، هەر وێ رۆژێ، دفتر مهمة ٢، حوکمێ هژمارە ٧٥٨، بپ ٣٣٦، فەرمانەم بۆ والیێ وانێ ل رۆژا ٢٠ی جمادا ئێکێ ٩٦٧ێ مشەختی/ ١٧ی شواتا ١٥٦٠ێ زایینی، دفتر مهمة ٢، حوکمێ هژمارە ٧٩٨، بپ ٢٥٤.

١١. سلدۆز: نۆکە دبێژنێ (نەغەدە) و ئێکە ژ قەزایێن پارێزگەها ئازەربایجانا رۆژئاڤا ل ئیرانێ، ئەڤە ل وی دەمێ نۆکە ناڤێ سلدۆز بۆ دەڤەرەکا چیایی یا باکوورێ باژێرێ نەغەدە دهێتە گۆتن، بنێرە: ایرج افشار سیستاني، نگاهي به اذربایجان غربي، ثامن الائمة، (تهران: ١٣٨١ هـ.ش)، بەرگێ ١، بپ ٩٩٢.

١٢. فەرمانەك بۆ والیێ وانێ ل رۆژا ٢٩ی شەعبانا ٩٦٧ێ مشەختی/ ٢٥ی گولانا ١٥٦٠ێ زایینی، دفتر مهمة ٣، حوکمێ هژمارە ١١٦٨، بپ ٥١٧.

١٣. فەرمانەك بۆ میر سولتان حسێن بەگ ل رۆژا ١٢ ي زیلقعدة ٩٦٧ێ مشەختی/ ٤ی تەباخا ١٥٦٠ێ زایینی، دفتر مهمة ٣، حوکمێ هژمارە ١٤٠٦، بپ ٦٢٤.

١٤. فەرمانەك بۆ میر زەینەل بەگێ میرێ هەکاری ل رۆژا ٢٧ ربیع الاخر ٩٦٧ێ مشەختی/ ١٩٤ی چریا ئێکێ یا ١٥٦٨ێ زایینی، دفتر مهمة ٧، حوکمێ هژمارە ٢٢٧٨، بەرگێ ٣، بپ ١٥٧.

١٥. عماد عبدالسلام رؤوف، دراسة وثائقية في تاريخ الكرد الحديث وحضارتهم، چاپخانا وەزارەتا رۆشنبیری، (هەولێر: ٢٠٠٨)، بەرپەرێن ١٥٤-١٥٦.

١٦. فەرمانەك بۆ والیێ وانێ ل رۆژا ٧ی رەمەزانا ٩٨٥ێ مشەختی/ ١٧ی چریا دووێ یا ١٥٧٧ێ زایینی، دفتر مهمة ٣٢، حوكمێ هژمارە ٦٥٩، بەرپەرێن ١٨١-١٨٢.

١٧. فەرمانەك بۆ حەسەن بەگێ مەحمودی ل رۆژا ٧ی رەمەزانا ٩٨٥ێ مشەختی/ ١٧ی چریا دووێ یا ١٥٧٧ێ زایینی، دفتر مهمة ٣٢، حوكمێ هژمارە ٦٦٠، بەرپەرێن ١٨٢-١٨٣.

١٨. انور المايي، الاكراد في بهدينان، چاپا ٢، چاپخانا خەبات، (دهۆك: ١٩٩٩)، بەرپەرێن ١٢٥-١٢٦.

١٩. البدليسي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٦٤.

٢٠. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٢٦٣.

٢١. بەلگەنامەیەكا ئوسمانی دبێژیت كو وی دەمی زاخۆ سنجەقەكا ل بن حوكمێ سەیدخان بەگێ بوو، بنێرە: فەرمانەك بۆ والیێ بەغدا ل رۆژا ١٧ی رەجەبا ٩٩٢ێ مشەختی/ ٢٥ی تیرمەها ١٥٨٤ێ زایینی، دفتر مهمة ٥٤، حوكمێ هژمارە ١٤٠، بپ ٨٠.

٢٢. بۆ زانیاریێن زێدەتر بنێرە: ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٦٣.

٢٣. فەرمانەك بۆ والیێ بەغدا ل رۆژا ٢٥ی رەجەبا ٩٩٢ێ مشەختی/ ٢ی تەباخا ١٥٨٤ێ زایینی، دفتر مهمة ٥٤، حوكمێ هژمارە ٣٣٨، بەرپەرێن ١٤٧.

٢٤. بۆ زانیاریێن زێدەتر، بنێرە: البدليسي،ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٢٦٣-٢٦٣، رؤوف، دراسة وثائقية في تأريخ الكرد.... بث ١٦٢.

٢٥. البدليسي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٦٦.

٢٦. بێتەنوور (بيت نور): كەلایەكە دكەڤیتە بەتەنا رۆژهەلاتێ یا چیایێ مەتینا ل باكوورێ بازێرێ ئامێدیێ ل نێزیك توخیبێ عیراقێ- توركیا.

٢٧. تومر يازجي، مصدر ثيشين، ورقة: ٧٥.

٢٨. رؤوف، دراسة وثائقية في تأريخ الكرد.... بث ١٦٥.

٢٩. نۆكە گەڤەرێ دكەڤیتە دوورترین خالا باشوورێ رۆژهەلاتێ توركیا و سەر ویلایەتا هەكاریێ.

٣٠. تومر يازجي، منظومة تاريخ امارة هكاري (دەستنڤیس) كاغەزا: ٤٢٢-٤٢٤. (لبەك ژێ ل نك ڤەكۆلەریە)

٣١. چەلێ (چال): نۆكە دبێژنێ çukurca كو دەڤەرەكا چیایی یا ئاسێ یە و دكەڤیتە باشوورێ بازێرێ جۆلەمێرگێ نێزیكی توخیبێ عیراقێ- توركیا و بەرامبەری گوندێ سەرزێری یێ سەر ب دەڤەرا بەرواری بالایە ل دووترین خارا باكوورێ پارێزگەها دهۆك.

٣٢. يازجي، ژێدەرێ بەرێ، كاغەزێن: ٥٨٧-٦٠٨.

٣٣. هەمان ژێدەر، كاغەزێن: ٦١٠-٦١١.

٣٤. هەمان ژێدەر، كاغەزا: ٦١٢.

٣٥. نێروە: كەلایەكە دكەڤیتە دەڤەرا عەشیرەتا نێروە ل باكوورێ بازێرێ ئامێدیێ، كو كەلایەكا كەڤنە و ناڤێ وێ د هندەك ژێدەرێن
ئیسلامی دا هاتیە: بنێرە: ياقوت الحموي، معجم البلدان، دار صادر، (بەیرۆت، د. ت) بەرگێ ٥، بپ ٣٣١.

٣٦. يازجي، ژێدەرێبەرێ بەرێ، كاغەزا: ٦١٦.

٣٧. هەمان ژێدەر، كاغەزێن: ٦١٣-٦٢٣.

٣٨. ئەڤ پرە (پرا بلبل) هەردو دەڤەرێن نێروە و بەرواری بالا پێكڤە گرێ ددەت و دكەڤیتە سەر رووبارێ زێ یێ مەزن ل نێزیك توخیبێ نۆكەیێ عیراقێ - توركیا، شوینوارێن وێ پرێ هەتا نۆكە باش دیارن ، سەرەدانا ڤەكۆلەری بۆ جهێ پرێ ل رۆژا ٢٣ی نیسانا ٢٠١٥ێ.

٣٩. يازجي: ژێدەرێ بەرێ، كاغەزا: ٦٢٧. هەروەسا سترانەكا فۆلكلۆری ژی بەحسێ هێرشا میر عیمادەددین بۆ سەر بەهدینان و نەچاركرنا میرێ وێ بۆ حەزوڤیانا میرێ هەكاری دكەت، بنێرە پاشبەندێ.

٤٠. کەلا شخۆ: کەلایەك و گوندەکە دکەڤیتە داوییا بەتەنا رۆژئاڤایێ چیایێ مەتینا ل باکوورێ بازێرێ دهۆك.
٤١. Evliya çeleb ı s ı yahatnamesi، hazirlayanlar: Seyit Ali Kahraman، Yucel Da⊠li،(Istanbul،2000)، IV Kitap، s. 310 - 312
٤٢. انور المائي، الاکراد في بهدينان، بپ ١٢٤.
٤٣. انور المائي، الاکراد في بهدينان، بپ ١٩٥.
٤٤. بنێرە پشکەکا ستراتا فولکلۆری یاپەیوەندی ب هێرشا چل قەدەر ل سەر بەهدینان: محەمەد ئەمین دۆسکی، ئەرزێ و بەکر بەگێ ئەرزی، سپێرێز، (دهۆك: ٢٠٠٢)، بپ ٤٩.
٤٥. ئەڤ دەقە ل سەر کێلیا گۆرێ بەهرام بەگێ برایێ ئیبراهیم بەگێ هتییە نڤیسین: (بەهرام بەگ کورێ محەمەد بەگێ عەباسی)، گۆری وی ژی ل گۆرستانا (ملك اسد)ل باشوورێ کەلها جۆلەمێرگێ، سەرەدانەك بۆ گۆرستانێ ل رۆژا ١٢ی چریا ئێکێ یا ٢٠١٤ێ.
٤٦. المايي، الفردوس المجهول، کاغەزا: ٥١-٥٢.
٤٧. میر عەبدللا کورێ ئیبراهیم بەگێ یێ ل سالا ١١٩٤ی مشەختی/١٧٨٠ێ زایینی فەرۆزەك ل داوییا پەرتووکا (مختصر احوال الامراء) نڤیسییە و دەمێ وێ ئەڤەیە: (مخابن، من د گەنجینییا خۆ دا کەسەکێ راست و ئاقلمەند ژ دەست دا کو ئەو ژی میرزا محەمەدە... ب زۆری ژینا وی ژ هەڤدە سالیێ دبۆریت و وەغەرا داوینی کریە خودێ دلۆڤانییا خۆ پێ ببەت)، بنێرە: میرزا محمد اليازجي، مختصر احوال الامراء، وەرگێران و تویژاندن: نزار ایوب حسن، بەرگێ ٢، سپێرێز، (دهۆك: ٢٠١٣)، بپ ٧٨.
٤٨. میرزا محەمەد یازجی، ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٧٥-٧٦.
٤٩. محەمەد یازجی ب ئاوایێ (بلاطون) گۆتییە، لێ خەلکێ دەڤەرێ دبێژن(بەلەك تون یان بەلەك دون)، دیدارەك دگەل محەمەد عەبدللا ئامێدی ل رۆژا ٣ی خزیرانا ٢٠١٥ێ.
٥٠. Yaşar Kaplan، Kaniya Sitranan، Nûbihar، (Stanbul: 2015)، s.280
٥١. انور المائي، الاکراد في بهد ينان، بث ١٥٢.
٥٢. D-٢٢٣١٧،G.no ،٤٤٨،BOA: HAT، D.no
٥٣. انور المائي، الاکراد في بهدينان، بث ١٥٢.
٥٤. بۆ زانیارێن ئتر ل سەر ڤی بابەتی، بنێرە: هاکان، سینان، کورد و بەرخودانەکانی ١٨١٧-١٨٦٧، وەگێران لە تورکییەوە: بەکر شوانی، ئەکادیمیای کوردی، (هەولێر: ٢٠١٢)، بپ ١٣٥.
٥٥. BOA: I.MVL، D.no: 39، G.no: 729